زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١١-١٢





# لەگەڵ پێغەمبەران

## لەقورئانی پیرۆزدا

وەرگێڕانی
کاوە هاوڕاز

پێداچوونەوەی
نەوزاد محمد سعید

# مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرەڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیان لە گشت کوت و بەندو بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێزتر بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد، تاتوانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانە هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچونەکانیان بین .

با دەستوریشمان لە دەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

# لەگەڵ پێغەمبەران

نوزاد

## لەقورئانی پیرۆزدا

نوسینی

**عفیف عبدالفتاح طبارة**

وەرگێڕانی
**کاوە هاوڕاز**

پێداچونەوەی
**نەوا محمد سعید**

بەشی یەکەم و دووەم

چاپی سێیەم



ناوی کتێب بە عارەبی: مع الأنبياء في القرآن الكريم
ناوی نوسەر: عفيف عبدالفتاح طبارة
ناوی کتێب بەکوردی: لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا
ناوی وەرگێڕ: کاوە مصطفى محمد (هاوڕاز)
پیت چنین: جمعە صديق کاکە
نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامين
پێداچوونەوەی: نەوا محمد سعيد
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمين مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: سێیەم ١٤٣٠ك - ٢٠٠٩ز
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر ژمارەی سپاردنی (٣٢٠) ی ساڵی ٢٠٠٤ دراوەتێ

تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
ت : ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بە خۆشحاڵیەوە چاپی سێیەم ئەم کتێبە بەبەهایە پێشکەش بە خوێنەری هێژای کوردستان دەکەین. بە باشمان زانی هەردوو بەرگەکەی چاپی یەکەمی لە یەک بەرەگی قەشەنگ و بە تەصمیمێکی نوێ وە بخەینە بەردەستی خوێنەران.

دیارە لەبەر داکۆکی و داواکاری خوێنەران هەستاین بە چاپکردنەوەی، ئەگینا عەوداڵی دەرهێنانی بەرهەمە تازەکانمانین.

بە هەرحاڵ ئێمە ڕەزامەندی خوێنەرانمان مەبەستە. هیواداریش ئەم کارەمان وەبەررەزامەندی خوا بکەوێ و خوێنەرانیش لێی بەهرەمەند بن.

لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٖ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٖ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾

**سورة يوسف**

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْۗ

**سورة الانعام**

# پێشەکی

## بە پێنووسی مامۆستا " محمد شریف سکر"

الحمد لله والصلاة والسلام علی رسوله محمد، وبعد..

بێگومان لەسەردەمی کۆن و نوێدا زۆر کەس لەنووسەران و زانایان دەربارەی چیرۆك و بەسەرهاتی پێغەمبەران نووسیویانە.. . بەڵام هەندێك جار شێوازو بەرنامەی نووسینەکانیان لەیەك چووە و وەك یەك بووە.

هەندێك چیرۆکیشیان پڕ بوون لەشتی ئەفسانەو دەسهەڵبەستی جوولەکەو "إسرائیلیات". هەر بۆیەش هەموو ئەو چیرۆکانەیان بە بەراورد لەگەڵ ڕاستی یەکانی قورئانی پیرۆزدا ئەو حەقیقەتە بۆ خوێنەری ئاسایی دەردەخەن کە هەموویان لەیەك پلەو ئاستدا بوون.

جێی داخیشە هەندێك لە کتێبە پشت پێبەستراوەکانی تەفسیرو مێژووش لەو شتە ئەفسانەو پووچەڵانە بەدەرنەبوون. لەبەرئەمە ئەرکی دانەرو نووسەرە وردبین و ساغ کەرەوەکان گران بووە.

نووسەری ئەم کتێبەش زۆر بەپەرۆش و سووربووە لەسەر ئەوەی کە دەبێت ئەم چیرۆکانە چەند چیرۆکیکی قورئانی بن.

بۆ ئەم کارەش لەکاتی نووسینی چیرۆکی پێغەمبەرانی خوادا (دروودی خودایان لەسەر بێت) قورئانی پیرۆزی کردووە بەتاکە سەرچاوەی ڕۆشن کەرەوەی ڕێگای کارەکەی. چونکە هەر تەنها قورئان ئەو سەرچاوە ڕاست و جێگیرەیە کە لەهیچ کاتێکی پێش خۆی و دوای خۆیەوە و لەهیچ گۆشەو کەنارێکیەوە شتی نابەجێو ـ باطل ـ ی تێ نەکەوتووە.

جگە لەوەش نووسەر پشتی بە مێژووە ڕاست و سەلمێنراوەکان بەستووە. واتە لەهەندێك شوێندا (کەزۆربەی کتێبەکەیە) تەنها پشتی بەقورئانی پیرۆز بەستووە گەر مەبەست و پێداویستی و ئاتاجەکەی تێدا بەدی کردبێت.. پاشان پشتی بە مێژوو (تأریخ)یش بەستووە گەر ڕوون کردنەوەو شیکارێکی لە قورئان دا نەدی بێت. بەم ڕەنگە کتێبەکەی نووسەری بەڕێزمان (عفیف طبارة) وەك ئەو کتێبە پشت بەقورئان بەستووەیە کەدڵو دەروون پێی شادو ئاسوودەیە. کتێبی (لەگەڵ پێغەمبەران... لە قورئان دا) یەکەمین کتێبێك نیە کە ئەم شێوازە ڕاست و دروستەی وەبەر نابێت ، بەڵکو پێش ئەوەش ، (شێخ عبدالوهاب النجار) ـ خودا لێی خۆشبێت ـ ئەم مەنهەجەی وەبەر ناوە کە لە کتێبەکەیدا (قصص الانبیاء) ـ خودا

پاداشتی لەسەر بداتەوە ـ داهێنان (ابداع)ی تێدا نواندووە. بـەڵام ئـەوەی نووسـیویەتی تـەنها زانایانی شارەزاو پسپۆر توانای وردەکاریو ساغ کردنەوەییان هەیە ، چونکە چەندین لێـدوان و وەڵام و ڕەت دانەوەش هەڵدەگرێت، بێگومان خوێنەری هاوچـەرخیش بـە ئاسـانی ئـەو جـۆرە کتێبانەی بۆ ناخوێندرێتەوە. سەرەڕای ئەمەش ـ شێخ عبـدالوهاب النجـار ـ لـەو کتێبەیـدا باسی ژیاننامە(سـیرة)ی پێغەمبەری ئیسلام ـ محمدﷺ ی نەکردووە. بەڵام دانـەری ئـەم کتێبـە بەشێوازێکی تازەو نایاب لەژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلامی کۆڵیوەتەوەو خوێنـەری ئـەمڕۆی لەزۆر لایەنی دیکەی پلەو پایەی پێغەمبەر ـ محمدﷺ بەهرەمەند کردووە. واتە لەو لایەنانـەی ئاگادارکردۆتەوە کە لەلای زۆر کـەس نـەزانراوو نادیـاربوون. جـا لـەو بـاوەڕەدام ئـەم کتێبـە بەپوختی، نایابترین لێکۆلینەوەیە کە تائەمڕۆ نوسراوە، چونکە هەموو جۆرە چـین و توێـژێکی خەڵکی بە (خاص) و عەوامەوە خۆشحال دەکات.

دیارە من لەقۆناغەکانی نوسینی ئەم کتێبە ئاگاداربووم و دەیان سەرچاوەشم لەلای نووسەر بینیوە لەو سەرچاوانەی کە سوودی لێوەرگرتوون لەنووسین و بەرهـەم هێنـانی ئـەم کتێبەیـدا کەهەوڵو کۆششێکی زۆری لەم پێناوەدا بۆ خستۆتەگەڕ تاکو بەم تـەرزە جـوان و ڕێـك وپێکـە بیخاتە ڕوو.

دانەریش بەرنامەیەکی تایبەتی خۆی لە دانانی کتێب دا هەیە، هەروەك لەمەوبـەریش لـە کتێبەکانی تری وەك (روح الدين الاسـلامي) و (اليهـود في القـرآن) و (روح الـصلاة)دا ڕەنگـی داوەتەوە.

ئەم بەرنامە تایبەتەشی بەروبوومی خۆی هەبووەو بەڵگەش لەسـەر ئـەم ڕاسـتیيە ئەوەیـە هەر کتێبێکی زیاتر لەجارێك یان دووجار چاپ کراوەتەوەو تەنانەت کتێبێکیان (نۆ) جار چـاپ کراوەتەوە. ئەمەش نیشانەی شادمانی خوێنەرانە بەبونیادو چەمکی کتێبەکانی.

نووسەر دەیەوێت لەم کتێبەیدا سێ ئامانج بەجێ بگەیەنێت:

یەکەم / خوێنەری ئەمڕۆ فێری قورئانی پیرۆز بکات بـە گێڕانـەوەی چـیرۆك و بەسـەرهاتی پێغەمبەران ـ چونکە باس و خواس دەربـارەی پێغەمبـەران ڕووبـەرێکی فراوانـی لـە قورئـان داگیرکردووە، ئەو ئایەتانەش کە لەمەڕ هەر پێغەمبەرێك دەدوێت بەسـەر چـەند سـوورەتێکدا دابەش بوون.

دانەریش هاتووە هـەموو ئـەم ئایەتانـەی لـە یەکەیـەکی بابەتیانـە (وحدة موضـوعية)دا کۆکردۆتـەوەو ئینجـا بەشـێوەیەکی تـەواو و ڕێگەیـەکی نـوێی بـێ گرێو گـۆڵ ئایەتـەکانی شیکردۆتەوەو تەفسیری کردوون.

بەمەش بێجگە لەگێڕانەوەی چیرۆکەکان گەنجینەیەکی پاشەکەوتی دیکەی لە (لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز)و (فەرمانە شەرعی یەکان)و (ڕەوانبێژیی ی قورئانی )دا خستۆتە سەر چیرۆکەکان.

دووەم / دەرهاویشتنی چەندەها پەندو وانەو حیکمەت لە چیرۆکی پێغەمبەران، چونکە مەبەست لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران وەرگرتنی پەندو عیبرەتە. هەروەك خوداش لەم بارەیەوە فەرموویە ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ ...﴾یوسف/١١١. دانەریش هەوڵو تەقەللای زۆری داوە لە دەرهێنانی ئەو پەندو عیبرەت و دەرسانەدا وەك چەندین دەرسی پەروەردەیی و گیانی و دەروونی و کۆمەڵایەتی کە هیچ کەسێکی تر پێش خۆی بەزۆربەی ئەو دەرسانە نەگەیشتووە ، چونکە نووسەرە کۆنەکان هێندە گرنگییان بەدەرس و پەندەکان نەداوەو مەسەلەی دەرهێنانیشیان بۆ ئاستی زیرەکیو دانایی‌و تێگەیشتنی خوێنەر بەجێ‌هێشتووە. دیارە ئەمەش خوێنەران دەخاتە سەر چەند ئاستێکی جیاواز لە رووی زانین و پەی پێ‌بردنی وانەو عیبرەتەکانەوە، بەڵام نووسەرە تازەکان بە ڕێنمایی‌ی خودا چەندین وانەو پەندیان لەتێگەیشتنیان دا دەرهێناوە. دانەری ئەم کتێبەش بەشێوازی تایبەتی ی خۆی ئاماژەی بۆ کاری ئەوانیش کردووەو چەندین وانەو پەندو حیکمەتی تازەی خستۆتە سەریان کە پەیوەستن بە هەموو جۆرە بوارێکی ژیانەوەو ئەو دەردی فەسادی‌و گومڕایی‌یەش چارەسەر دەکات کە ئەمڕۆ بە ڕادەیەکی گەورە ڕووی لەکۆمەڵگەی هاوچەرخ کردووەو هەڕەشەی فەوتان لەشارستانێتی‌ی نوێ دەکات هەروەك لەوەوبەریش لەقۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا ڕووی داوە.

لەو دەردو پەتا کوشندانەش کەدانەر وانەو پەندی لێوە هەڵێنجاون ، وەك: (بێ‌باوەڕی بەخودا۔ هاوەڵ بۆ خودادانان ۔ پێ نەزانین بە نیعمەت ۔ ڕۆچوون لەتاوان دا ۔ لووتبەرزی‌و بێ‌پەروایی ۔ تێکدان ۔ بەکۆیلەکردنی گەلان ۔ دەست بلاوی‌و زیادەڕۆیی ۔ فڕوفێڵو تەرازووبازی ۔ زیناکردن و هەتیوبازی ۔ وچەندان و چەندان دەردوپەتای تر...) لەدێرەزەمانەوە گەلانی ئەو سەردەمانەش ئەم تاوانە کوشندانەیان دەرهەق بە خۆیان کردووە و لەئەنجامیش دا کەوتوونە بەر ڕق و تووڕەیی‌و سزای سەختی خودا.

سێیەم/ سەلماندنی ئەو ڕاستی یەی کە قورئان سرووشێکی خودایی (وحي إلهي) یەو پاشان سەلماندنی ئەو ڕاستی ی پێغەمبەرێتی ی "محمد" ﷺ. دیارە دانەر بەچاکی توانیویەتی ئەم ڕاستی یانە بەبەڵگەی زانستی و ڕۆشنەوە بسەلمێنێت، چونکە بەڕێبازی شیکاری یەوە ئایەتەکانی قورئانی هێناوەتەوەو شی ی کردوونەوەو دەربارەی پێغەمبەران دواوەو لەم گۆشەنیگایەشەوە ئەو ڕاستی‌یە زانستیانەی نێو چیرۆکەکانیانی ڕوون کردووتەوە کە لەسەردەمی پێغەمبەری خودا ۔ محمدﷺو سەردەمەکانی دواتریش دا نەزانرابوون ، بەڵام دوایی

لەسەردەمی نوێدا مرۆڤی هاوچەرخ پێیان گەیشت لـە دوای پـەیبردنی بـە نهێنیـی چـاڵی‌و چۆڵی و بۆشاییەکانی زەوی‌و بەو شوێنەوارانەش کـە هـەزاران سـاڵ لەمەوبـەرەوە نـەزانراو و شارراوە بوون و لە ژێر زەوی‌و ناخیدا حەشاردرابوون. ئیتر دوایی زانایان توانیان هەموو هێماو نیشانەیەکیان دەرخەن و کرۆك و ناواخنیان شـیبکەنەوە. هـەروەها شـارەزاییی دانـەری ئـەم کتێبە لەوەشدا دەردەکەوێت کە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرێتی (نبوة)ی ـ محمد ﷺ باسـی ژیـان و سیرەی پاك و پیرۆزی کردووەو ئەو بەڵگەو دەلالەتانەشی بەدیار خستووە کە هیچ گومانێکیـان تێدا نامێنێت لەسەر ئەوەی کەوا ـ محمد ﷺ بە ڕاستی پێغەمبەری خودایە.

من لە کۆتایی ئەم پێشەکی یەدا ناتوانم هەموو لایەنە باشـەکانی ئـەم کتێبـە لـەم چـەند لاپەڕە سنوردارەدا (کە نووسەر بۆی دیاری کردبووم) دەربخەم...

بەڵام بەوەندە وازدێنم و تەواوکردنی ئەم کارە بۆ خوێنەر جێدێڵم تا خوێنەر خۆی بە تـەنیا هەست بەم کۆششە گەورەیە بکات کەدانەر خستویێتی یە گەڕ ، پاشان باخوێنەر هـەر خۆیـشی لەو سوودو چێژە ڕوحی یە ئاگاداربێت کەلەم کتێبەدایە... خودا پاداشـتی خێـری دانەرەکـەی بداتەوەو هەر بەم کتێبەش سوود بەهەر خوێنەرێك بگەیەنێت لەو خوێنەرانـەی کـە خوازیـاری حەقیقەتن و هەوڵی ڕەزامەندیی ی خوداش دەدەن.

# وتەی وەرگێر

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورەو باڵادەست.. درودو سڵاو بۆ سەر گیانی پێغەمبەرو هاوەڵان و شوێنکەوتوانی بەگشتی.

بێگومان (ژیانی پێغەمبەران) هەر تەنها وەك چەند بەسەرهاتێکی دێرین و چەند ڕووداوێکی مێژووی بەشەری ئاماژەی پێنەکراوە، بەڵکو لەهەمان کات دا صیاغەی عەقڵی مرۆڤ و چەندین وانەو پەندو شوێنەواری کاریگەری دەروونی ی دیاری کردووە. ژیاننامەو (سیرەت)ی هەموو پێغەمبەران بەگشتی و ژیاننامەی دوایین پێغەمبەری خوداش بەتایبەتی ئەو چرا ڕۆشنەیە کە هەمیشە لەهەموو کات و سەردەمێك دا شەوەزەنگی نەفامی و کفرو بێباوەڕیی ی ڕەواندۆتەوەو مرۆڤەکانی لەخەوی قووڵی جاهیلی وگومڕایی بێدار کردۆتەوە، هەتا بەو ڕێبازە ڕاستەش لەمانا قووڵەکانی ژیان و ڕێزو بەهای خۆیان تێبگەن و، بەچاکییش پەی بەو ڕاستیەیە درەوشاوەیە بەرن، کەناردنی ئەو هەموو پێغەمبەرو نوێنەرانەی خودا بۆ لای سەرجەم گرۆی ئادەمی بەمەبەستی بایەخ دانی تەواوە بەڕێکخستنی هەموو کاروبارێکی ژیان و ئاوەدان کرنەوەی زەوی‌و پەستنی ئەو خودایەش بەتەنها کە هەر خۆی شایستەی پەرستن و بەندایەتی بۆ کردنە.. ژیاننامەی پێغەمبەران بۆ شیکاری هەر مەسەلەیکی وردودرشتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی یەو لایەنێکی هەرە دیاری ئەو ڕێنمایی‌و هیدایەتە خودایی‌یەشە بۆ بەندە چاك و بۆ خوا سوڵحاوەکانی، تا بەم ڕەنگەش ئاسوودەو بەختەوەربن و بەڕەحمەت و سۆزو بەزەیی خوداش بەهرەمەندبن.. هەموو ئەمانەش لەم فەرمایشتەی خودادا ڕەنگ دەداتەوە کە تیایدا فەرموویە: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾یوسف/١١١.

دیارە لەچەرخی نوێش دا چەندین لێکۆڵینەوەو دیراسات لەکتێبە هەمەجۆرەکان دا لەسـەر ژیانی پێغەمبەران نووسراون و لەسـەروو هەمووشـیانەوە ئـەو کتێبانـەی کـە نووسـەرەکانیان بەرادەیەکی زۆر پشتیان بەسەرچاوە شەرعی یەکان بەستووە بەتایبەتیش (قورئان و سوننەت)..

ئـەم کتێبـەش وەك لەناونیـشانەکەیەوە دیـارە بەپلـەی یەکـەم پـشتی بـەقورئانی پـیرۆز بەستووەو پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەرانی باس کردووە، واتـە باسـی ئـەو لایەنـە گرنگانـەی بانگەوازو جیهاد و رێنمایی‌کردنی گەلەکانیانی کردووەو ئەو ئایەت و سوورەتانەی کە چـەقیان خستۆتە سەر ئەو (مەسەلە چیرۆك ئامێزانە) شی کردۆتەوە.

لەراستیش دا لەدێرەزەمانەوە تا ئەمرۆ تا سبەینێش ڕوالـەت و بونیـادی کۆمەلایـەتی و سیاسی و فەرهەنگی و سەربازی‌و ئابووریی ی هەر گـەل و نەتـەوەو کۆمـەلگەیـەك لەچـەندین بواری بنەڕەتی و سەرەکی یەوە هاوشێوەی یەکدی بوون و دەبن، سائیتر لەسەر هەر بناغەیەکی عەقائیدی‌و ئایدیۆلۆژیش بێت، کەوابوو دەشێت بلێین چاخ لەدوای چاخ ئەم بەسەرهاتانەی نێـو ژیاننامەی پێغەمبەران وەك چەندەها پەندو عیبرەت و چاوگی وانەو دەرسـی کاریگـەر گـەلێك سوودو ڕێنمایی و ئامۆژگاری بەخەلکی و دانیـشتوانی هـەر شـارو ناوچـەیەك لەهـەر کـات و زەمانێـــك دا دەگەیـــەنن، هـــەر بۆیـــەش بانگـــەوازکاران و لێکۆلیـــاران و پـــەروەردیاران و سەرکردەکانیان بایەخی شیاوی خۆیانی پی دەدەن. تەنانەت لەسـەر ئاسـتی خوێنـدنی بـالاش لەچەندین زانکۆو پەیمانگەی تایبەت بەدیراساتی فیکری‌و مرۆیی‌دا وەك مەنهـەجێکی دروسـت دەخوێنرێت، جا ئەم کتێبەی بەردەستیشتان وەك سەچـاوەیەکی سـەنگین و گـرنگ لەسەرچـاوە بەسـوودەکانی ئـەو بـوارە جێگەیـەکی تایبـەتی ی لەکتێبخانـەو زانـستە مرۆیـی یەکانـدا داگیرکردووەو هەر لەبەر ئەم بایـەخ و سـەنگ و بـەها گەورەیەیـشی حـەزمان کـرد بیکـەین بەکوردی. هەڵبەتە هەر بەرێزێکی ئاگادار لەکاری نووسـین و تەرجەمـەش چـاك دەزانێـت کـە تەرجەمەکردنی کتێبێك لەم قەوارەو بارستایی یەدا کارێکی نـەختێك دژوارو‌پـڕ بەپرسـیارێتی یەو منیش وێڕای ئەوەی چەند سـالێکەو لەناوەنـدە ڕوونـاکبیری یـە ئیـسلامی یـەکان دا وەك نووسەرێکی بواری فیکری‌و سیاسی ناسراوین بەلام بەهاندان و پێشنیاری مامۆستایەکی بەرێزو خۆشەویستی وەك جەنابی خاوەنی (نوسینگەی تەفسیر) ـ مخلص یونس ـ و پاشان لەبەر گرنگی و سوودمەندیی ی کتێبەکەش ئەوا بەیارمەتی و کۆمەکی خودا کردمان بەکوردی.

لەم کارەش دا ڕێسای وەرگێرانی دەقاودەقی کتێبەکەمان وەك خۆی (بێ زیادو کەم و دەسکاری) ڕەچاو کردووەو لەشیکردنەوەی ئایەتەکانیش دا پشتمان بەچەند کتێبێکی تەفسیری قورئانی پیرۆز بەستووە، لەهەندێك جێگەشدا تەنها شیکاری نووسەرمان تەرجەمە کردۆتەوە، سەبارەت بەفەرموودەکانیش تەنها ماناو مەبەستە گشتی یەکانی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەرمان (محمدﷺ) ـ بەوردی نووسیوەتەوە، ئەگەر بیروڕاو تێبینی یەکی تایبەتی ی خۆیشمان لەجێگەیەك دا هەبوو بێت ئەوا لەکۆتایی ی تێبینی یەکەوەو لەنێوان دوو کەوانەدا وشەی (وەرگێر) مان داناوە.

جا وەك پێشتر گوتمان لەبەر گرنگی و تام و بۆی تایبەتی کتێبەکە بەپێویستمان زانیوە کە تەرجەمەی بکەین بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی و پاشان بۆ ئەوەی لە کتێبخانەی کوردی دا وەك سەچاوەیەکی بەکەڵك بەکاربهێنرێت چونکە ئەمە ژیاننامەی گشت پێغەمبەرانە بە پوختی لەیەك بەرگ دا و نووسەر توانیویەتی بەشێوازێکی ئەکادیمی و ڕێسای توێژینەوەی هاوچەرخ ئامادەی بکات و لەهەموو دیاردەیەکی ئەفسانەکاری و ـ خرافات ـ ی جوولەکەو ـ اسرائیلیات ـ خاوێنی کاتەوەو ڕووکارێکی جوان و ڕاستەقینەی ژیاننامەی ئەو بەندە هەڵبژێرراوانەی خودا بخاتە ڕوو، جگە لە کورت کردنەوەو پوخت کردنەوەی ژیاننامەی دوایین پێغەمبەریش کە دوابەشی کتێبەکەیەو لەسێ قۆناغ و لایەنی پۆلێن کراوی دا دایڕشتۆتەوە.

خودای میهرەبان پاداشتی تەواوی نووسەر بداتەوەو پاداشتی هەموو ئەو خوێنەرە باوەڕدارە بەڕێزانەش بداتەوە کە بەوپەڕی دڵسۆزیو وەفاداری یەوە ڕێزو بەهای تەواو بەم جۆرە کتێبانە دەدەن و هەردەم دەرس و وانە و پەندە دیاری کراوەکانیان دەکەنە چرای ڕۆشن کەرەوەی ڕێگەی سەفەری دنیایان و توێشووی تەواویشی بۆ پاشەکەوت دەکەن، پاشان داواکارم لەخوێنەرانی بەڕێز نزای خێرو چاکەم لەلای خودای پەروەردگار بۆ بکەن و خوداش هەموان بخاتە بەر ڕەحمەتی فراوانی خۆی و پلەی بەرزی شەهادەت و خۆبەختکاریمان پێببەخشێت.

**کاوە هاوڕاز**

# بەشی یەکەم

# دەروازەیەک

١. پێناسەیەکی پێغەمبەرێتی

٢. ئامانجەکانی چیرۆکەکانی پێغەمبەران

# بەندی یەکەم

## (( پێناسەیەکی پێغەمبەرێتی ))

( هەواڵبەران و پێغەمبەران کێن؟ـ پێغەمبەران و راستی ی وجودیان ـ تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەرێتی ـ فەرمانی پێغەمبەرێتی ژمارەی هەواڵبەران و پێغەمبەران ـ پێویست بوونی باوەڕهێنان بە هەواڵبەران ـپاکی پێغەمبەران ـ پێغەمبەران پێشەنگی مرۆڤن ـ موعجیزەکانی پێغەمبەران )

### هەواڵبەران و پێغەمبەران کێن؟

هەواڵبەران و پێغەمبەران (الأنبياء والرسل) [1] ئەو کەسانەن کە خودا هەڵی بژاردوون لەنێو نەوەکانی ئادەمی دا تاکو بانگەوازی خودا بەبەندەکانی بگەیەنن... مژدەش بدەن بەوانەی باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکەیان کردووە کەباشترین پاداشت و خەڵات لەژیانی دنیاو لەئاخیرەتیش دا وەردەگرن ، هەروەك هەڕەشەش بکەن لەوانەشی بێباوەڕ دەبن و کرداری خراپ دەکەن کەوا سزاو چارەنووسی سەخت و ناخۆشیان تووش دەبێت ..... خودای مەزن لەم ڕووەوە فەرموویە: ﴿ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾الأنعام/٤٨.. واتە: (ئێمە پێغەمبەرانمان تەنها وەك مزگێنیدەرو ترسێنەرو ووریاکەرەوەی خەڵکی ناردووە کەمزگێنی ی بەهەشت بەباوەڕداران دەدەن و گوناهبارو نەزانانیش لەسزای دۆزەخ دەترسێنن و وریایان دەکەنەوە. جا هەر کەسێك باوەڕبێنێت و کرداری

(١) لێرەدا ئێمە بەرامبەر وشەی (الأنبياء) زاراوەی (هەواڵبەران) مان داناوە، نووسەری ئەم کتێبە لەم پەراوێزەدا دەربارەی وشەی (الأنبياء) نووسیویە:

(الأنبياء) کۆی وشەی (نبي) یە. (نبی)یش لە وشەی (نبأ) ـــ هەواڵ ـ ەوە هاتووە. لە (شەرحی قامووس)یش داهاتووە: (النبيء) بە ـ هەمزەکەوە ـ ئەو کەسەیە کەهەواڵ لەلای خوداوە بەبەندەکانی دەگەیەنێت، چونکە خودا خۆی هەواڵی بەو هەواڵبەرە (نبی )یان بەو نێرراوە داوە، دەربارەی خوا بەیەك دانان (توحید) و لە نادیار (غیب)ی خۆیشی ئاگاداری کردووەو پێیشی ڕاگەیاندووە کە (ئەو) نێراوو هەواڵبەرە. کارەکەشی بە (نبوة) ناوبراوە. (نبوة) واتە (رفعة) کە مانای بەرزی و پایەی بلندی دەگەیەنێت. کە بە (نبي)یش ناوبراوە لەبەر پایەبەرزی یەتی لە ئاست سەرجەم خەڵکی تردا. دیارە پایەبەرزییەکەش لەڕووی کاروباری دنیایی یەوە نی یە.

چاکی هەبێت ئەوا نەترسێکی لەسەرەو نەخەمباریش دەبن).

ئـەو هەواڵبـەران و پێغەمبەرانـەش زانـستیان لـەخوداوە بـەهۆی عـەقڵو هەسـتە جۆربەجۆرەکانی تریان و لەچەند ڕێگایەکیشەوە وەرگرتووە، لەو ڕێگایانەش: گەیانـدنی بـەدڵو مێشك و ئاسۆی بیریان ، یان بیستنی ڕاستەخۆ لەفریـشتە (مەلائیکـە)یەکـەوە کـە لەشـێوەو ڕوخسارێکی بەشەریدا خۆی دەنوێنێت.. . یان خەوبینین (رؤیا)ی ڕاست لەکاتی نووستن دا یان لەهەر حاڵەتێك لەو حاڵەتە ڕۆحی یانەوەی کەجگە لەمرۆڤی پێغەمبەر کەسی تـر دەرکـی پـێ ناکات. ئەم شێوازە فێرکاری یەش کە پێـچەوانەی ڕێ وشـوێنە ئاسـایی یەکانـە بـە سـرووش (وحي) ناودەبرێت.

## جیاوازی نێوان هەواڵبەرو پێغەمبەر ( نبي ورسول ):

فەرمانی (نبـوة) پـێ دەچـێت کـە تـەنها بـە خاوەنەکـەی (واتـە بەهەواڵبەرەکـەی خـودا سپێررابێت و لەو ساتەش دا بە هەواڵبەر (نـبی) ناودەبرێـت، واتـە " هەواڵبـەرێکی نێـرراوی خودا"، لەوانەشە ئەم فەرمانە ئەرکی تریشی جگە لەگەیاندنی هەواڵی خودا پێـوە لکێنرابێـت وەك ئەرکی ڕاست کردنەوەی هەڵس و کـەوتی کۆمـەڵێك لەخـەلکی ، ئـەم ئەرکـەی دیکـەش بەپەیامێك (رسالة) ناودەبرێـت و خـاوەنی پەیامەکـەش بەپەیامبـەر (رسـول) [1] ناودەبرێـت. لەسەر ئەم بنچینەیەش هەر پەیامبەرێك لەهەمان کات دا نێرراو و هەواڵبەر (نبی)یشە، بـەڵام هەر (نبی) یەك پەیامبەر (رسول) نی یە.

## پێغەمبەران و ڕاستیی وجودیان

فەلسەفەی مەتریالیزم چەندەها گومانی لەسـەر بنـەمای "پێغەمبـەرێتی" خرۆشـاندووەو نکوولّی ی لەبوونی پێغەمبەرانیش کردووە، بەڵکو تەنانەت نکوولّی ی لەجیهانی (ڕۆحـانی) و گیان پەروەریش کردووە. بەڵام هەر توێژەرەوەو لێکۆڵەرەوەیەکی حەقیقـەتی "پێغەمبـەرێتی" کە بەوردی لەم ڕاستی یە بکۆڵێتەوە چەندین نیشانەی جێگیر بەدی دەکات کە بـێهیچ شـك و گومانێك قەناعەتی لەسەر حەقیقەتی پێغەمبەرێتی پێ دێنن.

---

(١) مانای (رسول) بەکوردی ـ پەیام بەرە ـ بەڵام دیارە ئەمڕۆ وشەی (پێغەمبـەر) لـەناوزمانی کـوردی دا جێگیربووە ، وشەی (پێغەمبەر)یش لە وشەی (پەیغام بەر)ی فارسی یـەوە بـەکارهاتوە،چـونکە (پـەیغام) بـە فارسی واتە (پەیام).. . (وەرگێر)

بەواقعیش ڕووی داوە کە لەزۆر وڵاتی جیهان دا چەندین ئایین هەبوون وچەندین پێغەمبەریش (کە ژمارەیان نەزانراوە) بانگەوازیان بۆ کردوون. دانیشتوانی ئەو وڵاتانەش ئەو ئاینانەیان لەژیانی ماددی و ڕۆحی یان دا پەیڕەوکردووە، ئەو ئاینانەش کە لەمەسەلە ڕەمەکی (جزئی)یەکانیان دا لێك جودابوون و کە لەمەسەلە گشتی یەکانیشان دا لەسەر زۆر کاروباری بنەڕەتی ی وەك (باوەڕ بەخودایەکی کردگار ـ خالقی وجود ـ و بوونی ژیانێکی دوای ئەم ژیانە) کۆك و ڕێکەوتووبوون، وایان ڕاگەیاندووە بەخەڵکی کە بەپێی ئەو ئاینانە مرۆڤ پاداشتی لەسەر کاری دنیای پێ دەدرێتەوە، هەروەك سزاشی لەسەر بەدکرداری ژیانی دنیای دەدرێت.

ئەم چەمکە گشتگیرە بەڵگەیەکی بنەبڕە لەسەر ئەوەی، کە (پێغەمبەریتی) ئاتاجێکی ڕۆحی بووە بۆ هەموو ئادەمیزادێك بەتایبەتیش لەسەردەمەکانی ڕابردوودا، چونکە لەو سەردەمانەدا خەڵکی جیهان ئاگایان لەیەکترنەبووەو بەهۆی ئەو ماوە دوورو درێژانەی ڕێگاکانەوە کە بەئاسانی بۆیان نەبڕراوە هەندێکیان ئاگاداری هەندێکیان نەبوون ، پەیوەندی نێوان گەلانیش لە ئارادانەبووە، نە ڕادیۆو تەلەفزیۆن هەبووە، نە ڕۆژنامەو گۆڤار، نەئامرازی گەیاندنی خێرا کەوەك ئەمرۆ جیهان بەیەکدی بگەیەنێت.

ئەو ئاینانە هەندێکیان، تائەمرۆش بەردەوامن و سەدان ملیۆن شوێنکەتووشیان هەیە کە ئەمەش خۆی لەخۆی دا شایەتی دانێکە لەسەربوونی "پێغەمبەرێتی" ، چونکە ــ پێغەمبەرێتی ـ سەرچاوەی ئەم ئاینانەیە، هیچ ئاینێکیش بەبێ بوونی پێغەمبەرێك نەبووە.

## ئیلهام لەلای ئاژەڵ

پێغەمبەرێتی لەعەقڵەوە دوور نی یە، ئەمرۆ لە دنیادا زانیاری لەلای هەندێك بونەوەر لەدەرەوەی ڕێگای هەستەوە هەیەو سەربەخۆیشە لە (هەوڵو تەقەللای عەقڵی) ، ئەمەش وەك "ئیلهامی ئاژەڵان" لەم ڕووەوە زانایانی "ئاژەڵناسی" ڕوونیان کردۆتەوە کە ئاژەڵان ، نەخاسمە سادەو ساویلکەکان کاروباری خۆیان لە گەڕان بە دوای خۆراك و بنیات نانی خانەو کرکەوتن لەسەر هێلکەو لەئامێزگرتنی کۆرپەدا بەئیلهامێکی وەها ڕێك دەخەن کەلەسەروو ڕاددەی تێڕوانین و تێگەیشتنەوەیە.[١]

---

(١) بۆ نموونە ئەو جانەوەرانە (حشرات)ـەی کە بە (نیکرۆفۆر) ناودەبرێت یەکسەر دوای هێلکەکردن دەمرن واتە هەرگیز وەچەی خۆیان نابینن ، بەڵام پێش هێلکەکردن ئەوپەری بایەخ بەدانانی چەند لاشەیەکی دیکەی جانەوەران لەتەنیشت جێگەی هێلکەکانیەوە دەدات تاکو ببنە خۆراك بۆ ئەو بەچکانەی خۆی لە هەرکاتێك دا کە لە هێلکەکە دەچنە دەرەوە. جا ئیتر کێ زانین و ئیلهامی بەو جانەوەرانە داوە کە لە هێلکەکانیان دا

جا ئەگەر زانایان خۆیان دان بەم دیاردەیەدا بنێن کەئیلهام بۆ ئاژەڵان هەیە، ئەوا هێندە لە عەقڵەوە دوورو پەنهانیش نی یە کەخودا چەند کەسێك لە مرۆڤەکان هەڵبـژێرێت و بەخواسـتی خۆی لەچەند ڕێگایەکی نەزانراو نائاسایی یەوە فێری چـەند شـتێکیان بکـات و بیانکـات بـە پێغەمبەر و نێرراوانی خۆی بۆ لای خەڵکی.

## لێکۆڵینەوە روحی یە هاوچەرخەکان

زانستی ئەمرۆش دان دەنێت بەوجودی جیهانێکی ڕوحی و گیان پەروەرێتی ی سـەربەخۆ و دابڕاو لە ماددەدا، ئەمەش کاری دانانی (پێغەمبەرێتی)و (سرووش)مان بە مەسەلەیەکی شیاو بۆ ساغ و پوخت دەکاتەوە.

زانای ئەڵەمانی دکتۆر(مسمیر) ساڵی(١٧٧٠ز)ــ"خەولێخستنی موگناتیـسی"ی دۆزی یەوە و بەتاقی کردنەوەش سەلماندی کە مرۆڤ هەر تەنها ئـامرازێکی مـاددی نـی یـە، بـەڵکو گەنجینەو ئامارێکە بۆ ڕۆحێك کە لەهـەموو ڕوویەکـەوە پێـچەوانەی - ماددەــ یـەو زاڵیـشە بەسەری دا دوای ئەوەی کاری یاسا سروشتی یەکان پووچەڵ دەکاتەوە، پاشان نـاوبراو بەڵگـەی پێ هێناوەتەوە لەسەر وجودی عەقڵێکی شارراوەی مرۆڤ کەبالآترە لەعەقڵی ئاسایی‌و پەیوەستە بەجیهانێکی گیان پەروەریی "ڕۆحانی" یەوە.

ئەم داهێنانەی زانا ئەڵمانیە کەهەموو زانا مەتریالیستەکانی ئەو سەردەمەی ترسـاندو بـۆ ماوەی یەك سەدەی تەواویش بەرەبەرکانی و دژایەتی یان دەکرد، بەڵام ئەو بەهۆی ڕاسـتی یـە جێگیرەکانیەوە توانی بەسەر هەموو ناحەزانی دا سەرکەوێت و دان پیانانی زانستیش بـۆ خـۆی دەستەبەر بکات. ئیتر لە ئەنجامی سەلماندن بەبەڵگەی هەست پـێکراودا دەرکـەوت کـە مـرۆڤ تەنها لەو لاشە ژینەوەری(حیواني)یـەی دا بەنـد نـی یـە، بـەڵکو لـەناخی دا چـەندین هێـزی شارراوەی بالآ هەیە، کە بە تەواوی و ڕاستەخۆو بە پلەی هەمەجۆر پەیوەستن بە جیهانی ڕۆحی یەوە.

ئەم پەیوەست بوونە ڕۆحی یەی نێوان دەروونی مرۆڤایەتی و جیهانی ئەودیو سروشـت ئـەو ڕاستی یە لە عـەقڵەکانمان نزیك دەکاتـەوە، کـەخودا چـەند ڕۆحێکـی پەیوەسـت بـەخۆی لـەم جیهانەدا هەڵدەبژێرێت و سرووشی ویست و خواستی خۆی لە گەیاندنی پەیامی دا بە (خـەڵکی

---

چەندین بەچکەیان هەیەو ئەو بەچکانەش کاتێك لە هێلکە دێنەدەر ئاتاجیان بەخۆراکەو؟ ئەی چۆن دەزانن کـە خۆراکی پێویستیان ئەو چەند لاشە مردووەی جانەورانی ترە؟ خۆ ئەگەر لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەکـە نەبوایـە ئەوا دەیان نموونەی دیکەمان لەم بارەیەوە دەخستە روو.

خۆی)یان پێ دەسپێرێت لە پەیرەوکردنی بیروباوەڕو هەموو ڕێساو ئاڕاستە ڕەوشتمەندی یـەکان، کە خۆشگوزەرانی یان تێدایە.

لەدواییش دا ئەوە دەخەینـە ڕوو، کـە خـەودیتنی ڕاسـت (الرؤيـا الـصادقة) یەکێکـە لـە ئامڕازەکانی ئەو سروشەی کە خودا پشتگیری پێغەمبەرانی پێکردووە ، ئەمەش لەڕاسـتی یـە دان پێدانراوەکانە کە هەندێك کەس بینیویانە و زانایانیش دانیان بە ڕاستی ی ڕوودانی دا ناوە.

## تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەرێتی

(پێغەمبەرێتی) بەخششێکی خودایی یەو خودای مەزن بە خواستی خۆی بە هەندێك کەس لەبەنـدەکانی بەخـشیوە. ئـەم فەرمانـە بـەهۆی عەقڵـەوە دەسـت مـرۆڤ ناکـەوێت، هـەروەك بەکاروکاسبی و زۆری ی گوێرایـەڵی (طاعـة)یـشەوە پەیـدانابێت ، هـەروەها بـە ڕەچـەڵەك و بۆماوەیی (وراثة)یش چنگ نەکەوتووە، بەڵکو ئەم فەرمانە سپێرراوە بە هەندێك کەس لەوانەی کە خودا پاڵاوتوونی و هەڵیبژاردوون و ڕەوانەی کردوون بۆ لای کۆمەڵێك کەس لە خەڵکی.

کەسیش بەم فەرمانە نەگەیەنراوە تەنها بە سرووشی خودایی و ڕێنمایی خودای پەروەردگار خۆی نەبووبێت. خودای مەزن لەم ڕووەوە فەرموویە:﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴾ الحج/٧٥.. واتە: (خودا لـە نێـو مەلائیکـەتان دا نێردراوانی وەك (جوبرائیـل) هەڵدەبژێرێت و لەنێو خەڵکیش دا نێرراوانـی خـۆی هەڵبژاردووە ــ بێگومان خودا بیسەر و بینەرە). هەروەها خـودا فەرموویـە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾آل عمران/٣٣. واتە: خودا ئادەم و نوح و ئالی ئیـبراهیم و ئالی عیمرانی لەنێو جیهانیان دا هەڵبژاردووەو پلەوپایەی پێغەمبەرێتی ی پێ بەخشیون).

ئەو بانگەوازەش، کە پێغەمـبەران گەیاندوویانە لـە زیرەکـی ی خۆیانـەوە نـەبووە یـان لـە ئازارچەشتن و خەمباری یانەوە بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە کۆمەڵگەکەیانی تێدا دەژیـا ، یان لەهەستی ناسك و خاوێنیانەوە، لە هیچ هۆیەك لەمانەوە نەبووە ئەگەرچی خاوەنی عـەقڵو زیرەکی و هەستی ناسکیش بووبن ، هیچ پاڵنەرێك لەمانە بەتەنیا هانـدەرێکی بـەگوڕ نـەبووە لەسەریان بۆ چاکسازی، بەڵکو تاکەسەرچاوەو چاوگی کرداریان (سرووش)و (پەیام) بووە، لەبەر ئەمە هەرگیز ناشێت کە ئەوان (واتە پێغەمبەران) بە (دانایان )یان پێـشەوایان یـان چاکـسازو ڕاست کەرەوان یان بە بلیمەتان وەسف و بەراورد بکەین...

خـــودای مـــەزن فەرمووبـــە: ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴾النحل/٢.. واتە (خودا فریشتە (مەلائیکە)کـانی بـەڕۆح (بەسرووش و قورئان و پێغەمبەرێتی) یەوەو بەفەرمانی خۆی و خواستی خۆی دەنێرێت بـۆ لای هەر تاقم و هۆزو گەلێك و ڕێسایان پێدەگەیەنێت لەسەر ئەوەی کە خەڵکی ئاگادارکەنەوە لـەر ڕاستی یەی کەوا جگە لەمن ـ لەخودا ـ هیچ پەرستراوێکی دیکـە نی‌یـەو کەسـی تـر شـایانی پەرستن نی یە، لەبەر ئەوە لە من بترسن و لەسزای من خۆبپارێزن).

لەبـەر ئەمـە پێغەمبـەر ناکەوێتـە بـەر چـەند هۆکـارێکی دەروونـی ی نـاوەکی یـەوە، پەیامەکەشی بەپێی بارودۆخـە کۆمەلایـەتی یەکـە بـەڕێوە نابـات... خـوداش فـەرمانی بـە پێغەمبەری خۆی(محمد) کردووە، کـە گەلەکـەی بـدوێنێت: ﴿ ...قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ... ﴾یونس/١٥. واتە: (ئەی-محمد- پێیان بڵـێ من بەهیچ شێوەیەك مافی ئەوەم نی یە کە قورئان بگۆڕم بەشتێکی دی یان بە پـەیامێکی تـر لە خۆمەوە، بەڵکو تەنها پەیرەویی ی ئەو سرووشە دەکەم، کە بۆم دەنێررێت).

## گشتگیریی پەیام

پاشان بێگومان پەیامی خـودایی بـۆ هـەموو مرۆڤێـك نێـرراوە. گـشتی‌یە بـۆ سـەرجەم بەشەریەت چونکە خودای پەروەردگار خودای هەموو جیهان و جیهانیيانە (رب العالمين)ـە نەك هەر خودای تاکە گەلێك بێت.. خودای پـەروەردگار فەرموویـە: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ[1] فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ﴾ النحل/٣٦. واتە: (بێگومان لەهەر نەتەوەیەك پێغەمبەرێکمان بۆ نـاردوون و لەرێگەی ئەوەوە داوامان لێ کردوون کە تەنها خودا بپەرستن و لەستەمکار دوورکەونەوە، لـەو نەتەوانەش دا هەندێك کەس شایستەی ڕێنوێنی ی خودا بووەو هەندێك کەسی تـریش بـەهۆی گونـاه و سەرپێـچی ی خۆیانـەوە گـومڕایی و ڕێ لێ تێکـچوونیان شـایان بـووە). ئەمــەش پێچەوانەی ئەو بیروبۆچوونەی "بنوأسرائیل"ـە کە نکوولی، یان دەکرد لەوەی خودا بەخواسـتی خۆی هەر بەندەیەکی خستبێتە بەر نیعمەت و ڕەحمەتی فراوانی خۆی، بەڵکو ئەوان (واتـە بنـو اسرائیل) فەرمانی پێغەمبەرێتی- یان تەنها تایبەت کردبوو بەخۆیان وەك ئەوەی گوایـە ئـیتر گەلانی تر لەخەڵکی دروستکراوی خودا نەبن.

---

(١) طاغوت/ بەهەر شتێکی پەرستراوی غەیری خودا دەگوترێت، وەك بت و شەیتان و ستەمکاران و.هتد.

## فەرمانی پێغەمبەرێتی

فەرمانەکانی پێغەمبەرێتی لەسێ کاروباردا پوخت دەبنەوە:

**یەکەم: بانگەواز بۆ باوەڕهێنان بەخوداو بەیەك دانانی خودا.**

**دووەم: باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی (ئاخیرەت) و پاداشت لەسەر کاروکردەوە تیای دا.**

**سێیەم: ڕوون کردنەوەی ئەو شەرع و یاساو دەستوورانەی کە بۆ چاکردنی باری مرۆڤ و بەختیارییەتی لە دونیاو ئاخیرەت دا..**

ئێستاش یەکەیەکە ئەم کاروبارانەی فەرمانی پێغەمبەرێتی شی دەکەینەوە..

### یەکەم / باوەڕ بەخودا:

باوەڕداری بەخودا سرووشت و خوویەکە (فیطرەیەکە) لەدەروونی ئینسانی دا. هەموو ئینسانێك خۆی وادەبینێتەوە، کە بەکێشکراوە بۆ ژێر دەسەلاتی هێزێك کە باڵاترە لەهێزی خۆی. بەڵام خەڵکی لەم رووەوە بیروبۆچوونیان وەك یەك نی یەو بیروڕای جیاوازو هەمەجۆریان لەسەر دیاری کردنی ئەو هێزە باڵاترەی سەروو هێزی خۆیان هەبووە، هەندێك کەس بە (هێزی سروشتی)ی لێك داوەتەوە، هەندێکی تریش لەچەند بتێك دا ئەو هێزەی بەدی کردووە کە خۆی دایتاشیوون... کەسانی دیکەش بەشێوەیەکی تر تەفسیری هێزەکەیان کردووە... پێغەمبەرانیش (دروودی خودایان لەسەر بێت) بۆ ڕاست کردنەوەی ئەو سەرلێ شێوان و گومڕایی یانە هاتوون، تاکو عەقڵ بەرەو (باوەڕهێنان بە وجودی خوداو یەکیەتی خودا) ڕێنموونی بکەن. شێخ ـ دەهلوی ـ دەڵێت: (یەکەمین بانگەوازی پێغەمبەران و گەورەترین ئامانجیشیان لەهەر زەمان و هەر ژینگەیەك دا ڕاست کردنەوەی باوەڕداری بووە بەخوداو ڕاست کردنەوەی پەیوەندییش لەنێوان بەندەو خودای پەروەردگاریدا، هەروەها بانگەواز بۆ گوێڕایەڵی و، بەندایەتی پوخت و تەواو تەنها بۆ خوداو (پەرستنی بەتەنها خودا) وملکەچ بوون بەوەی، کە هەرخودا سوودبەخش و زیان بەخش و شایستەی پەرستنە.. ئینجا پاڕانەوەو پەنابردنە بەر خودا و هەر جۆرە بەندایەتی یەك کە تەنها بۆ خودا بێت..

هەڵمەتی بانگەوازو چاکسازی پێغەمبەران چەقی خستبووە سەر ڕیشەکێشکردنی ئەو حاڵەتی (بت پەرستی) یەی کە بە شێوەیەکی دیارو ئاشکرا لەسەردەمەکانیان دا پەرەی سەندبوو ولەپەرستنی هەر بت و پەیکەرێکی داتاشراودا ڕەنگی دەدایەوە وە وایان لێ هاتبوو

پیاوچاكان و بە پیرۆز ڕاگیراوانیشیان لە زیندوان و مردوان دەپەرست) [(١)] خۆ ئەگەر (عـەقڵی بەشەری) تەنها ڕاستی یەكانی هەست پێبكردایـە، ئـەوا هـەرگیز نیـشانی خـۆی نـەدەپێكاو بەداواكاری‌ی پێویست نەدەگەیشت ، بەتایبەتیش لەو مەسەلەو كاروبارە ـ غەیبی‌یانەـ دا كـە مرۆڤ ئامادەیی‌ی بۆ زانین و پەی پێبردنیان نەدەبوو تەنها بەو سرووشە (وەحی یە) نـەبێت كـە خودا بە پێغەمبەرانی گەیاند. فەلسەفەی گریكی (یۆنانی) و هەر فەلسەفەیەكی هاوشێوەیشی هەوڵی گەرانیان بـەدوای مەسـەلەی پەرسـتن و دۆزینـەوەی خودایـەكی پەرسـتراو وكاروبـاری (ئیلاهیات )دا داوە و بەڵام هەر تووشی كەم بینی ی عەقڵ و بیروبۆچـوونی پووچـەڵو بـیروڕای لێك جیاواز بوون. لەسەردەمی نوێش دا زانایان بیروڕای لێك جیاوازیان لـە تەفـسیرو شـیكاری خۆیاندا هەبووە كاتێك تەنها پـشتیان بەعـەقڵی خۆیـان بەسـتووە. بـەڵام پێغەمبـەران وتـەی جیاكەرەوەو یەكلایی كەرەوەیان بۆ تەفسیرو دیاری كردنی ئەو هێزە خـودایی یـە هێنـاوە، كـە عەقڵیش دڵنیا دەكات.

## دووەم/ باوەڕ بەڕۆژی دوایی :

ئەمەش هەر لەفەرمانەكانی پێغەمبەرێتی یە، چونكە لـەو مەسـەلە غـەیبی یانەیـە كـە عەقڵ بەبێ ڕێنمایی ی پێغەمبەران پەی بەحەقیقەتی نابات.

هەر مرۆڤێكیش هەستێكی تەواو دەكات بەو مەسەلەیەی كە ئەم ژیانە بە كۆتایی هـاتنی تەمەن كۆتایی پێ نایەت بەڵكو دیارە ژیانێكی دیكە هەیە، كەمرۆڤ بە شێوەیەكی تر تیـای دا دەژی‌و دەیباتە سەر. ئەم هەستە گشتی یەش كـە بەڕووبەنـدی هـزری زۆربـەی خـەڵكی یـەوە نووساوە بەگومڕایی یەك لە گـومڕایی یـەكانی عـەقڵ دانانرێـت، هـەروەها بـە خـەیاڵێك لـە خەیاڵەكانیشی دانانرێت وەك چۆن مەتریالیستەكان (ماددە پەرستەكان) وای دەگەیەنن.

پاشان گەر لەخانەی عەقڵدا باوەڕ بەژیانێكی تـر نـەبێت ئـەوا ئەمـە لـەرووی دەروونی‌ـو كۆمەڵایەتیشەوە دەبێتە هۆی ڕوودانی كارەساتێك بۆ ڕەگەزی مرۆڤایەتی، چونكە هەر مرۆڤێك لەبەر ئەگەری چەندین ڕووداوو نەخۆشی و چەوساندنەوەو زوڵم و لەدەست دانی خۆشەویستێك دایە. باوەڕهێنانیش بەژیانێكی دیكەی باشتر لەم ژیانەی دنیا كە تیای دا بە ڕێسای دادگـەری پاداشتی مرۆڤ یان سزای بدرێتەوەو یاخود خۆشەویستان و پیـاو چـاكان پێكـەوە كۆبكاتـەوەو ئارامی و دڵنیایی و هێمنیش بخاتەوە نێو دەروونە برینـدارەكان، هـەروەها بـاوەڕ هێنـان بـەو ژیانەی تر كە لە مرۆڤ دەپرسێتەوە لەسەركردەوەكانی، ویژدانێكی زینـدوو لـە نـاخی مـرۆڤ دا

---

(١) بڕوانە (حجة الله البالغة)ی ـ شێخ دهلوي

دەخولقێنێت کە هانی دەدات بۆ خێرو چاکەکاری و لەشەڕ و خراپەشی دوور دەخاتەوە. هەروەها مرۆڤ لەناسینی باری ڕاستیەو دروستی ی پاداشت و سزادا بە بێ ڕێنموونی ی پێغەمبەران دەستەوسانە هەرچەندە بەبیرو خەیاڵیش هەوڵی ناسینی بدات.

## سێیەم/ ڕوون کردنەوەی شەریعەت:

هەر لەفەرمانەکانی تری (پێغەمبەرێتی) ڕێنماییکردنی خەڵکی یە بۆ سەر ئەو ئاکارو کردەوە جوانانەی کە بەختیاریەو کامەرانی ی هەردوو خانەی "دنیا" و "ئاخیرەت" یانی تێدایە، ئەم ڕێنمایی یەش لەڕێی ئەو شەرع و ڕێساو دەستوورانەوەیە کە لەخوداوە وەریان گرتووە. چونکە خەڵکی بەتەنیاو هەر بە عەقڵی خۆیان ناتوانن ئەو ئاکارو هەڵس و کەوتە شیاوانە دەستەبەرکەن و لەسەریان بڕۆن چونکە هۆکارو سەرچاوەی ڕەوشت و بەرژەوەندیەو ئارەزووەکانیان بەپلەی جیاوازن. بۆ نموونە لەوانەیە (خراپە) لای هەندێك کەس بە (چاکە) دابنرێت گەر دەسکەوت و سوودێکی تێدا ببینن، لەوانەشە واز لە چاکە بێنن گەر دژی بەرژەوەندی و هەواو ئارەزووە تایبەتییەکانیان بێت. گەورەترین بەڵگەش لەم ڕووەوە ئەو هەموو زوڵم و ستەم و دەسدرێژیەو پێشێل کاریەی مافی بێهێزەکانە کە ئەمرۆ دیاردەیەکی دزێوە لەم جیهانەداو، کە وای ڕادەگەیەنن گوایە گەشتوونەتە پلەیەکی بەرزی پێشکەوتن و شارستانێتی.

لەبەر ئەمە پەیامی پێغەمبەران ڕوون کردنەوەی ئەو کارەچاکانەیە کە مرۆڤ سازو ئامادە دەکات بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوداو بۆ چاکردنی کۆمەڵ، پاشان وریاکردنەوەی لەو کارە خراپانەی کەدەبنە هۆی بێزاری و تووڕەیی ی خوداو شێواندنی کۆمەڵگەش.

بێگومان دیاری کردنی کارەچاك و خراپەکان و دەستنیشان کردنی سوودو زیان و پاداشتو سزاکانیان مرۆڤ هان دەدات بۆ کاری خێرو پاڵنەری چاکەی تێدا دروست دەکات.

ترساندنی خەڵکیش لەکاری خراپ هۆیەکی زۆر کاریگەرە لە دەروونی ئینسانی داو ناردنی پێغەمبەرانیش بۆ لای مرۆڤەکان رێ لە ستەمکاران دەگرێت و پاساوێکیان بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بپارێزن لەوەی کەخودا رێی ڕاستی بۆ روون نەکردبنەوە تا بەپێی پێویست لەسەری بڕوشتنایە. قورئانیش ئەم ڕاستی یەی ئاشکرا کردووە، هەروەك خودا تیای دا فەرموویە:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾النساء/١٦٥ واتە: (پێغەمبەرانمان وەك مزگێنی دەرو ترسێنەر بۆ ناردوون تاکو دوای ناردنی پێغەمبەران بڕوبیانوویەك بۆ خەڵکی نەمینێت لەسەر ئەوەی خۆیان بە دوورگرن لە سزا. خوداش بە تواناو دانایە لە ڕێنماییکردنی خەڵکی و ڕێك خستنی سیستمی ژیانیان دا). لە

نەریت و سوننەتی خوداش وا بووە کە هیچ کەسێك لە بەندەکانی سزانەدات هەتا دوای ئـەوەی پێغەمبـەرێکیان بـۆ دەنێریـت، هـەروەك فەرمووشـیەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾الأسراء/١٥... واتە: (ئێمە هیچ کەس و تاقم و گەلێکمان سـزانەداوە هـەتا لـە پـێش ئەوەدا پێغەمبەرێکمان بۆ نەناردبن و هەوڵی زۆری لەگەڵ دانەدابن و ئەوانیش سەرپێچی، یـان لە پەیامەکەی کردبێت).

## ژمارەی هەواڵبەرو پێغەمبەران

هەواڵبەرو پێغەمبەران زۆرن ... بەڵام ئەوانەی کە قورئان باسی کردوون تـەنها بیـست و پێنج (٢٥) پێغەمبەرن کە دەبێت باوەڕ بە هەموویان بهێنرێت:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١ـ ئادەم | ٢ـ ئیدریس | ٣ـ نوح | ٤ـ هود | ٥ـ صالح |
| ٦ـ ئیبراهیم | ٧ـ لوط | ٨ـ ئیسماعیل | ٩ـ ئیسحاق | ١٠ـ یەعقوب |
| ١١ـ یوسف | ١٢ـ شوعەیب | ١٣ـ ئەیوب | ١٤ـ ذو الکفل | ١٥ـ موسا |
| ١٦ـ هارون | ١٧ـ داود | ١٨ـ سولەیمان | ١٩ـ ئیلیاس | ٢٠ـ ئەلیەسەع |
| ٢١ـ یونس | ٢٢ـ زەکرییا | ٢٣ـ یەحیا | ٢٤ـ عیسا | ٢٥ـ موحەممەد |

(دروودو سڵاوی خودا لەسەر هەموویان بێت)...

جگە لەم پێغەمبەرانەش چەندەها پێغەمبەری تر هەبوون کەقورئان ناوی نـەبردوون، بـەڵام ئاماژەی بۆ کـردوون، ئـەویش لـەم فەرمایـشتەی دا کەپێغەمبـەری خـۆی (محمدﷺ)ی پـێ دوانـدووە و فەرموویەتـی: ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ﴾النساء/١٦٤.. واتە: (لەپێغەمبەران هەندێکیانمان بۆ باس کردوویت و لەمـەو پـێش چیرۆکێکمان بۆ گێڕاویتەوەو چیرۆکی هەندێکی دیکەشیانمان بۆ نەگێڕاویتەوە).

پێغەمبەرانیش هەموویان لەرووی فەزڵ و گەورەیی یەوە لەیەك ئاست و پلەدا نـین، بـەڵکو خودا بەهۆی هەندێك بارودۆخ و سەردەمەوە پلەو (فـضل)ی هەندێکیانی لە هەنـدێکی تریـانی زیاتر داناوە، وەك فەرموویـە: ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾الأسـراء/٥٥... هـەروەها خودا پلەی دوایین پێغەمبەر (محمد)یﷺ لەسەرو پلـەی هـەموو پێغەمبـەرانی دیکـەی پـێش خۆیەوە داناوە چونکە بۆ هـەموو خـەڵکی سـەرزەوی ی (بێجیـاوازی) نـاردووە، لـەکاتێك دا پێغەمبەرانی پێشووی بۆ چەند گەلێکی تایبەتی ناردووە. لەم ڕووە خودا کە ڕووی گفتاری لـە

پێغەمبەر(محمد)ﷺ کردووە فەرموویـە: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَـذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾السبأ/٢٨.. واتە: (ئـەی محمـدﷺ ئێمـە تۆمـان وەك مزگێنیدەری بەهەشت و وریاکەرەوەو ترسێنەری خەڵکی لە دۆزەخ بۆ سەرجەم گرۆی ئینسانیو هەموو خەڵکی سەرزەوی ناردووە. بەڵام زۆربەی خەڵکی بەهۆی ڕوو وەرگێڕانیانەوە لەهەق ئـەم ڕاستی یە نازانن).

هەروەها پێغەمبەری ئیسلام (محمد)ﷺ دواین پێغەمبەر بووە کە کۆتاییی پەیامی خودای پێ هێنراوەو شەرع و ڕێساو دەستووری تەواوو هەمەلایەنەی هێنـاوە، خـودا فەرموویـە:﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾الأحزاب/٤٠

## پێغەمبەرانی خاوەن "عەزم"

هەندێك لە پێغەمبەران لەقورئان دا بە (أولوا العزم) ناوبراون، واتە خاوەنانی ئارامی زۆرو جێگیرو دەروون پتەو لەسەر ئاینەکەیان. خودا فەرمانی بە پێغەمبەری ئیسلامیش (محمـد)ﷺ کردووە کە لە جیهاندا شوێن پێی ئەوان هەڵبگرێت و بیانکات بە پێشەنگ (قدوة) بـۆ خـۆی، هەروەك پێی فەرمووە: ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ .. ﴾الأحقاف/٣٥... ئەوان بە (أولوا العـزم) ناوبراون چونکە (عـەزم)و ورەیـان زۆر بـەهێز بـووەو تاقیکردنەوەکانیـشیان زۆر سەخت و دژوار بووەوە جیهادەکەشیان قورس گران بووە، ئەوان کە لە ئایەتەکەدا بـەو سـیفەتە ناوبراون (نوح، ئیبراهیم، موسا وعیسا) بوون جگە لەوەی کە-محمد-یشﷺ بە یـەکێك لـەوان دەژمێردرێت و بە (اولوا العزم) دانراوە، چونکە لە نێو هەموو پێغەمبەران دا جیهادو ئارامیو قوربانیدانی زیاتری هەبووە. هەروەها خوداش ڕێزو ستایش و وەسفێکی وەهای بۆ دانـاوە کـە بەو ڕادەیە بۆ هیچ پێغەمبەرێکی پێش ئەوی دانەناوە.

## پێویست بوونی باوەڕهێنان بە پێغەمبەران

ئیسلام کاری (باوەڕهێنان بە پێغەمبەران)ی بە گۆشەیەك لە گۆشەکانی عەقیدەی ئیسلامی داناوە، خودای مەزن فەرموویە: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَـٰعِيلَ وَإِسۡحَـٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن

﴿...رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾البقرة/١٣٦. واتە (بڵێن باوەڕمان هێناوە بەخوداو بەوەی بۆمان نێرراوەتە خواروەوەو بەوەی بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب هاتۆتە خوارەوە، هەروەها بەوەش کە بۆ موسا وعیسا هاتووەو کە بۆ پێغەمبەرانی تریش لەخودای پەروەردگاریانەوە هاتووە، ئێمە جیاوازی لەنێوان هیچ کەسێکیان داناکەین و تەسلیمی فەرمانی خودا و مل کەچی ئەوین). هەروەها خودای مەزن لەدیاریکردنی عەقیدەی باوەڕداران دا دەفەرموێت: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ..﴾البقرة/٢٨٥.. واتە: (پێغەمبەر باوەڕی بەوە هێناوە کە لەخودای پەروەردگاری یەوە بۆی نێرراوەتە خوارەوە، هەموو باوەڕدارانیش تێکڕا باوەڕیان بەخوداو فریشتەکانی و کتێبەکانیوپێغەمبەرانی هێناوەو هیچ جیاوازی یەك لەنێوان یەکێك و یەکێکی تر لە پێغەمبەرانی خودادا ناکەین).

موسڵمانان باوەڕیان بەهەموو پێغەمبەرانی خودا هەیەو ڕێزی تەواویان دەگرن و حورمەت لە گەورەیی‌و پلەو پایەشیان دەنێن ، جا هەر کەسێك باوەڕ بە پێغەمبەرێك لەو پێغەمبەرانە نەهێنێت یان قسەی سووك و نابەجێیان پێ بڵێت ئەوە باوەڕی بەو شەرعەی -محمد-یش ﷺ نەهێناوە.. خودای مەزن لەم بارەیەوە فەرموویە:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ﴾النساء/١٥٠-١٥١. واتە: (ئەوانەی باوەڕیان بەخوداو پێغەمبەرەکانی نی یەو دەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان باوەڕ بە خوداو باوەڕ بە پێغەمبەرانی یەوەو دەڵێن ـ باوەڕمان بە هەندێکی هەیەوە باوەڕ بە هەندێکی تریان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوەندەدا دەربازێك بۆ خۆیان بدۆزنەوە، ئەوا بە ڕاستی ئەوانە کافرو بێ باوەڕن).

ئیسلام بە پێی ئەم ئاڕاستەو ڕێنماییانە بناغەیەکی بۆ یەکترناسین و برایەتی‌و یەکێتیی نێوان گەلانی سەر زەوی داڕشتووە، چونکە (خەڵکی) هەر کاتێك باوەڕیان بەهەموو پێغەمبەران هێنا ئەوا لێك گەیشتنیان ئاسان تر دەبێت لەوەی کە جیاوازی و ناکۆکی یان لەنێوان دا بمێنێت. ئەمەش خاسیەتێکی جوان و بەهادارە لە خاسیەتەکانی ئیسلام کە ئەگەری لێك نزیك بوونەوەی نێوان خۆی‌و ئاینەکانی دیکەی ئاسان و شیاوکردووە، ئەویش لەکاتێك دا کە (باوەڕهێنان بە پێغەمبەرانی خودا)و (ڕێزگرتنیان)ی لەسەر شوێنکەوتوانی (واتە لەسەر موسڵمانان) پێویست کردووە.

# پاکی و بێ کەم و کوڕیی پێغەمبەران

حیکمەت و دانایی خودا وابووە کە پێغەمبەرەکانی خۆی بە تـەواوترین کـەس دابنێـت، چ لەرووی خولقاندن و چ لە ڕووی ئاکارو خولقەتیشەوە، هەروەها باشترین زانستیان پێ ببەخشێت و لەبەرێزترین بنەماڵە بن و ڕاستگۆترین کەسی نێو کۆمەڵیش بن.. جگە لەمانەش خودا ئـەو پێغەمبەرانەی خۆی لەهەموو خەوش و نـەنگی یـەکی ئاکـاری و جەسـتەیی پاراسـتووە، وەك نەخۆشی یە (دوورخەرەوەکانی خەڵکی)[1] یان ئەو نەخۆشی یە (ساری) و هەمیشەیی‌یانەی کە خەڵکی لێ یان دەترسن.

خـودا پێغەمبـەرانی خـستۆتە ژێـر سەرپەرشـتی‌ی خـۆی و لـەژێر سـایەی (بایـەخ و ڕێنمـوونی)یـشدا داینـاون، بـۆ نموونـە لـەم بارەیـەوە سـەبارەت بـە محمـدﷺ فەرموویـە: ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ ﴾الطور/٤٨ واتە: ئەی پێغەمبەر بۆ فـەرمانی پـەروەردگارت خۆڕاگرو بەئارام بە و دڵنیاش بە تۆ لەژێرچاودێری و سەرپەرشتی مان دایت و کـەس ناتوانێـت ئازارت پێ بگەیەنێت).

هـەروەها دەربـارەی سەرپەرشـتی کردنـی -موسـا-ش (دروودی خـودای لەسـەر بێـت) فەرموویە: ﴿ ..وَأَلۡقَيۡتُ عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴾طه/٣٩.. واتە (مـن خوشەویـستی تایبەتیم بە تۆ بەخشی تاکو لەژێرچاودێری و پارێزگاری ی من دا پەروەردە بکرێیت).

بەم ڕەنگە خودای پاك و بێ‌هاوتا ئەرکی پەروەردەو پێگەیاندنی ئەو پێغەمبەرانەی خۆی لە ئەستۆگرتووەو (لەکەوتنە نێو گوناه و سەرپێچی)ی پاراستوون، چونکە ژیان و گوزەرانیان هـەر بۆ خۆیان نەبووە، بەڵکونموونەو پێشڕەوبوون وڕێنمـایی خـەڵکی یـان پـێ‌کراوەو ڕێی ڕاسـتیان پیشانی خەڵکی داوەو پەیرەوی بەرنامەیان کراوەو پاشان ڕەوت و سوننەتیان و یادو بـیرەوەری، یان لە دوای کۆچی دواییان بووەتە چراو، شەو زەنگی ژیانیان بۆ مرۆڤایەتی ڕۆشن کردووەتـەوە و ڕێگـای ڕاسـت و بەختـەوەرییان بـۆ ڕوون کردوونـەوە، هـەر ئـەوانیش (واتـە ـــ هـەر پێغەمبەران)ئەو ڕێ پیـشاندەرانەن، کـە خـودا فـەرمانی شـوێنکەوتنیانی پـێ‌کردووین. لـەم

---

(١) نەخۆشی یە دوورخەروەکانی خەڵکی وەك (بەڵەکی یان ئیفلیجی یاخود نەمانی ئەندامێکی لەش یـان هەر خەوش و عەیبێکی دیاری جەستە)... خودا پێغەمبەرانی خۆی لەم کەم و کوڕییانـەش پاراسـتووە چـونکە حیکمەت لەناردنی پێغەمبەران ڕێنمایی کردنی خەلکی بووە و ئەم ڕێنمـایی کردنـەش تـەنها بـە تێکـەڵبوون لەگەڵ خەڵکی و چوونە ناو کۆمەڵەوە بەئەنجام دەگات، بۆیە دەبێت ئەو پێغەمبـەرو ڕێنمـایی کارانـە سـاغ و سەلیم بوونایە چونکە گەر وانەبوونایەو عەیب و نەخۆشی یەکی دیاریان هەبوایە لێ یان دوور دەکەوتنەوە.

ڕووەشـەوە دەربـارەی کۆمـەڵێك لەپێغەمبـەرانی فەرموویـە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴾الأنعـــام/٨٩-٩٠ واتــە: (پێغەمبــەران کەسـانێکن کـە کتێـب (یاسـاوبەرنامە)و حــوکم و فەرمانڕەوایی‌و پێغەمبەرێتیمان پێ‌سپاردوون، جا ئەگـەر ئـەو کـافرو بەدرۆخەرەوانـە بـاوەڕی پێ‌نەهێنن (واتە کافرانی مەککـە) ئـەوا گـەلێکی تـر رادەسـپێرین (وەك خـەڵکی بـاوەڕداری مەدینە )یان هەر خەڵکێکی دیکەی شـوێنکەوتوویان کـە بێ‌بـاوەڕنین. هـەر ئەوانـەش خـودا ڕێنموونی ی کردوون وڕێی ڕاستی پیـشان داون و تـۆش ڕێبـازی ئـەو پێغەمبەرانـە بکـە بـە پێشرەوو سەرمەشق).

ئەو پێغەمبەرانە لە بەرزترین پلەی گوێ ڕایەڵی و خواپەرستی و بەندایەتی و چاکە کردندا بوون، هەروەك خودا دەربارەیان فەرموویە:﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴾الأنبياء/٧٣.. واتە (پێغەمبەرانمان کردووە بە پێشەوایان کە بەفەرمانی ئێمە ڕێنوێنیی خەڵکی بکەن، هەروەها سرووشمان پێ‌داون بەکاری چاکەو نوێژکردن و زەکات و تەنها منیشیان- واتە خودای خۆیان- پەرستووە)

گـەر بـەوردی سـەرنجی ئایەتـەکانی قورئـان بـدەین دەبیـنین لـەکاتی وەسـفکردنی هـەر: پێغەمبەرێك دا تەواوترین و باڵاترین وەسف وسیفەتیان دەخاتە پاڵ، ئێمە لەکاتی باس کردنـی بەسەرهاتی هەریەکێکیان دا ئاماژەیان بۆ دەکەین. جا ئەگەر پێغەمبەرانی خـودا لـەو ڕاددەو سنورە بەرزەی ڕێك و پێکی و ڕەوشـتمەندی ی ئینـسانی دا نـەبووبن ئـەوا بـەهاو ئەرزشـیان لەبەرچاوی خەڵکی بچووك دەبووەوەو کەسـیش بـەدەم بانگەوازیانـەوە نەدەچـوو، خـۆ ئەگـەر (دووربێت لەرووی ئەوان) ڕاستگۆنەبوونایەو ناپاکی و خیانەتیان بکردایە ئـەوا ڕەوتـی ژیـان و (سیرەتی موبارەکیـان) ناشـیرین دەبـوو و متمانـەی خـەڵکیش پێیـان لاواز دەبـوو و ئینجـا گومڕاکارو سەرشێوێن دەردەچوون نـەك ڕێنمایی‌کـار و ڕێ پیـشاندەر، بـەم ڕەنگـە حیکمـەت لەناردنیان دا نەدەما، لەبەر ئەمە خـودا سـیفەتی ناپـاکی‌و خیانـەتی لەهـەموو پێغەمبـەران دوورخستووەتەوە، هەروەك فەرموویە: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّۚ ﴾آل عمران/١٦١. واتە: (هیچ پێغەمبەرێك مافی ناپاکی کردنی نـەبووە چ لـە بانگـەواز و چ لـە بەرژەوەنـدی و دەسـکەوت وبەروبوومەکانیش دا)..

قورئانی پیرۆزیش بە پێچەوانەی سەردەمە دێرینەکانەوە بۆ پێغەمبەرانی ڕوانیوە، چونکە لەوسەردەمە دێرینانەدا خەڵکی نەفام پێغەمبەرانییان بە سیفەتە ناشیرینەکانی وەك (درۆو فریودان و سەرپێچی و تاوانی گەورە) وەسف کردووە، بۆ نموونە سیفەتی فریودان و چەواشەکارییان داوەتە پاڵ (یەعقوب)، (لوط)یشیان بەتۆمەتی (زیناکردن لەگەڵ هەردوو کچەکەی دا) تاوانبارکردبوو، جگە لەوەش گووتویانە گوایە (هارون) داوای لە (ئیسرائیلییەکان) کردووە کە گوێرەکە بپەرستن. دەربارەی (داود)یش گوتوویانە گوایە زینای لەگەڵ ژنی (ئوریا)ی سەرکردەی دا کردووە. لەمەڕ حەزرەتی (سلیمان)یش گوتوویانی گوایە ئەو بۆ ڕازیکردنی ژنەکانی خۆی (بت)ی پەرستووە.

بەڵام قورئانی پیرۆز بەتوندی ئەو هەموو گومان و درۆو دەلەسانەی پووچەڵ کردۆتەوە، ئەمەش ئاکارێکی جوانی قورئانە لەبەرامبەر خەڵکی سەردەمە دێرینەکان دا کە پێغەمبەرانی خودایان تیادا بەو وەسفە ناشرینانە باس دەکرد. دیارە وەسف کردنیان بەو خەوش و شوورەییانە کاردانەوەی خراپی لەسەر دەروونی مرۆڤی (باوەڕدار و خواپەرست و خۆپارێز) هەیەو لە دڵی خۆی دا دەڵێت: (ئەگەر حاڵی پێغەمبەرانی خودا ئاوابووبێت، ئەوا چی دەبێت گەر ئێمەش هەمان ڕەفتاری ئەوان بنوێنین؟).

ئەمەش کەلەبەرێك دەبێت کە پێ دەچێت کەسانی دەروون نەخۆش و نەفس نزم بیقۆزنەوە بۆ خۆخستنە نێو گوناهو تاوانەوە، جگە لەمەش کە ئەمە خۆی لەخۆی دا پێچەوانەی ڕاستی و واقعیشە، هەروەك پێچەوانەی پاکی و (عیصمەت) و بێکەم و کوڕی ی پێغەمبەرانی خوداو دوورە پەرێزییانە لە گوناهە گەورەکان. چونکە لەدیدی ئیسلامدا پێغەمبەران (معصوم)ن، لەگوناهانەو دوورن لەتاوان و سەرپێچی. لەوانەیە هەندێك هەڵەی زۆر بچووکی پەیوەست بەکاروباری دنیاو مومارەسەی ڕۆژانە لە هەندێکیانەوە ڕوویدابێت کە گلەیی و سەرزەنشتیان لەسەرکراوە، بەڵام هەرگیز ئەو هەڵە بچووکانە بەکاروباری باوەڕداری(اعتقادی)یەوە یان بە کاروباری ڕەوشتمەندی(خُلُقی)یەوە پەیوەست نەبوون و، بەم پێیەش کەوتنە نێو هەڵەیەك لەو هەڵە بچووك و بێبایەخانەوە بە مەسەلەیەکی زەق و خوشبار دانانرێت.

بێگومان پێغەمبەران هەمیشە خۆیان بەکەمتەرخەم دەرهەقی خودا زانیوە، چونکە لەهەموو کەس زیاتر لەشان و شکۆ و گەورەیی خودا تێگەیشتوون. هەر بۆیەش هەردەم داوای لێبوردن و (استغفار)یان لەخودا کردووە لەسەر کەمتەرخەمی و درێغی یەکیان، نەك لەسەر گوناه و تاوان کە هەرگیز لێیانەوە نەوەشاوەتەوە.

## پێغەمبەران پێشەنگی مرۆڤن

جـا لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەران (دروودی خودایـان لەسـەر بێـت) لـەو (پلـە بلّنـدەی خواپەرستی)و لەو (ئاستە خۆپارێزیەی دوور لە هەواو ئـارەزووی دەروون و گوناهـان)دا بـوون، ئەوا خوداش فەرمانی پیّکردووین کە چاویان لیّ بکەین و پـەیرەوی هـەلّس و کـەوتی ژیانیـان بکـەین و لاسـاییان بکەینـەوە، هـەروەك فەرموویـە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴾ الأنعام/ ٩٠ واتە: (خودا هیدایـەتی ئـەوانی داوەو تـۆش ئـەو هیدایەتـە بکـە بـە پێشەنگ و مەنهەجی کارت).

هەروەها خودا فەرمان بە موسلّمانان دەکات کە پێغەمبـەری خـۆی-محمـدﷺ- بکـەن بـە پێشەنگ و پێشڕەوو (قدوة)ی خۆیان، هەروەك فەرموویـە: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ﴾الأحزاب/ ٢١.. واتـە: لـە شەخـصی پێغەمبەری خودادا پێشرەویو پێشەنگییەکی چـاك هـەبووە بۆتـان و بـۆ ئەوانـەی بەتـەمای ڕەزامەندیی خوداو سەرفرازیی ڕۆژی دوایین و یادی خوا زۆر دەکەن).

خوداش لەسـوورەتی(فاتیحـە)دا، کـە موسـلّمانان ڕۆژانـە لەنوێژەکانیانـدا چـەندین جـار دەیلّێنەوە ئەم نزایەی داناوە:﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾الفاتحة٦-٧.. واتە: (خودایە بمانخەرە سەر ڕێگەی ڕاست.. ڕێگای ئەوانەی نیعمەتی خۆتت پیّ بەخـشیون کـە پێغەمبەران و پیاوچاکان و شەهیدان و ڕاستبێژانن).

لـەم نزایـەدا سرووشـێك لـەخوداوە بـۆ بـاوەڕداران هەیـە کـە دەبێـت لەهـەموو ڕەفتـارو گفتارێکیان دا پێغەمبەران بکەنە پێشەنگی خۆیان.

## موعجیزەکانی پێغەمبەران

هەرکەسێکی خاوەن باوەڕییش دەبێت بڕوابکات بەوەی کە خودا پشتگیریی پێغەمبـەرانی کردووەو بەچاودێریی خودایی ی خۆیشی بەجۆرە هۆکارێکی وەها یارمـەتی داون کـە هـەرگیز عـەقلّی مرۆڤ لەوەوپێش بەخەیالّی دا نەهاتوە، ئەمـەش تاکو ڕاستی ی ئەو وتانـەی خۆیـان بـۆ ئەو خەلّکە بسەلمێنن کە بانگیان کردوون بۆ باوەڕهێنانیان بەو پەیامـەی پێیانـدا نێـرراون بـۆ لایان. ئەم (هۆکارە یارمەتی پێدراوانە)ی خودا بۆ پێغەمبەران بە زاراوەکـانی (معجـزات یـان آیـات یان بيّنات) ناوبراون، واتە موعجیزەو بەلّگەو نیشانەی بەهێزو ڕوون کەرەوە. ئەم شـتانە

وەك جۆرە کردەوەیەك دەرکەوتوون کە لەسەروو توانای مرۆڤ و لەدەرەوەی سنووری وزە و زانست و زانیاریشیانەوە بوون، هەروەك پێچەوانەو دژی ڕێسا تایبەتی یەکانی ماددە ویاسا سروشتی یە زانراوو باوەکان بوون، لەنێو زاراوەکانیش دا زیاتر وشەی (معجزات) بەکارهێنراوە، بۆیەش بە (موعجیزە) ناوبران چونکە چەند کردارێك یان ڕووداوێکی ئەوتۆ بوون کە مرۆڤی ئاسایی توانای لە ئەنجامدانی دا نی یە، زانایانیش (موعجیزە)یان وا پێناسە کردووەکە (مەسەلەیەکی تێپەڕێنەری داب و نەریتە و خودا لەسەر دەستی پێغەمبەرێکی نێرراوی خۆی ئەنجامی دەدات تاکو بەهۆیەوە بەڵگەی تەواو لەسەر ڕاستی ی پێغەمبەرێتی یەکەی بخاتە ڕوو)... ئەم موعجیزانە لە خودی خۆیان دا شیاون و عەقڵیش ڕێگری نەبوون و واقعیش پشتگیری ی کردوون. ئەوە بوو چەند پیاوێك (واتە پێغەمبەران) هاتن و گوتیان کە ئەوان پێغەمبەرانی خودان و لەڕێی ئەم شتە دوور لە ئاسایی‌یانەوە کە ئەنجامیان دەدا بەربەرەکانی ی نەتەوەکانیان دەکردو خەڵکیش بەچاوی خۆیان ئەو شتە نائاسایی یانەیان لێ بینین و بەتێپەڕبوونی کات زۆر کەس باوەڕیان پێ هێنان.[1] چونکە پێغەمبەر (واتە: هەر پێغەمبەرێك) ئەو پەیامە بەخەڵکی دەگەیەنێت کە خودا فەرمانی پێ‌کردووە. خەڵکیش لەوەرگرتنی پەیام و باوەڕهێنان دا چون یەك نین... بەڵکو جیاوازن، بۆ نموونە خەڵکانی وا هەن کە سرووشت و فیترەتیان ساغەو هەر کاتێك ڕووناکی حەق بلاوبێتەوە پەسەندی دەکەن و دانی پێدادەنێن، بەلام کەسانی وا هەن کە فیطرەتیان شێواوەوبەهۆی نکوولی و لوتبەرزی یەوە لەئاست هەق و ڕووناکی ی هیدایەت ـ دا کوێرن.

لەبەر ئەمەش حیکمەتی خودا وابووە کەبەدیاردەو نیشانەیەکی بەهێزی وەها پشتگیریی پێغەمبەرانی بکات تاکو زمانی سەرکەش و لووتبەرزانی پێ لاڵ بکات و بیانویان ببڕێت و بەڵگەو شایەتی یان لەسەر دروست بکات. موعجیزەش لەڕێی بەکارهێنانی چەند زانستێك و وەبەرنانی چەند هۆیەکەوە دروست نابێت وەك ئەو زانست و هۆیانەی کە لە سیحربازی دا بەکاردێن و چەند هۆو ڕێسایەکیان بۆ دانراوەو هەندێك کەس دەتوانن فێری بن و چەند سیحرێکی وابکەن کە بەڕواڵەت لەکاری (خوارق) و تێپەڕێنەری داب و نەریتە ئاسایی یەکان بچێت بەلام نەك لەوان بێت.

---

(١) بێگومان زۆر کارومەسەلەی تێپەڕێنەری عادەت هەبووە کە خودا لەسەر دەستی هەندێك کەس لە پیاوچاکان بەدی ی هێناون، بەلام ئەم کارانە بەبانگەشەو دەعوای پێغەمبەرێتی یەوە بەند نین بەڵکو بەناوی کەرامەت(الكرامة)ـەوە ناسراون، هەروەك ئەو شتانەی بۆ (مەریەمی دایکی عیسا) بەدی دەهات کاتێك لەسەر بەرماڵی نوێژکردنەکەی میوەی هاوینی لەزستاندا بۆ دەهات و میوەی زستانیشی لە هاویندا بۆ دەهات.. هەروەها دوای ئەوەی (عیسا)ی لێ دەبێت دارخورماکەی تەنیشتی ڕادەوشێنێت و خورمای (خەستەوی)ی لێ بەردەبێتەوە لە کاتێك دا لەوەو پێش یەك دەنکە خورمای پێوە نەبووبوو.

# جۆرەكانی موعجیزە

موعجیزەكانی پێغەمبەران چەند جۆرێكن، وەك:

موعجیزەی گەردوونی(كوني) وەك تەقینەوەی ئاو لەوبەردەوەی كە موسا گۆچانەكەی خۆی پێ ی داكێشا كاتێك گەلەكەی داوای ئاوی خواردنەوەیان لێ كرد، یان وەك بەسێبەركردنی هەور لەسەر (بنی إسرائیل) لە شوێنێكی نادیاردا، یان وەك دووكەرت بوونی دەریاكە بۆ - موسا- و بڕانی ئاو لەو كەرتەوەی كە موساو شوێنكەووتوانی لێ ی پەرینەوەو لێی دەرچوون بۆ ڕزگار بوون لەدەست (فیرعەون).

هەندێك موعجیزەی پێچەوانەی یاسا سروشتی یە ناسراوەكان، وەك ئەو ئاگرەی كە كافران بۆ سووتاندنی (ئیبراهیم) هەڵیان گیرساندبوو بەڵام ساردو هێمن و بێ وەی بوو بۆ سەر ئەو پێغەمبەرەو زیانی پێ نەگەیاند.

چەند موعجیزەیەكی(كت و پڕی) كە بە پێ ی پێویست ڕادەی بۆ دانراوە. هەر لەخواست و دانایی خودا وابووە كە موعجیزەی هەر پێغەمبەرێك پەیوەست بێت بە دیاردەیەكی باوو بەربڵاوی ئەو سەردەمەو ئەو كۆمەڵگەیەی كە پێغەمبەرەكەیان بۆ نێرراوە تاكو كاریگەری زیاتری هەبێت لە پشتگیری كردنی پێغەمبەرەكەو كاریی بەهێزتریشی لە وابەستەبوونیان دا هەبێت، ئەمەش وەك موعجیزەكەی (عیسا)- سڵاوی خودای لێ بێت- لەبارەی زیندووكردنەوەی مردوانەوە چونكە لەو سەردەمەدا جوولەكەكان نكوولی یان لە گیان (روح) دەكرد، یان وەك موعجیزەكەی (موسا)- سڵاوی خودای لێ بێت- كاتێك گۆچانەكەی بوو بە مارێكی گەورەو هەموو داردەست و گوریسەكانی ئەو سیحربازانەی قووت دا، ئەو سەردەمەش خەڵكی میسر لە (سیحر)و (سیحربازی)دا شارەزابوون و ئەو كردارە ببوو بە شتێكی ئاسایی لە نێوانیاندا.

موعجیزەی پێغەمبەرانی پێش (محمد ﷺ) بەو شێوەیە بووە چونكە عەقڵی خەڵكی لە زەمانەدا لە ڕادەیەكی پێگەیشتنی وەهادا نەبوون تا بتوانن قەناعەت بە نموونەو نیشانەكان بێنن و باوەڕ بە (بەڵگەی عەقڵی)یش بێنن.. لەو قۆناغانەدا خەڵكی تەنها باوەڕیان بەشتی نائاسایی و تێپەڕێنەری عادەت بووەو لەدیدگای چاوانیانەوە باوەڕیان هێناوە بەو موعجیزانەی كە ڕێگای ڕوانینی بۆ دەرخستوون و پێ یان سەیرو سەمەرە بووەو چاویان ڕۆشن كردوونەوەو بووەتە هۆیەك بۆ قەناعەت هێنانیان بە ڕاستی ی پێغەمبەرێتی.

# موعجیزەی "محمد" ﷺ

موعجیزەی پێغەمبەران بەو شێوەیە بوو تا بەشەریەت گەیشتە تەمەنی تێگەیشتن(سن الرشد) و عەقڵی پێگەیشت و ئیرادەی خوداش وابوو کە ئیتر پەیامە گشتگیرەکەی لەسەر دەستی (محمد) ﷺ بگەیەنێت و بە موعجیزە عەقڵداری یە نەمرەکەش پشتگیری بکات، واتە بەو قورئانەی کە مرۆڤ عاجزو دەستەوسان بوو لە دارشتن و رەوانبێژیی دا، جگە لەو هەموو رێنمایی و زانست و مەعریفەیەش، کە تیای دا بوو، کە (محمد)یش ﷺ بەرەبەرکانی عەرەبی پێ کرد لەسەر ئەوەی گەر بتوانن تاکە سوورەتێکی وەك خۆی بێنن و نەیشیانتوانی، لەکاتێك دا ئەوان لەو سەردەمەدا بە قسەزان و زمانپاراو لەهونەرەکانی ئاخاوتن دا ناسراوبوون.

موعجیزەی پێغەمبەریش (محمد ﷺ) بەوە لە موعجیزەکانی پێشوو جیادەکرێتەوە کە موعجیزەیەکی بەردەوام و نەمر و هەمیشەیی یە تاکۆتایی دنیا و هەر لێکۆڵەرەوەو خوازیارێکی راستیش دەتوانێت هەستی پێ بکات و ئەنجامی تەواوی لێ وەدەست خات، بەڵام موعجیزەکانی پێغەمبەرانی پێشوو چەند رووداوێکی ئەو سەردەمە بوون و تەنها ئەو کەسانەی هاوچەرخی خۆیان بینیویانەو کەسانی دوای خۆیان نەیاندیوە، هەروەها تەنها لەرێی گێرانەوەو بیستنەوە پێیان گەیشتووە، ئەمەش کاریگەری لاوازی هەیە، نەخاسمە لەم سەردەمەش دا کە گومان و شوبهە لەسەر ئاینەکان زۆربوون. لەبەر ئەمە هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر موعجیزەکان (روو وەرگێرانی خەڵکی بووە لە داواکردنیان) و لەجیاتی ئەمەش هاندانیان بۆ وردبوونەوەو تێفکرین لە پەیامی ئیسلام و لەو رێنمایی و یاسا و دەستوورەی کە لەقورئانی پیرۆزدا رەنگیان داوەتەوە. هەندێك کەس لە گوماندارانی ئەو سەردەمەش داوای (چەند موعجیزەیەك)[1] یان لە -محمد ﷺ- دەکرد چونکە گومانیان لەپەیامەکەی هەبوو، لەبەرامبەر ئەم داوایەش دا وەڵامی خودای مەزن ئەوە بوو کە سەرنج لە قورئان بدەن و لەو روون کردنەوەو

---

(١) خۆ سەرەرای ئەوەش هێشتا خودای گەورە چەند موعجیزەیەکی لەسەر دەستی -محمد- یشﷺ پیشانی خەڵکی داوە وەك هەڵقوڵاندنی ئاو لەنێوانی پەنجەکانییەوە کاتێك دەستی کرد بە کاسەی ئاوەکەدا. هەروەها تێرکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بەخۆراکی کەم، جگە لەپێشبینیو ئاشکراکردنی هەواڵی چەند رووداوێکی داهاتووو باس کردنی سەفەرەکەی بۆ (بیت المقدس) لە شەورەوییەکە (إسراء)داو چەندین موعجیزەی دیکەش.

بەڵگە عەقڵی یانەشی بکۆڵنەوە کە دەربارەی سرووشی خودایی بوون. خودا فەرموویە: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَـٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ۝٥٠ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾العنكبوت/٥٠-٥١. واتە (بێباوەڕان گوتیان: ئەی بۆچی پێغەمبەر لە-خودا-کەیەوە چەند موعجیزەیەکی هەست پێکراوی بۆ نایەتە خوارەوە؟ تۆش ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: بەڕاستی بێگومان موعجیزات و بەڵگەونیشانە گرنگەکان تەنها لەلای خودان و منیش تەنها ترسێنەرو ورپاکەرەوەیەکی ئاشکرام. دەی ئایا هێندەیان بەس نییە کە کتێبێکی گرنگی وەك قورئانمان بۆ ناردوونەتە خوارەوەو بۆیان دەخوێندرێتەوەو یاساو بنەماکانیان تێ دەگەیەنرێت. بێگومان لەناردنی ئەم کتێبەدا بۆ ئەوان ڕەحمەت و بەزەیی خودا هەیەو یادخستنەوەو پەندو ئامۆژگاریش بۆ باوەڕداران هەیە).

# بەندی دووەم

## ((ئامانجەکانی داستانی پێغەمبەران))

( مەبەست لە چیرۆکی پێغەمبەران - مەنهەجی قورئان لە چیرۆکەکانیدا- شێوازی گێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەران - ڕازی دووبارەبوونەوەی چیرۆکەکان - جیاوازیی نێوان قورئان و تەورات لە چیرۆکەکانی پێغەمبەران دا )

## مەبەست لە چیرۆکی پێغەمبەران

چیرۆکی پێغەمبەران لە گرنگترینی ئەو هۆکارانەیە کە قورئان پەنای بردووەتە بەر لە (مشت و مڕ لەگەڵ سەرپێچی کارانی دا - و - لەمژدەدان بە ڕەزامەندیی خودادا - و هۆشداری دان بەخەڵکی لەسەرکێشی و یاخی بوون - و لەلێکدانەوەی بنەماکانی بانگەوازی ئیسلامی و ئامانجەکانیشی دا- و لەسەقام گیرکردنی دڵی پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەش کە شوێنەکەوتووی بوون - ولە بەڵگەهێنانەوەش دا لەسەر ڕاستی پێغەمبەرێتیی ی - محمد -ﷺ کە ئەو لە خودای پەروەردگاری یەوە پەیام بەخەڵکی دەگەیەنێت)..

جا کاتێك پێغەمبەر (سڵاو و دروودی خودای لێ بێت) بەم چیرۆکە نایابانەی پێغەمبەرانی پێش خۆیەوەو بەو شیکارو باس کردنە بەپێزانەوە بۆ لای خەڵکی هات و وەك پێغەمبەرێکی نەخوێندەواریش کەلەسەر دەستی زانایان(احبار)ی یەهوودی و ڕاهیبانی نەسرانیو کەسانی تر هیچی نەخوێندبوو، ئەوا بەمە گەورەترین بەڵگەی دەخستەڕوو لەسەر ئەوەی کە ئەو پەیامەی هێناویەتی - سرووشێکی خودایی یە. هەندێك ئایەتی قورئانیش لەپێشەکیو سەرەتای هەندێك چیرۆکەوە یان لەدامێن و پەراوێزی چەند چیرۆکێکەوە ئاماژەی بۆ ئەم مەبەستە کردووە، هەروەك خودا لە دواندنی پێغەمبەری خۆی - محمد -ﷺدا فەرموویەتی: ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾یوسف/٣.. واتە (ئێمە لەڕێگای ناردنی ئەم قورئانەوە باشترین چیرۆکت بۆ دەگێڕینەوە هەرچەندە لەمەوپێش تۆ لێ یان بێئاگابوویت).

هـەروەها خـودا فەرموویـە: ﴿ تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ هـــود/٤٩. واتــە: (بــاس و خــواس و بەسەرهاتی پێغەمبەران لەو هەواڵانەی نادیار(غەیب)ن، کە بۆ تۆمان بەسرووش ناردووەو لەوەو بەریش نە خۆت و نەگەلەکەشت زانیاریتان دەربارەیان نەبووە).

پاشان مەبەست لە چیرۆکی پێغەمبەران ڕوون کردنەوەی ئەو ڕاستی‌یەی تریشە کە ئاینەکان هەموویان لە خوداوە نێرراون، هەر لەسەردەمی -نوح-ەوە تا سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام- محمد-ﷺ، باوەڕدارانیش کە باوەریان بـە پێغەمبـەرانی خـودا هەیـە هـەموویان تێکـڕا یـەك نەتەوەن و خودای تاك و تەنهاش پەروەردگاری هەموویانە، لەنێوان ئاینـە ئاسمانی‌یـەکانیش دا (یەهوودی و مەسیحی و ئیسلام) هیچ دەعیەو شـانازی بەسـەر یـەکترکردنێك نی‌یـە، بـەڵکو هەموویان ئایینی خودان و لەیەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاون. هەر پێغەمبەر و هەواڵبەرێکیش کـە هاتبێت بۆ تەواوکردنی پەیامی پێغەمبەرەکەی پێش خۆی بە پەیامێکی تەواوکەرەوە هـاتووە، خوداش لەڕووی گفتاری دا بۆ - محمد- ی پێغەمبەریﷺ فەرموویە: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ﴾الشوری/١٣ واتە: (خـودا بـۆ ئێـوە ئـایینێکی دانـاوە کـە بـە نوحیـشی سپاردبوو، ئەو سرووشەی کە بۆ تۆشمان ناردووەو ئەوەش کە ئیبراهیم و موساو عیـسامان پـێ ڕاسپاردبوو ئەوەیە کە کاروباری ئایینی مەنهەجی ژیانتان بەچـاکی جێبـەجێ بکـەن و نـاکۆك ولێك جودا مەبن تیای دا).

## مەنهەجی قورئان لە چیرۆکەکانیدا

قورئـان کاتێـك چیرۆکی پێغەمبـەران و چـیرۆکی تـر دەخاتـە ڕوو، (کەرەسـەو مـاددەی چیرۆکەکان لەڕووداوەکانی مێژوو و کارەساتەکانیەوە وەردەگرێت، بـەڵام بەشـێوازێکی ئـەدەبی دایان دەڕێژێت و بە ڕێبازێکی سۆزبەخشانە (عاطفي)یش دەیانهێنێتەوە کـە ماناکـانیش ڕوون دەکاتەوەو مەبەستەکانیش بەهێزدەکات و ئەو کاریگەری‌یەش لەسەر دەروونەکان دەخولقێنێـت کـە شـوێنەوارێکی حـەزپێکردن و بەکێـشکاری بـەجێ دێڵێـت و لەوێـشەوە سـۆزو ویـژدان دەخرۆشێنێت). [1]

---

(١) بڕوانە کتێبی (الفن القصصي في القرآن). د. محمد احمد خلف الله ـ ص (١٢٢)

هەروەها لەبازنەی مێژوویی یەوە دەیخاتە نێو بازنەی ئایینی یەوە.
لەم سەمتەشەوە(اتجاه)، کە قورئان مەبەستیەتی (ڕاست نی یە وا لە قورئان بخوازرێت کە چیرۆکەکانی لەهەموو ڕوو و لایەنەکانیەوە وەربگرتایەو پۆلێن و خاڵبەندیی لەئامادەکردن و هێنانەوەی ڕووداوەکەدا بۆ ڕێك خستایەو تێگەیشتنی چیرۆکیش لەقورئانەوە بەتەنیا کارێکی گرانە گەر کەسێك لەوەو پێش لەسەرچاوەیەکی ترەوە شارەزایی یەکی لەسەر چیرۆکەکە پەیدا کردبێت، چونکە قورئان هێندەی لەچیرۆکەکە وەرگرتووە کەنیازەکانی ئامۆژگاریو پەروەردەکردنی بۆ بەدی دێنێت. جاری واش هەیە پوختەی چیرۆکەکە بەلایەنە پێکەوە بەستراوەکانیو بەشە پێك گەیەنراوەکانی یەوە دەگێڕێتەوە کە هەموو ڕووداوەکانی لەیەك جێگا پێکەوە بەستۆتەوەو سەرەتاو کۆتایی ی پێك گەیاندووە تا دوایی پێ دەهێنێت هەروەك لە سوورەتی (یوسف)دا دەیبینین. بەڵام لەزۆربەی جارەکان دا بەشێك لەچیرۆکەکە دەگێڕێتەوە چونکە لەو بەشەدا مەبەستەکە بەدی دێت. هەندێك جاریش قورئانی پیرۆز بەکورتی ئاماژە بۆ چیرۆکێك دەکات کەپێویست بە درێژەدان نەکات، ئەویش بەپشت بەستن بەناسراوی و ناوبانگی چیرۆکەکە... بۆ نموونە ئایا نەت دیوە کە جاری وا هەیە وتاربێژێك(خطیب) لەوتارەکەی دا چیرۆکێك دەکات بەبەڵگەی چەند وتەیەکی، بەڵام هەموو چیرۆکەکە بەجارێك لەو جێگایەدا ناگێڕێتەوە، بەڵکو بەشێکی لە وتارەکەی دا باس دەکات، تەنانەت جاری واش هەیە تەنها ئاماژە بۆ ناوی چیرۆکەکە دەکات بەبێ ئەوەی لەو جۆرە باس کردنانەدا کەم و کوڕییەك بکەوێتە وتارەکەوە یان بەرهەڵستی یەك بەرامبەر وتاربێژەکە دروست ببێت.[١]

## شێوازی گێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەران

دیاردەیەکی ڕۆشن کە سەرنجی خوێنەر بەلای شێوازی قورئان لەگێڕانەوەی چیرۆکەکان و باس کردنی هەر مەسەلەیەکی تردا ڕابکێشێت ئاسەواری نێودڵ و کاریگەری یەتی لە دەروونەکان دا، ئەویش لە کارایی ی ئەو ڕەوانبێژی یەوەی کە لەجوانی ی بێژەکان(الفاظ)و قەشەنگی ی ڕێك خستن و شکۆو بەهای واتاکانیەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە تۆ هیچ بێژەیەکی تر لە بێژەکانی قورئان ڕەوان ترو تێروتەسەل ترو شیرین تر نابینیت، هەروەها نە داڕشتنێك لەو دانان(تألیف)ـەی قورئان دەبینیت و نە دەقێك یان چەند ڕستەیەك دەبینیت کە وەك دەقەکانی قورئان لەو چیرۆکانەو غەیری چیرۆکەکانیش دا ئەوەندە پێکەوەلکاوو ڕێکخراو و

---
(١) -بلاغة القرآن - د. احمد احمد البدوي

پێك هاتووبن. سەبارت بە ماناكانیشی ئەوە لەهیچ خاوەن عەقڵێك پەنهان و شارراوە نی یە كە هەر قورئانە ئەگەر عەقڵ شایەتی ی لەسەر پێشكەوتنی بەشەكانی و بەرزی پلەكانی بەخشش لەوەسف و پێناسەكانی دا بۆ بدات).[1]

(باقلانی) دەڵێت:

(شێوازی قورئان شێوازێكی تابیەت بەخۆیەتی كە هیچ شێوازێكی تر وەك ئەو نییە، هەروەها جودایە لە شێوازە باوو زانراوەكان)[2]. پاشان دەڵێت: (لە زمانی عەرەبی دا لەوەوبەرو لەمەودواش هەرگیز دەقێك نەبووەو نابێت كە لەڕووی ڕەوانبێژیو كارتێكردنەوە هاوتاو هاوشانی بێت و بتوانێت جوانی ی شێوازەكە لەگەڵ ئەو درێژی یەی بەش و بابەت و شێوازەكانی دا بپارێزێت و پەل بۆ ئەو هەموو لایەن و مەسەلە هەمەجۆرانەی (فەرمان بەچاكە)و (ڕێگیری لەخراپە)و (بەڵێن)و (هەڕەشە)و (چیرۆك گێڕانەوە)یە بهاوێژێت).[3]

تایبەتمەندی یەكی تری قورئان ئەو ئیقاعە مۆسیقی یەیە كە بەشێوەیەكی تایبەتی لە (یەكگرتنی وشەكانەوە) دێتە ئاراوەو ئاوازێكی دیاریكراوی جێگیر لەكۆی چەند بڕگەیەكی دەنگدار پێك دەهێنن وەك چۆن لەدوا وشەی كۆتایی ی هەر ئایەتێك و لە سەدای دەنگ و گۆڕانی هێماكانی سەریانەوە سیستمێكی دیاریكراو سەرهەڵدەدات. چونكە ئەو وەستانە كورتە(فاصلة)ی نێوان كۆتایی ئایەتێك و سەرەتای ئایەتێكی دی كلیلی سەنگی قورئانیو مۆسیقای پەخشانەكەیەتی.

ئەم ڕەوانبێژی و بەلاغەتە قورئانی یەش ئەوەندە چەمك و مانای ڕێنموونیی لەئەستۆ ناوە كەعەقڵ و هۆشی عەرەبی لەسەرەتای ئیسلام دا بەلای خۆی دا ڕاكێشاو گەورەترین هاندەریشیان هیدایەت بوو. نووسەران و شاعیرانیش لەو سەردەمەو هەموو سەردەمەكانی تردا شایەتی، یان لەسەر بالادەستی و بێ هاوتایی ی قورئان و دەقەكانی داوە كە مەحاڵە دەقێكی تری هاووێنەی هەبێت.

## ڕازی دووبارەبوونەوەی چیرۆكەكان لە قورئاندا

ئەوەی جێی سەرنج و ڕامان بێت لە چیرۆكەكانی قورئان دا ئەوەیە مانای چیرۆكێك لەچەندین شوێنی سوورەتەكانی قورئان دا دووبارەبوونەوە، بەڵام ئەم جۆرە دووبارەبوونەوەیە بۆ هەموو بەشەكانی چیرۆكەكە نی یە، بەڵكو دووبارەبوونەوەی هەندێ ئەڵقەیەتی، هۆی ئەمەش

(١) بيان اعجاز القرآن. ـ الخطابي ـ ص٢٨
(٢) اعجاز القرآن ص٦٠ومابعدها.
(٣) اعجاز القرآن ص٦٧

ئەوەیە: (بێگومان واتا ئەدەبی و هونەری یەکان مەبەستێکی قورئانـە لـەو چـیرۆکانەداو ئـەو مەسەلانەشە کە بەدوایان دا دەگەڕێت، هەروەك چەند مەسەلەیەکی وایشن کە وایان لیّ کـراوە هەر ڕووداوێك بەچەند شێوەیەکی جیاجیا وێنەیان بگیرێت و بەچەند بڕگەیـەکی لێـك جـوداش بـەپێی بـارودۆخ و بۆنـەو موناسـەبەکان گوزارشـتیان لیّ بکرێـت)[1].. کـەوابوو مەبەسـت لەچـیرۆکەکان گێڕانــەوەی چــەند ماددەیــەکی مێــژوویی نــی یــە، بــەڵکو پەنــدو وانــەو ئاگادارکردنەوەیە لەگوناھ و سەرپێچی لەفەرمانی خوداو مژدەدانیشە بەڕەزامەندیی خودا. ئەم کاروبارانەش لەهەر جێگایەك دا بەشێوەیەك باسکراون، لێرەشەوە هەمەڕەنگی هاتۆتەکایـەوە. چونکە هەمەڕەنگی و هەمەچەشنەیی ی مەبەستەکانیش (بیّ هـیچ گومانێـك) دەبێتـە هـۆی سەرهەڵدانی شێوەو فۆرمـە ئـەدەبی یـە هەمـەجۆرەکان. بـۆ نموونـە جـاری واهەیـە شـێوازی گێڕانەوەکە لە جێگەیەکدا بەدرێژی هاتووە، بەڵام لەهەندێك جێگەی تردا بەکورتی بووە جگـە لە جیاوازیی ماوەی نێوان ئایەتەکان و هەمەجۆریی بڕگەو دەستەواژە کاریگـەرو شـیرینەکان تاکو بەلاغەت و هونەرە باڵاکانیـشی لـەدەربڕین دا ڕەنـگ بدەنـەوە. هەرئـەم دووبارەبوونـەوە کاریگەرەش بەڵگەیەکی ڕۆشنە لەسەر ئەوەی کە قورئان سرووشێکی خودایی‌یەو هەر کەسێکی زاناو شارەزای نهێنی یەکانی (پاراویی زمانی عەرەبی) هەستی پیّدەکات. چـونکە شـاعیریش یان نووسەر گەر وتەیەك دووبارەبکاتەوە ئەوا وتەی دووەمی بەپلـەی وتەکـەی یەکـەمی پـاراو نابێت، بەڵکو نیشانەکانی لاوازی و گرانی و لێك ترازانـی پێـوە دیاردەبێـت. کەچـی شـێوازی قورئان لەوپەڕی پاراوی و (فەصاحەت)دایەو لەهەموو ئەو بەشـە دووبارەبوانـەی چـیرۆکەکان و لەهەر مەسەلەو بابەتێکی تری دووبارەبوودا، پێویستە ئاماژەیەك بۆ ئەو ڕاسـتی یـەی تـریش بکەین کە بێگومان لەدووبارەکردنەوەدا شوێنەوارێکی گرنگ هەیەو کاردەکاتە سـەر کۆمـەڵ و ڕۆڵەکانی کۆمەڵیش، چونکە گەر شتێك دووبارە ببێتەوە بەشێوەیەك لەبیرو هۆشی خـەڵکی دا ڕەگ دادەکوتێت کە دەبێتە هۆی وەرگرتن و پەسندکردن. ئەمەش ڕاستی یەکی پرشنگدارە.

## جیاوازی نێوان قورئان و تەورات لە چیرۆکی پێغەمبەران دا

(قورئان لەم لایەنەوە ڕیچکەی-تەورات- ی نەگرتۆتەبەرو وەك -تەورات- تێکڕای هەواڵ و بەسەرهاتی پێغەمبەران و هەواڵبـەرانی نەگێڕاوەتـەوە، بـەڵکو هەنـدێکی لیّ هەڵبـژاردوون و چیرۆکەکانیانی گێڕاوەتەوەو ئیتر ئـەوانی تـری لیّ نەگێڕاونەتـەوە. هـەروەك خـوداش لـەڕووی

---

(١) بڕوانە (الفن القصصي في القرآن) — د. محمد احمد خلف الله.

گفتاری دا بۆ پێغەمبەری خۆی-محمدﷺ- فەرموویە:﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ﴾النساء/١٦٤.. واتە: (چیرۆك و داستانی هەندێك لە پێغەمبەرانمان بۆ گێڕاویتەوەو چیرۆكی هەندێكی دیكەشمان بۆ نەگێڕاویتەوە).

جا كاتێك خودا گێڕانەوەی بەسەرهاتی هەندێك لەم پێغەمبەرانەی هەڵبژارد بەمەبەستی باس كردنی هەواڵی هەموویان نەبووە، بەڵكو ئەو بەشانەی لە چیرۆك و بەسەرهاتی هەندێكیان هەڵبژاردووە كە لەگەڵ (بارودۆخی بانگەوازە ئیسلامی یەكەو هەڵوێستی پێغەمبەرﷺ بەرامبەر گەلەكەیدا گونجا بێت. هەر بۆیەش كە بەهەمان درێژەپێدان و شیكارەی - تەورات- نەبووە، پاشان قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو سەردەمانە نەكردووە كە پێغەمبەرەكانی تێدا ژیاون، ئەمەش هۆكارێكی تری بنچینەیی یە لەرێك خستنی چیرۆكەكان و لەجیاوازیی لەگەڵ -تەورات-دا.. هەموو ئەمانەش بەڵگەن لەسەر جیاوازی ی هەرەگەورە لەنێوان چیرۆكەكانی قورئان و چیرۆكەكانی (تەورات) دا. (تەورات) مەبەستی مێژوویی هەبووە، بەڵام قورئان مەبەستی لەپەندوعیبرەت و، مزگێنی دان و هەڕەشەو ڕێنمایی و هیدایەت و شیكردنەوەی بنەماكانی بانگەوازی ئیسلامیو ڕەت دانەوەی نەیاران و سەقام گیركردنی دڵی پێغەمبەرﷺ و شوێنكەوتوانی) [1] بووە.

خوداش هەر لەقورئان دا مەبەست لە گێڕانەوەی چیرۆكی پێغەمبەرانی بۆ دیاری كردووین: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ.. ﴾یوسف/١١١..

هەروەها خودا لەئاخاوتن و فەرمایشتی دا بۆ پێغەمبەرەكەی - محمدﷺ- فەرموویە:﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ هود/١٢٠.. لەم ئایەتەدا ڕستەی (وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ ) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە قورئان چەند ڕووداوێكی ڕاست و واقیعی ی لە مێژووەوە هێناوە تاكو وتەی جیاكەرەوە (القول الفصل)ی هەق لە ناهەق ڕوون كاتەوە بۆ شوێنكەوتوانی ئایینەكان لەو مەسەلەو كێشانەیان دا كە دەربارەی حەقیقەتی پێغەمبەران و پەیامەكەیان و بەرگری لێكردنیانە لەو تۆمەت و درۆودەلەسانەی كە بۆیان دروست كرابوون.

---

(١) (الفن القصصي في القرآن) — د. محمد احمد خلف الله.

# بەشی دووەم

## ئادەم (درودی لەسەر بێت)
## ئیدریس (درودی لەسەر بێت)

١- دروستکردنی ئادەم و بەرزڵێنانی
٢- ئادەم و ئیبلیس
٣- چەند وانەو پەندێک
٤- پێغەمبەرێتی ئیدریس

# بەندی یەکەم

## ((دروست کردنی ئادەم و ڕێزلێنانی))

(دەرکەوتنی ئادەم - پلەو پایەی ئادەم - ڕێزلێنانی ئادەم - کڕنووش بردنی مەلائیکەو سەرکێشی ی ئیبلیس.)

### "دەرکەوتنی ئادەم"[١]

چیرۆکی خەلق کردنی (ئادەم) بەو گفت و گۆ بەناوبانگەی نێوان خوداو مەلائیکەتەکانی دەست پێ دەکات کە لەچەند جێگایەکی قورئان دا هاتووە... لەو گفتوگۆیەدا خودا هەواڵی ئەوە بەفریشتەکان (ملائکة)ی خۆی دەدات کەوا لەسەر (زەوی) جێنشینێك بۆ خۆی دادەنێت، کە (ئادەم و وەچەو نەوەکانی یەتی)و باڵادەستیان دەکات لەزەوی دا و دەیانکات بەخاوەنی دەسەڵات تیای دا، بەڵام فریشتەکان لەبیستنی ئەم هەواڵە سەرسام دەبن، چونکە ئەوەی دەبێتە جێنشینی خودا لەسەر زەوی یەکەی، ناتوانێت وڵات و موڵکێکی گەورەو فراوان دامەزرێنێت و بەڕێوە ببات، کەلە ڕووی ڕەحمەت و پاکی یەوە وەك موڵکە فراوانەکەی ئاسمان بەڕێوە بچێت، چونکە خودا پێش "ئادەم"یش خەڵکی تری لەسەرزەوی دا دروست کردووەو بەڵام هەر کردەوەی خراپیان لەسەر زەوی دا هەبووە، لەبەر ئەمە فریشتەکان دوای بیستنی هەواڵەکە ڕوودەکەنە خودای پەروەردگاریان و دەڵێن: (ئایا لەسەرزەوی ئەو مرۆڤانە دادەنێیت کە بە (خراپە و بەدکاری) زەوی دەشێوێنن و خوێنی تێدا دەڕێژن لەکاتێك دا ئێمەش بەپاك و بێگەردو پیرۆزت ڕادەگرین لەهەر شتێکی وا، کە شایستەی شکۆو ڕێزت نی یەو بۆ شوکرانە بژێری و

---

(١) تێبینی: قورئان زاراوەی (پێغەمبەرێتی)ی بۆ -ئادەم- بەکارنەهێناوە وەك ئەوەی کە بۆ پێغەمبەرانی دوای -ئادەم-ی بەکارهێناوە، بەڵام ئەوەی دیاری کردووە کە خودا بەبێ میانگیر و (واسطة)یەك وت و وێژی لەگەڵدا کردووەو "فەرمان بەچاکە"و "ڕێگیری لە خراپە"و "حەڵاڵ"و "حەرام"ی بۆ دیاری کردووە، ئەمەش خۆی لەخۆی دا مانای پێغەمبەرێتی دەگەیەنێت. ئێمەش لەسەر ئەم بناغەیە چیرۆکی ئادەم دەخەینە ڕوو هەروەك چۆن لەقورئان هاتووە، ئەمەش هەر لەچوارچێوەی خستنەڕووی هەموو چیرۆکەکانی تری پێغەمبەران دا بەپێی چاخ و مێژووی مرۆڤ.

سوپاسگوزارییشت بەگەورەو مەزنت دادەنێین؟) فریشتەکان ئەمەیان بەخودای خۆیان دەگوت چونکە بەحوکمی پاکیزەیی ی خۆیان، خۆیان بەباشتر دەبینی لەو مرۆڤە دروست کراوەی کەدەبێتە جێنشین، هەروەها خۆیان بە شایستەترو لەپێشتر دادەنا بۆ جێنشینایەتیی زەوی، بەڵام خودا لەوەڵامی پرسیارە قەتیس ماوەکەیان دا ڕازونهێنیەیە شارراوەکەی ئەو مەسەلەیەو حیکمەتی خەلق کردنی ئادەمیشیان پێ ڕادەگەیەنێت کە (ئەوەی خودا خۆی دەیزانیت ئەو فریشتانە نایزانن). هەروەك فەرموویە: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ [١] بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ [٢] لَكَ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾البقرة /٣٠.

## پلە وپایەی ئادەم

خودای مەزن دوای خەلق کردنی ئادەم ناوی هەموو شتێکی لەگەڵ حەقیقەت و خاسیەتەکانی دا فێردەکات تاکو لەسەر زەوی باڵادەست بێت و سوودی تەواویشیان لێ ببینێت. پاشان خودا دەیەوێت ئەوە پیشانی فریشتەکان بدات کە ئەم بوونەوەرە تازەیەی لەکاروبارویان کەم دەکردەوە لەوان زیاتر زانست و زانیاری ی هەیەو دەبێت بەچاوی خۆشیان ئەو دیاردەیە ببینن. هەر بۆیە داوایان لێ دەکات، ناوی چەند شتێکی دیاری کراوو خاسیەتەکانیان پێ بڵێت گەر ئەوان بەگومان و بۆچوونی خۆیان وای دادەنێن گوایە لەئادەم زیاتر شایستەی جێنشینایەتی سەرزەوین.. بەڵام لەوەڵام دا دەستەوسان دەبن و داوای لێ بووردن لەخودای پەروەردگاریان دەکەن و دەڵێن (خودایە ئێمە هەر بەو پاك و بێگەردی و پیرۆزی یەت ڕادەگرین کە هەر شایستەی خۆتەو هیچ بەرهەڵستی یەکیشت بەرامبەر خواستی خۆت ناکەین چونکە هیچ زانستێکمان پێ نی یە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆت فێرت کردبین و پێت بەخشیبین، هەرخۆیشت زاناو ئاگاداری لەهەموو شتێکداو دانایت لەهەر کارێکدا کە دەیکەیت).. پاشان خودای پاك و کاربەجێ داوا لە (ئادەم) دەکات کە فریشتەکانیش فێر بکات و لەو زانستەی خۆییان پێ بگەیەنێت، بۆیە پێی دەفەرموێت: (ئەی ئادەم هەواڵی ئەو

---

(١) نسبح: (تسبیح) واتە دوورخستنەوەی سیفەتی جەستەداری لە (ذات)ی پاکی خودا.
(٢) نقدس: (تقدیس) واتە دوورخستنەوەی کردارەکانی خودا لە سیفەتی خراپ کردن.

ڕاستی یانەیان پێ بڵێ کە من پرسیارم لێ کردبوون) ئادەمیش وەڵام دەداتەوەو پلەی خۆی لەسەر فریشتەکان دەردەخات کەخودا پێی بەخشیوە. ئیتر لێرەدا خوداش ڕووی گفتار دەکاتەوە فریشتەکان و دەفەرموێت: (ئایا من پێم نەگوتن کە هەر خۆم دەزانم چی لەئاسمانەکان و زەوەی دا هەیە لەو شتانەی کەجگە لەخۆم کەسی تر نایانزانێت، هەروەها ئاگادارم لەهەر وتەو گفتارێکتان و لەهەر نهێنی یەکی نێو دڵ و دەروونەکانیشتان؟).

پوختەی ئەم باسەی پێشووش لەم ئایەتانەوە وەرگیراوە کە خودا تیایان دا فەرموویە:

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا [١] ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي [٢] بِأَسۡمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴾البقرة/٣١-٣٣.

## ڕێزلێنان لە ئادەم

قورئان باسی ئەو مادەیەمان بۆ دەکات، کە (ئادەم)ی لێ دروست کرا، هەروەك خودا فەرموویە: ﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴾ص/٧١. واتە (ئەی پێغەمبەر ئەو چیرۆکە بۆ بێباوەڕەکانی -مەککە- بگێڕەرەوە کەکاتێك خودا لەسەرەتاوە ڕووی کردە

(١)(وَعَلَّمَ آدَمَ الاَسْمَاءَ كُلَّهَا) واتە خودا ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد، مەبەست لە وشەی (أسماء) لێرەدا ناوبراوەکان(المسميات)ـە، واتە خودا زانیاری شتەکانی بەبێدیاری کردن و دەستنیشانکاری یەك خستە دڵی ـ ئادەم- ـەوە. خوداش بەگوێرەی توانای ئامادەیی خودی مرۆڤ زانستێکی پێویستی خستۆتە دڵیەوە کە دەربارەی ڕاستی شتەکان و ڕێساو دەستورەکانی خودان کە لەژێر حوکمی زانست و یاساکانی قازانج و زیان دان. واقیعیش پشتگیری ئەم بیروڕایە دەکات، چونکە ڕەگەزی بەشەری بە (میرات) ئەو ئامادەیی یە سروشتیەی لە (ئادەم)ی باوکی یەوە بەتێپەڕبوونی چاخەکان بۆ ماوەتەوە. هەر بەمەش نهێنییەکانی ئەم زەوی یەو یاساکانی شێوەی پێکهاتەی ڕۆژبەڕۆژ بەپێی توانای کۆنترۆڵ کردنیان دەدۆزنەوە لەگەڵ بەدی هێنانی فەرمایشتەکەی خوداش (إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً) (من لەسەر زەوی جێنشینم داناوە).

هەروەها دەربارەی زانستەکەی ئادەم گوتراویشە خودا لەناخی ئادەمدا زانستێکی خولقاندووە دەربارەی ناوی هەموو بوونەوەران و گیانەوەران و ئاسمانەکان و زەوی‌و ئاژەڵ و ڕووەك و چیاو دەریاکان و هەرشتێکی تر لەو شتانەی کە هاوزەمان و هاوژیانی خەلکی دنیا دەبن و دانیشتوی نێو دنیا ئاتاجی بە ناسینیان دەبێت تاکو بەئاسانی بتوانێت ژیانی تێدا بەسەر بەرێت. نەخاسمە ئەو کەسەش جێنشینی خودا دەبێت لەسەر زەویەکەی خودا.

(٢) أنبئوني: (أخبروني): هەواڵم پێبدەن، ئاگادارم کەن لەناوەکان.

فریشتەکان و پێی گوتن ئەوا من مرۆڤێك لەقوڕ دروست دەکەم)، قوڕ واتە: (ئەو خۆڵەی، کە بەئاو تێکەڵ کراوەو شێلراوە)... هەروەها خودا لەم ڕووەوە فەرموویە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾الحجر/٢٦.. واتە: (ئێمە مرۆڤمان لەقوڕێکی بۆش و ڕەنگ ڕەش و لەسەر شێوە و تەرزی ئینسانێك دا دروست کرد)...هەروەها فەرمویە:﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ﴾ الرحمن /١٤ واتە (خودا مرۆڤی لەو قوڕە وشکە دروست کرد، وەك ئەو قوڕەی کە تارادەی ڕەقبوونەوە دەسوتێنرێت)...

بەپێی ئەم ئایەتانە خودا ئادەمی لەقوڕێکی ڕەش لەسەر پەیکەرو تەرزی مرۆڤێك دروست کردووە تا ئەو کاتەی کەقوڕەکە بەڕادەیەکی وەها ووشك بووەتەوە کە ئەگەر فووی پیابکرایە دەنگی دەهات، قۆناغ بە قۆناغیش گۆرانکاری ی بەسەر قوڕەکەدا هێناوەو پاشان لەڕۆحی خۆی فووی پیاداکردووەو ئیتر بووەتە مرۆڤێکی پێك هاتوو لە گۆشت و خوێن و ئێسك و ئەو ئەندامانەی کە بزووتن و هەست بەرهەم دێنن و بەخواستی خوداو تێفکرینی مرۆڤیش لە جم و جووڵدا دەبن.. پاش ئەم خەلق کردنە خودا فەرمان بە فریشتەکانی دەکات کە کڕنووش بۆ ئادەم بەرن (کڕنووشی ڕێزلێنان) نەك (کڕنووشی پەرستن) چونکە خودا فەرمان بەهیچ کەسێك ناکات کەجگە لەخۆی دروست کراوێکی تر بپەرستن. خودا فەرموویە: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾الحجر/٢٨ــ٢٩. لەم ئایەتانەدا بەسێ خەلات خودا ڕێزی لە - ئادەم- نا:

یەکەم/ بەدەستی خۆی خەلقی کرد.

دووەم / لەرۆحي خۆی فووی وەدەیهێنانی پێداکرد.

سێ یەم/ فەرمانیشی بەفریشتەکانی کرد، کە کڕنووش(سووژدە)ی ڕێزی بۆ بەرن.

# کڕنووشی مەلائیکەو سەرکێشی ی "ئیبلیس"

فریشتەکان (مەلائیکە)ی خودا هەر هەموویان بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکەی خودای پەروەردگاریان کڕنووشیان بۆ -ئادەم- برد، تەنها (ئیبلیس) نەبێت کە ملی نەداو بەنەریتی خۆ بەزل زانین و نکووڵی کردنەوە قایل نەبوو کڕنووش بۆ -ئادەم- ببات.. خودا لەم ڕووە لە (ئیبلیس)ی پرسی (هەرچەندە خودا خۆی زانایەو ئاگاداری هەموو شتێکیشە) لێ ی پرسی دەربارەی هۆی سوژدەنەبردنی بۆ -ئادەم- دوای ئەوەی کە فەرمانیشی پێ کردووە، کەچی (ئیبلیس) بەوە پاساو بۆ خۆی دێنێتەوە گوایە لەڕووی پێکهاتەو ماددەی جەستەیی یەوە لە -ئادەم- باشترەو خۆی لە (ئاگر) دروست کراوە بەڵام -ئادەم- لە (قوڕ) دروست کراوەو ئیتر بەڕای خۆی ئاگر لە قوڕ باشترەو بەڕێزترە، بەم ڕەنگەش ئەوپەڕی لووتبەرزیی پیشان دا. لەم کاتەداو بەهۆی ئەم بەزل زانینەوەی، خودا لەبەهەشت دەری دەکات و نەفرەتێکی ئەبەدیو هەمیشەییشی هەر بەهۆی خۆ بەگەورەدانانیەوە تا ڕۆژی دوایی لێ دەکات. خودا لەم ڕووەوە فەرموویە: ﴿ فَسَجَدَ[1] الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا إِبْلِيسَ[2] اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنْتَ مِنَ الْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ[3] ﴿٧٦﴾ قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا[4] فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَىٰ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ص/٧٣-٧٨[5]

---

(١) کڕنووش بردن (سجود) لەبنچینەی زمان دا مل کەچی یە (تذلل) لەگەڵ خۆدانەواندن بەشێوەی سەرخوارکردنەوە. پاشان لەشەرع دا بەمانای (دانانی ناوچەوان لەسەرزەوی بەمەبەستی پەرستن و بەندایەتی) بەکارهاتووە. بەڵام لەم ئایەتانەدا مەبەست لەکڕنووشەکە ڕێزلێنانە..

(٢) أبليس "ئیبلیس" ناوێکی بیانی (اعجمي)ی غەیرە عەرەبی یە بۆ (عەلەم). بەڵام "ابوعبیدة" گوتوویەتی کە ناوێکی عەرەبییەو لەوشەی (إبلاس)ەوە وەرگیراوە بەمانای دوورخستنەوە لەخێرو چاکەیان بێئومێدی لەڕەحمەتی خودا (الأبعاد عن الخير او اليأس من رحمة الله).

(٣) دیاری کردنی ئەو چەمکەی کە ئاگر لە قوڕ باشترە لەبەر ئەوەیە چونکە ئاگر خاوەن تیشکی هەڵاتووی بەرزو جوان و هاوشانی سروشتی ئەستێرەو هەسارە ئاسمانی یەکانە، بەڵام قوڕ تاریکە، هەروەها چونکە ئاگر کارو کاریگەریی ی بەهێزی هەیە، بەڵام خاك و خۆڵ تەنها کارلێکراوی (انفعال) و پەسندکردنی لەسەرە.

(٤) "منها" واتە (من الجنة) واتە لەبەهەشت دەربچۆ.

(٥ ) تێبینی/ تەفسیری ئەم ئایەتانەی پێشوو لەو بڕگەیەی پێش ئایەتەکان و لێکدانەوەی ئەم وشانەی پەراوێزەکانی نووسەردایە. "وەرگێڕ"

# بەندی دووەم

## (( ئادەم و ئیبلیس ))

( دەرکردنی ئیبلیس لەبەهەشت - خەلق کردنی (حەواء) - فریودانی ئادەم لەلایەن ئیبلیسەوە - هەڵەی ئادەم – لێبوردن لە ئادەم و دەرکردنی لەبەهەشت – ئەو بەهەشتەی کە خودا ئادەمی تیا دانابوو. )

## دەرکردنی - ئیبلیس - لەبەهەشت

سزای ئیبلیس لەسەر سەرکێشی و خۆ بەگەورەدانان و سەرپێچی کردنی لەکڕنووش بردن بۆ ئادەم -" دەرکردنی بوو لەبەهەشت" بەسەرشۆری و ڕیسواکراوی- بەڵام داواکاری ی ئیبلیس - لە بەرامبەر ئەم سزایە-دا لە خودای پەروەردگار ئەوەبوو، کە تا ڕۆژی قیامەت مۆڵەتی پێ بداو بەزیندوویی بیهێڵێتەوە، خوداش لەبەر حیکمەتێك " کەتەنیا خواست و ئیرادەی خۆی تیادابوو" داواکاری یەکەی -ئیبلیس-ی پەسندکردو بۆی جێبەجێکرد... (ئیبلیس) لەمەڕ هۆی داواکاری یەکەی گوتی (خودایە لەبەر ئەوەی لەبەهەشتت دەرکردم و سزات دام بەو حوکمەی کە لەناوم دەبەیت لە دۆزەخ دا، ئەوا سوێند دەخۆم کە ئەوپەڕی هەوڵ و کۆششم بخەمە کار بۆ گومڕاکردن و لەڕێلادانی نەوەکانی -ئادەم- و لە ڕێگاڕاستەکەی تۆش دووریان خەمەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت هەموو شێوازو ئامڕازێك بەکاربێنم، هەروەها لەهەموو ڕوو و ئاڕاستەیەکەوە بچمە سەریان و کاتەکانی بێئاگایی و غەفڵەت بوون ولاوازییان بەهەل بزانم تاکو دەگەمە نیازی گومڕاکردن و تێکدانیان، ئیتر زۆربەی بەندەکانت وا لێ بکەم پێنەزان بن و سوپاسگوزار نەبن، بەڵام خودا بەرپەچی دایەوەو فەرمووی: (بەسەرشۆڕی و سەرگەردانی و دەرکراو لەڕەحمەتی خۆمەوە بڕۆ دەرەوە لەبەهەشت، سوێندیش دەخۆم کەمن دۆزەخ پڕ بکەم لە تۆو هەموو ئەوانەی شوێنت دەکەون. ئەمەش دەقی وتووێژەکەیە هەروەك لەقورئان دا دیاری کراوەو خودا تیای دا فەرموویە: ﴿ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ [١] ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ [١] ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ

---

(١) (الصاغرين) واتە سەرشۆڕەکان، بێدەسەڵاتەکان.

أَغْوَيْتَنِي (٢) لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ (٣) صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَن شَمَائِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا (٤) مَّدْحُورًا (٥) لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾الأعراف/١٣-١٨..

قورئانی پیرۆز لەجێگایەکی تردا دوای هەڵخەڵەتاندنی -ئادەم- لەلایەن (ئیبلیس)ـەوەو دەرکردنی (ئیبلیس) لەبەهەشت و بەڵێن دانی بەوەی گوایە لەسەر ئەو سزایە هەموو ئادەمیزادێك لەسەر ڕێ لادەدات، بەڵام لێرەدا قورئان (واتە لەم جێگایەو چەندین جێگای تردا) بەڵێن و سوربوونی (ئیبلیس) بەرامبەر بەندەڕاست و چاکەکانی خودا پووچەڵ دەکاتەوەو ئەو مژدەیەش بەباوەڕداران دەگەیەنێت کە فێڵ و تەڵەکەی -شەیتان- بەرامبەر خواناسان و بەندە باوەڕدارەکانی خودا هیچ کاریگەری یەکی نی یە، هەروەك خودا لەم ئایەتانەدا دەفەرمویت: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ قَالَ أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَأَيْتَكَ (٦) هَٰذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ (٧) ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ اذْهَبْ (٨) فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَاسْتَفْزِزْ (٩) مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ (١٠) وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم (١١) بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ (١٢) وَشَارِكْهُمْ فِي

---

(١)(يبعثون)لە وشەی(بعث)ـەوە هاتوە، واتە ئەو رۆژەی کە خودا خەڵکی لەگۆڕەکانیانەوە زیندوو دەکاتەوە.

(٢) (أغويتني) لەسەرچاوەی (إغواء)ـەوەیە بەمانای (تیاچوون). گوتراویشە دانانی گومڕابیە لەدڵدا کە ئەمەش بیروباوەڕی پووچەڵ دروست دەکات.

(٣)(لأقعدن هم)پسپۆڕانی ڕێزمان لەوبڕوایەدان،کەئامڕازی (علی)لێرەدا لابراوەو وای دادەنێن بنەڕەتی رستەکە (لأقعدن هم علی صراطك المستقيم)بێت، واتە:(دەبێت لەسەر ڕێگاراستەکەت بۆسەیان بۆ دابنێم و لایاندەم).

(٤) (مذؤما) واتە (محقورا) سەرشۆڕو بێ‌نرخ.

(٥) (مدحورا) واتە دەرکراوو دوورخراوە.

(٦) (أرأيتك) واتە (هەواڵم پێبدە) ئاگادارم کە... هۆیەکەیم پێ بڵێ.

(٧) (لأحتنكن) واتە ڕایاندەکێشم بەرەو گوناه و یاخی بوون.

(٨) (أذهب) واتە برۆ بەلای کارو خواستی خۆتەوە.

(٩) (أستفزز) وشەی (استفزاز)لێرەدا بۆ بەکەم گرتنە، واتە فریوی‌داو خستیە ئەو داوەوە کە بۆی نابووەوە.

(١٠) (بصوتك) واتە بەو بانگەشەیەت بۆ سەرپێچی کردن لەفەرمانی خودا توانای فریودانی هەرکەسێکت هەبوو فریوی بدەو بیانخەرە ناو داوی خۆتەوە چونکە هەر دۆزەخ جێی تۆو ئەوانیشە.

(١١) (وأجلب عليهم) واتە (هەرچی لەفڕوفێڵ و تەڵەکەبازی دەیزانیت و دەتوانیت بۆیان کۆیکەرەوە).

(١٢)(بخيلك ورجلك)واتەهەر(سوارە)و (پیادە)یەك بن لەسەرپێچی کردنی خودا لەشوێنکەوتوانی - ئیبلیس-

ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾ الأسراء/٦١-٦٥...

واته: (خودا بەفریشتەکانی گوت" هەمووتان بەشێوەی خۆچەماندنەوە بۆ - ئادەم- سڵاوی لێ بکەن ورێزی لیَ بنێن"، فریشتەکان هەموویان ئەم فەرمانەیان جێبەجێ کرد تەنها - ئیبلیس- نەبێت کە بە نکوولّی کردنەوە گوتی (چۆن کڕنووش بۆ کەسێك دەبەم کە لەقوڕ دروست کردووە) خوایە تۆ هۆی ئەوەم پێبلّێ کە بۆچی ـ ئادەم ـ ت لەسەروو منەوە داناوەو داوای کڕنووش بۆ بردنیم لیّ دەکەیت؟ بۆچی لەمن بەڕێزترو باشترت داناوە لە کاتێکدا من لەو باشترم؟ جا ئەگەر بەهۆی ئەم کڕنووش نەبردنەمەوە -کە فەرمانی تۆم تیادا پشت گوێخست- بم هێڵییەوە تا ڕۆژی دوایی تاکو هەموو نەوەکانی ئەم مرۆڤە (ئادەم) بەفریودان و گومڕاکردن لەناوبەرم تەنها ئەو چەند نەوە کەمە نەبێت کە بەهۆی خواپەرستی و وریاییانەوە دەیانپارێزیت و لەگوناه بە دووریان دەکەیت، ئەگەر ئەم داوایەم وەرگریت و بۆ ئەم مەبەستە بمهێڵیتەوە، ئەوا منیش لەسەر ئەم مەبەستەم و ئاکامەکانیشی سوور دەبم).

خوداش لەگەڵ وەڵامی داواکەی دا بەهەڕەشەکردنەوە لەو جۆرە وەچەو نەوانەی ئادەمیزاد فەرمووی:(دەبڕۆ بەلای کارو نیازەکەتەوەو هەرکەسێکیش لەوەچەو نەوەی ئادەم گوێ ڕایەڵی ی تۆ بکات ئەوا دۆزەخ سزای تۆو ئەوانیشە، ئەمەش سزایەکی تەواوو پڕ بەپێستی کردارەکانیانە).

پاشان خوای مەزن لەسەر هەڕەشەکەی بەردەوام بوو و فەرمووی: (چەندە توانیت سوور بە لەسەر لەڕێ لادان و هاندانی نەوەکانی ئادەم لەسەر گوناەو یاخی بوون، هەروەها ئەوپەڕی کوڕونەوەیان و فریودانیان دا بۆ فەساد ـ هاوبەشیان بە- هەوڵ و تەقەللا بدە لەهەموو جۆرە شێوازێکی فریودان دا و لەماڵو سامانی حەرام و بێباوەڕکردنی کوڕو نەوەیان و فریودانیان دا بۆ فەساد - هاوبەشیان بە- پاشان بەڵێنی درۆو پوچەڵیشیان پێ بدە)...

ئینجا خودای پەروەردگار بۆ روون کردنەوەی ئەو وەڵامەی خۆی دەفەرموێت:(هەر بەڵێنێك کەشەیتان بیخاتە دڵی گوناهکارو یاخی یانەوە تەنها فریودان و ڕازاندنەوەی کردارە نابەجێکانە. دەنا بەندە خواویست و دڵسۆزەکانی خودا، کە باوەڕێکی بەتینیان هەیە هیچ بوارێك بە -شەیتان-نادەن و-ئیبلیس- هیچ تواناو دەسەڵاتێکی بەسەریاندا نی یە، چونکە تەنها پشتیان بەخودای خۆیان بەستووەو هەرخوداش بەسە بۆ پشت پێ بەستن و بەپشتیوان دانان).

## خەلق کردنی حەواء

خودای مەزن کەئادەمی دروست کرد هاوسەری ژیانیشی بۆ داناو داوای لێ کرد کە لە بەهەشت دا پێکەوە دانیشن و ژیانی تیادا بەرنەسەر. زانایان ئیختیلاف و بیرورای هەمەجۆریان لەسەر کاتی خەلق کردنی هاوسەرەکەی ئادەم هەیە، هەندێکیان دەڵێن: کاتێك خودا -ئیبلیس-ی لەبەهەشت دەرکردو -ئادەم-ی تیادا نیشتەجێ کرد، ئادەم خۆی لەبەهەشت دا مابووەوەو کەسێك نەبوو کەهاوژین و هاونشینی بێت، بۆیە خودا خەوی لێ خست و پاشان پەراسوویەك لەپەراسووەکانی لای چەپی لێ کردەوەو لەجێگایدا گۆشتی بۆ داناو ئیتر لەو پەراسووەوە -حەوا-ی دروست کرد.

کاتێك ئادەم لەخەو هەستا دیتی ئەوا ئافرەتێك لەلای سەریەوە دانیشتووە. ئینجا لێی پرسی: (تۆ کێیت)؟ ئەویش گوتی (من ئافرەتم). گوتی (ئەی بۆچی دروست کراویت؟). حەواش گوتی (تاکو لەگەڵم دا بژیت).. لەقورئانیش دا ئاماژەیەك بۆ ئەم لایەنەکراوە، هەروەك خودا فەرموویە: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾النساء/١ واتە (ئەو خودایەی کە ئێوەی لەیەك نەفسەوە دروست کردو لەو نەفسەشەوە هاوسەری خۆی بۆ دروست کرد). هەروەها فەرموویە: ﴿وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا﴾الأعراف/١٨٩.

## فریودانی ئادەم لەلایەن ئیبلیسەوە

کاتێك خودا ئادەم و هاوسەرەکەی لەبەهەشت دا دانا ڕێگەی دان کەتام و چێژ لەهەموو شتێکی نێو بەهەشت وەرگرن و بەئارەزووی خۆیان لەهەموو بەروبوومێکی بخۆن، تەنها لەبەروبوومی درەختێك نەبێت و فەرمانیشی پێکردن هەرگیز لێ ی نزیك نەبنەوەو تامی بەرەکەشی نەکەن، دەنا گەر وابکەن ئەوا بەو سەرپێچی کردنەی فەرمانی خودا ستەمێکی گەورە لەخۆیان دەکەن و بەم پێیەش سزای لەسەر وەردەگرن. "ئیبلیس" لەدڵی خۆیدا بەمە دڵشاد بوو چونکە دەروازەیەکی تێدادەبینی کە لێ یەوە بچێتە نێو دەروونی ئادەم و ژنەکەیەوە، ئەمەشی کرد بەبابەتی گفت وگۆو ئاخاوتن لەگەڵیانداو دەستیکرد بە لێدوان بۆیان و فریودانیان تاکو لەبەروبوومی درەختە قەدەغەکراوەکە بخۆن و پاشان ئاکامی ئەوەش دەرکەوتنی ئەو بەشانەی عەورەتیان بێت کە داپۆشرابوون و شاراوەبوونەوە. "ئیبلیس" زیادەڕۆیی یەکی زۆری کرد لەهاندانیان و سووربوونی لەسەر خواردنی بەروبوومی درەختەکە بەو فێڵەی گوایە خودا بۆیە نەیهێشتووە لەو درەختە بخۆن تاکو نەبنە مەلائیکەو لەبەهەشتی

پڕنازو نیعمەت دا بەنەمری نەمێننەوە. ئینجا گەلێك سوێندی بۆ خواردن لەسەر ئەوەی گوایە ئەو زۆرو دڵسۆزو بەپەرۆشە بۆیان و ئامۆژگارییان دەکات.

خودای گەورە لەم بەسەرهاتەدا فەرموویە: ﴿ وَيَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ [1] فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ [2] لَهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ [3] أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَـٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ [4] إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴾الأعراف/١٩-٢١.

## هەڵەی ئادەم

دیارە - ئادەم و حەوا- ئەوەیان لەبیرچووبوو، کە ئیبلیس" دوژمنیانەو فریویان دەدات، هەر بۆیەش کەوتنە نێو داوەکانی پیلانەکەوەو لەدرەختەکەیان خواردو جا هەر، کە تامەکەشیان چەشت یەکسەر عەورەتی هەردووکیان بۆ یەکتر دەرکەوت، چونکە لە وەوپێش نە عەورەتی خۆیان و نەعەورەتی یەکتریشیان نەدی بوو، ئیتر لەبەر زۆری ی شەرم کردنیان کەوتنە کۆکردنەوەی هەندێك گەڵای درەختەکان و خۆیان پێ دادەپۆشی. لەو ساتەوەختەش دا خودا بانگی لێ کردن و بەتوندی سەرزەنشتی کردن لەسەر ئەو گوناهەیان و بەگلەیی یەوە فەرمووی:(ئەرێ ئەوە من داوام لێ نەکردن، کە لەو درەختە نەخۆن و پێم ڕانەگەیاندن کەشەیتان دوژمنێکی دیارو ئاشکراتانە)؟!

بێگومان "ئادەم و حەواء" هەستیان بەڕادەو بارستایی ئەو گوناهەیان کرد لەدەرچوونی لەفەرمانی خودادا، بۆیە زۆر زۆر پەشیمان بوونەوەو لەخودا پاڕانەوەو بەم نزایەوە ڕووی

---

(١) دەربارەی ناووجۆری درەختەکە (الشجرة) خیلاف وجیاوازی بیروڕا لەنێو وتەی زانایان دا هەیە، هەندێکیان گوتویانە (گەنم )یان (دارخورما) بووە، گوتراویشە (داری هەنجیر) بووە، هەروەك گوتراویشە کە درەختی خۆشەویستی بووە، جگە لەچەند بۆچوونێکی دیکە. بەڵام باشتر وایە ناوی هیچ درەختێکی بۆ دیاری نەکەین، چونکە خودای گەورە خۆی هیچ ناوێکی بۆ دانەناوە.

(٢) وەسوەسەی شەیتان لێرەدا بەمانای خورپەی خراپ و چرپەی نهێنی دەگەیەنێت، چونکە وەسوەسەی شەیتان بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە خەڵکی چەند خورپەیەکی خراپ بەدڵیان دا دێت لەو خورپەو خەیاڵانەی کە لەڕووی جەستەیی‌و گیانی و هەڵس و کەوتیشیانەوە زیانیان پێ دەگەیەنێت.

(٣) (تکونا ملکین) کە مانای "بۆ ئەوەی ببنە دوو فریشتە" دەگەیەنێت، مەبەستی لەوە بووە کە چۆن مەلائیکەو فریشتەکان چەندین خاسیەت و تایبەتمەندیی ی وەك (هێز و تەمەندرێژی و نەکەوتنە بەر گۆڕانکارییە ئازاربەخش و وەرسکارەکان)یان هەیە تۆ و حەواش با وابن گەر لەدرەختەکە بخۆن.

(٤) (قاسمهما) واتە سوێندی گەورەی بۆ خواردن کە ڕاستگۆو دڵسۆزە بۆیان و بەو سوێندە فریوی دابوون.

دوعایان کردە پـەروەردگارو گوتیـان: (خودایـە ئێمـە بـەو سەرپێـچی کـردن و دەرچـوونەمان لەفەرمانی تۆ ستەممان لەخۆمان کرد، جا تۆش لێمان خۆش بەو بەزەییت پێمان دا بێتەوە، خـۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێمان دا نەیەتەوەو بە (لوطـف) و بەخششی خۆت لێمـان نەبووریت ئەوا لەزەرەرمەندان و ڕەنج بەخەسار دەبین)..

لەم ڕووەشەوە خودا لەبەسەرهاتیان دا فەرموویە: ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ (١) فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا (٢) وَطَفِقَا (٣) يَخۡصِفَانِ (٤) عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾الأعراف/٢٢-٢٣.

## لێبوردن لەئادەم و دەرکردنی لەبەهەشت

خودای گەورە تەوبەو پاشگەزبوونەوەی ـ ئادەم ـ ی پەسند کرد:﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ (٥) عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾البقرة/٣٧.. واتە(خودا چەند وشەیەکی نزاو پاڕانەوەی خستە دڵی ئادەمەوەو فێری داوای لێبوردن کردنی بوو و خوداش داواکـەی پەسـند کـردو تەوبـەی لێ وەرگرت، بێگومان خودا هەر خۆی وەرگری تەوبەیەو میهرەبان و بەڕەحمیشە).

بەڵام دوای وەرگرتنی ـ تەوبـە ـــ خـودا (ئـادەم و حـەوا)ی لەبەهەشـتەوە بـۆ سـەر زەوی دابەزاندو هەواڵی ئەوەشی پێدان کە وەچە و نەوەیان دەبێت و لەنێوان نـەوەکانیان دا دژایـەتی دروست دەبێت (گەر خۆیان بدەن بەدەم خۆپەسندی و ئارەزووپەرستی یـەوە)، هـەروەها ئـەوان

---

(١) (فدلاهما بغرور): لەم ڕستەیەدا وشەی (دلاهمـا)، کـەمانای (ڕێ نیـشاندانیانە بـۆ خـواردن لەبـەری درەختەکە) مەبەست پێی ئەوەیە کە تامیان چەشتووە، گوتراویشە (ڕێنیشاندانەکە (الدالـة)) جورئەتـە، واتـە جورئەتی ناونەتەبەر بۆ خواردن لەبەروبوومی دەرختەکە. وشەی (بغرور )یان (غرور)ـەکەش بەمانای فریودانـە بەشتی پووچەڵ و بەتاڵ.. . گوتراویشە (واتە: خستوونیە نێو دۆخی تیاچوون و هەلاکەتەوە).

(٢) دەربارەی "فلما ذاقا الشجرة بدت لهما سوآتهما"، شێخ رشید رضـا‌ـ وای بـۆ چـووە کـە (ئـارەزووی جنسی لەلای هەردوکیان (ئادەم و حەووا) دروست بووە، ئەویش بەکاریگەریی خـواردن لـە درەختەکـە، بـەڵام خێرا ئاگاداربوونەتەوە لەوەی کە لێ یان پەنهانی بووەو بەم ڕەنگەش لە دەرکەوتنی عەورەتیان شەرمەزار بوون و هەستیان بەپێویستی ی داپۆشینی کردووە.

(٣) (طفقا): دەستیان کردووە بەشاردنەوەی.

(٤) (یخصفان): واتە گەڵا بە گەڵا یەك لەسەر یەك خستوویانەتە سەر عەورەتیان.

(٥) فتاب علیه: واتە خودا تەوبەی لێ وەرگرت، بەڵام -تـابَ العبدُ- واتـە بەندەکـە گەڕایـەوە بـۆ سـەر گوێڕایەڵی خودای خۆی، چونکە ڕیشەی (توبة) -رجوع- واتە گەڕانەوەیە.

لەسەرزەوی نیشتەجێ دەبن و ئاوەدانی دەکەنەوەو ماوەیەکی کەمی تیادا بەسەر دەبەن کە تەمەنی ژیانی دنیایانەو دوای ئەوە هەر کەسە بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە. خوداش لەماوەی ژیانیان دا ڕێ ی ڕاست و هوشیارییان پیشان دەدات، جاهەر کەسێك دوای ڕێبازی خودا بکەوێت ئەوا ناکەوێتە نێو هەڵەو گوناهەکانی دنیاوە، هەروەك بەدبەختیش نابێت تیای دا.

خودای مەزن پێی فەرموون: ﴿ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴾الأعراف/٢٤-٢٥.

هەروەها پێی فەرموون: ﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴾طه/١٢٣.

## ئەو بەهەشتەی، کە خودا ئادەمی تێدا دانابوو

زانایان بیروڕای جیاجیایان لەبارەی ئەو بەهەشتەوە هەیە کە لەقورئان دا باس کراوەو خودا ئادەمی تیادا نیشتەجێ کردبوو و دوایش فەرمانی لێ دەرچوونی پێدابوو، بیروڕایان وایە کە داخۆ لەسەرزەوی یان لەئاسمان دا بووبێت؟ ڕای ڕاسترو یەکلاکراوەتر ئەوەیە، کە پێ دەچێت ئەو بەهەشتە لەسەر زەوی بووبێت، چونکە خودا ئادەمی لەسەر زەوی دروست کردووە هەروەك فەرموویە: ﴿إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ﴾ ئیتر خودا باسی گواستنەوەی ئادەمی بۆ ئاسمان نەکردووە. پاشان لەلایەکی ترەوە خودا وەسفی بەهەشتە بەڵێن لەسەردراوەکەی ئاسمانی بە بەهەشتی نەمری (جنة الخلد) کردووە، جا ئەگەر ئەم بەهەشتی نەمرییە بوایە کە خودا ئادەمی تیا دانابێت ئەوا "ئیبلیس" جورئەتی ئەوەی نەدەبوو کە بە ئادەم بڵێت: ﴿قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴾طه/١٢٠.. واتە: (ئەرێ -ئادەم- ڕێنماییت نەکەم بۆ خواردن لە بەروبوومی درەختی نەمری کە هەرکەسێك بیخوات نامرێت و بۆ موڵکێکیش کە هەرگیز لەناو ناچێت و کۆتایی نایەت)؟. بەهەشتی نەمری(جنة الخلد)یش خانەی پڕ نازو نیعمەتە، نەك ئەرك پێسپاردن، خوداش ئەو ئەرکەی بە - ئادەم و حەوا- سپارد کە لە بەری ئەو درەختە دیاریکراوە نەخۆن.. (جنة الخلد) کە لە ئاسمان دایە وەها بۆ شایستەبوانی وەسفکراوە کە ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، ئەمە لەکاتێك دا کە ئادەم و حەوا لەبەهەشتێك دا دەرکراون کە تیای دا دانرابوون، بەمەش وا ڕوون دەبێتەوە، کە (ئەم بەهەشتە) ئەو بەهەشتە بەڵێن پێدراوە نەبووە، کە لەقورئان دا باسی کراوەو لەڕۆژی

ئاخیرەت دا خودا بۆ باوەڕدارە چاکەخوازەکانی داناوە. لە روویەکی تریشەوە گەر ئەم ڕاستی یە بسەلمێنین دەبینین کاتێك (ئیبلیس) ئامادە نی یە کڕنووشی ڕێز بۆ (ئادەم) ببات، نەفرەتی لێ دەکرێت و لەبەهەشتەکە دەردەکرێت، جا ئەگەر ئەم بەهەشتەش بەهەشتی نەمری(جنة الخلد)ـەکە بوایە، ئەوا هەرگیز نەیدەتوانی لەکاتی ڕق و تووڕەیی ی خوادا لەسەری بگاتە ئەو بەهەشتی نەمری یەو بەخورپە دروست کردن بۆ ئادەم و حەوا وەسوەسەی خۆی بکات و فریویان بدات.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەو بەهەشتەی کە خودا ئادەمی تیا دانابوو ئەو بەهەشتی نەمری یە نەبووە،کە لەئاسمان دایە. هەروەها ئەو بەهەشتەی کەخودا ئادەمی تیادانابوو لەپارچەکانی تری زەوی بەرزترنەبووەو دارودرەخت و بەروبووم و سێبەرو هەر نیعمەتێکی دیکەشی هەر تێدا هەبووە، هەروەك خوداش وەسفی کردووەو فەرموویە: ﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ﴾طه/١١٨-١١٩. واتە: (تۆ لەم بەهەشتەدا نەبرسیت دەبێت و نەبێ بەرگ و بێپۆشاك دەبیت، نە تووشی گەرماو تینوێتی دەبیت و نەبەر گەرمیی خۆر دەکەویت).. کەچی کاتێك ئادەم و حەوا بە پیلانەکەی شەیتان لەدرەختەکە دەخۆن دادەبەزنە سەر خاکی بەدبەختیو ماندوێتیو گرفتاریو تەجرەبەی سەختی ژیان.

جا هەرکەسێك بۆ بەڵگەی بوونی (ئادەم و حەوا) لەبەهەشتی نەمریی ئاسمان داو فەرمان پێکردنیان بەدابەزین(هبوط) بۆ سەرزەوی ئایەتی ﴿قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا﴾ دیاری دەکات، واتە گەر هەر کەسێك وشەی دابەزین(هبوط)ـەکە بکات بەبەڵگەی بەهەشتی نەمریی ئاسمان، ئەوا لەوەڵام دا پێی دەڵێین کە وشەی (هبوط) بەمانای گواستنەوە دێت لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی، هەروەك چۆن خوداش فەرمانی بە ـ موساـ(سڵاوی خوای لێ بێت) و گەلەکەی کردووە، کە لە وڵاتێکی گەورە بگیرسێنەوە:﴿ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ﴾البقرة/٦١. واتە (ڕوو بکەنە -یان- بگوازنەوە بۆ وڵاتێکی گەورە چونکە لەوێ پێویستی‌یەکانتان دەست دەکەوێت).. هەروەها خودای مەزن کاتێك فەرمان بە پێغەمبەرەکەی خۆی(نوح) دەکات بەکەشتی یەکەوە لەو ناوچەیە بگوازنەوەو دەربچن پێیان دەفەرموێت: ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا ﴾هود/٤٨.

# بەندی سێ یەم

## ((چەند وانەو پەندێك))

( ڕێزلێنانی مرۆڤ - ئاکامی لوتبەرزیی - داوایەك بۆ شکۆمەندیی گیان - ئادەم یەکەم کەس نەبووە کە نیشتەجێی زەوی بوبێت - ڕوانینی زانست بۆ ماددەی مرۆڤ - وانەیەك بۆ خوپاراستن لەخراپە. )

## ڕێزلێنانی مرۆڤ

یەکێك لەو تیرو توانجانەی لەئیسلام دراون ئەوەیە گوایە ڕێزی لەمرۆڤ نەناوەو پلەو پایەشی بەرز نەکردۆتەوە، هەروەك لەکتێبی "شارستانێتی ی ئیسلام"ی خۆرهەڵاتناسی نەمسایی (ج. أ. گرۆنباوم)دا هاتووە کە نووسەر دەڵێت: (ئیسلام لەسەرەتای سەرهەڵدانی یەوە دانی بە ڕێزی مرۆڤ دانەناوە تەنها بەنەختێکی دانەبێت. قورئانیش دەیەوێت مرۆڤ بەو قەناعەتە بگەیەنێت کە بەچاوی سووك سەیری بنەڕەتە جەستەیی یەکەی خۆی بکات). هەر کەسێك بەوردی سەرنج لەم وتەیەی -گرۆنباوم- یان هەر وتەیەکی هاوشێوەی بدات دەبینێت، کە بەسەرهاتی ئادەم لەقورئان دا ولە سەرەتایەوە تا کۆتایی ی بەسەرهاتەکەی، وەڵامێکی تەواوە بۆ ئەو جۆرە تیرو توانجانە، قورئانی پیرۆز بە ڕاددەیەك لە پلەوپایە و قەدری مرۆڤی بەرزکردووەتەوە، کەهیچ فەلسەفەیەك، یان ئاینێك، یان هیچ ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی بەو ڕاددەی ڕێزلێنانە نەگەیشتووە، سەبارەت بەو توانجەی دیکەش، کە گوایە قورئان دەیەوێت مرۆڤ قانع کات بەوەی سووکایەتی بەبنەڕەتە جەستەیی یەکەی بکات، ئەوە هەر خودی ئەو کەسە، کە بەوردی سەرنج لەقورئان دەدات دەبینێت چۆن قورئان مرۆڤ لەلاوازی و بێدەسەڵاتی خۆی ئاگاداردەکاتەوە، چونکە سەرنجی بەلای ئەو ڕاستی یەدا ڕادەکێشێت کە لە خۆڵ یان لەقوڕ یان لە ئاو(نطفة) دروست کراوەو زانستیش دانی بەم ڕاستی یەدا ناوە. قورئان بۆیە ئەم ڕاستی یە بەبیر مرۆڤ دەخاتەوە تاکو ئارەزووی لەخۆبایی بوونی لێ دابڕنێت و بەم پێیەش لەسنووری خۆی تێ نەپەڕێت و وای لێ بێت باوەڕ بەخودای خالقی نەهێنێت و لەتاواندا ڕۆبچێت و خۆی لەسەروو هەموو ئەوانەی دەوروبەریەوە دابنێت.

خودای مەزن لەبەسەرهاتی ئادەم دا هەواڵی ئەوەی پێداوین، کەبۆیە مرۆڤی خەلق کردووە، تاکو جێنشینێك بێت لە سەر زەوی و ئاوەدانی بکاتەوەو گیان بەبەر شتە بێ گیانەکانی دا بکات و بیانجووڵێنێت و ماددەو کەرەسە خاوەکانی بەکاربێنێت و جوانکاری و داهێنانیان تێدا بەدی بێنێت و بەم ڕەنگەش، تا بەرزترین ئاست خۆی پێش خات پێیان ...﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ هاوکات لەگەڵ ئەم هەواڵەدا ڕووی گفتار لەنەوەی ئادەمی دەکات ودەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾، واتە (هەر خودایە کە هەموو شتێکی پێویست و تایبەتی بەژیانتانی لەزەوی دا بۆ خولقاندوون. گومانیشی تێدا نی یە کە خودا هەموو ئەو ئامێرو کەرەسەو شت و مەکە پێویستانەی سازکردووە کە ڕێگا بۆ مرۆڤ خۆش دەکەن لەکاری جێنشینیی ی دا، ناوی هەموو ئەو کەرەسەو ئامرازانەشی فێرکردووە: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ﴾ واتە: (خودا ئەو شتانەی فێری ئادەم کردو پەرەی بەمیزاج و بەهرەو هۆیەکانی زانینی ڕاستی یەکانی داو ناووسیفەتی هەموو ئەو شتانەی بۆ دیاری کرد کە ئاتاجی پێ یان دەبێت).

دوای ئەمە دیمەنێکی تری ڕێزلێنانی -ئادەم-ی مرۆڤمان دێتە بەرچاو، ئەویش فەرمان کردنی خودایە بە فریشتەکان(ملائکة)، کە کڕنووشی ڕێزی بۆ بەرن وەك سڵاولێکردنێکی بەشکۆیانەو بەگەورەدانان نەك کڕنووشی پەرستنی و بەندایەتی بۆ کردنی. ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ ﴾.. دیارە لەکاتی باس کردنی بەسەرهاتی ڕێزلێنان لەئادەم دا هەمان ڕێزو تەقدیر کە لەئادەم نراوە لەنەوەکانیشی نراوە. خودا لەم بارەیەوە فەرموویە: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَـٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَـٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَفَضَّلْنَـٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾الأسراء/٧٠..

واتە: (بێگومان ئێمە ڕێزمان لەنەوەکانی ئادەم ناوەو هەموو کەرەسەو ئامرازێکی هەڵگرتن و گواستنەوەیمان لەوشکانیو دەریادا بۆ فەراهەم هێناوەو لەخۆراك وخواردەمەنی باش ڕۆزیمان بۆ تەرخان کردووەو بەسەر زۆربەی مەخلوقاتی تریشمان دا ڕێزو -فضل-مان پێداوە).

کەوا بوو لەم ئایەتەدا ڕێزو تەقدیر بۆ هەموو تاکێکی گرۆی ئینسانی دیاری کراوە، چونکە خودا بە (بني آدم) ناودێریان دەکات... واتە: (ئادەمیزاد)، یان (نەوەی ئادەمی)... ئیدی جیاوازی لەنێوان ڕەگەزێك و ڕەگەزێکی دیکەدا نی یە، هەروەك لەنێوان ڕەنگ و ڕەچەڵەکیشیان دا نی یە، سپی پێست بن، یان ڕەشپێست، ئاری بن یان سامی تەنانەت لەنێوان نێرومێ و بەهێز و لاوازیش دا جیاوازی نی یە.

هەروەها وردبەرەوە لەم ڕستەیەی نێو ئایەتەکە ﴿ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ﴾ ئەمە وێنەگرتنێکی دیمەنی پایەبڵندی یە ومرۆڤیش لەهەر شوێنێك دابێت خزمەت کراوە، چونکە خودا هۆی گواستنەوەو هات وچۆکردنی لەوشکانی و دەریادا بۆ بەیدەست کردووە. ئەوە بوو لە ڕابردوودا ئاژەڵان بۆ وشکانیو پاپۆری بچووك بۆ نێو دەریا ئامرازی گەیاندن و گواستنەوە بوون. بەڵام ئەمڕۆ ئێمە وشەی (حملناهم)ی ئایەتەکە لەسەر ڕووبەرێکی فراوانتری واتاکەی دەبینین و زیاتر لێی تێدەگەین، ئەویش بەو سرووش و ئیلهامەی کەخودا بەمرۆڤی بەخشیوەو بەهۆیەوە توانیویە فرۆکەو شەمەندەفەرو ئۆتۆمبێل و کەشتی ی گەورە دروست بکات. پاشان وردبەرەوە لەم ڕستەیەی تری ئایەتەکە ﴿ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ﴾ ئەمەش وێنەگرتنێکی ئەو ئاستە باڵایەی مرۆڤە لەچۆنیەتی خۆراك و خواردنەوەی دا، هەروەها فەرمایشتەکەی تری خوداش ﴿ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾ ڕوون کردنەوەیەکی جوانی شان و شەوکەتی مرۆڤە کە ڕێزو -فضل-ی بەسەر هەموو گیانەوەران و مەخلووقاتی دیکەدا هەیە.. بەم ڕەنگەش هەستکردنی مرۆڤ بەو ڕاستی یەی کە جێنشینی خودایە لەسەرزەوی و فریشتەکانیش کڕنووشیان بۆ بردووەو شایستەی ڕێزلێنان بووەو شکۆو -فضل-ی بەسەر زۆربەی مەخلووقاتی خودادا دراوە، گرنگترین هاندەرن بۆی لەسەر بەرزبوونەوەی گیان و کەڵك وەرگرتن لە ئامرازە هێزبەخشە ئاکاری و ڕەوشتی یەکان. ئیتر ئەمە لەکوێو ئەو فەلسەفە تازە داتاشراوو نامۆیانە لەکوێ کاتێك بۆ مرۆڤ دەڕوانن بەچاوی بەدبینی و ڕەشبینی یەوە سەیری دەکەن و بەنەگبەت ترین و بەدبەخت ترین مەخلوقی لەقەڵەم دەدەن و ڕەچەڵەك و بنەچەی بۆ جانەوەرێکی بێزراو یان کرمێکی پیس دەگێڕنەوە، کە لەزبڵخانەی ژیان دا گوزەران دەکات هەروەك (سارتەر) گومان دەبات و وا دەڵێت... یان وەك (نیتشە) دەڵێت، کە گوایە مرۆڤ مەیمونێك بووەو خودا خولقاندوویەتی بۆ ئەوەی لەژیانە ئەبەدی یە درێژو جەنجاڵی یەکەی دا گەمەی پێبکات.

دیارە ئەم ڕوانینە دەردەدارانە هەموو ئومێدێك لەناخی مرۆڤ دا دەکوژێت و دەیکاتە نیشانی تیرەکانی بێئومێدی و ڕەشبینی، لەکاتێکدا ڕوانینی قورئان بۆ مرۆڤ هەموو ئاوات و خواست و شکۆیەکی تێدا دروست دەکات و وای لێ دەکات هەست بە واتا بەرزەکانی سەربەرزی و ئابڕوومەندی بکات.

## ئاکامی لوتبەرزیی

هەر لەو بەسەرهاتەی -ئادەم-ەوە وانەیەکی تر وەردەگرین دەربارەی دوورکەوتنەوە لەسیفەتی لووتبەرزی و خۆ لێ لادانی، ئەویش دوای ئەوەی کە خودا ئاکام و دەرەنجامەکەی بۆ

دیاری کردووین، چونکە -ئیبلیس- کاتێك خۆی بەگەورە زانی و ملی بەفەرمانی خـودا نـەداو سەری بۆ کەچ نەکرد، خوداش لەبەهەشت دا بەسەرشۆڕی دەری کرد، هەروەك فەرموویە: ﴿ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾الأعـــراف/١٣. واتـە (دەبـڕۆ دەرەوە لە بەهەشت چونکە بۆت نی یە لووتبەرزو خۆبەزلزان بیت تیای دا، لەبەر ئـەوە دەبێـت لێ ی دەرچـیت وئـیتر تـۆ لەڕیـسواکراو و سەرشـۆڕەکانیت). لـەم ڕووەوە پێغەمبـەریش ﷺ فەرموویە ((مَنْ تَوَاضَعَ للهِ رِفَعَهُ وَمَنْ تَكَبَّرَ وَضَعَهُ اللهُ)).. واتە (هەر کەسـێك لەبـەرخودا خـۆ بەکەم گرو لەخۆبووردوو بێت ئەوا خوداش لە پلـەو پایـەو ڕێـزی بـەرز دەکاتـەوە، بـەڵام هـەر کەسێك خۆی بەگەورە دانێت خوداش بچووك و سەرشۆڕی دەکـات). هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ لەشیکارو لێکدانەوەی واتای لووتبەرزی وکیبر وخۆبەزل زانین دا فەرموویـە: ((الْكِبْرُ بَطْرُ الحَقِّ وَغَمطُ النَّاسِ))اخرجه مسلم.. واتە (لووتبەرزیو خۆبەزل زانین لادانە لە هەق و ماف پێـشێل کردنەو بەسووك سەیرکردنی خەڵکیشە).. لـەو فەرموودەیـەدا وشـەی (غمـط النـاس) مانـای بەکەم گرتنی خەڵك و کەم کردنەوەی ڕۆڵ و وزەو ڕێزیان دەگەیەنێت، کەوا بوو (کیبر) و خۆبەزل زانی (لەسەر ئەم پێوەرە) خۆپەسندی و من گەرایی یەکی وەهاشـە کـە خاوەنەکـەی دەیـەوێت خۆی بە پەرستراوێکی سەر زەوی بچوێنیت و مل بەهەقێك نەدات و ئامۆژگاریش لەکەسێکەوە وەرنەگرێت. چونکە بە (ئیدیعای خۆی) نایەوێت سەر بەکەسێکی تر بێت یان لـەژێر فـەرمان و ڕاسپاردەی لەخۆی بەرزتردابێت. بەم پێیەش ستەمکارێکی بەزەبرو زەنگیشە دەرهەقی هەموو ئەو کەسانەی کە لەژێر دەستی دا دەبن و کە هیچ ڕێزو خێرو بێرێکیـشیان پـێ ڕەوا نابینێـت، چونکە خۆی لەوان بەشایستەتری هەموو ئەو ڕێزو خێرو بەرژەوەندییانە دادەنێت.

هەر بۆیەش لەقورئان دا ئاکامێکی سەخت و دژوار بۆ لووتبەرزی و کیبر دانراوە، چـونکە بابای خۆ بەزل زان لەخوداوە بێزراوە: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡتَكۡبِرِينَ ﴾.. واتە (بێگومان خـودا کەسانی خۆبەزل زان و لووتبەرزی خۆش ناوێت) بەمانای ڕقی لێ یانەو دیارە گەر خوداش ڕقی لەهەر کەس و تاقمێك هەبێت چارەنووسیان خراپ دەبێـت، هـەروەها ئـەم ڕەوشـتە ناپەسـندە سزایەکی سەختی لەبەرامبەردا هەیە جگە لەوەش کە لەکۆمەڵی باوەڕداران دەردەکرێت بۆ نێـو کۆمەڵی نەفرەت لێکراوان...

لەبەر ئەمەشە خودا بەم شـێوەیە ڕووی هەڕەشـە لـە "ئیبلیس"ی خۆبـەزل دانـەر کـردو فەرمووی: ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ص/٧٧-٧٨. واتە: (ئەی ئیبلیس لەبەهەشت بڕۆ دەرەوە چونکە ئیتر تۆ لەهـەموو خێـرو کەرامـەتێك دابڕاویـت و تاڕۆژی سزاو لێپرسینەوەی ئاخیرەتیش نەفرەتی منت لەسـەرە). هـەروەها لووتبـەرزی دەبێتـە هۆی کەم بوونەوەی عەقڵ. لەم بارەیەوە (ئیمام جعفر ـ ی صادق) خودا لێ خوشبێت گوتوویـە:

(گەر چەندێك لەسیفەتی لووتبەرزی بچێتە دڵی مرۆڤەوە بەو ڕادەیەش لەعەقڵی کەم دەکاتەوە).

## داوایەك بۆ شکۆمەندیی گیان

لەبەسەرهاتەکەی ئادەم دا داوایەك لەمرۆڤ کراوە بۆ شکۆمەندیی گیان و زاڵ بوون بەسەر هۆکارەکانی خراپە لەنێو دەروونی دا، چونکە خودا لە ڕۆحی خۆی بەئادەمی بەخشیوە: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾.. ئینسان هەروەك ـ قورئانیش ئاماژەی بۆ کردووە- لەماددەیەك دروست کراوە، کە قوڕەو لەلاشەی مرۆڤدا خۆی دەنوێنێت، لە ماسولکەکانیو ئەندامەکانی لەشی و لە گۆشت و خوێنی دا.. زانستیش دانی بەوە داناوە کەلاشەی مرۆڤ لەهەموو ئەو ئۆرگان و ماددانە پێکهاتووە کە لاشەی زەوییان لێ پێك دێت. پێکهاتنی مرۆڤ لەماددە چەند فاکتەرێکی لێ دەبێتەوە، وەك هۆگریی مرۆڤ بەخود(ذات)ـە مرۆڤی یەکەیەوە بۆ حەزکردنی لەخۆراك و خواردنەوەو پۆشاك و نیشتگەو ماڵ و سامان و پلەوپایەو چالاکی ی جنسی. هەروەها مرۆڤ لەسروشتی مادەکەیەوە پەل دەهاوێت بۆ ئازاردان و لێدان و کوشتن و تۆڵەسەندنەوە و خوێن سەندن و خۆ زاڵکردن و گەورەبوون. جا وەك چۆن مرۆڤ لەو ماددەیە دروست بووە بەڵام ڕازی فوو(نفخة)یەك لە گیانی خودا(روح الله) بەبەردا کراوە﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى ﴾... گیان بەبەرداکردنی مرۆڤ (نفخ الروح) ڕازو نهێنی یەکە لەلایەن خودا خۆیەوە، کە لەمرۆڤ دا دانراوە تاکو بیبات بەرەو باوەڕهێنان بەخودای خەڵقەندەی و بۆ سوپاسگوزاریی و گەڕانەوەش بۆ لای. هەروەها بانگیشی دەکات بۆیەدی هێنانی ئیرادەی خودا لەم دنیایەداوخۆڕازاندنەوە بەئاکاری بەهادارو جوانی وەك دادگەری و ڕاستگۆیی و چاکەکردن و خۆشویستنی هەق و چاکە. خوداش دەربارەی بەندە باوەڕدارەکانی دەفەرموێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾ المجادلة/٢٢.. واتە (خودا بەرۆحی خۆی کە ڕووناکی یەکە ودەیخاتە دڵی باوەڕدارانەوە ئیمان و باوەڕ لەدڵیاندا جێگیرو بەهێز دەکات).. مەبەست لەگیانە، کە (ڕۆح)یش تەنها ئەو ژیانە نی یە کە بەهزری مرۆڤ دابێت چونکە ژیانی زیندوێتی ئەندازەیەکی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵیشە. کەوابوو ئەوە پلەی شکۆمەندی و گیان بڵندییش نی یە گەر گیانەکە تایبەت بێت بەژیانی زیندوێتی(حیواني)یەوە و خوداش فەرمانی بە فریشتەکان نەدەکرد کە کڕنووش بۆ مرۆڤە گیان بەبەرداکراوەکە (ئادەم) ببەن.. هەروەها

لەقورئانیش دا باسکردنی گیان بەبەردا کردنەکە بەمەبەستی دەسپێکردنی ژیانی زیندەوەری لەبەدەن دا نی یە. چونکە ئینسان لە-چەمکی قورئان-دا بەفیطرەتی خۆی "ماددی و ڕۆحییشە" و (ڕازی ئیمان بەخوداو گەڕانەوە بۆ لای خوداو شکۆی ڕەوشتمەندی)[1]ی لەگەڵ (خۆ پەلکێش کردن بۆ زەوی و سەرکردنە سەر تام وچێژی زیندەوەرێتی ی)دا کۆکردووەتەوە.

لەم باسەی پێشووەوەو لەو چەمکەی قورئانەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە باوەڕو ڕەوشت (ئیمان و ئەخلاق) لەگشتگیرترین واتاکانیان دا شتێکی دابڕاو لەمرۆڤ نین هەروەك شتێکی واش نین کە لەدەرەوەی قەوارەکەیەوە بەسەری دا سەپێنرابێت، بەڵکو هەردووکیان (واتە باوەڕو ڕەوشت) لەقووڵایی فیطرەت(سروشت)یەوە سەرچاوە دەگرن، ئەویش بەهۆی ئەوەی خودا لەڕۆحی خۆی بەبەرداکردووە. هەر لەمەشەوە جودایی و پێچەوانەیی ی قورئانمان لەبۆچوونە گەندەڵەکەی (دۆرکایمی جوولەکە)وە بۆ ڕوون دەبێتەوە کە-دۆرکایم-دەڵێت: (بێگومان کۆمەڵەی ڕێسا ڕەوشتی یەکان هیچ وجودێکیان لەخودی خۆیان دا نی یە)، هەروەها پێچەوانەبوونی قورئانمان لەگەڵ تەفسیرە مەتریالی یەکەی مێژووش دا بۆ ڕوون دەبێتەوە، (کە ئەو تەفسیرە ماددەگەرایی یە) دەڵێت: (بێگومان بەها ڕەوشتی یەکان شتێك نین، کە لەقەوارەی مرۆڤەوە سەرچاوەیان گرتبێت، بەڵکو ڕەنگدانەوەیەکی ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و مەتریالی یەن کەمرۆڤی تیادا دەژی و لەدەرەوەی قەوارە مرۆیی یەکەیەوە بەسەری دا سەپێنراوە). جودایی و پێچەوانەبوونی قورئان لەگەڵ ئەم ڕێبازە مەتریالیانەدا مەسەلەیەکی سەیرو نامۆ نی یە، چونکە لەڕاستی دا ئەو جۆرە لێکدانەوانە بەبۆچوونی خۆیان سروشت و فیطرەتە چاکەکەی مرۆڤ و هەڵس وکەوتیشی دەڕوخێنن، چونکە لەسەر بناغەی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی زیندەوەری و حەیوانیانەیە بۆ ئەو مرۆڤەی، کە ڕیچکەی -داروینیزم- ڕەچەڵەکەکەی بۆ حەیوان دەباتەوەو لەزۆربەی ڕێبازە ئەورووپی یەکانی سەدەی نۆزدەش و بنەماکانی سەدەی بیستەمیان دا پەیڕەو کرا. ئەم تەفسیرە داروینی یەش مرۆڤ لە- مرۆڤایەتی یەکەی خۆی دادەبڕێت و لە نێو چاڵە هەرە قووڵەکانی حەیوانێتی دا نغرۆی دەکات.

## "ئادەم " یەکەم کەس نەبوو کە نیشتەجێی زەوی بوبێت

ئایینی ئیسلام لەهیچ ماوەو سەردەمێکی دا دژی زانست و بەتاڵکەرەوەی نەبووە بەڵکو هەمیشە ئامێزی بۆ بڕیارو دەسکەوتەکانی کردۆتەوە. زانستی (ئەنثرۆپۆلۆژیا)ش باسی ئەوە دەکات کە لەپێش -ئادەم-دا چەندان جۆری تر لە مرۆڤ لەسەر زەوی نیشتەجێ بوون. لەمەشدا

---

(١) هەر لەقورئان دا جەخت لەسەر ئەم ڕاستی یە کراوە کە خودا تیای دا فەرموویە: ﴿فأقم وجهك للدين حنيفاً فطرة الله التي فطر الناس عليها﴾.

پشتیان بەستووە بەلێکۆلینەوەو پشکنینی ئەو کەللەسەرو ئێسقانە ڕەق بووە لەبەردچوانەی کەلە سەرانسەری دنیادا دۆزراونەتەوەو بەمەزەندەی زانایان تەمەنی هەندێکیان بۆ یەك ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگێڕنەوە و هەندێکی تریشیان بۆ سێ چارەکە ملیۆن و هەندێکی دیکەیان بۆ کەمتر لەو تەمەنە دەگێڕنەوە.

بۆ نموونە مرۆڤی (جاوە) بەکۆنترین مرۆڤی چاڵنشین دانراوە، دوای ئەویش مرۆڤی (بەکین)و ئینجا مرۆڤی (سۆلۆ)و، پاشان مرۆڤی (بیلتداون) و دوای ئەویش (هێڵدبرج) و پاشان مرۆڤی (ڕۆدیسیا). لەکۆتایی ئەم پۆلێنکاری یە زەمەنی یەی جۆرەکانی بەشەردا مرۆڤی (نیانـدەرتاڵ) دێت کە وا پێ دەچێت باپیرەی ڕاستەوخۆی مرۆڤی عاقڵ بوو بێت، ئەم جۆرەی دوایش لەماوەی نێوان (١٣٠٠٠٠) ساڵ تا (٧٠٠٠٠) ساڵ پێش زایین ژیاوەو لەزۆر شوێنی دنیاش دا بڵاوبوونەتەوە.

قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە لەپێش ئادەم دا مرۆڤ هەبووە، هەروەك لەم فەرمایشتەی خوادایە ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾، بۆ مانای وشەی (خلیفة) لەم فەرمایشتەی نێو قورئان دا زانایانی تەفسیر دوو بۆچوونیان هەیە:

یەکەم/ بەر لە خەلق کردنی ئادەم کۆمەڵێك، یان پتر لەکۆمەڵێك لەجۆری مرۆڤ هەبووە، بەڵام قڕیان تێکەوتووە، چونکە خراپەو فەسادییان لەسەر زەوی کردووەو خوێنی یەکتریان ڕشتووە. جا بۆیە فریشتەکان کاتێك هەواڵی دروست کردنی مرۆڤی جێنشین(خلیفة) لەخوداوە دەبیستن یەکسەر سەرسام دەبن، چونکە وایان گومان دەبرد، کە جێنشینەکە دەبێت هەر لەو مرۆڤەی ئەوسای سەرزەوی بچێت و لەسەر تەرزو هەیئەتی ئەوەی پێشوو بێت، هەر بۆیەش گوتبوویان ﴿..قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ..﴾ البقرة/٣٠...واتە: (ئایا ئەو مرۆڤەی تێدا نیشتەجێ دەکەیت و دەیکەیتە جێنشینی خۆت کە خراپەو بەدکاری ی تێدا دەکات و خوێنی ناڕەوای بەستەم و دوژمنکاری تێدا دەڕێژێت، لەکاتێك دا ئێمەی مەلائیکەت بەپاك و بەرزو بێ خەوش ڕاتدەگرین و بەپیرۆزو گەورەت دادەنێین و بەدوورت دەگرین لەهەر ڕواڵەتێك، کەشایانی مەزنی و سەروەریت نی یە؟!).

دووەم/ بۆچوونی دووەمی زانایانی تەفسیر لەسەر وشەی (خلیفة)ی نێو ئایەتەکە ئەوەیە" خودا بۆیە ناوی (خلیفة)ی لێ ناوە تاکو خەلافەتی خودا بکات (واتە جێنشینایەتیی بکات لە حوکم و فەرمانڕەوایی ناو خەڵکی داو مافی هەڵسوکەوتیشی لەسەر زەوی و باڵادەستی بەسەر مەخلووقاتی تردا پێداوە. بەم ڕەنگە دەبینین چۆن قورئان شان بەشانی لێکۆلینەوەکانی ئەو

زانستە دەڕوات کە هەواڵی بوونی کۆمەڵێك لەبەشەرمان لەپێش دروست کردنی ئادەم دا پێ دەدات کەلەسەر زەوی نیشتەجێ بوون و دواییش قڕیان تێ کەوتووە.

## ڕوانینی زانست بۆ ماددەی مرۆڤ

قورئان باسی ئەو ماددەیەشی بۆ کردووین، کە ئادەم و نەوەکانی لێ دروست کراون. ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾، لەم ئایەتەدا (طین)-قوڕە-کە بنەڕەتی ئەو شتەیە، کە مرۆڤی لێوە دروست بووە، وێرای ئەوەش قوڕەکە بەچەندین قۆناغ دا ڕۆشتبێت تاکو مرۆڤەکەی لێوە پەیدابووە. قوڕ(طین)یش وەك زانراوە لە خۆڵی تێکەڵ کراو بە ئاو گیراوەتەوە. خودای مەزن فەرموویە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ مەبەست لە (حمأ مسنون)یش ئەو قوڕە ڕەشەیە، کە بۆنەکەی دەگۆڕێت. (بیضاوي) لەتەفسیرەکەی دا دەڵێت: (ئەو قوڕە گۆڕاوە ڕەش داگەڕاوەیە، کە بەهۆی درێژخایەنی ی ئاوەوە لەسەری ڕەش بووەتەوە. قورئان بەڕاشکاوی دەڵێت: کە خەلق کردنی ئینسان و بنەڕەتیشی لەخۆڵ و ئاوە. خەلق بوونی ئینسانیش لەخۆڵ مەسەلەیەکەو واقیع پشتگیریی دەکات و زانستیش دانی پێدادەنێت. بۆ نموونە گەر پارچەیەك لەلاشەی مرۆڤ بگریت و چەند کردارێکی شیتەڵ کاری ی بەسەردا ئەنجام دەیت دەبینیت پێك هاتووە لەهەمان ئەو ئۆرگان و ماددانەی، کە خۆڵی زەوی لێ پێك دێت. هەروەها جگە لە خۆڵ دەربارەی ئاوەکەش زانایانی زیندەوەرناسی لەو باوەڕەدان، کە ژیان لەناو ئاوی سوێری ئۆقیانووسەکانی زوودا دروست بووە، بەڵام چەند کەسێکی کەم لەو زانایانە لەسەر بیردۆزەیەکن، کە دەڵێت: ژیان لەناو ئاوی شیرین دا دەست پێکراوە. ژیان تەنها لەنێو ئاودا دەست پێ نەکراوە، بەڵکو بەبێ ئەوەی (زۆر لە وردبینی ی زانستیانە) لابدەین دەتوانین بڵێین، کە ژیان هەرگیز لەنێو ئاودا دەستی پێ نەکردووە، چونکە هەموو شێوەکانی ژیان بەهۆی (پرۆتۆپلازم)ەوە بەردەوام دەبن و مومارەسەی چالاکی خۆیان لەناوی دا دەکەن. یەکێك لەفەرهەنگەکانیش (پرۆتۆپلازم) بەوە پێناسە دەکات، کە (ماددەیەکی شیرینی ئاوی ی نیو شلەیی یەو بەبناغەی یەکەمی ئەو ژیانە سروشتی یە دادەنرێت، کە هەموو زیندەوەرە گیانلەبەرەکانی تری لێوە گەشە دەکەن) ئەو ماددانەش، کە (پرۆتۆپلازم)یان لێ پێك دێت لەئاودا دەتوێنەوە یان پێوەی دەنووسێن، چونکە ئاو شتێکی بنچینەیی یە بۆی.. پرۆتۆپلازمیش شتێکی بنچینەیی یە بۆ ژیان. ژیان و ئاویش لەم هەسارەیەدا دوو شتی پێکەوە لکاوو هۆگری یەکترن هیچیان لەوی تر جیانابێتەوە، خوداش

ئامـاژەی بـۆ ئـەم ڕاسـتی یـە کـردووەو فەرموویـە: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ..﴾ الأنبياء/ ٣٠.. واتە (ئاومان وا لێ کردووە کە هەر شتێك لەدنیادا ژیان و هۆی ژیانی تێدا بێـت بەوەوە پەیوەست و زیندووبێت).

## وانەیەك بۆ خۆپاراستن لەخراپە

لەم چیرۆکەدا خودای مـەزن هـەواڵی دوژمنایـەتیکردنی "ئیبلـیس" بەرامبـەر باوکمـان "ئادەم" پێ دەگەیەنێت، هەروەك ڕوونیشی کردۆتەوە کە چۆن هەڵی خەڵەتانـدووە بـە خـواردن لەو درەختەی کە نەدەبوو هەر لێیشی نزیك بێتەوە، کەچی بەوە خستی یە ناو هەڵەو سەرپێچی کردن لەفەرمانی خودایەوەو بەدرۆ و فرِوفێڵ وای لێ کرد لەبەهەشت دەربکرێـت، ئـەویش وەك سزایەك بۆ سەرپێچی کردنی لەفەرمانی خودا. بەڵام لەوکاتەوە دوژمنایەتی یەکەی (ئیبلـیس) بەرامبەر -ئادەم- بەردەوام بووەو نەبڕاوەتەوە.. تاڕۆژی ئاخیرەتیش لەدژی نـەوەکانی-ئـادەم- بەردەوام دەبێت..

هەر بۆیە خوداش نەوەکانی ئادەم لەفێڵ وتەڵەکەی شەیتان ئاگاردەکاتـەوە:﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ ..﴾ الأعراف/٢٧.. واتـە (هـۆ نـەوەکانی ئادەم وریابن شەیتان گومڕاتان نەکات و تەفرەتان نەدات، وەك چۆن باوك و دایکتان -ئـادەم و حەوا- ی فریوداو لەبەهەشت دەری پەڕاندن).

دیارە شەیتان بەو جۆرە ئادەم و حەوای لەبەهەشت دەرپەڕاندووە کە بـەهۆی فریودانیانـەوە خستبوونیە بەر سزای خوداو لەبەهەشت دەری کردن. وەك لەمەوپێشیش باسمان کرد خـودا لـە ڕۆحی خۆیی ی کردووە بەبەر ئادەم داو بەم ڕەنگەش مرۆڤ ڕەوشـتەکانی چـاکەو دادپـەروەری‌و خێرخوازیی ی تیادایە. بەڵام کەوتۆتە بەر ئەگەری فریودانی ئەو شەیتانەی کە هەوڵ دەدات ئەم ڕەوشتە بەرزانەی داپۆشیت و بەرەو خراپەی ببـات. لەمـەوە نـاکۆکی ی نێـوان چـاکەو خراپـە (خێرو شەڕ) لەمرۆڤ دا دروسـت بـووەو ئەمـەش تـاقی کردنەوەیەکـە بـۆی و هەڵـسەنگاندنی ناخیەتی. جا ئەگەر مرۆڤ بەرامبەر هەواو ئارەزووەکانی دەروونی بووەستێت و بەسـەریاندا زاڵ بێت ئەوا بەنیعمەت و ڕەزامەندیی خودا شاددەبێت و دەچێتە بەهەشـتەوە. بـەڵام گـەر خـۆی بدات بەدەم هەواو خراپەوە دەبێت بەیەکێك لەزەرەرمەندان.

لێرەشدا وا باشە نەختێك دەربارەی (شەیتان و وەسوەسەکانی و کاریگەریی ی لەسەر مرۆڤ) بدوێین، تاکو خوێنەری بەڕێز سڵی لێ بکاتەوەو جیهادی نەفسی خۆی بکات و ئیتر بگاتە پلەی شکۆمەندیی گیان و سەروەریی ڕۆح، کە بەختەوەریی دنیاو قیامەتی ی تێدایە.

## سروشتی ئیبلیس و شەیتانەکان

(ئیبلیس) باوکی هەموو شەیتانەکان و یەکەم ڕەگەزیشیانە. ئەو خۆیو نەوەو وەچەکانی ئەو هەڵگەڕاوانەن کە سەر بەجیهانی جنۆکەن"جن".. هەروەك خوداش لەبارەیانەوە فەرموویە: ﴿ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ ﴾الكهف/٥٠..واتە (تەنها-ئیبلیس- کەلەکۆمەڵەی -جن- بوو کڕنووشی ڕێزی بۆ ئادەم نەبردو لەفەرمانی خودای خۆی دەرچوو).

(جن) جورێکن لەو ڕۆحە عەقڵدارە نادیارو یاخی یانەی، کە وەك مرۆڤ بەگوێڕایەڵی و بەندایەتی ڕاسپێرراون، بەڵام لە (ماددەی بەشەری) دابڕراون و بەر هەستەکانی مرۆڤ ناکەون و بەشێوەی خۆیان نابینرێن و بەوێنە ڕاستەقینەکەشیان بەرچاوی مرۆڤ نەخراون. خودا لەبارەی (ئیبلیس)ەوە فەرموویە: ﴿ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡ[1] ﴾الأعراف/٢٧. واتە (ئیبلیس خۆی و کۆمەڵەکەی بەنەوەو سەربازانیەوە دەتانبینن، بەڵام ئێوە نایانبینن).

هەروەها-جن-یش لەئاگر دروست کراون، ﴿ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ[2] ﴾ الحجر/٢٧. واتە (جن-یشمان لەوەوپێش بەر لەدروست کردنی ئادەم لەئاگرێکی گەشی بێ دووکەڵ دروست کردووە).. هەروەها لەچیرۆکەکەی قورئان دا (ئیبلیس) ڕوو دەکاتە خوداو دەڵێت: ﴿خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ ﴾. واتە(منت لەئاگر دروست کردووە).(جن) چەند دەستەو تاقمێکی جۆراوجۆریان هەیە، لەنێویان دا چاکەخوازو خواپەرست هەیە، هەروەك گومڕاو بێباوەڕیشیان تێدایە..﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدٗا[3] ﴾الجن/١١..

---

(١) بێگومان ئێمە کە جن و شەیتانەکان نابینین مانای ئەوە نییە کە ئیتر وجودیان نەبێت، چونکە لەسروشت دا زۆر شت هەیەو لەهەستەکانی مرۆڤیش نادیارن، زانایانیش گەیشتوونەتە ئەو ڕاددەیەی هەندێك لەو شتە شارراوانە لەماوەیەکی کەم لەمەوبەرەوە بدۆزنەوە وەك میکرۆبەکان و کارەباو چەندان شتی تر. جا ئایا ئەو شتانە لەوەوبەر نەبوون و ئەو کاتە هاتوونە وجودەوە کە مرۆڤ دۆزیانەوە؟ نەخێر.. هەرگیز هیچ مرۆڤێکی عاقڵ وا نالێت.. دیارە هێشتا چەندین شتی دیکە ماون و مرۆڤ نەی دۆزیونەتەوەو بەنهێنی یەکانی نەگەیشتووە. جن و شەیتانەکانیش لەو جیهانە نادیارانەن کە قورئانی پیرۆز هەواڵی وجودیانی پێ داوین. هەریەکە لەم دووانەش (جن وشەیتان) لەو بوونەوەرانەن کە نەکەوتوونەتە ژێر هەستەکانی مرۆڤەوە. واتە هەستەکانی (بینین و بیستن و بۆن کردن و دەست لێدان و.. هتد).

(٢) نار السموم: بەبلێسەی گەشی ئاگرێك دەگوترێت کە دووکەڵی نەبووە گوتراویشە (دۆزەخ) چەند کونێکی بچووکی هەیەو لەو کونانەشەوە ئاگر دەردەچێت. (وەرگێڕ).

(٣) طرائق قددا: واتە چەند ڕێچکەیەکی هەمەچەشن و لێك جودا.

## شەیتانەکان دوژمنانی مرۆڤن

-ئیبلیس- چ خۆی و چ ئەو شەیتانانەی کە لەگەڵی دان ئەو دوژمنە سەرسەختانەی مرۆڤن کەبەردەوام خوویان گرتووە بەزیادکرن و بەهێزکردنی هۆوئامرازی خراپەو شەڕانگێزی لە دەروونی ئینسان دا. خودای مەزن فەرموویە: ﴿..وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاءِ وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾البقـرة/ ١٦٨-١٦٩. واتە (خەڵکینە دوای ڕێچکەو ئاسەوارو فەرمانەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنێکی دیارو ئاشکراتانە، هەروەها ئەو بەچرپەو وەسوەسەکانی خۆی هانتان دەدات بۆ بەدکاریو ناشیرینترین کاری خراپ و واشتان لێ دەکات شتێك دەربارەی خودا بیڵێن کە نایزانن). خودای پەروەردگار بۆ هەر مرۆڤێك شەیتانێکی داناوە کە وەسوەسەی بۆ دەکات. واتە (لەناخەوە دەروونی دەدوێنێت و خەیاڵی دەخاتە سەر ئەو شتانەی کە هیچ سوودو بەرژەوەندییەکی ڕەوای تێدانییە بۆی) وخراپەشی لەبەرچاو دەڕازێنێتەوەو بەکاری ناپەسندو نالەبار فریوی دەدات، دیارە نەك هەر مرۆڤی ئاسایی، بەڵکو پێغەمبەرانیش هەریەکەیان خودا شەیتانێکی بۆ داناوە، لەو تاقیکرنەوانەیاندا. هەروەك فەرموویە:﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ..﴾الأنعـام/١١٢. لەپێغەمبەریشەوە ﷺ گێراوەتەوە کە فەرموویە: ((**ما منكم من أحد إلا وقد وكل به قرين من الجن. قالوا: واياك يارسول الله؟ قال: وأياي الا ان الله اعانني عليه فأسلم، فلا يأمرني إلا بخير**))رواه مسلم، واتە: (هیچ کەسێك لەئێوە جیانەکراوەتەوە لەوەی کە هاوڕێیەکی لەڕەگەزی (جن وشەیاتین) بۆ دانەنرابێت.. گوتیان: تەنانەت بۆ تۆش دانراوە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: تەنانەت بۆ منیش تەنها بەوە نەبێت کە خودا یارمەتی داوم لەسەری و موسڵمان بوە و تەنها بە خێرو چاکە فەرمانم پێ دەکات).

## شەیتانەکان سەرچاوەی خراپەن لەدنیادا

هەروەها شەیتانەکان بانگکەرانی شەڕو تێکدانن لەسەر زەوی. هەر شەیتانە کە نەفسی مرۆڤ ئارەزووی لە هەرشتێك بێت بۆی جوان دەکات و وخۆشەویستی ی جنس و پلەو پایەشی لەلا بەهێز دەکات، جگە لە خواستی خۆسەپاندن و ستەمکاری و شێواندنیش. هەر شەیتانە کە دوژمنایەتیو ڕق و کینە لەنێو خەڵکی دا پەرە پێ دەدات و برا لە برا جیادەکاتەوە و مێرد لەژن دەکات و تەنانەت هۆزو تیرە و کۆمەڵە هەمەجۆرەکانی نەتەوەی ئیسلامیش لە یەك

دادەبڕێت. خودای مەزن فەرموویە: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ﴾الأسراء/٥٣.. واتە (بەبەندەکانم بڵێ کە باشترینی قسەو گفتاریان هەبێت، چونکە بەڕاستی شەیتان لەڕێی قسەی نابەجێیانەوە نێوانیان تێك دەدات و شەڕو فیتنەو ئاژاوەیان لەنێودا دەورووژێنێت). جا شەیتانیش نێوانی بڕواداران بەوتەی ڕەق و ئازاردەر تێك دەدات کە هەندێك جار لە هەندێك کەسەوە دەبیسترێت بێ ئەوەی هوشیارییەکی هەبێت لەسەر زیان و ئاسەواری ئەو وتە ڕەق و ناخۆشانە. هەروەها نێوانی ئیمانداران بەوەلامی ئەو وتە ڕەق و ئازاربەخشانەش تێك دەدا کە لەبەرامبەریان دا دەگوترێنەوە، ئیدی کەشی سۆزو خۆشەویستی دەبێت بە دوژمنایەتی و ناکۆکی... بەڵام وتەی خۆش وجوان شەیتان دوور دەخاتەوەو زامی دڵانیش سارێژ دەکات.

هەر شەیتانە ئەو بەدگومانی یە دەخاتە دڵی مرۆڤەوە کە گوایە بەیارمەتی دانی هەژاران و دەسگیرۆیی‌کردنیان ماڵ و سامان لەناودەچێت، بەمەش فەرمانی‌بەدەسگرتنەوەو چاوچنۆکی و بەخیلی پێ دەکات و وای لێ دەك ات سووربێت لەسەر بەندکردنی پارەو ماڵی و نەدانی زەکات بەوانەی شایستەو نەدارن.. هەروەك خوداش فەرموویە: ﴿ ٱلشَّيْطَـٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ﴾البقرة/ ٢٦٨. واتە: (بێگومان شەیتان بەوەسوەسەکانی خۆی واتان تێدەگەیەنێت گوایە خەرج کردنی پارەو سامان لەڕێی خێردا دەبێتە هۆی نەمانی سامان و هەژاریتان بۆ پەیدا دەبێت، هەروەها شەیتان بەو وەسوەسانە فەرمانتان بەکاری بەدڕەفتاریو چاوچنۆکی پێ دەکات).

مەی خواردنەوەو قومارکردنیش لەو کردارە هەر گەندەڵانەن کەشەیتان فەرمان بە کردنیان دەکات وسوورە لەوەسوەسەکردنی دا بۆ خەڵکی، چونکە دوو ئامڕازی دیارن لە ئامڕازەکانی سەرپێچیو تێکدان و دوژمنایەتی ی نێوان خەڵکی و لادانیان لە یادو (ذکر)ی خودا.

لەم بارەیەشەوە خودای مەزن فەرموویە: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾المائدة/ ٩٠-٩١

واتە: (بێگومان مەیو قومارو پەرستنی بەردو شتی بەپیرۆز دانراوو بەخت گرتنەوە چەند کارێکی پیس و چەپەڵن لەکاروباری شەیتان و ئێوەش دەبێت لێیان دوورکەونەوە تاکو لەزەرەری دنیاو سزای ئاخیرەتیش ڕزگاربن. بەڕاستی شەیتان دەیەوێت لەڕێی مەی خواردنەوەو قومار کردنتانەوە دوژمنایەتیو ڕق و کینە بخاتە نێوانتانەوەو لەیادی خوداو نوێژەکانتان

دابڕێت. جا ئایا ئیتر دەست لەم کارانە هەڵدەگرن؟) دەست بڵاوی و بەفیڕۆ خەرج کردنی پارەو پوولیش یەکێکە لەسیفەتەکانی شەیتان و فەرمانی بۆ مرۆڤیش پێ دەکات. چونکە دەست بڵاوی دەبێتە هۆی پێنەزانین بەنیعمەت و باوەڕنەمان بە بەخششەکانی خودا، هەروەك فەرموویە:﴿ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴾ الأسراء/٢٧.. واتە (بەبێ‌شك کەسانی دەست بڵاو هاوڕێو هاوڕێبازی شەیتانن، شەیتانیش لەوپەڕی سپڵەیی‌و نکوڵی کردنی نیعمەتی خودا دابووە).

ئەو تێکچوونە جنسیی یەش کە ئەمڕۆ لەدنیادا بڵاوبۆتەوە بەتایبەتیش بەهۆی داهێنانی جل وبەرگی تەنك و تەسکی وەهاوە کە شوێنە ڕووتەکانی جەستەی ئافرەت و جوانی یە سەرنج ڕاکێشەکانی دەردەخات و خەڵکیش بۆ بەدڕەفتاری هاندەدات هەر لەفەرمان پێدانی پەنهانی ی شەیتانن. هەروەها ئەو تێك چوونی ڕەوشتی‌یەی لەجیهان دا بڵاوەو، کە لەئەنجامی کردنەوەی یانەکانی شەوانەو خانەی ڕووت و قووتانەوە پەرەی سەندووەو پیاوان و ژنان تیایان دا بەبێ پۆشاك دەبینرێن و ئەو بەدکاری‌و زیناو داوێن پیسی‌یانەی نێو بارەکان و تلیاك کێشان و ڕەوتی شێوانکارییان هەمووی لەوەسوەسەکانی شەیتانن. خوداش پێش ڕوودانی ئەم هەموو بەدکاریانەو پێش بڵاوبوونەوەو کەڵەکەبوون و زۆربوونیشیان هەواڵی پێ‌داوین و ئاگاداری کردووینەوە، هەروەك فەرموویەتی ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ﴾الأعراف/٢٧.. واتە: (ئەی نەوەکانی ئادەم وریابن شەیتان فریوتان نەداو گومڕاتان نەکات وەك ئەو فریودانەی کە دایك وباوکی ی ئێوە "ئادەم و حەوا" ی پێ لەبەهەشت دەرکردن کاتێك بەتەفرەدانیان لەخواردنی بەری درەختەکە جل و بەرگەکەیانی لەبەر داماڵین و وایان لێ هات کە ئەوان واتە -ئادەم و حەوا- عەورەتی یەکتر ببینن و شەیتان پێ‌ی بینین).

## شەیتان هیچ دەسەلاتێکی بەسەر مرۆڤی باوەڕداردا نییە

باوەڕ ڕۆشنایی‌یەکی زۆر دەخاتە دەرونەوەو دڵیش پڕدەکات لەنوور. جا ئەگەر دڵو دەروون ڕۆشن بووەوە ئەوا هیچ وەسوەسەو تەفرەدانێکی شەڕخوازانەی شەیتان لەئارادا نامینێت، هەروەك خوداش فەرموویە: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾النحل/٩٨-٩٩.. واتە (کاتێك

قورئانت خوێند پەنابگرە بەخودا لەدەست شەیتانی دەرکراوو نەفرەت لێکراو و بڵێ (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) چونکە شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر ئەوانەدا نییە کە باوەڕیان هێناوەو پشتیان بە پەروەردگاری خۆیان بەستووە).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾الأعراف٢٧. واتە: (ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بەدۆست و هاوڕێی بێباوەڕان).

هیچ شتێکیش لەویردو یادو زیکری خودا بەهێزتر نی یە بۆ دەرپەراندنی شەیتان لە ناو دڵداو چاودێری کردنی لەئاشکراو نهێنی دا. زیکرو یادکرنەوەی خوداش چاو ڕۆشن دەکاتەوەو خۆشەویستیی هەق وهۆکارەکانی چاکەشی لەدەروون دا بەهێز دەکات. مەیلی خراپەو شتی پووچەڵیشی تێدا لاواز دەکات تاوای لێ دێت شەیتان هیچ دەروازەیەك بۆچوونە نێو دەروونەوە بەدی ناکات..

خودای مەزن فەرموویە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ[١] طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴾الأعراف/٢٠١.. واتە: (تەقواکارو خواپەرستان ئەگەر خەیاڵێك یان وەسوەسەیەکی شەیتانیان تووش ببێت لەو خەیاڵانەی، کە مرۆڤ هەڵدەنێن بەرەو یاخی بوون و سەرپێچی، یەکسەر ئەوەیان بەبیردێتەوە، کە ئەم خەیاڵە لەشەیتانی دوژمنیانەوەیەو ئامرازێکی گومڕاکارییەتی. ئەوەشیان بەبیردێتەوەو، کە سزای خودا هەیە بۆ هەرکەسێك گەر دوای شەیتان بکەوێت، بەڵام پاداشتی تەواو بۆ هەرکەسێکە کە گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خودا دەکات، ئیتر لەسەر بینایییو چاوڕۆشنی هەڵس و کەوت دەکەن و خاوەنی ئەو چاوە هەق بینەش دەبن کە جیاوازیی نێوان چاکەو خراپە و هەق و ناهەقی پێ دەکەن و دوایش خورپەو وەسوەسەی شەیتان لەخۆیان دووردەخەنەوە).

زۆر پێویستیشە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییە بکەین کە شەیتان هەرگیز ناتوانێت مرۆڤ لەخشتە بەرێت تەنها کاتێك نەبێت کە مرۆڤ ڕوو لەیادی خوداو زیکرو ویردەکان وەردەگێڕێت، لەم بارەیەوە خودا دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَعْشُ[٢] عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾الزخرف/٣٦.. واتە (هەر کەسێك خۆی بێ ئاگاکات لەزیکرو یادی خودا ئەوا خوداش

---

(١) (مسهم)" وشەی (مسّ) بەهەر خراپەو ئازارو زیانێك دەگوترێت کە تووشی مرۆڤ دەبێت.

(٢) (یعش) لەعەرەبیدا دەگوترێت (عشي الرجل) واتە کاتێك بەرچاوی خۆی تاریك دەکات، لێرەشدا مەبەست لەتاریکیی دڵ و چاوە.

شەیتانێکی لێ نزیك دەکاتەوەو دەبێتە هاوڕێی، دیارە بەپێچەوانەشەوە گەر کەسێك بەردەوام بێت لەسەر یادو زیکری خودا، خوداش شەیتانی لێ دوور دەخاتەوە).

* * *

پوختەی قسان لێرەدا ئەوەیە لەجیهانی نادیاردا دروستکراوێکی پەنهانیش هەیەو ناوی "شەیتان"ـە کە هەستەکانمان دەرکی پێ ناکەن، بەڵام کاریگەرییی لەسەر دڵ و دەروونمان هەیە، تەنانەت پەیوەندیی پێوە دەکات و هۆکارو ئامرازی خراپەشی تێدا بەهێز دەکات.. خوداش لەقورئاندا ئەم پەیوەندییەی بە (وسواس-و-نزغ-و-مَس) ناوبردووەو لەمەوپێش مانای هەریەکەیانمان لێك داوەتەوە. ئێمە شوێنەواریان لەدەردوونماندا دەبینین ئەگەرچی سەرچاوەکەشی پێنەزانین. کاتێکردنی ئەو شەیتانانەش لەڕۆحەکان وەك کارتێکردنی میکرۆبەکانە لەجەستەکاندا، میکرۆب هەلی هەرجۆرە لاوازی یەکی جەستە دەقۆزێتەوە، گەر مرۆڤیش هەر سستی یەك لەخۆپاراستن و هەر بێ ئاگایی بوونێك لەو میکرۆبانەدا بنوێنێت، واتە کەمتەرخەم بێت لەبەکارهێنانی ئامێرە پزیشکی یەکان و دەرمانەکان دا، ئەوا میکرۆبەکان دزە بۆ ناو جەستەی دەکەن و هەوڵی لەناوبردن و کوشتنی دەدەن. دیارە شەیتانەکانیش بەهەمان شێوە هەوڵ دەدەن، بەڵام ئێمە دەتوانین خۆمانیان لێ بپارێزین بەڕێگای بەهێزکردنی ڕۆح و گیانمان بە ئامرازی (باوەڕی تەواو بەخوداو بەچاودێریی لەسەرمان و بەپاڕانەوە لێ ی و بەندایەتی ی پوخت و پەرستنی تەواو هەر بۆ خوداو وازهێنان لەبەدکرداری بەهەموو جۆرێکی ئاشکراو نادیاری یەوە)، تاکو سیفەتە جوانەکانی چاکەو خۆشەویستی ی هەق و ڕقەبەرایەتیی ناهەق لەدەروون دا بچەسپێن.. بەم ڕەنگەش قەڵاکانی دەروون پتەو دەکرێن بەرامبەر ئەو شەیتانانەی کەبانگەشە بۆ خراپەو بەتاڵ دەکەن. حیکمەتیش لەئاگادارکردنەوەی قورئاندا بۆ ئێمە کە لەشەیتان بێئاگا نەبین ئەوەیە چاودێری فیکرو خەیاڵ و حەزەکانمان بکەین و لێ یان بێدار بین وەك چۆن چاودێریی جەستەمان و نەخۆشییەکانی دەکەین و لەگەڵ وجودی هەر ئازارێکی جەستەیی دا پەنا دەبەینە بەر چارەسەر بەئامرازی پزیشکی. جا هەر کاتێك هەستمان بەوجودی (مەیلێکی دەروونمان بۆ خراپە یان بەتاڵ) کرد ئەوا پەنا دەبەینە بەر خوداو دەروونمان بەم فەرمایشتە ڕاست دەکەینەوە: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾الأعراف/٢٠٠. واتە: (هەر کاتێك لەشەیتانەوە وەسوەسەی فەرمان بەگوناهێکت پێدرا یەکسەر پەنا بەرە بەر خودا،

چونکە بێ‌گومان خودا بیسەرو ئاگاداری بارودۆختانە). هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾الناس/١-٦. واتە: (بڵێ پەنا دەبەمە بەر خودای پەروەردگارو خالق و هەڵسوڕێنەری کاروباری خەڵکی. خودای حاکم و خاوەنی خەڵکی. خودای پەرستراوی ڕاستەقینەی خەڵکی. پەنادەگرم بەم خودایە لەخراپەی ئەو وەسوەسەکارەی دێت و دەڕواتەوەو دێتەوەو خورپەو وەسوەسەی فەرمان بەکاری خراپە دەخاتە دڵی خەڵکی یەوە. سا ئیتر ئەو وەسوەسەکارانە لەکۆمەڵەی (جن) بن یان کۆمەڵەی ئینسان من هەر پەنا بەخوا دەگرم لێیان).

لەقورئان دا تەنها شەیتان بەسەرچاوەی وەسوەسەو خورپەی نەفس دانەنراوە، بەڵکو چەند مرۆڤێکیش هەن کت ومت وەك شەیتانەکان هەڵس و کەوت و ڕەفتاریان هەیەو لەفریودانی خەڵکی و هاندانی خراپەو شەڕانگێزی دا وەك شەیتان وان، ئەم جۆرە مرۆڤانەش بەئەندامانی حیزبی شەیتان دادەنرێن، هەروەك خوداش فەرموویە: ﴿ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾المجادلة/١٩.. واتە: (ئەو موشریك و بێباوەڕانە شەیتانیان بەسەردا زاڵ بووەو خوداو زیکری خودای بیربردوونەوە، ئەوانە لەکۆمولەو حیزبی شەیتانن، حیزبی شەیتانیش بێگومان زەرەرمەندو ڕەنجەڕۆن).

## تەوبەکردن شەیتان ڕاودەنێت

بێگومان شەیتان توانی (ئادەم و حەوا) بەهۆی (خواردن لەدرەختەکە)وە هەڵخەڵەتێنێت و بیانخاتە چاڵی ئەو کردەوەیەی، کە لێ یان قەدەغەکرابوو. بەڵام ئارەزووەکانی خێرو چاکەخوازی لەدڵی (ئادەم و حەوا)دا بێداربوونەوە دوای ئەوەی کەوتبوونە نێو داوەکەوە. هەرئەو ئارەزووە جوانانەی چاکەخوازییشیان بوو کە سەرکەوت بەسەر خورپەو وەسوەسەکانی شەیتان داو وای لێکردن بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو تۆبە بکەن و پەشیمان بوونەوەیان ڕابگەیەنن و بڵێن: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾الأعراف/٢٣.. واتە:

(خودایە ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد و ئەگەر تۆش لێمان نەبووریت و بەزەییت پێمان دا نەیەتەوە ئەوا لەخەسارەتمەندان و ڕەنجەڕۆیان دەبین). خوداش (تەوبە)ی لیٚ پەسندکردن و بەدەم نزاو پاڕانەوەکەشیانەوە هات و دووعای لیٚ وەرگرتن: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾البقرة/٣٧.. واتە: (کاتێك ئادەم پەشیمان بووبووەوە خودای پەروەردگاریشی ئیلهامی چەند وشەیەکی بۆ داواکردنی لێبوردن پیٚ گەیاندو ئەویش بەو وشانەوە تەوبەی کردو گەڕایەوە بۆ لای خودای خۆی، بێگومان خوداش وەرگری تەوبەو لێبوردووەو میهرەبان و بەبەزەیی یە بۆ بەندەکانی).

بێگومان هەر بە تەوبەو پەژیوان بوونەوە چاکە بەسەر خراپەو خێر بەسەر شەڕدا زاڵ دەبێت، هەر کاتێك خێریش بەسەر شەڕو خراپەدا زاڵ دەبێت ئەوا شەیتانیش دەبەزێت و مرۆڤیش بەهیدایەت و ڕێنموونیی خودا بەهرەمەند دەبێت. جا ئەی مرۆڤی باوەڕدار.. ئەگەر هات و (خوانەخواستە) پێت هەڵخلیسکاو گوناهێکت کرد تەنها ئەو ڕێگەیەت لەبەردەم دایە کە (ئادەم)ی باوکت پێش خۆت وەبەری ناو کە ڕێگەی تەوبەو دەسپێکردنەوەی ژیانێکی باشترو پاکترە. هەر بەم شێوەیەش لەدەسەڵاتی شەیتان و وەسوەسەو خورپە فریودەرییەکانی دەرباز دەبیت.

# بەندی چوارەم

## (( چیرۆکی قابیل و هابیل ))

" قابیـل" و "هابیـل" کـە دوو کـوڕی -ئـادەم- بـون (سـڵاوی خـوای لەسـەر) قورئـان بەسەرهاتەکەیانی گێڕاوەتەوە، چونکە چەندین پەنـدو حیکمـەتی بەسـوودی بـۆ بـاوەڕداران تێدایە.

(قابیل) خـاوەنی کەسـێتی (شخصیة)یـەکی دەردەداربـوو کـە توخمـەکانی شـەڕخوازیو خراپەکاری تێدابوو و نەریتەکانی (تەماعکاری و گوناهباری و یـاخی بـوون لـەحوکمی هـەق) کۆنترۆڵی بیروهۆش و ئاکاری کردبوو ولەهەق دووری خستبوونەوە.

بەڵام (هابیل)ی برای، پیاوێکی چـاکەخوازو لـەخواترس و هەقپـەروەربوو، لـەنێوان ئـەم و براکەی دا ململانێیەکی عادەتی درووست ببوو کـە زۆرجـار لەسـەر شـتێك دەکەوێتـە نێـوان ئادەمیزادانی دیکەوەو بەدرێژایی ژیانی بەشەری هەمیشە دووبارەو چەندبارە دەبێتـەوە، ئـەم ململانێیەش ململانێی نێوان چاکەو خراپەیەو یەکەمین ئاکامی بەوە دەرکەوت کـە "قابیـل" براکەی خۆی "هابیل" بکوژێت.

دەربارەی هۆی ناکۆکی یەکەی نێوان ئەو دوو برایە، دوو وتە هەیە:

**یەکەم/** دەڵێن -هابیل- خاوەنی ڕانەمەڕێك بووەو -قابیل-یش خاوەنی کێڵگەیەك بـووە. هەریەکەیان بۆ نزیك بوونەوە لەخودا قوربانی یەك پێشکەش دەکەن. قوربانیيەکـەی (هابیـل) ئەوەبوو کە باشترین مەڕی لەنێو مەڕەکانی دا هەڵبـژاردو کردیيـە قوربـانی. بـەڵام (قابیـل) خـراپترین جـۆری گـەنمی لەکێڵگەکـەی هەڵبـژرادو کـردی بـەقوربانی. پاشـان هـەردووکیان قوربانیەکەیان پێشکەش بەخودا کرد. لەئاسمانیشەوە ئاگرێك نێررایەخوارەوەو قوربـانی یەکـەی (هابیل)ی خوارد، بەڵام قوربانی یەکەی (قابیل)ی پشت گوێ خست. بەمەش (قابیل) زانـی ی کەوا خودا قوربانی ی براکەی پەسندکرد، بەڵام قوربانی یەکەی خۆیی پەسند نەکردووە. لەبـەر ئەمە ئیرەیی (حەسوودی)ی پێ بردو کوشتی ی.

**دووەم/** وتەی دووەمیش دەربارەی هۆی ناکۆکی یەکەی نێوان (قابیل) و (هابیـل) ئەوەیـە دەڵێن گوایە (ئادەم) سڵاوی خودای لەسەربێت- هەموو جارێك لـەکاتی منـاڵبوونی (حـەوا)ی هاوسەری دا خودا دوو منداڵی پێ دەدا، واتە دوانەیەکی کوڕو کچی پێ دەبەخشی. ئـەوە بـوو یەکەم جار (قابیل) لەگەڵ کچێکدا بەشێوەی دوانە (توأم) لەدایکبوون، دوای ئەوانیش (هابیل) لەگەڵ کچێکی تردا بەدوانە لەدایکبوون. ئەو کچەی لەگەڵ (قابیل)دا لـەدایك ببـوو جـوانترین

ئافرەت بوو، ئادەمیش دەیویست بیكات بەهاوسەری (هابیل)، بەڵام (قابیل) ئەوەی پێناخۆش بوو، بەڵكو گوتی (من زیاتر شایستەی ئەو كچەم دەبێت لەمن مارە بكرێت، چونكە (هابیل) دەبێت ئەو خوشكەی پێبدرێت، كە لەگەڵ خۆی دا لەدایك بووە. ئەم فەرمانەش لەخوداوە نیە بەڵكو تەنها بیروڕای خۆتە [1]).

(ئادەم)یش (سڵاوی خوای لێ بێت) ڕووی كردە كوڕەكانی وپێی گوتن (كەوابوو هەریەكەتان قوربانی یەك پێشكەش بەخودابكەن و هەركەسێكتان قوربانی یەكەی لێ وەربگیرێت ئەوا منیش ئەو كچەی لێ مارە دەكەم).

ئەوانیش قوربانی یەكانیان پێشكەش كرد و خودای مەزنیش تەنها قوربانی‌یەكەی (هابیل)ی پەسندكرد، نیشانەی پەسندكردنەكەش ئەوە بوو لەئاسمانەوە ئاگرێكی ناردە خوارەوەو قوربانی یەكەی قووت داوبردی.

(قابیل) كەزانی قوربانی یەكەی ڕەتكراوەتەوە لەداخ و حەسوودی‌دا براكەی خۆی كوشت.

سەبارەت بەوەرنەگرتنی قوربانی یەكەی (قابیل) قورئان لەئاماژەیەكی‌دا هۆیەكەی ڕوون كردۆتەوە، هەروەك تیای دا فەرموویە: ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْـَٔاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ ۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَىَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾المائدة/٢٧-٣٠.واتە: (ئەی پێغەمبەر داستانی هەردوو كوڕەكەی ئادەم (قابیل و هابیل)یان بۆ بخوێنەرەوەو بەڕاستی بۆیان بگێرەوە كاتێك هەردووكیان بۆ نزیك بوونەوە لەخوداو لەڕەزامەندی خودا قوربانی یان پێشكەش كرد، بەڵام لەیەكێكیان پەسندكراو لەوی تریان پەسندنەكرا، وئەوەی لێ ی پەسندنەكرا ڕووی كردە براكەی‌و پێی گوت (دەبێت بتكوژم) ئەویش گوتی (من بێتاوانم، هیچ زیانێكم لێ نەداویت، خوداش تەنها لەخواپەرستان و تەقواكاران قوربانی وەردەگرێ. جا ئەگەر دەست درێژكەیت بۆم و بمكوژیت ئەوا من لەڕەتدانەوەی تۆدا دەستم درێژناكەم بۆت تابت

---

(١) لەهەندێك تەفسیردا واهاتووە كەبەپێی شەریعەتی ئەو سەردەمەی سەرەتای ژیانی مرۆڤایەتی كوڕ بۆی نەشیاوە ئەو كچە بخوازێت كەبەدوانە لەگەڵ خۆی دا لە دایك بووە. (حەووا)ش لەهەر جارێكی منداڵبوونی‌دا بەسكێك دوانەیەكی كوڕوكچی دەبوو ئەم دووانە نێرومێ‌یەش بەیەك نەدەشیان، بەڵكو هەریەكەیان دەبوو بە هاوسەری یەكێك لەدوانەیەكی تر، بەم ڕەنگەش (قابیل) بۆی نەبووە ئەو كچەی لەگەڵی دا لەدایك بووە بخوازێت، بەڵكو دەبوایە خوشكەكەی (هابیل) بخوازێت. بەڵام وادیارە خوشكەكەی خۆی جوانتر بووە، بۆیە سووربووە لەسەری.(وەرگێڕ).

کوژم، من بێگومان لەخودای پەروەردگاری جیهانییان دەترسم، من دەمەوێت گوناهی کوشتنی من و گوناهەکەی پێشووشت لەئەستۆ بگریت کە بەهۆیەوە قوربانی یەکەت لێ پەسند نەکراو بەم پێیەش ببیتە یەکێك لەدۆزەخی یەکان، ئەوەش سزای ستەمکارانە).ئیتر دەروونە شەڕخوازەکەی (قابیل)کاری کوشتنی براکەی بۆ ئاسان کردو کوشتی ی. بەو تاوانە دزێوەش سەرگەردان و زەرەرمەند بوو و بووە یەکێك لەخەسارەتمەندان).

با نەختێك هەڵوەستە بکەین لەبەردەم ئەم فەرمایشتەی خودادا: ﴿فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ بێگومان هەر خودی وشەی "تقوی"[1] لەم فەرمایشتەدا کە لەسەرزاری (هابیل)ـەوە لەکاتی دواندنی براکەیدا باسکراوەو ئاڕاستەیی کردبوو، بەس بووە بۆ ئەوەی خواستی شەڕخوازی و خراپەکاری لەدەروونی (قابیل)دا ڕیشەکێش کات.. بەڵام ئەم ئەگەرە زۆر دووربووە لەبەدیهاتنی کردەیی ی نێو دەروونێکی یاخی ی وەك دەروونی (قابیل)دا چونکە (قابیل) خاوەنی "تقوی" و "طاعة" نەبووە. واتە "لەخواترس" و "گوێڕایەڵی فەرمان" نەبووە، هەربۆیەش خودا قوربانیەکەی لێ وەرنەگرتووە، ئیدی ئەو چکۆسی و (حەسوودی)یەی کە هەموو ڕووبەندی دڵی داگیر کردبوو و دڵی پڕکردبوو لەڕق و کینە، وای لێ کردبوو سووربێت لەسەر کوشتنی براکەی.

دوای ئەمە دێینە سەر فەرمایشتەکەی تری خودا کەلەسەر زاری برای مەزڵووم و بێچارەوە حاڵ و هەڵوێستی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ﴿لَئِنْ بَسَطْتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾المائدة/٢٨. لێرەش دا دەروونە چاکەخوازەکەی (هابیل)مان پیشان دەدرێت کە ئاوێتەی "تقوی"یەو خواستی چاکەو خێرخوازی کۆنترۆڵی کردووە چونکە نایەوێت بەخراپە بەرامبەر خراپە بجووڵێتەوەو (کوشتن)یش لە ڕەوشت و سیفەتەکانی ئەو نی یە، چونکە (هابیل) لەخودای پەروەردگاری جیهانییان دەترسێت. هەر کەسێکیش لەخودا بترسێت دەستدرێژی بۆسەر کەس ناکات. (ترسان لەخوداش) گەورەترین ڕێگرە لەتاوان کردن لەسەر زەوی دا. جائەگەر پەروەردیار و چاکسازی خوازان بزانن چۆن خەڵکی ڕێنمایی دەکەن بۆ (باوەڕهێنان بەخودا)و (بەچاودێری و ئاگاداری خودا لەکاروبارو هەڵس و کەوتیان)و (سڵکردنەوە لە سەرپێچی کردنی) ئەوا کۆمەڵگەیەکی پتەوی وەهایان بۆبنیات دەنرێت، کە ئاشتی و ئاسوودەیی باڵی بەسەردا دەکێشێت. بەڵام (قابیل)، کە

---

(١) وشەی "تقوی" مانایەکی زۆر گەورەوبەرفراوانی هەیەو واتاکانی (ترسان لە خودا) و (خۆپاراستن لەسزای خودا) و (پەیڕەویکردنی فەرمانەکانی) و (دوورکەوتنەوە لەو شتانەی قەدەغەی لێکردوون) و (وریایی‌و بێداری) و.. چەندان واتای تری لەم جۆرە دەگرێتەوە (وەرگێڕ).

(ڕەوشتی شەڕخوازی)ی بەسەردا زاڵ ببوو کرداره چەپەڵ و ناشرینەکەی ئەنجام دا: ﴿ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ المائدة/ ٣٠.. ناکۆکی یەکەش لەنێوان (قابیل) و (هابیل)دا نەبووە، بەڵکو لەنێوان (قابیل)و دەروونە شەڕخوازەکەیدا بووه، ئەو دەروونەی کە فەرمانی بەخراپە پێ‌کردووە، ناکۆکی لەنێوان خۆی و ئارەزووە خراپەخوازی یەکانی وخواستە پیسەکانی دابووە. ئینجا هەر دەبوو، کە (قابیل) پەنا بەرێتە بەر ئەم هەواو ئارەزووە شەڕەنگێزانەیە تاکو دایانمرکێنێتەوەو خۆی لەدیلی ی و ئەسارەتیان پێ قورتارکات. وەلێ لەبەردەم بێ دەسەڵاتی خۆیو ڕۆچوونی ئارەزووەکانی دا دەستەوەسان دەبێت و لەنگەری خۆی بۆ ڕاناگیرێت و تاوانکاریشی دەگاتە ڕادەی کوستنی براکەی. ئەم تاوانەش توندوتیژترین نموونەی حەسوودی یە.. (حەسوودی)یش یەکەم گوناه بووه کەسەرپێچی خودای لەئاسماندا پێ کراوە، هەورەك یەکەم گوناهی سەرپێچی لێ کردنیشی لەسەرزەوی دابووە. ئەوەبوو لەئاسماندا- ئیبلیس-حەسوودی بە-ئادەم-برد، بەڵام لەسەر زەویدا -قابیل- حەسوودی بە-هابیل- برد.

## وانەیەك لەقەلەڕەشەکەوە

کاتێك (قابیل) براکەی کوشت، نەیدەزانی چی ی لێ بکات و لاشەکەی لەوێدا کەوتبوو.. خوداش لەوکاتەدا دوو قەلەڕەشی ناردە خوارەوە کە شەڕیان لەگەڵ یەکتردا دەکردو لەئەنجامی شەڕوکوشتاری نێوانیان دا یەکێکیان ئەوی دیکەیانی کوشت، دوای کوشتنی، بەدەنووکی خۆیو بەهەردوو قاچیشی چاڵێکی بۆ هەڵکەندو هەڵیدایە ناویو ناشتی. جا کاتێك (قابیل) دیتی ئەوا قەلەڕەشە بکوژەکە قەلەڕەشە کوژراوەکە دەنێژێت، ئەویش دڵی نەرم بوو و قایل نەبوو کە ڕەحمی لەو قەلەڕەشە کەمتر بێت و خێرا تەرمی براکەی لەژێر خاك دا شاردەوەو لەهەمان کاتیش دا دڵی پڕبوو لەحەسرەت و پەشیمانی لەسەر کردەوە نابەجێ‌کەی [(١)] بۆیە لەدڵی خۆیدا گوتی (تۆ بڵێی من بەزەییم لەو قەلەڕەشەش کەمتر بێت؟!).."هەمان هەست" لەقورئانیش دا گێڕاوەتەوە، کە خودا دەربارەی کۆتایی بەسەرهاتەکە دەفەرموێت: ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ ۚ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى ۖ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴾ المائدة/٣١..

---

(١) گوتراویشە کاتێك (قابیل) براکەی دەکوژێت و نازانێت چی لەتەرمەکەی بکات، خودا قەلەڕەشێك دەنێرێت کە چاڵ هەڵدەکەنێت و خۆڵ دەکات بەسەر تەرمی کوژراوەکەدا. کاتێك (قابیل)ی بکوژیش دەبینێت کە چۆن خودا ڕێز لەکوژراو دەنێت دوای مردنی، ئیتر دڵتەنگ و پەشیمان دەبێت.

# بەندی پێنجەم

## (( پێغەمبەرێتی ئیدریس ))

ئیدریس (سلاوی خوای لەسەر) یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی کەناویان لەقورئان دا هاتووە. خودا لەبارەیەوە فەرموویە: ﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾الأنبياء/٨٥. هەروەها فەرموویە: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ٥٦ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا [1]﴾مريم٥٦-٥٧.. واتە: (هەروەها لەم کتێبەدا(قورئان) باسی(ئیدریس) بەیادبێنەوەکە بەڕاستی ئەو ڕاستگۆ و سەرڕاست و پێغەمبەرێك بووەو، ئێمەش لەدنیاو لەئاخیرەتیش دا پلەو پایەیەکی بەرزمان پێداوە).

قورئان -ئیدریس-ی بە ڕەوشتەجوانەکانی (ئارام گری و ڕاستگۆیی و پایەبەرزی) وەسف کردووە. پوختەی وتەی زانایان دەربارەی ئەم پێغەمبەرە ئەوەیە کە ئەو یەکەم کەسە (جبریل)ی مەلائیکەت سرووشی بۆ هێناوەتە خوارەوە بە مەبەستی ڕێنموونی و هیدایەت دانی نەوەکانی (قابیل) تاکو لەگومڕایی و بێباوەڕییان پاشگەز ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو-تەوبە- بکەن و پاشان بەپێی شەریعەتەکەی بجوولێنەوە. بەڵام قورئان بەدرێژی باسی ژیان و بەرنامەی پێغەمبەرایەتی یەکەی نەکردووە. هەروەها سەرچاوەیەکی پشت پێبەستراو و جێگیری مێژوویش دەربارەی ژیانی نی یە. دیارترین سەرچاوەش دەربارەی دوابێت کتێبی (تأريخ الحكماء)[2] یە کەلێرەدا چەند بڕگەیەکی لێ دەخەینە ڕوو، بەڵام نەك بەو پێودانگەی کەبەچەند ڕاستی یەکی جێگیری دابنێین، بەڵکو تەنها لەدەرووی زانیاری بەخشینەوە: (حەکیمان بیروڕای لێك جوداو جیاوازیان دەربارەی شوێنی لەدایك بوون و ژیانی - ئیدریس- هەیە، هەندێك زانایان دەڵێن: ئەو لە -میسر- لەدایك بووە و ناوی (هەرمس- ی هەرمسان)یان لێ ناوە، واتە (پادشای پادشایان) و لە (منف) لەدایك بووە. گوتووشیانە (بەزمانی یۆنانی (ئەرمیس)ـەو لەعەرەبی دا کراوە بە (هرمس)[3]) لەلای (عیبرانی یەکان)یش بە (خنوخ) ناوبراوەو

---

(١) (ورفعناه مكانا عليا) واتە خستمانە پلەیەکی بەرزەوە- پلەی بەرز(مكاناً عليا) واتە: شەرەف و پلەی پایەی پێغەمبەرێتیەو ڕێزی نزیکی لە خوداوە. خوداش ناوو ڕێزی -ئیدریس-ی لەنێو خەڵکیدا بەرز ڕاگرتووە، وەك چۆن بە پێغەمبەری خۆشمان (محمد ﷺ)ی فەرمووە: (ورفعنا لك ذكرك). گوتراویشە مەبەست لە (مكانا عليا) ئەوەیە کە خودا بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان. لەهەردوو کتێبی فەرموودە ڕاستەکان (الصحيحين)دا بەڵگەی پشتگیریکردن و بەهێزکەری ئەم وتەیە هەیە.

(٢) لێرەدا لە (مختصر الزوزني)یەوە وەرمان گرت کە بە (المنتخبات الملتقطات) ناوبراوەو لەکتێبی (اخبار العلماء)ی (جمال الدين ابي الحسن علي بن يوسف القفطي)یەوەیە.

(٣) هرمس: یان هورمس یان هورمزیش نازناوێکە وەك چۆن دوگوترێت (قەیسەر )یان (کیسرا).

لەعەرەبیشدا کراوە بە (اخنوخ). خوداش لەقورئانە ڕۆشنە عەرەبی یەکەی دا بە (ادریس) ناوی بردووە.. ئینجا (هرمس) واتە (ئیدریس) لە-میسر- دەرچووە وبەسەرانسەری زەوی دا گەڕاوەو دوایی بۆ میسر گەڕاوەتەوە و خوداش بۆ لای خۆی بەرزی کردووەتەوە، ئەمەش دوای هەشتاو دوو ساڵ لەتەمەنی).. کۆمەڵێکی دی لە (حەکیمان) دەڵێن: (ئیدریس) لەبابل لەدایك بووەو لەوێ پێگەیشتووەو ژیاوە. لەسەرەتای تەمەنی دا زانستی لە (شیث)ی کوڕی (ئادەم) وەرگرتووە کە باپیری باپیرەی بووە. کاتێك-ئیدریس- گەورە دەبێت خودا ئەرکی پێغەمبەرێتی ی پێ دەسپێرێت، ئەویش ڕێگە بەخراپەکارانی نێو نەوەکانی ئادەم نادات کەسەرپێچی لەشەریعەتەکەی (ئادەم وشیث) بکەن. ژمارەیەکی کەمیان گوێڕایەڵی ی دەکەن، بەڵام زۆربەیان بەقسەی ناکەن و پەیڕەوی ی ئامۆژگارییەکانی ناکەن. ئەویش خۆی شوێنکەوتووەکانی لەو ناوچەیە دەردەچن و ملی ڕێگە دەگرنەبەر، تا دەگەنە میسر، لەوێش خۆی و ئەوانەی لەگەڵی دابوون بانگەواز بۆ ڕێ ی خودا دەکەن و خەڵکی بانگ دەکەن بۆ فەرمان بەچاکە و ڕێگری لەخراپەو گوێڕایەڵیو بەندایەتی بۆ خودا. هەروەك گوتراویشە (ئەو بانگەوازی بۆ (ئاینی خودا)و (ڕێبازی خوابەیەك گرتن)و (پەرستنی خودای خالق)و (پاکژکردنەوەی دەروون لەسزای ئاخیرەت بەکاری چاك لە دنیادا) کردووە، جگە لەهاندانی خەڵکی لەسەر خۆگرتنەوە (زوهد) لەدنیادا و کارکردن بەدادگەری، هەروەها فەرمانی پێکردوون بە جۆرە نوێژێك کە خۆی بەچەند سیفەت و کردارێك بۆی ڕوون کردوونەوەو فەرمانی بەرۆژوگرتنیش پێ‌کردوون کە لە هەرمانگێك دا چەند ڕۆژێکی دیاریکراو بەرۆژوو بن، پاشان داوای جیهادی لێ کردوون بۆ بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانی ئایینەکەیان، جگە لە بەخشینی زەکاتی ماڵ و سامانیان وەك کۆمەکێك بۆ نەداران. لەسەر نقێم(فص)ی ئەنگوستیلەکەشی نوسرابوو (باوەڕبەخودا سەرکەوتن دەستەبەر دەکات). لەو شوێنەش دا کە نوێژی مردووی لەسەر دەکرد نوسرابوو (بەختیار ئەو کەسەیە کە بەخۆی دادەچێتەوە، هۆی شەفاعەت و تکاکاری لای خودایشی کردەوە چاکەکانیەتی) لەوتەکانیشی:

- هیچ کەسێك ناتوانێت بەڕادەی (نیعمەت بەخشینی خودا بە عەبدەکانی) سوپاسی خودا لەسەر نیعمەتەکانی بکات.
- ئەگەر نزاتان لەلای خودا کرد، نیازتان پاك بکەنەوە، هەمان نیازی پاکیشتان لە نوێژکردن و ڕۆژووگرتنتان دا هەبێت.
- حەسوودی بەخەڵکی مەبەن لەسەر خۆشبەختییان لەهەندێك شتی دنیادا چونکە چێژوتامی ئەو شتانەیان ماوەیەکی کەمە.
- هەر کەسێك بەبەشی خۆی قەناعەت نەکاو لەوە تێپەڕێت هیچ شتێك دەوڵەمەندی ناکات.
- ژیانی مرۆڤ لەدانایی دایە.

# بەشی سێیەم

# نوح

دروودی لەسەربێت

١- چیرۆکی نوح

٢- لافاوەکە

٣- چەند وانەو پەندێك

# بەندی یەکەم

## ((چیرۆکی نوح))

(پەرستنی بت و خواوەندەکان - بانگەواز بۆ لای خودا - خۆبەزل زانینی بێ باوەڕان - بەردەوامی(نوح) لەسەر بانگەوازەکەی - نکوڵی ی کوشندە - سکاڵا لەلای خودا - ئاوەڕپێدانەوەیان بەلای توانای خودا - هەڕەشەکردنیان لە نوح)

## پەرستنی بت و خواوەندەکان

نوح (سلاوی خوای لێ بێت) یەکەمین پێغەمبەرە، [1] کە خودا بەپەیامی ئیلاهی ی خۆیەوە بۆلای گەلەکەی ناردبێت کاتێك سەریان کردۆتە سەر بت پەرستی و ڕۆچووبوون لە کفرو گومڕایی دا. خودای مەزن لەقورئان دا ناوی ئەو بتانەشی هێناوە کە گەلەکەی -نوح- دەیانپەرست، ئەویش لەسەرزاری گەورەو پیاوماقووڵانیانەوە کە دەیانگوت:﴿ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ [2] وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا نوح/٢٣و٢٤. واتە.. (نەکەن دەسبەرداری خواوەندەکانتان بن، بەتایبەتیش بتەکانی وەك -وەدد، سواع، یەغوث، یەعووق، نەسر- فەرامۆش نەکەن). جابێگومان بەم بتانەش خەڵکێکی زۆریان لەڕێ لاداوەو گومڕایان کردوون).

گەلەکەی -نوح- چەند خواوەندێك(آلهة)یەکی دیکەشیان بۆ خۆیان داناوە، هەروەك لەئایەتی (ولاتذرن آلهتكم)دا ئاماژەی پێدراوەو گوتراوە کە ئەو خواوەندانە ئەستێرە گەڕۆکەکان بوون، چونکە لەبەر ئەوەی ئەم ئەستێرانە بەشەو دەردەکەوتن و بەرۆژ بزر دەبوون، لەبەر ئەوە بتەکانیان کردبوو بەهۆ(واسطة)، تا لەخواوەندەکانیان نزیك بکەنەوە.

---

(١) ئەمەش هەروەك لەهەردوو کتێبی (صحیح)دا جێگیرەو لەپێغەمبەرەوەﷺ لە (حدیث الشفاعة)وە هاتووە کە فەرموویە: (بێگومان -نوح- یەکەم پێغەمبەرێکە کە بۆ خەڵکی سەرزەوی نێررابێت) هەندێك لە زانایانیش لەکاتی لێکدانەوەی فەرموودەکەدا پەیامی -ئادەم- بەیەکەم پەیام و هی -ئیدریس-یش بەدووەم و پاشان -نوح- بەسێیەم پێغەمبەر دادەنێن.

(٢) (لاتذرن) واتە دەسبەرداریان مەبن.

(نوح) ماوەیەکی ئیجگار زۆر لەنێو گەلەکەی دا مابووەوەو بانگی دەکردن بۆ پەرستنی خودا. لەم بارەیەوە خودا ماوە زەمەنی یەکەی دیاری کردووەو فەرمووبە ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾العنكبوت/١٤. واتە (بێگومان ئێمە -نوح-مان نارد بۆلای گەلەکەی کە ماوەی نۆسەدو پەنجا ساڵ لەنێویان دا مایەوەو بانگی دەکردن بۆ لای خودا). بەڵام ئەم ماوە زۆرەش بەرێکی نەگرت و ئەنجامێکی بۆ دەستەبەرنەکردن، چونکە ژمارەیەکی کەم نەبێت کەباوەڕی پێهێنا، زۆربەیان باوەڕیان پێ ی نەهێنا، لەنێو ئەو گەلە بەدبەختەدا ئەگەر کوڕ بگەیشتایە تەمەنی ژیری(سن الرشد) یەکسەر باوکی ئامۆژگاریی ئەوەی دەکرد کە هەرگیز دوای -نوح- نەکەوێت، بەم ڕەنگەش میراتی سووربوون لەسەر (شیرك)یان بۆ یەکتر بەجێ دەهێشت و لەسەرپێچی و یاخی بوون دا نغرۆ دەبوون.

## بانگەواز بۆ لای خودا

"نوح" بەگەلەکەی خۆی گوت: (من هۆشداری و ئاگاداریتان پێدەدەم لەسەر سزای توندی خودا و ڕێ ی ڕزگاربوونیشتان بۆ ڕوون دەکەمەوە، جا ئێوەش تەنها خودا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەن بەهاوەڵ(شریك) بۆی، چونکە من زۆر دەترسم لەوەی گەر ئێوە غەیری خودا بپقەرستن یان هاوەڵی بۆ دانێن خوداش لەڕۆژی دوایی دا سزایەکی سەخت و توندتان بدات: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴾ هود/٢٥-٢٦..

هەروەها (نوح) پێ ی گوتن: (گەر ئێوە گوێڕایەڵی ی خودا بکەن و لەخراپەو بەدکاری دوورکەونەوە، خوداش لەگوناهانی پێشووتان خۆش دەبێت و ماوەی زیاترتان بۆ کاری چاکەو قەرەبووکردنەوەی ڕابردوو پێ دەبەخشێت و هەر لەم دنیایەش دا نیعمەتی خۆیتان بەسەردا دەڕژێنێت تا ئەو وادەیەی کە خودا بۆ کۆتایی ژیانی داناون. دەنا گەر هەر سەرپێچی لەخودای پەروەردگارتان بکەن ئەوا چی دی مۆڵەتتان پێ نادات، بەڵکو سزاکەتان پێشتریش دەخات و کت وپڕ هەرلەم دنیایەدا بەشێوەیەك ئەو سزایەتان بۆ دەنێریت، کە هیچ هەستی پێ ناکەن و نازانن لەکوێوە هاتووە. ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ

وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى[١] إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾نوح/٢-٤.

## خۆ بەزل زانینی بێ باوەڕان

بەڵام گەلەکەی -نوح- بەدەم ئامۆژگاری یەکەیەوە نەچوون و ئـاوڕێکی وایـان لەهەڕەشـەو ئاگاداری خودا نەدایەوە، تەنانەت نکوولّی ی ئەوەشیان لێ دەکرد کە ئەو پێغەمبـەرێك (واتـە نێرراوێك) بێت بۆلایان، ئەمەش لەبەرچەند هۆیەك، وەك:

**یەکەم:** ئەویش " واتـە نـوح " مرۆڤێکـە وەك خۆیـان کـە هـەروەك ئـەوان دەخـوات و دەخواتەوە ئیتر (بەڕای ئەوان) چۆن کەسێك وەك ئەوان مرۆڤ بێت پێغەمبـەر دەبێـت؟ چـونکە پێغەمبەر"لەدیدوبۆچوونی ئەو گەلەدا"دەبوایە مەلائیکەیەك بوایە نەك لەڕەگەزی بەشەر بێت.

**دووەم:** ئەوانەی دوای کەوتبوون لەبێکەس و چەوساوان بوون، مەبەستیان لـەم کەسـانەش ئەو هەژارانەی نێو چینەکانی کرێکاران و جوتیاران و خاوەن پیشە ساکارەکان بووە. ئەم جـۆرە کەسانەش لەلای ئەو گەلە وا وەسف دەکران گوایە بەبێ تێڕامان و تێفکرین و بیرکردنەوە دوای -نوح- کەوتوون و دیارە بەکەسانی خاوەن هەیبەت و پیاوماقوولّیان دانەدەنان.

**سـێیەم:** خـەتابارکردنی -نـوح- و بـاوەڕداران بـە تۆمـەتی -درۆکـردن- لـەم خەتابارکردنەشیاندا دڵنیانەبوون چونکە لەسەر " گومان" هەڵیان چنیبوو.

﴿فَقَالَ الْمَلَأُ[٢] الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا[٣] بَادِيَ الرَّأْيِ[٤] وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ﴾ هود/٢٧. لەئایەتێکی دیکەشدا خودا وێنەی خۆبەزل دانانی ئەو گەلە لەو بەتەنگەوە نەهاتنی بانگەوازی (نوح)مان پیشان دەدات و ڕوخساری دزێوی گومڕاییشیان دەردەخات، هەروەها وێنەی (نوح)یشمان وا پیشان دەدات کە پیاوێکی بەئارام و بەسۆزەو

---

(١)زانایان ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگەیەك لەسەرئەوەی کە (بەگوێڕایەڵی ی خوداو چاکەکاری و گەیاندنی (صلەی ڕەحم ـ تەمەنی مرۆڤ زیاد دەبێت).

(٢) (الملأ): واتە کەسانی پیاوماقوولّ و ـ ئەشراف ـ وخاوەن پلەی کۆمەلاّیەتی.

(٣) (أراذلنا): واتە هەژارە ئاست نزمەکانمان و بێ هێزو لاوازەکانمان.

(٤) (بادي الرأي): بەڕای سەرپێیی و بێ تێفکرین دوات کەوتوون.

هەوڵ دەدات ئەو وەهم وبۆچوونە هەڵەیە لەعەقڵیان دەربێنێت و پێیان دەڵێت: (گەلۆ بڕوا بکەن من ئەو گومڕاییی یەم تێدانی یە کە ئێوە گومان دەبەن لەسەری، من سەرم لێ تێك نەچووە.. من نێرراوێکم(رسول) لەپەروەردگاری جیهانییانەوەو ئەو ڕاسپاردەو فەرمان و حوکمانەتان پێ دەگەیەنم کە بە من داناردوویە بۆ ڕاست کردنەوەی کاروبارتان.. من بەوە ئامۆژگاریتان دەکەم کە بەختیارییتانی تێدایەو هۆشدارییشتان پێ دەدەم لەسەر بەدبەختییتان، بێگومان ئەو زانستەش کە خودا پێی بەخشیوم ئێوە نایزانن). پاشان ـ نوح ـ ئەوەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هیچ شتێکی سەیرو سەمەرە نی یە گەر (پیاوێکی وەك خۆی) لەنێو ئەوانەوە ببێت بەپێغەمبەرو بە پەندو ئامۆژگاری ڕێنموونییان بکات و ئاگادارییشیان بکاتەوە لەسزای سەختی خودا گەر سەرپێچی ی لێ بکەن، هەروەها بانگیشیان بکات بۆ ڕێی شادبوون بەرەحمەتی خوداو ڕازی بوونی: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾الأعراف/٦٠-٦٣.

## بەردەوامیی نوح لەسەر بانگەوازەکەی

-نوح- هەر بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازەکەی بەمەبەستی قەناعەت پێکردنی گەلەکەی. ئەوە بوو هەر وت و وێژی لەگەڵدا دەکردن و دەیدواندن و پێ ی دەگوتن: (ئەرێ باشە ئێوە بیروڕاتان چی دەبێت لەسەر حاڵ و بارودۆخی من لەگەڵتان دا گەر خودا بەڵگەی ڕۆشنم بۆ بنێرێت و پێغەمبەرێتی و پەیامم پێببەخشێت و بەرەحمەت و بەخششی خۆی ڕێنماییم بکات، بەڵام ئێوە خۆتان لەم ڕێنمایی یەو هیدایەتە خودایی یە کوێرکەن و بەنەزانین و لەخۆیایی بوونتان ڕووی لێ وەرگێرن و بەماڵ وسامان و پلەو پایەتانەوە بنازن، جا ئایا لەم بارودۆخەدا دەشێت من بەزۆر ناچارتان بکەم لەسەر وەرگرتنی دین و ڕێنمایی ی خودا لەکاتێکدا ئێوە ناتانەوێت؟! هەروەها من داواتان لێ ناکەم کە لەبەرامبەر گەیاندنی پەیامی خوداو پەندو ئامۆژگاری یەکانم دا (کرێ)، یان پاداشتێکی وەك ماڵ و پلەو پایەم پێ بدەن، بەڵکو پاداشتی من تەنها لەلای خودای میهرەبانە).

وادیارە گوتار(خطاب)ی - نوح- بۆ گەلەکەی کاریگەری هەبووە، بەڵام دیتیان کەوا

شوێنکەوتوانی لەهەژاران و بێدەسەڵاتانن ولەنێوان ئەمان و ئەو گەلەش دا چەندین جیاوازی قەبەی دارایی و کۆمەڵایەتی هەبوو، هەربۆیەش ئەو مەرجە گرانەیان لەسەر -نوح- دانا کە (بۆ ئەوەی باوەڕی پێبێنن دەبێت ئەو هەژارو بێدەسەڵاتانە لەخۆی دوورخاتەوەو لەدینەکەش دەریان کات)..

بەڵام -نوح- لەوەڵامی مەرجەکەیان دا پێیان دەڵێت: (من هەرگیز کەسێکیان-لەو باوەڕدارانە- دەرناکەم بەهۆی داواکاری ئێوە ورق هەڵگرتنتان لێیان، چونکە ئەوان نزیکن لەلای خوداو ڕۆژی دوایش بەسەربەرزی دەچنەوە بەردەم خودای خۆیان و پاداشتی خۆیانیان لێ وەردەگرن. بەڵام ئێوە وا دەبینم کە گەلێکی نەزانن و نازانن مرۆڤ بەچی لای خودا بەختەوەر دەبێت..

گەلۆ هیچ کەسێکیش ناتوانێت من ڕزگاربکات و سزای خودام لێ قەدەغە بکات گەر ئەو باوەڕدارانە دەرکەم دوای ئەوەی باوەڕی ڕاستیان بە پەیامەکەم هێناوە.. مەگەر ئێوە نازانن ئەم شوێنکەوتوانەی من پەروەردگارێکیان هەیەو سەرخەرو یارمەتیدەریانە؟.. پاشان من پێتان ناڵێم خاوەنی گەنجینەکان(خزائن)ی ئاسمانم و بەئارەزووی خۆم هەڵس و کەوتیان پێوە دەکەم. ناشڵێم لەغەیب و نادیار دەزانم، هەروەك ناشڵێم من یەکێکم لە مەلائیکەتەکان تاکو دوام کەون، چونکە من تەنها مرۆڤێکم.

هەروەها دەربارەی ئەوانەی کە ئێوە بەچاوی سووك وبێحورمەتیان سەیر دەکەن -کەباوەڕدارەکانن- دەربارەی ئەوان ناڵێم (خودا پاداشتی خێریان ناداتەوە) تاکو بەم وتەیە ئێوەی پێڕازی کەم، چونکە هەر تەنیا خودا خۆی بەنیازی دڵسۆزیی نێو دەروونیان دەزانێت. جا ئەگەر من بەگوێرەی خواست و داواکاری یەکانی ئێوە بجووڵێمەوە گومانی تێدا نیيە کە دەکەومە نێو گرووپی ستەمکارانەوە: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا[1] وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ[2] إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ

---

(١) (أنلزمكموها): واتە ئایا ناچارتان بکەین لەسەر وەرگرتنی؟! ئەمەش یەکەم دەقی ئاشکرایە لەئاینی خودادا کەبەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەگیز ناشێت ئاین بەزۆرکاریو بەناچارکردن بگەیەنرێت.

(٢) (لا أسألكم عليه مالاً): واتە داوای کرێیەکتان لێ ناکەم. لەم دوورەپەرێزییەی ـ نوح ـ لەوەرگرتنی "کرێ لەسەر بانگەوازەکەی" رووکارێکی پیرۆز هەیەو شایانی لێ ووردبوونەوەیە، هەروەها نیشانەیەکەلەنیشانەکانیڕاستگۆییولەخۆبڕانی و ولەخۆبوردنی بۆ خزمەتی ڕێبازی پەروەردگاری، ئەمەش ڕەوشت و ڕەفتاری هەموو پێغەمبەرانی خوداو تێکرای پیاوچاکان و چاکسازانیش بووە.

أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ[١] ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِيٓ[٢] أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمْ إِنِّيٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ هود/٢٨-٣١.

## نكوولَی كوشنده

قسه‌كانی -نوح- كاریگه‌ریی له‌سه‌ر ده‌روونی گه‌له‌كه‌ی نه‌بوو، به‌ڵكو به‌وپه‌ڕی سه‌ركێشی وبه‌ربه‌ره‌كانێ‌یه‌وه ڕه‌دیان دایه‌وه‌و گوتیان (هه‌ی نوح تۆ زۆر دژایه‌تیت كردین و درێژه‌شت پێ‌ی داوه‌و جا ئه‌گه‌ر له‌بانگه‌وازت دا ڕاستگۆیت ده ئه‌و سزایه‌مان بۆ بێنه كه هه‌ڕه‌شه‌مان لێ ده‌كه‌یت له‌سه‌ری. -نوح-یش له‌وه‌ڵامی ئه‌و به‌به‌ركانی یه‌یان دا گوتی (ئه‌م كاره ته‌نها به‌ده‌ستی خودایه، چونكه هه‌رخۆی سزاكه‌تان تووش ده‌كات گه‌ر بیه‌وێت، گه‌ر ویستیشی وابوو ئه‌وا هیچ ڕێگرێكی له‌به‌رده‌م دا نی‌یه. هه‌روه‌ها ئه‌و ئامۆژگاری‌یه‌ی كه‌من پێم گه‌یاندن سوودی نابێت بۆتان گه‌ر خودا خواستی وابێت (به‌هۆی خراپه‌ی خۆتانه‌وه كه هه‌ق په‌سند ناكه‌ن) له‌سه‌ر گومڕایی‌یه‌كه‌تان بتانهێڵێته‌وه ئه‌گه‌رچی من له‌ملاوه هیوای خێرو خۆشیشتان بۆ بخوازم. هه‌رخودای پاك و بێ‌هاوتاش په‌روه‌ردگارتانه و هه‌ر بۆلای ئه‌و له‌ڕۆژی دوایی‌دا ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌و ئه‌و كاته‌ش له‌سه‌ر كرده‌وه‌كانتان لێتان ده‌پرسێته‌وه: ﴿ قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ[٣] ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ[٤] هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾هود/٣٢-٣٤.

---

(١) (تذكرون): ئه‌رێ ئه‌وه په‌ندو عیبره‌ت وه‌رناگرن؟

(٢) (تزدري): واته به‌چاوی سووك و عه‌یب و عاره‌وه بۆیان ده‌ڕوانن.

(٣) (بمعجزين): ئێوه زه‌فه‌رنابه‌ن و ئه‌گه‌رچی زۆریش بن سه‌ركه‌وتوو نابن.

(٤) (يغويكم): گوتراوه (به‌مانای يهلككم ـ ه واته له‌ناوتان ده‌بات) گوتراویشه: به‌مانای (يضللكم) واته گومڕاتان ده‌كات)..

# سکاڵا لەلای خودا

دوای ئەوەی نوح بەدەست گەلەکەیەوە زۆر وەڕس و زویر بوو، پەنای بردە بەر پەروەردگار و داوای لێ کرد فریای کەوێت لەو ئازارانەدا کە بەدەستیانەوە دەیچێژێت، ئەوەبوو گوتی (خودایە بانگەوازی گەلەکەمم کرد بۆ باوەڕهێنان بە تۆو وازهێنان لەبت پەرستن. زۆر رژدو سووریش بووم لەسەر باوەڕهێنانیان، لەم پێناوەش دا هیچ بۆنەو موناسەبەیەکم لەکیس نەداوەو تیایدا دەعوەتم کردوون، سائیتر بەشەو بووبێت یان بە ڕۆژ، بەڵام لەباتی ئەوەی بەو (ڕژدیەو بانگەوازو داواکاریانەم لێ یان بۆ پەرستنی تۆ) بێنە سەر ڕێی ڕاست و ڕەوان، کەچی یاخی بوون و سەرپێچی کردنیان زیاتربووە، من هەر جارێك بۆ پەرستنی تۆ بانگم کردبن تاکو لە گوناهەکانیان ببوورێت، کەچی ئەوان لەجیاتی ئەوەی گوێم بۆ ڕادێرن دەستیان دەخستە ناو گوێچکەکانیانەوە تا نەبادا گوێ یان لەبانگەوازەکەم بێت، لەمەش دا زیادەڕۆیییان لەڕوو وەرگێران داکردووەو کراسەکانیان بەسەروگوێیان دا دەدا تا نەمبینن و گوێ یان لەو بانگەوازەش نەبێت کە بۆت ناردوون. بێگومان ئەوان سووربوون لەسەر ڕوو وەرگێڕانیان لە بانگەوازی خودا وخۆیان زۆر بەزل دەزانی لەبەرامبەر شوێنکەوتنم و بەدمەوەهاتنی پەیامەکەمدا. پاشان خودایە من جار لەدوای جار بانگم کردوون بۆ پەرستنی تۆ، بانگکردنیشم بەچەندین شێوازی هەمەڕەنگ و هەمەجۆر بووە، بۆ نموونە هەندێك جار بەئاشکرا لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیان دا بانگم کردوون، هەندێك جاریش بەجیاجیا و یەك بەیەك بانگم کردوون، پێم دەگوتن: (داوای لێخۆشبوون لەپەروەردگاری خۆتان بکەن، تەوبە لەکفرو سەرپێچی یەکان بکەن، چونکە خودای مەزن تەوبەی بەندەکانی وەردەگرێت و لەگوناهانیش دەبوورێت، پاداشتان لەسەر تەوبەکانتان دەداتەوەو زەوی و زارتان لەدوای وشکانی و بێ داهاتی بۆ تەڕو پاراوو بەپیت دەکاتەوە و بەماڵ وسامانێکی زۆر ڕزق ڕۆزیتان پێ دەداتەوەو ئێوەش سوودو بەخششی زۆری لێوە دەستەبەر دەکەن. هەروەها خودا کوڕونەوەیەکی زۆرتان پێ دەبەخشێت کە پاڵپشتی بەهێز دەبن بۆتان، جگە لەوەی چەندین باخ و دارستان و بێستانی پڕ بەرووبوومیشتان بۆ خۆشگوزەرانتان فەراهەم دێنێت لەگەڵ چەندین ڕووبارو جۆگەلەدا بۆ ئاودانی زەوییەکانتان:

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِيَ إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ [1] وَأَصَرُّوا وَٱسْتَكْبَرُوا ٱسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾

---

(١) (واستغشوا ثیابهم): واتە کراس و پۆشاکەکانیان بەسەر هەموو لاشەیان دا دەدا بەتایبەتی سەریان، تاکو گوێ بۆ ـ نوح ـ نەگرن و شەرمەزاری بکەن.

ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا[1] ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ[2] وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴾ نوح/٥-١٢.

## ئاوەڕ پێدانەوەیان بەلای توانای خوادا

-نوح- دوای ئەوەی سوودی "داوای لێخۆشبوون لەخودا-استغفار"ی بۆ گەلەکەی ڕوون کردەوەو جگە لەوەش ئاکام و بەرەوبوومی لەبەختەوەری ی نێو دنیاش دا بۆ بەدیارخستن، سەرنجی ڕاکێشان بەلای قودرەت و توانای خوادا تاکو بەمەیان باوەڕبێنن، ئەوە بوو پێ ی گوتن: (ئەرێ ئێوە چۆن لەگەورەیی و دەسەڵاتی ئەو خودایە ناترسن کە بەچەند قۆناغێك و لەڕێگەی پلەکانی -هەر لە- ئاولینجەکەوە تا خوێنە مەییوەکە و، تا گۆشتپارە هێناونی و خەلقی کردوون پاشان لەویشەوە ئێسقان و گۆشتی خستوونەسەر ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴾ نوح/١٣-١٤.

پاشان (نوح) بەردەوام دەبێت لەسەر دواندنیان و ئاوەڕپێدانەوەیان بەلای قودرەتی خوادا لەسەرەوویانەوە کە چۆن ئەستێرە گەڕۆکەکانی دروست کردووەو مانگی لەماوەی سووڕانەوەکانی خۆیدا سووڕاندۆتەوە تاکو زەوییان لەشەودا بۆ ڕووناك بکاتەوە، هەروەك چۆن خۆریشی کردووە بەچرای ڕۆژگارو ئێوەی لەسەر زەوی‌نیشتەجێ کردووەو خۆراکیشتانی لەو ڕووەکانەوە دەستەبەرکردووە کەلەو خاکەوە دەڕوێن، پاشان هەر دەتانخاتەوە نێو ئەو خاکە لەپاش مردنتان ولەڕێی ناشتن و (دفن) کردنتانەوە، دوایش لە ڕۆژی قیامەت دا بۆ حساب و لێپرسینەوە زیندووتان دەکاتەوە هەروەها سەیرکەن چۆن زەویی ی بۆ تەخت و ئاسان کردوون تاکو ڕێگای فراوانی بۆ بەدەست هێنانی ڕزق و بەدی هێنانی ئامانجەکانی ترتان لێوە ڕاکێشن:

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ[3] طِبَاقًا[4] ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ

---

(١) (مدراراً): واتە یەك بەدوای یەك (متتابع).

(٢) (جنات): کە کۆ (جمع)ی (جنة)یە، لێرەدا واتە (چەند باخ و بێستانێك).

(٣) (سماوات): لەعەرەبیدا وشەی (سماء) بەوە دەگوترێت کە لەسەروو مرۆڤەوە بێت و سێبەری لەسەر بکات و بەو فەزا فراوانەش دەگوترێت کە چواردەوری زەویی گرتووە.

(٤) (طباقاً): دەگوترێت (طابق طباقاً مطابقة) واتە هەنگاوێك لێی نزیك بووەتەوە یان وای لێ کردووە کەلەسەر یەك ڕێزەوبن.

ٱلشَّمۡسَ سِرَاجٗا ﴿١٦﴾ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ نَبَاتٗا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمۡ فِيهَا وَيُخۡرِجُكُمۡ إِخۡرَاجٗا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ بِسَاطٗا ﴿١٩﴾ لِّتَسۡلُكُواْ مِنۡهَا سُبُلٗا فِجَاجٗا[1] ﴾نوح/١٥-٢٠

## هەڕەشەكردنیان لە نوح

كۆمەڵێكی كەم نەبێت هیچ كەس لەو ماوە درێژەدا بەدەم بانگەوازەكەی -نوح- ـەوە نەچوو، هەروەك قورئانیش ئاشكرای كردووە ﴿ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ﴾هود/٤٠.. كەواتە زۆربەیان بەدەنگیەوە نەچوون و بگرە بەدرۆشیان دەخستەوەو تەنانەت وەسفی (شێتی)یان دەدایە پاڵ ـ نوح ـ وبەجۆرەها ترساندن و ئازاردانیش ڕێیان لەگەیاندنی پەیامەكەی دەگرت.. ﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ فَكَذَّبُواْ عَبۡدَنَا وَقَالُواْ مَجۡنُونٞ وَٱزۡدُجِرَ[2] ﴾القمر/٩. هەروەها هەڕەشەی بەردباران (ڕەجم كردن)یان لێ كرد: ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ﴾ الشعراء/١١٦. بەڵام ـ نوح ـ هیچ باكی لەم هەڕەشەو گوڕەشەیە نەبوو، بەڵكو بەباوەڕە پتەوو پۆلاینەكەیەوە بەرەوڕوویان بووەوەو گوتی: (گەلۆ.. ئەگەر وجودی من لەنێوانتان دا (بۆ گەیاندنی پەیامی پەروەردگارم پێتان) بووەتە شتێكی ناڕەحەت لە سەرتان، ئەوا من وای نابینم و، بەڵكو هەر بەردەوام و جیددیم لەسەر بانگەوازەكەم و پشتم بەخودا بەستووە. جا ئێوەش چیتان بۆ دەكرێت بیكەن و لەسەر كاری خۆتان سووربن و ئەوەی بەخەیاڵتان دا دێت پێم بكەن و بەسەرمی بێنن، ئیتر پشت بەهاوبەشەكانیشتان ببەستن لەوانەی باوەڕیان بەوە خواوەندە باطل و بێناوەڕۆكانە هەیە، باهیچ پەنهایی یەكیش لەدژایەتی كردنم وئازاردانم دا نەبێت، بەڵكو بەئاشكرا پێی بەرەو ڕووم ببنەوەو هیچ مۆڵەتێكی دواخستنم بۆ دامەنێن. بەڵام دڵنیابن هەرگیز ئێوە ناتوانن نیازی خۆتان لە دژی من بەدی بێنن، چونكە خودای پەروەردگارم بەڕەحمەتی خۆی سەرپەرشتی ی من دەكات، جا ئەگەر هەر ڕوو لەو بانگەوازەم وەرگێرن ئەوە هیچ زیانێك بەمن ناگەیەنێت، چونكە من بۆ مەسەلەی (بەدەست هێنانی پاداشتی خۆم لە ئێوە) ئەم كارەم ڕانەپەڕاندووە، بەڵكو پاداشتی ی من هەر لەلای خودا خۆیەتی كە فەرمانی

(١) (فجاجاً): واتە فراوان، كۆی (فج)ـە كە بەرێگایەكی فراوان دەگوترێت.
(٢)(ازدجر): واتە ڕێی لێ گیرا بەجنێوولێدان و هەڕەشەی ڕەجمكردنی گەر واز نەهێنێت.

پێکردووم تـەنها ملکـەچ و فەرمانبـەرداری خـۆی بم: ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ[1] عَلَيْكُم مَّقَامِى[2] وَتَذْكِيرِى بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوٓا۟ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً[3] ثُمَّ ٱقْضُوٓا۟ إِلَىَّ وَلَا تُنظِرُونِ[4] ﴿٧١﴾ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ یونس/٧١-٧٢.

(١) (كَبُـرَ): لێرەدا واتە: (گەر ئەركی پێغەمبەرێتی ی من لەسەرتێوە قورس و ناڕەحەت بووەو پێی وەڕس بوون، ئەوە من باكم لەوە نی یە).

(٢) (مقامي): واتە (اقامتي) بەمانای ژیان و گوزەرانم لەنێوتان دا.

(٣) (غمة): واتە هیچ ئاتاجێكم بەوە نی یە كە كاردانەوەتان شارراوەو نادیار بێت وپێویست بەدڵـەڕاوكێ و واق وڕمانیش ناكات.

(٤) (اقضوا الي ولا تنظرون): واتە بەردەوام بن لەسەر بەدی هێنانی ئەو نیازانەی نێو دڵتـان بەرامبـەر بـە من و چی دەكەن بیكەن و هیچ دوام مەخەن.

# بەندی دووەم

## ((لافـاوەکە))

( نزاکردن لەبەدرۆخەرەوان – دروست کردنی کەشتیی ڕزگاربوون – دەسپێکردنی لافاوەکە – ڕوودانی لافاوەکە – سەرنگووم بوونی کوڕەکەی (نوح) – (نوح) داوای ڕزگاربوونی کوڕەکەی دەکات – کۆتاییهاتنی لافاوەکە – دابەزین لەکەشتی یەکە – دۆزینەوەی چەند شوێنەوارێکی لافاوەکە لەعێراقدا )

## نزاکردن لەبەدرۆخەرەوان

دوای ئـەوەی (نـوح پێغەمبـەر) (سـڵاوی خـوای لێ بێـت) ئەوپـەڕی کۆشـشی لـەپێناوی ڕێنماییکردنی گەلەکەیدا خستەگەڕ و دوای ئەوەش هەموو ڕێگەیـەکی بـەردەمی بـۆ ڕاست کردنەوەیان تەنگ دەبووەوە، ئیتر پەنای بردەوە بـەر پـەروەردگاری خـۆی و سـکاڵای لەدەست گەلەکەی لەلا کـردن: ﴿قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾الـشعراء/١١٧-١١٨.. واتـە: (-نـوح- گـوتی: خودایـە گەلەکـەم بـەدرۆیان خستوومەوە، جا تۆش حوکمی خۆت لەنێوان من و ئەوان دابدەو خۆم و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵم دان ڕزگاربکە).

هەروەها نزای تیاچوونی لەو گەلـەی کـرد: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا[1] ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾ نـــوح/٢٦-٢٧. نزاکەی ـ نوح ـ هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە مانای ئەوە دەگەیەنێت داوا لـەخودا دەکـات کـە تاکەکەسێکیش لەکافران لەسـەرزەوی نـەهێڵێت، چـونکە گـەر خـودا واز لـەکافران بێنێـت و ئەوانیش لەگومڕایی خۆیان دا ڕۆبچن ئەوا کەسانی تریش لەسەر هەق لادەدەن و گوناهی خۆیان لەهەموو شوێنێك بڵاودەکەنەوەو فەسادو خراپەیان بـەمیرات بـۆ وەچـەو کـوڕو نەوەکانیـشیان بەجێدێڵن، چونکە ئەوان هەر منداڵ و نەوەی کافرو بەڕەفتار دەخەنەوە.

---

(١) (دیّارا): واتە هەرکەسێك کە نیشتەجێی خانوویەك بێت، واتە کەسیان لێ مەهێڵەرەوە.

## دروستكردنی كەشتیی ڕزگاربوون

خودا نزاكەی -نوح-ی پەسندكرد و دووعاكەی بەجێگەیاند.. بەڵام پێش ئەوەی گەلە بەدرۆخەرەوەسەركەشەكەی لەناوببات خواستی پەروەردگار وابووكە بەپەیامی خۆی هۆیەكانی ڕزگاربوون بۆ (نوح) وباوەڕداران سازكات..

ئەوە بوو خودا سروشتی بۆ نارد كە ئیتر كەسی دی باوەڕناهێنێت و نابێت بەهۆی ڕەفتاری بەدرۆخستنەوەی كافران و ئازار بەدەست چەشتنیانەوە دڵتەنگ بێت، چونكە خودا هەموویان سەرنگووم دەكات. هەربۆیەش خودا فەرمانیدا بە (نوح) كەبا كەشتی یەكی ڕزگاربوون دروست بكات. هەواڵی ئەوەشی پێدا كەلەكاتی دروست كردنی كەشتییەكەدا لەژێر سەرپەرشتیو پارێزگاریی خودا خۆی دایە، هەروەها داوای لێ كردبانگی هیچ كەسێك لەكافران بۆ ڕزگاربوون نەكات دوای ئەوەی ڕژدبوون لەسەر كفرو بێباوەڕییان، چونكە حوكمی سەرنگووم بوونی بەسەردا داون. (نوح) دەستی كرد بەدروست كردنی كەشتییەكەو هێنانی تەختەو داروبزمارو، وەك دارتاشێك كاری دەكرد. ئەم گۆڕانكارییەش لەهەڵس و كەوتیدا كە لە (بانگەوازكارێكی دینی خودا) وە ببوو بە (دارتاشێك) هۆیەك بوو بۆ سەرسام بوونی كافران و پاشان گاڵتە پێكردنی. (نوح)یش لەبەرامبەر گاڵتەپێكردنیان دا پێی دەگوتن (ئەگەر ئێوە گاڵتە بەمن و بەو باوەڕدارانەی لەگەڵم دان دەكەن، ئەوا ئێمەش بەم زوانە گاڵتەتان پێدەكەین، چونكە من ئەزانم چیتان بەسەر دێت و چ سزاوتیاچوونێك چاوەڕێتان دەكات، ئیدی ئەوسا دەزانن كێیە تووشی سزایەكی وەها دەبێت كە لەدنیادا سەرشۆڕو سەرگەردانی دەكات و لە ئاخیرەتیش دا تووشی سزایەكی هەمیشەیی و نەبڕاوە دەبێت:

﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ[1] بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا[2] وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾ وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟

(١) (فلا تبتئس): واتە "هێندە دڵتەنگ و پەرێشان مەبە".
(٢) (بأعيننا): واتە لەژێرچاودێری و سەرپەرشتیمان دایت.

مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ [1] وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ [2]﴾ هود/٣٦-٣٩.

## دەسپێکردنی لافاوەکە

(نوح) لەدروست کردنـی کەشـتی یەکـە بـووەوەو ئینجـا نیـشانەکانی دەسـپێکردنی سـزا دەرکەوتن، کە تەقینەوەی ئاوبوو لەژێر زەوی یەوە، خـوداش خێـرا فـەرمانی بـە (نـوح) کـرد کەلەهەر جۆرێکی گیانەوەران و ئاژەڵان جوتێك (واتە: نێرو مێیەك) لەگـەڵ خـۆی لەکەشـتی یەکەدا هەڵگرێت تاکو دوای سەرنگووم بوونی هەموو زیندەوەرانی سەرزەوی بێننـەوەو زاووزێ بکەن و بەم ڕەنگەش جۆرو ڕەگەزیان لەسەر زەوی بمێنێت و قڕیان تێ نەکەوێت. هەروەها خودا فەرمانی ئەوەشی بە (نوح)دا، کە هەموو کەس و کاروخزمان و ئاشنایانی لەباوەڕداران لەگـەڵ خۆی لەگەشتی یەکەدا هەڵگرێت تەنها دووکەسیان لەو (کەس و کارە نزیکانـەی) هەڵنـەگرێت چونکە باوەڕیان بەخودا نەهێنابوو، ئەو دوو کەسەش یەکێکیان هاوسـەرەکەی (واتـە ژنەکـەی خۆی) ودووەمیشیان یەکێك لەکوڕەکانی بوو. بێگومان دیارە خودا فەرمانی پێدابوو ئەو چەند باوەڕدارەی تریش هەڵبگرێت کـە لـەخزم و کـەس و کـاری نـەبوون و ژمارەشـیان کـەم بـوو، (نوح)یش کەشتی یەکەی ئامادەکردو بەئیمانـدارانی گـوت (سـواربن و خۆتـان بـەیادی خـودا سەرفراز کەن ولەکاتی ڕۆشتنی کەشتییەکەو لەکاتی وەستانیشی دا ناوی خودا بێنن، تەبەڕوك بەناوە پیرۆزەکەی بکەن) چونکە خودی کەشتی یەکە تاکە هـۆی دەسـکەوتنی ڕزگـاری نییـە، بەڵکو هەموو دڵیان ئاڕاستەی خودا بکەن و هەر خوداش لێخـوڕو ڕاگیرکـاری کەشـتییەکەیە. جگە لەمـەش (نـوح) بـەیادی خـستنەوە، کـەخودا زۆر لێبـوردوو بەڕەحمـە بەرامبـەر بەنـدە باوەڕدارەکانی، بەتایبەتیش کاتێك لەو تیاچوونە ڕزگاری کردوون، پاشان دوای ئـەوەی ئاوەکـە

---

(١) جـوان وردبـەرەوە لەدەسـتەواژەی (عـذاب يخزيـه) واتـە: (سـزایەك سەرشـۆڕی دەكـات) هەنـدێك سزا(عـذاب)،کە پێغەمبەران و موجاهیـدانی ڕێی خـودا بەدەسـت سـتەمکارانەوە دەیـچێژن ئـەوا هـەر ئـەو سزایەیە، کە(سزادراوان) دەگەیەنێتە پلـەی بـەرزی ئینـسانی و هـەر ئـەم سـزایەش سـزایەکی شـیرین کـراوو سەربەرزی یەلەلای ئەو ئالوودەبوانەی، چونکە لەدوای ئەم سزایە ژیانێکی خۆشـیو شـادمانیی هەمیـشەیی لەئاخیرەت دا هەیە، بەڵام ئەو سـزایەی، کەتووشـی سـتەمکاران دەبێـت سـزایەکی سەرشـۆڕکەرەو لـەدنیادا پـەردەیان لەسـەر ڕوو هەڵـدەماڵێت. جگەلـەوەش، کەلـەڕۆژی دوایـیش دا سـزایەکی ئێجگـار سـەخت تـرو کاریگەرتریان تووش دەبێت.

(٢) (مقيم): واتە (دائم) بەمانای سزایەکی هەمیشەییو نەگۆڕ.

گەیشتە ناوەڕاستی شەپۆلێکی زۆر توندی وەهاوە کەلە قەبەیی وبەرزی دا لەئاست قەبەیی و بەرزی چیاکان دا بوو، کەشتی یەکە دەڕۆشت:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ (١) قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ (٤٠) ۞ وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ (٤١) وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ ﴾ هود/ ٤٠-٤٢.

## ڕووداني لافاوەکە

هەورەها قورئان هەواڵی ئەوەشی بۆ گێراوینەوە کە کاتێك -نوح- نزای لەکافران کرد لەلای خوداو داوای لێکردبوو کە تۆڵە لەگەلەکەی بسێنێت، خوداش نزاکەی گیراکردو لەئاسمانەوە بارانێکی زۆروبەلێشاوی وەهای ناردەخوارەوە کە هەرگیز لەوەوپێش زەوی بارانی وای بەخۆوە نەدی بوو، هەروەك خودا فەرمانی بەزەویش کرد کەلەهەموو بەشەکانیەوە ئاو بتەقێنێتەوەو ئیدی ئاوی ئاسمان و ئاوی زەویش یەکیان گرت و کۆبوونەوەو تا ئەو لافاوە گەورەیەی لێ پێك بێت کە خودا بەو ئەندازەیە دایناببوو بۆ لەناوبردنی بێباوەڕان، ئەمەش لەسەر داواکاری ی پێغەمبەرەکەی خۆی،جگە لەسازکردنی ڕێی ڕزگاربوون بۆ (نوح)و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵی دا بوون بەهۆی ئەو کەشتی یەوەی کەبەچاودێری و پارێزگاریی خودا دەڕوشت. خودا ئەم بەسەرهاتەی دیاری کردووەو فەرموویە:

﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ (١٠) فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ (٢) (١١) وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ (١٢) وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ (٣) (١٣) تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا (٤) جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴾القمر/ ١٠-١٤.

---

(١) (وفار التنور): سەرچاوەی ئەم فەرمان (فعل)ـە کە لە (فورـ و ـ فوران)ـەوەیە مانای بەرزبوونەوەی بەهێز دەگەیەنێت، ئەم وتەیەش کاتێك بۆ ئاو بەکاردێنرێت ئەگەر هەڵقولێت و بڕواتو بەرزبێتەوە. وشەی (تنور)یش مانای سەرووی زەوی دەگەیەنێت، کەواتە (فار التنور) واتە: (زەوی لەهەموو جێگا جۆربەجۆرەکانیەوە ئاوی هەڵقولاند).

(٢) (ماء منهمر): بارانێکی ئیجگار زۆری خێرا وبەلێزمە.

(٣) (ذات الواح ودسر): مەبەست لەم وەسفە کەشتی یەکەیە. (دسر) کۆی (دسار)ـە ومانای بزمار دەگەیەنێت. گوتراویشە (دسر) لایەنەکانی کەشتی یەکەیە.

(٤) (تجري باعيننا): واتە: کەشتی یەکە لەسەر ئاوەکە بەچاودێری و پارێزگاریی ئێمە دەڕۆیشت.

# سەرنگوم بونی کوڕەکەی "نوح"

(نوح) لەسەرەتای لافاوەکەدا کوڕەکەی خۆی بیرکەوتەوەو سۆزی باوکایەتییش وای لیٚ کرد بانگی لیٚ بکات بۆ سواربوونی نێو کەشتی یەکە لەگەڵ تەواوی کەس و کاری دا، بێگومان ئەو کوڕەش بەهۆی سوربوونی یەوە لەسەر کفر دووربوو لەکەشتی یەکەوە، بۆیە (نوح) پێی گوت (کوڕم سواربە لەگەڵمان دا تاکو لەسەرنگووم بوون ڕزگاربیت، لەگەڵ ئەو کافرانەدا مەبە کە دانیان بەدینی خوادا نەناوە).. بەڵام ئەو کوڕە بەدەم هاواری باوکی‌یەوە نەهات و سووربوو لەسەر یاخی‌بوون، سەبارەت بەڕووداوەکەش وای گومان دەبرد کە ئەوە چەند کارەساتێکی ئاسایی‌ی سروشتی بێت، لەبەر ئەوە بەتەما بوو بەبێ سواربوونی کەشتی‌یەکە ڕزگاری ببێت، ئینجا بەباوکیشیی گوت (من پەنا دەبەمە بەر چیایەك کە ئاوی لافاوەکەی پێ‌ناگات و لەسەرنگووم بوونیش ڕزگاربیم) بەڵام باوکی وەڵامی دایەوە و پێی‌گوت (هیچ هێزێك نی‌یە بتوانێت کەسێك لەو سەرنگوومی یە ڕزگار بکات، کە خودا وەك سزایەك بۆ بێ‌باوەڕانی داناوە). وەلیٚ کوڕەکە هەر نەیویست بەدەم هاوارەکەی باوکی‌یەوە بچێت، گومانیشی وابوو، کە بەتەقەللای گەیشتنە سەر لوتکەی چیاکە لەغەرق بوون ڕزگار دەبێت. بەڵام هێزی ئاوەکەو هەڵچوونی شەپۆلەکان ئەو کوڕە گومڕاو بێ باوەڕەی لوول دا:

﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ[1] ﴿٤٢﴾ قَالَ سَآوِي إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾هود/٤٢-٤٤.

---

(١) لەم بارەیەوە گوتراوە: (نوح ـ بەکفرو بێ‌باوەڕی ی کوڕەکەی خۆی نەزانیبوو، واتە کاتێك بانگی دەکرد بۆ نێو کەشتی یەکە نەیدەزانی، کە باوەڕی نەهێناوە، چونکە کوڕەکەی ئەو بێ‌باوەڕێتی و کافرێتی یەی خۆی لەلا ئاشکرا نەکردبوو. دەنا نوح پێی نەدەگوت (لاتكن مع الكافرين)، واتە: (لەگەڵ کافران دا مەبە).

## (نوح) داوای ڕزگاربوونی کوڕەکەی دەکات

سۆز و بەزەیی یەکی زۆر لەدڵی ـ نوح ـ دا خرۆشا کاتێـك دیتـی ئـەوا خەریکـە کوڕەکـەی لەناودەچێت. بۆیە بەملکەچی یەوە لەخودا پاڕایەوە کە کوڕەکەی ڕزگار بکات.. ئـەی مەگـەر لەوەپێش خودا خۆی بـەڵێنی ڕزگـارکردنی خـۆی و کـەس و کاریـشی پـێ نـەدابوو؟ ئـێ خـۆ کوڕەکەشی یەکێکە لەو کەس وکارەی و خوداش بەڵێن لەسەر هەر شتێك بدات دەیباتـە سـەر، چونکە دادخوازترینی حاکمانە. بەڵام خودا لەوەڵامی ـ نوح ـ دا هەواڵی ئـەو ڕاسـتی یـەی پـێ دەدات کە (کوڕەکەی بێباوەڕەو مادام بێباوەڕیشە ئەوا بەیـەکێك لەکـەس و کـاری دانانرێـت لەوانەی کە خودا بەڵێنی ڕزگاربوونیانی پێداوە، چونکە کوڕەکەی نەك هەر بـاوەڕی نـەهێناوە بەڵکو سووریش بووە لەسـەر کفـرو بێبـاوەڕی، جگـە لـەوەش چـەندین کـرداری ناهـەمواری هەبووە). پاشان خودا ڕێگە لە (نوح) دەگرێت، کـە داوایـەك نـەکات ئەگـەر دڵنیانـەبێت لـە شیاوی و ڕەوایی ی ئەو داواکاری یەی، هەروەها ئاگاداریـشی کـردەوە لـەوەی نەکەوێتـە نێـو کۆمـەڵی نەزان و ستەمکارانەوە (ئەوانەی شـەفاعەت لەسـەر سـزای خـودا دەکـەن ئەگەرچـی تاوانبارەکە کوڕیشیان بێت) هـەروەك نابێـت، کـە ـ نـوح ـ وەك ئـەو جـۆرە کەسـانە (سـۆزی باوکایەتی)یەکەی بەسەر خواستی حوکمی خوادا لەسەر زاڵ ولەپێشتر بێت، بێگومـان ـنـوحـ بـەم نـەهی و ئاگادارکردنەوەیـەی خـودا پەشـیمان بـووەوە لـەو (داواکـاری یـەی تایبـەت بەڕزگارکردنی کوڕەکەی) و دانی بە گوناهەکەشی داناو گوتی (خودایە مـن هـەر پـەنا بـە تـۆ دەگرم و خۆم دەخەمە ژێرسایەی پشتیوانی و پارێزگارییی تۆوە گەر لەمەولا داوای شتێکت لێ بکەم کە پێی ڕازی نەبیت. جائەگەر لێم نەبووریت و بەـ فضل ـ و بەخششی خـۆت ڕەحـم پـێ نەکەیت ئەوا لە کەسانی خەسارەتمەندو ڕەنجەڕۆیان دەبم):

﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ (١) فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ

---

(١) (انه عمل غير صالح): ئەمـە وەڵامـی خودایـە لەبەرامبـەر نـزای ـ نـوح ـ دا دەربـارەی ڕزگـاربوونی کوڕەکەیو هەر لەمەشدا ئاماژەیەکی ئاشکرا هەیە لەسەرئەوەی ناشێت مرۆڤی باوەڕدار داوای ئەو شـتانە لـە نزادا بکات کەپێچەوانەی ڕێساکانی خودان لەنێو مەخلووقاتی دا، هەروەك ناشـێت داوای شـتێك بکـات کـە بەپێی (شەرع) حەرام کرابێت.

أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ هود/٤٥-٤٧.

## کۆتایی هاتنی لافاوەکە

کاتێك بەهۆی سەختی و کاریگەریی ی لافاوەکەوە هەموو کافران لەناوچوون و نەمان، خودا فەرمانی بەزەوی کرد کە ئاوەکەی قووت بداتەوەو فەرمانی بەئاسمانیش کرد کە چیدی باران نەبارێنێت و دەستی لێ هەڵگرێت، بەم ڕەنگەش ئاو لەزەویدا نەما دوای ئەوەی خودا بڕیاری لەناوبردنی ستەمکارانی داو کەشتی یەکەش لەسەر چیای ناوبراو بە (چیای -جودی-) گیرسایەوە. لەو چرکەساتانەدا بەزمانی "قودرەتی خودایی" یەوە بەوکافرە لەناوچوانە گوترا: ((هەر لەناوچوو و دووربن لەڕەحمەت و لێخۆشبوونی خودا، ئەی کافرانی گومڕا)) هەروەك خوداش لەوەسفی ئەو چرکەساتانەدا فەرموویە: ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِيِّ[١] وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هود/٤٤. واتە (فەرمان کرا بەزەوی‌و پێی گوترا (ئەی زەوی ئاوەکەت هەڵمژەو ئەی ئاسمان تۆش دەست هەڵگرە لەباران). ئیدی ئاو کەم بووەوەو چووە ژێر زەوی یەوەو کاری تەفرو تووناکردنی بێباوەڕان ئەنجام درا، پاشان کەشتی یەکە لەسەر چیای (جوودی) گیرسایەوەو جێگیربوو، لەدوایی دا گوترا: (هەرِ قڕکراوو لەناوچووبن گەلی ستەمکار).

## دابەزین لەکەشتی یەکە

دوای ئەوەی کەشتی یەکە لەسەر چیاکە ڕاوەستاو زەویش ئاوی لافاوەکەی هەڵمژی، خودا فەرمانی بە (نوح) کرد، کەلەکەشتی یەکە دابەزێت و بچێتە سەرزەوی. ئەویش لەسەر خاکی "موصل" دابەزی و خێروبەرەکەتی خوداش بەسەر خۆی و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵی دابوون ڕژاو بەسەر ئەو وەچەونەوەپاکانەش دا ڕژاوە کە چەندین نەتەوەی باوەڕداریان لێ بۆتەوەو بەردەوام لێشیان دروست دەبێتەوە، هەندێك نەتەوەش تەنها لەدنیادا تام وچێژی خۆشی‌یەکانی

(١) (جودي): کە چیایەکە لەکوردستانی تورکیا، بەڵام دانەری ئەم کتێبە لەم پەراوێزەدا دەڵێت: (جبل بالموصل کان معروفا فی القدیم). (وەرگێڕ)

ژیان دەچێژن، بەڵام بـەپیت وبەرەکـەتی خـودا شـادنابن چـونکە لەسـەر ڕێی ڕاسـت لادەدەن وشەیتان فریویان دەدات و دەیانبات بەرەو سـزای خـودا چ لـە دنیـاو چ لـە ڕۆژی دوایـش دا. هـــەروەك خـــوداش فەرمووییـــە: ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾هود/٤٨.. واتە: (فەرمان کرا بەنوح و پێی گوترا: (ئەی نوح بەئاشـتی و ئاسایـشی ئێمـەوە لەکەشـتییەکە دابـەزەو بەچـەند خێـرو بەرەکەتێکی جێگیریشەوەبۆ خـۆت و ئـەو گـەل و نەوانـەی کـە لـەتۆوە پەیدادەبنـەوە. چـەند گەلێکی دیکەش لـە ئـارادا دەبـن کەخۆشـی و نـازو نیعمـەتیان پـێدەدەین و بـەڵام بـەهۆی بێباوەڕیو ستەمکاریی خۆیانەوە تووشی سزایەکی سەختیان دەکەین).

## پوختەی چیرۆکەکە

خودا لەکۆتایی چیرۆکەکەدا ڕووی گوتار (خطـاب)ی دەکاتـە دوایـین پێغەمبـەری خـۆی -محمدﷺ- و دەفەرمووێت (ئەم چـیرۆکەی کـەدەربارەی (نـوح) و گەلەکـەی بۆمـان گێڕایتـەوە لەهەواڵکانی نادیار (أخبار الغيب)ـە.. تۆش نەخۆت و نەگەلەکەشت ئەم چیرۆکەتان بەم شێوە ڕاست و دروست و لێکدانەوەیەی لەمەوپێش نەبیستبوو کەوا بەسرووش بۆمان ناردوویـت، جا تۆش ئەی (محمد) لەسەر ئازاردانی گەلەکەت ئارام بگرە وەك چۆن (نوح) لەپێش تـۆدا ئـارامی گرت، چونکە بێگومان سـەرەنجامی کـاری تـۆش هـەر سـەرکەوتنە وەك (نـوح). سـەرەنجامی باشیش هەمیشە بۆ خواپەرسـتانە): ﴿تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ[1] لِلۡمُتَّقِينَ﴾ هود/٤٩.

بێگومان خودا بەڵێنەکەی بەجێگەیاندو پێغەمبەری خۆی (محمد ﷺ)ی بەسەر دوژمنانیدا سەرخست وەك چۆن لەوەو پێش -نوح-ی سەرخستبوو. ئەو بەڵێنی سەرخستنە لەگـەورەترینی ئەو بەڵێنانەیە کە دەربارەی قورئان دەهێنرێنەوەو کەوا سرووشێکی خـودایی (وحـي الهـي)یـەو ناردنی -محمد-یش ﷺ ڕاستی یەکی تەواوو حەقیقەتێکە، چونکە خودا لـەو سرووشـەدا (کـە قورئانە) هەواڵی چەند کاروبـارێکی نادیـارو نـەزانراوی ڕاگەیانـدووە کـە ڕوودەدەن و دوایـش بەڕاستی ڕوویان داوە، دیارە نادیار (غەیب)یش کەس نایزانێت تەنها خودا نەبێت.

---

(١) (العاقبة): سەرەنجام و عاقیبەت واتە سەرفرازی لەدنیاداو سەرکەوتنی ئاخیرەت.

## دۆزینەوەی چەند شوێنەوارێکی لافاوەکە لەعێراق دا

ئەوەی لەقورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەوە زانراوە دەربارەی بەسەرهاتەکە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە لافاوەکـە تـەنها گەلەکـەی (نـوح)ی گرتۆتـەوە، ئەمـەش وا ناگەیـەنێت کـە لافاوەکە بەگشتی هەموو ناوچەکانی سەرزەوی گرتبێتەوە، چـونکە هـیچ بەڵگەیـەکیش نییـە لەسەر ئەوەی مـرۆڤ لەهـەموو ناوچـەکانی زەوی دا ژیـابن، بـەڵکو لەناوچـەیەکی تایبـەتی و سنووردراردا ژیاون، ئەویش ئەو ناوچەیەیە کە بەر لافاوەکە کەوتووە. هیچ کەسێکیش لەزانایان جورئەتی ئەو تێڕوانین و بۆچوونەی نـەبووە لەسـەر ئـەوەی دەشـێت گـەر بەڵگەیـەکی مـاددی بەدەست خرێت بۆ سەلماندنی ڕوودانی فیعلی ی لافاوەکە، چونکە وا دیـارە (دۆزینـەوەی چـەند ئاسەوارێکی مێژوویی بۆ سەلماندنی ڕوودانی لافاوە گەورەکە) لە مەحاڵ و نەشیاوەکان بێت.

کاتێـك (سـێر لیۆنـارد وولـی)یـش لەسـەرەتای سـاڵی (١٩٢٠ز)دا هـات بـۆ عێـراق و سەرکردایەتی وەفدێکی نێرراوی دەکرد کـە مۆزەخانـەی بـەریتانیاو زانکـۆی "پەنـسلڤانیا"ی ئەمەریکاش بەشداربوون تیای دا بەمەبەستی بیرکردنەوە لەچـۆنیەتی و شـوێنەواری لافاوەکـە نەبوو، بەڵکو مەبەست لەناردنی ئەو وەفدە گەڕان بوو بەدوای بەشێك لەمێژووی ڕابردوودا. ئەو چاڵانەی لەچەند بەرزایی یەك هەڵی کەندبوون کە ماوەی چـوار میـل لەسـەروو (ئـوور)ـەوەن لەجێگایەك دا کە بەناوی (تل العبید) ناسراوەو هەورەها ئـەو چـاڵانەش کەلەشـاری (ئـوور)دا هەڵی کەندن لەو جێگایەی کە چەند گۆڕستانێکی شاهانەی تێدابوو، هەموو ئەو چاڵانە بوونـە هۆی دۆزینەوەی چەند چینێك لە قوڕاو بەقووڵایی یـەکی گـەورە، کـە بڕێکـی زۆری لـەقاپ و دەفرە گڵێنەکان و کەرەسە بەردینە پارێزراوەکانی داپۆشی بـوو، لـەو ئـامرازو ئامێرانـەی کـە لەچاخی بەردین(العصر الحجري)دا بەکارهێنراون، هەروەها چەند پەیکەرێك لەقوڕی سوورکراو و چەند پارچەیەك لەو دیوارە بەقوڕ سواغ دراوانەی کە شوێنەواری داری چیغیان پێـوە بـووەو بـە پاڵەپەستۆ لەسەریان دانراون. پشکنینی میکرۆسکۆپیش دەری خستووە کە هـەر ئاوەکـە ئـەو قـوڕو لیتاوانـەی (بەتـەڕی یـان بەوشـکی) خـستۆتە ژێـر چـەند چـینێکی زەوی یـەوەو کۆیکردوونەتەوە، ئەمەش چەند مادەیەکی تێدا بووە کە ئـاو لەناوچـەی ناوەڕاسـتی ڕووبـاری (فورات)ـەوە ڕای ماڵیون. هـەموو ئەمانـەش بەڵگەیـەك دروسـت دەکـەن کـە دژی وجـودی لافاوێك نی یە کەوا لە سەردەمێکی دوور لەوەوبەرەوە هـەموو ئـەو ناوچـانەی داپۆشـی بـوو. توێژینەوەکانی (سێرلیۆنارد) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە بەرزایی لافاوەکە لـە (بیـست وپێـنج

پێ) کەمتر نەبووە.

هەر بەڕای (سێر لیۆنارد) لافاوەکە هەموو دنیای نەگرتۆتەوە، بەڵکو لافاوێکی بەهێزی باران بووە کە سەرتاپای دۆڵی نێوان (دیجلە) و (فورات)ی گرتۆتەوەو هەموو ئەو ناوچە قەرەباڵغە ئاوەدانەی کەوتۆتە نێوان چیاکان و بیابانەوە سەرنگووم کردووە.

ئەم ناوچەیەش بەنیسبەت دانیشتوانەکانیەوە بەهەموو دنیا دانراوە. دانیشتوانی ئەو دۆڵەی نێوان دوو ڕووبارەکەش دوای لافاوەکە بەسەرهاتی لافاوەکەیان لەسەر دوازدە تەختە (یان تابلۆ) نووسیبووەوە وتیایدا باسی سەرنگووم بوونی گشت دانیشتوانی ئەو ناوچەیەیان کردووە کە تەنها پیاوێکی خواپەرست و کەس و کاری و چەند کەسێکی کەم و هەندێك لەگیانەوەران و ئاژەڵان ڕزگاریان بووە بەهۆی ئەو کەشتی یەوەی کە پیاوە خواپەرستەکە (واتە -نوح-) دروستی کردووە و سواری بوون، هەر ئەمانیش بەتەنها ڕزگاربوونیان بۆ نووسرابوو.[1]

---

(١) ئەم چەند دێرە کەمەی دوایی لەکتێبی (ئەو زەویەی لەسەریی دەژین) ــ ڕۆث مۆر ــ وەرگێڕانی (اسماعیل حقي). ل٢٦ـ٣٥ وەرگیراوە

# بەندی سێیەم

## ((چەند پەندو وانەیەك))

( ڕەوانبێژیی قورئان لەوەسفی لافاوەکەدا - چەند ڕاستییەکی زانستیی قورئان -
یەکسانی لەنێوان چینەکان دا - وانەیەك لەهێزی خۆڕاگری - کودەتا بەسەر
پەیوەندییە نادروستەکانی کەسایەتیو خزمایەتی دا )

### ڕەوانبێژیی قورئان لەوەسفی لافاوەکەدا

لافاوی "نوح" دیارترین ڕووداوی مێژوویی یەو توندترین کاریگەرییشی لەدەروونی ئینسانی دا هەیە، نەخاسمە لەو ڕووەوەی دژوارترین سزایە لەو سزایانەی کەوا خودا تووشی کافرانی کردووە، هەروەك لەنیشانەکانی قودرەتی بێهاوتای خوای گەورەشە:﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾الفرقان/٣٧.. واتە (هەورەها گەلی(نوح) کاتێك پێغەمبەریان بەدرۆخستەوە بەئاووباران سەرنگوومان کردن و کردمانن بەپەندو عیبرەت بۆخەڵکی وسزایەکی سەختیشمان لەئاخیرەت دا بۆ ستەمکاران ئامادەکردووە).

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ[1] ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾ القمر/٩-١٤.
واتە: (پێش ئەم بێباوەڕانەی سەردەمی تۆ (ئەی پێغەمبەر) گەلەکەی -نوح- ئەو بەندە نێرراوەی منیان بەدرۆ خستەوەو باوەڕیان پێ نەهێناو گوتیان ئەمە کابرایەکی شێتەو دەریان کرد و نەیانهێشت، کە پەیامی خودایان پێ بگەیەنێت. ئەویش(واتە نوح) هاواری لەخودای

---

(١) (ازدجر): واتە دەرکراو بەڕوویا هەڵشاخان.

پەروەردگاری کردو گوتی ئەوا من بەزێنراوم و تۆڵەم بۆ بسێنەرەوە، ئێمەش لە تۆڵەی دا دەروازەکانی ئاسمان (واتە هەورەکانمان) بەگەڕخست و ئاوێکی زۆرو بارانێکی بەلێزمەمان بەسەردا باراندن، هەروەها چەندین کانیمان تەقاندەوەو زەویمان لێك هەڵتەقاندو ئیتر ئاوی زەویو ئاوی بارانەکەش پێکگەیشتن لەسەر بەجێهێنانی فەرمانێك کەلەوەوپێش دەرمان کردبوو بۆ سزادانی ئەو گەلە ستەمکارە بە سەرنگووم کردنیان. (نوح)یشمان سواری ئەو پاپۆڕە کرد کەبەتەختەو بزمار بەشێوەیەکی مەحکەم دروست کرابوو، بەلاّم کەشتی یەکە لە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری ئێمەدا دەڕۆیشت. ئەو سەرنگووم کردنەش سزایەك بوو بۆ ئەو کەسانەی کافر بووبوون). چەند قەشەنگە ئەو وێنەیەی، کە قورئان بۆ لافاوەکەی کێشاوە.. بارانێك لەئاسمانەوە، بەلاّم نەك وەك باران بێت، بەڵکو ئاوێکە ئێجگار زۆر کە لافاوێکی بەهێزو لوول دەری هەر شتێك بێت، لەملاوە زەویش ئاوی بەخوڕ لێوە هەڵقولێت، نەك هەر لەیەك جێگایشیەوە، بەڵکو لە چەندین جێگای هەمەجۆری یەوە، هەروەها تەنانەت هەر لەو زەوی یەوە چەندین کانیاوی بەهێز بتەقێتەوەو لافاوەکە بەهێزترکەن.. جا ئەگەر لەقورئان دا وا بهاتبایە، کە (ئێمە کانی یەکانی زەویمان تەقاندەوە– وفجرنا عیون الأرض) ئەوا مانای خوازراوی نەدەبەخشی، چونکە"زەوی"هەمووی یەکپارچە ببوو بە چەند کانی یەك... پاشان بڕوانە ئەوا: ئاوی زەوی و ئاوی ئاسمان بەیەك دەگەن تاکو لەئاکامی ئەوەوە لافاوە گەورەکە ڕوویدات. بەناوڕاستی ئەو لافاوەش دا پاپۆڕەکە بەئیماندارە سەرنشینەکانی یەوەو بەهێمنی و چاودێری و ئاگاداری ی خودا ڕێگادەبڕێت.

پاشان خوێنەری بەرێز..سەرنجی ورد بدە لەشێوازی ئەو ئایەتانەو ئەو ئیقاعە مۆسیقی یەی تێیدان و چۆن (بەئاسانی ی بێژە(لفظ) و شیرینی ی قاڵبەکانی) ئاخاوتنی پێ ڕێـك دەخرێـت، هــەروەها بــەوردی ســەرنج بــدە لــەدانان و ڕێکخــستنی نێوانــە جیاکــەرەوەکانی[(١)] کۆتــایی ئایەتەکانی کە لەسەر سیستمێکی دیاری کراوەو هێزێکـی دیکـەی لـەدەربڕین و کـارتێکردنی دەروون بەقورئان داوە.

بڕوانە چۆن خودا وەسفی کۆتایی هاتنی لافاوەکە لەم ئایەتەدا بەو دەربڕینە ئەدەبی یە دێنێتەوە کە گەشتۆتە بڵندترین پلەی ڕەوانبێژی(بلاغة)، هەروەك فەرموویە: ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ

---

(١) نێوانی جیاکەرەوە(فاصلة): زاراوەیەکە بەو وشەیە دەگوترێت کە ئایەتێکی قورئانی پێ کۆتایی دێت. پلەی ئەمەش لەئایەتەکەدا وەك پلەی سەروا(قافیـة)ی شیعرەو کارایی مۆسیقی ی خۆی لەڕێکخستنی گوتاردا هەیە.

﴿ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾هود/٤٤. واتە: (فەمان کراو بەزەوی گوترا ئاوەکەی خۆت قووت بدەرەوەو هەڵمژەرەوە، بەئاسمانیش گوترا تۆش دەست لەباران بارین بگرەوە. ئیدی ئاو کەم بووەوەو نەماو فەرمانەکەش جێبەجێ کراو ستەمکاران سەرنگووم بوون و پاپۆڕەکەی -نوح-یش لەسەر چیای -جوودی- ڕاوەستاو جێگیربوو، لەوساتانەدا بەگەلی ستەمکاران گوترا: هەر لەناوچن و نەمێنن).

ئەو کەسەی لەم ئایەتە ورد دەبێتەوە دەبینێت، کەدیمەنی لافاوەکە بەکورت ترین بێژەو کاریگەرترینی وەسف دەکات، بۆ نموونە جوانیی بەستنەوە(حسن النسق)[1]ی تێدا بەدی دەکەیت چونکە خودا ڕستەکانی پێکەوەگرێداوە بەپیتی (واو)ی گەیاندن و لەسەر ئەو ڕێکخستنەی کە ڕەوانبێژییەکە ئاتاجی پێی دەبێت. خوداش بەدیاری کردنی گرنگترین دیاردەی لافاوەکەدەستی پێکردووە ئەویش دەرچوونی خەڵکی نێوکەشتی یەکەیە بۆ سەر وشکانی، ئەمەش تەنها لە کاتی نەمانی ئاو لەسەر زەوی دا دەشێت، هەربۆیەش خودا فەرمان بەزەوی دەکات کە ئاوەکەی هەڵمژێتەوە، هەروەك لەفەرمایشتەکەیدا هاتووە: (**ابلعي ماءك**[2]).. پاشان دیارە گەر هەر تەنیا زەوی ئاوەکە هەڵمژێت و بەڵام بارانە بەلێشاوە زۆرەکە نەبڕێت ئەوا خەڵکی کەشتییەکە لەکاتی دەرچوون و دابەزینیان دا ئازاریان پێ دەگەیشت، لەوانەیە ئەو ئاوەی لەئاسمانەوە دەهاتە خوارەوە قەرەبووی ئەو ئاوە بووبێت کە زەوی قووتیی دەدا، لەبەرئەمەش خودا بەم فەرمایشتەی (**ویا سماء اقلعي**) [3] فەرمانی بەئاسمان کرد کە (بەسەو ڕاوەستە لەناردنی باران). لێرەش دا بەجوانی ڕامێنە لەو جیناس و ئیقاعە مۆسیقی یەی نێوان هەردوو وشەی (**ابلعي**) و (**اقلعي**) کەقورئان بێژەی (**ابلعي**)ی لەجیاتی (**ابتلعي**) هەڵبژاردووە چونکە کورت و زیاتر ڕێکەوتووە لەگەڵ وشەی (**اقلعي**)دا.. هەروەها سەیرکە چۆن قورئان کاتێك فەرمانی (هەڵمژە -ابلعي)ی هێناوە بەدوای دا نەیگووتوە (ئیتر ئەویش هەڵیمژی) یان بۆ ئاسمانیش هەر بەم شێوەیە، واتە ئایەتەکە بەم جۆرە نەبووە (**یا أرض ابلعي**

---

(١) جوانی ی بەستنەوە(حسن النسق)/ ئەوەیە، کە بگۆ(متکلم) چەند وشەیەك لەپەخشان و چەند دێرە شیعرێك بێنێت کە هەموویان یەك لەدوای یەك و یەکگرتوو و پێکەوە بەستراوبن بەشێوەیەکی ساغ و جوان کراو، نەك دزێو و پڕ لە خەوش بن و تێکدەری سیماو ناوەڕۆکی مەبەستەکان بێت.

(٢) (ابلعي ماءك): لەم فەرمانەدا بڕوانە چۆن قورئان ئاوی خستۆتە پاڵ زەوی، ئەمەش لەبەر پەیوەستی ی ئاو بەزەوی یەوەو لەبەر ئەوەش کەلە بنەڕەت دا لە زەوی یەوەیەو خۆر دەیکات بەهەڵم و دەبێتە هەورێك وپاشان وەك باران دەڕژێتەوە زەوی.

(٣) (یا سماء اقلعي): لەم فەرمانەدا ئەوە دەردەکەوێت کە لە زانستی ڕەوانبێژی دا بە (مەجاز) ناسراوە، حەقیقەتی وتەکەش ئەمەیە (یا مطر السماء اقلع) واتە: (ئەی بارانی ئاسمان بەسە خۆت بگرەوەو مەبارێ).

**فبلعت، وياسماء اقلعي فأقلعت)**، چونكه ئەمە خەياڵی ئەوە دەخاتە هزری مرۆڤەوە كە ئەگەری سەرپێچی و یاخی بوون لەشان و شكۆی بەرزی ئیلاهی لەئارادا دەبێت، بەڵكو قورئان تەنها هێندەی فەرمووە **(يا أرض ابلعي)**... **(وياسماء اقلعي)**، چونكە فەرمانی ئیلاهی ڕەت ناكرێتەوەو گەردوونیش سەراپا هەمووی ملكەچی ئەم وشەیەتی **(كن فيكون)** واتە (ببە.. دەبێت).

لەدوای ئەمە خودا ئاماژە بۆ ئەنجامی پێویستی ئەو فەرمانە دەكات بەم ڕستە خەبەرییە (وغيض الماء)[1] واتە (ئاوەكە ڕۆشت و بزربوو)، وشەی (غيض)یش ئاماژەیە بۆ بڕانی ماددەی ئاو لە ناخی زەوی و بڕانی بارانی ئاسمانیش، دەنا گەر وانەبوایە ئاوەكە بزرو بەند نەدەبوو. پاشان خودا ئەو نیازەی لەلافاوەكەی هەبوو بەم ڕستەیە (وقضي الأمر[2]) ڕوون دەكاتەوەو ماناكەشی ئەوەیە كە هەر كەسێك خودابڕیاری لەناوچوونی دابوو، لەناوچوو و هەركەسێكیش كەخودا قەدەری ڕزگاربوونی بۆ دانابوو ڕزگاری بوو. ڕستەی "وقضي الأمر" ئەو شعوورە پەخش دەكات كەلەناوبردن و ڕزگاركردن بەپێی فەرمانێكی جێبەجێكراوو بڕیار (قضاء)ێكی ئەو خودایە بووە كەهەرگیز بڕیارو فەرمانی ڕەت ناكرێنەوە.

هەورەها قورئان ڕاوەستان و لەنگەرگرتنی پاپۆڕەكە لەسەر چیای (جوودی) بە بێژەی (استوت) وەسف دەكات، واتە (بەرێكی جێگیر بوو) چونكە لە ڕێك جێگیربوون (استواء) دا هەواڵی دانیشتنێكی تەواوی وای تێدایە كە هیچ خواری ولاری وجووڵەیەكی تێدا نییەو، (بەو جێگیربوونەشی) دڵی خەڵكی نێو كەشتییەكەش هێمن بۆتەوەو دەرچوون و دابەزینیشیان بەبێترس ئاسان كراوە، ئەمەش بەپێچەوانەی وشەی لەنگەرگرتنە چونكە مانای لاربوون هەڵدەگرێت. لەدوایش دا قورائان ئایەتەكە بەڕستەی (وقيل بعداً للقوم الظالمين) كۆتایی دێنێت كە نزاكردنێكە لە دژی قەڵاچۆبوان و وەسف كردنیشیانە بەستەم (ظلم) تاكو ئەو كەسانەی دوای ئەوان دەژین بزانن كە هەموو ئەوانەی قەڵاچۆكران شایستەی لەناوچوون بوون، ئەمەش بۆ ئەوەی نەبادا وەهمێك بێتە كایەوە لەمەڕ ئەوەی لەناوچوون (بەبارە گشتییەكەی) ئەو كەسانەش دەگرێتەوە كە شایستەی سزاكە نەبوون.

---

(١) (وغيض الماء): ئەمەش لەزانستی ڕەوانبێژی دا بەهونەری (ئیشارەت) ناسراوەو ئەوەیە دەبێت بێژەی كەم دەلالەت لەسەر مانای زۆربكات.

(٢) (وقضي الأمر): ئەمەش لەزانستی ڕەوانبێژیدا بەناوی هاوواتاكان (الأرادف) ناسراوەو ئەوەیە بگۆ (متكلم) مانایەكی بوێت وبەو شێوەیە تەعبیری لێنەكات بەڵكو بەبێژەیەكی دی تەعبیری لێ بكات كە هاوواتای مەبەستەكەو وشێنكەوتەی بێت.

## چەند ڕاستی یەكی زانستی ی قورئان

قورئان لەوەسفكردنی توانای خودا بەسەر ئەم گەردوونەدا گوزارشت(تعـبیر)ێكـی ورد بـەو وەسفە دەبەخشێت كەگەلی عەرەب چواردە سەدە لەمەوپێش بەجۆرێك تێ ی دەگەیشتن و ئـەو تێگەیشتنەیان گونجاو بوو لەگەڵ ئەو پەی بردن (ادراك)ـەیان دا كە عەقڵیان پێ ی گەیـشتبوو، كت و مت وەك چۆن مرۆڤی مەدەنیەت خوازی ئەمڕۆ بەفەهمێكی تازەوە پێـشوازی دەكـات و ئەم فـەهم و تێگەیشتنەیـشی بەزانـست و زانیاری یـە هاوچـەرخەكانیەوەیەتی، هـەروەك بـەو داهێنانە زانستیانەشەوەیە كەلەبواری ئەم گەردوونەدا پێ ی گەیشتووە. نموونەش لـەم بارەیـەوە لەقورئان دا زۆرە، بەڵام لێرەدا تەنها دوو نموونەی زانستی دەخەینە ڕوو كە دەربـارەی چـیرۆكی (نوح) هاتوون:

یەكەم/ ئایـەتی ﴿وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا﴾نـوح/١٦.. واتـە (خـودا لەنێو ئاسمانەكان دا مانگی كردووە بەڕووناك كەرەوەی زەوی لەكاتەكانی تاریكی داو، خۆریشی كردووە بەچرایەكی ڕۆشن كەرەوەی لەناوبەری تاریكی).

لەم ئایەتەدا خودا ئەو ڕاستی یە دەردەخات كە خۆر لەچرایەكی پرشنگدار(السراج الوهاج) دەچێت، واتە چرایەكی ڕۆشن كەرەوەی داگیرساو بەبڵێسەیەك كـە بـە (ڕۆن زەیـت) و (كحـول) دەبریسكێتەوە، چراش ڕووناكی یەكی خۆیی (ذاتي)ی هەیە، زانست (علم)یش ڕوونی كردۆتـەوە كە (خۆر) تۆپەڵە(كتلة)یەكی گازیی گڕگرتووەو وزەی خۆی لەچەند كارلێـك و تەقینەوەیـەكی ناوكی یەوە وەرگرتووە. لەمەدا زانست لەگەڵ قورئـان تـەباو هاوڕایـە كـە خـۆر لەبڵێـسەیەكی ئاگرین پێك هاتووە. ئەم بڵێسەیەش وزەی خۆی لە چەقی ناوخۆیی ی خۆیەوەوەردەگرێت.

هەروەها قورئان وەسفی مانگ(قمر)ی بە"ڕووناكی" كردووە، كەوابوو ئەمیش تۆپەڵەیەكی تاریكە و ڕۆشنایی یەكی وەرگیراو(مكتسب)ی هەیـە و لێ یـەوە ڕەنـگ دەداتـەوە، زانـستیش ئەمەی سەلماندووە كە مانگ هەسارەیەكی تاریكەو ڕۆشنایی ی خۆی لەخۆرەوە وەردەگرێت.

دووەم/ نمونەی زانستی ی دووەم لەچیرۆكی ـ نوح ـ ەوە ئەو ئایەتەیە كەلـەقورئان دا لەسـەر زاری ـ نـوح ـ خـۆی دا هـاتووە ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا﴾نـوح/١٧. لـەم ئایەتـەدا وا ڕاگەیەنراوە كە خودا ئێمەی لەڕووەكیشەوە(نبات) دروست كردووە و بـەردەوامیی ژیانیـشمان لەسـەر ڕووەك بەنـدە. ئـەم ئایەتـەش حەقیقـەتێكی زانـستی یـە، هـەروەك لـەكتێبی (ئـاو موعجیزەی سروشتە)ی نووسـەر (تۆمـسۆن كیـنگ)دا هـاتووە وتیـای دا دەڵێـت: (زانایـانی زیندەوەرناسی گەیشتونەتە ئەو دان پیانانەی كە هەموو گیانەوەران لەنێوانیان دا من و تۆش و

گشت بەکتریایەك لەسـەر خـواردنی ڕووەك و بەرهەمـە رووەکـی یـەکان دەژیـن، یـان لەسـەر خواردنی گۆشتی ئەو گیاندارانەی کەڕووەکیان خواردووە، بۆ نموونە ماسی یەك دەخـۆین و ئـەو ماسی یەش لەسەر خواردنی چەند ماسی یەکی بـچووك ژیـاوە، ئـەو ماسـی یـە بـچووکانەش لەسەر خواردنی ماسی ی بچووکتر یـان لەسـەر خـواردنی چـەند کرمێـك ژیـاون یـان لەسـەر زیندەوەرانی ترو، کە ئەو زیندەوەرانەش بە ڕووەك ژیـاون.. ئیـدی لەهـەر شـتێك وردبینـەوەو ئەلْقە بەئەلْقـەی زنجیرەکـەی ژیـانی لێکدەینـەوە دەبیـنین لەوسـەری کۆتـایی یەکەیـەوە هـەر دەچێتەوە سەر ڕووەك. کەوا بوو ڕووەکـەکان بنکـەو بناغـەی هـەرەمی ژیـانن، کـە ڕەگـەزی مرۆیی(جنسی بەشەری) لوتکەی هەرەمەکەی داگیرکـردووە). بـەم ڕەنگـەش دەبیـنین قورئـان بەکورتی وەسفی خۆراکی مرۆڤ و ئەو ڕەگەزو ئۆرگانە خۆراکی یانەشی کردووە کەپێیان دەژی. هەروەك زانستیش لە چەرخی نوێدا دانی پێداناوە)...

## یەکسانی لە نێوان چینەکان دا

قورئانی پیرۆز هەر لەسەردەمی ـ نوح ـ ەوە سروشتی کۆمەڵگەی بەشەریی بەسەر دوو چین دا دابەش کردووە، چینی یەکەم چینی دەوڵەمەندان و گەورە پیـاوان و دەسـەڵاتدارانن کـە لـە سەردەمی نوێدا بە دەرەبەگ و بۆرژواکان ناوبراون، چـینی دووەمـیش کرێکـاران و هـەژاران و چەوساوەکانن، کە ئەوانیش لەم سەردەمەدا بەچینی –پرۆلیتاریا– ناو دەبـران. جا قورئـــانیش لە بەسەرهاتەکەی ـ نوح ـ دا وێنەی ئەو دیـاردە ڕاستەقینەیەمـــان پیشـان دەدات، کـە هـەر چینی هەژاری زەحمەتکێش و کارگەر بـەدەم بانگـەوازی پێغەمبەرانـەوە چـوون، چـونکە لـەو بانگەوازەدا دادگەری و یەکسانی و سۆز و بەزەییان بەدی کردووە و بەم ڕێـسایانەش یەکـسانی دەخرێتە نێوان ئەوان و دەوڵەمەندانەوە و هەموو شتێکیان لەگەڵ زاڵمان و زەوت کاران دا پـێ دەکەن بە دوو بەشەوەو ناهێڵرێت بێبەش و مەحرووم بن. دیارە چینی ئەشراف و دەوڵەمەنـدان لەبانگەوازی –نوح– یاخی بوون و بـەم جـۆرە وتانـەش بەرپەرچـی بانگەوازەکـەیان داوەتـەوە: ﴿ وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ﴾هود/٢٧.. واتە: (ئـەو کەسـە بـەناو پیاو ماقووڵ و گەورەپیاوو دەوڵەمەندە بێباوەڕانەی گەلەکەی (نوح) لەوەڵامی بانگەوازەکەیدا پێیان گووت: بۆچی باوەڕت پێ بێنین، ئاخر ئێمە دەتبینین مرۆڤێکیت وەك خۆمان و دەشبینین تەنها کەسە بچووك و گەمژەو بـێ دەسـەڵاتەکانمان باوەڕیـان پـێ هێناویـت لەوانـەی کـە بـێ بیرکردنەوەو تێفکرین دوات کەوتوون).. ئـەم وتەیـەی ئـەو کەسـە بێبـاوەڕە دەسـەڵاتدارانەش

وەسفێکی شێوازی بیرکردنەوەیان دەکات کە ئاوێتەی لووتبەرزیو بێ باکی یە، ئەوان (هەروەك قورئان لەسەر زاریان دەیگێڕێتەوە) لەکاتی دواندنی چینی هەژارو نەداریش دا پێیان گوتـوون: ﴿وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ﴾هود/٢٧.. واتـە: (ناشـبینین ئێـوە فەزڵێکتان بەسەر ئێمەی دەوڵەمەندو ئەشراف دا هەبێت، بەڵکو تەنانەت واگومان دەبەین ئێوە درۆزنن و هەڵخەڵەتێنەر بن). بەمانای گوایە ئەم دەوڵەمەندو خۆبەئەشراف دانەرانە لەو هەژارو نەدارانە باشترو بەرێزترن و ئیدی دەرفەتێك نی یە بۆ بەیەکدی گەیشتن لەهەر بیروباوەڕێك یـان خەباتێکی هاوبەش دا.

واش دەردەکەوێت، کە چینی باڵادەستان بەڵێنیان بە -نوح- دابێت لەسەرئەوەی گەر ئەو کرێکارو ڕەش و ڕووت و بێ دەسەڵاتانە لە کۆڕو ئەنجوومەنی خۆی دەرکات ئەوا ئەمان لە گەڵی دا دادەنیشن و بانگەوازەکەی پەسندەکەن.. بەڵام ئەم ڕەفتارە هەرگیز لەپێغەمبەرێکی وەك (نوح) نەوەشاوەتەوەو بەڵێنەکەیان لێوەرناگرێت و پێشنیارەکەشیان ڕەت دەکاتەوەو ئەم وتەیەیان بەڕوودا دەدات: ﴿وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًاۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾هود/٢٩-٣٠. واتە (من هەرگیز ئەوانە دەرناکەم کەباوەڕیان پێهێناوم، سائیتر لەهەر چینێك بن، چونکە بەڕاستی ئەوان بە خودای پەروەردگاریان دەگەن، بەڵام دەبینم ئێوە گەلێکی نەفام و نەزانن. جائەی گەلی خۆم گەر لەبەر خاتری ئێوە ئەو باوەڕدارە هەژارانە دەرکەم دوایی کێ دەتوانێت من لەسزای خودا ڕزگارکات، دەی، ئایا بیرناکەنەوەو تێ ناگەن؟). پاشان (نوح) بەردەوام دەبێت لەسەر پووچەڵ کردنەوەی بیرو بۆچوونەکـانیـان: ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًاۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْۖ﴾ هود/٣١. واتە: (هەروەها ناڵێم ئەوانەی کە ئێوە بەچاوی سووك و بێڕێزی بۆیان دەڕوانن و کە لەچینی هەژارو کەم دەستانن، ناڵێم خودا پاداشتێکیان ناداتەوە، تاکو ئێوە بەم قسەیەم ڕازی بکەم، چونکە هەرخوداش ئاگاداری نێودڵ و دەروونیانە)..

قورئانی پیرۆز لەچواردە سەدە لەمەوبەرەوە کاری کردووە بـۆ ڕووخانـدنی ئـەو جیاوازیـیـە نابەجێیە کۆمەڵایەتیيانە، ئەویش لەو ڕێسایانەدا کە بەچەندین ئایەت دیاری کـردوون وداوای یەکـسانی ی نێـوان خـەڵکییان کـردووە. بێگومـان خـودای مـەزن لەبەسـەرهاتی (نـوح)دا

ویستوویەتی ئەوە ڕوون بکاتەوە کە دەوڵەمەنـدان و دەستڕۆیـشتوان هـیچ سـیمایەکی باشـترو جیاکەرەوەیان لەکەسانی دی زیاتر نـی یـە، چـونکە ئـەو کۆمەڵگـە مرۆڤـی یـەی کـە خـودا خوازیاریەتی کۆمەڵگەی چەسپاندنی یەکسانیی نێوان خەڵکی یـە لـە مـاف و ئەرکـەکان دا. بەباشتردانانی هەندێك کەس لە خەڵکییش لەهەندێکی تریان تەنها لەسـەر بناغـەی زانـست و تەقواو لەخواترسانە، هەروەك لەسەر بناغەی ئەو خێروچاکە زیادەیەشە کە هەر تاکێکی کۆمەڵ بۆ کۆمەڵگەکەی بکاتە دیاری..

خـــوداش لەقورئانـــدا لـــەم بارەیـــەوە فەرموویـــە: ﴿..إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ..﴾ الحجرات/١٣. واتە (بێگومان بەڕێزترین کەستان لەلای خـودا بەتـەقواترین تانـە). هـەروەها فەرموویەتی: ﴿هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الزمـــر/٩. واتـە (ئایـا وەك یـەك و یەکسانن ئەوانەی دەزانن و زانست وباوەڕیان هەیە لەگەڵ ئەوانەدا کە نەزان و بێزانـست و بـێ باوەڕن)؟!.

جا قورئان وای داناوە گەر پیاوانی خاوەن سامان و دەوڵەمەند گوێ بیـستی دەنگـی هـەق بن، پەیڕەوکاری هەق بن ئەوا ململانێ و ناکۆکی نێوان چینەکانی کۆمـەڵ لەئارادانەدەبوو.

## وانەیەك لەهێزی خۆڕاگریدا

لەو سیفەتە جوانانەی کە مرۆڤ خۆییان پێ برازێنێتەوە ئەو خواست و ئیرادەی خۆڕاگری یـە بەهێزەیە کە بەهۆیەوە بەرەو ڕووی هەموو کۆسپ و ناڕەحەتی یەکی سەر ڕێگەی پێ دەبێتەوە، پێغەمبەرەکەی خوداش (نوح) (سڵاوی خوای لێ بێت) پلەیـەکی بـەرزی لـەهێزی خـۆڕاگری و سووربوون و بەردەوامی ئەو بانگەوازەیمان پیـشان دەدات کەماوەیـەکی زۆر درێـژی خایانـدووە بێئەوەی ئیرادەیەکی لاوازبێت یان عەقیدەیەکی بلەرزێت. لەو وێنە دیارانەی ئەم بەسەرهاتەش کە قورئان دەربارەی ئەو ئیرادە پۆڵایینەی خۆڕاگرتنی دەدوێـت بـەردەوامیی بێپـسانەوەیەتی لەبانگکردنی گەلەکەی دا بۆ سەر ڕێبازی خودا بەشەو و بەڕۆژ وبەئاشکراو نهێنی، بـەڵام ئـەو گەلە زۆربەی هەرەزۆریان بانگەوازەکەیان پەسند نەکردو بەدەمیەوە نەدەچوون، تەنانـەت وایـان لێ هاتبوو کە تۆزقاڵێك گوێیان بۆ ڕانەدەگرت و تەماشاشیان نەدەکرد، دیارە ئەمەش دواپلەی ڕوولێ وەرگێران و ئازاردانی هەست و شعووری بووە..جگە لەمەش لەکەداریان دەکردو بەشـێت

و بێعەقڵیان وەسف دەکرد: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ[١] فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾ المؤمنون/٢٥.. واتە: (گەلەکەی -نوح- بەو پێغەمبەرەی خۆیان دەگوت ئەم کابرایە شێتە (یان جنۆکە شێتیان کردووە) وجائێوەش ڕاوەستن و دان بەخۆدابگرن تا ئەو کاتەی چاك دەبێتەوەو واز لەم شێتی یە دێنێت).

هەر سەبارەت بە پتەوی و تۆکمەیی خواستی خۆڕاگری ی (نوح) وێنەیەکی دیکەمان لەم ڕووەوە دێتە بەرچاو کەکاتێ هەڕەشەی زۆری لەگەلەکەیەوە لێ دەکرا، کەچی ئەو بەچەلەنگی و ئازایەتی یەوە بەرامبەر هەڕەشەکانیان دەوەستا و لە بانگەوازی خۆی پاشگەز نەدەبووەوە ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴾ الشعراء/١١٦. واتە: (ئەی (نوح) گەر وازنەهێنیت و کۆتایی بەم بانگەوازەت نەهێنێت ئەوا بەشێوازی بەردباران کردن دەتکوژین، کە ناشیرینترین و دڕندانەترین شێوازی پیاوکوشتنە).. بەڵام بێگومان -نوح- لەبەردەم ئەو هەڕەشەیەدا پاشگەز نەبووەوە، بەڵکو پەنای بردە بەر خوای پەروەردگاری﴿ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الشعراء/١١٧-١١٨. واتە: (خودایە وا دەبینیت گەلەگەم بەدرۆیان خستمەوە، جاتۆش حوکمی خۆت لەنێوان من و ئەوان دا بکەو خۆم و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵم دان ڕزگاربکە لەزوڵم و ستەمیان). لەلایەکی تریشەوە هەر دەربارەی هێزی ئیرادەی بەئارامی و خۆڕاگری ی "نوح"وێنەیەکی ڕۆشنی دیکەمان لەهەڵس و کەوتی دەکەوێتە بەرچاو، ئەویش لەکاتی دروست کردنی کەشتی‌یەکەدا کەگەلەکەی گاڵتەی پێ دەکەن، کەچی ئەو زۆر بەهێمنی‌و سینەفراوانی‌یەوە چاوپۆشییان لێ دەکات و بەپەڕی ئارامی و دڵنیاییشەوە بەتەمای سەرکەوتنی خودایەکە کە پێی ببەخشێت: ﴿وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُواْ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾ هود/٣٨و٣٩.. واتە: (نوح- سەرقاڵی دروست کردنی کەشتی‌ی ڕزگاربوون بوو و هەر جارێکیش چەند کەسێك لەبێ باوەڕان بەلای دا تێ‌پەڕینایە گاڵتەیان پێ دەکردوسەریان بادەدا لەسەر ئەوەی کە تادوێنی هەر بانگەوازی بۆ ئیمان دەکردن و ئەمڕۆش بۆتە دارتاش و کەشتی

---

(١) (بِهِ جِنة): واتە (شێتی)یان (شێتێتی) یەکی هەیە.. وشەی (جنة) لە (جنون)ـەوە هاتووە یان لە (جن)یشەوە، واتە (جنۆکە).. کەوابوو واژەی (بە جـنة) مانای ئەوەش دەگەیەنێت، کە (جنۆکەی لەگەڵدایەو شێتی دەکەن).. (وەرگێڕ)

دروست دەكات.. -نوح-یش لەوەلامی ئەو گالتە پێکردنەیان دا دەیگووت (گەر ئێوە گالتەمان پێ دەکەن ئەوا بێگومان لەراستیدا ئێمە گالتە بەئێوە دەکەین و دەزانین بەم زوانە چیتان بەسەر دێت، ئەوساش چاك دەزانن كە كێیە تووشی سزای سەرشۆڕكەر دەبێت و پاشان لەئاخیرەت دا سزایەكی هەمیشەیی ی شایستە دەبێت)؟!.

جا داخۆ هۆکاری دروست بوونی ئەو خواستە بەهێزەی خۆڕاگری و سووربوونی و ئەو ڕەگ و ڕیشالە توندەی خۆڕاگری ی نێو دەروونی (نوح)ی پێغەمبەری خودا لەکوێوە هاتبن؟ بێگومان چاوگی هەموویان ئەو باوەڕە بەهێزو پتەوەی بوو بەخودای پەروەردگاری و پشت پێ بەستنی بووە کەلەهەموو تەنگژەو بارگرانی و ئازار چەشتنێکدا پشتی پێ بەستووە.

## كودەتا بەسەر پەیوەندی یە نادروستەكانی كەسایەتی و خزمایەتیدا

بێگومان "پەیوەندی كەسایەتی و لێك نزیكی ی خانەوادەیی و خزمایەتی" هەمیشەو هەردەم لەگرنگترین ئەو هۆكارە بزوێنەرانەی مرۆڤ بووە كە جێی بایەخ و بەتەنگەوەهاتنیان بووەو بڕێكی گەورەی سۆزی شەخصی و قوربانی دانیشی بۆ تەرخان كردووە، ئیسلامیش بایەخێكی فرەو دیاری بەم لایەنی پەیوەندی كەسایەتییە داوە چونكە میزاجی مرۆڤ و بەرژەوەندییەكانیشی لەسەر ئاوڕ لێ دانەوەو ڕاپەڕاندنی ئەركەكانی ئەم پەیوەندییە حەسساسە هاتوونە ئاراوە.

وەلێ مەرجێكی بنەڕەتی لەپەیرەوییكردنی پەیوەندی خزمایەتی و كەسایەتی دا هەیە تاكو مافە تەواوی خۆی پێبدرێت، ئەویش باوەڕهێنان بەخودا و جێبەجێكردنی فەرمانەكانی شەریعەتەكەیەتی، چونكە مرۆڤی موسڵمان نابێت كەسانی بێباوەڕو سەرپێچی كارو گوناهبار بخاتە ڕیزی خۆشەویستانی یەوەو خۆشی ی بوێن تەنانەت گەر ئەو جۆرە كەسانە لەنزیكترین كەسو كاری یان خزمانی بن.. هەروەك خوداش لەم بارەیەوە لەقورئان دا فەرموویە:

﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ [1] ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ ﴾ المجادلة/٢٢.. واتە: (نابێت كەسانێك گەر باوەڕیان بەخوداو ڕۆژی دوایی هێنابێت بێباوەڕان و سەرپێچی كارانیان خۆش بوێت تەنانەت گەر ئەو جۆرە كەسانە باوكیان یان كوڕیان

(١) (حاد الله): واتە: (عصى الله) بەمانای (سەرپێچی یان لەفەرمانی خودا كردووە).

یان برایان یان لەهۆزوعەشیرەتیان بن، چونکە کەسانی خاوەن باوەڕ خودا نیعمەتی ئیمانی پێ بەخشیون و لەدڵ و دەروونیان دا ئەو ئیمانەی بەهێزو جێگیر کردووە، هەر کەسێکیشیان خۆش بوێت تەنها لەپێناوی خوداو سەرخستنی دینی خوادا خۆشیان دەوێن).

لە داستانەکەی "نوح"یش دا نموونەیەکی دیاروو زیندوو و زۆر گرنگمان پێش چاو دەخات لەکاتێك دا سۆزو بەزەیی پیاهاتنەوە یەخەی - نوح- دەگرێت کاتێك دەبینێت ئەوا خەریکە کوڕەکەشی لە لافاوەکەدا نغرۆ بێت و بەو سۆزو عاتیفەی باوکانەیە داوا لە خودای مەزن دەکات و لێ ی دەپاڕێتەوە ئەو کوڕەی لەتیاچوون قوتار کات، بەڵام خودا لەسەر ئەو داواکاری یە گلەیی ی لێ دەکات و کاری پاڕانەوەکەشی بەو جەهل و نەفامی یە دادەنێت کە هەرگیز ناشێت بەئاوێنەی ڕەفتاریەوە بلکێت، وەك دەیگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ هود/٤٥-٤٦.. واتە: (کاتێك لافاو هەستابوو -نوح- هاواری بۆ خوا بردو داوای ڕزگاربوونی کوڕەکەی دەکرد و گوتی: (خوایە بێگومان کوڕەکەم لەکەس و کارو خانەوادەی منەو تۆش بەڵێنت هەربەجێ گەیەنراوە دەربارەی ڕزگاربوونی کەسو کاری من. هەر خۆشت دادگەرترین حاکمیت)، بەڵام خودا لەوەڵامی هاوارو داواکەی دا فەرمووی (ئەی نوح ئەو کوڕە کەسی تۆ نیەیەو لەئەهلی تۆ نیەیە، چونکە خاوەنی کردەوەی خراپە کە بێباوەڕی یە، ئیتر داوای شتێکم لێ مەکە کە زانستت لەسەری نیەیەو نازانیت ڕەوایە یان نا؟ من ئامۆژگاریت دەکەم کە نەبیت بەیەکێك لەوانەی نازانن). نیاز لەو بنەما جوان و بێوێنانەی کە قورئان لەپشت ئەم ئایەتانەوە دایاندەڕێژێت ئەوەیە ڕێنمایی ی مرۆڤ بکات بۆ کردارو هەڵس و کەوتی چاك وپێویست کە هەر ئەم کردارانەش بەدی هێنەری بەختەوەرین لە ئاخیرەت دا، واتە: هیچ شەفاعەت و پەیوەندییەکی کەسایەتی و لێکنزیکی، کارابیەکیان نییە لە ڕزگار بوون لە سزای خودا گەر ئەوکەسە شەفاعەت بۆ کراوە نزیکە بێ باوەڕو یاخی بێت، هەر لە قورئاندا تەئکید لەسەر ئەم ڕاستیەش کراوەتەوە،وەك خودای مەزن فەرموویە:

﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴾ التحريم/١٠. واتە: (خودا بۆ نموونەی ئەوانەی بێباوەڕ بوون ژنەکەی -نوح- و

ژنەکەی – لوط– ی بەوێنە هێناوەتەوە بۆیان، ئەو دوو ژنە لەژێر عیصمەت و سەرپەرشتی هاوسەرێتی دوو بەندە پێغەمبەرەکەمان دابوون، بەڵام ناپاکییان لێ کردن و هاوبیروباوەڕیان نەبوون، ئەو دوو پێغەمبەرش نەیانتوانیوە لەلای خودا شتێك لەسزایان کەم کەنەوە یان شەفاعەت و سوودێکیان پێ‌بگەیەنن، چونکە ژنەکانیان دوژمنی خوداو پەیامەکانیان بوون، لەسزای ئەوەش دا ئاگر بەقیسمەتیان بوو و پێ‌یان گوتراوە بڕۆنە نێو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ دۆزەخی یەکان دا).

لە ڕووداوی لەناو وچوونی هاوسەری (نوح) وهاوسەری (لوط) بەهۆی گوناهباری و ستەم و لادانیان لەڕێگای ڕاستەوە پەندێکی کاریگەری قورئانی هەیەو ئەوەیە کە: (کەسایەتی و لێك نزیکی هەر چەندێك پتەوو سۆزدارو مەحکەم بێت بەڵام ناشێت بۆ مرۆڤ سوودمەندبێت ئەگەر مرۆڤەکە بێ‌باوەڕو بەدکار بێت.. زۆر جاریش خەڵکی بەهەڵە لەچەمکی ڕێگای ڕزگاربوون تێگەیشتوون و بەمەش تووشی گومڕایی بوون، چونکە وایان زانیوە گوایە ڕزگاربوون لەخۆشویستنی پیاوانی ئایینی و خۆ لێ نزیك کردنەوەیان دایە بە (دیاری بۆ بردن و گوێڕایەڵی کردنی کوێرانەی فەرمانیان) بێ ئەوەی ئەرکی خۆچاکردن و لێپرسینەوەی ویژدانیان لەئەستۆ بگرن. ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەش خراپەی دەرهەقی دین کردووەو بووەتە هۆیەك لەهۆیەکانی دواکەوتن و مت بوون و تێك دان، لەجیاتی ئەوەی لەگرنگ ترین پاڵنەرەکانی چاکسازی و پێشکەوتن و شکۆمەندی بێت.

# بەشی چوارەم

## هود (درودی لەسەر بێت)

## صالح (درودی لەسەر بێت)

١- چیرۆکی هود
٢- چیرۆکی صالح
٣- چەند وانەو پەندێك

# سەرەتایەك

داستان گێڕەوان و شارەزایانی مێژوو و دەنگ و باسی گەلان میللەتی عەرەبی دێرینیان بۆ سێ چین دابەش کردووە:

عەرەبی " بائدة"          عەرەبی " عاربة"          عەرەبی " مستعربة "

لەعەرەبی "بائدة" دا چەندین گەلی وەك (عاد) و (ثەمود) هەبوون. گەلی (عاد) لەوەچەی (عاد-ی کوڕی -عوص-ی کوڕی -إرم) بوون.

گەلی (ثەمود)یش لەوەچەی (ثەمود-ی کوڕی -جاثر-ی کوڕی -إرم) بوون. ئیرەم-یش کوڕی (سام)ی کوڕی (نوح) بووە. هۆی ناوبردنیشیان بە عەرەبی "بائدة" لەبەر ئەوەیە ئەوان ئیبادەبوون و لەنێوچوون و هیچ کەسێکیان لەو وەچەیە لەسەر زەوی نەماوە، هەروەها هۆی ناوبردنی (عاد) و (ثەمود) بەعەرەبی "عاربة" لەمانای جێگیری‌و ڕەگ داکوتانیان لە (عروبة)دا وەرگیراوە.[1] بەپێی ڕاوبۆچوونی داستان گێڕەوان(رواة) دوو چین لەگەلی "عاد" هەبوون بەناوی عادی یەکەم (عاد الاولى) و عادی دووەم (عاد الثانية).

- عادی یەکەم بە سامترین و بە هێزترین نەتەوە بوون و لە چەندین هۆز و تیرە پێك هاتبوون و ماوەی پتر لە هەزار ساڵ ژیاون. قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەو ڕووداوە کردووە، کە خودا " عادی یەکەم " و " ثەمود"ی لە نێو بردووە: ﴿ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ ﴾النجم/٥٠، ٥١.

خودای مەزن پێغەمبەرێکی بەناوی (هود)ەوە بۆ گەلی (عاد) نارد کە لەخێڵی (عبداللە-ی کوڕی -خلود-ی کوڕی -عاد-ی کوڕی -عوص- ی ارم) بووە. (خلود) یەکێك بووە لەو

(١) دەربارەی هۆی ناوبردنی چینی سێیەمی عەرەب بەعەرەبی (مستعربة)ش دوو مانا هەیە: یەکەمیان ئەوانەن کەبوون بەعەرەب وەڕەچەڵەکیان لەنێو میللەتی عەرەب دا ون بووە، دووەمیش: مانای ئەو نەوەیە دەگەیەنێت کە لەکوڕانی (اسماعیل)ی کوڕی (إبراهیم) بوون. (سلاوی خودایان لەسەر بێت). بڕوانە (المعجم الوسیط) ص٥٩١. (وەرگێڕ)

هۆزانەی (عاد) کە ژمارەیان (واتە ژمارەی هۆزەکان) بەڕای هەندێك لەشارەزایانی ئەم بوارە یازدە هۆز بووە. هەروەها خودای پەروەردگار پێغەمبەرێکی بەناوی (صالْح)ـەوە بۆ گەلی (ثەمود) ڕەوانە کرد کە لە خێڵی (صالْح-ی کوڕی-عبید-ی کوڕی-أسف-ی کوڕی -ماسخ-ی کوڕی -عبید-ی کوڕی -خادر-ی کوری -ثەمود-ی کوڕی -جاثر-ی کوڕی -إرم) بووە.

# بەندی یەکەم

## (( چیرۆکی هود ))

( خانووەکانی (عاد) و خواوەندەکانیان ـ بانگەواز بۆ خودا ـ بەبیرخستنەوەی بەخششەکانی خودا ـ وت ویژ لەگەڵ بت پەرستان دا ـ بانگەوازێك بۆ گەڕانەوە ـ ڕزگاربونی باوەڕداران و لەناوچونی بێ باوەڕان )

## خانووەکانی ( عاد ) و خواوەندەکانیان

لەقورئان وا دەفامرێتەوە کە خانوو و شوێنی نیشتەجێی گەلی (عاد) لەدۆڵی (أحقاف)ی ناوچەی(حضرموت)دا بوو بێت. خودا فەرموویە: ﴿وَٱذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ﴾الأحقاف/٢١. وشەی (أحقاف) کۆی (حقف)ـە ومانای ناوچەی لماوی دەگەیەنێت. لەقورئان دا ناوی مەوقیعەکەی دیاری نەکراوە. بەڵام زانایانی هەواڵی گەلان دەڵێن: (مەوقیعەکەی لەنێوان –یەمەن- و –عومان-دا تا –حضرموت- و –شحر-ە).

گەلی (عاد) شارێکیان بنیات نابوو ناوی (ئیرەم)[1] بوو کە لە قورئانیش دا باسی کراوە:﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ﴾الفجر/٦-٧. واتە (ئایا نەت زانیوە خودای پەروەردگارت چی ی کرد بە گەلی (عاد)؟ واتە بەو گەلەی کە ـ هود ـ ی پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە کراوەو ناوی باوکیان (عاد) بووەو هۆزێك بوون لە (ئیرەم) واتە لەو شارەی بە بینا و ساختمانی بەرز و مەحکەم ناوبانگی دەکردبوو، خانووەکانیان بەچەندین ستوون(عەموود)ی پتەو ڕاگیرابوو).

زانایانی شوێنەوارەکان بەپێی چەندین کرداری پشکنین و لێکۆڵینەوەی وردیان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە شوێنی (ئیرەم) چیای (رەم) بێت کەوا (٢٥) میل لە خۆرهەڵاتی شاری (عەقەبە)ـەوە دوورە، چونکە بێگومان لەتەنیشت چیاکەوە چەندین شوێنەواری دێرینی

---

(١) "ابن خلدون" لەمێژووەکەی دا ڕای وایە، کە گوایە شارێك بەناوی (ئیرەم)ـەوە لەکایەدا نەبووە، بەڵکو ئەمە لەشتە ئەفسانەییەکانی نێوداستانەکانەو تەفسیرنووسە کەم ئەزموونەکان باسی دەکەن، دەنا وشەی (ئیرەم) کەلەفەرمایشتی خودا (ارم ذات العماد) داهاتووە مانای هۆز دەگەیەنێت نەك شار و وڵات.

سەردەمی جاهیلی دۆزراوەتەوە.

هەروەها زانایانی هەواڵ و کاروباری گەلانی کۆن دەڵێن کە گەلی (عاد) سێ بتیان پەرستووە، یەکێکیان ناوی (صداء) بووە و دووەمیش ناوی (صمود) بووەو سێیەمیشیان ناوی(هباء)[1] بووە. ئەمەی پێشوو کورتە باسێك بوو دەربارەی گەلی (عاد) تاکو بیکەینە دەروازەیەکی لێدوان دەربارەی پێغەمبەری خودا (هود).

## بانگەواز بۆ خودا

(هود پێغەمبەر) بانگی گەلەکەی کرد بۆ پەرستنی بەتەنها و وازهێنان لەپەرستنی بتەکان، چونکە ئەمە ڕێگای خۆپاراستنە لەسزای ڕۆژی قیامەت. لەم بارەیەوە خودا فەرموویە: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ الأعراف/٦٥، واتە: (بۆ لای گەلی -عاد-، هودی برایانمان بۆ ڕەوانە کردن، کە پەیامی خودایان پێ بگەیەنێت و پێ یان بلێت: (گەلۆ تەنها خوداپەرستن چونکە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکەتان بەهەق نی یە، دەی ئایا لەخوا ناترسن و خۆتان لەسزای سەختی ناپارێزن؟)). هەروەها خودای مەزن فەرموویە: ﴿وَٱذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ الأحقاف/٢١.. واتە: (هەورەها باسی داستانی برای گەلی عاد (هود) بەبیربێنەوە کاتێك ڕەوانەکرا بۆ لایان و گەلەکەی خۆی لە پێش خۆیو دوای خۆی بۆ هۆزو گەلەکانیان نێررابوون و هەمویان داوایان ئەوەبوو کە: تەنها خودا بپەرستن و بەڕاستی من ترس و نیگەرانیم لەسزای ڕۆژێکی گەورە هەیە بۆ ئێوە). گەلی (عاد) بیروباوەڕیان وابوو گوایە بتەکان چەند هاوەڵێك(شرکاء)ی خودان و لەلای خودا نزاو شەفاعەتیان بۆ دەکەن. بەڵام (هود) لەوەڵامیان دا پێی ڕادەگەیاندن کە (ئێوە لەم ئیدیعایەتان دا درۆ دەکەن، چونکە کەس شایانی پەرستن نی یە تەنها خودا نەبێت، هەروەك لەسوورەتی (هود)دا خودا فەرموویە:﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ﴾هود/٥٠.. واتە: (بۆ گەلی عاد،هود-ی برایانمان بۆ ناردن کەپێی گوتن: ئەی گەلی خۆم تەنها خودا (الله) بپەرستن، چونکە بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکەتان نی یە، بێگومان ئێوەش کە هاوەڵتان بۆ خودا داناوە درۆتان

---

(١) مێژووی (طبري)، تأريخ الطبري / بەرگی یەکەم.

هەڵبەستووە لەسەر ئەوەی کە گوایە خودا هاوەڵێکی هەبێت). بەڵام داخۆ کارایی ئەم بانگەوازە لەسەر گەلی (عاد) چەند بوو بێت؟

بێگومان ئەوان بە چاوی سووك سەیری ـ هودـ یان دەکرد و ڕێزیان لێ نەدەگرت و بە (شێت و گەمژەو درۆزنیان وەسف دەکرد). دیارە ـ هودـ یش ئەو سیفەت و تۆمەتانەی ڕەت دەکردەوە و بەچاکی بۆی ڕوون دەکردنەوە کە ئەو خۆی پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوی خودای پەروەردگاری جیهانیانە و تەنها ئامۆژگاری و ڕێنمایی یان پێ دەگەیەنێت و بەتەمای هیچ دەسکەوتێکی تایبەتی نی یە لێ یان. هەروەك خوداش بەسەرهاتەکەی لەقورئان دا گێڕاوەتەوەو فەرمووویە: ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ[1] وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ الأعراف/٦٦-٦٨.

واتە:(گەورە پیاوان و دەسەڵاتدارە چاوسوورەکەرەوە بێباوەڕەکانی ئەو گەلە بە (هود)یان گوت (ئێمە بەگەمژە دەتبینین و واش گومان دەبەین درۆ بکەیت). ئەویش پێی گوتن (ئەی گەلی خۆم هیچ گەمژەیی یەکم تیادانی یە، بەڵکو من پێغەمبەرێکم لەخودای پەروەردگاری جیهانیانەوە بۆ لای ئێوە نێرراوم و پەیامەکانی خوداتان پێ دەگەیەنم، هەروەها من پەندو ئامۆژگاریتان بەئەمانەتەوە پێ ڕادەگەیەنم وڕێ پێشاندەرێکی سەر ڕاستانم).

## بەبیرخستنەوەی بەخششەکانی خودا

"هود" (سڵاوی خودای لەسەر بێت)، لەهەوڵدانی زۆری دا بۆ قایل کردنی گەلەکەی بەگەڕانەوە بۆ سەر ڕێ ی ڕاست، بەردەوام بوو لەسەر دواندنیان و لە بەشێکی دیکەی ئەو هەوڵانەی دا دەیویست نیعمەت و بەخششە زۆرەکانی خودایان بەبیربێنێتەوە.. ئەوە بوو پێی دەفەرموون: ئەرێ ئەوە لاتان سەیرو سەمەرەیە گەر ڕێنمایی و ئامۆژگاری یەکانی خودای پەروەردگارتان لەسەر زمانی یەکێك لەخۆتانەوە -کە منم- پێتان بگەیەنرێت و لەئاکامی خراپ وریاتان کاتەوە بەهۆی ئەو گومڕایی یەوەی ئێوە تێ ی کەوتوون؟ ئایا بە بیرتان دا

---

(١) (ليس بي سفاهة):کە ماناکەی(واتە: هیچ گەمژەیی و عەقڵ سووکی یەکم نی یە)وەڵامی پێغەمبەری خودا -هود-ە بۆ گەلەکەی،و، ئەم وەڵامەش لەوپەری بەئەدەبیو ڕێزداری دایە چونکە نەیویستووە وەك خۆیان بدوێت و بەو شێوەیە وەڵامیان بداتەوە لە کاتێك دا هەر خودی ئەو نەیارو ناحەزانەشی لەو پەری نەفامیو گەمژەیی دابوون، لەم هەڵس و کەوتەی (هوود)دا خووڕەوشتی گەورەو پێشرەوی (قدوة)ی چاك بەدی دەکرێت.

نایەتەوە خـودا کردوونی بە میراتگری زەوی لە دوای گەلی (نوح)، کە خودا بەهۆی گوناهەکانیانەوە لەناوی بردن، یان سەیر کەن چۆن خودا هێزی زیاتری لە جەستەتان و لەدەسەلاتیشتان دا پێ داون، ئەم نیعمەتەش ئەوەتان لێ دەخوازێت کە باوەڕ بەخودا بێنن و سوپاسی ی لەسەر بکەن نەك سپڵەو پێ نەزان و بێباوەڕبن. جا ئامۆژگاریی من بۆتان ئەوەیە کە نیعمەت و بەخششی خودا بەیاد بێننەوەو لە بیریان مەکەن تاکو بەختیاری دنیاو ئاخیرەتیشتان دەستەبەر کەن، ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَاذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ الأعراف/٦٩.

بەڵام گەلەکەی (هود) مافی سوپاسگوزارییان بەرامبەر ئەو هەموو بەخـشش و نیعمەتـەی خودا بەجێ نەگەیاند، بەڵکو لەهەواو ئارەزووەکانیان دا نغرۆبوون و لەسـەرزەویش دا لوتبـەرزو بێ پەروابوون. (هود)یش پێی گوتن: (باشە ئێوە، کە لەسەر هەر بەرزایی یـەك سـاختمانێکی گەورە بۆ شانازی بەخۆوە کردن و بێ هوودەیی بنیـات دەنـێن و جـوانترین کۆشـك و تـەلاریش دروست دەکەن وەك ئەوانـەی بەتـەمای نـەمریو ژیانی هەمیـشەیی ی سـەرزەوین و ئەگـەر پەلاماری خەڵکیش بدەن زۆر بوتوندو تیژی و زۆرداری یەوە پەلامار دەدەن و زەبـر دەوەشـێنن لەکاتێك دا تووڕە دەبن و ڕەحم ناکەن، بۆچی لەخواناترسن و ناگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێ ی ڕاسـت؟ دەبێت لەخوا بترسن و گوێ ڕایەڵی ی فەرمانەکانی بکەن و پەیرەوی ئەو ڕێگاڕاسـتەش بکـەن، کە من ئێوەی بۆ بانگ دەکەم. گەلی خۆم بترسن لەو خودایەی کە ئەو هەموو خێروبێرە فرەیەی بۆ فەراهەم هێناون چ لەماڵ و مناڵ و نەوە بێت یان لەوڵاخ و گیانداران و ئـەو هـەموو بـاخ و بێستان و جۆگەو کانی و ڕووبارانە. جـا ئێـوەش چـی دی بەرامبـەر بـەو هـەموو نیعمـەت و بەخششانەی خودا بێباوەڕو پێ نەزان و بێباك و لووتبەرزو زۆردار مەبن، دەنا گەر وابـن ئـەوا سزای سەختی ڕۆژی دوایی شایستەتان دەبێت و لەناوتان دەبات):

﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ[1] ءَايَةً[2] تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ[3] لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ[4]

---

(١) (ريع): واتە شوێنی بەرز.. بەرزایی.

(٢) (آية): واتە کۆشکێکی بەرز و پتەو کە لە ئالاّ(علم) بچێت. (عَلَم)یش بەیداخە یان منارەیە یـان چـیاو هەر شوێنێکی بەرزایی یە.

(٣) (مصانع): واتە حەوزو ئەستێرکی ئاو، گوتراوە کەمانای قەڵاکانیش دەگرێتەوە.

(٤) (تخلدون): واتە بۆیە وا دەکەن تاکو لەدنیادا بەتەمای نەمریو ژیانی هەمیشەیی بن.

﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ الشعراء/١٢٨-١٣٥.

## وتو ویژ لەگەڵ بت پەرستان دا

گەلی (عاد) بەپیر بانگەوازەکەی (هود)ـەوە نەچوون، سەرکردەکانیشیان سووربوون لەسەر پەرستنی بتەکانیان، هەربۆیە بە (هود )یان گووت: (تۆ بەڵگەیەکی ڕوونت لەسەر ڕاستیی ئەو بەرنامەیە بۆ دەرنەخستووین، ئێمەش واز لەپەرستنی خوداوەندەکانمان ناهێنین و باوڕت پێ ناکەین، لەو باوەڕەش داین کە وا دیارە هەندێك لەخواوەندەکانمان خراپەیان دەرهەق کردبێت، بۆیە تۆش قسەی نابەجێیان پێ دەڵێیت).. (هود) لەوەڵامیان دا گوتی: (خودا دەکەم بەشایەت(شاهد) لەسەر ڕاستیی وتەکانم، ئێوەش دەکەم بە شایەت لەسەر ئەوەی کە بێتاوانم لەو شیرکەی ئێوە تێی کەوتوون، دە ئێوەش خۆتان و خواوەندەکانتان هاوکاروپشتگیری ی یەکتر بن لەسەر پیلان گێران لەمن و لەسەر سزادانم پاشان بۆ ساتێکیش سزاکەم دوا مەخەن گەر توانیتان، منیش هیچ ترسێکم لەو پیلان و فڕوفێڵانەی ئێوە نییە چونکە پشتم بەستووە بەو خودایەی کە خاوەنی من و ئێوەشە، تەنانەت هەر گیانەوەرێك و هەر بوونەوەرێکی زیندوو ڕوو لەم بانگەوازەی من وەرگێرن ئەوە هیچ زیانێکم پی ناگەیەنێت، چونکە ئاگادارم کردوون و ئەوەی خودا پێی سپاردووم پێم گەیاندن، خوداش توانای لەسەر لەناوبردنتان هەیەو دەتوانێت گەلێکی تر جگە لە ئێوە بێنێت و لەخاکی ئێوەدا نیشتەجێ بکات. بێگومان خودا توانا و دەسەڵاتی لەسەر هەموو شتێك هەیە):

﴿قَالُوا يَا هُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ [١] بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُ شَيْئًا إِنَّ رَبِّي عَلَى كُلِّ شَيْءٍ

---

(١) (اعتراك): (مَسّك) واتە تووشت بووە. خراپەی هەندێك خواوەندمانت تووش بووە.

حَفِيظٌ ﴾ هود/٥٣-٥٧.

پاشان ئەو گەلە داخ و نیگەرانی یەکی زۆریان لە (هود) و لە بانگەوازەکەشی دەربڕی و تەنانەت لە زۆری ی ئامۆژگاری یەکانی بێزار ببوون، بەم ڕەنگەش وازیان لەپەرستنی خواوەندەکانیان بۆ پەرستنی خودای پەروەردگار نەهێنا کە (هود) بانگی ی دەکردن بۆ ئەو ڕێگەیە، بەڵکو بەرەبەرەکانی ی ئەوەشیان دەکرد کە مەحاڵە هەڕەشەی ئەو سزا سەختانەیان بەسەردا بهێنرێت، (هود)یش لەو ساتەوەختانەدا پێ ی گوتن: (هەر دەبێت ڕق وتووڕەیی خوداتان بەسەردا بباریێت و چاوەڕێ ی سزای خودابن، ئەوا منیش لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕوانم):

﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٌ وَغَضَبٌۖ أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴾ الأعراف/٧٠و٧١.

لەم دەقە قورئانیەدا دەبینین جۆرە بەندکاریی یەکی ڕۆحی باڵی بەسەر گەلەکەی (هود)دا کێشاوە، چونکە لاسایی کردنەوەی کوێرانەی باووباپیرانیان هەموو سەربەستی یەکی تێڕوانیێت وبیرکردنەوەی لێ زەوت کردوون، هەروەها دەبینین هێزی بەڵگەکەی(هود) لە چ ئاستێکی باڵادایە کاتێك هەموو خواوەندەکانیان دەکات بە چەند ناوێکی بەتاڵ کە لەجیهانی ڕاستی دا هیچ شتێکی ناوبراو (مسميات)یان تێدا بەدی ناکریت، هەروەك لەڕادەی ئەو شتانەش دا نین کە ناوەکانیان لێ بنرێت، چونکە هیچ بەڵگەیەك لەسەر خواوەندی (ألوهية)ی ئەو بتانە نی یەو هێزێکیشیان نی یە، کە وجودی پەرستنیان بسەلمێنێت.

## بانگەوازێك بۆگەڕانەوە

گەلەکەی (هود) تووشی سێ ساڵی لەسەریەکی بێبارانی بوون دوای بانگ کردنیان بۆ سەر ڕێ ی ڕاست و ڕوو لێ وەرچەرخانیان. ئەم سێ ساڵی وشکانی و باران نەبارینەش وەك نامەیەکی ئاگادارکردنەوە بوو دەربارەی نزیك بوونەوەی هاتنی سزایەك لەسەریان. لەو ساتانەش دا (هود)ی پێغەمبەری خودا هەر بەردەوام بوو لەئامۆژگاریکردنیان و هوشیارکردنەوەیان و، پێ ی گوتن: (ئێوە لەخوداتان بپاڕێنەوە و نزا لەلای خودای خالقتان بکەن کەلەو گوناهانەی پێشووتان خۆش بێت، پاشان بەتۆبەکردن بگەڕێنەوە بۆ لای خودا، گەروا بکەن ئەوا تۆبەشتان

لێ وەردەگیرێت و بارانی بەلێشاوی زۆرو بێ زیانتان بۆ دەنێریت و بەوەش داهاتی چاندن و کشتوکاڵتان زۆر دەبێت. جگە لەوەش هێزی زیاتر دەخاتە سەر هێزتان، جا تکاتان لێ دەکەم لەم بانگەوازەش ڕوو وەرمەگێرن و لەسەر کفرو ستەمکاری سوورمەبن):

﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ﴾ هود/٥٢.

## ڕزگاربونی باوەڕداران و لەناوچونی بێباوەڕان

دوای بڕانی باران بۆ ماوەی سێ ساڵ و دوای ئەوەی گەلەکەی -هود- نکوولی یان لە پەیامی پێغەمبەرەکەیان کردو هەر بەردەوام بوون لەسەر کفرو گومڕایی و ڕۆچوونیان لەتاواندا، فەرمانی خودا لەمەڕ دابەزاندنی سزای سەخت لەسەریان جێبەجێ کراو لەو سزا سەختەدا خودا(هود)و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵی دا بوون ڕزگارکردو گەلی تاوانبارانیان لەناوبرد:﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا[1] نَجَّيۡنَا هُودٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ﴾ هود/٥٨.

دەربارەی چۆنیەتی ڕزگاربوونی -هود- یش قورئان ئەوەی بۆ ڕوون نەکردووینەتەوە، بەڵام هەندێك لەمێژوونووسان پێیان وایە کە مەسەلەی ڕزگاربوونی -هود- بەهۆی دوورکەوتنەوەی لەگەلەکەی بووە دوای بێهیوا بوونی لێ یان لەوەرگرتنی بانگەوازەکەیان و ڕۆشتنی لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیان پێی هێنابوو بۆ شاری(مەککە) و ژیان تیای دا بۆ ماوەیەك تا کاتی کۆچی دوایی ی لەوێو بەخاك سپاردنیشی هەر لەوێ[2]. سزاش بۆ سەر گەلی(عاد) ئەوە بوو خودا بۆ ماوەی حەوت شەوو هەشت ڕۆژی لەسەریەك ڕەشەباو زریانێکی سەختی بۆ ناردن و هەمویانی تەفروتونا کرد و لاشەکانیان بەسەر زەوی دا بڵاوبووەوە وەك چۆن دارخورمای ناوبەتاڵ لەڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەکەنرێت و هیچیان لێ نامینێت، ئیدی لەو گەلەی کە لەناوچوون هیچ نەدەبینرا تەنها خانوو ونیشتگاکانیان نەبێت..خودای مەزن دەربارەی ئەم سزایەش فەرموویە:﴿وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ[3] عَاتِيَةٖ[4] ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ

---

(١) (أمرنا): واتە فەرمانی خودا بەهاتنی سزا.

(٢) بڕوانە (احبار مكة- للأزرقي): ١/٣٠.

(٣) (بريح صرصر): واتە: بایەکی ئێجگار گەرم یان زۆر سارد.

(٤) (عاتية): واتە ئەوپەڕی توندو بەهێز.

حُسُومًا[١] فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ[٢] نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴾الحاقة/٦-٨. هەر لەم بارەیەوە خودا مەزن لەئایەتێکی دی دا فەرموویە:﴿ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ[٣] ﴾الذاريات/٤١-٤٢. واتە:(بۆ سزادانی گەلی-عاد-بایەکی بەهێزی لەناوبەرمان بۆناردن،کە توخمو وەچەشیانی لێ نەهێشت و بایەکی وەهابوو، کە هیچ شتێکی نەدەهێشتەوە، تا لەناوی دەبردو لێکی هەڵدەوەشاند).

(١) (حسوماً): یەك لەدوای یەکی لەبن هێنەر.
(٢) (اعجاز): واتە ڕەگ و لق و پۆپ.
(٣) (الرمیم: وشکی وردبوو وەك ڕووەکی زەردی وەریو.

# بەندی دووەم

## ((چیرۆکی صالح))

(خانووەکانی "ثەمود" و خواوەندەکانیان ـ بانگەواز بۆ خواپەرستی ـ زیادەڕۆیی کوشندە ـ "ثەمود" داوای موعجیزەیەك دەکەن ـ تەقینەوەی دوژمنایەتی ـ سەربڕینی حوشترەکە ـ پیلان دانان بۆ وشتنی "صالح" ـ لەناوچوونی گەلی "ثەمود" )

### خانووەکانی "ثەمود" و خواوەندەکانیان

قورئان شێوەی خانووەکانی گەلی"ثەمود"ی دیاری نەکردووە، بەڵکو هەر هێندە لەفەرمایشتێکی خوادا دەردەکەوێت کە خانوو و شوێنی نیشتەجێ، یان لەچەند ناوچەیەکی شاخاوی یان لەچەند بەرزاییەکی بەردین دابووە:﴿وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ﴾الفجر/٩.. واتە:(هەروەها بڕوانە خودا چی کرد بەگەلی-ثەمود-کە بەردی گەورەی نێوچیاکانیان دەبڕی و خانووەکانیان لێ دروست دەکرد و لەدۆڵەکەدا نیشتەجێ ببوون).. لەم ئایەتەدا مەبەست لە وشەی دۆڵەکە (الواد) ئەو (وادي القرى)یە بووە کە شوێنەکانی نیشتەجێبوونی ئەو گەلەی لەخۆگرتووە. زۆربەی داستان گێڕەوانیش (الرواة) گوندی (الحجر) بەو شوێنە سەرەکییەی خاکی نیشتمانی - ثەمود- دادەنێن و باسی بیرێکیش دەکەن، کە بە (بیری ثەمود) ناوبراوە. پێغەمبەری پێشەواشمان -محمد- ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی دا لەجەنگی ـ تبوك ـ بەلای ئەو بیرەدا ڕۆشتوون، بەڵام ڕێی نەداوە بەهاوەڵان (صحابة) لەئاوی بیرەکە بخۆنەوەو لەدەوروبەری ئەو ناوچەیەش دانیشن. هەروەها گەلی -ثەمود- چەندین بتیان پەرستووە، لەوانەش بتی (ود)و (جد- هد)و (شمس)و (مناف)و (مناة)و (لات)و[1]... هتد.

### بانگەواز بۆ خواپەرستی

خودای مەزن (صالح)ی نێراوو پێغەمبەری خۆی بۆ لای گەلی "ثەمود" نارد تاکو بانگیان بکات بۆ پەرستنی خوداو وازهێنان لە(بت پەرستی)، ئەم پێغەمبەرەش بەگەلەکەی خۆی گوت: (گەلی خۆم تەنها خودا خۆی بپەرستن و هیچ کەسێك مەکەن بە هاوەڵی، چونکە هەر خودایە

(١) بروانە (تأريخ العرب قبل الأسلام. للدكتور جواد علي. ج١).

کە لەخاك دروستی کردوون و یارمەتی داون، کە ئەو خاکە ئاوەدان بکەنەوە و هۆو ئامرازەکانی ئاوەدان کردنەوەشی بۆ سازکردوون. جاکەوا بوو مادام خودا خاوەنی ئەوبەخشش و (فضل)و چاکانەیە لەسەرتان، دەبێت ئێوەش وەك ئەرکی سەرشانتان داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن لەسەر ئەو گوناەو سەرپێچی یانەی پێشووتان و تۆبەی لەلابکەن و دڵنیاش بن خودا لێتان نزیکەو نزای نزاکار گیرادەکات و لەگوناهی تۆبەکار دەبووریت گەر باوەڕی پێهێنابێت و لە نزاکەش دا دلسۆزو ڕاستگۆ بێت: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ [1] أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ﴾ هود/٦١.

## زیادەڕۆیی ی کوشندە

گەلی -ثەمود- پێغەمبەرەکەی خودایان بەدرۆخستەوەو بەدەم بانگەوازی خواپەرستیو خوا بەیەکگرتن و لەخواترسانەوە نەچوون لەکاتێك دا ئەو (واتە: صالح) پێغەمبەرێکی سەرڕاست و دەسپاك بوو و هیچ پاداشت و کرێ یەکی لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی لێ یان نەدەویست.

یەکێك لە داب و نەریتەکانی ئەو گەلە ئەوە بوو زیادەڕۆیی یان کرد لە تام و چێژە هەست پەرستی یەکانی خۆیان دا وەك خواردن و خواردنەوەو دانیشتن لە خانووی گرنگ و قەشەنگ دا. (صالح)ی پێغەمبەریشیان بەرهەڵستی ی ئەو داب و نەریتەیانی دەکرد وپێ ی دەگوتن: (ئایا واگومان دەکەن گوایە خودا دەسبەردارتان دەبێت لەسەر ئەو حاڵەتی نازو نیعمەتە زیاد لەڕادەیەو لەخۆشتان دڵنیان کە سزای خوداتان تووش نابێت؟ ئایا هەروا بەئارەزووی خۆتان لەو باخ و بێستان و کاریز و ڕووبارانە و لەو بەروبووم وخورما شیرین و پێگەیشتوانە بخۆن و خانوو نیشتگای جوان و گرنگ لەبەردی داتاشراوی چیاکان دروست بکەن و بەبێباکی و نامەسئولانە تیایان دا بژین و پاشان سوپاسی خودا نەکەن لەسەریان و کڕنووشی بەندایەتی ی بۆ نەبەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتە گەورانە؟ دە ئیتر لەخودا بترسن و گوێڕایەڵی ی من بکەن لەو فەرمانانەدا، کە ڕێنمایی ی ئێوەی پێ دەکەم. هەروەها گوێڕایەڵی ی فەرمانی ئەو دەست بلاوانە مەکەن کە زیادەڕۆیی لەسەر خۆیان بەکفرو سەرپێچی و یاخی بوون دەکەن، ئەوانەی کەخراپەو بەدکاری لەزەوی دا بلاودەکەنەوەو ڕێگایەکی چاکسازی نازانن: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ

---

(١) (والی ثمود): واتە بۆلای گەلی ثەمود ـ صالح ـ ی برایانمان بۆ ناردن. واتە لەکەس و کاری خۆیان.

وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ[١] ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ[٢] ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ[٣] ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴾ الشعراء/١٤١-١٥٢

هەر لە وتەکانی دیکەی (صالح) ئەوەبوو کەپێ ی دەگوتن:

﴿ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ[٤] ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ الأعراف/٧٤.. واتە (هەروەها ئەوە بەیاد بێننەوە کە خودا دوای گەلی عاد ئێوەی نیشتەجێ کردو لەزەویش دا جێ‌ی چاکی بۆ کردنەوە کە لە قەدپاڵ و دەشتاییەکانی زەوی دا کۆشکی جوان دروست دەکەن و لەچیاکانیش خانوو دروست دەکەن و لەبەردی شاخ دایدەتاشن. جا ئێوەش نیعمەت و چاکەی خودا بە یادبێننەوەو لەسەر زەوی خراپەو ئاشووب مەنێنەوەو لەسەر فەسادو خراپە بەردەوام مەبن).

## "ثەمود" داوای موعجیزەیەك دەکەن

ثەمودی یەکان باوەڕیان بەو بەرنامەیە نەهێنا کە (صالح) ئامۆژگاریی پێ دەکردن، ئەو ڕێگە ڕاستەشیان نەگرتەبەر کەپێشانی دابوون، بەڵکو هەر بەخەڵەفاویان دادەناو گوایە عەقڵی تێك چووەو سیحریش هەموو هۆش و هەست و نەستی داگیرکردووەو وای لێکردووە تا خۆی بەپێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوی خودابزانێت. ئەوان داوایان لێ کرد موعجیزەیەکیان بۆ بەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی پیشان بدات و بیسەلمێنێت کەبەڕاستی پێغەمبەرە. ئەویش لەبەرامبەر ئەو داوایەدا حوشترێکی هێنا کە خودا بەشێوەیەکی نائاسایی و ناوازە (غير

(١) (طلعها هضيم): واتە بەرووبوومەکەی نەرم و گەیشتووە.

(٢) (فارهين): واتە شارەزان لەداتاشینی بەردو بیناسازیداو زیادڕەوو لووتبەرزن.

(٣) (ولا تطيعوا أمر المسرفين): لەم فەرمانەدا ئاماژەیەك بۆ ئەو ڕاستی یە گرنگە هەیە کە باشتر وایە لەدنیادا بەڕادەی پێویستی ی ژیان مرۆڤ هەوڵ بدات نەك هەموو هەولێکی هەر بۆ بەرژەوەندیی یە دنیاییەکانی بێت و تام وچێژی خواردەمەنیو هەواو ئارەزووە نەفسییەکانی زیادبکات.

(٤) (آلاء الله): واتە بەخشش ونیعمەتەکانی خودا.

مألوف)[1] خەلقی کردبووو فەرمانی پێکردن،کە خراپەی دەرهەق نەکەن و نابێت ئازار بدرێت و دەربکرێت و سواری پشتی ببن و سەری برن، هەروەها خودا ڕۆژێکی دیاری کردبوو بۆ ئاودانی حوشترەکەو بۆ ئەوانی تریش ڕۆژێکی تری دانابوو، هەڕەشەی سزای سەختیشی لێ کردن گەر دەسدرێژی بکەنە سەر وتنێ ی گەیاندن، کە ساغی و سەلامەتی ی حوشترەکە بەندە بە سەلامەتی ی ئەوانەوە: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا فَأۡتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٞ لَّهَا شِرۡبٞ وَلَكُمۡ شِرۡبُ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾الشعراء/١٥٣-١٥٦. هەر لەم بارەیەوە خودای مەزن فەرموویە: ﴿ إِنَّا مُرۡسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتۡنَةٗ لَّهُمۡ فَٱرۡتَقِبۡهُمۡ وَٱصۡطَبِرۡ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡۖ كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ [2] ﴾ القمر/٢٧-٢٨. واتە (ئێمە حوشترێکمان داناوەو (ناردووە) بۆ تاقیکردنەوەیان و تۆش (ئەی صالح) چاوەڕوان و چاودێری سەرەنجامیان بەو ئارامیش لەسەر ئازارو ئەشکەنجەیان بگرە و پەلە مەکە. پێشیان ڕاگەیەنە ئاوی ئەو بیرەی لێیان دەخواردەوە دابەش کراوە لەنێوان ئەوان و حوشترەکەدا (ڕۆژێك بۆ ئەوان و ڕۆژێك بۆ حوشترەکەیە) و هەرلایەنەش لەڕۆژی سەرە (نۆبە)ی خۆی دا ئامادەبێت).

## تەقینەوەی دوژمنایەتی

حوشترەکە بۆ ماوەیەك لەنێویان دا مایەوەو لەگژوگیای سەرەزەویی دەخوارد. بەڵام ڕۆژێك دەچووە سەر ئاوەکەو ڕۆژێکی تریش ڕێی لێ دەگیرا. بێگومان ڕاگرتنی لەسەر ئەم حاڵەش بەپێی ویستی زوربەی خەڵکی بوو لەگەڵەکەی (صالح) چونکە لەوەدا ڕاستی پێغەمبەرێتیی (صالح)،یان بۆ دەرکەوتبوو. ئەمەش چینی پیاوماقووڵان و دەسەڵاتدارانی ئەو گەلەی ترساندبوو و لە نەمان وتیاچوونی موڵك و دەسەڵاتیان دەترسان. هەر بۆیەش لەناخەوە ڕقیان لەحوشترەکە هەستاو هەڵوێستی ڕکەبەریو دوژمنایەتییان بەرامبەر (صالح) و باوەڕداران گرتەبەر، (صالح)یش هەستی بەو هەڵوێستە شەڕخوازیانەی ئەوان کردو پێیشی گوتن: (ئەی

---

(١) هەر دەربارەی ئەو شێوە نائاسایی یەی خەلق کردنی حوشترەکە گوتراوە کە ئەو حوشترە لەبەردێکی گەورەوە دەرچووە.

(٢) (کل شرب محتضر): واتە (هەر بەشە ئاوێك خاوەنەکەی بەندی دەکات بۆ خواردنەوەی لەو ڕۆژەی دا کەبۆی تەرخان کراوە). واتە لەڕۆژی سەرەی خۆی ئامادە دەبێت.

گەلی خۆم بۆچی پەلە لەداوای ئەو سزایە دەکەن کە پێش تەوبەکردن هەڕەشەتان پێ‌ی لێ کراوە)؟ بۆچی داوای لێخۆشبوون لەخودای پەروەردگارتان ناکەن تاکو ڕەحمێکتان پێبکات)؟!... کەچی ئەو گەلە بەدبەختە لەوەلاّم دا وتیان (ئێمە تووشی نەگبەتی و شوومی بووین بەهۆی تۆو ئەوانەی باوەڕیان لەگەڵتاهێناوە، هەروەها تووشی بێبارانی و ڕەنجەڕۆیی بووین لەو ڕۆژەوەی کە بەو بانگەوازەوە هاتووینە لامان).. (صالح)یش گوتی: (لەڕاستی دا شتێکی ئەوتۆ بۆ نەگبەتی و شوومی لە ئارادا نی یە، چونکە هەموو هۆیەکانی چاکەو خراپە و خێروشەڕ لەلای خوداوەیە، خوداش بەم ناڕەحەتی یە تاقیتان دەکاتەوە تاکو باوەڕبێنن و بزانن هەر خودا پشت و پەناتانە: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِۖ لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ [1] وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِۖ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ [2] ﴾ النمل/٤٦-٤٧.. دەسەلاّتدارە پایەدارە لووتبەرزەکانی ئەو گەلەش سەرزەنشتی باوەڕدارانیان دەکرد لەسەر باوەڕهێنانیان بە-صالح- و بەرنامەکەی بەلاّم ئەو باوەڕدارە بێ دەسەلاّتانەش لەچینی هەژاران و چەوساوان بوون و داکۆکی یان لەهەڵوێستی خۆیان دەکرد و بۆشیان دوویات دەکردنەوە کە ئەوان باوەڕیان بەپەیامەکەی ـ صالح- هێناوە:

﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ الأعراف/٧٥-٧٦.

## سەربڕینی حوشترەکە

دەسەلاّتداران و سەرانی ئەو گەلە چی دی بەو حاڵەتەدا چاویان بەدیتنی باوەڕداران هەڵنەدەهات. تەنانەت بەوجودی حوشترەکەش لەنێوانیان دا. لەوانەشە هێندە زل بووبێت کە ئاژەڵەکانی ئەوانی ترساندبێت، یان ئاوەکەی لێ زەوت کردبن لەکاتی زۆربوونی ئاتاج دا بە ئاو، هەورەها وادیارە لەوەش ترسابن ژمارەی باوەڕداران بەهۆی ئەو حوشترەوە زۆربێت، وادیاریش بووە ئەمانە هەمووی وای لێ کردبن هەوڵی کوشتنی حوشترەکە بدەن سەرەڕای ئەو ئاگاداری و هۆشداری یەی لەلایەن پێغەمبەرەکەیانەوە ئاڕاستەیان کراوە دەربارەی سزادانیان و

---

(١) (اطيرنا بك): واتە ئێمە شووم ونەگبەت بووین بەهۆی تۆوە.

(٢) (تفتنون): واتە تاقی دەکرێنەوە.

هەڕەشە لێ کردنیانشیان بەتیاچوون گەر بەخراپی تـوخنی حوشـترەکە بکـەون، کەچـی ئـەوان بێباکانە حوشترەکەیان سەربڕی و داواشیان لەپێغەمبەرکەیان کرد کە ئـەو سـزایەی هەڕەشـەی پێ لێ کردوون پێشی خات بۆیان تاکو بۆیان بسەلمێنێت، کە ئەو خۆی پێغەمبەرێکـە لەلایـەن خوداوە بۆیان ڕەوانە کراوە. لەئاست ئەو بەرەبـەرکانی کردنەیانـدا بەرامبـەر فـەرمانی خـودا) (صالح) هەواڵی پێ دان کەوا سزای خودا دوای سێ ڕۆژ پێیان دەگات و بەسـەریاندا جێبـەجێ دەکرێت:

﴿ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾الأعراف/٧٧..هەر دەربارەی وادەی سزاکەیان خودا فەرموویە: ﴿ فَعَقَرُوهَا[1] فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ﴾هود/٦٥.

## پیلان دانان بۆ کوشتنی صالح

لەنێو گەلی -ثەموود-دا نۆ پیاوی دەسـەڵاتدار هـەبوو کـە هەریەکـەی چـەند کەسـێکیان لەگەڵدا بوو و هەر یەکەشیان سەرسەخت ترین بێباوەڕ و بەدکارترین کەس بوون لەسەر زەوی و پێکەوە لەنێوخۆیان دا کۆبوونەوەو پیلانێکیان دانابوو بۆ کوشتنی (صالح). سوێندیـشیان بـە خودا خواردبوو لەسەر ئەوەی، کە بەنهێنی خۆی و کەس و کارەکانیـشی بکـوژن، پاشـان گـەر لایەنگران و خزمانی بێن و بەدوای بکوژانیان دا بگەڕێن و داوای خوێنەکەی بکـەن، ئـەوانیش نکوڵی لە تاوانەکەیان بکەن و پێ دابگرن لەسەر ئەوەی گوایە ئـەوان نـە ئاگـاداری کوشـتنی بوون و نە بەشداریشیان تێدا کردووە.

ئەو نۆ پیاوە دەسەڵاتدارە کە سەرانی گەلی - ثەموود- بوون نەخشەکەیان وا داڕێژابوو تا بەشێوەیەکی کت و پڕی (صالح) و کەس و کارو خانەوادەکەی بکوژن، بەڵام خودا ئاگاداری ئەو

---

(١) خودا کاری سەربڕینەکە(عقر)ی خستۆتە پاڵ هەموو ئەو بێ باوەڕە خۆبەزل دانەرانە، خـۆ ئەگـەر هـەر تەنیا یەك کەسیشیان کارەکەی ئـەنجام دابێـت یەکێکـە لـەوان چـونکە خـودا لەجێگایـەکی تـری قورئـان دا فەرموویە: (فتنادوا صاحبهم فتعاطی فعقر) واتە:(ئەوان کەسێکی سەرشێت و بێبەروایان لەخۆیان بانگ کردو کارەکەیان پێسپاردو ئەویش حوشترەکەی خستە ژێر شمشێرەکەیەوەو بەجورئەتەوە سەری بڕی)، جـا ئـیتر ئـەو بێباوەڕانە بەپیلان دانان وقایل بوونیان بەڕاپەڕاندنی کارەکە بەشدارن لەجێبەجێکردنی تاوانەکەدا. لەمەش دا پەندێك وەردەگرین دەربارەی ئەوەی گەلێك هەموویان هاوکـارو پـشتیوانی یـەکترن لەچـاکەو خراپـەدا و هـەر کاتێکیش لەخراپەیەك بێدەنگ بوون و لەتواناشیان دا هەبوو ڕووبەڕووی بنەوە ئەوا خودا بەسـزای تێکرایـی و گشتگیر سزای هەموویان دەدات لەسەر ئەو بێدەنگی یە... لەو بارەیەشەوە خودا لەقورئاندا فەرموویە:(واتقوا فتنة لاتصيبن الذين ظلموا منكم خاصة)-الأنفال/٢٥..

نیازەچەپەڵیان بوو و ئیرادەی وا بوو ئەو پێغەمبەرەی خۆی و خانەوادەکەشی ڕزگارکات لەو پیلانە، تیاچوونیش هەر بۆ ئەو پیلانگێڕانەبوو کە نەیانزانیبوو لە کوێوەو چۆن لەناو دەبرێن: ﴿ وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ[1] لَنُبَيِّتَنَّهُۥ[2] وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَـٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ النمل/٤٨-٥٢.

## لەناوچوونی گەلی "ثەمود"

لەناو بردنی -ثەموود ـ بەچەخماخە (صاعقة)بووە، هەروەك خودا لەو بارەیەوە فەرموویە: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴾ الذاريات/٤٤. وشەی (صاعقة) بەو دەنگە گەورەیەی ئاگرێکی ئاسمان دەگوترێت کە پێك دێت لە شورشێکی کارەبایی ی نێوان دوو بارگەی جیاوازی کارەبایی ساردو گەرم یان پۆزەتیف و نێگەتیف (موجب وسالیب)، جا ئەگەر هەورێکی بارگەی (موجەب)ی کارەبایی ی لەزەوی نزیك ببێتەوە، ئەوا تەزوویەکی کارەبایی ی بەو کارتێکردنە دروست دەبێت و بەر بارگەی (سالیب)ی کارەبایی ی دەکەوێت و بەتاڵ بوونەوە (استفراغ)، یان یەکگرتن (اتحاد) لەتەنێکی سەر زەوی دروست دەبێت و یەکسەر هەر شتێکی سەر ئەو شوێنە دەسووتێنێت، درەخت بێت یان مرۆڤ، هەروەها گەر بەردی گەورەشی لێ بێت وردی دەکات و گەر بیناو ساختمانیشی لێ بێت دەیڕووخێت.

ڕادەی ئەوەی کە چەخماخە(صاعقة) وێرانی دەکات پەیوەستە بەڕێژەی بڕی بەتاڵ کردنەوەکەو ڕادەی هێزی هەردوو بارگە کارەبایی یەکەشەوە. قورئان لەهەندێك شوێن دا لەبریتی وشەی (رجفة/ واتە: زەمین لەرزەی توند) و وشەی (طاغية/ واتە: دەنگی بەرزی بەهێز) ووشەی (صيحة/ واتە: دەنگ و هاواری زۆر گەورە)ی بەکار هێناوە ﴿ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ ﴾هود/٦٧. ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴾الحاقة/٥.. ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِي دَارِهِمْ جَـٰثِمِينَ ﴾ الأعراف/٧٨..

---

(١) (تقاسموا بالله): (حلفوا اليمين) ـ سوێندیان خوارد.

(٢) (لنبيتنه): بەشەو هەڵدەکوتینە سەری.

جا لەبەر ئەوەی چەخماخە(صاعقة) دەنگێکی گەورە دروست دەکات بەوشـەی (صـیحة)ش ناوبراوە، لەوانەشە لەرزەیەکی وای لەگەڵدا بێت کە لـە بوومەلـەرزە بـچێت و هـەموو دڵێـك بەڕوودانی لەرزینەکەی بلەرزێنێت و ڕاچڵەکێنێت. لەوانەشە لـەجێی خۆیـەوە پـەل بهاوێـت و زیادەڕۆیی بکات (یطغی) تاکو جێیەکی دیکەش بگرێتەوە، بەمەش ناوبرێت بە (طاغیة). جا ئەو وەسفانەی تر/ کە قورئان بەچـەند گوزراشـتێکی دی بـۆ (صـاعقة)ی دانـاوە دەربڕینێکـی دروست و تەواوە کە وەسفی شوێنەوار و هۆکارو دیاردەکانی دەکات.

# بەندی سێ یەم

## (( چەند پەند و وانەیەك ))

( میانڕەوی لەبژێویدا ـ بانگەواز بۆ شۆڕش لەدژی زۆردارانی ملهوڕ ـ وانەیەك لەبوێری‌دا ـ ئاکامی خۆبەزل دانان تیاچوونە ـ داوای لێخوشبوون و تۆبەکردن و شوێنەوارەکانیان )

### میانڕەوی لەبژێویدا

لەڕێنمایی یە جوان و بەهادارەکانی قورئان بۆ بنیادنانی نەتەوەیەکی ساغ و یەکگرتوو ئەوەیە داوای ڕێکی و میانەڕەویی لەبژێوی دا لێ کردوون و ڕێگەی دەست بڵاوی و پەرش و بڵاوکردنی نیعمەتی لێ گرتوون، هەروەك لە ئایەتەکەدا لەسەر زاری (هود) هاتبوو:﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴾الشعراء/١٢٨-١٢٩.. پێغەمبەری خودا (هود)-سلاوی خودای لەسەر بێت ـ لەو وتەیەی دا پرسیاریان لێ دەکات و دەڵێت: (بۆچی ئەو هەموو کۆشك و تەلارە گەورانە لەشوێنەبەرزەکان دا دروست دەکەن؟ ئایا بۆ ئەوەیە تاکو ڕادەی دەوڵەمەندی و دەست ڕۆیشتوویيتان بزانرێت وەك ئەوەی بەتەمای مانەوەو نەمری بن لەسەر زەوی؟).. (هود)ی پێغەمبەر لەکاری بیناوساختمانی گەورەدا سەرزەنشتی گەلەکەی دەکات، چونکە ئەوان ئەو جۆرە خانووبەرەیەیان بەمەبەستی نیشتەجێ بوون و حەوانەوە بنیاد نەنابوو، دەنا سەرزەنشتی نەدەکردن لەسەر ئەو کارە، بەڵکو بەحەزو ئارەزوویان لەشانازی بەخۆوەکردن و لوتبەرزی و خۆبەگەورەزانینەوە ئەو کۆشك و باڵەخانە بەرزانەیان بنیات نابوو، ئەوەش نەریتێکی عەبەسی و دەست بڵاویی یەکی بێزراوە چونکە لەپشت ئەو کارانەوە بەتەمای نەمریی بوون لەزەوی دا ویڕای ئەوەش کە نەمری (خلود) مەحاڵە و خۆشی ی دنیاش کەمە.

(صالح)ی پێغەمبەری خوداش ـ گەلەکەی وریا دەکاتەوەو نیعمەتەکانی خودایان بیردەخاتەوەو بەتایبەتیش نیعمەتی شارەزایی لەسەر دروست کردنی خانوو لە چیاکان داو لە داتاشینی بەردی ئەو چیایانەدا، هەروەها سەرزەنشتیان دەکات لەسەر پێ نەزانینیان نکوڵی

کردن لەو نیعمەتە، چونکە بەو ڕەفتارەیان خۆیان بەزل وگەورە دەبینی، خودای زاناو کاربەجێ هەموو ئەو مانایانەی لەیەك وشەی وەك(فارهین)دا کۆکردووەتەوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ [1] ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾الشعراء/١٤٦-١٥٠.

ئەمڕۆش لەم سەردەمەمان دا چەند زۆرن ئەوانەی بۆ فەخروشانازی و ڕووپامایی کۆشك و تەلاری بەرز و گەورە بنیاد دەنێن و بەبێ باکی و بێ هودەیی دەجووڵێنەوە. چەند زۆریشە ئەو پارەو ماڵەی کە لەبەردەستی ئەو دەست بڵاوانەدایە. چەندەش ئاتاجیان بە ڕاوێژکار و تێگەیەنەرە تاکو ڕێ بەهەدەردانی ئەو پارەو سامانەیان لێ بگرن و نەهێڵن ئەو هەموو عەبەسیەت و زیادەڕۆیی یەیان لێ بووەشێتەوە. ئاخر میللەت چ سوودێکی پی دەگات بەو کۆشکە گەورە و ڕازێنراوەی کە ملیۆنەها دینار و دۆلاری تێ دەچێت و تەنها پیاوێکی دەوڵەمەندیش خۆشی و حەوانەوەی لێ دەبینێت و بەهەزاران خەڵکی دیکەش لەکرێکاران و پیشەگەران لە چواردەوری دا خزمەت بکەن و خۆیان بڕەتێنن. بەڵام هیچیان خۆراکی تەواو و خانوویەکی باش و بەرگی ڕێك وپێکیان نەبێت، ئەی وا باشتر نەدەبوو گەر ئەو پیاوە دەوڵەمەندە خاوەن کۆشکە لەخانوویەکی مام ناوەندی دا بژیایەو هەموو ئەو پارەو سامانە زۆرەی لەکاروباری ژیانی میللەت دا بەکاربێنایە بۆ بەگەڕخستنەوەی کشتوکاڵ و پیشەسەزی و پێویستی یە گرنگەکانی تری خەڵکی. ئایینی ئیسلام ئەم چەمکە دادگەرێتیە کۆمەڵایەتیەی لەدڵ و دەروونی شوێنکەوتوانی و پەیڕەوکارانی دا جێگیرکردووە تاکو کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر کۆڵەکە ڕاست و دروستەکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بنیات بنرێت و پاشان تاکو دەسەڵاتداران و حاکمانی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەوپەڕی شەونخوونی و بێداری دا بن بۆ ئاگاداربوون لە هەر فەرد و دەستە و تاقمێك کە پارە و ماڵی میللەت بۆ هەواو هەوەس و ئارەزووە گەندەڵەکانیان بەکاربێنن، چونکە ماڵ و سامانی دەوڵەمەندان (بە تێڕوانین و یاسای قورئان)، ئەگەرچی لە مولکدارێتی ی تایبەتی دا بێت، بەڵام سوودەکەی سوودێکی گشتی یە

---

(١) (فارهین): لەدەربرین (تعبیر )دا بە (اسمی ـ فاعل ـ ی فارهین)ـەوە ئیعجازێکی مەعنەویی تێدایە، چونکە فەرمان (فعل)ـەکە بەپێی گۆڕانی دەروازە (باب)ـەکەی دەگوترێت، بۆ نموونە فیعلی (فَرِهَ) لەدەروازە (باب)ی (کَرُمَ)ـەوە مانای زانایی‌و شارەزایی (حذق) دەگەیەنێت، لە دەروازەی (فَرَحَ)یشەوە مانای (أَشِرو بَطَرَ) واتە (لوتبەرزی وخۆبەزل زانین) دەگەیەنێت. ئەمەش هەروەك لە قاموس دایە، ناوی بکەر (اسم الفاعل)ـەکەش دەلالەت لەسەر هەردوو ماناکە دەکات.

بۆ میللەت، چونکە خودا لەڕاسپاردەی دا بۆ باوەڕداران دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ[١] أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمًا[٢]﴾النساء/٥. واتە (پارەو سامانی گەمژەو نەفامەکان ـ کەپارەی گشتی ی هەموانە ـ مەدەنە دەست خۆیان کە بە ئارەزووی خۆیان هەڵس و کەوتی پێوە بکەن، چونکە خودا ئەو پارەو سامانەی کردۆتە هۆی بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانتان).

## بانگەواز بۆ شۆڕش لەدژی زۆردارانی ملهوڕدا

خودا لەسەر ئەوە سەرزەنشتی گەلی (هود) دەکات کە پەیڕەویی ی فەرمانی زۆردارە ملهوڕەکانی خۆیان کردووەو بەو کردارەشیان شایستەی تەفروتووناوبوون و بێبەشی لەڕەحمەتی خودا بوون: ﴿وَتِلۡكَ عَادٞۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ[٣] عَنِيدٖ[٤] ﴿٥٩﴾ وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ﴾هود/٥٩-٦٠. ئەم ئایەتە بانگەوازێکە بۆ ڕزگاربوون لەژێر ڕکێفی زۆردارە ملهوڕەکان کە قورئان لەبەر گوێی پەیڕەوکارانی دا سەدای بەهێزی پێدەزرنگێنێتەوە تاکو خۆیان لەژێر دەسەڵاتی هەر خۆسەپێنێکی بێ ڕەحم و بەزەبروزەنگ و هەر زۆردارێکی بەرهەڵستکاری هەق ڕزگارکەن کە دان بەمافێك دانانێن. فەرمایشتەکەی قورئانی پیرۆزیش (کل جبار عنید) تەعبیرێکی وردو گرنگە، چونکە خودا دوو سیفەتی بۆ زۆرداری خۆسەپێن تیایدا کۆکردووەتەوە، سیفەتی (جبار) و سیفەتی (عنید).. (جبار)یش بەو کەسە زۆردارە خۆبەزل زان و دڵڕەقە دەگوترێت کە (دیارترین نەریتی) نکوولی کردن (عناد)ـە لەپێناوی بەرگریکردن لەناهەق (باطل) و ڕۆچوون وسەرنگووم بوون تیای دا.

ئیسلام قایل نابێت کە شوێنکەوتوانی خۆی جڵەوی ژیانیان بدەنە دەست چەند ستەمکارێکی لووتبەرزو ئەوانیش بیانکەن بەکۆیلەی خۆیان و هەموو جۆرە

---

(١) (السفهاء): (گەمژەو نادان و نەفامەکان) ن بەو دەست بڵاوە پارەدارانەش دەگوترێت کە پارەومالی خۆیان لەرێگای نادروستەوە خەرج و پەرش وبڵاو دەکەن، ئەویش، یان بەهۆی تێکچوونی خووڕەوشتیان و لاوازی ی عەقڵیانەوە یان بەهۆی خراپی و ناڕاستی ی شێوازەکانی بەکارهێنانەوە.

(٢) (قیاما): واتە خودا ئەو ماڵ وپارەیەی کردووە بەهۆی ڕاگرتنی لەنگەرو هاوسەنگیی بژێوی‌و گوزەرانتان وبنیات نانی بەرژەوەندییەکانتان.

(٣) (جبار): مرۆڤی دەسەڵاتداری لوتبەرزو ڕەتکەرەوەی هەق و پەسند نەکەری. گوتراویشە ئەو کەسەیە کەلەکاتی هەڵچوون و تووڕەیی دا لەخەڵك دەدات یان دەیکوژێت.

(٤) (عنید): نکوولی کار لەهەق و خۆبادان بەو هێزو دەسەڵاتەوەی کە هەیەتی.

سزاوئەشکەنجەیەکیشیان پێبچێژن و بەپێ ی هەواو ئارەزووەکانیان بەکاریان بێنن، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئیسلام شوێنکەوتوانی خۆی هان دەدات لەسەر ئەوەی کە بەڕووی ئەو ستەمکارانەدا ڕاپەڕن و گوێ بەهێزو دەسەڵاتیان نەدەن، چونکە بەجێهێنانی ئارەزووی زۆرداران پێچەوانەی باوەڕی ڕاستەقینەیە، باوەڕیش ڕێزوکەرامەت بەدەروون دەبەخشێت و مرۆڤ لەهەر دەسەڵاتێکی ملهوڕ(غشیم) ڕزگار دەکات، باوەڕدارانیش هیچ پاساوێکیان بۆ ژێردەستی و لاوازی نی یە، چونکە زۆرن، بەڵام دەسەڵاتدارانی ستەمکار و بێباوەڕ کەمن، خۆ ئەگەر بەڕاستی باوەڕداران خوازیاری ڕزگاری بن ئەوا لەپێناوی دا قوربانی دەدەن و دەستیشیان دەکەوێت، بێگومان خودای مەزن و باڵادەستیش لەقورئان دا مژدەی ئەوەی بەباوەڕداران داوە، کە چارەنووسی ستەمکاران هەر زەرەرمەندی و لەنێوچوونە: ﴿وَخَابَ[1] كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾ابراهيم/١٥.

بێگومان گەلی (عاد)یش بۆیە فەوتان، چونکە گوێ لەمست و پەیڕەوکاری فەرمانی هەر (جبار) و (عنید)ێك بوون، بەنەفرەت لێکراویی ی دنیاو ڕۆژی دواییشیانەوە لەناوچوون و هەموو کەسێکیش ئەو چارەنووسەی تووش دەبێت گەر ملکەچی هەواوئارەزووکانی هەر ستەمکارێکی لووتبەرزو دوژمنێکی هەق بێت.

## وانەیەك لەبوێریدا

هەر لەداستانەکەی (هود)دا وانەیەك لەسەر بوێری و جورئەت و خۆبەخت کردن لەپێناوی بیروباوەڕدا بەدی دەکرێت، ئەم وانەیە چرایەکە بۆ هەر چاکەخوازو چاکسازێك کە نەفسی خۆی تەرخان (نذر) کردبێت، بۆ بیرو باوەڕەکەی ئەوەتا (هود) پڕ بەگەرووی هاوار لەگەلەکەی دەکات و پێیان دەڵێت: ﴿..إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ﴾هود/٥٤-٥٥. واتە: (من خودا دەکەم بەشایەت لەسەر بەرائەت و بێتاوانیم لەو شیرك و هاوەڵ بۆ خوادانانەی ئێوە، ئێوەش دەکەم بەئاگادارو شایەت لەسەر ئەو بێ بەریتی و بەرائەتەم لەڕەفتارەکەتان، دە ئێوەش خۆتان و خواوەندەکانتان بەهەموو هێزو تواناتانەوە چیتان پێ دەکرێت بەرامبەر بە من، بیکەن و تەنانەت بۆ تاکە ساتێکیش لێم ڕامەوەستن). بەچاکی سەرنج بدە لەو فەرمایشتەی خودا لەسەر زاری (هود) (فكيدوني جميعاً)، کە (هود) دەیەوێت ئەو ڕاستی یە بخاتە گوێ یانەوە کەوا ئەو بەهیچ

(١) (خاب): زەرەرمەندو فەوتاوە.

شێوەیەك لێ، یان ناترسێت و باكی نی یە لەو هەموو فڕوفێڵەیان گەر هەموویشیان پێكەوە كۆببنەوەو پیلان وفڕفێڵ ڕێك خەن، هەورەها لەسزاو ئازاردانیان ناترسێت سەرەڕای ئەوەی كە ئەوان بەهێزترو زۆرتریش بن، ئەم بوێری و چاونەترسی یەش نیشانەیەكی جوانە لە نیشانەكانی ئەو باوەڕدارانەی دڵییان پڕە لە ئیمان و هەموو هەست و ئەندێشەیەكیشیان بۆ خۆشویستنی چاكسازی یە.. ئیدی هیچ ترس و بیمێكیان لەشاگردانی ناهەق نی یە، چونكە باوەڕداران عەقیدەیەكی وەهایان هەیە كە دەتوانن هەر مەترسیو زوڵم و زۆرداری یەكی پێ لابدەن. ڕازی ئەم بوێری یەی (هود)یش ئەوەیە كە ئەو پشتی بەخودای خۆی بەستووەو بە گەلەكەیشی دەڵێت: (إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمْ).. دیارە هەر كەسێكیش پشت بەخودای پەروەردگاری ببەستێت و پەنا بۆ خالقی خۆی بەرێت كەسەرچاوەی گشت هێزێكە لەوجوددا ئەوە شایستەی ئەوەیە خودا ترسەكەی بەئارامی بۆ بگۆڕێت و لاوازییەكەیشی بە (هێز) بۆ بگۆڕێت. مرۆڤی خاوەن باوەڕی چاكسازو بانگەوازكار ئاتاجێكی هێگجار فرەی بەخوداو بەو پشت بەخوا بەستنە هەیە چونكە دڵنیایی و خۆ ڕاگری و ڕازی بوونی بەهەر جۆرە قوربانی یەكی لەپێناوی ڕەزامەندی خوادا پێ دەبەخشێت.

## ئاكامی خۆبەزل دانان تیاچونە

هەروەها لەچیرۆكی (هود )دا بەڕوونی سەرەنجامی دژواری ئەو گەل و نەتەوانە دیاری كراوە كە بێباوەڕو لوتبەرزو لەستەم دا ڕۆچوو بوون.. یەكێك لەو گەلانە (عاد) بووە كە قورئان سەرەنجامە ناخۆشەكەیان بۆ وەسف دەكات: ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَحِسَاتٍ لِنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لَا يُنْصَرُونَ ﴾ فصلت/١٥-١٦. واتە: (گەلی عاد بەناهەق لەسەر زەوی خۆیان بەزل داناو گوتیان (داخۆ كێ لەئێمە بەهێزترە؟ بەڵام نكوڵی یان لە بەڵگەو نیشانە ڕۆشنەكانی ئێمە دەكرد. لەسەر ئەوە ئێمەش ڕەشەبایەكی توندی ساردو وەڕسكەرمان بۆ ناردن لەچەند ڕۆژێكی شووم و زۆر ساردو پڕ تەپ و تۆزدا تاكو سزای سەرشۆری و بێدەسەلاتیان لەژیانی دنیادا پێبچێژین، بێگومان سزای ڕۆژی دوایشیان توندتر و سەرشۆڕكارترە و هیچ سەرخەرو یارمەتی دەرێكیشیان نابێت).

گەلی (عاد)یش لە زەوی دا لوتبەرزو خۆ بەزل زان دەرچوون و بەهێزی خۆیان فریویان خواردبوو، بەم پێیەش ڕوویان لە ڕێنمایی ی خوداو ڕێ ی ڕاست وەرگێڕاو خوداش

سەرشۆڕوریسواو سەرگەردانی کردن. لەناوی بردن و تەفروتونای کردن. ئەمەش بێگومان پەندێکی کاریگەرەو قورئان دەیخاتە بەر چاوانمان تاکو بەتینترین وانەی لێ وەربگرین.

ئەو ئیدیعاو خۆهەڵکێشانەی ئەو سەردەمەی گەلی (عاد)یش هەمان ئیدیعاو خۆهەڵکێشانی دەوڵەتە گەورەو زلهێزەکانی ئەمڕۆشە کە بەپڕوپاگەندەی زانست و مەدەنیەتەوە لەخۆیان بایی بوون، ئەو دەوڵەتانەی کە بەهۆی دەست ڕۆیشتوویی‌و هێزی ماددییانەوە فریویان خواردووەو بەهۆیەوە لەڕێی هەق لایان داوەو گەلە کەمدەست و بچووکەکانیان کردووە بەکۆیلەی خۆیان و سەروەت و سامانیان زەوت کردوون و تەنانەت لەپێناوی دەست بەسەرداگرتنی ئەو سامانەدا هەموو شێوازێکی نابەجێ و ناڕەوایان گرتۆتەبەر چ لەشێوازەکانی فیتنەگێڕی‌و ئاژاوەنانەوەوە، چ لە شێوازەکانی کڕینی ویژدانی چەند کەسێکی نەفس نزم، یاخود پەرتەوازەکردن و لێك دابڕینی دەستەو کۆمەڵە تێکۆشەرەکان تەنها لەپێناوی دەسکەوتەکانیان و بەرژەوەندی یە ئیمپریالیستەکانیان دا، زمانی حاڵیشیان دەڵێت: (مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً) هەروەك کە لەئایەتی ژمارە (١٥)ی سوورەتی (فصلت)یش دا هاتووە.

بەڵام دەبا نەختێك چاولێك نێن و بیربکەنەوەو ئاورێك لەمێژووی نزیك بدەنەوە کە کاریگەرترین پەندی لەخۆگرتووە.. ئایا دەرسێکیان لەو سەرەنجامە تاڵەی ئەڵمانیای ـ هیتلەر ـ ەوە وەرنەگرتووە کە سەرەڕای دروشمەکانی خۆیادان بە هێزو قووەتەوەو خۆبەزل دانان لە زەوی دا دەشیان گوت: (ئەڵمانیا لەسەروو هەموانەوەیە) کەچی ئاکامیان دوای ئەو هەموو دروشمانە هەر ماڵوێرانی و لەناوچوونی زۆربەی لاوانیان بوو جگە لەو بەزین و سەرشۆڕییەش کە لەلایەن سەرکەوتوانی جەنگی جیهانیەوە تووشیان بوو.

## داوای لێخۆشبوون و تۆبەکردن و... شوێنەوارەکانیان

خودای پەروەردگار چەند یاسایەکی بۆ جیهانی ماددە داناوە تا بەگوێرەی ئەو یاسایانە کاروباریان بەڕێوە بچێت، هەروەها چەند یاساوڕێسایەکیشی بۆ جیهانی کۆمەڵگەی بەشەری داناوە تاکو بەپێی سیستمێکی تۆکمەو مەحکەم ژیانی کۆمەڵایەتی بەڕێوە ببرێت... لەو ڕێسایانەش ئەوانەن کە قورئانی پیرۆز جەختی لەسەرکردوون و کەوا: (ئەگەر گوناهان و کەمتەرخەمی‌یەکان و سەرپێچی کردن لەنێو هەر نەتەوەیەك دا تەشەنە بسێنن دەبنە هۆیەك بۆ بەدبەختی و لەنێوچوونی ئەو نەتەوەیە هەروەك چۆن بەسەر گەلی (هود) و (صالح) داهات. خوداش لەڕێی نێرراوان وپێغەمبەرانی یەوە هەمیشەو چاخ لەدوای چاخ و نەوە لەدوای نەوە فەرمانی بەگرۆی ئادەمی کردووە، کە دەست لەتاوان هەڵگرن و داوای لێخۆشبوون بکەن لەسەر

ئەو خەتاو گوناهانەی پێشوویان و تۆبەی لەلا بکەن تاکو بەخشش و نیعمەتەکانی خودایان دەستکەوێت و بەرەحمەت و بەزەیی بەهرەمەند بن و خۆیان لەرق و تووڕەیی ی بپارێزن. ئەوەش (هود)ی پێغەمبەری خودایە ئامۆژگاری گەلەکەی دەکات بەو شێوەیەی، کە قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە و دەیکاتە ڕێ نموونی یەك بۆ ئێمەش: ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ﴾هود/٥٢.. واتە: (ئەی گەلی خۆم داوا لەخودای پەروەردگارتان بکەن کە لەگوناهانی پێشووتان خۆش بێت وپاشان بگەڕێنەوە بۆ لای و تۆبەی لەلا بکەن، ئێوە گەر وابکەن ئەوا خوداش بارانێکی زۆرتان بۆ دەبارێنێت و لە مەترسی یەکانی وشکانی و بێبارانی دەرباز دەبن وخێرو بێری کشت و کاڵ وبژێوییتان زۆر دەبێت وهێزێکی زیاتریشتان بۆ دەخاتە سەر ئەم هێزەی ئێستاتان).

هەروەها قورئان چۆنیەتی ئامۆژگاری کردنی (صالح پێغەمبەر) بۆ گەلەکەی دیاری دەکات: ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِۖ لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ النمل/٤٦. واتە: (بۆچی داوای لێخۆشبوون لەسەر گوناهەکانتان لە پەروەردگارتان ناکەن هەتاکو بەر ڕەحمەت و بەزەیی ی خودا بکەون)؟! هەروەها (صالح) پێیان دەڵێت:﴿فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ[1]﴾هود/٦١. واتە: (داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن و، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای خودا چونکە گەڕانەوەو داوای لێخۆشبوون ئامرازێکن بۆ گیرابوون وپەسندکردنی نزا وپاڕانەوەتان). گوناهیش نەك هەر ناڕەوان، بەڵکو زیان بەجەستەو عەقڵ و سیستمی کۆمەڵایەتیش دەگەیەنێت. کاتێك زیانیشی زۆرە کە گوناهکارەکە سووربێت لەسەری، جائەگەر گوناهبار خێرا هوشیاربێتەوەو داوای لێخۆشبوون لەخودا بکات لەسەر ئەو گوناهانەی پێشووی و ئەو خراپەو بەدکاری یانەی ئەنجامی داون ولێشیان پەشیمان بێتەوە ئەوا ئەو فەسادو ناهەمواریەش بنبڕ دەبن و شوێنەواریان دەسڕێتەوە، لەسەر بناغەی ئەوەش چاك بوونی تاك و کۆمەڵ مەیسەر دەبێت.

(١) دانەری ئەم کتێبە ئەم ئایەتەی وەك خۆی نەهێناوە، بەڵکو لەنێوان دوو کەوانەی گەورەدا ڕستەیەکی وەك (واستغفروا ربکم انه قريب مجيب) هێناوەو لەدوای کەوانەکەشەوە ماناشی بۆ لێك داوەتەوەو نازانم هەڵەی چاپ بێت یان بەئایەتی دانابێت بەو جۆرە صیاغەیە، بەڵام دوای پشکنینی تەواو لە (مفردات القرآن)ی (سیوطي) بۆم دەرکەوت کە صیاغەی ئایەتەکە وەك ئەو بەشەی ئایەتی (٦١)ی سوورەتی هوودە. (وەرگێڕ)

ئەمەش ڕێساو سوننەتی خودایە دەربارەی خەڵکی خۆی وبەڕۆشنی بۆ هەر لێکۆڵیارێکی مێژووی دەوڵەتان دەردەکەوێت گەر بیەوێت لەهۆیەکانی ڕووخان و بەزینی دەوڵەتان بکۆڵێتەوە. ئەو دەوڵەتانەش، کە رژدن لەسەر ستەم و خراپەکاری، ئەوا خوداش هەر لەدنیادا بەلاوازیو پەرتەوازەیی و وێران بوونی خانووبەرەو نیشتگایان سزایان دەدات، ئیدی دەسەلآت و سەرەوریش لەدەست دەدەن و کۆمەڵیشیان لێك هەڵدەوەشێت و تەماعکاران و چاوچنۆکە داگیرکەرەکانیش دەستیان بەسەردا دەگرن و لاوازی و سەرشۆڕی و ژێردەستەییان پێدەچێژن.

# بەشی پێنجەم

## ئیبراهیم سڵاوی خوای لێبێ

## ئیسماعیل سڵاوی خوای لێبێ

## لوط سڵاوی خوای لێبێ

**بەرایی: -**

## " ئیبراهیم ... باوکی پێغەمبەران "

ئیبراهیم(سڵاوی خودای لێ بێت) لەلای شوێنکەوتوانی هەر سێ ئایینی (یەهوودی- و- مەسیحی- و-ئیسلام) پلەو پایەیەکی گەورەی هەیە و ناوەکەشی هەمیشە بە ڕێزلێنان و نزاو شکۆداری یەوە بەستراوەتەوە.. چونکە یەکێکە لە پێغەمبەرانی خاوەن -عەزم- ولە پێناوی بانگەواز بۆ پەرستنی خوداو بەیەك دانانی دا جیهادی کردووەوخۆی خستووەتە بەر مردنیش لە پێناوی ئەو بیروباوەڕەی کە ئیمانی پێ هێنابوو. ژیانیشی زنجیرەیەك قوربانی دان بووە بۆ خودای پەروەردگاری ولەم ڕووەشەوە نموونەیەکی زیندووی بۆ هەموو گەلانی دوای خۆی لەسەر دڵسۆزیو فەنابوون بۆ خۆشەویستی خودا خستۆتەڕوو.

هەروەها پلەو پایەی "ئیبراهیم" وبەرزیی شان وشکۆی لەوەش دا دەدرەوشێتەوە کە (باوکی پێغەمبەرانە)و هەر کتێبێك لە ئاسمانەوە بۆ سەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی دوای خۆی نێررابێتە خوارەوە لە وەچەو پەیڕەوکاران و ڕەچەڵەکی خۆی بوون[1]. ئەمەش جێو مەقامێکی وەهایە بۆ -ئیبراهیم- کە هیچ جێ و مەقامێکی دیکەی پێناگات، چونکە ئەو (واتە ئیبراهیم) دوو کوڕی هەبووە وخودا کردوونی بە پێغەمبەرو ناویان (اسماعیل) و (اسحاق) بووە. (ئیسماعیل) باپیرەگەورەی پێغەمبەری ئیسلام (محمد) ﷺ[2] و باپیرەی عەرەبی "حیجاز"ە و عەرەبی -حیجاز-یش بنەچەو (نەسەبیان)بۆ هەردوو کوڕەکەی -ئیسماعیل- (واتە بۆ -نابت- و-قیذار-)[3] دەگەڕێتەوە.

قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بۆ باوکایەتی (ابوة)ی -ئیبراهیم- لە عەرەب دا کردووە، هەروەك خودا تیای دا ڕووی گفتاری کردووەتە ئیماندارانی عەرەب و فەرموویەتی:﴿..وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ ..﴾ الحج/٧٨..

واتە: (خودا لە بەرنامەی ئەم دینەدا هیچ کارێکی قورس و زیاد لە توانای خۆتانی پێ نەسپاردوون، بەڵکو هەروەك شەریعەتەکەی (ئیبراهیم)ی بابە گەورەتانەو لەمەوبەر هەر خۆی ناوی (موسڵمان)ی لێ ناون). (ئیسحاق)یش خودا کوڕێکی پێ داوە ناوی (یەعقوب) بووە کە

(١) بڕوانە کتێبی " البداية والنهاية "ی -ابن کثیر- بەرگی یەکەم. لاپەڕە (١٦٧).

(٢) شارەزایانی ڕەچەڵەك (نەسەب ناسان) ڕەچەڵەکی پێغەمبەرﷺ بەڕای تێکرایی و یەك دەنگی ی خۆیان- دەبەنەوە بۆ(عدنان-ی کوڕی- أدد)و-عدنان-یش ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر (ئیسماعیل-ی کوڕی -ئیبراهیم).

(٣) بڕوانە: (تأریخ الطبری) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٢١).

به نازناو (لقب)ی -ئیسرائیل- ناودەبرێت و هەموو ڕۆڵەو نەوە خواپەرستەکانی (بنی اسرائیل)یش بە نەوەو وەچەی ئەو دادەنرێت، لەو نەوە خواپەرستانەش دا چەندین پێغەمبەر هەبوون و(عیسا-ی کوڕی -مریەم) دواییینیانە و هەروەك (ئینجیل) دەیگێڕێتەوە کە بە شوێنکەوتوانی خۆی گوتووە: (ئیبراهیم باوکتانەو دڵخۆش بووە بەوەی کەئەم ڕۆژگارەی من ببینێت جا بینیویەتی و خۆشحاڵ بووە پێی).[1]

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە، کە - ئیبراهیم- باوکی پێغەمبەرانی دوای خۆیەتی، هەروەك خودای مەزن لەم ڕووەوە فەرموویە:﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا[2] ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾الانعام/ ٨٤-٨٦...

واتە: (کوڕانی صالح و بەڕێزی وەك - ئیسحاق- و-یەعقوب- مان بە ئیبراهیم بەخشیوەو ڕێنماییشمان بۆ خوا پەرستی کردوون، وەك چۆن ڕێنمایی ی -نوح-مان لەوەوبەر (بۆ هەمان مەبەستی خواپەرستی و بانگەواز بۆ کاری چاك) کردبوو، لە نەوەکانی (نوح)یش -داودو سولەیمان-ی کوڕی و-ئەییوب- و -یوسف-ی کوڕی -یەعقوب- و موساو -هارون-ی براگەورەی و، ڕێنمایی کراوانی چاکە خوازو چاکەکاریش پاداشتیان هەر لای ئێمەیە، هەروەها لە نەوەکانی دیکەی -نوح- پێغەمبەرانی وەك-زەکەریا-و-یەحیای کوڕی زەکەریا-و(عیسا- ی کوڕی-مەریەم)و-ئیلیاس- هەبوون، کە هەموویان بە چاکەخوازی و زوهدو خواپەرستی ناسراوبوون،ئینجا دوای ئەوان-ئیسماعیل-ی کوڕی ئیبراهیم و-ئەلیەسەع-و-یونس-و-لوط-ی برازای-ئیبراهیم- هاتوون. خوداش هەموویانی بەمەقامی (پێغەمبەرێتی) لە خەڵکی تر جیاکردوونەوەو فەزڵی ئەوانی بەسەر خەڵکی تردا بەوە داوە).

لەم دەقە قورئانی یەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە "ئیبراهیم" باپیرەی هەموانە، باپیرەی جوولەکەو گاورو، موسڵمانیشە... پێغەمبەرانی ئەم سێ ئاینەش لەبنەچەدا پێك دەگەنەوە، چونکە لەبنچینە وئەسڵێکی جێگیرن و بۆ یەك نیازیش هەوڵ و تەقەللایان داوە، ئەویش کارکردن بووە بەو فەرمان و ڕاسپاردانەی، کەخودا بۆیانی ناردووەتە خوارەوەو کەپێش هەر شتێکی دیکەش دەربارەی پەرستنی خودا بووە بەتەنها.

---

(١) (یوحەننا / ٨: ٥٦).

(٢) (لوط) برازای ئیبراهیم بووە. هەر بۆیەش بە دەلالەتی ئەو تێکەڵاوی یە لەنێو ئەو نەوەو وەچانەدایە.

# بەندی یەکەم

## ((ئیبراهیم ودیاردەی بتپەرستی))

(پێگەیشتنی "ئیبراهیم" لە خاکی"بابل" دا -"ئیبراهیم"و خواوەندەکانی "بابل"- ئیبراهیم دا وا لە باوکی دەکات واز لە بتپەرستی بێنێت- ئیبراهیم بتەکان تێك دەشکێنێت- دادگایی کردنی"ئیبراهیم - فەتحێکی زانستیانەی قورئان )

## پێگەیشتنی ئیبراهیم لە خاکی – بابل – دا

بەبەراورد لەنێوان ئەوەی لە (سفر التکوین)[١]دا هاتووەو ئەو شوێنەوارانەش، کە زانایانی (شوێنەوارناسی) دۆزیانەتەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی، کە سەردەمی(ئیبراهیم) ناگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووەمی پێش زایین هەروەك چەندین ساڵ و عەوام واگومان دەبرا، بەڵکو بۆ سەدەی نۆزدە (یاخود باشتر بڵێین) بۆ سەدەی حەڤدە[٢]. شارۆچکەی (ئوور-ی کلدانی)یش لانکەی -ئیبراهیم- بووە کە ئەمڕۆ بە ناوی (مغیر) ناسراوەو دەکەوێتە دەشتی باشووری نێوان هەردوو ڕووباری (دیجلە)و (فورات)ـەوە. پاشان (سفر التکوین) ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کەوا ئیبراهیم لەگەڵ باوکی دا چوون بۆ نزیك شاری (حاران)، کە دەکەوێتە ئەوبەری خۆرئاوای نێوان هەردوو ڕووبار.

سەرچاوە عەرەبییەکانیش وای باس دەکەن کەشوێنی هاتنە دنیای (ئیبراهیم) لە (بابل)[٣] بووە. مێژوونووس (یاقووت)[٤]یش لە وەسف کردنی خاکی بابل دادەڵێت: (کەوتۆتە نێوان - دیجلە-و-فورات-ەوەو ئەو خاکەیە کە پێ ی دەگوترێت: سواد.[٥] لەدایك بوونی

---

(١) (سفر التکوین) یەکەم بەشە لەو پێنج بەشەی کتێبەکەی – موسا -. (وەرگێڕ).

(٢) (دائرة العارف) – للبستانی – مادە (ابراهیم).

(٣) تأریخ الطبری – (ج١ – ص ١٦٢).

(٤) معجم البلدان (بابل).

(٥) "سواد" بەو گوندو شارۆچکانە دەگوترێت کە لەچواردەوری شارێکی گەورە دایە. بۆ نموونە، کە گوتراوە (سواد العراق) واتە ئەو خاکەی نێوان (بصرة) و (کوفة) وگوندو کۆمەڵگەکانی چواردەوری. (وەرگێڕ)

(ئیبراهیم)یش له سەردەمی حوکمڕانی ی — نمرود-ی کوڕی —کنعان-ی کوڕی-کوش-دا بووە).
مێژووش سەلماندوویەتی که لەو زەمانەی —ئیبراهیم-ی تێدا ژیاوه لـەعێراق دا، شارسـتانیەتی
" بابل" له -عێراق-دا بالادەست بووه.

## ئیبراهیم و خواوەندەکانی بابل

بەڵام داخۆ بیروباوەڕی خەڵکی -بابل- چی بووبێت؟ زانینی ئەو بیروباوەڕەیـان یارمـەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لەو ئایەتە قورئانییانـەی کـە باسـی بیروبـاوەڕو عەقیـدەی گەلەکـەی -ئیبراهیم- دەکەن. له کتێبی "قصة الحضارة" داهاتووه که: (خەڵکی بابل چەندەها خواوەندیان هەبووە، چونکه -بەڕای خۆیان- لەهـەر شـارێکیان دا خواوەنـدێکیان بـۆ پاراسـتنی شـارەکه هەبووه. لەکـەرت و ناوچـەو دێهاتەکانیـشیان دا چـەند خواوەنـدێکی بـچووکیان هـەبووە بـۆ پەرستنیو دڵسۆزی بۆ نواندنیان سەرەڕای ئەوەش که بەشێوەیەکی ڕەسمی ملکەچـی خواوەنـدی گەورەترینیان بوون. پاشان وردە وردە ژمارەی خواوەندەکان کەم بوونەوە دوای ئەوەی خواوەنـدە بچکۆلەکان وا لێك دەدرانەوە کـە ئـەوان چـەند ڕوخـسارێکی خواوەندەگەورەکـەن یـان چـەند سیفەتێکیین. بەم ڕەنگەش خواوەند (مردك) بوو بە خواوەندی (بابل)و گەورەی خواوەندە بـابلی یەکانی تریش. پادشاکانیش هەستیان بـە ئاتـاجێکی هێجگـار فـرە دەکـرد بـۆ لێخۆشـبوونی خواوەند، هەربۆیەش چەندین پەیکەریان بۆ دەتاشیو تفاقی ناوماڵ و خواردەمەنی و شەربەتیان له دەوری دادەنا).[1]

جا لەو ژینگەیەدا که (فرە خواوەندی) باڵی بەسەر داکێـشابوو و چـەندەها پەیکـەریان بـۆ چەسـپاندبوون و دەیانپەرسـتن، خـودای پـەروەردگار هۆشـی سـاغ و ڕاسـتی ی تـەواوی بـە "ئیبراهیم" بەخشیی بوو، ئەویش بـە ڕای ڕاسـت و سرووشـی (وەحـی)ی پـەروەردگاری خـۆی زانیبووی که بێگومـان خـودا (الله) یەکـەو هـەرخۆی کاربەدەسـت و دەسـەڵاتداری سـەر ئـەم گەردوونەیە. لەبەرئەمە دەیەوێت ڕێنمایی گەلەکەی بکات و ڕزگاریان بکات لەوشتە پوچـەڵ و بەتاڵانەو بە ئامۆژگاری و پەندو وتەی جوان ڕووی ئاخاوتنی تێ دەکردن و داوای واز هێنان لەو حاڵەتە نابەجێ یەی لێ دەکردن.

خوداش ئەم بەسەرهاتەی له قورئان دا باس کردووەو فەرمووبە: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا

---

(١) قصة الحضارة — ول ديورانت — ج٢ — ص (٢١١) وما بعدها.

عَٰكِفُونَ (١) ﴿٥٢﴾ قَالُواْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ (٢) وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾الأنبياء /٥١-٥٦

واتە: (بێگومان ئێمە بۆ پوچەڵ کردنەوەی بت پەرستی‌و بنبڕکردنی کفرو شیرك لەوەوبەر (واتە: بەر لە پێغەمبەرێتی - موساو هارون)ئیبراهیمان بۆ ئەو کارە هەڵبژاردو ئەو ژیری و عەقڵ و فەهمە پێویست و شایستەیەمان پێ دا کە هەر شایانی پێغەمبەرانە، ئەویش بەم عەقڵ و فەهمە ناوازەیەوە، کە هەر ئێمە دەزانین شایانی پێغەمبەرێتی یە ڕووی کردە باوکی و گەلە بت پەرستەکەشی و پێ ی گوتن:(ئەرێ ئەوە بۆ واز لەم بت پەرستی یە ناهێنن و سەر قاڵی بوون کە هیچ سوودو زیانێکیان نی یە)؟ ئەوانیش گوتیان (ئێمە هەر لە زووەوە دیومانە کە باب و باپیرانمان پەرستوویانن و شوێن پێ ی ئەوانمان لەم کارەدا هەڵگرتووە)، ئیبراهیمیش پێ ی گوتن: (دەی کەوا بوو ئێوە خۆتان و باب و باپیرانتان لە گومڕایی یەکی ڕوون و دیاردان) گەلەکەی لە وەڵام دا بە توورەیی یەوە پێ یان گوت: ئایا تۆ پەیامێکی ڕاستت بۆ هێناوین یان گاڵتەمان لەگەڵ دا دەکەیت)؟ ئەویش گوتی: (نەخێر بەڕاستی دەدوێم و خوداتان خودای ئەو ئاسمانانەو زەوی یە کە دروستی کردون و منیش بۆتان دەسەلمێنم)). کەوا بوو پاساوی ئەو گەلە بۆ پەرستنی بتەکانیان ئەوە بوو: ئەوان باب و باپیرانی خۆیان وا دیوە کە هەر پەرستوویانن و ئیدی ئەمانیش دەبێت شوێن پێ یان لەمەدا هەڵگرن و لاسایی یان بکەنەوە. ئەمەش هەر ئەو بیانووە نا بەجێ و لاوازەیە کە تێکدەران و خراپە کاران لە هەموزەمان و سەردەمێك دا لە بەربەرەکانی کردنی چاکسازان و ڕاستکەرەوان دا دەری دەبڕن، بەڵام چەند لاوازە ئەم بیانووە! کە عەقڵی خۆیانی پێ پەك دەخەن و وەك ئاژەڵانیش جڵەوی کاروباری خۆیان دەدەنە دەست کەسانی پێش خۆیان !!

(ئیبراهیم) ویستوویەتی گەلەکەی لە بت پەرستی قوتار کات، هەروەها لەو ئەفسانەو شتە گەندەڵ و پوچەڵانەی لە ئاکامی ئەو بت پەرستی یەوە سەر هەڵدەدەن، تاکو بیانگەیەنێت بەو حەقیقەتە گەورەیەی کە پێویستە گشت مرۆڤێکی سەر ئەم هەسارەیە خوازیاری بێت، واتە پەرستنی خودای تاك و تەنیا وهیچ شتێکیشی بە هاوەڵ بۆ دانەنێت، هەربەم حەقیقەتەش ئیبراهیم گەلەکەی خۆی دەدواند: ﴿ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ

(١) (عاکفون): (بەردەوام بوون لەسەر خەریك بوون بە پەرستنیانەوە).
(٢) (فطرهن): (خلقهن) — (دروستی کردوون).

ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِيٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾الشعراء/٧٥-٨٢ .. واته: {(ئیبراهیم) دوای ڕوون کردنەوەی بێ کەڵکی و پوچەڵی ی بت و دیاردەی بتپەرستی، بە گەلەکەی گوت: (ئەرێ ئێوە بە وردی سەرنجتان لەو پەرستراوانەتان داوە کە خۆتان و باب و باپیرانتان پێوەی خەریك بوون لە دێر زەمانەوە؟} خۆ ئەگەر منیش بە تکاو داوای ئێوەئەو جۆرە شتانە بپەرستم و بە گەورەو پیرۆزیان بگرم ئەوا دوژمنی سەرسەختم دەبن و لە ڕۆژی قیامەتیش دا سوودێکم پێ ناگەیەنن، تەنها خودای پەروەردگارم (الله) دەپەرستم چونکە هەر خودا دروستی کردووم و ڕێنمایی کردووم بۆ ڕێ ی ڕاست و هەر خوداشە ڕزق و ڕۆزیم لە خواردن و خواردنەوە پێ دەدات و هەموو جۆرە نیعمەتێکی بۆ مەیسەر کردووم، دیسان هەر خودایە لە کاتی نەخۆشیو ناساغی یەکم دا شیفاو هۆیەکانی چارەسەرم بۆ دابین دەکات. ئینجا هەر خوداش خۆی لە دنیاو لە ڕۆژی تەواو بوونی ژیانی دنیام دا من دەمرێنێت و پاشان لە ڕۆژی دوایی دا زیندووم دەکاتەوە، هەروەها هیواو تکام هەر لە خودایە کە لێم خۆشبێت و لە گوناهم ببوورێت لە ڕۆژی دوایی دا}.

ئەمەیە باوەڕی -ئیبراهیم- باوەڕی ئەو کەسەی کە بە هەموو گیان و هەست و هۆش و جەستەیەوە خۆی بە خودای پەروەردگاری سپاردووە.. ئەم باوەڕەشە هەموو خەم و پەژارەیەك لە دڵ دەردەکات و دڵنیایی و کامەرانی ی زۆری پێ دەبەخشێت. ئەم باوەڕە نەفس (دەروون) لە(خۆتەسلیم کردن بە ئەفسانەکان) ڕزگاردەکات و ناهێڵێت پەنابەرێتە بەر وەهم و خەیاڵ.. چونکە هیچ ڕازق و ڕۆزی دەرو شیفابەخش و ژیێەنەرو مرێنەرێك و لێخۆشبوویەکی تاوان و گوناهانیش نی یە تەنها خودای پەروەردگاری جیهانییان نەبێت.

## (ئیبراهیم) داوا لە باوکی دەکات واز لە بت پەرستی بێنێت

باوکی ئیبراهیم لەبت پەرستی دا لەپێشەوەی هەموو بت پەرستان دا بوو، تەنانەت یەکێك بوو لەوانەی بتیان دەتاشی و دەیانفرۆشت. ئیبراهیم ئەم ڕەفتارەی باوکی ی لەلا ناخۆش و قورسیش بوو، چونکە نزیکترین کەس بوو لێ یەوەو خۆشەویسترین کەسیش بوو لە دڵی دا، هەر بۆیەش بەئەرکی خۆی دەبینیێ، کە دەبێت بەتایبەتی ئامۆژگاریی بکات و لەسەرەنجامی بێ باوەری یەکەی ئاگاداری کاتەوە. بەڵام داخۆ (ئیبراهیم) بەچ شێوازێك قسەی بۆ باوکی

کردبێت؟ بێگومان بە زمانێکی خۆش و بەوپەڕی ئەدەب و نەرم ونیانیو بەبەڵگەی عەقڵی‌یەوە بۆی دواوەو بتپەرستی‌یەکەی بە کارێکی پوچەڵ وبێ هوودە بۆ خستۆتە ڕوو. هەروەك خوداش بەسەرهاتەکەی لەقورئانی پیرۆزدا گێڕاوەتەوەو فەرموویە: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ﴿٤٧﴾ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا نَبِيّٗا﴾مريم: ٤١-٤٩..

واتاو شیکاری ئایەتەکان: بەڕاستی وتەیەکەو سۆزو ویژدانی بیسەرانی دەهەژێنێت. سەرنج بدە لەوەی چۆن — ئیبراهیم لە سەرەتای هەر ئامۆژگاری یەکی دا وتەکانی بە ئامرازی بانگکردن (نداء)ی (بابە گیان: یا أبت) دەست پێ دەکات بۆ خۆ لێ نزیك کردنەوەی زیاترو بزواندنی دڵی لەگەڵ بەکارهێنانی ئەدەبێکی زۆرو هەڵس وکەوتی جوان.

(ئیبراهیم) سەرەتا بەڵگەی عەقڵی دەخاتە بەر چاوی باوکی و پێ ی دەڵێت: }بۆچی شتێکی بێ گیان و بێهەست و نەست دەپەرستیت کە نە (دەبیستێت) و نە (دەبینێت) و نە (توانای ئەوەشی هەیە چاکەیەك یان خراپەیەکت تووش بکات{ ؟! پاشان هەر ئامۆژگاریی دەکات و بەنەریتی هاوسۆزی نواندنیشی بانگی دەکات بۆ لای هەق و باوکی بەنەفامیی ڕەها وەسف ناکات، نەبادا باوکی ئەوە بە (سووکایەتی بە بیروڕاکانی) دابنێت و لەسەر ئەوەش ڕووی لێ وەرگێڕێت.

هەروەها ئیبراهیم خۆی بەخاوەن زانستێکی زۆر دانانێت تاکو خۆی لەسەروو باوکی یەوە دەرنەخات و بەمەش لێ ی تەرە نەبێت. بەڵکو پێ ی گوتووە: (من هەندێك زانستم پێ یە کە لە خودای پەروەردگارمەوە بۆم هاتووەو بەڵام هەمان شت بۆتۆ نەهاتووەو بە پێی ئەو زانست و زانیاریانەش پەیڕەویی ئامۆژگاری و ڕێنمایی یەکانم بکە، چونکە من ڕێگای ڕاستت پیشان دەدەم. شەیتانیش کە سەرپێچی ی لەفەرمانی خودا کردووە ئەو تاکە دوژمنەتەکە دووچاری ئەم گومڕایی یەی کردوویت و بەمەش دەتگەیەنێت بەسزای سەختی خودا).

کەچی باوکی بەپەلەو سەرسوڕمانەوە پێ ی دەڵێت: (ئای چەند سەیرە! ئەریٚ ئەوە (ئیبراهیم) تۆ ڕووت لە بتەکان وەرگێڕاوەو بەتەمانیت بیانپەرستیت. دەسا ئەگەر لەم هەڵس و کەوت و بیروڕایەت پاشگەز نەبیتەوە کە دەربارەی ڕێگرتن لەبت پەرستی یە، ئەوا بەردبارانت دەکەم. جا بۆ ئەوەی ژیانت پارێزراو بێت، ئەوا ون بە لەبەرچاوم و لیٚم دوور کەوە بۆ ماوەیەکی زۆر ئەگەر ڕزگاربوونت دەوێت)..

ئیبراهیم لەبەرامبەر هەڕەشەی باوکی و دەرکردنی دا تەنها بە وتەی (سلام علیك) وەڵامی دایەوە بە مانای: (لەمنەوە هیچ ناخۆشییەکت پیٚ ناگات و هیچ ئازارێکیشت تووش نایەت، بەڵکو لەلایەن منەوە ساغ و سەلیم دەبیت، لەخوداش دەپاڕێمەوە لیٚت خۆش بێت و سزات نەدات. هەروەها خودای پەروەردگارم هەردەم وای ڕاهێناوم کە ڕێزم لیٚ بنێت و نزاو پاڕانەوەم گیرابکات. جا ئەگەر بە هۆی (ئەوەی بانگت دەکەم بۆ باوەڕ هێنان بە خودا) ئازارت پیٚ بگات، ئەوا ئیدی خۆم لە تۆو میللەتەکەشت دوورەپەرێز دەگرم، هەروەك خۆم لەو خواوەندانەشتان بە دوور دەگرم تاکو هەر تەنها خودای پەروەردگار بپەرستم نەوەك بە پەرستنی ئەو خواوەندانە وەك ئێوە بەدبەخت و ڕەنج بە خەسار بم)..

بێگومان ئەم نزاو لە خودا پاڕانەوەیەی (ئیبراهیم) بۆ لێخۆشبوون لە باوکی، لەکاتێکدا بووە کەبەڵێنی پەسندکردن و گیرابوونی نزاکانی پیٚ دراوەو، کە هێشتا (ئیبراهیم) بیٚ ئومێد نەبووە لە باوکی و وا بە تەما بووە باوەڕ بێنێت، بەڵام دوای ئەوەی بە ڕوونی بۆی دەرکەوت کەوا باوکی دوژمنی خودایەو نایەوێت دەسبەرداری بت پەرستی بێت، ئیدی ئەویش (واتە — ابراهیم) بیٚلایەنیو بیٚبەری بوونی خۆی لیٚ ڕاگەیاند، هەروەك لەقورئانیش داهاتووە: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴾التوبة/١١٤..

## " ئیبراهیم بتەکان تیٚك دەشکێنیٚت "

-ئیبراهیم- لەدڵی خۆی دا بڕیارێکی پەنهانی ی بۆ شکاندنی ئەو بتانە دانا بوو کە گەلەکەی دەیانپەرست، ئەوە بوو سوێندی لەسەر تیٚك شکاندنیان خواردو ئەمەش ڕێگەیەکی کردەیی (عملي) بوو کە ویستی گەلە چەواشە کراوەکەی تیٚ بگەیەنێت و بەڵگەی ڕەوانی خۆییان بخاتە ڕوو لەسەر ئەوەی کەوا ئەم بتانە هیچ زەرەرو قازانجێکیان نی یەو تەنانەت ناتوانن ئازاری کەسێکیش بدەن گەر زیانێکیان لیٚ بدات. دیارە (بەڵگەی کردەیی)یش کاریگەریی یەکی گەورەی لەسەر دەروونی خەڵکی هەیەو زیاتریشە لە کاریگەریی

ئامۆژگاریو ڕێنمایی بەزمان. (ئیبراهیم) بۆ دەرفەتێکی گونجاو دەگەڕا تاکو نیازەکەی خۆی بەدی بێنێت، ئەو دەرفەتەش لە ڕۆژێکی وادا هاتە پێشەوە کە بە (جەژنی گەلەکەی) دادەنراو لە شار دەچوونە دەرەوە بۆ ئاهەنگ گێران. لەو ڕۆژەدا باوکی پێ ی گوت (ئیبراهیم) ئەمڕۆ جەژنەو بۆچی لەگەڵمان نایەیتە دەرەوەو بەشداریی ئاهەنگەکەمان ناکەیت و خۆت دڵخۆش ناکەیت؟)، ئەویش چەند هەنگاوێك لەگەڵیان دا ڕۆیشت، بەڵام هەر زوو بیانوویەکی ڕەوای بۆ پەیدابوو تا بەهۆیەوە بتوانێت خۆییان لێ دوا بخات و نەچێت لەگەڵیان، ئەوەبوو تەماشایەکی ئەستێرەکانی کردو گوتی: (من لەدەرکەوتنی ئەستێرەدا ئەوە دەخوێنمەوە کە لەسەر لێواری نەخۆشی -تاعوون-م وخەریکە تووشم ببێت)، گەلەکەشی لەوە دەترسان کە (ئیبراهیم) بەم نەخۆشییە ئەوانیش تووش کات، جا بۆ ئەوەی میکرۆبەکەی ئەوانیش نەگرێتەوە وازیان لێ هێنا تا لەگەڵیان دا نەچێتە دەرەوە بۆ ئاهەنگی ڕۆژی جەژنەکەیان.

ئەویش لەوڕێیەی لێوەی ڕۆیشتبوو گەڕایەوە بۆ ئەو جێ یەی بتەکانیانی لێ بوو و سووریش بوو لەسەر تێك شکاندنیان. جاکە دەرفەتی بۆ ڕەخسا چوو بۆ ئەو پەیکەرخانەیەی بتەکانیان لێ دانا بوو. بتەکان هەندێکیان لە تەنیشت یەکترەوە بوون و گەورەترینیان واتە (گەورەکەیان) لەپێش هەموویانەوە بوو.

(ئیبراهیم) بینی ی لەبەردەم بتەکان دا بڕێکی زۆر لەخواردن و خواردنەوە دانراوە کەگەلەکەی بەنیەدیعای قوربانی و خۆ لێ نزیك کردنەوەیان پێشکەشیان دەکردن، ئەویش بەگاڵتە پێکردنەوە ڕووی کردە بتەکان و لێ ی پرسین: (ئەرێ بۆچی ناخۆن؟) کاتێك هیچ بتێکیش لەوانە وەڵامێکی نەدایەوە دووبارە لێ ی پرسینەوە: (ئەوە بۆچی دەنگتان نایەت؟) ئینجا دەستی ڕاستی بۆ لار کردنەوەو هەموویانی بەتەورێك شکاندو وردوخاشی کردن. تەنها بتە گەورەکەیانی هێشتەوە (واتە گەورەترین خواوەندیان) وتەنانەت تەورەکەشی بەدەستی ئەو بتە گەورەیەدا هەڵواسی و دوایی پەیکەرخانەکەی بەجێ هێشت.

ئەم بەسەر هاتەی پێشوو شیکاری ئەم ئایەتانە بوون کە دەیخوێنینەوە:

﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ[1] لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى

---

(١) (من شيعته) - لە کۆمەڵی -نوح-ە، واتە لەوانەیە کە پەیڕەوی مەنهەجی (نوح)یان کردووە لە خوا بەیەك گرتن و ئیمانداری دا. (ضمیر)ی (ه) لە (شیعته)دا بۆ (نوح) دەگەڕێتەوە، چونکە چەند ئایەتێکی پێش ئەم ئایەتانە باسی بەسەرهاتی (نوح) دەکەن.

ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ[1] فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴾الصافات/٨٣-٩٣... هەروەها لە قورئان داهاتووە: ﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَـٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا[2] إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴾الانبياء/٥٧-٥٨..

(ئیبراهیم بە تێك شكاندنی ئەم بتانە بەڵگەیەكی هەستداری لەسەر پوچەڵی و بێ هوودەیی بت پەرستی خستە بەرچاوی گەلەكەی كە: ئەگەر چەند خواوەندێكی ڕاستەقینە بوونایە ئەوا بەرگرییان لەخۆیان دەكردو زیانیشیان بەهەر كەسێك دەگەیاند كەنیازێكی خراپی لێ یان هەبوایە).

ئیمپراتۆر (هیدیۆشی)ی ئیمپراتۆری پێشووتری - ژاپۆن- لەم حەقیقەتە تێگەیشت و لێی ئاگادار بووەوە، ئەوە بوو ناوبراو پەیكەرێكی زلی بۆ (بووزا) بنیات ناو هێشتا كاری بنیات نانی بەتەواوەتی بەئەنجام نەگەیشتبوو كە ساڵی (١٥٩٦ز) بومەلەرزەیەك ڕوویداو یەكسەر ئەو بتەشی بۆ وردوخاش كرد. لەم بارەیەوە گێڕاویانەتەوە كە (هیدیۆشی)ی ئیمپراتۆر بتە وردوخاش بووەكەی دایە بەر تیرو بەسووكایەتی پێ كردنەوە پێ ی گوت: (خۆ من پارەو پوولێكی هێجگار زۆرم تیادا خەرج كردیت وكەچی نەت توانی هەر تەنها پەرستگاكەی خۆیشت بپارێزیت)[3].

## دادگایی كردنی ئیبراهیم

ئەو گەلە دوای ئەوەی ئاهەنگیان بەرۆژی جەژنەكەیانەوە گێرا گەڕانەوە بۆ نێو شارو دیتیان بتەكانیان چی بەسەر هاتووە، بەمەش ترسیان لێ نیشت و لە نێو خۆیان دا پرسیاریان دەربارەی زانینی ئەو دەست وەشێنە ستەمكارە دەكرد كە شتە پیرۆزەكانیانی پێشێل كردووە. هەندێكیان گوتیان: (بیستومانە لاوێك بە خراپە باسی بتەكان دەكات و ناوی -ئیبراهیم-ە و نەریتی وایە كە عەیب و عاریان لێ بدۆزێتەوە و گاڵتەیان پێ بكات، هەر ئەویشە گومانی ئەو كردارەی لێ بكەین). هەواڵی دەستدرێژی كردنە سەر بتەكان بە حاكمان گەیشت و ئەوانیش بەسەربازەكانیان گوت: خێرا ـ ئیبراهیم ـ بێنن تا لەبەر چاوی خەڵكی دادگایی ی بكەین. ئەو

(١) (فراغ الى الهتهم): واتە بە پەلە و پەنهانی چوو بۆ لای خواوەندەكانیان.
(٢) (جذاذا): واتە چەندین پارچەی وردو بچووك، وردوخاش كراو.
(٣) قصة الحضارة / ول ديورانت ج٥ / ص ١٣٣.

کەسانەش با بێنە پێش و شایەتی بدەن لەسەر ئەو قسانەی ـ ئیبراهیم ـ کاتێک لای ئەوان خەوش و عەیبی لە بتەکان دۆزیوەتەوەو بەڵێنی سەرەنجامی خراپی پێ داون)..

-ئیبراهیم- هێنراو حاکمان لێ یان پرسی: (ئەرێ ئەوە جەنابت وات لەم خواوەندانەمان کردووە ئەی-ئیبراهیم-؟!) لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ـ ئیبراهیم ـ هەست بەوە دەکات کەئیدی دەرفەتی پێویست هاتۆتە ئاراوە بۆ گەیاندنی مەبەستی خۆی و گەیشتن بەو حەقیقەتەش کە داوای دان پیانانی لێ دەکردن. بۆیە بە شێوازێکی دانایانە وەڵامی پرسیارەکەیان دەداتەوە بەو ڕستەیەی: (کە تێك شکێنەری بتەکان بتەگەورەکەیانەو شایەتیش لەسەر ئەو کردارە پاشماوەی بتەکانی دیکەیە، پێشیان دەڵێت ﴿فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ﴾... (دە لێ یان بپرسن گەر ئەوان قسە دەکەن)، چونکە (بتی گەورە)تووڕە بووە لەوەی ئەو هەموو بتە بچووکانە بپەرستن و لەکاتێکدا ئەویش لەهەموویان گەورەتریێت، هەر بۆیەش شکاندوونی).

ئەو گەلەش بێ بیرکردنەوەو تێفکرین دەکەونە نێو ئەو دۆخی بێ ئاگایی یەوەی کە بەپەلە بەیەکدی بڵێن: (ئێوە بەپەرستنی ئەو بتانەی ناتوانن قسە بکەن زوڵمتان کردووەو بەتاوانبار کردنی -ئیبراهیم-یش ستەمتان کردووە)، بەڵام دوای ئەمەش لووتیان بەڕاستی یەك دادەژەنێت و خێرا سەریان لەشەرمەزاری دا بادەدەن و دەگەڕێنەوە سەر مشتومڕێکی تر لەگەڵ -ئیبراهیم-داو پێ ی دەڵێن: (تۆ خۆت دەزانیت ئەم بتانە دەنگیان لێوە نایەت و ناتوانن قسە بکەن، ئیتر چۆن داوای ئەوەمان لێ دەکەیت پرسیاری ئاخاوتنیان لێ بکەین و داوایان لێ بکەین بۆمان بدوێن دەربارەی ئەوەی بەسەریان دا هێنراوە؟)...

لەوکاتەش دا بەڵگەو پاساوی ئیبراهیم بەجوانی دەنگ دەداتەوەو لە زەنگی گوێچکەکانیان دەدات و زمانیان لاڵ دەکات و بەم وەڵامە کاریگەرە قسەیان پێ ناهێڵێت:

﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾الانبياء/٦٦-٦٧. واتە: (ئایا ئێوە لە جیاتی خوا پەرستی و عیبادەتی خودای پەروەردگاری جیهانییان ئەو بتە بێ هەست و بێ گیان و بێ دەسەڵاتانە دەپەرستن کەتوانای سوودو زیانێکیان بۆتان نی یە؟ بەڕاستی من زۆر پەست و بەداخم لەو کارە پیس و ناهەموارەتان و لەخۆتان و ئەو بتانەی، کە لەجیاتی خودا (الله) دەیانپەرستن. دەی ئیتر تۆزقاڵێك عەقڵتان نی یە کەبیربکەنەوەو پەشیمان بنەوە؟).

ئەم ئایەتە لە هەر چاخ و سەردەمێك دا بێ نرخی و نەفس نزمی ی ئەوانە دەردەخات کە بت و پەیکەرەکان بە پیرۆز دادەنێن ولە جیاتی خودا دەیانپەرستن. بەڵام ئەگەر نەفامی(جهل) لە دەروونی خەڵکی دا خۆی بچەسپێنێت و دەمارگیری ی کوێرانەش دڵان داگیرکات، ئیدی

دەروونەکان دەگەنە ئاستێکی بێزراو لەهەڵسەنگاندنی باری ڕاستی ی شتەکان دا. لە بەر ئەوە کاتێك دەبینن گلۆڵەیان دەکەوێتە لێژی و پەردە لەسەر ڕوویان هەڵدەماڵرێت و هیچ بەڵگە و بیانوویەکیان بەدەستەوە نامێنێت، یەکسەر واز لە وت و وێژو دەمەتەقێ و موناقەشەی بەرامبەر دێنن و پەنادەبەنە بەر ئەو هێزەی کە ڕیسوایی و شەرمەزاری یەکانیان بۆ دادەپۆشێت. ئەو گەلە بێ باوەڕەش دوای وت وویژ لەگەڵ (ئیبراهیم) و دوای نەمانی بروبیانوویان، حوکمی مەرگیان (بە سووتاندن) بەسەردادا و ویستیان بیسووتێنن. بەڵام خودا بە تواناو قودرەتی خۆی ڕزگاری کردو فەرمانی ساردی و سەلامەتی ی بە ئاگرەکەش کردو پێ ی فەرموو: ﴿كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ ئاگرەکەش بە فەرمانی خودا ساردو سووك و ئاسان بوو لەسەری، واتە هێندەش ساردنەبووەوە کە سەرمای ببێت.

خودا لەم بارەیەوە فەرموویە: ﴿قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ الانبياء/٦١-٦٩.

لە جێگەیەکی دیکەی قورئان داو لە وەسفی ئەو شێوە دادگایی کردنەوەی (ئیبراهیم)دا خودا بە شێوەیەکی کورت وکاریگەر فەرموویەتی: ﴿فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ﴾ الصافات/٩٤-٩٨

جا خوێنەری بەڕێز نەختێك لە ئاست ئەم ئایەتەدا هەڵوێستە بکە: ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ﴾.. واتە: (ئەرێ ئەوە ئێوە ئەو بتانە دەپەرستن کەبەدەستی خۆتان دایاندەتاشن و دروستی دەکەن؟)..(بە کورتی یەکی سەرسوڕهێن)و (باسکردنێکی ئاشکرا)قورئان پوچەڵی و بەتاڵی ی بت پەرستی ڕوون دەکاتەوە.. ئەمەش وەك دەبینیت هیچ نووسەرو ئەدیب و ڕاگەیانەرێك ناتوانێت بەو ڕوون کردنەوە کورت وپوختە مەبەست بپێکێت، ئەمەش تەنها لەتایبەتمەندیەکانی قورئانە. لەم ڕووەشەوە وتەیەك هەیە کە لەپەندە بەناوبانگەکانی (چین)ـەو

دەڵێت: (هیچ کەسێك لەوانەی پەیکەرەکان دادەتاشن خواوەندەکان ناپەرستن، چونکە دەزانن لەچ ماددەیەك دادەتاشرێن)!! بەڵام جیاوازی یەکی ئێجگار زۆر لەنێوان هەریەکە لەڕەوانبێژیی قورئان و پەندە چینی‌یەکەدا هەیە، چونکە قورئان هەمان مانای بەکورت کردنەوە بێوێنەکەی خۆی ڕوون کردووەتەوەو ئەم کورت کردنەوەیەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کەقورئان سرووشێکی خودایی یە.. دواى ئەمەش سەرنج لەم فەرمایشتەی تری خودا بدە ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ واتە: خودا خۆیان و کارەکەشیانی دروست کردووە، بەمانای ئەوەی خودا لەمرۆڤ دا ئامادەیی‌و توانای بۆ کارکردن تێدا خەلق کردووە، هەروەك ئەو ماددەیەشی خەلق کردووە کەبتەکانی لێ دروست دەکرا، ئیتر چۆن (مرۆڤ)ی خەلق کراوی خودا مەخلووقێکی دیکە (کە بتەکانە) دەپەرستێت؟ ئەی وا ڕاسترو شایستەتر نی یە کەئەو خودای خالقەی بپەرستێت، نەك بتێکی دروست کراوو داتاشراو؟!

## فەتحێکی زانستیانەی قورئان

هەرکەس بەوردی سەرنج لەو ئایەتە قورئانیانەی پێشوو بدات دەبینێت باسی چەند ڕووداوێکی واقیعی‌و ڕاستەقینەی مێژوویی دەکات کە زانست (علم)یش دەرکی پێکردوون و دانی بە حەقیقەتیان داناوە. بۆ نموونە قورئان ئەوە باس دەکات کە (ئیبراهیم) بۆ ئاسمانی ڕوانیوە: ﴿ فَنَظَرَ نَظۡرَةً فِي ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴾ واتە (تەماشای ئەستێرەکانی کردووەو لە هەڵاتنیان دا ئەوەی خوێندۆتەوەبۆ گەلەکەی کەوا خەریکە تووشی نەخۆشی یەکی ترسناك دەبێت). لەم ئایەتەدا ئەو ڕاستی یە مێژوویی یە تێدەگەین کە خەڵکی ئەو زەمانە بە ئەستێرە خوێندنەوەوە خەریك بوون، (ئیبراهیم)یش ئەو پاکانەیەی بەگوێرەی بیروبۆچوونەکانی خۆیان بۆ هێناونەتەوە لەسەر ئەوەی لەگەڵیان دا نەچێتەدەرەوەی شار بۆ ئاهەنگەکەیان تا بەمەش دەرفەتی شکاندنی بتەکانی بۆ مەیسەر بێت.

(ویل دیورانت) لەکتێبەکەی دا (قصة الحضارة) دەڵێت: (بابلی یەکان دیراسەی ئەستێرەکانیان بۆ ئەوە نەکردووە تاکو نەخشەی ڕێگاکانی کاروان و پاپۆڕەکانیان بکێشن، بەڵکو زیاتر دیراسەیان کردووە، کە یارمەتی یان بدات لە پێشبینی کردنی داهاتووی خەڵکی و چارەنووسیان دا. بەمەش وا دیارە ئەوان (ئەستێرە خوێنەرەوە) بوون زیاتر لەوەی گەردووناس بن. جا ئەو کۆشش وتەقەللایانەش کە بۆ زانینی داهاتوو لە ڕێ ی زانینی جم وجووڵ و هات و چۆی ئەستێرەکانەوە دەخرێتەگەڕ تەنها ئارەزوویەکە لەو ئارەزوانەی بابلی یەکان).[1]

---

(١) - قصة الحضارة - ج٢ - ص (٢١١) وما بعدها.

هەروەها قورئان دەربارەی داب ونەریتەکانی گەلەکەی (ئیبراهیم) دەدوێت کە چۆن قوربانی یەکانیان لە خۆراك پێشکەش بە خواوەندەکانیان دەکەن: ﴿ فَرَاغَ[1] إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾.. بە مانای -ئیبراهیم- کاتێك گەیشتە ئەو پەرستگایەی خواوەندەکانی گەلەکەی تێدا بوون و (دیتی خۆراکیان لەلایە) ئەو خۆراکەی پێشان دان وداوای لێکردن بیخۆن لەکاتێکدا دەیشی زانی ئەوانە بێ گیان و هەست ونەستن، بەڵام لاسایی گەلەکەی دەکردەوەو گاڵتەی بەو داب ونەریتە نالەبارە دەهات. (ویڵ دیورانت) لەو کتێبەی پێشووی دادەڵێت: (پادشاکان وا هەستیان دەکرد، کە ئاتاجێکی زۆریان بە لێخۆشبوونی خواوەندەکان هەیە، بۆیە پەیکەری زۆریان بۆ دادەمەزراندن و ناو پەرستگاکانیشیان پڕدەکرد لە نوێن و تفاقی ناوماڵ و خواردەمەنی. خواردن و خواردنەوەش زۆرترینی ئەو ئامرازی قوربانی کردن وخۆ لێنزیك کردنەوەی خۆیان بووە لە خواوەندەکانیان)[2].

پاشان قورئان باسی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە (ئیبراهیم) هەموو بتەکانی شکاندووە تەنها بتەهەرە گەورەکەیان نەبێت ﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ ﴾، لەم دەقەی قورئانیشەوە تێدەگەیت کە گەلەکەی -ئیبراهیم- چەندەها خواوەندیان هەبووە، لەگەڵ هەموو ئەو خواوەندانەش دا خواوەندێکی گەورەیان هەبووە کە (ئیبراهیم) هێشتویێتیەوەو نەیشکاندووە. هەروەها (ویڵ دیورانت) لەو کتێبەی دا دەڵێت: (مردك- بەگەورەی خواوەندەکان لەلای خەڵکی -بابل- دادەنرا، لە تەنیشت ئەو خواوەندەشیانەوە چەندین خواوەندی دیکەیان هەبووە).

بێگومان ئەم ڕاستیانەی کە قورئان هەرخۆی بەتەنیا باسی کردوون و زانستیش لە نزیکەوە دانی پێداناون، سەرکەوتنێکی زانستیانەی قورئانە، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام (محمدﷺ)داو لە ژینگەو دەوروبەریشی دا نەزانرابوون. (ڕاستی و نهێنی یە شارراوەکانیشی) ماوەیەکی کەم لەمەوبەر دۆزراونەتەوە، ئەویش دوای ئەوەی زانایان لە خاکی (بابل)دا چەندین چاڵیان هەڵکەندو بەدوای ئاسەواری کۆن دا دەگەڕان و پاشان چەندین تابلۆیان دۆزیەوە لەو تابلۆیانەی کە بە زمانی (مسماری) بیروباوەڕەکانی خەڵکی ئەو سەردەمەی (بابل)یان لەسەر نووسرابووەوە، ئینجا هێما و نیشانەکانی سەر ئەو تابلۆیانەیان لێك جیاکردەوەو شیکاریان کردو لە ناوەڕۆکەکانیان تێگەیشتن.

---

(١) (فراغ الی الهتهم): واتە بە پەلە و پەنهانی چوو بۆ لای خواوەندەکانیان.

(٢) هەمان سەرچاوە.

# بەندی دووەم

## (( ئیمانی ئیبراهیم ))

( بەڵگەی (ئیبراهیم) لەسەر پوچەڵێی فرەخواوەندی - بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتێی خودای تاك وتەنیا - توانای خودا لەسەر زیندووکردنەوەی مردوان )

## بەڵگەی " ئیبراهیم " لەسەر پوچەڵێی فرەخواوەندی

لێکۆڵینەوە مێژوویی یەکان دەریان خستووە کە لەو زەمەن و ژینگەیەی ئیبراهیمی تێدا ژیاوە خەڵکی (خۆر و مانگ و ئەستێرەکانیان) پەرستووە. -ئیبراهیم-یش (سلاوی لێبێت) کە ئیمانی بە خودای تاك وتەنیا هێنابوو هیچ هەلێکی فەرامۆش نەدەکرد بۆ قسە کردن لەگەڵ گەلەکەیو دەربارەی پەرستراوەکانیان دەمەتەقێ ی لەگەڵ دادەکردن وبۆیان دەدوا، یەکێك لەو دەمەتەقێ و وت وویژانەی لەگەڵیان دابۆنەوە بوو دەیویست بەڕوونی باسی پوچەڵی و بەتاڵی کاری پەرستنی خۆرومانگ و ئەستێرەکانیان بۆ بکات وبۆشیان دەرخات کە پەرستراوی ڕاستەقینەهەر خودای تاك وتەنهایە..

لەم بارەیەوە خودای مەزن فەرموویە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾الانعام/٧٥-٧٩.

(ماناو شیکاری ئایەتەکان): بێگومان خودا هەندێك لەو نهێنییانەی (مولکی گەورەو گەردوونی بەرفراوانی ژێر دەسەڵاتی خۆی) کە بەڵگەن لەسەر پەروەردگارێتی یەکەی، پیشانی (ئیبراهیم) دەدا تاکو لەو باوەڕداره دڵنیاو بەیەقین گەیشتوانە بێت کەئیمان لەدڵیان دا جێگیربووەو بەڵگەش بخاتە بەردەمی گەلەکەی لەسەر ڕاستی ی ئەو باوەڕە پوختەی. بەسەر هاتەکەش ئاوابووە: ئەوا شەو داهاتووەو پەردەکانی داداوەتەوە (ئیبراهیم)یش لەنێو کۆمەڵە

کەسێکی گەلەکەی دا دانیشتووەو پێکەوە سەرگەرمی قسەوباس وگفت وگۆی شەوانەن. لەو شەوەدا (ئیبراهیم) بە سووکە نیگایەکەوە تەماشای ئەستێرەیەك لەو ئەستێرە گەڕۆکانە دەکات کە لەئاسمان دا دەدرەوشانەوەو گەلەکەی دەیانپەرست، ئینجا ڕوویان تێدەکات و بەگریانێکەوە پێیان دەڵێت (ئەوە خودامە) واتە با هاوڕای ئێوە بم و وای دانێین من لەسەر بیروڕای ئێوەم)، بەلاّم هێندەش ناخایەنێت ئەو ئەستێرەیە لەگەڵ داهاتنی ڕۆژدا لەبەرچاو ون دەبێت و ئاوا دەبێت، خێرا لەو ساتەدا (ئیبراهیم) بەهاونشینانی شەوی دەڵێت (من باوەڕ بەپەرستراوێك ناهێنم کە دەرکەوێت و پاشان بزر ببێت).. ئەمەش شێوازێکی دانایی یە کە -ئیبراهیم- هەڵی بژاردووە، ئەو لەو شێوازەی دا پەرستراوەکانیانی بەسووك وبێ نرخ دانەناوەو بیروباوەڕەکانیشیانی لەسەرەتادا بەخراپ و ناهەموار لەقەڵەم نەداوە نەبادا لێ ی بتەکنەوەو دژایەتی بکەن و گوێ ی خۆیان بناخنن لەئاست بیستنی بەڵگەکەی دا، بەڵکو (بەگریمان) خۆی کردە هاوڕاو هاوبیرو بۆچوونیان تاکو متمانەیان دەستەبەر بکات و جێ ی وتەکانیشی لە نێو دڵ و دەروونیان دا بکاتەوەو بتوانێت لەوێوە دڵیان بکاتەوەو شوێنەواری هەڵەیان لە بیروباوەڕیان دا بۆ دیاری کات، ئەو بیروباوەڕەی لەدەرکەوتنی ئەستێرەیەك دا بەندە کە بزردەبێت و ئەمەش گۆڕانی تێدایە، گۆڕانیش لەحاڵەتی هاتن و نەمانی ئەستێرەکەدا پێچەوانەی خوایەتی کردن و پەرستراوێتی یە.

هەروەها (ئیبراهیم) لە نێو کۆڕ وکۆمەڵێکی دیکە لەگەڵیان دا کۆدەبێتەوەو دەبینێت ئەوا مانگ لەپشت ئاسۆیەکەوە هەڵدێت و (بە ڕۆشنایی خۆی) تاریکی شەو ڕاو دەنێت، ئینجا بەهەمان گریمانی پێشوو دەڵێت: (ئەوە خودامە) وەك پیشاندانی هاوڕاییەك بۆیان لەو بیروباوەڕەیان دا کە (باوای دانێین ئەمەیان خودایە)، بەلاّم مانگیش هێندە ناخەیەنێت کە لەبەر چاوان گوم دەبێت. لەو کاتەش دا خێرا (ئیبراهیم) دەڵێت: گەر بێتو ئەو خودایەی خەڵقی کردووم ڕێنمایییم نەکات ئەوا لەکۆمەڵی گومڕایان دا دەبم).. ئەو لەم دان پیانانەدا دوو ئامانجی ڕەچاوکردووە: یەکەم: پوچەڵ کردنەوەی پەرستنی مانگ.

دووەم: بەلاّم لەڕاستی دا پەرستراوێکی دیکە هەیە کە خودا (الله)ی تاك وتەنیاو بێ هاوەڵەو دەروونی خەڵکی ڕێنمایی دەکات و ناهێڵێت گومان و ڕاڕایی بگاتە قووڵایی دەروونەکانیان.

ئینجا لە کاتی سەرلەبەیانی دا، واتە لە ڕۆژی دواتردا خۆر هەڵدێت ولە ناوجەرگەی ئاسماندا بەجوانی دەردەکەوێت و پرشنگ و تیشکی زێڕینی پەخش دەکات، -ئیبراهیم-یش بەو کەسانەی لەگەڵی دانیشتوون دەڵێت: (هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُ) ئەمەیان خودامە، ئەمە گەورەترە لە ئەستێرەکان و لە مانگ.. بەم پێ یە هێدی هێدی وایان لێ دەکات گوێ ی لێ بگرن و هاوڕاو هاوبیروبۆچوونی بن لەدوای ئەو وتەو گریمان ڕەت کردنەوەیەی پێشووی و نکۆڵی

کردن لە پەرستراوێتی(الوهیـة)ی ئـەو شـتانەی تـر. ئیـدی لـەکاتی ئـاوابوونی خـۆریش دا -ئیـبراهیم- ئـەو بەرەنجامـەی نیـازی بـووە پـێ یـان ڕادەگـەنێت کـە (خـۆ بەدوورگرتنـە لەپەرسـتراوەکانیان) چـونکە ئـەو هەسـارانەی دەردەکـەون وپاشـان ون دەبـن هـەر دەبێـت خولقێنەرێکیان هەبێت، ئەویش خودای پاك وبێ خەوشە.

جا دوای ئەوەی -ئیبراهیم-خۆی (بەری و بەدوور دەگرێت) لەپەرستراوەکانیان ڕوویـان تـێ دەکات وپێ یان دەڵێت: (من هەموو نیازو مەبەستێکی خۆم بۆ پەرستنی خودای تـاك وتـەنیا تەرخان کردووە، ئەو خودایەی ئاسمانـەکان و زەویـی دروسـتکردووە، هـەروەها مـن خـۆم لـەو گومڕایی یە دوورەپەرێز گرتووەو ئەو پەرسـتراوە پڕوپـووچ و بەتاڵانـەتانم فـەرامۆش کـردووەو هاوەڵ بۆخوداش دانانێم و لەپاڵ خوادا شتێکی تر ناپەرستم. لەلایـەکی دیکـەوە ئـەوەی لـەو ئایەتانەی پێشوو وردبێتەوە ڕاستی یەکی ڕۆشنی زانستی لە قورئان دا بەدی دەکـات، ئەوەیـە قورئان دەربارەی ئەو شـتە پەرسـتراوانەی سـەردەمی(ئیـبراهیم) دەدوێـت وەك(ئەسـتێرەکان و مانگ وخۆر) کە چەند پەرستراوێکی کۆن بوون و زانست دانی بە وجودیان داناوە دوای ئـەوەی بە هۆی ئامرازەکانی گەڕان و هەڵکەندن ودۆزینەوەی چاڵ و ئاسەوارە دێرینەکانەوە لە مێـژووی گەلان و نەتەوەکانی کۆڵیوەتەوە. هـەر لەسـەردەمی -ئیـبراهیم-دا دەرکـەوتووە کەپەرسـتنی مانگ لەشاری (ئوور)، واتە لە شارەکەی -ئیبراهیم-دا بووەو ناوی (نانار)یان لـەمانگ نـاوە. هەروەها خۆریش پەرستراوەو ناوی (شماس)یـان لێ نـاوە، پەرسـتنی ئەسـتێرەکانیش لەکایـەدا بووەو ناودار ترینیان ئەستێرەی (زوهرە) بووە کە نـاوی (عەشـتار)ی لێ نـراوە، ئەسـتێرەی -مەریخ-یش ناوی (مەردۆخ)[1]ی لێ نراوە.

قورئان -وەك تێ بینی دەکـەین- ئامـاژە بـۆ چـەند ڕووداوێکـی ڕاسـتەقینەی مێـژوویی دەکات لەسەر زمانی(ابراهیم پێغەمبەر).ئەو ڕووداوە مێژوویی یانەش بە هەندێك لەو هەواڵ و چیرۆکە نەزانراوە غەیبی یانە دادەنرێن کە بۆ پێغەمبەری خودا(محمد ﷺ) هاتوون وشایەتی بـۆ قورئانیش دەدەن لەسەر ئەوەی سروشێکی خودایی (الهي)یە.

## بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتیی خودای تاك وتەنیا

لە سەردەمی -ئیبراهیم-دا (نـەمروود) پادشـابووە، ئـەم پادشـایە ئیـددیعای خوایـەتیو پەرستراوێتیی بۆ خۆی کردووە. بانگەوازی (ئیبراهیم)یشی پێ گەیشتبوو لەسەر ئەوەی دەبێـت تەنها خودای تاك و بێ هاوەڵ بپەرسـترێت وهـەر پەرسـتراوێکی دیکـەی غـەیری خـودا (الله)

---

(١) بڕوانـە کتێبـی " ابـراهیم ابـو الانبیـاء "ی – مامۆسـتا (عبـاس محمـود العقـاد) ص (١٦٨، ١٦٩) هەروەها کتێبی (قصة الحضارة)ی ویلڵ دیورانت – ج٢ – ص٢١٤.

بەلاوەنرێت. هەربۆیەش پادشا کەسێکی نارد بەدوای (ئیبراهیم) داو بانگی کرد بۆ ماڵی خۆیەو لە نێوانیان دا ئەم گفت وگۆیەکرا کە قورئان بۆی گێراونەتەوە:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾البقرة/٢٥٨

واتا و شیکاری ئایەتەکان: (ئایا نەت بینیوەو هەواڵی ئەو کەسەت نەبیستووە کە لەئاست بەڵگەکانی ئیمان دا کوێربووەو کەچی مشتومڕی لەگەڵ -ئیبراهیمیش-دا کردووە دەربارەی پەرستراوێتی و تاك وتەنهایی خودا، هۆکاری مشت ومڕەکەشی، ئەو موڵك وسامان ودەسەڵاتە دنیایی یەی بوو کەخودا پیّ ی دابوو و ببووە مایەی لە خۆبایی بوون ولووتبەرزیەو خۆبەزل دانان و شانازی بەقودرەتی یەوە. ئەم پادشایە داوای لەئیبراهیم -کرد سیفەتەکانی ئەو خودایەی خۆی پیّ بڵێت کەبانگەواز بۆ پەرستنی دەکات، ئەویش لەوەڵام داو دەربارەی سیفەتێکی خودا گوتی کەخودای خۆی ئەو خودایەیە خەڵکی دەژیەنێت و دەمرێنێت ﴿ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾ خودای پاك وبیّ خەوش بناغە دارێژی ژیان و بەدی هێنەریەتی، هەر ئەویش بەفیعلی ژیان لە مرۆڤ دەسێنێتەوە. بەڵام پادشای (فریوخواردوو بەهێزی خۆی) بەجۆرێك نکوولّی ی لیّ کرد کەگوتی: من خەڵکی دەژیەنم ودەیامرێنم ﴿ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ﴾، (ئیبراهیم)یش گوتی: (چۆن دەتوانیت)؟ پادشا گوتی: (دوو پیاو کە شایانی کوشتنن دێنم و یەکێکیان دەکوژم و بەو کوشتنەشی مانای وایە مراندوومە، پیاوی دووەمیش لیّ ی دەبوورم و نایکوژم وبەمەش مانای وایە ژیاندوومە). بێگومان ئەم قسەیەی پادشاکە بە هەڵەداچوون و شێواندنی حەقیقەتە چونکە کرداری ژیاندنی ڕاستەقینە تەنها بە هێنانە ئارای مەخلووقێکی زیندوو لە نەبوو(عدم)ـەوە دەبێت. لەبەر ئەوەش دەبینین (ئیبراهیم) لەسەر ئەو وتەیەی پادشا کە ئاتاجی بە لۆژیك (منطق)ـە مشتومڕی لەگەڵدا ناکات، بەڵام بۆ یەکلایی کردنەوەو براندنەوەی ئەو مشتومڕەو دەم کوت کردنی پادشا ڕێگەیەکی بەسوودترو پتەوتر دەگرێتە بەرو پیّ ی دەڵێت: (دەی باشە ئەوە خودا خۆر لەڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێت تۆش ئەگەر ڕاست دەکەیت لە خۆرئاواوە هەڵی بێنە).ئیّ خۆ ئەم پادشایە پڕوپاگەندەی ئەوەی بۆ خۆی دەکرد هاوبەشی خودایە، هاوبەشی و شەراکەتیش دەبێت یەکسانی قودرەت وتوانای تێدا ڕەنگ بداتەوەو مادام وابێت دەبێت ئەم پادشا ئیددیعاچی و خۆ بە خوادانەرە توانای خۆی لەسەر گۆڕینی ڕەوتی خۆر بنوێنێت،کەچی لەئاست ئەم داوایەی- ئیبراهیم- دا ڕاچڵەکی و وەڵامێکی نەدرکاند).

لەم دەقەی پێشووی قورئان دا کەبەڕاشکاوی باسی ئیددیعای خۆ بەخوادانانی پادشایە، فەتحێکی زانستیانەی بۆ قورئان بەدی دەکرێت، لەمۆزەخانەی (اشمول)ی - ئینگلتەرا-شدا ناوی ئەو خانەوادانە هەیە کە حوکمی -بابل-یان کردووە لەدوای (لافاوەکەی سەردەمی نوح)ەوە. لەو تابلۆیانەش دا کە پارێزراون ولە نێو شوێنەوارە دێرینەکان دا دۆزرابوونەوە هاتووە کە گوایە: (ئەم پادشایانە لەئاسمانەوە هاتوونە خوارێ بۆ سەر زەوی‌و حوکم کردنی سەر زەوی، دوای ئەوەی خودا زەویی پاك کردۆتەوەو لە خراپەو شێواندن پاڵاوتوویەتی، هەروەها ئەم پادشایانە چەند خواوەندێکی ئاسمانیین وپێویستە خەڵکی بیانپەرستن)، دیارە وەك زانراویشە (ئیبراهیم) لە ڕۆژگاری حوکمی یەکێك لە پادشاکانی -بابل- دا ژیاوە. ئەمەش بێگومان فەتحێکی زانستیانەیە بۆ قورئان چونکە لەو ژینگەیەی پێغەمبەری خودا (محمد ﷺ)ی تێدا ژیابوو و لە چواردە سەدەوە نەزانراوە، کە (ئیبراهیم) لە ناوچەیەك دا ژیاوەو پادشایانی ئەو ناوچەیە پڕوپاگاندەی خوایەتی و پەرستراوێتییان بۆ خۆیان کردووە. ئەمەش بەڵگەیەکی ڕۆشنە لەسەرئەوەی کە قورئان سرووشێکی خودایی یە.

## توانای خودا لەسەر زیندوکردنەوەی مردوان

باوەڕ بە ڕۆژی دوایی‌و بەو پاداشتی چاکەو سزای خراپەیەی ئەو ڕۆژەو بە زیندوکردنەوەی مردوان کە خودا تیای دا زیندوویان دەکاتەوە، بەردەوام تا ئەمڕۆو تا کۆتایی دنیاش لە گرنگترین مەسەلەکانی باوەڕهێنانن. مەتریالیستەکان (ماددە پەرستەکان)یش چەند گومانێکیان لەسەر ئەم باوەڕوعەقیدەیە خرۆشاندووە کە هەندێك کەس لە باوەڕلاوازەکان والێ دەکەن نکوولّی لە بوونی ئاینەکان بکەن. قورئانیش لە چەندین جێگادا وەڵامی ئەو کەسە دوودڵ وگومانداراانەی داوەتەوە کە بەدی هاتنی ڕۆژی دوایی (الیوم الآخر) بە دوور دادەنێن و گوایە خودا لەوە دەستەوسانە،لەکاتێکدا خودا توانای بەسەر هەموو شتێك لەگەردووندا هەیەو هیچ شتێکی لەلا گران وئاسەنگ نی یە،چونکە وەك چۆن مرۆڤی لەسەرەتادا خەلق کردووە تواناشی لەسەر زیندووکردنەوەی بۆ ڕۆژی قیامەت هەیە، وەڵامێکی قورئان بۆ ئەو جۆرە کەسانە لەوەسف کردنی قودرەتی خودادا ئەوەیە:﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾.

ئیبراهیمیش -سڵاوی لێ بێت- هەرچەندە باوەڕی هەبوو بەتوانای خودا لەسەر زیندوکردنەوەی مردوان لە ڕۆژی دوایی‌دا، بەڵام داوای نموونەیەکی بەرچاو و هەست پێکراوی لەو بارەیەوە لە خودای پەروەردگار کرد تاکو ئارامی و دڵنیایی لە دەروونی‌دا بچەسپێن، خوداش ئەو داوایەی بۆ بەجێ هێناو توانای خۆی پیشان دا، هەروەك قورئانیش بەم جۆرە بۆمان دەگێڕێتەوە: ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ

وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾البقرة/ ٢٦٠..

واتە: (هەروەها -ئیبراهیم- داواکاری یەکی لەخودا هەبوو و گوتی: (خودایە پیشانم بدە تا بزانم چۆن مردوان زیندوو دەکەیتەوە)؟ خوداش لیٚ ی پرسی: ئەی مەگەر باوەڕت بەوە نەهێناوە؟ ئەویش گوتی: بەڵی چۆن باوەڕم نەهێناوە بەڵام هەر بۆ ئەوەی دڵنیاو ئارام بم). خوداش بۆ وەڵامی داواکەی پێی فەرموو: (دە کەوا بوو چوار باڵندە بێنەو پارچە پارچەیان بکەو هەر بەشێك لەو پارچانەش بخەرە سەر چیایەك، ئینجا بانگیان کەرەوە دەبینیت بەخێرایی دێنەوە بۆ لات و زیندوو بوونەتەوە. بەم ڕەنگەش بزانە خودا باڵادەست ودانایە).

هەر کەسێك بەوردی سەرنج لەم فەرمایشتەی خودا بدات بۆی دەردەکەوێت کەوا (ئیبراهیم) هیچ گومانێکی لە (باوەڕ بە قودرەتی خودا و زیندووکردنەوەی مردوان بۆ ڕۆژی دوایی) نی یە، بەڵکو داوای وێنەیەکی لە وێنەکانی دڵنیایی (یەقین) کردووەو لە خودای پەروەردگاری خۆی پرسیوە (چۆن مردوان زیندوو دەکەیتەوە: کیف تحیي الموتی) نەك (ئایا مردوان زیندوو دەکەیتەوە: هل تحیي الموتی؟)، پرسیارەکەشی وەك پرسیاری ئەو مرۆڤەیە کە دەیەوێت دڵارام ودامەزراو بێت وبوارێك بۆ گومان وڕاڕایی لە نێو دەروونی دا نەهێڵێتەوە. هەروەها پرسیاری عەقڵێکەو دەیەوێت خواست وحەزی خۆی لە داواکاریی ڕوون بوونەوەی ئاشکرای حەقیقەت دا تێر بکات، هەر بۆیەش لەم داواکاری یەدا بە ناوی عەقڵەوە پرسیار لە پەروەردگاری دەکات و هەر بە ناوی عەقڵیشەوە وەڵامەکەی چنگ دەکەوێت. ئەی داخۆ وەڵامی پەروەردگاری چی بێت؟ بێگومان خوداش لە وەڵام دا فەرمانی پیٚکردووەو پیٚ ی فەرمووە: (چوار باڵندەی زیندوو بێنەو لای خۆت ڕایانگرە تا بە تەواوی دەیانناسیت ولە باڵندەی تریان جیادەکەیەوە، پاشان دوای سەر بڕینیان پارچە پارچەیان بکەو هەر بەشێکیشیان لەسەر چیایەکی نزیك لەیەك دابنیٚ، ئینجا بانگیان کەرەوە دەبینیت زۆر بەپەلەوخێرایی بە فڕین وبە پیادە دێنەوە بۆ لات وژیانیان وەك جاری پێشوو بە بەرداکراوەتەوە، ئەوەش بزانە خودا هیچ شتێکی لە دەست دەرناچێت وبە تواناو باڵا دەستە، هەروەك خاوەن حیکمەتێکی بیٚوێنەشە لە هەموو کاروبارێکدا).

(ئیمام ڕازی) وتەیەکی بەپێزی لەسەر ئەم بەسەر هاتە هەیەو تیایدا گوتوویە: (مەبەست لەوە دیاری کردنی نموونەیەکی هەست پێکراوە لە گەڕاندنەوەی گیانەکان دا بۆ جەستەکان بەڕێگایەکی ئاسان). کە لای خودا زۆر ئاسانە..

# بەندی سێ یەم

## (( چیرۆکـی ئیسماعیل ))

(کۆچ کردنی "ئیبراهیم" بۆ میسر - خودا "ئیسماعیل" بە (ئیبراهیم) دەبەخشێت - کۆچ کردنی (ئیبراهیم) بە "ئیسماعیل"ی کوڕیەوە بۆ دۆڵی (مەککە) - هەڵقوڵانی ئاوی (زمزم) - قوربانیدان بە"ئیسماعیل" - "ئیبراهیم" و هاوسەرەکەی "ئیسماعیل" - "ئیبراهیم" و "ئیسماعیل" – کەعبە بنیات دەنێن )

## پێغەمبەرێتیی " ئیسماعیل "

خودای مەزن بە دەقێکی قورئـانی ئامـاژەی بـۆ پێغەمبـەرێتیی ئیـسماعیل–کـردووەو فەرموویـە: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴾ مـــریم/٥٤.. "ئیسماعیل" لەنێو ئەو هۆزە عەرەبی یانەی دا کە تیایاندا ژیـاوە بانگـەوازی خـەڵکی ی بـۆ خواپەرستی کردووە. لە بەسەرهاتی لە دایك بوون و ژیانی " ئیسماعیل "دا هەنـدێك ڕووداوی گرنگ و سەرنج ڕاکێش هەبووەو لەم برگانەی "بەنـدی سـێ یـەم"ی ئـەم بەشـەی کتێبەکـەدا باسیان دەکەین.

## کۆچ کردنی "ئیبراهیم" بۆ "میسر"

(ئیبراهیم)– ماوەیەك لە شارۆچکەی (حەڕران)دا مایەوەو لەو ماوەیـەدا (سـارە)ی کـچی مامی خواست. بەڵام لـەو شارۆچـکەیە زۆر وەڕس بـوو لەبـەر ئـەوەی دانیـشتوانەکەی بـەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون وباوەڕیان پیێ نەهێنا تەنها (لـوط) و چـەند کەسـێکی کـەم نـەبێت، هەبۆیەش بڕیاری دا ئەو شارە بەجێبێڵێت، هەروەك قورئـانیش ئامـاژەی بـۆ ئەمـە کـردووە: ﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٞۘ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾العنکبــوت/٢٦.. واتـە: (لەو شارۆچـکەیەدا تـەنها-لـوط- و چـەند کەسـێکی کـەم باوەڕیـان پـێ هێنـاو بـەدرۆیان نەخستەوە. ئەویش (واتە - ئیبراهیم) بڕیاری جێ هێشتنیانی داو گوتی: ئەوا لەبـەرخودا مـن ئەم شارۆچکەیە لە ـ عیراق ـ جێ دێڵم وکۆچ دەکەم بۆ شوێنێکی دیکە کە خودا فەرمانی کۆچ بۆ کردنی پیێ داوم (واتە بۆ شام). هەر خودای پەروەردگاریشمە کە بە تواناو دانایە).

هۆی ئەم کۆچەش ئەو دوژمنایەتی یە سەخت وتوندو تیژەی بت پەرستان بوو بەرامبەر (ئیبراهیم) و ئەو چەند کەسە ئیماندارەی لەگەڵی دابوون چونکە بت پەرستەکان بەدەم بانگەوازەکەی (ئیبراهیم)ـەوە نەدەچوون و ئیبراهیمیش خۆی لێ بەریو بە دوور گرتن و ڕووی لێوەرگێران.

خودا ستایشی ئەم هەڵوێستەی (ئیبراهیم)ی بەرامبەر گەلەکەی کردووەو لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردووەو هانی باوەڕدارانیشی لەسەرچاولێکردن وشوێن پێ هەڵگرتنی داوەو فەرموویە: ﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴾الممتحنة/٤.. (لە هەڵوێست و ئاکاری (ئیبراهیم)ـ و ئەو ئیماندارانەی لەگەڵی دابوون سەر مەشق و پێشەنگییەکی چاك بۆ ئێوە هەیە لە خۆبەری کردن و بە خۆ دوورگرتنتان دا لە گومڕایان کە کاتێك بە گەلەکەی خۆیان گوت: (ئێمە بێ تاوان وبەریین لە خۆتان و ئەو بتانەی دەیانپەرستن، هەروەها نکوولی لەو کارەتان دەکەین و خۆمانتان لێدادەبڕین. بەمەش دوژمنایەتیو ڕق وکینەی هەمیشەیی کەوتۆتە نێوانمانەوەو هەتا هەتایە ناحەزتانین مەگەر تا ئەو کاتە نەبێت کە پەشیمان ببنەوەو باوەڕبە خودای تاك وتەنیا بێنن).

ئیدی " ئیبراهیم "و ئەو ئیماندارانەی لەگەڵی دا بوون بەرەو خاکی (شام) کەوتنە ڕێ کە بە خاکی (کنعان) ناو دەبراو ماوەیەکی کەم تیای دا مانەوە، چونکە تەنگانەیەکی سەختی وەها ڕووی لەو ناوچەیە کرد کە هەرەشەی برسێتی ی لە خەڵکەکە دەکرد، زۆربەی دانیشتوانەکەشی دوور کەوتنەوەو ڕوویان لە شوێنانی تر کرد بۆ پەیدا کردنی بژێوی خۆیان یان بۆ دۆزینەوەی گژوگیاو شوێنی لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان. لەگەڵ ئەو خەڵکەش دا (ئیبراهیم) لەوێ دەرچوو و بەرەو وڵاتی (میسر) ڕۆیشت وماوەیەك تیای دا ژیا.

## خودا " ئیسماعیل " بە " ئیبراهیم " دەبەخشێت

(ئیبراهیم) لە"میسر"ـەوە گەڕایەوە بۆ" فەلەستین"و ژنەکەشی لەگەڵ دابوو، هەروەها کەنیزە(جاریـة)یەکی ژنەکەشیان لەگەڵ بوو ناوی (هاجەر) بوو. ئیبراهیم لە ناخەوە هیوای ئەوەی دەخواست کە کوڕێکی هەبێت، هەر بۆیەش لە خودا پاڕایەوە کوڕێکی صالح و چاکی پێببەخشێت: ﴿ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾الصافات/١٠٠.. واتە: (خودایە بەسۆزو بەزەیی

خۆت کوڕێکم لـەکوڕە چـاك و گوێڕایـەڵ و صـاڵحەکان پـێ ببەخـشە). وادیـاربوو (سـارە)ی هاوسەریشی هەستی بەو خەیاڵ و ئەندێشەیەی "ئیبراهیم"ی مێردی کردبوو، بۆیە پێ ی گوت: (خودا منالّی بەمن نەداوەو لەبەر ئەمـە وای بەچـاك دەبیـنم -هاجـەر-ی کـەنیزەم بخوازێـت، بەشکم خودا کوڕێکت لەو ژنە پێ ببەخشێت، بێگومـان (سـارە)ی هاوسـەری، ژنێکـی بەسـالاّ چوو و بەتەمەن و نەزۆکیش بوو وبەتەمای ئەوە نەبوو کوڕی ببێت. (ئیبراهیم)یش، هاجـەر-ی خواست و بووە هاوسەری. لەم هاوسەرەش (ئیسماعیل)یان بوو کەلە (سفر التكوين)داٍ وەسـفی بەم جۆرە کراوە: (وأما اسماعيل فقد سمعت قولك فيه وهاءنذا اباركه وانميه واكثره جداً جداً ويلد اثني عشر رئيساً واجعله أمة عظيمة)[1].. واتە: (سـەبارەت بـە -ئیـسماعیل- ئـەوا نزاکـەتم پەسند کردو گوێ بیستی داوا کاریەکەت بووم و وا پیرۆزو بەپیت وبەرەکەتی دەکـەم وگەشـەی پێدەکەم و زۆر زۆر زیادی دەکەم و دوازدە سەرۆکیشی لێ دەبێتەوەو دەیکەم بـە نەتەوەیـەکی گەورە). ئەمە مزگێنیەیە کە سەبارەت بە نەتەوە(امة)کەی (محمد)یـشﷺ چـونکە (محمـد) لـە وەچەی (اسماعيل)ـەو عەرەبی (حیجاز)یـش هـەر لـەو وەچـەیەن هـەر چـەندە ئـەو بەڵێنـەی (دەربارەی بوون بە نەتەوەیەکی گەورە) لە نەوەی (اسماعیل)دا تەنها لەسەر دەستی (محمدﷺ) و نەتەوەکەی بەدی هات.

## کۆچکردنی "ئیبراهیم" بە "ئیسماعیل"ی کوڕیەوە بۆ دۆڵی "مەککە"

دوای ئەوەی خودا کوڕێکی وەك (ئیسماعیل) بـە (ابـراهیم) دەبەخـشێت لـە (هاجـەر)ی هاوسەری دووەمی، ئیتر ئەم هاوسەرە (واتە هاجەر) دەست دەکات بە خۆ هەڵنان و شانازی بەم کوڕەوە، بەمەش پەژارەو دەمارگیری لە دەروونی (سارە)ی هاوسەری یەکەمی دا دەبزوێنێـت و (سارە) داوا لە (ئیـبراهیم) دەکـات کـە ئـەو دوانـە (هاجـەر- و-ئیـسماعیل) لەبـەر چـاوی دوورخاتەوە چونکە وای لێ هاتووە ناتوانێت ژیان لەگەڵ (هاجەر)دا بەسەر بەرێت. ئیبراهیمیش بەفەرمانێکی جێ ی خواست و ئیرادەی خودا ئەو داوایـەی (سـارە)ی خێزانـی بـەجێ دێنێـت. ئەویش لە کاتێکدا کە خودا ئەو فەرمانە بە سـرووش بـۆ-ئیـبراهیم- دەنێرێـت و کـە دەبێـت (هاجەر) و (ئیسماعیل) لەگەڵ خۆی دا ببـات بـۆ (مەککـە)، لـەو کاتـەش دا (ئیـسماعیل) منداڵێکی شیرەخۆرە بوو. (ئیبراهیم) ئەو منداڵەو دایکەکەی بۆ سـەفەر سـازداو لەگـەڵیان دا کەوتە ڕێو تەنها خواست وئیرادەی خوداش ڕێگەی پیشان دەدا. هەر ڕێگایان دەبڕی‌و هێنـدە ڕۆشتن. تاکو خودا فەرمانی پێدان بە ڕاوەستان لە خاکێکی چۆڵی دوور لە بیناو ئاوەدانی، واتە لەو جێگەیەی کە دەبوو لە ئایندەیەکی نزیك دا ماڵی خودا (بيت الحرام)ی تیادا بنیاد بنرێت.

---

(١) الفصل (١٧). آية (٢٠).

(ئيبراهيم) منداڵەکەو (هاجەر)ی گەیاندە ئەو شوێنە چۆڵ و وشك وبرینگەی کە نەکەسی لێ بوو نەئاو و دارو درەخت و گژوگیا. پاشان بەجێی هێشتن وگەڕایەوە. لەو کاتەدا (هاجەر) بەپەلەو بەهەڵەداوان دوای کەوت وپێ ی گوت: (ئەرێ بۆ کوێ دەچیت؟ بۆ کێمان جێ دێڵیت لەم دۆڵەچۆڵ و وشك وبرینگەدا ؟).. ئەم پرسیارانەی چەندەها جار لێ دووبارەو چەندبارە دەکردەوەو داوای سۆزو بەزەیی لێ کردو ئەویش لەهەنگاونانی خۆی بەردەوام بوو. ئینجا (هاجەر) لێ ی پرسی: (ئایا خودا فەرمانی بەمە پێ کردوویت)؟ (ئیبراهیم) گوتی (بەڵێ)، ئیتر (هاجەر) هێمن بووەوە وگوتی: (کەوابوو خودا فەرامۆشمان ناکات)، لەگەڵ ئەم وتەیەدا گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە (ئیبراهیم) خۆی و کوڕەکەی تیادا دانابوو.

(ئیبراهیم) خۆیشی زۆر خەمبار بوو وبەدەم ڕێوە خەریك بوو دڵی پارەپارە ببێت لەبەر دوورکەوتنەوەی لە هاوسەریو کوڕەکەیو لە خەفەت وپەژارەدا. خواستی خوداش لەسەروو خواستی ئیبراهیمەوە بووە. ئەویش خۆی دابوە دەست خوداو بەدەم گەڕانەوەوە لێی دەپاڕایەوەو بەم وشانەی کە قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە دووعاو نزای لەلای خودا دەکرد:

﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ابراهيم/٣٧-٣٨..

ماناو شیکاری ئایەتەکان: (خودایە ئەوا من هەندێك لەکەس و نەوەم لەدۆڵی (مەککە)دا نیشتەجێ کردووە کە هیچ سەوزایی و کشتوکاڵێکی لێ نی یەو لەلای ئەو ماڵەتەوە کە لەمەولا بۆت بنیاد دەنێم و کەڕێزو بەهای گەورەی دەبێت و کەس ناتوانێت بەچاوی سووك وبێحورمەتی بۆی بڕوانێت خودایە من تەنها بۆیە ئەوانم لێرەدا نیشتەجێ کرد تاکو نوێژبکەن لەلای ئەو ماڵەتەوەو ئەرکەکانی پەرستش تەنیا بۆ تۆی تاك وتەنها جێ بەجێ بکەن. جا خودایە دڵ ودەروونی هەندێك کەسیان بەلادابەرەو باسۆزو ڕەحمیان بۆیان هەبێت وڕۆزییشیان لەم شوێنەدوورە دەست وچۆڵەوانی یەدا بە هەندێك جۆری میوەو بەروبووم پێ ببەخشە تاکو لەسەر نیعمەتەکانت سوپاسگوزارو شوکرانە بژێرت بن... خودایە تۆ لە نهێنی و ئاشکرامان ئاگاداریت و دەزانیت چەندە خەم وپەژارەم بۆ کەس وکارو نەوەکەم لەدڵ داحەشارداوە، هیچ شتێکیشت لێ پەنهان وشارراوە نی یە گەر هەر چەند بچووکیش بن وتەنانەت لەزەوی یان ئاسمانیش دابن).

# هەڵقوڵانی ئاوی " زمـــزم "

"هاجەر" خۆی دایە بەر فەرمانی خوداو ئارامی گـرت. بـەردەوام لـەو خـۆراك وئاوەشـی دەخوارد کە – ئیبراهیم – بۆی بەجێ هێشتبوو تا تەواو بوو و هیچی پێ نەماو تینووی ببوو، کوڕەکەشی تینوو بوو، ئەویش هەر بۆی دەڕوانی کاتێك کوڕەکەی تینوێتی زۆری بۆ هێنا بوو و ڕادەچڵەکی لەتینوان دا. بێگومان ئەم دیمەنە دڵتەزێنەی زۆر لەلا ناخۆش بوو وچی دی خۆی بۆ ڕانەگیراو وای لێ هات سەرسام وبێ چارە بێـت وبـەم لاولادا بـڕوات وبـسوڕێتەوە بـێ ئـەوەی بزانێت بۆ کوێ دەچێت، هەر هەنگاوی دەناو ڕایدەکردو خەریك بوو لە هـۆش خـۆی بـچێت و ببوورێتەوە. لەو ساتانەدا (هاجەر)چووە سەر شوێنێکی بەرز‌ـ کە بە(صفا)ناسراوە- ودەیڕوانـی بۆ ئەو شوێنە تاکو ئاو ببینێت، بەڵام هیچ شتێکی نەدی، ئینجا هاتە خوارەوەو وەك مرۆڤێکی شپرزەو ماندوو هەوڵ وتەقەللایەکی زۆری دا تاکو چووە سەر شوێنێکی دیکەی بـەرز، کـە بـە (مەروە) ناو دەبرێت ولەوێش زۆری ڕوانی و ئاوی دەست نەکەوت، دوایی گەڕایەوە بۆ (صفا)ش هەر ئاوی بەدی نەکردەوە... ئەم هات وچۆیەی نێوان (صفا و مەروە) حەوت جاری خایانـد[١]. پاشان لەدوا جاردا کە ڕووی کردبووەوە (مەروە) گوێی لە دەنگێك بوو وئاوڕی بۆ دایەوە دیتی ئەوا فریشتەیەك لەفریشتەکان (ملائکـە) لەمـەوقیعی (زمـزم) دایـەو بـەباڵی خـۆی زەوی ی هەڵکەند تا ئاو دەرکەوت. [٢]

(هاجەر) هەر کە ئەم دیمەنە گرنگەی بینی زۆر خۆشحاڵ وشادمان بوو وخێرا خێرا مـشتی لە ئاو پڕ دەکردو دەیکرد بەدەمی کوڕەکەیەوەو خۆیـشی لێ تێرکـرد. کاتێـك ئـاو هەڵـدەقوڵا مەلەکانیش ڕوویان تێکرد.. کۆمەڵە کەسێکیش لە هـۆزی (جورهـەم) لـەنزیك ئـەو شـوێنەوە دەڕۆیشتن و دیتیان ئەوا (باڵندە بەسەریا و لەو دەوروبەرەدا دەسوڕێنەوە)و لەیـەکتریان پرسـی: (ئەو باڵندانە بەسەر ئاوێك دا دەسووڕێنەوە، ئەرێ زانیوتانە ئاو لەم دۆڵەدا هەبێت)؟ گوتیـان: (نەخێر).. ئینجا یەکێکیان نارد بۆ زانینی هەواڵەکەو گەڕایەوە بۆ لایان ومژدەی بوونی ئـاوی پێدان. ئەوانیش چوون بۆ لای (هاجەر)و پێ یـان گـوت: (گـەر بتـەوێت لەگـەڵت دا دەبـین و بەخۆشی لەگەڵتا دەژین و ئاوەکەش با ئاوی خۆت بێت). ئەویش بەخێرهاتنی لێ کردن و ئیدی لەتەنیـشتیەوە جـێ نـشین بـوون هـەتا (ئیـسماعیل) گـەورە بـوو و بـالغ بـوو و ئـافرەتێکی (جورهەمی)ی لێ خواستن و هەر لەوانیشەوە زمانی(عەرەبی) فێربوو.

---

(١)پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویە: (لەبەر ئەمەش خەلکی لەـ حەج-دا هات وچۆی لەنێوان دا دەکەن).

(٢) گوتراویشە:(ئیسماعیل بە هەردوو پێ ی خۆی یان بەهەردوو دەستی زەویی دەپشکنی و لەو کاتانەدا ئاو لە ژێر هەردوو پێی یان دەستی یەوە هەڵقوڵاوە).

# قوربانی دان بە " ئیسماعیل "

(ئیبراهیم) ئەگەر چی "ئیسماعیل"ی لە - مەککە- جێ هێشتبوو، بەڵام لەبیری نەچوو بوو و پشت گوێشی نەخستبوو، بەڵکو جاروبار سەردانی دەکردن و دەگەڕایەوە. (ئیبراهیم) لە یەکێك لەو سەردانانەدا خەونێك دەبینێت کە تیایدا خودا فەرمانی پێدەکات (ئیسماعیل)ی کوڕی سەرببڕێت. خەو بینین (رؤیا)ی پێغەمبەرانیش ڕاستە چونکە وەك (سرووش)و لە پلەو پایەی (ئەمرێك) دایە کەلەخوداوە بۆی بێت. لەبەر ئەمە (ئیبراهیم) بڕیاری دا سوور بێت لەسەر ڕاپەڕاندنی فەرمانی خودا، هیچ هۆیەکیش لەو بڕیارەی پاشگەز نەدەکردەوە، وەك ئەو هۆیەی کە (ئیسماعیل) تاقە کوڕیەتی، یان وەك ئەو هۆیەی کەخۆی کەوتۆتە تەمەنی پیری یەوە، هیچ شتێك لەمانە پاشگەزی نەدەکردەوە.

قورئانیش بەسەرهاتەکەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە: ﴿(٩٨) وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ (٩٩) رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ (١٠٠) فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ (١٠١) فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَىٰ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ (١٠٢) فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ (١٠٣) وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ (١٠٤) قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٠٥) إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (١٠٦) وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (١٠٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ (١٠٨) سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ (١٠٩) كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١١٠) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (١١١) وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾الصافات/٩٩-١١٢..

(واتاو شیکاری ئایەتەکان): لەم ئایەتانەدا خودا لە بەشێکی چیرۆکی "ئیبراهیم" ئەوە باس دەکات کاتێك خاکی گەلەکەی جێ دێڵێت داوا لەپەروەردگاری دەکات کوڕێکی (صالح)ی پێبدات، خوداش داواکاری یەکەی پەسند دەکات و مزگێنی ی کوڕێکی هێمن (غلام حلیم)[1]ی پێ دەدات کە (اسماعیل)ی یەکەم کوڕیەتی. جاکە ئەم کوڕەش پێ دەگات وگەشەدەکات ودەچێتە ئەو تەمەنەوەی کە دەتوانێت خۆی هەوڵ بدات و توانای کارکردنی

(١) (حلیم): لە وشەی (حلم)ـەوەیە، (حیلم) دژی بێ عەقلی و جەهل وگەمژەیی یە.. هەروەها (حیلم) مانای بەئارامی و شکۆمەندیو سەلاری دەگەیەنێت لەگەڵ وجودی هێزو تواناداا.

هەبێت، (ئیبراهیم) لە نووستنی دا خەون بەوەوە دەبینێت ئەوا خودا فەرمانی پێدەکات کوڕەکەی خۆی (واتە: ئیسماعیل) سەربڕێت هەر چەندە تەنها ئەو کوڕەتاقانەیەشی هەیە، (ئیبراهیم)یش مەسەلەکە دەخاتە بەرچاوی (ئیسماعیل) تاکو ئیمانی تاقی بکاتەوەو بەم شێوەش لەبەر دڵی دا کارەکە لەبارترو ئاسان تریش بێت لەوەی کە بەزۆر وستەم سەری ببڕێت..

(ئیسماعیل)-سڵاوی لێ بێت- لە وەڵامی باوکی دا دەڵێت:(بابەگیان ئەو فەرمانەی خوداپێ ی داویت ئەنجامی بدەو بەپشتیوانی خوداو -ان شاءالله- دەمبینیت یەکێکم لەخۆڕاگران وقایل بوان بەویست وئیرادەی خودا.. ئیدی کەهەردووکیان خۆیان دەدەنە دەست فەرمان وبڕیاری خوداو بە تەمای ڕاپەڕاندنی ئەمری خودا دەبن، (ئیبراهیم) کوڕەکەی بە ڕوودا دەخات (واتە دەم وچاوی دەخاتە سەر زەوی و بەسك دا دەیخات) تاکو لەپشتەوە سەری ببڕێت و ڕوخساری کوڕەکەی لەحاڵەتی سەربڕینی دا نەبینێت، ئینجا چەقۆکە بەملی دا دێنێت، بەڵام نایبڕێت (واتە: چەقۆکە نایبڕێت)...

لەو ساتە حەساسە مێژوویی یەدا خودای پەروەردگار بانگی ئیبراهیم دەکات وپێ ی دەفەرموێت: (ئەی-ئیبراهیم- دەست هەڵگرە لەسەر بڕینی کوڕەکەت چونکە مەبەستی تاقیکردنەوەکەمان دەست کەوت ولێمان ڕادییت، کەگوێڕایەڵیت و فەرمانی خودای خۆت بە چاکی ڕادەپەڕێنیت، ئەمە ئەو تاقیکردنەوە گەورەو دیارو ڕۆشنە بوو کە باوەڕوئیمانی تۆمان پێ هەڵسەنگاند وتۆش تیای دا سەرکەوتوو بوویت، جاڵە بریتی کوڕەکەت ئەم بەرانەی بۆمان داناویت سەربڕە وبیکە بە فیدای کوڕەکەت).

## سەربڕراو کێ دەبوو؟

بەگوێرەی دەقی قورئان سەربڕراوەکە (ئیسماعیل) دەبوو، چونکە بەسەرهاتی سەربڕراوەکەی باس کردووە و، پاشان خودا مژدەی کوڕێکی تری بە -ئیبراهیم- بەخشیوە کەناوی (ئیسحاق)ـە: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ هاتنی مژدەی کوڕێکی تر (اسحاق) دوای دیاری کردنی بەسەرهاتی سەربڕینەکە بەئاشکراو ڕاشکاوی یەکە (ئیسحاق) کوڕێکی دیکەیەو جودایە لەو کوڕەی پێشوو کە (ئیبراهیم) بەسەربڕینی تاقی کراوەتەوە. بەڵام جوولەکەکان ئیددیعای ئەوە دەکەن گوایە سەربڕاوەکە (ئیسحاق) بووە چونکە لەلای ئەوان (سفر التكوين) -ئیسحاق-بەسەر بڕاوەکە دادەنێت و لەو بەسەر هاتەدا سەرەتا باسی پێناساندنی دەکات و فەرمایشتێکی خودا دیاری دەکات گوایە بە (ئیبراهیم)ی فەرموبێت

(کوڕە تاقانەکەی خۆت کە خۆشت دەوێت و (ئیسحاقە) لەگەڵ خۆت دا ببە بۆ خاکی - مۆریە-).[1] ئیمام (ابن کثیر) -ڕەحمەتی خودای لێ بێت- لەوەڵامی ئەو ئیددیعایەی جوولەکەکان دا گوتوویەتی: (لەو ئیددیعایەیان دا بێژە(لفظ)ی -ئیسحاق- بەنابەجێ دانراوە، چونکە -ئیسحاق- کوڕی تاقانەو کوڕی یەکەم نەبووە، بەڵکو -ئیسماعیل- بووە، بەڵام جوولەکەکان ئەوەیان بەپێچەوانەوە باس کردووە لە بەر ئیرەیی (حەسوودی) بردنیان بە -عەرەب-، لەبەرئەوەی -ئیسماعیل- باوکی ئەو عەرەبانەیە، کە لە(حیجاز)دا نیشتەجێ بوون ویەکێك لەوانیش(محمد-ی پێغەمبەری خودایە ﷺ)، (ئیسحاق)یش باوکی -یەعقوبە- واتە(ئیسرائیل) کەجوولەکەکان لەڕەچەڵەکی ئەون ویستوویانە ئەو پلەو پایەیە بۆخۆیان بەکێشکەن، بەم ڕەنگەش دەسکاریی ی[2] فەرمایشتی خودایان کردووەو بۆیان زیاد کردووە)[3].

## ئیبراهیم و هاوسەرەکەی ئیسماعیل

ڕۆژێکیان (ئیبراهیم) لەسەردانێك لەو سەردانانەی دا کەدەچوو بۆ - مەککە- چوو بۆ ماڵی (ئیسماعیل) و بەڵام ئەو لەماڵەوە نەبوو، بەڵکو تەنها هاوسەرەکەی بینی و ئەویش نەیدەزانی ئەم میوانە باوکی مێردەکەیەتی(خەزووریەتی)، (ئیبراهیم) هەواڵی -ئیسماعیل-ی لێ پرسی و ئەو ژنەش لە وەڵام دا پێ ی ڕاگەیاند مێردەکەی چووە بۆ ڕاو، پاشان دەربارەی حاڵ و بارودۆخی گوزەرانیان لێ ی پرسی، ئەویش گوتی (ئێمە لەبارگرانی و ناڕەحەتی داین) واتە سکاڵای ناخۆشی ی گوزەرانیانی لەلا کرد. ئینجا -ئیبراهیم- لێ ی پرسی: (ئایا میوان ڕادەگریت؟ ئایا خواردن وخواردنەوەت لەلا هەیە)، ئەویش گوتی: (نەخێر هیچم نی یە و کەسیشم لەمیوان لەلا نی یە).. واتە میوانم ناوێت. (ئیبراهیم) ئەم ئافرەتەی بە کەیبانوویەکی چاك پەسند نەکرد چونکە ئەوەی لێ بینی کە ناڕازی یە بەو بەشەی خودا پێ ی داوەو وەڕس بووە لەژیان لەگەڵ مێردەکەی دا. جگە لەو چاوچنۆکی یەش کەوای لێ کرد ڕێز لەو هاتن و میوانداریێتی یەی نەگرێت. هەربۆیەش دواجار "ئیبراهیم" پێ ی گوت: (ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سڵاوی منی پێ بگەیەنەو پێیشی بڵێ با شوێنی بەر دەرگاکەی بگۆڕێت).. (ئیبراهیم) ڕۆیشت و (ئیسماعیل) بەجیا هاتەوەو وایشی دەبینی کە لەماوەی دەرچوونی لەماڵ دا شتێك

---

(١) الفصل (٢٢) آیة (٢).

(٢) قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتیدا باسی ئەو نەریتە ناهەموارەی جوولەکەکانی کردووە کە زوربەی کتێبی خوداو فەرمایشتەکانیان دەسکاری کردووە. واتە (تەورات) دەسکاری کراوە.

(٣) البدایة والنهایة. ج١. ص ٥٩.

ڕووی دابێت، بۆیە لەهاوسەرەکەی پرسی: ئەرێ ئەمڕۆ کەسێك نەهات بۆ لات)؟ ئەویش لە وەڵام دا گوتی: (بەڵێ پیاوێکی پیر هات و ئاواو ئاوابوو و پرسیاری دەربارەی تۆ لێ کردم ومنیش پێم ڕاگەیاند کە لەماڵەوە نییت و دەرچوویوویت).. هەروەها لەهاوسەرەکەی پرسی: (ئەی باشە هیچ ڕاسپاردەیەکی پێ نەداویت)؟ گوتی: (بەڵێ زۆر سلاوی لێ دەکردیت وداوای لێ کردم پێیشت بڵێم کە پێش دەرگاکە بگۆڕیت).. ئینجا (ئیسماعیل) گوتی: (دە کەوا بوو ئەوە باوکم بووە و فەرمانیشی پێ کردووم لێت جیاببمەوەو ئیدی تۆش بڕۆ بۆ ماڵی باوکت).. بەم ڕەنگە تەلاقی داو ژنێکی تری هێنا. دوای ماوەیەکی تر (ئیبراهیم) هاتەوە بۆ ماڵی (ئیسماعیل)ی کوڕیو ئەو جارەش لەماڵی خۆی دا نەی بینی، بەڵام هاوسەرە تازەکەی بینی کە بەگەرمی پێشوازی لێ کردو زۆر بەخێرهاتنی کرد، (ئیبراهیم) لێ ی پرسی (میوان ڕادەگریت)؟ گوتی (بەڵێ)و بەمیوانی پەسندکردو ڕێزی لەهاتن ومیوانداریێتی ی گرت، ئینجا پرسیاری دەربارەی بارودۆخی ژیان و گوزەرانیان لێ کرد، ئەویش لەوەڵام دا گوتی: (ئێمە حاڵمان زۆر باشە ولەفەرەحیو رزق و ڕۆزیی فراوان دا دەژین وسوپاس بۆ خودا). سوپاس وستایشی زۆری خوداشی لەلا کرد (ئیبراهیم)یش پێ ی گوت: (ئەگەر مێردەکەت هاتەوە زۆر سلاوی منی پێ بگەیەنە و پێیشی بلێ با شوێنی پێش دەرگاکەی جێگیرکاو بیهێڵێتەوە).. ئینجا ماڵئاوایی لێکردو ڕۆیشت. ئێوارەی ئەو ڕۆژە (ئیسماعیل) گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو هاوسەرەکەی هەواڵی هاتنی پیاوێکی بە سالاچووی پێ گەیاندو وەسفی شێوەو ڕوخساریی بۆ کردو ڕاسپاردەکەشی پێ گوت، (ئیسماعیل)یش پێ ی وت: (ئەوە باوکم بووەو فەرمانی پێکردووم تۆ لەلای خۆم بهێڵمەوەو هەرگیز لێت جیانەبمەوە). ئیتر بە درێژایی تەمەنی ژیانی لەگەڵ دا بردە سەرو بووە دایکی منداڵەکانی.

## "ئیبراهیم" و "ئیسماعیل" -کەعبە- بنیات دەنێن

(ئیبراهیم) ماوەیەکی دوورو درێژ (ئیسماعیل)ی نەدیبوو، دوای ئەم ماوە زۆرە بۆ کارێکی پیرۆزو گەورە هاتەوە بۆ لای. ئەم هاتنەوەیەشی بەفەرمانێکی خودای مەزن بوو بۆ بنیاد نانی " کەعبە " لە -مەککە- تاکو ببێتە یەکەمین ماڵ بۆ خواپەرستی.

(ئیبراهیم) لەو ناوچەیەدا بە دوای -ئیسماعیل-دا دەگەڕا تا بینی یەوە لە نزیك ئاوی (زمزم)ەوە کە خەریکی تاشینی تیرێك بوو، بەرەو ڕووی ڕۆشت و (ئیسماعیل)ی کوڕیشی بەپەلە ڕایکرد بۆ بەرەو پیرەوەچوونی وتوند باوەشیان بەیەك دا کردو هەریەکەشیان بلێسەی گڕی خۆشەویستی و خۆشحاڵی ی گەورەیان بۆ یەکتر دەربڕی.

ئیبراهیم دوای ئەوەی بەدیداری کوڕەکەی گەیشت و جێ وڕێ ی بۆ خۆش بوو، هەواڵی ئەوەی پێ گەیاند کەوا خودا فەرمانی پێ کردووە خانوویەك بۆ عیبادەت و پەرستنی خودا لەو جێگەیەدا دروست بکات، ئاماژەی بۆ جێگەکەشی کرد کە لەسەر گردێکی بەرزی نزیك خۆی بێت. (ئیسماعیل)یش گوتی: (ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردوویت ئەنجامی دەو منیش لەم کارە پیرۆزو پڕبایەخەدا یارمەتیت دەدەم).

ئینجا (ئیبراهیم) دەستی کرد بەبنیات نانی خانووەکەو-ئیسماعیل-ی کوڕیشی بەردی دەدایە دەست، پاشان (ئیبراهیم) پێ ی گوت: (بەردێکی چاکم بەرێ تابیخەمە سەر گۆشەکەو جێ ی زانیاری و ئاگاداری بێت بۆ خەڵکی. لەو ساتەدا (جیبریل) سرووشی بەردەڕەشەکە (الحجر الاسود)ی پێ ڕادەگەیەنێت، ئەویش هەڵی دەگرێت و لەشوێنی خۆی دا دایدەنێت، لەگەڵ هەر بەشێکی کاری بنیات نانەکەشیان دا دەیانگوت: (خودایە ئەم کارەمان لێ قبووڵ کە بەڕاستی تۆ خۆت بیسەرو زانایت). ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾.

کاتێك چینەکانی خانووەکە بەرز بووبووەوە (ئیبراهیم)ی پیرەمێردی بەساڵاچوو نەیدەتوانی بەردەکە بەرز بکاتەوە، بەڵکو چووە سەر بەردێك کەبە (مەقامی ئیبراهیم)[1] ناو دەبرێت و ئیتر هەر کە لایەکی دیوارەکەی تەواو دەکرد ئەو بەردەی ژێر قاچی دەگواستەوە بۆ تەواو کردنی لایەکیتر ولەسەری دەوەستا. کە لە بنیاتنانی هەر دیوارێکیش دەبوەوە، دەستی دەکرد بە دروست کردنی دیوارێکی تر..

بەم ڕەنگە تا کاری بنیات نانی هەموو دیوارەکانی (کەعبە) تەواو بوو، ئەو بەردە ڕەشەش لەدێر زەمانەوە بەدیواری پێشەوەی کەعبەوە نووسابوو هەتا سەردەمی جێنشینیی (خەلافەت)ی (عمری کوڕی خطاب) -خودا لێ ی ڕازی بێت- کە دواجار نەختێك لە ماڵەکە بردی یە دواوە تاکو نوێژخوێنان لە کاتی نوێژدا سەرنجیان بەلای دا نەچێت.

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتە ڕۆشنانەدا ئاماژە بۆ کاری بنیات نانی کەعبە دەکات: ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ

(١) ابن الاثیر. ج١. ص ٤٦.

وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾البقرة/١٢٥–١٢٧.

لەم ئایەتانەدا خودا ئەو نیعمەتە دەخاتەوە یادی عەرەبەموسڵمانە کان کەوا ماڵە حورمەت دارەکە (البيت الحرام)ی بۆ کردوونەتە چاوگێك (مثابة)[1] واتە سەرچاوەی جێ نزرگەیەك بۆ خەڵکی کەبە مەبەستی عیبادەت و خواپەرستی سەردانی بکەن. هەروەها خودا کردوویەتی بە شوێنێکی دڵنیایی‌و هێمنی بۆ هەر ترساوێك (خائف)، چونکە هەر کەسێك بچێتە ناو ئەو (حەرەمە)وە هیچ کەسێك ناتوانێت ئازاری بدات. ئەم مەسەلەیەش لەدێر زەمانەوە چەسپاوەو پیرۆزی‌و قودسیەتێکی وەها بەو ماڵەی خودا دراوە کەهیچ کەسێك بۆی نەبووەو بۆی نی یە پەرژینی پیرۆزی یەکەی ببەزێنێت.

دەربارەی مەقامی ئیبراهیمیش واتە شوێنی تیا ڕاوەستانی)، کە خودافەرمانی‌داوە (بکرێتە جێگایەك بۆ نوێژکردن) گوتراوە ئەو بەردەیەکە (ئیبراهیم) لەسەری وەستاوە بۆ بنیات نانی کەعبە، گوتراویشە هەموو ئەو حەرەمەیە کەلە چواردەوری کەعبەدایە.

ئینجا خودا لەو ئایەتانەدا ئاماژە بۆ ڕاسپاردە(وصية)ی خۆی دەکات بۆ (ئیبراهیم) و (ئیسماعیل) دەربارەی پاکژ کردنەوەی ماڵەکە لە پیسیی ئاکارییی وەك بەدکرداری و بەدخوویی، هەروەها لە پیسیی مەعنەویی وەك هاوەڵ بۆ خوادانان (شرك)و بت پەرستی، تاکو بەپاك وخاوێنی بۆ تەواف کارانی(بەچواردەورا سووڕاوانی) و، خەڵوەت نشینانی خوا پەرستی‌و، مل کەچ وکڕنووش بۆ خوا بەرانی بمێنێتەوە.

پاشان قورئان ئاماژە بۆ نزاکەی (ئیبراهیم) دەکات، کە تیای دا لە خودا دەپارێتەوە ئەو شارەی کە ماڵەکەی خودای تیادا دەبێت بکات بە شارێکی هێمن ودانیشتوانەکەشی کە باوەڕیان بە خوداو ڕۆژی دوایی هێناوە بەهرەمەندکات لە ڕزق وڕۆزیی ی بەروبووم و خێروفەڕەکانی زەوی. خوداش نزاکەی گیراکردو هەواڵیشی پێ داکە تەنانەت ڕزقی ئەو کەسانەش دەدات کەلەم دنیایەدا بەڕزقی خودا نازانن ودانی پێدانانێن وسپڵەو پێنەزانن و شوکرانە بژێری ڕزق ونیعمەتەکانی نیین، بەڵام لە ڕۆژی قیامەت دا دەیانخاتە بەر سزای دۆزەخ و دژوارترین چارەسەر.

بەڵێ...خودا نزاکەی -ئیبراهیم-ی گیراکردو داواکاری یەکەی بەجێ گەیاندو شاری

---

(١) (مثابة) زاراوەیەکەو مانای (مەبەست) و (جێ نزرگە)ش هەڵدەگرێت لەگەڵ بۆ گەڕانەوەی دا. بەهۆی (بوون بەچاوگ بۆ خەڵکی)یشەوە کارێکی زانراوەو بڕیار لەسەر ڕاستی و (تصديق)ی سەردانی سەردانکارانی دەدات، جگە لەمەیل و هۆگریی ی ڕۆحیان بۆی‌و حەزکردنی کەسانی تر لەسەردان کردنی و هیوا خواستنیان بە گەیشتن بەو ئەرکی سەرلێ دانە.

(مەککە)ی کردە ولاتێکی ئارام وهێمن و هەر کەسێك ویستبێتی دەسـدرێژی ی بکاتـە سـەر، خودا لەناوی بردووە هەروەها ئەو نزایەشی گیراکرد دەربارەی بەخـشینی ڕزق وڕۆزی یـەکی زۆر بەدانیشتوانەکەیو هەموو جۆرە میوەو بەروبوومێك کە لەگشت ولاتێکەوە بـۆی دەبرێـت. لـە کۆتاییی ئایەتەکان دا خودا باسی ئەوەدەکات چۆن (ئیـبراهیم وئیـسماعیل) ماڵەکـە بنیـات دەنێن وبناغەو دیوارەکانی بەرز دەکەنەوەو، بەدەم ئەو کارانە شەوە لەخودا دەپاڕێنەوە کە ئـەو ئەرکە پیرۆزو گەورەیەیان لێ قبووڵ وپەسندکات.

# بەندی چوارەم

## ((لە خاسیەتە بەرزەکانی ئیبراهیم))

(پلەو پایەی " ئیبراهیم "- لە نزاکانی" ئیبراهیم"-
"ئیبراهیم" موسڵمانی ئایینپەروەر- بەخشندەیی " ئیبراهیم " )

## بەراوردێك لە نێوان تەورات و قورئان دا لەسەر چیرۆکی ئیبراهیم

هەر کەسێك بەراورد بکات لەنێوان ئەو شێوە گێڕانەوەیەی چیرۆکی (ئیبراهیم) لە (العهد القدیم)و ئەو شێوەهاتنەی چیرۆکەکە لە قورئانی پیرۆزدا، جیاوازییەکی گەورەی تێدا بەدی دەکات، بۆ نموونە گەر لە(العهد القدیم)[1]دا هەر تەنها(ژیانی ئیبراهیم وگەشت وڕووداوەکانی و بەڵێنی خوداش بۆ خۆی و نەوەکانی دەربارەی کردنە جێنشینیان لەزەوی دا) باس کرابێت، بەڵام قورئان چەند ئاماژەیەکی کورت بۆ ژیانی شەخصیو تایبەتی ی "ئیبراهیم" دەکات و لەکاتی ئەو ئاماژە کورتانەشی دا چەند لایەنێکی گرنگتری داستانی (ئیبراهیم) دیاری دەکات، وەك باس کردنی پلەوپایەو ڕێزی "ئیبراهیم" لەلای خوداو جیهادکردنی لە ڕێی خواداو شیکردنەوەی بونیادی نەفسی ی و تیشك خستنەسەر ڕەوشتی بەرزیو قوربانی دانی.. هەروەها قورئان دەربارەی ئەو پەیامی خوایە یەك گرتنەی کە (ئیبراهیم) بانگەوازی بۆ دەکردو ئەو بەڵگە- عەقلی -یانەی بۆ پوچەڵکردنەوەی کاری بت پەرستی دەیخستنە ڕوو، دەدوێت. جگە لەوەش دەربارەی خۆپاریزی و لەخواترسانی ئیبراهیم و لەخواپاڕانەوەیو باوەڕی قووڵ ودڵسۆزیو خوا ویستی‌یەکەی دەدوێت کەئەو جۆرە باسکردنە هەرگیز لە (عهد القدیم)دا نابینرێت. ئەمەش تایبەتمەندی‌یەکی تەنهای قورئانە لەباس ولێدوان دا دەربارەی ژیانی (ئیبراهیم)و ڕێزو پایەیەکی وای بۆ دادەنێت کە لەوەوبەر هیچ کتێبێکی دیکە لەکتێبە ئاسمانی یەکان بەو ئاقارە نەگەیشتووە.

---

(١) (العهد القدیم) بە تەورات و ئەو کتێبە کۆنانە دەگوترێت کەپێش هاتنە دنیای (عیسا) — سڵاوی لێبێت — نووسراونەتەوە، (عهد الجدید)یش بەو کتێبانە دەگوترێت کە لە دوای ئەو نووسراونەتەوە.

# پلەو پایەی " ئیبراهیم "

لێرەدا بۆ خوێنەری بەڕێز هەندێك لەو سیفەت و ڕەوشتە بەرزانەی (ئیبراهیم) دیاری دەکەین کەلە قورئانی پیرۆزدا باس کراون وخودا بە هۆیانەوە نموونەیەکی ڕۆشنی بۆ ڕێنمایی‌و گوێ ڕایەڵی‌و سوپاسگوزاری وێنا دەکات..

خودای مەزن فەرموویە: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾النحل/١٢٠-١٢٢ لەم ئایەتانەدا خودا وەسفی "ئیبراهیم" وەها دەکات کە نەتەوەیەك (ئوممەتێك) بووە، واتە بە تەنها خۆی نەتەوەیەك بووە لە نەتەوەکان چونکە هەموو خاسیەت و نەریتە جوانەکانی تێدا کۆ ببوونەوە، هەر ئەم وشەیەش وەك وتارێکی درێژی دەگمەنە لە ستایش کردنی کەسێتی ی " ئیبراهیم "دا، چونکە هەموو ئەو ڕەوشتە جوان وئاکارە پاك وخاوێنانەی کە بەرێژەی جیاجیا لە نێو خەڵکی دا بڵاون خودا لە پێغەمبەرەکەی دا (ئیبراهیم) کۆی کردوونەوەو بەمەش بووە بەو پێشەنگەی شوێن پێ ی هەڵبگیرێت و پەیرەوی سوننەت وئاکاری بکرێت. هەروەها خودا واشی وەسف دەکات ﴿حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ بەمانای "ئیبراهیم" ئەو خواویست وخوا بەیەك گرەبووە کە تەنهاوبە پوختی هەر خودای خۆی پەرستووەو هیچ کەسێکی نەکردووە بە هاوبەش و هاوەڵی خودا. پێش ئەم سیفەتەش بە ﴿قَانِتًا لِّلَّهِ﴾ داینا‌وە، واتە مل کەچ و گوێڕایەڵی هەر فەرمانێکی خودا بووە، لەگەڵ ئەمانەش دا ﴿ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ﴾ واتە شوکرانەبرێژو سوپاسگوزاری بەخششەکانی خودا بووە، لەبەر ئەوە شایستەی ئەو پلەیە بووە: ﴿ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە خودا هەڵی بژاردووە بۆ لەئەستۆنانی پەیامەکەی‌و سازو ئامادەو ڕێنموونی کردووە بۆ گرتنەبەری ڕێگای ڕاستی هەق کە گەیەنەرێتی بەرەزامەندیی خودا.. تا ئەو شوێنەی خودا دەفەرموێت ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، واتە خودا لە دنیادا ناوویادو زیکرێکی باشی بۆ داناوەو لەئاخیرەتیش دا لەو پیاو چاکە نیعمەت پێ بەخشراوانە دەبێت کە نیعمەتی بە هەشتی خوداو ڕەزامەندی یەکەی دەست دەکەوێت.

هەر دەربارەی وەسفی ڕەوشتە بەرزەکانی" ئیبراهیم" خودا لە قورئان دا فەرموویە: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ

عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾البقرة/١٢٤.. لەم ئایەتەش دا خـودا وەسـفی ئـەو حاڵەتـەی "ئـیبراهیم" دەكـات كاتێـك (بەچـەند ڕاسـپاردەیەكی شـەرعیو چـەند فەرمانكاریـیەك بەچـاكەو بەربەسـتكارییەك لەخراپـە) تـاقیی كردۆتـەوەو ئـەویش هـەمووی بەتـەواوی جێبـەجێ كردووەومافی تەواوی تێدا گەیاندوون، دوای ئـەم هەڵـسەنگاندنە خـودای پـەروەردگاری پێـی دەفەرموێت: (ئەوا من دەتكەم بە پێشەوایەكی خەڵكیو ئەوانیش پابەندی سـوننەت وڕێـسات دەبن) لەو ساتەدا -ئیـبراهیم- داوا لـە خـودا دەكـات كـە هەنـدێك لـە نەوەكانیـشی بكـات بەپێشەوا، خوداش لەوەڵامی داواكەی دا ئەوەی پێ ڕادەگەیەنێت كەهـەرگیز ستەمكاران ئـەو پێشەوایەتییەیان دەست ناكەوێت، لەم فەرمایشتەدا ئاماژەیەك بۆ ئەو ڕاستی یـە كـراوە كـە لەنێو ئەو نەوانەی دا چاك وخراپ هەیە.. لێرەدا سەرنج بدە لەچۆنیەتی ئەو هەواڵەی خودا بـە (ئیبراهیم)ی دەگەیەنێت سەبارەت بەوەی كەپێشەوایەتی (امامة) دەست ستەمكاران ناكـەوێت چونكە شایانی ئەوە نین كەخـەڵكی جڵـەوی خۆیانیـان بدەنـە دەسـت و بەپێـشەواو سـەركاری خۆیانیان بزانن. هەروەك ئیرادەی خـوداش وایـە هـەموو خـەڵكی ڕقیـان لەستەمكاران بێـت وكاروباری خۆیان نەخەنە بەر چنگیان. زوڵم و ستەمیش لەدیدی قورئان دا بەزانـدنی سـنووری یاساكانی خوداو پەیڕەونەكردنی فەرمانەكانیەتی، هەروەك خودای مەزنیش فەرموویە: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾المائدة/٤٥..

هەروەها خودای مەزن دەربارەی خاسیەتە بەرزەكانی "ئیـبراهیم" فەرموویـە: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴾مریم/ ٤١.. بە مانای: (ئەی محمد باسی داستانی ئیبراهیم بۆ گەلەكەت بگێڕەوە بەشكم پەندو وانەی لێوەربگرن، ئەو پێغەمبەرەی بـە (صـدیق) وەسـف كـراوە كـە ڕاسـتگۆیی (صـدق) یێكـی زیـاد لـە ڕادەو ئێجگـار زۆری هـەبووە)، بێگومـان "ئیبراهیم"یش شایانی ئەم وەسف ونازناوەیە لەبەر ڕاستگۆیی ی زۆرو فرەی خۆی، جا سـەرنج بدە لە چۆنیەتی ئەو وەسفەی خودا كە پێش ئەوەی بە پێغەمبەر وەسفی بكات بـە ڕاسـتگۆیی وەسفی كردووە تاكو بەهای ڕاستگۆییمان پیشان بدات، چونكە لە كۆمەڵە بـەهێزو پتـەوەكانی ڕاگیركـاری پێغەمبـەرێتی یـە... لـە وەسـفێكی دیكـەی (ئیـبراهیم)دا خـودا فەرموویـە: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾الـنجم/٣٧.. واتـە: "ئیـبراهیم" هـەموو فـەرمان وكـارو بـارێكی

سەرشانی کە خوداپێی سپاردووە بەجێ هێناو هەموو خەسڵەتێکی باوەڕو لقەکانی تەواو کرد، هیچ فەرمانێکی گرنگ فەرمانێکی سوپاسگوزارییی لە بیرنەدەبردەوەو هیچ کارێکی گەورەش لە کارێکی بچووکتری دانەدەبڕی. هەروەها خودای مەزن (بە فەرمایشتێکی دیکەی) پلەوپایەی - ئیبراهیم - دیاری دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا﴾النساء/١٢٥.. واتە: خودا ئیبراهیمی بەتایبەتی هەڵبژاردووەو پالاوتوویەتی و ڕێزو کەرامەتێکی وای پێداوە وەك ڕێزو کەرامەتی ئەو (هاوڕێ یانەی کە زۆر یەکتریان خۆش دەوێت) بەیەکتریی دەبەخشن). دەربارەی مانای هاوڕێ (خلیل) گوتراوە: ئەو خۆشەویستەیە کەهیچ (خەلەل)و کەلەبەرێك لەخۆشەویستی یەکەی دا نی یە. گوترایشە ئەم هاوڕێ یەتی یە تەواوی خۆشەویستی و کۆتایی و ئەوپەڕی دەگرێتەوە، خوداش لەنێوبەندەکانی دا هەرە چاك وپوختەکانی خۆش دەوێت، (ئیبراهیم)یش خۆشەویستی ی تەواو و بێ کەم وکووڕیی بۆ خودا هەبووەو خودای خۆی زۆر زۆر خۆش ویستووە، لەبەر ئەمەش بەرهەڵستی ی باوکی و گەلەکەی خۆی لەپێناوی خودای پەروەردگاری دا کردووە، خوداش بۆ ئەمە خۆشی ی ویستووەو بە (خلیل) واتە: (هاوڕێ ی دەسپاك و ئەمین)ی داناوە.

## لە نزاکانی " ئیبراهیـــم "

دووعاو نزاکردن لە ئیسلام دا وا ناسراوە کە کرۆك ومۆخی بەندایەتی یە، جاوەك چۆن مرۆڤ بە مۆخەوە بەندە، خواپەرستی و بەندایەتییش بەنزاو پاڕانەوەوە بەندە. چونکە نزاو (داواکردنی پێویستی) لەخودای پەروەردگار یەکەمین ڕواڵەتی مرۆڤ وبەندایەتی بۆ خوداکردنی و جڵەودانە دەست فەرمانیەتی، هەر لەسەر جۆروشێوەی نزاکەش حەقیقەتی مرۆڤ دەردەکەوێت کە داخۆچی لەخودا دەوێت؟! چەند دەسکەوتێکی ماددی و دنیایی ی دەوێت یان پلەوپایەی ڕۆحی و مەعنەوی؟!

قورئانیش هەندێك لەو نزایانەمان بۆ دەخاتە ڕوو کەلەسەر زاری (ئیبراهیم) هاتوون و خوێنەریش لەو نزایانەوە بەرزیو گیان بڵندیی (ئیبراهیم) وئەو پلەوپایە مەعنەوییەی بۆ دەردەکەوێت کە هەڵی بژاردبوو و وای لێ کردبوو لەلای خودای پەروەردگاری خۆشەویست ببێت، چونکە ئەو (واتە ئیبراهیم) لەنزاکانی دا داوای کەرەسەیەك لەکەرەسەکانی دنیا ناکات، بەڵکو نزای ئەو، نزای مرۆڤێکی باوەڕدارە کە خودای خۆی ناسیوەو ئیدی هەموو شتێکی دیکەی لەبەر چاو بچووك بووە، هەر کەسێکیش تامی باوەڕی چەشتبێت ئەوا هەر زیاتر داوادەکات (واتە باوەڕی زیاتر) داوا دەکات..

ئەمەش هەندێك لەو نزایانەی "ئیبراهیم"ە کە نموونەی وانەیەکی نایابن بۆ بڵندی گیـــان.. ﴿ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾الشعراء/٨٣-٨٩..

لەم ئایەتانەدا (ئیبراهیم) لە خودای خۆی پاڕاوەتەوە حیکمەت ودانایییەکی وای پێببەخشێت کە بەهۆیەوە بیروباوەڕو قیەمی ڕاستی بۆ دەرکەوێت ولە ناڕاست وساختەکانی جیاکاتەوە، وشەی (حکم) لە ئایەتەکەدا مانای ئەوەش دەگەیەنێت کەداوای لەخودا کردبێت بیکات بە حەکەم (دادوەر)ی نێوان خەڵکی لەسەر هەق، هەروەها لێ ی دەپاڕێتەوە ڕێنموونیی بکات بۆ کاری چاك وچاکەخوازی تاکو لەڕیزی پیاوچاکان دا دابنرێت و لەدوای مردنی بەباشی باسی بکرێت و لەو کەسانەش بێت کەڕەزامەندیی خودایان لەڕۆژی دوایی (ئاخیرەت)دا دەست دەکەوێت وبە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت شاددەبن، هەر لەو نزایانەیدا داوای لەخودا کردووە کە لەباوکی خۆش بێت ولەو بێ باوەڕی و گومڕایی یەی ببوورێت[1]. ئینجا لەپەروەردگاری داوا دەکات لە ڕۆژی حساب و زیندوو کردنەوەدا بەسزاو چارەنووسی خراپ سەرشۆڕو سەرگەردانی نەکات، لەو ڕۆژەدا کەهیچ ماڵ و سامانێك فریای گوناهبار ناکەوێت هەرچەندی لێ کۆکردبێتەوە، هەروەك کە کوڕونەوەکانیشی ناتوانن سوودێکی پێبگەیەنن ئەگەرچی خواناس وپیاو چاکیش بووبن، بەڵکو لەو ڕۆژەدا تەنها دڵێکی ساغ وسەلیم و (پارێزراو لە بێ باوەڕی و دوو ڕوویی و لەنەریتە بێزراوەکان) سوودمەند دەبێت ومرۆڤی باوەڕدار بەو دڵەساغ و خاوێنەوە بە خودای خۆی بگات...

هەروەها (ئیبراهیم) و (ئیسماعیل) پێکەوە بەم جۆرە لەخودای پەروەردگاریان دەپاڕانەوە:

﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾البقرة/١٢٨-١٢٩..

واتای ئایاتەکان: (خودایە ڕێنموونیمان بکە بۆ ئەوەی دووکەسی دڵسۆزو ملکەچی فەرمانت بین، نەوەو وەچەکانیشمان بکە بەکۆمەڵێکی دڵسۆز بۆ خۆت، هەروەها شێوازی

---

(١) هەروەك لەبەندی یەکەمی ئەم بەشەدا (بەشی پێنجەم) ئاماژەمان کرد بۆ چۆنیەتی ئەو نزاو داواکاریی لێخۆشبوونەی (ئیبراهیم) لەخودا بۆ باوکی لەکاتێك دا بووە کە هێشتا لێ ی نائومێد نەبووەو (واتە لە باوکی نائومێد نەبووبوو)و هەربەتەمای ئەوەبوو بەدەم بانگەوازەکەیەوە بێت، بەڵام لەدوایی دا کەزانی ی دوژمنی خودایە خۆی لێ بەری کردو دووعای لێخۆشبوونی بۆ نەکرد. (وەرگێڕ).

عیبادەت و بەندایەتی کردنمان فێرکەو تۆبەو گەڕانەوەمان لێ پەسندکە، بێگومان تۆ لەبەر ئەوەی بەڕەحم و میهرەبانیت لەگەڵ بەندەکانت دا (تۆبە) لە هەڵەکارو گوناهبارە تۆبەکارەکان وەردەگریت. ئەی خودای پەروەردگارمان لە نێو ئەو وەچەو نەوانەمان دا پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە بکە تاکو ئەو ئایەت وبەڵگەو نیشانانەیان (دەربارەی بوون و تاك وتەنیایی تۆو گەورەیی شان وشەوکەتی تۆ)یان بۆ بخوێنێتەوەو ئەو شەریعەتەی نێو کتێبە بە سرووش بۆ نێرراوە کەشتیان فێرکات وئەو حیکمەتەشیان فێرکات کە ڕازونهێنی ی فەرمانە شەرعی یەکان ومەبەستەکانی و سوودو کەڵکەکانیانی لە خۆگرتووە وئینجا بەم ڕەنگەش دڵ و دەروونیان لە هەموو داب ونەریتێکی خراپ و گشت سیفەتێکی ناپەسند پاك بکاتەوە).

بێگومان خودای بەڕەحم وپەروەردگار ئەو نزایەی (ئیبراهیم-و-ئیسماعیل)ی گیراکردو ئەوە بوو لە نێو وەچەونەوەکانیان دا پێغەمبەرێکی لەخۆیان بۆ ناردن کە (محمدﷺ) بوو، لەم ڕووەوە فەرموویە: ((انا دعوة ابراهیم وبشارة عیسى))[1].. واتە: (من بانگەوازەکەی -ئیبراهیم- ومزگێنی یەکەی -عیسا-م).. (محمد)یش ﷺ ئەو پێغەمبەرە بوو کە دڵ ودەروونی عەرەبی لەسیفەتە ناپەسندەکان پاك کردەوەو فێری کتێبەکەی کردن (کە -قورئان- بوو)و فێری حیکمەتیشی کردن، کە (سوننەتی پێغەمبەرێتی بوو)، لەماوەی چەند ساڵێکی دیاری کراویش دا کردنی بەنەتەوەیەکی یەکگرتوو وپێکەوە بەسراوی وا کەچاکەو ڕەوشتی جوانیان لەسەرانسەری گێتی دا بڵاوکردەوە دوای ئەوەی لەوەوبەر (لەپێش ئیسلام دا) ئەونەتەوە گومڕاو بێ بەرنامەیە بوون کە کەوتبوونە نێو قوڕەڕەشی بەدکاری و لەمەیدانەکانی شەڕخوازیش دا وێڵ بووبوون.

نزایەکی دی لە نزاو دووعاکانی -ئیبراهیم- ئەمە بوو:﴿..رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾الممتحنة/٤-٥.. واتە: (ئەی خودای پەروەردگارمان کاروبارمان هەر بەتۆ سپاردووەو پشتمان هەر بەتۆ بەستووەو تەنها بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە لەعیبادەتمان دا چونکە چارەنووسمان لەڕۆژی قیامەت دا هەر بۆلای تۆیە... خودایە گیرۆدەی ئەو فیتنەو بەڵایەمان نەکەیت کە بێ باوەڕان ئازارمان پێ بگەیەنن ولەڕێ ی تۆ لامان دەن، یان ئێمە خۆمان مایەی فیتنەو بەڵابین بۆ بێ باوەڕان بە هۆی ئەوەی پێشەنگ و نموونەیەکی خراپ بین بۆیان و لاسایی ی کوێرانەمان بکەنەوەو ببێتە هۆیەك بۆ لادانیان لەو هەق ورێگە ڕاستەی کە پێویستە پەیڕەویی بکەن... خودایە لێمان خۆش بەو لەو گوناهی زیادە ڕۆیی یانەمان ببوورە، بەڕاستی تۆ باڵادەست و دانایت).

---

(١) رواه احمد في مسنده.

## " ئیبراهیم " موسڵمانی ئاینپەروەر

زۆر کەس لەخەڵکی عەوام وا تێ گەیشتوون کە وشەی (ئیسلام) ناوێك بێت پێغەمبەری خودا (محمد) ﷺ لە ئاینەکەی نابێت و خۆی یەکەمین کەس بێت ئەم ناوەی داهێنا بێت، بێگومان ئەم بۆچوون وتێگەیشتنە هەڵەیە، چونکە بەپێی ئەو حەقیقەتەی کەقورئان ئاشکرای کردووە پێغەمبەرانی خودا هەموویان موسڵمان[1] بوون لەسەروو هەمووشیانەوە (ئیبراهیم)ـە کە ئەم ناوە (واتە ناوی ئیسلام)ی بۆ ئایینەکەی هەڵبژاردووەو وشەی (موسڵمان)یشی بۆ شوێنکەوتوانی داناوەو وەچەو نەوەکانیشی پێڕاسپاردوون. جا ئەو عەرەبانەی باوەڕیان بە پەیامەکەی (محمد ﷺ) هێنابوو و ئیسلامیان لەئەستۆنا لەم ئایەتەدا تەئکید لەسەر (موسڵمانێتی)یەکەیان کرایەوە، هەروەك خوداتیایدا فەرمووییە: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ﴾الحج/٧٨.. واتە: (خودا لەم ئایینەدا هیچ تەنگی و بارگرانی‌یەکی وای بەسەردانەداون کە تواناتان لەسەری نەبێت، جا ئێوەش پابەندی شەریعەتی خوا بەیەك گرتنەکەی (ئیبراهیم)ی باوکتان بن کەلەوەوپێش لەزووەوە ئێوەی باوەڕداری بە (موسڵمان) ناوبردووە).

(محمد)یش ﷺ فەرمانی پێکرابوو پەیڕەویی (شەریعەتی خوابەیەك گرتن)ی - ئیبراهیم - بکات کەلەسەر بنەمای (پەرستنی خودای تاك وتەنها) پێك دێت، هەروەك خودا لە ڕووی گفتاری‌دا بۆ (محمد-ی پێغەمبەری خۆی)ﷺ فەرموویە: ﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا[2] وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾النحل/١٢٣.. واتە: (پاشان سرووشی ئەوەمان بەتۆش داوە کە پەیڕەویی شەریعەتی پوختی (ئیبراهیم)ی ئاین پەروەری خاوەن تاکە ئایینی ڕاست بکە کە هەرگیز هاوبەش وهاوەڵی بۆ خودا دانەناوەو هەردەم خودای تاك وتەنهای خۆی پەرستووە).

## مانای ئیسلام

ئەی باشە (ئیسلام) چی یە؟ حەقیقەتی ماناکەی لەچی دایە کە هەموو پێغەمبەرانی خوداش چەمك ومەفهوومەکەیان پەیڕەوکردووە؟ (ابن تیمیمە) -خودا لێ ی خۆشبێت- لە پێناسەکردنی -ئیسلام-دا دەڵێت: (ئیسلام ئەوەیە مرۆڤ تەنها خۆی تەسلیم بە خودا بکات نەك بە غەیری خودا، هەرخودا بپەرستێت وهیچ شتێك نەکات بە هاوبەش وهاوەڵی، هەروەها

---

(١) بڕوانە کتێبی (روح الدين الاسلامي) کەکتێبێکی دیکەی نووسەری ئەم کتێبەیە / بەشی (معنى الاسلام) لەکتێبی ناوبراودا.

(٢) (حنیفا): واتە ڕوو وەرگێڕ لەهەر ئایینێکی بەتاڵ وبێناوەڕۆك بەمەبەستی پەیڕەوکردنی ئاینی ڕاست.

پشت بەخودای تاك وتەنیا ببەستێت وتەنها تكاو داواكاری وترسی لەو هەبێت.. بەتەواویش خودای خۆش بوێت وئەو خۆشەویستی یەی لە ڕاددەیەك دابێت كە هیچ مەخلووقێكی بەو جۆرە خۆش نەوێت، تەنانەت خەڵكیشی لەبەر خودا خۆش بوێت ولەبەر خوداش ڕقی لەهەندێكیان ببێت، دۆستایەتیش لە پێناوی خوداو سەرخستنی دینەكەیدابكات، هەروەك چۆن دوژمنایەتیشی لەگەڵ هەندێك كەس دا لەپێناوی خوداو سەرخستنی ڕێبازەكەی دابێت. جا هەر كەسێك خۆی بەزل بزانێت و ڕوو لەخواپەرستی وەرگێڕێت ئەوە موسڵمان نی یە، هەركەسێكیش لەگەڵ پەرستنی خودادا شتێكی دیكە بپەرستێت ئەویش هەر موسڵمان نی یە)[1]..

ئەمەیە ئیسلام و ئەوەیە ماناكەی. ئیدی سەیر نی یە گەر خودا بەم مانایە ستایشی ئەو كەسانە بكات كە ڕەچاوی دەكەن وسیفەت وئاكارو كرداریان پێ دەڕازێننەوە ولەو بوارەش دا شوێن پێ ی باپیرەگەورەیان (ابراهیم علیه السلام) هەڵدەگرن: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴾النساء/١٢٥،

ماناو مەبەستی ئەم ئایەتەش ئەوەیە ئەوكەسەی ڕووی عیبادەت تەسلیم بە خودا دەكات ئەوەیە عیبادەت و بەندایەتیی خۆی تەنها تایبەت بە خودا دەكات ولەكارو باری عیبادەت دا تاكە مەبەستی (ڕەزامەندی خودایە)، چاكەكار(محسن)یش ئەو كەسەیە كارەكانی چاك دەكات و كاری باش ئەنجام دەدات. كاری باش (حسنات)یش كاری چاكسازیو كردەوەی شیاوە. ئیسلامیش ئەو پەیمان وبڕوانامەیەیە كە (مرۆڤ بەگیان ودەروون ودڵ وگفتارو ئارەزووەكانیو تووڕەییو قایل بوونیەوە) لەتەرازووی خودادا دادەنێت.. (ئیبراهیم)یش بە گەلەكەی دەڵێت: ﴿وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ﴾الممتحنة/٤.. هەروەها دەڵێت: ﴿ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ[2] لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾الانعام/٧٩، ئیسلام بوون وموسڵمانێتی ی "ئیبراهیم" -سڵاوی لێ بێت- ئاوا بووە، لەبەر ئەمەش خودا بە هۆی ئیسلام بوونیەوە هەڵی بژاردووەو فەرموویە: ﴿..وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ

---

(١) بڕوانە (كتاب النبوات)، ص (٨٧).

(٢) مەبەست لەوشەی ڕوو(وجه) لەم ئایەتەدا دەم وچاونی یە، بەڵكو ڕووی دڵە، چونكە ڕووگەی دەم وچاوو ڕوخساری گۆنای مرۆڤ هەربە دڵەوە بەندەو دڵی مرۆڤ ڕووی لەكوێ بێت ئەوا گۆناو دەم وچاویشی ڕووی لەو شوێنەیە.

لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾البقرة/١٣٠-١٣١.. واتە: (بێگومـان ئێمـە -ئیبراهیم-مـان بـۆ گەیانـدنی پەیامەمان هەڵبژارد لەدنیادا، لەڕۆژی دوایش دا لەپیاوچاکان و صاڵحانە، چونکە کاتێك خـودای پەروەردگاری فەرمانی پێ کردو پێ ی فەرموو: (عیبادەت بۆ من پوخت وتەرخان کەو جڵـەوی خۆتم پێبسپێرە)، ئەویش گوتی: (ئەوا خۆم دایـە دەسـت خـودای پـەروەردگاری جیهانییـان و ئیسلام بوونم ڕاگەیاند).

## بەخشندەیی " ئیبراهیـــم "

خواستی خودا وابوو گەلەکەی (لـوط) لە نێو بەرێت لەسەر ئەو بەدڕەفتاری یەیان کـەپێش خۆیان کەسی تر لەخەڵکی پێ ی نەگەیشتبوو، لەو گەلەدا پیـاوان خۆیـان تووشـی خوویـەکی ناپەسندو نائاسایی ی جنسی ی وەك نێربازی (لـواط) کردبـوو، لەبـەر ئـەم خووەشـیان سـزای سەختی خودایان لەسەر شایستە بوو، ئەوەبوو خودای باڵادەست چەند ملائیکەیـەکی نـارد بـۆ تەفروتووناکردنیان، بەڵام ئەو مەلائیکانە فەرمانیان پێ کرابوو پێش ئەوەی سزاکە جـێ بـەجێ کەن وەك چەند میوانێك لەشێوەو ڕوخساری چەند کوڕێکی گەنج دا سەردانی(ئیبراهیم) بکەن.

(ئیبراهیم)یش ناسرابوو بە بەخشندەیی و بەسۆزی و نازهەڵگرتنی میوان، گەر تاپـازدە ڕۆژ میوانێکی نەبوایە دڵی تەنگ دەبوو، ئەم میوانانەش دوای ئەو ماوەیە سەریان لێدابوو، بۆیـە بەدیتنیان زۆر دڵشادبوو وچووە دەرەوە بۆ لای خانەوادەکەی و گوێرەکەیەکی قەڵەوی سـەربڕیو بەئاگر سووریی ی کردەوە، تا ڕەنگی گۆشتەکەی لەئاکامی کولاّویی دا سوور هەڵگەڕاو پاشـان خستیە بەردەمیان. بەڵام دەستی ئەو میوانانە نەگەشتە گوێرەکە سوورکراوەکە، (ئیبراهیم)یش دیتی ئەم میوانانە هیچ ئارەزوویەکیان لەخۆراك نی یە، بەمـەش کەوتـە گومانـەوە لێ یـان و ترسی لێ نیشت کاتێك هیچیان لەگۆشتەکە نەخوارد، هەر بۆیەش لەم ڕووەوە لەگەڵیان دا دواو پرسیاری هـۆی نـەخواردنی لێ کـردن، ئـەوانیش لـەوەلاّم دا هـەواڵیان دایـە کەئـەمان چـەند مەلائیکەیەکن وخودا ناردوونی بۆ تۆڵەسەندنەوە لەخەڵکی بەدڕەفتاری (سـدوم) و (عـاموورە)، کە لەقورئان دا بە گەلی (لـوط) ناویان هاتووە. لەوساتەدا (سارە)ی هاوسەری "ئیبراهیم"یـش پێکەنی کاتێك میوانەکانی ناسیو کەهێندەشـی نـەبرد ئـەو میوانانـە مزگێنیـی کوڕێکیـان پێگەیاند کەوا خودا کوڕێکی بەناوی (ئیسحاق) پێ دەبەخشێت و ئەم کوڕەش (واتە ئیسحاق-یش) خودا کوڕێکی بەناوی (یەعقوب) پێ دەبەخشێت.. کەچی (سارە) لـەم مژدەیـە سەرسـام بوو وپێ ی گوتن: (چۆن من بەم پیری یە منداڵم دەبێت کەپیرەژنێکم و ئەم مێردەشم (ئیبراهیم)

هەر پیرو بەساڵا چووە)؟ مەلائیکەکان لەوەڵام دا گوتیان: (چۆن تۆ لەم مژدەیە سەرسام وواق و ڕماو دەبیت؟ ئەمە بەقودرەتی ئەو خودایەیە کەهیچ شتێکی لا ئاستەنگ وگران نی یە وهەر خوداش ئێوەی (بنەماڵەی ئیبراهیم)ی بەتایبەتی خستۆتە بەر ڕەحمەت و بەرەکاتی خۆی.
پاشان ئیبراهیم کە دڵنیا بوو لە حەقیقەتی سەردانی ئەو میوانانەو لەو مزگێنی یەی بەخشینی (ئیسحاق)ی کوڕی و (یەعقوب)ی کوڕەزای پێ ی، ئینجا دەستی کرد بەگفتوگۆ لەگەڵیان دەربارەی لێکۆڵینەوەی هۆی سزای خودا بۆ گەلی (لوط) بەو ئومێدەی بەشکم خودا بەچاوی سۆزو بەزەیی بۆیان بڕوانێت، قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەو دەمەتەقێ یە کردووە وبەدرێژیش لە (سفر التكوين)دا هاتووە.

خودای مەزن لە قورئان دا پوختەی ئەم بەسەرهاتەشی لەم چەند ئایەتەدا گێڕاوەتەوەو فەرموویە: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ ۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۚ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴾هود/ ٦٩ - ٧٦.

# بەندی پێنجەم

## (( چـەند پەندو وانەیەك ))

(دڵفراوانی "ئیبراهیم"- وانەیەك لە ئازایەتی - قوربانیدان بەخۆ و
بەکوڕ لەپێناوی خوادا - بت پەرستی و هاوشێوەکانی)

## دڵفراوانی " ئیبراهیم "

(ئیبراهیم)ئەو سەرمەشقە ڕۆشنایی بەخشەبووە کە هەمیشە پێغەمبەرانی دیکەی خودا و باوەڕدارانیش لەهەموو چاخ وسەردەمێك دا پەیڕەوکاری ڕێبـازو شـوێن کـەوتووی ڕێبازەکـەی بوون. تەنانەت ئەو نموونەو پێشەنگە جوان و بەهادارەشە کەخودا خستویێتی یە بەرچاوی هەموو ئادەمیزادێك. خۆ ئەگەر بمانەوێت وەسفێکی وا بۆ (ئیبراهیم) دانێین کەهەر شایانی خـۆی بێـت ئەوا لەوەسفی(دڵفراوانی) باشترو وردتر لەدەربڕین دا بەدی ناکەین، ئەو دڵەفراوانەی کەئایەت و نیشانەی بەرزی و ناسکی و نەرم و نیانی و بەسۆزی بووە و، ساغ و پارێزراویش بـووە لـە هـەر ڕق وکینەو نەریتێکی بێزراو. ئەی چۆن (ئیبراهیم) هەڵگری ئەم وەسف ونەریتە جوانانە نی یـە کەهەر خۆی بانگەوازی بۆ ساغیو سەلامەتیی دڵ کردووە و دەربـارەی چارەنووسـی مـرۆڤیش لـــەڕۆژی قیامـــەت دا گوتوویـــە: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ الشعراء/٨٨-٨٩... بەڕاستی گفتارێکی قەشەنگەو لە پلەیەکی شکۆداریی ئـەوتۆ دایـە کـە هیچ تیۆرێکی فەلسەفی پێ ی ناگـات وهـیچ (ڕێبـازێکی ڕەوشـتمەندی)یـش ناتوانێـت لێ ی بەرزتر بێت، چونکە ئەو گفتارەی باوکی پێغەمبـەران (ئیـبراهیم) (کـە خودا لەسـەرزاری ئـەو لەئایەتی (٨٨- ٨٩)ی سوورەتی (الـشعراء)دا هێناویەتی) ئەو نیازە پاکە بۆ ئادەمیزاد دیاری دەکات کە پێویستە بیخەنە بەر گلێنەی چاوانیان لەپێناوی ڕێزو شکۆی مرۆڤایەتی و بەختیاری ی هەمیـشەیی دا ونەمـەش بایـەخ دانەبـە سـاغی و سـەلامەتی دڵـەکانیان وپاکتاوکردنیـان لەخراپەو گوناهکاری.

بێگومان ناوەندی گەورەیی لە -ئیـبراهیم-دا دڵـە گەورەکـەی بـووە کەجێگـەی سـەرجەم خەڵکی ی تێدا بۆتەوە، چونکە خۆی بۆ بەختیارکردنیان تەرخان کردبوو بەبێ جیاوازی سا ئـیتر لەخزم وکەس وکارە نزیکەکانی بووبن یان هیچ پەیوەندی یەکی خزمایەتی ی پێـوە نەبوونایـە،

چونکە ئەو سوور بووە لەسەر گەیاندنی خێرو چاکە پێ یان و ڕزگارکردنیان لەو بت پەرستی یەی، کە لەنێویان دا بڵاوبووبووەوە و بەندایەتی یەك بوو کەوا عەقڵ وهۆشی زەوت کردبوون و کردبوونی بەنێچیری دیاردە ئەفسانەیی‌و شتە پوچەڵ و بەتاڵەکان.. بەندایەتی‌یەك بوو بەچەند ئەرکێکی زەرەرمەند شپرزەی کردبوون وملکەچی ئەوەشی کردبوون کەئامادەبن هەموو جۆرە قوربانی یەك لە خواردن وخواردنەوەو سەربڕینی ئاژەڵ بەفیڕۆ بدەن بۆیان.. ئەو بەندایەتی (عیبادەت)ـەش دەبێتە هۆی ڕق وتووڕەیی ی خودای تاك وباڵادەست وتۆڵەسێن، چونکە ئەوە ڕوو وەرچەرخانە لە پەرستنی خودای خالق بۆ پەرستنی چەند شتێکی کوێرو کەڕو بێ هۆش.

هەر بۆیەش دڵەگەورەکەی "ئیبراهیم"ناتوانێت باوکی بەو حاڵەتەوە ببینێت کەوا لەگومڕایی دا سەرنگووم بووەو سەرگەرمی بت پەرستی‌یە، بەڵکو خێرا هەوڵدەدات بەبەڵگەی عەقڵ و لۆژیك (منطق) ڕێنمایی بکات وڕێی ڕاستەقینەی بەندایەتی‌و خواپەرستی پیشان بدات. بەڵام ئەو باوکەی کە عەقڵی تەسك و داخرابوو و وەك بەردی لێهاتبوو، بەسزای (سەخت و هەڕەشەی بەرد باران کردن) بەربەرەکانی دەکرد.. ئەم کوڕە بە ئارام و ژیرەشی لە وەڵام دا پێ ی دەڵێت: ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ .. ﴾مریم/٤٧.. ئەم داوای لێخۆشبوونەی (ئیبراهیم) بۆ باوکی لە دوای هەڕەشە لێکردنی و بەڕوودا هەڵپژانی، بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزی و پەرۆشی بۆ باوکی‌و دەلالەتی ڕۆشنییشە لەسەر ناواخنی دڵێکی گەورەی وەها کە بە (خۆشەویستی‌و سۆزو بەزەیی) کاردەکات ولێ دەدات.

دڵە گەورەکەی (ئیبراهیم) ڕۆڵەکانیشی خستۆتە نێو ئەو سۆزو ئەوینەوەو لەخودا بۆیان دەپاڕێتەوە کە لە (بت پەرستی) بیان پارێزێت و بەدووریان خات: ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ﴾ابراهیم/٣٥..

هەروەها دڵە گەورەکەی "ئیبراهیم" سۆزو پەرۆشی بۆ ئەو کوڕو نەوەو ڕۆڵانەی خۆیشی زۆرەو سەرفرازی و سەربەرزی بەشێوەیەك بۆ خواستوون، کەئەم جۆرە خواستە هەموو هەست و نەستی داگیر کردووە. تەنانەت کاتێك خودا پێشەوایەتی ی پێ دەبەخشێت قایل نابێت هەر خۆی بەتەنها خاوەنی ئەم خێرو بەخششە بێت، بۆیە داوا لەپەروەردگاری دەکات هەمان پلەش بە ڕۆڵەو نەوەکانی ببەخشێت: ﴿قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ ..﴾البقرة/١٢٤.

ئەم دڵە گەورەیەی جگە لەمەش وای لێ دەکات داوا لەخودا بکات هەردەم بەرپاگیرکاری نوێژو نوێژ خوێنی دابنێت، چونکە نوێژ گرنگترین هۆکاری نزیك بوونەوەی مرۆڤە لەخودای پەروەردگاری. وە نەبێت ئەمە هەر بۆ خۆی داوا کات، بەڵکو داوا دەکات خودا ئەو ڕۆڵەو کوڕو

نەوانەیشی لەسەر هەمان کرداری نوێژکردن ڕاگیرو دامەزراوکات: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ﴾...

ئینجا دڵە گەورەکەی (ئیبراهیم) سۆز بۆ گەلەکەشی دەڕێژێت سەرەڕای ئەوەی ئازارێکی زۆریشی دەدەن وخۆیانی لێ دوور دەخەنەوە، بەڵام ئەو دوعای فەوتانیان لەسەر یاخی بوون لێ ناکات و داوای سزای پەلەشیان بۆ ناکات، بەڵکو دەیانسپێرێت بەڕەحمەت و لێخۆشبوونی خودا: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنۡ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾.

ئەم دڵە گەورەیەی -ئیبراهیم- حەزناکات سزا بەر کەس بکەوێت تەنانەت گەر شایستەشی بێت ئەوەتا چەند مەلائیکەیەك هاتوونە لای و هەواڵی گەیاندنی سزا بەگەلی (لوط)ی پێ دەگەیەنن. بەڵام ئەو خێرا تەلەکانی دڵی دەلەرێنەوەو خەم دەخوات بۆ ئەو کارەساتەی کە تووشی ئەو گەلە دەبێت، هەر بۆیەش گفت وگۆیەك لەو بارەیەوە لەگەڵ خودادا دەکات، تاکو بەشکم ڕەحمەتێك بەو یاخی یانە بکات وبەوە پاشگەزبنەوە و تووشی ئەو کارەساتە توندو تیژە نەبن، هەروەك خوداش لەبارەیەوە فەرموویە: ﴿يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ ٧٤ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ[1] أَوَّٰهٞ[2] مُّنِيبٞ[3]﴾هود/٧٤-٧٥..واتە: (ئیبراهیم- دەربارەی سزاکەی سەر گەلی (لوط) لەگەڵمان دا دەدوا تا بەنەریتی مرۆڤ دۆستانەی خۆی بوارێك بۆ هەڵگرتنی یان دواخستنی سزاکە بەدی بکات، بەڕاستی -ئیبراهیم- لەسەرخۆو خەم هەڵگرو گەڕاوەیە)، بۆ شیکاری ئەم سێ سیفەتە تەماشای پەراوێزەکانی ئایەتەکە بکە.

## وانەیەك لە ئازایەتی

بێگومان لەژیانی -ئیبراهیم-دا وانەیەکی کاریگەر لەئازایەتیو بوێریو فیداکاری لە پێناوی عەقیدەو بیروباوەڕدا هەیە، چونکە ئەو ڕووبەڕووی ئەو گەلەی دەوەستێت کە کرداری بت پەرستییان تێدا بڵاوبووەتەوە، بیروباوەڕیان بەنادانی دادەنێت و بە بەڵگەو نموونەی

---

(١) (حلیم): واتە (بەئارامەو حەز بە زووسزادان و سزای خێرا ناکات).

(٢) (أواه): واتە (ئاه وناڵەو خەمی زۆرە لەو ڕووداو وناڕەحەتی یانەی کە تووشی کەسانێتر دەبێت وبە تاوانی خۆیان سزابدرێن سەرەڕای شایستەبوونیشیان، بەڵام – ئیبراهیم – بەو نەریتی هەست ناسکی یەی خۆی بەزەییشی پێ یان دادێتەوە).

(٣) (منیب): واتە لەهەر مەسەلەو کاروبارێك دا بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە و تۆبە دەکات.

بەهێزەوە داوای وازهێنان لەو بت پەرستی یەیان لێ دەکات، ئای چ داوایەکی گرانەو بانگەوازێکی چەند قورسە !! خۆ هیچ شتێکیش لەلای مرۆڤ لە کاری گۆڕینی (ئەو بیروباوەڕە بۆ ماوەیی‌یە) گرانتر نی یە کە لەدڵ ودەروونی خۆی دا ئەوپەڕی بایەخی بەپیرۆزدانان و شکۆدارکردنی پێداوە، هەروەك هیچ شتێکیش هێندەی (بەپوچەڵ دانانی بیروباوەڕەکانی) تووڕەی ناکات.. لەبەرئەمە ئەرکەکەی "ئیبراهیم" زۆر سەخت ودژواربووەو ئاتاجی بەئازایەتی‌و سەنگینی‌و ئارامی یەکی وەهابووە کە بەهۆیانەوە بتوانێت بەرگەی ڕق وکینەی ئەو گەلەی خۆی بگرێت کە یەکەم کاردانەوەی لەباوکی خۆیەوەیەتی و بە هەڕەشەو تووڕەیی یەوە پێ ی دەڵێت: ﴿ ئەگەر واز لەم قسەو باسانە نەهێنیت بەردبارانت دەکەم و، دەبڕۆ تا ماویت لێم دوور کەوەرەوە: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِى مَلِيًّا ﴾مریم/٤٦.. (ئیبراهیم) هیچ گوێ یەکی بیسەری لەنێو گەلەکەی دا بەدی نەکرد، بەڵکو لەبریتی ئەوەی گوێی بۆ بگرن و پەیڕەویی پەیامەکەی بکەن بەرهەڵستی‌و دوژمنایەتی‌یان کردو دەریان کرد، بەڵام هەموو ئەمانە لەو مەبەستەی خۆیی پاشگەزنەکردەوە و هیچ ترس ولاوازی‌یەك بەدڵی دا نەهات، بەڵکو چەکێکی کاریگەرترو بەهێزتری بەڕوویان دا هەڵکێشا، چەکێك کە بیروباوەڕیان لەنێوبەرێت وبونیادی شتە بەپیرۆزگیراوەکانیشیان هەڵتەکێنێت.. ئەوەش چەکی بەرەنگار بوونەوەی (باطل)ـە بەدەست وبازوو کەشوێنەوارێکی قووڵ تری لەبەرەنگاربوونەوەی زمان هەیە، چونکە بەرەنگاری بەقسەو وت وویژ بە تەنیا سوودی نی یە لەگەڵیان دا، چەکی (بەدەست وبازوو بەرەنگار بوونەوە) ئەو چەکە کردەیی (عەمەلی)یە بوو کەبتەکانیانی پێشکاند.. بێگومان ئەنجامی ئەم کارەش لەبەر چاوان دیارە: یان مردنی زانراو، یان قەناعەت پێهێنانی قەومەکەی بە واز هێنان لەبت پەرستی.. ئەمەش شێوازێکی کردەیی و (عەمەلی) بوو کە (ئیبراهیم) وە بەری نا تاکو ئەو ڕاستی یە بۆ گەلەکەی بسەلمێنێت کە ئەو پەرستراوانەیان ناتوانن بەرگری لەخۆیشیان بکەن، ئیدی چۆن دەتوانن بەرگری لەوان بکەن و چاکەو خراپەیەکیان پێ بگەیەنن (وەك عەقیدەیان وابوو)... تاکە شێوازێکی بێوێنە بوو کە "ئیبراهیم" ویستی ئەوە بۆ گەلەکەی دەرخات کەئەو پەرستراوانەیان نەدەبیستن و نەدەبینن و نەدەدوێن، کاتێك پرسیاریشی لێ دەکرێت دەربارەی ئەنجامدەری کارەکە (واتە کاری شکاندنی بتەکان) وەڵامیان دەداتەوە بەوەی کە (ئەنجامدەری کارەکە بتە هەرەگەورەکەیانەو پرسیاریشیان لێ بکەن گەر ئەو بتانە قسەدەکەن): ﴿ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴾. دیارە ئەم کارەش ڕقێکی ئێجگار توندی گەلەکەی تەقاندەوەو گیانی

تۆڵەیان تێدا ورووژاو حوکمی (سووتاندن تا مردن)یان بەسەردادا، بەڵام (ئیبراهیم) لەم ساتەدا نەپەشۆکاو تووشی سەغڵەتی یەکی وەهاش نەبوو کە لەهۆش خۆی بچێت و ببووریتەوە، بەڵکو لەبەردەم ئەو کۆمەڵە نەفام و بێ مەبدەئە باطل خوازەی گەلەکەی دا (بەدڵنیایی لە چارەنووسی و بەگیانی پڕ لەورەو متمانە بەخودا) وەستا. بەڕاستی ئەمە دەرسێکی گەورەو بەهادارە بۆ بانگەوازکارانی چاکسازی تاکو خۆیانی پێ بەهێزکەن و خانەکانی گومان و ترس و لاوازیی ی تێدا بتوێننەوەو بیانکەن بە چەند دەروونێکی چاوقایم وبوێرترو بە هێزتر.

## قوربانیدان بە خۆ و بە کوڕەوە لە پێناوی خـوادا

ئەو قوربانی دانەی کە خودا فەرمانی پێ بە "ئیبراهیم" کرد "واتە سەربڕینی کوڕەکەی خۆی -ئیسماعیل-و، بەدەمەوە هاتنی (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)یش بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکە بەوپەڕی قایل بوون و لەخۆبوردنەوە، لەگەورەترینی ڕووداوەکانی مێژووی قوربانی دان ولەبەهادارترینیشیانە، نەخاسمەگەر لەو گۆشەنیگایانەوە بۆ هەردوکیان (ئیبراهیم و ئیسماعیل) بڕوانین کە خستبوونی یە نێو واقیعێکی چاوەڕوان نەکراوەوە. بۆ نموونە سەرنج بدە لە (ئیبراهیمێك)ی پەرۆش بۆ کوڕونەوە کە لەتەمەنی پیری دا لەکەنیزەیەك (هاوسەری دووەمی) منالێکی بووە وئەم منداڵەش گیان وخوێنی دڵی و هیوای ژیانیو میراتگری ناوو ناونیشانیەتیو کەچی ئەوا خودا فەرمانی پێدەکات بیکات بەقوربانی تاکو باوەڕو ئیمانی پێتاقیبکاتەوە و ڕادەی بەدەمەوەهاتنی فەرمانەکەی وپلەی گوێڕایەڵیشی ببینێت. (ئیبراهیم)یش لەم بارەیەوە و بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە ترسناکە لەگەڵ کوڕەکەیدا دەدوێت ودڵیشی خەریکە لەخەم وپەژارەدا لەجێی خۆی دەرچێت، بەڵام (ئیسماعیل)ی کوڕی بەسانایی وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: (ئێ بابە گیان چ فەرمانێکت پێ دراوە بیکە، (ان شاء الله) دەبینیت من خۆ ڕاگرم): ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾.. قەڵەمیش دەستەوسانە لەئاست وەسفی ناوەڕۆکی ئەم وتەیەی دا کەڕازی بوونی تەواوی (بۆ قوربانی دان بە نەفس لە پێناوی خوادا) تیادا ڕەنگ دەداتەوە.. قوربانی دانی کوڕەکەش بەخۆی.

بەڕاستی ئەمە بلندترین وێنەی باوەڕ و شکۆدارترینیشیانە لەمێژووی مرۆڤایەتی دا، چونکە باوەڕ چەند پڕوپاگاندەو ئیددیعایەك نی یە کەزمان بیانجوێتەوەو بۆ خەم بەباکردنی ماوەیەك نی یە، هەروەها تیۆرێك لەو تیۆرانەش نی یە کەعەقڵ بەدوای دۆزینەوەی پەنهان و

نادیارەکانی دا وێڵ بێت، بەڵکو باوەڕ (الإيمان) جێگیری و خۆ مەحکەم کردنی تەواوە لەو ئیرادەیەی خوادا کەبەندە بەجێبەجێکردنی ڕاسپاردەو فەرمانەکانیو قوربانی دان بەهەر شتێکی بەنرخ وگەورەو گران بەها لەپێناوی خودادا. ئای ئەمڕۆ چەند پێویستمان بەم دەرسە گەورانەیە لە زەمانێك دا کەماڵ و کوڕو ئافرەت جێ ی بایەخی تەواوی مرۆڤن و لەهەموو شتێك لەلای خۆشەویسترن و تەنانەت لەلای هەندێك کەس وەك پەرستراویان لێ هاتووە لەجیاتی خودا.. ئای مرۆڤیش چەند بچووك وبێ نرخە گەر کاتێك پەیوەست بێت بەباق وبریقی دنیای فانیو براوەوەو چاو لەو ڕاستی یە نەمرە بپۆشێت، کەهۆی وجودو سەرچاوەی بەردەوامی ی ژیانی یەتی.

## بتپەرستی و هاوشێوەکانی

هاوارێك بابلی هەژاندو نزیکەی سی و حەوت سەدە لەمەوبەر (ئیبراهیم) سەدای پێ دایەوە بۆ ڕیشەکێش کردنی بتپەرستی.. هاوارێك بەردەوام لەهەموو چەرخێك و هەموو ژینگەیەك دا سەدای خۆی دەزرنگێنێتەوە، چونکە بتپەرستی، ئەو پەرستشە بێنرخ و پوچەڵەیە کەسووکایەتیو بێحورمەتیکردنی بەعەقڵی ئینسانی تێدایەو دەرەنجامی ئەفسانەو وەهم وشتە بەتاڵ وپوچەڵەکانەو ئاسەوارەکانی لەدەروونی چەند کۆمەڵگەیەك دا تا کۆتاییەکانی (سەدەی بیستەم)ی ناسراو بەسەدەی زانست وڕووناکی هەرمابوو. بۆ نموونە هێشتا تا ئەمڕۆش هەندێك ئاین لەجیهان دا بڕیاری چەسپاندنی چەند بتێکی وەك هێمایەك بۆ شتە بەپیرۆز گیراوەکانی داوە، هەر لەئەستێرەکانی ئاسمانەوە تا ئاژەڵەکانی کێڵگەو باڵندەکانی ئاسمان و تەنانەت تا مەیموون ومارو فیل ومانگا کە بەپیرۆزیان دەگرن وبتیان بۆ دادەتاشن ودەیانپەرستن..

جا داخۆ شیکارو پاساوی بەردەوامی ی بتپەرستی لەم زەمانەمان دا چی بێت کەعەقڵی ئینسانی تیایدا بە چاورۆشنیو پەیبردنی ڕێگای ڕاست گەیشتووە؟! گەر بە دوای زانینی ئەو هۆکارە شارراوەو پاڵنەرانەی مرۆڤ دا لەسەر (بت پەرستی) بگەڕێین دەبینین بەندن بەهۆکاری لاسایی کردنەوەی باب وباپیرانیانەوە. قورئانیش بە ڕاشکاوی لەچواردەسەدە لەمەوبەرەوە ئەم ڕاستییەی جێگیرکردووە کاتێك دەربارەی ئەو سەردەمەی (ئیبراهیم) دواوە کەبت پەرستی ی تێدا بڵاوبۆتەوەو کە گەلە بت پەرستەکەش ئەو شیکارو پاساوانەی لاسایی کردنەوەی کوێرانەی باب وباپیریان لەپەرستنی بتەکانیان دا خستۆتە ڕوو، هەروەك خودای مەزن لە بارەیانەوە

فەرموویـــــە: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴾الشعراء/٦٩–٧٤.. واتە: (ئەی-محمد- تـۆش چیرۆکی – ئیبراهیم – بۆ بێ باوەڕەکانی نێو گەلەکەی خۆت بگێڕەوەو بۆیان باس کـە کاتێـك (ئیـبراهیم) بانگەوازی باوکی و گەلەکەی کردووەو پێ ی گوتـوون: (ئـەم شـتانە چین کـە دەیانپەرسـتن)؟ ئەوانیش گوتوویانە (ئەمانە چەند بتێکن دەیانپەرستین وبـەردەوام خوومـان بـە پەرسـتنیانەوە گرتـووە)، ئـەویش لێ ی پرسـیون (دەی کاتێـك دووعایـان لا دەکـەن و لێ یـان دەپاڕێنـەوە گوێبیستی دووعا و پاڕانەوەتانن؟ ئایا هیچ سوودێکتان پێ دەگەیەنن وهیچ زیانێکیان بۆتـان هەیە گەر نەیانپەرستن و وازیان لێ بێنن)؟، ئەوانێش لە وەڵام دا گوتوویانە: (بۆیـە ئـەم بتانـە دەپەرستین چونکە باب وباپیرانیشمان هەر وا دیوە)، واتە جـا ئێمـەش دەبێـت لاسـایی ئـەوان بکەینەوە) بێگومان هەر تەنها ئەو وەڵامەی گەلەکەی ئیبراهیم دەربارەی بت پەرستیەیەکەیان کەوا بە (هۆکاری لاسایی کردنەوەی باب و باپیرانیانە نەك بە هۆکارێکی دی)، دان پیانـانێکی ناڕاستەوخۆیە بەو حەقیقەتەدا کە بتەکانیان هیچ سوودو زیانێکیان نی یە. هـەروەها قورئـانی پیرۆز ئاماژە بۆ پاکانەیەکیتری بت پەرستیەیەکەیان دەکات: ﴿ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا.. ﴾العنکبـــــوت/٢٥.. واتـــە: (ئیـــبراهیم -دوای ڕزگاربوونی لە ئاگرەکە- بە گەلەکەی خۆی گوت: ئێوە کە ئەو بتانە لە جیاتی خودا دەپەرستن بۆ ئەوە نی یە باوەڕێکتان پێ یان هەبێت یان قەناعەتێکتان پێ یـان هێنـا بێـت، بـەڵکو بـۆ پاراستن و هێشتنەوەی ئەو پەیوەندی و خۆشەویستی یەی نێوان خۆتانـە لەسـەر حـسابی حـەق وبیروباوەڕی ڕاست کاتێك لەو پەرستگایانە پێك دەگەن وکۆدەبنەوەو لە ژیانی دنیادا چاوتان بە یەکدی دەکەوێت) دیارە ئەم ڕواڵەتە کۆمەڵایەتی یە لە نێو ئەو دەستە وتاقم وکۆمەڵانەدایە کە عەقیدەو بیروباوەڕیە گرنگ وبەجیددی ناگرن.

مرۆڤی ئەمڕۆی شارنشین وشارستانی خوازیش چـەندەها جـۆری تـازەی لـە بتـە ڕەمزیـو هێماداراەکان داهێناوەو لە جیاتی خودا دەیانپەرستێت، لـەو بتانـەش (کەسـێتی پەرسـتی)یـە کەسەرۆك وپێشەواکان لەوانەی کە هێزو دەسەڵات وپڕوپاگاندە کەسـێتی (شخصیة)یـانی وەك چەند پەرستراوێك بۆ داڕشتوونەوە، تا لەجیاتی خودا بپەرسترێن وچەند وەهم وئەفسانەیەکیـشی بۆ هۆنیونەوە کە وای لێ کردوون خۆیان لە پلەی خوایـەتی دا ببیـنن وقـسەو گفتاریـشیان بـە چەند ڕاستی یەکی وەها دابنرێت کە هیچ بوارێك بۆ بەرهەڵستی و بە ناڕاست دانیـان نـەبێت.

یەکێکی‌تر لەو بتانەی کە مرۆڤ خۆی ئەمڕۆ دروستیی کردووە (بتی نەتەوەو دیاردەی نەتەوە پەرستی) یە وەك ئەو کردەوەیەی (نازی یەکان) کاتێك (نەتەوە)یان بە سەرچاوەیەکی ڕەهای یاساو قیەم دادەناو ئینتیمای یەکەم و سەرەکی یان بۆی هەبوو و تەنانەت دروشمێکی دژ بە حەق و دادگەریی ی مرۆڤایەتییان بۆ دانا بوو وەك دروشمی (ئەڵمانیا لە سەروو هەموانەوەیە) و بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی و لەم جەنگەش دا نزیکەی حەفتا ملیۆن مرۆڤ بوونە قوربانی. خۆ دیارە نیشتمان نرخ وبەهای خۆی هەیە، بەڵام نەك تا ڕادەی بە پیرۆزدانانی ڕەها (مطلق) و نیازی باڵاو سەرەکی. چونکە ئامانجی بەرزترو بەهادارتر کە پێویستە مرۆڤ هەوڵ وتەقەللای بۆ بدات تەنها پەرستنی خودای تاك و بێ هاوەڵەو پەیڕەوی کردنی ئەو ڕاسپاردەو فەرمانانەیەتی دەربارەی (ڕێزگرتن لە مرۆڤ و خۆشەویستنی و هەڵس وکەوت لەگەڵ داکردنی بەدادو مافپەروەری، بێ گوێ دانە ڕەنگ ورەگەز).

# بەندی شەشەم

## (( چیرۆکـــی " لـوط " ))

(بەد ڕەفتاریی گەلەکەی " لـوط"- — پەیامی " لـوط"- فریشتەکان
لە ڕێگەیان دا بۆ " سەدوم "- — فریشتەکان لە میوانداریی " لـوط "
دا --- سزای خودا بۆ گەلەکەی " لـوط ")

## بەد ڕەفتاریی گەلەکەی "لـوط "

لەمەو پێش باسی ئەوەمان کرد (ئیبراهیم - سلاوی لیٚ بیٚـت) لـە شـاری (حـەڕران)ـــەوە (کەدەکەوێتە باکووری ولاتی دوو ڕووبار واتە-عیراق-ەوە) کۆچی بۆ (فەلەستین) کردووە لەگەڵ هاوسەرەکەیو ئەو کەسانەی باوەڕیان پیٚ ی هێنا بوو لەسەرووشیانەوە برازاکەی خۆی (لــوط- ی کوڕی-هاران). پاشان (ئیبراهیم) و (لــوط) دوای بلاو بوونەوەو تەشەنە سەندنی برسێتی لـە فەلەستین، چوون بۆ (میسر). ئینجا لە پاش ئـەوەی بـارگرانیی برسـێتییەکە سـووك دەبێـت وهەواڵەکە بەوانیش دەگات، لە (میسرەوە) دەگەڕێنەوەو ئـاژەڵێکی زۆریـشیان پیٚـدەبێت کـە پادشای (میسر) پیٚ ی بەخشیبوون.

دیارە ئەم ئاژەڵانەش پێویستیان بە مێرگ ولەوەڕگایە، جالە بەر ئەوەی لەوەڕگەکان کـەم و تەسك دەبن وئاژەڵەکانی هەردووکیان بەتەواوەتی جیٚ یان تـیادا نابێتەوە، ئیتر بەهۆی ئـەمـەوە چـەندین هــەراوناکۆکی لــەنێوان شــوانەکانی (ئیــبراهیم) وشــوانەکانی (لــوط)دا ڕوودەدات، (ئیبراهیم) وای بەباش دەزانێت بۆ نەهێشتنی ناتەبایی، زەوی یەکـە لەگـەڵ (لــوط)دا دابــەش بکات، لەم ڕووەشەوە داوا لە (لـوط) دەکات کام لایەی دەوێت هەڵی بـژێرێت، ئـەویش پارچـە زەویــی (ئــەردەن) هەڵدەبـژێرێت کەلــە هــەردوو شـاری (ســەدوم)و (عــەموورە) وناوچـەکانی دەوروبەریان پێك هاتبوو وخۆیشی لە شاری (سەدووم) دانیشت. خەڵکی ئەم شارە بـەدکارترین خەڵك و بیٚ باوەڕترینیان بوون، هەروەك کە بیٚ ویژدان ترین وبیٚ شەرم تـرین خـەڵکیش بـوون، جەردەو ڕێگربوون بـۆ دزی و ڕاووڕووت، بەکۆمــەڵ لــە شـوێنی کۆبوونــەوەی خۆیـان دا کـاری نابەجیٚ و ناشیرینیان دەکرد، لەهیچ کارێکی ناشیرین نەدەگەڕانەوە، بەدکرداری یەکی تازەشیان داهێنابوو کەلەوەوبەر هیچ کەسێك لەنەوەی ئادەم نەی کردبوو، ئەوەش نێربازی (لیواط) بـوو. خوداش بۆڕێنمایی کردن و ڕێگای ڕاست پیشان دانیان پێغەمبەری خۆی(لوط)ی بۆ ڕەوانەکردن تاکو لە ئاکامی خراپی کردەوەکانیان ئاگاداریان بکاتەوەو بیانترسێنێت لەسزای سەختی خودا.

# پەیامی "لوط"

(لوط) گەلەکەی خۆی بانگ دەکرد بۆ باوەڕهێنان بە خوداو بەسزای خودا دەیترساندن و هانی دەدان لەسەر وازهێنان لە گوناه وبەدکاری.. هەروەها پێ ی گوتوون: {من پێغەمبەری خودام بۆ لای ئێوە، دەسپاك و ئەمینم لەگەیاندنی پەیامی خوادا، جا ئێوەش لەسزای خودا وریابن و ئەوەی من فەرمانتان پێ ی دەکەم جێ بەجێ ی کەن، ئێ خۆ من هیچ کرێ و پاداشتێکم ناوێت لەسەر بانگ کردنی ئێوە بۆ ڕێگای ڕاست ودروست، چونکە پاداشتی من تەنها لای خودای خاوەنی (مالیکی) جیهانیان و پەروەردگاریانە، ئیتر بۆتان ڕەوانی یە سروشت ومیزاجی خۆتان تێك بدەن وبە پێچەوانەی ژیانی ئاسایی یەوە ڕەفتاربکەن وکاری ناشیرین و بەدکرداری لەگەڵ (نێرینەدا) بکەن وبەم ڕەنگەش ئەو ژنەهاوسەرانەی خۆتان فەرامۆش کەن کە خودا بۆی خولقاندوون، چونکە داخوازیی ڕاستەقینەو ئاساییش ئەوەیە (نێر) پەیوەندی بە (مێ) وەبکات لە (پەیوەندییەکی شەرعی ی هاوسەری دا). ئیدی چۆن ئێوە نەریت ومیزاجی خۆتان دەشێوێنن وئەم بەدکرداری یە ئەنجام دەدەن؟ بەڕاستی ئێوە بەم سەرپێچی یە گەورەیە لەسنوور تێپەڕیون} .. بەڵام ئەو گەلەش لە جیاتی ئەوەی بەدەم داواو بانگەوازی پێغەمبەرەکەیانەوە بچن، هەڕەشەیان لێ کردو پێ یان گوت: (ئەی لوط ـ گەر واز لەم گلەیی‌و سەرزەنشت کردنانەت نەهێنیت ئەوا لەم وڵاتەت دەردەکەین).. (لوط)یش گوتی: (من دژی ئەو کردارەتانم، ڕقم لەم کارانەتان دەبێتەوە)..

ئەمەی پێشوو شیکار و واتای ئەم ئایەتانە بوون کە خودا تیایان دا فەرموویە:

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ[1] ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ[2]﴾الشعراء/١٦٠-١٦٩..

سەرەڕای تاوانی (نێربازی ئەم گەلە چەندین تاوانی دیکەشیان ئەنجام دەدا، وەك کردارە ناشیرینەکان بە ئاشکرا لە نێو کۆڕو کۆمەڵەکانیان دا و ڕێگرتن لە گەشتیاران و ڕووت

---

(١) (عادون): واتە (دەسدرێژکارو تێپەڕێنەری یاساکانی خودا).
(٢) (القالين): واتە (زۆر ڕقم لێ ی دەبێتەوە).

کردنەوەیان و زەوت کردنی پارەو ماڵیان و پاشان دەسدرێژی کردنە سەر ئابڕوو و نامووسیان، دیارە (لـوط)یش بە توندی بەربەرەکانی ی ئەو هەموو تـاوان و بـەدڕەفتاری یانـەی گەلەکـەی دەکردو لەسزای سەختی خودا ئاگادارو وریای دەکردنەوە. بـەڵام ئـەو گەلـە هەڵگەڕابوونـەوە و خۆیان بەزل دەزانی و لووتبەرز بوون ویە (لـوط)یان گوت: (ئەگەر ڕاست دەکەیت و ڕاسـتگۆیت لەو هەڕەشەیەت دا دەربارەی هاتنی سزا بۆمان ئەوا هەر زوو بەپەلە بۆمان بێنە)..

ئەمەی پێشووش واتای ئەم ئایەتانەیە کە خودا تیایان دا فەرموویە: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ العنكبوت/٢٨-٢٩...

## فریشتەکان لە ڕێگەیان دا بۆ " سـەدوم "

لەمەو پێش لە داستانی (ئیبراهیم)دا باسی ئەوەمان کرد کەفریشتەکان (ملائکة) کاتێـك وەك چەند میوانێك لای ئەو لایان دا، لە ڕوخساری چەند کوڕێکی نەوجـەوان داخۆیـان پیـشان دابوو، یەکێك لەو هەواڵانەش کەبە (ئیبراهیم)یان گەیاند ئەوە بوو ئەوان بەڕێوەن بـەرەو لـەناو بردنی گەلەکەی (لـوط) بەهۆی ڕۆچوونیان لە بەدڕەفتاری دا. ئەویش بەم هەواڵە دڵتەنگ بـوو کاتێك زانی ی ئەم فریشتانە خەڵکی شاری (سەدوم) لە نێـو دەبـەن چـونکە (لـوط)ی بـرازای خۆی تێدایە. هەر بۆیەش بەفریشتەکانی گوت: (ئێ خۆ-لــوط-ی لێ یـە)، ئـەوانیش گوتیـان (بەڵێ، ئێمەش دەزانین -لـوط-ی لێ یە، بەڵام تیاچوونەکە تەنها بۆ ئەو کافرانەیە کە باوەڕبـە خودا ناهێنن. دەنا -لـوط-وکەس وکاری و ئەو ئیمانداارانەش لە گەڵی دان هەموویان پارێزراوو ڕزگارکراون لەوسزایە تەنها هاوسەرەکەی-لـوط- نەبێت کە تووشی هەمان سزای کافران دەبێت سەرەڕای ئەوەی ژنی-لـوط-یش بێت هەر ڕزگاری نابێـت، چـونکەکردەوەی بـەدو ناهـەمواری هەبووەو،خیانەتی لەمێردەکەی کردووەو، زۆر سوور بووە لەسەر بەربەرەکانی و بێ باوەڕی)..

ئەم گفت وگۆیەی پێشووی نێوان (فریشتەکان)و (ئیبراهیم) واتای ئەم ئایەتانەیە کە خودا تیایان دا فەرموویە: ﴿وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ[1] إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ[2] قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ

(١) (رسلنا): واتە: (مەلائیکەکانمان).

(٢) (البشری): مەبەست مزگێنی دانە بە(ئیبراهیم)کەوا خودا کوڕێکی بە ناوی (ئیسحاق) پێ دەبەخشێت.

هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ[1]﴾ العنكبوت/٣١-٣٢..

## فریشتەکان لە میوانداریی -لـوط- دا

فریشتەکان (ئیبراهیم)یان جێ هێشت وبەرەو شاری "سەدووم" کەوتنە ڕێو لەوێش بوونە میوانی (لـوط) بەڵام ئەو نەیدەزانی ئەمانە چین وکێن.. هەروەها هەستی بەشەرمەزاری و بارگرانیەیەکی زۆریش دەکرد لەو هاتنەیان دا، چونکە ئەوان (واتە ئەم میوانانـە) زۆر جـوان و ڕووگەش بوون و دەترسا لەوەی گەلەکەی دەسدرێژی بکەنـە سـەر ئابڕوویـان، دیـارە ئـەرکی میوانداریتییش وادەخوازێت کە بیانپارێزێت لـە هـەر ئـازارو ستەمێك و، لـە هـەر کـارێکی ناخۆش ونابەجێش بە دووریـان کـات. ئـەو مەترسـی یانەشـی بـە بیرداهـات کەلـە ئەنجامی میوانداریتی یانەوە تووشیان دەبێت، هەر بۆیـەش لـەدڵی خـۆی دا گـوتی: (ئـەمڕۆ ڕۆژێکـی سەخت وناخۆش وپڕلە ئازارە). بێگومان هەواڵی هـاتنی ئـەو میوانـە جـوان وقۆزانـە بـۆ لای (لـوط) لە نێو ئەو گەلە بەدکردارەدا بڵاوبووبووەوە وخێراو بەهەڵەداوان بەرەو ماڵەکەی (لـوط) دەچوون ولەچوار دەوری گردببوونـەوە وبەتـەمای ئەنجامـدانی بـەدڕەفتاری بـوون لەگـەڵ ئـەو میوانانەدا. (لـوط)یش دیتی ئەوا بەدکرداران تێکڕاله دەوری ماڵەکەی کۆبوونەتـەوەو لـەنیازە گەندەڵەکەشیان تێ گەیشتبوو، لەبەرئەمە داوای لەسـەرانی گەلەکـەی کـرد کـچەکانی خـۆی بخوازن (وەك پیشاندانی مامەڵەیەکی باش لەگەڵیان دا) لە جیاتی ئەوەی تـوخنی میوانـەکانی بکەون بۆ مەبەستی بەدڕەفتاری، هەروەها هیوای ئەوەشی لێ خواسـتن کەلـە نێـو ئـەو گەلـە بەدکارەو سەرانی ملهوڕیان دا پیاوێکی ژیرو عاقڵ هەبێت وملی بـە هـەق بـدات ولـە ناهـەق پاشگەزبێتەوەو یارمەتیشی بدات لەسەر هوشیار کردنەوەی گەلەکـەی ودوورخـستنەوەیان لـەو گومڕایی یە.

کەچی ئەو گەلە بە وتەکانی (لـوط) قایل نەبوون، بەڵکو پێ یان گوت: (تۆ چاك دەزانیت ئێمە هیچ ئارەزوویەکمان لە خواستنی کچەکانت نی یەو بەتەمای زەواج نین لێ یان، بـەڵکو -خۆت بێ شك- چاك دەزانیت چیمان دەوێت). ئینجا -لـوط- ناچاربوو بەئاشکرا هـەواڵی ئـەو مەترسیيە بە میوانەکانی بگەیەنێت کە خەریکە ڕوویان تێ دەکات، بۆیە بە ڕاشـکاوی پێـی گوتن: (ئەگەر بە هۆی مانەوەی زیاترتـان لـەلام هێـزو توانـای ئـەوەم هەبوایـە بـۆ بـەرەوڕوو بوونەوەی ئەو بەدڕەفتارانە، ئەوا سێ ودووم لێ نـەدەکردو بـەرگریيم لێ دەکـردن، خـۆ ئەگـەر

---

(١) الغابرین: واتە یەکێك لەوانەی ماونەتەوەو شایستەی سزاکەن.

کۆمەڵێکی بەهێزیشم لە خزم وکەس و کارو لایەنگر هەبوایە بۆ پشت پـێ بەستنیان لـەکاری پاراستنی ئێوەدا ئەوا پەنام بۆ دەبردن، بەڵام بەداخـەوە هـیچ تـەگبیرو ڕێگەچـارەیەکی ئـەوتۆ بەدی ناکەم بۆ بەرەنگاربوونەوەیان وبەرگری کردن لە ئێوە)..

ئەم ئاخاوتن و دەمەتەقێ یانەی پێشووش تەفسیرو شیکاری ئەم ئایەتانەی تـرن کـە خـودا تیایان دابەشێکی بەسەر هاتەکەی تێدا گێڕاوەتەوەو فەرمووییە:

﴿وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ (١) وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا (٢) وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ (٣) إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى (٤) هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ (٥) ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ (٦) ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ ﴿٧٨﴾ قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ (٧)﴾هود/٧٧-٨٠.

---

(١) (سیء بهم): واتە (هاتنی فریشتەکان بۆلای — لـوط — بووە هۆی ئەوەی ناخۆشی یـەکی بـۆ دروست بێت چونکە وای بۆدەچوو ئەمانەش مرۆڤن ولە ماڵی ئەودا دەکەونـە بـەر دەسـدرێژیی بـەدڕەفتاران ، بـەڵام لەڕاستی دا فریشتە (ملائکە) بوون).

(٢) (ضاق بهم ذرعاً): واتە (دڵتەنگ وپەرێشان بوو).. بۆ نموونـە لـە زمـانی عەرەبی‌دا گـەر بگوترێـت: (ضقت بالامر ذرعاً) واتە (لە وزەو تواناتانەبووەو دەرەقەتی نـەهاتوویت). (لـوط)یـش بۆیـە دڵتـەنگ بـووە چونکە نەیتوانیوە میوانەکانی بپارێزێت.

(٣) (یهرعون): (یسرعون): واتە (بەپەلەو هەڵەداوان دەهاتن بەمەبەسـتی بینینـی ئـەو میوانـە جوانانـەو دەسدرێژی کردنە سەر ئابڕوویان).

(٤) هؤلاء بناتي: (لەوانەیە هەندێك كەس پرسیارێك بەخەیاڵیان دابێت دەربارەی ئـەوەی چـۆن - لـوط - کچەکانی خستۆتە ڕوو بۆ زەواج لەو بەدڕەفتارانە و پێشنیازی ئـەوەی بـۆ کـردوون، لـە وەڵامـی ئـەم جـۆرە پرسیارانەش دا گوتراوە (- لـوط ـــ بۆیـە وای کـردووە تـەنها وەك مامەڵەیـەکی جـوانی سـەرزارەکی، نـەك بەمەبەستی گەیشتنە سنووری عەمەلی یەکەی، ئەمەش بۆ ئەوەی شەرمەزاربن وتـەریق بنـەوە و دەسـت لـە میوانەکانی هەڵگرن)، گوتراویشە (مەبەست لە کچەکانی خۆی "بناتي" واتە ئافرەتانی نەتەوەکەی بە تێکـڕا) چونکە هەر پێغەمبەرێك باوکێکە بۆ نەتەوەکەی).

(٥) (هن أطهرلکم): واتە خواستنی ئەو کچانەو ژنهێنان پاکترە لە کردەوەی (نێربازی).

(٦) (لا تخزون في ضیفي): واتە بە هۆی میوانەکانمەوە عەیب بارو لەکەدارم مەکەن.

(٧) (آوي الی رکن شدید): واتە پەنا بەرمە بەر بەهێزێك وخۆمی پێ‌سەرخەم. پێغەمبەری ئیسلام محمدﷺ سەرسامی ی خۆی لەم وتەیەی (لـوط) پیشان داوە، هەروەك لەو فەرموودەیەدا کـە (بخـاری) گێڕاویێتـی یـەوە پێغەمبەرﷺ فەرموویە: (خودا لە ـ لـوط ـ خۆش بێت لەسەر ئەوەی پەنای دەبردە بەر (بەهێزێك) لـە کاتێـك دا بەهێزەکە هەر خودای پەروەردگارو خالقیشی بووە) ((یغفر الله للوط انه کان لیأوی الی رکن شدید وهو ربـه وخالقه)).

# سـزای خودا بۆ گەلەکەی - لـوط -

لە کاتێك دا هەراو هوریاو بەیت وبالۆرە لەبەردەم ماڵی (لـوط)دا پەرەی دەسەند وئەویش نەیتوانی بوو ئەو گەلەی خۆی قایل کات بە پاشگەزبوونەوە لەو نیازە خراپەیان، لەو سـاتانەدا فریشتەکان (کە لەڕوخسارو سیمای چەند مرۆڤێکی گەنج وجوان دا خۆیان دەنواندو میـوانی - لـوط-بوون) هەموو ئەو بەدڕەفتارانەیان تووشی کوێری ونابینایی کـرد، ئـەوەش دوای ئـەوەی خەریك بوون نیازە ناڕەواکەیان جێبەجێ بکەن وهێندەی نەمابوو کە توخنیان کەون، بەڵام هـەر کە کوێریان کردن ئیتر پەرش وبڵاوبوونەوەو لێك جیابوونەوەو بەسەر شۆڕی وڕیسوایی گەڕانـەوە بۆئەو شوێنانەی لێ یانەوە هـاتبوون، هـەروەك خـوداش فەرمووییـە: ﴿ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا۟ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴾القمر/٣٧.. واتە: (ئەو گەلە بەدڕەفتارەداوایان لە -لـوط- کرد ڕێ یان بدات بەدکرداری لەگەڵ میوانـەکانی دا بکـەن، بـەڵام ئێمـە کوێرمـان کـردن لـە سەردەستی ئەو میوانانە وکاریگەری و شوێنەواری ڕوانینی سەر چاوانیانمان سڕییەوە، دە ئـیتر ئەی بەدکاران بچێژن ئەو سزایانەو ئاکامی ئاگاداری و ورباکردنەوەکانم).

پاشان هێندەی نەبرد کە فریشتەکان خۆیان بە (لـوط) ناساندو پەردەیان لەسەر حەقیقەتی ئەرك و کەسێتیی خۆیان لادا وهۆی هاتنیشیان بۆ ئەو شارە پێ ڕاگەیاند لە دوای ئەوەی چاوی خەڵکە بەدڕەفتارەیان کوێرکرد بە فەرمانی خودا، تاکو نـەتوانن دەربـازو قوتـاربن، جگـە لـە ڕزگارکردنی (لـوط)یش لەشەڕو خراپەیان، لەم بارەیەوە بە (لـوط)یـان گـوت: (نـاتوانن هـیچ ئازارێك بە خۆیشت بگەیەنن، تەنانەت ناتوانن لەسەر ئێمەش سەرزەنشت و خـەتابارت بکـەن، جا تۆش خۆت وکەس وکارو ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ئەمشەو لەم شارە دەرچن و کەستان ئاوڕ بۆ دواوە نەداتەوە تاکو ڕادەی ئـەو سـزا سـەختە بـە چـاوی خـۆی نـەبینێت و زیـانێکی پـێ نەگەیەنێت، بەڵام هاوسەرەکەت کە ناپاکی ی لێ کردوویت نابێت لەگەڵتان دابێت، چونکە هەر دەبێت بەر ئەو سزاسەختەی تیاچوون بکەوێت کەتووشی ئەو گەلە دەکرێت، وادەی جـێ بـەجێ کردنی سزای لەناوبردنیشیان بەرەبەیانی سـبەینێ یـە و ئـەم وادەیـەش نزیکـە). کاتێـك ئـەو سزایەی کە خودا داینابوو بۆیان وبڕیاری جێ بەجێ کردنی دابوو هاتەدی، ئیتر بەرزیو نزمی ی ئەو شارەی کەگەلەکەی (لـوط)ی تێدا نیشتەجێ بوو وەك یەك لێ کـراو بەسـەریەك دا تـەخت کرا، هەروەها لەئاسمانیشەوە بەردباران کـران بـە جـۆرە بـەردێك کەلـەقوڕی تونـدو کۆبـۆوەی لەسەریەك وڕەق وبەردین پێك هاتبوو ویەك لەدوای یەك وبە شـێوەیەکی وردو ڕێـك خـراو وەك باران بەسەریان دا دەباری بە پێ ی ئەو سزادانەی کە خودا بڕیاری دابوو، دیارە سـزای خـوداش

نزیکە لە ستەمکارانی بەدکردارو لێ یان دوورنی یە..

خودای گەورە فەرموویـە: ﴿قَالُواْ يَـٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيْكَ ۖ فَأَسْرِ [١] بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ [٢] وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ ۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا [٣] جَعَلْنَا عَـٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ [٤] ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ۖ وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾هود/٨١– ٨٣.. ئەو پارچە زەوییەش کەبەر ئەو سزا سەختەی خودا کەوتووە ئـەمڕۆ بە دەریای مردوو (البحر الميت) ناسراوە، یان بە دەریاچەی (لـوط) (بحيرة لوط).

هەندێك لە زانایان ڕایان وایە گوایە ئەم (دەریای مردوو)ـە پـێش ئـەو ڕووداوە لـە ئـارادا نەبووە، بەڵکو لە ئاکامی ئەو بومەلەرزەیە بووە کە سەروخوارو باکووروباشووری ئـەو وڵاتـەی وەك یەك لێ کردووەو تەختی کردووەو بەم هۆیەوە نزیکەی (چوار سەد مەتر) نزم تـر بووەتـەوە لە ڕووی دەریا. لەم ساڵانەی ڕابردووش دا چـەند هـەواڵێك بڵاوکرانـەوە دەربـارەی دۆزینـەوەی چەند ئاسەوارێکی شارەکانی گەلەکەی (لـوط) لەسەر لێواری دەریای مردوو.[٥]

---

(١) (أسر): واتە شەوڕەوییان پێبکە. لە (سري) وەهاتووە، واتە لە بەشی یەکەمی شەودارۆی.

(٢) (بقطع من الليل): واتە لە بەشێکی تاریکی شەودا، یان لەدواین بەشیدا.

(٣) (جاء أمرنا): أي (عذاب الله): واتە کاتێك وادەی سزادانمان هاتە پێشەوە.

(٤) (منضود): واتە یەك لە دوای یەك، خێرا خێرا دەنێران لەو بەردە گلێنە پتەوو ڕەقە.

(٥) بڕوانە کتێبی (قصص الانبياء)ی مامۆستا (عبدالوهاب النجار).

# بەندی حەوتەم

## ((چەند پەنــدو وانــەیەك))

(ئاگادارکردنەوە لە نێربازی- زیانە تەندروستی یەکانی نێربازی- سزای خودا بۆ نێربازان- بەرگری کردن لە میوان)

## ئاگادارکــردنەوە لە نێربــازیی

لە چیرۆکی -لــوط-دا تاوانی (نێربازی) بە کارێکی زۆر دزێوو ناشیرین دانراوەو هەڕەشــەی توندیشی لە خوداوە تێدایە لەسەر سزای سەخت لە دنیاو ڕۆژی دوایی دا بۆ ئەنجام دەرانی.

(نێربازی)یش لە ناشیرینترین و گەندەڵترینی بەد ڕەفتاری یەکانە، چونکە بەڵگەیەکی ڕوون ودیارە لەسەر وجودی فەسادو نەخۆشی لە میزاجی مرۆڤایەتی دا.. مەترسی یــەکی گەورەشــی لەسەر کۆمەڵگەی بەشەری هەیە ومرۆڤ شۆڕدەکاتەوە بۆ ئاستێکی نزمی ئارەزووی ئاژەڵیانــەو تەنانەت خوار ئاژەڵیانەش.

قورئــانی پــیرۆز بایــەخێکی زۆری بەباســکردنی مەســەلەکە داوەو لەچــەندین شــوێندا سەرزەنشتی ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە گەورەیەی کردووەو ڕیسوای کردوون. گەلەکەی-لــوط-یش کە نێربازی (لواط)یان تێدا بڵاو بووبووەوە، بە چەندین ســیفەتی بێــزراوو ناشــیرین لەقورئانــدا وەسف کراون.خودا لەشوێنێك دا بــە دەســدرێژ کــارو تــەجاوزکار وەســفیان دەکــات: ﴿ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴾ الشعراء /١٦٥ —١٦٦ .. لەم ئایەتانەدا سەرنج لە وشەی (قوم عادون) بــدە، بــەمانای ئــەوان تەجاوزکارو تێپەڕێنەری سنوورەکانی شەریعەتی خودان، هــەروەها دەســدرێژکارو تێپەڕێنــەری هەر بەهاوقیەمێکی ڕاســت و دروســتن، بــەم پــێ یــەش بــوون بــەو تاوانبارانــەی کــە دەبێــت تاوانەکەیان بنبڕبکرێت بەو سزایەی بەرپەرچیان پــێ ی دەدرێتــەوە... لــە شــوێنێکی دیکــەی قورئان دا خودا بەجەهل وەسفیان دەکــات:﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾النمل/٥٥، جەهل وەك چۆن مانای ئەو نەفامی یە دەگرێتەوە کە دژی زانست (علم)ــە، مانای بــەدکاری و شــەڕەنگێزییش دەگرێتــەوە، مرۆڤــی بــەدکارو لاســاریش نابێــت

بوارێکی لەبەردەم دا بمێنێت بۆ ئەوەی بەئارەزووی خۆی هەڵسووڕێت و پەلاماربدات و تەڕو وشك پێکەوە بسووتێنێت، بەڵکو دەبێت ڕێ لە هەڵس وکەوتی بگیرێت و لەسەر بەدکاری و لاساری یەکانی سزابدرێت. هەروەها خودا بە سیفەتی (زیادەڕۆیی) وەسفی کردوون: ﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴾الاعراف/٨١..

بە مانای لە هەواو ئارەزوودا زیادەڕۆیی یان کردووە و لەو سنوورانەش تێپەڕیون کە خودا بۆ بەندەکانی کێشاون. زیادەڕۆیانیش ئەودۆست وهاوڕێیانەی شەیتانن کەوا کۆمەڵگەکەیان دەشێوێنن و،کە پێویستە بەرەو ڕوویان بووەستین و ڕێگەلە زیادەڕۆیی یان بگرین.

کاتێك دەبینین قورئان بەتوندی دژی ئەم بەدڕەفتاری یەیە، کەچی دەبیسین ودەبینین (مرۆڤی پێشکەوتووخواز و شارنشین) لەکۆتایی سەدەی بیست داو لە (سێ یەکی دوایی ی ئەم سەدەیەدا)لەهەندێك ولاتانی خۆرئاوادا بەئاشکرا دەستی کردەوە بە ئەنجام دانی ئەو بەدڕەفتاری یە بەپاساوی سەربەستی ی تاکەکەسی و بەقۆستنەوەی چاوپۆشی ی(دەسەلاتداریتی ی یاسادانانیش لەو ولاتانەدا)، کە بەڕاستی لەلای ئێمە جێگای سەرسوڕمان و سەیر لێ هاتنە.

جا ئایا سەربەستی ی شەخصی و تاکەکەسی مانای(ڕێ پێ دان بەو جۆرە ئارەزووەی(نێربازی)دەگەیەنێت)،کە ئاکاری ئافرەتانیش تێك بدات بەهۆی ڕوو وەرگێرانی پیاوان لێ یان و، ئینجا سیستمی خێزانیش تێك بدات؟ ئەو سیستمەی کە ستوونەکەی لەسەر بەرپرسیارێتی و سۆز و بەزەیی ڕاوەستاوە.

ئایا سەربەستیی شەخصی مانای پەك خستنی ئەو تۆوە دەگەیەنێت کەخودا بۆ ئاوەدان کردنەوەی گەردوونی داناوە و هەست و ئارەزووەکانیش بەبێ ڕێکخەرێك پشت گوێ بخرێن؟ بێگومان ئەمەش بونیادی کۆمەڵ و ئاسایش وهێمنی یەکەی بە تەواوەتی لەناو دەبات.

## زیانە تەندروستییەکانی نێربازیی

(نێربازی) سەرەڕای زیانە کۆمەلایەتی یەکانی، چەندین ئاسەواری خراپی لەسەر تەندروستی ی مرۆڤ هەیە، چونکە وەکو زینا چەندین نەخۆشی تووشی مرۆڤ دەکات، وەك نەخۆشی یەکانی (زوهری-و-سیلان-و-زامی نەرم وشل) و نەخۆشی یەکانی پێست وەك حەساسیەتی پێست و خورانە جۆراوجۆرەکانی تری. هەروەها (نێربازی) چەند نیشانەیەك لەسەر (کۆم) دروست دەکات وەك لاوازی ی ماسولکەی گوشین تا ئەو ڕادەیەی کە توانای خۆڕاگرتن لەسەر پیسایی‌کردنی نامێنێت و بەبێ خواست و ئیرادە خۆی پیس دەکات،جگە لەدڕانی کۆم و نەمانی ئەو دەزوولە خوێنانەی چواردەوریان گرتووە، پاشان قووڵ دەبێتەوە تا لە شێوەی قووچەکێك دەچێت. کۆمیش پڕە لە چەندەها میکرۆبی وەها، کە دەچنە نێو ئەندامە جنسی

یەکەی تاوانباری نێربازەوەو لەسەر بۆڕی وکونی میزکردن ئاوسان (التهابات) دروست دەکەن.
لەوانەشە کارلێکراوەکە (مجني عليه) نێرەمووك ببێت گەر لەکاتی منداڵی یەوە ئەم خووە ناشیرینەی گرتبێت، هەر بۆیەش پیاوەتی ی زیاتر لە خۆی دا پیشان دەدات تاکو ئەو کەم و کوڕی یەی خۆی پێ داپۆشێت.. بەم ڕەنگەش بۆمان دەردەکەوێت خودای مەزن هەر فەرمانێکی بە مرۆڤ کردبێت لەسەر هەر کاروبارو مەسەلەیەك تەنها بۆ ساغی و بەختیاری ی خودی مرۆڤ بووە، هەر شتێکیش زیانی مرۆڤی تێدا نەبووبێت لێ ی حەرام نەکردووە.

## سزای خودا بۆ نێربازان

جێ ی باسیشە قورئان بەڕوونی باسی ئەو سزا سەخت وتوندو تیژەی کردووە کە تووشی ئەنجامدەرانی ئەم جۆرە بەدڕەفتاری یە هاتووە تاکو گەل ونەتەوەکانی دیکەش لەمەترسی ئەو کردارە ناشیرینە وریاببنەوەو خۆیان لەشەڕو خراپەکانی بپارێزن.(سەدووم) واتە ئەو ناوچەیەی کە ئەم بەدڕەفتاری یەی تێدا بڵاو ببووەوە کەوتە بەر ئەوسزا سەختەی کەلەقورئان دا کارەساتەکەیان دیاری کراوە، هەروەك خودا تێ ی دا فەرموویە: ﴿ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴾الحجر/٧٤..واتە: (وڵاتەکەیانمان ژێرەو ژوورکردو سەروو خواریمان وەك یەك لێ کردو لەئاسمانیشەوە بەبەردی گڵینی بە ئاگر سوورکراوە بەردبارانمان کردن).
بێگومان قورئانی پیرۆز هەموو گەلانی سەرزەوی لەم کردارە پیس وگەندەڵە ئاگادار دەکاتەوەو داوایان لێ دەکات لێ ی بێ دەنگ نەبن وبنبڕی بکەن تاکو تووشی هەمان سزای سەختی گەلەکەی (لوط) نەبن، چونکە قورئان لەکاتێك دا باسی داب ونەریتی گەلەکەی (لوط) وسزا توندەکەیانی کردووە، دوای ئەوەش ئەم ڕستەیەی هێناوە: ﴿..وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾هود/٨٣.. بە مانای "بێگومان سزا دوورنی یە لەو کەسانەی هەمان ڕەفتاری گەلەکەی (لوط) دەکەن، بەڵکو سزای خودا شایستەی هەر کەسێك دەبێت گەر هەمان کرداری ئەوان ئەنجام بدات ".
ئەم هەڕەشە خودایی یە بە تێپەڕبوونی چاخ وسەردەمەکان کارایی و مەودای فراوانی خۆی هەیە و ڕێسایەکی نەگۆڕە بۆ ئاگادارکردنەوەی گەلان لە ئاکامی فەسادی و بەدکاری، ئەو هەموو بەڵاو کارەساتەی لە سەردەمی نوێش دا بەسەر هەندێك لە گەلانی سەرزەوی‌دا هات بە هۆی مەینەتی یەکانی هەردوو جەنگە جیهانی یەکەوە هێشتا لە بیرنەچوونەوە و سام و ترسیان لە هزری دنیادا ماوە، هەروەها ئەو هەموو کارەساتە سرووشتی یانەی (وەك بومەلەرزەو لافاوو گەردەلوول وگڕکان و... هتد) پەندی زۆریان بۆ (پەند وەرگران) تێدایە.

## ئیسـلام و سـزای نێربازیی

لەم ڕووەوە ئیسلام سزای توندی بۆ هەر کەسێك داناوە گەر کرداری (نێربازی) ئەنجام بدات. هەندێك لە زانایانی ئیسلامیش بیروڕایان وایە کەوا مرۆڤی (لیـواط کـار) دەبێـت بـەردباران (ڕەجم) بکرێت سا ئیتر ژنی هێنابێت یان نا، ئەم حوکمەش ڕای هەریەکە لە پێشەوایانی بـەڕێز (ئیمامی شافیعی- و -ئیمام ئەحمـەد-ی کـوڕی-حەنبـەل-وکۆمـەڵێکی زۆر لـە پێـشەوایانی تریشی لەسەرە، بەڵگەشیان لەم بارەیەوە ئەو فەرموودەیەیە کە(امام احمد)و پسپۆڕانی سوننەت (أهل السنن) لە (ابن عباس)ـەوەو ئەویش لـە پێغەمبـەرەوەﷺ گێڕاویانەتـەوە کـە تیـای دا فەرموویە: ((من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول بـه)) واتـە: (هـەر کەسێکتان بینی خەریکی هەمان کرداری گەلەکەی -لـوط-بـوو ئـەوا لـەو حاڵەتـەدا بکـەرو کارلێکراویش بکوژن). بەڕای ئیمام-ابو حنيفه-(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەبێت لیـواط کـار لەسەر لوتکەی بەرزی چیایەکەوە بەربدرێتەوەو پاشان بـەردباران بکرێـت وەك چـۆن گەلەکـەی (لـوط) ئاوایان بەسەرداهات، ئەمەش بۆ جێبەجێ کردنی فەرمایشتەکەی خـودا: ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾هود/٨٣.

## بەرگـری کردن لە میـوان

هەر لەم بەسەرهاتەی "لـوط پێغەمبەر"دا -سلاوی خوای لێ بێت- وانەیەکی بە کـەڵکی دیکە هەیە لە ڕێزلێنان لە میوان و بەرگری لێ کردن بـە هـەموو جـۆرە هۆکـارو ئـامرازێکی شیاو. بێگومان میوانیش لە ژیانی ئینسانییمان دا برایەکمانە کەبە شێوەیەکی کاتی پـەنامان بۆ دێنێت بە مەبەستی بەدی کردنی نیشتگایەك بۆ تێدا حەوانەوەی و پشوودانی لەناڕەحەتی و ماندوێتی ی سەفەر، یان بە مەبەستی داواکردنـی ژەمـەخۆراکێك بـۆ قوتـار بـوون لەحاڵـەتی برسێتی، یاخود داوای پارێزگاری دەکات لە دەسدرێژی یەك کە خەریکـە دەکرێتەسـەری. ئـەو (واتە میوان) برایەکمانە لەلایـەنی مرۆیـی یـەوەو جلـەوی کاروبـاری خـۆی و هـەموو گرفـت وکێشەیەکی خستۆتە بەردەستمان. جا ئیتر ئـەوە کـارێکی جـوامێری و مـرۆڤ دۆسـتیو سـۆز پەروەری یە گـەردەرکرێت ودەرگاکـان بـەڕووی دا داخـرێن؟ -لـوط-ی پێغەمبـەری خـوداش لەکەسێتی (شخـصية)ی خۆی دا ئاکاری بەرزی (ڕێز لەمیوان نان و بەرگری لێ کردن و قوربانی بۆدانی بەنرخترین شت) پیشان دەدات، ئەویش کاتێك دەبینێت کەوا میوانەکانی (کەمەلائیکە

بوون) وبەلام لە شێوەو ڕوخساری چەند لاوێك دا خۆیان دەرخستبوو، هەست بەدروست بوونی ئەو گرفت وبارگرانی یە دەکات کەبە هۆی میوانداریێتی کردنیانەوە تووشی دەبێت، هەر چەندە بێگومان دەیتوانی هەر لەسەرەتاوە بەمیوانیان پەسندنەکات ودەرگای ماڵەکەی بەڕوویان دا داخات وخۆی لە ئەگەری هاتنە ئارای ئەو گرفت وتەنگ و چەڵەمانە بە دووربگرێت کە تا ئەوکاتە لەو جۆرە نارەحەتیانە بە دووربووە، کەچی وێڕای ئەوەش دەبینین چۆن پێشوازی لە میوانەکانی دەکات و دەروونیشی زۆر بێ ئارام و نیگەرانەو چاوەڕێی ڕووداوی زۆر دەکات ولە دڵی خۆیشیدا دەڵێت: (بەڕاستی ئەمە ڕۆژێکی زۆر سەخت وناخۆشە): ﴿هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ هود/٧٧. وەك چاوەڕوانیش دەکرا ئەو گەلە بەدڕەفتارە بەپەلە خۆیان دەگەیەننە لای ماڵەکەی بەنیازی دەسدرێژی کردنە سەر ئابڕووی میوانەکانی.. (لوط)یش بۆ بەرگری کردن لێ یان گرنگ ترین و بەنرخترین قوربانی یان بۆ تەرخان دەکات کە کچە جگەرگۆشەکانی خۆیەتی و ئەو پێشنیارە دەخاتە بەرچاوی هەموو ئەو بەدڕەفتارانەی کە هاتوونە بەردەرگای ماڵەکەیو بەڕاشکاوی پێ یان ڕادەگەیەنێت کەوا ئامادەیە کچەکانی خۆی (بە ڕێسای زەواج و بەشوودان) مارە ببڕێت لێ یان لە جیاتی ئەوەی بەو شێوازە نائینسانی و بەدکاری یە دەسدرێژی بکەنە سەر ئابڕووی میوانەکانی.

پاشان کە دەبینێت ئەو بەدڕەفتارانە هەر سوورن لەسەر نیازە خراپەکەیان، بیر دەکاتەوە چۆن بەرگری یان لێ بکات وبەهێز بەرپەرچیان بداتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەیەوێت هێزی خۆیو هێزی میوانەکانیشی یەك خات و بەرگری یەکیان پێ بکات. پاشان دەیەوێت بەراوردیان پێ بکات لەگەڵ هێزی دوژمنەکانی دا ودەبینێت هێزەکەی خۆیان ئەوەندە نی یەو دەستەوسانن لە بەرگری، ئیتر لەوێ دا ئومێد دەخوازێت گەر هێزێکی گەورەتری هەبوایەو بەرگری ی لە میوانەکانی پێ بکردایە.. ﴿..لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٖ شَدِيدٖ﴾هود/٨٠.

کەوا بوو لەمەدا وانەیەکمان بۆ دیاری کراوە دەربارەی ڕێز لە میوان نان و پاراستنیو بەرگری لێ کردنی.. هەر لەم ڕووەشەوە ئەو ڕاسپاردەو ئاکارە بەرزی پێغەمبەری خۆشمان (محمدﷺ) بەبیردێتەوە کە چۆن بەوپەڕی پەرۆشی و سووربوونەوە جەختی کردووەتە سەر ڕێزنان لە میوان و ئەوەشی بە باوەڕداریێتی یەوە پەیوەست کردووە، هەروەك فەرموویە: ((**من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلیکرم ضیفه**)). واتە: (هەر کەسێك باوەڕی بەخوداو ڕۆژی دوایی هێنابێت دەبێت ڕێز لە میوانی بگرێت).

# بەشی شەشەم

## ئیسحاق سڵاوی خوای لێبێ

## یەعقوب سڵاوی خوای لێبێ

## یوسف سڵاوی خوای لێبێ

١- چیرۆکی ئیسحاق و یەعقوب

٢- یوسف و فێڵی براکانی

٣- یوسف و چەواشەکاری ژنەکە

٤- یوسف لە زینداندا

٥- یوسف .. وەزیری پادشا

٦- یوسف و ناسینەوەی براکانی

٧- بە یەك گەیشتنەوەی یەعقوب و یوسف

٨- چەند وانەو پەندێك

# بەندی یەکەم

## (( چیرۆکی " ئیسحاق " و " یـەعقوب " ))

( پێغەمبەرێتی ی (ئیسحاق) و (یـەعقوب) - کورتەیەك لە ژیانی (ئیسحاق) و (یـەعقوب) - نەوەکان — پێغەمبەرێتی ی (یوسـف) )

## پێغەمبەرێتی ی " ئیسحاق " و " یـەعقوب "

ئیسحاق -سلاوی خودای لیّ بیّـت- کـوڕی (ئیبراهیمـە) -سـلاوی خـودای لیّبیّـت- لـە "سارە"ی هاوسەری یەوە، لەکوڕ و نەوەکانی (ئیسحاق)یشەوە پێغەمبەرانی (بەنو ئیـسرائیل) هاتوون، لەپێش هەمووشیانەوە (یـەعقوب)ی کوڕی - سلاوی لیّ بیّت.

پێغەمبەرێتی (نبوة)یش لە نەوەکانی "ئیبراهیم"ەوە (واتە لەهەردوو کوڕەکەی خـۆی -لـە ئیسماعیل و ئیسحاق-ەوە بووە)، هەروەك خـوداش فەرموویـە: ﴿..وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ..﴾العنکبوت/٢٧..

هەروەها خودا لەقورئان دا باسی پێغەمبەرێتی ی (ئیسحاق)ی کردووە کە لەپێغەمبەران و لە چاکان(صالحین)ـەو خودا ڕەحمەت وبەرەکەتی خۆی بەسەردا ڕشتووە وەك چۆن باوکیشی بەوە بەهرەمەند کردووەو مەلائیکەکانیش مژدەیان بە (ئیبراهیم) داوە لەسەر بوون بـە بـاوکی ئـەو کـوڕە، هـەروەك فەرموویـــە: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴾الصافات/١١٢-١١٣.. واتـە: (دوای ئەوەی خواستی خودا وابوو کە نیعمەتی خۆی بۆ ئیبراهیم زۆر وتەواو کـات و -ئیـسماعیل-ی پیّ ببەخشێت، دوای ئەمانە مژدەی بەخشینی (ئیسحاق)مان پیّ گەیاند کـەخودا ئـەویش بـە یەکێك لە پێغەمبەرە صالح وچاکەکانی دادەنێت. هەروەها ئێمە بەرەکەتی دین ودنیامان بە -ئیسماعیل و ئیسحاق- بەخشی، لەنـەوەکانی هەردووکیـشیان دا پیـاو چـاك ومرۆڤـی صـالح هـەبووەو لەهـەمان کـات دا مرۆڤـی بـەدکارو زۆرداریـش هـەبوون کـە بەئاشـکرا بـەهۆی

بەدکاریيەوە ستەمیان لە خۆیان کردووە).

هەروەها خودای پەروەردگار باسی پێغەمبەرێتی ی (یـەعقوب)یشی کردووەو لەم بارەیەوە ڕووی گفتارو فەرمایشتی کردۆتە پێغەمبەرەکەی (محمدﷺ) و فەرموویە: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ﴾النساء/١٦٣.. واتە: (ئێمە سرووشی (وەحی)ی پێغەمبەرێتییمان بۆ تۆ (ئەی محمد) ناردووە، وەك چۆن لەمەوپێش بۆ (نـوح)و ئەو پێغەمبەرانەی دوای- نـوحمان - ناردووە، هەروەها بۆ (ئیبراهیم)و (ئیسماعیل)و (ئیسحاق)و (یـەعقوب)و هەردوازدە (کوڕو نەوەکانی)-یـەعقوب -یش ناردووە).

هەروەها خودای مەزن لەم فەرمایشتەی دا ستایشی "ئیبراهیم" و "ئیسحاق[1]" و "یـەعقوب"ی کردووە و فەرموویە: ﴿وَٱذْكُرْ عِبَـٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخْلَصْنَـٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ﴾ ص ٤٥— ٤٧.. خودای مەزن لەم ئایەتانەدا فەرمان بە (محمد)ی پێغەمبەری خۆی -ﷺ- دەکات کە بەندەکانی تری خودا لەپێغەمبەرانی وەك (ئیبراهیم وئیسحاق و یـەعقوب) — وئەوانی تر بەیاد بێنێتەوە، لەگەڵ باس کردنی ئەو سیفەتە بەرزانەیان لە هێزو لەخواپەرستیو لە هەموو ئەو نیعمەتانەش کە لە پەیامی پێغەمبەرێتی یەوە پێ ی بەهرەوەر ببوون. بەڕاستی خوداش هەموو ئەم پێغەمبەرانەی پاڵاوتووەو بە هۆی سیفەتێکی جوان و بەرزەکەوە هەڵیبژاردوون کە زیکرویادی بەردەوامیان بووە لەسەر ڕۆژی ئاخیرەت وهەردەم بەیادی خۆیان هێناوەو بەیادی خەڵکیشیان هێناوەتەوەو خۆیان و خەڵکییان لێ ئاگادارکردۆتەوە، لەبەرئەمە پێغەمبەران لەنێو هەموو ڕۆڵەکانی ڕەگەزی خۆیان دا هەڵبژاردەو دەسنیشان کراوی خودا بوون. لەو دەقە قورئانیيەدا وانەیەکیش بۆ باوەڕداران بەدی دەکرێت لە سەر ئەوەی دەبێت ڕۆژی دوایی (ئاخیرەت) جێ ئومێدی بەرچاوانی بێت و بەکاری چاك و ڕەنجی بەردەوام بۆی تێ بکوشێت تاکو نزیك بوونەوە لە خوداو ڕەزامەندیو ڕەحمەت ومیهرەبانی یەکەی دەسگیربێت.

---

(١) بەزمانی (عیبری) — یصحك —یشی پێ دەوترێت، بـەمانای (یـضحك) واتـە (پێدەکـەنێت)، بۆیـەش ناونراوە چونکە دایکی (اسحاق) لەدڵی خۆی دا پێکەنیوە کاتێك فریـشتەکان مـژدەی کـوڕێکی پێـدەدەن و ئەویش پیرەژنێکە و پیربووە و لەتەمەنی منداڵبوون تێپەڕیوە، تەنانەت لەوکاتەدا تەمەنی خۆی گەشتۆتە نەوەد (٩٠) ساڵ و تەمەنی مێردەکەشی سەد (١٠٠) ساڵ بووە.

# کورتەیەك لە ژیانی " ئیسحاق " و " یـەعقوب "

قورئان شتێکی ئەوتۆی دەربارەی ژیانی شەخصی وتایبەتی‌ی "ئیسحاق" باس نـەکردووە، هەروەك دەربارەی (یـەعقوب)ی کوڕیشی هیچ شتێکی وای باس نەکردووە تەنها ئـەوە نـەبێت کە (یـەعقوب) لەژیانی دا (یوسف)ی کوڕی لێ ون دەکرێت، لەگەڵ تەواوی ئەو ڕووداوو بەسەر هاتانەدا کە لە چیرۆکی (یوسف)دا (سلاوی لێ بێـت) هـەمووی بـاس دەکـەین، بـەلام لێـرەدا پوختەی ئـەو باسـانەی (اهـل الکتـاب) دەخەینـە ڕوو کەچـۆن ئـەوان (واتـە شـوێنکەوتوانی ئاینەکانی تری وەك ئایینی یەهوودی ومەسیحی) دەربارەی (ئیسحاق)و (یـەعقوب) دیارییـان کردووە:-

(کاتێك -ئیبراهیم- هەست بە نزیك بوونەوەی وادەی کۆچی دوایی‌ی خۆی دەکات، هێـشتا -ئیسحاق-ی کوڕی ژنی نەهێنابوو و باوکیشی نەیدەویست ئافرەتێکی -کەنعانی-ی جاهیـل و نامۆ بە هۆزەکەیانی بۆ بخوازێت. لەبەر ئەوە -ئیبراهیم- خزمەتکار(خادم)ێکی خۆی کە جێـی متمانەی بووەو کاروباری ناوماڵەکەی پێ سپاردووە، ڕادەسـپێرێت بـەوەی بـچێت بـۆ شـاری (حاران) لە-عێراق- و کچێکی لە هۆزەکەی خۆی بۆ بهێنێت. خزمەتکارەکـەش بەچـاودێری و سەرپەرشتی‌ی خودا بەڕێ دەکەوێت تاکو دەگاتە (حاران) وکچی (بتوئیـل)ی کـوڕی (نـاحور)ی برای (ئیبراهیم)ی بۆ هەڵدەبژێرێت کە ناوی (رفقة) بووەو کچی برای ئیبراهیم (کـچە برازاکـەی ئیبراهیم) بووەو لەگەڵ خۆی دا دەیهێنێت و دەگەڕێتەوە، ئینجا لە (ئیسحاق)ی مارە دەکەن.

(ئیسحاق) دوای بیست (٢٠) ساڵ لەزەواجی خۆی دوو کوڕی (دوانە)ی لەژنەکەی دەبێـت، یەکێکیان ناوی (عیسوو) بووە کە عەرەبەکان بە (العیص)ی ناودەبـەن، دووەمیـشیان لـەکاتی لەدایك بوونی دا وا دێتەدەرەوە کەدەستی بە قولەپێ ی قاچی براکەیەوە گرتووەو نـاوی دەنـێن (یـەعقوب)، هەروەها بەناوی (ئیسرائیل[1])یش ناسراوە.

(ئیسحاق) -سلاوی لێ بێت- (عیص)ی لە (یــەعقوب) زۆرتـر خـۆش دەویـست چـونکە

---

(١) (ئیسرائیل) وشەیەکی لێکدراوە لە (ئیسرا) و (ئیل)، (ئیسرا) بەمانای (بەندە) یان -هەڵبژێرراو- یـان -مرۆڤ-، یان کۆچەر، دێت، (ئیل)یش بەمانای خودا، کەوابوو وشەی (ئیسرائیل) مانای بەندەی خودا (عبدالله )یان هەڵبژێرراوی خودایە، گوتراویشە مانای جـەنگاوەر، یـان سـەربازی خودایـە، هـەروەها گـوتراوە مانـای فەرماندەی موجاهید لەگەڵ خودایە.

نۆبەرەبوو و لەپێش ئەودا لەدایك بووە، کەچی دایکیان (رفقە) یەعقوبی زیاتر خۆشویستووە چونکە ئەو بچووکتر بووە. لەبارەی ئەم دووکوڕەوە بەسەرهاتێکیش دەگێڕنەوە کەوا جارێکیان (ئیسحاق) ئارەزووی لە خۆراکێك دەبێت و داوا لە(عیص) دەکات ئەو خۆراکەی بۆ بهێنێت. بەڵام (یەعقوب) لەگەڵ دایکی دا لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون کە پێش (عیص) خۆراکەکە بۆ (ئیسحاق) ببات، ئەویش دەیخوات و دوعای بۆ دەکات. (عیص) بەمە دەزانێت و لەبراکەی زویر دەبێت و هەڕەشەی لێ دەکات، دایکیان هەست بەم حاڵەتەی نێوانیان دەکات و فەرمان بە "یەعقوب" دەکات سەردانی براکەی خۆی (لابان) بکات، واتە: برای (رفقە) وخاڵی (یەعقوب) لە خاکی (حاران) لە -عێراق- و لەوێ لای ئەو بمێنێتەوە تاکو ڕق و تووڕەیی براکەی هێور دەبێتەوە، هەروەها کچێك لە کچانی ئەو خاڵەی بخوازێت. (رفقة) داوا لە (ئیسحاق)ی مێردیشی دەکات کە ئەویش لەلایەن خۆیەوە هەمان فەرمان بە (یەعقوب)ی کوڕیان بکات و بەو نیازە ڕایسپێرێت و دووعاشی بۆ بکات.

(یەعقوب)یش کار بەم فەرمانە دەکات و دەچێت بۆ لای (لابان)ی خاڵی و لەلای دەمێنێتەوەو خزمەتی دەکات تا لە بەرامبەر ئەو خزمەتکردنەی دا (ڕاحیل)ی کچی ی پێبدات، بەڵام خاڵی لەجیاتی ئەو کچە، (لیئة)ی کچە گەورەی پێ دەدات. سەر لەبەیانیی ڕۆژی دوایی بەخاڵی دەڵێت: (من -راحیل-م لێ خواستبوویت)، چونکە چاکترو جوانتریش بوو، خاڵیشی پێ ی دەڵێت: (ئێمە عادەت و داب ونەریتمان وانی یە، کە کچی بچووك پێش کچی گەورە بەشوو بدەین، خۆ ئەگەر هەر ئەو خوشکەیانت دەوێت ئەوا دەبێت حەوتساڵی تریش لەلام کاربکەیت ئینجا پێت دەدەم). ئەویش حەوت ساڵ کاردەکات وجگە لە (لیئە)، (ڕاحیل)یش دەخاتە پاڵی، واتە هەردوو خوشکەکە پێکەوە لەیەك کات دا هاوسەری دەبن، ئەم دیاردەیەش لەڕێساو شەریعەتی ئەو کاتەیان دا هەبووە.

(لابان)یش (کەخەزووری یەعقوب و خاڵیشی بووە) دوو کەنیزە بە هەریەکە لەو دوو کچەی خۆی دەبەخشێت، ئەو کەنیزەیەی بە (لیئە)ی دەبەخشێت ناوی (زلفا) بووەو ئەوەشیان کە بە (راحیل)ی دەبەخشێت ناوی (بلهە) بووە، کچەکانیشی (واتە هەردوو ژنەکەی یەعقوب) هەر یەکەو کەنیزەی خۆی بە (یەعقوب)ی مێردیان دەبەخشن. بەم ڕەنگەش (یەعقوب) چوار ژنی دەبێت و لەو ژنانە دوازدە کوڕی دەبێت:

- بۆ نموونە لە (لیئە)ی ژنی ئەم کوڕانەی هەبووە (ڕائۆبین) و (شەمعوون) و (لاوی) و (یەهووزا) و (یەساکر) و (زوبۆلون).
- لە (ڕاحیل)یش، (یوسف) و (بنیامین)ی هەبووە.

- لە (بلهە)ش، (دان) و (نفتالی)ی بووە.
- لە (زلفا)ش، (جاد) و (ئەشیر)ی هەبووە.

دوای تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر مانەوەی (یـەعقوب) لەلای (لابان)ی خاڵی، داوای لێ دەكات مۆڵەتی بدات كە بگەڕێتەوە بۆ لای كەس وكاری خۆی، خاڵیشی مۆڵـەتی ئـەوەی پـێ دەدات. (یـەعقوب) بۆ ئەو مەبەستە خۆی بۆ گەڕانەوە ئامادە دەكات، بەڵام هەر كە لە خاكی (كەنعان) واتە: لە - فەلەستین- نزیك دەبێتەوە هەواڵی ئـەوەی پـێ دەگـات كـەوا (عیـسۆ)ی برای، (بەچوار سەد پیاوەوە لەدژی وەستاوەو خۆی بۆ سازكردووە)، ئەویش لەمـە دەترسـێت و دووعای سەلامەتی دەكات، ئینجا دیاری یەكی گەورە بۆ براكـەی ئامـادە دەكـات و بەچـەند پیاوێكی دا بۆی دەنێرێت. (عیسو) كاتێك ئەو دیاری یە جوان و گەورەیەی براكـەی دەبینێـت دڵی نەرم دەبێت، هەر بۆیەش ناوچەكە بۆ براكەی چۆڵ دەكات و دەڕوات بۆ چیاكانی(سعیر).

ئیتر (یـەعقوب) دێتەوە بۆ لای (ئیسحاق)ی بـاوكی و لـە شارۆچـكەی (حـبرون) لەگـەڵی دەژی كە ئەمڕۆ بەشاری (الخلیل) ناو دەبرێت.

(ئیسحاق) سەدو هەشتا ساڵ ژیاوەو لەو ئەشكەوتەدا نێژراوە كە (ئیبراهیم)ی باوكی تێـدا نێژراوە لە شارۆچكەی " خلیل ".

## نـــــەوەكـــــــــان

نەوەكان (الاسباط) ئەو دوازدە كوڕو كوڕەزایانەی (یـەعقوب)ن كەوا بە (اسـباط) ناسـراون و بە هەریەكەیان (سبط) دەگوترێت، واتە كوڕ، یان كوڕی كوڕەكـەی. (سـبط) لـە جوولەكـەدا وەك تیرەیەكی عەرەبە و هەر ئەوانیش (واتە -جوولەكەكان) خۆیان بۆ یـەك بـاوك دەگێڕنـەوە. هەر كوڕێكیش لە كوڕانی (یـەعقوب) باوكی نەوە(سـبط)ێكە لـە نـەوەكانی (بـني اسـرائیل)، چونكە هەموو (بني اسرائیل) لە دوازدە كوڕو نەوەكەی (یـەعقوب)ـەوە پەیدابوون وزۆربوون.

لەم نەوانەش دا بەم شێوەیە پێغەمبەرێتی دەركەوتووە:

- لەنـەوەی (لاوی)دا پێغەمبـەرێتی لـە (موسـا و هـارون و ئـەلیاس و ئەلیەسـەع)دا دەركەوتووە.
- لەنـەوەی (یـەهووزا)دا پێغەمبـەرێتی لـە (داود و سـولەیمان و زەكـەریيا و یـەحیا و عیسا)دا دەركەوتووە.
- لەنەوەی (بنیامین)دا پێغەمبەرێتی لە "یونس"دا دەركەوتووە.

# پێغەمبەریتی ی - یوسف -

یەکێك لەو کوڕو نەوانەی -یەعقوب- کەخودا ئەرك وپلەی پێغەمبەریتی ی پێ سپاردووە "یوسف"ە، لە قورئان دا لە زاری یەکێك لە باوەڕدارانەوە کە ئامۆژگاریی گەلەکەی کردووەو بەم جۆرە ئاڕاستەیان دەکات و پێغەمبەریتی ی (یوسف)یان بەبیردێنێتەوە، هاتووە کە: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا﴾غافر/٣٤.. واتە: (ئەوەی کە لە بنەماڵەی (فیرعەون) باوەڕی هێنابوو بەگەلەکەی گوت: ئەرێ لە یادتانە لەمەوپێش پێغەمبەرێکی وەك -یوسف-یش بۆ لای باب وباپیرانتان بە چەندین بەڵگەو دەلالەتی ئاشکرا (لەسەر ڕاستی ی پەیامەکەی و ڕاستگۆیی ی خۆی) نێررابوو و بانگی دەکردن بۆسەر ڕێی ڕاست، کەچی بەردەوام لە گومانێکی شارراوەی نێو ناخی خۆتان دا بوون لەسەر ئەو پەیامەی بۆی هێنابوون، تەنانەت کاتێك مردیش ئەو گومانەی نێو ناخی سینەتان دەربڕی و نیفاق و دووڕوویی ی خۆتان ئاشکراکردو نکوولێتان لەو پەیامەکردو گوتتان: ئیدی لەمەولا خودا هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نانێرێت).

هەروەها خودا سوورەتێکی قورئانی بە سوورەتی (یوسف) ناوبردووەو تیای دا بەڕوونی باسی ژیانی و مەینەتی و تاقیکردنەوەی لەگەڵ براکانی دا دەکات، جگەلە تاقی کردنەوەی بە ژنەکەی (عەزیز-ی میصر)و، چوونە نێو زیندان و، بانگەوازکردنی بۆ خودا و، پاشان دەرچوونی لەزیندان و، لێکدانەوەی خەونەکە بۆ پادشاو، لەئەستۆگرتنی پۆستی وەزارەتی دارایی‌و ئینجا هاتنی براکانی بۆ -میسر- بەهۆی وشکانی و بێ بارانی یەوەو، دواتر ناسینەوەی براکانی جگە لە ساتەکانی دوایی ی بەسەر هاتەکە، هەروەك لەم بەندانەی داهاتوودا بەدرێژی لە بەسەرهاتەکە دەدوێین.

# بەندی دووەم

## (( " یوسف " و فێڵی براکانی ))

( خەونەکەی "یوسف" - پیلان گێڕان لە"یوسف"- "یوسف" لەبیرەکەدا ---
ڕزگارکردنی "یوسف" و فرۆشتنی ی بە وەزیرەکەی پادشا )

## خەونەکەی " یوسف "

" یـەعقوب -سڵاوی لێ بێت- لەنێو تەواوی کوڕەکـانی دا هـەردوو کـوڕە بـچکۆلەکەی، واتە: (یوسف- و -بنیامین)ی بەتایبەتی خۆش دەویست و لەوانیدی زیاتر بایەخی پـێ دەدان. قورئانی پیرۆز سەرەتای ئەم چیرۆکە بەوە دەست پێ دەکات کە -یوسف- لەخەونی دا دەبینێـت ئەوا (یازدە ئەستێرە)و (خۆر)و (مـانگ) بەملکەچـی یـەوە کڕنـووش (سـوژدە)ی بـۆ دەبـەن. سەرلەبەیانی لەکاتی لەخەو هەستانی دا ئەم خەونە بۆ باوکی دەگێڕێتەوە و باسی ئـەو ڕووداوە نامۆو سەرسوڕهێنەرەی نێو خەونەکـەی بـۆ دەکـات. (یــەعقوب)ی باوکیـشی یەکـسەر لـەم خەونەوە پەی بەو پێشبینی یە دەبات کە کوڕەکەی لە ئایندەدا خاوەنی ڕێـزو پلـەو پایەیـەکی تایبەتی دەبێت، چ لەلای خوداو، چ لەلای خەڵکییش. بەڵام ترسی ئەوەشـی لێـی هـەبوو کـە براکانیتری ئێرەیی(حەسوودی)ی پێ ببەن، هەر بۆیەش داوای لێ دەکات ئەم خەونەی خۆی بـۆ براکانی نەگێڕێتەوە تاکو شـەیتان فریویـان نـەدات بـەوەی پیلانـی بـۆ بهۆننـەوەو دەسـتێکی نامەردانەی لێ بووەشـێنن. ئینجـا بۆیـشی ڕوون دەکاتـەوە کـە لـە پاشـەڕۆژدا سـەردارێکی فەرمانڕەواو گوێڕایەڵیکراو دەبێت، خوداش بۆ پێغەمبەرایەتی دەیپاڵێوێت و فێری لێکدانەوەی هەموو جۆرە خەونێکی دەکات، جگە لەوەی نیعمەت و بەخششی خۆی بـە خێـرو بەرەکـەت و ڕەحمـەت بەسـەر (یوسـف)و بنەماڵـەی " یــەعقوب"دا دەڕێـژێت، وەك چـۆن لـەوەو پـێش (ئیبراهیم)و (ئیسحاق)یشی لەو بەخشش ونیعمەتە زۆرانە بەهرەوەر کردبوو..

ئەم دێڕانەی پێشوو واتای ئەم ئایەتانەن کەدەیخوێننەوە:

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَـٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَـٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَـٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ

لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ[1] وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَـٰقَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦﴾ ۞ لَّقَدْ كَانَ فِى يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَـٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ[2]﴾ يوسف/٤-٧

## پیلان گێڕان لە " یوسف "

کوڕەکانی "یـەعقوب" دیتیان باوکیان ئێجگار زۆر (یوسف) و (بنیامین)ی برا گـچکەیان خۆش دەوێت، بەشێوەیەك کە هیچ کوڕێکی تریان هێندە لای باوکی خۆشەویست نییـە، هـەر بۆیە بەمە پەست وتووڕە بووبوون، چـونکە (بەڕاوبۆچـوون و ئیـددیعای خۆیـان) ئـەمان چـەند کەسێکی بەهێزو بازوون و یارمەتی باوکیان دەدەن و ئەو پیت وبەرەکەت وسوودەی بۆ باوکیـان پەیدادەکەن زۆر لە سوودی ئەو دووکوڕە بچووکە زیاترە بۆی، هەروەها بەو ئیددیعایەی خۆیـان گوایە باوکیان بەهەڵەدا چووەو لـە هـەق و ڕاسـتی دوورکەوتۆتـەوە بـەهۆی ئـەوەی یوسـف و برابچووکەکەی پێش ئەوان خستووە لە سۆزو خۆشەویستی دا.

لەبەر ئەمەش نیازی خراپ لە دەروونیان دا سەری هەڵداو ویستیان بە پەنهانی گێـچەڵێك بۆ (یوسف) بنێنەوەو لە نێو خۆیان دا ڕێك کـەوتن لەسـەر ئـەوەی لەناویبـەرن و خۆیـانی لێ قوتارکەن، سا ئیتر بە کوشتنی ڕاستەوخۆی بێت، یان بەجێ هێشتنی لە خاکێکی دووری وەهـا کەهەرگیز ڕێ ی گەڕانەوەو هاتنەوە نەزانێت (ئەمە گەر هاتو لەمردن ڕزگاری ببوو لەو شـوێنە دوورە)، ئەو کوڕانە وا گومانیان دەبرد کە بەم کارەیان دەکەونە بەر خۆشەویـستیی باوکیـان و هیچ نەیارو پێـشبڕکێکارێکی دیکـەیان لـەم ڕووەوە نامێنێـت، ئـەویش دوای ئـەوەی لـەپاش ئەنجامدانی کارە خیانەتکاری یەکەیان تۆبـە دەکـەن و بـبن بـە چـەند کەسـێکی چـاك و پیـاو ماقووڵ، دیارە ڕایان وا بووەکە خوداش تۆبەیان لێ وەرگرێت و باوکیشیان پاسـاویان لێپەسـند دەکات.

---

(١) (تأویـل الاحادیـث): واتـە (شـیکارولێکدانەوەی خـەون).. تـەئویل کـردن ڕوون کردنـەوەی هۆکـارو عیللەتەکەیە. (أحادیث) — ئەو ڕووداوو بەسەر هاتانەش دەگرێتەوە کەلەکاتی خەوتن یان بێـداریش دا دێنـە کایەوە. مەبەست لەوانەی " کاتی بێداری " تێگەیشتن و زانینی مەبەست وچـەمکی کتێبـە ئاسمانی‌یـەکان و وتەی خەلکی و ڕێبازو یاساکانە.

(٢) (آیات للسائلین): واتە بەسەر هاتی (یوسف وبراکانی) چەندین پەندو نیشانەی تێدایە لەسـەر قـودرەتی خوداو سۆزو بەزەیی ی بۆ بەندەکانی، بۆ ئەو کەسانەی پرسیار دەربـارەی ڕووداوە مێـژوویی یـەکان دەکـەن و لەئاکامە وسەرەنجامەکانی دەکۆڵنەوەو بەدوای پەندو عیبرەت و وانەکانی دا دەگەڕێن.

یەکێك لەو کوڕانە پێشنیارێك دەخاتە بەردەمی براکانی سەبارەت بەوەی با (یوسف) نەکوژین، بەڵکو دوور لەچاوانی خەڵکی فڕێ ی دەینە بنی قووڵایی ی بیرێکەوە، بەشکم ئەوساش کاروانێك بێت و دەری بێننەوەو لەگەڵ خۆیان دا بیبەن، بەم پێ یەش نیازی خۆیان (کە دابڕینی یوسفە لەباوکی) بەدی بێنن ولە گوناهی کوشتنیش بەدووربن..

براکانیشی ئەم ڕایەیان پەسندکرد ودەستیان کرد بە جێبەجێ کردنی کارەکەیان.. ئەوەبوو سەرەتا چوونەلای باوکیان و بەفرِوفێڵ داوای ئەوەیان لە باوکیان دەکرد ڕێگەیان بدات (یوسف) لەگەڵ خۆیان دا ببەنە دەرەوە، ئەمەش دوای هەست کردنیان بەوەی کە باوکیان یوسفیان لێ دوور دەخاتەوە..

ئەوان بە باوکیان گوت: (ئەرێ بابە تۆ چ گومانێکت لە ئێمە پەیدا کردووە کەوا یوسفمان لێ دوور دەخەیەوەو هەست بە ئارامیو حەوانەوە ناکەیت کاتێك لەگەڵمان دایە؟ ئێمە بۆتی دووپات دەکەینەوە کە خۆشمان دەوێت و سۆزوبەزەییمان بۆی هەیە، جا سبەینێ لەگەڵ ئێمەدا بینێرە بۆ ئەو مێرگانە تاکو لەوێ یاریمان لەگەڵ دا بکات و نەختێك ببزوێت و وەك ئێمە چێژ لەخواردن و خواردنەوە وەرگرێت. خۆ ئێمەش ئاگامان لێ یەتی و وەك خۆمان دەیپارێزین و زیاتریش سوورین لەسەر پاراستنی).

باوکیشیان کە زیاد لە ڕادە ئەو کوڕە بچووکەی خۆی خۆشدەویست، وەڵامی بۆ کوڕەکانی ئەوەبوو کە زۆر خەمبارو دڵتەنگ دەبێت گەر (یوسف) لێ ی دوور کەوێتەوەو ترسی ئەوەشی هەیە گەر بێ خەم ودڵنیابێت لێ یان (واتە لەو کوڕانە) ئەوا لەوە دەترسێت ئەوان لێ ی بێ ئاگا بن وگورگ بیخوات.

ئەوانیش سوێندیان بۆباوکیان خوارد لەسەر ئەوەی نەهێڵن ئەو جۆرە کارەساتانە ڕووبدات و هەر ناخۆشیەکیش بەدی بێت مایەی عەیب و شەرمەزاری دەبێت بۆیان. لەبەر ئەوە زۆر سوور بوون لەسەر پاراستنی یوسف و وەك باوکیشی خۆیان بەپەرۆش پیشان دەدا (تەنانەت لەویش بەپەرۆشتر) تاکو لەبەر چاوی خەڵکی وەك کۆمەڵێکی شکست ورەنجەڕۆ دەرنەکەون..

ئەمەی پێشوو پوختەی مانای ئەم فەرمایشتەی خودایە لەم ئایەتانەی سوورەتەکەدا:

﴿ إِذْ قَالُوا۟ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ [1] إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُوا۟ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَـٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَـٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ [2] إِن كُنتُمْ

(١) (عصبة): (جماعة) " کۆمەڵێك "، کۆمەڵە کەسێك.

(٢) (السيارة): لە (سير)ـەوە هاتووە، واتە ئەوانەی بەرێدا دەڕۆن.

فَعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَـٰصِحُونَ (١) ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّى لَيَحْزُنُنِىٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَـٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ ﴾يوسف/٨-١٤..

## " یوسف " لە بیرەکەدا

"یەعقوب" ڕێ بە کوڕەکانی دەدات کە (یوسف) لەگەڵ خۆیاندا بەرنە دەشت ودەر، ئەوانیش بردیان وبەپێی ئەو پیلانە وردونەخشە بۆ کێشراوەی کە لەنێو خۆیاندا لەسەری ڕێکەوتبوون فڕێ یان دایە نێو بیرەکەوە. لەو ساتەش دا خودای گەورەو میهرەبان ئەوەی خستە نێودڵ و زەینی ـ یوسف ـ ەوە کە لەو حاڵەتە ڕزگاری دەکات وبێ ئارام ونیگەران نەبێت، هەروەها ڕۆژێکیش دێت کە ئەم هەواڵە بەبراکانی بگەیەنێتەوە سەبارەت بەو ڕەفتارە نائینسانیەی دەرهەقی کردیان، لەکاتێکیش دا پێ یان دەگەیەنێت، کە ئەوان هەموویان لەبەردەمی دا ڕاوەستێنراون و ئەوپەڕی ئاتاجیشیان پێیەتی و بەخەیاڵیشیان دا نایەت کە ئەمە (یوسف) خۆیەتی، ئەویش لەبەر پایەبەرزی ی (یوسف) لەو ڕۆژەدا.

براکانی (یوسف) دوای ئەنجام دانی کارەکەیان سەرلەئێوارەی ئەو ڕۆژە دەگەڕێنەوەو خۆیان بەدڵتەنگ وغەمگین پیشان دەدەن ودەنگی هاوارو گریانیشیان لێ بەرزدەبێتەوەو دەچنە لای باوکیان وپێ ی دەڵێن: (بابەگیان ئەمڕۆ ئێمە سەرگەرمی پێشبڕکێ ی ڕاکردن وتیرئەندازی بووین و (یوسف)مان لەلای کەل وپەل وشت ومەکەکانمان دانابوو تاکو پارێزگارییان لێبکات بەڵام گورگ خواردبووی وئێمەش لێی دووربووین. هەرچەندە تۆ باوەڕبەقسەکانیشمان ناکەیت، چونکە بەوە تاوانبارمان دەکەیت، کە ڕقمان لێ ی بوویێت گەرچی ئەوەی دەیڵێین ڕاست و ڕەوانیش بێت).

ئینجا کراسەکەی (یوسف)ی واپیشان دەدەن کە بەخوێن ڕەنگ کراوە، بەڵام کاتێك (یەعقوب) چاوی بەکراسەکە دەکەوێت، دەسبەجێ درۆکەیانی بۆ دەردەکەوێت، چونکە ئەو خوێنەی بەسەر کراسەکەدا کراوە خوێنی کوڕەکەی نییەو کراسەکەش نەدڕابوو، یان دەشێت (یەعقوب) بە حوکمی ناسین وشارەزایی ی لە (ناخی کوڕەکانی) ئەو درۆو دەلەسەیەیانی بۆ

---

(١) (لناصحون): لە (نصح — و — نصوح — و — نصاحة)ـەوەیە، بەمانای ساغ کردنەوەو پاکژ کردنەوەی کرداروگفتار. واتە ئێمە لەگەڵ — یوسف دا — بێ نیازو پاك وسەرڕاستیین.

ئاشکرابوو بێت، هەربۆیە پێ یان دەڵێت: (بێگومان ئێوە دەروونی خۆتان کارێکی ترسناکی بۆ مەیسەرکردن و ئەمەی پێ کردوون. منیش بەشێوەیەکی رێك وپێك ئارام دەگرم کەهیچ وەڕس بوون وبێئومێدییەکی تێدانەبێت. تەنها لەخوداش داوای یارمەتی دەکەم بۆ دەرخستنی باری راستەقینەی ئەو قسەوباسە پووچەڵەتان، جگە لە خۆڕاگرتن لەبەر باری گرانی ئەم تاقیکردنەوەیەی دووربوونم لە-یوسف-..

ئەم بەشەی پێشووی داستانەکەش پوختەی لێکدانەوەی ئەم ئایەتانەبوو کە خودا تیایان دا دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُوا يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾يوسف/١٥-١٨.

## رزگارکردنی "یوسف" وفرۆشتنیی بە وەزیرەکەی پادشا

کاروانێك لەبەردەم بیرەکەوە تێ دەپەڕێت (کە بەرەو-میصر- دەچوون)و کەسێکیان بۆلای بیرەکە دەنێرن تاکو ئاویان بۆ بێنێت، ئەویش سەتڵەکەی دەستی شۆڕدەکاتەوە بۆ خوارەوە و (یوسف)یش خۆی پێ دا هەڵدەواسێت ولەبیرەکە دێتە دەرەوە. ئەم پیاوە ئاودەرهێنەش زۆر زۆر دڵشاد دەبێت و بەپەلە دەگەڕێتەوە بۆ نێو هاوڕێکانی تا بەخۆشحاڵییەوە پێیان بڵێت: (مژدە مژدە ئەوە کوڕێکی نەوجەوانە "غلام").. ئەوانیش -یوسف- لەناو کەل وپەلەکانیان دا دەشارنەوەو بەشت ومەکێکی خۆیانی دادەنێن لەوشت ومەکانەی کە دەیانفرۆشت. کاروانچی یەکان (یوسف) لە-میسر- بەچەند درهەمێکی کەم دەفرۆشن تا خێرا لەکۆڵ خۆیانی کەنەوە نەبادا کەس وکاری پێیان بگەن ولێیان بستێننەوە. کڕیارەکەش وەزیری پادشا[1] دەبێت، هەر کە دەیکڕێت دەینێرێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و هاوسەرەکەشی (کەناوی زولەیخا)یە ڕادەسپێرێت بەوەی چاك بێت لەگەڵی داو پێ ی دەڵێت: (بەچاکی هەڵس وکەوتی لەگەڵ دا بکەو رێزی زۆر لێ بگرە تاکو ژیان وگوزەرانی لەلامان خۆش دەبێت و بۆ ئەوەی سوودمان پێ بگەیەنێت، یان بۆ ئەوەی بیکەین بەکوڕی خۆمان وکوڕمان بێت).

(١) ئەم وەزیرە ناوی (فوطیفار) بووەو ئەو کۆگادار (عەزیز)ـەی سەر کۆگاو گەنجینەکانی (میسر) بووە لەسەردەمی یەکێك لەپادشاکانی (هیکسۆس)دا.

جا هەروەك چۆن خودا پلەیەکی بەرزو ڕێزێکی زۆری بۆ (یوسف) لەماڵی وەزیرەکەی پادشادا مەیسەرکرد، هەروایش دەسەڵات وسەربەستیی لە بەکارهێنانی گشت جۆرە موڵك وکەل وپەلێکی وەزیرەکەش دا بۆ مەیسەرکردبوو، ئەمە جگەلە پلەوپایەیەکی بڵند لەخاکی میسردا، هەروەها خودا سروشتی لێکدانەوەی خەونی پێ بەخشیبوو. بێگومان خودای مەزن خۆی بەتوانایە لەڕاپەڕاندنی هەر کارێك دا بیەوێت وئیرادەی لەسەربێت. بەڵام زۆربەی خەڵکی نهێنی و ڕازی حیکمەتی خودا نازانن.

کاتێك "یوسف" گەشەی کرد و پێگەیشت وهێزو بازووی تەواوی لەقۆناغی لاوێتی دا بۆ دروست بوو، خودا حیکمەت وزانینی نهێنی ی شتەکان وزانستێکی بەسوودی پێ بەخشی. ئەمە پاداشتەو ئەم جۆرە پاداشتەش خودا هەرشایانی چاکەکاران وخواناسان دەکات..:

﴿وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ۖ قَالَ يَـٰبُشْرَىٰ هَـٰذَا غُلَـٰمٌ ۚ وَأَسَرُّوهُ[١] بِضَـٰعَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوْهُ[٢] بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ[٣] عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَـٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾يوسف/١٩—٢٢

---

(١) (أسروه): (شاردیانەوە).

(٢) (شروه): واتە فرۆشتیان (باعوه) بەپێچەوانەی کڕییان (اشتروه)وەوەیە. خودا فەرموویە: (ولبئس ماشروا به انفسهم لو کانوا یعلمون)(البقرة / ١٠٢) بەمانای (نەفسی خۆیانیان پێ فرۆشتووە — باعوها). هەروەها خودا لەم بارەیەوە فەرموویە: (ومن الناس من یشتري نفسه ابتغاء مرضاة الله)(البقرة / ٢٠٧).. واتە (لەنێو خەڵکیدا کەسانی واهەیە کە خۆی بەخودا دەفرۆشێت ونەفس وگیانی خۆی لەجیهاددا تەرخان دەکات).

(٣) (مثواه): واتە شوێنی دانیشتن وحەوانەوەو پلەومەقامی نێوماڵ.. (أکرمي مثواه): واتە (ماڵ وشوێنی دانیشتن وپلەو مەقامی نێوماڵی بۆ وا لێبکە کە بەڕێز و گەورە بێت لەلامان).

# بەندی سێ یەم

## (( " یوسف " و نەریتی چەواشەکاریی ژنەکە ))

( ژنەکەی "عزیز " یوسف فریودەدات - یوسف وئافرەتەکان )

## ژنەکەی " عزیز " یوسف فریو دەدات

خودای مەزن بڕێکی زۆری لەجوانی و قەشەنگی بە "یوسف" بەخشیبوو، ئەم جوانی یەش هۆیەکی بەڵاومەینەتی ی تاقیکاری یەکانی ژیانی بوو.. (زولەیخا)ی ژنی (عەزیز)، (واتە ژنی وەزیری پادشا)ش بەچاوی مێیینەیی ی خۆی ئەم جوانی یەی (یوسف)ی دەبینی و دڵی بۆی لێ دەداو هەست ونەستیشی گڕی گرتبوو. نەخاسمە کەئەم کوڕە جوانەی بەبەندە(عەبد)ی خۆی دادەناو ملکەچی فەرمان وئیشارەتی خۆی بوو، هەربۆیەش ئەو هەموو سۆزوئەوین وئارەزووەی لەدڵی دا بەرامبەری دروست ببوو بەلاوە ئاسان بوو.. بێگومان ئەم ژنە خۆیشی ژنێکی گەنج ونەرم ونیان ولەسەرەتای تەمەنی لاوی و جوان وشۆخ وشەنگ بوو..

ماوەیەك لەو حاڵەتی ئالوودەبوونەیدا مایەوەو دوودڵ بوو لەدەرخستنی هەست وسۆزی خۆی بۆ "یوسف".. بەڵام هێندەی نەخایاند کە عاتیفە و سۆزی بەجۆشی بەسەردا زاڵ بو و لاوازی ی سروشتیشی هەموو شعورو هەست ونەستێکی لێ داگیرکردو لەهەلێك دەگەڕا کەجامی سۆزو ئارەزووی بەسەردا قلْپ کاتەوە..

هەربۆیەش ڕۆژێکیان هەلی وجودی (یوسف)ی بەتەنها لەماڵ دا قۆستەوەو دەستی کرد بەجێبەجێ کردنی نیازەکەی.. سەرەتا کەوتە فریودانی بەئاڵ وگۆڕکردنی خۆشەویستی و جووڵاندنی ئارەزووی و خستنەڕووی جوانی یەکانی و ئەندامە هەست بزوێنەکانی جەستەی (ئەمەش دوای ئەوەی کەهەموو دەرگاکانی ماڵەکەی توند داخستبوو) وپێشی گوت: (دەی ڕووم تێبکەو وەرە بە لام دا ئەوا منیش خۆم بۆ سازکردوویت)..

(یوسف)یش بەنەریتی لەخواترسانی خۆی و وەك کەسێکی زۆر پەست و تووڕە لێ ی دوورکەوتەوەو نکۆڵی ی لەو کردارەو سەرپێچی ی لەفەرمانەکەی کردو پێ ی گوت: (من پەنام

بردە بەرخودا تاکو لەگوناھ بم پارێزێت. ئیدی چۆن گوناھ دەکەم لەکاتێك دا خـودا مێردەکـەی تۆی بۆ ڕەخساندم کەئەویش گەورەی منەو ڕێزی لێ ناوم وشوێنی حەوانەوەو پلـەو مـەقامێکی چاکی لەنێو ماڵەکەی دا پێ داوم. نەخێر شتی واناکەم چونکە بەڕاسـتی هـەر کەسـێك سـتەم وخیانەت بکات لەبەرامبەر چاکەیەك دا کە لەگەڵی دا کراوە سەرکەوتوو وسەرفراز نابێت).

بەڵام خودا دڵی ئەو ژنەی کوێر کردبووەوە وهیچ بایەخێکی بەوتەکانی یوسف- نەدا، بەڵکو هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی دەستی لەگەڵ دا تێکەڵاو بکات. تەنانەت نەفسی سەرکێشی خۆی فەرمانی ئەوەی پێکرد کە پەلاماری بدات (لەوساتەش دا -یوسف- ڕووناکی ی ڕاسـتەقینەی خودای بەدی کردو خۆی بەو نوورەی خودا پارێزراوو بەهرەمەنـد کـردو مـەیل وهـەوای نـەفس نەیتوانی زەفەری پێ ببات وبەربەرەکانێی (گوناە ویاخی بوونی) پیشان دا بەم ڕەنگەش خـودا خراپەی زینـاکاریو ناپـاکی (خیانـەت)ی لێ دوورخـستەوە، چـونکە لـەو بەنـدە خـاویـست و خواپەرستانە بوو کە (بەپوختی و بێ گرێ وگۆڵ وپێچ وپەنا) و بەدڵسۆزی یەوە خـودای خۆیـان دەپەرست.

لەگەرمەی خۆڕاپـسکانی -یوسـف-دا و بـۆ دەربـاز بـوون لەچـنگی ئـەو ئافرەتـە جـۆش سەندووە، خۆی گەیاندە لای دەرگای ژوورەکە تا بەپەلە لـە ژێردەسـتی هـەڵێت، ئافرەتەکـەش خێرا بەدوای دا ڕای کرد تا نەهێڵێت لـەو ژوورە دەرچـێت و کراسـەکەی لـەدواوە ڕاکێـشا بـۆ هێنانەوە نێو ژوورەکەی، بەڵام کراسەکەی دڕاو توانی ی دەرچێت بۆ دەرەوە..

لەو چرکە ساتانەش دا کت وپڕ هەردووکیان لای دەرگاکە مێردەکەیان بینی کـە دەهاتـەوە بۆ ماڵەوە. لەو ساتەدا خێرا ژنەکـە دەسپێـشخەریی ی کـرد بـۆ تۆمـەتبار کردنـی (یوسـف) بەتاوانی هەوڵی پەلاماردانی و دەسدرێژی کردنە سەری، ئینجا داوای زیندانی کردنـی دەکـرد. (یوسف)یش نکووڵی ی لەو تاوانە کردو گوتی کەوا ئەم ژنە خـۆی هـەوڵی پـەلاماردانی داوەو ویستوویەتی خیانەت لەمێردەکەی بکـات و ئـەمیش (واتـە یوسـف خـۆی) بـەرگری لـەخۆی کردووەو وەڵامی داواکەی نەداوەتەوە.

لەکاتێکدا (یوسف) وژنەکەی (عـەزیزی میـسر) خـەریکی تاوانبـارکردنی یەکـدی بـوون، کەسێکی نزیك (ناسیاو)ی ئافرەتەکە بەسەر ئەو قسەوباس ومـشت ومڕەیـان دا هـات و دوای تێگەیشتن لەڕووداوەکە، حـوکمێکی خـۆی تیـادا داو گـوتی: (ئەگـەر کراسـەکەی ئـەم کـوڕە لەپێشەوە "لەبەرۆکیەوە" دڕابێت ئەوە بێگومان ژنەکـە ڕاسـت دەڵێـت لـەم ئیددیعایـەی دا، چونکە مانای وایە کوڕەکە هێرشی بردۆتە سەری و بەرەو ڕووی چووەو ژنەکەش بەرگری لەخۆی کردووەو کراسەکەی بۆ دڕاندووە. خۆ ئەگەر کراسەکەی ئەم کوڕە لەدواوە دڕابێت ئـەوە مانـای وایە ژنەکە پەلاماری داوەو ئەو تەنها بەرگری لەخۆی کردووەو هەوڵی دەربـازبوونی داوەو بـەم پێیەش ژنەکە درۆ دەڵێت لەوتەکانی داو هەر کوڕەکە ڕاست دەڵێت و ڕاستگۆیە.

مێردی ژنەکە تەماشای کراسەکەی (یوسف)ی کردو دیتی کەوا لەدواوە دڕاوەو گەیشتە ئەو ڕاستی یەی بەژنەکەی خۆی بڵێت: بەڕاستی ئەم کردەوەیە لەفڕوفێڵ ومەکری ژنانە و مەکرو تەڵەکەبازیشیان گەورەو گرانە).. دیارە ئەم مێردە حەزی کردووە ئەو کردارە شەرمەزاریو ئابڕووبەرانەیە پەردەپۆش بکرێت و بشاررێتەوە، هەر بۆیە خێرا بە یوسف دەڵێت: (ئەمەی کە تووشت هات لەبیرخۆتی بەرەوەو بیشارەوە ولەلای کەس باسی مەکە).. بەژنەکەی خۆیشی گوت: (تۆش داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەم گوناهەی کە کردت و تۆبەی تەواو لەلای خودا بکە، بەڕاستی لەم کارەت دا لەگوناهکارانیت).

ئەمەی پێشوو تەفسیری ئەم ئایەتانەی لای خوارەوەی بەشێکی تری سوورەتەکەیە کە خودا تیای دا فەرمووەیە: ﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ [1] أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا [2] لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ

---

(١) (انه ربي): گوتراوە ئەمە دوولێکدانەوەی هەیە، یەکەمیان: مەبەستی لەو گەورەیەی خۆیەتی کە (عەزیزی میسرە) واتە (وەزیری گەنجینەو دارایی ی وڵاتەکەیە)و ئەم لەماڵی دایەو جێ ی کردۆتەوە، دووەمیشیان: مەبەستی لەخودای پەروەردگاریەتی کەئەو هۆکارانەی بۆ خولقاندووە.

(٢) (ولقد همت به وهم بها): زانایان لەم بارەیەوە چەند بیروڕایەکیان هەیە، سەبارەت بە (همت بە) کە بۆژنەکەیەو (ویستوویەتی کارەکەی لەگەڵ دابکات یان زۆری لێ بکات تا ئەو کارەی لەگەڵ دابکات) ئینجا یوسفیش (لولا أن رأى برهان ربه) واتە گەر ئەو ڕۆشنایی ی ڕێگاڕاستەی خودای بەدی نەکردایەو بەڕێنمایی ی خودا هەڵس وکەوتی نەکردایەو سام وگەورەیی ی خوداو فەرمان وچاودێری ی هەمیشەیی ی خودای لەبیرکردایە ئەوا (هم بها) ئەو کردارەی لەگەڵ دادەکرد. واتە بەدیکردنی ڕووناکی ی ڕێگای ڕاستی خودا کەلێرەدا بە (برهان ربە) گوزارشتی لێ کراوە نەیهێشتووە ئەو خەیاڵ و (هەمم) و بۆچوونە پێچەوانەیەی هەبێت. ڕایەکی تریش لەڕای زانایان ئەوەیە: (یوسف) بەپاڵنەری خووی سروشتی ی خۆی (کەخوویەکی ئاسایی ی هەموو مرۆڤێکە) خەریك بووە هەمان خەیاڵ پەیڕەو کات، بەڵام بەدیتنی (برهان ربە) ڕێ ی کەوتنە نێو هەڵەو سەرپێچی ی لێ بەستراوە. مەبەست لە (برهان ربە)یش واتە چاودێریی هەمیشەیی ی خودا لەسەری و دەرکەوتنی چاودێری یەکە بەعیصمەت وپاراستنی. مامۆستا (محی الدین بن عربی)یش لەم ڕووە وە دەڵێت: ("همت به" بۆ بەکێشکردن و"وهم بها "بۆ بەرگریکردنە) مامۆستای (علامة)ش (ابن حزم) دەڵێت: (همت بە) مەبەستی کوشتن و (وهم بها)ش هەمان مەبەست بووە.

ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴾ یوسف/٢٣-٢٩..

## یوسف وئافرەتەکان

هەواڵ و قسەو باسی (ئالوودەیی ئەو ژنە بە یوسف) کەوتە سەرزاری کۆمەڵە ئافرەتێکی ناوشارو لەکۆڕوکۆمەڵەکانی نێوخۆیان دا دەیانگوتەوەو لەلای یەکتر باسیان دەکردو دەشیان گوت: (ژنەکەی "عزیز" کوڕە خزمەتکارەکەی خۆی هەڵناوە بۆ کاری نابەجێ و ویستوویەتی بەدکاریی لەگەڵ دابکات، بەڵام ئەو کوڕە بەدەم داخوازییەکەیەوە نەچووە. وادیارە ئەو ژنە هێندە حەزی لەو کوڕەیە کەئارامی لەبەر بڕیوەو دڵی پارەپارە کردووەو گەشتۆتە قوڵایی دڵی، جا تۆبڵێی پێویست بەو هەموو بێ ئارامی و خۆشێت کردنەبکات و پەلاماری بدات، بەڕاستی بەگرتنەبەری ئەم شێوازەی، کەوتۆتە نێو گومڕایی یەکی تەواوو دوورکەوتنەوە لەهەق)..

ئەم قسانەی چینی ئافرەتان کە لەنێو خۆیان دا ئاوا باسی ژنەکەی (عەزیز)یان دەکرد و بەنەریتی ژنانەی خۆیان توانج وپلاریان تێ دەگرت بەخودی ژنەکەی (عەزیز) گەشتەوەو پێی ڕاگەیەنرا کە لە نێوژنان دا چۆن باسی دەکرێت.. دیارە ئەویش بەمە پەست دەبێت و دەیەوێت (یوسف) و (جوانیی یوسف) پیشانی ئەوانیش بدات تا چیدی بەناهەق لەخۆڕا سەرزەنشتی نەکەن وپاکانەش بۆ هەڵوێستی خۆی بهێنێتەوە..

بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژێك داوەتیان دەکات وشوێنێکی نەرم وخۆشیان بە (سەرین ودۆشەك)و (کەرەسەی جێ ی پاڵدانەوەو قاچ ڕاکێشان وئەنیشك دادانەوە) بۆ ڕێك دەخات و زیادە ڕۆیی یەکی دیاریش لەشێوازی ڕێزلێنان وئامڕازی حەواندنەوەدا پیشان دەدات، هەر وەك چۆن ئەمە هەمیشە داب ونەریتی دەست ڕۆیشتوان و دنیاپەرستانە.

بانگکراوانیش دوای ئەوەی دێن ودادەنیشن ولەجێ ی خۆیان دا جێگیر دەبن، ژنەکەی (عەزیز) فەرمان بەکەنیزەکانی دەکات خۆراکیان بۆبێنن، خۆیشی چەند چەقۆیەك دێنێت وهەر ژنێك وچەقۆیەکی پێ دەدات تاکو بەدەستی خۆیان گۆشت وخۆراك ومیوەو سەوزەکانیان لەت لەت بکەن بەپێچەوانەی ئەو عادەتەی کە دەبوایە چەقۆکان لەسەر مێزێك بوونایە بۆ لەت کردنی خۆراکەکان ودەشبوایە کەنیزەکانی بۆی لەت بکردنایە، بەڵام دیارە لەمەدا مەبەستێکی گرنگی هەبووە.

ئافرەتە میوانەکانیش چەقۆکانیان بەدەستەوە دەگرن و خواردەمەنی یەکانیان پێ لەت و پەت دەکەن وبەدەم نان خواردنیشەوە خەریکی قسەی خۆش وپێکەنین و گاڵتەو گەپ دەبن. لەو ساتە ناسکانەدا (زولەیخا)ی ژنی (عەزیزی میسر) خێرا فەرمان بە (یوسف) دەکات کە بچێت بۆلای ئافرەتەکان وخۆی پیشانیان دات تا لەنزیکەوە بیبینن. ئەوانیش هەر کەچاویان بە"یوسف" دەکەوێت تەزوویەکی توند دەیانگرێت و ڕادەچڵەکن بەو جوانی یە لەڕادەبەدەرو بێ وێنەیەی (یوسف)، هەربۆیەش لەو وەختەدا کت وپڕ هەموویان بێ ئەوەی ئاگایان لەخۆیان بێت دەستی خۆیان بەچەقۆکان بریندار دەکەن لەبەر زۆری ی سەرسوڕمان و لەهۆش خۆچوونیان بەدیتنی (یوسف) لەکاتی لەت کردنی خۆراکەکانیان دا. تەنانەت لەبەر ڕامان ووردبوونەوەیان لەجوانی ی ئەو کوڕەو سەرنج لێ دانی زۆریان هەست بەئازاری زامەکانی دەستیان ناکەن. ئەوان بەم شێوەیە ئەو جوانی یە بەگەورە دەگرن چونکە لەسەروو جوانی ی ئاسایی ی مرۆڤەوە بووە. پاشان دەڵێن: (ئەمە مرۆڤ نی یە، بەڵکو فریشتەیەکی بەڕێزە بەجوانی ی ناخی و تەواویی و بێ کەم و کووڕیی ی ڕەوشتەکانی).

ژنەکەی(عەزیز)، کە دەبینێت میوانەکانی هاودیدو هاوبەشی بوون لە سەرسوڕمان و هۆگریی یان دا بە"یوسف"و کە هەمان هەست وغەریزەیان هەیە، خێرا لەو ساتەدا (ناخی دڵی خۆی)شی دەکاتەوە بۆیان و بەئاشکرا نیازی خۆییان پێ دەگەیەنێت وپێشیان دەڵێت: ئەمە ئا ئەو کوڕە نەوجەوانە(فتی)یەیە کە سەرزەنشتی منتان لەسەر خۆشویستن وحەزلێ بوونی دەکرد.. ئێ خۆ ئێوەشی بەو جوانی یەی خۆی مەست وسەرسام کردو شێتی کردن و لەبیرخۆتانی بردنەوە تاوای لێ هات خۆتان زامدارکرد...ئا ئەمە ئەو نەوجەوانەیە کە ویستم پەلکێشی کەم بۆ ڕابواردن وکەچی نەیهێشت...ئێستاش لەسەرهەمان نیازی خۆم سوورم وسوێند دەخۆم لەسەر ئەوەی گەر گوێڕایەڵیم لەم فەرمانەم دا نەکات ئەوا لەزیندانی توند دەکەین تاکو- سەرکزو ئیهانەکراو- بێت).

بەڵام (یوسف) لەبەردەم ئەو هەڕەشەو گوڕەشانەدا وورەی بەرنەداو تەنانەت لەهیچ یەکێك لەو ئافرەتانەشی ڕانەدەبینی گەر لەو بارەیەوە ئامۆژگارییان بکات تا ئەوانیش گوێ ی لێ بگرن و سوودی لێ وەرگرن. بۆیە پەنای بردەبەر خودای پەروەردگاری ولێ ی پاڕایەوە کە زیندانەکەی بۆ برەخسێنێت، چونکە ژیانی نێو زیندانی بەباشتر دەبینی وەك لە سەرپێچی کردنی خودا. پاشان داوای لەپەروەردگاری کرد، کەهەر خراپەو زیانێکی ئەو مەکرو تەڵەکەبازی یەی ئافرەتەکانی لێ دوورخاتەوە تاکو نەکەوێتە بەرمەترسی ی مەیل کردن لەداواکاری یەکانیان و بەم ڕەنگەش ببێت بەیەکێك لەنەفام و گەمژە لەڕێ لادەرەکان. خوداش نزاو پاڕانەوەکانی گیرا کردو گوناە و تاوانی لێ دوورخستەوە، چونکە هەر خودایە کە بیسەری نزاو پاڕانەوەی پەنابەرانی یەتی...

ئەمەش دەقی ئایەتەکانی تایبەت بەم بەشەی داستانەکەیە:

﴿ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ ۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا [١] ۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ [٢] لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ [٣] ۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ [٤] ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ یوسف/ ٣٠–٣٤.

---

(١) (شغفها حبا): واتە: (خۆشەویستی ی ئەو کورە پەردەی دڵی ی بڕیوەو گەشتۆتە قووڵایی یەکانی).

(٢) (أعتدت): واتە (سازی کردو ڕێکی خست).

(٣) (استعصم): واتە (خوازیاری — عیصمەت —و ڕێ نەدان بوو وبەتوندی بەرگری کردو نەیهێشت).

(٤) (الصاغرین): واتە: (ملکەچ وئیهانەکراوان).

# بەندی چوارەم

## (( "یوســــف " لەزینــــدان دا ))

( تۆمەتبار کردنی "یوسف " و زیندانی کردنی - "یوسف " بانگەواز بۆ پەرستنی خودای تاك وتەنها دەكات - "یوسف" خەونی هەردوو هاوەڵەكەی لێك دەداتەوە )

## تۆمەتبار کردنی " یوسف " و زیندانی کردنی

کاتێك هەواڵی ژنەکەی"عەزیز"و -یوسف- لەسەرانسەری شـاردا بڵاوبـووەوە، عـەزیز و بنەماڵەکەشی ڕایان وابوو کە بۆ ئەوەی لەعەیب و عار و قسەو باسی سـەر زمـانی خـەڵکیش ڕزگاربن، تەنها کاری زیندانی کردنی"یوسف"ڕێگەچارەیەو دەبێت تاوانەکەش بخرێتە پاڵ ئـەو، سەرەڕای ئەوەی کە بەشێوەیەکی ڕوون وئاشـکرا بـێ تـاوانی و دەسپاکی و داوێـن پـاکی ی-یوسف- یشیان بۆ دەرکەوتبوو.

بارودۆخی "یوسف" لەکاتی چوونە نێو زیندانی دا تێکەڵەیـەکی پێکهـاتوو لـە "خـەم" و "شـادی" بـوو.. خەمەکـەی بـۆ ئـەوەبوو چـونکە بەسـتەم وبەناهـەق دەخرێتـە زیندانـەوەو لەدەرەنجامی ئەم گرتنەش دا لەوانەیە لەڕێزوحورمـەتی کـەم بێتـەوە، بەتایبـەتی لـەلای ئـەو کەسانەی لەحەقیقەت ئاگادارنین.. شادیو خۆشحاڵییشی بۆ ئـەوەبوو کـەوا لـەماڵی گـەورەی خۆی (عەزیزی -میسر) دەردەچێت و لەمەکرو ئاشووب دوور دەکەوێتەوە.. بـەڵام چـوونە نێـو زیندانیشی سەرەتای خێروچاکەیەك بوو بۆی: (وربّ محنة صنعتها منحة).. (لەوانەیـە لـەناخی مەینەتی یەك دا خەڵاتێك هەبێت)، ئەوەبوو هاوکـات لەگـەڵ زینـدانی کردنـی یوسـف دا دوو کوڕی نەوجەوانیش لەدارودەستەی پادشا دەخرێنە زیندانەوە، یەکێکیان: سەرۆکی ئاوکێـشەکان بوو و ناوی (نەبۆ) بوو، دووەمیشیان سەرۆکی نانەواکان بوو،کەناوی(مەلحەب) بوو. ئـەم دوانـە بەتاوانی – پیلان گێڕان لەدژی پادشا گیرابوون.

دوای ماوەیەك لەزیندان وناسینی (یوسف) هەریەکەیان خەونێك دەبینێت و بـۆ (یوسـف)ی دەگێڕنەوە.. یەکەمیان دەڵێت: لەخەونم دا دیتم ترێم دەگوشی تا (مەی)ی لێ دروست بکـەم)، دووەمیشیان دەڵێت: (منیش خەونم بەوەوەدی کە نانم لەسەر سەرم هەڵگرتبووو باڵندەش لێ ی دەخوارد).. ئەم دوو کوڕە داوا لەیوسف دەکەن هەردوو خەونەکەیان بۆ لێك داتەوە دوای ئەوەی

بۆیان دەرکەوتبوو زانستی تەفسیرکردنی خەونی هەیەو لەگەڵ ئەمەش دا سیفەتی خۆپاریزی و چاکەخوازی ی تێدایە..

(یوسف)یش لەگەڵ ئەوەدا ئاماژە بۆ نیعمەتی خودا دەکات لەلێکدانەوەی خەون دا، دان بەنیعمەتێکی دیکەش دا دەنێت کە زانستی نادیارەکان (مغیبات)ـە وخودا سروشتی زانینیانی پێداوە، بۆ نموونە دەتوانێت جۆری ئەو خۆراکەیان پێ بڵێت کە لەزیندان دا پێیان دەدرێت پێش ئەوەی بیبینن و بزانن چی یە. خوداش ئەم مەسەلە غەیبییانەی بەتایبەتی بەو سپاردووە، چونکە تەنها خودای بەشێوەیەکی پوخت وبێ گەرد پەرستووەو هیچ کەس وشتێکی نەکردووە بەهاوەڵی ونەیشی هێشتووە هاوبەش و (شەریك) بۆ خودا دابنرێت، هەروەها، چونکە خۆی دوورەپەرێزگرتووە لەرێبازە چەوتەکەی ئەو گەلەی باوەڕیان بەبوونی خودا نی یەو باوەڕیش بەرۆژی دوایی ناهێنن:

﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٣٥﴾ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾ یوسف/٣٥-٣٧.

## "یوسف" بانگەواز بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنها دەكات

زیندانییانی ئەو گرتووخانەیە زۆر هاوسۆزو هۆگری (یوسف) بوون و ڕێزێکی زۆریشیان بەهۆی لێکدانەوەی خەونەکانیانەوە لێدەگرت کەلەم کلاو ڕۆژنەیەشەوە هەندێك لەهەواڵەکانی نادیار (غەیب)ی فێرکردن، (یوسف)یش ئەمەی بەهەلێکی لەبارو پێویست دەبینی تا لەم ڕێ یەوە ناسنامەی خۆییان بۆدەرخات کە لەچ بنەماڵەیەکی ڕەسەنەو ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانی بەرامبەریان چی یە، ئیدی دەست دەکات بەئامۆژگاری کردنیان وبانگ کردنیان بۆ سەرئایینی خودای تاك وتەنها، پاشان ڕوون کردنەوەی پووچەڵی ی (ڕێبازی هاوەڵ بۆ خوادانان)، کە هیچ بەڵگەونیشانەیەکی نی یە پشتی پێ ببەستێت.

(یوسف) بەم شێوەیە دەیدواندن وپێ ی دەگوتن: (من هیچ ئاینێکم دانەهێناوەو دانەڕشتووە، بەڵکو شوێنکەوتووی ئایینی ڕاستەقینەی باب وباپیرانم (ابراهیم و اسحاق و یعقوب)م کە خودا ڕێنمایی ی کردوون بۆسەر باوەڕی ڕاستەقینەو ئەو عەقیدە ڕاست ودروستەی کە دەربارەی پەرستنی خودایە بەتەنها. ئەمەش فەزڵ وبەخششی خودایە لەسەر ئێمەو

لەسەرخەڵکیش کاتێك ئێمەی بۆلای خەڵکی نارد تاکو ڕێنموونی یان بکەین بۆ سەر ئاینی ڕاست. بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم فەزڵ وبەخششە خودایی یە بە سوپاس وشوکرانە بژێری و باوەڕهێنانەوە وەرناگرن، بەڵکو بەبێ باوەڕی و نکوولّی کردنەوە بەربەرەکانی ی دەکەن)...

پاشان "یوسف "لەدواندنی هەردوو هاوڕێی نێوزیندانی بەردەوام دەبێت وپێ یان دەڵێت: (ئایا چەند خودایەك بۆ مرۆڤ باشترە کەمل بۆ هەریەکەیان کەچ کات، یان ئەو خودا تاك وبێهاوەڵەی کە بەسەر هەموو شتێك دا باڵادەستە؟ ئەو خواوەندە هەمەچەشن ولێك جودایانەی ئێوە دەیانپەرستن لەجیاتی (الله) تەنها چەند ناوێکن کەئێوە خۆتان وباب و باپیرانتان بۆ ئەو وەهم وخەیاڵانەتان داناون کەهیچ وجودێکیان لەواقیع دانی یە، تەنانەت هیچ بیانوویەك یان بەڵگەیەکی (عەقڵی)یشتان لەسەر شەرعیەتی پەرستنیان بەدەستەوە نی یە بۆ قەناعەت پێهێنانی هەر کەسێك کە لەجیاتی خودا(الله) بیانپەرستێت. لێرەش دا حوکمی جیاکەرەوە لەسەر (زانینی خودای هەق وئەوەی شایستەی پەرستنە) هەر بۆ خودا(الله) خۆیەتیو فەرمانی کردووە کەئیدی غەیری خۆی نەپەرسترێت وملی بۆ هیچ شتێکی تر کەچ نەکرێت. جا هەر ئەمەیە ئاینی ڕاست وڕەوان کە بەچەندەها دەلالەت وبەڵگەوە بۆ مرۆڤ ڕوون بووەتەوە. کەچی زۆر کەس لەخەڵکی نایانەوێت بەم بەڵگەڕۆشنانە ڕێنمایی بکرێن وپەی بەم ڕاستی یە پرشنگدارەش نابەن:

﴿وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ[1] إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾یوسف/٣٨-٤٠.

## - یوسف - خەونەکانی هەردوو هاوەڵەکەی لێك دەداتەوە

یوسف دوای ئەوەی پەندو ئامۆژگاری یەکانی بۆ هەردوو هاوڕێکەی نێو زیندانی تەواو دەکات، دێتە سەر وەڵامی پرسیارەکانیان لەسەر لێکدانەوەی خەونەکانیان، بۆ تەفسیری خەونی سەرۆکی ئاوکێشەکان، پێ ی دەڵێت: (تۆ هەر خۆشبیت وچاوت ڕوون بێت ئەوا من مژدەی ڕزگاربوونت پێ دەدەم ومژدەت لێ بێت پادشا لەژیانتا دەتهێڵێتەوە لەبەر بەرائەت وبێ

(١) سلطان: بەڵگە، نموونە، پاکانە، پاساو ...

تاوانیت لەو پیلانەدا کە تۆشی تێدا تاوانبارکرابوویت، بەم زوانەش ئـازاد دەکرێـیـت و لەسـەر کاری جارانت وەك ئاوکێشی پادشـا دەمێنیـەوە).. دەربـارەی لێکدانـەوەی خـەونی سـەرۆکی نانەواکانیش، دەڵێت: (بەڵام تۆ ئەی سەرۆکی نانەوایان دەبێت لـێم ببووریـت گـەر بەڕاسـتیو ڕاشکاوانە خەونەکەت بۆ تەفسیربکەم، چونکە دەبێت لـەکاروبارو چارەنووسـی خـۆت ئاگـادار بکرێیت، ئەویش ئەوەیە بەپێی ئەو خەونەی دیوتە پادشـا حـوکمی کوشـتنت بەسـەردا دەداو لەدار دەدرێیت وباڵندەش دوایی لەسەرت دەخۆن، چونکە بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە تۆ بەشداریت کردووە لەو پیلانەدا لەدژی پادشا)...

پاشان "یوسف" ڕوودەکاتە هەردووکیان وپێ یان دەڵێت: (ئیتر خودای مەزن بڕیـاری خـۆی بەم ڕەنگە داوە کە من بۆم ڕوون کردنەوە، ئەم بڕیارەش هیچ ڕێگرو بەربەسـتێکی لەبەردەمـدا نابێت. منیش لەخۆمەوەو بەئارەزووی خۆم نادوێم، بەڵکو بەپێ ی سرووش وئیلـهامی خـودای پەروەردگارم دەدوێم لەمەڕ لێکدانەوەی هەردوو خەونەکەی ئێوە)..

سەرۆکی ئاوکێشان بڕیاری ئازادبوونی بۆ دێت ولەکاتێکدا خەریك بوو لەزیندان دەردەچوو، (یوسف) داوای لێکرد بەسەرهاتی خۆی (واتە: بەسەرهاتی یوسف ومەسەلەی زیندانی کردنـی) بەپادشا بگەیەنێت کاتێك پێ ی دەگات، لەگەڵ باس کردنی ئەو زوڵم وسـتەمەی لێ ی کـراوە تاکو لەکاروباری بکۆڵێتەوەو چاو بەکێشەکەی دا بخشێنێتەوەو بـۆ پادشـا ڕوون بێتـەوە، کـە- یوسف- بێ تاوانەو پاشان ئەو زوڵم وستەمەی لەسەرلابات کە بەناڕەوا دەرهەقی کـراوە. بـەڵام سەرۆکی ئاوکێشەکان لەبەر خۆشحاڵی ی لەڕادەبەدەری خۆی بەبۆنەی لەزیندان دەرچوونیەوەو لەبەر کاروباری زۆریشی لەبیری دەچێت، کە باسی(یوسف)وگرفتـەکانی لـەلای پادشـا بکـات. دیارە ئەمەش خوویەکەو لەزۆربـەی خـەڵکی دا هەیـە کاتێـك لـەدوای تەنگانەیـەك دەکەونـە خۆشیو شادیو ئاسوودەیی یەوەو هاوڕێ یانی تەنگانـەیان بیردەکـەن. بێگومـان بـەهۆی ئـەو لەبیرچوونەوەیەی سەرۆکی ئاوکێشەکانیشەوە (یوسف) چەند ساڵێکی تریش لەزیندان دامایەوە، هەروەك لەئایەتەکەدا وشەی (بضع سنین) هاتووەو مانای نێوان (٣-٩) ساڵ دەگەیەنێت..

ئەم دێرانەی پێشووش پوختەی مانای ئەم فەرمایشتەی خودایـە لـەم ئایەتانـەی بەشـێکی دیکەی سوورەتی "یوسف"دا: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ[1] سِنِينَ ﴾یوسف/٤١-٤٢.

(١) (بضع): واتە (چەندێك) کە بۆ ماوەی نێوان (٣ – ٩) ساڵ دەگەیەنێت.

# بەندی پێنجەم

## ((یوســـــف.. وەزیری پادشا))

(خەونی پادشا - سەرۆکی ئاوکێشەکان لەلای "یوسف"- "یوسف" خەونەکەی پادشا لێك دەداتەوە - لێکۆڵینەوە لەپیلانەکە - پادشا وەزارەتی دارایی بە "یوسف" دەسپێرێت)

## خەونـی پادشـــا

دوای ئەو چەند ساڵەی، کە (یوسف) لەزینـدان دا بەسـەری بـرد خواسـتی سەرپەرشـتی ی ئیلاهی وابوو لەزیندان دەربچێت و بەرزترین پلـەی دنیاییـشی پـێ بـسپێرێت، خـوداش گـەر ئیرادەی لەسەر شتێك هەبێت هۆکارەکانی بۆ دەسـتەبەردەکات. پادشـا[١] جارێکیـان لـەکاتی نووستنیدا، خەونێك دەبینێت وبێئارامی دەکات وترس وبیمی لێدەنیشێت، دیـارە خـەونێکی سامناك بووە، بۆیە چەندین (کاهین) و حەکیم کۆدەکاتەوەو پێ یان دەڵێت: (من لـە خـەونم دا دیتم حەوت مانگای لەڕو لاواز حەوت مانگای قەڵـەو دەخـۆن. هـەروەها حـەوت گوڵەگـەنمی سەوزو حەوتی وشکم بینی، گەلۆ ئێوەش مانای ئەم خەونـەم بـۆ شـی بکەنـەوە گـەر توانـای تەفسیرکردنی و ڕوون کردنەوەی مەبەستەکەیتان هەیە)..

ئەو کۆمەڵەش کە گوێ یان بۆ پادشا گرتبوو بەو خەونەی ناوبراو پەشۆکان وسەریان لێتێك چوو و ئەو سەر لێ تێکچوونەشیان پێوە دیاربوو. لەنێو خۆیشیان دا ڕاوێـژێکیان کـردو دوایـی وەڵامێکی وای پادشایان دایـەوە کـە لەجـەهل و نـەفامی ی خۆیانـەوە سەرچـاوەی گرتبـوو، وەڵامەکەشیان ئەوەبوو گوایە ئەم جۆرە خەونانە هیچ پێودانگێکیـان بـۆ دانانرێـت لـەکاروبارو هەڵس وکـەوتی ڕۆژانـەدا، بـەڵکو تـەنها چـەند تێکەڵەیـەکی هەنـدێك لەخەونـە بـۆش وبـێ ناوەڕۆکەکانە کە لەئەنجامی چەند خەووخەیاڵێکی پادشا خۆیەوە دروست بوون وئاماژە بۆ هـیچ شتێك ناکەن.. کەچی لەگەڵ ئەمەش دا ئەو کاهین و حەکیمانە دانیان بـەوەدانابوو کـە ئـەوان

---

(١) ئەم پادشایە لەو بیانییانە بووە، کە-میسر-یان داگیرکردووەو لەوانەش بووە، کە ناوی(هیکسۆس)،یـان لێ نراوە،واتە: (پادشاشوانەکان)،هەندێك مێژوونووس بەعەرەبیان دادەنێن، هەندێکی تریش بـە(فینیقـی)یـان دادەنێن.

وێڕای ئەو قسانەشیان هیچ زانستێکیان لەبارەی لێکدانەوەی خەونەوە نی یە..

﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴾يوسف/٤٣-٤٤.

## سەرۆكی ئاوكێشەكان لەلای یوسف

سەرۆكی ئاوكێشەكان كاتێك گوێ ی لەپرسیاری پادشا بوو دەربارەی خەونەكەیو ئاگاداری وەڵامی كاهین و دەستە و دایەرەكەشی بوو لەشێوازی لێكدانەوەی خەونەكەیدا كە جگە لە پیشاندانی نەفامییان لەبابەت تەفسیری خەونەوە تەعبیریان لەهیچ شتێكی دی نەدەكرد، خێرا ئەم (دیمەنی گفت و گۆو لێدوان لەخەونە)یادگارەكانی ڕابردووی بەبیرهێنایەوە و ڕوخساری (یوسف)ی كەوتبووەوە بەرچاو. هەروەها لەو ساتەدا سەرۆكی ئاوكێشەكان لێهاتوویی و شارەزایی ی (یوسف)ی لە تەفسیرەكانی خەون دا بۆ دەركەوت، هەر بۆیەش كت و پڕ ڕوو دەكاتە ئەو كۆمەڵەی كە چوار دەوری پادشایان داوەو پێیان دەڵێت: (من دەتوانم كەسێكتان بۆ دەسنیشان كەم كە ئەو خەونەتان بۆ تەعبیر كات ئەویش كوڕێكی نەوجەوان (فتی)یە و ناوی -یوسف-ەو من و سەرۆكی نانەوایان لەگەڵ ئەودا لەزیندانەدا بووین، ئەمەش بەو بەڵگەیەی ئێمە هەردووكمان (واتە خۆی و سەرۆكی نانەواكان) هەریەكەمان خەونێكمان دیو بۆمان گێڕایەوەو ئەویش كە بۆی لێكداینەوە، ڕاستگۆو زیرەك بوو لەلێكدانەوەی خەونەكانمان دا، چونكە هەردوو خەونەكەمان وا دەرچوون و بەپێی لێكدانەوەكەی ئەو بەدی هاتن. جا ئەگەر جەنابی خاوەن شكۆی (پادشامان) دەمنێرێت بۆ لای -یوسف- ئەوا دەچم بۆ لای و تەفسیری هەرە ڕاست و دروستی لەسەر خەونەكەی بۆ دێنمەوە).

پادشاو هەموو ئەوانەی چوار دەوریشی قایل بوون بەوەی ئەو كابرایە (سەرۆكی ئاوكێشەكان) بنێرن بۆ لای (یوسف) لەزیندان دا. ئەویش سەردانی یوسفی لەزیندانەكەی دا كرد دوای ئەو ماوە درێژەی كە لێی دابڕابوو و لەزیندان ئازاد كرابوو جارێكی تر دیداری كردەوە، بەڵام گومانی ئەوەشی هەبوو كە گلەیی لێ بكات لەسەر ئەوەی دوای لەزیندان دەرچوونی باسی -یوسف-ی لەلای پادشا نەكردووەو گرفتەكەی پێ نەگەیاندووە، لەبەر ئەمە خێرا پاساوی ئەوەی بۆ دێنێتەوە كە بەهۆی چەند ڕووداوێكی تایبەت بەخۆیەوە بیری چوو بوو باسی كێشەو گرفتەكانی -یوسف- بۆ پادشا بكات. دوای ئەم پاكانەیەش هۆی سەردانەكەی بۆ ڕوون دەكاتەوەو پێی دەڵێت: (ئەی ئەو كەسەی لەهەموو وتەیەكت دا ڕاستگۆ بوویت

خەونێکمان هەیە کە خەڵکێکی تر دیویانەو بۆمان لێك بدەرەوە، خەونەکەش ئەمەیە" حەوت مانگای قەڵەویان لەخەوا دیوە، کە حەوت مانگای لەڕولاواز دەیانخۆن، هەروەها حەوت گوڵەگەنمی سەوزیان لەگەڵ گوڵە گەنمی وشك دا پێکەوەبینیوە لەهەمان خەون دا. جا یوسف تۆش حەقیقەتی ئەم خەونەو هەواڵە شاراوەکەیمان پێ بڵێ تا منیش بەخاوەنەکەی بگەیەنمەوەو بەشکم ئەوانیش گرنگی ی ڕێزو پلەو پایەی تۆ لە زانست دا بزانن)...

ئەم چەند دێرەی پێشووش شیکارو واتای ئەم دوو ئایەتەی سوورەتەکەیە کە خودا تیایان دا فەرموویە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ[1] أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ[2] وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ یوسف/٤٥-٤٦.

## یوسف خەونەکەی پادشا لێك دەداتەوە

"یوسف" کە گوێی لەم جۆرە خەونە دەبێت بۆی دەردەکەوێت ئەوە هەواڵی چەند کارەساتێکی ناخۆشە لەداهاتوودا. ئەویش وێڕای ئەوەی لەسەرەتای لێك دانەوەی خەونەکەدا هەواڵی ئەو کارەساتانەیان پێ دەڵێت، بەڵام لەهەمان کاتدا چەند چارەسەرێکی پێویست و شیاویشیان بۆ دەخاتە ڕوو،تا بتوانێت لەو قەیرانە کوشندەیەی ئەو ڕۆژگارەی(میسر) دەربازبن.

"یوسف" بۆ تەفسیری خەونەکەی"پادشا" بەسەرۆکی ئاوکێشەکان دەڵێت: (بەگوێرەی ئەم خەونە ولاتی "میسر" حەوت ساڵی پڕ لەداهاتی دەغڵ و دان و خێرو بێری کشتوکاڵی ی بەسەرداد‌ێت، بەڵام دەبێت ئەو زەوی و زارانەتان ساڵ لەدوای ساڵ بەردەوام بکێڵن و گەنم و جۆی تێدا بچێنن و کۆششێکی زۆر بخەنە گەڕو ئەوەشی دەیدروونەوە لەنێو گوڵەگەنمەکانیان دا بیانهێڵنەوەو دەستیان پێوە بگرن و هێندەی لێ مەخۆن تەنها کەمێکی وای نەبێت کە سەغڵەتی و نارەحەتیتان نەهێڵێت، چونکە دوای ئەم حەوت ساڵی پڕ خێرو خۆشیو داهاتە، حەوت ساڵی (وشکانی و بێداهاتی)یتان تووش دەبێت و ئەوەی لەوەوپێش هەڵتان گرتووەو پاشەکەوتتان کردبوو بەکاری دێنن و هیچی وای لێ ناهێڵێتەوە مەگەر تەنها ئەوەندەی نەبێت کە ببێت بە تۆو بۆ چاندنتان. دوای ئەم حەوت ساڵی نەهاتی و نەبونی یەشتان ساڵێکی بەداهات و پڕ خێرو بێرتان بۆ دێت کە خەڵکی بە (باران) دەبووژێنەوەو زەوی و زاریش بە

---

(١) (ادكر بعد أمة): واتە: (دوای ماوەیەکی زۆر بیری کەوتەوە).

(٢) (عجاف): کۆ(جمع)ی (عجفاء)و (عجف)ە،واتە: ئەو ئاژەڵە هەرە لەڕو لاوازەی، کە وێنەی نی یە لە لاوازی دا.

بەرهەم و داهاتی زۆر دەبوژێتەوەو خۆراك و هەر شتێكی وەك (ترێ و زەیتوون) كە ڕۆن وشەربەتیان هەبێت بۆ خەڵكی دەستەبەر دەكات.

هەروەك خوداش فەرموویە: ﴿قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنبُلِهِۦٓ[1] إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾يوسف/٤٧-٤٩.

## لێكۆڵینەوە لە پیلانەكە

سەرۆكی ئاوكێشەكان تەفسیری خەونەكەی بۆ پادشا بردەوەو پادشاش زۆری پێ شادمان بوو و زانیشی كە ئەو لێكدانەوەیە لەگەڵ خەونەكەی دا دەگونجێت و ئەوەش بەڵگەیە لەسەر تەواویی و كامڵی ی عەقڵی لێكدەرەوەكەی، بۆیە فەرمانی كرد بیهێنن بۆ لای خۆی تا داوای ڕوون كردنەوەی چەند لایەنێكی گرنگی ئەو خەونەی لێ بكات. نێرراوی پادشا چوو بۆ لای -یوسف-و ئەو خواستەی پادشای پێ گەیاند، بەڵام (یوسف) زۆر پەرۆشی چوونە دەرەوەی زیندان نەبوو، بەڵكو داوای كرد ئەو تۆمەتە ناڕەوایەی لەسەر لاببرێت كە بەناهەق خراوەتە پاڵی، دەنا هەر سورە لەسەر مانەوە لەزیندان دا. داواكاریشی لەنێرراوەكە ئەوە بوو بگەرێتەوە بۆ لای پادشاو داوای لێ بكات لەو پیلانە بكۆڵێتەوە كە لەدژی هەڵبەسترابوو و ئەو ئافرەتانەش بانگ بكات كەلە داوەتی ژنەكەی (عەزیزی میسر)دا ئامادەببون و دەستی خۆیان تێدا بڕیبوو لێ یان بپرسێت هۆیەكانی زیندانی كردنی چی بوون تاكو چەند شاهیدێكی ئەو كێشەیەی بن.

نێرراوەكەش گەڕایەوەو پەیامی -یوسف-ی بەپادشا گەیاند. دیارە پادشاكەش سێ‌ودووی نەكردووە لەلێكۆڵینەوەی ئەوەی داوای كردبوو. بۆ ئەم مەبەستەش نوێنەری خۆی بۆ لای ئەو ئافرەتە داوەتكراوانە دەنێرێت و داوای ڕوون كردنەوەی حەقیقەتی ئەو مەسەلەیەی -یوسف-یان لێ دەكات، لەو كاتەدا ژنەكەی (عزیز)یش لەگەڵیان دا ئامادە دەكرێت. ئەو (واتە: نوێنەری پادشا) بە ئافرەتەكان دەڵێت: (ئەرێ بۆچی ئێوە ویستووتانە -یوسف- فریوبدەن و تووشی هەڵەی بكەن؟ ئایا دیوتانە مەیلێكی بەلای ئێوەدا هەبوبێت؟ ئایا پێكەنیوە بۆتان؟ ئایا هیچ

(١) (فذروە في سنبلە): (كە مانای ئەوەیە لەنێو گوڵەگەنمەكەی دا بیهێڵنەوە) ئەوەی ئەم ئایەتە باسی كردووە زانستی نوێش پێی گەیشتووە كە هێشتنەوەی دانەوێڵە لەنێو گوڵەگەنمەكانیان دا لەكاتی هەڵگرتن و پاشەكەوت كردنیان دا شێوازێكی پاراستنیانە لەفاكتەرە سرەشتی یەكان و لەمێرووە زیانبەخشەكان، جگە لەمەش دانەوێڵەكە بەم شێوازە هەموو سیفەت و ماددە خۆراكیەكانی دەپارێزرێت. جا كەوابوو (محمد پێغەمبەر(ﷺ) كە قورئانی خودای بۆ هاتوە لەكوێ ئەم ڕاستیەیە زانستیانەی لەخۆوە هێناوە گەر خودا بۆی نەناردبێتە خوارەوە؟ نی خۆ (تەورات)یش باسی ئەمەی نەكردووە تا بگوترێت لەتەوراتەوە هێناویەتی، بەڵكو بەڕاستی ئەمە موعجیزەیەكی زانستی قورئانەو بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتی یەكەی محمدیش(ﷺ).

گاڵتەو گەپێکی لەگەڵ کردوون هەتا ئێوەش بەتەمای فریودانی بن و جورئەتی داوالێکردنی ئەو کارەتان هەبوبێت کە بۆ ئێوە جوان و شیاو نی یە؟)..

لەوەڵامی ئەم پرسیارانەدا ئافرەتەکان گوتیان: (پاك و بێگەردی هەر بۆ خودایەو ماشاڵڵا لەپاکی و ئابڕوومەندیی -یوسف- ئێمە هیچ خراپەیەکمان لێ نەبیستووە و نەدیوە)..

لەو ساتەوەختەدا (زولەیخا)ی ژنی (عەزیزی میسر) وای بەچاك زانی کە بێگومان ژیری و دانای لەوەدایە دان بە واقیع دابنێت، چونکە هەر سووربێت لەسەر نکوولی کردن ئەوا ئەو ئافرەتانە شایەتی لەسەر ئەو وتەو هەڵوێستەی پێشووی دەدەن کە بەڕاشکاوی گوتبووی (من داوای بەدکرداریم لە -یوسف- کرد و گەر خواستەکەم جێبەجێ نەکات زیندانی دەکرێت).

یان لەوانەشە ویژدانی خۆی لەدوای ئەو شایەتی دانەی ئافرەتەکان لەسەر پاکی و پاکداوێنی ی -یوسف- بێدار بووبێتەوەو هیچ ڕێگەیەکیشی لەو بارودۆخەدا لەبەردەم نەمابێت تەنها دان نان بەڕاستی دا نەبێت کەوا (ئەم - خۆی) هەوڵی لەخشتەبردنی -یوسف-ی داوە تا هەڵێنێت بۆ کاری ناشەرعی، بەڵام -یوسف- لەبەرامبەر ئەو جۆرە هەوڵەدا خۆڕاگرو سەنگین بووەو بەم پێیەش ڕاستگۆیە لەتۆمەتبارکردنی ژنەکەدا بەو جۆرە هەوڵانە.

پاشان ژنەکەی -عەزیز- بەڵگەی بۆ ئەم دان پیانانەی بەوەش هێنایەوە کە دەیەوێت (یوسف) تێبگەیەنێت و بزانێت کەوا (ئەم ژنە خۆی) هەرگیز حەزی نەکردووە زیندانی کردنی (یوسف) بکات بەهۆیەك بۆ تۆمەتبارکردنیو بۆ هێشتنەوەی تۆمەتەکە پێوەی و بۆ خیانەت لێکردنی لەکاتی نادیار بوونی دا، چونکە خودا ڕێ بەسەرگرتنی پیلانی خائینان نادات.

لەدوایشدا ژنەکەی (عزیز) دەیەوێت داوای لێبوردن لەسەر ئەوە بکات کە نەفسی مرۆڤ خوازیارو پەرۆشی خراپەکاری یە، تەنها ئەو نەفسە نەبێت کە خودا دەیپارێزێت و چاودێری ی دەکات بەڕەحم و بەزەیی خۆی.. خوداش لێبوردوو میهرەبانە بۆ تەوبەکاران..

﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّـٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ[1] إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ قُلْنَ حَـٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٔـٰنَ حَصْحَصَ[2] ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّى لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِىٓ ۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾یوسف/ ٥٠-٥٣.

---

(١) (ما خطبكن): (ماشأنكن) واتە (کارتان بەوە چی بوو)؟.. چ پەیوەستییەکتان پێوەی هەبوو؟

(٢) (حصحص): واتە دەرکەوت و جێگیربوو.

## پادشا وەزارەتی دارایی بە -یوسف- دەسپێرێت

پادشای –میسر- ڕاستی ی بێ تاوانی ی –یوسف- و داوێن پاکی یشی بۆ روون بووەوە، بەمەش متمانەی زیاتر بوو پێ‌ی و حەزی کرد زیاتریش لێ ی نزیك بێتەوە، بێگومان پێشتریش زیرەکی و تێگەیشتوویی –یوسف-ی بەهۆی لێکدانەوەی خەونەکەیەوە بۆ دەرکەوتبوو، جگە لەو ڕاوێژو تەکبیرەش کە بۆی کردبوو سەبارەت بەرزگاربوون لەو تەنگژە ئابووریيەی کە لەو ڕۆژگارەدا تووشی-میسر- ببوو. پادشا کە (بەرەگەز-ئاسیایی- بوو) وای دەبینی کەوا لەنێوان خۆی و -یوسف-دا پەیوەندی یەکی خزمایەتی لەڕووی ڕەگەزەوە هەیە... هەموو ئەو هۆکارانەش ئاسەوارێکی بەهێزی لەدەروونی پادشادا جێهێشتبوو وای لێ کردبوو (یوسف)ی زۆر زۆر خۆش بوێت و هەڵیبژێرێت بۆ هەندێك کاروباری گرنگی خۆی.

نێراوی پادشا چوو بۆ لای -یوسف- تا (ئەنجامی لێکۆڵینەوەو دان پیانانی -زولەیخا-ی بە بێ‌تاوانی یەکەی دا) پێ بگەیەنێت جگە لەگەیاندنی ئەو مەبەستەی پادشاش بە یوسف سەبارەت بەوەی کە دەیەوێت جڵەوی کارێکی پێ بسپێرێت. (یوسف)یش بێ هیچ گومان و ڕاراییيەك خواستەکەی پادشای جێبەجێ کردو چوو بۆ لای.. لەودیدارەدا پادشا پێ‌ی گوت: (بێگومان من زۆر سەرسام و شادمانم بە تۆ). ئینجا بەگوتاری بەڵێن و دڵنیاکردنەوە ڕووی کردە یوسف و پێ‌ی وت: (تۆ -ئەی یوسف- بەڕاستی لەلای ئێمە ڕێزو پلەو پایەیەکی گەورەت هەیەو لە هەموو شتێکیش دا متمانەت پێ دەکەین).

(یوسف) بەم پلەو پایە گەورەیەوە هەستی بەلێپرسراوێتی ی سەرشانی دەکرد لەئاست هەر تەنگانەیەك دا کە بەسەر هاوولاتیانی -میسر-دا بێت لەسالانی بێ‌بارانی و نەداری دا (وەك ئەوەی نەبادا کەسانی بەهێزو دەست ڕۆیشتوو ستەم لە هەژارو بێ‌هێزەکان بکەن) وەك چۆن پێشتر ستەم لەخۆی کرابوو، یاخود (سووکایەتییان پێ‌بکەن) وەك ئەو سووکایەتی یەی بەخۆی کرابوو.. لەبەر ئەمە حەزی کرد کە کاروباری داهاتووی ئەو خەڵکە بێ‌هێزو کەم دەستە لەئەستۆی خۆی بگرێت و خۆی ڕاستەوخۆ لەخزمەتیان دا بێت تاکو زوڵم و ستەمیان لەسەرلاببات. ئینجا داوای لەپادشاکرد بیکات بە باوەڕپێکراو (ئەمیندار)ی گەنجینەکانی وڵات، تا ئەرکی (سەرپەرشتی‌کردن و هەڵگرتنی خۆراك و پاشەکەوت کردنی بۆ سالانی وشکانی و نەهاتی) بگرێتە دەست. چونکە ئەم کاری سەرپەرشتیاريیە ئاتاجی بەدەسپاکی و زانست و شارەزایی یەو ئەمیش (واتە -یوسف-)هەموو ئەم مەرجانەی تێدایەو پادشاش لێ ی

ڕادیون. لەسەر ئەو بنچینەیەش پاشا قایل بوو بەو سەرپەرشتیاریێتی یەی و ئیدی -یوسف- هەموو کاروبارێکی ئابووریی ی -میسر-ی لەئەستۆ گرت و دەسەڵاتیشی بۆ دانا لەسەرخاکی -میسر- تاکو بە ویست و داخوازیی ی خۆی هەڵس و کەوتی تێدابکات و بەرژەوەندیی گشتی بپارێزێت. دیارە ئەمەش خواستی خودا خۆیەتی لەکاری بەندە چاکەکانی داو نیعمەتی خۆی بەو بەندە چاکانەی دەبەخشێت کە دەیانپاڵیوێت و هەڵیان دەبژێرێت بۆ ئەو کارە گرنگ و مەزنانە، لەدنیاش دا پاداشتیان لەسەر ئەو کارە چاك و بەئەمەکانە دەداتەوە کە ئەنجامیان داوە، پاشان لە ڕۆژی دوایی (ئاخیرەت)دا پاداشتێکی چاکتر لەوەی دنیاشیان دەداتەوە، ئەو پاداشتەی ڕۆژی دوایی بۆ ئیمانداران و خواپەرستانە کە ئیمانی ڕاستیان پێ هێناوەو لەخودای خۆیان دەترسن و خۆیان لەهەموو جۆرە گوناه و سەرپێچی یەك و سزای خودا دەپارێزن..

﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِى ۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجْعَلْنِى عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ ۖ إِنِّى حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَآءُ ۚ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَآءُ ۖ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾يوسف/٥٤-٥٧...

# بەندی شەشەم

## ((یوسف و ناسینەوەی براکانی))

(براکانی "یوسف" لە میسر - گەڕانەوەی براکان بۆ لای "یەعقوب"ی باوکیان -"یوسف" "بنیامین"ی برای بەبارمتە دەگرێت - براکانی "یوسف" داوای ڕەحم و بەزەیی لێ دەکەن)

## براکانی " یوسف " لە - میسر -

لێکدانەوەکەی (یوسف) بۆ خەونی -پادشا- وا دەرچوو کە ڕاستەو دەبێت ئەو ماوەی خۆشی و ناخۆشی و بارگرانی یە بەدی بێت، ئەوەبوو یەکەم جار حەوت ساڵی پڕ لەداهاتی کشتوکاڵی و پڕ لەخێروبەرەکەت هاتەپێشەوەو (یوسف)یش بەسەلیقەو تەگبیری خۆی سەرپەرشتی کاروباری ئابوری و دارایی ی دەکردو بەروبومی زۆرو زیاد لەپێویستی ئامار دەکردو لەگەنجینەدا دایدەنا. ئینجا وەك چاوەڕوان کراوبوو حەوت ساڵی وشك و بێبارانی و بێداهاتی ڕووی تێکردن و برسێتیی و گرانی ی خستەوە، بەتایبەتیش لەچەند وڵاتێکی دراوسێیان دا (وەك فەلەستن)، چونکە خەڵکی ئەو وڵاتانەی دەوروبەریان خۆیان بۆ ئەو جۆرە ساڵانە ئامادە نەکردبوو و هەواڵی قات و قڕییان نەزانیبوو. بێگومان (یەعقوب) و کوڕەکانیشی وەك هەر خەڵکێکی تر تووشی بارگرانیو تەنگانەی ژیان بوون، بەڵام -یەعقوب- بیستی کە ڕزق ورۆزی لەلای خەڵکی میسر هەیەو لەوەوپێش خۆیان بۆ ڕۆژگارێکی ئاوا سازکردووە، هەربۆیەش هەموو کوڕەکانی بانگ دەکات (تەنها -بنیامین-ی کوڕە بچووکی نەبێت) و داوایان لێ دەکات بچن بۆ میسر و ئەوەی هەیانە لە کەل و پەلی بازرگانی و لە زیو و لە شتی تریش لەگەڵ خۆیان دا بیبەن تا لەوێ بیگۆڕنەوە بە گەنم و جۆ.

براکانی -یوسف- بەدەم ئەم داواکاری یەی باوکیانەوە دێن و دەچن بۆ "میسر". دیارە چەند کەسێکیشیان بۆ چاوەڕوانی کردنی گەیشتنیان دانراوە کاتێك ئەوان بەو شێوەیە نائاسایییەو بەو ژمارە بەکەم دانەنراوەیانەوە (کەجێی سەرنج و ڕامان و هۆی دروستبوونی بەدگومانییشە لێ یان (خۆیان دەکەن بە ناوشاردا، بۆیە دەسبەجێ دەیانگرن و دەیانبەن بۆ لای -یوسف- لەکۆشکەکەی دا. (یوسف)یش لەو کاتەدا دەیانناسێتەوە بەهۆی ڕوخسارو ڕەنگ و

ڕوویان و قسە و گفتاریان و جل و بەرگە فەلەستینییەکانیانەوە. بەڵام ئەوان (یوسف)ی برایان نەناسنەوە، ئەویش لەبەر زۆری ئەو جیاوازی و گۆڕانکاریانەی بەسەری داهاتووەو لەبەرزۆری ی تێپەڕبوونی ماوەی لەیەکتر دابڕانیان و گۆڕانی ڕەنگ و ڕوخساریشی.. بێجگە لەوەش بە هۆی وجودی -یوسف- لەوەزارەتی -دارایی-و بەو جل و بەرگە تایبەتی یەشیەوە، هەروەها بەزمانی دێرینی -میسر- لەگەڵیان دا دەدواو ناویشی گۆڕابوو، چونکە لەجیاتی -یوسف- پادشای میسر ناوێکی تازەی بۆ دانابوو و ناوی لێ نابوو (صفنات فعینع).[1]

(یوسف) براکانی خۆی بەمیوان دانا (لەجیاتی ئەوەی بەشێوەیەکی دی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکات) و دوای ڕێزلێ نانیان و گەنم جۆی بەزیادەوە و پتر لەمافی شیاوی خۆیان بۆ کێشان (واتە لەو سەنگەی تای تەرازووەکە زیاتری بۆ کێشان) و تەنانەت خۆراکی ڕێگاشی پێدان و هەموو پێداویستی‌یەکی سەفەری بۆ دەستەبەرکردن. کاتێك براکانی خۆیان بۆ ڕۆیشتن سازدەکرد، پێی گوتن: (برایەکی بچووکتان هەیە کە لەباوکتانەوە براتانە، بۆم بهێنن لەجاری داهاتووتان دا کە دێن بۆ میسر ﴿ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم﴾[2]یوسف/٥٩. گەر براکەتان نەهێنن ئەوە کۆسپ و تەگەرە دێنمە سەر ئەم کارانەتان و جارێکی تر بێنەوە بۆ -میسر- هیچ دانەوێڵەیەکتان بۆ ناکێشم، هەروەها ئاگاداریشتان دەکەمەوە لەوەی گەر ئەم داوایەم جێ بەجێ نەکەن ڕێ نادەم پێ بنێنەوە ناو وڵاتەکەم).

کاتێك یوسف ئەو داوایەی لە میوانەکانی (واتە براکانی) کردو ئاگاداریشی کردنەوە لە ئاکامی جێبەجێ نەکردنی داواکەی و نەهێنانی براکەیان لەلای باوکیانەوە، ئەوانیش پێیان

---

(١) (صفنات فعینع): دوو وشەی کۆنی میسری یەو مانای (خۆراکی ژیان)یان "خواردەمەنی زیندووەکان" دەگەیەنێت، بەلێکدانەوەیەکی تریش مانای "ڕزگارکەری جیهان" دەگەیەنێت، هەردوو لێکدانەوەکەش ئەو مەبەستە دەبەخشن کە ـ یوسف ـ هۆکاری دەستەبەربوونی ڕۆزیی زیندوان و خۆراکیان و ڕزگاربوونیان بووە لەمردن، ئەویش بەوکارەی خۆی کە گەنم و جۆی هەڵگرتووەو لەگەنجینەی ناوە بۆ زەمانی نەداری و بی بارانی.

(٢) ئەم ڕستەیە (ائتونی بأخ لکم من أبیکم) هەر کە بەباوکیان گەیاندووە یەکسەر هزرو ئەندێشەی (یەعقوب)ی باوکیانی جوولاندووە و خستویێتی یە گومان و پرسیارەوە لەوەی کە ئاخۆ ئەم پیاوە میسرییەی سەرپەرشتیاری سەرگەنجینەکانی(میسرە) چ نیازێکی لەم داوایەی دا هەبێت؟ دەنا کێ پی ی گوتووە کە ئەم کوڕانە برایەکیان لەباوکیانەوە هەیە؟ ئەی ئەمەش چ پەیوەندی یەکی بەوەوە هەیە؟ ئەی باشە ئەو هۆیانە چین کە هاندەری بوون بۆ ئەم داواکاری یە؟ لەوە دەچێت ئەم دواکاری یەی ـ یوسف ـ وەك برووسکەنامەیەك بێت لەخۆیەوە بۆ باوکی یان هێمایەك بێت و کەس نەزانێت شی بکاتەوە تەنها ـ یەعقوب ـ نەبێت، ئەمە جگە لەوەی کە ـ یوسف ـ هەموو پێداویستی‌و کەرەسەیەکی سەفەر بۆ براکانی دابین دەکات و تەنانەت ئەو بڕە زیادەیەی لەگەنم و جۆ بۆی کێشایوون بەخۆڕایی دەیانداتێ. (یەعقوب) لەم هەموو هێماو نیشانانە ئەوە تێدەگات کەوا ـ یوسف ـ ی کوڕی لە ـ میسر ـ ە، بەڵگەش بۆ ئەم جۆرە تێگەیشتنەی ـ یەعقوب ـ ئەوەیە کاتێك کوڕەکانی(بۆ جاری سێیەم) بەتەمای سەردانی ـ میسر دەبن. پێ یان دەڵێت: (یَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ )، واتە: (کوڕەکانی خۆم بڕۆنەوەو بەدوای هەواڵی ـ یوسف ـ و براکەی دا بگەڕێن)..

گوت: (ئێمەش بەشێوازێکی وردو دانایانە لەگەڵ باوکمان دا خەریك دەبین تا لەو خواستەی خۆی وازدێنێت و ڕێمان دەدات برا بچووکەکەمان بۆ (میسر) بێنین. دڵنیاشت دەکەین لەوەی ئێمە ئەو داواکاری یەت جێبەجێ دەکەین)... جا لەساتێکدا بەتەمای ڕۆشتن بوون. (یوسف) فەرمانی بەکارمەندانی خۆی کرد کە بە پەنهانی ئەو نرخەی بۆ گەنم و جۆکە هێنابوویان بخەنەوە نێو کەل و پەلەکانیان بێئەوەی ئەوان (واتە براکانی) لەو ساتەدا هەست بەوە بکەن کەوا وەزیری دارایی ی میسر بەخۆڕایی ئەو هەموو گەنم و جۆو پێداویستی‌یە زۆرەی پێداون، بەمەش -یوسف- دەیویست براکانی هەر کاتێك دەگەنەوە بۆ فەلەستین و نرخەگەڕێنراوەکە لە نێو شتومەکەکانیان دا دەبینن، هەست بەگومان باشی ی(حسن الظن)ی لێ بکەن و بزانن کە بەڕادەیەکی هێگجار زۆر بەخشندەو دەست بڵاوبووە لەگەڵیان دا. (یوسف) بۆیە ئەم کارەی دوایی ی کرد تاکو براکانی هان بدات لەسەر ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای و بشزانن ئەو بەسۆزو بەزەیی یە بۆیان و با ئەوانیش خێرو چاکەی زیاتری لێ ڕاببینن...

ئەم ئایەتانەش پوختەی ئەم بەشەی بەسەرهاتەکەیە، کە خودا تیایان دا فەرموویە:

﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى[1] ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ[2] ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِى بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى وَلَا تَقْرَبُونِ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾يوسف/ ٥٨-٦٢.

## گەڕانەوەی براکان بۆ لای - یەعقوب-ی باوکیان

براکانی -یوسف- بەو خۆراك و داهاتەی هێنابوویان گەڕانەوە بۆ لای باوکیان و دەنگ و باسی سەفەرەکەیان و ئەوەی لەنێوان خۆیان و وەزیری دارایی ئەو وڵاتەدا ڕووی دابوو بۆ باوکیان گێڕایەوە، جگە لەباس کردنی ئەو هەموو میوانداریێتی و ڕێزلێنان و بایەخ پێدانەشیان. پاشان داواکاری یەکەیشیان پێگەیاند کە ئەگەر جاری داهاتوو ئەو برا بچووکەیان (بنیامین) لەگەڵ خۆیان دا بۆ میسر نەهێنن ئەوا هیچ خۆراك و دەغڵ و دانێکیان بۆ ناکێشێت. لەبەر ئەم ئاگادار کردنەوەیەش داوایان لەباوکیان کرد ڕێیان پێبدات لەگەشتی دووەمیان دا (بنیامین)یش لەگەڵ خۆیاندا بەرن تاکو ئەو خۆراك و گەنم و جۆیەی ئاتاجیان

---

(١) (أوفي): واتە (زۆری دەکەم، زیادی دەکەم)..

(٢) (المنزلين): میوانداران، واتە من (چاکترینی میواندارانم و میوان بەچاکی رادەگرم)..

پێیەتی دەستیان کەوێت. ئەوەشیان بۆ باوکیان دووپات کردەوە کە ئەوان چاودێری و پارێزگاریی لێ دەکەن.

لەکاتی بیستنی ئەم داوایەدا (یەعقوب) چەند یاداوەری یەکی ڕابردووی لەدڵدا ژیایەوە و ڕۆژگاری داواکردنی -یوسف-ی کەوتەوە بیر، بۆیە لە وەڵامی ئەم داوایەش دا جارێکی دی خەم و پەژارە دڵی بریندار کردو ڕووی تێکردن و گوتی: (چۆن متمانەتان پێبکەم؟ وەك جاری پێشوو؟ کە -یوسف-ی برای بچووکتان ون کردوەو پابەند نەبوون بەبەڵێنەکەتانەوە بۆ پارێزگاری کردنی و نەتانپاراست؟ لەمەش دا هەر پەنا بەخوا دەگرم بۆ پاراستنی کوڕەکەم چونکە خودا بەهێزترین و چاکترین پارێزەرەو میهرەبانترینی میهرەبانانیشە).

براکانی -یوسف- هێشتا بەوەشیان نەزانیبوو کە وەزیری دارایی ی میسر نرخی دەغڵ و دانەکەی بۆ ڕەت کردوونەوەو پارەوماڵەکەیانی لەهەگبەکانیان دا داناوە، بەڵام دوای کردنەوەیان دیتیان کە هەموو پارەو ماڵی نرخی دەغڵ و دانەکەشیان لێ وەرنەگیراوە، ئیتر ئەمەیان کردە هۆیەکی لەبار بۆ دڵنەرم کردنی باوکیان تاکو قایل بێت بەناردنی (بنیامین) لەگەڵیان داو بۆ هێنانی خۆراك لە (میسر). بەتەواویش دڵنیایان کرد لەوەی زۆر سوودەبن لەسەر بایەخ پێدانی، لەسەروو ئەمانەشەوە بوونی کوڕە بچووکەکە لەگەڵیان دا بەنەفەرێکی تر دادەنرێت و باری حوشترێکی دی لەخۆراك زیاد دەکات بۆیان، چونکە وەزیری دارایی بڕیاری دابوو هەر پیاوێك لەباری حوشترێك زیاتری پێ نەدات لەو داهاتە.

بەڵام ئەو مەرجەی خستە سەر کوڕەکانی کە لەکاتێکدا (بنیامین) دەنێرێت لەگەڵیان دەبێت پەیمان بەخودای پەروەردگار بدەن لەسەر ئەوەی ئەم کوڕە بچووکەی بۆ بهێننەوەو هیچ بەربەستێکیش ڕێی ئەوەیان لێ نەگرێت مەگەر مردن نەبێت یان مەگەر دوژمن چواردەوریان بگرێت و ڕێی هێنانەوەیان لێ بگرێت، ئەوانیش مەرجەکەی باوکیان پەسندکردو سوێندیان خوارد بەخوا کەبیپارێزن.

(یەعقوب) بەو پەیمانەی کوڕەکانی هێور بووەوە دوای ئەوەی جۆرە ڕاستیەکی لە وتەکانیاندا بەدی کرد، بەمەش وای لێ هات قایل بێت بەناردنی (بنیامین) لەگەڵیان دا، پاشان بەزەیی بەهەموویان داهاتەوەو ئەم بەزەیی یەی وای لێکرد ئامۆژگارییان کات بەوەی کاتێك دەچنە ناو (میسر)ەوە لەچەند دەروازەیەکی جیاجیاوە بچنە ناوەوە تاکو سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیان دا ڕانەکێشن و چاوانی پاسەوانان چاودێرییان نەکەن، چونکە لەوانەیە ئەمە دڵتەنگیان بکات گەر بە کۆمەڵ پێکەوە لەیەك دەروازەی شارەوە بچنە ناوەوە، ئەویش (واتە یەعقوب) توانای ئەوەی نیيە زەرەرو زیانێکی لەو چەشنەیان لێ دووربخاتەوە، بەڵکو تەنها خودای تاك و باڵادەست توانای دوورخستنەوەی ئازارو زیانی هەیە...

ئەمەی پێشوو پوختەی واتاو شیکاری ئەم چەند ئایەتەی ترە لەبەسەرهاتەکەدا کەخودا تیایان دا فەرموویە: ﴿ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلۡ ءَامَنُكُمۡ عَلَيۡهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمۡ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبۡلُ فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمۡ وَجَدُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ رُدَّتۡ إِلَيۡهِمۡۖ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبۡغِيۖ هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتۡ إِلَيۡنَاۖ وَنَمِيرُ أَهۡلَنَا[1] وَنَحۡفَظُ أَخَانَا وَنَزۡدَادُ كَيۡلَ بَعِيرٖۖ ذَٰلِكَ كَيۡلٞ يَسِيرٞ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنۡ أُرۡسِلَهُۥ مَعَكُمۡ حَتَّىٰ تُؤۡتُونِ مَوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأۡتُنَّنِي بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمۡۖ فَلَمَّآ ءَاتَوۡهُ مَوۡثِقَهُمۡ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَهُمۡ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٖ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾یوسف/٦٣-٦٨.

## "یوسف" -بنیامین-ی برای بەبارمتە دەگرێت

براکانی -یوسف- چوونەوە بۆ (میسر)و گەیشتنەوە لای "یوسف" لە دیوانی خۆی داو (بنیامین)ی برا گچکەشیان لەگەڵدابوو، ئەویش میوانداریکردن، پاشان بەتەنیا و بەجیا لەبراکانی دیکەی لەگەڵ (بنیامین)ی برای دا دانیشت و بەڕاشکاوی خۆی پێناساندەوەو پێی گوت کە ئەو (یوسف)ی برای ونبوویەتی.. ئیدی شادی و خۆشحاڵی یان بەو دیدارە ناوازەیە لەڕادەیەکی وادابوو کە بەهیچ شتێك گوزارشتی لێ ناکرێت.. ئەوان هەردووکیان باسی ڕابردووی خۆیان بۆ یەکدی کرد، کە تووشی چ خەم و خەفەت و ئازارێك بوون بەهۆی ڕق و کینەو فڕوفێڵی براکانیانەوە..

(یوسف)لەو دیدارەدا بەبراکەی گوت: (لەمەولا هیچ پەست و تووڕە مەبە لەسەر ئەو ڕەفتارە نامرۆیی یانەی دەرهەقی ئێمە کردوویانە، چونکە ئەوەتا خودای مەزن دەسەلآت و پلەو پایەو ڕێزی پی بەخشیوم و ئەوە تۆش ئێستا لەبەر سایەی چاودێری و سەرپەرشتیاریی من دایت)..

---

(١) (نمير أهلنا): واتە: خۆراك بۆ کەس و کارمان دێنین.

ئینجا (یوسف) وای پێخۆش بوو ئەم برایەی لای خۆی بهێڵێتەوە وەك ڕێخۆشکردن بۆ ئەو مەرجەی کە دەبێت دایك و باوکیشی بهێنن بۆ میسر. شێوازی وەبەرنراویشی بۆ ئەو مەبەستە (واتە بۆ هێشتنەوەی براکەی لەلای خۆی) ئەوە بوو کە تۆمەتی دزی کردنی بخاتە پاڵ و بەو هۆیەوە دەسبەسەری کات تاکو هەر لای خۆی بێت و هاوڕێی تەنهاییی بێت، (بنیامین)یش بۆ ڕازی کردنی (یوسف)ی برای ئەو تۆمەت خستنە پاڵەی پەسند کرد. دیارە تۆمەتبارکردنی (بنیامین)یش بە (دزی کردن) تۆمەتبارکردنی هەمو براکانە، چونکە ئەوە سەرشۆڕیان دەکات و کلاویان لار دەکات و بۆ تەمێکردنیشیان لەکەسێتی و گەورەیی، یان کەم دەکاتەوە، هەروەها ئەم تۆمەتباکردنەی (بنیامین) ئەو برایانەی دەخاتە نێو تەنگژەیەکی شەرمەزاریی ی بەردەم باوکیانەوە، جگە لەوەی خەم و پەژارەیەکی زۆریشیان تووش دەکات بۆ تۆڵە لێ کردنەوەیان لەسەر ئەو بەدکارییەی دەرهەق (یوسف) کردبوویان، ئەوەتا ئەویش بەفێڵێك لەسەر ئەو فێڵەی زوویان سزایان دەدات. بۆ دروست کردنی ئەم فێڵەش (یوسف) وەك جاری پێشوو گەنم و جۆیان بۆ دەکێشێت و بارێکی زیاتریشان بەهۆی وجودی کەسێکی ترەوە (کە بنیامینە) بۆ دادەنێت. بەڵام بەدەستی خۆی ئەو تەرازووە ڕەسمی یەی کە خۆراك و دانەوێڵەیان پێ دەکێشا دەخاتە نێو کەل و پەلەکانی (بنیامین)ی برایەوە، واتە (بەئانقەست ونی دەکات و لە فەرمانبەرەکانی خۆی دەشارێتەوە تا بەدوای دا بگەڕێن و بزانن کێ دزیویەتی).

فەرمانبەرانی(یوسف) بەدوای تەرازووەکەدا گەڕان و ونەیاندۆزی یەوە، جا لەبەر ئەوەی لەو ساتانەدا تەنها شتیان بۆ ئەو برایانە پێکێشابوو، خێرا بێهیچ گومان و دوو دڵی یەك ئەوانیان بەدزینی تەرازووەکە خەتابار کرد، بۆ ئەم مەبەستە یەکێك لەو فەرمانبەرانەی (یوسف) هاواری لێ کردن و پێ ی گوتن: (هۆ کاروانەکە ڕاوەستن ئێوە دزیتان کردووە)، ئەو برایانە بەبیستنی ئەمە ترسیان لێ نیشت و بەرەو ڕووی هاوارەکە ڕۆیشتن و لێیان پرسین کە داخۆ چیەیان لێ ون بوویێت، هاوارکارەکەش پێیگوتن (بەدوای تەرازووە ڕەسمی یەکەدا دەگەڕێین و خەڵاتێکیش دانراوە بۆ ئەو کەسەی دەیدۆزیتەوە، خەڵاتەکەش باری حوشترێکە لەخۆراك). براکانی - یوسف- سوێندیان خوارد لەسەر ئەوەی بێتاوان و بێئاگان لە دزی و بەدکاری، فەرمانبەرانی -یوسف- لێ یان پرسین (سزای ئەو کەسە چی یە کە تاوانی دزیکردنی ئەنجام دابێت؟)، کوڕانی (یەعقوب) لەبەر بێتاوانی ی خۆیان لەوەڵامدا گوتیان: (سزای ئەو کەسەی تەرازووەکەی دزی بێت ئەوەیە وەك بەندەیەك (رقیق) بگیرێت، چونە ئەمە سزای عادیلانەیە بۆ ئەو گوناهکارەی دزی لەو کەسە کردووە کە چاکەی لەگەڵدا کردووە).. بێگومان ئەم سزایەش لەشەریعەتی بنەماڵەی (یەعقوب)دا بۆ دز دانرابوو.

ئینجا دوای ئەم وت و وێژە فەرمانبەرەکان دەستیان کرد بە پشکنینی کەل و پەلی براکـان پێش (بنیامین) تاکو وا دەرنەکەوێت کە نەخشەیەك بۆ (مەسەلەی دزی یەکە) داڕێژراوە، پاشان کەل و پەلەکانی (بنیامین)یان پشکنی و تەرازوووەکەیان تێدا بینی و لێ یان دەرهێنا.

براکانی (یوسف) کاتێك تەرازوووەکەیان لەوێدا دۆزی یـەوە، یەکـسەر ڕاچڵەکین و واقیـان وڕما، چونکە وایان دەزانی کە تووشی چەخماخەیەکی ترسناك بـوون. بـەم ڕەنگـەش فێڵەکـەی (یوسف) سەری گرت و بەبڕیاری براکانی مافی ئەوەی هەبوو کە (بنیامین) بە بارمتە بگرێـت، واتە بەو بڕیارو مەرجەی کە بەپێی شـەریعەتی خۆیـان (ئـەو کەسـەی تەرازوووەکـە لەکـەل و پەلەکانی دا بێت وەك بەندەیەك دەگیرێت).

خوداش بەم شێوەیە کارەکەی بۆ (یوسف) ڕێك خست، چـونکە نەیـدەتوانی براکـەی خـۆی بەپێی شەریعەتی (میسر) بگرێت، بەڵکو لە (میسر) بەیاسایەکی تر سزای دزیان دەدا، بـەڵام بێگومان خودا ڕێنمایی (یوسف)ی کـرد ئـەو جـۆرە ڕێو شـوێنە بگرێتەبـەر بـۆ هێـشتنەوەی (بنیامین)ی برای لە لای خۆی.. بەم پێیەش خودا بە ویست و خواستی دانایانـەی خـۆی هـەر کەسێکی بوێت بەزانست و دانایی و ڕاوێژی جوان پایەبڵندی دەکات، وەك چۆن ئـەو بەهرانـەی بە یوسف دابوو، لەسەروو هەموو زانستمەندێکیـشەوە کەسـێکی لـەو زانـاترو دانـاتر هەیـە، خوداش لەسەرووی هەموویانەوەیە، دەبا هیچ مرۆڤێك لەخۆبایی نەبێت بەو زانستەی هەیەتی.

﴿ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِى رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَـٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَـٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَـٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ [1] مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَـٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴾يوسف/٦٩-٧٦.

---

(١) (كدنا ليوسف): مەبەست لەم ڕستەیە ئەوەیە لەبەرامبەر ئەو فێڵەی زوودا کەلە -یوسف-یـان کردبـوو خوداش بەفێڵێکی لەو چەشنە سزای دان.

## براکانی -یوسف- داوای ڕەحم و بەزەیی لێدەکەن

بەدەرهێنانی تەرازووە ڕەسمی یەکە لەکەل وپەلەکانی (بنیامین)دا براکانی یوسف) زۆر شەرمەزار بوون، بەڵام بەپاکانەیەکی ناهەموای وەها خۆیان پەراندەوە کە تەنها (بنیامین) نەبێت هەموو کۆمەڵەکەی خۆیان بەبێتاوان دانێن، پاکانەشیان توانج دانێك بوو لەو برا گچکەیەیان و لە -یوسف-یش، بەوەی گوتیان (شتێکی سەیرو سەمەرە نیە گەر ئەم کوڕە بچووکەی لەگەڵمانە، دزی بکات (چونکە (زڕبرایان بووە) ئەوە بێگومان برایەکی تریشی[1] لەمەوبەر دزی ی کردبوو (واتە یوسف کە لەدایك و باوکەوە برای بوو نەك زڕبرا).

(یوسف) بەم توانجە پەنهایی یەیان بێداربووەوەو لەدڵی خۆی دا پێی گوتن: (ئێوە خۆتان خراپترین ڕەفتارتان هەبووە و کەمترین ڕێزتان هەبووە بەهۆی هەڵبەستنی ئەم درۆیەتانەوە، هەر خودا خۆی ئاگاداریشە لەو پڕوپاگەندەو ئیدیعایانەتان).. واتە (یوسف) بەئاشکرا وەڵامی نەدانەوەو لە دەروون و ناخی دڵی دا ئاوا وەسفی دەکردن.. ئەی ئایا وا نی یە؟ ئایا ئەو برایانە خۆیان چەند دزێك نەبوون کە (یوسف)یان لەباوکیان دزی و فڕێیان دایە نێو بیرەکەوە؟

لەم کاتەش دا (براکان) هیچ ڕێگەچارەەکیان لەبەردەم دانەبوو بۆ ڕزگارکردنی (بنیامین) تەنانەت لەجیاتی هیچ باج و شتێکی تریش بۆیان دەرباز نەدەکرا تا بتوانن پابەندبن بەو پەیمانەی بەخودایان دابوو لەبەردەم باوکیان دا. هەر بۆیەش دەستیان کرد بە داوای ڕەحم و بەزەیی لە (یوسف) و زۆر تکایان لێ کردو پێیان گوت: (ئەم کوڕە نەوجەوانەی لەگەڵمان دایە باوکێکی بەساڵاچووی پیری هەیەو زۆری خۆش دەوێت و ئەگەر بەبێ ئەو بچینەوە زۆر خەمبارو دڵتەنگ دەبێت بۆی، ئێمەش پەیمانمان بەخودا دابووکە بیپارێزین، جا لەجیاتی ئەو یەکێکمان بگرەو لەجێگەی داینێ‌و ئەو بەرەڵاکە، ئێمە لەم ڕووەوە هەر چاکەو یارمەتی و بەخشندەییت لێ ڕادەبینین)..

---

(١) گوتراوە: (ڕاحیل)ی دایکی - یوسف - کاتێك لەگەڵ (یەعقوب)دا وڵاتی نێوان دوو ڕووباری (واتە عێراقی ئەمڕۆ)ی جێهێشتووە و بەرەو (فەلەستین) ڕۆیشتوون پەیکەرێکی بچووکی لەگەڵ خۆی دا بردووە کە لەزێڕ دروست کراوەو هی (لابان)ی باوکی بووەو لێ ی ون بووە (واتە- لابان)ی باپیرەی یوسف لێ ی ون بووە) و گەڕاوە بەدوای دا و نەیدۆزیوەتەوەو نە لەلای (ڕاحیل)ی کچی بووە نە لەلای کەسێکی دی، چونکە (دایکی یوسف) ئەو پەیکەرەزێڕینەی لەکورتانی ئەو حوشترەدا حەشاردابوو کە سواری پشتی ببوو. کاتێك(یەعقوب)و خێزانەکەی دەگەنە (فەلەستین) ئەو پەیکەرە بەدەست یوسفەوە دەبێت و یاری پێدەکات چونکە لەو بووکەشوشەیە دەچوو کە منداڵان یاری ی پێدەکەن، گووتووشیانە گوایە (یوسف) پەیکەرە زێرینە بچکۆلەکەی لەماڵی باپیرەی دزیوە. بەڵام لەڕاستی دا (یوسف) هیچ ڕەفتارێکی لەو چەشنەی بەمنداڵییش نەنواندووەو هیچ شتێکی لەکەس نەدزیوە.

(یوسف) لەوەلآمی داواکەیان دا پێی گوتن: (پەنا دەگرم بەخودا لەوەی کەستەم لەبێ تاوان بکەم و یەکێکی تر تانی لەجێدا دانێم، ئەوەش هەر مەحاڵە گەر بەپێچەوانەی حوکمی شەریعەتەکەتانەوە هەڵس و کەوت کەم کە سزای بە (بەندەدانانی) ئەم جۆرە تاوانکارەی داناوە، جگە لەمانەش یاسای پادشای (میسر)یش ڕێ نادات بێتاوانێك لەسەر تاوانی کەسێکی دی سزا بدەم. خۆ ئەگەر وا بکەم ئەوا یەکێك دەبم لەستەمکاران)..

براکانی دوای ئەوەی لەقەناعەت پێهێنانی (یوسف) بێئومێد بوون و نەیانتوانی یەکێکی تریان لەجیاتی -بنیامین- دابنێن، بەجیا لەنێو خۆیان دا کۆدەبنەوەو دەست دەکەن بەراوێژکردن دەربارەی هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر باوکیان. لەئەنجامی ڕاوێژەکەیان دا قایل دەبن بەو بیروڕایەی (ڕائۆبین)ی براگەورەیان کە گوتبووی: (نابێت ئەو مەسەلەیەتان لەبیربچێت کەپەیمانتان لەسەری بەخودا دا لەبەردەم باوکتان دا دەربارەی پاراستنی -بنیامین-و گەڕاندنەوەی بەساغ و سەلامەتی.. چونکە دەربارەی -یوسف-یش لەمەوپێش پەیمانی پاراستنیتان پێداو بەلآم بەون کردنی ئەو کوڕە (هەرە خۆشەویستەی) خەم و خەفەتێکی زۆرتان پێدا. ئێستاش من خۆم لەئاست مەسەلەیەکی شەرمەزارکاری ئاوادا دەبێت لە -میسر-بمێنمەوەو بەملاولادا نەچم هەتا ئەو کاتەی باوکم لەڕوی ڕاستەقینەی بارودۆخەکەمان تێدەگات و مۆڵەتی گەڕانەوەم پێدەدات، یان خودا بەحوکمی ئیلاهی ی خۆی ئیرادەی گەڕانەوەم بۆ دەڕەخسێنێت و، هەر خوداش دادگەرترین حاکمە).

برا گەورەکەیان دوای دەربڕینی ئەم ڕایە بە براکانی تری دەڵێت: {ئێوە بەبێ من بگەڕێنەوە بۆ لای باوکم و حەقیقەتی ڕووداوەکەی پێ بڵێن و هەواڵی ئەوەشی پێ بگەیەنن کە -بنیامین-ی کوڕی (تەرازووی ڕەسمی ی میسر)ی دزیوەو بەیاسای (بەعەبددانان) حوکم دراوە. هەموو ئەمەشمان بەچاوی خۆمان دی، خۆ ئەگەر لە (غەیب)مان بزانیبایە و هەواڵی ئەو ڕووداوەمان پێش (ڕوودانی) پێ بگەیەنرایە ئەوا هەرگیز لەگەڵ خۆمان دا نەمان دەبرد}.

هەروەها پێی بڵێن: (بابە گیان ئەگەر تۆ گومانت لەم هەواڵانە هەیە کە پێمان گەیاندیت ئەوا دەتوانیت بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی وتەو هەواڵەکانمان چەند نێرراوێکی خۆت ڕەوانەی -میسر- بکەیت تاکو شایەتیی ئەو خەڵکەی ئەوێشت بۆ بێننەوە، هەر خۆیشت بەتەنیا دەتوانیت ئەو هاوڕێیانەی سەفەری ئەم جارەمان بانگ کەیت کە لەکاروانەکەدا لەگەڵیان دا بووین وگەڕاونەتەوەو پرسیاریان لەو بارەیەوە لێ بکە تاکو ڕاستیی قسەی ئێمەت بۆ ڕوون بێتەوە)..

تا ئێرە پوختەی لێکدانەوەی ئەم چەند ئایەتەی دیکەی تایبەت بە چیرۆکی (یوسف) بوو کە خودا لەم بەشەی سوورەتەکەدا فەرموویە: ﴿ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ

فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًاۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَـٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّظَـٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُواْ مِنْهُ خَلَصُواْ نَجِيًّاۖ [1] قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِي يُوسُفَۖ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِيٓ أَبِيٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِيۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَـٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُواْ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ [2] ٱلَّتِي كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ [3] ٱلَّتِيٓ أَقْبَلْنَا فِيهَاۖ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴾يوسف/٧٧-٨٢.

---

(١) بەجوانی سەرنج بدە لەڕەوانبێژیی نێو ئەم ڕستەیە: (فلما أستيأسوا منه خلصوا نجياً)، واتە: (کاتێك براکان لە-یوسف- نائومێد بوون لەنێوخۆیان دا بەجیا ڕاوێژیان کرد)، (استیأسوا): واتە (نائومێدی کەوتە قووڵایی دەروونیانەوە وتیایدا جێگیربوو)، (خلصوا)ش واتە (لەگۆشەیەك دا هەموو براکان بەجیا و دوور لەخەڵکی کۆبوونەوە بۆ ڕاوێژێك لەسەر ئەو مەسەلەیە)، (نجیا) واتە: (بەنهێنی کەوتنە بیرورا گۆڕینەوە).. کەوابوو ئەو ڕستەیە لەترۆپکی ڕەوانبێژیو ئیعجازی کورت کردنەوەدایە، چونکە بەچەند وشەیەکی کەم وێنەی حاڵەتی ئەو برایانە دەگرێت کە نائومێدی و ڕەشبینی لەدەروونیان دا چەسپاوەو خەڵکی لێیان دوورکەوتۆتەوەو، خۆیان بیروراکانی خۆیان تاوتوێ دەکەن و، ئەو هەڵوێستەش ئامادە دەکەن بۆ چاوپێکەوتنەوەی باوکیان. جا ئیتر وشەکانی نێو ئەم ڕستەیە وەك ئەو گەوهەرو مروارییە وایە کەهیچ وێنەو هاوشێوەیەکی نییە و بەڵگەو دەلالەتیشە لەسەر پاراوی ی زمانی قورئان و تۆکمەیی و هێزی مەنطیقەکەی، لەگەم شوێنی قورئانیش دا (پاراویو ڕەوانبێژیی)لەڕستەیەکی وەك ئەم ڕستە قورئانی یەدا پێکەوە کۆبوونەوە.

(٢) (القرية): لەقورئان دا وشە (قرية) بەهەر ناوچەیەکی ئاوەدانی ی بچووك یان گەورە دەگوترێت لێرەش دا واتە دانیشتوانی ناوچەکە. چونکە (عەرەب) ناوی شوێنەکە دەبەن و دەشیانەوێت بزانن کێ ی تێدایە.

(٣) (العير): واتە کاروانێك لەحوشتر، لێرەدا واتە ئەو کاروانچی یانەی کە ئەو حوشترانەیان بەکارهێناوە لەکاروانەکەیان دا.

# بەندی حەوتەم

## ((بەیەك گەیشتنەوەی "یـەعقوب" و "یوسف"))

("یـەعقوب" نێچیری خەم و پەژارە - براکان "یوسف" دەناسنەوە -
"یـەعقوب" هەواڵی ساغی و سەلامەتیی "یوسف"ی پی دەگات -
پێك گەیشتنەوەی پر شەوق و و شادی و.. بەدیهاتنی خەونەکەی "یوسف")

## "یـەعقوب" نێچیری خەم و پەژارە

براکان (تەنها -بنیامین-و برا گەورەکەیان نەبێت) ئەوانی دی هـەموویان هاتنـەوە بـۆ لای "یـەعقوب"ی باوکیان و هەواڵی ئەو ڕووداوە تازەیەی بەسەریان دا هاتبوو پـێ گەیانـد، ئـەم هەواڵەش سەرلەنوێ خەم و خەفەتەکانی نێو دڵی ی ورووژاندەوەو، ئازارە دەروونیەکانیشی دوو هێندەی دی زیاتر بوو بۆ لەدەست دانی کوڕی دووەمی، باوەڕیشی پـێ نـەکردن، چـونکە درۆو دەلەسەی زۆری لێبیستبوون، هەر قسەیەکیان بۆ بکردایە لای ئەو جێی باوەڕ نەبوو، تەنانەت گەر بەڕاستبێژیش بدوانایە چونکە دەردەدارو مەینـەتباری کارەسـاتێکی پێـشتر بـوو بـەهۆی سەرنگوم کردنی براکەی تریان (یوسف)ـەوە، هەر بۆیەش (یـەعقوب) لـەکاتی بیـستنی ئـەم هەواڵە تازەیەدا بەڕاشکاوی تاوانباریکردن و پیێ گوتن: (بێگومان هەواو ئارەزووی نەفـستان کاری لەکۆڵ کردنەوەی (بنیامین)ی بۆ ڕازاندوونەوە، وەك چۆن لەمەوبەر هەمان بەڵاتان بەسـەر براکەی تریدا هێنا، (واتە بەسەر -یوسف-دا). دەنـا ئـەو وەزیـرەی میـسر (واتـە -یوسـف- لەکوێ دەیزانی -بنیامین- لەبەرامبەر وەها تاوانێکداو بە شـەریعەتی ئێمـە بەبەنـدە (عەبـد) دەگیرێت گەر ئێـوە بڕیـارو فـەتوای واتـان لـەوێ بـۆ نەدایـەو پیلانتـان نەسـەر نەگێڕایـە).. هەروەها(یـەعقوب) بەکوڕەکانی دەڵێت: (من لەبەرامبەری ئـەم کێـشەیەش دا هـیچ تـەگبیرو ڕێگە چارەیەك شك نابەم تەنها ئەوە نەبێت بەجوانی و دانایانـە ئـارام بگـرم و هـەر بەتـەمای ڕەحم و بەخشندەیی ی خودا بم و داوای لێ بکەم هەموو کوڕەکانم بۆ بگێڕێتەوە، چـونکە هـەر خودایە کە بەزانست و عیلمی خۆی لەهەموو شتێك ئاگادارەو حیکمەتی لەهەموو کاروبارێـك دا هەیە).

ئینجا (یـەعقوب) ڕووی لێ وەرگێران و خەم و پەژارەش هەموو جەستەی داگرتبـوو و داخ لەدوای داخیش ڕووی تێ دەکرد.. کارەساتی (بنیامین) کارەسـاتی -یوسـف-ی بیردەخـستەوەو دەیگوت: (ئای چ داخ و حەسرەت و ماتەمییەکم بـۆ -یوسـف- هەیـە). ڕەشـێنەی چاویـشی لەزۆری و توندی ی خەم و پەژارەدا سپی بوو بوو و نـەمابوو، جگـە لـەو ڕق و تـووڕەیی کـە لەکوڕەکانی ی هەبوو بێ ئەوەی دەری بڕێت و قسەیەکی ناخۆشیان پێبڵێت..

ڕۆژان هات و ڕۆشت و (یـەعقوب)یش خـووی بەئـەحزان و خەماکانیـەوە گرتبـوو و ببـوو بەهاوڕێیان. کوڕەکانیشی ترسی ئەوەیان هـەبوو کـە بـەم هـەموو خـەم و خەفەتـەوە تووشـی ڕووداوێکی ناخۆش ببێت، بۆیە پێیان گوت: (گەر ئەوەندە بیرکەیتەوە لە (یوسف) ئەوا خـەم و ئازارو نارەحەتییت زیاد دەکات تا وای لێدێت خەم و خەفەت هەموو جەسـتەت دەتوێنێتـەوەو بەرەو مردنت دەبات)..

ئەم وتەیەی کوڕەکانی هیچ کارایی یەکی لەسەری نەبوو، بەڵام وەڵامی دانەوەو پێی گوتن: (من سکاڵای خۆم لەلای ئێوە نەکردووە. بەڵکو سکاڵای ئـەو خـەم و پـەژارەو داخانـەم تـەنها لەلای خودا دەکەم و هەر لەخودا دەپاڕێمەوە، چونکە ئەو ڕەحمەتە زۆرو فراوانەی کە لـەخوداوە بەدیی دەکەم و دەیزانم ئێوە نایزانن).

بێگومان باوەڕو متمانە بەخودا هیوا دەژیەنێتەوە، خەم و پەژارەش نـەیتوانی (یـەعقوب) بێهیوا کات لەگەڕانەوەی هەردوو کوڕەکەی بۆ لای، چونکە ئـەوەی لـەهزردا جێگیرببـوو کـە هەردووکیان زیندوون و ماون، بۆیە فـەرمان بـەکوڕەکانی دەکـات بگەڕێنـەوە بـۆ -میـسر-و بگەنەوە بە برا گەورەکەیان و لەگەڵ ئەودا هەموویان بەدوای (یوسف) و براکەیدا بگەڕێن و لە سۆزو ڕەحمەتی خوداش بێئومێد نەبن، چونکە تـەنها بێباوەڕان و سەرگەردانەکان لەرەحمی خوا بێئومێدن..

ئەمەش ئایەتەکانی تایبەت بەم بەشەی داستانەکەیە کە خودا تیایان دا دەفەرموێت:

﴿ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ [١] أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ [٢] فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ

---

(١) (سولت لكم): واتە (بۆی جوان و ئاسان کردوون).

(٢) (وابيضت عيناه من الحزن): واتە لەخەم و خەفەت دا پەردەیەکی سپی ی وەها ڕەشێنەی چاوی داپۆشی کە گلێنەکەشی سپی بوو، ئەویش لەبەر زۆری ی فرمێسك).. بێگومان لەئاکامی پەژارەی قووڵدا حاڵـەتێکی دەروونی (نفسی)ی وا پەیدا دەبێت کە بەهۆیەوە پاڵەپەستۆ (ضغط) لەسـەر هەردووچـاوی مـرۆڤ زیادەبێـت و

حَرَضًا(١) أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَـٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّى(٢) وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ(٣) وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ يَـٰبَنِىَّ ٱذْهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ(٤) إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ یوسف/٨٣ -٨٧

## براکان -یوسف- دەناسنەوە

کوڕەکانی (یـەعقوب) بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکەی باوکیان و بەمەبەستی گـەڕان بـەدوای (یوسـف) و براکەی دا، چوونەوە بۆ (میسر) بـۆ دۆزینـەوەیان و دەسـکەوتنی ئـەو دانەوێڵـەو خۆراکەش کە پێویستیان پێیەتی. دیارە هەر چوونەوە بـۆ لای وەزیـری دارایـی و گەنجینـەکان (واتە بۆ لای یوسف) لەدیوانی وەزارەتەکەی دا، بۆ ئەوەی داوای ڕەحـم و بـەزەیی ی لێ بکـەن لەکاری ئازادکردنی (بنیامین)ی برا بچوکیان دا، لەسەرەتای ئەم داخوازی یانەشـیان دا، باسـی ئەو هەژاریو کەساسی و مەینەتیانەی خۆیان بـۆ کـرد کـە خـەڵکی ناوچـەکەیانی تەنگـەتاو کردووە، ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی دڵی نەرم بێت بۆیـان و ئـەمانیش بەئامانجەکـەی خۆیـان بگەن، ئەوەبوو پێیان گوت: (ئەی شازادە (ئەی عەزیزی میسر).. ئێمە خۆمان و خەڵکو کەس وکارمان تێکڕا تووشی بارودۆخێکی سەختی برسێتیو هـەژاری بـووین، ئـەم جـارەش ئـەوەی هێناومانە بۆ لاتان (بەمەبەستی نرخی خۆراك و دانەوێڵە) چەند شت و مەکێکی کەمە لـەوەی ماومانەو شایانی ئاڵ و گۆڕیش نی یە لەبەر ناسازی و گونجانیان، بـەڵام ئێمـە هـەر بەتـەمای سنگ فراوانی و خێرومەندیی ی تۆین و لێت ڕادەبینین کە ئەم جارەش گەنم و جـۆی تـەواومان

(گلوکۆما)ی بەسەردا دێنێت، یان کە لەنێو خەڵکی دا بە (ئاوی شین) ناودەبرێـت، بەمـەش ڕوونـی وبریقـەو پرشنگی هەموو ڕووکاری پێستی چاو نامێنێت و چـاوەکە وردەوردە بـێهێز دەبێـت تـا بەتـەواوەتی هێـزی نامێنێت و وەك سپی دەردەکەوێت، جا بڕوانە قورئان چۆن وەسفی حاڵەتی (یـەعقوب) دەکات بەشێوەیەك کـە زانستی ئـەمڕۆش پـشتگیریی دەکـات. دیـارە تـەنها لەبەرئـەوەی سرووشـێك (وحـی)ی خوداییـە نـەك دەسـەڵبەستی مرۆڤێك بێت.

(١) (حرضا): واتە (خەریکە لەسەر لێواری تیاچوون بێت).

(٢) (بثي): وشەی(بث) بەمانای سەختترین خەم کەخاوەنەکەی ئارامی لەسەر ناگرێـت و لـەنێو خـەڵکی دا باسی بکات.

(٣) (انما اشكو بثي وحزني الى الله): بزانە هاوڕێکی و پێکەوە گونجانی وشەکانی ئـەم ئایەتـە لـە سـانایی دارشتن و شیرینی بێژەکانیان کە چ شوێنەوارێکی گەورەی لەدەروونی مرۆڤ و چ کاریگـەری یەکیـشی لەدڵانـدا هەیە.

(٤) (رَوْحِ اللهِ): واتە (دەرگای ڕزگاریو ڕەحمەتی خودا) ... هیواو ئومێدو متمانە بەخودا...

بۆ بکێشیت و ئەوەی زیاد لـەمافی خۆشمانـە وەك بەخـشش و (صـەدەقەیەك) پێمـان بـدەیت، بێگومان خودای میهرەبانیش پاداشتی خێرەومەندو بەخشندەکان بەچاکترین خەڵات دەداتەوە).

(یوسف) بۆی دەرکەوت براکانی سکاڵای حاڵی بارگرانی ی خۆیان بـە جۆرێـك دەکـەن کـە گوزارشت لە بارودۆخی تەنگانەو ژیانێکی پڕ لەزەحمەت دەکات و ئەو دڵو دەروونـە ڕەق و بـێ ڕەحمانەشیان بۆ چەند دڵ و دەروونێکی نەرم و ناسـك و هـێمن گـۆڕراون، ئـەویش بـەم خـەم و مەینەتی و بێ چارەییەیان دڵی نەرم بوو و لێبوردن و لـەخۆبڕانی تێـدا خرۆشـا، هـەر بۆیـەش بڕیاریدا کەسێتیی ڕاستەقینەی خۆییان بۆ دەرخات و خۆییان پی بناسێنێتەوە تاکو ئـەوانیش و دایك و باوکیشی بخاتە پاڵ خۆیو وایان لێ بکات لەمەولا بکەونە نێو شـادیو کامـەرانی و خۆشگوزەرانی یەوە، جا خێرا کەسێکی لەفەرمانبـەرانی نـارد بـەدوای (بنیـامین)ی بـرای دا، پاشان ڕووی تێکردن و گوتی: (ئایا دەزانـن وهەسـتتان بەگـەورەیی ئـەو تاوانـە کـردووە کـە دەرهەق (یوسف) و براکەی کردتان؟ ئایا گەندەڵی و چەپەڵی ی ئەو کارە ناشیرینەی خۆتـان بـۆ دەرکەوتووە کە لەسەرچاوەی جەهالـەت و زۆرداری و کـەودەنی یـەوە ئـەنجامتان دا؟ ئایـا لـە یادتانە (یوسـف)تـان لـەباوکی دابڕیـو فڕێتـان دایـە نـاو تاریکـاییی بیرەکـەوە؟ دەربـارەی (بنیامین)یش ئەوە دیارە چـۆن دڵتـەنگ و خـەمبارتان کـرد بـەهۆی لەدەست دانـی براکـەی (شقیق)یەوە (واتە برای لە دایك و باوکی یشیەوە) و چێژی شـیرینی ی ژیانتـان لێ زەوت کـرد تاکو لەو کارەساتەدا هاوبەش و هاوخەمی بێت...)...

براکان لەکاتی بیستنی قسەکانی (یوسف)دا فیکری خۆیان لەچـەقی مەبەسـتەکانی نزیـك کردبووەوەو بەوردی سەرنجیان لەهێماو نیشانەکانی گۆنای دەداو بـەجوانی گوێیـان لەنەغمـەی دەنگی گرتبوو تا وایان لێهات لەو قۆناغی نەناسینەیانەوە گومان لە کەسـێتیی ئـەو کەسـە بکەن کە بۆیان دەدوێت و ئاخۆ یوسفە یان نـا؟! لەبـەر ئەمـە خێـرا بەپەشـۆکاوییەوە لێیـان پرسی: (ئایا تۆ یوسفیت)؟ (یوسف)یش لەوەڵامدا بـۆ بەڕاسـت دانـانی گومانەکـەیان گـوتی: (بەڵێ، من یوسفم، ئەم کوڕەش (واتە بنیـامین) براکەمـە، خـودای پـەروەردگار بەنیعمـەت و بەزەییی خۆی لـەو مەترسـییانە پاراسـتوینی و بەهـەموو بەخشـشێکی (ڕێـزو دەسـەڵات و دەوڵەمەندی) بەهرەمەندی کردووم. ئەوەش هەمووی پاداشتی خودا خۆیەتی لەسەر ئەو تەقواو خۆپاریزیو خـۆڕاگری یـەم لـەو تاقیکردنـەوەو مەیەنەتیانـەدا، خـوداش بێگومـان پاداشـتی چاکەکاران ون ناکات)..

(یوسف) هێشتا دوایی ی بەم وتانەی نەهێنابوو کە بۆیان دەرکەوت ئەم پیاوە بەڕاستی بـرا ون بووەکەیانە و یەکسەر لەو ساتەوەختەدا ڕەنگیـان زەردبـوو لەترسـان و سـەریان داخـست و شەرمەزار بوون، پاشان ویستیان پاکانەیەك ڕێك خەن تـاکو خۆیـان بێتـاوان کـەن و لەسـزای

براکەیان ڕزگار بن، بەڵام هیچ پاکانەو پاساوێکیان بۆ ڕێك نەخرا. بەڵکو تەنها ڕێگای دان پیانانی ڕاستەقینەیان لەبەردەم دابوو کە پێیان گوت: (دەسا وەڵڵاهی خودا تۆی بەهۆی خۆپارێزی و خۆڕاگریو چاکەخوازی و پلەو پایەی بەرزەوە لەئێمە بەچاکتر داناوەو فەزڵی تۆی بەسەر ئێمەدا بەو ڕەوشتانەت داوە لەکاتێکدا ئێمە گوناهکارین و خۆپارێز (بەتەقوا) و (خۆڕاگر) و (بەئارام) نەبووین و لەگفتارو کردارمان دا هەڵەمان دەرهەق کردوویت. داوای لێبوردن لەخوداو لەخۆیشت دەکەین، تۆش بەسۆزو نەرم و نیان بە لەگەڵمان داو لەم تەنگانەیەدا سزامان مەدە)..

(یوسف)یش پێی گوتن: (ئەمڕۆ هیچ گلەییو سەرزەنشتێکتان لەسەر کردارەکانتان لێ ناکرێت، منیش داوای لێبوردن و ڕەحمەتتان لەخودا بۆ دەکەم، خوداش بەڕەحمترینی بەڕەحمانە).

ئینجا -یوسف- هەواڵی تەندروستیی باوکی لێ پرسین و ئەوانیش گوتیان کە باوکی چاوی لەدەست داوە (واتە کوێر بووە) بەهۆی سەختی و زۆریی ی ئەو هەموو خەم و پەژارەیەوە کە لە ڕووداوەکانی (یوسف)دا بەسەری هاتووە. (یوسف)یش کراسەکەی خۆی بەبراکانی داو داوای لێ کردن بیخەنە سەر دەم و چاوی، چونکە بەوە چاوی چاك دەبێتەوە.. جگە لەمەش داوا لەبراکانی دەکات جاری داهاتوو لەگەڵ تێکڕای کەس و کاریان دا بێنەوە بۆ (میسر).

ئەمەی پێشوو شیکاری واتای ئەم ئایەتانەی بەشێکی دیکەی بەسەرهاتەکە بوو کە خودا لەسوورەتەکەدا گێڕاویێتی یەوەو فەرموویە: ﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ[١] فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ[٢] عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي[٣] هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾يوسف/٨٨-٩٣.

---

(١) (مزجاة): واتە (خراپ و بێکەڵك)

(٢) (لا تثریب): واتە: (هیچ گلەییو گازاندەیەك نەماوە).

(٣) (قمیصي): بۆ ئەم وشەیە تەفسیرێکی دیکەش لەڕووی زمانەوانییەوە هەیە، بۆ نموونە وشەی (قمیص) بەو پلە بەرزو بەهادارەش واتاکراوە کە (یوسف) لە (وەزارەتی دارایی)یەوە دەستی کەوتووە یان بەو

## "یـەعقوب" هەواڵی ساغی و سەلامەتی ی -یوسف-ی پێدەگات

براکانی " یوسف" گوێڕایەڵی ئەو فەرمانەی (یوسف)یان کردو ئەرکی جێبەجێ کردنیشیان لەئەستۆگرت. بۆ ئەم مەبەستەش سوارپشتی ولاخەکانیان بوونەوەو زۆر بەپەرۆشیوخێرایـشەوە بەرەو فەلەستین (بۆلای باوکیان) دەڕۆشتنەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کراسەکەی (یوسف)یشیان بۆ هەڵگرتبوو، جگە لەهەڵگرتنی مزگێنیی دەست بەکاربوونی لەپۆستی وەزارەتـی دارایـی ی ئەو ولاتەدا.

جا کاتێك کاروانەکەیان لەخاکی (میسر) نەختێك تێپەڕی بوو (یـەعقوب)یـش هەسـتێکی شارراوەی لەلا خولقابوو لەسەر نزیك بوونەوەی وادەی چاوپێکەوتنەوەی بە (یوسف)ی کـوڕی.. (واتە وەك چۆن لەغەیبەوە ئەو هەواڵەی بە دڵدا هاتبێت) هەر بۆیە ئەم هەواڵە بەکەس و کاری خۆی و بە نەوەکانی (کوڕزاکانی) دەگەیەنێت و پێیان دەڵێت: (من هەست بـە بـۆن و بەرامـە خۆشەکەی -یوسف- دەکەم و پێم وایە هەموو گیان و جەستەی داپۆشیوم، خـۆ ئەگـەر لەبـەر ئەوەش نەبێت کە لەم قسەیەم دا بەشتێك خەوشبارم کەن ئەوا لەبارەی یوسفەوە هەواڵی زیاترم پێ دەوتن. بەڵام ئێستا ئەو زیندووەو وادەی بەیەك گەیشتنەوەشمان نزیك بۆتەوە)..

دیارە تا ئەو ساتە کوڕەکانی (یـــەعقوب) نەگەیـشتبوونەوە بـۆ لای کـە (یـەعقوب) ئـەم هەواڵەی بەکەس و کارو نەوەکانی دیکەی دەگەیاند... بەڵام هێشتا لەقسەکانی نـەبوو بـووەوە کە نەوەکانی بەگلەیی و سەرزەنشتەوە سوێندیان بۆ خـوارد لەسـەر ئـەوەی گوایـە ئـەو (واتـە یـەعقوب) هەر دوورە لەواقیع و بەردەوام لەخەو و خەیاڵ دا نغرۆ بووە بەهۆی زیادەڕۆییکردنی لەخۆشویستنی (یوسف)و خووگرتنی بە باس کردنی هەمیشەییەوە.

کەچی (یـەعقوب) وێڕای ئەوەی ڕەحنەو سەرزەنشتی نەوەکانیـشی لـەلا گـران بـوو بێـت، هێندە بایەخی پێ نەدان و چاوی لێ پۆشین و گوێی بـەو ناخاوتنـە وشـك و کـورتبینی یـەیان نەدا، بەڵکو لەئاست ئەو قسە ڕەق و ناخۆشانەیان دا بێدەنگ و خۆڕاگر بوو، خـۆڕاگری و بـێ

---

ڕاسپاردەیەش واتاکراوە کە لەپاشاکەی (میسر)ـەوە وەری گرتووە.. لەعەرەبیدا گەر بگوترێت (مـن قمصك هذا القمیص) واتە: کێ ئەم پلەو پایە بەرزەی پێداویت؟ مەبەست لە (فألقوه علـى وجـه أبـي)یـش (کراسـەکە بدەن بە دەم وچاوی باوکم دا) مەبەسـت لەمـەش واتـە (زانیـار و ئاگـاداری بکـەن لەحاڵـەت و پلـەو پایـەی هەنووکەی من و هەموو زانیارییـەکی لەسـەر مـن پـێ بگەیـەنن). مانـای وشـەی (بـصیراً)یـش (هـەروەك لەکتێبەکانی زمانەوانی و فەرهەنگ)دا هاتووە مەبەست لەچاوساغی و بینایی (دڵە) یان بەمانای زانستە کە زانستی لەسەر یوسف دەبێت.. واتە لەسەر چاوڕۆشنی(بصیرە) دەبێـت بـەحاڵی (یوسـف)ی کـوڕی و ئاگـادار دەبێت لە بارودۆخەکەی.

دەنگی‌یەکەشی وەك وەڵامێك وابوو بۆیان. (یـەعقوب) هەر لەسەر ئەو هەستە پاك و پڕهیوایە بوو بۆ چاوەڕوانی‌کردنی کاتی چاوپێکەوتنەوەی کوڕەکەی تا ئەو سـاتەی هـەڵگری کراسـەکەی (یوسف) هات و مزگێنی‌ی ساغی و سەلامەتی‌ی (یوسف)ی پێ‌گەیاند.

جا کاتێك کراسەکە بەسەر گۆنای دا درا خۆشـی و شـادی یـەکی وەهـا ڕووی تـێ‌کرد کـە ژیانێکی نوێ‌ی بەگیانی بەخشی یەوەو بەخواستی خوداش چاوی بۆ گەڕایەوەو چاوی هەڵهاتەوە بە دیتن. پاشان مزگێنی دەر(البشیر) هەموو حاڵەت و کاروبارێکی (یوسف)ی بـۆ بـاس کـردو پێیشی گوت کە یوسف داوای لێ دەکات (یـەعقوب)ی باوکی بەخۆی و کەس و کارو سـەرجەم نەوەکانی یەوە بچن بۆ لای لە میسر.

لەو ساتەدا (یەعقوب) ڕووی کردەوە کەس و کارو ئەو نـەوەو کوڕەزایانـەی لەچـوار دەوری بوون وپێ‌ی ڕاگەیانـدن کـە بیربکەنـەوە لەڕاسـتی ی پێـشبینی یەکـەی و حەقیقـەتی هەسـت کردنەکەی بەوەی ئەو بەجۆرێکی وەها لەڕەحمەت و میهرەبانی ی خودا تێگەیـشتووەو دەرکـی پێ‌کردوە کە ئەوان ئاوا دەرکی پێ‌ناکەن. ئەوانیش زۆر داوای لێبوردنیان لێ کـرد لەسـەر ئـەو هەڵوێـستە نالـەبارو قـسە ڕەق و ناخۆشـانەیان و تکاشـیان لێ کردلـەلای خـودا داوای لێخۆشبوونیان لەگوناهەکانیان بۆ بکات، (یـەعقوب)یش بەڵێنی پـێدان لەسـەر ئـەوەی داوای لێبوردنیان لەخودا بۆ بکات و بۆیان بپاڕێتەوە کەخودا لـەو گوناهانـەیان خـۆش بێـت چـونکە تەنها خودای تاك و تەنیاو بێ‌هاوەڵ لێبوردووەو بەڕەحم و میهرەبانە...

﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلْعِيرُ[١] قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّى لَأَجِدُ رِيحَ[٢] يُوسُفَ لَوْلَآ أَن تُفَنِّدُونِ[٣] ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَـٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴿٩٥﴾ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَـٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾یوسف/٩٤-٩٨.

---

(١) (ولما فصلت العیر): واتە (کاتێك کاروانەکە لەبارەگای - یوسـف - دەرچـوون لـە - میـسر - وشـەی (فصلت) لەجیابوونەوە (فصل)ـەوە هاتووە، بۆ نموونە دەگوترێـت (فـصل القـوم عـن المکـان و انفـصلوا عنـه) بەمانای (فارقوه) واتە (ئەو کەسانە لەو جێگەیە جیابوونەوە، لێ ی نەمان).

(٢) (ریح): بەمانای (هێزو پلەو پایەو دەوڵەت و سەرکەوتن)یش دێت.

(٣) (تفندون): (واتە بەگەمژەم دادەنێن، یان خەڵەفاو، یاخود بەدرۆم دەخەنەوە). چاوگی فەرمانی (تفنیـد) بۆ تێك چوونی عەقڵ و بیرو هۆشیش بەکاردێت.

## پێك گەیشتنەوەی پڕ شەوق و شادی و بەدی هاتنی خەونەكەی -یوسف-

دوای ئەوەی (یـەعقوب) ئەو داوایەی پێگەیشت، خێرا فەرمانی بەكوڕەكانی كرد هـەمووو كەرەسەو ئامرازێكی سەفەری بۆ ئامادەكەن تاكو بەخۆشی و شادی و بەزووترین كات بەدیداری (یوسف)ی كوڕی بگات، ئەوانیش بەپەلە خۆیان و سەرجەم كەس و كاری نێو بنەماڵەكەیان كە ژمارەیان حەفتا (٧٠) كەس بـوو ئامـادە كـرد بـۆ سـەفەر بەهـەموو كەرەسـەو ئـامرازێكی پێویستەوە، كاتێك (یوسف)یش لەلای خۆیەوە هەواڵی هاتنیان و بەرێ كەوتنیانی پێ گەیـشت خێرا خۆیو چەندین پیاوماقوڵی ئـەو گەلـەی سـازكرد بـۆ پێـشوازیكردن و بەپیرەوەچـوونیان لەسەر سنووری (میسر).

بنەماڵەكەی -یـەعقوب- كەیشتنە (میسر) ودیتیان ئەوا (یوسف) لەپێـشوازی كردنیـان دایە.. (دیارە لێرەدا ناتوانین ڕادەی ئەو خۆشیو شادی یەی "یـەعقوب" وەسف كەین لەئاست چاوپێكەوتنەوەی كوڕەكەی دا، چونكە ئەم وەسفە لەسەرووی وزەو توانای نوسەرەوەیەو لە وزەو تینیدا نیيە باسی بكات و مافی تەواوی پێبدات، نەخوازەڵا لەپاش ئەو مـاوە دووردرێـژەی لێك دابڕان و دوای هاتنەئارای ئەو ڕۆژگارەش كە (یوسف) تیای دا خاوەنی دەسـەڵات و پلـەو پایەو دارایی یە).

(یوسف) دایك و باوكی خستە پاڵ خۆی و لەجێگەیـەكی بـەرزو بـەهاداردا داینیـشاندن و داواشی لێكردن ئیدی لە (میسر)دا بەهێمنی و ئاسـوودەییو بـە یارمـەتی و كۆمـەكی خـودا گوزەران بەرنەسەر. پاشان كەژاوەكە بەنێو -میسر-دا دەڕۆشت تاكو گەیشتنە بنكەو بارەگـای حكومەت و چوونە ژوورەوە. لەوێش -یوسـف- بـاوك و دایكـی لەتەنیـشت خۆیـەوەو لەسـەر كورسـیی فـەرمانڕەوایی دانیـشاند وەك ڕێزلێنـانێكی زیـاتر و بایـەخ پـێدانی شایـستەیان. (یـەعقوب) وكوڕەكانیشی لەو خۆشی و شادی یەدا هەستێكی گەورەو فرەیان بەو هەموو ڕێـزو شكۆیە كرد كە خودا لەسەر دەستی (یوسف) بۆی بـەدی هێنـابوون. لەبەرامبـەر ئەمـەدا بـە عادەت و ڕێسای ڕەچاوكراوی خۆیان سلاوێكیان لێ كرد، سلاوەكەش جۆرە خۆ چەماندنەوەیەك بوو كە بەگوێرەی دابو نەریتی ئەو سەردەمە خەڵكی ئـاوا بـەو جـۆرە سـلاویان لـە سـەرۆك و فەرمانڕەوایان دەكرد. ئەم سلاوەش یادگاری خەونەكەی لەدەروونی (یوسف)دا وورووژاندەوە كـە بە منداڵی بینیبووی، بۆیە لەدوای وەبیركەوتنەوەی خەونەكەی، بەباوكی گوت: (ئەمە تەفسیرو لێكدانەوەی ئەو خەونەمە كە بەمنداڵی بینیم و بۆم گێڕایتەوەو پێم گوتیـت (مـن لەخـەونم دا

دیتم ئەوا (یازدە ئەستێرە)و (خۆر)و (مانگیش) کڕنووشم بۆ دەبەن).. جا ئێستاش خودای پەروەردگارم ئەم خەونەی بۆ بەدی هێنام، هەروەها خودا ڕێزی زۆری لێنام و چاکەی لەگەڵ داکردم، ئەویش بەو شێوەیەی کە بێتاوانییمی سەلماندو لەزیندانیش ئازادی کردم و ئێوەشی لەدەشت و ژیانی بیابان نشینییەوە بۆ ئێرە هێنا تا لە -میسر- پێك بگەینەوە دوای ئەوەی (شەیتان) پەیوەندیی نێوان من و براکانمی تێك دا.. هەموو ئەمانەش بەبێ ویست و ئیرادەی خودای میهرەبان بەئەنجام نەدەگەیشت، چونکە خودا بەسۆزو بەلوطفە لەگەڵ بەندەکانیداو زاناو ئاگادارە لەهەموو شتێك دا، هەروەك داناو بەحیکمەتیشە لەهەڵسووڕاندنی هەموو کاروبارێکی مەخلوقاتی دا)...

(یوسف) دوای ئەوەی قسەکانی تەواو کردو بەتێرو تەسەلی دەربارەی هەموو ئەو نازو نیعمەتانەی خودا دوا کە پێی بەخشیوە، ڕووی کردە خوداو بەزمانی شوکرانە بژێریو سوپاس گوزاری یەوە لەخودا پاڕایەوەو گوتی: (ئەی پەروەردگار من چەند منەتبارو قەرزاری بەربارەگای تۆم!! من دەبێت دان بنێم بەو چاکەو بەخششە زۆرانەت دا، تۆ بێگومان حوکم و دەسەلاتێکی وات پێ بەخشیوم کە پێویستە سوپاست بکەم لەسەریان.. ئەی ئەو خودایەی کە بێئەوەی نموونەیەکی پێشترت لەلابووبێت (ئاسمانەکان و زەویشت) بەم شێوەجوان و بێوێنەیە دروست کردووە، تۆ خاوەنی کاروبارو سەرپەرشتیاری نیعمەت و پاداشتی منی لەدنیاو ئاخیرەت دا، جا بەو شێوەیەش بۆلای خۆتم بگێڕەوە کە لەسەر هەست و گیانێکی قایل بوو و تەسلیم بوو بەوەبم کە بۆ هەموو پێغەمبەران و بەندە چاکەکانی دیکەت داناوە، ئەوانەی تەنها سەربۆتۆ دادەنەوێنن و تەنها ملکەچی فەرمان و شەریعەتی تۆن. هەروەها بمخەرە نێو کۆمەڵی ئەوانەی ڕێنماییت کردوون بۆ چاکە و چاکەخوازی لەبەندە خواویست و دڵسۆزەکانت)...

﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ [1] وَقَالَ ٱدْخُلُواْ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ

(١) (أبويه): واتە (دایکی و باوکی).. بەڵام داخۆ دایکی "یوسف" کێ بووبێت کە لەو کاتەدا چووە بۆ (میسر)؟ گوتراوە: (ڕاحیل) دایکی بووە)، بەڵام لە (سفر التکوین)دا واباسکراوە کە لەو ڕۆژەدا دایکی نەبووە، چونکە (یوسف) تەمەنی دە ساڵان بووە کە دایکی وەفاتی کردووە، گوتراویشە: (ئەو دایکەی لەگەڵیان دا چووە بۆ میسر و بەدایکی دانراوە ناوی -بَلهە- بووە کە لەوەوپێش کەنیزەیەکی دایکی بووەو دایەنی -یوسف- بووە لەماوەی ژیانی دایکیو دوای مردنیشی. دایان (مربية)ش لە عورف و داب و نەریتی عەرەب دا بەدایك بانگ دەکرێت لەبەر ئەوەی ئەرکی دایك ڕادەپەڕێنێت.

جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِيٓ إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ [١] مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ [٢] ٱلشَّيْطَـٰنُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِيٓ ۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ [٣] ﴿١٠٠﴾ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾يوسف/٩٩-١٠١...

---

(١) (البدو): البادية.. واتە (دەشت و مێرگێکی فراوان کە خەڵکی خێڵەکیو دێهاتیی تێدا بژین)..

(٢) (نزغ): (واتە: شێواندیو فیتنەیی و گێرەشێوێنیی کرد).

(٣) بەم ئایەتەی دوایی (واتە بەئایەتی ژمارە (١٠٠)ی سورەتەکە) قورئان ئەو چیرۆکەی کورت و پوخت کردۆتەوەو تیایدا ئاماژەی بۆ گرنگترین ڕووداوی نێو ئەو چیرۆکە کردووە.

# بەندی هەشتەم

## ((چەند پەندو وانەیەك لەچیرۆكی -یوسف-ەوە))

( وانەیەك لەسەر باوەڕ لە "یـەعقوب"ەوە - بەڵگە لەسەر تاك و تەنیایی ی خودا - زیانەكانی تێكەڵاوبوونی هەردوو ڕەگەز - وانەیەك لەسەر داوێن پاكی - بەرەنجامی ئارام گرتن - سوودی چاكەكردن - ئابڕوومەندیی وئاكاری جوان - لێبوردن لەكاتی دەسەڵاتداریتی دا — دادگەرێتی ی باوكان لە نێوان ڕۆڵەكانیان دا )

### وانەیەك لەسەر باوەڕ لە (یـەعقوب)ـەوە

باوەڕهێنان بەخودا گەورەترین شوێنەواری لەدەروونی ئینسانی دا هەیەو لـەكاتی ڕوودانـی كارەساتێك دا سەبووری‌و ئارامی ی پێ دەبەخشێت، هـەروەها دڵنیاییـشی بـۆ دەرەخـسێنێت تاكو بەهۆی ئەوەوە خۆڕاگرو بەورەبێت لە بەردەم هەر ڕووداوو مەترسـی یـەك دا كـە تووشـی ببێت. ئەم باوەڕە لە هەڵس و كـەوتی (یــەعقوب)دا بـە جـوانی ڕەنگـی داوەتـەوە، ئـەویش لەزنجیرەیەك كارو هەڵوێستی دا لەماوەی ژیانی و لەشێوازی ڕێنمایی كردنی ڕۆڵەكانی دا... بۆ نموونە كاتێك هەواڵی لەناوچوونی خۆشەویست ترین كوڕی خۆی پێدەگـات كـە گوایـە گـورگ خــواردوێتی، (بڕوانــە قورســایی خەفــەتی ئــەم ڕووداوە لەســەری چــەندە)و داخــۆ چ زام و كاردانەوەیەكیش لەدەروونی دا دروست بكات؟!

بێگومان دیتمان و بۆمان دەركەوت (یـەعقوب) لەبەرامبەر ئەو ڕووداوە دڵتەزێنـەدا پـەنا بۆ خودا دەبات و ئارام لەسەر ئەو بەڵایـەش دەگرێـت، بـەڵام بـە چ شـێوەیەكی ئـارام گـیری؟ بێگومان بەو ئارامە جوانەی كە هیچ نیگەرانی‌و دڵـەڕاوكێ و سـكاڵایەكی تێكـەڵ نابێـت... دەبینین بەم وتـە نایابـەش دەری دەبڕێـت: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾... واتە: (سەبرێكی جوان و هیچ وەڕس بوون و پرتـەو بۆڵەیـەكی تێـدا نـەبێت و خـوداش پـەناو پشتیوانم بێت لەئاست ئەو ئیدیعاو درۆو دەلەسە ئاشكرایەتان دا)...

لەلایەكی دیكەشەوە (یـەعقوب) هەروا دەبیـنین كـە بـەباوەڕێكی قـووڵ و پـڕ لـە سـۆزی سەرپەرشتی ی ئیلاهی یەوە باوەڕدارەو بە متمانەو دڵنیای یەوە خـۆی پێسـپاردووە، نەخاسـمە

کاتێك کوڕەکانی داخوازی یەکی دیکەی دەخەنەوە بەرچاو و داوای لێدەکەن ڕێیان بدات (بنیامین)ی (زڕبرایان) و (کوڕە بچووکی خۆی) لەگەڵ خۆیان دا ببەن بۆ (میسر)، ئەویش هێشتا مارانگازەو دەروونی زامدارە بەو کارەساتەی پێشووی -یوسف-و، گومانیشی لەهەموو جم و جووڵ و هەڵس و کەوتێکیان دا هەیەو، لەخەم و ئازاری جودایی -یوسف-دایە، داخۆ چۆن وەڵامی ئەم داواکاریە تازەیەیان بداتەوە؟ بێگومان بەچەند وشەیەك وەڵامیان دەداتەوە کە هەریەکەیان باوەڕی بەهێزی لێ پەخش دەبێت... باوەڕ بەسۆزو لوتفی خوداو متمانە بەدادگەری و ڕەحمەتی خودا لەکاتی قایل بوونی دا بەناردنی (بنیامین)ی جگەرگۆشەی لەگەڵیان دا، واتە بەم وشانە وەڵامیان دەداتەوە: ﴿فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾.. واتە: (خودا بەهێزترین وباشترین پارێزەرەو هەر خۆیشی بەرەحمترینی بەرەحمانە).

هەروەها دەبینین (یەعقوب) پشتی بەخودا بەستووەو بەمەش ئارامی و هێمنی یەکی دەروونیی لەفەرمان و بڕیاری خودایی یەوە بۆ دەستەبەر دەبێت، ئەویش کاتێك کوڕەکانی ڕادەسپێرێت بەوەی لەگەشتی دووەمیان دا بۆ (میسر) تەنها لەیەك دەروازەوە نەچنە نێو ئەو وڵاتەوە، بەڵکو لەچەند دەروازەیەکەوە تاکو سەرنج و ئاوڕی پاسەوانانی شار لەسەریان جێگیر نەبێت و گومانیان لێ نەکەن و خراپەیەکیان دەرهەق نەکەن، نەخوازەڵا ئەمان خەڵکی (فەلەستین) و لەنێوان خەڵکی (فەلەستین) و خەڵکی (میسر)یش دا دوژمنایەتی هەبووە.

(یەعقوب) هۆی ئەم ڕاوێژو تەکبیر بۆ کردن و هۆشداری پێدانەی وا لێك دایەوە کە ئەو ناتوانێت هیچ قەزاو قەدەرێکی خودایان لەسەر لابات:﴿وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ﴾، چونکە گەر خودا خواستی ناخۆشی یەکی لەسەریان هەبێت، ئەوا ئەم ڕاوێژو ئامۆژگاری کردنەشی سوودمەند نابێت بۆیان.

پاشان (یەعقوب) لەسەر ئامۆژگاری یەکەی بەردەوام دەبێت و بەم ڕستەیە دەیاندوێنێت کە (باوەڕی زۆرو خۆدانە دەست ئیرادەی خودا)ی لێ هەڵدەقوڵێت: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾... لێرەدا (یەعقوب) وانەیەکمان فێر دەکات لەسەر ئەوەی دەبێت لەپشت بەخوا بەستنیش دا هۆو ئامراز بگرینە بەرو وریاو ئاگاداریش بین لەزەرەروزیان، چونکە سروشت لەڕەوتی خۆی دا سیستمێکی بۆ داناوە کە ڕادەو ژمارەی (هۆخوڵقێنەکانی) بەپێی هۆیەکان بێت. مرۆڤی ئیماندار و خاوەن باوەڕیش ئەو کەسەیە کە هۆیەکانی ڕزگاربوون بەکار بێنێت و لەهەمان کاتیش دا متمانەی بەقەدەری خودا هەبێت.. ئاگاداریو وریاییو خۆپارێزییش ئەو ئۆقرەو ئارامی بەدەروونی بەشەری دەبەخشن لەکاتی ڕوودانی ناخۆشی یەك دا.

ئامۆژگاری یەکەی (یـەعقوب)یش بۆ کوڕەکانی ئارامی و هێمنی ی بە (یـەعقوب-خـۆی) بەخشی و وای لێ کرد ئەوەنـدە داخ و حەسـرەت هەڵنەکێـشێت و بـەبێ ئومێـدییش خەفـەت نەخوات لەڕووداوێکی کت و پڕی ی (قەزاو قەدەر) گەر تووشی کوڕەکانی ببێـت، بەتایبـەتیش کە ئەو لەم ڕووەوە هێندە لاوازو ڕەشبین نەبووەو هیچ سستیو درێغی یەکیـشی لـە وەبـەرنانی هۆو ئامرازی گونجاودا نەکردووە، چونکە کاتێك ئەرکی خۆی بەجێ گەیاندوە، ئیدی کاریگـەری ڕووداوە کت و پڕی یەکەشی لەسەر کەم و سووك بووە.

سەرنج بدە لەحاڵەتێکی دیکەی ... (یـەعقوب) هـەواڵی کـت و پڕیـی (بەبەنـدەگرتنی - بنیامین-ی کوڕە کچکە)ی لە -میسر-ەوە پێ دەگەیەنرێت.. ئـەم ڕووداوە لـەناکاوە تازەیـەش کارەساتەکەی (یوسف)ی بیردەخاتەوەو بەنداوی خەم و پەژارەکانی دەتەقێنێتەوە.کاتێك کەس و کارەکانیشی گلەیی ئەوەی لێ دەکەن گوایە بووە بە هاورێ و هاودەمی خەم، دەبینین وایان تـێ دەگەیەنێت کەسکاڵای هەر خەم و دەردێکی بەئازاری تەنها لـەلای خـودا دەکـات: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾... لـەم ڕسـتەیەش دا جـوانترین واتـای " بـاوەڕو خـوڕاگری" لەبەرامبەر ئەو کارەساتانەدا دەردەوشێنەوە کە زۆرجار خەریکە بیروهۆشـی مـرۆڤ لەناودەبـەن یان کە مرۆڤ بەرەو هەرەس و ڕووخان دەبەن... بـەڵام مرۆڤێکـی ئیمانـداری وەك (یـــەعقوب) لەکاتی بیستنی هەواڵی نەهاتنـەوەی دووەم کـوڕی بـچووکی دا بەوانـەی دەوروبـەری دەڵێـت: ﴿إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي﴾ واتە (من خەمی هەرە گەورەو گرانم دەخەمە بـەردەمی خـوداو سـکاڵای کاروبارم هەر لای ئەو دەکەم، چونکە خـودا هـەرخۆی بـەڕەحم و میهرەبانـەو توانـای لەسـەر لابردنی خەمەکەم هەیە، جا ئیتر من سکاڵای خۆم نابەمە بەردەمی ئەو بەندانەی کە لەئاسـت کێشمەکێشی ڕۆژگارو ناڕەحەتی یەکانی دا هیچ هێزو توانایەکیان نی یە)..

دواجار هەر لەم لایانەوە دیمەنێکی تر لە گەشـبینیو ئومێـدەواریی (یـــەعقوب) بـەباوەڕە پیتەوەکەیەوە بەدی دەکەین، ئەویش کاتێك کوڕەکانی ڕادەسپێرێت بە سۆراغ کردنی (یوسـف) و (بنیـامین) و هـەوڵی دۆزینیـەوەیان، ئـەوەتا پێیـان دەڵێـت: ﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذْهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾..

(یـەعقوب) بەم وتانە (باری دەروونی)ی مرۆڤی ئیماندار دیاری دەکات و داوای لێـدەکات لەڕەحمەت و بەزەیی ی خودا بێئومێد نەبێت، چونکە بێئومێدی (یأس) پێنەزانین و بێباوەڕی یە بەنیعمەتی ژیان و بەخاوەنی نیعمەتەکەش (کەخودایە)، چونکە ژیان و ئیرادەی مرۆڤ ئیفلیج دەکات و دەستەوسانیشی دەکات لە خۆخستنە سەر ڕێی کاروانی ژیان، بـەڵام بـاوەڕ (ئیمـان)

دوژمنی سەرسەختی بێئومێدی یە، بگرە ئیمان هەرخۆی ئومێدەو هیوایە بەڕەحمەتی خودا، سائیتر تەنگانەو بگرەو بەردە هەرچەندێك زۆرو چڕبێت و، بارودۆخ و زەمانەش هەر چەندێك گران و ئالۆز بن، ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾ لەدوای هەر ناخۆشی یەك خۆشی هەیە لەدوای (تەنگانەو بارگرانی)یش ئاسوودەیی و ئازادی هەیە..).

## بەڵگە لەسەر تاك و تەنیایی خودا

یەکیەتی و تاك وتەنیایی(وحدانية)ی خودا یەکەمین ئامانج و پیرۆزترین و بالاترینی ئەو ئامانجانەشە کە ئیسلام لەپێناوی بەدیهێنانی دا هاتووە.

هەر کەسێك بەوردی و بەدیراسەیەکی گشتگیریو هەمەلایەنە لەقورئانی پیرۆز بکۆڵێتەوە سەرنجی بەلای چەندین بەڵگەی هەمەجۆر و هەمەچەشن دادەچێت لەسەر تاك و تەنیایی خودا، جگە لەو بەڵگانەش قورئان ڕەخنەی لەهەموو ئەو بیروباوەڕە دەسکردو مرۆڤکردانەش گرتووە کە دانیان بە تاکێتی و یەکیەتی خودا دانەناوەو لە جیاتی ئەوە تێکەڵی (شیرك)و هاوبەش بۆ خودا دانان بوون و بایەخێکی گەورەیان بەخەیاڵ و ئەفسانەو شتی پووچ و بێ ناوەڕۆك داوە.

قورئان هەر تەنها ڕەخنەی لە پووچەڵی ئەو بیروباوەڕە دەسکردو داتاشراوانە نەگرتووە، بەڵکو بەچەند بەڵگەیەکی (عەقڵی) و لۆژیکی (منطقي)یش ڕەخنەی خۆی دەسەلمێنێت و عەقڵی مرۆڤ وا لێدەکات جگە لەدان پێدانان هیچ دەربازێك بەدی نەکات.

قورئانی پیرۆز کاتێك دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەران دەدوێت کە خودا ڕەوانەی کردوون بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵکی، لەسەرزاری ئەوانەوە ئەو پەندو ئامۆژگاریانەیانمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لەبانگەوازیان دا بۆ تاك و تەنیایی ی خودا ئاڕاستەی گەلەکانیان کردوون و بۆ وازهێنانیان لە (هاوەڵ بۆ خودا دانان - شِرك) و پاشان خستنەڕووی ئەو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانەی گەواهی لەسەر وجودی خودا ده‌دەن..

بەم ڕەنگەش قورئان چیرۆکەکانی کردووە بەئامرازێك بۆ چەسپاندنی عەقیدەی یەك خوا پەرستی (توحيد) لەدڵ و دەروونەکان داو دەرهێنانی ئەو بیروباوەڕە دەسکردانەش لێیان و ڕیشەکێش کردنیان.

لێرەدا نموونەیەك لەسەر زاری "یوسف" دێنینەوە کاتێك ئامۆژگاریی هەردوو هاوڕێ زیندانی‌یەکەی دەکات و پێیان دەڵێت: ﴿ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ

قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّي إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ مَا كَانَ لَنَا أَن نُّشْرِكَ بِاللَّهِ مِن شَيْءٍ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ یوسف/٣٨-٤٠..

لەم ئایەتانەدا (یوسف) چەق دەخاتە سەر ڕێبازی ڕاست و دەڵێت کە ئەو خۆی ئاینێکی دانەهێناوە، بەڵکو لەسەر ڕێبازو بیروباوەڕی ئەو باب و باپیرە خواپەرستانەیەتی کە خودا ڕێنمایی ی کردوون بۆ سەر عەقیدەو بیروباوەڕی ڕاستەقینە، واتە بۆ خوا بەیەك گرتن و پەرستنی خودای تاك و تەنیاو بێ هاوەڵ. ئەم عەقیدەیەش لەزەمانێکەوە بۆ زەمانێکی دی ناگۆڕێت و هەریەك عەقیدەیە، چونکە ناشێت و ماقووڵ نی یە لە هەر ڕۆژو سەردەمێك و عەقیدەیەك هەبووبێت، خودای مەزنیش عەقیدەیەکی وای بۆ پێغەمبەرانی خۆی دانەناوە کە لە پێغەمبەرێکەوە بۆ پێغەمبەرێکی دی گۆڕابێت. چونکە یەکیەتی و تاکێتی ی خودا بانگەوازێکە هەموو پێغەمبەران تێکڕا بەشداربوون لە جەخت کردنە سەری و داکۆکی لێ کردنی دا، هەر بیروباوەڕێکیش دژو پێچەوانەی عەقیدەی پێغەمبەران بووبێت ئەوا لەئاینەکەشیان دا نامۆیە.

ئینجا دەبینین یوسف بەهەردوو هاوەڵە زیندانی‌یەکەی دەڵێت: (دەی ئایا شیرك و هاوبەش بۆ خوادانان (بەو هەموو بیرو دیدو بۆچوونە دژبەیەك و بەو خواوەندە هەموو جۆرو هەمەڕەنگانەوە) باشترە یان خوابەیەك گرتن و پەرستنی خودای تاك و بێ‌هاوەڵ؟) بێگومان بوونی (فرەخواوەندی) عەقلی مرۆڤ تێك دەدات و هەموو شتێکی بۆ تێکەڵ و پێکەڵ دەکات و دەیخاتە نێو گێژاوە بێ‌سەروبنەکانی ئەفسانەو خەرافات وبۆنەو ڕێ و ڕەسمە وەهمی یەکانەوە، هەروەها کۆمەڵی مرۆڤایەتییش لێك دادەبڕێت و خەڵکی دەکات بەدوژمنی یەکتر، ئەویش لەئاکامی ئەوەی هەر هۆزو دەستەو تاقمێك خواوەندێك بۆ پەرستن دیاری دەکەن کە جودایە لەخواوەندەکانی گەل و هۆزو تیرەکانی دی، لەکاتێکدا "خودا بەیەك گرتن و یەك خواپەرستی" مرۆڤ لەکۆت و پێوەندی شتی پروپووچ و ئەفسانە ڕزگار دەکات و ئامانج و کاری هەموو دەستەو کۆمەڵەکانی خەڵکی یەك دەخات و هەوڵ و تەقەللا بۆ یەك نیازی پیرۆز ڕێك دەخات، ئەویش خۆیەکلاکردنەوە بۆ خودای تاك و دڵسۆزی لەشوێنکەوتنی خوداو بەرنامەکەی و پیادەکردنی هەر کارێکی چاکی پێویست بۆ ئەو مەبەستە.

پاشان (یوسف) لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و پێیان ڕادەگەیەنێت و دەڵێت: (ئەو بتانەو هەموو ئەو شتانەی کردووتانن بەخواوەندی پەرستراوتان کە لە هەر دیاردەیەکی سروشتی بن و هەموو ئەو کردارو دەسەڵاتانەش، کە بۆتان دانساون، هەموویان زادەی بیری خۆتان و ناولێنراوی خۆتانن... جا چۆن دەبێت خۆتان چەند شتێك بکەن بەخواوەند لەو شتانەی داهێنراو و داتاشراوی دەستی خۆتانن و هیچ بەڵگەو نیشانەیەکی گونجاویان لەسەر نییە تاکو شەرعیەتێکی پێ بدەن..

ئەو خودا پەرستراوەش کە پێویستەو هەقە بپەرسترێت هەر (الله) خۆیەتی بەتەنیا. پەرستنی خودا(الله)ش بەتەنیا، ئەو ڕێگا ڕاست و دروستەیە کە پێویستە سەرجەم گرۆی بەشەری بیگرنەبەر. وەلێ مخابن زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستی یە نازانن و لێ ی ئاگادارنین، ئەویش بەهۆی ئەو نەزانین و گومڕایی یەوەیە کە (ئەوانەی جڵەوی فیکرو بیرو هۆشیانیان لەدەستدایە) بەسەریان دا هێناون.

## زیانەکانی تێکەڵاوبوونی هەردوو ڕەگەز

لەچیرۆکی (یوسف)دا لەم ڕووەشەوە دیمەنێك بەدی دەکەین، دیمەنی هەوڵدانی ئافرەتێك بۆ بەهەڵەدابردنی پیاوێك، تەنانەت هەوڵ و خووی هەمیشەیی ئەو ئافرەتە بۆ بەدەست هێنانی نیازە نارەواکەی، ئافرەتیش هەرچەندە مەخلوقێکی لاواز و بێ‌هێز بێت، بەڵام بەحوکمی جوانی و فرۆفێڵی فریودان و ڕاکێشانی پیاو بەلای خۆی دا دەشێت ببێتە ئەو کەسە بەهێزەی کە نابەزێنرێت.

ئەی ئایا ئەو هۆیانە چی بوون کە وای لە ژنەکەی -عەزیزی میسر- کرد هەوڵی لەخشتەبردنی "یوسف" بدات؟ بێگومان تێکەڵاویی ژنەکە لەگەڵ -یوسف-و وجودی هەمیشەیی (یوسف) لەناو کۆشکەکە لەلای ئەو ژنە لەو هۆکارو پاڵنەرانە بوون کە گڕی خۆشەویستییان بەردایە نێو دڵی ژنەکە.. لەبەر ئەوە دەبینین مەیل و ئارەزووی دەچێتە سەر ئەو کوڕە جوان و بەویقارەو دەیەوێت بە لەش و لاری خۆیو دەرخستنی جوانی‌یەکانی جەستەی هەڵی خەڵەتێنێت، بۆ ئەم مەبەستەش داوای ئەنجامدانی ئەو کردارەی لێ دەکات، کە حەرام و نارەوایە بۆ هەردووکیان، ئەویش (واتە یوسف) ڕێی پێ نادات و لەبەر سەربەرزی و ڕێزی خۆی و ترسان لەخودا خۆی نادات بەدەم هەواو ئارەزووەکەیەوە.. کەوابوو پێکەوەبوونی پیاوو ژنی نامەحرەم لەجێگایەکدا دوور لەچاودێریی کەس و کارو کۆمەڵ دەبێتە هۆی ئەو زیانە گەورانەی کە ئاکامی نالەباریان هەیە، هەروەك کاریگەریی خراپیشی لەسەر دوارۆژی پیاوو ژن دەبێت، لەبەر ئەمە ئایینی ئیسلام بەتوندی خەڵکی ئاگادار و وریا دەکاتەوە لەپێکەوە مانەوەی پیاوو ژن لەجێی چۆڵدا بەبێ وجودی کەسێکی نزیکی ژنەکە وەك باوکی، یان مامی، یا خاڵی..

## وانەیەك لەسەر داوێن پاکی

لەم ڕووەشەوە لەچیرۆکی (یوسف)دا خۆڕاگری و خۆپارێزیی کەم وێنـەی گـەنجێکی جـوان و قۆزی وەك (یوسف) بەدی دەکرێت لەبەردەم ئەو تاقیکردنـەوە سـەختەی کەوتنەبـەر تـەماعی شەهوەت و لەخـشتەبردن دا، لەمـەش دا وانەیـەکی کاریگـەر هەیـە لەسـەر داوێـن پـاکی و بەرەنگاربوونەوەی ئارەزوو و سەرکەوتن بەسەری دا، ئەوەش بەگەورەترین پەندو نموونە دادەنرێت بۆ ئەوەی چەندەها کوڕی لاوی دی شوێن پێ‌ی هـەڵبگرن، لەوانـەی مەبەسـتیان گەیـشتنە بـە (ئاستێکی باڵای شکۆو ڕێزی ئینسانی). "ئارەزووی جنسی"یش ئەو هێزە توندو سەرشیتانەیە کە چەندین گەورەپیاوی مێژووی کۆن و نـوێ لەپادشـایان و سـەرۆکان و سـەرکردەکانی سـوپا بەچۆك داهاتوون لە بەردەمی داو ملیان بۆ کەچ کردووە، بەڵام سەرکەوتن بەسـەر ئـەم هێـزەی ئارەزووی جنسیی دا کلیلی گەورەیی و شـکۆی ڕاسـتەقینەی گـەورە پیاوانـە، نەخاسـمە گـەر ئارەزووەکە هاوکاتی ئەو جۆرە (بارودۆخ)و (لەخـشتە بـردن)و (هەرەشـانە) بێـت، کـە بەسـەر (یوسف) داهات.

سەرنج بدەو بیرکەرەوە... ئەوا ژنەکەی وەزیری پادشا دەرفەتی مانەوە لەگەڵ (یوسف) دای چنگ کەوتووەو خۆیـشی ژنێکـی زۆرجـوان و جەحێڵـە و هـەموو جـوانی و ئەندامـە سـەرنج ڕاکێشەکانی جەستەی و هەموو شێوازو ڕێساکانی مەکربازی‌و فریودانیش بەکاردێنێت، ئینجـا بەئاشکرا داوای بەجێ‌هێنانی ئارەزووەکەی لێ دەکات. ئەو جۆرە بارودۆخ و هـەل و مەرجـەش کە -یوسف-ی تێ کەوتبوو وای دەخواست گوێڕایەڵی ی ژنەکە بکات و بەپەلە لەو سووربوون و پەرۆشی‌یەوە بەدەم ئارەزووە جۆش سەندووەکەی ئەو ژنەوە بچێت، چونکە (یوسف) خـۆی لـەو کاتەدا لە هەرەتی لاوی و سەرتای واڵابوونی دەروون بۆ خۆشەویستی و کڵپەسەندنی ئـارەزووش دایە.. لەسەروو ئەمانەشەوە ئەم لاوە لەماڵی ژنەکەدایەو لەژێر دەسـەڵات و هێزییـشی دایـەو ئەگەر گوێڕایەڵی ی نەکات مەترسی ی ئازاردانی هەیە، واتە ئارەزوو و ترس (رغبة و رهبـة)ی پێکەوە لەیەك کات دا خرابووە بەردەم.. دیسان لەلایەکی ترەوە ترسی ئەوەشـی نابێـت ئەگـەر ژنەکە ناڕازی بێت یان سەرزەنشتی بکـات، چـونکە ئـەو ژنـە خـۆی داواکـارو دەسپێـشخەرو ئارەزوبازەو هەموو دەرگاکانی داخستووەو چـاودێرو سیخوڕانیـشی دوورخـستووەتەوە. وێـرای ئەمانەش (یوسف) بۆ ئەو ژنە کڕابوو و بەنـدەو (مملـوك)ی بـوو و مـافی چـوونە ژوورەکـەی‌و چوونە دەرەوەو لەگەڵدا مانەوەشی هەبوو، بێ‌ئەوەی کەسێك نکوڵی لەو مافانە هەبوایە..

دیارە ئەو مافانەش هاوڕێ یەتی و هاوسۆزی و خۆشەویـستی زیـاد دەکـەن و گـرنگترین و بەهێزترین هۆکاری بەجێ‌هێنانی ئارەزووی ژنەکە بووە، کەچی لەئاسـت هـەموو ئـەم هۆکـارو پاڵنەرو زەمینەسازی یەدا (یوسف) ڕووی لێ وەردەگێڕێت و بەپێ‌ی ئەرکی پاراستنی شەرەف و

نواندنی دڵسۆزی و وەفاداری بۆ مێردەکەی کە (نابێت خیانەتی لێ بکات) پێی دەڵێت: ﴿مَعَاذَ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ﴾.. هاندەری وەفاداری یەکە لێرەدا بەستراوە بەچاودێری ی خودایی یەوە، هەر ئەم چاودێری یەش وای لەدەروونە پاك و تەمیزەکەی (یوسف)کرد، کە خۆی بەپاکی بهێڵێتەوەو توخنی ئەو گوناهە گەورەیە نەکەوێت لەگەڵ ژنی بەرپرسە گەورەکەی دا.

هەروەها هەڵوێستێکی دیکەی هاوشێوەی ئەمەی پێشوو لەچیرۆکەکەدا بەدی دەکەین کەپلەو پایەی -یوسف-ی پێ بەرزدەبێتەوە، ئەوەبوو کاتێك خانمەکەی (واتە ئاغاژنەکەی) جارێکی دی وبەشێوازێکی بێ شەرمانە پیلان دەگێڕێت و لەگەڵ چەند ژنێکی داوەت کراوی هاوڕێی دا دەیانەوێت مەیل و ئارەزووی بەلای خۆیان دا بەکێش کەن و دوایش هەڕەشەی دەسگیرکردن و زینندانی کردنی لێ دەکەن گەر داواکەیان ڕەت کاتەوە، هەڵوێستی ڕەوشتمەندانەی (یوسف) لەبەرامبەر ئەو هەڕەشەو گوڕەشانەش دا هەر وادەبێت، کە بەوپەڕی پاکداوێنی و سەربڵندی یەوە ڕوویان لێ وەردەگێڕێت و ژیانی نێو زیندان (کە ژیانی سەرکزی و ژێردەستەیی و ئازار چەشتنە) هەڵدەبژێرێت لە جیاتی (ژیانی نێو نازو نیعمەتی بێ باکی و دنیا پەرستی و ڕۆچوون لەهەواو ئارەزوودا) لەخواش دەپاڕێتەوە، کە ئەو ژیانەی نێو زیندانی لەجیاتی ئەو ژیانی سەرکردنە سەر ئارەزووبازی یە بۆ مەیسەرکات و زیندانی لەچارە بنووسێت.. ﴿رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ﴾..

## بەرەنجامی ئارام گرتن

پەندێکی دی لەو پەندو وانە بەسوودانەی لەچیرۆکی -یوسف-ەوە دەری دێنین ئارامگری و خۆ چاك کردنە بە سەبرو ئارامی، تاکو ئارام گرتن (صبر) ببێت بە توێشووی مرۆڤ لەگەشتی تەمەنی دا و پاشان بەرەنجامی چاك و بەپیزی لێوە دەست کەوێت. بێگومان ئادەمیزاد کە دێتە خانەی ژیانی دنیاوە چەندین گرفتیش لە (دەردەسەریو ڕووداوو ئێش و ئازارو هەژاری و نەخۆشی)ی تووش دێت، جگە لەمانەش لەدەست دانی خۆشەویستێك لەکەس و کارو ئاشنایان، یان بەدی نەهاتنی ئاواتێك، یاخود زیان کردن، بۆ هەموو ئەم گرفت و دەردەسەری یانەو هاوشێوەکانی دیکەشیان ئاتاجی هەر بەئارام گرتن و دان بەخۆداگرتنە تاکو بەسەریان دا زاڵ بێت، بەم پێیەش سەرکەوتن و سەرفرازی و بەختیاریی دەستەبەرکات.

ژیانی -یوسف- زنجیرەیەك گیروگرفتە کە ئاکام و بەرەنجامەکەیان سەرکەوتن و شوێنی شایستەو پایەبەرزی و ژیانی کامەرانی یە. سەرتای ژیانی(یوسف)بەوە دەست پێ دەکات کەلەکەس وکاری دووردەخرێتەوەو فڕێ دەدرێتە ناو بیرەوەوپاشان لەوێ ڕزگاردەکرێت و

بازرگانی ی پێوە دەکرێت و دوور لە کەس و کاری دەژی، جە لەو هەموو خەم و ئازارە پەنگ خواردووەی نێو دڵی لەسەر دابڕانی لەکەس و کاری و لەسەر فڕوفێڵی براکانی، ئینجا دەکەوێتە نێو قۆناغێکی تفت و تاڵەوە کاتێك بە زوڵم و زۆرداری لەپاداشتی داوێن پاکیو ئەمانەتپارێزیی دا لەزینداندا توند دەکرێت، لەوانەیە ئەم جۆرە ئازارو مەینەتی یانە هەندێك کەس بەرەو بێئومێدی و بێباوەڕی بەیاساکانی هەق و ادپەروەری هەڵنێت و وای لێ بکات خۆی بخاتە ناوباوەشی بەدکاری و خراپەوە، بەڵام خەیاڵی (یوسف) بەلای هیچ شتێك لەو خەسڵەتە ناشیرینانەدا ناچێت، بەڵکو بەردەوام جێگیر دەبێت لەسەر ڕێساو بیروباوەڕەکەی بەئارام و لەخۆبووردوو دەبێت لەسەر بەلاو مەینەتی یەکانی، بەتەمای ڕەحمەتی خودای میهرەبانیەتی و چاوەڕوانی ڕەوینەوەی قەیرانەکەیەتی کە بەزۆرو ستەم بۆی خوڵقێنرابوو، باوەڕو قەناعەتیشی بەخوداو عەدالەتی خودا هەبوو، لەهەمان کات دا، لەتاریکاییەکانی زیندان دا بانگەوازی بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنیا دەکرد، ئیدی هەموو ئەو ناخۆشیو دەردەسەریانە تۆزقاڵێك لە (باوەڕو متمانەی بەخودا) پاشگەزی نەکردەوە. لەپاداشتی ئەو جۆرە باوەڕو متمانەیەش دا خودا بەهرەی لێکدانەوەی خەون (تفسیر الرؤى)ی پێ بەخشیبوو، تا ئەو بەهرەیە بکاتە هۆیەك بۆ ڕزگاربوونی لەزیندان و لەئەستۆگرتنی بەرزترین پلەو پایەی دنیابییش، کە لەڕێزو شکۆو دەسەڵات و خۆشی یەکانی ژیانیشی بەهرەمەندبوو، بێگومان (یوسف) خۆیشی ئەو بەرهەمی ئارامگرتنەی دیاری کردووە (کە ئاکارو کەسێتی ی خۆی پێ ڕازاندەوە)و بەم چەند وشەیە گوزارشتی لێ کردووە، کە (خودا لەسەرزاری ئەو لەئایەتەکەدا فەرموویەتی): ﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾...

## سوودی چاکەکردن

لەچیرۆکی (یوسف)دا بەهادارکردن و خۆشەویست کردنی (نەریتی چاکەکردن) بەدی دەکرێت لەگەڵ دیاریکردنی شوێنەوارە جوان و بەکەڵکەکانی لەبەدەستهێنانی بەختیاریی دنیاو ئاخیرەتیشدا.. بەڵام چاکەکردن (ئیحسان) چی یە؟ ئیدی چ مانایەکی هەیە؟ چاکەکردن (احسان) پێچەوانەی خراپەکردن (إساءة) یە، هەروەها مانای بەتین کردنی کارو جوان کردنیەتی.. یەکەم سوودی چاکەکردن کە خودا لەچیرۆکی (یوسف) داو دەربارەی (یوسف) دیاریی کردووە، ئەوەیە کە فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾..کەوابوو بەپێی ئەم ئایەتە(یوسف)ئەم عیلم و حیکمەتەی لەبەرامبەر ڕەفتاری

چاکەکردنی پێشتری دا پێ دراوە، نەك لەبەرخۆشەویستی یەکی ئاسایی.دیارە نیعمەتی عیلم و حیکمەتیش باشترین نیعمەتی ژیانن بۆ کەسانی خاوەن دەروونی گەورەو هەرگیز لەگەڵ نیعمەتی ماڵ و سامان دا بەراوردناکرێت.

خودا چی ی بە (یوسف) بەخشی؟ بێگومان پلەو دەسەلات و فەرمانڕەوایی لە پاداشتی ئیحسان و چاکەکردنی دا پێبەخشی.. ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَآءُ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَآءُ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾یوسف/٥٦.. ئەم ئایەتە بەڵێنێکی ئیلاهییە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك چاکەکار (محسن) بێت خودا دەسەلاتی حوکمی لەسەر زەوی پێ دەبەخشێت و دەیخاتە بەر ڕەحمەتی خۆی لەو ڕووەوە، ئەم بەخشش (عطاء)ـەش بەکەسێکی دیاری کراوەوە پەیوەست نی یە، بەڵکو بەوەسفەکەوە بەستراوە.

هەر لەو ئایەتەدا بەجوانی سەرنجی ئەم ڕستەیەش بدە: ﴿وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ سەیرکە چ تەئسیرو شوێنەوارێکی شیرینی لەسەر نەفسی بەشەری هەیە، ئەمەش مەرهەمێکی سارێژکاری زام و برینەکانە بۆ ئەو مرۆڤە چاکەکارو لەخۆ بوردوو و دڵگەورانەی ئارامیان لەسەر مەینەتییەکانیان گرتووەو هۆیەکی هاندەریشیانە بۆ بەردەوام بوون لەسەر خەبات و تێکۆشانیان لەڕێی چاکەکردنیان دا، جا مرۆڤ بەو کارە چاك و خزمەتە بەسوودو جوانانەی کە بۆ کۆمەڵگەی خۆی ئەنجامیان دەدات دەگاتە پلەی بڵندو ناوبانگی جوان و پێزانینی خەڵکی لەوانەی کە چاکەکەیان لەگەڵ دا کراوە، هەر کەسێکیش کاری خۆی بەچاکی بکات، واتە پتەووو ڕێك و پێك و بێ خەوش ئەنجامی بدات ئەوا خەڵکیش زیاتر ڕوو دەکەنە سەر کارو بەرهەمیو متمانەی پێ دەکەن و ڕێزیش لەهەوڵ و پیشەکانی دەنێن، دەی ئایا پاداشتی چاکە هەر چاکە نی یە؟ ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴾...

ئەوە دەربارەی سوودی چاکەکاری لەدنیادا، بەڵام گومانی تێدا نی یە کە خەڵات و پاداشتی چاکەکاری لەڕۆژی دوایی (ئاخیرەت)دا زۆر لەو سوودو بەرهەمانەی دنیای زیاترو گەورەترن، هەروەك خودای پەروەرگار خۆی لەپاشماوەی مەبەستەکەو لەو ئایەتەی دواتر دا ئەمە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿ وَلَأَجْرُ ٱلْآخِرَةِ خَيْرٌ ﴾، چونکە پاداشتی ئاخیرەت پیرۆزترو گەورەتریشە لەپاداشتی دنیا.

## ئابڕومەندی و ئاکاری جوان

هەروەها لەچیرۆکی "یوسف" دا دەرسێکی کاریگەر هەیە دەربارەی پارێزگاری لە ئابڕووی چاك و بەرگریکردن لە ڕەوشت بۆ ئەوەی هیچ پەڵەیەکی ناشیرینی پێوە نەلکێت و تووشی خراپەیەك نەبێت. کاتێك (یوسف) وەك ئەو مرۆڤە سەنگینەی کە چەوساوەو ستەم لێکراوبوو و بۆ ماوەیەکی زۆریش لەتاریکاییەکانی زیندان دا بوو بێ ئەوەی گوناهێکی کردبێت، کاتێك بریاری ئازادبوونی پێ دەگات و داوای ئەوەی لێ دەکرێت بەدیداری پادشا بکات، هێندە پەرۆشی دەرچوون نابێت و بەو مژدەیەش شاگەشکەو شادمان نابێت، بەڵکو قایل نییە لەزیندانەکە دەرچێت هەتا ئەو تۆمەتەی لەسەر لادەبەن کە بە ناهەق دوایان خستبوو، هەر بۆیەش بەنوێنەرەکەی پادشا دەڵێت: (من هەرگیز لەزیندان نایەمەدەر هەتا دوای ئەوەی لەکێشەکەم دەکۆڵرێتەوەو ئەو بوختانەی بۆم هەڵبەستراوە بەدرۆ دەخرێتەوە).. کێشەکەشی لەترفەدان و مەکربازیی ئافرەتەکان دا بەندبوو.. ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ﴾.. جا کاتێك پادشا کە لەو ئافرەتانەو لە ژنەکەی (عەزیز-ی میسر)یش دەکۆڵێتەوەو لەئەنجامی لێکۆڵینەوەدا بەرائەت و داوێن پاکی و ڕووسپێتیی ئەم لاوەی بۆ دەردەکەوێت ئەوسا (یوسف) قایل دەبێت بەدەرچوون لەزیندان بەسەربلندی و بەئابڕووی بەرزو بێتاوانی یەوە، ئەمەش تاکو لەبارەیەوە نەگوترێت گوایە لەسەر تاوانێك گیراوەو پادشاش بە لوتفی خۆی لێ ی خۆشبووەو فەرمانی ئازادبوونی لەزیندان بۆ دەرکردووە. هەروەها بەپێی لێکۆڵینەوە لەو کێشەیە ئابڕوومەندیو ڕەوشتبەرزیی (یوسف) ڕوون بۆتەوەو تەنانەت پادشای پێ سەرسام و خۆشحاڵ بووە.

لەجاری یەکەم دا کاتێك پادشا زانیویەتی ئەم لاوەی نێو زیندان شارەزایە لە تەفسیرکردنی خەون و لەڕاوێژو دانانی ڕێو شوێنی گرنگ دا بۆ بەرەنگاربوونەوەی کارەسات و لێقەومان، دەڵێت: ﴿ٱئْتُونِى بِهِۦ﴾، واتە (ئەو کابرایەم بۆ بێنن). بەڵام کاتێك دوای لێکۆڵینەوە (لەکێشەو تۆمەتە بۆ هەڵبەستراوەکەی) بەرائەت و پاکیی -یوسف-ی بۆ ڕوون دەبێتەوەو دەڵێت ﴿ائْتُونِي بِهِ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي﴾ واتە (ئەو پیاوە پاك و بێتاوانەم بۆ بێنن تاکو بەتایبەتی بۆ خۆمی هەڵبژێرم و دەسنیشان کراوی خۆم بێت).. بەمانای تاکەکەسی سەرڕاست و جێی متمانەی خۆی بێت. ئەوە بوو کاتێك (یوسف) گەیەنرایە لای، یەکسەر (وەزارەتی دارایی و گەنجینەکان)ی پێ سپارد دوای ئەوەی شارەزایی و بێ تاوانی و داوێن پاکیی لێ بەدی کردبوو.

## لێبوردن لەکاتی دەسەڵاتدارێتی دا

هەروەها لەداستانی -یوسف-دا دەرسێك هەیە بۆ چاوپۆشیی ولێبوردن لە گوناهکارو سەودا لەگەڵکردنی بەچاکەو لەگەڵدا جوولانەوەی بەباشی لەجیاتی ئەوەی خراپەی دەرهەق بکرێت یان تۆڵەی لێبکرێتەوە. (یوسف)یش کاتێك براکانی ناسینی یەوەو پێیان گەیشتەوە دەیتوانی تۆمەتباریان کات بەهەر جۆرە تاوانێك تاکو بیانخاتە زیندانەوەو هەموو جۆرە ئازارو ئەشکەنجەیەکیشیان لەبەرامبەر ئەو پیلانەیان دا پێبچێژێت، بەڵام بەشکۆی باڵای دەروونی و بەسنگ فراوانیو خۆلادان لەفیکری تۆڵەسەندن نەیویست خۆی بخاتە نێو ئەو ئاستە نزمەی کە کەسانی سادەو ساکار بەپێی داب و نەریتی خۆیان تیایدا سەرنگووم دەبن. بێگومان خۆ (یوسف) دەسەڵات و حوکمی لەدەست دابوو، ژیانی ئەو کەسانەش کە خراپەیان دەرهەق کردبوو لەبەر ئیشارەتێك و وتەیەکی دابوو، دەیتوانی بەفەرمانێك تۆڵە لە هەموو ئەو کەسانە بکاتەوە کە هەریەکەی بەجۆرێك خراپەیان دەرهەقی کردبوو. بەڵام لەبەرامبەر خراپەکەیان دا (ئەو) بە چاکە لەگەڵیان دا هەڵس و کەوتی کردبوو.

سەبارەت بەبراکانیشی هەر بە چاکە لەگەڵیان دا دەجوولێتەوەو زیاد لەمافی خۆیان گەنم و جۆو خۆراکیان بۆ دەکێشێت و نرخەکەشیان بەپەنهانی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەمەش لەکاتێکدایە کە خۆی پێنەناساندوونەتەوەو براکانی نازانن ئەم وەزیرەی میسر (یوسف)ی برایانە. لەدواییش دا کە یوسف خۆی پێیان دەناسێنێتەوەو براکانیشی دەزانن ئەمە وەزیری پادشایە، خێرا لەو ساتەداو لەو دۆخە ترسناك و بەسامەدا هەست بەڕادەو بارستایی ئەو تاوانەیان دەکەن کە دەرهەقی ئەو برا بچووکەیان ئەنجامیان دابوو، هەر بۆیە دان بەهەڵەکەیان دادەنێن و پێی دەڵێن ﴿تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾: واتە (دەسا بەخودا بێگومان دەرکەوت کەخودا خۆی تۆی بەهۆی تەقواو خۆپارێزیو خۆراگری و چاکەکردنەوە لەئێمە بەباشترو بەرێزترداناو کەچی ئێمەش تاوانمان دەرهەق کردیت و تەقواو سەبرو ئارامان لەگفتارو ڕەفتاردا نەبوو).. لەبەرامبەر ئەم دان پێدانانە ڕوون و ئاشکرایەی براکانیدا دەبینین (یوسف) بەچەند وتەیەکی شیرین وەڵامیان دەداتەوە کە پڕن لە سۆزو هەستی برایانە و چاوپۆشین لەو تاوانەی بەرامبەری کردوویانە، هەروەك (دەڵێت: ﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ

﴿ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ ﴾.. واتە (ئەمرۆ هیچ گلەیی و گازاندەیەکتان لێ ناکەم و داوا لەخوداش دەکەم لێتان ببورێت).

## دادگەرێتیی باوکان لە نێوان رۆڵەکانیان دا

دواجار لەچیرۆکی(یوسف)دا وانەیەك لەسەر(چۆنیەتی ی مامەڵەی باوکان لەگەڵ رۆڵەکان دا بەدادویەکسانی) بەدی دەکرێت.. منداڵیش بەسروشتی خۆی دەمارگیرو حەسەدکارەو ئاتاجیشی بەسۆزو نازی باوك و دایکیەتی، جا پشتگوێ خستنی لەهەر بارودۆخێکدا و کەمتەرخەمی لەلاواندنەوەی هەست و نەستی دا رقێکی شاراوەی بەرامبەر براکانی لەدڵدا دەخولقێنێت. خۆپەسندی و دەمارگیرییش بەخێرایی لەنێوان براکان دا پەیدادەبێت، چونکە گەر دایك و باوك تاکە رۆڵەیەکیان بەجیا لەرۆڵەکانی تر خۆش بوێت و نازی زیاتری پێبدەن ئەوە دەبێتە هۆی هەڵگیرساندنی ئاگری دوژمنایەتی لەنێوانیان داو بەردەوام بەدرێژایی تەمەن لە کڵپەسەندن دایە، دوایش دەبێتە هۆی پچرانی پەیوەندی لەنێوان خیزانەکان دا.لەم چیرۆکەش دا (یوسف) بەتایبەتی نزیکە لە دڵی (یەعقوب)ی باوکی یەوە چونکە (یەعقوب) نیشانەکانی پێغەمبەرێتی ی لە -یوسف-دا بەدی کردبوو، هەر لەبەر ئەمەش لە براکانی دیکەی بەباشتر دادەناو فەزڵی ئەوی بەسەردا دەدان. ئەمەش رق و کینەی براکان لەو رووەوە دەورووژێنێت و نیشانەکانیشی لەوەدا دەردەکەون کە دوای ئەوەی (یەعقوب) گوێ بۆ -یوسف-ی کورە گچکەی دەگرێت لەکاتێکدا خەونەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو کە چەندین پێشبینی و موعجیزە لەسەر پایەبەرزی و شکۆمەندیی ی ئایندەی لەو خەونەدا بەدی دەکات، داوای لێ دەکات هەرگیز ئەم خەونە بۆ براکانی نەگێڕێتەوە نەبادا فێڵو تەڵەکەیەکی بۆ رێك خەن: ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ﴾...

# بەشی حەوتەم

## شوعەیب سڵاوی خوای لێ بێ
## ئەیوب سڵاوی خوای لێ بێ
## ذوالکفل سڵاوی خوای لێ بێ

# بەندی یەکەم

## (( چیرۆکی شوعەیب ))

( گومڕایی ی خەڵکی "مەدیەن " - گاڵتەکردنی گەلەکە بە(شوعەیب) - هەڕەشەکردن لە"شوعەیب" -
لەناوچوونی خەڵکی "مەدیەن" -
گەلی نێو دارستانی چڕ"أصحاب الأيكة" )

"شوعەیب" یەکێکە لە چوار پێغەمبەرە عەرەبەکە (هودو صالح و شوعەیب و محمدﷺ)ن.
لە وەسفی (شوعەیب)دا وا گێڕراوەتەوە کە بە وتاربێژ(خطیب)ی پێغەمبەران ناوبراوە بەهۆی زمانپاراوی و ڕەوانبێژی و ڕاست پێکانی نیاز و مەبەست لەبانگکردنی گەلەکەی دا بۆ باوەڕهێنان بەپەیامەکەی.

گەلەکەیشی خەڵکی (مەدیەن) بوون کە شارێکە و دەکەوێتە ناوچەی (مَعان)ـەوە لە دەوروبەری (شام) ولەسەر ڕێ ی (حیجاز) و نزیك دەریاچەی (لوط).

خەڵکی ئەو گوندە عەرەب بوون و ڕچەڵەکیان دەچێتەوە سەر -مەدیەن-ی کوڕی (ابراهیم الخلیل). کارو پیشەی ڕۆژانەشیان بازرگانی بووە چونکە شارەکەیان وێستگەیەکی دیاری بازرگانی و مەڵبەندی هات وچۆی کاروانەکان و بازرگانەکان بووە.

## گومڕایی خەڵکی مەدیەن

خەڵکی -مەدیەن- باوەڕیان بەخودا نەدەهێناو، شتی تریان دەپەرست، لەسەوداو ئاڵوێریی و کڕین و فرۆشتن دا خراپترین خەڵك بوون. ئەگەر شتێکیان بفرۆشتایە، لەکێشانەوەو تەرازووەکەیان کەم دەکردەوەو بەناتەواوی دەیانکێشا.

خودای مەزن پیاوێکی لەخۆیان بۆ ناردن کە (شعیب)ی پێغەمبەرو نێردراوی بوو، ئەویش بانگی کردن بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنها. بێگومان خوداش بەچەند موعجیزەیەك پشتگیریی ی کردبوو. هەروەها (شوعەیب) ڕێگەی ئەو کردارە ناشیرین و نا بەجێیانەی لێ

گـرتن و فـەرمانی پێکـردن بەدادگـەری و دەسـپاکی و، لەسـەرەنجامی سـتەمکاریی ی ئاگادارکردنەوەو بۆی دووپات کردنەوە کە ئەو ماڵ و سامانە حەلاڵەی خودا پێیان دەبەخشێت باشترە بۆیان لەو ماڵ و سامانەی بەحەرامی کۆی دەکەنەوە گەر بـە چـاکی بـڕوا بـەم وتانـەی بکەن و باوەڕ بەو پەیامەشی بێنن کە بۆ ئەو مەبەستە پێیان دەگەیەنێت. پێیشی ڕاگەیانـدن، کە ئەو خۆی توانای ئەوەی نی یە لەو بەدکرداری یانە بیانپارێزێت، بەڵکو ئەو تەنیا تێگەیەنەر و ئامۆژگارێکی سەرڕاستە بۆیان.

لەم ڕووەوە خودا فەرموویە: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ وَلَا تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ ۚ إِنِّي أَرَاكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَا قَوْمِ أَوْفُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ اللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَا أَنَا عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ﴾هود/٨٤-٨٦..

واتە: (بۆ خەڵکی-مەدیەن- کە بـەدکارو سـتەمکاربوون (شـعیب)ی برایانمـان بـۆ نـاردن، کەپێ ی گوتن: (ئەی گەلی خـۆم تـەنها خـودا بپەرسـتن چـونکە جگـە لـەو هـیچ خودایـەکی پەرستراوی ڕاستەقینەتان نی یـە، هـەروەها لـەکڕین و فرۆشـتن دا فـڕوفێڵ مەکـەن و کاتێـك خۆراکێك یان هەر پێویستی یەك بۆ خەڵکی دەکێشن لە تەرازووەکـە مەگرنـەوە و بەناتـەواوی مەیکێشن ، چونکە من بەڕاستی بۆم دەرکەوتووە، کە ئێوە هـیچ ئاتاجێکتـان بـەو فـڕوفێڵ و گزی و تەرازووبازی یە نی یە، بەڵکو لەخێرو خۆشی و دارایی دا دەتانبینم. گەروا بکـەن ئـەوا دەترسم تووشی سزای سەختی ڕۆژێکی پڕ ترس و بیم و لەناوبەر بن کە ئەو ڕۆژە لەهـەر چـوار لاوە ترس و بیم گەمارۆی خەڵکی ی داوە. جا ئـەی گـەلی خـۆم تـەرازوو و کێـشانەو پێوانـە بەرێکوپێکی و دادگەری و هاوسەنگی جێبەجێکەن و شت ومـەکی خـەڵکی بەسـووك و کـەم سەیر مەکەن و نرخی کەرەسەکانیان مەشکێنن، چونکە بەمە شێواندن و فەسادی بەدی دێنن و ناشبێت ئێوە لەسەر زەوی کاری تێکدەرانەی وەها توندوتیژ ئەنجام بـدەن. بـەڵکو لەڕاسـتی دا ئەو پارەو پوولە حەلاڵەی کە خودا بەقیسمەتی کردوون باشترە بۆتان لەو پارەو پوولە حەڕامـەی کەبەو کارە نارەوایەی تەرازووبازی پەیدای دەکەن گەر باوەڕتان بـەم وتەیـەو بـەو قیـسمەت و بەشە دیـاری کراوەشـتان هـەبێت. جـائیتر منـیش ئـەو پـارێزەرو چـاودێرە نـیم کـە هـەموو تاوانەکانتان ببڕێرم و سـزاتان بـدەم لەسـەری، بـەڵکو تـەنیا نێرراوێکـی خـوداو ئامۆژگـاری کارێکتانم.).

هەر لەم بارەیەوە خودا لەگێڕانەوەی چیرۆکەکەیان دا فەرموویە:

﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ[1] مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾الأعراف/٨٥..

واتای ئەم ئایەتەی سوورەتی (أعراف)یش واتای ئایەتەکانی پێشووی سوورەتی(هود)ە-.

بەدکاری و گومڕایی یەکەی ئەو گەلە ئەوە بوو لەسەر ڕێگای ماڵی (شوعەیب) و هەر ڕێگایەکی دی ڕادەوەستان وچاودێری ی هات وچۆی ئەو کەسانەیان دەکرد کە دەچوون بۆلای (شوعەیب) تاکو لەڕێبازی خودایان دوورخەنەوە. هەروەها پلارو تیروتوانجیان لەپەیامەکەی دەداو پاشان هەڕەشەیان لەباوەڕداران دەکرد. (شعیب)یش لەسەر ئەو ڕەفتارانە سەرزەنشتی دەکردن و ئاماژەی بۆ نالەباری و ناشیرینی ی ڕەفتارەکانیان دەکردو، دوای ئەمەش نیعمەت و بەخششە بێپایانەکانی خودای بەبیر دەهێنانەوە، وەك ئەو نیعمەتە هەرە دیارو بەرچاوەی لەدوای کەمی ی ژمارەیان خودا زۆری کردبوون و چەندین کوڕو نەوەی دیکەیان لێ پەیدا ببوو و پاشان لەدوای هەژاریو نەداری خودا دەوڵەمەندی کردبوون..

لەم بەئاگا هێنانەوەیاندا—شوعەیب- سەرنجی ئەو گەلەی بەلای ئەو ڕاستی یەدا ڕاکێشا کە دەبێت پەندو دەرس وەرگرن لەو سزا سەختەی خودا تووشی بەدڕەفتارانی پێش ئەوانی کردووە.

ئینجا بەڕاشکاوی بیروڕای خۆی بۆ دەربڕین و پێی گوتن: (ئێوە دابەش بوون بەسەردوو تاقم دا، تاقمێکتان باوەڕتان بەخودا هێناوەو بانگەوازەکەی من بەڕاست دادەنێن، تاقمێکی دیکەشتان باوەڕ بەخودا ناهێنن و بانگەوازەکەم بەدرۆ دەخەنەوە، ئیدی منیش خودا دەکەم بەحەکەم و دادوەر لەنێوانمان دا لەسەر ئەو مەسەلەیەی تیای دا ناکۆکین، خوداش باشترین حاکمە لەم مەسەلەیەدا..)

ئەم ئایەتانەی دەیخوێننەوە بەشێکی تری بەسەرهاتەکەیە کە لەم دێرانەی پێشوودا شیکارو واتایان خرایە ڕوو: ﴿ وَلَا تَقْعُدُوا۟ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ

(١) (بّينة): لێرەدا مەبەست لە وشەی (بّینة) ـ موعجیزەـ یە. چونکە (شوعەیب) موعجیزەیەکی وای بۆ دانراوە کە بەڵگە بووە لەسەر ڕاستگۆیی یەکەی، بەڵام قورئان جۆرو چونیەتی و ماهیەتی ئەو موعجیزەیەی (شوعەیب)ی بۆ باس نەکردووین.

مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ۖ وَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَـٰكِمِينَ ﴾الأعراف/٨٦-٨٧

## گاڵتەکردنی گەلەکە بە "شوعەیب"

ئەو گەلە گاڵتەیان بەقسەکانی "شوعەیب" دەهات و لووتبەرز بێپەروابوون وبەدەم بالۆرە وتن و گاڵتەجاڕی یەوە پێیان دەگوت: (ئەرێ کابرا ئەم نوێژ و دیانەتەی خۆت ئاوا کاری تێ کردوویت و کردووتی بەرابەرێك بۆ ئێمەو تا داوای وازهێنانی ئەو بتانەمان لێ بکەیت، کە باب و باپیرانمان لەمەوپێش هەر پەرستوویانن، پاشان سووریش بیت لەسەر ئەوەی نەهێڵیت بەئارەزووی خۆمان هەڵسوکەوت و مامەڵە بەپارەو سامانمان بکەین، ئەرێ تۆ چۆن ئاوا لەگەڵمان دەجووڵێیەوە لەکاتێکدا بەسیفەتەکانی ئارامی و ژیری و هۆشمەندی لەلای ئێمە ناسراویت؟).

لەوەڵامیان دا (شوعەیب) پێی گوتن: (ئەی گەلی خۆم هەر خۆتان بیربکەنەوە لەوەی ئەگەر من لەسەر ڕێبازێکی ڕوون و ئاشکراو دڵنیایی ی باوەڕداریتی بەخودای پەروەردگار بم وخوداش ڕزق و ڕۆزی ی باش و تەواوم پێبدات، ئایا بۆم هەیە لەگەڵ ئەو هەموو نیعمەتانەی خودا خیانەت لەپەیامەکەیو سەرپێچی لەفەرمان و ڕێگری (أمر و نهي)یەکانی بکەم؟ من بێگومان بەم پەندو ئامۆژگاریانەم بۆ ئێوە تەنها چاکسازیو خۆش کردنی باری ژیانی خۆتانم مەبەستەو هێندەی لەتوانام دا بێت لەم ڕووەوە هەوڵی چاکردنی ئێوە دەدەم، دیارە گەر بەیارمەتیو پشتیوانی ی خوداش نەبێت من لەگەیاندنی هەق دا سەرکەوتوو نابم، هەر بۆیەش پشت بەخودای تاك و تەنها دەبەستم و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە).

پاشان لەبەشێکی تری وتەکانی دا (شوعەیب) پێی گوتن: (ئەی گەلی خۆم نابێت ئەو ناکۆکیو دژایەتییەی بەرامبەر من هەتانە هاندەرتان بێت بۆ ڕژدی و نکوولی و سوور بوون لەسەر بێباوەڕیو بەمەش هەمان سزای سەختی گەلەکەی(نوح) یان گەلی(هود) یان گەلی (صاڵح) یان گەلەکەی (لوط)تان تووش ببێت، ئێ خۆ کات و شوێنی لەناوچوونیشیان هێندە لەئێوەوە دوور نی یە، دە ئیتر پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرن تاکو هەمان سزای ئەوان تووشی ئێوەش نەبێت. هەروەها داوای لێخۆشبوون لەخودا بکەن تا لە گوناهەکانتان ببورێت. دوای

ئەوەش بەپەشیمانی یەوە بگەڕێنەوە بۆلای و بۆ سەر ڕێبازە ڕاستەکەی، داوای لێبوردن لەسەر ئەو ڕەفتارە نادروستانەو ئەو تاوانە ناشیرینیانەتان بکەن.بێگومان پەروەردگاری من ڕەحمەت و بەزەیی ی زۆرە بۆ بەندە تۆبەکارو گەڕاوەکانی:

﴿ قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَـٰٓؤُا۟ ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَـٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ وَيَـٰقَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ (١) شِقَاقِىٓ (٢) أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَآ أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَـٰلِحٍ ۚ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴿٨٩﴾ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴾ هود/٨٧-٩٠..

## هەڕەشەکردن لە-شوعەیب-

ئەوە هەڵوێست و حاڵەتی (شوعەیب) بوو لەبانگەوازەکەی و بانگکردنی گەلەکەی‌دا، بەڵام کەسانی خۆبەزل زان و لووتبەرزی نێو گەلەکەی هەڕەشەیان لێ‌کردو بەرقی کوێرانەو تووڕەیی‌یەوە پێیان گوت: (ئێمە خۆت و ئەوانەی باوەڕیشیان پێ هێناویت لەم شارەمان دەردەکەین و هەردەشبێت دەرتان کەین، مەگەر لەکاتێك دا نەبێت کە پەشیمان بنەوەو بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو ئاینەی خۆمان کەوازتان لێ هێناوە).

(شوعەیب) بەرپەچی دانەوەو پێی گوتن: (ئەرێ چۆن دەگەڕێینەوە بۆ سەر ئەو ئاینەی کەلەبەر (ناتەواوی‌و شێواوی و ناشایستەیی ی) ڕقمان لێ ی دەبێتەوە. ئەوە مەحاڵەو هەرگیز نابێت، چونکە گەر بێینەوە سەر ئەو ئاین و ڕێبازە چەوتەی ئێوە ئەوا درۆو دەلەسە بۆ خودا هەڵدەبەستین و درۆ لەگەڵ ڕێبازە ڕاستەکەی دا دەکەین دوای ئەوەی کەخودا هەر خۆی ئێمەی خستۆتە سەر ڕێی ڕاست. لەبەر ئەوە بۆمان ناشێت بەخواست و ئارەزووی خۆمان بێینە سەر ئاینی ئێوە، تەنها بەخواست و ئیرادەی خودا نەبێت، کە (ئێمەش لەکاتی گومڕایی و ڕوو لەهەق وەرگێڕان دا) بێینەوە بۆ سەر ئاینەکەتان، ئەمەش هەر زۆر زۆر دوورەو هەرگیز ناشێت ئێمەی ئیمانداروو خواپەرست ڕێ ی گومڕایی بگرینە بەر و بێینە سەر دینی دەستکردی ئێوە،

---

(١) (لایجرمنکم): (لایکسبنکم) واتە هاندەری تاوانکاری و گوناهکاریتان نەبێت.

(٢) (شقاقي): (معاداتي) واتە بەربەرەکانی کردنتان بەرامبەر بە من.

چونکە خودای پەروەردگارو ئاگاداری کاروبارمان قایل نابێت و لێمان ڕازی نابێت بگەڕێینەوە بۆسەر ڕێچکە پووچەڵەکەتان، هەرخوداش بەزانستی خۆی وبەعیلم و ئاگاداریی خۆی هەموو شوێنێکی تەنیوەو بەسەر هەموو لایەك دا باڵادەستە، ئێمەش داوای لێ دەکەین و لێ ی دەپاڕێینەوە، کە بەڕێبازە ڕاست و هەق خوازی یەکەی خۆی دادوەری لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بکات و هەرخۆیشی دادگەرترینی دادوەرانە).

﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ﴾الأعراف/٨٨-٨٩..

جارێکی تر گەلەکەی دەستیان کردەوە بەهەڕەشەلێکردنی و گوایە ئەگەر لەبەرخاتری هۆزو تیرەو کەس و کاری نەبێت بەردبارانی دەکەن، دیارە-شوعەیب-خاوەنی هیچ هێزو دەسەڵاتێکی واش نەبوو کە بەربەست بێت لەبەردەم کاری کوشتن و بەردباران کردنی‌دا، بەڵکو ئەو خاترو خۆترانەیەش منەتێکی دەسکردی خۆیان بوو. هەر بۆیەش (شوعەیب) بێ پێچ و پەناو بە ورەی بەتینەوە پێیان دەڵێت: (ئاخر ئەی گەلی خۆم ئایا هۆزو تیرەکەم خاتریان زۆرترە، یان خودا زیاتر شایستەی ئەو خاترگرتنەیە کە زۆر بەدەسەڵات ترو بەهێزترە لەهۆزو تیرەو ئەو کۆمەڵەی دوام کەوتوون و کەدەبێت فەرمانەکانیشی پەیڕەوی بکرێت، لەکاتێك دا ئێوە پشت گوێتان خستوون و ڕاسپاردەکانی خوداتان فەرامۆش کردووەو پشتتان لێ هەڵکردوون؟ بەڕاستی خودای پەروەردگارم ئاگادارە لەگشت کردارێکتان و هەموو شتێك دەزانێت و مامەڵە لەگەڵ هەر مرۆڤێك دا بەگوێرەی کارو کردەوەکەی دەکات):

﴿قَالُوا۟ يَٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَٰكَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَهْطِىٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا ۖ إِنَّ رَبِّى بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾هود/٩١-٩٢..

## لەناوچوونی خەڵکی "مەدیەن"

بڕیاری -ئیلاهی- بۆ لەناوچوونی خەڵکی -مەدیەن- دەرچوو، لەئاکامی سەرکێشی‌و یاخی بوونیان لەڕێبازی خودا، بەڵام خودا بەڕەحمەتی خۆی -شوعەیب-و باوەڕدارانی لەو سزا سەختە ڕزگارکرد و بێ‌باوەڕانی تەفروتوونا کرد، ئەویش بەو سزا سەختەی کە چەخماخەو هەورەتریشقە(صاعقة)یەکی توندو بەهێزی بۆ هەڵکردن و لەهەمان کات دا بومەلەرزەیەکی

قایم و بەهێزیشی لەگەڵ دابوو (کە بە هەورە تریشقەو بە بومەلەرزەکەش) وای لێکردن تێکرا هەموویان بەسەردەم و چاویان دا تەخت بن و بکەون و لەناوبچن. ئیدی کۆتایی بەمەسەلەکەیان هات و ئاسەواریشیان نەماو تەنانەت لەئاکام دا وادەزانرا کە هەرگیز لەو خاکەشدا نەژیاون. دەی هەر تەفروتونا بن خەڵکی مەدیەن و هەر دووربن لەڕەحمەت و سۆزی خودا وەك چۆن گەلی (ثەمود)یش پێش خۆیان لەو ڕەحمەتە دووربوون: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَـٰرِهِمْ جَـٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ﴾هود/٩٤-٩٥..

کاتێك -شوعەیب- حاڵی لەناوچوونی ئەو گەلەی خۆی بینی و سەیری کرد چییان بەسەرهاتووە بەدەم خۆبەری کردن لەسستی نەنواندن و درێغی لەگەڵ نەکردنیانەوە گوتی: (ئای گەلی خۆم.. خۆ من بەتەواوی‌و بێ تەم ومژ فەرمانەکانی خوداو پەیامەکەی پەروەردگارتانم پێڕاگەیاندن و گەر ئێوە کارتان پێبکردنایە ئەوا بەختەوەرو شادمان دەبوون، هەروەها زیاد لەڕادەش ئامۆژگاریم کردن، کەچی ئێوە هەرلەسەر چەوتی و گومڕایی مانەوە، ئیدی چۆن خەمتان بۆ بخۆم و چۆن لەپێناوتان دا دڵتەنگ دەبم دوای ئەوەی هەر سوور بوون لەسەر بێباوەڕی‌و یاخی بوون؟!!: ﴿فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَـٰفِرِينَ﴾الأعراف/٩٣..

## گەلی نێو دارستانی چڕ (أصحاب الأيكة)

خودای مەزن دوای ئەوەی خەڵکی -مەدیەن-ی تەفروتونا کردو (شوعەیب) و باوەڕدارەکانی قوتارکرد، (شوعەیب)ی ڕەوانەکرد بۆلای(اصحاب الأيكة) کە گەلێك بوون لە پارچە زەوی یەکی بەپیت دا دەژیان و دارو درەختێکی زۆرو چڕیان هەبوو و ئاوێکی زۆری هەڵقوڵاوی ژێرزەویشیان هەبوو، ناوچەکەشیان لەنزیك شاری -مەدیەن-ەوە بوو و لەم خاکەش دا کۆمەڵە کەسێك لەخەڵکی ی هەبوون لەسەر هەمان ڕێچکەی خەڵکی (مەدیەن) بوون لەبەدکاری و تاوانباری دا.

(شوعەیب) پێی گوتن: (بێگومان من لەخودای پەروەردگاری جیهانییانەوە نێرراوم بۆ ڕێنموونی و ڕێ پیشاندانی ئێوە وبەئەمانەت و دەسپاکی یەوە پەیامی خوداتان پێ دەگەیەنم و ڕێی ڕاستی خوداتان پیشان دەدەم. ئێوەش خۆ بپارێزن لەسزای سەختی خودا و گوێڕایەڵی ی من بکەن بەو شێوازەی فەرمانەکانی خودا پەیڕەو بکەن. هەروەها من لەبەرامبەر ئەم کاری ڕێ پیشاندانەدا هیچ کرێ و پاداشتێکم لەئێوە ناوێت، چونکە پاداشتی من تەنها لەلای خودای

پەروەردگاری جیهانییانە)..

یەكێكی تر لەو ئامۆژگاریانەی (شوعەیب) بۆ ئەو گەلە ئەوە بوو پێی دەگوتن: (بەچاكی و بە ڕێكوپێكی كێشانەو پێوانە بەجێبگەیەنن و بەدادگەریو تەرازووی هەق كاروباری خەڵكی بەڕێوە بەرن و هیچ شتێك لە مافەڕەواكانیان كەم مەكەنەوە، بەدكاری و خراپەش لە زەوی‌دا مەكەن وتیای دا ڕۆمەچن، لەسزای خودا بترسن كە ئێوەی دروست كردووەو كە نەتەوە بەهێزەكانی پێش ئێوەشی دروست كردووە)..

ئەم پەندو ئامۆژگاریانە كاریان نەكردە سەر دڵ و دەروونی ئەو گەلە، بەڵكو لەوەڵامی (شوعەیب)دا گوتیان: (تۆ پێغەمبەر نیت، بەڵكو تەنها یەكێكیت لەو كەسانەی بەر سیحرو جادوو كەوتوون و وات لێ هاتووە بەم جۆرە ورێنە بكەیت و ئەم قسانە هەڵبزڕكێنیت.. تۆ تەنها كەسێكیت وەك ئێمەو لەژیانی بەشەری دا وەك ئێمە مرۆڤیت، جاچۆن خۆت لە ئێمەی مرۆڤ بەو پەیامە جوێ دەكەیەوە؟ هەر بۆیە ئێمە بەدرۆزنێكت دادەنێین لەپڕوپاگاندەو ئیدیعاكانت داو، بەڕاستگۆت دانانێین لەو مەسەلانەدا كە بانگمان دەكەیت بۆلایان. خۆئەگەر بانگەوازكارێكی ڕاستەقینەو بێ‌گرێ و گۆڵ بیت لەو پەیامەدا كە بانگەوازی ئێمەی بۆ دەكەیت ئەوا لەخودای خۆت داوا بكە لەئاسمانەوە سزایەكمان بۆ بنێریتە خوارەوە)..

(شوعەیب) لە وەڵامیان دا گوتی: (خودای پەروەردگارم هەرخۆی زانا و ئاگادارە لەو بەدكاری و سەرپێچی یانەتان و هەرخۆیشی دەزانێت شایستەی چ سزایەكن كە لەكاتی دیاریكراوی خۆی دا بۆتان بنێرێتە خوارەوە)..

دیارە ئەو گەلە بەردەوام بوون لە بەدرۆخستنەوەی (شوعەیب) و باوەڕ پێنەهێنانیو بەدكاری دا، لەبەرامبەر ئەوەش خودا گەرمایەكی توندو تیژی بەسەردا هێنان كە هەناسەیان تەنگ بوو و تووشی تەنگەنەفەسی‌یەكی ئەتۆ بوون وایان لێ هات ڕاكەن و دەربچن بۆ دەشت ودەر تاكو هەناسە بدەن و هەوایەكی باش و فێنك هەڵمژن، لەوێش هەورێك باڵی بەسەردا كێشان و مژدەی خێرو خۆشییان لێ چاوەڕوان دەكرد و خێرا هەموویان لەژێری دا كۆبوونەوە تاكو لەبەر سێبەرەكەی دا بحەوێنەوە، بەڵام هەورەكە چەند بروسكەو چەخماخەیەكی توندی تێ‌گرتن و لەناوی بردن، ئەو ڕۆژەش ڕۆژێكی بەسام و پڕ لەسزای سەخت و پڕ لە ترس و بیمی زۆر بوو...

﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ [1] ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ

(١) (الأيكة)یان( الأيك) مانای دارودرەختی زۆرو دارستانی چڕ دەگەیەنێت كە لق وپۆیان تێكەڵی یەكتر بوونبێت، ئەم وشەیە كۆ(جمع)ی(تكسير)ەو تاك (مفرد)ەكەی (أيكة) یە.

﴿١٧٨﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٨٠﴾ أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ[1] ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ[2] الْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَا أَنْتَ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا وَإِنْ نَظُنُّكَ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا[3] مِنَ السَّمَاءِ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾الشعراء/١٧٦-١٩١..

(١) (المخسرين): واتە ئەوانەی لەکێشانەوپێوانە دەدزن و کەمی دەکەنەوەو بەتەواوی شتەکە ناکێشن.

(٢) (الجبلة): واتە خەڵك و گەلانی پێش ئێوە.

(٣) كسفا: واتە چەند بەشێك لەسزا.

# بەندی دووەم

## (( چەند پەندو وانەیەك ))

( بنەماکانی چاکسازی - کاریگەری نوێژ - هاندان لەسەر دەسپاکی )

## بنەماکانی چاکسازی

لەبەسەرهاتەکەی "شعیب"دا قورئانی پیرۆز ئەو شێوازە جوان و دروستەمان بۆ دەردەخات کە پێویستە مرۆڤی چاکەخوازو چاکساز بیگرێتە بەر تاکو کاریگەریەکی بەتەوژمی هەبێت لەچاکەکردن وڕاست کردنەوەی کۆمەڵگەکەی دا. خودای مەزن لەزاری (شعیب)ەوە دەگێڕێتەوەو دەفەمونێت: ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾.. نەختێك هەڵوێستە بکە لە ئاست ئەم فەرمایشتەی خودا: ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ﴾ کە لەسەر زاری (شعیب)ەوە هێناویەتیەو ئەویش لەم وتەیەدا ئەوە بۆ گەلەکەی دووپات دەکاتەوە کە هەمان ڕەفتارو هەڵس و کەوتی ئەوان نانوێنن لەکاتێك دا داوای نەهێشتنی دەکات لێ یان.

لێرەدا وانەیەکی بۆ مرۆڤی ڕاست کەرەوەو چاکەخواز تێدایە دەربارەی ئەوەی دەبێت زۆر بەوردی و هوشیاری یەوە ئاگاداری هەر گفتارو ڕەفتارێکی خۆی بێت و گفتاری بە ڕەفتاریەوە ببەستێت و پێچەوانەی یەکتر نەبن. چونکە ڕەفتارو هەڵسوکەوت کاریگەریی زیاتریان لەقسەی ڕووت و سەرزارەکی هەیە، هەر وتارو حیکمەت و پەندو ئامۆژگاری یەکی کاریگەریش کە عەقڵی خەڵکی و هەست و نەستیان بەکێش دەکات ئاسەواری گەورەو کارایی یەکی ئەوتۆیان لەدڵ و دەروونی گوێبیستانی دا نابێت گەر ئەو خەتیب و وتاربێژو بانگەوازکارە خۆی یەکەمین کەسی پەیڕەوکاریان نەبێت و کار بە ڕێساکانی نەکات و یەکەم فەرمانکاریان بەچاکەو ڕێ لەخراپەگریان نەبێت، هەر بۆیەش خودا سەرزەنشتی گەلێك دەکات لەسەر ئەوەی لەکاتێك دا فەرمان بەخەڵکی دەکەن بۆ چاکەکردن، کەچی خۆیان بەو فەرمانەوە پابەند نابن، هەروەك فەرموویەتی: ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ﴾البقرة/٤٤..

لەبەشی دووەمی ئایەتەکەدا لەزاری (شوعەیب)ەوە ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ﴾ خواستی -شوعەیب- بەدی دەکرێت لەچاکسازیو ئیصلاح دا کە تاکە خواستێکە تەنها لەبەرخاتری خوای گەورەیەو دوورە لەهەر نیازێکی ماددی یان بەرژەوەندییەکی تایبەتیو شەخصی. ئامانجەکانی پێغەمبەران لە هەموو قۆناغەکانی مێژوودا ئاوا بووە، هەر ئەمەش ئامڕازی بەدەست هێنانی سەرکەوتن بووەو هەر ئەمەش ئەو ڕێگا ڕاست و دروستەیە کە دەبێت مرۆڤی چاکەخوازو بانگەوازکاری (چاکسازی) بیگرێتە بەر بۆ گەیشتن بەسەرکەوتن و بۆ هەڵبژاردن و بەجێگەیاندنی چەندین بەها و بنەمای جوان و باڵا لەوانەی باوەڕی پێیانە. جا بێگومان هەر مرۆڤی چاکەخوازی ڕاستگۆو دابڕاو لە هەر نیازو ئارەزوویەکی نەفسە، کە لەئەنجام دا سەرکەوتووە. بەڵام نیازو ئارەزووە تایبەتی یەکان زۆرجار هەر خۆیان پەردە لەسەر ڕووی خاوەنەکانیان لادەدەن و شکست دێنن و دەگۆڕێن و دوایش ڕەنجەڕۆیی و خەسارەتمەندی یان تووش دەبێت.

ئیدی چۆن حەقیقەت سەرناکەوێت لەکاتێك دا هەر خودای (خالقی گەردوون) و (بەڕێوەبەری ئاسمانەکان و زەوی) داڕێژەری بووەو هەر حەقیقەتیشە کەئایەتەکە لەکۆتایی ی دا ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾.

## کاریگەریی نوێژ

هەروەها لەبەسەرهاتەکەی (شوعەیب)دا ئاسەواری نوێژ لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤ دیاری کراوە، وەك چۆن گەلەکەی (شوعەیب) هۆی بانگەوازەکەی ئەو پێغەمبەرەیان بۆ نوێژەکانی دەگێڕایەوە: ﴿ قَالُوا۟ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُا۟﴾.

بێگومان گەلەکەی(شوعەیب) تێبینی کاریگەریی ی نوێژیان لەسەر(شوعەیب)و شوێنکەوتوانی کردبوو کە چۆن ئەو نوێژەیان بارودۆخی بۆ گۆڕیبوون و لەپەرستنی غەیری خودا ڕزگاری کردبوون بۆپەرستنی خوداو لەفرۆفێڵی سەوداو مامەڵەی کێشانەو پێوانەش دووری خستبوونەوەو بۆدەسپاکی و دادگەری، هەربۆیەش بەلووت بەرزی و پلارو بالۆرەگوتنەوە ئەم قسەیەیان پێگوتن:(ئەرێ ئەوە نوێژەکەتان داواتان لێ دەکات واز لەپەرستراوەکانی خۆمان و باوو باپیرانمان بێنین؟)چونکە لەهزری خۆیان دا بڕیاریان وایە کە نایانەوێت ئەو حاڵەتەی خۆیان بگۆڕن..

بەڵێ بێگومان نوێژ باری دەروونی و نەفسی ی شوێنکەوتوانی(شوعەیب)ی گۆڕیبوو،

چونکە نوێژکردن و پەیوەندی بەخواوە بەستن (صلاة) بۆ مەبەستی دروست کردنی ویژدانێکی پاك و بێگەردە لەنێو مرۆڤ دا، ئەم ویژدانە خاوێنەش هەست و نەستی پارێزکاری (تقوی)و چاودێری (مراقبة)ی نەفس لەمرۆڤدا دەبزوێنێت و بەردەوام ڕۆژی دادگاییو لێپرسینەوەی بیردەخاتەوە، ئەو ڕۆژەی کەخودای مەزن لەبارەیەوە فەرموویە: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا﴾آل عمران/٣٠.. واتە: (ڕۆژی لێپرسینەوەو قیامەت ئەو ڕۆژەیە هەموو مرۆڤێك دەزانێت چیکردووەو چ جۆرە مەحکەمەو سزایەکی بۆ ئامادەکراوە؟ ئەویش بەهۆی ئەو نامەو پەڕاوی کردەوانەیەتی، کە پیشانی دەدرێت و کە هەموو خراپەو بەدڕەفتاری یەکانی تیادا نوسراوە، ئیدی لەو کاتەدا حەزدەکات لەنێوان ئەو ڕۆژەو خۆی دا ماوەیەکی زۆر دوور هەبێت و هەرگیز پێی نەگات)...

لەبەر ئەمە نوێژ بەربەستی گوناه و بەدکاری یەو ڕێگری کاری ناشیرین و ناپەسندە، نوێژ مرۆڤ لەم جیهانە پڕ لەشەپۆلی فیتنەو گوناهەوە ڕزگار دەکات و دەیگەیەنێتە ئاسۆی فراوانی ڕەحمەتی خوداو هەواری پان و بەرینی دڵنیایی. لەم ڕووەشەوە قورئان بەم فەرمایشتەی خودا کاریگەریی نوێژی دیاری کردووە: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾العنكبوت/٤٥.. واتە: بێگومان نوێژ بەرگری دەکاو ڕێ نادات (بەکاری نابەجێی وەها کە دەگاتە ڕادەی زیناو شەڕوال پیسی) و کاری نابەجێی وەهاش کە (هیچ یاساو داب و نەریت و عەقڵێکی ساغی بەشەری ڕێی پێنادەن وەك کوشتن و تێکدان و ئاشووب نانەوە)..

جا داخۆ لەڕۆژگارێکی وەك ئەمڕۆشدا کۆمەڵگەی بەشەری چەند ئاتاجی بەو نوێژە ڕاست و دروستە هەبێت کە مرۆڤ لەخودای خۆی نزیك دەکاتەوەو لەژێر چنگی هەموو پەرستراوێکی پووچەڵ و بەتاڵ و لەژێر چەپۆکی هەموو دەسەڵاتێکی ستەمکار ڕزگاری دەکات و پاشان لەهەموو بەدکارییو فەسادێکیش دەیپارێزێت کە تەشەنەی سەندووەو چارەسەرکردنی ئاڵۆز بووە.

## هاندان لەسەر دەسپاکی

هەر لەو ئامۆژگاری یانەی لەچیرۆکەکەی-شوعەیب-دا بەدیی دەکەین بانگکردنی گەلەکەیەتی بۆ دەسپاکی و پاراستنی سپاردە (أمانة) و دادگەری لە کڕین و فرۆشتن و وازهێنان لەگزیو تەرازووبازی و کەم کردنەوەی سەنگی کەل وپەلی فرۆشراوو، دەست هەڵگرتن لەخراپەو شێواندن لەسەر زەوی. چونکە ئەو تەرازووبازی و خراپەکاری یانە دەبنە هۆی ڕق و تووڕەیی خودای تۆڵەسێن و خۆخستنە بەر سزای توندوتیژی، وەك چۆن خودا سزایەکی توندی بۆ گەلەکەی -شوعەیب- ناردو بەهۆی بەدکاری خۆیانەوە تەفروتونای کردن. دیارە هەمیشە

(شوعەیب) گەلەکەی وریا دەکردەوە لەو کارە ناهەموارانە، هەروەك خوداش لەسەرزاری ئەو پێغەمبەرەیەوە لەفەرمایشتەکەی دا ئاگاداریان دەکاتەوە.. ﴿..تَنقُصُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ [١] إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾هود/٨٣-٨٥.

ئەوەی شایانی باسیشە زۆربەی دەوڵەتە پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆ زۆر سوورن لەسەر ڕاگرتنی کێشانەو چاودێری ی سەنگەکان و سزادانی یاری پێکارانی بەسەختی.. ئایینی ئیسلامیش هەمیشە لەدانانی ڕێساو سیستمە پێویست و شیاوەکانی کۆمەڵگەی بەشەریدا دەسپێشکارو پێشەنگی هەموو یاسایەکی دی بووە، سەرەڕای ئەمەش ئیسلام هەر بەوەندە وازی نەهێناوە، بەڵکو بەرزترین بەهاو شکۆی بەکاروباری سەوداو ئاڵوێریی نێوان خەڵکی داوەو داواشی لێ کردوون بەچاوی سووك سەیری کەلوپەلی یەکترنەکەن و بەناڕەوا لەنرخ وسەنگی‌کەمنەکەنەوە..

﴿وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ﴾. وشەی (أشياء) لێرەدا هەموو جۆرە هەست و نەستێکی بەکارهاتووی نێو گشت مامەڵەیەکی خۆیەخۆی خەڵکی دەگرێتەوەو هەموو شتێکیش دەگرێتەوە لەو شتانەی بۆ کێشانەو پێوانە بەکاردێن، هەروەك چەمك و واتا مەعنەوی‌یەکانی ڕێزگرتنی خەڵکی و ڕێزلێنانیشان دەگرێتەوە بەپێی ڕۆڵ و بەخشش و ئەو قوربانی‌یانەی خۆیان لەکۆمەڵدا. پاشان دانانی هەر کەسێکیش لەو پلەیەدا کە شایستەیەتی بەگوێرەی پسپۆڕی‌و وزەو توانازانستی یەکانی.

﴿وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ﴾ ڕاسپاردەیەکە لەخوداوە کە خێرو بەرەکەت لەهەموو لایەکەوە کۆدەکاتەوەو لەبۆتەی پەندو وانە بەرزەکانیش دایە. چەند پێویستیشە ئەمڕۆ هەموومان هەمیشە ئەم پەندە بەرزە بلێینەوەو بەپێی ئاڕاستەو ڕێنمایی یەکانی بجووڵێینەوە تاکو بەرووبوومی شیرینی دەسکەوت و چاکسازی یەکانی کۆمەڵی لێ بچنینەوەو هەموو ئەو بەرهەمانەی لێوە دەست خەین کەلەناخی خۆی دا بۆی هەڵگرتووین.

---

(١) هەروەها لەنموونەکانی فێڵ وگزی بازی لەتەرازووداو لەکڕین وفرۆشتن دا ئەوەیە ئەمڕۆ هەندێك سەوزەفرۆش و دووکاندار لەسەرروو سندووقەکانی میوەو سەوزەیانەوە میوە ساغ و جوانەکانیان داناوەو لەژێریشیانەوە ئەو میوەو سەوزە رزیوو شێواوانەیان داناوە کەکەس نایەوێت تاکو کڕیارەکانیان چەواشە بکەن، جا زۆر پێویستە دەسەڵاتداران و حکومەتی هەر وڵات و ناوچەیەك بەدەستێکی بەهێزو ئاسنین لەو کەسانە بدەن و ئەو فروفێڵ و تەرازووبازی یانەشیان بنبڕ بکەن کە تەشەنە دەسێنێت و داب و نەریتێکی تەقلیدییش دادەهێنێت و ئابڕووی وڵاتەکەش دەڕووشێنێت، جگە لە وورووژاندنی خەشم و قینی خودای بالادەست لەخۆیان.

# بەندی سێ یەم

## ((چیرۆکی ئەیـوب))

(مەینەتی ی "ئەیـوب" - "ئەیـوب" لەقورئان دا - سوێندەکەی "ئەیـوب")

## مەینەتیی "ئەیـوب"

"ئەیـوب"[1] لەو پێغەمبەرانەیە کە قورئان ئاماژەی بۆ پێغەمبەرێتیان کردووە، هەروەك خودا لە ڕوو کردنە گفتاری دا بۆ محمد ﷺ باسی کردووەو فەرموویە:

﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ ..﴾النساء/١٦٣.

"ئەیـوب" زۆر پارێزکارو بە تەقوا بووەو بـەڕەحم و بەسـۆزبووە بـۆ هـەژاران و، خـەمخۆرو لەخۆگری بێوەژنان و هەتیوان بووەو، ڕێـزی زۆری لـەمیوان دەگـرت و بـانگی گەلەکەشـی بـۆ پەرستنی خودای تاك و تـەنیا دەکـرد. زانایـانی "تەفـسیر" و "مێـژوو" وای دەگێڕنـەوە کـە "ئەیـوب"خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆر بووە لەهەموو چەشن و جۆرێك لەنیعمـەت و بەنـدەو کەنیزەو لەئاژەڵ و مەڕومالات و لەزەوی و زاری فراوان، کە لەخاکی (بثینة)ی ناوچەی (حوران) بووە. جگە لەمانەش خاوەنی کوڕو نەوەو کەس و کارێکی زۆرو بنەماڵەیەکی گەورەش بـووە.. لەناکاودا هەموو ئەم نیعمەت و ماڵ سامان و کوڕو کەس و کارانەی لێ دەستێنرێتەوەو لەش و لاریشی تووشی چەندین جۆرە دەردو بەلا دەبێت. هیچ ئەندامێکی ساغ لەجەستەی دا نامێنێت تەنها دڵی و زمانی نەبێت کـە زیکـرو یـادی خـودای گـەورەی پێبکـات، بێگومـان ئـەویش لەهەموو ئەو بەلاو میحنەتانەی دا بەئارام و خۆڕاگر بوو و باوەڕی بەپاداشـتی ئـەو خـۆڕاگری

---

(١) "ئەیـوب" لەوەچەی "ابراهیم"ـە (سلاوی خودای لەسەربێت)، دایکیشی (کچی لـوط ـ سلاوی خودای لێبێت، هاوسەریشی ناوی (لیا) بووە کە کچی(یەعقوب) بووەو گوتراویشە ناوی(ڕەحمـە)ی کـچی (ئیفـرائیم) بووە، هەروەها گوتراوە (مەنشا-ی کچی -یوسف-ی کوڕی یەعقوب) هاوسەری بووە. (ابن جریـر-ی طـبري-یش) وای دیاری کردووە کەوا "ئەیـوب" کاتێك کۆچی دوایی کردووە تەمەنی نەوەدو سێ (٩٣) سـاڵ بـووە، گوتراوە کە لەوەش زیاتر ژیاوە. (ابن عـباس) لەم بارەیەوە گووتویـە: (بۆیـە بـە "ئەیـوب" نـاوبراوە چـونکە لەهەموو حاڵەت و بارودۆخێك دا هەر بۆ لای خودا گەڕاوەتەوەو هەر پەنای بەخودا گرتووە).

یەی هەبوو...شەوو ڕۆژ لەیادی خودادا بوو و ئێوارەو بەیانی بۆساتێك خودای لەبیر نەدەکرد...
نەخۆشی یەکەشی بەجۆرێکی وا پەرەی سەند کە هیچ کەسێك نەیدەتوانی لەلای دانیشێت. بەڵکو وەك لە ریوایەتێکی مێژوویی دا هاتووە هەموان لێ ی دوورکەوتنەوە و تاکە هاونشینێك و هاوخەمێکی نەما. تەنانەت لەشارەکەی خۆی برایە دەرەوەو لەسەرەنوێلکەیەکی دەرەوەی شار فڕێ دراو خەڵکیشی لێ دابڕاو، کەسێك نەمابوو تا سۆزێکی بۆ بنوێنێت، تەنها هاوسەرەکەی خۆی نەبێت کە هەردەم چاودێری دەکردو بایەخی تەواوی پێ دەداو، چاکەو لەخۆبوردوویی و سۆزی لەوەوبەری "ئەیوب"ی مێردی لەیاد نەکردبوو و، بەوپەڕی ڕێزو پێزانینەوە لەخزمەتی دابوو. هەروەها بەردەوام هات و چۆی دەکردو فەرامۆشی نەدەکردو کاروباری بۆ ڕادەپەڕاندو یارمەتی ی دەدا لەسەر بەجێگەیاندنی پێویستییەکانیو بەپێ ی بەرژەوەندیی ئەو دەجولایەوە، لەگەڵ ئەوەش دا ئەم هاوسەرەی "ئەیوب" لەحاڵێکی هەژاریو کەم دەرامەتی دابوو و بۆ چارەسەری ئەم گرفتەش پەنای دەبردە بەر ئیش کردن و خزمەتکاریی خەڵکی بەکرێ، تاکو خۆراك بۆ مێردە نەخۆش و پەککەوتەکەی پەیداکات و بارە قورس و گرانەکانی لەئەستۆ بگرێت، بێگومان ئەم ژنەشی (وەك خۆی) بەئارام و خۆڕاگر بووە لەسەر ئەو کارەساتی لەدەست چوونی ماڵ و کوڕو نەوەیەو لەسەر ئەو هەموو دەردو پەتایەش کە تووشی مێردەکەی بووبوو، جگە لەدەسکورتیو نەبوونیو خزمەتکارییش بۆ خەڵکی لەدوای ئەو هەموو نیعمەت و بەختیاری یەی پێشوویان.

هەموو ئەم دەردو نەبوونی و مەینەتی یانەش ورەو خۆڕاگریی پتری بۆ "ئەیوب" زیاد کردو بە(احتساب) و باوەڕو قەناعەت بەپاداشتی مەینەتی یەوە خۆی ڕادەگرت و سوپاس و شوکرانەبژێریی خودای دەکرد، تەنانەت بەشێوەیەك خۆی ڕاگرتووە کە هەمیشە نموونە لەسەر خۆڕاگری یەکەی لەهەر مەسەلەو کاروبارێکی لەو جۆرانەدا دەهێنرێتەوە. هەروەها نموونەی لەسەر هەموو ئەو بەڵاو میحنەتە هەمەچەشنانەی پێ دەهێنرێتەوە. [1]

دەربارەی ماوەی مەینەتییەکەشی، زانایان وتەو بیروڕای لێك جودایان هەیە، هەندێکیان دەڵێن(٣٠) سی ساڵ لەو مەینەتی یەدا بووە، هەندێکیشیان دەڵێن(حەوت ساڵ و چەند مانگێك بووە)، هەندێکی دیکەشیان دەڵێن (هەژدە ساڵ لەو مەینەتی یەدا بووە).

دەربارەی بەسەرهاتیشی ئەوە گێڕراوەتەوە کە هاوسەرەکەی پێ ی گوتووە: (ئەی "ئەیوب" گەر لەخودای خۆت بپاڕێیتەوە ئەوا ڕزگارت دەکات لەم بەڵایانە).. ئەویش لەوەڵامیدا گوتوویەتی: (من حەفتا ساڵ بەساغ و سەلامەتی ژیاوم و ئەگەر حەفتا ساڵی دیکە دوای ئەمە بەنەخۆشی و ناڕەحەتی بژیم ئەوا هەر کەمە بۆ خۆڕاگرتنم تیای دا).

---

(١) البداية والنهاية لأبن كثير، ج١.

هەر لەبارەی ئەو حاڵەتەیەوە گێڕراوەتەوە کە هەر جارێك ئازارێك یان بەڵایەکی نوێ ڕووی تێ‌کردبێت گوتوویەتی: (خودایە تۆ خۆت لێت سەندوومەوەو خۆت پێت بەخشیوم).

هەروەها مێژوونووسەکان چەندەها ڕووداوو داستانیان لە"ئەیوب" گێڕاوەتەوەو لەم ڕووە سوودیان لە(کتێبی ئەیوب-سفر ایوب) وەرگرتووە یان لە(تەفسیری یەهوود بۆ تەورات کە بە(هجادة)ناودەبرێت و ئەم سەرچاوانەش جێی پشت پێ بەستن و متمانەی زانایانی ئیسلام نین، چونکە چەندین شتی نابەجێ و ناڕاستیان تێکەڵکراوەو چەندەها ڕووداوی هەڵبەستراویشی تێ ئاخنراوە.

هەندێك لەڕاڤەکاران (مفسرون)ی قورئانیش ڕەخنەیان گرتووە لەو مێژوونووسانەی کە جۆری ئەو دەردو بەڵایانەی "ئەیوب"یان دیاری کردووە. لەم بارەیەوە مامۆستا(احمد المراغی) لەتەفسیرەکەی دا دەڵێت: (هەرچی گێڕراوەتەوە لەڕادەو ئەندازەی ئەو مەینەتی یەی تووشی- ئەیوب- بووە کە گوایە گەیشتبێتە ڕادەی ئەوەی خەڵکی لێ ی دوورکەونەوەو، خۆیانی لێ بپارێزن و، لەپلەو پایەو شکۆی پێغەمبەرێتیان دابەزاندبێت و بردبێتیان بۆ دەرەوەی شارو، لەسەر نوێلکە فڕێ یان دابێت و، ئیتر جگە لەهاوسەرەکەی خۆی کەسی دی سەردانی نە کردبێت و هەر ئەویش خۆراك و کەرەسەی پێویستی بۆ بردبێت، هەموو ئەم قسەو باسانە لەو هەواڵە درۆو دەلەسە هۆنراوانەی جوولەکەکانە، کە بە(اسرائیلیات) ناودەبرێت و کەجێی هیچ بڕوا پێکردن و متمانە پێ‌بوونێك نین، چونکە هیچ بەڵگەیەکی پشت پی بەستراوی بە هێزیان نی یە کەڕاستی یەکەی بسەلمێنێت، هەروەها، چونکە یەکێك لەمەرجەکانی پێغەمبەرێتی ئەوەیە نابێت پێغەمبەرەکە ئەو جۆرە نەخۆشی‌و دەردانەی هەبێت، کەدەبنە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵکی لەدەوری، لەبەر ئەوەی هەر کاتێك حاڵ وتەندروستی ی ئاوابێت ناتوانێت پەیوەندی بەخەڵکەوە بکات و ڕێساو حوکمەکانی خودایان پێ بگەیەنێت). [1]

## "ئەیوب" لەقورئان دا

قورئانی پیرۆز بەگوێرەی پێویست باسی نەخۆشی یەکەی "ئەیوب" ی کردووەو ئاماژەی بۆ شێوازی لەخواپاڕانەوەکەشی کردووە کە چۆن لەلای خودا نزای کردووەو پاشان خوداش نزاکەی گیراکردووەو چارەی نەخۆشی یەکەی کردووەو شیفای پێ‌بەخشیوەو ڕۆڵەو کەس و کارەکانیشی بۆ گێڕاوەتەوە، لەم بارەیەوە خودای مەزن فەرموویە:

﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ[2] وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ

(١) تفسير المراغي، للأستاذ احمد مصطفى المراغي.

(٢) (الضُّرّ): بە(ضَمَّةُ) بەدەردو نارەحەتی ی نێودەروون و هەربارگرانی یەکی هاوشێوەیان دەگوترێت.

﴿فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ[1] رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ﴾الأنبياء/٨٣-٨٤..

هەروەها خودا فەرموویە: ﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ[2] وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا[3] فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًاۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ[4]﴾ص/٤١-٤٤..

لەم ئایەتانەی سوورەتی (ص)دا خودا ئاماژە بۆ بەسەرهاتی "ئەیوب" دەکات و لەزمانی ئەویشەوە بەمەبەستی لە﴿أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ﴾ ئەو وەسوەسەو خورپە ساتەوەختی یانەیە کە لەکاتی نەخۆشی یەکەی دا بەدڵی دا ڕەت بوون و پەنای بەخودا گرتووە لە (قورسی ی ئەو بەڵاو مەینەتی یە)و، لە (بێ ئومێدی لەڕەحمەتی خودا)و لە (وەڕس بوون لە ژان و ئازاری نەخۆشی) کە ئەمانە هەمووی چەند وەسوەسەیەکن بەدڵی مرۆڤ دا ڕەت دەبن لەکاتی ئازارو نەخۆشی دا، هەربۆیەش لەبەرامبەر ئەمانەدا پەنای بەخودا گرتووە کە لەوانە بیپارێزێت و بەدووری کات، سا ئیتر بەهۆی لابردنی بەڵاو مەینەتی یەکانیەوە بێت یان بەئاسان کردنی هۆیەکانی لابردن و دەرکردنی ئەو وەسوەسەو خورپە لەناکاوانە بەسەبرو ئارامی یەکی جوانەوە.

بۆ چونیەتی و شێوازی چاك بوونەوەو شیفا وەرگرتنیشی، خودا بەم شێوەیە ڕێنموونیی کردووەو، پێی فەرمووە: ﴿ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾. واتە: (ئەی ئەیوب بەقاچت لەزەوی بدەو پێت بکێشە بەزەوی داو ئەوەی خودا فەرمانی پێکردوویت جێبەجێی کە)، ئەوەبوو هەرکە پێی دا بەزەوی دا خودا کانیاوێکی ساردی بۆ هەڵقوڵاندو فەرمانی پێ کرد لەو ئاوە خۆی بشوات و لێ ی بخواتەوە، "ئەیوب" ئەو فەرمانانەی بەجێگەیاندو خوداش بەو

---

(١) (وآتيناه أهله ومثلهم معهم): گوتراوە کەوا کەس و کارو خانەوادەی"ئەیوب" هەموویان لە ناکاودا مردوون تەنها هاوسەرەکەی نەبێت، دوایی خودا زیندووی کردوونەوەو هێندەی ئەوانی تریش کوڕو کەسوکاری تری پێبەخشیوە. گوتراویشە خودا پاداشتی لەسەر نەمانی ئەو کەس و کارەی بەچەند ڕۆڵەیەکی دی داوەتەوەو لەدنیادا لەجیاتی ئەوان چەند منداڵێکی دیکەی پێبەخشیوە.

(٢) (بنصبٍ): واتە بەماندوێتی وگرانی.

(٣) (ضغثا): واتە دەسکێك گیای وشك یان دەسکێك ڕەیحانە.

(٤) (أوّاب): (واتە زۆرپەنا دەباتە بەرخوداو بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە)، بێگومان خودای مەزن بەفەرمایشتی(نعم العبد)ستایشی"ئەیوب"ی کردووە، چونکە سیفەتی (أوّاب)ی داوەتە پاڵ، ئەم ستایشە هەر مرۆڤێکی خاوەن باوەڕی وەهاش دەگرێتەوە کە بەشێوەیەکی زۆر پەنا بەخودا بگرێت وبۆلای خودا بگەڕێتەوە.

هۆیەوە هەموو ئازارو نەخۆشی یەکی لەسەر لابرد لەو نەخۆشـی یانـەی کـە دەرەوەو نـاوەوەی جەستەی تەنیبوو.

مامۆستا (المراغی) لەتەفسیرەکەیدا دەڵێـت: (لـەم ئایەتـەدا ئاماژەیـەك بـۆ جـۆری ئـەو نەخۆشـی یـەی کـراوە کـە لەنەخۆشـی یـەکانی پێـست (الأمـراض الجلديـة) بـووە، وەك نەخۆشییەکانی ئەکزیما و گەڕیو گولی وپێست ئاوسان و...هتد، نەك نەخۆشی یەکی نـاوەکی بووبێت وەك نەخۆشی یەکانی گەدەو گورچیلەو سـی و.. هتـد، دیـارە ئـەو نەخۆشـی یانـەی پێستیش لەش ماندوو دەکەن و توندترین ئازاریشی دەدەن، بەڵام نەخۆشی ی کوشندە نین.

هەر لەو ئایەتەدا ئاماژەو پێناسەیەك هەیە بۆ جۆری ئەو ئاوەی لـەژێر پێیـەوە هـەڵقوڵاوە کەلە ئاوێکی کبریتی بووەو سوودێکی زۆرو شیفابەخشی بۆ ئەم جـۆرە نەخۆشـی یانـە هەیـە. پاشان هەروەك لەفەرمانی بەکاربردنی ئاوەکەدا هـاتووە باسـی لیّ خواردنەوەشـی کـراوە، وەك چۆن ئەمڕۆش چەندان جۆر لەم کانیاوانە لەئـەوروپاو لـە(میـسر) و وڵاتـانی دیکـەدا هەیـە و گەرماو(حەمام)یان لیّ دروست کراوەو چـەندەها زسـتانەهەوار (مـشتی) و نەخۆشـخانەی بـۆ نەخۆشی یەکانی پێست و نەخۆشی یە ناوەکی(باطني)یەکانیشیان لیّ بنیات نراوە.

## سوێندەکەی "ئەیـوب"

جارێکیان "ئەیـوب" لەماوەی نەخۆشی یەکەی دا سوێندێك دەخوات لەسـەر ئـەوەی گـەر لەنەخۆشی یەکەی چاك بووەوە سەد قامچی لەهاوسـەرەکەی بـدات، لەبـەر ئـەوەی جارێکیـان لەهەندێك ئەرکی سەرشانی دا سستی ی نواندبوو، بەڵام دوای چاك بوونەوەی دڵی نەرم دەبێت، چونکە ژنەکەی بەچاکی خزمەتی کردبوو و سستی یەکەیشی هێندە نەبوو، خوداش سوێندەکەی "ئەیـوب"ی بەسووك ترین سزای هاوچەشن بۆ بردەسەر، ئـەویش بـەو جـۆرەی داوای لیّ کـرد دەسکێك لەگژوگیای وشك یان دەسکێك ڕەیحانە بەدەستەوە بگرێـت و بەیـەك جـار لەژنەکـەی بدات، ئەمە لەڕادەی ئەو سەد قامچی یەدا بووەو بەم هۆیەش سـوێندەکەی بردۆتـە سـەر بـیّ ئەوەی ئازاری هاوسەرەکەی بدات، ئەم شێوازی سوێند بردنەسەرە دەربازێکی بیّ وەیە بـۆ هـەر کەسێك لـەخوا بترسـێت و بەتـەقوابێت و گوێڕایـەڵی ی فەرمانـەکانی خـودای خـۆی بکـات، بەتایبەتیش لە هەڵسوکەوتێکی لەم چەشنەی سوێند بردنەسەر دا دەرهـەق بـەو هاوسـەرە بـە ئارام و ڕاستگۆو هاوزام و چاکەخوازەی...

هەربۆیەش خـودا بـە"ئەیـوب"ی فـەرموو: ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ﴾... (ئەی "ئەیـوب" دەسکێکی بچووك لەگژوگیای وشك -یان ڕەیحانە- بەدەستەوە بگـرەو بەیـەك جار لەژنەکەتی پیّبدە و سوێندەکەت مەشکێنە)...

# بەندی چوارەم

## (( چەند وانەیەك لە "ئەیـوب"ەوە...))

( خۆڕاگرتن لەسەر میەینەتی- پەنابردنە بەر خودا- تیمارکردن- نەرمی لەگەڵ هاوسەردا )

## خۆڕاگرتن لەسەر مەینەتیی

لەداستانی "ئەیـوب" وئـەو میحنەتـەی تووشـی بـووەو ئـەو شـێوازی لەخواپاڕانـەوەو داواکردنی چاك بوونەوەیەیەو، ئەو نیعمەتـەی خـوداش لـە هـەڵگرتنی بـەڵاو چـاك بوونـەوەی لەنەخۆشی ی دوای ئەو ماوەیەو پاشان لەو بەخـشش و نیعمەتـە چـەندان هێنـدە پیَدراوانـەی دوای چاك بوونەوەشی دا، لەهەموو ئەمانەدا چەندین دەرس و وانە بۆ بـاوەڕداران هەیـە تـاکو "ئەیـوب" بکەن بەپێشەنگ(قدوة)ی خۆیان لەهەر بەڵاو ناڕەحەتی یەك دا کە تووشیان ببێـت، چونکە پێغەمبەرانیش لەبەڵاو میحنەت بێبەش نەبوون، تەنانـەت هـەر پێغەمبـەران تووشـی سەخت ترین بەڵاو کارەسات هاتوون، پاشان جۆرەکـانی دی لەخـەڵکی، هـەروەك پێغەمبـەری خوداش -محمـدﷺ- فەرموویـە ((**أشد الناس بلاء: الأنبياء، ثم الصالحون، ثم الأمثل ثم المثل، يبتلي الرجل على حسب دينه، فأن كان في دينه صلابة زيد في بلائـــه**))[1].. واتـە (لـەنێو خەڵکی دا پێغەمبەران بەپلەی یەکەم تووشی توندترین بەڵاو کارەسات بـوون، دوای ئـەمانیش پیاوچاکان، پاشان چاکتران و چاکتران، مرۆڤیش بەگوێرەی ئاین و ڕادەی دینداری یەکەی تـاقی دەکرێتەوە، هەتا ڕادەو پلەی دینداری و ئیمانەکەی زیاترو بەهێزتربێت، ئەوا بـەڵاو ناڕەحـەتی یەکانیشی زیاتر دەبن)..

لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کەبـەڵاو کارەسـات مانـای نەگبـەتی و بەدبـەختی ناگەیەنێت، چونکە چ (بەختیاری) وچ (بەدبەختی)یش لەم دنیایـەدا پەیوەسـت نـین بـەکردەوە چاکەکان، یان خراپەکانەوە، بێگومان دنیاش خانەی خەڵات و سـزادان نیـیە، بـەڵکو خانـەی تاقیکردنەوەو، کێڵگەیەکی ڕۆژی دواییشە، بەرهەم و ئاکامی خـۆڕاگرتنیش بەدەسـت هێنـانی پاداشت و خەڵاتی کردەوە چاکەکانە بە چـەندان هێنـدە، "ئەیـوب"یـش کاتێـك بـەوە تـاقی

(١) البداية والنهاية لأبن كثير.

کرایەوە کە هەموو ماڵ و سامان و کەس و کاری لێ سەنرایەوەو چەندین ئازارو نەخۆشی ڕووی لەجەستەی کرد، خۆی ڕاگرت و شوکرانە بــژێری خــودای دەکــرد، لــەئاکامی ئەمــەدا خــوداش ڕەحمی پێ کردو بەزەییی پێدا هاتەوەو ساغی و تەندروستی ی بۆ گێڕایەوەو چــەندان هێنــدەی تر لەماڵ و سامان و کوڕوکەس و کاری پــێ بەخــشی یــەوە... هــەر بۆیــەش خــودا لــەدوای چیرۆکەکەی "ئەیــوب"ەوە فەرمووییــە: ﴿وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ﴾ (ئــەوە یادخــستنەوەیەکە بــۆ خواپەرستانی دی تاکو ئارام بگــرن وەك "ئەیــوب" و ئــەو پاداشــتە گەورەیەشــیان وەك ئــەو لەدنیاو ئاخیرەت دا دەسگیر بێت). جا ئەگەر بەندەکانی خوداو خواپەرستان مەینەتی و ئارامی "ئەیــوب" بەیادی خۆیان بێننەوە کە باشترین ئینسانی سەردەمەکەی خۆی بووە، ئەوا خۆیــان بە(ئارام گرتن لەسەر ناڕەحەتی یەکانی دنیا) ڕادەهێنن.

هەروەها ئارام گرتن لەڕەوشتی پێغەمبەران و چەکی پارێزکــاران و چاکــسازان بــووەو هــەر پێغەمبەرو، پێشەواو، چاکسازێك تەنها بە ئارام گرتن سەرکەوتوون. جــێی باســیــشە قورئــانی پــیرۆز بایــەخێکی زۆری بــەئارام گــرتن و وەســف و ســتایش کردنــی داوەو لەپلــەو پایــەی بەرزکردۆتەوەو ستایشی زۆری خاوەنانی ئەم ڕەوشتە بەرزەی کردووەو بــەم ڕادەیــەش ستایــشی هیچ ڕەوشتێکی دیکەو خاوەنانی هیچ ڕەوشــتێکی دیکــەی نــەکردووە، لــەقورئان دا نزیکــەی حەفتا جار باسی ئەم ڕەوشتە بەرزە کراوەو، کەچی ئاوا گرنگی بەباسی ڕەوشــتێکی باشــی دی نەدراوە. پێغەمبەری پێشرەویشمان -محمــدﷺ- بــەم ڕەوشــتی ئارامگرتنــەی ڕاسپاردووین و فەرموویە: (**الصبر نصف الأيمان**)... واتە: (ئارام گرتن نیوەی بــاوەڕە). هــەروەها فەرموویــە: ((**ومن يصبر يصبره الله وما أعطي احد عطاء خيراً وأوسع من الصبر**)).. واتە(هەر کەســێك خۆی بەئارام گرتن ڕابهێنێت و بەرگەی بارەگرانەکانی بگرێــت، ئــەوا خــوداش یارمــەتی دەری دەبێت لەو ئارام گرتنەدا، هیچ کەسێکیش نــی یــە، کــە جگــە لــە(ئــارام گــرتن) بەهرەیــەکی بەسوودترو گەورەترو زۆرتری دەست کەوتبێت). پەندێکی بــەناوبانگ و پــڕ مانــای عــەرەبیش دەڵێت: (الصبر مطيّة النصر).. واتە: (ئارام گرتن جڵەوگری سەرکەوتنە).

## پەنابردنە بەر خودا

هەروەها لەبەســەرهاتەکەی "ئەیــوب"دا وانەیــەکی بەســوود هەیــە دەربــارەی پەنابردنــە بەرخوداو نزاو پاڕانەوە لێ ی، وەك چۆن "ئەیــوب" نزای لەلا کرد.. ئینجا مل کەچ کــردن بــۆ خودا و دووعاکردن بەناوەجوان و پیرۆزەکانی و بەسیفەتە بــەرزەکانی تــاکو ئــەو بەڵایــەی کــە تووشمان بووە لایبات لەسەرمان.

## تیمارکردن

هەر لەو بەسەرهاتەی "ئەیــوب" وانەیــەکی دی بــەدی دەکرێـت دەربــارەی پێویــستی ی تیمارکردن و بەکارهێنانی دەرمان چونکە خودای مەزن فەرمانی بە"ئەیـوب" کـرد لـەو ئـاوە بخواتەوەو خۆی لیّ بشوات کەلەژێر پیّیەوە هەڵقولا، بێگومان خودا بــەبیّ ئــەوەش لەتوانای‌ـدا هەبووە شیفای بۆ بنێرێت لەجیاتی ئەوەی داوای گرتنەبەری ئەو شێوازو ئامرازەی تیمــارکردنی لیّ بکات.

## نەرمی لەگەڵ هاوسەردا

دیــسان لــەم داســتانەی "ئەیــوب"دا وانەیــەکی تــر دەردەهاوێـژرێت لــەبارەی پێویــستی هەڵــسوکەوتی چــاکەوە لەگــەڵ هاوســەردا، "ئەیــوب" لــە کــاتی دەوڵەمەنــدی و ســاغی و تەندروستی دا باش وبەئەمەك بوو لەگەڵ ژنەکـەی دا. ژنەکەشـی لـەماوەی ئـەو نەخۆشـی و نارەحــەتی یانــەی دا بەچــاکی هەڵــسوکەوتی لەگــەڵدا کــردووەو لەزۆربــەی هــەرەزۆری ساتەوەختەکانی دا بەهانایەوە چــووە، تــەنها چــەند هەڵەیــەکی کــەم نــەبووبێت کــەوەك هــەر مرۆڤێکی دی جۆرە سستی یەکی کەمی نواندووەو ئەوەش بەبەراورد لەگەڵ ئەو هەموو ئارام و هەوڵ و بەتەنگەوەهاتنەی دا جیّی سزادانێکی ئەوتۆ نەبووە... بەڵام لـەکاتی ئـەو هەڵــە وردو بچووکانەی دا "ئەیـوب" سوێندی لیّ خواردووە کـەوا دوای چـاك بوونـەوەی دەبێـت تـەمیّی کات، بەڵام هەر دوای چاك بوونەوەی لەنەخۆشی یەکە خودای گەورە فـەرمانی پـیّکردووە کـە سزایەکی ئازاربەخشی نەدات وەك وەفاداری یەك بـۆی، لـەجیاتی ئـەوەش خـودا مۆڵـەتی ریّ وشوێنێکی ئاسانی پیّداوە بۆ نەشکاندنی سوێندەکەی، ئەویش وەك پێشتر گوتمان ئەوە بووە کە دەسکێکی گژوگیا یان رەیحانەی بچووکی پێکـەوە بەسـتووەو بەیــەك جـار داوێتـی لەژنەکـەی بیّئەوەی ئازاری پیّ بگەیەنێت.

## پێغەمبەرێتی ی "ذوالکیفل"

خودای مەزن فەرمووییــە: ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِنَ الصَّابِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُمْ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾الأنبياء/٨٥-٨٦. واتــە (پێغەمبــەرانی وەك ئیسماعیل-ئیدریس-ذوالکیفـل-هەریەکەیان لەپێغەمبەرانی بەئارام و خۆڕاگر بوون، ئێمە ئەوانمان خستۆتە بەر سایەی سۆزو رەحمــەتی خۆمــان و ئــەوان لــە چــاکان وصــاڵحان بــوون)..

هەروەها خودا فەرموویە: ﴿ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴾ ص/٤٨. واتە (ئەو پێغەمبەرانەی تریش بەیاد بێنەوە، وەك (اسماعیل) و(الیَسَع) و(ذوالكیفل) كە هەموویان لەچاكان و هەڵبژێراوان بوون)..

(ابن كثیر)-خودا لێ ی خوشبێت-دەڵێت: (لەو ئایەتانەدا وا دەردەكەوێت كە -ذوالكیفل- پێغەمبەر بووبێت ئەویش بەپێی ئەو ناوهێنان و جۆرە ستایش كردنەی كە قورئان لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەی تردا ناوی هێناوە، تاكە بەڵگەی بەناوبانگیش لەم ڕووەوە هەر ئەوەیە). بەڵام قورئان نەبەكورتی و نەبەدرێژی باسی چۆنیەتی بانگەوازو پەیامی ئەم پێغەمبەرەو باسی ئەو گەلەی نێرراوە بۆ لایان نەكردووەو باسی ژیانیشی هەر نەكردووە. شارەزایانی مێژووش وای دادەنێن كە ئەم پیاوە كوڕی "ئەیوب" بووبێت -سلاوی خودای لێ بێت- و، ناویشی لەبنەڕەت دا (بیشر) بووبێت و خودا دوای "ئەیوب" كردبێتی بەپێغەمبەرو ناوی (ذوالكیفل)ی لێ نابێت چونكە مەرجی هەندێك عیبادەت و فەرمانی لەئەستۆ گرتووەو مەرجەكانیشی بردۆتە سەر.[1]

---

(١) گوتراویشە ئەو-واتە ذولكیفل-پێغەمبەر نەبووە، بەڵكو عەبدێكی صالحی خودا و بانگەوازكارێكی چاكەبووەو ئەركی دادوەری كردن و بەجێگەیاندنی هەقی لەنێو گەلەكەیدا لەئەستۆ گرتووەو ئەو ئەركانەشی بەچاكی ڕاپەڕاندووەو بەم هۆیەشەوە ناوی (ذوالكیفل)ی لێ نراوە، چونكە كەفالەتی ئەو ئەركانەی كردووە. وەك چۆن (یوونس) بە(ذوالنون) ناوبراوە و (ذوالنون)یش مانای (ذوالحوت) یان (ذوالسمكة) دەگەیەنێت، چونكە ماسی یە گەورەكە (واتە نەهەنگەكە) لەدەریادا قووتی داوە، هەروەك لەبەشەكانی داهاتووی ئەم كتێبەدا (إنشاء الله) بەتەواوی ئاماژەی بۆ دەكەین. (وەرگێڕ)

# بەشی هەشتەم

## موسا سڵاوی خوای لێبێ

## هارون سڵاوی خوای لێبێ

## سەرەتایەك:

## پێغەمبەرێتی-موسا-و-هارون-

موسا پێغەمبەرێکەو، یەکێکیشە لەپێغەمبەرانی خاوەن(عەزم). خودای مەزن فەرموویە: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴾مریم/٥١. واتە (هەروەها لە-قورئان-دا بەسەرهاتی-موسا-بەیادبێنەوەو بیخوێنەوە کە ئەو (واتە: موسا) هەڵبژاردەو پالآوتەکراوی خودا بووەو هەورووەها (پێغەمبەرێك)ی هەواڵبەر-بووە). ئەم پێغەمبەرە نازناو (لقب)ی دوێنراوی خودا(کلیم الله)یە، چونکە خودا بەبێ (ئامرازو هۆکارێکی ناڕاستەوخۆ) دواندوویەتیو قسەی لەگەڵدا کردووە. هەروەك فەرموویە: ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ الأعراف/١٤٤. واتە: (ئەی-موسا-من تۆم هەڵبژاردووەو لەنێو خەڵکی دا پالآوتومیت بەم پەیامەی کە بە سرووش بۆم ناردوویت و بە وتەو دواندنی ڕاستەوخۆ لەگەڵتا، جاتۆش ئەوەی پێم داویت لەپەیام و ڕاسپاردەو لاپەرەکانی-تەورات-وەربگرەو سوپاس گوزاری خودای پەروەردگارت بە).

(هارون)یش (سلاوی خودای لیّ بیّت) بەرەچەڵەك برای -موسا-یەو خودا ئەویشی ڕەوانە کردووە وەك پالپشت و یاریدەدەرێك بۆ (موسا)، بەتایبەتی لەکاتێك دا (موسا)ی دەنارد بۆ لای فیرعەون تا پەیامی خودای پیّ ڕاگەیەنێت. دانانی (هارون) بەیاریدەدەر و پالپشت لەسەر داواکاری یەکی (موسا) بووە کە ئاڕاستەی خودای پەروەردگاری کردووە:

﴿ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ٢٩ هَٰرُونَ أَخِي ٣٠ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴾طه/٢٩-٣١. واتە: (موسا داوای کرد خودایە لەکەس و کاری خۆم یەکێك بکەیت بەپالپشت و هاوکارم کەئەویش (هارون)ی برام بێت تاکو خۆمی پیّ بەهێزبکەم و لەم کاروبارەم دا بەشداری کەم و هاوبەش و هاوخەمی کارەگرانەانی پێغەمبەرێتیم بێت).

خوداش داواکەی -موسا-ی جێبەجێ کردو (هارون)ی لەگەڵدا ناردو، بەڕەحمەت و بەخشندەیی ی خۆی پلەی پێغەمبەریتیشی پیّدا، (واتە: بە- هارون)..

﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴾مریم/٥٣.

# چەوسانەوەی ( بنو اسرائیل )

لەمەوپێش لەچیرۆکی (یوسف)دا (سلاوی خودای لێ بێت) ئەوەمان باس کرد چۆن (یوسف) کەوتبووە پێش (باوکی و کوڕو نەوەکانی باوکی) بۆ گوزەران کـردن لـەولاتی (میـسر)، پاشـان هەر لەو سەردەمەی خۆیان دا داوای لەپادشای (میسر) کردووە باوکی و خانەوادەکەی لەخاکی (جاسان)دا نیشتەجێ بکات کە دەکەوێتە باکووری (بەلبیس)ـەوەو یەکێك لەشـارەکانی نـاوی (سفط الحنة)یە... دیارە ئەم داواکاری یەی (یوسف) بەهۆی ئەوەوە بووە کە ئـەو خاکـە شـیاو بووە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ. ئەوانیش (واتە: کەس و کارەکەی یوسف) بـەکاروباری بـەخێوکردنی ئاژەڵ ولەوەڕاندنی یەوە خەریك بوون، ئەم بارودۆخە لەسەردەمی (پادشا شوانەکان)دا بووەو لەو ڕۆژەگارەدا خەڵکی بەشوانکارەیی یەوە سەرقاڵ بوون...

لەدوای ئەوانیش ڕۆژگار گۆڕراوەو (أحمس-ی یەکەم) هـات کـە یەکـەم پادشـای (خێزانـی هەژدە پادشایی)یەکە بووە کە هەموو (پادشا شوانەکان)یان دەرکردووە. پاشـان (رعمـسیس-ی دووەم) هاتووە و کاتێك دیتی (بني أسرائیل) بەرەو زۆربوون دەچن و ژمارەیان زیـاتر دەبێـت و وەچەو نەوەیان زیاد دەکات، ترساوە لەوەی ببنە پاڵپشتێك بۆ دوژمنـانی(میسر)، لەبـەر ئەمـە هەوڵی وەڕس کردنیانی داوەو لەقورسترین کاردا بەکاری هێناون تاکو هێزیان کەم ولاوازکاتەوە، جگە لەوەی تەقەللایەکی هێجگار زۆری داوە لەپەرتەوازە کردنیان دا بۆ چەند دەستەو تاقمێك، لەم بارەیەوە گوتراوە: (کاهین و جادوگەرەکانی ئەو سەردەمە هەواڵی ئـەوەیان بەفیرعـەون داوە کە لە داهاتوودا ئەو موڵك و دەسەلاتەی هەیەتی لەسەر دەستی یەکێك لـەکوڕە تـازە لـەدایك بووەکانی ئەو ماوەیەی کە تیای دا دەژیان لەناو دەبرێت)...

فیرعەونیش بەبیستنی ئەم هەواڵە دەترسێت و فەرمان دەدات بەکوشتنی هەر کوڕێکی تازە لەدایك بووی (بنو اسرائیل)، هەتا ژمارەیان زۆر نەبێت... دیارە پیرانیش لەو ماوەیەدا زۆریان لێ دەمرد بەهۆی ماندوو بوونی زیاد لەتوانایان لەکاردا. لەبەر ئەمـە سـەرانی (قیبتیـیـەکان) چـوونە لای (فیرعـەون) وپێیـان گـوت: (ئـەوا مـردن بـەزۆری ڕووی کردۆتـە پیرەمێـردو بەسالاچووەکانی نەوەی ئیسرائیل (بني أسرائیل) وتۆش منداڵە کوڕیەکانیان دەکوژیـت و، بـەم پێیەش خەریکە کارەکانیان بکەونە سەرشانی ئێمەو جگە لەخۆمان کەسێکیان لێ نامێنێتەوە بۆ بەردەستیو خزمەتکاری)...

ئینجا (فیرعەون)یش فەرمانی دا کە ساڵێك منداڵان بکوژن و سـاڵێکی تـریش وازیـان لێ بێنن، تاکو هەموو نەوەکانی (اسرائیل) لەنێو نەچن، لەو سـاڵەش دا کـە (نـۆرەی نەکوشـتنی

منداڵە تازە لەدایك بووەکان بـوو)، (هـــارون) لـەدایك بـوو، بۆیـە وازی لێهێنـراو نـەکوژراو لەئامێزی باوك ودایکی دا بەخێو کرا.

بەڵام (موسـا) لەو ساڵەدا لەدایك بوو، کە نۆرەی واتە ساڵی سەربڕینی منداڵان بوو، لەبەر ئەمە هەر کە هاتە دنیاوە، خێرا دایکی لەبەرچاوان شاردییەوەو، ئیتر هەواڵی لـەدایك بـوونی بە(فیرعەون) نەگەیشت.

خودای مەزن ئاماژەی بۆ ئەم سـتەمە گەورەیـەی فیرعـەون کـردووە کـە دەرهـەق نـەوەی (ئیسرائیل) و سەربڕینی منداڵەکانیان ئەنجامی داوە.. ...هەروەك فەرموویە:

﴿ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ[1] بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ[2] إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾القصص/٣-٥.

واتە: (لەهەواڵ و بەسەرهاتی موسـا وفیرعەون باری حەقیقەت وڕاستەقینەی ڕووداوەکـانی نێوانیانت بۆ دەگێڕینەوە تاکو هۆیـەکی پەنـد وەرگـرتن و ڕێنمـایی ی زیـاتر بێـت، بـۆ ئـەو کەسانەی باوەڕیان پێ هێناویت و ئەوانەش لەمـەولا بـاوەڕت پـێ دێـنن. بێگومـان فیرعـەون کابرایەکی ستەمکارو ڕۆچووی نێوزۆڵم وکفرو تاوان و خۆبەزل زانین بـوو وجیـاوازیی دەخـستە نێوان دانیشتوانی وڵاتەکەیـەوەو وەك یـەك سـەوداو مامەڵـەی لەگـەڵ دا نـەدەکردن، بـەڵکو کردبوونی بەچەند دەستەو تاقمێکەوە، ئەوەبوو هەموو میسری یەکانی لەخۆی نزیك کردبووەوە کەچی گەلی (بەنوئیسرائیل)ی دەچەوساندەوەو کوڕەکانیـانی سـەردەبڕی و ئافرەتـەکانیانی بـۆ کۆیلایەتی و بەدکاری لای خۆیان دەهێشتەوە، تاکو ئەو گەلە قڕکات، بەڕاستی فیرعـەون بـەم ڕەفتارە گەندەڵانەی لەدژی (بنو اسرائیل) یەکێك بووە لەو زۆردارە تێکـدەرو گومڕایانـەی کـە کاروباریان هەر شێواندن و گێرەشـێوێنی بـووە. بـەڵام ئێمـەش لـەدژی ئـەو زۆردارە خواسـتی پێویستمان لەسەر ئەوە بووە کە چەوساوان و بێدەسەڵاتان بەهێزکـەین و فـەزڵی سـەربەرزی و دەسەڵاتیان پێببەخشین و پاشان بیانکەین بەپادشاو سەرکردەوپێشەوایان، هـەروەها بیانکـەین بەجێگیرەوەومیراتگری تەختی فیرعەون و موڵك و مەملەکەتەکەی).

---

(١) (فیرعەون): نازناوێك بوو بەکاردەهێنرا بۆ هەر پادشایەك لەپادشاکۆنەکانی(میسر).

(٢) (يستحي نساءهم): واتە(ئافرەتەکانیان ناکوژێت و دەیانهێڵێتەوە تـاکو بیانکـات بەچـەند کۆیلەیـەکی خۆیان).

# بەندی یەکەم

## ((ژیاننامەی-موسا- پێش پێغەمبەرێتی))

( بەخێوکردنی "موسا" لەکۆشکی شاهانەی "فیرعەون"دا -
"موسا" بەهانای (ئیسرائیلیەیەک)ـەوە دەچێت -ئاشکرا بوونی "موسا"و ڕاکردنی - "موسا" لە خاکی "مەدیەن" - ژنهێنانی "موسا" )

## بەخێوکردنی "موسا" لەکۆشکی شاهانەی "فیرعەون"دا

"موسا" لەدوای هاتنە دنیای، چەند مانگێك لەئامێزی دایکی دا مایەوە. پاشان کاتێك دایکی ترسی ئەوەی لێ نیشتبو کە فیرعەون بەنهێنی ی هاتنە دنیای ئەو کوڕەی بزانێت و بیکوژێت و نەهێلێت لەئامێزیدا بمێنێتەوە، خێرا بە سرووش و ئیلهامی خودا سندووقێکی سازکرد تاکو "موسا"ی کورپەی ساوای تێبخات و بە(زفت) ڕەنگی سندووقەکەی گوڕی و بۆیەی کرد تا بیناسێتەوەو، وئینجا بەسندووقەکەوە "موسا"ی هەڵدایە ڕووباری نیلەوە، ئەمەش لە ساتەوەختێکدا بوو کە خودا ترس و نیگەرانیی لێ دوورخستبووەو مژدەی تەواوی پێدابوو، کە "موسا"ی جگەرگۆشەی بۆ دەگێڕێتەوەو، لەئایندەش دا دەیکات بەیەکێك لەپێغەمبەران. جا لەو ماوەیەدا، کە سندوقەکە بەناو ئاوەکەدا دەڕۆیشت چەند کەسێك لەدەست وپێوەندی (فیرعەون) بەدییان کردو دەریان هێناو بردیانەوە بۆ ماڵی (فیرعەون)، لەوێش سندووقەکەیان هەڵپچڕی، ژنەکەی (فیرعەون) چاوی بە منداڵێك کەوت تیای دا (واتە "موسا"[1]) و یەکسەر خوداش لەو چرکەساتانەدا خۆشەویستیی ئەو منداڵەی دەخاتە دڵەوەو دەزانێت گەر (فیرعەون)ی مێردی ببینێت و بزانێت (کوڕە) دەسبەجێ دەیکوژێت، وەك چۆن هەموو کوڕانی (بني اسرائیل)ی کوشتبوو، هەر بۆیەش بەو مێردە ستەمکارەی دەڵێت: (ئەم کوڕە دەبێتە هۆی خۆشی و شادی من و تۆ، لەبەر ئەوە مەیکوژە بەشکم سوودمان

---

(١) سەبارەت بەوشەو ناوی(موسا) گوتراوە کە وشەیەکی (لێکدراو)ـەو لەدوو بڕگەی (موو)و(شا) پێك دێت، (موو) لەزمانی میسری یە کۆنەکان دا مانای (ئاو) دەگەیەنێت و (شا)ش مانای (درەخت) دەگەیەنێت، بۆیەش وا ناونراوە، چونکە کاتێك دایکی پێی گەیشتۆتەوە لەنێوان (ئاو)و(درەخت)دا بینراوەتەوە، هەروەها گوتراوە ئەم ناوە (موسا) لە وشەی (مس)ـەوە وەرگیراوە، کە وشەیەکی کۆنی میسری یەو مانای(منداڵ) دەگەیەنێت.

پێبگەیەنێت یان تاکو بیکەین بەکوڕی خۆمـان و چیتر ئـاوا بـێکوڕو وەجـاخ کـوێر نـەبین). (فیرعەون)ی مێردیشی بەو ڕایە قایل بوو و بۆ ژنەکەی خۆیی هێشتەوە.

بەم ڕەنگـە"موسـا" لـەو مەرگەسـاتە ڕزگـاری بـوو، بێگومـان فیرعـەون و (هامـان)ی وەزیریشیو سەربازەکانیشیان نەیاندەزانی کە قەدەر چ شتێکی لەناخی خۆیدا بۆ حەشارداون و ئـەو منداڵـەی کەڵـە ئاوەکـەیان دەرهێنـاوە دەبێـت بـەدوژمنیان و بەسەرچـاوەیەکی خـەم و نیگەرانییان و، بەهۆکارێکی لەناوچوونیان لەئاکامی بێباوەڕیو ڕۆچونیان لەستەم دا.

ئەمە بوو حاڵی"موسـا" لەساتەکانی هەڵدانە نێو ڕووبـارو دەرهێنانەوەیـدا، ئـەی داخـۆ حاڵی دایکـی چـۆن بووبێـت؟! بێگومـان دایکـی هـەر کـە ئـەم کۆرپەیـەی هەڵدەداتـە نێـو ڕووبارەکەوە، خێرا کچەکەی خۆی (واتە: خوشکەکەی موسـا) بەدوای ئاسەواری سـندووقەکەدا دەنێرێت و لەمەودایەکی دوورەوە چاودێریی دەکات تادەبینێت چۆن هەڵدەگیرێتەوەو بۆ مـاڵی (فیرعەون) دەبرێت، بۆیە بەهەڵەداوان هەواڵەکە بەدایکی دەگەیەنێت و ئەویش بەبیستنی ئـەو هەواڵەو لەترس و بێئارامی دا هۆش و عەقڵی لەلا نامینێت و دڵـی لەهـەموو شـتێك خـاڵی دەبێتەوەو هیچی تێدا نامینێت تەنها یادو فیکری موسـا نەبێت و خەریك بوو لەو پەرۆشـی و بێئارامییەیدا نهێنییەکەش ئاشکراکات و پەردە لەسەر مەسەلەکەی خۆی هەڵداتەوە، بـەڵام خودا دڵی جێگیر دەکاتەوەو دەیکات بەمرۆڤێکی ئیمانـدارو پـشت بەسـتوو بەپـەیمانی خـوداو دڵنیا دەبێت لەوەی کە خودا کۆرپەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.

جا کاتێك "موسـا" لەماڵی فیرعەون دابـوو چـەندین ئـافرەتی دایـەن و خـاوەن کۆرپـەی شیرەخۆرەی بۆ دێنن تاکو لەمەمکی خۆیان شیری پێ بـدەن، بـەڵام ئـەم منداڵـە شـیری هـیچ کەسێکیان نـاخوات. لـەو ماوەیـەش دا خوشـکەکەی دەگاتـە لای‌ـو بەدەسـت وپێواندەکـەی (فیرعەون) و ژنەکەی دەڵێت: (من ژنێك دەناسم کە دەتوانێت شیر بەو منداڵە بدات و ڕێم بدەن بانگی بکەم بۆتان). ئەوانیش ڕێ ی پێ دەدەن و قایل دەبن بەوەی بینێرن بـەدوای دا، (دیـارە مەبەستی ئەم کچە (دایکی موسـا) بووە)، ئینجا خێرا دەچێت بەدوای دایکـی داو دەیهێنێـت بۆ لای‌و-موسـا-یش زوو هۆگری دەبێت و مەمکی دەگرێتە دەم و هەموو دایەنەکانی تر ڕەت دەکاتەوە. بەم ڕەنگە دایکی "موسـا" بەتەواوی بۆی ڕوون دەبێتەوە کە پەیمانی خودا ڕاسـت و ڕەوانە، دوای ئەوەی ساوا جگەرگۆشەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.

ئەمەی پێشوو شیکاری ئەم ئایەتانەیە کە دەیخوێننەوەو خودا تیایان دا فەرموویە:

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا

تَحْزَنِيٓ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ (١) ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ (٢) وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾القصص/٧-١٣.

شتێکی سروشتی و ئاساییشە کەوا-موسا- دوای ئەوەی ماوەی شیرخواردنی تەواو بووە، هەر لەماڵی-فیرعەون-دا بووبێت و هەر لەوێش واتە (لەکۆشکی شاهانەی فیرعەونیشدا) بەخێوکرابێت. جا کاتێك گەورە بووەو پێگەیشتووەو هێزێکی گەنجی ی بۆ خولقاوە خودا زانست و حیکمەتیشی پێ بەخشیوە. خودا ئەم جۆرە پاداشتە هەر بە چاکەکاران و باوەڕدارانی چاکەخواز دەبەخشێت، هەروەك فەرموویە: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ القصص/١٤.

## - موسا- بەهانای ئیسرائیلی یەك-ەوە دەچێت

موسا تا هەرەتی لاویی لەماڵی-فیرعەون-دا بەسەبردو جەستەیەکی بەهێزو توانایەکی زۆری هەبوو. لەو حەقیقەتەش بێئاگا نەبوو کە ئەو خۆی ناموێیەکە لەماڵی فیرعەوندا، چونکە ئیسرائیلییەکەو یەکێکە لەو گەلە چەوساوەیە. لەبەر ئەمەش هەردەم پاڵپشتێك بوو بۆ ئیسرائیلییەکان و شەڕو خراپەی گەلەکەی فیرعەونی لێ دوور دەخستنەوەو بەرگری لێ دەکردن.. بۆ نموونە: (ڕۆژێکیان-موسا-لەکۆشکەکەی فیرعەون دەچێتە دەرەوەو لەناکاودا

---

(١) لە(أصمعي)یەوە گێڕاوەتەوە کە ئەو گوێی لە کەنیزە(جاریـة)یەك بووە لەزمان پاراوی و ڕەوانبێژیـدا زۆر لێهاتوو بووە، پێی گوتووە (بەڕاستی جێی ستایش و سەرسوڕمانی و، ماشەڵڵا چەند ڕەوانبێژیت). کەنیزەکەش پێی گوتووە (ئەرێ داخۆ دوای ئەم فەرمایشتەی خودا هیچ پلەو ئاستێکی ڕەوانبێژی مابێت: (وأوحينا الى أم موسى.. تاوەکو(وجاعلوه من المرسلين) کەلەیەك ئایەت دا دوو فەرمان (أمر) و دوو قەدەغە(نهي) و دوو هەواڵی(مزگێنی دار) ومژدە بەخشی پێکەوە کۆکردۆتەوە.

(٢) (عن جنب): (عن بعد) واتە ( لەمەودایەکی دوورەوە).

خۆی دەکات بەناو شاردا بێ ئەوەی کەسێك پێی بزانێت و لەوێ دەبینێت دوو پیاو لەگەڵ یەکدی بەشەڕ هاتوون و لەیەکتر دەدەن، یەکێکیان ئیسرائیلی یەو لەگەڵەکەی خۆیەتی و، ئەوی تریشیان لەگەڵەکەی فیرعەونە، لەو کاتەدا ئیسرائیلی یەکە هانا بۆ-موسا-دەبات و داوای یارمەتی و بەهاناوە هاتنی لێ دەکات. موساش بەهانایەوە دەچێت و مشتەکۆڵەیەکی وەها توند بەکابرای (فیرعەونی)دا دەدات کە یەکسەر لەناوی دەبات و هەناسەی لێ دەبڕێت، بەڵام زوو لەو کردەوەیەی پەشیمان دەبێتەوەو بەکردارێکی-شەیتانی دادەنێت-وداوای لێخۆشبوون لەخوداش دەکات لەسەر ئەو گوناهەی کە کردی ولێ ی دەپاڕێتەوە تۆبەو پەشیمان بوونەوەی لێ وەرگرێت و نەیکات بەیاریدەدەرێکی تاوانباران. خوداش لێ ی دەبوورێت و تۆبەی لێ وەردەگرێت، هەروەك لەم بەشەی بەسەرهاتەکەی دا فەرموویەتی:

﴿ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ[١] قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا[٢] لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾القصص/١٥-١٧.

## ئاشكرا بوونی " موسا" و ڕاکردنی

بۆ ڕۆژی دووەم (واتە ڕۆژێك لەدوای کوشتنی کابرای فیرعەونی)، "موسا" دەچێتەوە بۆ ناو شارو لەئاشکرا بوونی کردارەکەشی دەترسێت، بەڵام دەبینێت ئەو پیاوە (ئیسرائیلی یە)ی کەدوێنی بەفریای گەیشتبوو و کابرای سەر بەخێڵی فیرعەونی ی لەپێناودا بەمشتەکۆڵەیەك کوشتبوو، ئەوا خەریکی شەڕکردنە لەگەڵ پیاوێکی تری فیرعەونی داو دووبارە داوای بەفریاکەوتنی لێ دەکاتەوە تاسەری خات بەسەریا.

---

(١) (فوکزه موسی فقضی علیه): لەسەر ئەم ڕستەیە هەندێك لەخۆرهەڵاتناسان چەند گومانێکیان دروست کردووە دەربارەی ئەو ڕووداوەی گوایە-موسا-گوناهێکی گەورەی بەهۆی کوشتنی کەسێکەوە ئەنجام داوە لەکاتێك دا ئیسلام ئیدیعای پاکی و بێگوناهی و (عیصمەت)ی پێغەمبەران دەکات، ئێمەش لەوەڵامیان دا دەڵێین: قورئان بەڕوونی باسی ئەو کارەساتەی کردووە کە موسا مشتەکۆڵەیەکی لەکابرای سەر بەهۆزی (فیرعەون) داوە تاکو نەهێڵێت دەستدرێژی بکاتە سەر پیاوە (ئیسرائیلی‌یەکە). مشتەکۆڵەش لەڕێزمان دا لێدانێکە بە مەچەك. موساش بەمەچەك لێ ی داوەو مەبەستی کوشتنی نەبووە، جێی باسیشە بۆ زانیاری پتر (موسا) لەو کاتەدا هێشتا نەبوو بوو بەپێغەمبەر(رسول) یان هەواڵبەر (نبي)یەکی خودا.

(٢) (ظهیراً): (معیناً) واتە( یارمەتی دەر)، (پشتیوان).

(موسـا)ش ڕقی لەو کردەوە شەڕانگێزیانەی پیاوە ئیسرائیلییەکە دەبێتەوە کە هەموو ڕۆژێك حەزی لە شەڕو هەراو هوریایەو لەسەر ئەوە سەرزەنشتی دەکات و گلەییەکی زۆری لێ دەکات. ئینجا دەکەوێتە نێوانیانەوەو ناوبژییان دەکات بۆ براندنەوەی ناکۆکییەکەیان و پاڵ بەهەردووکیانەوە دەنێت و لەیەکتریان دووردەخاتەوە، کەچی کابرای (ئیسرائیلی) کە سەر بە هۆزەکەی -موسا-یەو ڕۆژێك لەوەوبەر پیاوێکی لەسەر کوژراوە وا گومان دەبات گوایە(موسا) دەیەوێت ئەو (واتە ئیسرائیلی یەکە) بکوژێت، هەر بۆیە پێی دەڵێت: (ئەرێ دەتەوێت منیش بکوژیت وەك چۆن دوێنی کەسێکت کوشت).

پیاوە فیرعەونییەکەش هەر کە ئەم وتەیە دەبیسێت وەك دان پیانانێکی ڕاشکاوانە بەرگوێی دەکەوێت، چونکە لەڕۆژی پێشووەوە تا ئەو کاتە گەلەکەی خۆی نەیاندەزانی کێ پیاوەکەی دوێنێیانی کوشتووە، بەم شێوەیە کابرای ئیسرائیلی هەواڵی تەواویان پێ دەدات و خێرا پیاوە فیرعەونییەکەش ئەو هەواڵە بە کەس و کارو نێو هۆزەکەیان دەگەیەنێت. ئەوانیش هەموو خۆیان سازدەکەن و بەگورجی دەکەونە خۆ بۆگەڕان بەدوای -موسا-داو لەناوبردنی.

لەو ساتانەدا پیاوێکی دڵسۆزی -موسا- لەوپەڕی شارەوە بەپەلەو بەهەڵەداوان خۆی دەگەیەنێتە لای(موسا)ی هاوڕێی و لەو خۆسازدانەی گەلەکەی(فیرعەون)ی ئاگادار دەکاتەوەو ئامۆژگاریشی دەکات لەسەر ئەوەی خۆی قوتار کات و لە-میسر- دەرچێت تاکو دەستیان پێی نەگات. (موسا)ش ئامۆژکارییە یەکەی لێ وەردەگرێت و بەترس و نیگەرانی یەکی ئاسایی و وریایی یانەوە هەڵدێت و نزاش لەلای پەروەردگاری دەکات کە لەدەست گەلی ستەمکاران ڕزگاری کات.

ئەم ئایەتانەی خوارەوەش بەشێکی تری بەسەرهاتەکەیە کەلەم دێڕانەی پێشوودا لێکدرانەوە: ﴿ فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ[1] قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ القصص/١٨-٢١.

---

(١) (يستصرخه): (يستنصر بە) واتە (لەدوورەوەو بەدەنگ و هاوارێکی بەرزەوە هانای بۆ دەبات و داوای بەفریاگەیشتنی لێ دەکات).

## موسا لەخاكی "مەدیەن"

دوای ماندووبوونێكی زۆر-موسا-لەمیسرەوە گەیشتە خاكی "مەدیەن" و ڕووی كردە سەرچاوەی ئاوەكەی تاكو تێنوێتی یەكەی خۆی بشكێنێت و تێر ئاو بخواتەوە، لەو كاتەش دا دیتی ئەوا خەڵكێكی زۆر قەرەباڵغی یان لەسەری دروست كردووەو پاڵەپەستۆی لەسەر دەكەن و هەر كەسەو پشتی بەهێزی جەستەیی خۆی بەستووە لەپێشبركێو نۆرەبڕی دا بۆ سەر كانیاوەكە، لەتەنیشت ئاوەكەشەوە دوو كچی بینی كە ڕانەمەڕەكەیان دەلەوەڕاندو تێیان دەخوڕین تاكو لەئاوەكە نزیك نەبنەوە. جا كاتێك نزیك بووەوە تا لێ یان بپرسێت بۆچی ناتوانن مەڕەكانیان ئاو بدەن؟ ئەوانیش لەوەڵام دا پێیان ووت: (ئێمە بۆیە هاتووینە ئێرە تاكو مەڕەكانمان ئاو بدەین، بەڵام لەبەر ئەو قەرەباڵغی یە زۆرەی پیاوان ناتوانین ئاویان بدەین تاكو شوانەكان دەڕۆن)...

ئەو وەڵامەش دەلالەتێكی ڕوونە لەسەر وجودی ئەو جۆرە لاوازیو شەرم و ئابڕووەی لەئافرەتان دایەو وایان لێ دەكات كە خۆیان دوابخەن لەبەجێ گەیاندنی كاروباریان لەو جۆرە بارودۆخانەی پاڵەپەستۆو قەرەباڵغی و تێكەڵاوبوونی پیاوان و ئافرەتان دا، ئینجا هەردوو كچەكە هۆی ئەو حاڵەتەی خۆیان باس دەكەن و دەڵێن: (بۆیە ئێمە خۆمان هاتووین بۆ لەوەڕاندن و ئاودانی ئەم ئاژەڵانە چونكە باوكمان پیاوێكی پیرو بەساڵاچووە). ئەم قسەیەش لەوتەكانیان دا وەك ئەوەیە كە ویستبێتیان ڕەحم و بەزەیی لەدڵی-موسا-دا بجوڵێنن. دیارە خێرا غیرەت و جوامێریی(موسا) خرۆشاوەو مەڕەكانیانی بۆ ئاوداون و هیچ كەسێكیش نەیتوانیوە ڕێی لێ بگرێت، چونكە لەگەرمەی ئەو پاڵەپەستۆو قەرەباڵغی یەدا هێزو توانایەكی وەهایان تێدا بەدی كردووە، كە نەیانتوانیوە بەرەنگاری ببنەوەو ڕێی چوونە پێشەوەی ئاوەكەی لێ بگرن.

دوای ئەمە (موسا) چۆتە بەرسێبەرێك تاكو بحەسێتەوەو هێزی بەبەردا بێتەوە. بەدەم پشوودان و خۆحەساندنەوەشەوە سوپاسی خودای لەسەر ئەو هێزو بازووە بەتینەی كردووەو گوتوویەتی: (خودایە من سەرەڕای ئەو هەموو هێزو توانا جەستەیی یەی پێت بەخشیوم هەر هەژارو فەقیری بەر قاپی تۆم و، هەردەم ئاتاجم بەتۆیە).

دوای ماوەیەكی كەم یەكێك لەكچەكان بەڕووسوری و شەرم و شكۆوە دێت بۆ لای(موسا)و پێی دەڵێت، كە باوكی بانگی دەكات بۆ لای خۆی تاكو پاداشتی ئەو كاری ئاودانەی بداتەوە لەیارمەتی دانی كچەكانی دا... (موسا)ش بەخۆشی و سووربوونەوە داواكاری یەكەی باوكیان

جێبەجێ دەکات. ئەی مەگەر لەو کات و شوێنەدا هەر خۆی نامۆو هەژار نی یە؟ کەوابوو دەبا ڕێگاکە لەگەڵ ئەو کچەدا بپێچێتەوەو بگاتە لای ئەو باوکە بەساڵاچووەیان. هەر واشی کرد، ئەوەبوو گەیشتە لای ئەو پیرەمێردەو لەگەڵی دانیشت و وت و وێژێکی زۆری لەگەڵدا کردو هەموو ڕازو نهێنییەکی خۆیشی بۆ باس کرد، پیرەمێردی دنیادیتەو بەساڵاچووش هەڵوێستێکی ناوازەی جوانمەردی و بەخشندەی لەئاست دا هەبوو و دڵنیاشی کردەوە لەسەر ڕزگاربوونی لەدەست گەلی ستەمکاران..

ئەم ئایەتانەی دەیخوێنینەوە قۆناغێکی تری ژیاننامەی-موسا-یە لەپێش وەرگرتنی پەیامی خودادا.. ﴿ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ[1] قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ[2] ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ ۖ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا ۖ قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ ۖ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا[3] ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ[4] قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ ۖ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾القصص/٢٢-٢٥.

---

(١) (مدين): ناوچەیەکە لەدەوروبەری کەنداوی (عەقەبە)ولەنزیك کۆتایی باکوورییەوە.

(٢) (عسى ربي ان يهديني سواء السبيل): واتە: (تکاکارم لەخودای پەروەردگارم کە ڕێنماییم بکات بۆ سەر ڕێی ڕاست).

(٣) لەم ئایەتەدا کورت کردنەوە(ایجاز) هەیە، کورت کردنەوەش واتە کەم و پوخت کردنەوەی هەندێك لەبێژەکان(الفاظ) تاکو فەرمایشتەکە کورت و کاریگەر بێت، پوخت کردنەوەش بەو شێوەیەی کە ئەوەی چیرۆك دەگێڕێتەوە چەند کەرتێکیشی لێ ببڕێت بێ ئەوەی هیچ شتێك لەبنچینەو ناوەڕۆکی بسڕێتەوەو پوختەی چیرۆکەکەش لەچەند دەستەواژەیەك دا کورت کاتەوە، بەڵام گەر لەو دەستەواژانە ببڕێت ئەوا هەمان هێزی تری لەمانا بەخشیندا نامێنێت، وەك لەم ئایەتەدا بەکورتی فەرمایشتەکەی خودا هاتووە(وجد عليه أمة من الناس يسقون)، واتە (دیتی کۆمەڵە کەسێك لەسەر ئاوەکەبوون و ئاژەڵ و مەڕەکانیان ئاودەدا): (يسقون: أي يسقون أغنامهم ومواشيهم).. مەبەست لە (تذودان)یش واتە( کچەکان مەڕەکانی خۆیان لەئاوەکە دووردەخستەوە) (أي تمنعان مواشيهما عن الماء)، هەر لەو فەرمایشتەی خودا (فسقى لهما) واتە (موسا) خێرا مەڕەکانی ئەو دوو کچە بەشەرم و بێدەسەڵاتەی ئاودا: (يعني سقى لهما غنمهما).

(٤) (تمشي على أستحياء): چەند شیرینە ئەم ڕستەیەو چەند ساناشە لەبەر گوێ یەکاندا!! ئەم ڕستەیە دەلالەتە لەسەر بوونی باشترین سیمای (جوانی) لە کچەکان دا کە جوانیی شەرم و حەیایە، قورئانی پیرۆزیش ئەم سیفەتەی دیاریکردووە بۆ وەسف کردن و ستایشی ئەو کچە بەشەرم و شکۆیانەی کە خۆیان بەو سیفەتە بەرزە ڕازاندۆتەوە.

# ژن هێنانی-موسا-

لەبەر ئەوەی-موسا-کوڕێکی گەنج و ژیرو ڕەوشتبەرز بوو، چ ئەو پیرەمێردەو چ هەردوو کچەکەیشی پێی دڵشادو و خۆشحاڵ بوون، هەر بۆیەش یەکێك لەکچەکانی گوتی: (بابە ئەم پیاوە بەکرێ بگرە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانمان تاکو بەدەرامەتی ئەو کارە بژێویمان بۆ دابین کات، چونکە بەڕاستی پیاوێکی بەهێزو دەسپاکیشە).

باوکە پیرەکەشیان وای دەبینی کە ئیدی بەمەبەستێکی خوازراوی خۆی دەگات، بۆیە بەپەلە کەوتە جێبەجێکردنی خواستی کچەکانی و بۆ ئەم مەبەستەش مەرجێکی داناو داوای لە(موسا) کرد کە ماوەی هەشت ساڵ کاریان لەلابکات و شوانی مەڕەکانیان بێت، لەبەرامبەر ئەم کارەش دا یەکێك لە کچەکانیی لێ مارە دەکات، خۆ ئەگەر دوای ئەو ماوەی هەشت ساڵە دوو ساڵی تریش زیاد بکات و لەخزمەتیان دا بێت ئەوە چاکەیەکی جوان و خێرێکی زیادەیە کە بۆ خۆی دەکات.

موسا ئەو مەرجەی پەسند کردو داواکارییی پیرەمێردەکەی بەجێهێناو سەرپشکیی کرد لەسەر ئەوەی لەهەر ماوەیەکیان دا ئامادەیە لەخزمەتیان دا بێت واتە لە هەشت ساڵەکە یان لە دە ساڵەکەدا. ئیتر هەردوکیان لەسەر مەسەلەکە ڕێکەوتن...

خودای مەزن فەرموویە: ﴿ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَـٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ[1] إِحۡدَى ٱبۡنَتَىَّ هَـٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِى[2] ثَمَـٰنِىَ حِجَجٍ[3] فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرًا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِى وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَىَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾القصص/٢٦-٢٨.

---

(١) (أنكحك): (أزوجك): واتە (لێت مارە دەبڕم)، ( دەیکەم بەهاوسەرت).

(٢) (تأجرني): (تكون أجيراً لي): (واتە کارمەندێکم بیت لەکاری لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانمان دا) ئیشی شوانکاریمان بۆ بکەیت.

(٣) (حجج): سنين: ساڵان، (هەشت ساڵەکە).

# بەندی دووەم

## (( پێغەمبەرێتی " موسـا" و "هارون" ))

( سەرەتای پێغەمبەرێتی - خودا فەرمان بە "موسـا" دەکات بچێت بۆ لای "فیرعەون" - موسـا و هارون پەیامی خودایان دەگەیەنن - وت و وێژێکی نێوان "موسا" و "فیرعەون" دەربارەی پەروەردگارێتیی خودا - "فیرعەون" فەرمان دەکات بەبنیات نانی کۆشکێك بۆ سەرکەوتن بۆ ئاسمان. )

## سەرەتای پێغەمبەرێتی

(موسـا) ماوەی ئەو چەند ساڵە دیاری کراوەی لەخزمـەتی (پیرەمێـرد)ــەکەدا بردەسـەر، پاشان بەخۆیو هاوسەرەکەیەوە بەرەو باشوور بەرێکەوتن تا گەیشتنە کێـوی (سـیناء). لـەوێ لەشەوێکی موبارەك دا خودا خواستی وابوو کە بە(رێزو شکۆ)و (پێغەمەرێتی) و (فەرمایشتی خۆی) —موسا- بەهرەمەندکات. لەو کاتەش دا (موســا) رێی لێ هەڵـە بـوو بـوو و شـەوی بەسەردا هاتبوو ونەیدەزانی ڕوو لەکوێ بکات، هەر لەو جۆرە حاڵەتەی داو لەدوورەوە ئاگرێکی بەدی کردو بەهاوسەرو خێزانەکەی خۆی گوت: (لەجێی خۆتان بمێننەوەو لێرە جێگیربن، چونکە وا لەدوورەوە ئاگرێکم بەدی کردووەو دەچم بۆئەوەی گرێکتان بەکۆتەرە دارێکەوە بۆ بێنم تـاکو (بەڕۆشنایی یەکەی) ڕێگای خۆمان بدۆزینەوە، یاخود خۆمانی پێگەرم کەینەوە، یـان پرسـیار لەکەسانی نزیك ئاگرە بکەم دەربارەی ڕێگامان و ڕێنماییمان بکەن بۆ سەر ڕێی خۆمان).

ئینجا(موسـا)بەرەو لای ئاگرەکە ڕۆشت و هەر کە نزیك بووەوە یەکسەر گوێی لەبانگێکی خودایی بوو کە پێی فەرموو:(ڕاوەستە ئەی-موسـا-ئەوە من(خودای پـەروەردگارتم) لەگـەڵتا دەدوێم، تۆش دەبێـت لـەم جێگەیـەدا پێڵاوەکانـت دا بکـەنیت(لەبـەر ڕێـزی شـوێنەکە) وەك بەئەدەبی و لەخۆبوردنێکیش لەتۆوە، چونکە تۆ لەدۆڵی پاککراوەی(طوی) دایت).

هەر لەوێش دا-موسا-ئەم فەرمایشتە گەورەیەی لەخودای خۆیەوە بیست دەربارەی مژدەی بوون بە پێغەمبەرو لەئەستۆنانی کاروبارە سەنگینەکانی، هەروەك خودا پێی فـەرموو: (ئـەی موسا من تۆم بۆ کاری پێغەمبەرێتی هەڵبژاردووەو گوێ بگرە بەچاکی لەمەی بەسرووش بـۆت دێت: من هەر خۆم خودام و ناوم (الله)یەو هیچ خودایەکی پەرستراوی دیکە جگە لەمن نی یەو تۆش هەر تەنها من بپەرستەو گوێڕایەڵی من بە، ئەوەش بزانـە کـە ڕۆژی قیامـەت بـەبێهیچ

گومانێك دێت و دەبێت هەموو كەسێك محاسەبەو دادگایی لەسەر كردەوەكانی بكرێت، تۆش نەهێڵێت هیچ شتێك ئەو ڕۆژەت لەبیربباتەوەو ڕێی كارو كرداری چاكەت لەپێناویدا لێ بگرێت. هەر كەسێكیش باوەڕ بەهاتنەدیی وەها ڕۆژێك نەكات ئەوا خۆی شایستەی سزا سەختەكەی دەكات)..

پاشان خودا هەندێك لەموعجیزەكانی خۆی پیشانی-موسا-دا، وەك ئەوەی داوای لێ كرد كە گۆچانەكەی دەستی (واتە دارەدەستەكەی) فڕێ داتە سەر زەوی و خێرا ببێت بەمارێكی ڕاستەقینەی گەورەو خۆی لوول كات و بجوولێت و بزوێت و ترس وبیم بخاتە دڵی بینەرانیەوە. هەروەها خودا داوای لێكرد دەستی بخاتە گیرفانی یەوەو دوایی دەری بێنێتەوەو سەیری كات چۆن ڕەنگی دەستی سپی هەڵگەڕاوەو بەشێوەیەك دەدرەوشێتەوەو پرشنگ دەدا كە وەك مانگ و خۆر ڕەونەقێكی تایبەتیی وەرگرتووە..

ئینجا خودا فەرمانی پێدەكات كە دەبێت بەم دوو موعجیزە گەورەیەوە(داربەدەستەكەی و دەستی نێوگیرفانی)یەوە بچێت بۆلای فیرعەون و پەیامی خوداو ڕێی ڕاستی پێ ڕاگەیەنێت، چونكە بەڕاستی ئەو پادشایە لەسنووری خۆی تێپەڕیوەو لەزوڵم و ستەم دا ڕۆچووە.

جا لەبەر ئەوەی كاری بەرەو ڕوو بونەوەی ستەمكارێكی وەك (فیرعەون)یش پێویستی بەوپەڕی ئازایەتی و چاوقایمی و چەلەنگی یە، (موسا) داوای لەپەروەردگاری كرد كە سینەی فراوان كات بۆ وەرگرتن و لە ئەستۆنانی ئەو پەیامە گەورەو گرانە و دەركردنی هەر خەم و پەژارەیەك لەسینەی و یاریدەدەریشی بێت لە زمان ڕەوانیو دەربڕینی وتەكانیدا، هەروەها (هارون)ی براشی لەگەڵ دابنرێت و بیكاتە پاڵپشتێك بۆی لەگەیاندنی ئەو پەیامە قورسەدا، خوداش ئەم نزاو داواكاریانەی (موسا)ی پەسند كردو هەرچی داوای كردبوو پێی بەخشی بۆ ئاسان كردنی كارەكەی.

لەم ئایەتانەی خوارەوەش دا كە (خوێنەری خۆشەویست) دەیانخوێنێتەوە، خودا وەسفی سەرەتای پەیام و بوون بەپێغەمبەری موسای تێدا دەكات و بەشێوەیەك لەگوزارشت و دەربڕینی بێوێنە وەسفی دەكات كەسام و شكۆی مەقامی بەرزی پەروەردگاریتی (ربوبیة)ی خودا دەردەخات:

﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ يَـٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّىٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾ وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ

إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ[1] ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا[2] لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّي وَزِيرًا[3] مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي[4] ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِيٓ أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾طه/٩-٣٦

## خودا فەرمان بە (موسـا) دەكات بچێت بۆ لای فیرعەون

خودای مەزن (موسـا)ی سازو ئامادە كردبوو بۆ پێسپاردنی پەیامەكەیو هەموو ئەو نزاو داواكاریانەشی بۆ جێبەجێ كرد لەئالیەتی گەیاندنی بانگەوازدا، ئەوە بوو (هـارون)ی برایـشی لەگەڵ دا ناردو فەرمانی پێكرد كە (موسـا) خۆی و ئـەو برایـەی بـچن بـۆلای فیرعـەون بـەو مـوعجیزە و بەڵگـە بەهێزانـەوە. هـەروەها وریـای كردنـەوە لـەوەی كـە هـیچ سـستی و كەمتەرخەمی یەك لە زیكر و یادی خودا و گەیاندنی پەیامی دا نەنوێنن. بەڵام داوای لێكردن كە بۆ مەبەستی گەیاندنی پەیام و بانگەواز بۆ سەر ئایین و ڕێبازی ڕاستی خـودا یەكـەم جـار بەتایبەتی بـۆ لای-فیرعـەون-بـچن چـونكە هـەر ئـەوە كـە لەسـتەم و زۆرداری‌ـدا ڕۆچـووەو زیادەڕەویی كردووەو سەرچاوەی هەموو بەدكاری و گومڕایی یەكیشە.

ئینجا خودا نێرراوانی خۆی (واتە موسـاو هارون)ی راسپارد بەوەی كەزۆر بەنەرم و نیانی و بەگفتاری سادەو شیرین (فیرعەون) بـدوێنن تـاكو بـەم شـێوە ئاخاوتنـە لـەمیزاج و سروشـتی زۆرداری یەكەی كەم بێتەوەو ئەویش بەنەرمی گوێ بگرێت، بەشكم وتـەكان بـەدڵ و دەروونـی بگەن و ئەوانیش بەوتەی جوان و ناسك بچنە ناخی قوڵایی بیرو هۆشـی یـەوە و بـەم ڕەنگـەش

(١) (الساعة): ڕۆژی قیامەت.

(٢) (أكاد اخفيها): نامەوێت كاتی هاتنی دیاری بكەم و خەڵكی بزانن كەی دێت.

(٣) (وزيراً): پاڵپشتێك، یاریدەدەرێك.

(٤) اشدد به ازري: پشتم بەهێز بكە بەهۆی ئەوەوە.

لەخودا بترسێت، ئەوەبوو (موسا و هارون) بەخودایان گوت (ئێمە لەدڵڕەقی ودڕندەیی ی-فرعەون-دەترسین و گومانمان وایە گەر ئەم پەیامەی پێبگەیەنین لەوانەیە بەهۆی ڕق و تووڕەیی زۆریەوە سزامان بدات یان زووتر دەستمان لێ بووەشێنێت)..خوداش لەوەڵامی ئەو وتەیەیان دا فەرموی: (مەترسن لەو کارەساتەی کەوا گومان دەبەن بەسەرتان بێت، چونکە من خۆم لەگەڵتانم و دەبیستم و دەبینم و لەزوڵمی ئەو دەتانپارێزم)..

پاشان خودا داوای لێ کردن بە"فیرعەون" بڵێن: (ئێمە دوو نێرراوی ئەو خودایەین کە تۆش بەندەیەکیت لەبەندەکانی، نەك بەپێی ئیددیعای خۆت خواوەندێك بیت. جا بۆت ڕەوا نیەیە کە نەوەی "ئیسرائیل" بەدیل و کۆیلە دابنێی و ئازادییان لێ زەوت بکەیت، بەڵکو دەبێت ئازاد و سەربەستیان کەیت، تاکو بتوانن بە ئازادی و بەخواستی خۆیان لەگەڵ ئێمەدا بێن، هەروەها مافی ئەوەت نیەیە ئازاریان بدەیت لەکاری قورس و گران دا و بیان چەوسێنییەوە. ئێمەش بەڵگەی تەواوو ڕۆشنمان پێیە لەسەر ئەوەی کە راسپێراوین بەگەیاندنی ئەم وتانە بەتۆ.. ئاشتی وبەختیاریش بۆ ئەو کەسەیە کە دوای هەق دەکەوێت و پەیڕەوی دەکات وباوەڕ بەخودای تاك و تەنها دێنێت)..

ئەمەی پێشووش بەشێکی دیکەی بەسەرهاتەکە بوو ، کە خودا فەرمانی خۆی بەوان دەکات و، دەفەرموێت: ﴿ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَـٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَـٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَـٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾طه/٤٢-٤٧.

## "موسا" و "هارون" پەیامی خودایان دەگەیەنن

"موسا" و "هارون" بەدەم فەرمانی پەروەردگاریانەوە چوون و پەیامەکەیان گەیاند، لەو وتانەی، کە"موسا" بە-فیرعەون-ی گەیاند ئەوە بوو ئەو بێجگە لەوتەی هەق دەربارەی خودا، هیچی تر نالێت.خوداش بەچەند(تایبەتمەندی و موعجیزەیەکی بەدەر لەهێزو توانای مرۆڤ)پشتگیری کردووە بۆشایەتی و بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە بەڕاستی ئەو پێغەمبەری خودایە،هەروەها داوای لە-فیرعەون-کرد ڕێ بدات(بنو اسرائیل)لەگەڵی دا بڕۆن بۆ (فەلەستین)..

خودای مەزن لەم بارەیەشەوە فەرموویە: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرۡعَوۡنُ إِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ[1] عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾الأعراف/١٠٤-١٠٥.

(فیرعەون) وتەکانی (موسای-بەخێوکراوی پێشووی خۆیان)ی لەلا سەیرو سەمەرە بوو، بۆیە لەوەڵامی وتەو داواکاری یەکەی دا دەستی کرد بەمنەت باران کردنی-موسا-و باس و خواسی چاکە لەگەڵکردنی و بەخێوکردنی نێومالّی خۆی لەکاتی منداڵی ی دا، دیارە ئەم هەموو منەت و پیاوەتی یانەش وای لێ دەخوازن کە دەبێ بەوەفاو بەئەمەك بێت بۆ (فیرعەون) و لەجیاتی ئەم بانگەوازە خۆی بەدوور بگرێت لەهەر هۆیەك کە وەڕسی بکات.

پاشان (فیرعەون) وەك هەر زۆردارێکی هەلپەرست و خۆپەسندی دی (موسا)ی بەوە تاوانبار کرد کە پیاوێکی لەگەلی (فیرعەون) کوشتووە وبەو کارەش کە تاوانێکی کوشتنە گوناهبار بووەو ناکەوێتە بەر ڕەحمەتی ئەو خودایەی داوای پەرستنی لێ دەکات و شایانی ئەوەش نییە کە پڕوپاگەندەی (لەئەستۆنانی ئەرکی پەیامی خودا) بۆ خۆی بکات و خۆی بەپێغەمبەرو نێرراوی ئەودابنێت.

موسا-لەوەلاّمی ئەو قسانەی-فیرعەون-دا ئەوەی دووپات کردەوە کە ئەو هەرگیز مەبەستی کوشتنی کابرای (فیرعەونی) نەبووە، بەڵکو تەنها مشتەکوڵەیەکی پیادا کێشاوەو نەیزانیوە ئەوە دەبێتە هۆی مردنی، پاکانەی خۆیشی لەهەلاّتنی دا ئەوەبوو پێی گوت: (ئیدی من دەترسام سزام بدەن لەسەر کوشتنێك کە هەرگیز لەوەو پێش خۆم بۆ ئامادە نەکردووە. هەر بۆیەش لە-میسر- دەرچووم و هەلاّتم لەدەستتان. دوای ئەمەش خودا حیکمەت و زانستی پێ بەخشیم و هەڵی بژاردم بۆ کاری پێغەمبەرێتی).

لەوەلاّمی ئەو منەت بارانەی (فیرعەون)دا، کە گوایە بەمنداڵی بەخێویان کردووە، گوتی: (ئەرێ تۆ منەتی چیم بەسەردا دەکەیت؟ ئایا تەنها بەخێوکردنی من لەمنداڵیدا بەنازو نیعمەتێك دادەنێیت لەکاتێك دا تێکڕای نەوەکانی (بنو اسرائیل)ت دیل و یەخسیر کردووە؟ خۆ ئەگەر لەتافی منداڵیم دا چاکەیەکتان لەگەڵ من دا کردبێت ئەوا لەهەمان کاتدا تا ئەمڕۆ سەرجەم رۆڵەکانی گەلەکەی من (بنو اسرائیل) بەدەست سەرشۆڕی و ژێردەستەیی ژێر حوکمی تۆوە دەناڵێنن، منیش بەو دیاردەیە دڵتەنگم و هاوزام و هاوئازاریانم و سوورم لەسەر چاکردنی بارودۆخیان)..

---

(١) (حقیق): سوورم لەسەری، شایانی ئەوەم.

ئەم وت و وێژەش بەشێکی دیکەی چیرۆکەکە بوو کە شیکاری ئەم چەند ئایەتە بوو:
﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَا إِذًا وَأَنَا مِنَ الضَّالِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْمًا وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴾الشعراء/١٨-٢٢.

## وتووێژێکی نێوان "موسا" و "فیرعەون" دەربارەی پەروەردگارێتی-خودا-

(فیرعەون) پەیامی(موسا)ی بەشتێکی نامۆو غەریب داناو دەستی کرد بەدەمەتەقێو مشت و مڕ لەسەر پەروەردگارێتی(ربوبیة)ی خودا و لەموسای پرسی: (ما ربّ العالمین)، موساش بە (فیرعەون)و دەست و پێوەندەکانی گوت: (پەروەردگاری جیهانیان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەو شتانەی لەنێوانیان دایە گەر ئێوە پەی بەڕازی توانای خودای تیاداببەن)..

لەو کاتەدا فیرعەون ئاوڕێکی بەلای لایەنگرانیدا دایەوەو بەسەرسامییەوە گوتی: (ئەرێ گوێتان لەو قسانەیە؟) (موسا)ش بەردەوام بوو لەوتەکانیداو گوتی: (پەروەردگاری ئێوە پەروەردگاری باب و باپیرانی پێشینیشتانە) کە ئەو کاتە (فیرعەون) هەر لەئاراش دانەبووە.

لەوەڵامی ئەم وتەیەش دا (فیرعەون) خۆی بۆ ڕانەگیراو وای لەقەڵەم دا، کە (موسا) شێتە، چونکە دەربارەی چەند مەسەلەیەکی نادیار دەدوێت. بەڵام(موسا)لەدرێژەی وتەکانی دا گوتی: (خودا پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاواو هەموو ئەو ناوچانەی نێوانیشیانە گەر ئێوە ژیرو هۆشمەندبن)..

ئەمەش بەشێکی دیکەی بەسەرهاتەکەیە لەقورئان دا، کە خودا تیای دا دەربارەی ئەو دەمەتەقێیەی نێوان (فیرعەون)و (موسا) دەفەرموێت: ﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴾الشعراء/٢٣-٢٨.

جا (موسا و هارون) کاتێك دیتیان ئەوا فیرعەون بەدەم بانگەوازەکەیانەوە ناچێت و ڕووی لێ وەردەگێڕێت هۆشدارییان پێدا لەسەر ئەوەی کەوا خودا سرووشی بۆ ناردوون لەسەر هەواڵی سزادانی هەر کەسێك لەوانەی بەرپەرچی بانگەوازەکەیان دەداتەوەو پەسندی ناکات.

لەو ساتەدا (فیرعەون) دەربارەی حەقیقەتی پەروەردگارەکەیان پرسیاری لێ کردن، ئەوانیش تێیان گەیاند کە خودای پەروەردگار ئەو خودایەیە کە هەموو شتێکی دروست کردووەو ژیانی بەهەندێك لەدروستکراوان و مەخلووقاتی داوە و پاشان ڕێنموونیی کردوون بۆ پاراستنی ئەو ژیانەیان بەپێی ئەو شێوازو خواست و غەریزە تایبەتیانەی کەلەناخیان دا خوڵقاندوونی.

پاشان فیرعەون پرسیاری دەربارەی حاڵ و کاروباری نەتەوەکانی پێش خۆیان کرد کە داخۆ چییان پەرستبێت و ئایا دەکەونە بەر ڕەحمەت یان سزای خودا؟ دیارە (فیرعەون) بەم پرسیارە ویستوویەتی بابەتی گفت و گۆکە بگۆڕێت بەوەی، تا(موسا) دوورخاتەوە لەناوەڕۆکی مەبەستە بنچینەیی‌یەکەی خۆی، یان بۆ ئەوەی داوای زانست و زانیاریی لەسەر هەندێك مەسەلەی غەیبی لێ بکات. بەڵام (موسا) لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا کاری زانینی بارودۆخی نەتەوەکانی پێش خۆیان دەباتەوە بۆ عیلمی خوداو کە هەر خودا خۆی دەزانێت چییان پەرستووەو چارەنووسیان بەکوێ گەیشتووە؟ چونکە زانست و زانیاری لەو بارەیەوە تەنها لەلای خودایەو لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوەو خوداش لەحوکم و بڕیاری دا هیچ هەڵەیەك ناکات و (سبحان الله-لەهەموو ئەو جۆرە شتانە) هەروەها هیچ کەسێکیش لەبەندەکانی خۆی لەبیرناکات لەهەر کات و شوێنێك دا بووبن.

پاشان(موسا) هەندێك لەنیشانەکانی قودرەتی خۆی بۆ ژماردن کە هەموویان بەڵگەن لەسەر وجودی خوداو هەموو کەسێکی ژیرو هۆشمەند دەرکی پێدەکات، وەك ڕاخستنی زەوی و بەیدەست کردنی بۆ خەڵکی وباراندنی ئاو لەو ئاسمانەوەو سەوزبوونی چەندەها جۆری ڕووەك و گژوگیاو دارو درەخت بەو ئاوەو ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵیش بەو بەروبوومانەی زەوی و بە ئاوو بەزەوی یەکەش..

﴿ إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا[1] وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُولِي النُّهَىٰ ﴾ طه/٤٨-٥٤.

(١) (مهداً): واتە ڕام و ئاسانی کردووە وەك بێشکەو جۆلانە، واتە خودا زەویی وەك پێخەف و شوێنی نووستن بۆ مرۆڤ ڕەخساندووە.

## "فیرعەون" فەرمان دەکات بەبنیات نانی کۆشکێك بۆ سەرکەوتن بۆ ئاسمان

" موسـا "بەوپەڕی ڕژدی و سووربوونەوە زۆر هەوڵ و تەقەللای دا کە(فیرعـەون)بانگ بکات بۆ باوەڕهێنان بەخودا لەنێو کۆڕ و کۆمەڵی خۆی دا و لەم ڕووەوە زۆر لەگەڵی دا خەریك بوو.

بەڵام لەبەر ئەوەی (فیرعەون) بەبۆچوونی خۆی وای گومـان دەبـرد، کـە ئـەم باوەڕهێنانـە لەشان و شەوکەتی دادەبەزێنێت و ترس و سامی لەلای خەڵکی کەم دەکاتەوەو ڕێزو شکۆی کاڵ دەکاتەوە، بۆیە فەرمانێکی بۆ وەزیرەکەی خۆی (هامـان) دەرکـردو داوای لێکـرد تـەلارێکی بەرزی بۆ بنیات بنێت تاکو بڕوانێت بۆ (خوداکەی موسـا)و بیناسێت.

دیارە(فیرعــەون) بـەو ڕادەیـەش نـەفام و سـاویلکە نـەبووە کـە هیـوای ئـەوە بخوازێـت و بەساختمانێکی بڵند ئاسمان بەیدەست کات، بەڵام بەم کارەی ویستوویەتی ئەو گەلەی خۆی فریو بدات و چەواشەیان بکات تاکو هیچ شك و گومانێکیان لەتوانای -فیرعەون-بۆ دروست نەبێت.

ئەی ئاخۆ فیرعـەون دوای تەواوبوونی کۆشکەکە و دوای سـەرکەوتنە سـەری و ڕوانینـی بـۆ ئاسمان چی بەو خەڵکەی چواردەوری خۆی ڕاگەیاندبێت؟ ڕاڤەکاران و خاوەنانی (تەفـسیر) لـەم ڕووەوە ئەوەیان باس کردووە کاتێك (هامـان) ئـەو کۆشـك و تـەلارە بڵنـدەی تـەواو کـردووەو هێندەی لەتوانای دا بووبێت بەرزی کردۆتەوە، (فیرعەون)یش دوای ئـەوە چـۆتە سـەر بانیـژەی دوایین باڵەخانەی کۆشکەکەو تیرێکی ئاراسـتەی ئاسمـان کـردووە و گوایـە لـەکاتی هاتنـەوەی تیرەکەی دا(سەری تیرەکە) خوێناوی بووە[1]، ئینجا (فیرعەون) هـاواری کـردووەو گوتوویـەتی: (ئاگاداربن ئەوا خوداکەی موسـام کوشت).

ئەم چەند دێڕەی پێشووش قۆناغێکی داستانەکە بوو و تەفسیرو شیکاری ئەم چەند ئایەتەش بوو کە ئەو بەشەی داستانەکە دەگێڕنەوە و خودا تیای دا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ[2] فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ[3] ﴾ غافر/٣٦-٣٧.

---

(١) بێگومان فیرعەون لەوەو پێش بەدەستی خۆی تیرەکەی بـەخوێن ڕەنـگ کردبـوو تـا بنـچینەو ئەسـڵی مەسەلەکە لەو گەلە بشارێتەوە.

(٢)(اسباب السموات):بەمانای(ابواب السموات)،واتە ئەودەرگایانەی ئاسمان و ئەوڕێگایانەی بەرەوئەوێ دەچن.

(٣) (تبـاب): واتە: (لەناوچوون وخەسارەتمەندی).

# بەندی سێ یەم

## (( تێکۆشانی " موسا" و گەلەکەی ))

( موعجیزەکانی "موسـا" وباوەڕهێنانی سیحربازەکان - خۆ ڕاگرتنی "موسـا" و شوێنکەوتوانی - باوەڕدارێکی بنەماڵەی (فیرعەون) هۆزەکەی بەئاگا دێنێتەوە - باوەڕدارەکە بانگەواز بۆ رزگاری دەکات - بەخۆوە نازینی فیرعەون. )

## موعجیزەکانی " موسـا" وباوەڕهێنانی سیحربازەکان

مشتومڕی نێوان "فیرعەون" و " موسـا" لەسەر (مەسـەلەی پەیامـە خـودایی یەکـەی) کەوتە قۆناغێکی توندترەوەو (فیرعەون) داوای لـە "موسـا" کـرد بەڵگەیـەك بـۆ سـەلماندنی ڕاستیی قسەکانی بخاتە ڕوو. "موسـا"ش خێرا لەو کاتەدا داردەستەکەی دەستی فرێدایە سەر زەویو یەکسەر بوو بەو مارە گەورەیەی کە بەڕاستی دەجووڵایـەوەو کـەس گومـانی لەجووڵـە وبزاوتنی نەبوو، هەروەها "موسـا" دەستیشی لـەگیرفانی دەرهێنـاو بـەو سپێتی و پرشـنگە بەتینانەی پیشانی دان کە تەماشاچییانی سەرسام دەکرد.

فیرعەون و دەست و پێوەندەکانیشی ئەوەیان بینـی و بـەڵام بەئانقەسـت و بـەدەمارگیریی خۆیان بەردەوام بوون لەسەر بەدرۆخستنەوەی "موسـا" و، ئـەو دوو دیاردەیەشـیان بەسـیحرو ئەفسانەبازی دانا، لەنێو خۆشیان دا ڕاوێژیان دەربارەی "موسـا" کـردو پێیـان لەسـەر ئـەوە دادەگرت گوایە ئەویش سـیحربازێکی شـارەزایەو مەبەسـتی لـەم سـیحربازییەش دەرکردنـی ئەمانە لەخاکی (میسر) تاکو خۆی بکات بەپادشای وڵاتەکەیان.

ئینجا (فیرعەون) لەو ڕاوێژکارانەی خۆی پرسی کە بۆ مەسەلەی "موسـا" چی بکەن؟ ئـەو ڕاوێژکارو پیاوماقووڵانەی چوار دەوریشی ئاماژەی ئەوەیان بۆ فیرعەون کرد کە بـۆ ماوەیـەکی تریش (موسـا وبراکەی) لەلای خۆیان بهێڵنەوە هەتا دەنێرن بەدوای سیحربازەکانی خۆیـان داو لەسەرانسەری (میسر)ـەوە کۆیان بکەنەوە تا لەبەردەم (موسـا)دا هـەمان سـیحری وەك ئـەو پیشان بدەن. چونکە گەر ئەو موعجیزەیەی "موسـا" پیشانی دابوون و کە ئـەوان بەسـیحریان دادەنا، هەر کەسێکی دی هەمان هونەری ئاوا پیشان بـدات و توانـای ئـەوەی هـەبێت، ئـەوە بێگومان موعجیزەکەی (موسـا) لەبار دەبات و بانگەوازەکەشی پووچەڵ دەبێتەوە.

(فیرعەون) بەپێی ئەو بیروڕایە هەموو لایەنگرو کارگوزارانی بۆ سەرانسەری(میسر) نارد بەدوای سیحربازەکانی وولات دا و ژمارەیەکی زۆریان لێ گەیاندنە کۆشکی پاشا بۆ بەربەرەکانی کردنی(موسا). بەڵام پێش ئەوە داوایان لە فیرعەون کرد کە کرێیەکی زۆریان پێبدات گەر بەسەر(موسا)دا سەرکەوتوو بن لەکاری سیحربازی دا. (فیرعەون) بەو مەرجە قایل بوو و پەیمانی پێدان کە تەنانەت دەیانکات بەکەسانی نزیك لەخۆی.

جێی باسیشە لەو سەردەمەدا(سیحرو ئەفسانەکاریو جادووگەری) بایەخێکی گەورەیان لەوولاتی(میسر)دا هەبووە و پادشاو سەرکردەکان گرنگی یەکی تایبەتییان پێ دەداو خەڵاتیان بەسیحربازان دەبەخشی. ئاسەواری ئەم دیاردانە لەم دواییانەدا لەلایەن دەزگای شوێنەوارناسی(میسری)یەوە دۆزراونەتەوە.

وادەی ڕۆژی دیاری کراو بۆ پێك گەیشتنی(سیحربازەکانی فیرعەون)و (موسا)هاتە پێشەوەو جەماوەرێکی زۆریش لەخەڵکی ئەو وولاتە بانگکرابوون بۆ مەیدانی پێك گەیشتنەکەو بینینی سیحرو جادوو، ئەو ڕۆژەش بەڕۆژی خۆڕازاندنەوە(یوم الزينة) ناسرابوو، واش دادەنرێت کە بەڕۆژی(وەفاداری ی ڕووباری نیل[1]) ناوبرابێت، ئەم ڕۆژەش گەورەترین جەژنی ئەو گەلە بووە لەو زەمانەدا،(موسا) کە سیحربازەکانی بینی لە وت و وێژێکی کورتی نێوانیان دا لێ یان پرسی: (ئایا یەکەم جار ئێمە دەست بە نمایشی سیحرەکانمان بکەین یا تۆ؟)(موسا)سووربوو لەسەر ئەوەی دەبێت ئەوان یەکەم جار سیحری خۆیان پیشان بدەن.

کەرەسەکانی ئەوانیش چەند گوریس و داردەستێك بوو و هەموویان فڕێ دایە سەر سەکۆی شانۆکەو ئەو جێگایەیان (بەپێی سیحری خۆیان) پڕکرد لەماری هەمەجۆر بەنێرو مێو گەورەو بچووکیانەوە، هەتا موساو ئەو جەماوەرەی لەوێش ئامادەبوون وایان دەزانی دێن و دەچن و دەجووڵێنەوەو ئازار دەگەیەنن، هەر بۆیەش خەڵکەکە لەدیمەنی ئەو هەموو مارە زۆر ترسان و سام و دڵەڕاوکێیەکی زۆریان لێ نیشت.

دیارە فیرعەون و گەلەکەشی بەوە شادو دڵخۆش بوون و دڵنیا بوون لەسەرکەوتنی سیحربازەکان و(بەدیدو بۆچوونی خۆیان)وایان دەزانی موسا ناتوانێت بەرامبەریان بووەستێت و بیانبەزێنێت... بەڵام خودا سروشی بە-موسا-دا کە دوای ئەوان داردەستەکەی خۆی فڕێ داتە سەر زەوی، ئەویش فڕێی داو دەسبەجێ لەوێدا بوو بە مارێکی گەورەو خێرا خێرا کەوتە قوت دانی هەموو مارەکانی ئەوان و لەماوەیەکی کەم دا هەموو درۆو چاوبەستی و فڕوفێڵێکیان لەکاری سیحربازی دا پووچەڵ کردەوە.

---

(١) یان بەڕۆژی (شکاندنی بەربەستی کەنداو لە-میسر- ) دادەنرێت، بڕوانە قاموسی (المعجم الوسيط) بەرگی یەکەم. ( وەرگێر).

فیرعەون و گەلەکەی زۆر سەریان سوڕماو سیحربازەکانیش بۆیان دەرکەوت کەبەڕاستی ئەوەی(موسا) ئەنجامی دا هەرگیز سیحر نی یەو سیحر ناتوانێت ڕۆڵی ئاوا بگێڕێت، بەڵکو هەر تەنیا هێزێکی خودایی یە کە دیمەنی ئاوا نمایش دەکات، هەر بۆیەش سیحربازەکان لەوێدا کڕنووشیان بۆ خودا بردو گوتیان (ئەوا ئێمە باوەڕمان بەخودای پەروەردگاری جیهانییان هێنا، بەخودای موساو هارون).

فیرعەونیش بەچاکیو دڵنیایی یەوە بۆی ڕوون بووەوە کە بێگومان لەم ڕێو ڕەسمەی ڕۆژی چەژنی(زینة)دا (موسا)ی بۆ نەبەزێنراوە، بەڵکو لەڕاستی دا-موسا-ئەوی بەزاندووە، بەڵام ویستی کەبەزین و شکستی پەردەپۆش کات و لاریی لەسەر بکات، بۆ ئەم مەبەستەش بێشەرمانە بەهەموو سیحربازەکانی گوت: (موسا خۆی گەورەو مامۆستای ئێوەیە لەسیحرداو هەر خۆی فێری سیحربازیی کردوون، بۆیە بەسەرتان دا سەرکەوت و بەسیحرەکەی خۆی سیحری ئێوەی لەناوبرد)... (فیرعەون) وێڕای ئەم قسەیەش چاك دەیزانی، کە(موسا) هەرگیز ئەوانی نەناسیوەو، تا ئەو ڕۆژە سیحربازەکانی نەدیبوو. جا دیارە گومانیشی تێدا نی یە کە مرۆڤی بەزیو و دۆڕاو هەمیشە پاساوێکی سەیرو سەمەرە بۆ خۆی دێنێتەوە.

(فیرعەون)دوای ئەو قسەیە بەتوندی هەڕەشەی لەسیحربازەکان کردو هێزو زەبری کاریگەری خۆی پیشان دان و پێی گوتن (ئەرێ چۆن باوەڕتان بە-موسا-هێنا پێش ئەوەی داوای مۆڵەت لەمن بکەن).

بەم قسەیەی دوایش خۆی وا دەلەنگاند گوایە مافی هەڵسوکەوت و هەڵسووڕاندنی ڕەوتی ئیدراك و مەعریفەیانی هەیەو هەر خۆی ڕەفتار بەناخی دەروونی ئەوانیشەوە دەکات، هەروەها خۆیشی وا دەردەخست گوایە خەریك بووە ڕێی ئەو باوەڕهێنانەیان پێبدات، بەڵام ئەوان بەو باوەڕهێنانەیان تاوانیان ئەنجام داوە، چونکە پێشتر مۆڵەتێکیان لە(فیرعەون) نەخواستووە. پاشان هەڕەشەی دەست بڕین و قاچ بڕینی لێکردن، جگە لە هەڕەشەی لەقەنارەدان و هەڵواسینیان بەلقەکانی دارخورماوە.

سەرەڕای ئەم هەموو هەڕەشەو گوڕەشەیەش سیحربازەکان تۆزقاڵێك لەو باوەڕهێنانەیان پاشگەز نەبوونەوە، بەڵکو گوتیان: (ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوەو سزای تۆش تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئیمانمان بەموسا هێناو بڕوامان پێ کرد و ملکەچی بەڵگەو نیشانە ڕوون و هەق دەرخەرەکانی خودای خۆمان بوین)..

ئینجا ئەو باوەڕدارە تازانە بەدەستی دوعاو پاڕانەوەوە ڕوویان لەقاپی بارەگای خوداکردو لەنزاکانیان دا گووتیان (ئەی خودای پەروەردگاری ئێمە ئارامی یەکی زۆر و گەورەمان پێ ببەخشە بۆ بەرگەگرتنمان لەسەر سزاکانی فیرعەون وبەملکەچی تەواوو خۆتەسلیم کاری هەموو ڕێساو ڕێبازەکەت بمانمرێنیت).

ئەمەی پێشووش گێڕانەوەی ئەلقەیەکی تری داستانەکەو شیکاری ئەم ئایەتانەبوو کە ئەم بەشەی داستانەکە دەگێڕنەوەو کە خودای پەروەردگار تیایان دا فەرموویە:﴿ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ[١] مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ۖ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ[٢] وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَـٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُوا۟ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَـٰغِرِينَ[٣] ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَـٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَمَكْرٌ[٤] مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَـٰفٍ[٥] ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَـٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ[٦] ﴾الأعراف/١٠٦-١٢٦..

---

(١) (الملأ): (الاشراف) واتە (پیاو ماقوولان و کەسانی ناسراو و خاوەن پلەو پایەی کۆمەلایەتی).

(٢) (أرجه): واتە کارەکەی دوابخەو بیهێڵەوە.

(٣) (انقلبوا صاغرين): بەسەرشوڕیو زەلیلی گەڕانە دواوە و دۆڕاندنیان.

(٤) (المكر): الخداع: واتە فروفیڵ، تەفرەدان، چەواشەکاری.

(٥) (من خلاف): لە هەر لایەك لەلایەکانی جەستەوە، وەك بڕینی دەستی ڕاست لەگەڵ بڕینی قاچی چەپ دا، یان بەپێچەوانەوە.

(٦) (مسلمين): لەوشەی (اسلام)ـەوەیە واتە خۆتەسلیم کردنی مرۆڤ بەگیان و جەستە و هەست و نەستەکانیەوە بەخوداو خۆیەکلاکردنەوەی بۆ خودا و هیچ خوداو پەرستراوێکی تر جگە لە (الله) نەپەرستێت و لەهیچ ڕوویەکەوە دانیان پێ دانەنێت.

# خۆڕاگرتنی-موسـا- و شوێنکەوتوانی

(فیرعەون) بەچاوی خۆی ئەو بەڵگەو نیشانە بەهێزانەی کە (موسـا) پیشانیدان، بینی و بەڵام هەر بەردەوام بوو لەکفرو بێباوەڕیی داو سووربوو لەسەر لاری و نکوولی کردن. کەسانی بەناو پیاوماقووڵو (اشراف)ی گەلەکەشی سەرزەنشتیان کرد لەسەر ئەوەی چاوی نوقاندووە لەو دیاردەیەی کەوا (موسـاو شوێنکەوتوانی) تەنها خودا دەپەرستن و بەم هۆیەشەوە(پەرستنی فیرعەون و خواوەندەکانی)یان فەرامۆش کردووە. بەرای ئەو (گەورە پیاوانە) ئەوە هۆکارێکی تێکدان و فەسادی سەر زەوی بوو.

فیرعەونیش ئەوانی هێمن کردەوەو بەڵێنی دا لەسەر ئەوەی، کە گوتی: (چۆن چاویان لێ دەنووقێنم؟ دەبێت هەموو کوڕەکانیان بکوژم و ئافرەتەکانیشیان بۆ کۆیلایەتی بهێڵمەوە). ئیتر دەستی کرد بەجێبەجێکردنی ئەوهەڕەشە نالەبارەی و توندتر کەوتە سزادان و چەوساندنەوەی خەڵکی.

بێگومان (بنو اسرائیل)یش سکالای حاڵی خۆیان لەلای (موسا) کرد لەسەر ئەوەی چەندە کەوتوونەتە بەر زوڵم و ستەمی لەڕادەبەدەری-فیرعەون-"موسا"ش داوای لێکردن ئارام بگرن لەسەر ئەو بەڵایەی تووشیان بووەو تەنها پشت بەخودا ببەستن و داوای کۆمەك و یارمەتی لێبکەن. پەیمانیشی پێدان کە ئەگەر ئەوان بەتەقواو پارێزکارو لەخواترس بن ئەوا سەفرازو ئازاد دەبن. بەڵام ئەمە لەئازاری بەڵاو ناڕەحەتییەکانیانی کەم نەکردەوە، بەڵکو بەغەمبارییەوە گووتیان: (ئێمە لەپێش ئەوەدا بەم پەیامەوە بێیت بۆ لامان، ئازار دەدراین، وەك چۆن دوای بوونیشت بە پێغەمبەر هەر ئازار دەدرێین). (موسـا)ش هاوخەمیو هاوسۆزیی بۆ دەربرین و پێی گوتن: (ئێوە بەو تەقواو (خۆپارێزی یەتان لەکوفرو گومڕایی) تکاو نزا لە لای خودای پەروەردگارتان بکەن بەشکم خودا دوژمنەکەتان لەناوبەرێت و بتانکات بە جێنشین لەسەر زەوی و لەو وڵاتەی بەڵێنی پێداون، پاشان دوای ئەمەش تاقیتان بکاتەوەو ببینێت و (ببینن) چ کارو کردەوەیەك ئەنجام دەدەن و، تا پاداشتتان بداتەوە یان سزاتان بدات لەسەریان..

﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ وَنَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ

عِبَادِهِۦ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴾ الأعراف / ١٢٧- ١٢٩.

## باوەڕداریکی بنەماڵەی (فیرعەون) هۆزەکەی بەئاگادینیتەوە

(فیرعەون) چی دی لە حەوسەڵەو توانای دا نەما کە-موسا-و شوینکەوتوانی بەو شیوە ببینیت، بۆیە خۆیو هۆزەکەشی دەستیان کرد بەپیلان دانان بۆ کوشتنی "موسا" و لەریشە هینانی ئەوەی بەتیکدان و فەسادیان ناودەبرد).. خودای مەزن لەم بارەیەوە فەرموویە:

﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴾غافر /٢٦..

جا کاتیك هەموویان سەرقاڵی ئاڵ و گۆڕ کردنی بیروڕا و دانانی ڕێ و شوین بوون لەخۆسازدان دا بۆ کوشتنی (موسا)، پیاویکی ئیمان دار لەبنەماڵەی (فیرعەون) کە ئیمانەکەی شاردبووەوە، ویژدان و غیرەتی جوانمەردانەی دەبزویت و بەوپەڕی چاوقایمی و ئازایەتییەوەو بەڕوونی بەرگری لە-موسا-دەکات و بەئاشکرا پییان ڕادەگەیەنیت کە (نابیت پیاویك بکوژن لەبەر ئەوەی دەڵیت (الله پەروەردگارمە) بەتایبەتیش کە بۆ ئەم (وتەیەی) چەندین موعجیزەی لەسەر ڕاستگۆیی خۆی هیناوەتەوە، خۆ گریمان-وای دانیین-گەر ئەو درۆش بکات ئەوا زیانیك بەئیوە ناگەیەنیت، بەڵام ئەگەر ڕاستگۆبیت ئەوا تووشی هەندیك لەو سزایانە دەبن کە هۆشداریی پیداون لەسەریان).

هەروەها ئەو پیاوە باوەڕدارە بەهۆزەکەی گوت: (ئیوە ئەگەرچی ئەمڕۆ خاوەنی دەسەڵات و هیزیش بن لەزەوی دا، ئەی کێ دەتوانیت سزای خودامان لێ دوورخاتەوە کاتیك بەرەو ڕوومان دەبیتەوە).

کەچی (فیرعەون) بەرهەڵستی ئەم پیاوە باوەڕدارەشی کردو ئیدیعای ئەوەی بۆ خۆی دەکرد گوایە ڕینمایی ی گەلەکەی دەکات بۆ سەر ڕێی ڕاست و بەجێ.

پاشان پیاوە باوەڕدارەکەی نیو بنەماڵەی-فیرعەون-لەدریژەی وتەکانی دا سزای سەختی خودا و زەبری کاریگەری لەم دنیایەدا بەبیر دەخستنەوە، وەك چۆن هەر لەدنیادا گەلانی پیش خۆیان بەهۆی کردەوە نابەجێ و ناشیرینەکانیانەوە تووشی ئەو سزا سەختە بوون و کەوتوونە بەر ڕق و خەشمی خودا. جگە لەمەش لە سزای دژواری ڕۆژی ئاخیرەتیشی ئاگادار کردەوەو، ئەو ڕۆژەی کە بێباوەڕان هەوڵی هەڵاتن لەدەست سزای خودا دەدەن و بەڵام هیچ دەروازەیەکیش بۆ

هەڵاتن لەو سزایە بەدی ناکەن.

ئەم پیاوە باوەڕدارە لەبەشێکی دیکەی وتەکانیدا ئەوەشی بەیادهێنانەوە کە بانگەوازی پێغەمبەران بەدرێژایی مێژوو لەئارادابووەو ئەم بانگەوازەی (موسا)ش مەسەلەیەکی تازەو ریزپەڕ نی یە، بەڵکو لەوەوبەر (یوسف)یش بەو بەڵگەو نیشانانەی پێغەمبەرێتیو سەلماندنی ڕێگای ڕاستەوە بۆ لای باوو باپیرانتان نێرراوە و ئەوانیش گومانیان لەڕاستی وتەکانی دەکردو تەنانەت کاتێك کۆچی دوایی کرد، دەیانگوت (ئیتر لەمەولا دوای-یوسف-خودا پێغەمبەرێکی تر نانێرێت)، لەدواییدا ئەوەی بۆ روون کردنەوە کە ئەم هەڵوێستە خراپەیان دەبێتە هۆی گومڕایی و سەر لێ تێك چوون. چونکە کاتێك لەڕێی ڕاست لادەدەن خوداش دەروونیان بەڕووناکی ی هیدایەت ڕۆشن ناکاتەوەو دڵیان لەوەها ڕێگایەك وەردەگێڕێت.

ئەمەی پێشوو گێڕانەوەی بەشێکی تری ئەم چیرۆکەو واتاو شیکاری ئەم ئایەتانەش بوو کە خودا تیایان دا فەرموویە: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾ يَـٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَـٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ[1] ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَـٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ[2] قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَـٰقَوْمِ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ[3] ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ[4] مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴾غافر٢٨-٣٤.

---

(١) بأس (عذاب): سزای سەخت و کەوتنەبەر تووڕەیی ی خودا.

(٢) دأب : (جزاء): سزا (سزا لەسەر ئەو داب و نەریتە ناهەموارەیان لەبەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەران دا).

(٣) یوم التنادِ: (ڕۆژی قیامەت). (تناد) واتە بانگ کردن بۆ ڕۆژی حەشرو بۆ کۆبوونەوەی خەڵکی و محاسەبەکردنیان.

(٤) (تولون مدبرین): واتە ئێوە دوور دەکەونەوەو تەقەللای ڕاکردن دەدەن.

## باوەڕدارەکە بانگەواز بۆ ڕزگاریی دەکات

فیرعەون و گەلەکەی زیاتر ڕۆچووبوون لەگومڕاییی داو ئەو پیاوە باوەڕدارەش بەردەوام بوو لەبانگ کردنیان بۆ سەر ڕێگەی هەق و ڕاست و ڕەوان، بۆ ئەم مەبەستە ئامۆژگاری کردن کە بەم دنیا بڕاوەو فانی یە تەفرەنەخۆن و کار بۆ (ڕۆژی دوایی و خانەی مانەوەی هەمیشەیی) بکەن، چونکە لەوێ خودا ئەگەر سزای کاری خراپ وەك خۆی و بەڕادەی خۆی بدات، بەڵام بێگومان بەباشترین شێوە پاداشتی کاری چاکە دەداتەوەو مرۆڤی چاکەخواز حەز لە هەر شتێك بکات پێی دەبەخشێت.

پاشان ئەو پیاوە ئیماندارە گلەیی لێکردن لەسەر ئەوەی کە لەکاتێك دا ئەو بانگیان دەکات بۆ سەر ڕێی ئیمان و خواناسی، کەچی ئەوان داوا لەم دەکەن بێتە سەر ڕێی کفرو بێباوەڕی یەکەی خۆیان. ئەو خواوەندانەی کە ئەوان بانگەواز بۆ پەرستنیان دەکەن هیچ سوودێکیان لەدنیادا پێ ناگەیەنێت و، لەڕۆژی قیامەتیش دا شەفاعەتێکیان بۆ ناکات، چونکە هەموان هەر بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە.

ئینجا ئاگاداریشی کردنەوە لەوەی کە وەختێك دێتە پێشەوە ویادی ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی ئەم دەکەنەوەو، ئەمیش کاروباری خۆی هەر بەخودا دەسپێرێت.

دیارە ئەو گەلە لەستەمکارو بێئیمانە بیریان لەکوشتنی ئەمیش کردەوە، بەڵام خودا لەو کردەوە خراپەیان پاراستی و چارەنووسیشی هەر سەفرازای و بەختیاری بوو لەکاتێکدا چارەنووسی بنەماڵە و هۆزی فیرعەون بەدبەختیو چارەڕەشی بوو.

قورئانی پیرۆز ئەم بانگەوازو هاوارەی پیاوە باوەڕدارەکەی بەشێوازێکی وەها قەشەنگ و جوان دارشتووە کە دڵسۆزی و ڕاستگۆیی لێوە پەخش دەبێت و وات لێ دەکات (بەقەناعەتێکی تەواوو بەباوەڕی زۆر بەسەرچاوە خوداییەکەی)ـەوە بیخوێنیەوەو پاشان (هەستپێکردنێکی ڕۆحی) و (تەوژمێکی بەکێشکردنی ئاسمانی بۆ گەیشتن بەخودات) تێدا دەخروشێنێت..

فەرموو جارێ هەموو ئایەتەکان بخوێنەوە کە ئەو دایەلۆگەت بۆ دەگێڕنەوە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا

مَتَٰعٌ (١) وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ (٢) ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾ وَيَٰقَوْمِ مَا لِىٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِىٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِى لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ (٣) ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ ۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴾غافر/٣٨-٤٥.

## بەخۆوە نازینی -فیرعەون-

فیرعەون هەر ڕژدو دەمارگیر بوو لەسەر نەفامی و گومڕایی یەکەی و (دەسەڵاتی پادشایی)یش هۆش و هەست و نەستی لێ داگیرکردبوو، لەم پێناوەشدا هەموو بنەماڵەو هۆزەکەی کۆکردەوەو جاڕی بەناویان دا داو پێی گوتن: (ئەرێ گەلۆ من پادشای میسرو خاوەنی ئەمرو نەهی (ڕێپێدان و قەدەغەکردن) نیم؟ ئایا ڕوباری (نیل) و لق و جۆگەلەکانی بەنێو کۆشك و تەلارو باخەکانم دا ناڕۆن؟ ئەی من باشترنیم لەم پیاوە بچووك و بێدەسەڵات و بێکەسەی کەهیچ خزمەتکارو بەردەستێکی نی یە(مەبەستی لە-موسا-بووە-سڵاوی خوای لێبێت-)؟ من باشترنیم لەم پیاوە لاڵ و زمان گیراوەی کە خەریکە نەتوانێت تەعبیر لە واتەو مەبەستەکانی خۆی بکات؟

---

(١) (انما هذه الحياة الدنيا متاع): واتە (ئەم دنیایە تام و چێژێکی کەمەو خەڵکی بۆ ماوەیەکی کەم دەیچێژن. پاشان بەکۆتایی هاتنی تەمەنتان ئەم تام و چێژەش کۆتایی دێت، یان بە نەمانی هۆیەکانی بەدەست هێنانی ئەو تام و چێژە، وەك نەبوونی ماڵ و سامان یان لەدەست دانی تەندروستیو هاوشێوەکانیان.

(٢) (دار القرار): واتە خانەی جێگیربوون و مانەوە بەونەمری تیایدا).

(٣) (وان المسرفين هم اصحاب النار): واتە ئەوانەی لە ( زوڵم و زۆرداری و هابەشی بۆ خوادانان)دا لەسنوور تێپەڕبوون و ڕۆچوون تیایدا ئەوانەن کە خودا دەیانخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

پاشان (فيرعەون) لەدرێژەی جارو هاوارە ناسازەکەی دا دەیگوت: (ئەم کابرایە هیچ سیمایەکی سەرۆکایەتی ی تیا دیار نی یە، ئیتر چۆن دەتانەوێت شوێنی کەون بێئەوەی چەند بازنەیەکی زێڕی بۆ نێررابێتە خوارەوەو خۆی پێ برازێنێتەوە وەك خۆڕازاندنەوەی پادشایان؟ ئەی بۆچی فریشتەکان(ملائکە) لەگەڵی دان نایەن تا پۆل پۆل لەدوایەوە بڕۆن و ئالوودەی بن و گەواهی (شایەتی) لەسەر ڕاستگۆیی ی بدەن و پاڵپشت و یاریدەدەری بن، وەك چۆن دەستەودایەرەی پادشاو کارگوزارانی لەدوایەوە دەڕۆن؟).

(فيرعەون) بەم قسە پووچەڵ و بەتاڵانە عەقڵو هۆشی ئەو گەلەی بەیدەست کردو ئەوانیش گوێڕایەڵییان کردو ملکەچی بوون، چونکە گەلێکی دوور لەخواو نەفام بوون و گوێڕایەڵی فەرمانی خودایان نەدەکرد..

ئەم چەند دێرەی پێشووش تەفسیرو ڕاڤەی ئەم چەند ئایەتەیە کە خودا بەشێکی داستاکەی پێ گێڕاوەتەوەو فەرموویە: ﴿وَنَادَىٰ فِرۡعَوۡنُ فِي قَوۡمِهِۦ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوۡلَآ أُلۡقِيَ عَلَيۡهِ أَسۡوِرَةٞ مِّن ذَهَبٍ أَوۡ جَآءَ مَعَهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مُقۡتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾ الزخرف/٥١-٥٤..

# بەندی چوارەم

## (( چارەنووس خراپی فیرعەون و گەلەکەی ))

( ئەو کارەساتانەی کەخودا تووشی کردن - دەرچوونی (بنو اسرائیل) و لەناوچوونی "فیرعەون" و گەلەکەی - چارەنووسی هۆزەکەی "فیرعەون" لەرۆژی دوایی دا )

## ئەو کارەساتانەی کە خودا تووشیکردن

پەندو ئامۆژگاری ی جوان و وتەی بەسوودی (موسا) کاری نەکردە سەر (فیرعەون)و نەیویست سوودێکیان لێ ببینێت، بەڵکو (فیرعەون) خۆی و گەلەکەشی زیاتر لەخۆیان بایی بوون و لوت بەرز بوون لەزەوی داو باوەڕدارانیشیان زیاتر ئازار دەداو لە زوڵم و ستەم دا ڕۆچووبوون.

لەبەرامبەر ئەم ڕەوشتەدا (موسا) ڕووی کردە خودای پەروەردگاریو لێی پاڕایەوەو گوتی: (خودایە بێگومان تۆ هەموو هۆو ئامرازێکی خۆشگوزەرانیی دنیات بەفیرعەون و گەورەپیاوانی هۆزەکەی بەخشیوە هەر لە کەرەسەو کەل و پەلی جوانکاری و خۆڕازاندنەوەی نێو دنیاوە تا ماڵ و سامان و جل و بەرگی گران بەها و کۆشك وباخچەی هەمەڕەنگ و دەسەڵات و حوکمداری. بەڵام ئەی پەروەدگار ئەوان لەجیاتی سوپاسگوزاری و پێزانین بەم نیعمەتانە، گومڕابوون و ڕویان کردۆتە کفرو بێباوەڕی، لەهەمان کات دا خەڵکیشیان لە باوەڕهێنان و ئیمانداری دوورخستۆتەوە، دەی خوایە تۆش پارەو ماڵیان لەناوبەرەو ناپووتیان و دڵیان ڕەقترو ڕەشترکە تا شایانی ئیمانداری نەبن و تا بەچاوی خۆیشیان سزای سەخت ببینن).

(موسا) بەم وتانە دووعاو نزای لەلای خودا لێ کردن و (هارون)ی برایشی بەجێی متمانەی خۆی دانابوو، لەکاتی خوێندنی دووعاکانی دا ئەویش هاوڕازو هاوبیروڕای تەواوی بوو لەو داواکارییانەدا. خوداش لەوەڵامی دوعاکانیاندا پێی فەرموون: (ئەوا دووعاکانتانم گیرا کردو داواکاریەکانتان بۆ بەدی دەهێنم، ئێوەش بەردەوام بن لەسەر ڕۆیشتن بەو ڕێگا ڕاستەداو ڕێچکەی ئەو نەفام و بێباوەڕانە فەرامۆش کەن کەڕێگەی ڕاست و هەقی ڕوون کراوەی ئێوە نازانن، واتە (ئەو ڕێگەیەی کە بۆ ئێوە ڕوون کراوەتەوە ئەوان ڕووی لێ وەردەگێڕن و نایەنەوێت هیچی لێ بزانن)..

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾يونس/٨٨-٨٩..

خودای میهرەبان نزاکەی-موسا-ی گیراکردو دووعاو داواکاری یەکانی بەدی هێناو دەستی کرد بەسزادانی فیرعەون و گەلەکەی، ئەوەبوو سەرەتا بە (وەرزی بێبارانیو وشکەسالی)و (کەم کردنەوەی بەروبوومی کشتوکاڵ و دارودرەخت) سزای دان بەو ئەمێدەی کە ئەمە ببێتە هۆیـەك بـۆ بـەخۆدا چـوونەوەو بەئاگاهاتنـەوەیان لـە لاوازی و بێدەسـتەلاتییان و لەدەستەوسـانیو بێچارەیی (فیرعـەون)ی پادشای خۆبەخواوەند دانەریان لەبەرامبـەر هێـزی خـودادا، تـا بـەم ڕەنگەش پەندو عیبرەت وەربگرن و بەدەم بانگەوازەکەی-موسـا-وە بـچن، بـەلام بەسروشـت و نەریتی لوتبەرزییان هیچ پەندو عیبرەتێکیان ڕەچاو نەدەکرد لەو کارەساتانەی تووشیان دەبوو.

ئەوان گەر بکەوتنایەتە نێو خۆشیو زۆریی داهات و بەروبوومەوە دەیانگوت: (ئێمە خۆمان شایستەی ئەوەین، چونکە لەخەڵکی تر چاکترین) خۆ ئەگەر تووشـی وشکەسـالی و نـەداری و بێبارانی ببونایە یاخود کارەساتێکیان لێبقەومایە خێرا بەو پەڕی ڕەشـبینیەیەوە (موسـا) و شوێنکەوتووەکانی-یان تاوانبار دەکرد و ئەوانیان بەشووم و نەگبەت دادەنـا لـەنێو خۆیـان داو گوایە هەر تووشی شوومی و نەگبەتیەیان دەکەن. بەلام ئەوان نەیاندەزانی کە (ئەو خێروبێـرەی ڕوویان تێدەکات) یان (ئەو شەڕوخراپەیەی تووشیان دەبێت) هەمووی لـەلای خـوداوە تەقـدیر کراوەو ڕادەو ماوەی بۆ دانراوە.

﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾الاعراف/ ١٣٠-١٣١

بەلام نەریتە شەڕخوازەکەی فیرعەون و گەلە خراپەکارەکەی ڕێی پێنـەدان ملکەچـی ئـەو ڕێساو دەستوورە ڕۆشـنـەی (موسـا)و بەلگـەو نیـشانەکانی بـن، کـە ڕاسـتی ی پەیامەکـەی دەسەلماند. بەلکو هەر بەردەوام بوون لەخراپەو تاوانکارییاندا.

لەم قۆناغەی سزادانیشیان دا خودای مەزن چەند جۆرە کارەسـاتێکی تـری بـۆ نـاردن، بـۆ نموونە لافاوێکی گەورەی بۆ ناردن کە هەموو کەلوپەل و کێلگەکانیشیان داپۆشـێت، هـەروەها

کوللەزەردێکی زۆریشی بۆ ناردن تاکو بەرهەمەکانی دەغڵ ودانیان بۆ بخۆن. هەروەها سن وکیسەڵەشی بۆ ناردن(کە جانەوەرێکە بەروبوومی کشتوکاڵی دەشێوێنێت و زیان بە مرۆڤ و بە ئاژەڵیش دەگەیەنێت)،پاشان بۆقێکی ئیجگار زۆری بۆ ناردن،کە لەهەموو جێگەیەکی گشتی و تایبەتییان دا بڵاو بووبوونەوەو ژیانی لێ وەڕس کردبوون و ئارامی و هێمنی لێ تێك دابوون، دوای ئەمەش دەردو پەتایەکی وای بۆ ناردن، کە وای لێ کردبوون خوێن لەدەم و لوتیانەوە دەرچێت و بەم هۆیەشەوە ئاوەکانیان پیس دەبووو لەش و لاریشیان لەڕو لاواز بوو بوو.

ئەوان هەر جارێك سزایەك لەو سزایانەیان تووش ببوایە خێرا بە(موسا)یان دەگوت: (ئەگەر خودا ئەم سزاو بەڵایەمان لەسەر هەڵگرێت ئەوا باوەڕی پێ دێنین و (بنو اسرائیل)ی لەگەڵدا دەنێرین و ئازادیان دەکەین)، کەچی هەر کە خودا سزاکەی لەسەر لادەبردن ئەو بەڵێنەی خۆیان دەشکاندو باوەڕیان پشت گوێ دەخست.

هەروەك خوداش لەگێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەیان و باس کردنی قۆناغەکانی سزادانیان دا فەرمویە: ﴿ وَقَالُواْ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ [1] لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾ الأعراف/١٣٢-١٣٥.

## دەرچوونی (بنو اسرائیل) و لەناوچونی (فیرعەون) و گەلەکەی

خودا فەرمانی بە (موسا) کرد، کە دەرچن لە-میسر-، ئەویش لەگەڵ گەلەکەی خۆی (بنو اسرائیل)دا شەوێك بەنهێنی لەخاکی-میسر-ەوە بەرەو (فەلەستین) ڕۆشتن.

(فیرعەون) بەوەی زانی و خێرا کاربەدەستانی خۆی بۆ هەرێمەکانی تری وڵاتەکەی نارد بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی بەزۆرو ستەم تاکو سوپایەکی گەورە پێك بێنن و دوای(بنو اسرائیل)کەون و بیانگرنەوە پێش ئەوەی بۆ (فەلەستین) ڕابکەن.

(فیرعەون) لەم کارەی دا هیچ ترس و نیگەرانییەکی پیشان نەداو تەنها ئەوەی لەنێو خەڵکی-میسر-دا بڵاوکردەوە گوایە: (هەڵاتووەکان چەند کەسێکی کەمن و هیچ حسابێکی

(١) الرجز: واتە (سزا) مەبەستی لەو سزایانەیە کە لەو ئایەتەی پێشتریدا باس کراون.

وايان بۆ ناکرێت و مەترسی یەکی ئەوتۆیان نی یە. بەڵام تووڕەیان کـردووین و بـەهۆی ئـەوەی ماڵ و سامان و زێرو خشڵی ئافرەتەکانمانیان دزیوە دەبێت تۆڵەیان لێکەینەوەو دوایان کـەوین. ئێمەش هەردەم بەوردیو وریایی‌یەوە چاودێری ی جم وجوولو هەڵسوکەوتیانمان دەکرد).

(فیرعەون) بەخۆی و سەربازانی سوپاکەشـیەوە کەوتنـە دوای (موسـا)و (بنـو اسـرائیل) ومیسریان بەهەموو باخ و بێستان و گەنجینەکانی ئاڵتوون و خـانووە خـۆش و ڕازاوەکانیانـەوە جێ هێشت تاکو ئەو باوەڕدارانە بگرنەوە، بەڵام بێگومان هەمو ئەو شتانەیان بۆ (هەتاهەتایە) و بەهەمیشەیی جێهێشت گەرچی واشیان زانیبێت گوایە بەشێوەیەکی کاتی بەجێ ی دەهـێڵن، چونکە هەرگیزاو هەرگیز نەگەڕانەوە بۆ نیشتمانەکەیان و لـەجیاتی خۆیـشیان (بنـو اسـرائیل) بوون بەخاوەنی هەمو ئەو نیعمەتانە لە (فەلەستین) دا.

چونکە هەروەك لەم دێرانەی دوایـی ی چیرۆکەکەدا بـاس کـراوە (بنـو اسـرائیل) کاتێـك گەیشتنە کەناری (دەریای سوور) لەسـەر کەنـداوی (سـوێس)، (فیرعـەون) و سەربازەکانیـشی لەگەڵ هەڵاتنی خۆر لە دەمەو بەیانی ئەو ڕۆژەوە بەدوایانەوە بوون، لەو کاتەش دا ئەمان (واتە بنو اسرائیل) وایان زانی لەناودەچن و فیرعەون دەیانگرێت، هەر بۆیـە تـرس و دڵەڕاوکێیـەکی تەواویان لێ نیشت و بە (موسا) یان گوت: (ئەها ئەوا فیرعەون پێمان دەگاتەوەو هـیچ توانـاو دەسەڵاتێکمان لەبەرامبەریدا نی‌یەو دەریاش لەبەردەممان دایە، جا چیبکەین؟ )..

لەوەڵامیان دا-موسا-گوتی: (هیچ ترسێکتان نـەبێت چـونکە خـودای پـەروەرگارم لەگـەڵ دایەو ڕێگای ڕزگاربوونم پیشان دەدات).

لەوساتە وەختەش دا خودا سرووشی ئـەوەی بـە (موسـا)دا کـە داردەسـتەکەی بـەدەریادا بکێشێت، ئەویش وای کردو ئاوی دەریاکە پارچەپارچە بوو و درزی تێ کەوت و دوازدە ڕێگـەی وشکانیی لێ پەیدا بوو، واتە بەژمارەی هەر دوازدە کوڕو نەوەکەی (بنو اسـرائیل). ئاوەکـەش لەنێوان ئەو ڕێگایانەدا وەك چیای بەرزی لێ هاتبوو. ئیدی (بنـو اسـرائیل) بـەو ڕێگـەکراوەو تەخت کراوانەیان دا ڕۆشتن و لەدەریا پەڕینەوە.

هەر لەو ساتەدا خەریك بوو فیرعەون و تاقمەکەی بگەنە ئەو جێگەیەی کە (بنو اسـرائیل) لێوەی ڕۆشتن، و ڕێگەیەکیان لەدەریاکەدا بەدی کردو خۆیان پیـاکرد تـا دوایـان کـەون، بـەڵام دەسبەجێ (ئاوەکە) یەکی گرتەوەو ڕێگەکان داخرانەوەو ئاوی دەریا فیرعـەون و سـەربازەکانی لوول داو هەموویانی خنکاندو سەرنگووم کرد، بەم ڕەنگەش خودا-موسـا-و هـەموو ئەوانـەی لە-بنو اسرائیل-لەگەڵی دا بوون ڕزگارکرد.

قورئانی پیرۆز باسی لەناوچوونی فیرعەون و سەربازەکانیی لە چەندین ئایـەت دا کـردووە، کە لەو ئایەتانەدا چەندین پەندو عیبرەت هەیە، جگە لـەوەش ئایەتـەکان بەچـەندین شـێوازی داڕشتن و ڕەوانبێژی و هونەری خراونە ڕوو، بۆ نموونە لە هەنـدێك جێگـەی قورئـان دا وەسـفی

کارەساتەکە بەچەند ئایەتێکی کورت و پڕمانا دیاری کراوە، کە بەخێرایی بەدوای یەکدا دێـن، لەهەندێك جێگەی دیکەش دا بەچەند ئایەتێکی درێـژ وەسـفی کارەسـات و بەسـەرهاتەکان و قۆناغەکانیان کراوە تاکو مرۆڤ لێ یان وردبێتەوەو هەڵوێستە لەئاستیان دا بکـات و بـەفیکری خۆی چەق بخاتە سەریان و سەر ئەو مانا جوان و قووڵانەش کە لەخۆیان گرتوون.

هەندێك لەو ئایەتانەش ماناکەت بەپوختی و بـەکورتی پـێدەدات و لەشـیکارو تەفـسیری درێژ دوورت دەخاتەوە. جا بەم هەمەڕەنگی و هەمەچەشنی یەیشیان (ئیقاعێکی مۆسـیقی)ی هاوشێوەی شیعرو پەخشانی سەروادار(سجع)[1] دەخولقێنێـت کـە نـە شـیعر و نـە پەخـشانی سەرواداریشە.

ئەم ئایەتانەش کە دەیخوێنییەوە بەشێکی ئەم داستانە بەو شێوە هونەریانە وەسف دەکەن: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ[2] ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ[3] ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْءَاخَرِينَ[4] ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ الشعراء/٥٢-٦٧..

هـەروەها (قورئـان) لەجێگەیـەکی دیکـەی دا بەشـێوە دەربڕینێکـی تـر وەسـفی ئـەو گۆڕانکارییەی حاڵی فیرعەون و گەلەکەی دەکات لەژیانی پڕ نازو نیعمەتەوە بۆ لەناوچـوون و تەفروتوونا بوون، هەروەك لەم ئایەتانەدا بەدی دەکرێت:

---

(١) وشەی (سجع) لەزمانی عەرەبی دا بەو ڕستانە دەڵێن کە کۆتاییەکانیان سەروا( قافیـە)ی هـاوڕێکی یەکدییان هەیە وەك سەروای ( شیعر) بەڵام کێش (وزن)ی دێرەکان وەك یەك نین.

(٢) (مقام کریم): واتە (خانووی خۆش و دیارو ڕازاوە لەهەموو ڕوویەکەوە).

(٣) (کل فرق کالطود العظیم): واتە: ( هەر بەشێکی ئاوەکە لەنێو ڕێگاکان دا وەك شاخێکی گەورەبوو).

(٤) (وأزلفنا ثم الآخرین): واتە: (لەم کاتەدا فیرعەون و کۆمەڵەکەیان لەموسـاو گەلەکەی نزیك کـردەوەو (بەم پێیە لەدەریاکەش نزیکمان کردنەوە) تاکو ڕێچکەی خۆیان وەرگرن و بەهەمان ڕێی موسـا و گەلەکەیدا برۆن. بەڵام موسـاو گەلەکەی دەرچوون و فیرعـەون و کۆمەڵەکەیان لەئاوەکەدا هێشتەوەو خنکاندمانن).

﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَاتْرُكِ الْبَحْرَ رَهْوًا[1] إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ تَرَكُوا مِن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ[2] ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ[3] ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنَ الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ إِنَّهُ كَانَ عَالِيًا مِّنَ الْمُسْرِفِينَ ﴾الدخان/٢٣-٣١..

ئینجا قورئان باسی ئاکامە چاکەکەی خۆڕاگرتنی (بنو اسرائیل) دەکات کە لەئەنجامی چەوسانەوەیان و خۆنەدانە دەست فیرعەون و ڕەت کردنەوەی زوڵم و ستەمەوە خودا سەری خستبوون و دوژمنانی بۆ لەناوبردوون، هەروەك لەم ئایەتانەی قورئان دا فەرموویە:

﴿ وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُوا يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ وَمَا كَانُوا يَعْرِشُونَ[4] ﴾الأعرف/١٣٧..

پاشان قورئان کەسێتی ی (فیرعەون) دەردەخات و پەردە لەسەر ناخی دەروونی هەڵدەداتەوە لەکاتی سەرنگوم بوونی دا و ئاماژە بۆ هێشتنەوەو مانەوەی تەرمەکەشی دەکات لەدنیادا، کە تا ئەمڕۆش ئەو تەرمە وەك خۆی ماوەتەوە..

ئەوەبوو فیرعەون پێش ئەوەی گیانی دەرچێت ئیمانە حەشاردراوەکەی نێو دڵی خۆی ئاشکرا دەکات و باوەڕدینێت تاکو خودا لەو مەرگەساتە ڕزگاری کات، بەڵام خودا لەوەڵام دا ئەوەی پێ ڕادەگەیەنێت، کە چۆن ڕزگاری دەکات لەکاتێکدا ئەو زۆرداره تا ئەو حاڵەتە هەر لەیاخی بوون و سەرپێچی دا بووەو باوەڕی بە پەیامەکەی موسا نەهێناوەو دژایەتیشی کردووە.

بەڵام خودا هەواڵی ئەوەی پێ دەدات، کە دەبێت ئەو تەرمەی بهێڵێتەوەو لاشەکەی بەمردوویی وبێ ئەوەی هیچ گۆڕانکاری یەکی بەسەردابێ پیشانی خەڵکی بدات تاکو ببێتە بەڵگەونیشانە بۆ کەسانی دوای خۆی. زۆر کەسیش لەخەڵکی بێئاگان لەو بەڵگەو نیشانانەو عیبرەتیان لێ وەرناگرن!

---

(١) (رهواً): واتە (ساكناً).. بەمانای (هێمن و کراوە دەبێت وەك باری ئاسایی خۆی دوای ئەوەی موسا، بەداردەستەکەی خۆی لێ دەدات ولێ ی دەپەڕنەوە)

(٢) (نعمة كانوا فيها فاكهين): واتە: لەخۆشگوزەرانی و حاڵێکی پڕلەنازو نیعمەت و ئاسوودەیی دابوون).

(٣) (وما كانوا منظرين): واتە(مۆڵەتیان پێ نەدرا بۆکاتێکی تر و هیچ تۆبەو دووعایەکیان لێ وەرنەگیرا).

(٤) (يعرشون): واتە(ئەو کۆشك و تەلارو خانووبەرە هەمەڕەنگ و ڕازاوانەشیانمان بۆ تێکدان،کە بنیاتیان نابوون).

﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾يونس/ ٩٠-٩٢..

لەم ئایەتەدا سەرنج بدە لەو فەرمایشتەی خودا: ﴿فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾.. ئەم بەڵگەو نیشانە(آیة)یەش موعجیزەیەکی زانستیانەی(قورئان)ـەو شایەتی دانێکە بۆ قورئان لەسەر ئەو ڕاستی یەی، کە سرووش(وحی)ێکی خودایی یەو بێگومان (محمد)یش ﷺ پێغەمبەری خودایە، چونکە ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ (هێشتنەوەی لاشەی مردووی-فیرعەون-بەپارێزاوی) دەکات تاکو خەڵکی ببینن و بەبینینی ئەم تەرمەش عیبرەت و دەرس وەرگرن، نەخاسمە ئەوانەی کە خۆیان بەخواوەند دادەنێن.

بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتری ئەم لایەنە ئاماژەیەك بۆ (تەورات)یش دەکەین کە باسی ئەم ڕووداوەی کردووەو دەیگێڕێتەوە چۆن (فیرعەون)ی-میسر-بەتوندی (بنو اسرائیل)ی چەوساندۆتەوەو بەکاری هێناون لە بنیات نانی هەردوو شاری(فیتۆم)و (ڕەعمسیس)[1]دا. ئەمەش لەئاسەواری ئەو چاڵە دێرینانەوە دەرکەوتووەو زانراوە کە دوو شاری ئاوا هەبوون و بەفەرمانی شا (ڕەعەمسیسی دووەم) بنیات نراون.

دوای ئەمەش (تەورات) دەڵێت: (پادشای-میسر-مرد).[2]

دیارە ئەمەش لەکاتی هەڵاتنی(موسا)بۆ (مەدیەن)و لەپێش بوونی بەپێغەمبەردا بووە.

دوای مردنی ئەو (شایە) کوڕەکەی چۆتە سەر حوکم، واتە (مینفتاح-ی کوڕی-ڕەعمسیس-ی دووەم). بەم پێیەش (مینفتاح) ئەو فیرعەونە بووە کە لە میسر دەرچووەو دوای (موسا) کەوتووەو خنکاوە دوای ئەوەی (موسا) لەلایەن خوداوە نێررابوو بۆ لای بەمەبەستی بانگەواز بۆ ئاینی خوداو ئازادکردنی (بنو اسرائیل) و ڕێ پێدانیان بۆ-فەلەستین-.

لاشەکەشی تا ئێستا پارێزراوە وەك چۆن قورئان باسی کردبوو. بەڵام تا ساڵی (١٩٠٠- ی زاینی) ئەو تەرمە نەدۆزرابووەوە، واتە دوای سیازدە سەدە لەهاتنی قورئان ئەو مەسەلەیە

---

(١) سفر الخروج: الفصل الأول - الآية: ١١

(٢) سفر الخروج: الفصل الثاني - الآية: ٢٣.

زیاتر بۆ خەڵکی سەرزەمین ڕۆشـن بـووەوەو تەرمەکـەی لەناوچـەی (الأقـصر) لـەنێو چـاڵەکان ولەگۆڕی (امنحتب الثاني)دا دۆزرایـەوە، ئـەمڕۆش ئـەو تەرمـەی (فیرعـەون) لەمۆزەخانـەی (میسر)دایە.

ئەوەی شایانی باسیشە وەك لە شوێنەواری گۆڕەکەی(منفتاح)ـەوە دەرکەوتووە بەو شێوەیە گۆڕەکەی سازو ئامادە نەکراوە، کە شایستەی پادشایەکی وەك ئەو بووبێـت، چـونکە (مردنـی ئەو) ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو بووە کە بەم شێوەیە بخنکێت وهەموو سەربازەکانی لەناوچن، تا گۆڕی تایبەتی ی بۆ ئامادە بکەن.

## چارەنووسی هۆزەکەی ( فیرعەون ) لەرۆژی دواییدا

ئەمەبوو ئاکام و سەرەنجامی هۆزەکەی-فیرعـەون-لـەدنیادا، کـە لـەدەریادا خنکێنـران و سەرنگووم کران. بەڵام لەڕۆژی دوایی (آخـرة)دا سزای زۆر سەخت تریـان بـۆ دانـراوەو قورئـانی پیرۆز باسی ئەو سزایەی قیامەتیشی فەرامۆش نەکردووە کە سزای ئەبـەدیی دۆزەخـەو شـەو و ڕۆژ بەهەمیشەیی لەسەریان دەبێت، دیارە هـەر کەسـێکی بـاوەڕداریش بەسـەرنجی ورد پەنـدو عیبرەتی زۆری لێبەدی دەکات، هەروەك خوداش لەبارەیانەوە فەرموویە:

﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّاۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾غافر/٤٥-٤٧..

# بەندی پێنجەم

## ((لەرێگادا بەرەو خاکی ژوان -أرض الميعاد-))

( پاشماوەی بتپەرستی لەنێو (بنو اسرائیل)دا - نیعمەتەکانی خودا بۆ (بنو اسرائیل) - وادەی دیدارێکی (موسـا) لەگەڵ خودادا - (بنو اسرائیل) و پەرستنی گوێرەکە - سزادانێکی (بنو اسرائیل) و... پاشان لێبوردنیان - بەرزکردنەوەی چیاکە بەسەر (بنواسرائیل)دا - روو وەرچەرخاندنی (بنو ئیسرائیل) لەچوونە نێو خاکی پیرۆزەوە -
رێ لێ ون بوونی (بنو اسرائیل). )

### پاشماوەی بتپەرستی لەنێو (بنو اسرائیل)دا

بێگومان "موسـا" چەندین مەترسی ی بەهۆی (بنو اسرائیل)و لەپێناوی بانگ کردنیان دا بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنیا تووش ببوو. بەڵام تەنیا ئەو موعجیزانەی کە خودا ئەوی پـی بەهێز کردبوو بەس بـوون بـۆ ئـەوەی هـەر گـەردو خڵتـەو پاشماوەیـەکی بتپەرسـتی‌یان تێـدا بنبڕبکرێت.

وەلێ سەرەڕای ئەمەش جاروبار سەریان دەکردەوە سـەر ئـەو دیـاردەی بتپەرسـتی‌یەی کـە لەوەوبەر لەگەڵ میسری‌یەکان دا خوویان پێوە گرتبوو.

بۆ نموونە کاتێك لەدەریاکە پەڕینەوە بەلای گـەلێك دا تێپـەڕین کـە سـەرقاڵی بتپەرسـتی بوون، جا داوایان لە "موسـا" کرد بتێکیان بۆ تەرخان کات وەك چۆن ئەو گەلـەش (بـت)یـان هەیەودەیپەرستن.

"موسـا" لەسەر ئەو داواکاریـەیان سەرزەنـشتی کـردن و ئـەو ڕاسـتی‌یەی بـۆ دووپـات کردنەوە کەوا ئەو گەلەی بەلای دا تێپەڕبوون و (بتپەرستن) لەسەر ئاینێکی ناتەواوو پووچەڵن و لەهەر کاروکردەوەیەکی بەندایەتییان دا ڕەنجەڕۆو زەرەرمەندن، بەم ڕەنگەش چارەنوسیان هـەر تیاچوون و سزای سەختە.

پاشان "موسـا" سەرسـامی ی خـۆی دەربـڕی لەسـەر ئـەوەی چـۆن دەبێـت ئـەوان داوای پەرستراوێکی دی جگە لەخودای پەوەردگاری جیهانیان بکەن کـە بەتایبـەتی ڕێـزی لێنـاون و

فەزڵی داون بەسەر نەتەوەکانی تری ئەو زەمانەیان داو بەتایبەتمەندی یەکانی(سرووش بۆ ناردن)و (سەرپەرشتی کردنیان) لەنەتەوەو گەلانی تری جیا کردبوونەوە..

ئەم ئایەتانەی دەیخوێننەوە ئاماژە بۆ ئەو نەریتەیان دەکات، وەك خودا تیایدا فەرموویە: ﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ يَعْكُفُونَ (١) عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ لَّهُمْ ۚ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾الأعراف /١٣٨-١٤٠.

## نیعمەتەکانی خودا بۆ (بنو اسرائیل)

(بنو اسرائیل) بەردەوام بوون لەڕۆشتن تا گەیشتنە بەشی خۆرهەڵات و بەڵام ئاویان دەست نەدەکەوت بۆ خواردنەوەی خۆیان و ئاودانی ئاژەڵەکانیان. بۆیە خێرا سکاڵای خۆیان بە"موسا" ڕاگەیاندو بەدەم پرتەو بۆڵەوە داوای ئاویان لیّ کرد. ئەویش بۆ ئەو مەبەستە فەرمانی لەخوداوە بۆ هاتبوو کە بەدارەکەی دەستی لەبەرد بدات و، کاتێك لیّ ی دا، دوازدە کانیاوی لیّ تەقییەوە[2] و هەر تیرەیەك کانیاوێکی بەرکەوت و کاروباری خۆیانیان پیّ بەجیّهێنا.

دوای ئەمەش گەیشتنە دەشتەکانی نیمچەدورگەی (سیناء) و لەوێش خۆر گەرمیەکی هێندە بەتینی هەبوو و هیچ خانووبەرەو نیشتگەیەکیش نەبوو کەتیایدا دانیشن و تەنانەت هیچ دارو درەختێکیشی لیّ نەبوو تا لەژێر سێبەرەکەیدا وچانێك بدەن. بۆ ئەمەش سکاڵای حاڵی خۆیان لەلای "موسا" کردەوە کە چەندە ماندوو و نارەحەت بوون، "موسا"ش لەخودا پاڕایەوە بۆیان وخوداش هەورێکی سپیی پاك و بێگەردی بۆ ناردن و لەگەرمای خۆر پاراستنی.

لەبەر ئەوەش، کە خۆراك وتوێشووی ڕێگەیان بەرەو تەواوبوون دەچوو "موسا" داوای لەخودا کردەوە کە جارێکی دی خۆراکیان بۆ دابین بکاتەوە، خوداش گەزۆو باڵندەی بۆ ناردن

---

(١) (یعکفون): واتە: سەرقاڵیبوون، لەوشەی (عکوف)ەوەیە بەمانای ڕووکردنەکارێك و خەریك بوونی هەمیشەیی پێوەی بەمەبەستی (بەگەورەدانانی).

(٢) ئەم کانیاوانە کەوتوونە بیابانی خۆرهەڵاتی کەناڵی (سوێس)ـەوەو نزیکیشن لەشاری(سوێس) و بە(کانی یەکانی موسا) ناسراون، ئەمڕۆ ئاوی هەندێکیان کەمبوونەوەو هەندێکیشیان کوێربونەوە.

کە لەقورئان دا بە (مَنّ) و(سلوى) ناوبراون. (مەن=مَنّ) کە مادەیەکی شیرینەو لەئاسمانەوە دەبارێتە سەر بەردو گەڵای درەخت و وەك بارانێکی سووك و کەم بەهێواشی دێتە خوارەوە بۆ سەریان (واتە بۆ سەر بەردو درەخت) و، وتامیشی وەك هەنگوین شیرینە، (سەلوا =سلوى)ش باڵداری (کوڕکوڕە) یان (شەلاقە) (سومانی)یەو بەشێوەیەکی چڕو پۆل پۆل یەك لەدوای یەك دێن و بەهۆی زۆری ژمارەیانەوە زەوی دادەپۆشن.

جا خواش کاتێك بەفەزڵو بەخششی خۆی ئەو نیمعەتانەیان پێدان فەرمانی پێکردن لەو خۆراکە باش و خۆشانە بخۆن، بەڵام ئەوان بەو نیعمەتانەیان نەدەزانیو لەجیاتی شوکرانەبژێری لەسەریان کەچی داوای خۆراکی تریان دەکرد و حەزیان لەوانە نەبوو. بەم پێیەش زوڵم و ستەمیان لەخۆیان کرد، هەروەك لەم ئایەتەدا دەیخوێنینەوە:

﴿وَقَطَّعْنَاهُمُ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ۚ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ إِذِ اسْتَسْقَاهُ قَوْمُهُ أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ ۖ فَانبَجَسَتْ[1] مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۚ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾الأعرف/ ١٦٠

## وادەی دیدارێکی "موسا" لەگەڵ خودادا

"موسا"هەواڵی بە(بنو اسرائیل) لە- میسر- گەیاندبوو کەوا خودای مەزن-فیرعەون- لەناو دەبات و کتێبێکیش بۆ ئەمان دەنێرێت دەربارەی(فەرمان پێکردنیان بە چەند کارێك)و (ڕێگرتنیشیان لەچەند کارێکی تر)وەك بەرنامەیەك کە پێویستە پەیڕەویی بکەن و لەسەری بڕۆن.

جا کاتێك خودا-فیرعەون-ی لەناوبرد، "موسا" داوای لەخودای پەروەردگاری کرد ئەو کتێبەیان بۆ بنێرێت. خوداش بۆ ئەو مەبەستە فەرمانی بە "موسا" کرد بچێت بۆ لای ڕاستی قەدپاڵی چیای (طوور) و سی (٣٠) ڕۆژ لەوێ بمێنێتەوەو خەریکی بەندایەتی وخواپەرستی بێت.

"موسا" ئەم فەرمانەی جێبەجێ کردو کاتێك سیهەم ڕۆژی تەواو کرد، خودا فەرمانی پێ کرد دە(١٠) ڕۆژی تریش لەوێ بمێنێتەوەو بەڕۆژوو بێت بۆ مەبەستی تەواوکردنی خواپەرستی و عیبادەتەکەی.

---

(١) (انبجست): (انفجرت) بەمانای: تەقینەوە، یان هەڵقوڵا...

هەروەها "موسا" بەرلەوەی بەرەو ئەو کاری خواپەرستیو لە خواپاڕانەوەیە بڕوات، (هارون)ی برای لەجیٚی خۆی داناو لەڕاسپاردەیەکی پێویست دا پیٚی گوت: (برام تۆ لەنێو گەلەکەم دا جێنشینم بەو کاروباریان بەرێوەبەرەو کاریان بۆ چاك و ڕێکوپێك بکەو، وریاش بە لەوەی پەیڕەویی ڕێبازی تێکدەران و گومڕایان بکەیت وهوشیاربە لەفڕوفێڵ و تەڵەکەبازییان).

دوای ئەوەی "موسا" چل ڕۆژەکەی تەواو کرد، خودا بەفەرمایشتی دێرین و ئەزەلیی خۆی دواندی و بەم دواندنەش پلەو پایەیەکی وەهای پیٚ داوە کە لەخەڵکی جیاکردۆتەوە.

موسا لەکاتی بیستنی فەرمایشتی خودای پەروەردگاری دا خواستێکی هێگجار توندو بەجۆشی تێدا خرۆشابوو بۆ دیتنی خوداو، داوای لەپەروەردگاری کرد خۆی پیشان بدات تاکو (ببیبنێت)، خوداش پیٚی فەرموو: (هەرگیز نامبینیت) (لن تراني).

پاشان خودا لەسەر ئەو داواکارییە ویستی بەڕوونی "موسا" ئاگادار کاتەوە لەوەی بێگومان ئەو داوای شتێکی گەورەی ئەوتۆی کردووە کە چیاکانیش بەرگەی (هەڵگرتنی ئەو داوایە) ناگرن و ناتوانن خودا ببینن)، جا بۆ ئەوەی زانیاریی تەواو لەم بارەیەوە بۆ "موسا" ئاشکراکات پیٚی فەرموو: (تۆ ناتوانیت بۆ من بڕوانیت و هەرگیز وزەی (بۆ من ڕوانینت) نابێت، بەڵام بڕوانە بۆ ئەو شاخە کە ئێستا نەختێك لەنوری خۆمی پیشان دەدەم و، کە زۆر لەتۆش بەهێزترو توندترەو، سەیری کە چی بەسەردێت و گەر لەجیٚی خۆی مایەوەو، توانایی خۆی ڕاگرێت لەبەر دیتنی نوری من و هەیبەت و شان و شکۆم دا، ئەوا تۆش دەتوانیت ببینیت، خۆ ئەگەر چیاکە وزەو توانای ئەوەی نەبوو تۆش واز لەمە بێنە).

کاتێك خودا نەختێك لەنووری خۆی پیشانی چیاکەدا یەکسەر وردوخاش بوو و لەگەڵ زەویشدا تەخت بوو، لەم ساتەوەختەدا "موسا" کەوتە سەرزەویو لەهۆش خۆی چوو وهیچ هەست و نەستێکی لەبەر سام و بیمی ئەو ڕووداوە گەورەیە تیا نەما، بەڵام کە هۆشی بەبەردا هاتەوە گوتی (خودایە ئەی پەروەردگار من هەردەم بەپاك و بیٚخەوش و گەورەت ڕادەگرم بە شێوەیەك کە هەر شایستەوقابیلی مەقامی بەرزی شکۆی تۆبێت و داوای لێبوردن و وەرگرتنی تۆبەت لیٚدەکەم، جا وا من خۆم بەیەکەم باوەڕهێن بەگەورەیی تۆ لەم زەمانەدا دادەنێم).

دوای ئەمە خودای بالادەست و پەروەردگاری جیهانیان لەبەشێکی دیکەی ئاخاوتنی دا بۆ "موسا" پیٚی ڕاگەیاند کە هەڵیبژاردووە لەنێو هەموو خەڵکی داو سیفەتی زیاتری پیٚبەخشیوە بۆ لەئەستۆنانی ئەرکی پێغەمبەرێتی، بۆ ئەم مەبەستەش پەیامەکانی خۆی (واتە- اسفار-ی تەوارت)ی پیٚ دەدات کە پڕن لە پەندو ئامۆژگاریو ڕیساو ئەحکامی پێویست بۆ (بنو اسرائیل).

فەرمانیشی پێ‌کرد کە گەلەکەی خۆی بەچاکترین و گەورەترین ڕێساو ئەحکامیەوە پابەندکات، واتە لەسەر نەخشەی داڕێژراوی باشترین ڕێسایان بڕون، بۆ نمونە گەر ڕێسایەك لەو ڕێسایانە بۆ دوو کار بوو و بەڵام کامیان پاداشتێکی زیاتری هەبوو با ئەوەیان ئەنجام بدەن.

پاشان خودا ئەو گەلەی "موسا" واتە (بنو اسرائیل)ی لەوە ئاگادارکردەوە کە لەفەرمانەکانی دەرنەچن، دەنا دەکەونە بەر سزای سەخت وەك چۆن کەسانی تری لەیاخییان و لەفەرمان دەرچوانی سزا داوە و تەفروتوونای کردوون...

ئەمەی پێشوو تەفسیرو شیکاری ئەم ئایەتانەی لای خوارەوەیە کە بەشێکی تری داستانەکە دەگێڕێتەوەو خودا تیایان دا فەرموویە: ﴿وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾الأعراف/١٤٢-١٤٥.

## (بنو اسرائیل) وپەرستنی گوێرەکە

وەك پێشتریش باسمان کرد ئاسەوارو خلتەی-بتپەرستی-لەنێو دڵی (بنو اسرائیل)دا مابوو، ئەویش بەهۆی بەسەربردنی تەمەنێکی زۆریان لەگەڵ میسرییەکان دا، ڕواڵەتێکی ئەم سیفەتەشیان لەگوێرەکەپەرستی‌دا ڕەنگی دەدایەوە، گوێرەکە پەرستراوەکانیشیان گەر بمردنایە لە-میسر-دا، لاشەیان مۆمیا دەکردو لەگوڕستانێکی تایبەتی نزیك لە (شوێنێکی گەرمکراو) یان لە (کوورەیەك) کە بە (سرابیوم) ناودەبرا دەنێژران.

پیاوێکی فێڵبازیش لەنێو (بنو اسرائیل) کە لە قورئاندا بە (سامری) ناوبراوە ئەم دیاردەیە بەدەرفەتێك دەزانێت بۆ ئەوەی فریویان بدات، ئەوەبوو ناوبراو گوێرەکەیەکی بۆ

هێنابوون و پێی گوتبوون: (ئەمە خوداتانەو خودای "موسا"شەو لێرەدا لەبیری چووەو ڕوشتووە بۆ دیداری و لەم ماوە درێژەی بزربوونی دا بەوەوە خەریکە).

بێگومان "موسا" بەر لەڕۆشتنی بۆ دیداری خودا بەگەلەکەی خۆی ڕاگەیاندبوو کەوا لەسی ڕۆژ زیاتری پێناچێت، بەڵام ئەو کاتەی خودا (دە ڕۆژی تریشی بۆ دەسپێکردنەوەی ڕۆژوو لەسەرداانابوو و ماوەی بزربوونی درێژەی کێشابوون، ئەوانیش لەو ورەو عەزمەی پێشوویان تێدا نەمابوو و، بەدواکەوتنی موسا سست و لاوازبوو بوون و گوتبووشیان: (بەڕاستی (موسا) لەوادەی خۆی دواکەوت و بەڵێنەکەی بۆ نەبردینە سەر).

ئیتر لەم ساتە وەختەدابوو کە (سامری) نیازی خراپ لەدڵی دا جووڵاو ئەم هەلەی قۆزتەوەو بۆ جێبەجێکردنی نیازە خراپەکەی چەند خشڵو گەوهەرێکی لەو ژنانەی (بنی اسرائیل) سەند کە لە-میسر-ەوە هێنابوویان و بەخۆیانەوە کردبوو و هەموو خشڵەکانیانی هەڵدایە ئاگرەوە تا توانەوەو ئینجا پەیکەری گوێرەکەیەکی لێ دروست کردن و بەڕێگایەکی تایبەتی ئەندازەییش دایتاشیو کونێکی لەم سەرییەوە بۆ ئەو سەری تێکرد تا ئەگەر (با) پیایدا بڕۆشتایە دەنگێکی وەك دەنگی مانگا لەدەمییەوە دەردەچوو. (سامری) کە دیتی (بنو اسرائیل) گوێی بۆ دەگرن و لێ ی کۆبوونەتەوە خێرا فەرمانی پێکردن کە بیپەرستن.

لەو کاتەدا (هارون) بەپەلە بەرەنگاریان بووەوەو تێی گەیاندن کە ئەوان فریودراون و زۆر هەوڵ و تەقەللایشیدا بۆ ئەوەی تا لەپەرستنی گوێرەکەکە پاشگەزیان کاتەوە، بەڵام نەیتوانی و ئەوانیش پێیان ڕاگەیاند کە سووردەبن لەسەر پەرستنی هەتا "موسا" دێتەوە بۆ لایان.

لەولاشەوە "موسا" لەماوەی دیدارو وتوێژی لەخزمەت خودا ئەو هەواڵەی لەخوداوە پێ دەگات کەوا(سامری)گەلەکەتی تەفرەداوەو لەئاینی خۆیانی دوورخستوونەوەو گومڕای کردوون.

"موسا" بەمە زۆر زویر و پەست دەبێت و لە توندترین حاڵەتی دڵتەنگی و تووڕەیی دا دێتەوە بۆ لایان و پێیان دەڵێت: (ئەرێ خودای پەروەردگارتان بەڵێنێکی پیرۆزو گەورەی پێنەدان دەربارەی ئەوەی-تەوارت-تان بۆ دەنێرێت کە ڕێی ڕاست و ڕووناکی تێدایە بۆتان؟ ئەی ئایا نازانن خودا ئەو بەڵێنەی بەدیهێناوە، یاخود بەهۆی درێژبوونەوەی ماوەی بزربوونم لێتان ئیمانەکەتان بەکوفرو بێباوەڕی گۆڕییەوە؟ یان هەر ویستوتانە کردارێکی خراپ ئەنجام دەن و خودا لەخۆتان زویر بکەن و، بەمەش ئەو پەیمانەتان بشکێنن کە بەمنتان دا دەربارەی خۆڕاگری و مانەوە لەسەر ئیمان و باوەڕداری؟).

ئەوانیش لەوەڵامی ئەو پرسیارانەدا بە "موسا" یان گوت: (ئێمە بەخواست و ئارەزووی خۆمان ئەو پەیمانەمان نەشکاند کە بەتۆمان دابوو، بەڵکو (سامیری) هات و گومڕای کردین و

بیروڕایەکی دەربڕی و پێی گوتین گوایە بەهۆی ئەو ئاڵتوون و خشڵەی کە پێمانە و لە میسری یەکانمان سەندووە کەوتوینە بەر ڕق و تووڕەیی ی خودا، چونکە ئەم خشڵە هەمووی بووە بەچەند گوناهێك لەسەرشانمان و لەسەرمان لاناچێت هەتا نەگەڕێیتەوە بۆ لامان، بەڵکو هەتا ئەم گوناهانەمان لەسەربوایە گەڕانەوەی تۆش دوا دەکەوت، بیروڕای ئەویش وابوو کە دەبێت هەموویان فڕێ دەینە ناو ئاگرەوە تاکو خودامان ڕازی بکەین و تۆش بگەڕێیتەوە بۆ لامان، ئیتر باوەڕمان پێکرد و هەموو خشڵەکانمان فڕێ دایە ناو ئاگرەوە، (سامری) بەم ڕەنگە لەگەڵمان جووڵایەوەو خۆیشی هەرچی هەبوو لەزێڕو زیو فڕێی دایە ناو ئاگرەکەوە، ئینجا لەو هەموو خشڵەی نێو ئاگرەکەوە پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دەرهێناین و پێی گوتین: (ئەمە ئەو خودایەتانە کە دەبێت بیپەرستن، هەورەها خودای موساشە کە ئێستا لێ ی بێ ئاگایەو چووە لە کێوی (طور) بیدۆزێتەوەو نازانێت لێرەیە).

داخۆ عەقڵی ئەو گەلە چەند کەم و سووك و ناتەواو بووبێت، تۆ بڵێی نەیانزانیبێت کە ئەو پەیکەرە هیچ سوودو زیانێکی نی یە و ناتوانێت سوودیان پێبگەیەنێت یان زیانیان لێ دوورخاتەوە؟ تەنانەت توانای وەڵام دانەوەی قسەیەکیشیانی نەبووە چونکە ماددەیەکی بێگیان و بێدەنگ بووە.

پاشان "موسا" ڕووی کردە (هارون)ی برایو بەتوندی ڕایتەکاندو توند ڕیش و قژی ڕاکێشا و بەتووڕەیی یەوە پێی گوت: (ئەرێ بۆچی کاتێك ئەو خەڵکەت لەو حاڵەتی گومڕاییەدا بینی و دیتت ئەوا مەیلیان بەلای پەرستنی گوێرەکەکەدایەو تەفرەدراون، بۆچی خێرا نەهاتیت بەدوام دا و پێم بگەیتەوەو هەواڵی ئەو بارودۆخەیانم پێ بگەیەنیت؟)

(هارون)یش لەوەڵامدا پێی گوت: (لەوە دەترسام کە وابزانیت من گەلی -بنو ئیسرائیل- م بەش بەش کردووەو بەشێکیان دوای تۆ کەوتن و بەشێکی تریشیان دوای سامری کەوتن، هەروەها لەوەش ترسام تۆ پێم بڵێیت: من تۆم لەنێویان دا جێهێشتووە کەچی تۆش هاتوویت بەدوام دا. لەکاتێك دا فەرمانت پێکردم کە لەنێویاندا بمێنمەوە و ئیتر منیش چاوەڕێم کردیت هەتا گەڕایتەوە.)

دوای ئەمە "موسا" گلەیی و گازاندەیەکی هێگجار فرەی لە-سامری- کرد کە ببووە هۆی ڕێ لێتێك دانیان. کەچی-سامیری-لەوەڵامی دا گوتی: (من لەهەموو کەس زیاتر دەمزانی تۆ لەسەر هەقیت و پەیڕەویم کردبوویت و هەندێك لەدینەکەشتم وەرگرتبوو، بەڵام دوایی وازم لێهێناو گەڕامەوە بۆ سەر-گوێرەکەپەرستی-ئەمەش نەفسم پێی کردم و بۆی جوان کردبووم تا وام لێ هاتبوو کە ئەو کردارە ئەنجام بدەم)..

ئیتر "موسـا" پێی گوت: (دەبڕۆ وا کەوتیتە بەر سزای خودا و سزاکەش ئەوەیە لـەدنیادا هەتاماویت دەبێت بڵێیت -لا مساس-(واتە دەستم لێمەدە))، چـونکە بـەوە ئـازارێکی زۆری دەچەشت گەر هەر کەسێك دەسـتی لێ بدایـە یـان دەسـتی بـەر هـەر جێگەیـەکی جەسـتەی بکەوتایە. سامیری-لەدنیادا وای لێ هاتبوو بەهەر کەسێك بگەیشتایە دەبـوو پـێی بگوتایـە (لامساس)-واتە دەستم لێ نەدەیت-.

دەربـارەی سـزای ئـاخیرەتیش "موسـا" پـێی گـوت: (ڕۆژی دوایـش وادەی سـزایەکی کاریگەرتر هەیە بۆت و ناتوانیت لێی دەربازبیت).

پاشان "موسـا" بەرەو پەیکەری گوێرەکەکە ڕۆیـشت و سـووتاندیەو هـەموو خۆڵەمێـشی پاشماوەی سووتاوییەکەی بەنێو دەریادا بڵاوکردەوە.

لەملاشەوە (بنو اسرائیل) زۆر پەشیمان بوون لەو گوناهە گەورەیەی کردبوویان و لـەخودای مەزن پاڕانەوە لێیان خوش بێت و لێیان ببورێت. خوداش بۆ وەرگرتـنی ئەو نزایەیان سرووشـی بۆ "موسـا" نارد کە دەبێت بۆ بەجێگەیاندنی تۆبەکەیان خۆیان بکوژن، واتە خۆکوشتنەکەیان بەو جۆرە بێت کە هەموو ئارەزویەکیان کپ کەنەوەو دەروونیان لەخراپەو بەدکاری پاك کەنەوەو خۆیان لەهەر حەزو ئارەزوویەکی نەفس دابڕن، بـەمانای نەفـسی خۆیـان لـەوەدا بکـوژن نـەك بەجەستە خۆیان لەناوبەرن، ئەوسـا خـوداش تۆبـەو پەشـیمانیيان لێ وەردەگرێـت و نزاکـانی لێخۆش بوونیان گیرا دەکات.

ئەمەی پێشوو قۆناغێکی دیکەی ئەو داستانە پڕ دەرس و پەندەی قورئان و شـیکاری ئـەم ئایەتانەش بوو کە خودای زاناو کاربەجێ تیایان دا فەرمووبە:

﴿قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنۢ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَـٰنَ أَسِفًاۚ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا[1] وَلَـٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَـٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَـٰذَآ إِلَـٰهُكُمْ وَإِلَـٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَـٰرُونُ مِن قَبْلُ يَـٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَـٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَـٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾

---

(١) (بملكنا): (بأختيارنا) واتە بەخواستی خۆمان.

قَالَ يَـٰهَـٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَـٰسَـٰمِرِىُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ۖ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَـٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا ۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَـٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴾طه/٩٣-٩٨

بۆ مەسەلەی خۆکوشتنەکەشیان بەو ڕەنگەی کە لەهەموو ئارەزوویەکی نەفس خۆیان دابڕن و ئەو ئارەزوانە بکوژن لەجێگەیەکی تری قورئان دا ئاماژەی بۆ کراوە و خودا تیایدا فەرموویە:

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ[1] فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾البقرة/٥٤...

## سزادانێکی "بنو اسرائیل" و پاشان لێبوردنیان

(بنو اسرائیل) بۆیان دەرکەوت کە بەڕاستی ئەوان زوڵمیان لەخۆیان کردووە و گوناهێکی گەورەشیان بەهۆی پەرستنی گوێرەکەکەوە ئەنجام داوە، "موسا"ش حەفتا پیاوی لێ هەڵبژاردن تا لەگەڵ خۆیدا بیانبات بۆ چیای (طوور)- واتە بۆ ئەو شوێنەی کە خووی پێوەگرتبوو لەکاری پەرستنیو زیکرو یادکردنەوەی دا-ئەم پیاوانەشی بۆیە برد بۆ ئەوێ تاکو ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ خودا پیشان دەن و پەشیمانیی خۆیان دەربڕن لەسەر گوناهەکانیان.

جاکاتێك گەیشتنە ئەو جێگەیە خودای مەزن لەگەڵ "موسا"دا قسەی کردو دواندیی. کەچی تاقمێك لەو پیاوانە باوەڕیان بەوە نەهێنا کە ئەوە (خودایە)ـەو لەگەڵ-موسا-دا دەدوێت، بەڵکو هەڵگەڕانەوەو یاخی بوون و گوتیان (ئەی-موسا-ئێمە باوەڕت پێ ناهێنین هەتاکو خودا بەچاوی خۆمان و بەبێ وجودی بەربەستێك دەبینین)..

---

(١) (بارئکم): بەمانای (خالقکم) واتە خالق و کردگارتان کە دروستی کردوون.

هەر دوای ئەم داواکاری یە نابەجێ یەشیان خودا بەدەنگی هەورو بروسکەیەك سزای دان و خستنی بەزەوی داو کوشتنی، پاشان دوای ئەو مردنەیان زیندووی کردنەوە، چونکە بێگومان "موسا" زۆر بۆیان پاڕایەوەو داوای لەخوا کرد چاوپۆشی بکات لەوکارە ناهەموارەی هەندێك کەسی بێ عەقڵ و گەمژەی نێو خۆیان وبابەهۆی ئەو ڕەفتارە نادروستەی ئەو چەند کەسە نادان و سەرکێشەوە سزای هەموان نەدات، ئەوەبوو خوداش لێ یان خۆش بووو ژیانی پێدانەوە.

ئینجا لەم ساتەدا "موسا" داوای ڕەحمەت و میهرەبانیی خودای بۆ گەلەکەی کرد، لەوەڵامی ئەم داوایەدا خودا هەواڵی ئەوەی پێ‌گەیاند کە مەسەلەی (لێبوردن و ڕەحمەت بۆ ئەوان) بەندە بەخواستی ئیلاهیی خۆیەوە. هەروەها هەواڵی ئەوەشی پێ‌گەیاند کە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی بۆ کەسانی لەخوا ترس و بەتەقوا نووسیوە، ئەوانەی کە زەکاتی ماڵ و سامانیان دەدەن و باوەڕ بە ئایەتەکانی خودا دێنن و ڕێساو فەرمانەکانی پەیرەو دەکەن..

خودای مەزن فەرموویە: ﴿ وَٱخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُۥ[1] سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَٰتِنَا[2] فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ[3] قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾ وَٱكْتُبْ لَنَا فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِىٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنْ أَشَآءُ وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الأعراف/١٥٥-١٥٦.

هەروەها خودا دەربارەی دەنگە بەهێزەکەی ئەو هەورە تریشقەیەش کە لەشاخەکەی داو لەراندبوویەوەو ئەوانی بەسەرزەوی داخستبوو، فەرموویە: ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾البقرة/٥٥-٥٦..

---

(١) (قومه): واتە لەقەومەکەی، لەهۆزەکەی چەند کەسێکی هەڵبژارد.

(٢) (لميقاتنا): واتە بۆ ئەو کاتەی کە خودا دایینابوو تێبین و داوای لێبوردن بکەن لەسەر ئەو کاری گوێرەکە پەرستنەی کە هەندێك کەسی نەفام و گەمژەی نێو خۆیان ئەنجامیان دابوو.

(٣) (الرجفة): واتە لەرزینەوەی بەهێز، مەبەست لەلەرینەوەی چیاکەیە بەو دەنگە بەهێزەی هەورە برووسکەکە.

## بەرزکردنەوەی چیاکە بەسەر (بنو اسرائیل)دا

"موسا" هەر بەردەوام بوو لەسەر ڕاست کردنەوەی (بنو اسرائیل)، بەڵام جار لە دوای جار بەرهەڵستی و دڵڕەقی زیاتری لێ دەبینین، تا وای لێ هات خودا هەڕەشەی لەناو بردنی لێ کردن و شاخی (طوور)ی لەسەر سەریان بەرزکردەوە، ئەوانیش هێندە ترسان وایان دەزانی دەکەوێتە خوارەوە بەسەریان دا، بۆیە دەسبەجێ پەنایان بردەوە بەر خوداو لێ ی پاڕانەوە کە ئەو مەترسی یەشیان لەسەر هەڵگرێت.

خوداش فەرمانی پێ کردن کە بەچاکی و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەو فەرمان و ئەحکامەی بۆی ناردوون پابەند بن پێیانەوە بێ ئەوەی هیچ نارەزایی و پرتەو بۆڵەیەکیان لێوە بێت، هەروەها دیراسەی هەموو ئەو شتانەی نێو کتێبی خودا بکەن و لێی بکۆڵنەوەو لێی تێبگەن و کاری پێ بکەن و، نابێت لێ ی بێئاگاو غافل بن، تاکو بەم شێوەیە بگەنە پایەی پارێزکاران(متقین) و خواپەرستانی ڕاست.

جا کاتێك خودا ئەو خەمەشی لەسەر لابردن دووبارە لە ڕێی خودا لایان دایەوە. خۆ ئەگەر فەزڵ و رەحمەتی حەکیمانەی خودا نەبوایە ئەوا هەر ڕەنجەڕۆو خەسارەتمەند دەبوون:

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾البقرة/٦٣-٦٤..

## ڕوو وەرچەرخانی (بنو اسرائیل) لەچوونە نێو خاکی پیرۆزەوە

خودا فەرمانی بە "موسا" کرد کە (بنو اسرائیل) ببات بۆ خاکی پیرۆز (واتە بۆ- فەلەستین)، تا لەوێ نیشتەجێ بن.

"موسا" بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە سەرەتا بەچەند وتەیەکی پێویست گەلەکەی دواندو هەموو نیمعەتێکی خودای بەبیر هێنانەوە، وەك ئەو نیعمەتە دیارەی کە چەندین پێغەمبەریان لەنێودا دەرکەوتوەو خودا بۆی ڕەوانە کردوون تاکو لەگومرایی ڕزگاریان کات و ڕێی ڕاستیان پیشان بدات، هەروەها نیعمەتی ئازادیی ی پێداون و ڕزگاری کردوون دوای ئەوەی لەژیانێکی کۆیلایەتی و بەندایەتی ژێر دەسەلاتی (فیرعەون) وتاقمەکەی دا بوون، جگە لە هەموو ئەو نیعمەتە زۆرانەی کە بەتایبەتی پێیان دراوەو لەخەڵکی تری زەمانی خۆیانی پێ

جیاکراونەوە، بۆیە ئەرکی ئەوانیش لەبەرامبەر ئەم نیعمەتە زۆرو گەورانەدا ئەوەیە سوپاسی خودا بکەن و هەر فەرمانێکی پێ‌داون بەچاکی پەسندی بکەن و پیادەی بکەن.

ئینجا "موسا" پێش ئەوەی داوای چوونە نێو خاکی پیرۆزیان لێ بکات، چەند کەسێکی دیارو هەڵکەوتووی لەگەڵەکەی نارد بۆ وەرگرتن و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەو خاکە و سوود وەرگرتنیان لەو زانیاری یانە.

ئەوانیش کاتێك گەڕانەوە بۆ لای "موسا" هەواڵی ئەوەیان پێ دا کەوا گەلێکی بەهێزی تێدایەو هەموویان کەڵەگەت و باڵابەرزن و شارەکانیشیان (بەشووراو قەڵای بەهێز) مەحکەم کردووە.

(بنو اسرائیل) بەم هەواڵ و زانیاری یانە ترسیان لێ نیشت و گوێڕایەڵی فەرمانی "موسا"یان نەکرد لەئەرکی ڕوو بەڕووبوونەوەی ئەو گەلەو چوونە نێو خاکەکەوە، بەڵکو لەجیاتی ئەوە پێ‌یان گوت: (ئەی "موسا" بێگومان لەو خاکەدا چەندەها ئینسانی کەڵەگەت و بەهێز هەیەو ئێمەش دەرەقەتیان نایەین و پێ‌یان ناوێرین، جا هەتا ئەوانی تێدابێت ئێمە ناچینە ناوی. هەر کاتێکیش لێ ی دەرچوون ئەوا داواکاریەکەت بەجێ دەگەیەنین و دەڕۆینە ناو ئەو خاکەوە.)

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴾المائدة/٢٠-٢٢..

## ڕێ لێ ون بوونی (بنو اسرائیل)

دیارە هەمیشە لەهەر کۆمەڵەو دەستەو تاقمێك دا جگە لەوجودی کەسانی خراپ لەهەمان کات دا چەند کەسێکی بەئەدەب و ڕێکوپێکیش هەبوون. لەنێو ئەو خەڵکەش دا دوو پیاو (لەوانەی کە خودا لەسەر تەقواو بەندایەتی ڕاست بەهرەمەندی کردوون و هیدایەتی داون) ڕوو دەکەنە گەلەکەیان و ئامۆژگاری یان بەوە دەکەن، کە پێ‌یان دەڵێن: (ئێوە بچنە سەر ئەو گەلە(واتە لەخاکی پیرۆزدا)و هەڵکوتنە سەر ناوجەرگەی شارەکەیان لەدەروازەی شارەوەو ئیدی

کتوپڕ ئەوان دەترسن و سام و بیمێکی زۆر دەکەوێتە نێودڵیانەوەو دەبەزن، ئێوەش بەسەریان دا سەردەکەون، بەڵام لەم کارەدا دەبێت پشت بەخودا ببەستن گەر ئێوە بەڕاستی باوەڕتان پێی هەیە).

وەلێ (بنو اسرائیل) ئەو ئامۆژگاری یەشیان پەسند نەکرد و لەوەڵام دا قسەیەکی هێندە نابەجێ و ناشیرینیان درکاند کە بۆنی پیسکەیی ی و یاخی بوون و ترسنۆکی ی لێوە دەهات، قسەکەشیان ئەوەبوو کە قورئان لەئایەتە بەناوبانگەکەی دا بۆی گێراوینەتەوەو گوتبوویان ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾. واتە (ئەی موسا تۆ خۆت و خوداکەت بڕۆن و بجەنگن لەگەڵ ئەو گەلەی ناو خاکی پیرۆزداو، ئێمەش وا لێرە دانیشتووین).

ئەمەش دوایین (وێستگەی سووری ژیانی موسا لەگەڵ گەلەکەی)دا بوو، دوایین هەوڵ و تەقەللای ئەو سەفەرە درێژەی بوو کە ئەوەی بەچاوی خۆی دیتیی: ڕوو وەرچەرخانی گەلەکەی بوو لەچوونە نێو خاکی پیرۆزەوە.

ئەی داخۆ "موسا" (لەدوای ئەو هەموو کۆششە قورس و پڕ لەزەحمەتەیدا بۆ ڕاست کردنەوەی گەلەکەی) و لەئاست یاخیبوونی بەردەوامیان دا چ هەڵوێست و کاردانەوەیەکی بووبێت؟ ئایا جگە لە باسی حاڵی خۆی لەلای خودا هیچ ڕێگەیەکی تری گرتۆتەبەر؟

ئەو هەردەم لەو جۆرە حاڵەتانەو بەتایبەتیش لەدوایین حاڵەت دا وپاش بییستنی ئەو قسە نابەجێیە ڕوودەکاتە خودا و لێ ی دەپاڕێتەوەو دەڵێت: (ئەی پەروەردگار بەڕاستی من هیچ دەسەڵاتێکم لەسەر کەس نی یە تەنها لەسەرخۆم و براکەم نەبێت. دەتۆش ئەی خودایە بەحوکمی دادوەری و عەدالەتی خۆت دادوەری لەنێوان من و ئەو بەدکارو یاخییانەدا بکە.)

خوداش بەدەم ئەم داواکارییەوە دێت و نزای گیرا دەکات و هەواڵی ئەوەشی پێ دەدات کە دەبێت خاکی پیرۆز (الأرض المقدسة) هەتاکو (چل ساڵ) حەرام بێت لێ یان و دەبێت لەبیابانی (سیناء) و لەو ماوە درێژەدا بێن و بچن و ڕێیان لێ تێك چێت و ئاوەدانی نەبینن. هەروەها خودای مەزن داوای لە "موسا" کرد کە هیچ دڵتەنگ و خەمبار نەبێت بۆ ئەو گەلە نەفامەی لەفەرمانەکانی خودا دەرچوون و گوێڕایەڵییان نەکردووە.

ئەم بڕگەیەی دوایش شیکاری ئەم ئایەتانە بوو کە ئەم بەشەی دوایی داستانەکە دەگێڕنەوەو خودا تیایاندا دەفەرموێت:

﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن

نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِي ۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾المائدة/٢٣-٢٦..

# بەندی شەشەم

## ((چەند پەندو وانەیەك لەچیرۆكی "موسـا" وە))

( ڕاست كردنەوەی گەلان دوایتێكچونیان - ئاكامی بێباوەڕی و ستەمكاری -
تۆكمەیی و پتەویی بیروباوەڕ - سەركەوتنی هەق بەسەرناهەق دا - ئازادیی گەلان -
بانگەواز بۆ خەبات - لەڕیشە هێنانی ستەم - ئازادبونی بروادااران - دەرچوون لەژێر ڕكێفی داب و نەریت -
ئاخاوتن بەوتەی نەرم - باوەڕهێنان لەرێی عەقڵەوە - پووچەڵكردنەوەی عەقیدەی میسری یە كۆنەكان -
پیرۆز ڕاگرتنی خوداو ڕێزلێنانی تەواو و شایستەی )

### ڕاست كردنەوەی گەلان دوای تێكچونیان

بێگومان ئەو گەلانەی كـە ژیـان لـەژێر چـنگی زوڵـم و سـتەمكاری دا بەسـەر دەبـەن و مامەڵـەی تونـدو ناخۆشـیان لەلایـەن حاكمەكانیانـەوە لەگـەڵدا دەكرێـت، ئـەوا ڕەوشـت و ئاكاریشیان تێك دەدرێت و فێـری سەرشـۆڕی و زەلیلـی دەبـن، بـەم پێیـەش زیـاتر حـوكمی ستەمكاران بەرقەرار و بەهێز دەكەن.

خۆ ئەگەر ئەو حوكمە پڕ لەغەدرو ستەمە بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ بخایەنێت، ئەوا خـوو و ڕەوشتە شێواوەكانی نێـو خـەڵكییش زیـاتر ڕەگ دادەكـوتن و دەچەسـپێن و، بـەمیراتیش بـۆ نەوەكانی دوای خۆیانی دەهێڵنەوە، تەنانەت هەرئەم جۆرە خوو نەریتە تێك چوانەش سروشت و كەسێتی ی خۆیان و هەر مرۆڤێكی دی دادەڕێژنەوە.

سیمای ژیانی(بنو اسرائیل) و بارودۆخی گوزەرانیان ئاوابوو، زوڵمی فیرعـەونەكان سروشت و فیطرەتی ئەوانی تێك دابوو لە-میسر-دا و مۆركی سووكایەتیو سەرشۆڕی و ترسـنۆكی پێـوە نابوون، تا ئەو كاتەی خودا "موسـا"ی بۆ ڕەوانە كردن و بانگی كـردن بـۆ جیهـادو تێكۆشـان لەكاری چوونە نێـو خـاكی پـیرۆزەوە، بـەڵام دەروونـە زەلیـل كراوەكانیـان كـە بەملكەچـی و بەندایەتی ڕاهاتبوون ڕێی جیهادی پێ نەدان، هەر بۆیەش قورئـان باسـی ئـەو سـزایەمان بـۆ دەكات كە خودا خستیە سەریان و ماوەی چل ساڵ لـەو بیابانـەدا هێـشتنیەوەو ڕێیـان لێ ون ببـوو و دوای لـە "موسـا"ش كـرد هـیچ خەفـەتێكیان بـۆ نـەخوات: ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ

عَلَيۡهِمۡ (١) أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾. ئەمەش ئەو پەروەردە خوداییەیە کە پەروەردگاری جیهانییان ئەوانی پێ گۆش کرد، واتە بۆیە ماوەی ئەو چل ساڵە لەبیابان دا هێشتنیەوە تاکو سیفەتە جوانەکانی (ئازایەتی و دلێری و بەهێزی و متمانە بەخۆکردن)یان تێدا دروست ببێت، ئەو نەوە (جیل)ـە کۆنە بڕۆن و نەمێنن کە (ملکەچی ستەمکاری ببوون و کۆیلایەتیان لەلا شیرین و ئاسایی ببوو) و دوای ئەمان نەوەیەکی نوێ گەشەبکەن کە (خوو نەریتی جوامێری و ئازایەتی ی خێڵەکی و چاوقایمی)یان تێدا بچەسپێت و لەهەمان کاتیش دا بەدادگەری و ڕێنمایی ی شەریعەت بەختەوەربن.

خودای داناو باڵادەست بەم شێوەیە پەروەردەی کردن تا توانای ئەوەیان پێ بدات و سازیان کات بۆ چوونە نێو خاکی پیرۆزەوە، بەم ڕەنگەش توانای خۆکۆنترۆڵ کردن و بەدەمەوە هاتنی خێرای ئەرك و فەرمانە شەرعی یەکانیان هەبێت و تامی ژیانی ڕاستەقینەش بچێژن.. ژیانی مرۆڤێکی ئازادو بەڕێزو بەهێز، نەك ژیانی کۆیلەیەکی سەرکزو داماو.

ئێمەش دەبێت پەندو عیبرەت لەم پەروەردە خودایی یە وەرگرین و ئەوەش بەچاکی بزانین، کە بێگومان ڕاست کردنەوەی گەلان دوای تێك چوونیان بەپێگەیاندنی نەوەیەکی نوێی وەها ئەنجام دەدرێت و دەبێت ئەم ئاکارە بەرزانەیان تێدا بچەسپێت:

١/ یەکەمیان ئازایەتی ی کەسانی دەشت و دەر، واتە وەك دانیشتوانی دەشت و چیاکان ئازاو دلێرو ئازادی خوازو خاوەن بازووی پۆڵایین بن.

٢/ دووەم ئاکاری هەرە بەرزو جوانیش کارکردنە بەشەریعەتی خوداو خۆڕاگرتن لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی و پیادەکردنی ڕێبازە عادیلانەکەی.

با لێرەدا نەختێك چاو لێك نێین و بەوردی بیربکەینەوە لەبارودۆخی کۆمەڵگەی ئەمڕۆمان و ئینجا بەچاوی تیفکرینەوە بڕوانین بۆ ئەو فەسادو گومڕایی یەی کە سەرجەم گرۆی بەشەری و کۆمەڵگەکانیانی تێك داوە و داخۆ چ هۆکارێکی ئەوەندە تێکدەر و گێرەشێوێن بۆ ئەم مەبەستانە بەگەڕ خرابن؟

بێگومان دیارترینی ئەو هۆکارانەی کە لاوان و نەوەی نوێی بەرەو ئەم فەسادییە ئاڕاستە کردووە ئەمانەن: (فیلمە سینەمایی یەکان، بەرنامە هەست وورووژێنەکانی تەلەفزیۆن، ڕۆژنامەو گۆڤارە تێکدەرەکان)، (جگە لەو هۆکارە دیارانەی کە ڕۆژانە بەکاردێنرێن و لەخەڵکی پەنهانیین)..

جا ئایا کارێکی ڕاستە گەر چاو لە هەموو ئەو هۆکارانە بنووقێنین و واز بێنین تا بەرهەم

---

(١)(محرمة عليهم): واتە(حەرامە لێ یان)،مەبەستی لە(بيت المقدس)ـە کەتا ئەوچڵ ساڵە نەچنە ناوی یەوە.

هێنەران و دەرهێنەرانی فیلمە کوشندەکان و، کاربەدەستانی سەر ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەهەواو هەوەسی خۆیان هەڵسوکەوت کەن و هەر خەریکی تێکدان و زیادکردنی داهاتی مادیو کێشانەوەی پارەو پوول بن، تەنانەت کە لەسەر حسابی گومڕا کردنی نەتەوەو لاوازکردنی ڕۆڵەکانی و خاوو خلیچك کردنیان بێت؟

ئەی ئایا کارێکی ڕاست و دروستە گەر لاسایی فیلمە بیانی یە سەرشێوێنەکان بکەینەوە، واتە: ئەو فیلمانەی، کە زۆربەی کۆمپانیا بەرهەم هێنەکانیان لەژێر دەسەڵاتی جوولەکەدایە؟

ئایا دەشێت پەیڕەویی ئەو ڕێبازو شێوازانەی ناوەڕۆکی فیلمەکانیان بکەین و وەختێکی زۆر بەتەماشاکردنی فیلمە چەواشەکاری یەکانیانەوە بەسەربەرین؟

ئەی بۆچی حکومەت و کاربەدەستانی وڵاتە عەرەبی و موسڵمانەکان هەوڵی بەرهەم هێنانی فیلم و شانۆگەریی ی بەسوودو پەروەردەیی نادەن و، پاشان ئەو فیلمە نابەجێیانەش قەدەغەکەن کە عەقڵ و هۆشی خەڵکی تێك دەدەن و ئاکاریان دەشێوێنن؟

بۆچی حکوماتی وڵاتە عەرەبیو موسڵمانەکانی تر سانسۆر (چاودێری)یەکی توندو شیاو ناخەنە سەر ئەو فیلمانەی کە لەدەرەوەی وڵاتەکانیانەوە دەهێنرێن و بانگەشە بۆ ڕووت و قووتیو فریودان و تێکدانی ڕەوشتی ڕۆڵەکانی نەوەی نوێ دەکەن؟

بۆچی ئەم حکومەتانەی وڵاتانی (موسڵمان نشین) ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە تەمێ ناکەن یان داناخەن کە عەیب و عاری خەڵکی دەردەخەن و چەند مەسەلەیەکی ئابڕووچوون دەقۆزنەوەو وێنەی ئافرەتی ڕووت و نیمچە پۆشتە لەلاپەڕەی یەکەم دا بڵاو دەکەنەوە تاکو لەلایەکەوە هەواو هەوەسی چەند کەسانێکی بەدڕەفتار تێرکەن و لەلایەکی تریشەوە برەو بەبازرگانییە هیچ و پووچ و بێ بەهاکەی خۆیشیان بدەن؟

بۆچی حکوماتی عەرەبی سەمای خۆرهەڵاتی (الرقص الشرقي)و سەمای بیانی لەبەرنامەکانی تەلەفزیۆن لانابەن کە تەنها بۆ خرۆشاندنی ئارەزووی جنسی خەڵکی یە؟ ئەم جۆرە سەمایە تەنها بۆ بزواندنی ئارەزووە ئاژەڵییەکانی کەسانی نەفامە، بەتایبەتیش ئارەزووی لاوان کە لەئاکامی ئەوەوە زیانێکی زۆر بە دەروون و شێوازی هەڵسوکەوتیان دەگات.

یان بۆچی ئەو فیلمە پۆلیسی و جاسووسیانە قەدەغە ناکەن کە دەوری کوشتن و تاوانکاری زۆری تێدا دەبینرێت و بەم هۆیەشەوە کار لە فیکرو هەڵسوکەوتی گەنجەکان دەکەن و هیستریای دزی و تاوانکاری و ڕاوو ڕووت لەبیرو هۆشیان دا پەرە پێ دەدەن؟

هەروەها بۆچی حکوماتی وڵاتە موسڵمانەکان بەربەستێکی پێویست ناخەنە بەردەم ئەو هەموو مودێلی جل وبەرگانەی کە لەدەرەوەی وڵاتەکانیانەوە دەهێنرێن و شوێنە ئابڕوودارەکانی جەستەی ئافرەتان و ئەندامە سەرنج ڕاکێشەکانیان دەردەخەن و کە هەموو ئاینێك دژی ئەو ڕیسواکردنە بوون؟ بێگومان ئەم جۆرە جل و بەرگانە بە مۆدێلە هەمە

چەشنەكانیانەوە گـرِی ئـارەزووی لاوان و هەسـت و نەسـتیان خـۆش دەكـەن و دەرس و دەوری قوتابخانەشیان لیٚ تیٚك دەدەن و تواناكانیـان ئیفلـیج دەكـەن لـەكاری سـوودبەخش بـۆ خۆیـان ونەتەوەكەشیان و پەكیان دەخەن..

ئەریٚ توخوا ئەمە شارستانیەتە؟!! نەخیٚر، بەلٚكو چەند لایـەنیٚكی دەردەدارو بۆگـەنی ئـەو شارستانیەتە شیٚواوەی خۆرئاوایە كە هەرِەشەی خـراپترین كارەسـات لەكۆمـەلٚگای ئـادەمیزاد دەكات.

## ئاكامی بیٚباوەرِی و ستەمكاری

مرۆڤ هەنـدیٚك جـار چـەند پرسـیاریٚكی بەخـەیالٚ دادیٚـت لەسـەر كارەسـاتی سروشـتیو ناسروشتی و هەموو ئەو رووداوو پیٚشهاتانەی تووشـی دەبـن، لـەو كارەسـاتانەش وەك: (ئـەو بومەلەرزانەی كە هەموو شتیٚك لەناودەبەن، ئەو لافاوانـەی كـە سـامانی نەتـەوەیی لەدەسـت دەدەن و پەرش وبلاٚوی دەكەن و هەزاران كـەس دەكـوژن و ئـاوارە دەكـەن، ئـەو گـەردەلوول و گیٚژەلٚووكە توندو یەك لەدوای یەكانەی كە هەرچی مرۆڤ بنیـاتی نـاوەو تەمـەنی تیٚـدا بەسـەر بردووە تیٚك دەدەن، ئەو جەنگ و شەرِو شۆرِانەی كە سەركردە بەتەماع و چاوچنۆكەكان هەلٚیان دەگیرسیٚنن و جگە لە ئاكامی ویٚرانی و مالٚكاولی هیچی تریان لیٚ بەدی نایەت)..

مرۆڤ لەدلٚی خۆی دا پرسیار لەهۆو فاكتـەری هـەموو ئـەم رِووداوو كارەسـاتانە دەكـات و وەلاٚمی برِندە (قـاطع)ی وای چنگ ناكەویٚ-كە قەناعەتیٚكی پیٚبینیٚت. دیـارە ئەمـەش بـەرەو رِەشبینی ی دەبات و وای لیٚ دەكات كە لە گۆشەنیگایەكی رەشەوە بۆ ژیان برِوانیٚت و خۆشـی گوزەرانی لیٚ سەنیٚت و ئارامی ی دەروونیشی لیٚ بشیٚویٚنیٚت.

وەلاٚمی ئەم پرسیارانەی مرۆڤ دەربارەی ئەو سزاو ئازارانەی كە تووشی مرۆڤ دەبن لەقورئان دایـەو هـەر قورئـان توانـای وەلاٚم دانـەوەیانی هەیـەو لەچـەند جیٚگایـەكی دا ئـەم وەلاٚمانـە بەرچاودەكەون، بەتایبەتیش لەچیرۆكی "موسـا"دا، كە بەرِوونی ئاماژە بـۆ هۆكارەكـانی ئـەو كارەساتانە دەكات و جەخت لەسەر دیـارترینی ئـەم هۆكارانـە: (بیٚبـاوەرِی)و (سـتەمكاری)و (گوناه كردن) دەكات.

ستەمكاری وبیٚباوەرِی (ظلم وكفر)یش دوو زاراوەن لە قورئان دا بۆ گوزارشت (تعـبیر) لـە (باوەرِ نەهیٚنان بەخودا) یان (هاوەلٚ بۆ خوادانان) و رِوو وەرچەرخان لەشەریعەتیو، دەرچوون لە سـنووری رِیٚـساكانی ئـەو شـەریعەتەو ئـەنجام دانـی گونـاهی زۆرو هەمـەجۆرو تاوانكـاریو شەرِخوازی، هەروەك خوداش لەقورئانەكەی دا دەفەرمویٚت: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا

﴿شَدِيدًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾آل عمران/٥٦. واتە: (ئەوانەی بێباوەڕبوون سزایەکی سەختیان دەدەم چ لەدنیاداو چ لە ڕۆژی دواییش دا).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَتِلْكَ الْقُرَىٰ أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴾الكهف/٥٩، واتە: (خەڵکی ئەو ناوچانە-گوند بن یان شار-بەهۆی خراپە و بەدکاری و بێباوەڕی ی خۆیانەوە لەناومان بردن و وادەی لەناوبردنیشیانمان دیاری کردبوو).

خودای مەزن جۆرەکانی لەناوبردن و ئامرازەکانیشی باس کردووەو فەرموویە:

﴿ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ الْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾العنكبوت/٤٠..

خودای گەورەو باڵادەست لەم ئایەتەدا چەند جۆرێك لەو سزایانەی خۆی دیاری دەکات، کە داینابوون بۆ گەلان و نەتەوە یاخی یەکانی پێشوو، یەکێك لەو گەلانەی بە گەردەلوولێکی توند لەنێو بردووە کە وردە زیخ و چەوی پێوە بووە، گەلێکی دیکەشی بەچەخماخەو هەورە بروسکە تەفروتوونا کردووە، هەروەك نەتەوەیەکی تری بەقووڵایی زەوی دابردووەو تیای دا ڕۆچوون. جگە لەوەی کە چەند کەس و گەلێکی بە(لەئاودا خنکان و نغرۆبوون) سزاداوەو لەناوی بردوون.

لەداستانەکەی "موسا"ش دا خودا بەسەرهاتی ئەو سزادانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە تووشی (فیرعەون) و گەلەکەی بوو بەهۆی ستەمکارییان وڕوو وەرچەرخانیان لە ئیمان و باوەڕهێنان، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَاسْتَكْبَرَ هُوَ (١) وَجُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ ﴾ القصص/٣٩-٤٠.. واتە: (فیرعەون خۆی و سەربازەکانیشی لەزەویدا لوتبەرزو خۆبەزل زان بوون و بەناڕەوا خۆیان فەرز دەکرد و وایان دەزانی بۆ لای خۆمان ناگەڕێنرێنەوە، ئێمەش لەتۆڵەی ئەو نەریتە نالەبارانەی ستەمکاریو بێباوەڕییان دا خۆی و سەربازەکانیمان سزادا و لەدەریادا خنکاندمانن، جا بڕوانە سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بووە؟ ).

هەروەها قورئان وەسفی ئاکامی بارودۆخیان دەکات کاتێك لەدەریاکەدا سەرنگووم دەبن و یەکەیەکە هەموو ئەو بێستان و کۆشك و تەلارو کەرەسە ئامرازانەی خۆشگوزەرانییان

(١) (استكبر هو): مەبەست لە فیرعەونە، واتە ئەو خۆی بەزل گرت.

دەبژێرێت تاکو پەندو ئامۆژگاریی لێ بخاتە ڕوو: ﴿كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَـٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَـٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ﴾الدخان/٢٥-٢٩.. واتە: (ئای چەند باخ و بێستان و کانیاوو جۆگەلەی سازگاریان بەجێهێشت.. ئای چەند کێڵگەو زەوی‌و زارو کۆشك و تەلاریان بەجێهێشت.. جگە لەو ژیانە پڕلەنازو نیعمەتەی کە بەخۆشی و شادمانی بەسەریان دەبرد، بەڵام دیارە بەهۆی بەدکاری وبێ‌ئیمانیی خۆیانەوە هەموویان لێسەندنەوەو دامانە دەست گەلێکی دی- واتە (بنو اسرائیل) بۆ ئەم چارەڕەشی‌و سەرەنجامەشیان هیچ کەسێك نە لەئاسمان و نەلەزەوی بۆیان دڵتەنگ و خەمناك نەبوو، هەروەها سزاکەشیان لە وادەی خۆی دوانەخرا)..

بەوردی بڕوانە بـۆ ئـەم ڕستەیەی دوایـی ی قورئـان دەربـارەی ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ﴾ وسەرنج بدە لەو دیمەنە ڕەوانبێژی‌یەی قورئان دەربارەی چارەنووسی ئەو ستەمکارانە: (نە ئاسمان و نـە زەوی بۆیـان نـەگریان) ئـەم دیمەنـە ڕەوانبێـژی یـەش ئـەو کۆتایی‌یە پڕ لە بەدبەختی و ئازار بەخشەی ستەمکاران بەرجەستە دەکات کـە تیـای دا هـیچ مەخلووقێك خەمبار نەبووە بۆیان تەنانەت گەر بێ گیان (جماد)یش توانـای ئاخـاوتن (نطـق)ی هەبوایە بۆیان پەست و دڵتەنگ نەدەبوو.

جا کاتێك قورئان ئەم ڕووداوانە لەمێژووی دێرین دەگێڕێتەوە ئەم نیازانەی هەیە:-

١- داوا لە خەڵکی دەکات تەماشـای مێـژووی کەسـانی پـێش خۆیـان بکـەن و بەچـاوی سوودبینین و دەرس لێوەرگرتنەوە مێژوو بخوێننەوە.

٢- لێکۆڵینەوەو دیراسەکردنی هۆکارەکانی لەناوچوونی چەند نەتەوەیەك و مانەوەی چـەند نەتەوەیەکی دی لەڕابردوودا.

٣- ڕۆشـن کردنـەوەی ئـەو حەقیقەتـەی کـەوا بـەختیاری و سـەرفرازیی مـرۆڤ تـەنها بەئیمانـداری و کـردەوەی چـاك بـەدی دێـت، گونـاه وتاوانکـارییش سـەرنجامێکی خـراپ و کوشندەیان هەیە لەسەر ڕەگەزی ئادەمیزاد.

قورئـانی پـیرۆز بەشـێوەیەکی گـشتی ئـەم نیازانـەی دووپـات کردۆتـەوە، هـەروەك لـەم فەرمایشتەی خوداش دا ڕەنگ دەدەنەوە:

﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن

وَاقٍ [1]﴾غافر/٢١.. واتە: (ئەرێ باشە ئەو خەڵکە بەسەر زەوی و وڵات و ناوچەکانی تردا نەگەڕاون تاکو بڕوانن بۆ ئاسەواری گەلانی ستەمکاری پێش خۆیان کە بەچ سەرەنجام و چارەنووسێك گەیەنراون؟ خۆ ئەو هۆزو نەتەوانەی پێش ئەوان هێزو توانا دەسەڵاتیان لەمانیش زیاتر بووەو شوێنەواری بیناسازیو ئاوەدانیشییان لەوان دیارترو گرنگ تر بوون بەڵام بەهۆی گوناهەکانی بێئیمانیو بەدکارییانەوە خودا سزای داون و لەناوی بردوون بێئەوەی پارێزەرێکیان هەبێت و لەسزای خودا بەدووریان کات).

## تۆکمەیی و پتەویی بیروباوەڕ

بیروباوەڕی ساغ و عەقیدەی ڕاست گەر بەچاکی لەدەروون دا بچەسپێت و لەدڵدا جێگیربێت ئەوا هیچ هێزێکی ماددی جۆی پێ لەق ناکات و لای نابات. ئەمەش دەرسێکەو لەسیحربازەکانی فیرعەونی وەردەگرین کاتێك بە قەناعەتەوە باوەڕ بەپەیامەکەی "موسا" دێنن و، لەکاتێکیش دا هەڕەشە ترسناکەکەی فیرعەونیش دەبیستن لەسەر ئەوەی گەر نەگەڕێنەوە ئەوا هەریەکە وقاچ و دەستیان دەبڕێت و پاشان هەڵیان دەواسێت بەداردا: ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾الاعراف/١٢٤.

ئاخۆ چۆن وەڵامی فیرعەونیان دابێتەوە؟ تۆ بڵێی لەهەڕەشەکەی ترسابن؟ نەخێر بەڵکو بەم وتە گەورەو گرنگە وەڵامیان دایەوە کە دەروونی مرۆڤی تێدا ڕادەچڵەکێت بەهۆی ئەو قوربانی دان و لەمردن نەترسانەوەی کەلەپێناوی بیروباوەڕو لەدوو توێی خۆی دا هەڵی گرتووە: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴾الأعراف/١٢٥-١٢٦.. واتە: (لەبەرامبەر هەڕەشەکەی فیرعەون دا سیحربازەکان گوتیان ئێمە هەر دەبێت بۆ لای خودا بگەڕێینەوەو بمرین، تۆش بۆیە خەتابارمان دەکەیت چونکە باوەڕمان بەموسا هێناوە، کە بەڵگەونیشانە ڕۆشنەکانی خودای بۆ هێناوین و ملکەچی ئەو بەڵگەو موعجیزانە بووین، پاشان ڕوویان کردە خوداو گوتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە ئارامی یەکی زۆرو بەتینمان پێ ببەخشە تاکو بەهۆیەوە بەرگەی سزای فیرعەون بگرین و بەو سزایە لەبیروباوەڕەکەمان پەشیمان نەکاتەوە، هەروەها لەسەر ئەو باوەڕە بمانمرێنە کە بەتەواوەتی خۆمان تەسلیمی هەموو حوکم و فەرمانەکانت کردبێت).

---

(١) (واق): واتە پارێزەرێك کە لەسزای خودا بیانپارێزێت.

با هەڵوێستەیەکی کورت لەبەردەم ئەم ئایەتە پیرۆزەو واتا بەرزەکانی دا بکەین، سەیرکە چۆن سیحربازەکان دەدوێن و دەڵێن: ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾.. واتە: ئێمە بۆ لای خودای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە-ئەم بیروباوەڕەش ئازارو کاریگەریی کارەسات کەم دەکاتەوە، چونکە زوو بێت یان درەنگ مرۆڤ هەر بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، خۆ ئەگەر زووتر بۆ لای خودا بگەڕێنرێتەوە، ئەوا هیچ زیان و کەم و کووڕی یەکی تێدا نی یە، مادام ئەوە بەخواستی خودا خۆیەتی و بۆ گەیشتنە بەدیداری خوداو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی و پاداشتی.

هەروەها بەوردی بڕوانە بۆ ئەم وتەیەی تریان کە نزای تێدا دەکەن و دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ﴾ چونکە بەڕاستی هەندێك جار ئەو ژان و ئازارە ناخۆشانەی کە مرۆڤ بەهۆی نەخۆشیو هەژاری و چەوسانەوەوە دەیچێژێت یان بەهۆی لەدەست دانی کەسێکی خۆشەویستی‌یەوە لەوانەیە لەسەر ڕاستەهێڵی(باوەڕو یەقینی بەخودا)ی لابدەن و بە هەرچوار پەل دا بیخەنە دۆزەخی بێباوەڕی و ڕەشبینی یەوە. جا نزاکەی ئەو سیحربازانەی کە تازە ئیمانیان هێنابوو لەبنج و بناوانی دا ورەو تینێکی پۆلایینی حەشارداوە لەسەر بەرگەگرتنی ئێش و ئازاری سزاکانی فیرعەون و لەسەر بەردەوام بوونی بێپسانەوە لەو ڕێڕەوە ئیمانی و باوەڕداریێتی یەی کە هیچ باکی لەئاکام و ئەنجامی نی یە گەر هەرچی یەك و هەر چۆنێکیش بێت.

ئێش و ئازارە کاریگەرەکانیش توندترین و قورسترین ئەو شێوازانەیە کە نەفسی بەشەریی پێ تاقی دەکرێتەوە. ئەوە ئەزموونێك و تاقیکردنەوەیەکی خودی جەوهەرو ناوەڕۆکی عەقیدەیە و خوێندنەوەی پلەی جێگیربوونیەتی لەدەروون دا.. هەر بۆیەش قورئان بەجیددی ئیمانداران وریا دەکاتەوە لەو ئیمانە ڕووکەش و لاوازەی کە خۆی ناگرێت لەبەردەم ڕووداوو گۆرانکاری‌یەکانی سەردەم داو هیچ سوودێکی نە لەدنیاو نە لە ڕۆژی دوایی‌دا پێ ناگەیەنێت، ئەویش لەم ئایەتەدا:

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖ[1] فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ﴾ الحج/١١.. واتە: (هەندێك کەس کاری خواپەرستی بەدڵنیایی‌و یەقینەوە ناکات، بەڵکو لەسەر بارێکی بەرژەوەندپەرستانەی خۆی پەیڕەویی ئایینی خودا دەکات، بۆ نموونە گەر بەهۆی باوەڕ و

---

(١) (علی حرف): واتە لەسەر ڕووکارێکی ئاینەکە بەئارام و جێگیرنی یە و بەبچووکترین تاقیکردنەوەی وەك ڕووداوێکی کاتی یان ئازارێك دەڕووخێت و لەڕێ لادەدات.

خواپەرستی یەوە سوودو بەرژەوەندی یەکی تایبەتی دەست کەوێت ئەوا شادو دڵنیا دەبێت، بەڵام گەر تووشی تاقیکردنەوەو ناڕەحەتی یەك بێت لەسەر ئیمانەکەی، ئەوا لەو باوەڕداریێتی یەی پەشیمان دەبێتەوەو ڕەشبینی دەردەبڕێت. بەم ڕەنگە دنیاش و ڕۆژی دوایشی لەدەست دەچێت ولەخێرو بێری هەردوکیان بی بەش دەبێت، ئەمەش خەسارەتمەندی و ڕەنجەڕۆیی‌یەکی ئاشکرایە بۆ ئەو جۆرە دەروون لاوازانە).

## سەرکەوتنی هەق بەسەر ناهەق دا

چیرۆکی "موسـا" ڕاستی یەکی دیکەمان بۆ دووپات دەکاتـەوە دەربـارەی ئـەوەی ناهـەق "باطل" هەرچەندێك باڵادەست بووبێت و دۆست ولایەنگرو شوێنکەوتوانی زۆری لەدەوری خۆی کۆکردبێتەوە، هەر دەبێت لەدوایی دا لەبەردەم هەق دا ببەزێت.

جا ئەو سیحربازانەی لەوەوپێش شـتێکی بـەتاڵو ناهـەقیان پیـشان دەداو خـەڵکییان پـێ چەواشەو چاوبەست دەکردو عەقڵ و هۆشیان داگیرکردبوون، نەیاندەزانی کە خـودا پـشتگیری "موسـا"ی پێغەمبەری بەموعجیزەیەکی بەهێزتر لەو سیحرەی ئەوان دەکات، هەروەك قورئان بـــۆی گێڕاوینـــەوە: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾الأعراف/١١٧-١١٨.

ئەوەش ساتەوەختێکی کورتەو قورئان تیای دا ململانـێی هـەق لەگـەڵ ناهـەق دا پیـشان دەدات کە هێندەی پێ ناچێت ناهەق (باطل)ـەکە لەبەردەمیا بەچۆکا دێت و دەکەوێت.

دیارە سیحربازەکان خۆیان لەهەموو کەس زیاتر دەیانزانی لەسەر ناهەقن و ئەوەی دەیکـەن پووچەڵە، هەروەها لەهەموو کەسێکیش زیاتر تێگەیشتبون ، کە ئەوەی "موسـا" هێناویەتی بۆیان هەقەو ڕاستە، هەر بۆیەش ئەوان لەپێشەنگی ئەو کەسانە بـوون کـە باوەڕیـان بـەخودای موسـا هێنا.

دیارە (فیرعەون)یش هەڕەشەی تـەمێکردن وسـزای سـەخت و ئازاربەخـشیان لێ دەکـات. ئەوانیش هیچ بایەخێك بۆ هەڕەشەکەی دانانێن، بـەڵکو بـەدڵ و دەروونـی پـڕ لەباوەڕیانـەوەو بەگیانێکی بەرزی باوەڕداریێتی‌یەوە کە هیچ بوارێکی بۆ گومان لێکردنی تێدا نـەماوە وەڵامـی دەدەنەوەو دەڵـێن: ﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ..﴾طـه/٧٣.. واتە: (ئێمە باوەڕمان بەخودای پەروەردگاری خۆمان هێنا تاکو لەگوناه و خەتاکانمان خۆشـبێت و لەو سیحرەشمان ببورێت کە تۆ بەزۆرو ستەم ناچارت کردبووین بۆ بەکارهێنانی).

(أخفش)[١]ی زانا لەوەسفێكی جوان ورەوانی خوی دا دەربارەی (ڕووداوی باوەڕهێنانی سیحربازەكان) گووتویە: (لەكاتی ڕووبەڕوو بونەوەكەی نێوان -"موسا" و سیحربازەكان-دا دوو دیمەنی خۆنمایش كردن (القاء)ی سیحربازەكان دەبینرێت، یەكەمیان: ئەوەیە كاتێك گوریس و داردەستەكانیان فڕێ دەدەنە زەوی ﴿ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ ..﴾ كە بۆ پیشان دانی بێباوەڕیو نكوولّی كردن بووە لەپەیامەكەی "موسا". دووەمیشیان: لەكاتێك دا باوەڕدێنن بە موسا كە ئەو مارە گەورەیەی لەداردەستەكەیەوە پەیدا دەبێت و هەموو مارەكانی ئەوان دەخوات و ئەوانیش سوژدە بۆ خودا دەبەن: ﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴾، (واتە لەو كاتەدا سەریان بۆ سوژدەبردن و سوپاسی خودا دادەنوێنن).. جا بەوردی تێبینی ی ئەو جیاوازی یە فرەگەورەیەی نێوان هەردوو حالّەتی خۆنیشاندان و نمایش كردن (القاء)ی سیحربازەكان بكە).. واتە: جیاوازی ی نێوان هەردوو ئایەتی﴿ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ ..﴾﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴾[٢].

## ئازادیی گەلان

هەر لەو چیرۆكەی "موسا"دا بڕیاردانی (مافی چارەنووسی وئازادیی گەلان ومافی ڕزگاربوون لەدەست كۆیلایەتیو ژیانی ژێر حوكمی ستەمكارە دەسەلاّتدارەكان) بەدی دەكرێت.

ئەوەش لەو فەرمایشتەی خوادا ڕەنگ دەداتەوە دەربارەی (بنو اسرائیل) و نیعمەتی لەسەریان و یارمەتیدانیان كاتێك لەسەرشۆڕیی بەندایەتی فیرعەون ڕزگاری كردن، ئەو بەندایەتییەی كە ماوەیەكی زۆرو درێژ زووخاو و تالاّویان لیّ چەشت، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾القصص/٥.. واتە: (خواستی دانایانەی ئیلاهیی ئێمە وابوو كە فەزلّی ڕزگاربوون و سەربەرزی بەو چەوساوانە بدەین و بیانكەین بە پێشەوایان و میراتگر و جێگرەوانی فیرعەون لەمولّك و دەسەلاّتی دا).

ئەم دەقە قورئانی یە جارێ ئەو ڕێسا بەرزە شەرعییە بەگوێی دنیادادەدات كە هیچ نەتەوەیەك مافی بەكۆیلەكردن و سەرشۆڕكردنی گەلێكی تری نییە و هیچ ئاتاج و پاساوێكیشی نی یە، كە بیخاتە ژێر هێزو هەژموون و كۆنترۆلّی خۆیەوەو سامان و داهاتی

---

(١) (الأخفش): لەزانا بەناوبانگەكانی زانستی ڕێزمانە لەزمانی عەرەبیدا.
(٢) بڕوانە هەر دوو ئایەتی (٤٤ و٤٦) لەسوورەتی (الشعراء).

زەوت کات. خۆ ئەگەر وابکات ئەوا خـودا لەکۆمـەك و پـشتیوانی کردنـی ئـەو گەلـە سـتەم لێکراوەدایەو سەرخەری دەبێت و لەکۆت و پێوەندی کۆیلەکردن و ستەم کاری ڕزگاری دەکات.

مێژووش لەلاپەڕەکانی دا چەندەها بەڵگەی تۆمار کردووە لەسەر ئەو گەل و نەتەوانەی کـە لەژێر ڕکێفی ستەمکاران دەرچوون و ئازاد بـوون، بێگومـان سـەرەنجامی ئـەو سـتەمکارانەش سەخت و دژوار بووە، بەتایبەتیش کاتێك چەوساوەو ستەم لێ کـراوان بـەڕوویان دا ڕاپـەڕیون و پەلاماریان داون و بەتوندترین شێوە تۆڵەیان لێ کردوونەوە.

هەر لەسەر زاری "موسـا"ش ئیدانە و ناڕەزایی لەسەر سیاسەتی بەکۆیلەکردن دەربـڕراوە، ئەویش لەم ئایەتـەی قورئـان دا ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾الـشعراء/٢٢.. "موسـا" کاتێك ئەم وتەیەی بەفیرعەون دەگوت کە ئەو باسی بەخێوکردنی (موسـا)ی دەکردو منەتی بەسەر دا دەکرد گوایە منداڵێکی بێکەس بووەو لەکۆشکی شاهانەیدا پـەروەردەکراوە، بۆیە"موسـا"ش پێی دەڵێت: (ئاخر تۆ چـۆن منـەتم بەسـەردا دەکـەیت لـەکاتێك دا هـەموو ڕۆڵەکانی گەلەکەمت بەعەبدی خۆت داناوەو سزایان دەدەیت ودەیانکوژیت؟)..

لە واتاو مەبەستی ئەم وتەیەش دا هەڵمەتێکی بوێرانە هەیە لەسەر دیـاردەی بەندایـەتیو بەکۆیلـەکردنی خـەڵکی و، پاشـان وریاکردنـەوەی فیرعەونیـشە لـەو خۆبـەزل زانـین و خـۆ فەرزکردنەو، ڕەخنەیەکی توندو کاریگەریشە لەڕەفتارە نائینسانی یەکانیی.

## بانگەواز بۆ خەبات

لەداستانی باوەڕهێنانی گەلەکەی "موسـا"و خۆڕاگرتنیان لەبەر ئازارو ئەشکەنجەی "فیرعەون"داو، لەو ڕاسپاردەو ئامۆژگاریانەی "موسـا"ش بۆیان لەسەر (ئارمگری و خەبات گێڕان) وانەیەك بۆ باوەڕداران هەیە تاکو لە پێناوی عەقیدەیان دا بەردەوام بن لەسەر خەبات و تێکۆشان، جا ئەو کەسانەش کە باوەڕیان بەپەیامەکەی "موسـا" هێنابوو (فیرعەون) زیاتر هەوڵی ئازاردان و کوشتنی دەدان، "موسـا"ش هاوسۆزی و هاوخەمیی بۆ ئەو باوەڕدارانەی هۆزەکەی دەردەبڕیو هانی دەدان لەسەر ئارام گرتن و مژدەی سەرکەوتنی پێدەدان: ﴿ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ لەم ئایەتەدا "موسـا" لایەنگرو شوێنکەوتوانی خۆی ڕادەسپێرێت لەسەر خۆڕاگریو کۆڵ نەدان و بەپێی ئەو سیفەتانەش بەڵێنی سەرکەوتنیان پێ دەدات گەر بە تەقوابن و خۆیان لەسەرپێچی ی فەرمانەکانی خودا بپارێزن. بەڵام ئەوان لە ژێر بارەگرانەکانی ئازارو ژان دا دەناڵێنن و بەدەم هاوارو ناڵەیانەوە سکاڵای حاڵی خۆیانی پێ دەگەیەنن چ لەپێش

کاتی بوون بەپێغەمبەری داو چ دوای ئەوەش، هەروەك خودا لەسەر زاری ئەوان گێراویێتیەوە لەقورئان دا: ﴿أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا﴾، "موسا"ش لەوەلامی ئەو هاوارو ناڵەو ساکاڵایەیان دا باسی ئەگەری لەناوچوونی دوژمنەکانیان بۆ دەکات: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ﴾... لەم وەڵامەدا لەخۆبوردنێکی ڕوون و ئاشکرا هەیە لەوەی کەنابێت پەلەقاژە بۆ ڕزگاربوونی خێراو سەرکەوتنی کتوپڕی بکرێت، چونکە لەناوچوونی دوژمن بەدەستی خودایەو گەر خودا خواستی وا بێت زوو لەناوچێت ئەوا ئەو کارە پێش دەخات، گەر خواستیشی لەسەر ئەوە بێت درەنگ لەناوی بەرێت ئەوا کارەکە دوا دەخات، بەڵام خودا بەڵێنی ئەوەیان پێ دەدات کە زوو بێت یان درەنگ هەر لەناویان دەبات تاکو ئەمان واتە چەوساوەکانی (بنو اسرائیل) لەسەر کارو کردەوەی خۆیان لەو ماوەیەدا هەڵسەنگێنێت، هەروەك لەپاشماوەی ئایەتەکەش دا دەفەرموێت: ﴿..وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾الأعراف/١٢٩.

جا ئەگەر ئەو بۆچوونە جوانە بکەوێتە نێو دڵی بڕوادارانەوەو ڕووبەندی بیروبۆچوونیان داگیرکات لەسەر ئەوەی کە بەبێ هیچ گومانێك خودا بەسەر دوژمنانیان دا سەریان دەخات گەر لەخەبات و جیهادیان بەردەوام بن و کۆڵ نەدەن.

گەر ئەم بۆچوونە ئاوا ڕەگ داکوتێت لەکانگای هزرو بیریان دا ئەوا گەورەترین کاریگەریەو ڕۆڵی دەبێت لە بەتین کردنی هیممەت و بەهێزکردنی ورەو عەزم و سڕینەوەی ترس و لەرز لە نێو دەروون و، ڕەواندنەوەی بێئومێدی لەنێو دڵ دا.

## لەڕیشە هێنانی ستەم

سەرکەوتنی "موسا" بەسەر-فیرعەون-دا نموونەیەکی ئاشکرایە لەسەر ڕیشەکێش کردنی ستەم و قورئان دەیخاتە بەر دیدەی هەر نەتەوەیەك کە حاکمەکەی ستەمی زۆر بکات و نەریتی (لەستەم دا ڕۆچوون) (طغیان)ی هەبێت.

دیاردەکانی (لەستەم دا ڕۆچوون)ی (فیرعەون)یش لەم خاڵانەدا ڕەنگیان داوەتەوە:-

١- (فیرعەون) جاڕی خوایەتی و پەرستراویێتی (الوهیة)ی خۆی بەنێو وڵات و گەلەکەی دا ڕاگەیاندبوو: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى﴾القصص/٣٨.

٢- (فیرعەون) کۆت و زنجیری خستبووە سەر بیروباوەڕەکانی خەڵکی و ئابلۆوقەی عەقڵ و هۆشیانیشی دابوو و هیچ کەسێك لەخەڵکی بۆی نەبوو باوەڕ بەشتێك بێنێت تەنها بە

ڕێگەدانی -فیرعەون- خۆی نەبێت: ﴿..ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ ..﴾الأعراف/١٢٣.

٣- (فیرعەون) ئەو گەلەی بەش بەش کردبوو و خەڵکی کردبوو بەچەند تاقم و کۆمەڵێکەوە تاکو بەئاسانی دەست بگرێت بەسەریان دا وەك چۆن ئیمپریالیزم و داگیرکەرانی ئەمڕۆ هەمان سیاسەتی (پەرت کەو زاڵ بە) بەسەر نەتەوە لاوازەکان دا پیادە دەکەن یان وەك چۆن حاکمی ستەمکارو دیکتاتۆر پەنا بۆ ئەم سیاسەتە دەبات لە پێناو بەردەوامیی حوکمە زاڵمانەکەیدا: ﴿ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا ...﴾القصص/٤.

٤- (فیرعەون) هەردوو گوێی خۆی لەئاست بیستنی وشەی (هەق)دا کەڕکرد: ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾القصص/٣٩.

٥- (فیرعەون) بەو زوڵم و ستەمە لەڕادەبەدەرەی خۆی وای لێ هاتبوو هەموو هۆکارو ئامرازێکی زەبرو زەنگ و قڕکردن وەبەر نێت و کوڕانی (بنو اسرائیل) و پیاوانی بکوژێت و ئافرەتانیشیان بەزیندوویی لەلای خۆی بهێڵێتەوە: ﴿سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴾الأعراف/١٢٧.

قورئانی پیرۆزیش دەرەنجامی ئەو (لە ستەم دا ڕۆچوونەی فیرعەون و ئەو خۆبەزل زانین و بەدرۆ خستنەوەی بەڵگەو نیشانەکانی خودا)ی دیاری کردووە کەچی ی بەسەرهات و چ بەروبوومێکی لی ٚچنی یەوە: ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ...﴾آل عمران/١١..

ئەمەش پەندو عیبرەتێکە بۆ ئەو حاکمە زاڵمانەی کە لەزوڵم و زۆرداری دا ڕۆچوون و، دەرس و وانەیەکیشە بۆ گەلانی ژێر دەستەوچەوساوە تاکو خۆڕاگرابن و بەرەو ڕووی زوڵم و زۆرداری ببنەوەو کۆڵ نەدەن چونکە لەدوایی دا بەیارمەتی و پشتیوانی خودا سەرکەوتن بەدەست دێنن.

## ئازادبونی بڕواداران

ڕزگاربوون و ئازادیی باوەڕدارانمان لەوەدا بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خودا چۆن مۆڵەت دەدات بە "موسا"و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدابوون تا دەرچن لە-میسر-و پاشان چۆن (فیرعەون) سەربازەکانی سازدەکات و لەگەڵیان دا دوای "موسا" و باوەڕداران دەکەون و لەنزیك کەناری دەریاکەوە بەدییان دەکەن، لەو ساتەش دا هاوەڵانی "موسا" ئاوڕدەدەنەوەو ترسیان لێدەنیشێت و بواری هەڵاتنی زیاتریشیان لەبەردەم دا نابێت، چونکە دەبینن تەنها دەریایان

لەبەردەم دا ماوەو دەریاش هەر شەپۆل دەدات و ئیدی وا گومان دەبەن گوایە دوا ساتیانەو لەنێو دەچن.

بەڵام "موسا" زۆر خۆڕاگرو بێخەم دەبێت لەبەردەم ئەو جۆرە ترسەی کە هەموو هەست و نەستێکی هاوەڵەکانی داگیر کردبوو و هیچ پەستی و ماتەمینییەکیش دەرنابڕێت، بەڵکو ئەم ڕستە بەجۆشەی پڕ لە بڵێسەی باوەڕداری دەردەبڕێت بۆیان و دەڵێت: ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾.

ئەم ڕستەیەش نموونەیەکی زیندووە و قورئان دەیخاتە بەرچاوی ئەو موجاهیدانەی لەپێناوی خوادا تێدەکۆشن و هانیان دەدات کە هیچ زویرو بێئومێد نەبن لەکاتی ڕووداوو کارەساتەکان دا، بەڵکو هەموویان یەکە بەیەکە لەناخی دەروونیانەوەو بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەم ڕستەیە بڵێنەوەو دڵنیابن لەسەرکەوتنی بەرەی هەق بەسەر ناهەق داو، متمانەشیان بەو ڕاستییە بەهێز بێت کە خودا سەرخەریانە. وەك چۆن "موسا" لەململانێی لەگەڵ (فیرعەون)دا بە ورەو متمانەو دڵنیایی یەوە ڕەفتاری کردووەو قورئانیش دەقی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوینەوەو خودای مەزن فەرموویە: ﴿ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴾الشعراء/٦٥-٦٧.

## دەرچوون لەژێرڕکێفی داب و نەریت

قورئان لەجێیەکی تری ئەم چیرۆکەدا وێنەی زاڵ بوونی داب و نەریتە باوەکان بەسەر گەلی (فیرعەون)دا دەردەخات، ئەویش کاتێك "موسا" بانگیان دەکات بۆ سەرڕێی ڕاست و ئەوانیش لەوەڵامی بانگەوازەکەی دا پێی دەڵێن: ﴿ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا[1] عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا﴾یونس/٧٨.. واتە: (ئایا بۆ ئەوە هاتوویت بۆلامان و بانگەوازمان دەکەیت تاکو لەسەر داب و نەریتی باب و باپیرانمان نەهێڵیت و بمانخەیە سەر عادەتێکی دی؟ ).

بێگومان دەسەڵاتی داب و نەریت لەلایەنی کۆمەڵایەتییەوە نرخ و سەنگی تایبەتیی خۆی لەلای هەر نەتەوەیەك هەیە، لەوانەشە ئەم دەسەڵاتەی داب و نەریت هەندێك جار کۆسپ و بەربەستێك دروست کات لەسەر ڕێی گەشەکردن و پێشکەوتنی ئەو نەتەوانەو وایان لێ بکات هەردەم ملکەچ و وابەستەی ئەو داب و نەریتانە بن کە بەمیرات لەکەلەپووری باب و باپیران و پێشینە دێرینەکانیانەوە بۆیان ماوەتەوە، تەنانەت گەر دژ و پێچەوانەی ڕاستی یەکانیش بن!

---

(١) لتفتنا: واتە تاکو ( ڕوومان پێ وەرچەرخێنیت بۆ سەر داب و نەریتێکی تر).

لەم ڕووەوە بێگومان عادات و داب و نەریت چەند هۆیەکی دواکەوتن و وشك هەڵاتن و دۆگمابوونی هەر گەلێکەو وای لێ دەکات توانای جم وجووڵ و هەنگاوونانی نەبێت لەمەیدانی پێشبرکێی نەتەوەکان دا و ناهێڵێت هاوڕەوت و هاوزەمانی گۆڕانکاری یە کۆمەڵایەتی یەکان بێت، چونکە گەورەترین زیانیش کە ڕوو دەکاتە کۆمەڵگە بەشەرییەکان و ڕێی گرتنە بەری ڕێگای سەرکەوتنیان لێ دەگرێت، (لاسایی کردنەوەی کوێرانەی باب و باپیرانە).

لاسایی کردنەوەش لەهەندێك کۆمەڵگەدا بووەتە هۆی دەستدرێژی کردنە سەر بانگەوازکارانی هەق و ئەشکەنجەدانیان، وەك چۆن زۆر لە پێغەمبەران و کەسانی چاکەخواز و پیاوچاك ئاوایان بەسەرهاتووەو دەستدرێژییان کراوەتە سەرو توشی ئەشکەنجەدان بوون لەو کۆمەڵو گەلانەی کە نەیانتوانیوە لەژێر ڕکێفی داب و نەریتەکانیان دەرچن ولە داووکۆتەکانی قوتاربن.

هەروەها لایەنێکی تری جوانکاریی قورئان لەدەربڕین و دارشتنی پرسیارو هۆیەکانی سەرسوڕمان دا ئەوەیە باسی بێسەلیقەیی و نابینایی ی خەڵکی دەکات لەشوێنکەوتنی کوێرانەی داب و نەریتەکانی باب و باپیرانیان داو بەکارهێنانی ئەو داب و نەریتانەش بۆ دژایەتیکردنی چاکسازیخوازان و بانگەوازکارانی ڕێی هەق، قورئان دەپرسێت: (چۆن دەبێت مرۆڤ جڵەوی ژین و بیروهۆشی بداتە دەست ئەو باووباپیرانەی کە بەعەقڵی ساغ نەجووڵاونەتەوەو ڕێگای هۆشمەندییان نەگۆتۆتەبەر یان لەسەر نەفامیوگومڕایی بوون؟ ) ئەم پرسیارەش واتای ئەم فەرمایشتەی خودا بەرجەستە دەکات:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۗ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾البقرة/١٧٠.

## ئاخاوتن بەوتەی نەرم

کاتێك "موسا"و (هارون) فەرمانی خودایان پێگەیشتبوو دەربارەی بانگ کردنی (فیرعەون) بۆ خواپەرستی، ئاتاجیشیان بەشێوازێك بوو بۆ ئاسان بوونی ئەو بانگەوازەو ئەرکەکانی، بەڵام چ شێوازێك؟ چۆن فیرعەون بدوێنن؟ بێگومان خودا ئەمەشی بۆ مەیسەر کردن و فەرمانی پێکردن کە بەو پەری نەرم و نیانیو گفتاری شیرینەوە (فیرعەون) لەپەیامی خودا تێبگەیەنن: ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ﴾.

بەڕاستی ڕێنمایی یەکی گەورەو بەسوودە، کە قورئان دیاریی کردووە تاکو ببێتە نموونەیەکی پەیڕەوکراو لەهەر چاخ و زەمان و بارودۆخێك دا، چونکە گەر هاوکات لەگەڵ فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)دا نەرم و نیانییش

هەبێت ئەوا کارایی و شوێنەواری لەسەر دەروونی مرۆڤ زیاترە تاکو لەگومڕاییی خۆی بگەڕێتەوەو دەست هەڵگرێت، هەروەها دەرفەتی بیرکردنەوە لەو بارودۆخەی بۆ دەڕەخسێنێت، کە تیای دا دەژی و بەوردیش لەو ئامۆژگاریانە دەکۆڵێتەوە، کە پێی گەیەنراون.

هەر ئەم شێوازی نەرم و نیانی یەش ڕێزو گەورەیی ی بۆ دەنرخێنێت و لەپلەی شیاوی دا دایدەنێت و وایشی لێ دەکات ئامادە وگوێڕایەڵ بێت بۆ بیستن و وەرگرتنی ئەو ڕێبازە جوان و پڕ لە خێرەی کە دەخرێتە بەرچاوی، بەتایبەتیش گەر نیشانەی قایلکاری و قەناعەت پێهێنانی تێدارەنگ بداتەوە (واتە لە شێوازە نەرم ونیانی یەکەدا)، بەڵام دیارە شێوازی (زۆرکاری و دڵڕەقیو قسەی ڕەق و تووڕەیی) ئاسەواری نالەباریان هەیەو مرۆڤی بانگکراو بۆ ڕێی ڕاست زویردەکات وزیاتر هانیشی دەدات لەسەر یاخی بوون و تەکینەوەو دوورپەرێزی و پاشان وەرنەگرتنی ئامۆژگاری.

## باوەڕهێنان لەڕێی عەقڵەوە

هەر لەو چیرۆکە پڕ لەپەندو دەرسەی "موسا"دا (شێوازی نایابی بەڵگەهێنانەوە لەسەر وجودی خودا) پیشان دراوە، بۆ نمونە لەم چیرۆکەدا بینیمان چۆن (موسا) دەچێتە لای (فیرعەن) وبانگی دەکات بۆ (باوەڕهێنان بەخودا) لەڕێی عەقڵو خستنەگەڕی فیکرو هۆشیەوە، واتە لە ڕێی سەرنج دان لەسروشت و لەهەموو ئەو مەخلووقات و گیانلەبەر و شتە سەرسوڕهێنانەی کە وای لێ دەکەن بەهۆی لێکدانەوەو سەرنج دان و پاشان بەقەناعەت هێنانی تەواوەوە (ئیمانی بەخودا) بۆ دروست ببێت.

سەیرکەن ئەوە (موسا) یە لەگەڵ (هارون)ی برای دا لەلای (فیرعەون) دانیشتوون و ئەویش دەیەوێت بزانێت کێ خودایانەو لێ یان دەپرسێت: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾، (موسا) لەوەڵامدا ناسنامەو ئەرك و گەورەیی ی خودای بۆ پێناسە دەکات: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾، لەم ئایەتەدا قورئان ڕایدەگەیەنێت، کە هەموو دروستکراوەکان و مەخلووقات خودا دروستی کردوون و بەسیستمێکی تایبەتی هێناونیە ئاراوە. هەر دروستکراو(مخلوق)ێکیش بەچەند تایبەتمەندی یەکی ئاشکراو پەنهانی کە خودا پێی بەخشیون، جودایە لەوانی دی، پاشان ئیلهامی بەهەر مەخلووقێکی زیندوو داوە کە بەو دەستوورە تایبەتی یەی بۆی داناوە گوزەران بکات.

هەر خودی ئەم ئایەتەش چەندین کتێب بە زنجیرەو بەرگەکانیانەوە کورت دەکاتەوە لەو کتێبانەی دەربارەی زانستی زیندەوەرناسی (ئاژەڵ و جانەوەر و مێرو وباڵندەو گیاندارانی نێو ئاو) نووسراون. نووسەرانی ئەم کتێبانەو زانا شارەزاو پسپۆرەکانی ئەم بوارەش وا لێ دەکات

بەوردی لەو هەموو زیندەوەرانە بکۆڵنەوەو سەرسامیش بن لەو هەموو ڕازو نهێنییەی کە لەناخی ژیانیان دا دانراوە کاتێك بەوردی بۆ ژیانیان دەڕوانن و، لەشێوازی زاووزێو زۆربوونیشیان دەکۆڵنەوەو دیراسەی (خۆپاراستنیان) و هێشتنەوەی ڕەگەزیان) و(بەدەستهێنانی ڕۆزی)و (هەڵسوکەوتی نێوان خۆیشیان) دەکەن، بێگومان ئەو ئیلهامەی کە ژیانی ئەو زیندەوەرانە بەڕێوەدەبات، یان باشتر وایە (بەزاراوەی قورئان بڵێین) ئەو (هیدایەت) و ڕێنمایییەی کە ژیانی هەریەکەیان بەشێوەیەکی تایبەتی بەڕێوەدەبات بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر (مەبەست لە وجودی سروشت و ئەو گەردوونەی کە دەسکردی خودایە) و لەسەر (پووچەڵیی ئەو تیۆری-ڕێکەوت-ەی کە ماددە پەرست و مەتریالیستەکان دەیکەنە پاساوی لێکدانەوەی پەیدابوونی گەردوون).

دوای ئەمە با بگەڕێینەوە سەر خوێندنەوەی ڕەوتی دیداری نێوان (موسا) و (فیرعەن) و ببینین چۆن (موسا) دوای خستنەڕووی ئەو ئایەتەی بوونی خودای دەسەلماند، چەندین جۆری تری لەدروستکراوانی خودادیاری دەکرد: ﴿ ٥٢ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ ٥٣ كُلُواْ وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِى ٱلنُّهَىٰ ﴾طه/٥٣-٥٤.. واتە: (خودای پەورەردگارمان ئەو خودایەیە کە زەویی وەکو بێشکەو پێخەفی منداڵان بۆ ڕاخستوون و کردویە بەجێی حەسانەوەتان، هەر لەم زەوی یەدا چەندین ڕێگاو جادەی بۆ سازکردوون تاکو پێویستی یەکانی خۆتانی پێ بەجێبهێنن و، لە ئاسمانیشەوە بارانی بۆ ناردوونە خوارەوەو بەهۆی ئاوی بارانەوە چەندەها جۆر لەگژوگیاو دەغڵودان و بەروبوومی کشتوکاڵی ی بۆ دەستەبەرکردوون، ئێوەش لەو بەروبوومانە بخۆن و، لەگژوگیای زەویش ئاژەڵەکانتان بلەوەڕێنن، بەڕاستی لەهەموو ئەم دروستکراوانەدا چەندین بەڵگەونیشانەی ڕۆشن هەیە لەسەر بوونی خودا و پەروەردگارێتیی خودا بۆ ئەوانەی خاوەنی عەقڵو تێفکرینن و هۆشمەندو ژیرن).

جا تێبینی بکەو سەرنج بدە لەوەی چۆن ئایەتەکە بەم ڕستەیە ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِى ٱلنُّهَىٰ﴾ کۆتایی پێهێناوە واتە (بەڕاستی لەو هەموو دروستکراوانە و لەو دیمەنە گرنگانەدا چەندین بەڵگەی ڕوون و پرشنگدار هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی عەقڵن (أولی النهی). چونکە خولقاندنی ئەم زەوی یە و هەموو ئەو شتانەی تیای دان چەند بەڵگەیەکی دیار دەخەنە ڕوو بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستی یە حاشا هەڵنەگرەی کە هیچ گومانێکی لێ ناکرێت، واتە بۆ سەلماندنی وجودی خودا، وجودی خالقی زەوی و بونەوەر کە هەموو عاقڵ و هۆشمەندێکی خاوەن هۆشی ساغ قەناعەت بەم ڕاستی یە دێنێت.

کاتێك(فیرعەون)یش ئەم راستییەی بەدرۆ دەخستەوە و لاری و سەرکێشی ی دەکرد و دانی بەو بەڵگە عەقڵی یانەدا نەدەنا، خوداش موعجیزەی داردەستەکەو شتەکانی دیکەی پیشان دا.

جا قورئانی پیرۆز بۆیە سەرنج و ڕوانینمان بەلای تێفکرین و وردبوونەوە لەو بەڵگەو نیشانانەی نێو گەردوون دا ڕادەکێشێت تاکو بەهۆی ئەمانەوە هەست بە قودرەتی داهێنان و جوانکاریی خودا لە خولقاندن دا بکەین و پاشان باوەڕ هێنانیشمان بەخودا بەقەناعەت و تەسلیم بوونێکی ڕاست و هەق خوازانەی واوە بێت کە بەوردی دیراسەی بوونەوەرو بەڵگەو نیشانەکانی تایبەت بە وجودی خودا بکەین، ئەوەش دیارە ڕێگایەکە بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر خوداو ڕێنمایی ی خەڵکی بۆ ناسینی خوداو هەر تەنیا ئیسلامیش گرتوێتی یە بەر.

کەچی هەندێك ئاینی تر شوێنکەوتوانی بەفەرمانی (باوەڕبێنە، پاشان بیربکەرەوە) ڕادەسپێرێت و، ئینجا بۆ قەناعەت پێهێنانیشیان پەنا دەبەنە بەر ئەو موعجیزەو شتە سەیرو سەرسوڕهێنانەی کە لە پێغەمبەرانیانەوە دەرکەوتوون و بۆیان دەگێڕنەوە بەو شێوازەی لەگەڵ بەرژەوەندی یەکانیاندا بگونجێت، لەکاتێکدا ئیسلام ڕێگەی قەناعەت هێنانی عەقڵی کردۆتە بناغەیەك بۆ باوەڕهێنانی خەڵکی.

## "پووچەڵکردنەوەی عەقیدەی میسرییە کۆنەکان"

هەروەها لەو دیالۆگ(حوار)ەی نێوان "موسا" و (فیرعەون)دا دەربارەی پەروەردگاریتی (ربوبیة)ی خودا جوانترین و بەهێزترین وەڵام لەسەر دیاردەو داب و نەریتەکانی (هاوبەش بۆ خوا دانان)ی میسرییە کۆنەکان بەدی دەکەین، ئەوەش لەم ئایەتەی قورئان دا کە خودا لەسەر زاری "موسا" دیاری کردووەو لەبەشێکی گفت و گۆکەیان دا فەرموویە:

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴾الشعراء/٢٣-٢٩..

ئەوەی لەم دەقە قورئانی یە وردبێتەوە لەیەکەم چرکەسات دا وەسفێکی تێکڕایی‌و هەمەگیر (شامل) بۆ (پەروەردگاریتی ی خودا لەسە ئەم گەردوونە)بەدی دەکات، کە هەر خودا خۆی ئەو تاك و تەنیا(واحد)ەیە کە هیچ کەسێکی دی ڕکەبەرو بەرهەڵستکاری فیعلی نییە لەموڵکی دا.

بێگومان هەر زانایەکی لێکۆڵیارو لێکدەرەوەی (عەقیدە دێرینەکانی میسرو بیروباوەڕی خەڵکی ئەو سەردەمە)لەڕێی ئەم دەقە قورئانی یەوە دەبینێت چۆن قورئان وەڵامێکی پوخت و

پڕمانای بۆ سەرجەم ئەو بیروباوەڕە دێرینانەی خەڵکی میسری کۆن دیاری کردووەو ئەمەش خۆی لەخۆی دا ئاماژەیەکە بۆ ئەو ڕاستی یەی کە قورئان هەواڵی چەند شتێکی مێژوویی ڕاستەقینەی بەدنیا گەیاندووە پێش ئەوەی زانست(علم) پەی پێ بردبێت.

سەبارەت بەو ئایەتانەی پێشووش دەبینین حیوارەکە بەپرسیارێکی (فیرعەون) دەست پێدەکات: ﴿وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، (موساش) وەڵامی دەداتەوە: ﴿قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾. ئەم وەڵامەی (موسا) (یان ئەم وەڵامەی قورئان لەسەر زاری "موسا") ڕەت دانەوەیەکی دیاری ئەو عەقیدە و بیروباوەڕە کۆنانەیە کە لەو سەردەمەدا باوبوون و لەنێو خەڵکی دا بڵاوبوون.

بۆ نموونەش لەو سەردەمەدا خواوەندێکیان بەناوی (نووت) بۆ ئاسمان دانابوو و بیرو بۆچونیشیان وابوو گوایە ئەم خواوەندە ئافرەتێکی زۆر زل و گەورەیەو جەستەی لەگەورەیی دا لاربۆتەوەو شێوەی نیمچەکەوانەیەکی وەك گومەزی وەرگرتووەو بەسەر زەوی دا شۆڕ بۆتەوە.

هەروەها خواوەندێکیان بەناوی (غیب) بۆ زەویش دانابوو (کە بە ڕای خۆیان مێردی-نووت-) بووە.

خواوەندێکی دیکەیان بەناوی (شوو) هەبوو کە نوێنەرایەتی ئەو پانتاییە وشکە (الفضاء الجاف)ەی نێوان ئاسمان و زەویی دەکرد[1].

(مانگ)یش لای ئەوان خواوەندێك بوو و دێرینترین خواوەندی پەرستراویان بووە لە (میسر)دا. بەڵام بەپێی ئایینی ڕەسمی ئەو زەمانەیان (خۆر) گەورەترین خواوەندیان بووە[2].

پاشان لەگەرمەی گفت و گۆکەدا (فیرعەون) بەوپەڕی واق وڕمان و شانازی بەخۆکردنەوە وتەکانی (موسا) دەداتە بەر توانج و بەشێوازێکی گاڵتەجاڕی یەوە ڕوودەکاتە کەسانی چواردەوری خۆی و لێ یان دەپرسێت: ئەرێ گوێتان لەم قسەو باسانەیە؟ ﴿أَلَا تَسْتَمِعُونَ﴾؟!

وەلێ "موسا" وێڕای ئەوەی لە ئاخاوتنی خۆی بەردەوامەو خودایان وا پێ دەناسێنێت کە بێگومان خودای خۆیان و خودای باب و باپیرانیشیانە: ﴿رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾..

ئەم وتەیەش بەرپەرچ دانەوەیەکی بوێرانەی دژی خواوەندێتی ی فیرعەونە هەروەك ڕەت دانەوەیەکی عەقیدەی دێرینی میسری یەکانیشە، ئەو عەقیدە باطلەی کە چەند خواوەندێکی بۆ مردووەکانیش دانابوو وەك: (خواوەند (سکر) خواوەندنی گۆڕستانی (منف/ سقادە) و (خنتی

---

(١) بڕوانە کتێبی (میسر-مصر) لە دانانی (دریوتون) و (جاك فاندییە)، وەرگێرانی بۆ عەرەبی (الاستاذ: عباس بیومي).

(٢) بڕوانە (قصة الحضارة)ی (ول دیورانت) ج٢ / ص١٥٦.

ئەمنیتو)ی خواوەندی گۆڕستانی (ایجو).[١]

هەروەها ئەو وتەیەی نێو ئایەتە کە (کەلەسەر زاری"موسا" هاتووە) ڕێگە بەپەرستنی پادشا مردووەکانیش نادات: (چونکە لەکاتی مردنی پادشادا پەرستگایەك لەتەنیشت گۆڕەکەیەوە بنیات دەنراو فەرمان بەبەردەوامیی پەرستنی دەکرا بەوپێودانگەی خواوەندێکی مردووە).[٢]

بەڵام (فیرعەون)ی خۆبەزل زان بەربەرەکانێی (موسا)ی دەکردو بەم وەڵامە گاڵتەجاڕییە وەسفی (موسا)ی پێغەمبەری خودای بۆ دەست و پێوەندو کەسانی چواردەوری خۆی وا دەکرد گوایە (نێرراوێکی شێت) هاتووە بۆ لاتان: ﴿إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِيٓ أُرۡسِلَ إِلَيۡكُمۡ لَمَجۡنُونٞ﴾!..

(موسا)ش بێگوێدانە ئەو گاڵتەجاڕی یەی فیرعەون و بێئەوەی باکی لەو وتە نابەجێیانەی هەبێت بەردەوام بوو لەسەر ناساندنی زیاتری خودا و بەرپەچ دانەوەی (فیرعەونیش)، هەروەك خودا لەسەر زاری دەیگێڕێتەوە: ﴿رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾.

لەم ئایەتەدا وشەی (مەشریق) و (مەغریب) بۆ دەلالەت و گوزارشتە لەخۆرو ڕۆشنایییەکەی‌و، لەو سیستمە دیارەی جیهان لەخولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا کە وا لە لە خۆر دەکات لەجێگەیەکی دیاریکراوی خۆیەوە هەڵبێت و پێی بگوترێت (خۆرهەڵات/ مشرق) و لەجێگەیەکی بەرامبەریشیەوە ئاوابێت و پێی بگوترێت (خۆرئاوا/ مغرب). وشەی (وما بینهما)ش لەو ئایەتەدا دەربڕینێکە بۆ هەموو ئەو شار و دێهات و گژوگیاو ڕووەك و گیانلەبەرانەی کە خۆریان لەسەر هەڵدێت و سوود لە ڕووناکی و وزەی گەرمییەکەی وەردەگرن.

کەوابوو هەموو ئەو وتانەی "موسا" ڕەت دانەوەیەکی سەرجەم ئەو دیدوبۆچوون و بیروباوەڕە چەسپاوانەی ئەو سەردەمەی خەڵکی میسری دێرینەکە بۆ هەر ناوچە وشارۆچکەیەك خواوەندێکی (تایبەت بەخۆی)یان بۆ دانابوو، وەك خواوەندەکانی (أمن) و (اونوریس) و(انوبیس) و (اوزیریس) و (باست) و (هوریس) و (عنقت)[٣].

بەڵام (فیرعەون) دوای ئەوەی هیچ وەڵامێکی پێ نامینێت هەڕەشە دەکات لە " موسا" و پێی دەڵێت: (گەر جگە لەخۆم هەر خودایەکی دی بپەرستیت ئەوا لەزینداننت توند دەکەم): ﴿لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ﴾.

---

(١) لەکتێبی (مصر)ی (دریوتون و جاك فاندییە) وە، وەرگێرانی (عباس بیومي).

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) هەمان سەرچاوە.

قورئان لەم ئایەتەدا ئاماژە بۆ (خواوەندێتی فیرعەون) دەکات و باسی ئەوە دەگێڕێتەوە کە بێگومان، فیرعەون خۆی بەخواوەندی پەرستراو داناوە، ئەم ئاماژە قورئانیەش حەقیقەتێکی مێژوویی‌یە و کتێبەکانی مێژووش ئاماژەیان بۆ کردووە، هەروەك لەکتێبی (قصة الحضارة)دا باس کراوە کەوا (پادشا) لەلای میسری کۆنەکان خواوەندێك (اله) بووەو هەردەم پەرستراوە، بۆ نموونە کوڕی (آمون - رع) هەر تەنها بەگوێرەی (مافی خواوەندێتی‌یەکەی) حوکمی -میسر-ی نەکردووە، بەڵکو بەپێی مافی (بەخواوەند لەدایك بوونی) حوکمی کردووە کە گوایە ئەو (خواوەندێك)ەو ڕازی بووە بەوەی زەوی تا ماوەیەك نیشتمانی خۆی بێت)[1].

لەم باسەی پێشووەوە دەگەینە ئەو بەرەنجامەی کەوا میسری‌یەکانی سەردەمی زوو چەندین خواوەندیان هەبووە جگە لە بەخوادانانی پادشایانیشیان، قورئانی پیرۆزیش بەڕوونیو بەوردی ئاماژەی بۆ ئەو حاڵەتەیان کردووە، هەورەك خودا دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ... ﴾ الأعراف/١٢٧. واتە: (ڕاوێژکاران و پیاوماقووڵانی فیرعەون پێیان گوت: (ئەریٚ تۆ موسا و گەلەکەی ئازاد دەکەیت و وازیان لێدێنیت کە زەوی تێك بدەن و کاروبارمان بشێوێنن وتۆش پشت گوێ خەن و نەخۆت و نەخواوەندەکانیشت نەپەرستن)؟ )

بێگومان ئەو ڕاستی یە گرنگانەی کەقورئان باسیان دەکات و دەیانخاتە ڕوو خۆی لەخۆیدا دەسپێشکەری‌یەکی زانستیانەی قورئانە و پێش هەموو زانست و عیلمێکی دی باسی کردوون و بەر لە قورئان نەزانراون و تەنانەت (تا ماوەیەکی کەم)ی مێژوویی لەمەوپێش کەس نەیزانیبوون، واتە تا ئەو کاتەی کە چاڵەکان لە (میسر) دۆزرانەوەو هەڵدرانەوەو لە نهێنی‌یەکانی ئەو شوێنەوارانە کۆڵرایەوەو زاناکان هێماو ڕەمزەکانیان ناسی‌یەوە و لێکیان جودا کردنەوەو شییان کردنەوە.

## پیرۆز ڕاگرتنی خوداو ڕێزلێنانی تەواو و شایستەی

بەڕاستی بەشەریەت زۆر جار لەقۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا تووشی گومڕایی‌و هەڵەی زۆری دەرهەق بەخودا بووەو لەمەسەلەی عیبادەت دا دوچاری لادان و سەرەڕۆیی بووە.

بۆ نموونە هەندێك جار بەشەریەت و ڕەوتی کاروانی مرۆیی (خالقی خۆی) بەچەند خەیاڵ و وەهمێك وێناکردووە و هەموو بیدعەو شتێکی داهێنراویان تێکەڵی شان و شکۆی خودا کردووەو بە چەند ڕوخسارێکی وایان چواندووە، کە هەرگیز عەقڵی ساغ پەسەندی ناکات، بەم پێ یەش بیانوو و بەهانایان داوەتە دەست بێ باوەڕو مولحیدان تا بەهەواو ئارەزووی خۆیان

---

(١) قصة الحضارة-ول ديورات-ص١٦١

هێرش بکەنە سەر ئاینەکان.

قورئانی پیرۆز هەردەم دژی ئەم دیاردانەیەو ڕاستی ی ڕەهای دەربارەی خودای خالق هێناوەو خودای بەپاك و پیرۆز و بێ خەوش ڕاگرتووەو بەهیچ مەخلووقیکیشی نەچواندووە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾الشورى/١١.. ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾طه/١١٠..

لەچیرۆکی "موسا" لەقورئان دا وەسفێکی وردو تێروتەسەلی "گەورەیی ی خالق" و بەدیهێنەری گەردوون بەدی دەکەین، وەسفێك دوورە لەو جۆرە سیفەتانەی، کە جاروبار بە (ئەرکی خولڤاندنی) یەوە دەلکێنن، (لاوازی)و (سستی)ی لەهەندێك ڕووەوە دەدەنە پاڵ..

ئەو وەسفە تێرو تەسەلەش دەربارەی گەورەیی ی خالق لەو ئاخاوتنەی نێوان (خودا) و (موسا)دا دەبینین کاتێك "موسا" داوا لە پەروەردگاری دەکات (خۆی) پیشان بدات و خوداش وەڵامی داواکاری یەکەی بەوە دەداتەوە، کە ئەو (واتە "موسا") هەرگیز ناتوانێت (خودا) ببینێت، بەڵام خۆی بۆ چیاکە دەردەخات و... تا پاشماوەی ڕووداوەکە هەروەك قورئان بۆمان دەگێڕێتەوەکە: ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَـٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾الأعراف/١٤٣.

ئیدی ئەمە لەکوێ و ئەو کتێبە شێواوانەی جوولەکەکان لەکوێ، کە خودایان لەوپەڕی بێدەسەڵاتی و دەستەوەستانی دا داناوەو، کە (بۆ نموونە) وبەپێی کتێبەکانی ئەوان: (گوایە خودا تاکو سەرلەبەیانی زۆرانبازی ی لەگەڵ-یەعقووب-دا گرتووەو نەیبەزاندووە.[1]

هەروەك لەکتێبی (قصة الحضارة)ش دا هاتووە: (بێگومان " یەهووە"ی خواوەندی نەتەوەیی جوولەکەکان (بەڕای خۆیان) ئازاو بەزەبر بوو، بەڵام وا نەدەبینرا کە لە هەڵە بەدووربێت، گومانیشیان وابوو کە گوایە ناشیرینترین کاری هەڵەی ئەوەیە مرۆڤی خەلق کردووە. هەر بۆیەش دەیبینیت دوای لەدەست دانی دەرفەت پەشیمانە لەسەر خەلق کردنی ئادەم و، لەسەر ڕازی بوونیشی بەوەی (شائوول، واتە-طالوت ) پادشا بێت و، پاشان دەبینین سات لەدوای سات پەست و تووڕەو، تینوو بۆ خوێن و، دوودڵ و نائارام و گۆڕاوە... ئەمە لەکاتێك دا ئەو (واتە خواوەند) زیندووشەو ناهێڵێت هیچ بەشێکی خۆی ببینرێت تەنها پشتی نەبێت، پوختەی گفتاریش لەم بارەیەوە ئەوەیە هیچ نەتەوەیەك لەنەتەوە دێرینەکان (خواوەندێکی ئادەمی ی بۆ هەموو شتێك) وەك ئەم خواوەندەی-جوولەکە-نەبووە)..[2]

---

(١ ) بڕوانە (سفر التكوين) هەردوو ( فصل)ی (دووەم) و(سێیەم). لاپەڕە (٢٤-٣٠).

(٢)بڕوانە(قصة الحضارة)، بەرگی دووەم،لاپەڕە(٣٤٠) نووسینی(ویل دیورانت)گۆڕینی بۆعەرەبی(م.محمد بدران)

# بەندی حەوتەم

## (( موسـا و عەبدە صاڵحەکەی خودا ))

( گەیشتنی "موسـا" بەعەبدە صالحەکە - "موسـا " داوای زانست دەکات - "موسـا" بەرهەڵستی ی عەبدە صالحەکە دەکات - ڕازو مەبەستی عەبدە صالحەکە لە کردارەکانی - چەند وانەیەك لەم چیرۆکەوە. )

## گەیشتنی " موسـا" بەعەبدە صاڵحەکە

جارێکیان (موسـا) لەوتارێکی دا بۆ گەلەکەی دەربارەی خواپەرستی و گوێڕایـەڵی کردنـی فەرمانەکانی خودا بۆیان دەدوێت و لەکۆتایی وتارەکـەی دا پیاوێـك لێ ی دەپرسـێت: (لـەنێو خەڵکیدا کێ زاناترە)؟ (موسـا) دەڵێت: (مـن). خـوداش لەسـەر ئـەم وەلامـەی سەزەنـشتی دەکات چونکە زانستی هەر بەو نەداوە، بـەڵکو عەبـدی وای هەیـە کـە لـەویش زانـاترە لـەو سەردەمەدا، لەبەر ئەمە خودا سرووشـی ئـەو ڕاسـتی یـەی پـێ دەگەیـەنێت و دەفـەرموێت: (عەبدێکم لەناوچەی-پێك گەیشتنی هەردوو دەریا- هەیە و لەتۆ زانـاترە). (موسـا)ش لێ ی دەپرسێت و دەڵێت: (ئەی پەروەردگار چۆن پێ ی دەگەم؟ ) خـودا لـەوەلامی داواکـەی دا پـێ ی دەفەرموێت: (ماسی یەك لەگەڵ خۆت هەڵگرەو بیخەرە زەمیلەیەکەوەو لەهـەر شـوێنێك ئـەو ماسی‌یەت لێ ون ببێت ئەو عەبدە صالحەش لەوێ یە)...

(موسـا) بۆ جێبـەجێکردنی ئـەو کـارە ماسـی یـەکی هـەڵگرت و کەوتـەڕێو کـوڕێکی نەوجەوانی کارگوزاری خۆیشی لەگەڵدا بوو، جا کاتێـك گەیـشتنە (ناوچـەی پێـك گەیـشتنی هەردوو دەریا) (موسـا) دانیشت تا وچـانێك بـدات، بـەڵام لـەو وچـانەدا وەنـەوزێك گرتـی و نەختێك خەوی لێ کەوت، لەو ماوە کەمـەی خەوەکـەی دا بارانێـك بـاری و ماسـی یەکـەیان تەڕبوو و کەوتەوە جم و جووڵ و، بەمەش ژیانی دەست پێ کردەوەو گەڕایەوە بۆ نێو دەریا.

"موسـا" دوای بێداربوونەوەی لەوخەوە کەمەی فەرمانی بەکوڕە خزمەت گوزارەکەی کـرد کە پێکەوە دەست بە ڕۆیشتن بکەنەوە تاکو دەگـەن بـەو مەبەسـتەی خۆیـان، واتـە: بەعەبـدە صالحەکە، بێگومـان کوڕەکەش لەبیری چـووبوو هـەواڵی لەدەسـت دانـی ماسـی یەکـەی پـێ بگەیەنێت. بەڵام کاتێك هەستیان بەبرسێتی کرد (موسـا) داوای لێ کـرد خۆراکەکـە ئامـادە

کات(واتە- ماسی یەکە-کە لـەوەوپێش برژاندبووشـیان)، ئینجـا لـەو سـاتەوەختەدا کوڕەکـە ماسیەیەکەی بەبیر دێتەوەو هەواڵی ون بوون و لەدەست دانی بە-موسـا-دەگەیەنێت.

(موسـا)ش ئـەم هەواڵـەی وەك مژدەیـەکی خـۆش بـەرگوێ دەکـەوێت و بـە کـوڕە کارگوزارەکەی دەڵێت: (ئەمەبوو ئامانجی ئێمە، دەبوایە ئەم ماسیەیەمان لێ ون ببێت، دەبا بۆ ئەو جێیە بگەڕێینەوە کە ماسی یەکەی لێ ون بووە)..

جا کاتێك گەیشتنەوە بۆ ئەو جێگەیەی کـە ئامـانجی سـەرەکیی سـەفەرەکەیان بـوو ئـەو عەبدە صالحە[1]یان بینی کە بە پێی بەڵێنی خودا وا بڕیار بوو (موسـا)پێی بگات.

ئەمەی پێشوو پوختەی ماناو شیکاری ئەم ئایەتانە بوون کە ئەو بەشەی سەرەتای چیرۆکەکە دەگێڕنەوەو کە خودا تیایان دا فەرموویە: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ[2] حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا[3] ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا[4] ﴿٦١﴾ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا[5] ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ[6] وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا[7] قَصَصًا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا[8] ﴾الكهف/٦٠-٦٥.

---

(١) لێرەدا مەبەست لەعەبدی صالح مرۆڤێکی بەندەو کۆیلـەی کەسـێکی دی نـی یـە، بـەڵکو مەبەسـت لەبەندەیەکی خودایە کە هەردەم بەندایەتی بۆ خودا دەکات، مرۆڤەکانیش هەموویان بەندەو عەبدی خودان.

(٢) لا أبرح: واتە بەردەوام دەبم لەڕۆیشتن.

(٣) أمضي حقباً: واتە ( بۆ ماوەیەکی زۆر لەزەمەن) بەڕێگادا دەڕۆم.

(٤) سرباً: واتە (دەربازێك)ی دۆزی یەوە بۆ دەرچوون لێوەی بەرەو دەریاکە.

(٥) نصباً: واتە: ماندوێتیو بارگرانی.

(٦) (حوت): هەرچەندە لەزمانی کـوردی دا مانـای ( نەهـەنگ) دەگەیـەنێت، بـەڵام لەزانـستی ڕێزمـانی عەرەبیدا بەهەموو جۆرە ماسی یەکی گەورەو بچووکیش دەگوترێـت، لـەم چـەند ئایەتـەش دا بـۆ ماسـی ی بچووك بەکارهێنراوە، یان بۆ جۆرێك لەماسی. -وەرگێڕ-

(٧) فارتدّ علی آثارهما: واتە: هەردووکیان گەڕانەوە بۆ سەر ئەو ڕێگایەی پێشوویان و شوێن پـێی خۆیـان هەڵگرتەوە.

(٨) وعلمناه من لدنا علماً: واتە: زانیاری یەکمان دەربارەی خۆمان کە (هەندێك زانستی غەیب زانـی یـە) پێ بەخشیبوو.

## موسـا داوای زانست دەکات

"موسـا" کاتێك بەعەبدە صاڵحەکەی خودا گەیشت داوای لێ کرد قایل بێـت بـەوەی کـە لەگەڵیدا بگەڕێت و یاوەرو هاوسـەفەری ڕێگـای بێـت، تـاکو زانـستی لێ وەرگرێـت، عەبـدە صاڵحەکە لەوەڵام دا پێی گوت: (تۆ ناتوانیت ئارام لەسەر هاوڕێیەتی و چەند کردارێکی مـن بگریت لەکاتێك دا هاوسەفەری ڕێگامیـت)، هـەروەها پـێی گـوت: (ئـاخر تـۆ چـۆن خـۆت ڕادەگریت و بێدەنگ دەبیت لەئاست چەند هەڵسوکەوتێکی وەهادا کە بە ڕواڵـەت پێـچەوانەی ڕێساو شەریعەتی تۆن؟)

(موسـا)ش گـوتی: (پـشت بـەخودا دەمبینیـت بـەئارامم لەسـەر هەڵـسوکەوتەکانت و سەرپێچیش لەهیچ فەرمانێکت ناکەم).

دووبارە ئەو پیاو چاك و عەبدە صاڵحەی خودا داوای لێ کردو پێی گوت: (ئەی-موسـا- ئەگەر لەگەڵ من دەگەڕێیت ئەوا ئەو مەرجەت لەسەر دادەنێم کە نابێت دەربارەی هـیچ کـارو کردەوەیەکم پرسیارم لێ بکەیت و بڵێیت-بـۆ وات کـردو بـۆ وا چـوویت-ونابێـت هـیچ جـۆرە قسەیەك لەمانە بکەیت هـەتا خـۆم لەدوایی‌دا ڕازو نهێنییـەکانیت پـێ دەڵـێم و مەبەسـتی هەڵسوکەوتەکانمت بۆ ڕوون دەکەمەوە:

﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا[1] ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا[2] ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا﴾الكهف/٦٦-٧٠

## موسـا بەرهەڵستی ی عەبدە صاڵحەکە دەکات

"موسـا" و عەبدە صاڵحەکەی خودا بەسەر ڕۆخـی دەریـادا کەوتنـە ڕێ و کەشـتی یـەك بەلایان دا تێپەڕی، ئەوانیش هەردووکیان داوایان لە خاوەنانی کەشتی یەکـە کـرد هـەڵیانگرن لەگەڵ خۆیان دا. داواکەیان پەسندکراو سواری کەشتی یەکە بوون. بەڵام لەماوەی سـواربوونیان داو لەناکاو عەبدە صاڵحەکە بەئانقەست کونێکی کردە دیوارێکی کەشتی یەکەوە کە لەتەختـە دروست کرابوو و دەکرا لەدوایی دا بەئاسانی چاك بکرێتەوە.

---

(١) رشدا: واتە فێری زانستێکم بکە لەو زانستانەی کە خێرو چاکەت لێوە دەسگیر بوون.

(٢) خبرا: واتە زانینی شت لەڕێی تاقیکاری و تەجرەبەوە.

(موسـا) بەم کردارەی عەبدە صالحەکە پەشۆکاو ئەو پەیمانەشی بیرچووەوە، کـە دەربـارەی ئارام گرتن و بەرهەڵستی نەکردنی بوو لەسەر هەر کردارێکی ئەم پیـاوە چـاکەی خـودا. بۆیـە بەتەوسەوە لێی پرسی: (چۆن کون دەکەیتە کەشتی ی ئەو کەسانەی ڕێزیان لیّ گرتووین؟ ئایـا دەتەوێت سەرنگوومیان کەیت؟ بەڕاستی ڕەفتارێکی نابەجێت نواند).

بەلاّم لەوەڵامدا ئەو بەندە چاکەی خودا پەیمانەکـەی نێوانیـانی بیرخـستەوە. "موسـا"ش خێرا هەستی بەهەڵەی خۆی کردو داوای لیّ کرد چاوپۆشی لەو هەڵەیەی بکات، چـونکە بـیری چووبوو.

دوای ئەمە لەسەر ڕۆیشتن و هاوڕێیەتی ی یەکدی بەردەوام بوون و لـەڕێگایان دا کـوڕێکی مێردمنداڵیان بینی کە لەگـەڵ هاوەڵـەکانی دا یـاریی دەکـرد. بەنـدە چـاکەکەی خـودا ئـەو مێردمنداڵەی بەفێڵ لە هاوەڵەکانی جیـا کـردەوە، تـا گەیانـدی یـە شـوێنێکی دوورو لـەوێ کوشتی.

"موسـا" لەداخی ئەم کردارەش خەریك بوو دڵی لەت لەت بێـت و بـەتاوانێکی دڕندانـەی دەبینی، هەر بۆیە بەوپەڕی پەستیو تووڕەیی یەوە بەرهەڵـستی پیـشان دا و لیّ یـشی پرسـی: (ئەرێ بۆچـی نەفـسێکی پـاك و بیّتاوانـت کوشـت بیّئـەوەی تـاوانێکی کردبێـت؟ بەڕاسـتی تاوانێکی دزێوت ئەنجام دا).

عەبدە چاکەکەی خودا لەئاست گفتارێکی وەها توندی "موسـا"دا هەر هێندەی پیّکرا بـە وتەی پڕ نارەزایی و سەرزەنشتکاری یەوە پیّی بڵێت: (ئەرێ پێم نەگوتیت تۆ هـیچ ئارامێکـت بۆ ناگیرێت لەئاست ئەو هەڵسوکەوتانەم دا کە لەکاتی یاوەری و هاوڕێیەتی کردنـی ڕێگـام دا بەرچاوت دەکەون؟!)

دووبارە "موسـا" پەشیمان بوونەوەی خۆی لەسەر ئەم بەرهەڵستی یەی دوایشی دەربـڕی و گوتی: (گەر لەمەولا پرسیارم لەسەر هەر شتێك لیّ کردیت، ئیدی هاوڕێیەتیم مەکەو خۆتم لیّ دابڕە، چونکە بەڕاستی پاساوی خۆجیاکردنەوەت هەیەو ناهەقت ناگرم).

پاشان بەردەوام بوونەوە لە ڕۆیشتن و هێندە گەڕان هەتا ماندوو و برسی بوون و، خۆیان کرد بە گوندێك داو، داوای خواردەمەنی یان لەخەڵکی گوندەکە کرد، بەلاّم خەڵکی گوندەکە ئامادە نەبوون میوانداريیان بکەن، بەڵکو بەشێوەیەکی ناشیرین دەستیان بەڕوویانـەوە نـاو خۆراکیـان پیّنەدان. کەچی لەکاتی گەڕانەوەیان لەو گوندە دیوارێکیان بینی خەریك بوو هـەرەس بێنێـت، پیـاوە صالحەکەش چاکی کردەوەو بنیاتی نایەوە.

"موسـا" لەئاست ئەم هەڵوێستەشی دا نەیتوانی بێدەنگ بێت، بەڵکو بەپەلە پێی گوت: (بۆچی چاکەو پیاوەتی لەگەڵ گەلێکی ئاوادا دەکەیت و دیواریان بۆ ڕاست دەکەیەوە؟ ئـێ خـۆ دەت توانی کرێی ئەو کارەیان لێ وەرگریت تاکو بەشی خۆراکەکەمانی بکردایە).

ئیتر دوای ئەم بەرهەڵستی یە عەبدە صاڵحەکە لە"موسـا"جیـابووەوەو پـێش ماڵئـاوایی لێکردنی ڕازو نهێنی یەکانی ئـەو کردارانەشـی پێڕاگەیانـد، کـە لـەم بڕگەیـەی دوایـی ی دا دەیخەینە ڕوو.

ئەمەش ئەو ئایەتانەی تایبەت بەم بەشەی چیرۆکەکەیە:

﴿ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ۖ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا[1] ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا ﴿٧٣﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا[2] ﴿٧٤﴾ ۞ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَىْءٍۭ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِى ۖ قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّى عُذْرًا ﴿٧٦﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا فَأَبَوْا۟ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ ۖ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِى وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾ الكهف/٧١-٧٨.

## ڕازو مەبەستی عەبدە صاڵحەکە لەکردارەکانی

ئەو بەندە خواپەرست و پیاوچـاکەی خـودا پـێش ئـەوەی لـە "موسـا" جیابێتـەوە، ڕازو نهێنیو مەبەستی هەموو ئەو کردارانەی خۆی بۆ ڕوون کردەوە کە "موسـا"-نەیتوانی لێیـان بێدەنگ بێت-..

عەبدە صاڵحەکە گوتی: (سەبارەت بە کون کردنی دیواری کەشتییەکە لەبەر ئەوە بوو کـە ئەو کەشتییە موڵکی چەند هەژارێك بوو و جگە لەوە هیچ شتێکی تریـان نـەبوو، زانیبووشـم پادشایەکی دڵـڕەق هەیـەو بـەدوای هـەر کەشـتی یـەکی چـاك و بێخـەوش دا دەگـەڕێت تـا زەوتیکات و دەست بگرێت بەسەریا. منیش ویـستم ئـەو کەشـتی یـە خەوشـبار بکـەم بـەو

(١) شیئا إمراً: واتە شتێکی نالەبارو کارێکی ناڕەوا.
(٢) نکراً: کردارێکی ناشیرین و نائینسانی.

ئەندازەیەی کە لەدوایی دا چاك بکرێتەوە، بەلاّم کاتێك پادشاکە بەو خەوشەوە ببینێت با وا بزانێت بەکەڵکی نایەت و وازی لێ بێنێت و بیداتەوە دەست خاوەنە هەژارەکانی.

ئەو کوڕە مێردمنداڵەشم بۆیە کوشت، چونکە هەر لە منداڵی یەوە نیشانەکانی خراپەو بەدکاریی تێدا دەرکەوتبوو، جا لەبەر ئەوەی، کە باوك و دایکیشی دوو ئیمانداری چاك و ڕێکوپێك بوون و، منیش دەترسام لەوەی، کە بەو خراپەو بەدکاری یەوە هەراسانیان کات و تەنگیان پێ هەڵچنێت و، ئەوانیش لەبەر ئەو خۆشەویستی و سۆزە عادەتی یەی کە دایکان و باوکان بۆ ڕۆڵەکانیان هەیە نەتوانن بەرەنگاری ببنەوەو لەئاکام دا (ئەو خۆی) بەکێشیان بکات بۆ سەر بێئیمانی و ستەمکاری. جا بۆیە کوشتم تاکو ئەو باوك و دایکە ئیماندارە ڕزگارکەم لەدەست ئەو منداڵە شەڕخوازەی داهاتوو و لەجیاتی ئەوە خودای میهرەبان منداڵێکی باشترو صالح تری وایان پێببەخشێت، کە بەڕەحم و بەئەمەك بێت بۆیان.

ئەو دیوارەش، کە بنیاتم نایەوەو، کە لە ڕاست کردنەوەی دا ماندوو بووم هی دوو منداڵی هەتیو و بێکەسی ئەو ناوچەیە بوو و لەژێر دیوارەکەدا گەنجینەیەکیان هەبوو و، باوکیشیان کابرایەکی پیاوچاك و صالح بوو، خواستی پەروەردگاریشت وابوو ئەو گەنجینەیەیان بۆ بپارێزێت تا ئەو کاتەی هەردوو منداڵەکە گەورە دەبن و پێدەگەن و دەری دێنن.

جا هەموو ئەو کردارانەشم لەخۆوەو بە کۆششکاری (اجتهاد)ی خۆم نەبوو، بەڵکو بەسرووش و فەرمانی خودابوو... ئەمەش تەفسیرو ڕوون کردنەوەی ئەو هەڵسوکەوتانەم بوو کە لەماوەی یاوەری و هاوڕێیەتی ی ڕێگامان دا بەرچاوت کەوتن و نەت توانی ئارام لەسەر لێ بێدەنگ بوونیان بگریت).

ئەم ئایەتانەش بەشێکی دوایی و کۆتابڕگەی ئەو چیرۆکە کورتەی (موساو-عەبدە صالحەکەی خودا)مان بۆ دەگێڕنەوە کە خودا تیایان دا فەرموویە:

﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ[1] وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا[2] ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ

---

(١) زكاة: پاکژترو صالح تر.

(٢) رحماً: واتە سۆزو بەزەیی یەکی زیاتری هەبێت بۆیان، نەرم و نیان بێت.

أَشُدَّهُمَا[١] وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى ۚ ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا[٢]﴾ الكهف/٧٩-٨٢.

## چەند وانەیەك لەم چیرۆكەوە

لەم چیرۆكەدا چەندین پەندو وانەی بەسوود بەدی دەكرێن، وەك:

* هاندان لەسەر داواكردنی زانست و فێربوون و بەدەست هێنانی زانیاریی پتر.. لەم بەسەرهاتەدا "موسا" دوای پیاوێكی صالح لەبەندەكانی خودا كەوتووە، چونكە زانیبووی زانستێكی وای هەیە كە خۆی نی یەتی و نایزانێت. دیارە پلەو پایەی (پێغەمبەرێتی یەكەشی) ڕێی ئەوەی لێ نەگرتبوو كە بچێت بەدوای زانست و زانیاری دا بگەڕێت.

* وانەیەك لەسەر هێزی ئیرادەو سووربوون لەسەر گەیشتن بەئامانج تەنانەت گەر بەربەستەكان هەرچەندێك و هەر چۆنێكیش بن، هەروەك چۆن "موسا" باكی نەبووە لەوەی گەر بگاتە ناوچەیەكی دووری وەك (ناوچەی پێك گەیشتنی هەردوو دەریا) و یان بەردەوام ماوەیەكی زۆر دوورو درێژیش ببڕێت: ﴿لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴾[٣]. واتە:(هەر دەبێت بڕۆم و هەنگاو هەڵێنم، تاكو دەگەمە بنچینەی مەبەستم لەناوچەی پێك گەیشتنی هەردوو دەریا، یاخود گەر تەنانەت سەردەمێكی زۆریشم لەزەمەن بڕیبێت).

* وانەیەك لەسەر ئەدەبی فێرخواز لەگەڵ مامۆستاكەی دا، ئەم ئەدەبە جوانەش لەم وتەیەی"موسا"دا ڕەنگ دەداتەوە: ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴾ لەم وتەیەی دا (موسا) خۆی دەخاتە ئاستی خوێندكارێكی ئەو عەبدە صاڵحەی خوداوەو مافی سەرپەرشتیاری و پێشڕەوایەتی ی بۆ دادەنێت كە ئەگەر لە مەسەلەیەك بەئاگای بێنێتەوە ئەویش زوو ئاگادارو بێدار بێتەوەو، یان ئەگەر هەڵەیەكی بۆ دیاری كردو لەسەرپێچی یەكی وریاكردەوە، خێرا داوای لێبوردن بكات و بەڵێنی گوێڕایەڵی كردنی پێبدات و سەرپێچی لێ نەكات.

---

(١) يبلغا أشدهما: واتە: تاكو پێدەگەن و هوشیار وعاقڵ دەبن.

(٢) پوختەی ئەم چیرۆكە تەنها لە سوورەتی (كهف)دایە لە ئایەتی ژمارە(٦٠ تا ٨٢)ی ئەو سوورەتە كەلەم بەندە سەربەخۆیەو لەو بڕگەیەی دا باسی لێوەكرا.

(٣) لەزمانی عەرەبی دا وشەی"حقب"بەماوەیەكی درێژی زەمەنی دەگوترێت، كە هەشتا ساڵ یان زیاتر بێت. ( وەرگێڕ)

* وانەیەك لەسەر ئەوەی بێگومان خودا باوەڕی مرۆڤ دەپارێزێت و ناهێڵێت بەهۆی بارودۆخی ژیانەوە کز ببێت یان لەناو بچێت وەك لەڕووداوی کوشتنی ئەو مێردمنداڵەدا دەردەکەوێت کە لەبەر ئەوەی لەسەر کفرو ستەمکاری گەورە دەبوو و هەر بەو کفرو ستەم و یاخی بوونەشی هەر یەکە لەباوك و دایکی خۆی هەراسان دەکردو ئیمانیانی دەشێواندو لەوانەیە ناچاریشی بکردنایە بۆ پاشگەز بوونەوە لەئیمانەکەیان.

* وانەیەك لەسەر ئەوەش، کەوا خودا هەرگیز هەژاران پشت گوێ ناخات، بەڵکو لەهەر جەورو تەنگ و چەڵەمەیەکی ڕۆژگار دەیانپارێزێت و دوای بارگرانی تووشی خۆشگوزەرانیان دەکات، وەك لەڕووداوی کون کردنی دیواری پاپۆڕەکەدا ڕوون دەبێتەوە تاکو بەوە کەشتی یەکە خەوشبارو عەیبدار بکات، بەم پێیەش پادشا زۆردارەکە دەستی بەسەردا نەگرێت.

* وانەیەك لەسەر ئەوەی، کە بەڕاستی خودا (بۆ ڕێزلێنان لەباوکە چاك و پیاوباشەکان) سامان و نیعمەتی گەورە بەڕۆڵەکانیان دەبەخشێت و لەسەر هەندێك بەدکاری و لادانی کۆمەڵگەکانیان ئەوان سزا نادات. بەڵکو ژیانی خۆش و ئاسوودەیان بۆ مەیسەر دەکات. وەك لەکاری ڕاست کردنەوەو بنیات نانەوەی ئەو دیوارەدا دەرکەوت، کە لەژێری دا گەنجینەیەکی بەنرخ هەبووەو موڵکی دوو منداڵی هەتیو بوون و باوکەکانیان ئەو سامانە بەنرخەی بۆ پاراستبوون.

# بەشی نۆیەم

داود سەلاوی خوای لێ بێ

سولەیمان سەلاوی خوای لێ بێ

ئیلیەسع سەلاوی خوای لێ بێ

ئیلیاس سەلاوی خوای لێ بێ

یونس سەلاوی خوای لێ بێ

# سەرەتایەك

(داود) پێغەمبەرێکە لەپێغەمبەرانی (بنو اسرائیل)و خودا لەیەك کات دا پێغەمبەرێتیو دەسەلآت و پادشاییشی پێبەخشی بوو، هەروەها خێروبێری دنیاو ئاخیرەتیشی پێدابوو. ئەو کە پێغەمبەرو پادشاش بووە، یەکێکیشە لەو پێغەمبەرانەی کتێبە ئاسمانی یەکانیان لەدوای (مووسا) بۆ هاتوەتە خوارەوەو بۆ خودی (داود) کتێبی (زەبور)[1] نێرراوەتە خوارەوە، هەروەك خوداش لەم بارەیەوە فەرموویە:

﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍۢ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًۭا﴾الأسراء/٥٥.

(سولەیمان)یش کوڕی (داود)ـەو خودا ئەویشی بەپلەی (پێغەمبەرێتی و پادشایی) گەیاندووەو، دانایی و حیکمەتی زۆریشی پێ بەخشیوە، تەنانەت لەبەر زۆریی دانایی و حیکمەتیشی نازناوی (سولەیمانی حەکیم)ی بۆدانراوە.

(داود) یەکەم جار کە ناوی دەرکەوت و ناوبانگی پەیدا کرد ئەو کاتە بوو کە سەربازێك بوو لەسوپای طالوت (شاول)داو ئەم سەرکردەیەش (واتە طالوت) لەو زەمانەدا بەرەنگاریی سەرکردەی دوژمنان (جالوت-جلیات) بووەتەوەو بەزۆرانبازی و شەڕی دەستەو یەخە بەزاندوویەتی و کوشتوویەتی.

(بەڵام داخۆ (طالوت) کێ بێت؟ ئەی (جالوت) کێیە؟ باشتر وایە بەر لەوەی دەست بکەین بەباسی پێغەمبەرێتی ی (داود)و (سولەیمان) ئەم دوو سەرکردەیە (طالوت-و- جالوت) بەخوێنەران بناسێنین و سەرەتایەکی ڕێ خۆشکاری تەرخان کەین بۆ گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی کە هاوزەمانی ژیانی هەردووکیان بوون.

(١) (زەبوور) کتێبێکە دەربارەی پەندو ئامۆژگاریو سوپاس و ستایشی خودا.

# بەندی یەکەم

## (( "طـالوت" و "داود" ))

( بەزینی (بنو اسرائیل) و سەندنی دارەمەیتەکەش لێ یان - (بنو اسرائیل) داوای پادشایەك دەکەن - بوونی "طـالوت" بەپادشا-نیشانەکانی پادشایی "طـالوت" - "طـالوت" سوپاکەی هەڵدەسەنگێنێت - سەرکەوتنی "طـالوت" - "داود" و کوشتنی "جالـوت" - مردنی "طـالوت" و بوونی "داود" بەپادشا )

### بەزینی ( بنو اسرائیل ) وسەندنی دارەمەیتەکەش لێیان

دوای مردنی"مووسا"، (یوشەع-ی کوڕی-نوون)، کە لەنەوەکانی (یوسف) بـوو کاروبـاری (بنو اسرائیل)ی گرتە دەست و هەر لەگەڵ ئەویش دا (بنـو اسـرائیل) چـوونە نێـو ئـەو خاکـە پیرۆزەوەی کە ئەوسا بەڵێنیان پێدرابوو، واتە (خاکی-فەلەستین).

کاتێك چوونە نێو ئەو وڵاتەوە یەکەمین شارێك داگیریـان کـرد (ئـەریحا) بـوو، گوتراویـشە (ئۆرشەلیم) بووە، خودا فەرمانی پێدابوون کاتێك لەدەرگای شارەکەوە دەچنە ناوەوە بەو پەڕی (ملکەچی و سەرکزی بۆ خودا)وە بـچنە نـاو شـارەوەو هـەروەها بڵـێن: (حِطّـة) واتـە: (ئـەی پەروەردگار داوای لێبوردنت لێ دەکەین و گوناهەکانمان بۆ بسڕەوە). بـەڵام ئـەو گەلـەی (بنـو اسرائیل) سەرپێچییان لەفەرمانەکەی خودا کردو بەلووتبەرزی و خۆبەزل زانینـەوە چـوونە نێـو شارەکەوەو لە جیاتی ئەوەی داوای لێبوردنیش لەخودا بکەن بەد ڕەفتاری یـان نوانـد. خـوداش لێ یان زویربوو و لەئاسمانەوە سزایەکی لەسەر ئەو سەرپێچی یە بۆ ناردن و بەو سزایە ئازارێکی زۆریی دان...

هەروەك خوداش دەقی ئەم ڕووداوە لەم دوو ئایەتەدا دەگێڕێتەوە: ﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ

﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ﴾البقرة/٥٨-٥٩.

(یوشەع) کاروباری (بنو اسرائیل)ی لە (فەلەستین)دا گرتە دەست و حوکم و دادوەریی ی لەنێوان دا دەکردن تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی ی کردو دوای خۆیشی تا ماوەیەك چەند دادوەر(قاضی)یەك حوکم و دادوەریی ی لەنێوانیان داکرد بێئەوەی پادشایەکی بەهێزو خاوەن دەسەڵاتیان هەبێت.

دیارە لەو ماوەیەش دا (بنو اسرائیل) هەمیشە دەکەوتنە بەر شاڵاوی گەلانی دراوسێیان و دەبوایە بەرگری لەخۆیان بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش داب و نەریتێکی تایبەتییان هەبوو کە ئەگەر جەنگیان لەگەڵ دوژمنانیان دا بگێڕایە دارەمەیتی پەیمان(تابوت العهد)یان لەبەردەم خۆیان دادەنا تاکو بیکەنە هۆیەك بۆ سەرکەوتنیان لەجەنگ داو بەرزکردنەوەی ورەو عەزمیان.

جارێکیان لەجەنگی خوێناوی دا ڕووبەڕووی فەلەستینی یەکان دەبنەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەو ماوەیەدا خودا ڕقی لە (بنو اسرائیل) هەستابوو بەهۆی ئەو هەموو تاوان و خەتایانەیانەوە، لەو جەنگەدا بەزین و خراپترین شکستیان تووش بوو و فەلەستینی یەکان ئافرەتەکانیان بەکۆیلە گرتن و پیاوەکانیشیان لەخاکی خۆیان شاربەدەر کرد و تەنانەت (دارەمەیتی پەیمان)یشیان لێسەندن و بردیان بۆ ماڵی (داجون)ی خواوەندیان.

(بنو اسرائیل) لەسەردەمی دادوەران دا لەژیانێکی دەشتەکییانە (بدوی)دا دەژیان و دەمارگیرییەکی هۆزپەرستیشیان تێدابوو، ئەم حاڵەتە تاکو ساڵی (١٠٤٠)پ. ز- ی خایاندو لەو کاتەدا پێشەوایەکیان تێدا هەڵکەوت کە هەموو هۆزو تیرەکانیانی یەك خست و لەژێر یەك ئاڵادا کۆی کردنەوەو جڵەوی فەرمانڕەوایی و حوکمدارییانی گرتەدەست خۆی و بووە یەکەم پادشا لەنێو (بنو اسرائیل) دا، ئەم پادشایە لەمێژووی-جولەکە-دا بەناوی (شاوڵ) ناسراوەو لەقورئانیش دا بە (طالوت) ناوبراوە.

## (بنو اسرائیل) داوای پادشایەك دەکەن

(بنو اسرائیل) دوای ئەو شکستەیان و لەدەست دانی (دارەمەیتی پەیمان) تووشی لاوازی‌و سەرشۆڕی ببوون، بۆ ڕزگاربوون لەدەست ئەو حاڵەتە چەند کەسێکی ناسراوو پیاو ماقوڵیان دەچنە لای (سامۆئێل)، کە پێغەمبەرێك و دادوەرێکیش بوو و داوای لێ دەکەن پادشایەکیان بۆ هەڵبژێرێت تاکو لەژێر ئاڵای دا کۆببنەوەو بتوانن جەنگ و کوشتاری دوژمنانیان بکەن، (سامۆئێل)یش گەلەکەی خۆی چاك دەناسی و لە ڕەوشت و کرداریان ئاگادار بوو و دەیزانی لەجەنگ دا چەند بێدەسەڵات و لاوازن، هەر بۆیە لێ ی پرسین: (لەوانەیە ئەگەر جەنگتان

لەسەر فەرز بکرێت شەڕ نەکەن، ئایا وانی یە؟) ئـەوانیش نکـوولّی، یـان لـەو بۆچـوونە کـردو گوتیان: (چۆن شەڕناکەین لەکاتێك دا مافەکانمان زەوت کراوەو، دوژمنانمان لەنیشتمانی خۆمان دەریان کردووین و، ڕۆڵەو نەوەکانیان لیّ جیا کردووینەوە؟).

بێگومان ئەو بۆچوونەی (سامۆئێل) ڕاست دەرچوو، ئەوەبوو کاتێك خودا ئەو خواستەی بـۆ بەدی هێنان و جەنگیشی لەسەر فەرزکردن ڕوویان لەو فەرزە وەرگێڕا تەنها کۆمەڵێکی کەمیان نەبێت، هەروەك خوداش دەربارەی ئەوە حاڵەتەیان فەرموویە:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴾البقرة/٢٤٦.

## بوونی "طـالوت" بە پادشا

(سامۆئێل) هەواڵی ئـەوەی بـە (بنـو اسـرائیل) گەیانـد کـەوا خـودا داواکاریەکـەیانی جیبەجیّ کردووەو پادشایەتی بۆ داناون، ئەویش "طـالوت"ەو لەنەوەی (بنیامین)ە، بەڵام ئـەو گەلە دەستیان کرد بە پرتەو بۆڵەو بەرهەڵستییان لەسەر (هەڵبژاردنی "طـالوت") بۆ پادشـایی کرد، چونکە (ڕایان وابوو) "طـالوت" خاوەنی بنەماڵەیەکی ناودار نییە، بەڵکو (هـەر بـەڕای خۆیان) دەبوایە کەسێکی شایستەتر لەو هەبێت، دیارە ئەوسا لەنێو (بـنی اسـرائیل)دا دەبـوو پادشا لەنەوەکانی (یـەهووزا) بێـت و (پێغەمبـەرێتی)یـش لەنـەوەکانی (لاوی) بێـت، بـەڵام "طـالوت" یەکێك بوو لە ڕۆڵـەکانی (بنیـامین) کـە بـە ڕۆڵـەکانی گـەل و بەخـەڵکی عـەوام دادەنران.

هۆیەکی تری بەرهەڵستی کردنیان لەسەر دانانی ئەم پادشـایە ئـەوەبوو "طـالوت" هـەژار بوو و ماڵ و دارایی ی نەبوو، لەلای جوولەکەش ماڵ و سامان بەگەورەترین هۆی پایە بـەرزیەو پیاو ماقووڵی دادەنرێت.

(سامۆئێل) لەوەڵامی بەرهەڵستکارانی دا گوتی: (خودا "طـالوت"ی بـۆ هەڵبـژاردوون و چەند سیفەتێکی وەهاشی پیّ بەخشیوە کە شایانی پادشایەتی بێت، بۆ نموونە سـیفەتی زانـایی زۆری پیّداوە دەربارەی زانینی کاروباری سیاسی و بەڕێوەبردنی کاری فەرمانڕەوایی بەحیکمەت و چاوساغی یەوە، هەروەها خودا هێزێکـی جەسـتەیی ی واشـی پـیّداوە کـە بتوانێـت خـۆی

له‌جه‌نگ دا ڕاگرێت و به‌ره‌نگاریی دوژمنـان ببێته‌وه، پاشـان بێگومـان ئه‌و خودایـه‌ی کـه "طـالوت"ی بۆ هه‌ڵبژاردوون هه‌رخۆی ئاگادارو زاناتره له‌کاروباری به‌نده‌كانی داو، هه‌ر خوداش خۆی هه‌ڵسوڕێنه‌ری كاروباره هه‌مه‌جۆره‌كانی گه‌ردوونه به‌پێی خواستی ئیلاهی ی خۆی و، هه‌ر خۆیشی مافی پاشایه‌تی به‌و كه‌سه ده‌دات كه شایسته‌یه‌تی و له‌به‌ر حیكمه‌تێكیشه كه جگه له‌خودا هیچ كه‌سێك نازانێت چی یه..)

ئه‌مه‌ی پێشووش پوخته‌ی ته‌فسیری ئه‌م ئایه‌ته بوو كه خودا له‌به‌شێكی ئه‌و به‌سه‌رهاته‌دا فه‌رموویه: ﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾البقرة/٢٤٧.

## نیشانه‌كانی پادشایی ی "طـالوت"

قورئانی پیرۆز له‌به‌شێكی تری ئه‌م به‌سه‌رهاته‌دا ئه‌وه‌مان بۆ ده‌گێڕێته‌وه كه (سـامۆئیل)ی پێغه‌مبـه‌ر ده‌ربـاره‌ی نیـشانه‌كانی پادشـایی ی "طـالوت" بـه (بنـو اسـرائیل)ی گوتـووه: (له‌نیشانه‌كانی پادشایی "طـالوت" ئه‌وه‌یه به‌ره‌و سه‌ركه‌وتنتان ده‌بات و، ئه‌و داره مه‌یته‌شتان بۆ دێنێته‌وه كه سومبولی سه‌ربه‌رزیتان و ئارامیی دڵانتـان و چـه‌ند ئاسـه‌وارێكی بـه‌جێماوی مووساو هاروون-ی تێدایه وه‌ك ئه‌و تابلۆ نووسراوانه (الواح)ـه‌ی كـه ڕاسـپارده‌كانی خودایـان له‌سه‌ر تۆمار كرابوو، ئه‌و داره مه‌یته‌ش مه‌لائیكه‌كان هه‌ڵی ده‌گرن و ده‌یهێننه‌وه).

له‌م باره‌یه‌وه خودا فه‌رموویه: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾البقرة/٢٤٨.

## "طـالوت" سوپاكه‌ی هه‌ڵده‌سه‌نگێنێت

"طـالوت" گه‌له‌كه‌ی بانگ كرد بۆ جیهـادكردن لـه‌پێناوی خـودادا و هـانی‌ی دان له‌سـه‌ر جه‌نگ و كوشـتاری ئـه‌و دوژمنانـه‌ی لـه‌وه‌وپێش ژێرده‌سـته‌و زه‌لیلیـان كردبـوون، دوای ئـه‌م بانگه‌وازه‌ی بۆ جیهاد، سوپایه‌كی گه‌وره له‌ژێر به‌یداخی "طـالوت"دا كۆبووه‌وه‌و ئه‌ویش بردنی

بۆ جەنگ لەگەڵ ئەو فەلەستینی یانەی، کە (جالوت)[1] سەرکردایەتی ی دەکردن و بەسەرکردەیەکی ئازاو چەلەنگیش ناسرابوو، تەنانەت هەواڵ و دەنگوباسی پاڵەوانێتی و سەرکەوتنەکانی لەنێو هەموو گەلانی دراوسێیان دا بڵاوبوبووەوە و هەموویان لێی دەترسان و خۆیان لێ دەپاراست و توخنی نەدەکەوتن.

"طالوت" سەربازەکانی بردو لەولاتی خۆیان دووری خستنەوەو لەناوچەی دوژمن نزیک بوونەوەو لەوێدا "طالوت" ویستی ئەو سەربازانەی خۆی تاقی بکاتەوەو پلەی (ورەو خۆڕاگرییان لەسەر جەنگ) هەڵسەنگێنێت ورادەی ئارامی و گوێڕایەڵی کردنیان بزانێت، بۆیە لەو کاتەدا کە ئەوان تووشی ماندوێتی و تینوێتی یەکی زۆریش ببوون پێی گوتن: (ئێوە لەم سەفەرەدا بەڕووبارێك دا تێپەڕدەبن و خوداش بەم ڕووبارە تاقیتان دەکاتەوە تاکو (گوێ ڕایەڵ) لە(سەرپێچی کار) جیاکاتەوە، بۆیە هەر کەسێك لەئاوی ئەو ڕووبارە نەخواتەوەو تامیشی نەکات ئەوە لە شوێنکەوتوانی منە، بەڵام هەر کەسێکتان زۆر تینووی بوو ئەوە بۆی هەیە کە پڕ هەردوو دەستی بخواتەوە تاکو تینوێتی یەکەی پێ بشکێنێت، جا هەر کەسێك لەو بڕە ئاوە زیاتر بخواتەوە ئەوە لە شوێنکەوتوانی من نی یە).

کەچی ئەوان کاتێك گەیشتنە لای ڕووبارەکە زۆربەیان سەرپێچییان لەفەرمانەکەی "طالوت" کردو بەجۆرێك سەریان نا بەئاوی ڕووبارەکەوەو لێیان دەخواردەوە کە هەناسەیان لەسەر نەدەدا بێئەوەی بایەخێك بۆ فەرمانەکەی "طالوت" دانێن کە ڕێی ئاو خواردنەوەی تەواوی پێ نەدابوون.

خودای مەزن لەم بارەیەوە فەرموویە: ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ[2] فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ...﴾البقرة/٢٤٩.

---

(١) لەتەورات ( العهد القديم)دا بە ( جُلیات) ناوبراوە.

(٢) ڕازو حیکمەت لەو فەرمانەی طالوت -دا کە( نەدەبوو سەربازەکان زیاتر لەچنگێك ئاو لەو ڕووبارە بخۆنەوەو تەنها تێنوێتی یان پێبشکێنن) ئەوەیە تاکو سوپاکەی لەسەر بەرگەگرتنی هەموو جۆرە ناڕەحەتیو مەترسیەکی کوشتار ڕابهێنێت، لەوانەشە بۆ نەخشەیەکی جەنگی ونیازێکی پێویستی لەپشتەوە بوویێت، هەروەك مامۆستا (محمد ابو زهره)ش دەڵێت: ( ئەو ڕووبارە بەربەستێکی جیاکەرەوەی نێوان (بنو اسرائیل) و دوژمنانیان بوو، (بنو اسرائیل)یش زۆر بەماندوویی‌و تینوێتی و ناڕەحەتی‌یەوە گەشتبوونە سەر ڕووبارەکە، (طالوت ) لەوە دەترسا گەر بێت و لەلای ڕووبارەکە بمێننەوەو هەموو کەرەسەیەکیان پڕیکەن لەئاو و تێریشی لێ بخۆنەوەو سك و گەدەشیان پێقورس کەن و پاڵی لێ بدەنەوەو پێکەوە بەو جۆرە خڕبوونەوەیەی نزیك ناوچەی دوژمنەوە لێی دانیشن و بەم رەنگەش کتوپڕ دوژمن پێ یان بزانێت و لەڕووبارەکە بۆیان بپەڕنەوەو دووریان

# سەرکەوتنی "طالوت"

"طالوت" لەگەڵ (ئەو ئیماندارانەی خۆیان لەسەر تێنوێتی و ماندوێتی ڕاگرتبوو) لەڕووبارەکە پەڕینەوەو خۆیشیان بە چەند کەسێکی کەم و کۆمەڵێکی بچووك دەبینی، لەئاست ئەو کۆمەڵە زۆرانەی دوژمنانیان دا دوای ئەوەی لەمان (واتە لەم ئیماندارانە) زۆر کەس خۆیان دواخستبوو و لەگەڵیان نەچووبوون.

چەند کەسێکیشیان کە بەهۆی ئەو حاڵەتە نائاسایی و نابەرابەری یەوە لەژمارە زۆرەکەی دوژمن ترسابوون گوتیان: (ئەمڕۆ ئێمە دەرەقەتی -جالوت-و ئەو هەموو سەربازەی نایەین).

بەڵام پۆلێکی دیکەیان لەزۆریی ژمارەی دوژمن نەترسان چونکە بەدڵنیاییەوە دەیانزانی کە هەر دەبێت بمرن و بەخودای خۆیان بگەنەوە، هەر بۆیەش گوتیان: (ئەرێ نەتانزانیوە کە چەندەها جار چەند کەسێکی کەم کۆمەڵێکی زۆریان بەزاندوە و بەیارمەتی خودا بەسەریان سەرکەوتوون. دەبا ئێمەش لەسەر حاڵەتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن خۆڕاگرو بەئارام بین، چونکە خوداش بێگومان هەر لەگەڵ ئارامگرتوان دایەو پاڵپشت و سەرخەریان دەبێت).

جا کاتێك ئەو ئیماندارانە بەرەو مەیدانی کوشتاری (جالوت)و سوپاکەی دەچوون لەخودا پاڕانەوە دڵیان پڕبکات لەسەبرو ئارامی و لەمەیدانی شەڕیش دا چەسپاویان کات و، سەریان خات بەسەر دوژمنانیان دا.

خوداش ئەو نزاو پاڕانەوەوەیەی موجاهیدانی گیراکردو سەری خستن، (داود)یش (جالوت)ی کوشت و خودا کاری پادشایی ی (بنو اسرائیل)ی پێ سپاردو زانست و دانایی ی پێ سپارد.

بێگومان خودا هەر خۆی سەرخەری عەبدە صالح و سەر ڕاستەکانێتی، خۆ ئەگەر خودا صاڵحان و چاکەخوازانی بەسەر تێکدەران و بەدەڕەفتاران دا سەرنەخستایە و تەنانەت گەر خودا هەندێك لەشەڕخوازانی بەسەر هەندێکی دیکەیان دا زاڵ نەکردایە ئەوا زەوی ئاوەدان نەدەکرایەوە، بەڵکو سەرانسەری زەوی یان دەشێواند و خەڵکییان گومڕا دەکرد، بەڵام خودا چاکەو فەزڵی هێجگار زۆرو بەردەوامی بەسەر گشت خەڵکی یەوە هەیەو هەموانی بەنازو نیعمەتی هەمەجۆر بەهرەوەر کردووە.

---

خەنەوە. جا بۆیە (طالوت ) ویستوویە لەیەکەم ساتەوەختی لەناکاودا بێڕاوەستان و پشوودان لەڕووبارەکە بپەڕنەوە پێش ئەوەی دوژمنەکانیان هەست بەوجودی ئەوان بکەن. ئەم ڕێ وشوێنەش زۆر گونجاوە لەگەڵ تەکتیکە جەنگییەکان دا، چونکە (پەلاماردانی غەفڵەت گیرانەو لەناکاو) بەهێزترین و کاراترین چەکە.

ئەم بڕگەیەی پێشوش تەفسیرو شیکاری ئەم چەند ئایەتەیە،کە ئەو بەشەی بەسەرهاتەکە دەگێرنەوەو خودا تیایان دا فەرمووێە:

﴿..فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ[1] وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ البقرة/٢٤٩-٢٥١.

## ( داود ) و کوشتنی ( جالـوت )، یان ( جولیات )

(قورئانی پیرۆز) بەدرێژی باسی (چۆنیەتی کوشتنی(جالوت)ی بەدەستی "داود") نەکردووە، بەڵام لەکتێبی (العهد القديم)دا بەدرێژی باسی ئەم ڕووداوە کراوە. ئێمەش لێرەدا پوختەیەك لەو باسەی نێو ئەو کتێبە (واتە کتێبی العهد القديم)[2] دەخەینە ڕوو:

(فەلەستینیی یەکان سەربازەکانیان کۆکردەوە بۆ جەنگ لەدژی (بنو اسرائيل). (شاووڵ) وپیاوانی (بەنو ئیسرائیل)یش بەرەو ڕوویان وەستان و هەر پۆلێکیان لەسەر چیایەك جێگیر بووەو و لەنێوانیشیان شیوێك هەبووە، چەند ڕۆژێك تێپەڕیو ئەو دوو سوپایە هیچ لایەکیان جورئەتی هێرش کردنە سەر ئەوی دی ی نەبوو.

---

(١) (كم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بأذن الله): واتە: (چەندین جار واڕووی داوە کە کۆمەڵێکی کەم بەیارمەتی خودا سەرکەون بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا). کۆمەڵی کەمیش هەردەم خودا بەوە یارمەتی داون کەوا بەئارام و لەسەرخۆبوون و ورەیان بەرزبوووەو پابەندی فەرمانی سەرکردەکەیان بوون و، بەم ڕەوشتانە یارمەتی خوداو سەرکەوتنیان بەدەست هێناوەو سەرکەوتوون بەسەر ئەو کۆمەڵە زۆرەدا کە ناتەواوی‌و کەم و کووڕییان هەبووە لەئارامی‌و خۆڕاگری و یەکێتی ڕیزەکان و پابەندی بەفەرمانی سەرکردەیانەوە، بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستی‌یە زۆر لەو جەنگە نابەرابەرانەی مێژووی کۆن و نوێی جەنگەکانە کە زۆریی ژمارە(كثرة) گرنگترین هۆکار نەبوە لەسەرکەوتنی سوپایەك بەسەر سوپایەکی دیکەدا. ئەمەش سوننەت و داب و نەریتی خودایە بۆ بەندەکانی و، قورئانیش دەیخاتە بەردیدەی هەر گەلێکی چەوساوەو ژێردەستە لەو گەلانەی کە دەیانەوێت سەروەری‌و سەربەستی ی خۆیان بەدی بێنن.

(٢) کتێبی (العهد القديم) بەو چەند کتێبە گەورانە دەگوترێت کە پێش لەدایك بوونی (عیسا) سلاوی لێ بێت-نووسراونەوە، دیارە (العهد الجديد)یش بەوانەی دوای (عیسا) دەگوترێت، هەروەها لەلای (نەسرانی‌یەکان) وشەی ( العهد القديم) بە-تەورات-دەگوترێت. ( وەرگێر)

دوای ئەوە لەسەربازگەی فەلەستینی یەکانەوە پیاوێکی کەڵەگەت و زەبەللاح کە ناوی (جولیات)بوو و خۆی چەکدارکردبوو، هاتە دەرەوەو ڕمێکی گەورەی بەدەستەوە گرتبوو و لە ناوەڕاستی شیوەکەدا ڕاوەستاو بە ڕەوڕووی (بنو اسرائیل) هاواری کردو بانگی لێ کردن با پیاوێکی خۆیان بۆ زۆرانبازیی ی ئەو هەڵبژێرن و بینێرنە مەیدانەوە بۆی، مەرجیشی ئەوەبوو گوتی: (ئەگەر ئەو پیاوە هەڵبژێرراوەی ئێوە بتوانێت من ببەزێنێت ئەوادەبینە کۆیلەو خزمەتکارتان، خۆ ئەگەر من زەفەری پێ ببەم و بیکوژم ئەوا ئێوە دەبنە کۆیلەو خزمەتکارانی ئێمە).

کاتێك (شاووڵ)و سەربازەکانی گوی یان لەم قسانەی(جولیات) بوو، ترسیان لێ نیشت و نەیانوێرا بەرەوڕووی ببنەوەو کەسیشیان توانای زۆرانبازیی ی ئەوی نەبوو، ئەویش بەردەوام بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەیانیان و ئێواران خۆی بادەدا بەسەریان داو بەربەرەکانی ی دەکردن.

(شاووڵ)بڕیارو بەڵێنی دا لەسەر ئەوەی هەر کەسێك لە(بنو اسرائیل)بتوانێت ئەو کابرایە (واتە جولیات)بکوژێت، پارەو ماڵێکی زۆری پێ ببەخشێت و کچەکەی خۆییشی لێ مارەبکات.

لەشاری(بیت لحم) پیاوێك کەناوی (یەسسی)بوو سێ کوڕی خۆی بۆ نێو سوپاکەی(شاووڵ) ناردبوو تاکو بجەنگن لەدژی فەلەستینی یەکان، کوڕی چوارەمیشی کەناوی(داود) بوو ناردبوو بۆ لای براکانی بەمەبەستی زانینی بارودۆخیان. ئەم کوڕە(داود) کاتێك سەردانی سوپاو براکانی دەکات دەبینێت ئەو پیاوە کەڵەگەت و بەسام و زەبەلاحە(واتە جولیات) ڕۆژانە داوای زۆرانبازی و ڕمبازییان لێ دەکات و خەڵکی نێو ئەم سوپایەشیان خۆی لێ بێدەنگ دەکەن و دەترسن و ناوێرن وەڵامێکی ئەو هەموو جنێو و وتە ناشیرینانەشی بدەنەوە. هەر بۆیە غیرەت و ئازایەتی لەدڵی(داود)دا دەجووڵێت و داوا لە(شاووڵ)دەکات ڕێی بدات کە بچێت بۆ زۆرانبازی لەگەڵ ئەو دوژمنەدا.

(شاووڵ)یش حەسوودیی پێ دەبات و بەتوندی لەنەریتی بێباکی و بێپەروایی ی ئاگادار دەکاتەوە، بەڵام لەدوایی دا مۆڵەتی زۆران لەگەڵدا گرتنی ئەو کابرایەی پێدەداو قەڵغانێکیشی دەکاتەبەر هەرچەندە نازانێت پێوەی بڕوات، چونکە بە پۆشین و داکەندنی ئەو جۆرە قەڵغانە ڕانەهاتبوو، پاشان گۆچانەکەی بەدەستەوە دەگرێت و پێنج بەردی لوس و خڕ لەشیوەکە هەڵدەبژێرێت و دەیانکاتە نێو توێشووەکەیەوەو، قۆچەقانی یەکیش بەدەستەوە دەگرێت.

کاتێك دەگاتە لای (جولیات)و دوای مشتومڕ لەگەڵی دا، (جولیات) خێرا هەڵدەکوتێتە سەر (داود)و دەیەوێت ڕمێکی تێ سرەوێنێت، بەڵام (داود) لەو بەدەست وبردتر دەبێت و زووتر بەردێکی لەقۆچەقانی یەکەیەوە تێدەگرێت و دەیدات بەناوچەوانی دا (بەتەوێڵی)دا) وئیدی کابرا زەبەلاحەکە دەکەوێتە سەرزەوی و دەچەمێتەوە. (داود)یش دەسبەجێ برووسك ئاسا

بازدەداتە سەری و بەشمشێرەکەی ڕێگای لێ دەتەنێت و سەری لەجەستەی جیا دەکاتەوە.

فەلەستینی یەکان لەوساتەدا کە دەبینن ئەوا سەرکردە بەزەبرو زەنگەکەیان کوژرا، ترس و بیمێکی زۆر دایاندەگرێت و ئاژاوەو پشێوی دەکەوێتە نێو ڕیزەکانیانەوە، پاشان هەڵدێن و هەریەکەی بەلایەك دا ڕادەکەن، بەڵام (شاوول)و سەربازەکانی دوایان دەکەون و ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکوژن.

## مردنی "طالوت" و بوونی "داود" بە پادشا

"داود" دوای ئەوەی (جولیات)ی کوشت، حاڵو گوزەرانی لەلای (شاوول) (واتە لەلای طالوت) خۆش بوو و لەپێشەوەی هەمو پیاوانی سوپای (بنو اسرائیل) دادەنرا، بەڵام (حەسوودی) دڵی (شاوول) دادەگرێت و وای دادەنێت گوایە (داود) ڕکەبەرێکی ترسناکی بێت، نەخاسمە کە خۆشەویستی و سۆزی هەموو ڕۆڵەکانی گەلی (بنو اسرائیل)ی بۆ خۆی دەستەبەر کردبوو. بۆیە هێندەی پێ ناچێت ئەم حەسوودی و چکۆسی یەی (شاوول) دەبێتە ڕقێکی کوشندەو چەند جارێك هەوڵی کوشتنی دەدات، بەڵام لەو هەوڵانەی دا تووشی نوشوستی دەبێت.

دوای ماوەیەك جەنگی (جلبوع) لەنێوان (بنو اسرائیل) و(فەلەستینی‌یەکان)دا بەرپا دەبێت و ئیسرائیلیەکان پشت هەڵدەکەن و ڕادەکەن و، لەدواوە سێ‌کوڕی (شاوول) دەکوژرێن، پاشان تیرهاوێژە فەلەستینی یەکان (شاوول) بەدی دەکەن و تیرێکی تێ‌دەگرن و بەسەختی بریندار دەکەن. (شاوول)یش فەرمان بە هەڵگری چەکەکەی (واتە: بەچەکدارە پارێزگارەکەی) دەکات کەخێرا شمشێرەکەی دەربێنێت و یەك شمشێری لێ بدات و بیکوژێت تاکو دوژمنەکانی نەیکوژن و سووکایەتی بەلاشەکەی نەکەن، بەڵام (چەك هەڵگرە پارێزگاری کارەکە)ی ئەو فەرمانەی بۆ جی بەجێ ناکات و نایکوژێت. ئیتر (شاوول)یش لەوساتەدا خۆی شمشێرەکە بەدەستەوە دەگرێت و دەیچەقێنێت و خۆی بەسەر نووکە تیژەکەی دا دەدات و خۆی دەکوژێت.

(داود) دوای ئەمە چووە بۆ (حبرون) واتە شاری (الخلیل)ی ئەمڕۆ و لەوێ پیاوانی (یەهووزا) هاتوون بۆ لای و کردوویانە بە پادشایماڵی (یەهووزا). خەڵکە عەوامەکەی (بنو اسرائیل)یش گوێڕایەڵی و پشتگیرییان بۆ کوڕەکەی (شاوول) کەناوی (ئەشبۆشت) بووە، پیشان داوە، بەهۆی ئەمەوە چەند جەنگێك لەنێوان پیاوانی (داود) و پیاوانی (ئەشبۆشت)دا بەرپا بووە تا لەئاکامی جەنگەکان دا کوڕەکەی (شاوول) کوژراوەو دوای ئەو کارەساتانە (داود) بووە بە پادشای هەموو گەلی (بنو اسرائیل)و ئەو ڕۆژەی کەبووە بەپادشا (هەر بەپێی-العهد

القدیم) تەمەنی سی ساڵ بووە، ماوەی پادشایی یەکەشی چل ساڵ بووە... لە شاری (حبرون) حەوت ساڵ و شەش مانگ پادشا بووەو لەشاری (ئۆرشەلیم) سی وسێ ساڵ پادشای هەموو گەلی (ئیسرائیل) و-یەهووزا-ش بوە..

پاشان (داود) پێش ئەوەی بمرێت (سولەیمان)ی کوڕی خۆی کردووە بەجێنشینی خۆی، جا کاتێك-سولەیمان-چۆتە جێی باوکی و دەسبەکار بووە کاروباری باوکی تەواکردووەو بەردەوام بووە لە (فەتحی) ولاتان و مەملەکەتی ژێردەسەڵاتی خۆی لەسەر شێوازێکی نوێ ڕێك خستووەوتەوەو پەیکەر(هیکل)ـەکەی بنیات ناوەو حیکمەتیشی پێ بەخشراوە.

# بەندی دووەم

## (( چیــرۆکی "داود" ))

( "داود"ی دادوەر - حوکمدان لەمەسەلەی کێڵگەکەدا - "داود"ی خواپەرست - موڵك و حیکمەتی "داود"- موعجیزەکانی "داود"- کتێبەکەی "داود" )

### "داود"ی دادوەر

"داود" سلاوی لیّ بیّت- ڕۆژگاری خۆی بۆ چوار ڕۆژ دابەش کردبوو: ڕۆژێك بۆ بەندایەتی و عیبادەت.. ڕۆژێك بۆ دادوەری و قەزاوەت.. ڕۆژێك بـۆ ئامۆژگـاری و ڕێنـوونی ی خـەڵکی.. ڕۆژێکیش بۆ کاروباری تایبەتی خۆی.

جارێکیان لەڕۆژێك لەو ڕۆژانەی دا کە نۆرەی کاروباری تایبــەتی ی خـۆی بـوو کتـوپڕ دوو کەس بەبیّ ئاگاداربوونی پاسەوانانی لە هـەموو دیـوارو دەرگـاو پەنجـەرەکانی ماڵەکـەی تـیّ دەپەڕن و دەچنە ژوورەوە بۆ لای لەمیحرابەکەی دا، ئەویش لەو حاڵەتە لەناکاو وکتوپڕی یـەدا لیّ یان دەترسێت و واگومان دەبات ئەمانە نیازێکی خراپیان لیّ ی هەبێت.

بەڵام ئەوان بە "داود" دەڵێن: (مەترسە، ئێمە دوو کەسـی نـاکۆك و ناحـەزی یـەکترین و یەکێکمان مافی ئەوی تری خواردووەو بۆیە هاتووینە لات تـاکو بەهـەق و دادگـەری حـوکمی خۆت لەنێوانمان دا بدەیت، جا تۆش زوڵم لەکەسمان مەکەو ڕێنموونیمان بکـە بـۆ سـەر ڕێگـای ڕاست و ڕووناك).

ئینجا ئـەوەی مـافی خورابـوو سـکالای خـۆی خـستەڕوو و گـوتی: (ئـەم کابرایـە"واتـە هاوڕێکەی" هاوڕیّ و برای ئاییینمە و خاوەنی نەوەدونۆ(٩٩) سەر مەڕەو، منیش تـەنها یـەك سەر مەڕم هەیەو چاوی بڕیوەتە ئەو تاکە مەڕەی من و، دەیەوێت لێمی بسەنێت و بیخاتە پـاڵ مەڕەکانی خۆی، دیارە منیش زۆر تەقەللام داوە ئەو داوایـەی بـەناڕەوا دابنـێم بـەڵام لـەوەدا شکستم خواردووە، چونکە بەزمانی ڕەق و مشتومڕی زۆر کۆڵی پیّداوم).

"داود" دوای بیستنی ئەو قسانەو بەو شێوە گێڕانەوەیـە وای لیّ هـات گلـەیی لـەخاوەنی مەڕە زۆرەکان بکات لەسەر ئەوەی مەڕێکی هاوڕێکەی داگیر دەکات، بڕیارو حوکمیشی وابـوو کە ئەم کابرایە ستەمی کردووە لە داواکردنی ئەو تاکە مەڕەداو ئەویش وەك چەندین هاوبەش و

شەریکی دی ڕێگای ستەمی گرتۆتە بەرو گوایە زۆر کەس ئاوا ڕەفتار دەکەن لەکاتێکدا ئەرکی ڕاستەقینەیان ئەوەیە کە بە عەدالەت بجوولێنەوە.

هەروەها "داود" لەدرێژەی ئامۆژگاری یەکانی دا گوتی: (ئەو تەماع و چاو تێبڕینەش نەریتی زۆر کەس لەخەڵکی یە تەنها باوەڕدارانی بەویژدان و چاکەخواز نەبێت-کە ژمارەیان لەکۆمەڵگەی ئینسانی دا کەمە-).

هاوکات لەگەڵ وتنی ئەم وشانەدا "داود" خێرا بێدار بووەوەو بەئاگا هاتەوە لەوەی کەوا بێگومان (ئەم دووپیاوە ناحەزەی یەکدی) خودا خۆی بەم جۆرە ناردوونی بۆلای تاکو تاقیی کاتەوە پێیان و ئاگاداریشی کاتەوە لەو جۆرە حوکم و بڕیارانەی کە لەگەڵ پلەو مەقامی ئەودا ناگونجێت و (نابێت تەنها گوێ بۆ یەکێکیان ڕادێرێت و ئەوی دی فەرامۆش کات و یەکسەر بەبیستنی سکاڵای لایەك، لایەکەی دی خەتابار کات)، هەر بۆیەش کاتێك لەم هەقیقەتە هوشیار دەبێتەوە خێرا داوای لێ خۆشبوون لە پەروەردگاری دەکات و کڕنووش و سوژدە بۆ خودا دەبات تاکو خودا تۆبەو پەشیمانی یەکەی لێ وەرگرێت، خوداش تەوبەی لێ وەردەگرێت و سەر لەنوێ لەوەش دڵنیای دەکاتەوە کە ئەو هەر نزیکە لێ یەوەو پاداشت و چارەنووسیشی هەر بەهەشتە.

هەروەك لەم ئایەتانەش دا دەقی بەسەرهاتەکە هاتووەو خودا فەرموویە: ﴿وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ [١] إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ [٢] ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَىٰ [٣] بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ [٤] وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ [٥] ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا [٦] وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ [٧] ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ

---

(١) نبأ الخصم: واتە (چیرۆکی ناکۆکەکان)

(٢) تسوروا بالمحراب: واتە لەسەرووی شووورای ماڵەکەوە دابەزینە خوارەوەو خۆیان کرد بەناو ماڵدا. وشەی (تسوروا) کە فەرمان (فعل)ێکی (ماضی)یە لە وشەی (سور)ـەوەو هاتووەو (سور) بەدیواری شوورایەکی بەرز دەگوترێت. وشەی (میحراب)یش لێرەدا مانای ژوور(غرفة) دەگەیەنێت.

(٣) بغی: ستەمی کردووە، لەسنووری هەق تێ پەڕیوە.

(٤) لاتشطط: واتە لەهەق تێمەپەڕەو سنووری مەبەزێنە.

(٥) سواء الطریق: ڕێی ڕاست.. بەرنامەی هەق.

(٦) أکفلنیها: واتە بیکە بەموڵکی من.. دەستی لێ هەڵگرەو تەنازولی لەسەربکەو من دانێ بەخاوەنی (بەکەفیلی) کەلەئەستۆی خۆی دابێت.

(٧) عزني في الخطاب: واتە بەقسەی زۆر و مشت و مڕ کۆڵی پێداوم و هەموو ڕێگەیەکی لێ بەستوومەوە.

ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ[1] لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ[2] فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾ص/٢١-٢٥.

دوای ئەمە خودا ویستوویە گەورەیی ی ئەو بەخششە بۆ "داود" دەرخات، کە پێی بەهرەمەند کردووەو، کە ئەوەیە کردوویە بە جێنشین (خلیفە)ی خۆی لەسەر زەوی، ئەم جێنشینی و خەلافەتەش هەندێك جار وا لەمرۆڤ دەکات تووشی ستەمکاری یەك ببێت و هەواو ئارەزووی خۆی بکات بەحاکم و دادوەر، هەر بۆیەش خودای مەزن داوای لێ دەکات، کە بە تەرازووی هەق و دادگەری لەنێوان خەڵکی دا داد وەری بکات و دەبێت لەهەواو ئارەزووەکانی نەفس دوورکەوێتەوە، چونکە (ئارەزووی نەفس) ڕووی مرۆڤ لەو ڕێگا ڕاستەی خودا وەردەگێڕێت کەلەسەر دادو عەدالەتی ڕەها ڕاگیراوە، جا ئەو کەسانەی لەڕێی ڕاستی خودا لادەدەن ئەوە بێگومان سزایەکی سەختیان لە ڕۆژی دوایی دا بۆ دانراوە. ئەمەش بەهۆی ئەوەی(ئاکامی زوڵم و ستەم و لەڕێ لادانیان) لەبیر چووەتەوە...

ئەمەبوو ڕاسپاردەی خودا بۆ"داود"، هەروەك فەرموویە: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴾ص/٢٦.

## حوکمدان لەمەسەلەی کێڵگەکەدا

شەوێکیان ڕانەمەڕێك دەکەونە نێو کێڵگەکەیەکەوەو شوانەکەشیان لەگەڵدا نابێت، بەتەواوی ئەو کێڵگەیە دەشێوێنن، خاوەنانی کێڵگەکە لای "داود" سکاڵای خۆیان دەکەن و پێی دەڵێن: (ئەی پێغەمبەرەکەی خودا، ئێمە زەویی خۆمان کێڵاوەو چاندووەو چاکردووە تا ئە

---

(١) الخلطاء: واتە هاوبەشانی یەکدی، ئەوانەی شەریکی یەکترن لەکاروباری موڵك و ماڵداریێدا.

(٢) وظن داود انما فتناه: واتە (داود زانی کە ئێمە تاقیمان کردۆتەوە). دەربارەی ئەم تاقیکردنەوەیە گوتراوە: (داود ئەو ڕۆژە خۆی لەخەڵکی شاردۆتەوە، لەکاتێك دا باشتر وابووە کە دادوەر(قاضي) هەردەم بۆ کاری دادوەری ئامادەبێت و لەنێوان خۆی و ناکۆکەکان دا هیچ شووراو بەربەستێك دانەنێت، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی دوو پیاوە ناکۆکە شوورای میحراب ببەزێنن و بچنە ژوورەوە بۆ لای-داود -) هەر دەربارەی ئەم تاقیکردنەوەیە گوتراوە: (بۆیە بەتاقی کردنەوە دانراوە چونکە گوێی لەیەکێکیان گرتووەو گوێی لەوی تریان نەگرتووە). بەگوتەیەکی دی دەربارەی ئەم تاقی کردنەوەیە: (داود ئەوکاتە زانیویەتی ئەمە (تاقی کردنەوەیە) کە هەست دەکات بەوەی لەمەوقیعی پادشایی و دەسەڵاتدایێتیدایەو ئەمەش تاقیکاریەو هەڵسەنگاندنێکە لەخوداوەو ترساوە لەوەی نەبادا بکەوێتە هەڵەوەو زوڵم و ستەم بکات وەك زۆربەی حاکمانی دی).

ڕۆژەی وادەی دروێنەی بووە، بەڵام ڕانەمەڕی ئەو هۆزە بەشەو تێی کەوتووەوتێی دا بڵاوبوونەتەوەو هەموویان خواردووەو، هیچیان لێ نەهێشتووە).

"داود" خاوەنەکانی ئەو ڕانەمەڕە بانگ دەکات و لێ یان دەپرسێت: (ئەرێ قسەی ئەو جوتیارانە ڕاستە؟)، ئەوانیش دەڵێن: (بەڵێ).. ئینجا لەجوتیارەکان دەپرسێت: نرخی بەروبوومەکەتان بەچەند مەزەندە دەکەن؟ ) ئەوانیش نرخەکەی خۆیان پێ‌دەڵێن. پاشان لە ئاژەڵدارەکانیش دەپرسێت: (ئەی ئێوە نرخی مەڕەکانتان بەچەند مەزندە دەکەن؟ ئەمانیش بەنرخێك مەزندەی دەکەن.

"داود" دەبینێت هەردوو نرخەکە لێك نزیکن و بڕیاری دادوەری کردنەکەی لە نێوانیان دا ئەوەبوو، کە بە ئاژەڵدارەکان دەڵێت: (دەبێت ئێوە بۆ قەرەبووکردنەوەی زیانی کێڵگەکەیان ئەو ڕانەمەڕەتان بدەن بەجووتیارەکان).

لەو کاتەدا(سولەیمان)ی کوڕی ئامادەی دادگایی کردنە، کە دەبێت و پێشنیارێك دەخاتە بەردەمی باوکی (واتە بەردەمی دادوەر)وپێ ی دەڵێت: (من بیروڕایەکم لەسەر ئەم کێشەیە هەیەو وای بەچاك دەزانم، کە با ئاژەڵدارەکان مەڕەکانیان بدەنە دەست جوتیارەکان بەو مەرجەی ئەم جوتیارانە سوود لەخوری و شیرو بەرهەمەکانی وەرگرن، لەبەرامبەریش دا کێڵگەکەیان لێ وەرگرن و بیکێڵن و بیچێنن و ئاوی بدەن و بژاری بکەن تاکو کشتوکاڵەکە پێ‌دەگات، جا کاتێك وادەی دروێنەکردنی هاتە پێشەوە با ئاژەڵدارەکان کێڵگەکە بدەنەوە بەجوتیارەکان و لەهەمان کاتیشدا مەڕەکانیان لێ وەگرنەوە)...

هەموویان تێکڕا بە(جوتیارەکان و ئاژەڵدارەکانیشەوە) بەو حوکمەڕازی بوون و مەسەلەکەیان پێ بڕاندەوە.

"داود"یش گوتی: (کوڕم چاك بۆی چوویت، بەو حوکمەت ڕاستیت پێکاوە).

ئیتر"داود"بەپێ ی ئەو فەتوایەی(سولەیمان)بڕیاری خۆی لەنێوان هەردوولایەنی ناکۆك دا دەرکرد.

خودای پەوەردگار لە قورئانی پیرۆزا ئاماژەی بۆ ئەم سەگوزەشتەیەی مەسەلەی کێڵگەکە کردووەو لەبارەیەوە فەرموویە:

﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ[1] إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ[2] غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا

---

(١) الحرث: الزرع: واتە (کێڵگەکە).

(٢) نفشت فيه: واتە (بەشەو تێی دا لەوەڕان بەبێ ئەوەی شوانێکیان لەگەڵدا بووبێت).

لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ (١) وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾الأنبياء/٧٨-٧٩.

## "داود"ی خوا پەرست

بێگومان "داود" مرۆڤێکی بەئیمان و خواپەرست بووەو هەرگیز ساتێك لەیادی خودا بێئاگانەبووە، هەروەك خودای مەزنیش وەسفی ئەو خواپەرستی و عیبادەتەی (داود)ی کردووەو فەرمویەتی:

﴿وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ (٢) وَٱلْإِشْرَاقِ (٣) ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ص/١٧-١٩.

لەم ئایەتانەدا خودا فەرمان بە دوایین پێغەمبەری خۆی (محمد)ﷺ دەکات کە -داود-ی عەبد و پێغەمبەری خودا بەیاد بێنێتەوەو وانەی بەسوودی پێشەنگیی لێوەربگرێت، چونکە "داود" خاوەن هێزێکی باوەڕدارانەی بێوێنە بووەو بەسیفەتی (ذا الأيد) وەسفی دەکات، واتە خاوەنی ئەو باوەڕە پۆڵایینەو ئەو دینە قایم و بەهێزە بووە کە لەبەرامبەر هیچ تەنگانەیەك دا لاواز نابێت و لەبەرامبەر هەر جۆرە ستەمێکیش دا سەرشۆڕو دەستەوەسان نابێت.

---

(١) (ففهمناها سليمان): واتە: (سولەیمان-مان لەحوکمەکەی تێگەیاند بوو و شارەزای کاروباری حوکمڕانی بوو.) ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە -سولەیمان-حەقی پێکاوەو گەر وانەبوایە خودا بەتایبەتی فەهم و تێگەیشتنی پێ نەدەبەخشی. دیارە بەخشینی ئەو فەهمە تایبەتی یەش بە -سولەیمان-دەلالەت لەسەر بەهەڵەداچوونی"داود" ناکات، چونکە هەریەکەو لای خۆیەوە ڕاستی ی پێکابوو و مانای فەرمایشتەکەی خوداش(وكلاً آتينا حكماً وعلماً) ئەم حەقیقەتە دەگەیەنێت. لەم سەرگوروشتەیەوە ئەو ڕاستی یەش بەدی دەکرێت، کە بێگومان کۆششکاران (مجتهدين) مەرج نی یە لەهەموو مەسەلەیەك دا بتوانن هەق بپێکن. بەڵکو پێویستە گەر لەکاتی حوکم دان لەسەر مەسەلەیەکدا حوکمێکی ڕاست (یان نزیك تر لەڕاستی) یان خرایە بەرچاو مشتومڕ نەکەن و لەسەر حوکمێکی خۆیان سوورنەبن، بەڵکو هەمان ڕەفتاری"داود" یان هەبێت کاتێك لەحوکمی خۆی پاشگەزدەبێتەوەو دان بەو حوکمەی (سولەیمان)ی کوڕی دا دەنێت، هەروەها لەم بەسەرهاتەوە شیاویی کۆششکاری(جواز الأجتهاد)مان لە ئەحکام و بڕیاردا بۆ ڕوون دەبێتەوەو زانای کۆششکاریش(موجتەهید) لەوانەیەو دوور نی یە لەهەندێك مەسەلدا هەڵەبکات، بەڵام لەبەرامبەر هەڵەکردنیش دا یەك پاداشتی هەر هەیە، خوداش هەرچەندە وای ڕاگەیاندووە، کە (سولەیمان) هەقی پێکاوە، بەڵام ستایشی هەردووکیشیانی پێکەوە کردووە. واتە (ستایشی داود و سولەیمان)ی پێکەوە کردووەو ڕەخنەی لە"داود" نەگرتووە.

(٢) العشي: بەو کاتە دەگوترێت کەلەکاتی خۆرئاوابوون، تا بەرەبەیانەوەیە.

(٣) الأشراق: واتە کاتی خۆرهەڵاتن.

هەروەها خودا بەسیفەتی (أوّاب) وەسفی دەکات، واتە (داود) بەردەوام (تەوبە) و داوای لێخۆشبون دەکات و لەسەر بچوکترین هەڵە (تەوبە) دەکات و بۆلای خودای خۆی دەگەڕێتەوەو لەهەموو کاتێکی (ناخۆشی و خۆشی) و (نهێنی و ئاشکرا) پەنا هەر بەخودا دەگرێت.

بێگومان خودا (بەپێی ئەم ئایەتانە) شاخەکانی بۆ بەیدەست (تسخیر) کردووەو ئەو شاخانەش لەگەڵ "داود"دا شەو و ڕۆژ بە (زمانێکی تایبەتی) کە مرۆڤی ئاسایی پێی نازانێت تەسبیح و زیکری خودایان کردووە و خودایان بەپاك و پیرۆز و بێ خەوش ڕاگرتووە، شێوازی بەپیرۆزدانان و تەسبیحاتی شاخەکان کە-مرۆڤی ئاسایی پێی نەزانیوە-و کە "داود" پێی زانیوە بەهۆی ئەو (ئەندامە هەستیارانەی جەستەی) و ئەو زانست و بەهرە تایبەتیەیەوە بووە کە خودا پێی بەخشیوە.

هەروەها باڵندەکانیش لەدەوری "داود" کۆدەبوونەوە لەکاتی تەسبیحات و بەپاك و بێگەرد دانانی خوادا و بەشداری ئەو زیکرو تەسبیحاتانەی ئەویان دەکرد.

هەروەك خوداش لەئایەتێکی دیکەدا بەم فەرمایشتەی ئاماژەی بۆ کردووە: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُدَ مِنَّا فَضْلًا يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ...﴾السبأ/١٠.

## موڵك و حیكمەتی "داود"

لە جێیەکی تری قورئاندا خودا باسی ئەو نیعمەتانەی تری دەکات کە بە داودی بەخشیون و لەبارەیانەوە فەرموویە: ﴿وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ[1]﴾ص/٢٠..
واتە ئێمە موڵك و مەملەكەتی "داود"مان بە(سام و پشتیوانی ی خۆمان و زۆری ی سەربازو نیعمەتی زیاتر) بەهیز کردو پلەو پایەی پێغەمبەرێتیمان پێبەخشی و زانستی‌ی تەواو و زانیاری لەسەر یاساو شەریعەت و ڕێسای حوکمداریمان بۆ دەستەبەرکردو توانای دادوەری و قەزاوەتیشمان بۆ مسۆگەرکرد کە بەهۆیەوە بتوانێت هەق لەناهەق جیابکاتەوەو کێشەی نێوان ناکۆك و ڕکەبەرەکان یەکلایی کاتەوەو بڕیاری پێویستیان لەهەر جۆرە مەسەلەیەك دا بۆ بدات.

## موعجیزەكانی "داود"

پاشان خودا هەر سەبارەت بەچیرۆکی "داود" باسی چەند لایەنێکی گرنگ و تایبەتی‌ی دیکەی ژیانی دەکات و ئاماژە بۆ چەند کارێکی نائاسایی و سەرسوڕهێنی دەکات کە مرۆڤی ئاسایی ناتوانێت ئەنجامیان بدات، هەروەك فەرموویە: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ

---

(١) (فصل الخطاب): واتە زانستی بڕاندنەوەی ناکۆکیەکان. ئەمەش بەو وتەیە دەگوترێت کە پوختەی مەبەستەکە (بەبێ کورت کردنەوەیەکی ناتەواو) یان ( بەبێ درێژکردنەوەیەکی نارێك) ببەخشێت.

سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾سبأ/١٠-١١. مانای ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کەوا بێگومان خودا ئاسنی بۆ "داود" بەبێ ئاگر نەرم و شل کردۆتەوە (یاخود ئەو موعجزەیەی بەدەستی خۆی فێر کردوە) و هێندە ئاسنەکە نەرم بووەتەوە لەبەر دەستیدا تاوەك مۆمی لێ هاتووەو ئیدی بەبێ ئەوەی چەکوش یان ئاگری بۆ بەکاربێنێت ئیشی پێکردووەو، چەند قەڵغانێکی وای لێ دروست کردووە کە بە توندو تۆڵی دایڕشتوونەتەوەو ئەڵقەکانی بەقەدەریەك و بەسەنگ و چێوەی یەکسان پێکەوە بەستوون، دیارە ئەم جۆرە قەڵغانە ڕێی جم و جووڵ و بزواندنی جەستە لە پۆشەرەکەی ناگرێت و وەك ئەو جۆرە قەڵغانە ئاساییەی تر نەبووە کە لەیەك پارچە ئاسن پێك هاتبوون.

قورئانی پیرۆز لە جێیەکی تردا ئیشارەتی بۆ ئەمەش کردووە: ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ[1] لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ[2]﴾الأنبياء/٨٠. واتە (ئێمە "داود"مان فێری دروست کردنی پۆشاکێکتان کرد کە قەڵغانە و لەئاسن دروست دەکرێت تاکو هۆی خۆپارستنتان بێت لەو شمشێرو ڕمانەی دوژمنانتان لەکاتی جەنگ و کوشتاردا).

## کتێبەکەی "داود"

خودای گەورە لەقورئان دا ناوی ئەو کتێبەشی دیاری کردوە کە بۆ "داود"ی ناردووەو بە (زەبوور) ناوی بردووە: ﴿وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾.

بەڵام لای-أهل الكتاب-بەوشەی (مزامیر) ناودەبرێت و ئەم وشەیە بەچەند قەسیدەیەك دەگوترێت کە لەچەند شیعرو هونراوەیەکی ئایینی دا دەرکەوتوون و ئاوازیان بۆ دانراوەو وەك سروودو بەستەی ڕۆحی دەوترێنەوەو باسی گەورەیی ی خوداو دروستکراوە عەجیب و سەرسوڕهێنەکانی دەکەن، هەندێکیشیان بۆفێربوونی ڕاسپاردەکانی خوداو باسکردنی پاداشت و سزاکانیەتی، زۆربەی ئەو سروودو نزایانە (مزامیر) بۆ "داود" دەگەڕێنرێنەوە، هەندێکیشیان دوای خۆی دانراون، هەندێکی دیکەشیان بەپێی پۆلێن کردن و ڕێکخستنی (همان)و (اتهان)و (سلیمان)و (اساف)و (جدوتهن)و(موسا)و (کوڕانی قورح)ن.

---

(١) لبوس: بەپۆشاکی جەنگی (قەڵغان) و بەهەموو جۆرە چەکێکیش دەگوترێت.
(٢) بأسکم: جەنگ و شەڕو شۆڕتان.

# بەندی سێ یەم

## (( چیرۆکی سولەیمان ))

( "سولەیمان" و بیستنی قسەی مێرولەکە - تاقیکردنەوەی "سولەیمان" - بەیدەست کردنی (با) و (جن) لەخزمەت "سولەیمان"دا - ئەسپەکانی "سولەیمان" )

### "سولەیمان" و بیستنی قسەی مێرولەکە

خودای پەروەردگار"داود" و"سولەیمان"ی بە چەندین شت بەهرەمەند کرد بوو، بە تایبەتیش زانستی حوکم و ڕێساکان، ئەم دوو پێغەمبەرەش هەستیان بە ڕادەی گەورەیی و زۆریی ی ئەو نیعمەتانەی خودا کردبوو و دەیانگوت:(سوپاس و ستایشی زۆر بۆ ئەو خودایەی، کە بەخشش و-فضل-ی تەواوی ڕشتووە بە سەرمان داو لەهەموو بەندە باوەڕدارەکانی دیکەی بەهرەمەندتر کردووین و زانستێکی فرەی پێ بەخشیوین).

کاتێك "داود" کۆچی دوایی کرد، "سولەیمان" بەتەنیاو لەنێو هەموو کوڕەکانی دیکەی دا میراتگری-پێغەمبەرێتی-و-موڵك-ەکەی بوو، "سولەیمان"یش کاتێك کاروباری موڵك و دەوڵەتەکەی باوکی گرتە دەست هەموو سەرەك هۆزو پیاوماقووڵان و زانایانیشی کۆکردەوەو وتارێکی بۆ خوێندنەوەو تیای دا بەتایبەتی باسی هەموو ئەو نیعمەت و بەخششە زۆرو گەورانەی کرد کە خودا پێی داوەو دانی بەهەموو (فضل)و چاکەیەکی خوادا دانا.

"سولەیمان" گوتی (بەڕاستی خودا بە (فضل)و میهرەبانی ی خۆی لەزۆر شت بەهرەمەندیی کردووم.. فێری زمانی ئاژەڵ و باڵندەی کردووم و توانای ئەوەشی پێداوم کە لەهەموو قسەو باسێکیان تێبگەم، ئەمە جگە لە موڵك و پێغەمبەرێتی و پادشایی، بێگومان ئەم هەموو نیعمەتە گەورەو بێهاوتایانەش هەر لە فەزڵ و بەخشندەیی خودای پەروەردگارەوەیەو، لەکەس پەنهان نی یە).

هەروەها ڕۆژێکیان "سولەیمان" داوا دەکات کە هەموو سەربازەکانی بچن بۆ لای.. سەربازەکانیشی بەهەموو چین و توێژو ڕەگەزە جیاجیاکانیانەوە لە (مرۆڤ) و (جن) و

(باڵندەکان)، لای کۆدەبنەوەو گوێڕایەڵی ی خۆیانی لەسەر هەر فەرمانێك بۆ دووپات دەکەنەوە. "سولەیمان" بەم سەربازانەیەوە دەکەوێتە ڕێ و دەڕۆن تا دەگەنە دۆڵێك کە مێروولەیەکی زۆری تیادابوو. لەو دۆڵەدا "سولەیمان" گوێ بیستی مێرولەیەك دەبێت کە بەگشت هاورێکانی دەڵێت: (هۆ مێرولەکان وریابن ئەوە "سولەیمان"و سەربازەکانی بەناوچەی ئێوەدا دەڕۆن و خێرا خۆتان لەکونەکانتان دا بشارنەوە تاکو پێتان پیا نەنێن و پانتان نەکەنەوە لەکاتێکدا بەسەرتان دا دەڕۆن و هەست بەوجودی ئێوە ناکەن).

کاتێك "سولەیمان" گوێی لەقسەکانی ئەو مێرولەیە بوو زۆر شادو خۆشحاڵ بوو بەو ئیلهامەی مێرولەکە و بەو قسانەشی کە باسی بەخششەکانی خودای لە "پێغەمبەرێتی" و "دادگەری" و "ڕەحمەت" تێدابوو..

هەروەها دڵشادبوو بەو تایبەتمەندیانەی کە خودا پێی داوە، چ لەموڵك و دەسەڵات و چ لە هەست کردن بەقسەو ئاخاوتنی ئەو مێرولەیەی کەهیچ کەسێکی تر هەستی پێ ناکات و قسەیان نابیستێت.

هەر بۆیەش دەستی کرد بە نزاو پاڕانەوە لەخوداو گوتی: (ئەی پەروەردگار هەمیشە وام لێ بکە کە بەردەوام بم لە سوپاسگوزاری و شوکرانەبژێری لەسەر نیعمەتەکانت و، هەر بەو فەزڵ و سۆزو بەزەییەش بمخەرە ڕیزی ئەو بەندە چاکانەتەوە کە ڕەزامەندیی تۆیان بەدەست هێناوە).

ئەم بڕگەیەی پێشووش واتاو شیکاری ئەم چەند ئایەتەیە کە خودا تیایان دا ئەو لایەنەی چیرۆکی "سولەیمان"ی پێ گێڕاونەوەو فەرموویە:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ[1] ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ

---

(١) یوزعـون: سەربازەکانی "سولەیمان"کە دەهاتنە لای، لەیەکـەم سەربازەوە لـەلای خـۆی دەیهێشتنەوەو ڕایدەگرت تاکو هەموو ئەوانی تر دەهاتن و خڕدەبوونەوە تاکەسیان لێ دوانەکەوێت لەگەشتەکەدا.

سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ[١] ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكٗا مِّن قَوۡلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ[٢] أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَدۡخِلۡنِي بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾النمل/١٥-١٩

## تاقیکردنەوەیەکی "سولەیمان"

جارێکیان خودای مەزن "سولەیمان" بە نەخۆشی یەکی سەخت تاقی دەکاتەوەو وای لێ دێت گەر بیویستایە لەسەر کورسی یەکەی دانیشێت وەك جەستەیەکی بێ گیان دەکەوێت، بەڵام لەدوایی دا چاك دەبێتەوە.

لەوانەیە هۆی تووش بوونی "سولەیمان" بەم نەخۆشی یە لەئاکامی سستیو کەمتەرخەمی یەکی بووبێت دەرهەق بەنەفسی خۆی وەك چۆن (هەندێك کەس لەوانەی زێدەڕۆیی لەتەندروستیان دا دەکەن و بایەخێکی پێ نادەن) تووشی دەبن. جا هەر کاتێك مرۆڤ تووشی نەخۆشی یەك ببێت و هۆی سەرەکی ی نەخۆشی یەکەش زێدەڕۆیی بووبێت لەتەندروستی ی دا

(١) (لا یحطمنکم سلیمان وجنوده وهم لا یشعرون): واتە: ( با "سولەیمان"و سەربازەکانی پێتان پیانەنێن و نەتانشێلن لەکاتێکدا هەستیشی پێناکەن و لەوانەیە نەتانبینن)، ئەم وتەیەی مێرولەکە پاکانەکردنێکە لەجیاتی "سولەیمان" و سەربازەکانی، چونکە گریان گەر ئەوان مێرولەکانیان بکوشتایە ئەوا (بەهەڵە کوشتن) دەبوو و بەئانقەست نەدەبوو. بێگومان"سولەیمان"یش ئەو گومانەی مێرولەکەی بەڕاست داناوە کە لەوانەیە نەیانبینن و پێیان پیابنێن. دەنا هەر بەپێی گومان و بۆچوونی مێرولەکە ئەوان بەڕەحم و بەزەیی بوون و هەرگیز نەیانویستوە مێرولە بکوژن، هەربۆیەش"سولەیمان" بەبیستنی قسەکانی مێرولەکە لەخوا دەپارێتەوە کە وای لێ بکات زیاتر سوپاسگوزارو شوکرانەبژێری خودا بێت..

لەم بەسەرهاتەش دا تێبینی یەکی جوان بەدی دەکرێت لەسەر ئەوەی کە پێویستە (بەهێز) بەزەیی بە (بێ هێز)دا بێتەوە. لەم دەقە قورئانی یەشەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە مێروولەش لەچەند خانوویەکی تایبەت بەخۆیان دا دەژین، واتە کۆمەڵگەی تایبەتی ی خۆیان هەیە. هەروەها ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێت کە (وریایی و بێداری) لەڕەوشتە گرنگەکانی مێرولەن. تەنانەت زمانێکی تایبەتیشیان لەنێو خۆیان دا هەیە. جگە لەمانەش ئەوەی تائەمرۆ دەربارەی کۆمەڵگەی-مێروولە-زانراوە ئەوەیە ئەوان کۆمەڵگەیەکی رێکوپێك و رێکخراویان هەیەو بە ڕادەیکی زۆریش زیرەك و بەسەلیقەن و زۆر حەزیان لەکارکردن و تێکۆشان و گرتنەبەری شێوازی دانایانەیە لەکاروباردا، کۆمەڵە جیاجیاکانی مێرولە هەردەم حەزدەکەن لەجێیەك دا بەیەك بگەن و لەکاتێکەوە بۆکاتێکی تر جاروبار بەدیداری یەکتر بگەن و پێکەوە وتوێژ بکەن و پرسیار لەسەر گەلێك مەسەلەی پەیوەست بەکاروباریان لەیەکدی بکەن، جا بۆ ئەوەی زۆر لە ناوەڕۆکی باسەکەمان دەرنەچین بەوەندە وازدێنین، دەنا گەلێك زانیاری ی ترمان دەربارەی مێرولە دیاری دەکرد.

(٢) أوزعني: وام لێبکە، هانم بدە، ڕاگیرم کە لەسەر.

ئەوا پێویستە داوای لێبوردن لەخودا بکات و بایەخی تەواویش بەباری تەندروستی و خەوو خۆراك و پۆشاکی بدات..

دیارە "سولەیمان"یش دوای ئەو نەخۆشی یە داوای لێبوردنی لەخودا کردووەو هەر پەنای بۆ پەروەردگاری بردووە، وەك خوداش لەم بارەیەوە فەرموویە: ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا[1] سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ [2] ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي ...﴾ص/٣٤-٣٥.

## ئەو نیعمەتە تایبەتیانەی کە خودا بە "سولەیمان"ی بەخشیوە

### (با) و (جن) لەخزمەت سولەیمان دا:

"سولەیمان" لەگەڵ ئەوەدا کە داوای لێبوردنی لەخودا کرد لەسەر کەمتەرخەمی نواندنی بەرامبەر تەندروستی و جەستەی، لەهەمان کاتدا نزایەکی تریشی کردو داوای لێ کرد موڵك و سامانێکی وەهای پێ ببەخشێت کە هەرگیز بەهیچ کەسێکی تری نەبەخشیبێت، خوداش دووعاو پاڕانەوەی گیراکرد و ئەم نیعمەتانەی پێ بەخشی:

یەکەم: قودرەت و دەسەڵاتی لەسەر (با) پێبەخشی و (با)ی بۆ بەیدەست کرد کە بەفەرمانی "سولەیمان" خۆی بڕوات بۆ ئەو شوێنەی دەیەوێت.

دووەم: ڕام کردن و بەیدەست کردن (تسخیر)ی (جن) و کۆمەڵەی (جن و شیاطین[3]) لەخزمەتی دا بۆ ڕاپەڕاندنی چەند کاروبارێکی گرنگ کە هەندێکیان وەستای بیناسازی کۆشك و قەڵای پتەو بوون و، هەندێکیشیانی بۆ چوونە نێو قووڵایی ی دەریاکان بەکارهێناوە تاکو گەوهەرو بەردی بەنرخ و دوڕو مەرجانی بۆ دەربێنن، خودا لەهەمان کاتدا جنۆکە بێباوەڕەکانیشی خستبووە ژێردەسەڵات و کۆنترۆڵی "سولەیمان"ـەوەو ئەویش هەموویانی دەبەستەوە بۆ بەرگرتن لەشەڕو خراپەیان.

وێڕای هەموو ئەم موڵك و دەسەڵاتانەش کە خودا بۆ "سولەیمان"ی ڕێك خستبوو، مافی ئەوەشی پێدابوو بەئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت و ڕەفتاریان پێوە بکات و بەشی هەر کەسێکی تریشی لێبدا یان لەهەر کەسێکی بگرێتەوەو بەشی کەسی لێ نەدات..

---

(١)فتنا: واتە تاقییمان کردەوە.

(٢) أناب: واتە گەڕایەوە بۆ سەر تەندروستیو بایەخ دان بەباری تەندروستیی جەستەی.

(٣)وشەی (شیاطین)، یان (شیطان) لەهەندێك مانای ڕاڤەکراوی نێو فەرهەنگە عەرەبی یەکان دا بەواتای (جن)و هەر مەخلوقێکی یاخییش هاتووە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا پلەو پایەیەکی بەرزیشی لەلای خودا لەدنیادا هەبوو، لەرۆژی دوایشدا باشترین پاداشت و شوێنی حەوانەوەی هەیە کە بەهەشتە، هەروەك خودا فەرموویە:

﴿ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ (٣٥) فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً [١] حَيْثُ أَصَابَ (٣٦) وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ (٣٧) وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ [٢] فِي ٱلْأَصْفَادِ [٣] (٣٨) هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ [٤] أَوْ أَمْسِكْ [٥] بِغَيْرِ حِسَابٍ (٣٩) وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ [٦] وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾ص/٣٥-٤٠.

قورئان لەجێگەیەکی تردا بەشێوەیەکی گرنگ تر باسی چۆنیەتی بەیدەست کردنی (با) بۆ سولەیمان دەکات کە رێگەی یەك مانگی بۆ ماوەی (لەبەیانی یەوە تا خۆرئاوابونی تاکە رۆژێك) کورت کردۆتەوەو بەفەرمانی (سولەیمان) خۆی بۆ کوێی بیەوێت گواستوویەتیەوەو سەفەری پێ‌کردوە.

ئەم مەسەلەیش لەرۆژگاری ئەم سەدەمەی ئێمەدا هێندە غەریب نیەو مرۆڤ ئەمڕۆ زانستی بۆ سەفەری دووریش بەیدەست کردووەو لەرێی داهێنان و دروست کردنی فرۆکەوە لەماوەیەکی کەم دا لەمسەری دنیاوە بۆ ئەو سەری دەچێت، جگە لە داهێنانی ئەو مووشەکانەی کە مرۆڤ پێیان گەیشتە سەرمانگ.

هەروەها قورئان باسی ئەوەش دەگێرێتەوە کە خودا کانیاوێکی لەزەوی بۆ (سولەیمان) تەرخان کردووەو مسی تواوەی لێوە هەڵقولاوە... جگە لەبەیدەست کردنی(جن) لەبەردەستی دا بەفەرمانی خوداو بۆ هەر کارێك ویستبێتی. هەر کەسێکیش لە (جن)و خەڵکانی بەردەستی روویان لەبەجێ‌هێنانی فەرمانی خودا وەرگێرابێت (واتە: گوێرایەڵی ی (سولەیمان)یان نەکردبێت) ئەوا خودا لەرۆژی دوایی دا دەیانخاتە ناو ئاگرەبڵێسەدارەکەی دۆزەخەوە. بێگومان ئەو (جنی)یانە لەسەر خواستی (سولەیمان) هەموو جۆرە کارێکی بیناسازییان ئەنجام دەدا وەك

---

(١) رخاء: واتە کزو هێواش و رام کراو،.. خودا لێرەدا وەسفی هەموو جۆرە(با)یەکی بە نەرم و هێواش (رخاء) کردووە، واتە: تەنانەت بای بەهێزو گەردەلوولیشی سووك و لەسەر خۆکردۆتەوەو بۆ "سولەیمان"ی خۆش و ئاسان کردووە.

(٢) مقرنین: بەزنجیرو پێوەند بەستراونەوە بەشێوەیەك هەریەکەو بەوی دیەوە بەسترابێتەوەو هەموویان بەیەك زنجیرە پێوەند کرابن.

(٣) أصفاد: کۆ(جمع)ی-صفد-ە، واتە (پێوەند، زنجیر).

(٤) فامنن: بەئارەزووی خۆت بەشی هەر کەسێکی لێبدە.

(٥) أمسك: بەئارەزووی خۆت لەهەر کەسێکی بگرەوەو نەیدەیت پێی گەر شایستەی نییە.

(٦) لزلفى: واتە (نزیك خراوە لێمان و بەرێزە).

بنیات نانی پەرستگەو کۆشك و تەلارو، داتاشینی پەیکەرو، کێشانی وێنەی ئاژەڵی درندەو باڵندەش، جگە لە دروست کردنی چەند قاپێك بۆ خۆراك وەك حەوزە گەورەکان و چەند قابلەمەیەکیش بۆ چێشت لێنان کەلەبەر گەورەیی و بارستاییان نەدەجوولاَن.

خودای مەزن دوای باسکردنی ئەم نیعمەتانە، کە بە بنەماڵەو نەوەکانی (داود)ی بەخشیبوو داوای سوپاسگوزارییان لیَ دەکات و پیَ یان دەفەرمویَت: (ئەی خێڵی (داود) هەر گوێڕایەڵی ی خوداتان بکەن و بیپەرستن وەك شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاری یەکتان لەسەر ئەو هەموو نیعمەتەی پیَی بەخشیون)..

﴿ وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا[١] لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ[٢] وَمِنَ الْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَن يَزِغْ[٣] مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ[٤] وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ[٥] كَالْجَوَابِ[٦] وَقُدُورٍ[٧] رَّاسِيَاتٍ[٨] اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴾ سبأ/١٢-١٣.

**ئەسپەکانی-سولەیمان-:**

نیعمەتێکی دیکەی خودا بۆ-سولەیمان-ئەو ئەسپە ڕەسەنانە بوو، کەهەیبوون و کەجاروبار دەیخستنە بەرچاوی خۆی...

ڕۆژێکیان (سولەیمان) داوا لە کارگوزارانی دەکات کەهەموو ئەسپەکانی بۆ بهێننە بەردەستی. جا کە دەیانهێنن ڕوو لەو کەسانەی چواردەوری خۆی دەکات و بەزمانی سوپاسگوزاری و شانازی کردنەوە دەڵێت: (من بۆیە ئەم جەڵبە ئەسپەم خۆش دەوێت تاکو یادو زیکری خودایان پیَ بکەمەوەو دینی خودایان پیَ بەرز ڕاگرم، چونکە من لەپێناوی دنیادا خۆشم ناوێن و بۆ دەوڵەمەندی و ساماندداری نی یە).

پاشان دەست کرا بە پیشاندانی ئەسپەکان و هەموویان بە بەردەمی دا ڕۆشتن تاکو

---

(١) اسلنا: واتە (تواندوومانەتەوە).

(٢) القطر: واتە (مس)

(٣) یزغ: واتە (لابدات)

(٤) محاریب: کۆی وشەی ( میحراب)ە ولێرەدا مەبەست لە کۆشك و تەلار، یان لەپەرستگە، یان لەنیشتگەیە.

(٥) جفان: کۆی (جفن)ـەو بەو قاپە دەوترێت کە خواردنی تیادادەنرێت.

(٦) کالجواب: واتە ( وەك حەوزە گەورەکان)

(٧) قدور: کۆی (قدر)ەو بەو مەنجەڵە سەرداپۆشراوە دەگوترێت کە چێشتی تیا لیَ دەنرێت.

(٨) راسیات: واتە جێگیرو نەجوولاو.

لەبەرچاوان نەمان، بەڵام (سولەیمان) بەوەش گڕی خۆشەویستی ی بۆ دیتنی ئەسپەکان دانەمرکایەوە، بەڵکو بۆ جاری دووەمیش فەرمانی دا کە ئەسپەکان بە بەردەمی دا بهێنرێنەوە، ئەم جارەیان (سولەیمان) زیاتر لەئەسپەکان نزیك بۆوەوە دەیلاواندنەوەو دەستی بەمل و سەرو گوێو قاچیان دا دەهێنا.

ئەم کارەش بۆ چەند مەبەستێك بوە، وەك:-

▪ بۆ بایەخ پێدانی تەواویان لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا گەورەترین ئامراز بووە لە بەرەنگار بوونەوەی دوژمنان دا.

▪ سولەیمان لەم هەڵس و کەوتەی دا وا دەردەکەوێت، کە زۆر بایەخی بە ڕێك خستنی کاروباری سیاسی و دەوڵەت داوەو زۆربەی کارەکانیشی هەر خۆی ڕاستەوخۆ ئەنجامی داون.

▪ وا دیاریشە ئەو خۆی زاناتر بووە لەکەسانی دی لەبواری زانینی بارودۆخی ئەسپ و خەوش و نەخۆشی یەکانیان. بەو پیشان دان (استعراض)ـەی ئەسپەکانیش ویستویەتی ئاگاداری بارودۆخی تەندروستیان بێت و بیان پشکنێت تا ئاخۆ هیچ نیشانەیەکی نەخۆشییان پێوەیە؟!

دەربارەی ئەم ئەسپانەش لەچیرۆکی سولەیمان-دا خودا فەرموویە:-

﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ[1] ٱلْجِيَادُ[2] ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ[3] عَن ذِكْرِ رَبِّى[4] حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ[5] مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴾ص/٣٠-٣٣.

---

(١) الصافنات: بەو جۆرە ئەسپە دەگوترێت کە دەستێکی دەخاتە سەر پێی (بەسێجار) بۆ هەستان، ئەمەش لەنیشانەکانی ڕەسەنی یە لەئەسپدا.

(٢) الجياد: بەو ئەسپە تیژڕەوانە دەوترێت کە بەخێرایی دەڕۆن و هەنگاوی درێژ دەنێن.

(٣) الخير: لێرەدا مەبەست لەوشەی (خێر) ئەسپەکانە، (عەرەب) لەکۆن دا ئەسپیان بەوشەی (خێر) ناو دەبرد و(خێر)یشیان بۆ ماڵ و سامان بەکار دەهێنا. واتە خودی (خێر)یان بەماڵ و سامان ناودەبرد.

(٤) (احببت حب الخير عن ذكر ربي): واتە: (دڵم پڕ بووە لەخۆشەویستیی جۆرە باوەڕو خێرخوازییەك کە لە زیکرو یادکردنەوەی پەروەردگارمەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە ئەم ئەسپانە ئامرازی خێرو چاکەن لەجیهادی ڕێی خوادا).

ئەمەش وانەیەکە بۆ مرۆڤی باوەڕدار دەربارەی ئەوەی دەبێت تەنها خودای تاك و تەنیای خۆش بوێت، خۆ ئەگەر هەر شتێکیشی لەدنیادا خۆش بوێت دەبێت لەپێناوی خوادا خۆشی بوێت، چونکە دەبێتە هۆی بەیادهێنانەوەی خوداو سوپاسکردنی، هەروەها دەبێت رقی لەهەموو ئەو شتانەش بێت کەلەرێی ڕاستی خودای لادەدەن.

(٥) طفق: وای لێ کرد، دەستی پێ کرد.

# بەندی چوارەم

## (("سولەیمان" و شاژنی "سەبەء"))

( مەملەکەتی "سەبەء" - گفتوگۆیەك لەنێوان (پەپو) و "سولەیمان"دا - نامەیەك لە "سولەیمان"ەوە بۆ "بەلقیس" - وەڵامی "بەلقیس" بۆ نامەکەی "سولەیمان" - تەخت و تاراجی بەلقیس" لەبەردەم "سولەیمان"دا - "بەلقیس" تەخت و تاراجی خۆی دەناسێتەوە - "بەلقیس" لەکۆشکی "سولەیمان" - کۆچی دوایی "سولەیمان" )

### مەملەکەتی "سەبەء"

پێش ئەوەی بچینە نێو بەسەرهاتی "سولەیمان" لەگەڵ (شاژنی سەبەء)ەوە، پێویستە چەند زانیاری یەکی گشتی دەربارەی شانشینی (مەملەکەت)ی "سەبەء" بخەینە ڕوو.

"سەبەء" خاکێکە لە(یەمەن) و شاری (مەئرەب)ی تێدا بووەو دووری نێوان ئەم شارەو شاری (صنعاء) ماوەی سێ ڕۆژ لە ڕۆیشتنی پیادەیە. ئەم خاکەش بۆیە بە "سەبەء" ناوبراوە، چونکە شوێنی نیشتەجێ بوونی کوڕو نەوەکانی (سەبەئی کوڕی -یەشجوب-ی کوڕی -یەعروب-ی کوڕی -قەحطان) بووە، ئەم پیاوە (واتە:"سەبەء"ی کوڕی یەشجوب) بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە چونکە یەکەم کەس بوە لەپادشایانی عەرەب کە دیل و کۆیلەی ڕاگرتووە[1] و بۆ یەمەنی هێناون.

هەندێك لەمێژوونووسان دەڵێن: (ئەم پادشایە شاری "سەبەء"و بەربەست(سد)ی (مەئرەب)[2]ی بنیات ناوە). کاتێك: بەربەستەکەی (مەئرەب)یش بەهۆی لافاوە توندەکەوە هەڵچووەو هەرەسی هێناوە، خەڵکی ئەو ناوچەیە بەناوچەکانی تری وڵات دا بڵاوبوونەتەوەو هەر هۆزێك ڕووی کردۆتە لایەك. (عەرەب) دەربارەی ئەو پەرتەوازەبوونەی دانیشتوانی "سەبەء" پەندێکیان داهێناوەو بۆ هەر گەلێکی پەرتەوازەو لێك دابڕاو دەڵێن: (ذهب القوم أيدي سبأ) یان (ايادي سبأ)، واتە: (ئەو میللەتە پەرتەوازەبوون)[3].

---

(١) معجم البلدان: لياقوت.

(٢) تأريخ العرب قبل الأسلام للدكتور جواد علي

(٣) معجم البلدان لياقوت.

لەکتێبی (العهد القدیم)دا ناوی ناوچەکە بە "شەبەء" هاتووەو سەنتەرێکی بازرگانییش بووەو، بازرگانەکانیان لەگەڵ عیبرانی یەکاندا سەوداو مامەڵەی بازرگانییان کردووە، هەروەها بەسامانی زۆرو وجودی ئاڵتوون تیای دا ناسراوە[١].

هەر لە (عهد القدیم) (لەتەورات)دا ئەو چیرۆکەیان وا گێڕاوەتەوە گوایە شاژنی "سەبەء" بەکەژاوەیەکی زۆر گەورەوە سەردانی (سولەیمان)ی لە (ئۆرشەلیم) کردووەو لەو کەژاوەیەی دا باری چەندین وشتری لە (بۆن وبەرامە)و (زێڕو خشڵی بەنرخ)[٢] لەگەڵ خۆی دا بردووەو کردوونی بە دیاری بۆ (سولەیمان)و شاژنی (شەبەئن واتە: سەبەء) بە(ماقدة)[٣] ناو دەبەن.

بێگومان قورئانی پیرۆزیش بە شێوەیەکی کورت و پێویست چیرۆکی سەردانەکەی شاژنی (سەبەئی) بۆ لای (سولەیمان) بۆ گێڕاوینەتەوە بێ ئەوەی ناوی (شاژنەکە)ی دیاری کردبێت، بەڵام تەفسیرکارانی قورئان دەڵێن ناوی (بەلقیس)بووەو یەکێك بووە لەکچانی(توببەعی یەکان). [٤]

## گفتوگۆیەك لەنێوان- پەپو-و (سولەیمان)دا

لەمەوپێش باسی ئەوەمان کرد کە خودا چەند بەهرەیەکی گرنگی بە-سولەیمان-بەخشیبوو یەکێك لەوانەش توانای تێگەیشتن لە زمانی باڵندە بوو. باڵندەی (پەپو)یش یەکێك بوو لەو گیانلەبەرانەی کە (سولەیمان) لەلای خۆی بەخێوی دەکردن و بەزمانی تایبەتی ی خۆیان دەیدواندن.

ڕۆژێکیان (سولەیمان) بەدوای (پەپو)ەکەی دا دەگەڕێت، بەڵام نایدۆزێتەوەو ئاسەوارێکیشی بەدی ناکات، بۆیە هاوار دەکات و دەڵێت: (ئەرێ بۆچی ئەمڕۆ پەپو(هدهد)[٥] لەنێو باڵندەکان دا نابینم؟ تۆ بڵێی بەس تەنیا لەم کاتەدا بزر بووبێت کە من هەواڵی دەپرسم؟ یان لەزووەوە بزرەو من هەستم بە نادیاربوونی نەکردووە؟ ئەی باشە چۆن بەبێ ئاگاداربوونی من بزر دەبێت؟).

---

(١) حزقیال _ الأصحاح(٢٧)_ الآیة(٢٢)_ الأصحاح (٣٨) _ الآیة(١٣).

(٢) سفر الملوك الثالث، الاصحاح (١٠)، الآیة (٢).

(٣) تأریخ العرب قبل الأسلام للدکتور (جواد علي). (ج٢)_ ص١٠٤.

(٤) (توببەع) نازناوی پادشاگەورەکانی (یەمەن)بووەن، ئەم وشەیەش لەناوی(أبو کَرْب-ی حیمەری)ی پادشای یەمەنەوە داهاتووە، خەڵکی(مەککە) چاك دەزانن کە ئەو گەلەی(أبو کَرب) چییان بەسەرهات. (وەرگێڕ).

(٥) هدهد: بەکوردی (پەپووسلێمانکە)ی پێدەڵێن: ئەم باڵندەیە دەنوکێکی باریك و درێژی هەیەو پۆپنەیەك بەسەریەوەیەو لەبارستایی کۆتردایەو پەڕێکی خەت خەت و ڕەنگینی هەیە. (وەرگێڕ).

(سولەیمان) لەگەڵ ئەو پرسیارانەی دا تووڕەش بوو بوو و بڕیاری دا سزای (پەپو)ـەکە بدات بەو شێوەیەی کە لەپەڕەکانی ببڕێت یاخود لە قەفەسێکدا بەندی بکات، یان تەنانەت گەر گوناهەکەی گەورەبێت سەری ببڕێت، بەڵام گەر (پەپو) پاساوێکی شیاوی هەبێت وبەڵگەی پێویست لەسەر هۆی دیارنەبوونی بخاتە ڕوو ئەوا لێ ی دەبوورێت.

ماوەی بزربوونی باڵندەکەش هێندەی نەبردو دوای چەند ساتێکی کەم گەڕایەوە بۆ لای (سولەیمان)و هۆی دیارنەبوونی پێ ڕاگەیاندو گوتی: (بێگومان من زانیاریم لەسەر دیاردەیەکی نامۆ دەست کەوتووە کە هێشتا تۆ هیچی لەبارەوە نازانیت. ئەم جارەش وا هەواڵێکی ڕاست و تەواوم دەربارەی (مەملەکەتی سەبەء) بۆ هێناویت... بەڕاستی لەوێ دیتم ئافرەتێك حوکمی ئەو مەملەکەتە دەکات و پادشایانەو خاوەنی هەموو جۆرە هێزو ئامرازێکی جەنگیو دەسەڵاتدارێتییەو لەنازو نیعمەت دا دەژی، هەروەها تەخت (عەرش)ێکی گەورەی هەیەو بەگەوهەرو مرواری بۆی ڕازێنراوەتەوە، جا سەرەڕای ئەوەی کە خودا ئەو هەموو نیعمەتانەی بەلێشاو بەسەر خەڵکی ئەو مەملەکەتەدا ڕشتووە، کەچی هێشتا دانیان بەوەدا نەناوە کە ئەوە هەمووی نیعمەت و بەخششی خودایەو تەنانەت باوەڕیان بەخوداش نەهێناوەو نایپەرستن، بەڵکو لەجیاتی ئەوە(خۆر) دەپەرستن و کڕنووشی بەندایەتی ی بۆ دەبەن. دیارە شەیتانیش فریوی داون ودڵیانی لەسەر ڕێی ڕاست و ڕەوان لاداوە. ئەوانیش ڕێنموونی نەکراون بۆ سەر ڕێی ڕاست و پەرستنی خودای تاك و تەنیا. ئەوان شەیتان گومڕای کردوون و دووری خستوونەوە لە سوژدەبردن بۆ ئەو خودایەی کە هەر ئەو شایستەی پەرستنەو هەر خوداشە دەزانێت چ ڕووەکێك لەناخی زەویدا حەشاردراوەو چ گەنجینەیەکی بۆ خەڵکی تێدایەو، بارانیش لەئاسمانەوە دەنێرێتە خوارەوەو، هەر خۆیشی دەزانێت چ ڕازو نیازێك لەدڵ و دەروونی خەڵکی دایەو لەهەموو کردارێکی ئاشکراو نهێنییان ئاگادارە. بێجگە لەم خودایەش هیچ پەرستراوێکی دی نی یەو خاوەنی تەختی گەورە(العرش العظیم)ـە).

کاتێك (پەپو) قسەکانی تەواوکرد. (سولەیمان) دەربارەی ئەو مەملەکەتە پێی گوت: (ئێمە لەو مەسەلەیە دەکۆڵینەوەو بەدوای باری ڕاستی ی قسەکانت دا دەچین و دەبێت بۆمان ڕوون بێتەوە کە داخۆ تۆ ڕاست دەڵێیت لەم وتانەت دا یان لە درۆزنانیت، حوکم دانیشمان بەسەرتا بەگوێرەی ئەو حەقیقەتانەیە کە لەمەولا بۆمان ڕوون دەبێتەوە)...

ئەم گفت و گۆیەی پێشووی نێوان (سولەیمان) و (پەپو)ەکەی، شیکاری ئەم ئایەتانەی لای خوارەوەیە کە ئەو بەشەی بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوەو خودا تیایاندا فەرموویە:

﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ

عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ [1] ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ [2] وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّى وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَىْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ [3] عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ [4] مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ [5] فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾النمل/ ٢٠-٢٧.

## نامەیەك لە "سولەیمان"ەوە بۆ "بەلْقیس"

"سولەیمان" بۆ دەرخستنی ئەو حەقیقەتەی كە (پەپو) ئاشكرای كرد، نامەیەكی پێداو فەرمانی پێكرد فڕێی داتە بەردەستی "بەلْقیس"ی شاژنی "سەبەء"، داواشی لێ كرد لەنزیكەوە چاودێریی ئەو ژنەو گەلەكەشی بكات و گوێیان لێ بگرێت و بزانێت ئاخۆ چی دەڵێن و چ وەڵامێكیان بۆ نامەكەی هەیە.

(پەپو) بۆ جێبەجێگەیاندنی ئەم فەرمانە نامەكەی "سولەیمان"ی هەڵگرت و بەرەو مەملەكەتی "سەبەء" فڕی و هەڵیدایە بەردەستی (بەلْقیس). ئەویش نامەكەی هەڵگرتەوەو كردییەوەو خوێندی یەوە، پاشان هەموو پیاو ماقووڵانی گەلەكەیو سەركردەكانی مەملەكەتی كۆكردەوەو پێی گوتن: (گەلۆ مـن نامەیەكم لە (شا سولەیمان)ـەوەو بۆ هاتووەو ئەمە

---

(١) بسلطان مبین: واتە (بەبەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكراوە).

(٢) أحطت بما لم تحط بە: واتە ئەوەی تۆ نەتزانیوە من زانیومە.

(٣) عرش: واتە كورسی ی پادشا، تەخت و سەكۆی فەرمانڕەوایی.

(٤) یسجدون للشمس: واتە: ( ئەوان سوژدەیان بۆ (خۆر) دەبرد). سەبارەت بە حاڵەتی (خۆرپەرستنی سەبەئی یەكان) چەند لێكۆڵینەوەیەكی زانستی ی نوێش ڕاستی ی ئەو حاڵەتەیان سەلماندووە، وەك دەركەوتووە هەندێك لەو خواوەندانەی سەبەئی یەكان ناویان (عەثتەر)و (ئیلمیقە)و ( هیبس)و (ذات حمیم)و (ذات بوعدان) بووە، (عەثتەر)یش كوڕی خۆر بووە، خۆریش بە (دایكی عەثتەر) ناسراوەو بە خواوەندی بەرەكەت و پیت و فەڕ دانراوە، (ذات حمیم)یش مانای ( ذات الأشعة)ی بووە، واتە خاوەنی تیشكەكان، ئەو تیشكانەی كە لە ئاوێكی هێجگار گەرم دەچن، (ذات بوعدان)یش مانای ماوەیەكی دووری هەیە، مەبەست لەوەش ئەو خۆرەیە، كە لەزەوی یەوە دوورە، بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە كتێبی(تأریخ العرب قبل الاسلام-ی دكتۆر جواد علی-بەرگی دووەم و بەرگی پێنجەم. ئەمەش واتە: ( ئەم باسە مێژوویی یەی نێو قورئانیش) بەڵگەیەكی زانستی ی دێرینی قورئانە و دەچێتە پاڵ هەموو ئەو موعجیزانەی تر لە دەرخستنی ئەو ڕاستی یانەی، كە لە لای خەڵكی نەزانراون.

(٥) الخبء: واتە ( گەنجینە)و ( ڕووەك و چێنراوەكان)ی زەوی.

دەقەکەیەتی: (بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان... تکایە لەئاست من خۆتان بەگەورە مەگرن، بەڵکو دەبێت باوەڕ بێنن و بەدڵ و بەگیان خۆتان تەسلیمی بەرنامەی ڕاستی خودا بکەن)...

جادوای ئەوەی "بەلقیس" نامەکەی بۆ خوێندنەوە ڕووی ئاخاوتنی کردە ئەو کەسانەی چواردەوری خۆی و داوای ڕاوێژو تەگبیری دەربارەی ناوەرۆکی ئەو نامەیە لێدەکردن و، پێی گوتن: (گەلۆ خۆتان ڕێگەیەکم بۆ دانێن و تەگبیرێکم بۆ بکەن، چونکە بەڕاستی من هیچ حوکمێك نادەم و هیچ فەرمانێکیش تەبەنی ناکەم تەنها بەپرس و ڕاو بڕیاری ئێوە نەبێت).

ئامادەبوانیش لەوەڵامی دا گوتیان: ئێمە خاوەنی هێزێکی توندو کاریگەرو ژمارەیکی زۆرین، بەتەواوەتییش ئامادەی جەنگ و کوشتارین، بەڵام خۆتمان سەرپشك کردووە لە هەر فەرمانێکت دا کە بە ئێمەی دەکەیت، ئێمەش گوێڕایەڵی هەر فەرمانێکت دەبین).

ئەم ئایەتانەی قورئانیش ئەو پرس و ڕا ناوخۆیی یەی نێوان پادشا ژنەکەو گەلەکەیان بۆ دەگێڕنەوە.. ﴿ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ[1] ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا[2] حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ[3] ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ[4] وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴾النمل/٢٨-٣٣.

## وەڵامی "بەلقیس" بۆ نامەکەی "سولەیمان"

دوای ئەو پرس و ڕایەی "بەلقیس" لەگەڵ سەران و فەرماندەکانی گەلەکەیدا بۆی دەرکەوت کە گەلەکەی مەیلی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەیان هەیە زیاتر لەوەی حسابێکی تر بۆ ناوەڕۆکی نامەکەی "سولەیمان" بکەن، بەڵام ئەم ئافرەتە پادشایە مرۆڤێکی ژیرو تێگەیشتوو بوو و بەجیدی بۆ ئەنجامی گشت کێشەو کاروبارێکی دەڕوانی، بۆیە ویستی

---

(١) کتاب کریم: (نامەیەکی گرنگ)، ( نامەیەکی پیرۆز) بۆیە بەوشەی (کریم) ناوبراوە چونکە مۆرکراوە. گوتراویشە: شاژنەکە بۆیە وا وەسفی نامەکەی کردووە چونکە وتەی نەرم و ئامۆژگاریی لە شێوازی بانگەوازەکەدا تێدابووە.

(٢) قاطعة امراً: هیچ فەرمانێکم بەجێنەگەیاندووە.. هیچ کارێکم ڕانەپەڕاندووە.

(٣) تشهدون: واتە ( ئامادە دەبن بۆ پرس و ڕاو ڕاوێژکردن).

(٤) اولوا بأس شدید: واتە زۆر زۆر ئازاو بەجەربەزەو دلێرن.

زیانەکانی جەنگیان بۆ ڕوون کاتەوە، نەخاسمە لەسەر لایەنی تێکشکاو، لەم بارەیەشەوە پێی گوتن: ئەی گەلی خۆم... ئەی پیاو ماقوولاّن و فەرماندەو سەر لەشکرانی سوپا. بێگومان سوپاو لەشکری پادشایان گەر پێبنێنە نێو شارێك، یان(لادێیەکەوە)وێران و خاپووری دەکەن و هەموو بیناو ساختمانێکی بەسەر یەك دا دەدەن و بەتەواوی دەیشێوێنن، تەنانەت سووکایەتی وبێحورمەتی بەدانیشتوانەکەشی دەکەن، خۆ ئەگەر ئەوانیش (واتە لەشکری سولەیمان) ڕوبەڕووی خۆمان کەینەوەو جەنگیان لەگەلّدا بکەوین ئەوا هەمان کارەساتمان بەسەردێنن لەکاتێك دا گەر سەرکەون بەسەرمان دا).

ئێنجا دوای ئەم قسەیە (بەلقیس) بیروڕای خۆی لەو بارەیەوە دەردەبڕێت و پێیان دەلێت: (بەڕاستی من نیازم وایە کە با سەرەتا چەند نێرراوێکمان بەدیاری یەکی گەورەوە ڕەوانەی لای "سولەیمان" و گەلەکەی بکەین و بزانین ڕادەی کاریگەریی ئەو دیاری یە لە دلّو دەروونیان دا چەندە؟ چونکە هەمیشە دیاری و شتی جوان کارایی یەکی زۆری لەدلّی پادشایان دا هەیەو واز لە شەڕوشۆڕ دێنن و ڕێز لەخاوەنی دیاری یەکەش دەگرن، جا ئەگەر " سولەیمان" ئەم دیارییەمان لێوەربگرێت ئەوە دیارە کەئەو خۆیشی پادشایەکەو بەم جۆرە شتانە قایل دەکرێت کەپادشایانی پێقایل دەبن، خۆ ئەگەر پێغەمبەریش بێت ئەوا بەهیچ شێوەیەك بەدیاری ڕازی نابێت و هەموو خواست و نیازێکی ئەوەیە هەردەبێت پەیڕەویی دینەکەی بکەین، کەوابوو ناردنی ئەم نوێنەرانەمان بۆ ئەوێ بەو مەبەستەیە کە ئەوان (واتە نوێنەرەکانمان) هەوالّێکی ڕاست و دروست و دلّنیاییمان لەسەر سولەیمان و مەملەکەتەکەیو ڕادەی هێزو لەشکرەکەی بۆ بهێننەوە).

وەفدەکەی " بەلقیس" بەرەو فەلەستن کەوتنەڕێو چەند دیاری یەکیشیان بۆ "سولەیمان" پێبوو، کاتێك گەیشتنە ئەو ولاّتە. دیتیان مەملەکەتێکی گەورەیەو چەندین کۆشك و تەلاری تێدایەو سوپایەکی بەهێزی واشیان هەیە کە مەملەکەتی (سەبەء) لەئاستیان دا شتێکی جێی باس نییە، وەفدەکە بەدیداری "سولەیمان" گەیشتن و دیارییەکەی "بەلقیس"یان پێ گەیاند، بەلاّم "سولەیمان" ڕەتی کردەوەو پێی ڕاگەیاندن کە ئەو کاتێك نامەکەی بۆ ناردووە بەمەبەستی چاوتێبڕین لە (مالّ و سامان)، یان (ناردنی دیاری) نەبووە، بەلّکو داوای ئەوەی لێ کردووە کە بێت بۆ لایو باوەڕ بەخودا بێنێت و پەیڕەویی ی بەرنامەکەی بکات و واز لە (پەرستنی خۆر) بێنێت.

لەم ڕووەوە "سولەیمان" بەوەفدەکەی گوت: (ئایا ئێوە بۆ ئەوە هاتوون کە مالّو سامانێکم بەدیاری بدەنێ لەکاتێك دا خودای مەزن لەو مالّو سامانەی ئێوەی باشتر پێبەخشیوم؟ خودا مەملەکەتێکی ئاوای خستۆتە ژێر دەسەلاّتی منەوەو تەنانەت -جن-و-مرۆڤ-و با-و-بالّندە-

شی بۆ بەیدەست (تسخیر) کردووم، هەروەها خودا پلەو پایەی پێغەمبەریتیی پێ بەخشیوم. ئیتر تەماعم لەهیچ ماڵ و سامانێك نی یە، بەڵکو هیوای هیدایەت و دۆزینەوەی ڕێی ڕاستان بۆ دەخوازم، ئێوە خۆتان دڵتان بەدیاری خۆشەو لەبەر پەیوەست بوونی زۆرتان بەخۆشویستنی دنیاو شتە سەیرو سەمەرەکانیەوە حەز لە وەرگرتنی دیاری و ماڵ و سامان دەکەن، بەڵام من وانیم و لەو جۆرە پادشایانە نیم کە چاوم برپیبێتە دیاری ی ئەم و ئەو).

پاشان "سولەیمان" لەکۆتایی قسەکانی دا بەوەفدەکەی گوت: (بگەڕێنەوە بۆ لای گەلەکەتان و دیاری یەکەیان بۆ بەرنەوەو هەموو ئەو دیاردانەی لێرە چاوتان پێکەوت لە (موڵك و دەسەڵات و خواپەرستیمان)بۆیان بگێڕنەوە. خۆئەگەر بەدەم بانگەوازەکەمانەوە بێن و گوێڕایەڵیمان بکەن و باوەڕ بەخودا بێنن ئەوا ڕزگارو سەرفراز دەبن، بەڵام ئەگەر لەسەر کوفرو بێ باوەڕی بمێننەوە ئەوا قەسەم بەخودا سوپایەکی وایان دەکەینە سەر کە هیچ توانایەکی بەرگری لەخۆکردنیان نەبێت و دەرەقەتی نەیەن و، لەشاری (سەبەئیش) بەدیلیو سەرکزی و کۆیلەیی دەیانهێنینە دەرەوە).

ئەم برگەیەی پێشوش گێرانەوەی قۆناغێکی تری چیرۆکەکەو تەفسیری ئەم ئایەتانەی تایبەت بەو بەشەی بەسەرهاتەکەیە کە خودا تیایان دا فەرموویە:

﴿ قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّا آتَاكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ارْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا[1] وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَا أَذِلَّةً وَهُمْ صَاغِرُونَ[2] ﴾النمل/٣٤-٣٧.

## تەخت و تاراجی "بەلقیس" لەبەردەم "سولەیمان"دا

وەفدەکە بەرێی خۆیان دا گەڕانەوەو خەبەری هەموو شتێکیان بەشاژن "بەلقیس" گەیاند، چ دەربارەی هێزی سولەیمان و لەشکرەکەی و، چ دەربارەی هۆی ڕەت کرنەوەی دیارییەکەی.

"بەلقیس"بەبیستنی ئەو دەنگ و باسانە تێگەیشت کە بێگومان "سولەیمان" پێغەمبەرێکی نێرراوی خودایەو ڕاستگۆشە لەو هەڕەشەو گوڕەشانەیدا، ئەمیش، واتە "بەلقیس" ناتوانێت هیچ سەرپێچی یەك لەفەرمانی "سولەیمان" بکات، بۆیە بەخۆیدا هاتەوەو خۆی ڕیکخست تا لەگەڵ پیاوماقوولانی گەلەکەی دا بچن بۆ لای.

---

(١) لاقبل لهم بها: واتە هیچ وزەو توانایەکیان لەڕووبەڕووبوونەوەی دا نی یە.

(٢) صاغرون: واتە ملکەچ و زەلیلن.

"سولەیمان" لای خۆیەوە زانیبوی کەوا "بەلّقیس" بەرێوەیە بۆ لای، لەم ڕووەشەوە ویستی هەندێك لەو موعجیزە تایبەتی یانەی (کەخودا پێی داون) پیشانی بدات تاکو بەلّگەیەکی دیاربن لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی.

بۆ ئەم کارەش ڕووی کردە ئەو (جن)ـە چالاکانەی لەچواردەوری بوون و پێی گوتن: (کامتان تەخت و سەکۆی فەرمانڕەوایی ی-بەلّقیس-م بۆ دێنن پێش ئەوەی، کەخۆی و گەلەکەی بگەنە لام وباوەڕبێنن، تاکو بەوە تواناو قودرەتی ئەو خودایەیان ببینن کە بانگم کردوون بۆ پەرستنی و هەروەها تەخت و تاراجی پادشایی ی خۆیشیان لێرە ببینن، کە چۆن گەیەنراوەتە ئێرە لەپێش خۆیان دا).

لە وەلاّمی ئەم داخوازی یەدا (عیفریت-ێك لەجن)، کە هەرە بەهێزو چالاکەکەیان بوو گوتی: (من تەخت و تاراجیت بۆ دێنم پێش ئەوەی لەم کۆبوونەوەیەی ئەمڕۆت هەلّسیت، کە دادوەری و حوکمی تێدا دەکەیت).- جێی باسیشە کۆبوونەوەو مەجلیسی دادوەری و فەرمانڕەوایی ی"سولەیمان" ڕۆژانە لە بەیانی یەوە، تاکاتی نیوەڕۆ بووە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری خەلّکی.

هەروەها ئەم (عیفریتە) گوتی: (من توانام لەسەر هەلّگرتنی ئەو تەخت و تاراجە هەیەو دەسپاکم لەسەر پاراستنی هەر خشلّ و گەورهەرێکی بەنرخ، کە تێی دابێت).

بەلاّم یەکێك لەو فریشتە (مەلائیکەت)انەی، کە خودا یارمەتی "سولەیمان"ی پێ دەدان و زانستی لەسەر کتێبە ئاسمانی یەکان هەبوو بە "سولەیمان"ی گوت: (من لەماوەیەکی کەمی خێراتر لەچاوتروکانێك دا ئەو تەخت و کورسی حوکمڕانی یەی بەلّقیست بۆ دەهێنم).

ئینجا دەسبەجێ ئەو تەختەی گەیاندە لای "سولەیمان". لەو کاتەش دا "سولەیمان" کە دیتی ئەوا تەخت و تاراجی ئەو شاژنە لەبەردەمی دا دانراوە سوپاس و ستایشی خودای کردو گوتی: (ئەم سەرکەوتن و پشتیوانی کردنە لەئامادەکردنی خێرای تەختی "بەلّقیس" لەبەردەممدا هەر لەفەزلّ و بەخششی خودایەو تاقیکردنەوەیەکیشیەتی بۆ من سەبارەت بەوەی، کە ئایا لەسەر ئەو نیعمەتانە سوپاسی دەکەم، یان حاشا و کوفرانەی لێ دەکەم؟ جا من بەڕاستی هەر سوپاس و شوکرانەبژێریی پەروەردگارم دەکەم لەسەر ئەو هەموو بەهرەو بەخششانەی. دیارەو بێشك سوودی شوکرانەبژێریش هەر بۆ سوپاسگوزارەکەیەو هەر کەسێك سوپاس بکات، خۆی قازانج دەکات)، چونکە سوپاسگوزاری مانای بەدەستهێنانی نیعمەتی زیاترو بەردەوام بوونیشی دەگەیەنێت بۆ عەبدی شوکرانەبژێر. خۆ هەر کەسێکیش سوپاسگوزاری خوداو شوکرانەبژێری نەبێت ئەوە دیارە بێگومان خودا بێباك و بێخەمە لە بەندەکانیو هیچی لێ

کەم نابێتەوەو هەر خوداش بەخشندەو دەست بڵاوە بەفەزڵو بەخششی بۆ تێکرای مەخلووقاتی خۆی:

﴿قَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ(١) فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَـٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ﴾النمل/٣٨-٤٠.

## "بەڵقیس" تەخت و تاراجی خۆی دەناسێتەوە

"سولەیمان" فەرمانی دا نەختێك گۆڕانکاری بەسەر سیمای تەخت و تاراجەکەی "بەڵقیس"دا بێنن بۆ ئەوەی کاتێك دێت و دەخرێتە بەرچاوی و لێی ورد دەبێتەوە، دەیناسێتەوە یان نا؟ یان نازانێت کە ئەوە عەرش و تەخت وکورسی ی پادشایی یەکەیەتی؟.

جا کە "بەڵقیس" هات و تەخت و تاراجی خۆی خرایە بەرچاوی، نەختێك ڕاوەستاو هەڵوێستەیەکی بەسەرسامی و دوودڵی یەوە لەئاستی دا کردو دڵنیا نەبوو لەوەی ئاخۆ ئەم عەرشە هی خۆیەتی یان نا؟ چونکە چەند نیشانەیەکی وای تێدابوو کە وای لێ بکات گومانی هەبێت لەوەی کە ئەمە عەرشەکەی خۆیەتی.

لەوساتەوەختەدا پرسیاری لێ کرا: (ئایا ئەم تەخت و عەرشەی بۆی دەڕوانیت لەو عەرشەت دەچێت، کە لە وڵاتەکەی خۆت بەجێت هێشتووە؟).

ئەویش لەوەڵامدا گوتی: (وەك ئەو وایە)، ئینجا دوای سەرنجی تەواو و، لێوربوودنەوەی بەچاکی، بەدڵنیایی یەوە بۆی دەردەکەوێت، کە ئەمە هەر عەرشەکەی خۆیەتی و هێنانیشی بۆ ئەم جێگەیە موعجیزەیەکە لەموعجیزەکانی "سولەیمان"، چونکە ئەم تەخت و تاراجە بەشێوەیەکی توندو مەحکەم لەو کۆشکە داخراوەی دا هەڵگیرابوو و کۆشك و تەلارەکەشی بەچاکی قفڵ درابوو.

هەر بۆیە خێرا دوای دیتنی ئەم موعجیزەیە "بەڵقیس" بە "سولەیمان"ی گوت: (بێگومان ئێمە لەمەو پێشیش توانای خوداو ڕاستی ی پێغەمبەرێتی ی تۆمان زانیبوو، ئەویش بەهۆی ئەرکی (پەپو)ـەکەوەو لەڕێی ئەو هەواڵە تازانەشەوە کە نوێنەرەکانمان بۆیان هێنایەنەوە دوای

---

(١) قبل ان يرتد اليك طرفك: واتە خێراتر لە چاونووقانێکت.. یان لەهەڵهێنانەوەی پێڵووی چاوت دوای نووقاندنی.

ناردنیان بۆ لای ئێوە. ئەو هەواڵانەش چەند بەڵگەیەکی دی بوون لەسەر ئەم ڕاستی یەو ئێمە لەو کاتەوە باوەڕمان هێناوە، بەڵام ئەوەی کۆسپ و بەربەست بوو لەڕێ ی ئاشکراکردنی ئیمانەکەمان و دەرخستنی دا ئەوە بوو ئێمە لەنێو گەلێکی بێباوەڕدا دەژیین کە تا بینە قاقایان لەکفرو بی باوەڕی دا ڕۆچوو و نەماندەتوانی تاکاتی ئامادەبوونمان لەلات دەری بڕین. بۆیە شاردبوومانەوە تا گەیشتینە لای تۆ)...

ئەم بڕگەیەش واتاو ڕاڤەی ئەم چەند ئایەتەی تر بوون کە دەربارەی ئەم بەشەی چیرۆکەکەیەو خودا فەرموویە: ﴿قَالَ نَكِّرُوا لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِي أَمْ تَكُونُ مِنَ الَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَاءَتْ قِيلَ أَهَكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُ هُوَ وَأُوتِينَا الْعِلْمَ[1] مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا[2] مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾النمل/٤١-٤٣.

## "بەڵقیس" لەکۆشکی "سولەیمان"

"سولەیمان" بۆ ئەوەی جوانترین شێوەی بیناسازی و شاکارێکی ئەندازیاریی ی وەهاش پیشانی "بەڵقیس" بدات کە هەرگیز جگە لە "سولەیمان" کەسی تر نەیبووەو کە ئەو شاژنەش نەیبووەو نەیدیوە، فەرمانی بە وەستایانی شارەزاو پسپۆڕانی بیناسازی کرد کۆشکێکی بۆ دروست بکەن. ئەوانیش ئەو جۆرە کۆشکەیان بۆ دروست کردو، (هۆڵێکی میوانداری)یشی بەتایبەتی بۆ بنیات نرا کە ڕووبەندی زەوییەکەی لەشووشەیەکی تەنك و تەخت و لووس دروست کرابوو و ئاویشیان بە ژێردا برد تا وەك حەوزێکی ئاو دەرکەوێت.

"سولەیمان" لەبەشی سەرەوەی هۆڵەکەو لەسەر کورسی ی پاشایەتی لیّ ی دانیشت و ناردی بەدوای "بەڵقیس" دا بۆ چاوپێکەوتنی لە کۆشکەکەدا. جا کە بەڵقیسیان هێنا پیّیان گوت: (بڕۆ نێو ئەم کۆشکەوە بۆدیداری "سولەیمان").

ئەویش کاتێك کۆشکەکەی بەو شێوەیە دی سەری سوڕما و وای دەبینی گوایە پڕە لەئاو، بۆیە کاتێك پیّی نایە ژوورەوە هەر دوو قاچی هەڵکرد تاکو جلەکانی تەڕ نەبن (بەڕای خۆی)،

---

(١) واوتینا من العلم: گوتراوە ئەم ڕستەیە لەقسەکانی (سولەیمان)ە: واتە( زانستمان پیّدراوە دەبارەی خوداو توانای خودا پێش ئەوەی "بەڵقیس" ئەو زانستەی پیّدرابێت) گوتراویشە ئەمە قسەی "بەڵقیس" بووەو مانای ئەوە دەگەیەنێت گوایە لەپێش ئەو موعجیزەیەدا زانستی لەبارەی وجودی خوداوە هەبووە.

(٢) وصدها: (ڕێی لیّ گرت) ئاوەڵناو (ضمیر)ی (ها) لەوشەی (صدها) بۆ فەرمانەکەی "سولەیمان") دەگەڕێتەوەو واتە سولەیمان ڕێی پەرستنی خۆری لیّگرتووەو حەقیقەتی ئەو ڕێگایەی بۆ ڕوون کردۆتەوە کە دەبێت بیگرێتە بەر کە (پەرستنی خودای تاك و تەنیایە). خۆ ئەگەر ئاوەڵناوەکە (ها) بۆ فەرمانی "بەڵقیس" بێت ئەوە مانای وایە هۆی دەرنەخستنی باوەڕەکەی لەوەوپێش ئەوەبووە کە لەنێو گەلە بێباوەڕەکەیدا بووە.

ئینجا بە هۆڵەکەدا ڕۆشت و "سولەیمان"یش خێرا دڵنیای کرد لەوەی، کە ئەرزی ژوورەکە تەڕ نی یە و هەولّی دا ئەو سەرسوڕمانەی تیا نەهێڵێت و پیّی گوت: (ئەم هۆڵە لەشووشەیەکی تەنك و ساف دروست کراوە) دیارە "بەلقیس" لەوەو پێش ئەو جۆرە شوێنانەی نەدیبوو و پێشیان ڕانەهاتبوو.

پاشان کە ئەو هەموو ڕێزلێنانە زۆرو بێوێنەیەی "سولەیمان"ی بینی‌و ئەو حەقیقەتە ڕۆشنەشی دەربارەی خودا بۆ ڕوون بووەوە کەلیّ ی پەنهان ببوو، یەکسەر بەزمانی پاڕانەوەوە ڕووی کردە پەروەردگارو گوتی: (ئەی خودای پەروەردگارم، بەراستی من بەهۆی پەرستنی خۆرەوە ستەمم لەخۆم کرد، جا وا لەگەڵ سولەیمان داو (وەك ئەو) ملکەچی هەموو فەرمان و بەرنامەکەتم، چونکە ئەی پەروەردگاری جیهانییان هەر خۆت شایستەی ئەوەی بپەرسترێیت)...

﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾النمل/٤٤.

## کۆچی دوایی ی "سولەیمان"

قورئان بەم فەرمایشتەی خودا باسی مردنی "سولەیمان" دەکات: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِ إِلَّا دَابَّةُ الْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴾سبأ/١٤..

ڕاڤەکاران و خاوەنانی تەفسیر چەندین وتەو بیروڕایان دەربارەی تەفسیری ئەم دەقە قورئانی‌یە هەیە کە هەندێك بیروڕایان دوورە لەوەی عەقڵ پەسندی بکات. بەڵام ئەوەی کەشایانی باسە و لەعەقڵەوە نزیك بێت ئەم گێڕانەوەیەی مامۆستا (عبدالوهاب النجار)ـە، کەبەم شێوەیە ڕووداوەکەی لەچەند سەرچاوەیەکی پەیوەستەوە گێڕاوەتەوە:

("سولەیمان" کاتێك دەمرێت، (جن) پیّی نازانن، دوای ناشتن و بەخاك سپاردنی، کوڕەکەی خۆی کاروباری وڵات دەگرێتە دەست، لەو کاتەشدا (جن)ـەکان لەشوێنێکی دووری وەك (تەدمور) دەبن و سەرگەرمی کاری خۆیان دەبن و هیچ سستی یەك لەکارەکانیاندا ناکەن لەترسی ئەوەی نەبادا "سولەیمان" سزایان بدات.

بەڵام دوای ماوەیەك یەکێك لە (جن) بەمردنی "سولەیمان" دەزانێت چونکە دەبینێت ئەوا گۆچانەکەی لەسەر زەوی[1] کەوتووەو خێرا هەڵی دەگرێتەوەو سەیردەکات کرم لیّ ی خواردووە،

(١) هەڵگرتنی گۆچان لەو سەردەمانەدا بەنیشانەیەکی سەرۆکایەتی دانراوە. جا هەرکەسێك ( وەك

ئیدی بەهۆی کرمە ڕێزبوونی (کرم تێبوونی)ی گۆچانەکەیەوە ئەوە لێك دەداتەوە کەوا دیارە "سولەیمان" ماوەیەکی زۆرە ئەم گۆچانەی لێ کەوتۆتە سەرزەوی و، ئەمەش بەهۆی ڕووداوێکی تایبەتی یەوە بووە، یا بەهۆی مردنەوە یاخود لەبەر نەخۆشی یەك جێی هێشتووە.

ئینجا ئەو جنی یە بەدوای هۆی ڕووداوەکەدا دەچێت تا هەواڵی مردنی "سولەیمان" دەزانێت. بەمەش هەموو جنەکان بەیەقین و دڵنیایی یەوە ئەو ڕاستی یە حاشاهەڵنەگرەیان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەگەر ئەوان لە نادیار (غەیب)یان بزانیبایەو زانستی ڕووداوە نەبینراوەکانیان هەبوایە ئەوا لەو سزای بێ دەسەلاتیو بارودۆخی زەلیلی یەیان دا نەدەمانەوە). (واتە: سزای کاری سەخت و مانەوە لەو کارەدا لەماوەی مردنی سولەیماندا).

هەروەها دەربارەی ئەم ڕووداوەی مردنی "سولەیمان" گوتراوە:-

(ڕۆژێکیان "سولەیمان" لەمیحرابەکەی دا دەبێت و مردن یەخەی پێدەگرێت و ئەویش لەو کاتەدا شانی دابوو بەسەر گۆچانەکەی دا. پاشان کرم دێت و دەست دەکەن بەخواردنی گۆچانەکەو بەشێکی لێ دەخۆن و ئەو بەشە خوراوەش هەرەس دێنێت و هاوسەنگی یەکەی تێك دەدات و دەکەوێتە[1] سەر زەوی. ئەمەش دەلالەت لەسەرمردنی دەکات . ئینجا کەسوکاری دێن و هەڵی دەگرن و بەخاکی دەسپێرن.

بەڵام پێش ئەوە لەهۆی مردنەکەی دەکۆڵنەوەو دوای لێکۆڵینەوەکەیان بۆیان دەردەکەوێت کە ماوەیەکی (نەکورت و نەدرێژیشە) کۆچی دوایی ی کردووە. کاتێك ئەو (جنی)یانەی (لەکاروبارە قورسەکان دا بەکاردەهێنران) هەواڵی مردنی "سولەیمان" دەبیستن تێدەگەن کە ئەوان ئەگەر هەواڵی نادیارو (زانستی غەیب زانی)یان هەبوایە تا ئەو ماوەیەی نێوان (مردنی سولەیمان) و (زانینی ئەوان بەهەواڵەکە) لەو سزای تەسخیربوون و سووکایەتی پێکراوییەدا نەدەمانەوە)...

وەك لەمێژووی بەسەرهاتەکەشەوە ڕوون بۆتەوە "سولەیمان" کاتێك بۆ ناو میحرابەکەی خۆی بچوایەو خەڵوەتی تێدا بگرتایەو بەتەنها گۆشەگیری ی بۆ خواپەرستی بکێشایە، ئەوا کەس نەیدەتوانی بچێتە لای، مەگەر کەسێك خۆی ڕێ ی پێبدایە، وا دیارە کاتی مردنیشی لەمیحراب دا زۆری خایاندووە هەتا لەدوایی داو لەپاش ماوەیەك بەو حاڵی لەدنیا دەرچوونەیان زانیوەو بەخاکیان سپاردووە.

---

سولەیمان) پادشا بووبێت، هەمیشە گۆچانەکەی پێ بووەو قەت فڕێی نەداوە ئەگەر ساغ و تەندروست بووبێت.

(١)(دەکەوێتە سەر زەوی) ئەم ڕستەیە لەشیکاری ئایەتەکەدا بۆ مانای وشەی (خَرَّ)ی ناو ئەو ئایەتەیەو مانای (موت) واتە-مرنیش-دەگەیەنێت.

# بەندی پێنجەم

## ((چەند پەندو وانەیەك))

(وانەیەك لەسەر دادگەری - كاتە بەباش دانراوەكانی خواپەرستی - هەوڵدان بۆ دنیاو ئاخیرەت - لەخۆپرسینەوە - پیادەكردنی سیستمی ڕاوێژكاری - خۆڕاگرتنی عەقیدە لەئاست تەفرەدارێتیی ماڵ و سامان دا - وانەیەك دەربارەی لەخۆبوردوویی)

### وانەیەك لە سەر دادگەری

لەچیرۆكی "داود"دا دەرسێك لەسەر دادگەری هەیە، جگە لەدیاریكردنی ئەو چەمكانەی كەدەبێت دادگەرێتییان لەسەر پیادەبكرێت تاكو حاكم و دادوەر نەكەونە نێو زوڵم و ستەمەوە. ئەمەش لەو هاواری بەئاگاهێنانەوەی خودا بۆ"داود"دا دەردەكەوێت كەبەو پێغەمبەرەی خۆی دەفەرموێت: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾ص/٢٦.

لەم ئایەتەدا (وەك لەبەندی دووەمی ئەم بەشەی كتێبەكەدا ڕاڤەكرا) خودا پێغەمبەری خۆی (داود) ڕادەسپێرێت بەحوكم و دادوەری كردن لەنێوان خەڵكی دا بەڕێبازی(حەق). واتە بەو ڕێبازی دادگەرانەیەی، كە هەموو كاروبارێكی پێ ڕاست دەكرێتەوەو نەتەوەی باوەڕدارانیش ئیصلاح دەكات.

بەڵام ئەو هۆكارو فاكتەرانە چین، كە وا لەحاكم دەكەن لەڕێی هەق لابدات؟

بێگومان دیارترین هۆكاری ئەو لەهەق لادانە شوێنكەوتنی هەواو ئارەزووە، ئارەزووپەرستییش لەم خوونەرێتە نالەبارانەدا ڕەنگ دەداتەوە:

١) حەزكردن لە تۆڵە سەندنەوە لەناحەزی خۆی.
٢) خۆشویستنی دەسەڵاتداران و خزمان.
٣) زوڵم كردن لە بێهێزان و ڕكەبەرانی خۆی.

٤) تێرکردنی تەماع و ئارەزووەکانی خۆپەسندی و زیادکردنی ناوبانگ.

ئەم چوار نەریتەش دیارترین خاسیەتی هەندێك لەقازی و حاکمەکانە. هەر بۆیەش خودا دوای ڕاسپاردنی (داود) بەوەی، کە (بەرێبازی (هەق و دادگەری) حوکم لەنێوان خەڵکی دا بکات) پێی دەفەرموێت: (دوای هەواو ئارەزووی خۆت نەکەویت = ولا تتبع الهوى).

لەدواییشدا قورئانی پیرۆز ئاسەوارەکانی هەواو ئارەزووی دیاری کردووە و تیشکی خستۆتە سەر ئەو ئاکامەی کە مرۆڤ لەڕێی خودا لادەدات، ڕێی خوداش بەدی هێنەری بەختیاریو سەرکەوتنی گەورەیە لەدنیاو قیامەت دا.

هەروەها ئاسەوارێکی تری شوێنکەوتنی هەواو هەوەس، دەرچوونە لەو ڕێبازە ڕاستەی کە خودا نەخشەی بۆ کێشاوەو بەم پێیەش کەوتنەبەر سزای سەختی ڕۆژی دواییە.

ئەم ڕاسپاردەیەی خوداش بۆ (داود) جوانترینی ئەو ڕاسپاردانەیە کە قورئان دیاریی کردوون و، کە حاکم و قازی لە کەوتنە نێو هەڵەوە دەپارێزن و ناهێڵن حوکمی توندو ناعادیلانە دەرکەن لەو حوکمانەی کە سەرەنجامێکی نالەباریان بۆ سەر سیستمی دەوڵەت و ڕێزوشکۆی دادوەری (قضاء) هەیەو تەنانەت بونیادیشیان لە بناغەوە هەڵدەتەکێنێت.

## کاتە بەباش دانراوەکانی خواپەرستی

هەر لە چیرۆکەکەی "داود"ەوە چەند وەختێك دەسنیشان کراوە بۆ عیبادەت، هەروەك لە دەستەواژەی ئایەتە پیرۆزەکەوە دەفامرێتەوە: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ﴾ص/١٨.

لەم ئایەتەدا هەردوو وەختی (العشي و الأشراق) بەتایبەتی جیاکراونەتەوە بۆ تەسبیحات و زیکری خودا و نوێژ و بەخۆدا چوونەوە، کاتی (العشی) لە وەختی خۆر ئاوابوونەوە دەست پێ دەکات، تا بەرەبەیان و کاتی (اشراق) کەوەختی خۆرهەڵاتنە، واتە چێشتەنگاو(ضحی).

تەرخان کردنی ئەو دوو کاتە بۆ یادی خودا دەلالەتە لەسەر شکۆو گرنگی پێدانیان، بۆیە شایستەی دەسنیشان کردنیشن چونکە هۆیەکە بۆ سوور بوونی مرۆڤی باوەڕدار لەسەر عیبادەت و خواپەرستی لەو دوو وەختەدا.

دیارە چ (وەخت) و چ (شوێن)یش کارایی تەواویان لەچاکی و (فضل)ی ئەو عیبادەتەدا هەیە کە تیایاندا ئەنجام دەدرێت. چونکە لەکاتی ئاوابوونی خۆرو درێژبوونەوەی شەوگاردا دەروونەکانی خەڵکی پوخت و ساف دەبنەوەو بەوردی بۆ ئەو سروشتە دەڕوانن، کە چۆتە باوەشی هێمنی یەوەو ئەستێرەکانیش لەئاسمان دا بە تیشکە ڕۆشن کەرەوەکانیانەوە دەبینرێن،

هەموو ئەمانەش دڵۆ دەروون لەو کۆت و پێوەندانەی (ڕۆژگاری جەنجاڵ و پڕ لەزەحمەت و بارگرانیی کارکردن) ئازاد دەکات و وای لێ دەکات بە گورجی ڕوو بکاتە بارەگای پەوەردگاری بە تەسبیحات و شوکرانەبژێری و بەرزڕاگرتنی شکۆو گەورەیی ی خوداوە.

هەمیسان کاتی هەڵاتنی خۆر لەبەیانیان دا، کە سرووشت لەدرەوشاوەترین ڕواڵەتی دا دەردەکەوێت وتیشك و پڕشنگی خۆی بەهەموو لایەك دا دەڕژێنێت و هەموو گرۆی مرۆڤ و باڵندەو ئاژەڵی لێ بەهرەمەند دەبێت، هەموو ئەمانەش هەستێکی ڕۆحی لەدڵی مرۆڤ دا دەبزوێنێت و داوای زیکری خودای کردگار و پەرستن و بەرز ڕاگرتنی لێ دەکات.

## هەوڵ دان بۆ دنیاو ئاخیرەت

زۆر کەس لەخەڵکی وا تێدەگەن گوایە ناشێت مرۆڤ (شان بەشانی هەوڵدانی بۆ ڕۆژی دوایی) هەوڵ بۆ دنیاش بدات، چونکە دینداری (تدین) بەڕای ئەوان ڕوو لەدنیا وەرگێڕان و نەویستنیەتیەو، مانەوەی هەمیشەیی ی نێو مزگەوت و شوێنەکانی بەندایەتی یەو، ڕەت کردنەوەی بەش و(نصیب)ی دنیایە.

ئەم جۆرە وەهم و بۆچوونە ناڕاستانەش لەهەندێك کات و جێگەدا بەجۆرێك بڵاوبووەتەوە تا گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە (بانگەشەچیانی کفرو بێباوەڕی) ناشیرینترین (وەسف) بۆ (دین) دابنێن و بڵێن (ئاین ئەفیونی گەلانە)..

بەڵام مەتریالیستەکان نازانن کەئیسلام دنیاو ئاخیرەت پێکەوە دەبەستێتەوەو بەتەواوکاری یەکدییان دادەنێت. بەپێی ڕێساکانی ئیسلام مرۆڤ دەبێت بەشی پێویستی خۆی لە (دنیا) وەرگرێت و توێشوی تەواویش بۆ سەفەری ڕۆژی دوایی ی پاشەکەوت بکات. هەروەك لەم فەرمایشتەی خودادا ڕوون دەبێتەوە: ﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ ﴾.

هەروەها ئیسلام فەرمان دەکات بەدابین کردنی ئەو ئامڕازو کەرەسە پێویستانەی بنیاتنانی هێز وەك چەك و تفاقی جەنگی بۆ پاراستنی نیشتمان لەدوژمنان، ئەمەش هەر بەپێی فەرمان و فەرمایشتی خودا ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ ﴾.

ئەمەیە واتاو مەفهوومی (دین) لەدیدی ئیسلامدا و هەمان ڕاسپاردەی خوداشە بۆ "داود" دەربارەی چەك و تەقەمەنیەو، وەك ڕێنمونیەو فێرکاری یەك (بۆ ئێمەش): ﴿ أَنِ ٱعۡمَلۡ سَٰبِغَٰتٖ وَقَدِّرۡ فِي ٱلسَّرۡدِۖ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ ﴾. خودا لەم فەرمایشتەدا فەرمان بە"داود" دەکات کەقەڵغان دروست بکات. لەو سەردەمەش دا جەنگ و کوشتار بەتیرو ڕم و شمشێر بووە،

قەڵغانیش گرنگترین ئامراز بووە بۆبەرگری لەخۆکردن.

ئەمڕۆش لەم سەردەمەدا دوای داهێنانی چەکە کوشندەکان پەرە بەچەکی بەرگرییش دراوە، پێویستە دیندارانیش هەوڵی دروست کردن و بەکارهێنانی ئەو چەکانە بدەن و بەرگرییان لەخۆیان پێبکەن لەبەرامبەر ئەو چەکە پێشکەوتووە وێرانکارییەی دوژمنان دا.

پاشان بەوردی سەرنج بدە لە دوایین ڕاسپاردەی ئەو فەرمایشتە ﴿وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ﴾ کە چۆن خودا دوای ڕاسپاردنی "داود" بەدروست کردنی قەڵغان فەرمان بەخۆیو شوێنکەوتوانیشی دەکات پابەندبن بەکاری چاکەوە بۆ بەرژەوەندی ی دنیاو ئاخیرەتیان. چونکە دنیاو ئاخیرەت لەدیدو تێڕاونینی (دین)دا پێکەوە گرێدراون و یەکترییش تەواو دەکەن. بێگومان (هێزی سەربازی) نەتەوە لە دوژمنان دەپارێزێت و ناهێڵێت بکەوێتە ژێر چنگی داگیرکەران. (هێزی ڕۆحی)یش کە لەباوەڕهێنان و کاری چاکەدا ڕەنگ دەداتەوە ڕێنموونی ی نەتەوەی دیندار دەکات بۆ سەر چاکەخوازیو ناهێڵێت خراپەو بەرکردارییەیان تێدا بڵاوبێتەوە.

## لەخۆ پرسینەوە

هەروەها لەچیرۆکی "داود"دا وانەیەك دەربارەی لەخۆپرسینەوە هەیە لەسەر ئەو هەڵەو گوناە و خەیاڵە خراپانەش کە بەدڵی داهاتوون. هەروەك لەفەرمایشتەکەی خوداش دا بۆمان ڕوون بووەوە: ﴿وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ﴾. جا تۆ بڵێی مەبەست لە (فتناه) ئەوە بێت کە خودای مەزن تاقی ی کردبێتەوە یان گیرۆدەی فیتنە (واتە بەڵایەك)ی کردبێت؟ مانای هەموو ئەمانە لەئارادایە. بەڵام مەبەستی بنچینەیی لەفەرمایشتەکەی خودا ئەوەیە "داود" هەر کە گومانی کەوتنە نێو هەڵەی لەخۆی کردووە خێرا داوای لێخۆشبوونی لەخودا کردووەو گەڕاوەتەوە بۆ لای خودا.

ئەی داخۆ حاڵی ئەو دادوەرە چی بێت کە تەواو لێ ی ڕوونە بەهەڵەدا دەچێت یان لەهەق لادەدات؟ لەمەش دا وانەیەکی کاریگەر هەیە دەربارەی سوور بوون لەسەر لەخۆپرسینەوەو خۆ گرتنەوەو خۆنەویستی لەکاتی پەیدابوونی خەیاڵێکی نابەجێ لەهزردا، چونکە دەسبەرداریی دەروون و جڵەو بۆشل کردنی دەبێتە هۆی شێوان و تێك چوونی ئەو دەروونە.

جا ئەی مرۆڤی خاوەن باوەڕ هەر جارێك دەروونت داوای ئەنجامدانی کارێکی نابەجێی لێ کردیت یاخود خەیاڵی ئیرەیی پێ بردن یان ڕق وکینەیەك بەرامبەر مرۆڤێکی برات بەدڵ داهات ئەوا پێویستە پەیرەویی ی "داود"ی پێغەمبەری خودا بکەیت و خێرا داوای لێخۆشبوون لەخودا بکەیت و بەملکەچی و کڕنووش بۆ بردنەوە بگەڕێیتەوە بۆ لای و تۆبەی

لەلا بکەیت تاکو خوداش لێت خۆش بێت، چونکە خودا لەهەموو بیروخەیاڵێکیش دەپرسێتەوە، تەنانەت لەو خورپەو خەیاڵە پەنهانیو شارراوانەی نێو دڵیش دەپرسێتەوە کە مرۆڤ وا دەزانێت کەس لیّ یان ئاگادارنی یە: ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ﴾.

بێگومان ئەوەش شێوازێکی دانایانەیە لەشێوازەکانی قورئان بۆ چاکردنی دڵ و دەروون. دیارە کاری نابەجیّ و خەیاڵی خراپ گەر هەروا بیّچارەسەرکردن فەرامۆش بکرێن زیانێکی زۆر لەهەڵسوکەوتی مرۆڤ دەدەن و لەسەر ڕەفتارەکانیشی ڕەنگ دەدەنەوە.

لەم بارەیەوە (عوسمان-ی کوڕی-عەففان) (خودا لیّ ی ڕازی بێت) گووتویەتی: (هەر کەسێك نیازێکی نالەبار لەدڵی دا بشارێتەوەو بەتەمای بەدکاری یەك بێت، خودا پەردە لەسەر ڕووی هەڵدەماڵێت و بەزمانی خۆیشی پیّی ئاشکرا دەکات).

شاعیر (زهیر بن ابی سلمی)ش لەم ڕووەوە لەدێرە شیعرێکی دا دەڵێت:

**ومهما تكن عند إمريء من خليقه وإن خالها تخفى على الناس تعلم**

واتە: (مرۆڤ هەر سروشت ومیزاجێکی هەبێت و بەهەر جۆرە خەیاڵو خیلقەتێکیشی وا بزانێت لەخەڵکی پەنهانە ئەوا هەر دەزانرێت).

## پیادەکردنی سیستمی ڕاوێژکاریی

ئەگەر حاکمان و دادوەران تەنها پشت بەبیروڕای خۆیان ببەستن و ڕاوێژو پرس و ڕا لەگەڵ کاربەدەست و پەیوەندیداران و شارەزاو زانایان دا نەکەن ئەوا دوور نییە ئەم نەریتەیان ببێتە هۆی دەرکردنی چەند حوکمێکی وا کە کەم و کوڕییان تێدا بێت و زیانێکی زۆریش بەبەرژەوەندییەکانی گەل بگەیەنێت، مێژوو چەندین نموونەی لەم بارەوە لەخۆگرتووە. هەر دادوەرێکیش تەنها بەڕای خۆی حوکمی دابێت ئەوا بووەتە سەرچاوەیەك لەسەرچاوەکانی تێکدانی گەل.

شووراو ڕاوێژکردنیش سیستمێکی لەباری وایە کە هۆی بەدی هێنانی خێرو چاکسازی یە لە نێو گەلان دا، چونکە (بیروڕای بەکۆمەڵ) و (ڕای تێکرایی) ڕێك تر و ڕاستره لەبیروڕای تاکەکەس و، چەند عەقلێکی یەکگرتووش بەسوودترە لە تاکە عەقلێك.

قورئانی پیرۆز لەم ڕووەوە دەرسێکمان بۆ پیادەکردنی سیستمی ڕاوێژکاری پێشکەش دەکات، ئەویش کاتێك بەسەرهاتی شاژنەکەی "سەبەء"مان بۆ دەگێڕێتەوە بەتایبەتیش لەو ساتەوەختانەدا کە هەڕەشەکەی "سولەیمان"ی پیّ دەگات لەمەڕ هێرش بۆ سەر مەملەکەتەکەیان و، داخۆ چ هەڵوێستێکی بۆ وەبەرنێت؟ ئایا تەنها بەڕای خۆیەوە پابەندبووەو

داوای جێبەجێکردنی لێکردوون؟ نەخێر بەڵکو هەموو پیاوماقووڵان و ڕیش سپیانی گەلەکەی کۆکردۆتەوەو پێی گووتوون: (بەڕێزینە لەم بارەیەوە ڕاوێژێکم لەگەڵدا بکەن و فەرمانێکم بۆ دەسنیشان کەن، چونکە بەڕاستی من هەرگیز بەبیروڕای خۆم ڕەفتارم نەکردووەو بەبێ پرس و ڕاو ئامادەیی ئێوە بڕیارێکی سەربەخۆم نەداوە): ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ﴾، لەمەش دا چەق خراوەتە سەر ئەو پرنسیپی ڕاوێژکاری یەی کە ڕێساو دەستوورەکانی حوکم لەجیهانی پێشکەوتنخوازدا پەیڕەویی دەکەن. بەڵام چەند ناوێکی جۆراو جۆریان لێ ناوە وەك-ئەنجوومەنی نوێنەران-پەرلەمان-ئەنجوومەنی پیران، ئەنجوومەنی گەل و چەندەها ناوی دیکە..

ڕاوێژکردن کۆڵەکەیەکی پتەوە لەکۆڵەکەکانی حوکمی ڕاست و دروست و خێرو بێرێکی زۆر بۆ میللەت بەدەست دێنێت و لەهەمان کات دا بەدووریشی دەگرێت لەو زیانانەی کە زۆر جار بەهۆی هەواو ئارەزوو و تەماعکاریی چەند سەرکردەیەکەوە تووشی دەبن، لەو سەرکردانەی کە بەنیاز و ئامانجی شەخصی و تاکەکەسی ی خۆیان دەجوولێنەوە.

"پرانسیپی شوورا" شاژنەکەی "سەبەء"یشی پابەندکردبوو بەخۆیەوەو هەر ئەمەشە کە ئیسلام داوای پیادەکردنی کردووە و کردووشیەتی بە بنەمایەك لە بنەماکانی حوکمی ئیسلامی.. ئەوەتا هەر لەقورئان دا خودا ڕووی فەرمایشتی دەکاتە پێغەمبەرەکەی خۆی (محمدﷺ) و داوای ڕاوێژکاری و پرس و ڕای لەگەڵ هاوەڵانی دا لێ دەکات: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾. هەروەها لەجێیەکی تری قورئان دا خودای پەروەردگار ستایشی ئەو ئیماندارانە دەکات کە شووراو ڕاوێژکارییان کردۆتە ڕێسایەکی حوکم و دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾.

## خوڕاگرتنی عەقیدە لەئاست تەفرەدارێتی ماڵو سامان دا

خۆڕاگرتنی عەقیدە لەو وتەیەی سولەیمان دا دەردەکەوێت کاتێك نێرراوانی "بەلقیس" دیارییەکانی دەخەنە بەردەست و ئەویش بەو کەرەسە دەگمەن و بەنرخانە تەفرە ناخوات و پێیان دەڵێت: ﴿أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾، بەمانای ئەوەی کە خودا پێی بەخشیوم لە ڕەحمەتی زۆریو لەپلەو پایەی پێغەمبەرێتیو لەزانست گەلێك چاکترو باشترن لەو ماڵ وسامانەی کەئێوە بۆم دێنن. چونکە-ماڵو سامان-کەرەسەیەکی کاتییەو دیاردەیەکی دنیای بڕاوەیە.

مەبەستی "سولەیمان" لەمەدا بەگرنگتردانانی لایەنە ڕۆحی یەکانە لەلایەنە مادییەکان،

بۆ نمونە ئەو پێی نەگوتوون: (ئەوەی خودا پێی بەخشیوم زۆرترە لەوەی کە ئێوە بۆتان هێناوم) بەڵکو گوتوویە: (باشترە لەوە): ﴿خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾، بێگومان لەمەش دا مەبەستی لایەنە ڕۆحی‌یەکانیەتی، چونکە لەگۆشەنیگای باوەڕدارانەیەوە زۆر زۆر باشترو چاکترە لەلایەنە ماددی‌یەکانی، بێگومان لەسەرەتای ژیانی مرۆڤایەتی‌یەوە خەڵکی بە ماڵ و سامان تاقی کراونەوەو گیرۆدەی بوون، هەر ئەو ماڵ و سامانەش ڕێپیشاندەری هەموو ڕەفتارو هەڵس و کەوتێکیان بووە.

"بەلقیس"یش گومانی وابووە گوایە "سولەیمان" وەك هەر خەڵکێکی دی دەکەوێتە بەر کاریگەریی ماڵو سامان و بەوە تەفرە دەدرێت، هەر بۆیەش دیاری‌یەکی تایبەتی بۆ دەنێرێت تاکو لە ناخەوە هەڵیسەنگێنێت و پەردە لەسەر کەسێتی و ئامانجی بنچینەیی ی هەڵداتەوەو پاشان ئاسەواری ئەو تاقیکاری یە لەدەروونی دا بزانێت.. جا ئایا ئەو دیاری‌یە هۆکارێك بوو بۆ بێدەنگ بوونی "سولەیمان" و چاوپۆشی کردن لەبانگەواز بۆ ڕێی خوداو، وازهێنان لەو هێرشەی کە هەڕەشەی لەسەر پێدەکرد ؟!

نەخێر!! بەڵکو "بەلقیس" تەنها ئەم وەڵامەی لە"سولەیمان"ەوە پێ گەیشتەوە: ﴿فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾.. ئەمە وتەیەك بووە لەزاری "سولەیمان"ـەوەو، پاشان تاکو ببێتە دەستوورێك بۆ کەسانی دوای خۆی و بۆ ئەوەی هەر چاکەخوازێکی تری دوای خۆیشی بەدڵ و بەزمان بیلێتەوەو، گشت پێشەواو قازی‌یەکیش لەبەرامبەر شوێنکەوتوانی-باطل- و بەرتیل دەران دا خۆیانی پێ ڕاگرن و بێدەنگ نەبن لە بەد کاری و خراپەکانیان و سەربۆ ناهەقی و-باطل-یان نەلەقێنن.

ئەم وتەیەی "سولەیمان" بۆ جێگیرکردنی هەموو بەهایەکی بەرزو شکۆدارو، پابەندی بەهەقەوەو، ڕوو وەرچەرخان لە هەموو سیمایەکی تەفرەداری دنیایە، سا ئیتر سیمای بەزل دانان یان ماڵ و سامان یان پایەی بەرزوگران بێت..

دیاری‌یەکەی "بەلقیس"یش لەڕاستی و بنج و بناوان دا تەنها بەرتیلێك بووەو ویستوویەتی کارتێکردنێکی لەسەر "سولەیمان" پێ دروست کات تاکو وازیان لێ بێنێت و، لەسەر ئەو کوفرو گومڕایی‌و (خۆرپەرستی)یە لەمەملەکەتی خۆیان دا بمێننەوە. وەلێ "سولەیمان" سەرزەنشتیشیان دەکات لەسەر ئەو دیاری یە و ناخی ئەوان دەخوێنێتەوەو پێیان ڕادەگەیەنێت، کە (ئەوان خۆیان) بەم دیاری یەیان دڵخۆشن، (نەك سولەیمان): ﴿بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾.

"سولەیمان" بە ڕواڵەتەکانی ئەم دنیایەو شتە فریودەرەکانی تەفرە ناخوات و تەنانەت کاریشی تێناکەن، چونکە ئەو لەهەوڵی بەدی هێنانی حەقیقەتێکی هێندە گەورەو پیرۆزدایە، کە هیچ بەهایەکی (مەتریالی) هاوسەنگ و هاوتای نی یە.

## وانەیەك دەربارەی لەخۆبوردویی

لەم داستانەی "سولەیمان" لەگەڵ "بەلقیس"دا وانەیەكی ڕۆشنیش لەسەر (لەخۆبوردوویی) هەیەو سەرباری ئەو هەموو پلەو پایەو دەسەلاتەش تووشی خۆبەزل زانین نابێت و لەسەر ئەو زانستە زۆرانەش لەخۆیبایی نابێت..

ئەم نەریتەش لە وتەی -پەپو-ەكەدا دەردەكەوێت دوای ئەوەی ماوەیەك بزردەبێت و دەگەڕێتەوەو پێی دەڵێت: ﴿أَحَطتُ بِمَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ﴾...

بەودی سەرنج بدە لەو حاڵەتە و سەیركە "سولەیمان"ی پێغەمبەر كە خودای مەزن ئەو هەموو دانایی‌و زانستە زۆرو جۆر بەجۆرانەی پێداوە كەچی هەندێك هەواڵ كە -پەپو-ەكە زانیویەتی، ئەم لێ یان بێ ئاگابووە، ئەم باڵندە لاوازەی كە بەو وتەیە قسەی لەگەڵدا دەكات وەك بەربەرەكانی (تحدی) یەك وایە لەبەرامبەر "سولەیمان"داو مانایەكی زۆریش دەگەیەنێت لەبەرامبەر زانستی ئەودا، جگە لەوەش وانەیەكی گەورەی بۆ باوەڕدارانیش دیاری كردووە لەسەر ئەوەی كە هەرچەندە مرۆڤ بگاتە هەر ئاستێكی دیارو باڵا لەزانست و زانیاریدا، هەر دەبێت لە بێدەسەلاتترین مەخلووقاتی خوادا زانیاریەكی بالاتر لەهی خۆی بەدی بكات، سائیتر لەهەر جۆرە بوارێك لەبوارەكانی مەعریفەدا بێت.

بەلام ئەی داخۆ هەلویستی "سولەیمان" لەبەرامبەری -پەپو-ەكەدا چی بوو‌بێت؟ تۆ بلێی تووشی لەخۆیابی بوون بوو‌بێت و ئەو هەواڵەی -پەپو-ەكەی فەرامۆش كردبێت" ئەی ئایا (پایەبلندی و دەمارگیریی شاهانە) وەك ئەو سیفەتانەی كە -پادشاكان خۆیانی پێوە دەلەنگێنن- وای لە "سولەیمان" كرد كە لەسەر ئەو بەربەرەكانێیە سزای پەپو بدات؟

نەخێر.. بەلكو تاكە وەلامی "سولەیمان" لەكاتی بیستنی ئەو هەواڵەدا كە پەپو پێی دەگەیاند ئەوەبوو كە لەباری ڕاستی‌و دروستی قسەكانی دەكۆلنەوە تا بزانن وایە یان نا؟!: ﴿سَنَنظُرُ أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾. ئەمەش وتەیەكی ڕەوانە بۆ پەسندكردنی زانست لە پەپوەكەوەو بەدوادا چوونی ڕاستی یەكان. چونكە "سولەیمان" لەناخی خۆیەوە هەستی بەهیچ كەم و كووڕی‌و شوورەیی یەكی خۆی نەكردووە گەر بەچاكی گوێ بۆ دەنگ وباسەكەی ئەو باڵندە لاوازو بێدەسەلاتە بگرێت ئەگەرچی خۆیشی پێغەمبەرێك بێت و بڕێكی زۆریشی لەزانست و زانیاری پێ بەخشرابێت، هەروەك خوداش وەسفی عیلمەكەی"سولەیمان"و "داود"ی لەم فەرمایشتەی دا كردووەو فەرموویە: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ عِلۡمٗاۖ وَقَالَا ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٖ مِّنۡ عِبَادِهِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾...

ئەم ئایەتەش بەڵگەیە،کە لەسەر بایەخی زانست و گەورەیی و پایەبەرزیی ی زانستمەندان و زانیاران، هەروەك ئاگادارکردنەوەیە، کە بۆ زانایانیش تاکو سوپاسی زۆری خودای مەزن بکەن لەسەر ئەو زانست و حیکمەتەی، کە بە (فضل)ی خۆی پێی بەخشیون و، پەی بە گرنگی و بەهای بەرزی زانستیش بەرن و تێبگەن کەوا زانست لەئاستێکی باڵای وادایە، کە هیچ هاوتاو هاوێنەیەکی نی یە. لە بەشێکی تری ئایەتەکەدا باسی بە چاکتردانانی زانستمەندانی وەك"داود و سولەیمان" کراوە لەئاست زۆر کەس لەبەندەکانی تری خوادا و ئەم بەچاکتردانانە (تفضیل)ەش دیارە ئاماژەیە کە بۆ ئەوەی کەوا کەسانی تر لەخوار ئەوانەوە دانراون، ئەمەش هەر بەپێی پایەبلندی و بەهادارایی ی زانستەکەیە، بەم پێیەش سەرنجی زانایان بەلای ئەو ئاکارە جوانەی لەخۆبوردوویی دا ڕادەکێشێت و پێویستە ئەوپەڕی خۆبەکەم گرو لەخۆبڕاوبن چونکە هەر لەنێو عەبدەکانی تری خوداو مەخلوقاتی دیکەشی دا کەسای تر هەیە کە لەبواری زانست و زانیاری دا لەوان لەپێشتر و ئاگادارترن، وەك چۆن -پەپو- لەبوارێکی خۆیەوە ئاگادارتر بوو لە "سولەیمان" دەربارەی حاڵی ئەو گەلەی خۆریان دەپەرست.

# بەندی شەشەم

## (( پێغەمەرێتی ئیلیاس ))

گەلی ئیلیاس-یش لەنەوەکانی گەلی (بنو اسرائیل) بوون، واتە لەوانەی دوور کەوتوونەوە بۆ ئەو شارەی کە ئەمڕۆ بەناوی شاری (بەعلەبەك) ناسراوە، ئەم گەلەش بتێکیان بەناوی (بەعلا)[1] دەپەرست. خوداش پێغەمبەری خۆی (ئیلیاس)ی بۆ ناردن تا بانگیان بکات بۆ پەرستنی خودای تاك و بێهاوەڵ.

(ئیلیاس) پەیامی خودای بەگەلەکەی گەیاندو پێی گوتن: (ئەرێ بۆچی خۆتان لەسزای خوداو لەڕق و تووڕەیی ی ناپارێزن و پەیڕەویی-فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە- ناکەن؟ ئایا (بەعلا)ی-بت-دەپەرستن و واز لە پەرستنی ئەو خودا پەروەردگارەتان دێنن، کە هەموو جیهانی بەجوانترین شێوە دروست کردووە؟ تاکە خودای شایانی پەرستن هەر (الله)یەو، پەروەردگاری خۆتان و باب و باپیرە پێشینەکانیشتانە: ﴿رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمْ الأَوَّلِينَ﴾.

بەڵام ئەو گەلە بانگەوازی پێغەمبەرەکەیان بەدرۆخستەوەو بەدەمیەوە نەچوون. سزای ئەو کارەشیان ئەوەیە کە خودا لەدنیاو ئاخیرەتیش دا خستوونیە بەر خەشم و قینی خۆی بەهۆی بەدرۆدانانی بانگەزوازی پێغەمبەرکەیانەوەو تەنها ئەو بەندە چاك و دڵسۆزانەی لێجیاکردوونەوە کە بەڕاستی باوەڕیان پی هێنابوو و نەچووبوونە ڕیزی یاخی و بتپەرستانەوە.

بێگومان خودا بەرێزێکی زۆرەوە باسی (ئیلیاس)ی کردووە و لەسەرزاری ئەوانەی دوای خۆی هاتوون ستایشی هەوڵ و تەقەللای کردووە چونکە لە باوەڕدارە دڵسۆزو چالاك و ڕەوشتبەرزەکان بووە، خودای مەزن لەم ئایەتانەدا هەر هێندە باسی ژیان و پەیام و بانگەوازی ئەم پێغەمبەرەی کردووە و فەرمووویە:

﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴿١٢٥﴾ اللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ [2]

---

(١) دەربارەی ئەوەی کە گوترابێت: (ئیلیاس لەشاری -بەعلەبەك-دا بووە بەپێغەمبەر) بەوتەیکی ڕاست و ساغکراوە دانانرێت. هەروەك گوتراویشە: ( بەعلا-ناوی ئافرەتێك بووە کە لەجیاتی خودا دەیانپەرست).

(٢)لمحضرون: واتە بۆ سزا ئامادەدەکرێت چ لەدنیاو چ لە ڕۆژی دواییش دا.

﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ (١) ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الصافات/١٢٣-١٣٢.

## (( پێغەمبەرێتی ی ئەلیەسەع ))

(ئەلیەسەع)یش لەپێغەمبەرانی (بنو اسرائیل) بووە و قورئانی پیرۆز هیچ شتێکی وای لەسەر ژیانی باس نەکردووە تەنها ئەوەندە نەبێت کە ناوی لەگەڵ کۆمەڵێك پێغەمبەری تردا هێناوە، واتە لەو پێغەمبەرانەی کە دەبێت باوەڕیان پێبهێنرێت-هەروەك لەدوو شوێنی وەك ئایەتی ژمارە (٤٨)ی سوورەتی (ص)و ئایەتی ژمارە (٨٦)ی سوورەتی (الأنعام) لەگەڵ چەند پێغەمبەرێکی تردا ناوی هاتووە:

﴿ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴾ص/٤٨.

﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾الأنعام/٨٦.

گوتراوە ئەم پێغەمبەرە ئامۆزای (ئیلیاس) بووەو دوای کۆچی دوایی ی (ئیلیاس) بانگەوازی بۆ ڕێی خودا کردووەو داوای خواپەرستی ی لەخەڵکی کردووە لەسەر ئەو بەرنامەو شەریعەتەی، کە (ئیلیاس) پێی سپێررابوو، لەسەردەمی ئەودا تاوان و گوناهکارییش زۆربووە.

بەم ڕەنگە دەبینین قورئان بەشێکی کەمی لەبەسەرهاتی -ئیلیاس- دیاری کردووەو ئاماژەیەکیشی بەپێغەمبەرێتی ی "ئەلیەسەع" داوە، لەکاتێکدا کتێبەکانی مێژوو بەشێکی زۆریان لەبەسەرهاتی -ئیلیاس- بەشێوازی دەسهەڵبەستی جوولەکەکان باس کردووەو پڕن لەئەفسانەی (ئیسرائیلیات).

بەڵام لەم بارەیەوە مامۆستا (طبري) ڕیوایەتێکی بەسەرهاتەکەی دیاری کردووەو ئێمەش لەنێو چەندەها ڕیوایات و گێڕانەوەی تردا کورتەی شێوە گێڕانەوەکەی ئەو (واتە: طبری) هەڵدەبژێرین، ئەمەش نەك بەو پێودانگەی، کە حەقیقەتێکی پوخت وبێگرێ و گۆڵ بێت، بەڵکو تەنها لەکلاو ڕۆژنەی ئاگاداربوونەوە دەیخەینە ڕوو:

-ئیلیاس- "سڵاوی خوای لێ بێت" کاتێك داوای لە (بنو اسرائیل) کرد کە واز لە بتپەرستی بێنن و پابەندی باوەڕو خواپەرستی بن، بەڵام ئەوان بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون و

---

(١) الیاسین: کۆ (جمع)ی (ئیلیاس)ـەو مەبەست لە (ئیلیاسین)یش ئەو کۆمەڵە باوەڕدارە دڵسۆزانەیە، کە لەگەڵ (ئیلیاس) دابوون، هەر بۆیەش بە کۆ (جمع) ناوی ( ئیلیاسین= واتە ئیلیاسەکان)یان بۆ دانراوە، چ بۆ (ئیلیاس) خۆی و، چ بۆ شوێنکەوتوانیشی.

وەڵامێکی داواکاری یەکەیان نەدایەوە، -ئیلیاس-یش دووعاو نزای لەلای خودا کردو گوتی: (خودایە ئەوا (بنو اسرائیل) بەرپەرچی بانگەوازەکەیان دایەوەو تەنها ڕێگای باوەڕنەهێنان بەتۆو پەرستنی غەیری تۆیان هەڵبژارد. جاتۆش ئەی خودای گەورە و باڵادەست ئەو نیعمەتانەی پێت بەخشیون و ئەو بارودۆخی خۆشگوزەرانیەی بۆت دابین کردوون بیگۆڕە بەبارێکی تردا)..

خوداش سرووشی پێداو وەڵامی وابوو کە: (ئێمە لەمەولا کاروباری ڕزق و ڕۆزییان دەدەینە دەست تۆ و، خۆیشت سەربەست بە کە چۆن لەوەدا فەرمانیان دەدەیت).

-ئیلیاس-یش گوتی: (دەی خوایە بارانیان لێ بگرەوە و ئیتر هیچیان بۆ مەبارێنە). خوداش بۆ ماوەی سێ ساڵ بارانیان لێ دەگرێتەوەو بەهۆی ئەمەشەوە هەرچی ئاژەڵو کشتوکاڵێکیان هەبوو لەناو دەچێت و خەڵکیش دەکەونە نێو زەحمەت و نارەحەتی یەکی زۆرەوە.

-ئیلیاس- دوای ئەوەی دووعای لێ کردبوون، لەبەر چاویان وون بوو بوو و لەهەرجێیەکیش بوایە ڕزق و ڕۆزیی ی خۆی بۆ دەهات... تەنانەت لەم ڕووەوە کار گەیشتبووە رادەیەك لەهەر ماڵێك بۆنی (نان)یان بکردایە دەیانگوت: (ئیلیاس-لێرەیە) و بەدوایدا دەگەڕان و خراپەیان دەرهەق خاوەن ماڵەکان دەکرد.

جارێکیان -ئیلیاس- ڕوو دەکاتە ماڵی ژنێك کە کوڕێکی هەبوو بەناوی (ئەلیەسەع-ی کوڕی -ئوخطوب) و ئەم کوڕەش نەخۆشییەکی هەبوو، -ئیلیاس- دووعای خێرو چاك بوونەوەی لەلای خودا بۆ دەکات و کوڕەکەش چاك دەبێتەوەو ئەو نەخۆشی یەی تێدا نامێنێت، بەم هۆیەشەوە باوەڕ بە -ئیلیاس-و پەیامەکەی دێنێت و پەیڕەوی دەکات و پابەند دەبێت پێوەی، بۆ هەر شوێنێکیش بچێت لەگەڵی دا دەبێت.

-ئیلیاس- دەکەوێتە تەمەنەوەو پیردەبێت، بەڵام (ئەلیەسەع) هێشتا گەنجەو لەهەرەتی لاوێتی دا دەبێت، ڕۆژێکیان -ئیلیاس- بەگەلی (بنو اسرائیل) دەڵێت: (ئەگەر وازتان لە بتپەرستی هێنا ئەوا منیش لەخودا دەپاڕێمەوە، کە بارودۆخی ژیان و گوزەرانتان خۆش کات و لەو تەنگانەیە ڕزگارتان کات)...

ئەوانیش هەموو بت و پەیکەرو پەرستراوە داتاشراوەکانیان فڕێ دەدەن و لەناویان دەبەن، ئینجا -ئیلیاس- بۆیان دەپاڕێتەوەو داوای خۆشگوزەرانییان لەخودا بۆ دەکات. خوداش تەنگانەیان لەسەر هەڵدەگرێت و بەهانایانەوە دێت و بارانیان بۆ دەبارێنێت.

بەم ڕەنگە ولآتیان دەبووژێتەوەو دەکەونەوە نێو خێرو خۆشی. بەڵام بە تەواوەتی پاشگەز نەبوونەوە لەو حاڵەتی بێباوەڕی یەی تێی دابوون و لەسەر باوەڕی ڕاست و پەیڕەوکردنی شەریعەتی خودا جێگیر نەبووبوون، -ئیلیاس-یش، کە ئەو نەریتە نالەبارەی لێ بینین لەخودا پاڕایەوە، کە ڕۆحی بکێشێت و بیباتەوە بۆ لای خۆی تاکو قوتاربێت لەدەستیان و چی دی بەدەستیانەوە نەتلێتەوە. خوداش ئەو دووعایەی گیراکردو ڕۆحی کێشاو بەرزی کردەوەو بۆ لای خۆی.

بەڵام دوای ئەو (ئەلیەسەع)ی بۆ ڕەوانە کردن وەك پێغەمبەرێك تاکو لەسەر بانگەوازەکەی بەردەوام بێت.

# بەندی حەوتەم

## (( چیرۆکی یونــس ))

( "یونــس" بانگەواز بۆ خودا دەکات - "یونــس" لەسکی نەهەنگ دا- چارەنووسی گەلەکەی "یونــس" - ڕزگاربوونی "یونــس" و ڕێنمونی کردنەوەی گەلەکەی. )

### "یونــس" بانگەواز بۆ خودا دەکات

" نەینەوا" لەخاکی-مووسڵ-دا پایتەختی دەوڵەتی (ئاشووری) بوو، واتە ئـەو دەوڵەتـەی دەسەلاتی بەسەر زۆربەی وڵاتانی کیشوەری"ئاسیا"دا هەبوو، پایتەختەکەشی دەوڵەمەندترین و گەورەترین شاری خۆرهەڵات بوو لەو سەردەمەدا.

زۆریی ی ڕزق و ڕۆزی و، دەوڵەمەندیی ی زیـاد لـەڕادەو بـێ سنووریـشیان ببوونـە هـۆی گومڕابوون و لـەخۆبایی بـوون و بـەدکاری و گوناهکارییـان... سـەرباری ئەمانـەش خـەڵکی (نەینەوا) بتپەرست بوون و باوەڕیان بە خودای مەزن نەدەهێنا. هەر بۆیـەش شایـستەی سـزای لەناوچوون دەبوون گەر خودای میهرەبان بەڕەحمەت و سۆزی خۆی فریایان نەکەوتایـە، بـۆ ئـەم مەبەستەش خودا "یونــس"[1]یان بۆ ڕەوانە دەکات، "یونــس"یـش (سـڵاوی خـوای لێ بێـت) بانگیـان دەکـات بـۆ ســەرئیمان و باوەڕهێنـان بـەخودا و تەوبـەکردن و پەشـیمان بوونـەوە لەبەدکرداری یەکانیان. بەڵام ئەوان هەر ڕژد دەبن لەسەر ئەو حاڵەتی بتپەرستی و گـومڕایی و بەدڕەفتاری یانـەیان و بـەدەم بانگەوازەکەیـەوە ناچـن. ئینجـا "یونـــس" هەڕەشـەی هاتنـە خوارەوەی سزا بۆ سەریان لێ دەکات، کە دوای ماوەیەك دەکەونە بەر ئەوسزایە.

"یونــس" لەو بڕوایەدا بوو کە ئیدی بەتەواوەتی پەیامی خودای گەیاندووەو ئەو ئەرکەی، کە خودا پێ ی سپاردبوو بەجێ ی گەیاندووە. بۆیە بەدڵتەنگی لەو شارەیان دەردەچێت و بەهۆی (یاخی بوون و سووربوونیان لەسەر بێ باوەڕی)یەوە بەجێیاندێڵێت...

---

(١) "یونــس"کوڕی (مەتتی) یە، گوتراوە( مەتتی) ناوی باوکیەتی، گوتراویشە ناوی دایکیەتی، هەنـدێك لە(أهل الكتاب)یش بە ( یۆنان-ی کوڕی ئەمتای) ناودەبەن.

"یونــس" پێی وابوو کە ئەگەر ئەم شارە بەبێ مۆڵەتێکی خودا جێبێڵێت ئەوا خودا لێی ناپرسێتەوەو سزای لەسەر نادات، بۆیە هەر دەڕۆشت و ڕێگەی دەبڕی تا گەیشتە سـەر کـەناری دەریاو لەوێ پاپۆڕێکی بینی کەئامادەی سەفەربوو و خەریك بوو دەردەچوو، ئەویش خێـرا داوا لەسەرنشینانی دەکات جێگەیەکی بۆ بکەنەوەو لەگـەڵ خۆیـان دا ببیـەن، ئـەوانیش داواکـەی جێبەجێ دەکەن و لەگەڵ خۆیان دا دەیبەن.

## "یونــس" لەسکی نەهەنگ دا

پاپۆڕەکـە دەسـتی بـە ڕۆیـشتن کـرد و چـووە ناوەڕاسـتی دەریـاوە، لـەو کاتـە دا خـودا گەردەلوولێکی بەهێزی لەسەر دەریا هەڵکرد و وای لێکرد شەپۆلەکانی بەتوندی بلـەرزێنێت و مەترسی ی سەرنگووم بوون بخولقێنێت، کەشتی یەوانەکانیش لەگـەڵ هـەموو سەرنـشینەکانی تردا زۆرترسان و گوتیان: (بەڕاستی کەسێکی گوناهبارمـان لەگەڵدایـە، بۆیـە وامـان بەسـەر دێت). ئینجا لەنێو خۆیان دا ڕاوێژیان کرد لەسەر ئەوەی یەکێکیان لەپاپۆڕەکەوە هەڵدەنە نـاو دەریا تاکو خۆیانی پێ بپارێزن، بۆ ئەم مەبەسـتەش بەشـێوازی تیروپـشك (قورعـە ڕاکێـشان) کەسێکیان هەڵدەدایە ناو دەریاوە، ئەوەبوو لەئەنجامی ئـەو تیروپـشکەدا دەبوایـە پێغەمبـەری خودا "یونـس" بخەنە دەریاکەوە، "یونــس"یـش باسـی بەسـەرهاتی خـۆی بـۆ گێڕابوونـەوە، ئەوانیش گوتیان: (ئەم کابرایە پیاوچاکێکەو هەرگیز مـاقووڵ نـی یـە، کـە گوناهبـار بێـت و بەهۆی ئەوەوە تووشی ئەم گەردەلوولە بووبین، تیروپشکەکەش بە ڕێکەوت بەر ئـەو کـەوتووە). لەبەر ئەوە جارێکی تریش تیروپشکیان کردەوەو دووبارە هەر کەوتەوە سەر "یونــس".

ئیتر "یونــس"یش خۆی ئامادەکرد بۆ داکەندنی جلەکانی و خۆهەڵدانە نێو دەریاوە، بـەڵام ئەوان پێیان خۆش نەبوو خۆی فڕێدات. هەر بۆیەش بۆ جاری سێیەم تیروپشکیان ڕاکێشاو ئەم جارەش هـەر کەوتـە سـەر "یونـــس"، دیـارە ئـەوە بەخواسـت و ئـیرادەی خـودا بـووەو بـۆ مەبەستێکی گەورە بووە، دواجار هەڵدرایە ناو دەریاکەوەو، لەو ساتەدا خودا نەهـەنگێکی بـۆ ناردو "یونــس"ی قووت دا.

خودا لەقورئان دا باسی ئەم بەسەرهاتەی "یونــس"ی گێڕاوەتەوەو فەرمووییە:

﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ (١) إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ (١) ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ (٢) فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ (٣) ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ (٤) ﴾الصافات/١٣٩-١٤٢.

---

(١) أبق: واتە (هەڵات.. ڕای کرد) مانای بنەڕەتیی (أبق) ئەو جۆرە ڕاکردنەیە کـە کەسـێك بـۆ قوتـاربون

## چارەنووسی گەلەکەی "یونــس"

کاتێك "یونــس" گەلەکەی خۆی بەجێهێشت، ئەوانیش لێ یــان ڕوون بــوو، کـە گـیرۆدەی سزایەك دەبن و نیشانەکانی دەرکەوتبوون، خـوداش نیـازی تەوبـەکردنی خـستە دڵیانـەوە تـا بگەڕێنەوە لەگوناهان. ئەوانیش لەو کردارانەی پێـشوویان پەشـیمان بوونـەوە و بـەرگی پـاکی باوەڕو شکۆدارییان پۆشی و لەخودا پاڕانـەوە لێ یـان خـۆش بێـت. هـەروەها پیـاوان ژنـان و ڕۆڵەکانیان تێکڕا دەگریان و مافی خوراوی هەموو کەسێکیان دەگەیاندەوەو ئاسـەواری زوڵـم و ستەمی یەکتریان دەسڕییەوە، ئەمەش بەڕاستی بـارودۆخێکی بـێ وێنـەو بەسـام و گـەورەبوو کەبەسەریان داهات و وای لێ هات خوداش بەڕەحمەت و بەزەیی خۆی سزای لەسەر هەڵگرتن.

هەروەك دەربارەیان فەرموویە: ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَـٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ یونس/٩٨.

بەمانای دانیشتوانی هەر ئـاوایی و شـارو شارۆچـکەیەك باوەڕیـان بـەخوداو ڕۆژی دوایـی هێنابێت ئەوا باوەڕهێنانەکەیان سوودمەند بووە بۆیـان، بـەڵام هـیچ گـەلێك وەکـو گەلەکـەی "یونــس" باوەڕیان نەهێناوە کـە هـەر دوای باوەڕهێنانیـان خـوداش سـزای ژێـر دەسـتەیی و سەرگەردانی ی ژیانی دنیای لەسەر لابردوون و نازو نیعمەتی ژیانیشی تاکۆتایی تەمەنیان پـێ بەخشیون.

## ڕزگاربوونی "یونــس" و ڕێنموونیکردنەوەی گەلەکەی

کاتێك نەهەنگەکە "یونـــس"ی قـووت دا، خـودا ئیلـهامی بـەو گیانـدارە دا کـە هـیچ ئازارێکی "یونــس" نەدات، "یونــس"یش لە بۆشایی سکی نەهەنگەکەدا تەخت بوو و وایـشی زانی ئیتر دەمرێت. بەڵام وردە وردە هەر چوارپەلی کەوتەوە جموجووڵ و ئینجا بـۆی دەرکـەوت

---

لەدەست ئاغایەکی یان لەدەست کۆیلایەتی هەڵبێت.. بۆیە بە "یونــس" گوتراوە (أبق) چونکە بەبێ فـەرمانی خودا دەرچووە یان لەدەست بەندایەتی(عبودیە) هەڵاتووە. ، بەڵام بەندایەتیی هەر بۆ خودا بووە و بەندایەتیی ڕاستەقینەش ئەوەیە مرۆڤی خواپەرست واز لەهەر جۆرە حەزو ئارەزوویەکی بێنێت و خۆی بۆ خودا و خزمەتی ڕێبازەکەی تەرخان بکات.

(١) الفلك المشحون: واتە پاپۆری پڕ لەبار.. یان پڕ لە خەڵك.

(٢) ساهم: واتە تیروپشکی کرد. بەشدایی قورعەڕاکێشانی کرد.

(٣) المدحضین: واتە لەوانەبوو کە تیروپشکیان بەسەردا دەشکێتەوە.

(٤) ملیم: واتە ئەو کردارە ناهەموارە دەکات کە هۆی گلەیی و گازاندەیەو ڕووبەڕووی ڕەخنە دەبێتەوە.

کەوا هێشتا زیندووەو، خێرا کڕنووشی بۆ خودا بردو لێ ی پاڕایەوەو گوتی: (خودایە پەرستگەیەکی وات بۆ وەبەردەنێم، کە بێوێنە بێت و هیچ کەسێکی دی ئاوا نەیپەرستبیت).

پاشان تاچەند ڕۆژێك لەسکی نەهەنگەکەدا مایەوەو بەردەوام هەموو ئان وساتێك لەزیکرو یادو بەپاك و پیرۆز ڕاگرتنی خودا (تەسبیحات) دابوو و لەسوژدەگای خۆی دا دەیپەرست.

دوای ئەمە نزای لای پەروەردگاری کرد و دانی کزۆلی و بەندایەتی ی بەپەروەردگاریتی ی خودای خۆی دا نایەوەو دانی بەوەش دانا کە ستەمکار بووە لەکاری بەجێهێشتنی گەلەکەی دا بەبێ مۆڵەت دانی خودا.

خوداش نزای گیراکردو تەوبەو پەشیمان بوونەوەی لێ پەسند کرد و سرووشی بە نەهەنگەکەش دا، کە "یونس" فڕێ داتە دەرەوەو لەسەر زەوییەکی وشك و چۆڵەوانی دایبنێت.

"یونس" کاتێك لەسکی نەهەنگەکە هاتە دەرەوە نەخۆش و دەردەدار و ماندوو بوو، خوداش درەختێکی چرو پڕ گەڵای وەك کولەکە(یقطین)ی بۆ ڕواند، واتە لەو گەڵایانەی، کە زۆر پان و درێژن وەك گەڵای کاڵەك و ئەو ڕووەکانەی لەسەر زەوی بەرزنابنەوە، دارێکی بەم جۆرە گەڵایانەوە بۆ دەستەبەر کرد، کە سێبەرێکیشی بۆ خۆپاراستن لەگەرمای خۆر بۆ ڕەخساندبوو.

لەم حاڵەدا ماوەیەك مایەوە تاکو چاك بووەوە و ترس و ئازاری نەماو دەروونی هێمن بووەوە، ئینجا خودا فەرمانی پێ کرد بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو گەلەی خۆی، کە بەجێ ی هێشتبوون و ژمارەیان پتر لەسەد هەزار کەس دەبوو، ئەویش گەڕایەوە بۆ لایان و بانگی کردنەوە بۆ سەر ڕێگەی ئیمان و خواناسی و پەیامی خودای پێ گەیاندن، ئەوانیش ڕێ ی هیدایەت و خوناسییان گرتەبەر، ئیدی خودا ئەو گەلەی خستە ژیانێکی بەختەوەرو ئاسوودەوە، تا لەژیان دابوون.

هەروەك فەرموویەتی: ﴿فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ [1] ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ [2] ﴿١٤٤﴾ فَنَبَذْنَـٰهُ [3] بِٱلْعَرَآءِ [4] وَهُوَ سَقِيمٌ [5] ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَـٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ الصافات/١٤٣-١٤٨.

---

(١) من المسبحين: واتە لەنوێژخوێنان.

(٢)يوم يبعثون: واتە ڕۆژی دوایی.

(٣) فنبذناه: واتە هێنامانە دەرەوە، هەڵمان دایە دەرەوە.

(٤) العراء: واتە چۆڵەوانی.. بیابان.. . دەشت و سارا.

(٥) سقیم: واتە نەخۆشی.

هەروەها خودا لەبارەیانەوە فەرمووویە: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ[١] إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا[٢] فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ[٣] فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ[٤] أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَـٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾الأنبياء/ ٨٧-٨٨.

---

(١) ذا النون: یان (ذوالنون) واتە نازناوەکەی"یونس" وشەی (نون)یش واتە (نەهەنگ) بۆیەش بە (ذا النون) ناوبراوە چونکە نەهەنگەکە قووتی داوەو بەسەرهاتەکەی لەگەڵ ئەودا بووە.

(٢) مغاضبا: واتە لەپێناوی خوادا زویر ببوو لێیان. بێگومان مرۆڤی باوەڕدار تەنها لەپێناوی خوادا تووڕەو زویر دەبێت لەخەڵکی یاخی و بێباوەڕ.

(٣) لن نقدر علیە: گوتراوە مانای ئەوەیە گوایە("ئیبلیس" لەخشتەی بردووەو ئەوەی خستۆتە دڵی"یونس"ەوە کە هەرگیز ناتوانرێت سزایەکی بدرێت و لەتوانای ئێمەدا نی یە) ئەمەش وتەیەکی ناپەسند و ناماقووڵەو دوورە لە هزری پاك و نەریتی بەرزی پێغەمبەران، چونکە هەر وتنی ئەم قسەیە کفرو بێ باوەڕی یەکە، بەڵام زۆربەی زانایان لە بارەی مانای ئەم فەرمایشتەوە (لن نقدر علیە) گوتوویانە: ( واتە یونس گومانی وابووە کە ئێمە تووشی بارگرانی و سزایەکی تەنگانەی ناکەین، گوتراویشە: ( مەبەست لەڕستەی (لن نقدر) ئەو قودرەت و توانایە و ئەو قەدەرەشە کە دادوەریو قەزاوەتی پێ ئەنجام دەدرێت). واتە: ("یونس" لەو بڕوایە دابوو، کە ئێمە بەسزایەك حوکمی نادەین و داگایی ی ناکەین).

(٤) الظلمات: واتە: "تاریکایی یەکان": (تاریکایی شەو-تاریکایی نێو سکی نەهەنگەکە-تاریکایی دەریا).

# بەندی هەشتەم

## (( چەند پەندو وانەیەك لە "یونـس"ـەوە ))

( (خواپەرستی) مرۆڤ لە تەنگانە ڕزگار دەكات - پەنابردنە بەرخودا لەكاتی تەنگانەدا - ئارام گرتن لەكاری بانگەوازدا. )

### ( خواپەرستی ) مرۆڤ لە تەنگانە ڕزگار دەكات

یەكێك لەو وانەو دەرسانەی لەچیرۆكی"یونـس" دا هەیە ئەوەیە (بەندایەتی و خواپەرستی) لەبارودۆخی شێنەیی و هێمنـی دا ئـامرازێكی گرنگـی ڕزگاربوونـە لـە(بـارودۆخی تەنگانـەو نارەحەتی)دا.

خودای مەزن لەم بەسەرهاتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتـەوە، كـە "یونـــس" پـێش ئـەوەی نەهەنگ قووتی بدات وتووشی ئەو تەنگانەیە ببێت، هەمیشە هەر لەیادی خوداو تەسبیحات و عیبادەت دابووە، خـودا لەبارەیـەوە فەرموویـە: ﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، لەم فەرمایشتەدا وشەی (من المسبحين) مانای (مـن المـصلين= واتـە لەنوێژ خوێنان و كەسانی دەم بەزیكرو دووعا) دەگەیەنێت، چونكە "یونـس" لەكاتی خۆشی و ئارامی دا نوێژی زۆری دەكردو هەردەم ڕووی لەقاپی بارەگای خوابووە، خوداش لەو تەنگانەیـە ڕزگاری دەكات.

لـەم بارەیـــەوە فەرموودەیـــەكی بـــەناوبانگی پێغەمبـــەریش (محمـــدﷺ) هەیـــەو لـــە (ابـــن عباس)ـەوەو گێڕراوەتەوە كە پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری ی ئەوی (واتە-ابن عبـاس)ی كـردووەو فەرموویە: ((**إني معلمك كلمات: احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، تعرف الى الله في الرخاء يعرفك في الشدة**)). واتە: (من چەند وشەیەكت فێردەكەم و بەپەیڕەوی كردنیان ڕات دەسپێرم:-مافی خودا بپارێزە خوداش دەت پارێزێ... مافی خودا بپارێزە و لەهەموو وەختێكا بیپەرستە(خودا لەپشتیوانی ی خۆت دا دەبینیت)... خودا لەكاتی شێنەیی دا بناسـەو بـەرزو پیرۆزی ڕاگرە خوداش لەكاتی تەنگانەو باگرانیتدا دەتناسێت و ئاگای لێتەو بەهاناتەوە دێت).

بەڵام بێگومان لەبیرکردنی خودا لەحاڵەتی خێرو خۆشی و پڕ لەنازو نیعمەت دا و ڕوو وەرگێران لەڕێگا ڕاستەکەی، دەبێتە هۆی زویرکردنی خوداو بەتەنگەوە نەهاتنی لەحاڵەتی تەنگژەو نائارامی دا...

وەك لە بەسەرهاتەکەی (موساو فیرعەون)یش دا قورئان ئاماژەی بەو ڕاستی یە داوە، کە فیرعەون لەکاتی ئاسایش و ئارامی ی دا ستەمکارێکی بێوێنەو بێباوەڕ بووەو بەو هەموو خێرو خۆشی و نیعمەتانەی خودای نەزانیوەو کاتێك دەکەوێتە دەریاکەوەو تووشی چارەڕەشی ی خۆی دەبێت و خەریکە سەرنگووم دەبێت، خێرا خودای بیردەکەوێتەوەو باوەڕی پێ دەهێنێت، هەروەك خودای مەزن لەسەر زاری فیرعەون (خۆیەوە) قسەکانی هێناوەو باسەکەی گێڕاوەتەوە: ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾، ئەی تۆ بڵێی ئەو باوەڕەی لێ وەرگیرابێت؟ نەخێر... بەڵکو پێ ی ڕادەگەیەنرێت، کە ئەو جۆرە باوەڕە پەسند نییە و تۆ لەوەو پێش لەکاتی خێرو خۆشی و کەیف و سەفات دا هەر یاخی و گێرەشێوێن بوویت، ئیدی چۆن دەتوانیت خودا تەفرە بدەیت؟!: ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾.

## پەنابردنە بەرخودا لەکاتی تەنگانەدا

هەروەها لەم بەسەرهاتەی "یونس"دا وانەیەکی تر بۆ ئینسانی باوەڕدار بەدی دەکرێت دەربارەی پەنابردنە بەر خوداو دووعاو پاڕانەوەو لەحاڵەتی تەنگانەو خەم و بارگرانیدا تاکو خودا ئەو حاڵەتەی‌لەسەرلابات.

"یونس" لەنێو سکی نەهەنگەکەدا هەر پەنا بەخودا دەگرێت و لێی دەپاڕێتەوەو دەڵێت: ﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾.

لەم ئایەتەدا کەلەسەرزاری ئەم پێغەمبەرەوە هاتووە، ئەو (واتە"یونس") وەسفی پەروەردگاری بەم ڕستەیە دەکات﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ﴾ئەمەش وەسفێکی تێرو تەسەل و تەواوی پەروەردگارێتی ی خوداو پاك و بێخەوش ڕاگرتنیەتی لەهەر کەم و کووڕی و درێغی و بێدەسەڵاتی یەك، هەر لەدوای ئەو ڕستەیەشەوە وەسفی خۆی ئاوادەکات: ﴿إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾. واتە:(من یەکێك بووم لەستەمکاران،کە ستەمم لەخۆم کردووە بە هۆی لاوازیی نەریتی مرۆیی‌و کەمتەرخەمیشم لەبەجێ‌گەیاندنی مافی پەروەردگارێتی ی خودا)

ئەم ڕستەیە لەهەمان کات دا دان نانە بە گوناهی دا و ڕاگەیاندنی پەشیمانی و تەوبە کردنە تاکو خودا ئەو خەمە گەورەیەو ئەو بارگرانی یەی لەسەر هەڵگرێت، خوداش نزاو داوای لێ وەرگرتووەو ڕزگاری کردووە.

دوای ئەم ڕستانەش بڕوانە بۆ شێوازی لکاندنی ئەم هەواڵە بەکۆتایی ئایەتەکەوە: ﴿وَكَذَلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾، ئەم پەراوێزە قەشەنگەی ئایەتەکە بەڵێنێکە لەخوداوە بۆ باوەڕداران لەسەر ئەوەی کە لەخەم و تەنگانە ڕزگاریان دەکات گەر بەندایەتی و عیبادەتیان هەر بۆ خودابێت و هەردەم پەنابەرنە بەرخودا، وەك چۆن"یونس"ڕزگارکراوە بەو خواپەرستییە ڕاستەقینەیەی.

لەم بارەیەشەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە (سعد-ی کوڕی ابو وقاص) گێڕاوێتییەوەو پێغەمبەر ﷺ تیایدا فەرموویە: ((**دعوة ذي النون في بطن الحوت**: ﴿أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَـٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾، **ما دعا بها عبد مسلم قط وهو مكروب الاّ استجاب الله دعاءه**)). واتە: (نزاکەی "یونس"لەسکی نەهەنگەکەدا ﴿أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَـٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ نزایەکی هێندە گەورەیەو کاریگەرە کە ئەگەر هەر بەندەیەکی خواپەرستی موسڵمان لەکاتی تەنگانەیەکی دا بیخوێنێت و پەنای پێبباتە بەرخودا ئەوا خوداش نزاو پاڕانەوەی گیرا دەکات و بەهانایەوە دێت).

## ئارام گرتن لەکاری بانگەوازدا

وانەیەکی دی لەبەسەرهاتەکەی"یونس"دا ئەوەیە مرۆڤی خاوەن باوەڕ دەبێت بەچاکی هەموو ڕێنموونیو ئامۆژگاری یەکی خودا جێبەجێ بکات و بەوپەڕی ئارامیو دان بە خۆداگرتنەوە بانگەواز بۆ ڕێی خودا بکات، تاکو خودا گیرۆدەی تەنگژەو ناڕەحەتی یەکی ترسناکی ئاوای نەکات کە هەرگیز لەوەوپێش بەخەیاڵی دا نەدەهات گەر خودا بەهۆی بێئارامییەوە ئەوەیبەسەربێنێت.

"یونس" پەلەی کردووە لە هەڵاتن لەو مەیدانەی کە خودا بۆی دیاری کردووەو خۆی نەخستۆتە بەر چەند ئەرکێکی تر لەئارام گرتندا. ئەمەش ڕەفتارێکی نا ئاسایی ی وا بووە کە شایانی ئەوە نەبووە پێغەمبەرێك بیگرێتە بەرو پەنای بۆ ببات لەیەکەم هەڵوێستی خراپی گەلەکەی دا، کە ڕووی لێ وەردەگێڕن و خراپەی دەرهەق دەکەن.

کەواتە هەر دەبوایە وانەیەکی وا لە خوداوە وەرگرێت، کە باری ڕاستی ی مەسەلەکەی بۆ دەرکەوێت، هەر دەبوو خودا دەرسێکی تری دابات بەو ڕەنگەی، کە لە تەنگانەیەکەوە بیبات بۆ تەنگانەیەکی تاڵترو توندتر، کە (نێو سکی نەهەنگەکەیە)و پاشان ڕەحمەتی خودا فریای کەوێت و لەو تاریکاییانەی نێو سکی نەهەنگەکەوە دەری بێنێتەوە بۆ سەر زەوی یەکی وشکانی و لەوێوە بگەڕێتەوە بۆ ئەو شارەی بەجێ ی هێشتبوو و دەست بکاتەوە بەبانگەواز بۆ سەر ڕێ ی ڕاستی خودا بەورەو متمانەیەکی بەهێزترەوەو بەدەروونێکی کراوەو سنگفراوانی یەکی زیاترەوە.

ئیدی خوداش یارمەتی ی دەدات لەو ئەرکە پیرۆزەی دا، خودای مەزن لەفەرمانێکی دا بۆ دوایین پێغەمبەریشیﷺ داوای لێ دەکات بەئارام و لەسەرخۆ بێت لەبواری بانگەوازکردن بۆ خوادا و وەك "یونس" لەدەست گەلەکەی ڕانەکات و بەبێ‌مۆڵەتی خودا بەجێ‌یان نەهێڵێت:

﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ ﴿٤٩﴾ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ القلم/٤٨-٥٠.

# بەشی دەیەم

## زەکەریا سەلاوی خوای لێ بێ
## یەحیا سەلاوی خوای لێ بێ
## عیسا سەلاوی خوای لێ بێ

١- چیرۆکی زەکەریا و یەحیا

٢- چیرۆکی مەریەم و لەدایک بوونی مەسیح

٣- پەیامی عیسا

٤- چەند وانە و پەندێک

# بەندی یەکەم

## ((چیرۆکی - زەکەرییا - و - یەحیا -))

( "زەکەرییا" داوا لەخودا دەکات کە کوڕێکی پێ ببەخشێت -
مزگێنیی بەخشینی "یەحیا" بە "زەکەرییا" - پێغەمبەرێتیی "یەحیا" و سیفەتەکانی )

### "زەکەرییا" داوا لەخودا دەکات کە کوڕێکی پێ ببەخشێت

"زەکەرییا" یەکێکە لەپێغەمبەرانی خوداو تەمەنی خۆی لەبانگەواز بۆ خوداو خزمەتی (پەیکەری پیرۆز)ی نێو -قودس- بەسەربردووە، ئەو هەردەم هیوای ئەوەی دەخواست خودا کوڕێکی پێ ببەخشێت تاکو لەدوای خۆی بەردەوام بێت لەسەر بانگەوازەکەی بۆ ڕێی ڕاستی خوداو، پاشان لەترسی ئەوەی نەبادا گەلەکەی لەدوای خۆی گومڕابن. چونکە چەند نیشانەیەکی گومڕاییان لەسەر دەرکەوتبوو، بەڵام "زەکەرییا" بەهۆی پیری و بەساڵاچوویی خۆی و بەهۆی پیری و نەزۆکی ی هاوسەرەکەشیەوە هیواو ئاواتی کز بووبووەوەو بەتەمای ئەوە نەمابوو، کە منداڵێکیان ببێت.. کەچی سەرباری ئەوەش"زەکەرییا"ی خاوەن باوەڕ و متمانەی زۆر بەخودای پەورەردگاری، دەیزانی،کەهیچ کۆسپ و بەربەستێك لەبەردەم قودرەتی خودایی دا نی یە و لە ئارادابێت، سا ئیتر کۆسپی پیری و پەك کەوتەیی بن، یان هەر جۆرێکی تر.

هۆی دروست بوونی ئەم متمانەیەش زیاتر لەوەوە بووە کە ڕۆژێکیان "زەکەرییا" دەچێتە نێو پەیکەرەکەوە بۆ لای (مەریەم) کە شەوو ڕۆژی لەوێ بەسەر دەبردو دەبینێت خواردن و خواردنەوەو میوەی ناوەختی لەلایەو لێ ی دەپرسێت: (مریم تۆ ئەم هەموو نیعمەتەت لەکوێ بوو)؟ ئەویش لەوەڵامدا پێی دەڵێت: (ئەمە لەلایەن ئەو خودایەوە بۆم دێت کە ڕزق و ڕۆزیی ی خۆی بەبێ حیساب و تەقدیر بەهەر کەسێك دەدا لەوانەی کە بەخواستی ئیلاهی ی خۆی پێیان دەبەخشێت).

"زەکەرییا" کە ئەم بەڵگەو نیشانە ڕۆشن و پرشنگدارانەی خودای گەورەی بۆ دەرکەوت و دیتی چۆن خودا بەکەرەم و بەخشندەیی ی خۆی رزقی (مریەم)ی کچ و بێهاوسەر دەدات، بەمە زیاتر هانی خۆی دەدات لەسەر بەتین کردنی هیواو ئومێدو، لەخودای گەورە دەپاڕێتەوەو

دەڵێت: (ئەی پەروەردگار بێگومـان وەك دەبینیـت مـن پیـاوێکی بەتەمـەن و بەساڵاچـووم و تووشی نەخۆشی یەکانی پیری و کەنەفتی بووم و ئـەوە هـەموو ئێسقانەکانیـشم بـێهێزو لاواز بوون و، ئەوەش سەرم کەنیشانەی پیری لێ داوەو، وێڕای هەموو ئەمانـەش بەوپـەڕی پەڕۆشـی یەوە بەتەمای تکاکردنم لەتۆ کە ئەم داوایەم پەسندکەیت و کوڕێکم پێ ببەخـشیت، مـن لـەم نزایەمدا خۆم بەبێئومێدو بێبەش دانانێم، بەڵکو خۆم بەکەسـێکی بـەختیارو (نـزا وەرگـیراو) دەبینم، خودایە من بەم دوعایەم هیچ تـەماعێکم لـەدنیاو هـیچ مەبەسـتێکی ئاساییـشم لـە وەچەو نەوەی زۆر نی یە، بەڵکو دەبینم ئەوا کەس و کارو خزمانم خەریکە دەبنـە شـەڕخوازانی نێو گەلەکەم و دڵنیا نیم لێیان کە کاروباری ئایینیان بۆ بەڕێوە ببرێـت و دوای خـۆم لـە(پـاش مردنم) کارەکانی خەڵکی بەدادگەری جێبەجێکەن، جـا سـەرەڕای نـەزۆکی ی ژنەکەشـم بـەڵام خودایە تۆ هەر بەتوانایت لەسەر گیراکردنی دوعام و بەقودرەتی خۆت دەتوانیت کە کوڕێکم پی ببەخشیت تاکو لەزانست و ئاییندا میراتگرم بێت و میراتگـری مەملەکـەتیش بێـت لـەخێڵی (یەعقووب)دا هەروەها خودایە بەگوێڕایەڵ و خۆشەویستی لای خۆتی دابنێ...

ئەمەی پێشوو شیکاری ئەم ئایەتانە بوو، کە سەرەتای ئەم چیرۆکە دەگێڕنەوەو فەرمایشتی خودای گەورەی لە دوو سوورەتی وەك (آل عمران)و (مریم)دا لەخۆگرتووە:

﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴾آل عمران/٣٧-٣٨.

﴿ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ وَإِنِّى خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِىَ مِن وَرَآءِى[1] وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا[2] ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴾مریم/٢-٦.

---

(١) خفت الموالي من ورائي: واتە من ترسی ئەوەم لێ نیشتووە کە دوای خۆم، واتە (لەپاش مـردنم) خـزم و کەس و کارە نزیکەکانم دەسەڵات بگرنە دەست و دین کزو لاوازکەن و لەبەینی بەرن.

(٢) وليا: واتە (کوڕێك لەپشتی خۆم)،کە صالح بێت و جڵەوی کاروبار بگرێتە دەست لە دوای نەمانی خۆم.

## مزگێنی ی بەخشینی -یەحیا- بە " زەکەرییا"

خودای مەزن نزای -یەحیا-ی گیراکردو چەند فریشتە(مەلائیکە)یەکی نارد بۆ لای تا مزگێنی ی پێبدەن کەوا (خودا کوڕێکی پێ دەبەخشێت و ناوی (یەحیا)یشی بۆ هەڵدەبژێرێت، ئەم ناوەش هەر بە تایبەتی بۆ ئەو کوڕە دانراوەو لەوەوپێش کەسی تری پێ ناونەنراوەو خێرو بەرەکەتی خودای بەسەردا دەڕژێت و باوەڕ بەکتێبی خودا دێنێت و گەورەی گەلەکەی دەبێت و لەهەموو هەواو ئارەزوویەکیش خۆی بەدوور دەگرێت).

"زەکەرییا" لەم مژدەیە سەرسام دەبێت، چونکە خۆی پیاوێکی بەساڵاچووەو ژنەکەشی نەزۆکەو لەڕۆژانی گەنجیدا منداڵی نەبووە و داخۆ ئێستا چۆن نەوە دەخەنەوە؟ لەوەڵامی ئەو پرسیارانەیدا وەڵامی دەدرێتەوە: (خودا بەم ڕەنگە خواستی خۆی جێگیر دەکات و ئەو کارەش ئاسانە لەلای. ئەی مەگەر لەمەوبەر تۆشی نەهێناوەتە بوون کە پێشتر شتێکی جێی باس نەبوویت؟ )...

لەو ساتەدا"زەکەرییا" لەخودای پەروەردگاری دەخوازێت کە هێمایەکی بۆ دیاری کات تا بەهۆی ئەوەوە بزانێت ژنەکەی سکی پڕە (حامل). خودای گەورەش پێی ڕادەگەیەنێت کە هێماو نیشانەی زانینی ئەو هەواڵە ئەوەیە ئەو خۆی (واتە: "زەکەرییا") هەتا سێ ڕۆژ ناتوانێت لەگەڵ خەڵکی دا بدوێت و سەوداو مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، تەنها بەئاماژەی دەست بزواندن نەبێت، یان بە جووڵە و حەرەکاتی چاوو سەر ڕاوەشاندن، یاخود بەهەر شێوازێکی تر لەو شێوازانەی کە کەڕولاڵەکان لە تێگەیاندنی خەڵکی دا بەکاری دەهێنن.

هەروەها خودای گەورە فەرمانی پێ دەکات کە لەماوەی ئەو سێڕۆژەدا زیکرو یادی خودا زۆر بکات ، بەیانیان و ئێواران نوێژ وتەسبیحات زۆر بخوێنێت، چونکە سەرەڕای ئەوەی گەر توانای قسەکردنی لەگەڵ خەڵکی دا نەبێت، بەڵام خۆ توانای خواپەرستیو بەندایەتی و تەسبیحاتی هەیە.. هەروەك خودای گەورەش دەربارەی شێوازی گیرابوونی نزاکەی و هێمای زانینی فەرموویە:

﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا [1] ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا [2] ﴿٨﴾ قَالَ

---

(١)لم نجعل له سميّاً:لەمەوبەر هیچ کەسێکمان بەوناوە نەناوە، بەمانای لەوەوپێش کەس ناوی *یەحیا* نەبووە.

(٢) عتيا: واتە لەحالەتێکی پیری وبەساڵاچوویی ی وا دام کە هیچ ئومیدێکی بەگەڕ کەوتنەوەی چالاکیم تیانەماوە.

كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْـًٔا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا[1] ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ[2] فَأَوْحَىٰٓ[3] إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً[4] وَعَشِيًّا[5]﴾مریم/٧-١١

خودای مەزن لەجێیەکی تری قورئان و لەفەرمایشتێکی تری هاوشێوەی دا دەفەرموێت:

﴿ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا[6] وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِىَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴾آل عمران/٣٩-٤١.

## پێغەمبەرێتیی -یەحیا- و سیفەتەکانی

خواستی خودای گەورە هاتەدیو ژنەکەی "زەکەرییا"سکی پڕبوو، جا کەماوەی سك پڕی (حمل)ـەکەی تەواوبوو -یەحیا- هاتە دنیاوە، خودای گەورەش چەند بەهرەو سیفەتێکی گەورەی پێ بەخشیبوو وەك زیرەکی یەکی هێجگار زۆرو، باش تێگەیشتن و، فەرمانیشی پێدابوو کە (تەورات) بخوێنێتەوەو بەچوست و چالاکیو ورەی بەرزەوە کار بەناوەڕۆك و ڕێساو دەستوورەکانی بکات.

خودای گەورە -یەحیا-ی هەر لەمنداڵیەوە زاناو داناو بینا کردبوو بۆ تێگەیشتن لەزانستی دین و پەیڕەویکردنی حوکمەکانی شەریعەت، هەروەها خودای گەورە لەدەریای بێپایانی ڕەحمەتیەوە دەروونێکی بەسۆزو دڵێکی میهرەبانی بە -یەحیا- بەخشیبوو، هەروەك لەبەدکاریو کرداری چەپەڵ و نابەجێیش پاراستبووی و پاکی کردبووەوەو پاشان کردبووی بە

(١) ثلاث ليال سوياً: واتە سێ شەوی تەواو
(٢) المحراب: شوێنی نوێژکردن.
(٣) أوحی: واتە ئیشارەتی بۆ کردن
(٤). بکرةِ: ماوەی نێوان سپێدە (فجر) و چێشتەنگاو( ضحی) یە.
(٥) عشیا: کۆتایی ڕۆژگار تا کاتی خۆرئاوابوون.
(٦) حصورا: واتە ئەو پیاوەی خۆی لەئارەزووی نەفس دەگرێتەوەو بەلای ئافرەتدا ناچێت، سەرەڕای بوونی وزەو تواناشی لەو رووەوە. گوتراویشە ئەو پیاوەیە کە زۆر خۆی دەگرێتەوەو لەهەواو ئارەزوو دوور دەکەوێتەوە.

عەبدێکی گوێڕایەڵ و لەژیانیدا تاکە هەڵەیەکی نەکرد..

جگە لەوەش خودای گەورە وای لێ کردبوو کەئەوپەڕی چاك و بەئەمەك و ڕەوشتبەرز بێت لەگەڵ باوك و دایکی دا..

ئیدی –یەحیا-ش پیاوێکی دلڕەق و خۆبەزل زان نەبوو، بەڵکو لەخۆبوردوو و دڵنەرم بوو، بەم ڕەنگەش لەخودای گەورەوە سڵاوی گەرم و هێمنی و دڵنیایی لەهەر زیان و کارەساتێك لێ کرابوو و هەر لە ڕۆژی لەدایك بوونیەوەو تا ڕۆژی لەدنیا دەرچوونیەو.. تا ڕۆژی دوایی (قیامەت)یش لێی بێخەم و بەهرەمەند بوو کە بێگومان لەو ڕۆژەدا ئەویش زیندوو دەکرێتەوە تاکو حسابی خۆی لەبەردەمی خوادا لەگەڵ بکرێت

هەروەك خودای گەورەش دەربارەی ئەم بەشەی چیرۆکەکەی فەرموویە:

﴿يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا[1] وَزَكَوٰةً[2] ۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا[3] ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾مريم/١٢-١٥.

---

(١) وحناناً من لدنا: واتە سۆزو ڕەحمەت و ئەوینێك لەئێمەوە.. بەمانای خودا خستویێتیە بەر سۆزو ڕەحمەتی خۆی.

(٢) زکاة: واتە (خێرو بەرەکەت) مان پێداوە.. یان لەگوناهان پالاوتوومانە.

(٣) عصیاً: سەرپێچیکار لەفەرمانی خودای پەروەردگاری، واتە یەحیا ئاوا نەبوە..

# بەندی دووەم

## ((چیرۆکی -مەریەم- و لەدایك بونی "مەسیح"))

( پلەو پایەی "مەریەم" لەلای خودا - فریشتەکان مزگێنی بە "مەریەم" دەگەیەنن - "جیبریل" و "مەریەم"- سکپڕبوونی "مەریەم" بە "عسیا"وەو لەدایك بوونی "عیسا" - "عیسا" لەسەر بێشکەوە دەدوێت )

### پلەو پایەی -مەریەم- لەلای خودا

(عیمران-ی باوکی "مەریەم") لەنێو (بنـو اسـرائیل)دا پیـاوێکی گـەورەبوو و ژنەکەشـی نەزۆك بوو و منداڵێکی نەبوو بوو. بەڵام ئەم ژنە پەنای بردە لای خودای گەورەو بەملکەچـی و زەلیلی یەوە لێ ی پاڕایەوە کە خودای گەورە کـوڕێکی پـێ ببەخـشێت، نـەزری کردبـوو گـەر کاتێك خوا ئەو کوڕەی پێ دەبەخشێت تەرخانی کات (وەقفی کات) بۆ خزمەت و گوێڕایـەڵی هەموو حوکم و فەرمانێکی خوداو خزمەت کردنی ماڵە پیرۆزەکەی خودا.

خودای میهرەبانیش نزاو پاڕانەوەی ئەو ژنەی (عیمران)ی گیراکرد. ئینجا ژنەکەش هەستی بە وجودی کۆرپەلەیەك لەنێو سکی دا دەکرد، بەڵام کاتێك منداڵەکەی بوو دیتی (کچە) دیـارە کچانیش وەك کوڕان بۆ خزمەتی پەرستگاکان دەست نادەن، بەڵام هەر سوپاسـی خـودای کـرد لەسەر ئەو بەخششە و ناویشی نا "مەریەم" و دوعای لای خودای گەورە بۆ کـرد کـە ئـابڕو و شکۆی خۆی و نەوەکانیشی لە فڕوفێڵی شەیتان بەدوور کات.

جا وەك چۆن ژنەکەی (عیمران) نەزری کردبوو کـە منداڵەکـەی تـەرخان کـات بـۆ خـوداو خزمەتی پەیکەرەکە، خودای گەورەش ئەو نەزرو دیاریەی لێ پەسندکردو قایل بوو بـەوەی کـە ئەو کچە لەخزمەتی پەیکەرەکەدا بێت وەك وەفاداری یەك بۆ نەزرەکـەو ئـیتر لەسـەر ڕەوشـت بەرزی و داوێن پاکی پاراستیی.

لەلایەکی تریشەوە وا دەردەکەوێت کاتێك (عیمـران) مـردووە ئـەم کـچە بـچووك بـووەو پێویستی بەسەرپەرشتی و لەخۆگرتنی کەسـێك هـەبووە تـاکو بـەخێوی بکـات و پـەروەردەی بکات، بۆ ئەم مەبەستە دایکی دەیسپێرێت بەسەرپەرشتیارانی پەیکەرەکە.

ئەوانیش لەنێو خۆیاندا ناتەبا دەبن لەسەر ئەوەی کامیان "مەریەم" لە خۆبگرێت و سەرپەرشتیاری بێت، بۆیە پەنادەبەنە بەر شێوازی تیروپشك (قورعە) ڕاکێشان و لەئەنجامدا ئەرکی سەرپەرشتاریەکە بە "زەکەرییا" دەسپێررێت.

"زەکەرییا"ش کە مێردی پووری "مەریەم" بووە میحرابێك بۆ "مەریەم" دادەنێت تاکو جگە لەخۆی کەس نەچێت بۆ لای، ئینجا ڕێنمایی دەکات بۆ سەر خواپەرستیو بەندایەتی ی ڕاستەقینەو لەسەر ئەمە بەردەوام دەبێت تا ڕۆژێکیان دیاردەیەکی عەجیب و سەرسوڕهێنی بۆ دەردەکەوێت، ئەوەبوو هەرجارێك کە دەچێت بۆ لای "مەریەم" لەمیحرابەکەدا، دەبینێت خۆراکێکی لەلایەو ئەم خۆراکەش هیچ کەسێك بۆی نەهێناوەو جگە لە "زەکەرییا- خۆی" کەسی دیش لەو کاتانەدا نەچوون بۆ لای "مەریەم". هەر بۆیە بەسەرسامیەوە لێی دەپرسێت: (ئەرێ "مەریەم" تۆ ئەمەت لەکوێ بوو؟) (مەریەم) لەوەڵامدا دەڵێت: (ئەمە لەلای ئەو خودایەوەیە کە بەویستی خۆی ڕزق و ڕۆزی بەهەر کەسێك بدات، دەیدات)..

ئەمەی پێشووش واتا وشیکاری ئەم ئایەتانەن کە خودای گەورە بەشێکی چیرۆکەکەیان تێدا دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾آل عمران/٣٥-٣٧..

لەلایەکی تریشەوە خودای مەزن ئاماژە بۆ ئەو ناتەبایی‌یەی نێوان سەرپەرشتیارانی پەیکەرەکە دەکات، کە بەهۆی ئەرکی لەخۆگرتن و سەرپەرشتی کردنی "مەریەم"ـەوە لەنێوانیاندا دروست بووەو قورعەی لەسەر ڕادەکێشن، هەروەك لەم فەرمایشتەی دا کە لەئاڕاستەی پێغەمبەری خۆی محمدﷺی کردووەو فەرموویە: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ [1] أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾آل عمران/٤٤.

---

(١) يلقون أقلامهم: واتە تیرەکانیان بۆ قورعەو تیروپشك هەڵدەدا تاکامیان ئەرکی سەرپەرشتیو پەروەردەکردنی "مەریەم" لەئەستۆ بگرێت. گوتراوە مەبەست لەوشەی (أقلام) لەم ئایەتەدا ئەو قەڵەمانەشە کە (تەورات)یان پێ دەنووسی‌یەوە.

## فریشتەکان مزگێنی بە "مەریەم" دەگەیەنن

"مەریەم" کاتێك گەورە بوو و وەك ئافرەتانی پێگەیشتوو بالّغ بوو بوو هەوڵو کۆششێکی هێگجار زۆری بۆ خواپەرستی و بەندایەتی تەرخان کردبوو. بەوپەڕی وزەو تواناشیەوە عیبادەتی خودای بەشێوەیەك دەکرد کە بێگومان لەو سەردەمەدا هاوشان و هاو وێنەی نەبوو، ئاسەواری ئەو تەقواو لەخواترسانەشی بەرەنگێك بۆ "زەکەریا" دەردەکەوت کە هەر بەدیتنی زۆر دڵشاد دەبوو، لەبەر ئەمەش فریشتەکان (مەلائیکە) مزگێنی ی ئەوەیان پێدا، کە خودا بەتایبەتی هەڵیبژاردووەو لەهەموو ئافرەتانی دنیای بەباشتر داناوەو فەرموویە:

﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ[1] ﴿٤٢﴾ يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾آل عمران: ٤٢، ٤٣.

هەروەها فریشتەکان مزگێنی ی ئەوەشیان پێدا کە خودای گەورە کوڕێکی پێدەبەخشێت و هەر تەنیا بەوشەی (ببە: کُن) خەلقی دەکات (ئەمەش جودایە لەو شێوازە باوو زانراوەی زاووزێ ی مرۆڤ) ئەم کوڕەش ناوی (مەسیح _ی کوڕی _مەریەم)ـەو خودا لەدنیادا پلەو پایەیەکی بەرزی پێ دەبەخشێت و خاوەنی دەسەڵات و ڕێزو شکۆمەندی دەبێت، جگە لەمە لەڕۆژی دوایشدا خاوەنی پلەو پایەی بڵند و هاوشانی بەندە هەڵبژێرراوە لەخودا نزیکەکان دەبێت و لەگەڵ ئەوان دادەبێت، یەکێك لەو سیفەتە تایبەتیانەی تری (عیسا) ئەوەشە کە لە کاتێکدا منداڵێکی ساوایە، لەبێشکەکەی دا قسەدەکات و بەشێوەیەکی دانایانەش دەدوێت کە تەنانەت کاتێك گەورە دەبێت و وەك پیاوێکی تەواوی لێ دێت هەر هێندەش توانای ئاخاوتنی دانایانەی دەبێت، واتە هیچ جیاوازی یەك لەنێوان حاڵەتی منداڵی و گەورەیی ی دانابێت. هەروەها خودای گەورە ئەوی بە یەکێك لە پیاوچاکان و صاڵحان داناوە.

"مەریەم" سەری سوڕدەمینێت لەوەی کە کوڕی دەبێت لەکاتێکدا هێشتا خۆی کچەو شووی نەکردووە، بەڵام فریشتەکان هەواڵی تواناو قودرەتی زیاد لەڕادەی خودای پێڕادەگەیەنن لەسەر هەر کاروبارێك کە خواستی لەسەر بێت. جا خودای مەزن و باڵادەست بڕیاری لەسەر هەر شتێکدا بێت و خواستی لەسەر دروست بوونی هەر مەخلووقێك بووبێت، ئەوا پێی

---

(١) واصطفاك على نساء العالمين: واتە (خودا بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا فەزڵی داوی و هەڵی بژاردووی).. مەبەست لەوشەی (العالمين) لەوانەیە ئافرەتانی سەردەمی "مەریەم" خۆی بێت یاخود تێکرای ئافرەتانی دنیا و بەم رەنگەش "مەریەم" لەهەموو ژنانی دنیای پێش خۆیو دوای خۆی باشتر بووبێت.

دەفەرمویێت(ببە) و ئەویش دەسبەجێ (دەبێ).. (کن فیکون). هەروەك لەم بەشەی چیرۆکەکەدا فەرموویە: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى[1] ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ[2] وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ آل عمران/٤٥-٤٧.

ئەمە بوو ئەو حاڵەتانەی کەبەسەر مەریەم داهات هەر لە ناو سکی دایکیەوە تاکو هاتنە دنیایەو، پەروەردەبوونی.. بەچاکییش تێبینی ئەو حاڵەتە ناسکانەی دەکرێت کە کاتێك کۆرپەی نێو سکی دایکی بووە لەژێر سایەی خواپەرستی و پاکیزەییدا بووە تا کاتەکانی ژیانی دنیای و هەموو قۆناغەکانی و هەتا گەیشتۆتە تەمەنی گەورەبوونیش. بێگومان ئەم گەشەکردنە پاکیزەییەش سەرەتایەکی ڕێخۆش کردن بووە بۆ مەسەلەیەکی بەسام و هەیبەت، واتە: بۆ ئەوەی خودای گەورە بەخواستی ئیلاهی ی خۆی هەڵیبژێرێت وەك دایکی کەسێك کە (بەڕێساو ئامرازە زانراوەکانی زاوزێی ئاسایی) لەم دایکە نەبێت، تاکو ببێت بە بەڵگەو نیشانەیەکی بەناوبانگی خودای گەورەو هەر لایەنێکی شاراوەو زیادەڕۆیی تێدا کراویش ڕوون کاتەوە بەو ڕەنگەی کە گومانی گومانداران و زمانی هەر درۆ هەڵبەستێکیش ببڕێت، چونکە هەموو ژیانی "مەریەم" ئەو جۆرە گومانە نابەجێیانە پووچەڵ دەکاتەوەو لە کەلەبەرەکانی تۆمەتباریشی دووردەخاتەوە.

## "جیبریل"و "مەریەم"

" مەریەم" تەرخان (وەقف) کرابوو بۆ خزمەتی پەرستگەو خواپەرستی تێیدا، ئەویش خۆی دوورە پەرێز گرتبوو لەخەڵکی و بەتەنیا لەبەشی خۆرهەڵاتی پەرستگەکەوە دادەنیشت و خودای تێدا دەپەرست.

لەم جۆرە حاڵەتەی دا بوو کە خودا (روح الأمین)ی خۆی (جیبریل)ﷺی نارده لای. ئەویش (جیبریل) لەڕوخساری پیاوێکی ڕاست و ڕێك و بێخەوشدا لەلای دەرکەوت تاکو "مەریەم"

(١) عیسی: زاراوەی بەعەرەبی کراوی( یەشووع-ە بەمانای گەورە). ( مەسیح)یش نازناوی بووە، گوتراوە (بۆیە بە "مەسیح" ناوبراوە چونکە دەستی بەسەر هەر کەسێکی دەردەدارو نەخۆش داهێنابێت چاکی کردۆتەوە).. گوتراویشە (بۆیە بە"مەسیح"ناوبراوە چونکە بەپیرۆزی و بەرەکەت مەسح کراوە). هەروەها گوتراوە: ( چونکە بەرۆنی زەیت خۆی مەسح کردووەو پێغەمبەرانیش هەر بەوە مەسحی خۆیان کردووە).

(٢) المهد: واتە (بێشکە.. لانکە) ئەو جێیەی کە منداڵی شیرەخۆری تیا پاڵدەخرێت.

بەلایەوە ئاسایی بێت و لێی هەلنەیەت، بەڵام کاتێك "مەریەم" ئەو پیاوەی بینی بە ئادەمیزادێکی دەزانی و وای بۆ دەچوو گوایە دەیەوێت خراپەیەکی دەرهەق بکات، هەر بۆیەش بە نیگەرانی یەوە پێی گوت: (من پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕو خراپەی تۆ و هانا بۆ خودا دەبەم کە بەڕەحمی خۆی پاکیو ئابرووم بپارێزێت، جا ئەگەر تۆش پیاوێکی لەخواترس و بەتەقوایت ئەوا دەبێت لێم دوورکەویتەوە).

(جیبریل)یش پێی گوت: (من ئادەمیزادێك نیم بەو ڕەنگەی تۆ بۆی دەچیت، بەڵکو فریشتەیەکم لە فریشتەکان (ملائکة) و خودا ناردوومی بۆ لای تۆ تاکو کوڕێکی صالح و خواپەرست و بێخەوش و گۆشکراوی نێو خێرو بەرەکەتت پێ ببەخشم).

" مەریەم" لەم وتەیەی (جیبریل) سەرسام بوو و لێی پرسی: (چۆن من کوڕێکم دەبێت لەکاتێکدا هێشتا کچم و مێردێك نەهاتووە بەلامداو، ئێ خۆ ئافرەتێکی داوێن پیسیش نیم)؟!

(جیبریل) لەوەڵامدا پێی ڕاگەیاند: (ڕاستی یەکە ئاوایە وەك خۆت دەڵێیت.. بەڵام خودای پەروەردگارت فەرموویەتی: (بێگومان دروست کردنی منداڵێك بەبێ وجودی باوکێك کارێکی زۆر ئاسانە لەلام و تاکو ببێتە بەڵگەیەکیش لەسەر توانای زۆرو گەورەم، هەروەها تاکو ببێتە هۆی ڕەحمەتێك بۆ ئەو کەسانەی، کە ڕێی ڕاستی پێ دەگرنەبەر. مەسەلەی دروست کردنی (عیسا)ش کارێکی بڕیار لەسەردراوی لەمەوپێشمان بووەو هەر دەبێت بەدی بێت))..

هەروەك خودای پەروەردگاریش ئەم قۆناغانەی چیرۆکەکە لەم ئایەتانەدا دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ[١] مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا[٢] فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا[٣] فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا[٤] ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا[٥]﴾ مريم/١٦-٢٠..

هەروەها خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّتِيٓ[٦] أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا

---

(١) انتبذت: (خۆی دوورخستەوە).. (دوورەپەرێزوخۆیەنادەر بوو).

(٢) حجاباً: (پەردەیەك) بۆ خۆ حەشاردان لێیان.

(٣) روحنا: ڕۆحەکە واتە ( جیبریل)ـە، بۆیەش بە (ڕۆح) ناوبراوە چونکە گیانپەروەر ـڕۆحانی) بووە، گوتراویشە هەر لە ( ڕۆح) خەلق کراوە.

(٤) غلاماً زکیاً: واتە (کوڕێکی پاڵاوتە لەهەر تاوان و گوناه و کارێکی ناشیرین).

(٥) بغیاً: (زیناکار)-لەشفرۆش -

(٦) والتي: مەبەست لە " مەریەم" ە.

﴿فِيهَا مِن رُّوحِنَا[١] وَجَعَلْنَاهَا وَٱبْنَهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾الأنبياء/٩١.

بێگومان ئێمەش لەو ئایەتەدا بەڵگەیەكی دیارو ڕۆشن لەمەسەلەی لەدایكبوونی (عیسا)دا (بەبێباوك) بەدی دەكەین و بەكارێكی هێجگار مەزنی بەرچاومانی دەبینین، ئەو بەڵگە دیارو ڕۆشنەش ئەوەیە: لەدایك بوونی (عیسا) بەبێ وجودی باوكێك ئەو تواناو قودرەتە بێهاوتایەی خودا ئاشكرا دەكات كە لەكاری خولڨاندنی شتەكاندا پابەندی هیچ ئامرازو هۆكارێك نیيە لەو هۆكارانەی كە جیهانیان لەسەر بەڕێوە دەچێت و لەو سیستەمەشدا كە بۆی داناوە..

هەندێك كەسیش لە خەڵكی (دروست بوونی "عیسا" بە بێ باوك) دەكەنە بەڵگەیەك لەسەر خودایەتی ی خودای مەزن، بەڵام هەندێكی تر لە خەڵكی ئەمە دەكەنە هۆیەك بۆ تیر و توانج دان لە دایكی و گومان كردن لە وجودی"مەسیح". خودای گەورەش ڕوو لەهەموو ئەو جۆرە كەسانە دەكات و پێیان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ[٢]﴾آل عمران/٥٩.

گومانیشی تێدا نی یە كە كاری خەلق كردنی (ئادەم) لەكاری خەلق كردنی عیسا سەرسوڕهێن ترە، چونكە (عیسا) لەمێیینەیەكی مرۆڤ و -هاوڕەگەزی خۆی- دروست كراوە، بەڵام (ئادەم) لە (خاك) دروست كراوە.

## سكپڕبوونی "مەریەم" بە "عیسا"وەو لەدایك بوونی "عیسا"

خاتوو"مەریەم"ی ڕوو سوور و پاك داوێن لەو ساتەوەختەدا، كە (جیبریل-ی فریشتەی خودا)فووی پێداكرد، سكی پڕبوو، دیارە"مەریەم"ئەوەشی لەخەیاڵدابوو،كە داخۆ خەڵكی بێئاگاچی دەربارەی كچێك دەڵێن كاتێك سكی پڕبێت و، بێئەوەی مێردێكی هەبێت منداڵی دەبێت؟!

---

(١) فنفخنا فيها من روحنا: واتە ( لەرۆحی خۆمان فووی نهێنیيەكمان لەنهێنی یەكانی وجودی كۆرپەلە لەسكی دا-تێكرد) كە (عیسا) و ژیانەكەی بووە، سەبارەت بەوەی فووی تێكردووە زانایان بیروڕای هەمە جۆرولێك جودایان هەیە، هەندێكیان دەڵێن: (فووتێكردنە كە لەخودا خۆیەوە بووە، چونكە خودا شێوازی خولڨاندنی (عیسا)ی بە(ئادەم) چواندووەو دەربارەی ئادەمیش فەرموویە: (ونفخت فيه من روحي). هەندێك زانای تریش دەڵێن: (ئەوەی فووی تێكردووە (جیبریل) بووە). دوای ئەمەش ناتەبایی نێوان زانایان لەبیروڕادا لەسەر چۆنیەتی فووتێكردنەكەیە. بۆ نموونە هەندێكیان دەڵێن: (جیبریل-فووی بەباخەڵی "مەریەم"دا كردووەو ( باخەڵ (جیب)یش بەگیرفانی كراس و بەفەتحەی سینەش دەگوترێت) تاكو فووەكە گەیشتۆتە نێو منداڵدان(ڕەحم)ی، گوتراویشە فووەكە لە دەمیەوە بووەو گەیشتۆتە نێو سكیو ئیدی دەسبەجێ لەو ساتەدا سكی پڕبووە).

(٢) من الممترين: واتە ( لەگومانبەران).

ئەم جۆرە بیرو خەیاڵانەش "مەریەم"ی زۆر ترساندو زۆر بێ ئارام و نیگەرانی کردو، ترسێکی زۆری لێ نیشت و حەزی لەخۆدابڕان و گۆشەگیری دەکرد.. بۆیە لەو کاتانەدا چوو بۆ شوێنێکی دوور لەخەڵکی و خۆی لێ شاردنەوەو لەبەرچاویان ون بوو.

ئینجا لەوێ کاتی منداڵبوونی هاتە پێشەوەو ژان گرتی و لەبەر ئازارو ژانی منداڵبوونی پەنای بردە بەر قەدی دارخورمایەك تاکو خۆی پێ حەشاردات و خویشی پێ ڕابگرێت، هەر لەو ساتەشدا ئەوەی بیرکەوتەوە کەوا مۆر و پەڵەیەکی ناشیرینی پێوە دەلکێنن و خەڵکی خەتاباری دەکەن، هەر بۆیەش هیوای ئەوەی دەخواست کە بەر لەو ڕووداوە بمردایە یاخود هێندە بێ ناو و بێ کەڵك بوایە کە لای هیچ کەسێك شایانی باس کردن نەبوایە.

بەڵام کتوپڕ لوطف و بەزەیی ی خودای پێ گەیشت و سۆزو سەرپەرشتی خودا باڵی بەسەر داکێشاو دەنگی (جیبریل)ی لەنزیکەوە بیست کە لەخواروو خۆیەوە بوو و بانگی لێدەکرد هیچ خەمی نەبێت و خودا ڕزق و ڕۆزییشی بۆ بڕیارداوە و با لەوە دڵنیا بێت، هەروەها با قەدی دارخورماکە ڕاوەشێنێت، چونکە خورمایەکی تەڕو پێگەیشتووی بۆ بەردەداتەوەو بەئاسانی و ئیشتیهاوە بۆی دەخورێت. پاشان پێی ڕاگەیاند لەئاوی ئەو جۆگەلە پاکەش بخواتەوە کە لەژێر درەختەکەوە دەڕۆیشت، تاکو خۆی پێ هێور و دڵنیا بکاتەوەو بێتەوە سەرباری ئاسایی ی خۆی و، هیچ خەم و باك و ترسێکی نەبێت.

پاشان (جیبریل) فێری کرد، ئەگەر هەر کەسێك سەرزەنشتی ی کرد و پرسیاری دەربارەی ئەو منداڵە لێکرد و لێیان کۆڵیەوە، کە داخۆ ئەمەی لەکوێوە هێناوە، با ئەویش هیچ وەڵامێکیان نەداتەوەو هەر تەنها بە ئیشارەتێك بیاندوێنێت و تێیان گەیەنێت، کە: (من خۆم لەقسەکردن گرتۆتەوەو نەزری ڕۆژووی قسەنەکردنم لەسەر خۆم داناوەو دەبێت ئەمڕۆ لەگەڵ کەسدا نەدوێم)...

ئەم بڕگەیەی پێشووی ئەم بەندەش واتاو شیکاری ئەم ئایەتانەی قورئانە، کە خودای مەزن قۆناغێکی بەسەرهاتەکەیان تێدا دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا [1] ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا [2] ٱلْمَخَاضُ [3] إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا [4] مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ

---

(١) قصياً: دوور.

(٢) فأجاءها: ناچاری کرد.. زۆری بۆ هێناو تەنگی پێ هەڵچنی.

(٣) المخاض: سك ئێشە وژانی توندی منداڵبوون.

(٤) نسياً: واتە: شتێکی لەبیرکراوو و بێبایەخی وا کە هەرگیز شایانی باسکردن و وەبیرهاتنەوەو دڵتەنگ

جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا [١] ﴿٢٤﴾ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا [٢] ﴿٢٥﴾ فَكُلِى وَٱشْرَبِى وَقَرِّى عَيْنًا ۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِىٓ إِنِّى نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴾مريم/٢٢-٢٦.

## " عیسا" لەسەر بێشکەوە دەدوێت

بەڕاستی دوای ئەوەی "مەریەم" ئەو منداڵە "عیسا"ی بووە بردوێتی یە نێو گەلەکەشیەوە، وەك ڕووداوێکی هێندە قورس و لەناکاو دیار بووە لەلایان کەهەموانی پەشۆکاندووە، چ ئەوانەی ئاگاداری تەقواو خواپەرستی یەکەی بوون و چ ئەوانەش کەهیچیان دەربارەی بەندایەتی و عیبادەتی "مەریەم" نەدەزانی، چونکە شتێکی سەیرو سەمەرەی وای پیشان دان کە تا ئەو ڕۆژەش لای ئەوان بەکچێکی شوونەکردوو و بێ مێرد ناسرابوو، هەر بۆیەش دیاردە کتوپڕیەو لەناکاوەکە خۆی لەخۆی دا هۆکارێکی تاوانبارکردن بوو، چونکە (شتی کتوپڕی) بوار بەبیرکردنەوەو تێفکرین نادات، بەتایبەتی کەوا بەڵگەی خەتابارکردن لەئارادایەو هۆکاریش بەبینراوێکی ماددیەوە دیارە و هیچ پاکانەو پێچ و پەنایەکی تیادا نەماوەتەوە.

کاردانەوەی خاتوو " مەریەم"یش لەبەرامبەر ئەو گێژەڵووکەیەدا ئەوەبوو پەیڕەویی ڕاسپاردەو ڕینمایی یەکەی (جیبریل)ی کردو بێدەنگی ی خۆی ڕاگەیاندو بە ئیشارەت سەرنجی ئەو خەڵکەی بۆ لای کوڕە پاڵخراوەکەی ڕاکێشاو داوای لێکردن قسەی لەگەڵدا بکەن.

ئەوانیش زیاتر تووڕە بوون وپێی دا هەڵشاخان لەبەر ئەوەی وا تێدەگەیشتن گوایە "مەریەم" گاڵتەیان پێ دەکات، چونکە لەوەوبەر نەیاندیبوو منداڵێك لەنێو بێشکەوە قسەبکات لەو تەمەنەکەمەی دا، بەڵام"عیسا ﷺ" وەڵامی تێرو تەسەلی لەسەر پاکی و بێتاوانی ی دایکی ی دانەوەو بۆی سەلماندن کەخودا دەیهێنێتە ئاخاوتن و پێی گوتن: (من عەبدی خوام و لەمەولا کتێبی-ئینجیل-م بۆ دەنێرێت و دەمکات بە پێغەمبەرێك و بەسوودو

---

بوونی خەڵکی نەبێت کاتێك لەبەرچاو نامێنێت و لەناو دەچێت.

(١) سریّا: واتە (جۆگەلە ئاوێك) گوتراویشە مەبەست لە " عیسا" یە، چونکە (سریّ) بەو پیاوە گەورەو دیارانە دەگوترێت کە خاوەنی ڕەوشت و ئاکار وپلەی بەرزن.

(٢)رطباً جنیا: بەبەروبوومی ئەودار خورمایە دەگوترێت، کە هێشتا تەڕونەرمەو وشك نەبووەتەوە، لە ڕوانگەیەکی زانستییشەوە سەلمێنراوە کە خورمای تەڕو خاو ماددەی سەرەکی ی خۆراکی زۆری تێدایەو لەشێوەی گیراوەیەکی(بەئاسان هەرس کراو)دایە ولەڕووی تەندروستی یەوە سوودی زۆری بۆ ئافرەتانی زەیستان هەیە.

موبارەکم دەکات ومامۆستای ڕینمـایی کـاری خێروچـاکەتان دەبم، هـەروەها خـودای گـەورە فەرمانم پێ دەکات لەسەر نوێژکردنی بەردەوام و زەکات دانی ماڵ و سامان لەماوەی ژیـانم دا، جگە لەوەی کە فەرمانیشم پێ دەکات چاکە لەگەڵ دایکمدا بکـەم و ڕێـزی تـەواوی لێ بنـێم، دیسان خودای مەزن منی بەکەسێکی خۆبـەزل زان و لـەخوا یـاخی دانـەناوەو سەرپێـچیکاری فەرمانی نابم، هێمنیو سەلام و ئاسایش لەسەر من بووە لە ڕۆژی هاتنە دنیام و لەڕۆژی لەدنیا دەرچوون و لەڕۆژی زیندوو بوونەوەیشم دا).

هەموو ئەم دێڕانەی دوایـیش مانـاو ڕاڤـەی ئـەم ئایەتانـەن کـە خـودای گـەورە تیایانـدا فەرمویە:

﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا[١] ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأُخْتَ هَـٰرُونَ[٢] مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَـٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَـٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِى وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَـٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾مريم/٢٧-٣٣.

---

(١) فرياً: تاوانێکی زۆر گەورەو سەخت کە منداڵێکت بێباوك هەیە.

(٢) يا أخت هارون: واتە (ئەی خوشکەکەی هارون). دەربارەی وشەی (هارون) لێرەدا جیاوازی بیروڕا لـەنێو زانایاندا هەیە لەسەر مانای ئەو (خوشك و برایەتی یە)و داخۆ (هارون) کێبێت؟ بۆ نموونە هەنـدێك لـەزانایان دەڵێن: (براکەی-موسا-یە). مەبەستیش لەو قسەیەی خەڵکی ئەو سەردەمە بە"مەریەم" ئەوەبووە کە (ئێمـە لەکاری عیبادەت و خواپەرستیتدا وەك (هارون)ی خواپەرستمان دیویت و بەخوشکێکی ئەو خواناسەت لەقەڵەم دەدەین). بێگومان "مەریەم" لەکوڕانی (هارون)ی برای (موسا) بووەو بەڕەچەڵەك براوەتەوە سـەر (خوشـك و برایەتی)یەك لەگەڵ (هارون)دا چونکە لەنەوەی ئەو بووە، هەروەك چۆن بە (تەمیمی)یـەك دەگوترێـت: (ياأخا تميم) واتە: ئەی برایەکی(تميم). یان کە بەعەرەبش دەگوترێت: (يا أخا العرب) ئـەی بـرای عـەرەب. هـەروەها گوتراوە: لەو سەردەمەدا لەنێو (بنو اسرائيل)دا خوا پەرستێك هەبووە کە هەر خـۆی بـۆ خواپەرسـتی تـەرخان کردووەو ناوی (هارون) بووەو "مەریەم"یشیان لەکاری خواپەرستیدا بە خوشکێکی ئەو داناوە، چونکە لەسـەر ڕێبازی ئەو پیاوە خودای پەرستووەو وەك ئەو خۆی بۆ خزمەتی ماڵی خـودا و عیبـادەت تـەرخان کـردووە... واتە وەك ئەو خۆی وەقف کردووە.

# بەندی سێ یەم

## (( پەیامی "عیسا" ))

( گومڕایی (بنو اسرائیل) – پێغەمبەرێتی ی "عیسا" - مزگێنی دان بە هاتنی "محمد"ﷺ - شوێنکەوتوانی "عیسا"- موعیجیزەکانی "عیسا"- بەربەرەکانی ی " جولەکە" لەدژی "عیسا"- کۆتایی "عیسا"- بانگەوازی "عیسا" بۆ خوا بەیەکگرتن بووە. )

## گومڕایی ( بنو اسرائیل )

کاتێك(بنو اسرائیل) لەڕێی راست لایان داو لە سنووری شەرعی خودا تێپەڕین و سەرنگووم بوون لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان چ لەڕێی حەڵاڵ و چ لەڕێی حەرامیشەوە، ئیتر خودای گەورەش گەلێك شتی حەڵاڵی لێ حەرام کردن لەو شتانەی کە لەوە پێش حەڵاڵ بوو بۆیان، هەروەها خودای گەورە لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟[1] حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾النساء/ ١٦٠-١٦١.

هەروەها ئەوان لە چەند بیروباوەڕێکی ڕۆحی لایان دابوو، ئەوەبوو کۆمەڵێکیان نکوولێیان لە ڕۆژی دوایی و زیندووکردنەوە دەکرد، بەم پێیەش نکوولێیان لەسزاو لێپرسینەوەو پاداشت دەکرد... ئەمەش بووە هۆی نغرۆبوونیان لەهەواو ئارەزووەکان داو ڕۆچوونیان لەبەدکاری و هەوەسپەرستی دا بێئەوەی هەست بەسزاو لێپرسینەوە بکەن.

## پێغەمبەرێتیی " عیسا"

خودای پەروەردگار عیسای کرد بەپێغەمبەر لەتەمەنی (٣٠)ساڵیدا دوای ئەوەی سرووشی (وەحی) لەپەروەردگاریەوە پێ گەیشت و فێری (تەورات) و (ئینجیل)ی کرد، هەروەك خودا خۆی دەفەرموێت: ﴿وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴾آل عمران/٤٨

---

(١) هادوا: واتە ( یەهوود)-جولەکەکان.

﴿...وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾المائدة /٤٦

جا دوای ئەمە"عیسا" دەستی كرد بەمزگێنی دان بەخەڵكی و بە گەیاندنی پەیامی خودا پێیان و بانگی كردن بۆ پابەندی پێوەی و پەیڕەوی كردنی، چونكە وەك پێی ڕاگەیاندبوون ئەو بۆ ئەوە هاتووە، كە تەقەللا بدات لەپێناوی گێڕانەوەی جولەكەكان بۆ سەر ڕێی ڕاست و بەرگرتن لەو گومڕابوونەیان و، ڕوونكردنەوەو ڕەواندنەوەی ئەو ئیختیلاف و ناتەباییەش، كە دەربارەی ڕەواو ناڕەوا (حەلاڵ و حەرام) لە نێوانیاندا دروست ببوو، پاشان ئەو شتانەی لێ یان حەرام كرابوو، بۆیان حەلاڵكاتەوە بەفەرمانی خودا، هەروەك خودای گەورەش دەفەرموێت:﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾الزخرف/٦٣- ٦٤.

## مزگێنی دان بەهاتنی ( محمد ﷺ )

یەكێك لەو هەواڵانەی لەپەیامی "عیسا"دا بوو مژدەدانە بەهاتنی پێغەمبەرێكی دیكەی خودا لەپاش خۆی كەناوی (ئەحمەد-ە) واتە: (محمدﷺ)، هەروەك خودای گەورە لەسەرزاری "عیسا"وە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ الصف/٦..

واتە: (عیسای كوڕی "مەریەم" گوتی: (ئەی گەلی (بنو اسرائیل) بێگومان من پێغەمبەری ڕەوانەكراوی خودام بۆ لای ئێوەو، باوەڕهێنەرو بەڕاست دانەری كتێبەكانی پێش خۆم و تەوراتیشم، هەروەها مژدەتان پێدەدەم دەربارەی هاتنی پێغەمبەرێك لەدوای خۆم كەناوی (ئەحمەد-ە).)

"عیسا" بەزاراوەو بێژەی (پێغەمبەر) ناوی مژدە لەسەردراوەكەی دەبرد، هەروەها بە بێژەی "میسیا" و " فارقلیط"یش. بێگومان "فارقلیط" بێژەیەكی تەعریب كراوی زاراوەی یۆنانی (بیریكلتوس)ـە كە لە تەرجەمە یۆنانی یەكەی ئینجیلدا هەیەو مانای (بیریكلتوس)یش بە زمانی یۆنانی واتە (محمد واحمد)[1].

---

(١) دەربارەی وشەی (بیریكلتوس) مامۆستای زاناو عەللامە(عبدالوهاب النجار)ی دانەری كتێبی (قصص

# شوێنکەوتوانی "عیسا"

"عیسا" لەبانگەوازەکەیدا ڕووبەڕووی مشتومڕو شەڕەقسەی (صدوقی یەکان) بووەوە، کە تاقمێك بوون لەجولەکەکان و نکوڵییان لەڕۆژی دوایی (ئاخیرەت) و سزاو پاداشتەکانی دەکرد، هەروەها ڕووبەڕووی سەرکردە ئاینی یە لارەکانیشیان بووەوە کە بەهۆی بیروڕا چەوتە ئایینی‌یەکانیانەوە لەعەقیدەی ڕاست لایان دابوو، وەك(فریسی-و نووسەرو کاهینان). بەلام"عیسا" بەو بەڵگە بەهێزو قەناعەت پێهێنەرانەیەوە هەموویانی بێدەنگ کردو نارێکی ی ڕێبازەکەشیانی بۆ ڕوون کردنەوە، سەرەڕای ئەوەش لەسەرنکوولی و بێباوەڕییان هەر بەردەوام بوون.

جا کاتێك"عیسا" دیتی ئەوا تەوژمی لاری و سەرپێچی لەنێوانیاندا پەرەدەسێنێت و نیشانەکانی بێباوەڕیش زیاتر لەدڵیان دەچەسپێت، بەرەو ڕووی هەموویان وەستاو پێی گوتن: (کێ شوێنکەوتووی منە لەگەڕانەوە بۆ سەر ڕێبازی خوادا؟) لەوەلامدا خێرا ئەو قوتابیانەی کەباوەڕیان پێ هێنابوو، بەئازایەتی و چاوقایمی‌یەوە باوەڕی خۆیان ئاشکرا کرد هەر چەندە کەژمارەیەکی کەمیش بوون لەچاو کۆمەلانی بێباوەڕدا، هەروەك قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە..

﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾آل عمران/٥٢-٥٣..

لەم ئایەتەدا وشەی (حواریون) مانای (هاوەلانی عیساو قوتابی یە نزیکەکانی دەگەیەنێت)، ئەوانیش دوازدە پیاو بوون و بەزمانی ئەم سەردەمە بە (مژدەکاران=مبشرین) ناودەبرێن -و ئەوانە بوون کە (مەسیح) لەژیانی دا ناردوونی بۆ لای خەلکی شوێنەکانی تر تاکو مژدەی هاتنی ئەو ئاینە تازەیەیان پێ بگەیەنن.

---

الأنبياء) پرسیارێك لە دکتۆر (کارلۆ نلینو)ی ڕۆژهەلاتناسی ئیتالی دەکات، ئەویش لەوەلامدا دەڵێت: (قەشەکان دەڵێن ئەم وشەیە مانای (ئارام پێدراو) دەگەیەنێت. مامۆستا (عبدالوهاب) پێی دەڵێت: (من پرسیار لەدکتۆرێکی وەك تۆ دەکەم کە (بڕوانامەی دکتۆرات لەئادابی زمان)دا هەیە، نەك پرسیار لەقەشەیەك بکەم). ئینجا دکتۆر دانی پێ دادەنێت و دەڵێت: (مانای وشەکە واتە ئەو کەسەی حەمدو سوپاسی زۆرە). دوایی مامۆستا (النجار) لێی دەپرسێتەوە: (ئایا ئەمە شایستەی بەباشتردانان و ئامرازی (أفعل) نی یە کەوا لەجیاتی (حەمد)- أحمد بێت؟) ئەویش دەڵێ (بەڵێ وایە).. قورئانی پیرۆزیش زیاتر ئەو ڕاستی یەی سەلماندووە لەم ئایەتەیدا (ومبشراً برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد).

# موعجیزەکانی " عیسا"

لەو سەردەمەدا پیاوانی ئایینی هەستیان بەمەترسی یەك دەکرد، کە گەمارۆی داون، چونکە ئەوا "عیسا" هاتووەو سەرزەنشتیان دەکات لەسەر ڕۆچوونیان لەهەواو ئارەزووپەرستی داو لەسووربوونیان لەسەر بەدکاری، ئەوەبوو دەستی کرد بە پەردەلادان لەسەر کاری نابەجێ و نهێنی یەکانیان و لەنێو خەڵکی دا ڕووی ڕاستەقینەیانی باس دەکرد و دەردەخست.

ئەوانیش بەتێکڕای دەنگ و ڕێکەوتنی نێو خۆیان بڕیاریاندا بەتوندی دژایەتی بکەن و بەدرۆی بخەنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ویستیان شەرمەزاری بکەن و داوای چەند بەڵگەیەکی بەهێزیان بۆ سەلماندنی پەیامەکەی لێ دەکرد، خودای گەورەش بۆ ئەو کارە بەچەند موعجیزەیەکی گەورە پشتگیریی کرد، وەك ئەم موعجیزانە:

١- لەقوڕ شێوەی پەیکەرێکی باڵندەی دروست کردو پاشان فووی پیاکردو، بەفەرمانی خودا بوو بە باڵندەیەکی زیندووی ڕاستەقینە.

٢- چاکردنەوەی کەسێکی کوێرو نابینا کە هەر لەمنداڵیەوە بەکوێری لەدایك بووە و باوکیشی کوێر بووبێت، بەوشێوەیەی دەستی بەچاوانی دادەهێناو بەفەرمانی خودا چاوی دەبینیو چاك دەبووەوە.

٣- دەست هێنان بەسەر کەسێکدا کەتووشی نەخۆشی بەڵەکی بووەو پەڵەی سپی کەوتۆتە پێستیەوەو بەیارمەتی خودا چاکی دەکردەوە.

٤- زیندوو کردنەوەی مردوان بەفەرمانی خوداو (لەڕێی بانگکردنیان یان دەست لێدانیانەوە).

٥- خەڵکی لەماڵەوە هەرچیەکیان بخواردایەو پاشەکەوت کردایە، "عیسا" دەیزانی و هەواڵی ئەو خۆراك و پاشەکەوت کراوانەیانی پێ دەگوتن.

خودای گەورە ئەم پێنج موعجیزەیەی باس کردووەو لەسەر زمانی "عیسا"وە فەرموویە:

﴿..إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ آل عمران/٤٩..

"عیسا" موعجیزەیەکی تریشی هەبوو کە لەسەر داوای حەواری یەکان (قوتابی و

شوێنکەوتوانی) پیشان دا" ئەوە بوو خوانێك خۆراك لە ئاسمانەوە نێررایە خوارەوە بۆ لایان تالۆی بخۆن و بەتەواویش لەباوەڕیان دڵنیا بن و بزانن کە لەسەر ڕێی ڕاستن و ڕاستی ی پەیامەکەی"عیسا"شیان بۆ بسەلمێنرێت.

"عیسا"ش نزای لەلای خودای پەروەردگار کرد و لێی پاڕایەوە ئەو قاپەیان بۆ بنێرێتە خوارەوە کە داوایان کردبوو:

﴿ إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۖ قَالَ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّـٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَ ۖ وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ ۖ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّىٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ المائدة/١١٢- ١١٥.

## حیکمەت لەموعجیزەکانی

لێرەدا خوێنەری بەڕێز پرسیارێکی بەخەیاڵدا دێت لەمەڕ ئەوەی بۆچی موعجیزەکانی "عیسا" بەو جۆرە بوون؟ دەربارەی لێکدانەوەی هۆی ئەو جۆرە موعجیزانەش گوتراوە: بۆ خەڵکی ئەو ڕۆژگارەی "عیسا" پێویست و شیاوبوون چونکە لەو سەردەمەدا خەڵکی لارییان لە (ڕۆح) هەبوو و باوەڕیان بەوجودی نەبوو، هەربۆیەش (مەسیح) بەموعجیزەیەکی وەهاوە چووە بۆ لایان کە کارێکی نائاسایی‌و سەرسوڕهێن بوو و سەلمێنەری ڕاستیی پەیامەکەشی بوو، لەهەمان کاتیشدا جارێکی ڕاستەقینە و ڕاستگۆیانەی حەقیقەتی گیان (ڕۆح) بوو و بەڵگەیەکی بنەبڕ (قاطع)یش بوو لەسەر بوونی (ڕۆح).

ئەو قوڕەی کەپەیکەری باڵندەیەکی لێ دروست کردبوو و فووی پیادەکرد و کە بەفەرمانی خودای گەورەش دەبوو بەباڵندەیەکی زیندوو، تەنیا ئەو ڕاستی یە نوێیەی بۆ دەسەلماندن کەوا شتێکی تر بەنێو جەستە قوڕینەکەدا ڕۆشتووەو لەڕەگەزی خۆیشی نییەو ژیانی بەبەردا کردووە، جا ئەو مرۆڤەی، کەمردبوو و کەعیسا بانگی دەکردو زیندوو دەبووەوەو وەڵامی بانگەکەی دەدایەوە بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کەوا گیانێك لەو جەستەیەدا جێگیر دەبێت بەپێی ئەو بانگکردنەی "عیسا" و ژیانی تێدا دروست دەبێتەوە..

موعجیزەکانی "عیسا" بەپێی دانایی‌و حیکمەتی بانگەوازەکەی بووەو بۆ پەروەردەی گیانی و باوەڕ بە زیندووبوونەوە بووەو، کە بێگومان ژیانێکی تری دوای ئەم ژیانەی دنیامان هەیەو مرۆڤی چاکەخواز پاداشتی کارە چاکەکانی تیادا دەدرێتەوەو مرۆڤی خراپەکاریش لەسەر خراپەکانی سزا دەدرێت.

## بەربەرەکانیی جولەکە لە دژی "عیسا"

خودای مەزن بەو موعجیزە ڕۆشن و گەورانە پشتگیری "عیسا"ی کرد کە بێگومان هەموو زمانێك لەئاستیاندا لاڵ دەبوو و هەموو خاوەن گومانێکیشی دڵنیا دەکرد و گومانی لەدڵدا نەدەهێشتەوە.

بەڵام جولەکەکان کە "عیسا"یان بۆ ڕەوانە کرابوو دڵڕەق و پەست بوون لێی و دژایەتی‌یان دەکرد و بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا ڕێ لەخەڵکی بگرن و نەهێڵن گوێ رادێرن بۆ بانگەوازەکەی، تا لەدواییشدا پیلانی لەدژ بگێڕن.

جا کاتێك زۆر ماندووبوون لەو فرۆفێڵانەداو شکستیان خوارد لە نەهێشتنی بانگەواز کردنی و دیتیان وا هەر سوورە لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی و هەژاران و بێدەسەڵاتانیش بەردەوام بەدەم بانگەوازەیەوە دێن و لەدەوری کۆدەبنەوە، ئینجا دەستیان کرد بەهاندانی ڕۆمەکان لێ ی و وەهمی ئەو هەواڵانەیان دەخستە بیرو دڵیانەوە کە گوایە بانگەوازی "عیسا" بۆ لەناوبردنی موڵك و مەملەکەتی (قەیسەر) و ڕیشەکێشکردنی دەسەڵاتەکەیەتی..

لەم ڕێگەیەشەوە توانییان حاکمی ڕۆم هان بدەن بۆ ئەوەی فەرمانێکی تایبەت بۆ دەسگیرکردنی "عیسا" دەرکەن و حوکمی لەسێدارەدان (لەخاچ دان)یشی بۆ دەرکەن.. بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەم فەرمانە سەربازە ڕۆمانی‌یەکان دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای "عیسا"دا، لەو کاتەشدا لەنێو هاوەڵانیدا پیاوێکی دووڕوو (منافق) هەبوو کە درۆو دەلەسەی بۆ هەڵدەبەستن و دووزمانی و سیخوڕیی لەسەر دەکرد، بەڵام خودا ڕوخساری ئەو پیاوە دووڕووەی بەشێوەیەك گۆڕی کە لە"عیسا" بچێت و ئیتر بەهۆی ئەوەوە سەربازەکان گرتیان و وایان زانی "عیسا"یە، ئەویش پەشۆکاو زمانی تەتەڵەی دەکرد، خودای گەورەش بەئەمری خۆی بێدەنگی کردبوو وهیچی بۆ نەدەگوترا.. لەبەر ئەوە حوکمی لەخاچدانی بەسەردا دراو "عیسا"ش بێگومان خودا ڕزگاربوونی بۆ نوسیبوو و نەکەوتە بەر دەستیان.

قورئانی پیرۆز ڕاستیی ئەم بەسەرهاتەی وەها گێڕاوەتەوە کە خودای گەورە ڕێی نەداوە "عیسا" بکوژن، بەڵکو لەدەست ئەوان ڕزگاری کردووە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا

قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ...﴾النساء /١٥٧..

مانای ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە (ئەوان بە ئیدیعا و پڕوپاگەندەی خۆشیان نەیانتوانیبوو"عیسا" بکوژن یان لەخاچی بدەن هەروەکو ئیدیعای دەکەن، بەڵام پیاوە لەوچوێنراوەکەیان لەخاچ دابوو و وایان زانیبوو "عیسا"یە کە لەخاچیان داوە، بەڵکو کەسێکی غەیری ئەویان لەخاچدابوو).

ئەم بەشەی ئایاتەکە ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ...﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە (ئەوانەی گومانیان لەم ڕاستی یە هەیەو لەسەر ئەو بیروڕایەن گوایە "عیسا" خۆی لەخاچ درابێت و سوورن لەسەر ئەم بۆچوونە، ئەوە دیارە بەهەڵەداچوون، چونکە هیچ زانستێکی بەڵگەدار و ڕوون وئاشکرایان لەمەڕ سەلماندنی بۆ چوونەکەیان نی یە، بەڵکو هەر بەدوای گومانیاندا وێڵن).

قورئانی پیرۆز دوای باس کردنی عیساو ئەرك و پەیامی سەرشانی، باسی مەسەلەی کوشتن و لەخاچدانیشی کردووەو پەنجەی ئاماژەی بۆ ئەوەش درێژکردووە، کە گومان و بۆچوونە هەڵەکان لەو دوو مەسەلەیەی (کوشتن)و (لەخاچ دان)ـەوە سەریان هەڵداوە، ئەم شێوە گێڕانەوەیەی قورئان ڕاستی یەکی مێژوویی یە و تەنانەت لەنێو خودی (مەسیحی یەکانیش)دا چەند تاقمێك هەبوون نکوڵییان لە ڕووداوی لەخاچ دان و کوشتنی"عیسا" کردووە، وەك (ساترینوسی‌یەکان)و (مەرکیۆنی یەکان)و (پاردیسیانی یەکان)و چەندین هۆزو تیرەی تریان لەو هۆزو دەستەو تاقمانەی کە هەرگیز دانیان بەو گومانە سەیرو سەمەرانەدا نەناوە کە گوایە (مەسیح) لەخاچ درابێت و کوژرابێت.

خۆ ئەگەر لەڕێی قورئانەوە نەبێت ئەوا پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری وەکو (محمدﷺ) چۆن هەموو ئەو ڕاستیانەی دەزانی کە تا ئەو ڕۆژە لەلای گەلی عەرەبی ئەو سەردەمە نەزانراوو پەنهانی بوون؟ بێگومان ئەمەش لەو بەڵگە ڕۆشن و پرشنگدارانەیە لەسەر ئەو ڕاستی یەی، کە قورئانی پیرۆز سروشێکی خودایی(وحي الهي) بووەو هەر خودا خۆی ناردویێتی یە خوارەوە بۆ لای (محمد-ی ڕەوانەکراویﷺ) تاکو ئەو حەقیقەتەی جێی خیلاف و ناتەبایی‌و گومانداربیان بوو بۆیان ڕوون بکاتەوە و چی دی لەگێژاوی گومانە بێ‌بنچینەکاندا نەتلێنەوە.

# کۆتـایی "عیسـا"

ئەی باشە ئەگەر "عیسا" لەخاچ نەدراوە، داخۆ چی ی بەسەر هاتبێت؟

قورئان بەم فەرمایشتەی خودای گەورە وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتـەوە: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ﴾ کۆتایی ئایەتی١٥٧ وسەرەتای ئایەتی ١٥٨ی سورەتی النساء.. واتە (ئەوان-جولەکەکان-و ستەمکاران بە دڵنیاییەوە نەیانزانیبوو کە ئەمـە "عیـسا"یـەو لـەخاچ دراوە، بەڵکو تەنها بـەوەهم و گومـانی مەزنـدەکاریی ی خۆیـان وایـان دانـابوو گوایـە ئـەوە عیسایەو کۆتاییان پێ هێناوە).

هەروەها خودای گەورە لـەم فەرمایـشتەی تـری دا دەفـەرموێت: ﴿ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ...﴾ آل عمران/٥٥.. واتـە (خـودا بەعیسای فەرموو: ئەی عیسا ئەوا من بڕیـاری چـارنووس و کۆتـایی هاتنـت دەدەم و بـەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم و، ناهێڵم کەس بەسەرتا زاڵبێت و بتکوژێت و، دەربازت دەکـەم لێیـان و، پاکت دەکەمەوە لەو کردارە چەپەڵەی کە ئـەوان کـە دەیانـەوێت بەمەبەسـتی لەخاچـدانت توخنت بکەون)

سەبارەت بە ڕسـتەی ﴿وَرَافِعُكَ إِلَـيَّ﴾ لـەم فەرمایـشتەی خـوادا، زۆربـەی ڕاڤـەکاران و موفەسیرین باسی ئەوەیان کردووە کەوا بێگومـان خودا "عیسا"ی بەجەسـتەو ڕۆحـەوە بـۆ لای خۆی بەرزکردووەتەوە. لەچەندین فەرموودەی راست (صحيح)ی پێغەمبەریشداﷺ هـاتووە کـە "عیسا" وەك نیشانەیەك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی قیامەت دێتە خـوارەوە بـۆ سـەر زەوی، وەك خودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ ﴾، هاتنەخوارەوەیـشی بـۆ ناوەڕاسـتی نەتەوەی موسـڵمانانە و تێکـەڵیان دەبێـت و حـوکم بەشـەریعەتی ئیـسلام دەکـات. لـەحوکم کردنیشیدا پشت بە کتێبی خودا (قورئان) دەبەستێت و ژیانی سەر زەوی خاوێن دەکاتەوەو داد و یەکسانیی تیادا بڵاو دەکاتەوە، دوای ئەوەی پڕکرابوو لە زوڵم و زۆرداری.

بەڵام بەپێی بیروڕای دووەمی ڕاڤەکاران و موفەسیرین "عیسا" تا کاتی مردنـی بـەگوێرەی مانا ڕواڵەتی یەکەی ئایەتەکەش وەفاتی کردووەو ئینجا بەرزکراوەتەوە: ﴿بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْـهِ﴾ واتە: (چەند پلەیەك لای خودا بەرزکراوەتەوە)، وەك چۆن لەهەمـان مەبەسـتدا خـودا دەربـارەی (ئیدریس)یش فەرموویەتی ﴿وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾ مریم/٥٧...

جا ئەگـەر بـشگوترێت: دوای ئـەوە "عیـسا" بـۆ کـوێ ڕۆشـتووەو چارەنووسـی بـەکوێ

گەیشتووە؟ وەڵامی ئەمەش ئاسانەو ئەوەیە کەبێگومان خودا ئەم دوالایەنەی چارەنووسی "عیسا"ی باس نەکردووەو بۆی ڕوون نەکردووینەتەوە، ئێمەش زانیاری لەم ڕووەوە هەر بۆ خودا دەگێڕینەوەو بەبێ‌بەڵگە باسی مەسەلەیەك ناکەین کە خودا خۆی هیچی وای لەبارەوە باس نەکردبێت.

## بانگەوازی "عیسا" بۆ-خوا بەیەکگرتن-بووە

گەر بەهۆشێکی ساغ و ویژدانێکی هەقپەروەرەوە ئەو ئایەتانەی باسی "عیسا" و ئاینەکەی دەکەن، بخوێنینەوە، ئەوا بەڕاستی بۆمان دەردەکەوێت قورئان جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتە ڕۆشنە دەکات کە "عیسا"ش هەر مرۆڤێك بووەو پێغەمبەرێکی خودا بووەو ناردوویەتی بۆ ڕێنمایی‌کردنی گرۆی بەشەر و، پەیامەکەشی بانگەواز بووە بۆ یەکتاپەرستی و خوابەیەك گرتن لەبەندایەتی و خواپەرستی دا، بەندایەتی و عیبادەتیش تەنها پاك و پوخت بکرێتەوە بۆ خودا و هەر خودا بپەرسترێت.

پاشان خوابەیەك گرتن لە (ذات) و سیفەتەکانیدا کە (ذات)ێکی ماددیءو تەبەننی کراوانەی مرۆڤی نیەو لەسیفەتەکانیشی دا هیچ هاوشێوەو پێ‌چوێنراو (مشابە)ێکی نیە و نە لەکەس بووەو نە کەسی لێ بووەو، هەر وەك خودای گەورەش خۆی لەڕووی گفتاری ئاڕاستەکراویدا بۆ مەسیحیەکان و (اهل الکتاب) دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ [1] لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ [2] وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ [3] أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا﴾ النساء/١٧١..

واتە (ئەی شوێنکەوتوانی -ئینجیل- ئێوە زیادەڕۆیی لە دینەکەتاندا مەکەن و ئەو سنوورانە مەبەزێنن کە خودا دایناوەو قسەو باسی بەتاڵ و ناهەق لەسەر خودا مەڵێن وەك ئەوەی گوایە خودا کوڕی هەیەو "عیسا" کوڕی ئەو بووە، چونکە بەڕاستی (مەسیح)

---

(١) یا أهل الکتاب: ئامرازێکی بانگ کردن (نداء)ـەو بۆ مەسیحییەکان یان جولەکەکان یان بۆ هەردوولایان پێکەوە بەکاردێت.

(٢) لا تغلوا في دينكم: واتە لەو سنوورانە تێپەڕمەبن کە خودا دیاریی‌کردوون.

(٣) کلمتە: واتە ئەو کەسەیە کە بەوشەی (کن=ببە) و بەبێ‌وجودی ئامرازی ئاسایی (بووە).

"عیسا"ی کوڕی "مەریەم" تەنها پێغەمبەرێك بووە وەك پێغەمبەرانی دی و بە وشەیەك (کلمة)ی (ببە = کن) هاتۆتە دنیاوە ئەم وشەیەش مژدەیەك بووە بۆ "مەریەم" و دوایی گیان بەبەر لاشەی "عیسا"ی کوڕیدا کراوە، ئێوەش دەبێت باوەڕ بەخودا و پێغەمبەرەکانی بێنن و مەڵێن (سێ خواوەند هەیە) یان خودا پێك هاتووە لە سێ (أقنوم)ی-باب و کوڕو گیانی پیرۆز، وازبێنن لەم قسەو باسە پووچەڵانەو ئەم وازهێنانەشتان باشترو بەسوودترە بۆتان، چونکە بەڕاستی هەر خودا (الله) تاکە پەرستراوێکەو پاك و بێخەوش و دوورە لەوەی کوڕی هەبێت، هەروەها خودا خاوەنی هەموو ئاسمانەکان و زەوی‌و هەموو بوونەوەری نێوانیانە و هەر خۆیشی بەسە بۆ پارێزگاری و پێویستیی بەهیچ یاریدەدەرو جێگیرو وەکیلێك نی یە)..

هەروەها لەم بارەیەوە خودای گەورە فەرمووییەتی:

﴿ وَقَالُوا[١] ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا[٢] ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ[٣] مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴾ مريم/٨٨-٩٢.

هەروەها خودای پەروەردگار فەرموویە:

﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ[٤] كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾المائدة/٧٥

واتە: (مەسیح-ی کوڕی مەریەم) تەنها پێغەمبەرێك بووەو لەدوای پێغەمبەرانی تر هاتووەو بەرنامەکانی پێش خۆی بەتاڵ بوونەوەو داوای پابەندبوونی خەڵکی بەو بەرنامەو پەیامە تازەیەوە کردووەو دایکیشی بە گفتارو کردار لەگەڵ خوادا راستگۆ بووەو هەردووکیان (عیساو دایکی) مرۆڤ بوون و خۆراکیان دەخواردو دیارە بەخواردنی خۆراکیش وەك هەر مرۆڤێکی دی پاشەڕۆکیان هەبووە، جا بڕوانە چۆن بەڵگەو نیشانەکانمان لەسەر ئەو مەسەلەیە بۆ ڕوون دەکەینەوەو دوایش بڕوانە ئەوان چەند گومڕان و چۆن شەیتان لەخشتەیان دەبات و ناهێڵێت لەم بەڵگەو نیشانانە وردببنەوە)..

---

(١) قالوا: واتە نەسرانییەکان( مەسیحی یەکان) وادەڵێن.
(٢) إدّ ا: واتە کارێکی هێگجار بەدو ناشیرین ئەنجام دەدەن کاتێك دەڵێن خودا کوڕی بۆ خۆی داناوە.
(٣) یتفطرن: درزیان تێدەبێت و وردو خاش دەبن.
(٤) صدیقة: واتە ( خوونەریتی ئەو: ڕاستگۆیی‌و ڕاست پەروەرییە).

لەو ئایەتانەدا سەرنج بدە چۆن خودای مەزن بێژەی (مەسیح)ی بەوشەی (کوڕی مەریەم: ابن مریم)ـەوە لکاندووە تاکو خەڵکی بێدارکاتەوە لەو ڕاستی یەی کەوا "عیسا" کوڕی "مەریەم"ـە نەك کوڕی خودا (سبحان الله).

لەم ڕووەوە دکتۆر (عبدالحلیم محمود) دەڵێت: (خودا کاتێك مەسیحی یەکان لەو ڕاستی یە وریا دەکاتەوە کە مەسیح و دایکی خۆراکیان دەخوارد ﴿كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ﴾، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کەوا ئەو کەسەی خۆراك دەخوات و بەلەشی دا دەڕواتە خوارێ و لێ ی دەبێت بەخوێن و گۆشت و ئێسك و، عەرەقیشی لێ دەڕژێت و پاشان ئەوەی لێ ی دەمێنێتەوە دەبێت بەپاشەڕۆکێکی زیادەو لەلەشی دەردەچێت و گەر تێ ی دا بمێنێتەوە زیانی پێدەگەیەنێت.. جا وەك ڕوون و ئاشکرایە مەخلووقێکی لەم تەرزە هەر دەبێت مرۆڤێکی ملکەچی هەر جۆرە ڕێساو داب و نەریتێکی مرۆیی بێت لەو ڕێسایانەی کە لەپلەو پایەی پێغەمبەرێتیشی کەم ناکەنەوەو کەم و کووڕی ی بۆ دروست ناکەن)[1] .....

پاشان قورئان ڕووداوێکی ئایندەمان لەم بارەیەوە بۆ باس دەکات کە لەڕۆژی قیامەتدا ئەم گفتوگۆیە لەنێوان خوداو عیسادا دێتە ئاراوە، هەروەك خودای گەورە خۆی لەقورئاندا ئاماژەی پێ داوەو فەرموویەتی:

﴿(١١٥) وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ[2] مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ (١١٦) مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ المائدة/١١٦-١١٨.

واتە سەبارەت بەو پڕوپاگەندەو ئیدیعایانەی گەلەکەی "عیسا" کە گوایە -عیسا و دایکی- دوو خواوەندن، سەبارەت بەمە خودای گەورە لەڕۆژی دوایی دا و بەئامادەبوونی ئەو گەلەو بە مەبەستی سەرزەنشت کردنیان، لە "عیسا" دەپرسێت: (ئەرێ "عیسا" تۆ لەدنیادا بەو خەڵکەت گوتبوو (خۆم و دایکم لەجیاتی خودا بپەرستن؟) "عیسا"ش لەوەڵامی خوای پەروەردگاری دا دەڵێت: (خودایە پاکی و بێخەوشی هەر بۆ تۆیەو چۆن بۆم هەبووە ئەو وتەیەیان

(١) بروانە کتێبی ( التفكير الفلسفي في الأسلام)ی دکتۆر (عبدالحلیم محمود).
(٢) سبحانك: واتە ( زۆر زۆر بەرزو پیرۆزو بەدووریت لەوەی کە هاوەڵت هەبێت).

پێ بڵێم، خۆ گريمان ئەگەر پێشم گوتبێ ئەوا خۆت زانيوتە و هەر خۆيشت دەزانيت چيم لەدڵ و دەروونی خۆمدا حەشارداوە، چونكە بێگومان هەر خۆت زاناو ئاگاداری ناديارەكانيت، جا خودايە وەك خۆت ئاگاداربوويت من تەنها ئەو فەرمان و ڕاسپاردانەی تۆم لەدنيادا پێ‌دەگەياندن و هەرچی تۆ فەرمانت پێ‌دابوو ئەوەم پێ ڕاگەياندن كە دەبێت هەر تۆ بپەرستن، چونكە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئەوانيشيت، هەروەها من شايەت و ئاگاداری كردارەكانيان بووم لەدنيادا و بەوردی چاودێريم دەكردن هەتا لەژياندا بووم، بەڵام دوايی كە منت بردەوە بۆ لای خۆت و كۆتايی بەماوەی گەياندنی پەيامەكەم هات، هەر خۆت چاودێرو ئاگاداری كاروباريان بوويت و دوای ئەوە من هيچ لەبارەيانەوە نازانم، جا ئەی خودای ميهرەبان ئەگەر لەسەر ئەوە سزايان بدەيت ئەوە هەر بڕيارو هەڵسوكەوتی خۆتە و هەر خۆت مافی هەڵسوكەوتت لەسەر عەبدەكانت هەيەو دیارە شايستەی ئەو سزايەشن، بەڵام خۆ ئەگەر لێيان خۆشبيت ئەوە هەميسان هەر بڕياری خۆتەو ئەوانيش هەر عەبدو بەندەی تۆن و هەر خۆيشت باڵادەست و دانايت و هەموو كارێكی ئيلاهيانەت لەهێزو دەسەڵات و حيكمەتێكی گەورەوە سەرچاوە دەگرن).

لەم ئايەتانەدا ڕێبازێكی جوان و بەسام و شكۆداری چۆنيەتی ئامۆژگاری و بانگەواز بۆ ڕاست كردنەوەی بيروبۆچوون هەست پێ دەكرێت كە دەربارەی حەقيقەتی بارو دۆخی مرۆڤيانەی عيسايە عليه السلام.

لە فەرمايشتەكەی خوادا كە لەسەر زاری "عيسا"وە هاتووە و فەرموويە: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ﴾" ديمەنی حاڵەتێكی كرانەوەی دەروونی و سايكۆلۆژيی ی "عيسا" پيشان دەدرێت كە پڕيەتی لەسۆزو بەزەيی بۆ گرۆی ئادەمی و، لەهەمان كاتدا دان نانە بە تواناو دەسەڵاتی خوداو بەپيرۆزی و حيكمەتيشيدا لەسەر مەسەلەی (سزادانی بەندەكانی) ياخود (لێ خۆشبوونيان).

بێگومان ئەم ئايەتە شوێنەوارێكی گەورەی لەنێو دڵ و دەروونە باوەڕدارەكاندا هەيەو لەم بارەيەشەوە لە پێغەمبەری خودا (محمد ﷺ)ەوە گێڕراوەتەوە كە شەوێكيان هەستاوە بۆ نوێژكردن و تابەيانی ئەو دوعايەی نێو ئايەتەكەی ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ .. ﴾ خوێندووەو وتووەتەوە.

## ئاینی "نەسرانی" و زۆرترین ڕێز و خۆشەویستی بۆ ئیسلام

یەکێك لەو ڕاستی یە گرنگانەی کە زۆر کەس نایزانێت ئەوەیە ئیسلام بەتەنیا ئاینی نەسرانی یەکانی بەهۆی ڕێزو خۆشەویستی یەوە لەهەموو ئاینەکانی دی جیاکردووەتەوە، چونکە ئاینی "نەسرانی" لەگەڵ ئەوەشدا کە نکوولّی لە (خواوەندێتیی مەسیح) و (لەخاچ دان) و بیروباوەڕی بە سیان دانان (التثلیث)[1] دەکات لەهەمان کاتدا بەئاشکرا ڕایگەیاندووە کە نزیکترین ئاینە لەئیسلامەوە لەڕووی سۆزو خۆشەویستی بۆ نواندنیەوە، هەروەك قورئانیش بەم فەرمایشتەی خودا دووپاتی دەکاتەوە: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾المائدة/٨٢..

واتە: (ئەی محمد تۆ بێگومان دەبینیت لەنێو ئەو کەسانەی-أهل الکتاب-دا ئەوانەی خۆشەویستی و سۆزیان زیاترە بۆ باوەڕداران ئەو کەسانەن، کە گوتوویانە: ئێمە نەسرانی یەکانین، ئەم وتەیەشیان لەگیانێکی لەخۆبوردوویی و میانڕەوی و هەست ناسکی یەوەیە و زووتریش مل بەهەق دەدەن، ئەمەش چونکە چەند پێشەواو زانایەکی وایان هەیە، کە بەچاکی شوێنکەوتوانیان پەروەردە دەکەن و هێندە سەرگەرمی دنیاو خۆشی و ئارەزووەکانی نین و بۆ خواپەرستی یەکلابوونەتەوەو،وەك جولەکەکانیش لووتبەرزو خۆبەزل زان نین).

هەروەها خودای گەورە لە شوێنێکی تری قورئاندا ستایشی ئەو کەسانەی کردووە کە بەڕاستی شوێنکەوتووی مەسیح بوون و لەسەر ڕێبازەکەی ڕۆیشتوون و بەڕەوشت و ئاکاری ئەو جوولاونەتەوە: ﴿وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً﴾ الحدید/٢٧.

جا دوای ئەوەی باسی لێوەکراوە چ لەم ڕوانینەی قورئاندا بۆ (مەسیح-و بۆ- دایکی) و دانان نان بە پێودانگ و ئەرزش و بەرزیی پلەو پایەی لای خودایان داو، چ لەوجودی ئەم جۆرە ڕێزو خۆشەویستی یەی نێوان هەردوو ئاینەکەش دا، پێویستە ئەم جۆرە باسانە موسڵمانەکان و

(١) بیروباوەڕی بەسیان دانان، یان دانانی سێ بنچینەی خوایەتی (التثلیث) بەو سێکوچکەی پیرۆزیەی دەڵێن کە لەهەر سێ ئەسڵەکەی لای خۆیان یێك دێت واتە لە ( باوك و کوڕو ڕۆحی پیرۆز) پێك دێت و بە (عەقیدەی-تثلیث ) ناودەبرێت و گوایە لە (ذات)ی پەرستراوێتی (ألوهیة) دایە. (وەرگێڕ)

مەسيحى يەكانيش هان بدات لەسەر سۆزو خۆشەويستى يەكدى و هاوكارى ى نێوانيان لەسەر بەدى هێنانى چاكەو بەرژەوەنديە ڕەواكانى مرۆڤايەتى و وەستان لەدژى ئەو كفرو بێباوەڕى و ئيلحادەى كە خەريكە سەرانسەرى جيهان دەگرێتەوە و تەنگ بە كۆمەڵانى ئيمانداران هەڵدەچنێت.

# بەندی چوارەم

## ((چەند پەندو وانەیەك))

(خواستنی نەوەی باش - پارێزكاریو سوودەكانی - بانگەواز بۆ سەرخستنی ئایینی خوا)

### خواستنی نەوەی باش

خواستن و ویستنی منداڵ خوویەكە لەدەروونی مرۆڤایەتی و ئارەزوویەكی ئاسایی و سرووشتیشیەتیو بە ڕەمەك (غەریزە)ی مانەوەی ڕەگەز ناودەبرێت... بێگومان ئیسلامیش فیطرەت و غەریزەی مرۆڤایەتی ی بەدوور نەگرتووەو پێچەوانەشی نی یە، هەروەك لەچیرۆكی پێغەمبەری خودا (زەكەریبا)شدا سیمای سروشتی مرۆڤ دەكێشێت لەخواستن و خۆشەویستنی منداڵ و هەوڵبۆدانی دا. لەمەشدا "زەكەریبا" نموونەی پێشەنگێكی چاك پیشان دەدات، چونكە پیاوێكی بەتەمەن و بەساڵاچوووەو ژنەكەشی لەتەمەنی شیاوی سكپڕیو زاوزێدا نەماوەو، لەگەڵ ئەوەشدا لەقاپی ی ڕەحمەتی خودا دەدات و بەنزاو پاڕانەوە داوای لێ دەكات لەو تەمەنەدا نەوەیەكی چاكی پێ ببەخشێت: ﴿رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةً﴾.

ئەمە ئامۆژگاری یەكە بۆ ئێمەش لەسەر ئەوەی خوازیاری ڕۆڵەی باش بین و سووربین لەسەر پێگەیاندنی وەچەیەكی صالح و ڕەوشتبەرزو جێ ی شانازیمان بن، ئێمەش لەگفتارو كردارماندا سەرمەشق و پێشەنگیان بین تاكو ڕۆڵەكانمان هۆی خۆشی و ئاسوودەیی ژیانمان بن و پاڵپشت و یاریدەدەریشمان بن لەهەر ڕووداو و كارەساتێكدا كە تووشمان ببێت، جگە لەوەی لەدوای مردنیشمان گەنجینەیەكی بەنرخی پاشەكەوت كراومان دەبن و بەنزاو دوعاكانیان شادو بەهرەمەند دەبین.

هەر بۆیەش پێغەمبەری خودا محمد ﷺ فەرموویەتی: **((اذا مات الانسان انقطع عمله الاّ من ثلاث: صدقة جارية، او علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له))**.. واتە (كاتێك ئادەمیزاد دەمرێت هەموو كارو كردەوەیەكی چاكەشی كۆتایی پێدێت تەنها لەسێ بواردا نەبێت: (١)خێرێكی بەردەوام وەك چاندنی درەختێك یان دروست كردنی مزگەوتێك یان هەر شتێكی هاوشێوەیان. (٢)بەجێهیشتنی زانستێك، یان گەیاندنی زانستێك كە سوودی بۆ خەڵكی هەبێت، (٣)ڕۆڵەیەكی چاك و خواناس كە نزای لەلای خودا بۆ بكات.).

ئەوەی جێی ئاماژە پێدانیش بێت ئەوەیە "زەكەرییا" كاتێك ڕووی كردە قاپی ی ڕەحمەتی خوداو لێ ی دەپاڕایەوە كە كوڕێكی پێ ببەخشێت، لەوپەڕی ملكەچی و پێزانین بەنیعمەت و بەخشندەیی خودا دابوو، دانی بەلاوازیو دەستەوسانی ی خۆی دادەناو، بەتەمای بەدیهاتنی ئاواتەكەشی بوو.

ئەمەش وانەیەكە بۆ باوەڕداران لەچۆنیەتی پەنابردنە بەر خوداو لێپاڕانەوەی بۆ هەر شتێك كە لێی دەخوازن. پاشان لەكاتی گیرابوونی نزاو پاڕانەوەو بەدیهاتنی ئاواتدا پێویستە مرۆڤ بەڕادەیەكی زۆر سوپاس و ستایشی خودا بكات. خودای خۆی بەرزو پیرۆز ڕاگرێت و بەپاك و تەواوی بزانێت لەهەر كەم و كووڕییەك، چونكە "زەكەرییا" كاتێك دوعاكەی گیرابوو بوو و مژدەی منداڵێكی پێ درابوو، ئیشارەتی بۆ كەسوكارو شوێنكەوتوانی كرد كە ئەوانیش(وەك خۆی) خودا بەپاك و پیرۆز ڕاگرن و بەیانیان و ئێواران هەردەم (تەسبیحات)[1] بكەن.

وانەیەكی تر كەلەم چیرۆكەوە دەری دێنین ئەوەیە گەر منداڵان لەنێو باوەشی كەسانی خواناس و بەتەقوادا پەروەردە بكرێن ئەوا بەدوور دەبن لە بەدكارییو، پاشان لەهەر جۆرە مەترسییەكیش دەپارێزرێن، پێشڕەو و سەرمەشقیشمان لەم ڕووەوە ئەو جۆرە پەروەردە نایابەی "زەكەرییا"یە بۆ "مەریەم". ئەوەبوو ئەم كچە كاتێك كەوتە لای زەكەرییا و ئەویش بەو شێوازە ڕاست و دروستە پەوەردەیی یە لەماڵی خودادا بەخێوی دەكردو لەهەموو ئامرازێكی خراپ و لەهەر جۆرە هۆیەكی كاریگەری ناڵەباری دوور خستبووەوە.. دیارە بەم ڕەنگەش كچێكی خواپەرستی وەك "مەریەم" دەگاتە ئەو پلە بەرزەی لەخواترسان و نزیك بوونیش لەخوداوە. تەنانەت قورئانیش بەم جۆرە ستایش و ڕێزلێنانە گەورەیە ستایشی دەكات و لەهەموو ئافرەتانی دنیای بەچاكتردادەنێت: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾.

## پارێزكاری و سوودەكانی

خودای مەزن ڕزق و ڕۆزیی خەڵكی لەم ژیانی دنیایەدا بەپێی چەند هۆكارو ئامرازێك دابین كردووە. بەڵام مرۆڤ بەهەوڵ و تەقەللای زۆرو سەختی خۆی بەدەستی دێنێت. ئەم هەوڵ و تەقەللایەش بەشێكی دیاری هۆی دابین كردنی ڕزقی خودایە. هەر بۆیەش خودای مەزن

(١) تسبیحات: (التسبیح) گوتراوە لێرەدا بەمانای بەپاك ڕاگرتنی خودا لەهەر خەوشێكە، گوتراویشە مانای نوێژی گەیاندووە لەلای ئەوان.

فەرمانی بە باوەڕداران کردووە کە چەند کاتێك بۆ کۆشش و کارکردن تەرخان بکەن: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾.

بەڵام خۆ هەموو ڕزق و ڕۆزی یەك هەر تەنها بە هەوڵ و کارکردنی زۆری مرۆڤ بەدی نایەت، چونکە بێگومان خودای گەورە هەندێك جار بەبێ هۆکارو ئامرازو، بەخواستی ئیلاهی ی خۆی بەشێکی فرەی ڕزق بەچەند کەسێك لەعەبدەکانی خۆی دەبەخشێت لەو عەبدانەی کەوا بەپێی مەرام و دانایی یەکی خۆی پێیان دەدات، بێئەوەی ئەو کەسانە هەوڵێکی زۆریشیان بۆ دابێت، هەروەك خودای گەورە خۆی لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾.

ڕزق و ڕۆزی یەکانی خەڵك بەندە بەڕازو نهێنی ی خودای گەورەوەو دەیبەخشێت بەهەر کەسێك کە خۆی خواست و قەدەری لەسەربێت و بەپێی فەرمان و حیکمەتێکی پێویستیشی بێت، هەندێك لەو ڕازو نهێنی یانەی زۆربوونی ڕزق کە قورئان دەری خستوون ئەوەیە: بێگومان لەخواترسان و پارێزکاری (التقوی) هۆیەکی بەدەست هێنانی ڕزقی پاکە، هەروەك خودای گەورە خۆی فەرموویە: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾.

هەروەها لەچیرۆکەکەی "مەریەم" و "عیسا"شدا قورئان نهێنی تەقواو لەخواترسانی بۆ دەرخستووین. بۆ نموونە "مەریەم" پاکترین خۆراکی بۆ دەهات و دەیگوت: (ئەمە لەخوداوەیە)، دیارە ئەمەش هەر لەناسەوارەکانی ئەو پارێزکاری و تەقواو لەخواترسانەیە کە خودا وەك ڕەوشتێکی پاك بەتایبەتی پێی بەخشیبوو: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ لەم ئایەتەدا وشەی (المحراب) سەرنجت ڕادەکێشێت بەلای ئەو کەشە عیبادی یەی کە مەریەمی تێدابووەو هەر ئەم کەشە خاوێنەشە کە سیفەتی تەواوی (پارێزکاری و دووربوون لە گوناهان) بەو جۆرە خواپەرستانەوە دەلکێنێت.

هەروەها بیرکەرەوە لەو چرکەساتە ناسکانەی، کە"مەریەم" منداڵەکەی هەڵدەگرێت و لە حاڵەتێکی ناخۆش و شەرمەزاری ئاوادا چاوی بەگەلەکەی دەکەوێت، کە بەڕاستی مرۆڤ تیایدا تەریق دەبێتەوە و چاودا دەخات و زمانیشی لە گۆ دەکەوێت لەبەر گەورەیی و زۆری ی ئەو ترس و لەرزەی کە لە هەڵوێستێکی پڕ لەعەیب و عارو شوورەیی ی ئاواوە تووشی دەبێت.

بەڵام خێرا لەوێدا خودا ئیلهامی ئەوە بە "مەریەم" دەگەیەنێت، کە بۆ وەڵام دانەوەی هەر توانج و پلارێکی خەڵکەکە، با ئیشارەت بۆ منداڵەکەی بکات، ئەویش بەئیشارەت سەرنجی ئەوان بەلای منداڵەکەدا ڕادەکێشێت و، منداڵەکەش لەنێو پێخەفەکەی‌دا دێتە قسەکردن و باشترین شایەتی و گفتار لەسەر دایکی دەدرکێنێت، ئەمەش هەر موعجیزەیەکی "عیسا" بووەو مایەی ڕێزو کەرامەتیش بۆ دایکە ڕەوشتبەرزو پاك داوێنەکەی بووە، چونکە خودا هەرگیز عەبدە چاك و پارێزکارەکانی فەرامۆش ناکات و پشتیوانییان لێ دەکات.

هەروەك لەفەرمایشتی بەرزو پیرۆزیشی دا دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾... ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا﴾.کەوا بوو تەقواو خۆپارێزی لە گوناھ و لەسزای خودا هۆو ئامرازێکە بۆ پەیدابوونی ڕزق و خۆشگوزەرانی‌و ڕزگاربوون لە تەنگانە. ئێمەش زۆر زۆر پێویستمان بەو سیفەتە بەرزو جوانانایە تاکو ڕەوشت و ئاکاری خۆمانی پێ برازێنینەوەو توێشووی سەفەری قیامەتمانی لێ‌پڕکەین، بۆ ئەوەی چ لە دنیاو چ لە ڕۆژی دوایی (ئاخیرەت)یشدا بەختەوەرو شادمان بین. چونکە بەڕاستی هەر (تەقواو خۆپارێزی) باشترین توێشووی کاروانی ژیانە، هەروەك خودای گەورەش لەم ڕووەوە فەرمان بە تەقواکاران دەکات کە توێشوویان پڕکەن و پێیان دەفەرموێت: ﴿وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾...

## بانگەواز بۆ سەرخستنی ئایینی خودا

بانگەواز بۆ سەرخستنی ئایینی خودا لەو وتانەی "عیسا"دا بۆمان دەردەکەوێت کاتێك لەگەڵ گەلەکەی دا دەدوێت و هەست بە وجودی گومان و کەم و کووڕی لەباوەڕی هەندێکیاندا دەکات و، هێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوانیاندا دادەنێت: ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾.. دیارە وەڵامی شوێنکەوتوان (أنصار)یشی بەڕاستی و بێ‌پێچ و پەنا ئـــــەوەبووە: ﴿نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾.

لەم ئایەتەدا قورئانی پیرۆز دەستی ڕێزو گەورەیی و ستایش بۆ ئەو کۆمەڵە کەسە ڕادەکێشێت کە باوەڕیان بە "عیسا" هێناوەو ئیمانەکەشیان ئاشکرا کردووەو، ئامادەییان دەربریوە بۆ سەرخستنی ئاینەکەو باکیان نەبوە لەوەی کە چەندە قوربانی و خۆبەخت کردنی بوێت.

بە ڕاستی ئەمەش نموونەیەکی قەشەنگی باوەڕداریو قوربانی دانەو، خودا دەیخاتە بەر دیدەی باوەڕداران تاکو شوێن پێی ئەوان هەڵگرن و لەسەر ئاکارو داب و نەریتیان بڕۆن، خودای گەورەش لەم بارەیەوە فەرمان بەئیمانداران دەکات کە وەك شوێنکەوتووەکانی "عیسا" بن و هەمان هەست و عەقیدەو ورەی ئەوانیان هەبێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ ﴾..

هەر باوەڕی ڕاستەقینەشە مرۆڤی باوەڕدار هان دەدات بۆ سەرخستنی ئایینی خوداو بەرز ڕاگرتنی شان و شکۆی و، گەیاندنی مژدەی سەرفرازی بە خەڵکی و، مردن لە بەرگری لێ کردنی دا و گرتنەبەری هەموو ڕێبازێکی خۆبەختکاری بۆی... چونکە سەرخستنی ئایینی خودا سەرخستنی دادپەروەری و چاکسازی یەو، جێگیرکردن و چەسپاندنی هەق و لەناوبردنی ستەم و خراپەکاری یە.

# بەشی یازدەم

## محمد ﷺ

دوایین بەشی ئەم کتێبەیەو تایبەتە بە ژیاننامەی پێغەمبەری خودا (محمد) کە دوایین پێغەمبەرە بۆ گرۆی بەشەری‌و لەسێ لایەنەوە باسی ژیاننامە (سیرە)کەی کراوە:

### لایەنی یەکەم

ژیاننامەی محمد ﷺ لە ڕۆژی لەدایکبونیەوە

تا ڕۆژی کۆچکردنی لە مەککەوە بۆ یەثریب

### لایەنی دووەم

جیهادی پێغەمبەر لە ڕێی بانگەوازدا

### لایەنی سێیەم

پوختەیەک لە ژیانی شەخسی و کۆمەڵایەتی پێغەمبەر

## لاپەڕەی یەکەم

# ژیاننامەی محمد ﷺ لە ڕۆژی لەدایکبونیەوە تا ڕۆژی کۆچکردنی لە مەککەوە بۆ یەثریب

# بەرایـــــی

ئەم توێژینەوە کورتە: بێگومان موسڵمانە پێشینەکان (خودا لێ یان ڕازی بێت و ڕەحمـەتی خودایان لێ بێت) لەهەوڵی چڕو بێ وچانیان دا ئەمەنـدەیان لەفـەرمودەو گفتـارو ئاکـاری "محمد" نووسیوەتەوەو لـەدەیان و سـەدان بـەرگ دا تۆماریـان کـردووە کـە بـە "کتێبـەکانی فەرموودە" یان (کتێبەکانی سوننەت) ناودەبرێن.

سەبارەت بەباس و لێکۆڵینەوەش لەژیانی (محمد) پێویـستە سـوود لـە (قورئـانی پـیرۆز) وەربگرین، کە سەرچاوەیەکی سەرەکی یە لەسەرچـاوەکانی تایبـەت بـە (سـیرە)ی پێغەمبـەرو هەروەها پوختەو سەرجەمی ئەو ڕێساو عەقیدەو شەریعەتەشە کە خودا بەسرووش (وحي) بـۆی ڕەوانەکردووە. بۆ زانینی ئـەم بیروبـاوەڕو ڕێـسایانەو شـێکارو ڕوون کردنـەوەیان ئاتاجمـان بـە توێژینەوەیەکی وردو تێروتەسەل دەبێت، لەگەڵ چەندین کتێب دا..

منیش لەسەرەتای نووسین و دانانی ئەم کتێبەوە نیازم وابوو تەنها ژیانی پێغەمبەرانی تـر ئامادە بکەم و لەکتێبێکی سەربەخۆی تایبەت دا بێت، واتە بەتەمابووم ژیاننامـەی (محمـد)ی دوایین پێغەمبەری خودا لەگەڵ ژیاننامـەی ئـەو پێغەمبەرانـەی لـەقورئان دا باسـیان هـاتووە پێکەوە دانەنێم لەکتێبێك دا. بەڵام لەبەرئەوەی چەندین کـەس لـەهاوڕێ و برایـانم داوایـان لێ کردم و سووربوون لەسـەرئەوەی، کـە پوختەیـەك لـەژیانی (محمـد)یـش بخەمـە دوابەشـی ئـەم کتێبەوە، منیش دواجار بڕیارم دا ئەم بەشەی دوایی بەو باسە بڕازێنمەوە.

بۆیەش باسەکەم ئاوا بەکورتی نووسیوەو باسی گەلێك ڕووداویتری ژیاننامـە (سیرة)کـەیم نەکردووە تاکو قەوارەی کتێبەکەش لەمەی ئێستا گەورەتر نـەبێت. دیـارە خۆشـم هێنـدە بـەم کارەم قایل نیم، چونکە ناتوانم بەم توێژینەوە کورتە مافی تەواو بەپێغەمبـەری خـودا بـدەم و بەگوێرەی شایستەی خۆی تەقدیرو ڕێز لەباسەکەی بنێم، جێ ی باسیشە لەو کتێبەی ترمـان دا (روح الدين الأسـلامي) بەشێوەیەکی تێروتەسەل باسی یاساو شەریعەتی پێغەمبەرمان کردووەو بەم پێ یەش دەتوانین بڵێین ئەو باسە تەواوکاری ئەم توێژینەوە کورتەبێت..

**چاکەو (فضل)ی "محمد" بەسەر مرۆڤایەتی یەوە:** بەڕاستی هیچ شتێك لـەدنیادا ناگاتە پلەو ئاستی ئەو هەموو چـاکەو ڕۆڵ و (فـضل)ەی (محمـد)ی پێغەمبـەری خـودا لەسـەر موسڵمانان و تێکڕای گرۆی مرۆڤایەتییش. هەر بۆیەش خودا فەرمانی بەموسڵمانان کردووە کە هەرگیز ئەو ڕۆڵ و فەزڵ و چاکەیەی "پێغەمبەر" لەیاد نەکەن و ئەو ڕێبازە ڕاستەشـیان لـەبیر

نەچێتەوە کە پێشانی داون. هەروەها هەمیشە بیر لەوهەموو ئەرك و زەحمەت و قوربانی دانەی پێغەمبەر بکەنەوە، کە لـەرێگای گەیانـدنی پـەیامی خـوداو بـەختیارکردنی بەشـەرییەت دا پێشکەشی کردوون.

خودای پەروەردگاریش بۆ بەرز ڕاگرتنی ئەم خاسیەتی فەزڵ و چاکەیەی، فەرموویەتی:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾الأحزاب /٥٦ .. واتە: {بێگومان خوداو فریشتەکانی دروودوسڵاو دەنێرن بۆ سەر گیانی پێغەمبەر، ئێوەش ئەی ئەوانەی باوەڕتان بەپەیامەکەی هێناوە دروودوسڵاوی بۆ بنێرن}.. لەم ئایەتەدا وشەی (یصلون)، کە لە (صلاة)ەوە هاتووە مانای (نزاو بەموبارەك دانانە)، جا سڵاو (صلاة)ی موسڵمانان بۆ پێغەمبەر نزا کردنیانە بۆی. سڵاوی فریشتەکانیش بۆ پێغەمبەر (داوای لێخۆشبوونە بۆی)، سڵاوو دروودیش لەخوداوە بۆ سەرگیانی پێغەمبەر مانای گەیاندنی ڕەحمەتیەتی پێ ی و مانای ستایش کردنیەتی لەلای فریشتەکانی خۆی.

جا کاتێك موسڵمان دەڵێت: (( اللّهُم صَلّ عَلَى مُحَمَد )) واتـە: {خودایـە لەڕێزوشـان و شەوکەوتی پێغەمبەر لەدنیادا گەورەو زیاد بکە بەوەی کە یادکردنـەوەیو بـاس کردنـی بـەرز ڕاگیرێت و ئاینەکەی سەربخرێت و هـەردەم کـار بەشـەریعەتەکەی بکرێـت. هـەروەها لـەڕۆژی دواییش دا پلەوپایەی پێغەمبەر بەوە زیادو گەورەبکە کە شـەفاعەت و داوای لێخۆشـبوون بـۆ نەتەوەکەی بکات و، ئەجرو پاداشتی ڕۆژی دواییشی زۆرو بێـشومارکەو، فـەزڵ و چـاکەی بـۆ هەموو خەڵکی پێشین و دوایین دەرخەو لەسەروو هەموو کەسانی نزیك لەخۆتەوە دایبنێ}..

## بۆچوونێکی هەڵە:

سەبارەت بەچۆنیەتی سڵاو (صلاة) بۆ سەرگیانی پێغەمبەری خـودا مانایـەکی نابـەجێ و بۆچوونێکی ناڕاستی وەها خراوەتـە زەینـی هەنـدێك لـەو خوێنـدەوارە هاوچـەرخانەوەی، کـە زانیارییەکی ئەوتۆیان لەبارەی چەمك و ماناکانی زمانی عەرەبی یەوە نی یەو وا تێگەیشتوون گوایە مانای ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ ﴾ وەك ئەو نوێژانە (صلاة) بێت کـەلای خەڵکی باوو زانراون و گوایە مل کەچ کردن و کڕنووش بردن (رکوع وسـجود)ی تێدایـەو خـودا بەم ڕەنگە سڵاوو (صلاة و سلام) لەگیانی پێغەمبەرەکەی بکات. بەڕاستی ئەم (جۆرە بۆچوونە) بێ بـاوەڕی و نـەفامی یـەکی ئاشـکرایە بەرامبـەر ئـایینی ئیـسلام. چـونکە ((موحەمـەد)) پێغەمبەرێکی خـوداو بەندەیـەك لەبەندەکانیـەتی. خـوداش کاتێـك فـەرمانی پـێ کـردووین

سـڵاوودروودی بـۆ بنێـرین: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا﴾ مەبەسـتی لەوەیە نزاو دووعای لەلای خودا بۆ بکەین وەك ڕێز لێنانێك لەم پێغەمبەرە گەورەیەو، بۆ پـاك کردنەوەی دڵ و دەروونی موسڵمانانیشە تاکو ڕابهێنرێن لەسەر جـوانترین و پـاکترین ڕەوشـت و سوپاسی هەر کەسێك بکەن کە چاکەیەکی لەگەڵ دا کردوون. پێغەمبەری خوداش گەورەترین و زۆرترین چاکەی لەگـەڵ موسـڵمانان دا کـردووەو دەشـێت بڵـێین سـڵاوات دان لەسـەر گیـانی پێغەمبەر مانای ستایش کردنی خوداو سوپاس کردنی پێغەمبەرەکەیەتی.

## مەسەلەی -سڵاوات دان- لەسەر پێغەمبەر:

من لـەم باسـەی دوایـی ی کتێبەکـەدا لەچـەندین شـوێن دا نـاوی پێغەمبـەرم هێنـاوەو درووددوسڵاوم لەبەردەم ناوەکان دا نەنووسـیوەتەوە. ئەمـەش بـۆ مەبەسـتی کـورت کردنـەوەی دێڕەکان و پاشان تا خوێنەری بەڕێز خۆی لەقووڵایی ناخیەوە هەست بەو بەرزیو شکۆی گیانەی پێغەمبەری پێشەوای بکات و لەئاست هەر ناوێك دا سڵاواتی بۆ بنێرێـت. هـەروەها سـڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خودا لەهەر کاتێك دا کەناوی دەبرێت فەرزێکی دیاری کراو نی یە.

زانایانی ئیسلام لەم بارەیەوە چەندین حوکم و ڕێساو فەرمانیان بۆ (چـۆنیەتی سـڵاوات دان لەسـەر پێغەمبـەر) دەرهاویـشتووە. هەنـدێکیان دەڵـێن: {ئـەم سـڵاوات دانـە کـارێکی خۆشویستراوە (مـستحبة)}. هەنـدێکی تـریش لـەزانایان گوتوویانـە: }ئـەم کـارە پێویـست (واجب)ە بەبێ دیاریکردنی جارەکان. بەڵام کەمترینیان یەك جارە کە پاداشتی لێوە دەسـتەبەر بێت{. هەندێکی تریشیان دەڵێن: }سڵاوات دان لەسەرگیانی پێغەمبەر فەرزێکی ئیسلامی ی گشتگیری یەو بەهیچ ژمارەو جارو کاتێکی دیاری کراوەوە نەبەسـتراوەتەوەو دەبێـت هەمیـشە لەگەڵ یادهێنانی ناوەکەی دا سڵاواتی لەسەر بدرێت{. گوتراویـشە: }لـەدواییین ڕکـاتی نوێـژ لەدانیشتنی تەحیات خوێندن و لەپێش سەلام دانەوەدا پێویستە} .[1]

لەدوا وتەی ئەم سەرەتایەدا دەڵێم: خودایە بەژمارەی گشت مەخلووقاتی خۆت سەڵاوات و درووددی پڕ ڕەحمەتی خۆت بەسەرگیانی (محمد)دا برژێنە و بەو سەڵاواتەش لەپاداشتیو خـەڵاتی زیادکەو باشترین پاداشتی بەنزاکانی ئێمە بدەرەوە...

(( اللّهُم صَلِّ عَلَى مُحَمَد عَدد خَلقِكْ صَلاة تُكافئُه عَنا وتُجزيهِ خَيرَ الجَزاء))..

(١)بڕوانە : (القول البديع في الصلاة على الحبيب الشفيع)ى سخاوي..

# بەندی یەکەم

## ((گوزەرانی "محمد" پێش بوونی بە پێغەمبەر))

( ڕەچەڵەك و ناوەکانی - لەدایك بوونی - دایەنەکانی - مردنی دایکی - لەلای باپیرەی‌و مامی - سەفەری بۆ "شام" - ئاگاداربوونی لە "جەنگی بەدکرداران و پەیمانی فضول" - خوونەریتی پێش پێغەمبەرێتی‌س ی - زەواجی لەگەڵ "خەدیجە"دا - دادوەری کردنی لەبنیات نانەوەی "کەعبە"دا - کارکردنی لەپێش پێغەمبەرێتی دا )

## ڕەچەڵەك و ناوەکانی

ناوی"محمد—ی کوڕی—عبدالله—ی کوڕی—عبدالمطلب"[(١)]—ە. دایکیشی ناوی"ئامینە—ی کچی—وەهەب"[(٢)]—ە، هەموو باووباپیرانی پێغەمبەرﷺ لە گەورەو پیاوماقووڵە بەڕێزەکان بوون. جگە لەناوی(محمد)[(٣)]یش چەندین ناوی دیکەی هەیە وەك: أحمد-[(٤)] و—پێغەمبەر (نَبِيّ)- و—ڕەوانەکراوی خودا(رسول الله)— و-ماحی-[(٥)] و-عاقب-[(٦)] و—المقفی-[(٧)] و—پێغەمبەری ڕەحمەت— و- پێغەمبەری"تۆبە"— و—پێغەمبەری داستان— و—فاتح— و—تەها—و—یاسین—و—مصطفی— و—رسول— و-پێغەمبەری نەخوێندەوار(الرسول الأمي)- وچەندین ناوی بەرزو بەڕێزی دی.

---

(١)(عبدالمطلب) کوڕی -هاشم- کوڕی -عبدالمناف- کوڕی -قصی- کوڕی -حکیم- کوڕی -مرة- کوڕی -کعب- کوڕی -لؤي- کوڕی -غالب- کوڕی -فهر- کوڕی -مالك- کوڕی -نضر- کوڕی -کنانە- کوڕی -خزیمە- کوڕی -مدرکة- کوڕی -الیاس- کوڕی -مضر- کوڕی -نزار- کوڕی -عدنان- کوڕی -أدد-ەو ڕەچەڵەکی پیرۆزی پێغەمبەریش لەکۆتاییدا دەچێتەوە سەر (اسماعیل-ی کوڕی — ابراهیم) سلاویان لێ بێت..

(٢)(وهب)ی کوڕی (عبدمناف)ی کوڕی (زهرە)ی کوڕی (حکیم)ە، کە (حکیم)یش پێنجەم باپیرەگەورەی پێغەمبەرە. (بڕوانە پەراوێزی یەکەم).

(٣) وشەی (محمد) لەسیفەتێك (ئاوەڵناوێك)ەوە دێت، کە مانای سوپاس کراوو ستایش کراو (محمود) دەگەیەنێت. بەڵام مانای زۆری و دووبارەبوون (مبالغة وتکرار)یشی تێدایە، واتە (ئەو کەسەی دوای هەر حەمدو سوپاسێك حەمدی زیاتری دەکرێت. ئەمەش دەلالەتە لەسەر زۆری ئەو کەسانەی بەچاکی و بەستایشەوە باسی ڕێگای ڕاستی و ڕەوشتە گەورەکانی دەکەن.

(٤) (أحمد) لەسەر کێشی (افعل) ڕێزلێنانی حەمدی زیاترە. واتە ئەو (حەمدو ستایشەی کەشایستەی ئەوە) ڕێزو بەهای زیاترە لەهی کەسانی دی.

(٥) ماحي: واتە ئەو کەسەی کەخودا بەهۆی ئەوەوە کفرو بێباوەڕی بنبڕدەکات.

(٦) العاقب: واتە ئەو کەسەی هیچ پێغەمبەرێکی تری لەدوا نایەت.

(٧) المقفی: واتە شوێنکەوتوو و شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەران.

# لەدایك بوونی

(عبداللە)ی باوکی محمد ﷺ خۆشەویستترین کوڕی باوکی بوو لەنێو براکانی تریدا، ئەوە بوو باوکی کاتێك ویستی ژنی بۆ بخوازێت ( ئامینە-ی کچی وەهەب)ی بۆ خواست کە لەبەڕێزترینی بنەماڵەکانی قورەیش بوو، (ئامینە)ش شووی بە (عبداللە) کردو دوای ماوەیەك سکی پڕ بوو و پێغەمبەری خودای لەسك دا بوو، لەو کاتەش دا هێندەی نەبرد کە ( عبداللە) بەمەبەستی کاروباری بازرگانی لە مەککە دەرچوو و هەر لەو سەفەرەش دا مردولەلایەن خاڵوانی یەوە کە کوڕانی (عدی بن النجار) بوون لەشاری (یەسریب) نێژرا، (عبداللە) لەتەمەنی(٢٥) ساڵی دا کۆچی دوایی کرد.

کاتێك ماوەی نۆ مانگی سك پڕییەکەش تەواو بوو ( ئامینە) منداڵەکەی دەبێت و ئەمەش لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممە (٩) یان (١٢)ی مانگی (ربیع الاول)[١] بووە لەساڵی فیل ( عام الفیل)[٢]دا.

(ئامینە) خێرا کەسێك دەنێرێت بۆ لای (عبدالمطلب) ی خەزووری و (باپیرەی پێغەمبەر) تاکو مژدەی مناڵبونەکەی پێ بگەیەنێت، ئەویش زۆر شادو خۆشحاڵ دەبێت و هەر بەئیلهامێك لەخوداوە ناوی دەنێت (موحەممەد). ئەم ناوەش لەوەوبەر لەنێو عەرەب دا بڵاو نەبوو، تەنانەت چەند کەسێکی کەم هەڵگری ئەم ناوەبوون. لە (عبدالمطلب)ی باپیریان پرسی بوو: (بۆچی تۆ ناوێك لەناوەکانی باب و باپیرانییت لێ نەنا؟) لەوەڵام دا دەڵێت: } من بەهیوای ئەوەم هەموو خەڵکی سەر زەوی حەمدو ستایشی بکات، بۆیە ناوی —موحەممەد—م لێ ناوە{.

---

(١)مامۆستا (محمود الفلکی) خودا لێ ی خۆش بێت، بەپێی ڕۆژژمێری (هەتاوی -شمسی) لەمێژووی لەدایك بوونی پێغەمبەری کۆڵیوەتەوەو گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی بۆی روون بێتەوە کە ڕێکەوتی (٢٠)ی نیسانی ساڵی (٥٧١)ی زایینی یە.

(٢) ساڵی فیل (عام الفیل) ڕووداوێکی بەناوبانگی تێدابووە کە لەمەککەدا ڕووی داوەو عەرەبەکانیش کردوویانەتە بەرواری مێژوویەك بۆ خۆیان. پوختەی ئەم ڕووداوە ئەوەیە پادشایەك لەپادشایانی (حەبەشە) کە حوکمی یەمەنیشیان لەژێردەست دابووە شاڵاوێکی هێناوەتە سەر —مەککە— بەمەبەستی ڕووخاندنی (کەعبە)و فیلێکی زۆرو گەورەش لەپێشەوەی سوپاکەیان دابووە. دیارە عەرەبەکان لەوەوبەر سوپای وا گەورەو سامناکیان نەدیبوو. خودای مەزن و باڵادەست بۆ ڕێزلێنان لەهاتنی پێغەمبەری چاوەڕوان کراوو بۆ پاراستنی ماڵەکەی خۆیشی (کەعبە) ئەو سوپا گەورەیەی تەفروتوونا کردووە. قورئان ئەم بەسەرهاتەی لەسوورەتی (فیل)دا گێڕاوەتەوە. ئیدی لەو ساڵەدا کە ئەو ڕووداوە گەورەیەی تێدابووە پێغەمبەری خوداش لەدایك بووە.

## دایەنەکانی

لەو سەردەمەدا داب ونەریتی عەرەب وابوو کە دایەن بۆ کۆرپەو ساواکانیان ڕاگرن لە خەڵکی گوندنشین و هەر لەوێش پێ یان بسپێرن بۆبەخێوکردنیان تاکو لەش ساغ و تەندروست و وریاو زیرەك دەرچن. عەرەب دەیانگوت: (منداڵی لەشاردا بەخێوکراو زەینی ڕوون نابێت و ئازاو دلێر دەرناچێت.)

یەکەم دایەنیش کە پێغەمبەری لەخۆگرت و شیری پێ دا ناوی (ثُوَیبە) بوو و ماوەیەکی کەم لای مایەوە.

دوای ئەو خاتوو (حلیمە—ی کچی —أبي ذؤیب السعدیة) بەخێوی کردووەو شیری پێ داوە. ئەم دایەنەش هەژارو کەم دەست بوو، بەڵام بەهۆی (محمد—ەوە)ﷺ خودا خێرو بەرەکەتێکی زۆری بەسەردا ڕشتووەو مەڕەکانیشی شیریان زۆر بووەو مێرگ و لەوەڕگایەکی هێجگار زۆری بۆ ڕەخساوەو لەهەموو لایەنەکەوە بووژاوەتەوەو پیت و بەرەکەتی دەسگیر بووە. کاتێك تەمەنی گەیشتۆتە پێنج ساڵ گەڕاندوێتی یەوە بۆلای دایکی. لەوێش (ام أیمن — برکة الحبشیة)[1] دایەنی بووە.

## مردنی دایکی

لەشەشەم ساڵی تەمەنی دا، دایکی دەیبات بۆ سەردانی خاڵوانی لەشاری (یەسریب) و لەهەمان کات دا سەردانی گۆڕی مێردەکەشی بکات. (ئامینە) لەو سەفەرەدا کەنیزەکەی خۆی واتە: (أم أیمن)، کە مێردەکەی بۆی هێشتبووەوە لەگەڵ خۆی دا دەبات و مانگێك لەوێ دەمێننەوەو پاشان دەگەڕێنەوە بۆ—مەککە-. بەڵام لەڕێگای نێوان هەردوو شاری (یەسریب— و — مەککە)و لەجێگەیەك، کە بە (أبواء) ناودەبرێت —ئامینە— نەخۆش دەکەوێت و هێندەی پێ ناچێت کە دەمرێت و هەر لەو جێگەیەش دەنێژرێت. پاشان (ام أیمن) ئەم منداڵە هەتیوە بێ دایك و باوکە (محمد) دێنێتەوە بۆ "مەککە".

---

(١) بەڕاستی لەم ناوانەدا (عبدالله) و (آمنة) و (ثویبة) و (حلیمة السعدیة) و (ام ایمن)دا چەندین مانا و دەلالەتی سەرسوڕهێن بەدی دەکرێن. بۆ نموونە لەناوی باوکی دا (عبدالله) کەمانای (بەندەی خودا دەگەیەنێت) دەلالەتی یەکخواپەرستی(توحید) هەیە. لەناوی دایکیشی دا (آمنة) مانا و دەلالەتی دڵنیایی(أمان) بۆ نەتەوەکەی پیشان دەدرێت. لەناوی یەکەم دایەنیشیدا (ثُوَیبة) مانای پاداشت(ثواب) دەردەکەوێت. لەناوی دایەنە بەناوبانگەکەشیدا (حلیمة السعدیة) ماناو دەلالەتە جوانەکانی ئارامی و بەختەوەری ڕەنگ دەدەنەوە. هەروەها لەناوی (ام أیمن)دا دەلالەت و هێمای خێروبەرەکەت دەدرەوشێتەوە.

## لەلای باپیرەی و مامی

دوای مردنی دایکی.. (عبدالمطلب)ی باپیرەی لەخۆی دەگرێت و نەرم ونیانی یەکی وەهای بۆ دەنوێنێت کە لەوەوپێش بۆ هیچ کوڕێکی خۆی نەنواندبوو، ئەویش لەبەر چەند نیشانەیەکی جوامێری و ڕەوشتبەرزی کەبەدیی کردبوون لە (محمد)دا.

باپیرەشی دوای دووساڵ لەسەرپەرشتی و بەخێوکردنی، کۆچی دوایی دەکات. ئینجا دەکەوێتە لای (ابوطالب)ی مامی و ئەمیش کابرایەکی هەژار دەبێت، بەڵام وێڕای ئەوەش بەخشندەو دڵفراوان و گەشبین دەبێت و (محمد)ی برازاشی بەڕادەیەك خۆش دەویست، کەهیچ کوڕێکی خۆی هێندە خۆش نەویستبوو. ئەویش هەمیشە لەلای مامی یەوە دەخەوت و ئەگەر مامی بۆ کارێك بڕۆشتایە لەگەڵ خۆی دا دەیبرد.

(محمد) لەماوەی سالانی منالی ی دا نموونەیەکی بەرزی چاوتێری و قەناعەت و لەخۆبڕان بوو و تەنانەت دووربوو لەو جۆرە کردارە بچووك و وردانەی کە مندالان خوویان پێو دەگرن و پێوەی خەریك دەبن. (حالەتی هەتیوی)یش شوێنەوارێکی قووڵ و ئازاربەخشی لەدەروونی (محمد)دا جێهێشتبوو، بەلام دیارە بەهۆی ئەو سەرپەرشتیارییە پڕ سۆزو ئەوینەی مامی یەوە ئازاری ئەو حالەتەی لەسەر سووك بووبوو. هەروەك خوداش لەقورئان دا ئەو نیعمەتەی بیرخستبووەوەو فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ﴾.

## سەفەری بۆ - شام -

کاتێك تەمەنی دەگاتە -دوازدە ساڵی- مامی دەیەوێت بۆ کارێکی بازرگانی بچێت بۆ (شام)و ئەویش ئەمەی زۆر لەلا ناخۆش دەبێت کە بەتەنیا بمێنێتەوەو ماوەیەك لەمامی دابڕێت. هەر بۆیەش مامی دوای ئەوەی هەست بەو حالەتەی دەکات بەزەیی پیَ دا دێتەوەو لەگەڵ خۆی دا دەیبات.

ئینجا لەگەڵ کاروانێکی بازرگانی دا بەڕێ دەکەون و دەگەنە شاری (بوسرا)[1] و لەوێ ڕاهیبێك بەناوی (بحیرا)[2] چاوی بە (محمد) دەکەوێت و بەوردی سەرنجی دەدات و بۆی

(١) بوسرا (بصری): ئێستا گوندێکە لەنێوان (سوریا)و نیمچەدورگەی عەرەبی دا.
(٢)(بحیرا): ڕاهیبێکی مەسیحی ی سەر بەو کۆمەڵە مەسیحی یەیە کە بەهۆی بانگەواز بۆ (توحید)و یەك خواپەرستی یەوە چەوسێنراونەتەوەو ڕاهیبەکانیشیان پەنایان بردۆتەبەر کەنارەکانی بیابانی عەرەبی.

دەردەکەوێت هەموو ئەو بەڵگەو نیشانانەی پێغەمبەرێتی ی تێدایە، کە لەکتێبە نەصرانی یەکانی خۆیان دا خوێندبوویەوە. هەر بۆیە خێرا مامی ڕادەسپێرێت، کەوا بەوریایی چاودێری و پارێزگاری ی لێ بکات تاکو لەدەست جوولەکە پارێزراوبێت. (ابو طالب)یش کار بەو ڕاسپاردەیەی (بحيرا)ی زانای نەصرانی دەکات و بەپەلەش ئەم کوڕە نەوجەوانە دێنێتەوە بۆ "مەککە".

## ئاگاداربوونی لە ( جەنگی بەدکرداران ) و ( پەیمانی فضول )

کە تەمەنی دەگاتە بیست ساڵ ئاگادارو هاوزەمانی جەنگی بەدکردارەکان (حرب الفجار) دەبێت. ئەم جەنگە لەنێوان{تیرەی (قورەیش) بەهاوپەیمانەکانیانەوە{و}تیرەی (قەیس) بەهاوپەیمانانیانەوە{ ڕوودەدات و لەجێگەیەکی نێوان (مەککە)و (طائف)دا دەبێت کە بە (نخلة) ناوبراوە. بێگومان ئەم جەنگە زۆر دژوارو سامناك بووەو لەبەر ئەوەش کە سووکایەتی‌یەکی زۆری دەرهەق بەپیرۆزیو موقەدەساتی ئەوسای عەرەب لە (مەککە)دا تیاداکراوە بە (جەنگی بەدکرداران) ناوبراوە. پاشان ئەو جەنگە بەرێکەوتنێك کۆتایی‌ی پێهێنراوە دوای ئەوەی خەڵکێکی زۆری تیادا کوژراوە.

جا دوای جەنگی بەدکرداران هەندێك کەس لەپیاوماقوڵە مەککەیی یەکانی —قورەیش— بانگەوازیان بۆ بەستنی پەیمانێك کردووە کەناوی پەیمانی (فضول)یان لێ ناوەو تیای دا پەیمانیان داوە گەر هەر ستەم لێکراوێك لە —مەککەدا— ببینن و لەخەڵکی مەککە بێت یان خەڵکی هەر جێگەیەکی تریش بێت دەسگیرۆیی ی بکەن و یارمەتی‌ی بدەن لەسەر قەرەبووکردنەوەی ستەمەکەیو گێڕانەوەی مافی خۆی.

بێگومان (محمد)یش لەگەڵ مامەکانی دا ئامادەی بەستنی ئەو پەیمانە بووەو لێ ی ئاگاداردەبێت. ئەوەندەش ئەو ئامادەبوونەی پێ خۆش بووە کە دەربارەی ئەو ڕۆژە (لەدوای بەهرەمەندبوونی بەپلەوپایەی پێغەمبەرێتی) فەرموویەتی: ((من لەگەڵ مامەکانم دا ئامادەی بەستنی پەیمانێك بووم لەماڵی (عبدالله—ی کوڕی —جدعان) کە هێندەم پێ خۆش بوو زۆر زیاتر لەوەی خاوەنی حوشترە سوورکەڵەکان[1] بوومایە. خۆ ئەگەر هەر ئەو ڕۆژە بانگەوازم بۆ ئیسلام پێ بکردایە بەدەمەوە دەهاتن)).

---

(١) حوشترە سوورکەڵەکان }حمرالنعم{ بەو حوشترە هەرەگران و هەرەچاکانە دەگوترا کە لەو ڕۆژەدا لەلای عەرەبەکان بەنرخترین وڵاخ بوون لەو ناو جۆرەکانی حوشتردا.

## خوونەریتی پێش پێغەمبەرێتیی

"محمد" لـەنێو گەلەکـەی دا بەئـەدەب تـرین کـەس و ڕاسـتگۆترینیان و دەسـپاکترینی هەموویان بووە. لەهەمووشیان زیاتر دوور بووە لەبەدکاری و لـەو ڕەفتـارە ناهەموارانـەی کـە ڕەوشتی پیاوان لەکەدار دەکەن، تەنانەت گەلەکـەی خـۆی نـاوی (الأمـین)یـان لیّ نـاوە، واتـە کەسێکی جیّ ی متمانەو دەسپاك و دەم پاك و داوێن پاك، چـونکە خـوداش هـەموو سـیفەتە بەرزو جوانەکانی تێدا کۆکردبووەوە.

هەروەها خودا پێش ئەوەی پەیامی پێغەمبەرایـەتی ی پـیّ بـسپێرێت لەهـەموو تـاوان و خراپەیەکی گەلەکەی پاراستبووی و هەموو بـت و خواوەنـدەکانیانی لـەلای بێـزراوو ناشـیرین کردبوو تا هێندە ڕقی لیّ یان دەبۆوە، کە هەرگیز ئامـادەی هـیچ ئاهـەنگێك یـان جـەژنێکی بتپەرستان نەدەبوو.

(محمد) دەربارەی قۆناغەکانی منداڵی و نەوجـەوانی ی خـۆی فەرموویـەتی: ((مـن هـیچ کاتێك سەوداسەری کارێك نەبووم لەو کارانـەی کـە شـوێنکەوتوانی جاهیلیـەت[1] (نـەفامی) ئـەنجامیان دەدا، تـەنها دووجـار نـەبێت کـە لەهـەردوو جارەکـەش دا خـودا بـواری نـەدام و پاراستمی. ئیدی لەو تەمەنەی (پێش شەرەفمەندییم بەپەیامی خـودا) ئـالوودەو هـۆگری ئـەو جۆرە کردارانە نەبوومەتەوە.. ئەو دووجارەش کەخودا لەو کردارە نەفامی یانە بەدووری گـرتم و خەریك بوو ئالوودەی بم، ئەوەبوو شەوێکیان لەناوچەیەکی سـەرووی شـاری (مەککـە) لەگـەڵ کوڕێکی نەوجەوانی هاوڕێم دا، کە پێکەوە ئاژەڵمـان دەلەوەڕانـد پـیێم گـوت: {بـیّ زەحمـەت چاودێری‌یەکی ئەم مەڕانەم بۆبکە تاکو دەچمەوە بۆ (مەککە)و منیش وەك ئەو گەنجانەی ئەویّ بۆ خۆم کەیف و سەفایەك بکەم} . ئەویش داواکـەمی پەسـندکردو ئینجـا کەوتـمەڕێو لەگـەڵ گەیشتنم بۆ شارو نزیك بوونەوەم لەیەکەمین خانووی (مەککە)دا گـوێم لەئاهـەنگێکی بـەزم و گۆرانی بوو و پرسیم (ئەمە چی یە)؟ پیّیان گوتم: {ئەوە زەماوەندی فلاّن پیاوە کە فلاّنە کچی خواسـتووە} . مـنـیش بەمەبەسـتی ئـالوودەبیم بەکـەیف و سـەفایەکی گـەنجی و نەوجـەوانی دانیشتم، تا گویّ یان لیّ بگرم. بەلاّم خـودا پەردەیـەکی وای بەسـەرگوێم دا دا کـە خـەوم لیّ کەوت و بەهیچ شتێك خەبەرم نەبووەوە تا گەرمای خۆری بەیانی هەڵیساندم. ئینجا گەڕامـەوە بۆلای هاوڕیّ شوانەکەم و لیّی پرسیم داخۆ چۆن کەیف و سەفایەکم کردبێت، منـیش هـەواڵی

---

(١) جاهیلیەت: بەسەردەمی پێش هاتنی ئیسلام دادەنرێت. قورئانیش بۆیە ئەو ناوەی بۆ داناوە چونکە لەو زەمانەدا گوناهو تاوان زۆر ئەنجام دەدراو بەڕەواشیان دادەنا.

ڕاستی ی بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە... جاری دووەمیش، کە هەر بەتەمای کردارێکی وابـووم و کەخوداش پاراستمی، ئەوەبوو لەشەوێکی تردا بۆ هەمان مەبەست چوومەوە بۆ—مەککە— و دووبارە خودا خەوی لێ خستمەوەو نەیهێشت گوێم لەهیچ ئاهـەنگێکی نـەفامی بێـت. ئیـدی هەرگیز دوای ئەوە بەتەمای هیچ کردارێکی لەو جۆرانە نەبوم و خەیاڵم بەلای هیچ گوناهێك دا نەبرد)).[١]

## زەواجی لەگەڵ – خەدیجە –دا

لە تەمەنی (٢٥)ساڵی دا بۆ دووەم جار سەفەر بۆ سوریە (شام) دەکات، ئەم سەفەرەشـی بۆ کارێکی بازرگانی ی خاتوو (خەدیجە)[٢]ی کچی (خووەیلید) دەبێت کە هەندێك جار پیـاوانی بـەکرێ دەگـرت، تـا بازرگـانی ی بـەپارەو ماڵیـەوە بۆیکـەن، چـونکە خـۆی بێـوەژن بـوو و خزمەتکارێکیشی بەناوی (میسرە) هەبوو.

(خەدیجە) بۆیە ئەو کارەی بـە (محمـد) سپارد، چـونکە بیـستبووی مرۆڤێکـی دەسپاك و ڕاستگۆیەو خاوەنی چەندین ڕەوشتی بەرزی دیکەشە. لەو سەفەرەدا خزمەتکارەکـەی خۆیـشی لەگەڵ دا ناردو هەردوکیان (واتە —محمد— و —میسرە) لەو ئەرکی بازرگانی یەیان داو لـەکاری کڕین و فرۆشتن دا قازانجێکی هێجگار زۆریان بەدەست هێنا، وجودی خـودی (محمـد)یـش لـەو سەفەرەدا بووە هۆی خێرو بەرەکەتێکی ئەوەندە زۆر، کە (میسرە)ش هەسـتی پـێکردو سـەری سوڕمابوو و کاتێك هاتنەوە هەموو بەسەرهاتەکەی ئـەو سـەفەرەی بـۆ (خەدیجـە)ی خـاتوونی گێڕایەوە[٣]. دیارە – خەدیجە —ش زۆر سەرسام و خۆشحاڵ بوو بەو ڕەوشتە جـوان و بەرزانـەی – محمد —و شادمانیش بوو بەو قازانجە زۆرەی، کە لەو بازرگانی یـەدا پەیـدای کردبـوو. هـەر بۆیەش کەسێکی نارد بۆلای و ئامادەیی خۆی دەربڕی کە ئامادەیـە شـووی پێبکـات ئەگـەر داخوازیی بکات. لەو کاتەش دا— خەدیجە— تەمەنی گەیشتبووە چل ساڵ. (محمد)یش ئامادەیی خۆی دەربڕیو مامی خۆی (ابوطالب)ی نارده داوای و ئـەویش لای کـەس وکـاری خـوازبێنیی کردو مێردی پێکرد.

---

(١) بڕوانە: الكامل في التأريخ – لأبن الأثير – ج٢.

(٢) (خەدیجە) ژنێکی دەوڵەمەندبووەو لەخانەوادە هەرەبەرزو بـەڕێزەکانی – قـوڕەیش – بـووەو بەچـەندین ناوی وەك (طاهرة)و (سيدة قريش) ناسراوەو تەنانەت گەلێك لەپیاوانی (قوڕەیش) داوای زەواجیان لێ دەکـردو خوازبێنییان دەکرد، بەڵام شووی بەکەسیان نەدەکرد هەرچەندە بێوەژنییش بوو.

(٣) هەروەها گێڕراوەتەوە، کە (مەیسرە) هەواڵێکی تری بە(خەدیجە) گەیاندووە دەربـارەی ئـەوەی لـەکاتی نیوەڕۆو تین سەندنی گەرمادا دوو فریشتەی دیبوو سێبەریان بۆ(محمد) کردبوو بۆ پاراستنی لەگەرمای خۆر.

## دادوەریکردنی لەبنیات نانەوەی - کەعبە -دا

(محمد) لەتەمەنی سی وپێنج ساڵی دا دەبێت، کە لافاوێکی تونـد ڕوودەدات و کەعبـەش دەگرێتەوەو هەموو دیوارەکانی درزو کەلەبەریان تێ دەکەوێت. قورەیشی یەکان بەپەلە دەکەونە تێکدانی یەکجارەکی ی (کەعبە) تاکو سەرلەنوێ بەشێوەیەکی چاکتر بنیاتی بنێنەوە.

جا دوای ئەوەی هەموو لایەکی بنیات دەنێنەوە دەگەنە ئەو کارەی کە چـۆن بەردەڕەشـەکە (الحجر الأسود) بخەنەوە جێگەکەی خۆی. لەمەش دا ناتەبایی و جیاوازی بیروڕا دەکەوێتە نێوان سەرانی قورەیشەوە دەربارەی ئەوەی کامیان بیخەنەوە سەرجێگەی خۆی. مـشت ومـڕ لەسـەر ئەمە لەنێوانیان دا دەگاتە ئەو ڕادەیەی خەریك بوو ئاگری جەنگیان لـەنێوان دا هەڵگیرسـێت. لەو کاتەدا بەتەمەنترین پیاوی قورەیش (أبـو أُمَیّـةَ-ی کـوڕی -مغـیرة) هێوریـان دەکاتـەوەو پێیان دەڵێت: {گەلۆ ناکۆك مەبن. باشتر وایە یـەکێك بکەنـە دادوەر (حەکـەم)ی نێوانتـان و باکەسێکی واش بێت کە بەحوکم و دادوەری کردنەکەی قایل بن}. ئـەوانیش دەڵـێن: }کـاری دادوەری دەسپێرین بەیەکەمین کەس کە دێتەلامان{ واتە لەو کەسانەی دەچنە ژوورەوە بۆلایان لەکەعبەدا بۆ دیتنی بینای نـوێی کەعبـە. بێگومـان بەویـست و ئیرادەی دانایانـەی خـوای پەروەردگار یەکەم کەسێك کە دەچێتە لایان (محمد) دەبێت. ئەوانیش دڵخۆش دەبـن و دڵنیـاش دەبن لەتەحکیم و دادوەری کردنی ئەم پیاوەی کـە هـەموویان بـەمرۆڤێکی دەسپاك و جـێی متمانەو ڕاستگۆو ژیرو زانـا ناسـیویانە. بۆیـە دەڵـێن: {ئـەوە -محمـد-ی ئـەمین و متمانـە پێکراوەو ئێمەش قایلین بەدادوەریکردنی لەنێومان دا}.

جا کاتێك مەسەلەکەی بۆ باس دەکەن، ئەویش خێرا بۆ چارەسەری ئـەو کێـشەیەی نێـوان سەرانی قورەیش کراسەکەی خۆی ڕاخست و بەردەکەی خستەسەرو داوای لەگەورەکانی قورەیش کرد کە هەریەکەو گۆشەیەکی کراسەکە هەڵگرێت و بەهـەموویان هـەر چـوارلای ئـەو کراسـە بەرزکەنەوە.

ئینجا خۆیشی بەردە ڕەشەکە هەڵدەگرێت و بەدەستی خۆی دەیخاتەوە سەر جێگەکەی. بەم ڕەنگەو بەو هەڵس وکەوتە دانایانەیە توانی ی ئەو کێـشە ئـاڵۆزەی نێـوان سـەرەك هۆزەکـانی قورەیش چارەسەرکات کە خەریك بوو ببێتە هۆی ڕوودانی کارەساتێکی گەورە.

## کارکردنی لە پێش پێغەمبەرێتیی دا

"موحەممەد" هیچی وای لە ماڵ و کەلوپەل بەمیرات بۆ نەمابووەوە تەنها برێکی کەم نەبێت. جگە لەوەی کە بە (هەتیوی)یش گەورە بووبوو. کاتێك گەیشتە ئەو تەمەنەی توانای کارکردنی هەبێت لەگەڵ چەند برایەکی (شیری)ی دا کە (لەوەوپێش لەدێهات دا پێکەوە لای دایەن شیریان خواردبوو) مەڕی دەلەوەڕاندو بەپیشەی شوانکارەیی یەوە خەریك بوون. دەربارەی ئەم کارەش فەرموویە: ((هەر پێغەمبەرێك کەخودا ناردوویەتی کاری شوانیی کردووە)) هاوەڵان لێ یان پرسی: }ئایا تۆش شوانییت کردووە ئەی پێغەمبەری خودا{؟ فەرمووی: ((بەڵێ منیش کاری شوانی و مەڕلەوەڕاندنم بۆ خەڵکی —مەککە— دەکرد بەچەند —قیراط[1]— یك)).

جگە لەم کاری شوانکارەییەی کە لەتەمەنێکی مێردمنداڵیو نەوجەوانیدا پێوەی خەریك بووە، کاری بازرگانییشی لەتافی لاوی دا کردووەو شەریك (هاوبەش)ەکەشی لەو کارەدا (سائب—ی کوڕی —ابي السائب) بووە. هەروەها —وەك پێشتریش باسمان کرد— کاری بازرگانیو کڕین و فرۆشتنی بەکرێ بۆ (خەدیجە) کردووەو دوای ئەوەی بووە بەهاوسەرییشی و بەپارەو سامانی ئەو کاری کردووە.

---

(١) دەقی عەرەبیی فەرمودەکە: {وأنا رَعَيتُها لأهل مكة بالقراريط}.. وشەی (قراريط) کۆ (جەمعی) وشەی (قيراط)ەو مانای نرخی کەمتر لەدینارێك یان چەند بەشی دینارێك دەگەیەنێت. گوتراویشە وشەی (قراريط) ناوی جێگەیەك بووە لەو ناوچەیەی کە ئاژەڵیان تێدا لەوەڕاندووەو بەم پێیەش مانایەکی تری فەرمودەکە ئەمەیە: }بەڵێ منیش ئاژەڵم بۆ خەڵکی مەککە لە (قراريط) دەلەوەڕاند{.

# سبەندی دووەم

## (( پێغەمبەرێتیی " محمد " ))

( سەرەتای سرووش بۆ پێغەمبەر – بانگەوازی نهێنیی پێغەمبەر بۆ ئیسلام – ئاشکراکردنی بانگەواز – "قورەیش" بەرهەڵستیی پێغەمبەر دەکەن – هەڕەشەکردن لەپێغەمبەر – چەند هەوڵێك بۆ فریودانی پێغەمبەر. )

## سەرەتای سروش بۆ پێغەمبەر

. کاتێك (محمد) تەمەنی گەیشتە چل ساڵان خودا کردی بەپێغەمبەرو وەك مژدەدەرو ترسێنەرێك (بشيراً ونذيراً) ناردی بۆلای خەڵکی تاکو پەیامی خودایان پێبگەیەنێت و ڕێی ڕاستیان بدات و مژدەی بەهەشتیان لەبەرامبەر ئیمان و کردەوە چاکەکانیان دا پێبگەیەنێت و بەئاگری دۆزەخیش لەبەرامبەر باوەڕنەهێنان و گومڕاییدا بیانترسێنێت و ئاگاداریان بکاتەوە، هەروەك خوداش لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾...

یەکەم سەرەتای سرووش (وحي)یش بەخەوبینینی ڕاست(الرؤيا الصادقة) دەستی پێ کرد. (محمد) هەر جارێك خەوێکی بدیایە وەك خۆی دەهاتەدی.

دوای ئەوەش تەنهایی و دووری لەگەلەکەی لا خۆشەویست کرا (واتە: پێش لەئەستۆنانی ئەرکی پێغەمبەرێتی)، چونکە دەیبینی ئەو گەلەی خۆی لە چ سەرلێشێواوی و گومڕایی یەکی ئاشکرادان بەهۆی بتپەرستی و کڕنووش بردنیان بۆ بتەکانەوە. هاوکات بوو لەگەڵ نزیك بوونەوەی سرووشی خودادا بۆلای ئەم حەز لەتەنهایی کردنەی زۆر زیاد دەبوو. بۆئەم خۆدابڕان و تەنیایی یەیشی ئەشکەوتی (حەڕاء)ی دیاری کردبوو و چەندەها شەو خواپەرستی ی تێدا دەکرد. جاری وا هەبوو دە شەو تیای دا دەمایەوەو جاری واش هەبوو زیاتر لەمانگێك لەوێ دەمایەوە. خواپەرستیو بەندایەتی یەکەشی لەسەر ئایینی (ابراهيم)ﷺ بوو. بۆ ئەم مەبەستەش خۆراکی لەگەڵ خۆی دا دەبردو هەر جارێك بۆ لای خێزانەکەی دەگەڕایەوە خۆراکی تری لەگەڵ خۆی دا دەبرد.

بەم ڕەنگە لەو ئەشکەوتە وەختی بەسەر دەبرد تاکو ڕۆژێکیان فریشتەی خودا (جیبریل)ﷺ بەفەرمانی خودا گەیشتە لای‌و یەکەمین ڕاسپاردەی پێ‌گەیاندو پێ‌ی فەرموو: (بخوێنە: (إقرأ)). ئەویش فەرمووی: (من خوێندەوار نیم). پێغەمبەر خۆی لەباسی ئەم بەسەرهاتەیدا فەرموویەتی: ((ئینجا دوای ئەوەی پێم گوت کە من خوێندەوار نیم توند گوشیمی بەخۆیەوە تا هێزو گوڕم تیا نەماو پاشان بەری‌دام و پێمی فەرموو: (بخوێنە) منیش وەڵامم دایەوە کە: (خوێندەوار نیم). دووبارە توند بەخۆیەوە گوشیمیەوە هەتاکو هێزو بڕستم لێ بڕاو پاشان بەری‌دامەوەو فەرمانی پێ‌کردمەوەو فەرمووی: (بخوێنە). منیش وەك جاری پێشووتر وەڵامم دایەوە کە (من خوێندەوار نیم). بۆ سێیەم جار بەتوندی باوەشی پێم داکردەوەو پاشان بەرەڵڵای کردمەوەو فەرمووی:

﴿اقْرَأْ[1] بِاسْمِ رَبِّكَ[2] الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ[3] ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴾.))

ئینجا پێغەمبەر بەپەلەو بەهەڵلەرزینەوە ڕۆشتەوە بۆ ماڵەوەو بە (خەدیجە)ی هاوسەری فەرموو: (دامپۆشن.. دامپۆشن: "زملوني، زملوني")، ئەوانیش دایانپۆشی و پاڵکەوت هەتا ئەو ترس و بیم و هەڵلەرزینەی تیانەما، پاشان دەستی کرد بەگێڕانەوەی ئەو حاڵەتەی بەسەریا هاتبوو بۆ (خەدیجە)و فەرمووی: (بەڕاستی ترسم لەسەرخۆم هەبوو). (خەدیجە)ش پێ ی گوت: {نا، قەت ترست لەسەرخۆت نەبێت، چونکە قەسەم بەخوا هەرگیز خودا کەساس و مەلوولت ناکات، لەبەرئەوەی تۆ پەیوەندی سۆز(صلەی ڕەحم) دەگەیەنیت و هاتوچۆی کەس وکارت و خەڵکی دەکەیت و ڕێزێکی زۆر لەمیوان دەگریت و یارمەتیی کەسانی خاوەن ماڵ ومناڵی زۆر دەدەیت و دەسگیرۆیی ی هەژاران و نەداران دەکەیت و هاوکاری‌و کۆمەکی خاوەن هەق دەکەیت} .

---

(١) وشەی (اقرا) کەمانای (بخوێنە) دەگەیەنێت بانگەوازێکە بۆ خوێندن و بەدەست هێنانی زانست. لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کەئایینی ئیسلام لەیەکەم ساتەوەختی سەرهەڵدانیەوە مۆرکێکی زانستیانەی پێوە دیاربووەو بۆ ئەوەش هاتووە کە جەهل و نەفامی لەناوببات و زانست و زانیاری بڵاوبکاتەوە.

(٢) (باسم ربك)ەش تیشك دەخاتەسەر ئەو ڕاستی یەی کەوا بێگومان خوێندن و خوێندنەوە بەناوی پێشەوایەك یان بۆ سوودێکی تایبەتی‌و شەخصی نی یە، بەڵکو بەناوی خودای خالق و پەروەردگارەوەیە. جا ئەگەر خوێندن تەنها لەپێناوی خوادابێت ئەوا لەهەموو باروذۆخێك دا سوودمەندە. بەم ڕەنگەش ئیسلام لەیەکەم سەردەمی پەیدابوونی یەوە شوێنکەوتوانی خستۆتەسەر ڕێگای دڵسۆزی‌و یەکلابوونەوە بۆخودا.

(٣) (وربك الاكرم) ئەم تەعبیرە نایابەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەقە خوێندراوەکەو زانستە دەستەبەر بووەکە تەنها لەدەریای بێ پایانی (کەرەم)و بەخششی خودایی یەوەیە. لەم ئایەتەدا وشەی (أکرم) کەخودا خۆی پێ وەسف کردووە بەڵگەیەکی ترە لەسەرئەوەی کەزانست و مەعریفە بەنرخترین بەخشش و خەڵاتی خودایە بۆ مرۆڤایەتی.

دوای ئەم ستایشە — خەدیجە — خێرا (محمدی) لەگەڵ خۆی دا برد بۆماڵی ئامۆزایەکی خۆی کەناوی (وەرەقە—ی کوڕی —نەوفەل) بوو و لەسەردەمی جاهیلی دا بووبوو بە(نەسرانی)و لە (ئینجیل)دا شارەزاو زانابوو. هەروەها پیاوێکی پیرو بەساڵاچوو و کوێریش ببوو.

(خەدیجە) پێ ی گوت: {ئەی کوڕی مامی خۆم گوێ لەم برازایەی خۆت بگرە کە بەسەرهاتێکی زۆر گرنگی خۆیت بۆ دەگێڕێتەوەو پاشان بزانە چی بەسەردێت و ڕووداوەکەی بۆ لێك دەرەوە}.

(وەرەقە) لێ ی پرسی: {کوڕی برام چیت بەسەرهاتووە}؟ پێغەمبەریش ڕووداوەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئینجا (وەرەقە) (هەواڵی بوون بەپێغەمبەری خودا)ی پێ گەیاندو پێ ی گوت: (ئەو پەیامە بەرزەی کەخودا بۆ مووسای ناردە خوارەوەو لەڕێی (جیبریل)ی فریشتەوە بۆ تۆشی ناردووە، خۆزگە لەو ڕۆژەدا لاوێك دەبووم. خۆزگە زیندوو بوومایە کاتێك گەلەکەت لەسەر گەیاندنی ئەو پەیامە شاربەدەرت دەکەن).پێغەمبەر لێ ی پرسی: (ئەرێ بەڕاست ئەوان دەریشم دەکەن)؟ پێ ی گوت: (بەڵێ.. هەر کەسێك کەهەمان ئەرکی تۆی پێسپێرراوە بەربەرەکانێیەکی زۆری کراوە. منیش گەر تا ئەو ڕۆژە لەژیان دا بمێنم ئەوا بەتەواوەتی پشتگیریت دەکەم)... بەڵام هێندەی پێ نەچوو، کە (وەرەقە) مردو سرووش(وحي)یش دوای ماوەیەکی کەم بۆ پێغەمبەر هات کە پێشتر ماوەی چل ڕۆژێك دەبوو سرووشی لێ بڕابوو. بەڵام دوای ئەوە بەردەوام سرووشی بۆ دەهاتە خوارەوە.

## بانگەوازی نهێنی ی پێغەمبەر بۆ ئیسلام

پاشان پێغەمبەر دەستی کرد بەڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکەی کەخودا پێ ی سپاردو بەنهێنی بانگەوازی بۆ خواپەرستی دەکرد تاکو خەڵکی هەموویان ڕووبەڕووی مەسەلەیەکی کت وپڕی ی تازە نەبنەوەو لەئاسەواری ئەو جۆرە کاردانەوانە خۆی بپارێزێت.

یەکەم کەسیش کە باوەڕی پێ هێنا هاوسەرەکەی خۆی (خەدیجە —ی کچی -خووەیلید)و هەروەها (علی[1]—ی کوڕی —ابوطالب)و (عبداللە—ی کوڕی —أبوقحافە— واتە ئەبوبەکر)و

---

(١)(علی—ی کوڕی —ابوطالب) لەلای (محمد) نیشتەجێ بوو و هەر ئەو ئەرکی ژیانیی دەکێشا، چونکە لەو ماوەیەدا کە (قوڕەیش) تووشی کارەساتێکی برسێتی ببوون (ابوطالب)ی مامی پێغەمبەریش دوچاری هەژاری ببوو و خاوەنی ماڵ و مناڵێکی زۆریش بوو. جا بۆ سووك کردنی ئەو بارەگرانەی (ابوطالب)، (محمد) چووە لای مامێکی تری کەناوی (عباس) بوو و مەسەلەکەی لەگەڵ دا باس کردو پێ ی فەرموو: (بێگومان—ابوطالب—ی برات مندالی زۆری هەیەو تووشی ئەو بارگرانی و تەنگانەیە بووەو با پێکەوە بچین بۆلای و ئەرکی مناڵەکانی لەسەر کەم بکەینەوە. تۆ مناڵێکی لێ وەرگرەو منیش مناڵێکی لێ وەردەگرم و ئەرکی بەخێوکردنیان

(زید-ی کوڕی -حارثة) بوو. چەند کەسێکی کەمیش لەئەشراف و پیاوماقوولان لەسەرەتادا باوەڕیان پێهێنا، وەك (عثمان-ی کوڕی -عفان)و (زبیر- ی کوڕی -عَوام)و (عبدالرحمن-ی کوڕی -عوف)و (عبدالله-ی کوڕی -مسعود)و (سعد- ی کوڕی -ابو وقاص)و (طلحة-ی کوڕی -عبیدالله)و (ابوذر-ی غفاري)و (صهیب-ی ڕۆمی)و ئەوانی دی.

هەموو ئەم بەڕێزانەش بەوپەڕی چاوقایمی و قوربانی دانەوە موسڵمان بوون، بەڵام چۆن قوربانی دانێك، ئەوان تووشی ئازارو ئەشکەنجەدانی سەختی بێ باوەڕان و سەرانی قوڕەیش دەبوون...

بۆ نموونە لەم بارەیەوە گێڕراوەتەوە (ئەبو جەهل) کە یەکێك بوو لەسەرانی قوڕەیش کاتێك بیبیستایە پیاوێك موسڵمان بووەو گەر ئەو پیاوە خاوەنی پلەو پایەو هێزێك بوایە گلەیی‌و گازاندەیەکی زۆری لێدەکردو شەرمەزاری دەکردو پێ ی دەگوت: (چۆن وازت لەئاینی باوکت هێناوە کەئەو لەتۆ باشترە.. دەبێت بەگەمژەو نەفامت دابنێین و بیروڕات بەهەڵەو ناشیرین لەقەڵەم دەین و لەوپلەو پایەیەت بخەین)...

خۆ ئەگەر کابرا بازرگانێك بوایە(ئەبوجەهل)پێ ی دەگوت: (برەو لەبازرگانییت دا ناهێڵین و پارەو ماڵت لەناودەبەین)...

بەڵام ئەگەر کابرای تازە موسڵمان بوو بێ کەس و بێ دەسەڵات و هەژار بوایە لێ ی دەداو هەڵی دەنا بۆ پاشگەزبوونەوە.[1]

لەم بەسەرهاتانەشەوە گەورەترین بەڵگە بەدی دەکرێت لەسەر ئەوەی کەوا ئیسلام بەشمشێر بڵاونەبۆتەوە (وەك ئەوەی هەندێك ناحەزو قین لە دڵ) ئیددیعای لەسەر دەکەن. چونکە پێغەمبەری خودا خاوەنی هێزێکی وا نەبوو تاکو ئەو خەڵکە ناچارکات بۆ وەرگرتنی ئیسلام، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەنانەت خودی پێغەمبەرو شوێنکەوتوانیشی بەهۆی باوەڕەکەیانەوە بەدەست سەرانی قوڕەیش چەوسابوونەوە، هەروەك لەباسەکانی داهاتووش دا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

---

دەکێشین). ئینجا هەردوکیان چوون بۆلای (أبوطالب)و بیروڕاکەیان پێڕاگەیاندو (عباس) کوڕێکی (ابوطالب) بردە لای خۆی کە (جعفر) بوو. (محمد)یش (علی)ی گرتەخۆو وەك یەکێك لەمناڵەکانی خۆی لای مایەوەو بەخێوی دەکرد تا ئەو کاتەی خودا (محمد)ی کرد بەپێغەمبەرو ئیتر (علی)یش یەکێك بوو لەئیماندارە یەکەمەکان. (عەلی) هەرگیز لەژیانیدا کڕنووشی بۆ بتێك نەبردبوو، هەر بۆیەش بەنزای (کرم الله وجهە) ستایشی دەکرێت.

(١) (ابن هشام)، ج١.

# ئاشکراکردنی بانگەواز

پێغەمبەری خودا ماوەی سێ ساڵ بەنهێنی بانگەوازی بۆ بەرنامەی خودا دەکرد، ئەمەش لە سەرەتای دەست پێکردنی سرووشەوە بووە هەتا ئەو کاتەی فەرمانی خودای بۆ هات لە سەر ئاشکرا کردنی ئاینەکەی و پێ ی فەرموو: ﴿ فَٱصۡدَعۡ[1] بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾الحجر/٩٤.. واتە: {ئەو پەیامەی ئەرکی گەیاندنییت پێ سپێرراوە ئاشکرای کەو لەسەر کاری خۆت سوورو بەردەوام بەو باکت لەموشریکان و بێ باوەڕان نەبێت}.

پێغەمبەر بۆ بەجێ هێنانی ئەم فەرمانەی پەروەردگاری چووەسەر بەرزایی ی (صفا)[2] و هاواری لەخەڵکی کردو خەڵکیش لەنێو خۆیان دا پرسییان (ئەوە کێ یە هاواردەکات)؟ گوترا (ئەوە —محمد—ە) ئینجا کۆبوونەوەو (محمد) یەکە یەکە رووی کردە هەموو هۆزو بنەماڵەکان و فەرمووی: }ئەی بنەماڵەی فلان.. ئەی بنەماڵەی —عبدالمطلب.. ئەی بنەماڵەی —عبدمناف— ، ئایا گەر پێتان بڵێم (لەقەدپاڵی ئەم شاخەوە لەشکرێك دەردەچێت) باوەڕم پێدەکەن؟{ گوتیان: }هەرگیز درۆمان لێ نەبیستوویت{. ئینجا پەیامی خۆی بۆ روون کردنەوەو بانگی کردن بۆ ڕێ ی ڕاستی خوداو فەرمووی: }من ئاگادارتان دەکەمەوە لەسزایەکی سەختی خودا گەر لەسەر ئەم حاڵەتەتان بمێننەوە{. لەو کاتەدا (ئەبو لەهەب) گوتی: }دەك سەرگەردان بیت.. ئەرێ بۆ ئەمە ئێمەت لێرە کۆکردەوە{؟ لەسەرئەم قسەیەش فەرمایشتی خودا ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾ لەسوورەتێکی کورت دا هاتەخوارەوە..

پاشان خودا فەرمانی بەپێغەمبەرەکەی داو پێ ی فەرموو:﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الشعراء/٢١٤-٢١٥.. واتە: {یەکەم جار بانگەوازی کەس و کارە نزیکەکانت بکەو لە ئاکامی ئاکارو کردارییان بیانترسێنە، هەروەها نەرم و لەخۆبووردووبە بۆ ئەو بڕوادارانەی شوێنت کەوتوون}.

پێغەمبەریش کەس و کارە نزیکەکان و بنەماڵەی خۆی کۆکردەوەو پێ ی فەرموون: {بێگومان پێشڕەو(رائد)[3]ی هەر هۆزو بنەماڵەیەك درۆ لەگەڵ کەس وکاری خۆی دا ناکات. وەڵڵاهی ئەگەر درۆ لەگەڵ هەموو خەڵکی دا بکەم درۆ لەگەڵ ئێوەدا ناکەم. خۆ ئەگەر هەموو خەڵکی فریوبدەم هەرگیز ئێوە فریو نادەم. دەسا بەو خودایەی، کە جگە لەخۆی هیچ

---

(١) (اصدع) واتە: هەق و ناهەق لەیەکتر جیابکەرەوە: (افرق بين الحق والباطل).

(٢) (صفا): جێگەیەکی بەرزە لەچیای (ابی قبیس) لەشاری (مەککە).

(٣)(رائد) کە لەدەقی عەرەبیی فەرموودەکەدا هاتووە (ان الرائد لايكذب أهله) مەبەست لەو کەسەیە کە ڕێبازێکی دیاریکراو لەبەردەم کەسانی تردا ئاسان دەکات.

پەرستراوێکی تر نی یە من پێغەمبەری خودام بۆلای ئێوە بەتایبەتی و بۆلای هەموو خەڵکی دنیاش بەگشتی... قەسەم بەخودا ئێوە دەمرن وەك چۆن دەخەون. زیندوو دەکرێنەوە وەك چۆن لەخەو هەڵدەستن. لەسەر کاروکردەوەتان لێتان دەپرسرێتەوەو لەبەرامبەر کاری چاکەدا پاداشتی چاکەتان دەدرێتەوەو لەبەرامبەر کاری خراپەش دا سزای سەخت دەدرێن. ئیتر یان بەهەشتی هەمیشەیی، یان دۆزەخی هەمیشەیی خانەی ڕۆژی دواییتان دەبێت.} ...

لەوەڵامی ئەو فەرمایشتەدا کەس وکارە نزیکەکانی و بنەماڵەکەی بەنەرمی لەگەڵی دا دەدوان تەنها (ابو لهب)ی مامی نەبێت، کە توند بوو لەگەڵیا.

## -قوڕەیش- بەرهەڵستی ی پێغەمبەر دەکەن

لەپێش هاتنی ئیسلام دا عەرەبەکان بتیان لەشوێنی(مسجد الحرام)دا دەپەرست کەچەند پەیکەرێکی لەبەرد داتاشراو بوون و هیچ سوودو زیانێکیان نەبوو، بەڵام وێڕای ئەوەش لەلای قوڕەیش بەبناغەی ژیان دادەنران.. (قوڕەیشیەکانیش پێشەوای هەموو عەرەب بوون لەو سەردەمەدا...). عەرەبەکان قوربانی یەکانیان پێشکەشی ئەو بتانە دەکردو بەمەش بەرژەوەندی‌یەکی ئابووری و سوودێکی کۆمەڵایەتی بۆ قوڕەیش دابین دەبوو، چونکە قوڕەیش هەر خۆیان ئەرکی پاراستنی خانەی بتەکانیان دەکێشاو گەر ئەو جۆرە ئاینەش لەناو بچوایە ئەوا بەرژەوەندی یەکانی قوڕەیش و پێشەوایەتی یەکەشیان لەدەست دەچوو.

هەر بۆیەش کاری پێغەمبەری خودا لەبڵاوکردنەوەی ئاینێکی تازەدا هێجگار سەخت و گران بوو. چونکە پووچەڵی و نەشیاویی دیاردەی بتپەرستی‌و ئەو بیروباوەڕانەی تری بۆ دەسنیشان دەکردن کە پێچەوانەی تاکی‌و تەنیایی‌ی خودای پەروەردگارە.

پێغەمبەر هەر بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو شێواویی داب ونەریتە کۆمەڵایەتی‌یەکانیشیانی دەردەخست. لەبەرئەمەش قوڕەیشی‌یەکان بەو ڕەنگە بۆ (محمد)یان دەڕوانی کە گوایە یاخی بووەو لەسیستم و داب ونەریتەکانی ئەوان لای داوەو هەموو بنەما ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌یەکانیان بۆ تێك دەدات. هەر بۆیەش بڕیاریان دا سووربن لەسەر بەرهەڵستی‌کردنی بەتوندی تاکو قەوارەی خۆیان بپارێزن.

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خودا چووە نێو (مسجد الحرام)ەوەو دییتی ئەوان کڕنووش(سجدة) بۆ بتەکان دەبەن، ئەویش هەوڵی دا نەهێڵێت وا بکەن و ئامۆژگاریی کردن لەسەر ئەوەی لەئایینی باوکیان (ئیبراهیم) دەرنەچن، بەڵام ئەوان لەوەڵام دا گوتیان: (ئێمە بۆیە سوژدە بۆ ئەم بتانە دەبەین تاکو نزیکمان کەنەوە لەخودا، هەروەك خوداش ئەم وتەیەیانی لەقورئان دا دیاری

کردووە ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾. پێغەمبەر بۆی ڕوون کردنەوە، کە بێگومان ئەم ڕەفتارە (هاوبەش دانانە بۆ ئەو خودایەی کە هەرگیز ئەوەیان لێ پەسند ناکات). پاشان ئەو خووڕەوشتەیانی بەکارێکی نالەبارو ناهەموار دانا. ئەوانیش تێکڕا بڕیاریان دا لەسەر دژایەتی کردنی و ئیدی بەشێوازێکی گاڵتەجاڕی و بەسووك سەیرکردن بەرەو ڕووی وەستان. هەروەك خوداش بەسەرهاتەکەیان دەگێڕێتەوەو لەم فەرمایشتانەی دا دەفەرموێت:

﴿كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ۝٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ۝٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ﴾ص/٤-٥..﴿ وَإِذَا رَأَوۡكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِي بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ۝٤١ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا لَوۡلَآ أَن صَبَرۡنَا عَلَيۡهَاۚ﴾ الفرقان/٤١-٤٢.

ئەمەش پێغەمبەری خودای دڵتەنگ دەکردو ئازاری ی دەدا، خوداش بۆ کەم کردنەوەی ئازارو خەمی پێغەمبەر، بەم فەرمایشتانە دڵنەوایی ی دەکرد کە با ئارام بگرێت لەبەرامبەر شێوازە گاڵتەجاڕییەکانیان دا، چونکە پێغەمبەرانی پێش ئەویش تووشی هەمان حاڵەت بوون:

﴿وَلَقَدۡ كُذِّبَتۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمۡ نَصۡرُنَاۚ﴾ الأنعام /٣٤.

کەسانی گاڵتەجاڕو سووکایەتی پێ کەرانیشی لەو گەورەپیاوو سەرۆك هۆزانەبوون کە هەردەم بەوتەی ناشیرین و جنێوو تیروتوانج بەرپەرچی پێغەمبەریان دەدایەوەو دەربارەی خۆیشی دەیانگوت گوایە ئەمە (کاهینێکە) یان شێتە، جگە لە درۆ خستنە پاڵیشی. خوداش هەمیشە ڕووی فەرمایشتی بەم ڕەنگە لەپێغەمبەر بوو:

﴿ فَذَكِّرۡ فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٖ وَلَا مَجۡنُونٍ﴾الطور/٢٩.

هەندێك جاری تریش قسەی نابەجێ یان بۆ قورئان هەڵدەبەست و وایان ڕادەگەیاند گوایە لەئەفسانەکانی پێشینانە، هەروەك خودا خۆی ئاماژە بۆ ئەو کردارەشیان دەکات:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا ۝٤ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا﴾الفرقان/٤-٥.

شێوازێکی تری بەربەرەکانی کردنیان لەدژی پێغەمبەری خودا ئەوەبوو داوای چەندین موعجیزەیان دەکرد، وەك تەقاندنەوەی کانیاوێك لەزەوی دا یان دروست کردنی باخی زۆر لەدارخورماو ترێ و ڕاکێشانی ڕووبار بەنێویان داو هەڵقوڵاندنی ئاوی ڕووبارەکە لێ یانەوە،

یـاخود خـستنەخوارەوەی چـەند هۆیـەکی سـزادان لەئاسمانـەوە، یـان پیـشان دانـی خـوداو مەلائیکەتەکان بۆ سەلماندنی ڕاستی ی وتەکانی، یـاخود خـاوەنی خانوویـەکی دروسـت کـراو لەئاڵتوون بێـت، یـان بـەئاسمان دا سـەرکەوێت و بـاوەڕ بەسەرکەوتنەکەشـی نەکـەن هـەتاکو کتێبێکیان لەئاسمانەوە بۆ بێنێتەوە تا بیخوێننەوە.

لەم بارەیەشەوە خودا فەرموویە: ﴿﴿٨٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَـٰرَ خِلَـٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا[1] أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا[2] ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ[3] أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَـٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا﴾ الأسراء/ ٩٠-٩٣.

ئەمە هەندێك لەو بەربەستانە بوو، کە دەهاتنەسـەر ڕێ ی پێغەمبـەر بـەهۆی دژایـەتی و بەربەرەکانی ی گەلەکەیەوە، ئەویش زۆر بە ئارام و خۆڕاگر بوو و هەر بانگەوازی بـۆلای خـودا دەکردو بیروباوەڕەکانی ئەوانی بەنادانی و نەفامی دادەنا بەهۆی پەرستنی ئـەو بتانـەوەی، کـە هیچ زیان و سوودێکیان نەبوو، هـەروەك خـوداش لەبەشـێکی سـرووش و فەرمایـشتەکانی دا فەرمانی پێ دەکرد، کە ئەم ڕاستی یەیان پێ بگەیەنێت:

﴿إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَـٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ النجم/٢٣... ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾ البقرة/ ١٧٠... ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَـٰمِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ الفرقان/ ٤٤.

## هەڕەشەکردن لە پێغەمبەر

بەهۆی ئەوەی پێغەمبەر خواوەنـدەکانی ئـەوانی بەشـتێکی پووچـەڵ و ناشـیرین دادەنـاو عەقڵیەتیشیانی بەنـەفامی و کـەودەنی دادەنـا کۆمـەڵێك لەگـەورەپیاوانی قـوڕەیش بـۆ ئـەم مەبەستە چوونەلای (ابوطالب)ی مامی و پێ یان گوت: (ئەی "ئەبو تالیب" برازاکەت قـسەی

(١) کسفاً: {چەند پارچەیەك لەسزا.. چەند بەش و هۆیەکی ئەشکەنجەدان}.
(٢) قبیلا: {گرنتی و زامنی ڕاستی ی ئیددیعاکانت بن}.
(٣) زخرف: {ئاڵتوون}.

نابەجێ ی بەخواوەندەکانمان گوتووەو ئاینەکەمانی لەکەدار کردووەو عەقڵ و هۆشمانی بەنەفامی و کەودەنی داناوەو باب و باپیرانمانی بەکەسانی گومڕا لەقەڵەم داوە، جا تۆش یان دەبێت وای لێ بکەیت دەست هەڵگرێت لێمان یاخود دەسبەرداری ببەو هیچ هەقێکت بەسەر هەردووولامانەوە نەبێت، دیارە تۆش (وەك بزانین) دەسبەرداری نابیت، بۆیە ئێمە لەرێ ی تۆوە ئاگاداری دەکەینەوە)...

(ابوطالب)یش بەوتەی نەرم و ناسك قسەی لەگەڵ کردن و بەجوانی بەرێ ی کردن، ئەوانیش ماڵئاواییان لێ کردو ڕۆشتن. بەڵام پێغەمبەر لەسەر بانگەوازی خۆی بەردەوام بووو هیچ شتێك لەوە پاشگەزی نەدەکردەوەو هەرخەریکی باس کردنی ئایینی خوداو بانگەواز بۆکردنی بوو.

ئەمەش زیاتر ڕقی ڕەشی قوڕەیشی بزواندو هەموو سەرەك هۆزو پیاوماقووڵانیان کۆبوونەوەو جارێکی تر چوونەوە بۆلای"ابوطالب"و پێ یان گوت: (ئەی"ئەبو تالیب"بێگومان تۆ تەمەنێکت بەسەربردووەو پیاوێکی بەساڵاچوو و خاوەن پلەوپایەی تایبەتییت لەنێومان دا. ئێمە لەمەوپێش داوامان لێ کردیت کۆتایی بەمەسەلەی ئەو برازایەت بێنیت و نەهێڵیت چی ی دی بۆ ئەو بەرنامە تازەیە بانگمان بکات، بەڵام تۆ ڕێی ئەوەت لێ نەگرتووە کە کۆتایی بەو قسەو باسانەی بێنێت. دەسا بەخودا ئێمەش چی تر ئارام ناگرین لەسەر توانج دان لەباب و باپیرانمان و بەپووچەڵ دانانی عەقڵمان و لەکەدار کردنی خواوەندەکانمان، ئارام ناگرین هەتاکو وازی پێ دێنیت و لێمانی دووردەخەیەوە، یان گەر واناکەیت ئەوا خۆمان بەرەنگاریی ئەویش و تۆش دەبینەوە تا ئەو کاتەی لایەکمان لایەکەی تر لەناودەبات)ئینجا بەجێیان هێشت.

(ابوطالب) زۆری پێ ناخۆش بوو گەر لەگەڵەکەی دابڕێت یان دژایەتی بکەن. دیارە پێیشی خۆش نەبوو، کەپێغەمبەریان تەسلیم بکات یان سەردانەوێنێت بۆ داواکانیان. پاشان ناردی بەدوای داو پێ ی گوت: (ئەی کوڕی برام، ئەمڕۆ گەورەپیاوانی گەلەکەت هاتنە لام و چەند قسەیەکیان لەبارەی تۆوە پێ گوتم: (ئینجا ئەو قسانەی ئەوانی پێ گەیاند))و پێ ی گوت☹جا تۆش منیش و خۆیشت بهێڵەوەو هەردوکمان بپارێزەو بارێکی وا مەخەرە سەرشانم، کە نەیتوانم).

پێغەمبەر بەم وتانە گومانی وابوو، کەمامی بیروڕایەکی تازەو هەڵوێستێکی تری بەرامبەری هەبێت و سازشی لەسەرکردبێت و هاندەری بێت لەسەرخۆ بەدەستەوەدان و وازهێنان لەپەیامەکەی. ئەمەش بەوپێ یەی، کەتوانای پشتگیری کردنی لاواز بووبێت[1]. هەر بۆیەش ئەو فەرموودە بەناوبانگ و نەمرەی بەمامی فەرموو کە هەتا کۆتایی دنیا هەر بەنەمری

(١) ابن هشام، ج١.

دەمێنێتەوەو گوزارشت لە (مردن لەپێناوی عەقیدەو بانگەواز بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنیا)دا دەكات، ئەو بانگەوازەی كەهەموو هەڕەشەو گوڕەشەو چەشنە ئازاردانێكیش لەئاستیا بچووك دەبنەوە، ئەوەبوو پێغەمبەری خودا لەوەڵامی وتەكانی مامیدا فەرمووی: (ئەی مامی خۆم.. وەڵڵاهی ئەگەر خۆر بخەنە سەرشانی ڕاستم و، مانگ بخەنە سەرشانی چەپم تەنها بۆ ئەوەی دەست لەم كارە هەڵگرم، دەستی لێ هەڵناگرم هەتا خودا سەری دەخات و دەیچەسپێنێت یان لەپێناوی دا دەمرم).

بەڕاستی ئەم فەرموودەیە تەعبیر لەگەورەیی ی ئیمان و بەرزی و پیرۆزیی دەكات كاتێك لەقوولایی دڵ دا جێگیر دەبێت، ئیمانیش وەك لافاوێكی هەڵچووەو هیچ هێزێكی سەرزەوی خۆی لەبەردا ڕاناگرێت.

پێغەمبەر دوای ئەوەی لەبەردەم مامی دا ئامادەیی تەواوی بۆ خۆفیداكردن لەڕێ ی بانگەوازەكەی دا پیشان دا، ئینجا گریاو ڕۆیشت. بەڵام (ابو طالب)ی مامی بانگی كردەوەو پێ ی گوت: (كوڕی برام ئەوەی پێت خۆشە بیڵێ و وەڵڵاهی منیش هەرگیز بۆ هیچ شتێك دەسبەردارت نابم و تەسلیم بەهیچ كەسێكت ناكەم).

## چەند هەوڵێك بۆ فریودانی پێغەمبەر

ڕۆژ بەڕۆژ جەماوەر زیاتر بەدەم بانگەوازە ئیسلامی یەكەوە دەچوون و سەرانی "قورەیش"یش هەستیان بەم حاڵەتە كردبوو، هەر بۆیەش لەنێو خۆیان دا كۆبوونەوەو ڕاوێژیان لەگەڵ یەكتردا كرد دەربارەی ئەو مەترسی یە تازەیەی هەڕەشە لەبوون و دەسەڵاتیان دەكات، لەئەنجامی ڕاوێژیان دا بیر و ڕایان هاتەسەر ئەوەی چەند پلەوپایەو (ئیمتیازات)ێك بخەنە بەرچاوی (محمد) بۆ ئەوەی فریوی بدەن و وازی لەبانگەوازەكە پێ بێنن.

بۆ ئەم مەبەستەش كەسێكیان نارد بەدوای داو ئەویش بەگورجی چوو بۆلایان چونكە سوور بوو لەسەر ئەوەی بەو بۆنەیەوە ڕێنمایی یان بكات و پەیامی خودایان پێ بگەیەنێت. هەر كە گەیشتە لایان، پێ یان گوت: {ئەی –محمد– ئێمە ناردمان بەدواتا تا گفت و گۆت لەگەڵ دا بكەین، بێگومان نەماندیوە تا ئێستا پیاوێك وەك تۆ ڕەفتاری كردبێت و ئەو حاڵەتە نالەبارەی بەسەر گەلەكەی دا هێنابێت... تۆ جنێوو پلارت لەباووباپیرانمان داو ئاینەكەمانت لەكەداركردو قسەی ناشیرینت بەخواوەندەكانمان گوت و عەقڵی ئێمەت بەنادانی و نەفامی لەقەڵەم دا. هەروەها كۆمەڵت پەرتەوازەو بەش بەش كردووە. هیچ شتێكی قێزەون و ناشیرین نەماوە كە

بۆمانی نەهێنیت و نێوانی خۆت و ئێمەی پێ تێك نەدەیت. جا ئێستاش ئەگەر تۆ ئەم قسەو باسانەت بۆ ئەوە هێنابێت کە ماڵ و سامانێکی پێ پەیداکەیت ئەوا ئێمە لەهەموو ماڵ وسامانی خۆمان بۆت کۆ دەکەینەوە تاکو لەهەموومان دەوڵەمەندتر بیت. خۆ ئەگەر مەبەستت لەم قسەو باسانە ئەوەیە پایەداربیت ئەوا ئێمە دەتکەین بەگەورەو سەرداری خۆمان. یان ئەگەر ئامانجت گەورەییو پاشایەتی بێت ئەوا دەتکەین بەپادشای خۆمان. یاخود ئەگەر لە (جن)و لەشوێنکەوتەیی (جن)ەوە ئەم قسەو باسانە وەردەگریت و لەدەسەڵاتی خۆت دا نەماوەو (جن) زاڵ بوون بەسەرتا ئەوا ئێمە پارەو پوولێکی زۆرت لەچارەسەرکردنی پزیشکی و چاك بوونەوەدا بۆ خەرج دەکەین تاکو چاکت دەکەینەوە یان گەر چارەسەرێك بۆ ئەم نەخۆشی یەت نەبوو چیتر لێت نەگرین و سەرزەنشتت نەکەین} .

پێغەمبەریش لەوەڵامی ئەو پێشنیارانەیان دا فەرمووی: {من دوچاری ئەو حاڵەتانە نیم کەئێوە دەیڵێن. من بەوپەیامەی بۆ ئێوەم هێناوە داوای پارەو ماڵتان لێ ناکەم، هەروەها نە داوای پلەوپایەتان لێ دەکەم و نەپادشایەتی و موڵك و سامان. بەڵکو خودا منی وەك پێغەمبەرێك ناردووە بۆ لاتان و پەیامێکی پێسپاردووم و فەرمانی پێکردووم وەك مژدەدەرو ترسێنەرێکتان بم و پەیامی خودای پەروەردگارتان پێڕاگەیەنم و ئامۆژگاریو ڕێنموونیتان بکەم. جا ئەگەر ئەوەی بۆم هێناون پەسندی دەکەن و پەیڕەویی دەکەن ئەوا مایەی بەختەوەرییتان دەبێت لەدنیاو ڕۆژی دواییش دا، خۆ ئەگەر ڕەتی دەکەنەوە بەسەرما ئەوا لەسەر من پێویستە چاوەڕێ کەم و ئارام بگرم هەتا خودا بڕیاری خۆی لەنێوان من و ئێوەدا دەردەکات} .[1]

پاشان بێ باوەڕەکان بۆ بەرگرتن لەبانگەوازی هەق لەهەوڵێکی تریان دا پێشنیارێکی تریان خستەڕوو، ئەوەبوو کەپێغەمبەر بەشداریی ی عیبادەتی ئەوان بکات، واتە: (بەشداریی بتپەرستی و ڕێگە چەوتەکانیان بکات) لەهەمبەر ئەوەدا ئەمانیش ماوەیەك بەشداریی خواپەرستیو ڕێبازەکەی ئەو بکەن.

خوداش لەوەڵامی ئەو پێشنیارەدا ئەم سوورەتەی بۆ پێغەمبەرەکەی نارده خوارەوەو داوای لێ کرد ئاوا وەڵامیان بداتەوە: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ .... تا کۆتایی سوورەتەکە﴾ هەروەها ئەم ئایەتەشی هەر لەو بارەیەوە بۆ ناردووە: ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَـٰهِلُونَ ﴾.

---

(١) ابن هشام، ج١.

جگە لەو هەوڵە فریودەرییانەیان چەند ڕێـچکەیەکی تریـشیان لەگـەڵی دا گرتەبـەر، وەك ئەوەی داوایان لێ دەکرد ئەو ئایەتانە لەقورئان فەرامۆش کات، کە ئـەوانی پـێ تـووڕەو زویـر دەبن و باسی ڕێچکە چەوتەکەیان و سەرزەنـشتی بتـەکانیان و بـەڵێنی سـزای سـەخت لەسـەر پەرستنیانی تێدایە.

لەوەڵامی ئەم هەوڵە پووچەڵەشیان دا خودا ئەم ئایەتـەی بـۆ پێغەمبـەر نـاردو فـەرمانی پێکرد کە ئاوا وەڵامیان بداتـەوە: ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِيَ أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاءِ نَفْسِيَ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ ﴾...

# بەندی سێ یەم

## ((ئازاردانی پێغەمبەرو بڕواداران))

(ئازاردانی پێغەمبەر - ئازاردانی بڕواداران — کۆچ کردن بۆ (حەبەشە) —
گەمارۆدانی پێغەمبەرو بڕواداران — تەشکەنجەدانی پێغەمبەر لە (طائیف) )

## ئازاردانی پێغەمبەر

بێ باوەڕان کاتێك دیتیان ئەوا موسڵمانان ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەیان زیاد دەکات، دەستیان کرد بەکاری خراپە لەدژی پێغەمبەرو پاشان تەنگ پێ هەڵچنینی، ئەوەبوو کەسانی بەدکارو شەڕەنگێزیان دەنارد بۆ سووکایەتی پێ کردن بەخۆی و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵی دابوون تاکو زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنن.

دەربارەی ئەو هەموو ئازاردان و گەڕپێ کردن و بەدکارییانە پێغەمبەر فەرموویەتی: {بەڕاستی لەپێناوی دینی خوادا ئازارێکی وەها دراوم کە هیچ کەسێك ئاوا ئازار نەدراوە، هەروەها بەشێوەیەك لەو پێناوەدا تۆقێنراوم، کەهیچ کەسێك ئاوا نەترسێنراوە، هەروەها ماوەی وەهام بەسەردا تێ پەڕیوە کە سی شەوو سی ڕۆژ من و (بیلال)[1] خۆراکێکی وامان لانەبووە کەبەشی زیندەوەرێك بکات تەنها ئەوەندە نەبێت کە (بیلال) بۆ هاتوچۆو سەفەر لەبن دەستی نابێت و بەشێکی ئاتاجی خۆی پێ مەیسەر کردبێت}.[2]

بۆ نموونە لەو ئازارانەی، کە بەپێغەمبەر گەیشتووە، جارێکیان (ابو جهل)، کە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی قوڕەیش بەردێکی زلی بەدەستەوە گرتبوو، تا بیدات بەسەری پێغەمبەرداو بیکوژێت، بۆ ئەم مەبەستەش چاودێریی ی کردووە، تا دەچێتە شوێنی نوێژکردنی لەکەعبەداو دەست بەنوێژ دەکات و کاتێك دەچێتە سوژدەوە (ابو جهل) خێرا دەیەوێت بەردەکەی پیاکێشێت، بەڵام خودا لەو ساتەدا ترس و بیمێکی وەها دەخاتە دڵی (ابو جهل)ەوە تا وای لێ دێت لەو کارە پاشگەزبێتەوەو ڕەنگی دەم و چاویشی تێك دەچێت و بەدڵە لەرزێ یەوە دەگەڕێتەوە.

---

(1) (بیلال) کارگوزار (خادم)ێکی پێغەمبەر بووە.
(2) ئەم فەرموودەیە لە — تخریج —ی "ترمذي"و "ابن ماجه"یە.

جارێکی تریشیان (ابو جهل) داوا لەپیاوێك دەکات، کە پاشەڕۆکی نێو سکی حوشتری سەربڕراوی بۆ بێنێت (کە بەعەرەبی پێ ی دەڵێن: فرث جذور)، ئینجا –ابو جهل– ئەو هەموو پاشەڕۆك و پیسی و پۆخڵی یە هەڵدەگرێت و دەیدات بەسەری پێغەمبەردا، کە لەحاڵەتی سوژدەدابوو. بەڵام هیچ کەسێك لەو چەند موسڵمانە کەمەی ئەو ڕۆژە جورئەتی ئەوەی نابێت کە پاکی بکاتەوە لەو شتە پیسانە. دیارە ئەمەش بەهۆی کەمی ی ژمارەیان و ترسانیان لەبێباوەڕەکانی قورەیش، تا لەدوایی دا (فاطیمە)ی کچی دێت و ئەو شتە پیسانەی لێ دەکاتەوەو سەرو ڕوخساری باوکی پاك دەکاتەوە.

جارێکی تریش هەر (ئەبو جەهل) لەشاخی (صەفا) بەپێغەمبەر دەگات و ئازاری دەدات بەجنێوو قسەی نابەجێ بێحورمەتی بەپەیام و ئاینەکەی دەکات و تیروتوانجی لێ دەدات.[1]

هەروەها ڕۆژێکیان پێغەمبەر دەگەڕێتەوە بۆماڵەوەو نەختێك خۆڵ و تەپ وتۆزیش بەسەریەوە دەبێت (تومەز ئەمە لەوەوپێش هەندێك کەس لەنەفام و بەدڕەفتارەکان کردبووی بەسەری دا)، یەکێك لەکچەکانی خێرا هەڵدەسێت و سەری بۆ دەشوات و دەگری، بەڵام پێغەمبەر پێ ی دەفەرموێت: (کچم مەگری، دڵنیابە خودا پارێزەری باوکتە).[2]

یەکێکی دی لەو کەسانەی کە ئازاری پێغەمبەریان دەدا (عقبە–ی کوڕی –ابو معیط) بوو. ئەم کابرایە جارێکیان کە پێغەمبەر لەکەعبەدا نوێژی دەکرد دەچێت کراسەکەی توند لەملی شەتەك دەدات و خەریك بوو بیخنکێنێت هەتا (ئەبوبەکر) فریای دەکەوێت و کەمەری (عقبە) ڕادەوەشێنێت و لەپێغەمبەری دووردەخاتەوەو پێیشی دەڵێت: {ئایا پیاوێك دەکوژن کەتەنها دەڵێت (پەروەردگارم (الله)یە) و بەڵگەی ڕوون و ئاشکراشی لەخودای پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون}.

هەروەها لەوانەی کە ئازاری پێغەمبەریان دەدا (ابو لهب) و (ام جمیل)ی هاوسەری بوو، (ام جمیل) دڕك و داڵی کۆدەکردەوەو دەیخستە سەر ئەو ڕێگەیەی کە پێغەمبەر پیایدا دەڕۆشت.[3]

## ئازاردانی بڕواداران

دیارە جگە لەخودی پێغەمبەری خودا ئەو بڕوادارانەی لەگەڵیشی دا بوون ئازارێکی توندو کاریگەر دەدران، لەوانیش: (بیلال–ی کوڕی –ڕەباح) کە بەندەی (ئومەییە–ی کوڕی – خەڵەف) بوو. لەبەرئەوەی (بیلال) ئیمانی بە (محمد) هێنابوو (ئومەییە) لەسەرئەمە لەکاتی

---

(1) ابن هشام.
(2) تأریخ الطبري.
(3) ابن هشام.

نیوەڕوان و تین سەندنی گەرمادا (بیلال)ی لەسەرپشت پاڵ دەخست لەچۆڵەوانی یەك داو بەردێکی گەورەشی دەخستە سەر سنگی و پاشان پێی دەگوت: }هەر بەم حاڵەتەوە دەمێنیتەوە تا دەمریت یان دەبێت پاشگەز بیتەوە لەباوەڕهێنانت بە (محمد)و هەر (لات و عوززا)[1] بپەرستیت{. بەڵام (بیلال) لەو حاڵەتی نارەحەتی یەش دا هەر دەیگوت: (( أحَد.. أحَد))[2].. واتە: {خودا یەکەو تاك و تەنیایە}.

ڕۆژێکیان (ئەبوبەکر) بەلایان دا تێدەپەڕێت و دەڵێت: ئەرێ -ئومەییە- تۆ لەخوا ناترسیت کەوا لەم هەژارە دەکەیت و هەتا کەی ئازاری دەدەیت؟{. ئومەییە دەڵێت: }تۆ خۆت ئاکاری ئەم عەبدەت تێك داوە، دە هەر خۆشت ڕزگاری بکە لەم حاڵەتەی کەدەیبینیت}.

(ئەبوبەکر)یش ئەو بەندەیە (واتە — بیلال)ی لێ دەکڕێتەوەو ئازادیشی دەکات. خودای مەزن لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوە:

﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴿١٥﴾ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾اللیل/١٤-١٦ واتە: {من ئاگادارم کردوونەوە لەئاگرێکی بڵێسەدارو کڵپەسەندوو کە هەر مرۆڤی یاخیو بەدبەختی تێدەکەوێت، ئەو مرۆڤە بێ باوەڕەی کە بەرنامەی خوداو پەیامی پێغەمبەرەکەی بەدرۆ دەخستەوەو ڕووی لەگوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی پەروەردگار وەردەگێڕا}.

مەبەست لەم مرۆڤەش (ئومەییە-ی کوڕی —خەلەف—ە). پاشماوەی ئایەتەکانی ئەم دەقە قورئانی یەش باسی (ئەبوبەکر) دەکات و ستایشی ڕۆڵی بەخشندەییو دڵفراوانی ی دەکات:

﴿وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ﴿١٧﴾ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾اللیل/١٧-٢١. واتە: }بەڵام مرۆڤی لەخواترس و بەتەقوا (ئەوەی کەخۆی دەپارێزێت لەهەر شتێك کە دەبێتە هۆی پەستیو تووڕەیی ی خودا) لەو ئاگرە خۆی دووردەخاتەوە، ئەویش بەو ڕەنگەی لەماڵ و سامانی خۆی لەپێناوی خوادا دەبەخشێت بەمەبەستی چاکسازیو خۆ پاك کردنەوەو خۆپاراستن نەك بەمەبەستی ڕووپاماییو خۆهەڵنان. چونکە تەنها دڵسۆزان و بۆ خوا سوڵحاوان پاداشتی ئەو کارانەیان دەدرێتەوە، واتە ئەوانەی دەیانەوێت بەو کارە جوامێریانەیان تەنها خزمەتی ڕێبازی خوداو هەوڵی ڕەزامەندیی خودا بدەن. بێگومان خوداش لێ یان ڕازی دەبێت}.

یەکێکی تر لەوانەی بەهۆی ئیسلام بوونیەوە ئازار درا (عەممار—ی کوڕی—یاسر)و باوکی و دایکی بوون. ئەوەبوو خێڵی (بنو مخزوم) لەکاتی گەرمای نیوەڕۆدا هەریەکە لە (عەممار)و —

---

(١) (لات و عوززا) ناوی دووبتن کە کافران دەیانپەرست.

(٢) ابن هشام.

یاسر ـی باوکی و، دایکیشیان پێکەوە دەهێنانە دەرەوەو بەڕووتی لەسەر لمی گەرم و سووربۆوە پاڵیان دەخستن تاکو بەسەختی ئەشکەنجەیان بدەن و ئازاری زۆریان پێ بچێژن. هەندێك جار لەو حاڵەتانەدا پێغەمبەر بەلایان دا تێ پەڕدەبوو و زیاتر لەسەر باوەڕ هانی دەدان و پێ ی دەفەرموون: ((صَبراً آلَ یاسر فَمَوعِدَکُمْ الجَنة))...

(دایکی عەممار) بەو سزا سەختە کوژراو بەم پێ یەش یەکەمین شەهید بووە لەئیسلام دا.

یەکێکی دی لەبڕوادارە ئازاردراوەکان (خباب ـی کوڕی ـارت)ە کە بەندەی ژنێکی بێ باوەڕبوو و ئاسنی سوورکراوەی بەپشتی دا دەهێناو داخی دەکرد تا کافر ببێتەوە، بەڵام (خەبباب) بەمە ئیمانی زیاتر دەبوو. ڕۆژێك (خەبباب) چووە لای پێغەمبەرو باسی سەختیی ئەو سزایەی بۆکردو داوای لێ کرد کەنزاو دووعای بۆبکات و چیتر نەناڵێنێت بەدەست ئەو سزایەوە. بەڵام پێغەمبەر پێی فەرموو: }بێگومان بڕوادارانی پێش ئێوە بەمشاری ئاسن بڕراونەتەوەو ئێسك و گۆشت و ماسوولکەو دەمارەخانەکانی جەستەشیانی گرتۆتەوە، بەڵام بەوەش لەئاینەکەیان پاشگەز نەبوونەتەوە. بڕواداری وا هەبووە کەمشارەکە خراوەتەسەر تەپڵی سەری‌و لاشەی کراوە بەدوو کەرتەوەو کەچی لەدینەکەی هەڵنەگەڕاوەتەوە. خوداش ئەم دینەی ئێمە بەجێ دەگەیەنێت هەتا وای لێ دێت مرۆڤی سوارە (واتە ئەوەی ئەسپ سوارە یان سوارپشتی وڵاخی بەرزەبووە) لە (صنعاء)ەوە بۆ (حەزرەمەوت ـحضرموت) دەڕوات و جگە لەخودا لەهیچ کەسێکی دی ناترسێت{(١).

هەروەها چەندین موسڵمانی تر لەو سەردەمەدا کەوتنە بەر هەموو جۆرە سزایەکی وەك لێدان و برسی کردن و تینووکردن و چەندین جۆرە سزاو ئەشکەنجەدانی دی و تەنانەت هەندێك موسڵمانی ئازاردراو لەبەر سەختی ی ئازارەکەی نەیتوانیوە بەشێوەیەکی ئاسایی دانیشێت لەسەر زەوی.

لەو جۆرە دۆخانەش دا پێغەمبەری خودا ئەو ئایەتانەی بۆ بڕواداران دەخوێندەوە کە تایبەت بوون بەجێگیربوون و خۆڕاگرتن لەسەر ئەو جۆرە حاڵەتانەو ئازاری سزای سەختی لەسەرسووك دەکردن، هەروەك خودا لەو ئایەتانەدا فەرموویە:

﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾العنكبوت /٢-٣. واتە: {ئایا خەڵکی بڕوادار وا تێ دەگەن گەر بڵێن باوەڕمان هێناوە ئیتر وازیان لێ دێنرێت و تاقی ناکرێنەوە لەسەرئەو

(١) البداية والنهاية لأبن كثير.

ئیمانەی کە بەهۆیەوە هەڵدەسەنگێنرێن و تا ڕاستگۆو درۆزنیان لێ جیابکرێتەوە؟ بێگومان بڕوادارانی پێش ئەمانیشمان تاقی کردۆتەوەو ڕاستگۆیانمان لەناپاك و درۆزنان جودا کردۆتەوەو خودا هەردوولای ناساندووە}.

هەروەها لەئایەتێکی تردا کەهەمان چەمك و مانا دەبەخشێت و باسی تاڵی و نارەحەتی و ناخۆشی یەکانی سەرڕێگای باوەڕدەکات، فەرموویە: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴾البقرة/٢١٤.

## کۆچ کردن بۆ "حەبەشە"

جا کاتێك پێغەمبەر هەستی بەتوندتر بوونی سزاو ئەشکەنجە لەسەر هاوەڵانی کرد پێ ی فەرموون: {دەتوانن لێرە دەرچن و بڕۆن بۆ خاکی "حەبەشە" چونکە پادشایەکی لێ یە کەهیچ کەسێك لای ئەو چەوساوە نی یەو ئەو خاکەش ناوچەیەکی هێمنەو لەوێ بمێننەوە هەتاکو خودای مەزن دەروویەکی ڕزگاربوونتان لەم حاڵەی ئێستا لێدەکاتەوە}.

ئیتر ژمارەیەکی دیار لەموسڵمانان بەرەو خاکی (حەبەشە) بەئاینەکەیانەوەو لەڕێ ی خوادا هەڵاتن کە یەکەم کۆمەڵیان یازدە پیاوو چوار ئافرەت بوون و گەمی(سفینة)یەکیان بەکرێ گرت بۆگەیاندنیان. پاشان بەدوایان دا موسڵمانانی تریش بەرەو (حەبەشە) کۆچیان کرد هەتا لەدوایی دا ژمارەی کۆچکردووەکان گەیشتە هەشتاو سێ پیاوو هەژدە ئافرەت.

سەرانی قوڕەیش کەهەواڵی کۆچکردنی ئەو ڕێژە زۆرەی موسڵمانەکانیان پێگەیشت خێرا وەفدێکیان بۆ ئەو مەسەلەیە گەیاندە لای پادشای حەبەشە (نەجاشی)کە (عبداللە—ی کوڕی — ابی ربیعە) و (عەمر—ی کوڕی—عاص)ی تێدابوون و چووبوون بۆ گێڕاندنەوەی کۆچکردووەکان بۆ (مەککە) تا سەرلەنوێ سزایان بدەنەوە.

جا کاتێك وەفدی قوڕەیش بەدیداری (نەجاشی) گەیشت، (عەمر—ی کوڕی —عاص) ڕووی کردە پادشاکەو پێ ی گوت: {چەند کەسێکی هەرزەو نەفام لەلای ئێمەوە ڕوویان کردۆتە وڵاتەکەی تۆو وازیان لەئاینی گەلەکەی خۆیان هێناوەو پەیڕەویی دینەکەی تۆش ناکەن. بەڵکو ئاینێکی تازەیان داهێناوە کە نەئێمەو نەتۆش هیچمان لەبارەیەوە نەبیستووە. ئێمەش کەسانی گەورەو پیاوماقووڵمان لەباوك و مام و خزم و کەس وکاری خۆیان لەهۆزو تیرەکانیانەوە

خستۆته ناویانەوەو ناردوومانن لەگەڵیان دا تا هەر بەوان دا بیانگەڕێنیەوە، چونکە هەر ئەوان باشتر دەزانن کە چ عەیب و عارێکی پێوەناون؟!}.

(نەجاشی) دوای بیستنی ئەو قسانەیان ڕای وابوو کارێکی دانایی نی یە گەر ئەم کۆچکردوانەیان تەسلیم کاتەوە پێش ئەوەی گوێ لەوانیش بگرێت و بزانێت وتەو بەڵگەیان چی یە. ئەوەبوو ناردی بەدوای هاوەڵانی پێغەمبەرداو هاتنەلای و لیّ ی پرسین: {ئەرێ چی یە ئەم دینەی کە بەهۆیەوە وازتان لەقەوم و کەس و کار هێناوەو هاتوون بۆ ئەم وڵاتەو کەچی پەیڕەویی دینەکەی منیش ناکەن و لەو هەموو دینەش پەیڕەویی یەکێکیان ناکەن؟}.

لەوەڵامی ئەو پرسیارەی (نەجاشی)دا (جعفر-ی کوڕی -ابو طالب) لەنێو هاوەڵان دا کەوتە ئاخاوتن و گوتی: }بەڕێز جەنابی پادشا.. ئێمە گەلێکی شوێنکەوتووی نەفامی بووین، بتمان دەپەرست و گۆشتی مردوومان دەخواردو، بەدرەفتارییمان دەکردو، هیچ پەیوەندی یەکی سۆزو کەسایەتییمان نەهێشبووەوەو خراپەمان دەرهەقی هاوسێ دەکردو هاوسێ یەتیمان لەگەڵ یەکدی باش نەبوو... بەهێزەکانیشمان بێ هێزەکانمانیان دەخوارد. ئێمە لەسەر ئەم حاڵەتە بووین هەتا خودا پێغەمبەرێکی لەخۆمان بۆناردین کە ڕەچەڵەك و بنەماڵەی دەناسین و بەپیاوێکی ڕاستگۆو دەسپاك و داوێن پاك ناسراوە لەلامان، ئەو بانگیکردووین بۆئەوەی کە هەر خودای تاك وتەنیا بپەرستین و بەتاك و بێ هاوەڵی دابنێین و واز لەو بەردو بتانەی پێشوومان بێنین کە لەوەوپێش خۆمان و باب وباپیرانمان لەجیاتی خودای مەزن دەمانپەرستن.. پاشان ئەم پێغەمبەرەی خودافەرمانمان پێ دەکات بەڕاستگۆیی و بەجێگەیاندنی سپاردەو بەتین کردنی پەیوەندیی سۆز (صلە-ی -رحم)و چاکەکردن لەگەڵ هاوسێ داو وازهێنان لەکاری حەرام و خوێنڕێژی. هەروەها ڕێگریمان لیّ دەکات لەبەدکاریو قسەی درۆو بوختان هەڵبەستن و، خواردنی ماڵ و سامانی هەتیوان و، بوختان بۆ ئافرەتانی ڕەوشتبەرز. دیسان فەرمانی پیّ کردووین کەهەر خودا بپەرستین و هیچ شتێك نەکەین بەهاوەڵی. جگە لەمانەش فەرمانی پیّ کردووین بە نوێژکردن و زەکات دان و ڕۆژووگرتن... (جەعفەر- هەموو کارو فەرمانەکانیتری بۆپادشاکە بژارد)و بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و گوتی: (ئێمەش بڕوامان پێی کردووەو ئیمانمان پیّ هێناوەو پەیڕەویی ی هەموو ئەو فەرمانانەمان کردووە کە لەلایەن خوداوە بۆی هاتووەو، ئیدی هەر خودای تاك و تەنیامان دەپەرستین و هیچ شتێك ناکەینە هاوەڵ و شەریکی. هەروەها ئەو شتانەی کەپێغەمبەر بەحەرامی داناوە لەسەرمان ئێمەش بەحەرامان داناوەو توخنی نەکەوتووین، هەر شتێکیشی بۆ بەحەڵاڵ دانابێ ئێمەش بەحەڵاڵمان داناوەو پەیڕەویمان کردووە. لەبەرامبەر ئەم کردەوەیەمان دا گەلەکەمان دەسدرێژییان کردۆتە سەرمان و

ئازاریان داوین و بەربەرچی ئاینەکەمانیان داوەتەوە تاکو لەخواپەرستی یەوە بمانگێڕنەوە بۆ سەر بتپەرستیو سەرلەنوێ ئەو شتە پیس و نابەجێ یانە بەحەڵاڵ بزانین، کە لەوەوپێش ئەنجامان دەدا. جا کاتێك زوڵم و زۆری ئەوان گەیشتە ئەوپەڕی و بەتەواویش تەنگیان پێ هەڵچنیین و هەموو جۆرە بەربەستێکیان هێنایە سەرڕێی دینەکەمان ناچاربووین دەرچین و بێین بۆ وڵاتەکەی تۆ}.[1]

لەو کاتەش دا سەرەتای سوورەتی (مریـەم)ی بـۆ خوێنـدەوەو ئیتر (نەجاشـی ــی پادشـا) گریاو، گوتی: {بەڕاستی ئەم دینەو ئەو دینەش، کە —عیسا— هێناویەتی هەردوکیان لەیەك تاق و خانەوە دەرچوون}.

ئینجا ڕووی کردەوە بەلای نێرراوانی قوڕەیش (عبداللهــی کوڕی —أبی ربیعە)و (عەمرــی کوڕی —عاص)داو پێ ی گوتن: {بڕۆن، دەسا بەخودا ئەمانەتان تەسلیم ناکەمەوە}.

دیارە (نەجاشی) هەر کە لـەبیروباوەڕی ئیـسلامی تێگەیـشت، خێـرا زانـی ی کـە ئـەوە عەقیدەیەکی ڕاستەو، ئەم ڕاستی یەش لەلای کەسانی ژیرو خاوەن عەقڵی ساغ پەنهان نی یـە. هەروەك زانیبوویشی کە ئەو پەیامەی(محمد) هێناویەتی بۆ ئەو خەڵکە لەهەمان سەرچـاوەوەیە کەپەیامەکەی (عیسا)شی لێوە دەرچووە.

## گەمارۆدانی پێغەمبەرو بڕواداران

کـافرانی —قـوڕەیش— بـەو هـەموو ڕێ و شـوێن و شـێوازی فڕوفێـڵ و تەفرەدانانـەیان ئەنجامێکی وایان دەست نەکەوت و، بەڕوونی بۆیـشیان دەرکـەوت کـە گەیانـدنی هـەر ئـازارو ئەشکەنجەیەك بەپێغەمبەرو بەبڕواداران هـیچ ڕێگرێـك دروسـت ناکـات لەبـەردەم بەدەنگـەوە هاتنی زیاتری خەڵکی بۆ ئایینی خوادا، ئیدی ویستیان بەئاشکرا پێغەمبەر بکوژن.

بەڵام (ابوطالب)ی مامی، کە بەو نیازەی قوڕەیشی زانی خێڵی خۆی لـە(بنـو عبـدالمطلب) کۆکردەوەو مەبەستەکەی تێ گەیاندن و داوایشی لێ کردن کەپێغەمبەر لـەدۆڵێك لەدۆڵـەکانی چیاکە لەدەرەوەی —مەککە— بـشارنەوە، هـەروەها فـەرمانی پێکـردن، کـە بیپـارێزن لەهـەر کەسێك لەوانەی دەیانەوێت پێغەمبەر بکوژن.

ئینجا کە قوڕەیشیش زانییان ئەوا هۆزەکەی پێغەمبەر ناهێڵن کەس دەستی پێ ی بگـات بیروڕایەکی تریان تەبەنی کرد لەسەر ئەوەی نووسراوێك داڕێژنەوەو تیای دا ڕێك بکەون لەسەر

(١) ابن هشام، ج١.

گەمارۆی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەدژی هۆزی پێغەمبەر، کە لەخێڵ و بنەماڵەکانی (بنو هاشم)و (بنو عبدالمطلب)و بڕوادارانی تر پێك هاتبوون، بەو ڕەنگەی، کە تەواو بەرکەناریان کەن و بێ بەشیان کەن لەهەر مافێکی نێو کۆمەڵ و ژنیان لێ نەخوازن و ژنیشیان پێ نەدەن و هیچ کەرەسەو پێویستی یەکی ژیانیان پێ نەفرۆشن و هیچیشیان لێ نەکڕن.

لەم بارەیەوە بڕیارنامەیەکیان لە نووسراوێك دا بەنێو کەعبەدا هەڵواسی. ئەم نووسراوەش هەتا سێ ساڵ کاری پێ کراو بەدرێژایی ئەو سێ ساڵی گەمارۆیەی کافرانی (قوڕەیش) پێغەمبەرو شوێنکەوتوانی لەهەموو مافێك بێبەش کرابوون و بەدەست ئاسەوارە تفت و تاڵەکانی یەوە دەیانناڵاند، تەنانەت گەڵای درەختیان دەخواردو، نزوولەو گریانی منداڵەکانیشیان بەهۆی سەختی ی برسێتی یەکەیانەوە لەدوورەوە دەبیسترا.

ماوەی ئەو ئابڵووقەیەو درێژیی کاتە پڕ لەناسۆری یەکانیشی گەلێك مەینەتیو ئێش و ئازاری بەسەر ئابلۆوقەدراوان دا هێناو تا کار گەیشتە ئەوەی نەختێك سۆزو بەزەیی بکەوێتە دڵی چەند گەورەپیاوێکی قورەیشەوەو پێنج کەس لەگەورەپیاوانیان داوایان کرد چیتر کار بەو بڕیارنامەیە نەکرێت هەرچەندە کە هێشتا بەرهەڵستی یەکی توندیش لەسەر داواکەیان هەبوو، بەڵام دواجار داواکەیان جێبەجێ کراو پێغەمبەرو بڕواداران هاتنەوە بۆ سەرخانەو ماڵی خۆیان دوای ئەوەی ناڕەحەتی یەکی زۆریان بەدەست ئەو تەنگانەیەوە چەشت.

## ئەشکەنجەدانی پێغەمبەر لە -طائیف-

دوای ئەوەی پێغەمبەر هەستی بەو سووکایەتی یە زۆرەی قوڕەیش بە بانگەوازەکەی کردبوو، بیری کردەوە لەوەی سەردانی هۆزی (ثقیف) بکات لەشاری (طائیف) بۆئەوەی باوەڕی پێ بێنن و پشتگیریی بکەن لەدژی گەلەکەی و یارمەتی ی بدەن لەو ڕێگایەدا هەتا پەیامی خودا بەتەواوەتی دەگەیەنێت. (ثقیف)یش نزیکترین هۆز بوون لەهۆزەکانی (مەککە).
پێغەمبەر بۆئەم مەبەستە لەگەڵ خزمەتگوزارێکی دا کە (زەید—ی کوڕی —حارثة) بوو ڕووی کردە ئەو ناوچەیەو چاوی کەوت بەگەورەکانیان و داوای باوەڕهێنان و پشتگیریکردنی لەو کارەدا لێ کردن تاکو بتوانێت بانگەوازەکەی بەجێ بگەیەنێت.
کەچی ئەوان بەشێوازێکی ناشیرین وەڵامیان دایەوەو، پێغەمبەریش هیچ خێرو چاکەیەکی لێ بەدی نەکردن. بەڵام لەهەمان کات دا تکای ئەوەی لێ کردن کە ئەم مەسەلەیە بڵاونەکەنەوەو لای کەس باسی هاتنی پێغەمبەرو مەبەستەکەی نەکەن تاکو قوڕەیش پێ ی نەزانێت و ئازاری توندتریان نەدەن و تاوانباری نەکەن بەوەی گوایە پەنای بردۆتەبەر دوژمنانی

ئەوان. کەچی هۆزی (ثقیف) نەك هەر بەدەم داواکانیەوە نەچوون، بەڵکو بەپێچەوانەوە کەسانی گەمژەو نەفام و منالآنی خۆیانیان لیّ هان داو کەوتنە بەردباران کردنی هەتا خوێن لەبەری پێی دەچۆڕایەوە، (زەید-ی کوڕی -حاریسە)ی هاوەڵ و خزمەتگوزاریشی ببووە قەڵغانێك بۆیو خۆی دەخستەبەر ئەو بەردانە تا لەدوایی دا خۆیان گەیاندە لای درەختی (کەرەم)و لەژێر سێبەرەکەی دا دانیشتن.

لەو ساتە ناسکانەدا هەر فرمێسکێك لەچاوی پێغەمبەرەوە دەرچووبایە یان هەر خەمێکی دەربڕیایە تەنها بۆ خودای تاك و تەنیای بوو، شیرینترین ڕاز کەباری قورسی ئازاری لەسەر سووك کردایە تەنها نزایەکی (تۆبەکاری) بوو، وەك ئەم نزایەی کەپێ ی لەخواپاڕاوەتەوەو کەسیمای پرشنگداری ئەو دڵسۆزییە گەورەیەشی بۆ پەروەردگاری لێوە بەدی دەکەین، ئەوەبوو دوای ئەو هەموو ئازار چەشتن و ناڕەحەتی یانە بەم نزایەوە ڕووی کردە پەروەردگاری:

{خودایە من هەر بۆ تۆ سکالای (بێ هێزی)و کەم شارەزایی و (بێ دەسەڵاتیم لەئاست خەڵکی دا) دەردەبڕم. ئەی بەڕەحمترینی بەڕەحمان تۆ خودای چەوساوان و خودای منی، دەسا بەکێم دەسپێریت؟ بەکەسێکی دوورو نەناسیاو کە هەر ڕقی لێم دەبێتەوە؟ یان بەدوژمنێك کە کاروباری منت خستۆتە دەستی؟ بەڵام هێشتا ئەگەر تۆ ڕقێکت لەمن نەبێت و لێم زویر نەبوبیت ئەوا هیچ باکم لەم ئازارو کارەساتانە نی یە. سەرفرازی و تەندروستی یەکیش لەتۆوە بێت گەلێك زۆرو فراوانترە بۆمن. پەنا دەگرم بەڕۆشنایی ڕووی تۆ، کەهەموو تاریکی یەکی بۆ ڕووناك بۆتەوەو هەموو کاروبارێکی دنیاو ڕۆژی دوایی ی پێ ڕاست کراوەتەوە (پەنا دەگرم بەو ڕۆشنایی‌یەی ڕووی تۆ) لەوەی کەوا تووڕەبوونت بۆم نازڵ بێت یان بکەومەبەر ڕق و ناڕەزاییت. من هەردەم تکاکارم تاکو لێم ڕازی دەبیت، هیچ هێزو توانایەکیش نی یە تەنها لای تۆوە نەبێت}. [1]

ئەو شوێنەی کە لەو کاتەدا پێغەمبەر لێ ی دانیشتبوو نزیك بێستانێکی (عەتبە)و (شەیبە) بوو کە هەردووکیان کوڕی (ڕەبیعە) بوون. ئەم دووپیاوە کاتێك پێغەمبەریان لەو حاڵەتەدا بینی دڵیان نەرم بوو و کوڕێکی خزمەتکاری مێردمنداڵی خۆیان بانگ کرد (کەئەویش لەسەر ئایینی -نەسرانی- بوو) و ناوی (عەدداس) بوو و پێیان گوت: (ئەم هێشووە ترێیە هەڵگرەو بیدە بەو پیاوە). ئەویش پێی گەیاندو کەپێغەمبەریش دەستی بۆ هێشووە ترێ کە برد فەرمووی (بسم الله) — بەناوی خودا، لەو کاتەدا (عەدداس) گوتی: (ئەم

(١) ابن هشام، ج١.

وتەیە (واتە — بسم الله) بەزاری خەڵکی ئەم ناوچەیەدا نایـەت). پێغەمبـەریش لیێ ی پرسـی: }ئەی تۆ خەڵکی چ وڵاتێکیت و لەسەر چ دینێکیت{؟ ئەویش لەوەڵام دا گوتی: (من نەسرانیم و خەڵکی —نەینەوا— م). پێغەمبەریش لەوەسفی وڵاتەکەی دا فەرمووی: (تـۆ خـەڵکی شـاری پیاوە چاکەکە (یونس—ی کوڕی —مەتتی)یت). کوڕە نەسرانی یەکەش بەسەرسوڕمانەوە پرسـی ی: (تۆ چی لەبارەی —یونس—ەوە دەزانیت)؟ لەو ڕووەوە پێغەمبەر چـەند ئایـەتێکی قورئـانی لەچیرۆکی —یونس— بۆ خوێندەوە. ئیتر(عەدداس)یش دوای بیـستنی ئـەو ئایەتانـە موسـڵمان بوو.

کاتێك چووەوە بۆلای هەردوو کوڕەکەی (ڕەبیعە)ش پیێ ی گوتن: (هیچ شـتێك لـەزەوی دا لەو بانگەوازەی ئەو چاکتر نی یە. بەڕاسـتی شـتێکی وای پـیێ ڕاگەیانـدم کـە هـیچ کەسـێك نایزانێت مەگەر تەنها پێغەمبەرێك نەبێت).

# بەندی چوارەم

## (( پەرەسەندنی بانگەوازی ئیسلامی ))

( بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەنێو چەوساوەو بێدەسەڵاتەکان دا —
شەوڕەوی و بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان — سەرەتای بانگەوازی ئیسلام لەشاری
"یەسریب"ەوە — خەڵکی "یەسریب" پەیمان بەپێغەمبەر دەدەن. )

### بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەنێو چەوساوەو بێدەسەڵاتەکان دا

بێگومان زۆربەی بڕواداران لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلامی یەوە لەچینە هەژارو بێ دەسەڵاتەکان بوون وێڕای ئەوەی ئەگەر چەند کەسێکی هەڵکەوتووش لەچینی پیاوماقووڵان باوەڕیان پێهێنابێت. باوەڕی ئەو هەژارانەش لەئیسلام دا پەسندکراو خودا فەرمانی بەپێغەمبەرەکەی کردبوو دەستی سۆز بەسەریان دا بێنێت و ئامێزی ڕەحم و خۆشەویستییان بۆبگرێتەوەو بیروباوەڕو ڕێساکانی ئیسلامیان فێرکات.

ئەوەبوو پێغەمبەر کە لەمزگەوت و شوێنی خواپەرستی دا دادەنیشت چەندین هاوەڵی لەکەسانی هەژارو بێ دەسەڵاتی وەك (سوهەیبی ڕۆمی)و (عەممارـی کوڕی یاسر)و (سەلمانی فارسی)و (خەبباپی کوڕی ئەرەت)و... هتد. لەلا دادەنیشت، جگە لەموسڵمانانیتری کەم دەست ونەدار، لەملاشەوە گەورەپیاوانی قوڕەیش کاتێك سەرنجی ئەو حاڵەتەیان دەدا بە (محمد)یان دەگوت: (تۆ چۆن قایلیت بەم جۆرە کەسانەی گەلەکەت؟ ئایا لەنێومان دا تەنها ئەمانە خودا ئیمانی پێ بەخشیون؟ ئەی ئایا ئێمە دوای ئەم عەبدو کۆیلانەی خۆمان بکەوین؟ بەڕاستی ئێمە شەرم لەخۆمان دەکەین گەر بێینە نێو ئەم کوڕو کۆمەڵەوەو لەگەڵتا دانیشین. بەڵکو دەبێت دەریان کەیت تاکو ئێمە بێین و لەلات دانیشین و پەیڕەوی بەرنامەکەت بکەین} .

پێغەمبەر لەوەڵامی ئەو داواکاریەیان دا فەرمووی: {من بڕواداران لەلای خۆم دەرناکەم} .
ئینجا گەورە پیاوانی قوڕەیش بەڕواڵەت نەختێك سازشیان پیشان داو گوتیان: {باشە گەر دەریشیان ناکەیت ئەوا کاتێك ئێمە دێینە لات، بەر کەناریان کەو دووریان خەرەوە} ...

پێغەمبەر بەمەبەستی ئەوەی موسڵمان بن خەریك بوو ئەو داواکاریەیان جێبەجێ بکات، بەڵام خودا فەرمانی خۆی لەم ئایەتانەدا بۆناردو پێ ی فەرموو: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم

﴿بِالْغَدَوٰةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّٰكِرِينَ﴾الأنعام/٥٢-٥٣..

لەم دەقە قورئانی یەدا خودا ڕێگەی دەرکردنی ئەو هەژارو چەوساوانە لەپێغەمبەر دەگرێت کە بەیانیو ئێوارەی هەموو ڕۆژێك خودای پەروەردگاری خۆیان دەپەرستن، پاشان خودا بەرپەرچی ئەو گەورەپیاوانەی قورەیش (کە تیرو توانجیان دەگرتە برواداران) ئاوا دەداتەوە کە رووی گفتارو فەرمایشتی دەکاتە (محمد)و فەرمانی پێ دەکات نابێت بەپێ ی حسابات و بیروڕای ئەوان بجوولێتەوەو وەك هەژارەکانیش حسابیان بۆ نەکات، چونکە هەموان بەرپرسن لەبەردەم خواداو هەر کەسەش لەخۆی بەرپرسیارە، جا ئەگەر دەریان کات ئەویش یەکێك دەبێت لەستەمکاران.

لەبەشێکی تری ئەو فەرمایشتەی خودا (بۆ لێکدانەوەی وتەو بیانووی گەورەپیاوانی قورەیش لەوەلامی ئەو پرسیارە خۆپەرستی یەیان دا، کەدەیانگوت: (چۆن خودا ئەو هەژارانە لەنێو ئێمەدا بەئیمان بەهرەمەند دەکات)؟) دەفەرموێت: (هەر خودا خۆی دەزانێت کێ بەڕاستی سوپاسی نیعمەت و بەخششەکانی خودا دەکات و پەیڕەوکاری بەرنامەکەیەتی، چونکە ئایینی ئیسلام یەکسانی ی خستۆتە نێوان هەموو چین و توێژەکانی خەڵکی‌یەوەو گشت دیاردەیەکی خۆپەسندیو، تایبەتمەندێتی یەکی نابەجێ ی پیاوماقوولان و گەورەپیاوانی هەڵوەشاندۆتەوە... ئیدی هیچ جیاوازی یەك لەنێوان بەندەیەك و گەورەکەی داو لەنێوان دەوڵەمەندێك و هەژارێك دا نی یە. بەڵکو هەموان لەپێوەرو تەرازووی ئیسلام دا وەك یەکن و لێك جودانیین تەنها بەباوەڕو پارێزکاری و کاری چاکە نەبێت).

هەندێك لە پیاوانی قورەیش هێندە خۆیان دابوو بەدەم ئارەزووی خۆ بەگەورە دانان و خۆشویستنی سەرۆکایەتی و پلەوپایەوە، کە بەهۆی ئەمانەوە بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە نەچوون و بەربەرەکانییان دەکرد. یەکێك لەوان (وەلید-ی کوڕی -موغیرە) بوو، کە دەیگوت: {ئایا بۆ -محمد- قورئان بێتە خوارەوەو منیش کە گەورەو سەردارێکی قورەیشم فەرامۆش بکرێم.. ئەی ئایا (ئەبو مەسعود) واتە: (عەمر-ی کوڕی -عومەیری سەقەفی)ی گەورەی هۆزی (سەقیف) فەرامۆش بکرێت، ئایا ئەم دوو گەورەیەی وەك من و ئەو بەرکەناربن و ئەویش خۆی بکات بەدەمڕاستی خەڵکی} ؟!

بەهۆی ئەم ئیددیعای لوتبەرزی و خۆ بەگەورە دانانەوە خودا ئەم ئایەتانەی ناردۆتە خوارەوەو فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ[1] عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾الزخرف/٣١-٣٢..

مەبەست و واتای گشتی ی ئەم ئایەتانەش ئەوەیە، کە ئایا ئەو گەورە پیاوانە خۆیان (کاری پێغەمبەرێتی) دابەش دەکەن و بەئارەزووی خۆیان هەڵی دەسووڕێنن؟ بەڵکو دەبێت کاروبار هەمووی بەخواستی خودا دابنرێت و هەر خوداش خۆی ئەرکی بژێوو گوزەرانی خەڵکی ی لەئەستۆناوەو ڕزق و ڕۆزی و پلەوپایەی زیاتریش بەهەندێك کەس دەدات تاکو بیانکات بەسەرداروو هاوکارو یاریدەدەری یەکترو پێویستیو کارەکانی یەکدی پڕبکەنەوە. بەم ڕەنگەش یارمەتی یەکتر دەدەن و کار بۆ یەکتر ئاسان دەکەن لەبەدەست هێنانی ڕزق و ڕۆزیو ڕێکخستنی ژیان دا.

پاشان خودا دەفەرمویت: ﴿وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾... بەڕاستی فەرمایشتێکی قەشەنگەو جوانترین مانای دڵسۆزیو بۆ خواسوڵحانی لەدووتوێ ی خۆی دا هەڵگرتووەو وا لەمرۆڤ دەکات خۆی بەدوور بگرێت لەشتە فریودەرەکانی دنیاو خۆی بەرزیش بگرێت لەهەر دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێش و سەرشێوێن...

هەروەها ئەم فەرمایشتەی خودا دڵنەواییو ئاسوودەیی ی تێدایە بۆ هەر کەسێك لەوانەی لەهەندێك نیعمەتی ژیان بێ بەش بوون، دڵدانەوەش بەم جۆرە پرسیارانەیە کە ئایا ژیان خۆیشی بەخششێکی خودا نی یەو گەڕانەوەش هەر بۆلای خودا نی یە؟ ئایا خەڵکی لەسەر کردەوەکانیان لێ یان ناپرسرێتەوە؟ ئیدی ماڵ و سامان و پلەوپایە چ نرخێکیان هەیە گەر بینەهۆی دوورخستنەوەی مرۆڤ لەخودای خالقی؟ بێگومان خۆشیی دنیا کەمەو هەر ڕۆژی دواییش باشترو بەکەڵکترە بۆ ئەو کەسەی لەخودا بترسێت و پارێزکاری خۆی بێت.

نموونەی بەسەرهاتێکی تر کە هەر لەم ڕووەوە بەزەیی و بایەخی ئیسلامان بۆ هەژارو چەوساوەکان دەردەخات، ئەوەیە جارێکیان پێغەمبەری خودا لەگەڵ سەران و گەورەپیاوانی قورەیش دا دەدواو دەیویست پەیوەندییان لەگەڵ دا بەهێزکات و بانگیان کات بۆ ئیسلام، لەو کاتەش دا کە سەرگەرمی قسەو وت وویژ بوو لەگەڵیان دا، (عبداللە‌ی کوڕی ام مکتوم) - کە نابینابوو و یەکێك بوو لەوانەی زوو موسڵمان بووبوون- چوو بۆلای پێغەمبەرو ئەویش

(١) (القريتين) مەبەست پێ ی هەردوو شاری (مەککە)و (طائیف)ە کە ئەو دوو زاڵمەی تێدابوون.

لەگەرمەی قسەوباس و هەوڵی زۆری ڕاکێشانی ئەو سەرکردانەی قوڕەیش دا بوو، لـەو ساتەدا (عبداللەـی کوڕی ـام مکتوم) بەپێغەمبەری گوت: {ئەی پێغەمبەری خودا فێرم، کە لـەوەی خودا فێری کردوویت}.

پێغەمبەر لەو ساتە وەختانەدا هێندە گوێ ی لەوتەکانی ئەو کـابرا نابینایـە نـەگرت، کـە چەندجارێك ڕووی قسەو گفتاریشی تێ کردبـوو، ئەمـەش لەبەرئـەوەی پێغەمبـەر بـەکارێکی زەحمەتی دەبینی گەر لەو کاتانەدا وت وویژی خۆی ببڕێت و لەبەرچاوی گەورە پیاوانی قوڕەیش وەڵامی پیاوێکی ئاوا بداتەوە، چونکە دەترسا ئەوەببێتە هۆی سارکردنەوەی دڵی ئەوان و لێ ی تەرەبن و جارێکی تر گوێ ی بۆ نەگرن. بۆیە ڕووی خۆی لەئاست ئەو کـوێرەدا گرژکـردو ڕووی لێ وەرگێڕاو وەڵامی نەدایەوە.

خوداش لەسەرئەمە سەرزەنشتی کردو لەم ئایەتانەدا پێ ی فەرموو:

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخۡشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنۡهُ تَلَهَّىٰ﴾عبس/١-١٠

واتە: {پێغەمبەر ڕووی گرژ بوو و ڕووی وەرگێڕا کاتێك پیاوە کوێرەکە هاتەلای‌و پرسیاری کاروباری تازەی دینەکەی لێ دەکرد. جا ئەی پێغەمبەر تۆ چووزانیت ئەو نابینایە لە چ حاڵێك دا بووەو بۆیەش هاتـەلات تـاکو خـۆی زیـاتر پاکژکاتـەوە لەپیسی و چـەپەڵی ی نـەفامی و لەگوناهان، یان بۆئەوەی پەندو ئامۆژگاری زیاتر وەربگرێت و ئەو ئامۆژگاری و ڕێنمایی یەشت سوودی پێ ببەخـشێت. بـەڵام ئەوانـەی دەوڵەمەنـدو دەسـت ڕۆیـشتوون و بەسـامان و هێـزو دەسەڵاتیان دەنازن و خۆیان لەدینەکەی تۆ پێ لاداوە تۆش هەر ڕوو لەوان دەکـەیت و قـسەیان بۆدەکـەیت، لـەکاتێك دا کەسـانی تـر بـەپێ ی خۆیـان دێـن بـۆلات و لەچـینی هـەژارو لەخۆبووردوانت (وەك ئەو پیاوە نابینایە)، کە هاتە لات و هـەوڵی فێربـوونی زانـستی زیـاترو ڕێنمایی زۆرتر دەدات و لەخوا دەترسێت کەچی تۆش خۆت زیاتر سـەرقاڵ دەکـەیت بەکەسـانی ترەوەو واز لەو دێنیت}.

ئەم گلەیی یەی خودا لەپێغەمبەرەکەی گـەورەترین بەڵگەیـە لەسـەرئەوەی کـەوا قورئـان سرووشێك (وحی)ی ئیلاهی یەو لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی ی (محمـد)یـش، چـونکە ئەگـەر (محمد) تەنها یەکێك لەپیاوە گەورەو دانـا بەناوبانگـەکان بوایـە بێئـەوەی پێغەمبـەر بوایـەو قورئانیش (بەپڕوپاگاندەی دوژمنانی) کتێبێکی دەسنووس و دانراوی خۆی بوایە ئـەوا ڕێگـای

نەدەدا، کە هەڵەو کەم وکووڕی یەکانی بخرێتە بەرچاوی هەموو جۆرە کەسێك لەخاس و عەوامی خەڵکی. هەروەك کەرازیش نەدەبوو بڵێت (ئەم گلەیی و گازاندەیە لەخوداوەیەو سرووشێکی خودایی یە). هەروەها دەیشیتوانی پاساوێکی لەبار بۆ کابرای نابینا (کوڕی ـام مکتوم) بێنێتەوە بەو شێوەیەی کەوا ئەو هەوڵی داوە لەو کاتەدا ڕێنماییی ئەو گومڕایانەی قورەیش بکات. دیارە هەموو هاوەڵانیشی ئەو پاساوەیان بەجوانترین شێوە پەسند دەکرد.

بەڵام خودای زاناو بەحیکمەت وای ویستووە بڕواداران و موسڵمانان ئاگادارکات لەوەی، کە بێگومان دەروونە پاك و پڕ لەباوەڕەکان شایان ترو لەپێشترن وەك لەدەروونە یاخی و ستەمکارەکان، تەنانەت گەر یەکێك لەدەروون پاکان کەم ئەندامی و پەك کەوتەیی یەکیشی هەبێت. چونکە هیچ کەسێك بۆی نی یە لەئاست کەسێکی دەروونپاکی بێ دەسەڵات و هەژاردا ڕووی خۆی گرژکات و ڕووی لێ وەرگێڕێت لەکاتێك دا ئەو بێ دەسەڵاتە بۆ وەرگرتنی زانستی بەسوودو بەهرەمەندبوون هاتبێت کەچی ڕووی لێوەرگێڕرێت بەبیانووی ئەوەی ئاوڕدراوەتەوە بەلای کەسێکی بەهێزو دەست ڕۆیشتووی وادا، کە لەوپەڕی گومڕایی و لووتبەرزی دایە.

جێ ی باسیشە پێغەمبەر (هەروەك لێوەی گێڕراوەتەوە) هەر کاتێك دوای ئەوە ئەگەر (عبداللە ـی کوڕی ـ ام مکتوم) بچوایە بۆلای، پێ ی دەفەرموو: ((مرحباً بمن عاتبني به ربي))، واتە: {بەخێر بێیت ئەی ئەو کەسەی کەخودا لەسەر ئەو گلەیی ی لێ کردم}.

لەکاتێکیش دا پێغەمبەر بۆ جەنگی (ئوحود) لە -مەدینە- دەرچوو بوو، (عبداللە ـی کوڕی ـام مکتوم)ی لەجێ ی خۆی دانابوو بۆ پێشنوێژی و ئیمامەت لەنوێژەکان دا. ئەوەش کردارێکی جوان بوو لەو ڕێ و شوێنانەی کە پێغەمبەر گرتبوونی یە بەر بۆ نەهێشتن و هەڵوەشاندنەوەی داب ونەریت و ئیمتیازاتی نابەجێ ی پیاوەگەورەکانی ئەو سەردەمە.

## شەوڕەوی و بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان

خودای مەزن بۆ تاقیکردنەوەی باوەڕی ئیمانداران و بۆ دەرخستنی فەزڵ و بەخششی زیاتری بەسەر پێغەمبەرەکەی دا، چەند ئایەت و نیشانەیەکی گەورەتری پیشانی ئەو پێغەمبەرەی خۆی داوەو ئەمەش لەو ڕووداوە ناوازەیەی شەوڕەویو بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان (اسراء ومعراج) دایە، ئەوەبوو خودا لەڕێ ی مەلائیکەتی خۆیەوە بەشەو لە (مسجدالحرام ـی - مەککە)وە گەیاندیە (مسجد الأقصی ـی قودس)، کە چەندین ڕووبارو بەروبووم و داهات

بەرەکەتی خرابووە سەر، هەروەك خودا فەرمووییە:

﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ [١] بِعَبۡدِهِۦ [٢] لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ [٣] ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الاسراء/١.

جا کاتێك پێغەمبەری خودا (محمد) بەو خێراییە بەو ماوە هێجگار کەمە گەیەنرایە (بیت المقدس) لەوێ (ابراهیم و موسی و عیسا)و چەندین پێغەمبەری تری بینی و پێشنوێژی ی بۆکردن و لەگەڵیان دا پێکەوە سوژدەیان بۆ خودا برد. پاشان دوو قاپی بۆهات، کە قاپێکیان (مەی)ی تێدابوو و قاپەکەی تریش (ماست)ی تێدابوو. پێغەمبەری خوداش دەستی برد بۆ قاپە ماستەکەو لێی خواردەوە، بەڵام قاپە مەیەکەی فەرامۆش کرد. لەو ساتەدا مەلائیکەتی خودا (جیبریل) پێی فەرموو: (ئەی محمد بەڕاستی تۆ بەفیطرەت —و سرووشتی ساغی خۆت ڕێنمایی کراویت. بێگومان نەتەوەکەشت هەر ئاوا ڕێنمایی کراون و سرووشتێکی ساغیان هەیە، هەروەها (مەی)یشتان لێ حەرام کراوە).

پێغەمبەر لە (بیت المقدس)ەوە گەیەنرایە ئاسمان و ئەمەش بە (میعراج) ناوبراوە، ئیدی لەوێوە پێنج نوێژی لەشەوو ڕۆژێك دا لەسەر نەتەوەکەی فەرزکرا، پاشان گەڕایەوە (مەککە). هەموو ئەوانەش تەنها لەیەك شەودابوو.

سەرلەبەیانی لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا پێغەمبەری خودا هەرچی دی بوو لەوشەوەدا بۆ گەلەکەی گێڕایەوەو دوای تەواوکردنی باسی ڕووداوەکەی، هەندێك کەس باوەڕیان پێ کردو هەندێك کەسی تریش لەقوڕەیش بەدرۆیان خستەوە، چەند کەسێکیش لەو بڕوادارە سەرەتاییانەی کەوا باوەڕێکی لاوازیان هەبوو هەڵگەڕانەوە. هەندێك لەپیاوانیش خۆیان گەیاندە لای (ئەبوبەکر)و ویستیان بزانن بیروڕای ئەو چۆنە لەو ڕووەوە؟ ئەویش لەوەڵامیان دا گوتی:} من باوەڕی پێ دەکەم تەنانەت گەر ڕووداوی لەوە گران ترو گرنگتریش بگێڕێتەوە{ئیدی لەو ڕۆژەوە (ئەبوبەکر) بە (صِدّیق) ناوبرا، واتە (باوەڕکارو دان پیانەرو بەڕاست دانەر)...

---

(١) زانایان هەندێك بیروڕای لێك جودایان لەسەر چۆنیەتی ئەو ئیسرایە (شەوڕەوی یە) هەیە، بەڵام زوربەی هەرەزۆریان یەکڕاو هاوبڕوان لەسەرئەوەی، کەپێغەمبەر بەجەستەوگیان شەوڕەویو بەرزبوونەوەکەی پێ کراوە ژمارەیەکی کەمینەی زانایانیش وای بۆ دەچن گوایە تەنها (بەگیان) شەوڕەویی پێ کراوە.

(٢) بعبده.. واتە بە (محمد)ی پێغەمبەرو بەندەی خۆی.

(٣) وشەی (المسجد) لەم ئایەتەدا بێژە (لفظ)ێکە کە لەفەرمان (فعل)ی (سجد)ەوە وەرگیراوە، چونکە (مسجد) شوێنی (سجود)ە (واتە شوێنی سوژدە بردنە). کاتێك شەوڕەوی یەکەش بەپێغەمبەر کرا لەو شوێنەدا خانوویەك نەبوو کە بەناوی (مسجد الأقصی)وە ناسرابێت، لەئایەتەکەش دا بۆیە بە (مسجد) ناوبراوە چونکە شوێنی عیبادەت و خواپەرستی یە.

دوای ئەوە کافرانی مەککە ویستیان پێغەمبەر تاقی بکەنەوەو لەڕاستی و ناڕاستی ی ڕووداوەکە بکۆڵنەوە، ئەوەبوو داوایان لیّ کرد وەسفێکی (بیت المقدس)یان بۆبکات و باسی ئەو پیاوانەیان بۆبکات کە لەو شوێنەدا بوون. پێغەمبەریش وەسفی جێگە بەجێگەی بۆکردن، لەو کاتەدا هەندێکیان گوتیان (وایە ڕاست دەکات)..

پاشان داوایان لیّ کرد هەواڵی ئەو کاروانە حوشترەیان پیّ بدات کە بەڕێوەیەو لە (سووریا)وە دێتەوە بۆلایان و، کە شت ومەکی بازرگانییانی هەڵگرتووە.

پێغەمبەریش هەواڵی ئەو کاروانی بازرگانی یەی خۆیانی پیّ گەیاندن و ژمارەکەشی بۆ دیاریکردن و فەرمووی: (فلاّن ڕۆژ ئەو کاروانە لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا بەریّ کەوتوون و حوشترێکیان لەپێشەوەیە، کە ڕەنگەکەی لەنێوان ڕەش و سپی دایە.)

ئەوانیش بەردەوام لەچاوەڕوانی کردنی کاروانەکەدا بوون، تا لەدوایی دا گەیشت و بەو جۆرەش بینییان، کەپێغەمبەر بۆی باس کردبوون. کەچی سەرەڕای ئەوەش بیّ باوەڕی و سەرکەشی و نەفامی یەکەیان زیاتربوو.

## سەرەتای بانگەوازی ئیسلام لەشاری "یەسریب"ەوە

پێغەمبەر کە دیتی ئەوا قوڕەیش بەدەم بانگەوازیەوە ناچن و تەنها چەند کەسێکی کەم نەبێت زوربەیان باوەڕناهێنن، دەستی کرد بەبانگەوازکردنی ئەو هۆزو تیرانەی کە لەهەندێك ڕیّو ڕەسم و بۆنەو موناسەباتی عەرەب دا دەچوونە مەککە. هەندێك لەو هۆزو تیرانەش بەشێوەیەکی ناشیرین بەرپەرچی بانگەوازەکەیان دەدایەوەو هەندێکی دیکەشیان بەچاکی وەلاّمیان دەدایەوە.

چەند کەسێکیش لەعەرەبەکانی (یەسریب)،[1] کە بەدیداری پێغەمبەر گەیشتبوون، لیّ ی پرسین: (ئێوە کێن)؟ ئەوانیش گوتیان: (ئێمە چەند کەسێکین لەهۆزی –خەزرەج-). ئینجا پێغەمبەر لیّ ی پرسین: {ئایا ئێوە لەهاوپەیمانانی جوولەکەن؟} گوتیان: (بەڵێ). ئیتر لەلای دانیشتن و پێغەمبەریش بانگی کردن بۆلای بەرنامەی خوداو ئایینی ئیسلامی بۆ شیکردنەوەو قورئانی بۆخوێندنەوەو بۆی ڕوون کردنەوە. ئەوانیش دوای بیستنی بانگەوازو باسی قورئان و پەیامی ئیسلام لەنێو خۆیان دا هەندێکیان بەهەندێکی دیکەیان گوت: {دەسا بەخودا چاك

---

(١) یەسریب (یثرب) لەپێش ئیسلام دا بەشاری (مەدینە) دەگوترا، بەلاّم دوای کۆچ کردنی پێغەمبەرو هاوەڵانی بۆ ئەو شارەو دوای سەرهەڵدانی ئیسلام، بە (مەدینە) ناوبرا واتە (شاری پێغەمبەر). ئەمرۆش بەناوی شاری ڕۆشن کراو (المدینە المنورە) ناودەبرێت.

بزانن ئەم پیاوە (واتە محمد) ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکەکان[1] هەواڵی هاتنی پێداون و ئێوەی لێ ئاگادارکردوونەوە، جا با پێش ئێوە پێی نەگەن}. ئینجا وەڵامیان بۆ پێغەمبەر ئەوەبوو کەوا ئەوان بڕوایان (بەوەی ئەو بانگەوازی بۆکردوون) هێناوەو ئەو ئیسلامەی بۆی باس کردن لێ یان وەرگرتووە. پێیشیان گوت: (ئێمە گەلێکمان جێهێشتووە کەهیچ نیازێکیان لەخراپەو دوژمنایەتیی خۆبەخۆی یەکتردا نی یەو هیواداریین خودا بیانگەیەنێت بەتۆ، کاتێك بۆ لایشیان دەگەڕێینەوە بانگیان دەکەین بۆلای ئەم ڕێبازەی تۆو ئەو دینەی لەتۆشمان وەرگرتووە دەبێت بەوانیشی بگەیەنین. جا ئەگەر خودا هەموویانی لەسەر کۆبکاتەوەو هیدایەتیان بدات ئەوا ئیدی پیاوێکی لەتۆ باشترو بەهێزتریان تیا نابێت).

ئینجا ئەم چەند کەسەی (کە لەهۆزی (خەزرەج) بوون، چوونەوە بۆ شاری(یەسریب)و دەستیان کرد بەتێگەیاندنی هۆزەکەیان و باس کردنی ئەوەی، کە لە پێغەمبەرەوە وەریان گرتبوو و بانگیان کردن بۆلای ئیسلام. بۆ بەدەمەوەچوونی ئەو بانگەوازەش ژمارەیەکی زۆر باوەڕیان هێناو تەنانەت لەدوایی دا ماڵێك نەمابوو، کە باسی پێغەمبەری خودای تیادا نەکرێت و کارلێکی ئیجابی ی لەگەڵ دا نەبێت.

## خەڵکی – یەسریب – پەیمان بە پێغەمبەر دەدەن

ساڵێك دوای ئەوەو لەوەرزی حەج دا دوازدە پیاو لەخەڵکی (یەسریب) سەردانی مەککەیان کردو لەشوێنێکیش دا کە بە (عەقەبە) ناودەبرێت بەدیداری پێغەمبەری خودا گەیشتن و بەیعەت(واتە پەیمان)یان پێ دا لەسەرئەوەی هیچ کەسێکیان شەریك و هاوەڵ بۆخودا دانەنێت و

---

(١) پێش ئەوەی خودا پەیامی خۆی بۆ پێغەمبەرەکەی بنێرێت، هەردوو هۆزی (ئەوس)و (خەزرەج)و چەند تیرەو بنەماڵەیەکی جوولەکە لەشاری – یەسریب –دا دەژیان، زۆر جاریش شەڕوکوشتار لەنێوان عەرەبەکان و جوولەکەکان دا بەرپادەبوو، بەڵام جوولەکەکان پیلانێکی تریان بۆ خۆیان داڕشتبوو، ئەوەبوو ڕاستەوخۆ ڕوبەڕووی عەرەبەکان نەدەبوونەوە، بەڵکو ئاگری شەڕو دوژمنایەتییان لەنێوان (ئەوس)و (خەزرەج)دا هەڵدەگیرساند. ئەو ئاگرەش بەشێوەیەك کڵپەی سەندبوو تا ڕۆژێکیان کە بە (یوم بعاث) ناسراوە جەنگێکی خوێناویی گەورەیان لەنێوان دا بەرپابوو و ژمارەیەکی زۆر لەهەردوولای تیادا بوونە قوربانی. دوای ئەوە لەنێوان هەردوولادا هودنەیەك ئیمزاکراو لەو هودنەیەدا (خەزرەج) پەیمانی لەگەڵ جوولەکەکان دا بەست و بوونە هاوپەیمانیان. (ئەوس)یش پەیمانیان لەگەڵ عەرەب دا بەستبوو. دیارە لەو سەردەمەدا پێکەوە ژیانی جوولەکە لەگەڵ عەرەب داو نزیکییان لێ یانەوە کارایی یەکی گیانی(ڕۆحی)ی بۆ سەر عەرەب هەبوو، چونکە جوولەکەکان شوێنکەوتووی کتێبی خودا (تەورات) بوون و بانگەوازیان بۆ تاکی و تەنیایی ی خودا دەکرد بەڵام شیرك و هاوەڵ بۆ خوادانانی تێکەڵاوبوو و بیدعەشیان پێوەنابوو. هەروەها جوولەکەکان عەرەبیان بەوە وریاو ئاگادار دەکردەوە کە پێ یان دەگوتن: (ئێستا زەمانی ڕەوانەکردنی پێغەمبەرێك هاتووەو ئێمەش دوای دەکەوین و لەگەڵ ئەودا دەتانکوژین وەك چۆن هەردوو گەلی (عاد)و (ئیرەم) کوژران).

دزی نەکات و زیناو بەدڕەفتاری نەکات و منداڵەکانی خۆی نەکوژێت و کردارێکی ناشیرینی واش نەکات، کە پێچەوانەی بیروباوەڕەکەی بێت وەك ئەوەی کە لەخۆیەوە منداڵێك بداتە پاڵ هاوسەری، یان هەر بوختانێك لەو جۆرە بۆ کەسێکیدی بکات، هەروەها پەیمانیان دا کەسیان سەرپێچی ی فەرمانی پێغەمبەر لەکاری چاك دا نەکەن و هەر کارێکی چاکیان پێ بسپێرێت جێبەجێ ی بکەن. جا هەر کەسێکیان پابەندبێت بەو پەیماننامەو (بەیعەت)ەوە ئەوا بەهەشتی بۆخۆی دەستەبەر کردووە، بەڵام ئەگەر هەندێکی لێ جێ بەجێ بکات ئەوا کاروباری لەلای خودایەو خوداش بەخواستی خۆی سزای دەدات یان لێ ی دەبوورێت.

پاشان لەساڵی داهاتوودا (واتە ساڵێك دوای ئەو پەیماننامەیە)و هەر لەهەمان وەرزو موناسەبەی حەج داو لە (یەسریب)ەوە حەفتاوسێ پیاوو دوو ئافرەت هاتن بۆ —مەککە—و چەند نێرراوێکیان چوونە لای پێغەمبەری خوداو ئەویش بەڵێنی پێ دان، کە لەکاتی شەوداو لە (عەقەبە) لەگەڵیان دا دانیشێت. فەرمانیشی پێکردن کە لەو کاتەدا بەنهێنی بێن بۆلای و کەس پێ یان نەزانێت و هیچ خەوتوویەك بەئاگانەهێننەوە، تاکو قوڕەیش بەو کارەیان نەزانێت.

ئەوانیش دوای تێپەڕبوونی ماوەی سێ یەکی شەو بەنهێنی چوون بۆ (عەقەبە)و لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کۆبوونەوەو مامیشی (واتە —عباس—ی کوڕی —عبدالمطلب) کە هەر لەسەردینی قوڕەیش بوو لەوێ ئامادەبوو. مامی لەو دیدارەدا ڕووی گفتاری کردە ئامادەبوان و پێی گوتن: (وەك زانیوتانە —محمد— لەئێمەیەو نەشمانهێشتووە تا ئێستا گەلەکەی خۆمان دەستیان پێ ی بگات، (واتە پاراستوومانە لەو کەسانەی کە لەسەر باوەڕی خۆمان نین). ئەویش (واتە: محمد) سەربەرزو پارێزراوە لەنێو گەل و کەس وکارو وڵاتی خۆیدا. جا ئێوەش ئەگەر وا لەخۆتان ڕادەبینن کە توانای پابەندبوون بەپەیمانەکەو بەو دینەشەوە هەیە کەوا بانگەوازی کردوون بۆلای و دەتوانن بەرگریی ی لێ بکەن لەوانەی دژی دەوەستن، ئەوا دەبێت ئۆباڵ و بەرپرسیارێتی ی ئەو کارە هەڵگرن، خۆ ئەگەر وای دەبینن، کە نەتوانن بەوەوە پابەندبن و دەسبەرداریی دەبن لەهەر جۆرە یارمەتیەو بەهاناوە هاتنێك دا دوای ئەوەی، کەهاتووە بۆلاتان لێرە، ئەوا دەهەر لەئێستاوە وازی لێ بێنن چونکە ئەو لەنێو گەل و وڵاتی خۆیدا ئازادو پارێزراوە.).

ئەوانیش لەوەڵامی وتەکەی (عباس)دا گوتیان: (ئێمە تێگەیشتین لەقسەکانی تۆ، بەڵام با پێغەمبەری خوداش خۆی بدوێت و بەپێ ی ویست و داواکاری ی خۆی و خودای پەروەردگاری ئاراستەمان بکات).

پێغەمبەریش کەوتە ئاخاوتن و قورئانی بۆ خوێندنەوەو بانگیکردن بۆلای ڕێبازی خوداو هانیدان لەسەرپابەندی بەئیسلامەوەو پاشان فەرمووی: (بەیعەتم پێ بدەن لەسەر گوێ لێ گرتن

و گوێڕایەڵی کردنم لەهەموو حاڵەتێکی ساغی و ناساغی داو، لەسەرماڵ بەخشین بۆ خودا لەهەر حاڵەتێکی خۆشی و ناخۆشی داو، لەسەر فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپەو، لەسەر حەقبێژی لەڕێ ی خواداو لەوەش دا کە لەسەرزەنشتی سەرزەنشتکارێك نەترسن و، لەسەر سەرخستن و پارێزگاری لێ کردنم ئەگەر داوام لێ کردن، (واتە پارێزگاری لێ کردنم لەهەر شتێك لەوانەی کەوا خۆتان و هاوسەرو کوڕو کەس وکارتانی لێ دەپارێزن)، گەر بەم بەیعەتەوە پابەندبن ئەوا هەر بەهەشت پاداشتانە).

ئەو خەڵکەش بەیعەتیان لەسەر ئەو کارانە پێ دا. ئینجا پێغەمبەری خودا پێ ی فەرموون: {لەنێو خۆتان دا دوازدە ڕیش سپیو پیاوماقوولم بۆ هەڵبژێرن کە گەورەو سەرداری گەلەکەیان بن{. ئەوانیش دوازدە پیاوی هەڵکەوتوو و لێهاتوویان لەنێو خۆیان دا دیاریکرد. پێغەمبەریش بەو دوازدە پیاوەی فەرموو: (ئێوە ڕازگرو ڕاسپێرراوی سەر گەلەکەتانن وەك چۆن (حەواری یەکان) کەفیل و ڕاسپێرراوی (عیسا) بوون، منیش ڕاسپێرراوو کەفیلی نەتەوەکەمم. دوای ئەم کۆبونەوەیە ئەو حەفتاو پێنج کەسە گەڕانەوە بۆ (یەسریب)و بەگەڕانەوەشیان ئایینی ئیسلام بەشێوەیەکی هێجگار گەورەو فراوان لەنێو دانیشتوانی ئەو شارەدا بلاوبووەوە.

# بەندی پێنجەم

## ((کۆچکردنی پێغەمبەر لەمەککەوە بۆ یەسریب))

( پیلان گێڕان بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر – پێغەمبەر لەماڵی "ئەبوبەکر"دا– ڕزگاربوونی پێغەمبەر– گەڕان بەدوای پێغەمبەردا– پارێزگاریکردنی خودا لەپێغەمبەر– گەیشتنی پێغەمبەر بۆ "قباء"– وتارێکی پێغەمبەر– پێغەمبەر لە "یەسریب"– بەستنی برایەتی لەنێوان کۆچکاران و پشتیوانان دا )

## پیلان گێڕان بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر

دوای ئەوەی ئیسلام لە (یەسریب)دا بڵاوبووەوە پێغەمبەر داوای لەموسڵمانان کرد (مەککە) جێبێڵن و بچن بۆ (یەسریب) لەبەرئەوەی ئەشکەنجەو ئازاری بێباوەڕانیان لەسەر زیاتر بووبوو لە – مەککە –دا.

ئەوانیش بەنهێنی لەشار دەرچوون لەترسی ئەوەی نەبادا قورەیش پێ یان بزانن گەر بەئاشکرا دەرچن، تا لەدوایی دا ژمارەیەکی کەمیان لە (مەککە)دا لێ مابووەوە.

پێغەمبەریش دوای کۆچکردنی هاوەڵانی، هێشتا هەر لە (مەککە)دا مابووەوەو چاوەڕوانی فەرمانی ڕێگەدانی خودابوو بۆ کۆچکردن بەرەو (یەسریب). تا خودا ڕێنمایی کرد، کە بەم نزایە لەخودا بپارێتەوە تاکو هێمنیو ئارامی لەدەروونی دا جێگیربێت:

﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴾الاسراء/٨٠.. واتە: (بڵێ خودایە بمخەرە نێو شوێنێکەوە کە بەرەزامەندییەوەو بێترس و نیگەرانی داخڵی ببم، لەشوێنێکیشەوە دەربازم کە کە بەهەمان ورەی ڕەزامەندیو ئارامییەوە لێی دەرچم. هەروەها خودایە لەلای خۆتەوە هێزو دەسەڵاتێکی وام پێببەخشە کە پاڵپشت و سەرخەرم بێت بۆ گەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئیسلام).

لەو موسڵمانانەی، کە لەمەککەدا ئازارو چەوسانەوەو بەندکردنیان چەشتبوو کەسیان لەکۆچ کردن دوانەکەوتن تەنها (علي–ی کوڕی –أبوطالب)و (ئەبوبەکر–ی کوڕی –أبو قحافە) نەبێت کە لەگەڵ پێغەمبەردا مابوونەوە. بێگومان (ئەبوبەکر) زۆرجار داوای مۆڵەتی

لەپێغەمبەر دەکرد، کە کۆچ بکات، بەڵام پێغەمبەر پـێ ی دەفـەرموو: {پەلەمەکـە بەشـکم خودا هاوەڵێکت بۆ پەیداکات}، ئینجا (ئەبوبەکر)یش بەهیوابوو ئەو هاوەڵە پێغەمبەر بێـت و لەگەڵی دا کۆچ بکات، هەر بۆیەش دوو حوشتری زۆرچاك و شیاو بۆ سـەفەرو بـار هـەڵگرتنی کڕی و سازی کردن بەمەبەستی خۆ ئامادەکردن بۆ هیجرەت.

قورەیش زانییـان کـە (محمـد) لایـەنگرو پـشتیوانی هێجگـار زۆری لـە (یەسـریب)دا بـۆ پەیدابووەو زانییشیان چەندین کەسی بڕوادار لەخەڵکی (مەککە) بەرەو ئەوێ دەرچـوون و بـەم ڕەنگەش بۆیان دەرکەوتبوو کە بەبێ هـیچ گومانێـك پێغەمبـەریش بـەدوایان دا دەڕوات، کـە بەمانەیان زانی خێرا لەخانەی ڕاوێژکاری (دار النـدوة)دا کۆبوونـەوەو دەسـتیان کـرد بەڕاوێـژو ڕاگۆڕینەوە بـۆ گەیـشتن بـەبڕیارێکی تـازە لـەدژی پێغەمبـەر، ئـەوەبوو هەنـدێك لەسـەرانی (قورەیش) پێشنیاری دەربەدەرکردنیان بۆدانا، هەندێکیتریشیان ئاماژەیان بـۆ دەسـگیرکردن و بەندکردنی کرد.

بـەڵام (ابوجهـل) پێـشنیاری کوشـتنی بۆدانـان بەشـێوەیەك، کـە لـەدوایی دا هۆزەکـەی پێغەمبەر توانای تۆڵەسەندنەوەیان نەبێت، ئەوەش بەو ڕەنگەی هەر هۆزێـك لاوێکـی بـەهێزو خانەدان هەڵبژێرێت و پاشان هەریەکە لەو لاوانە شمشێرێکی تیـژو بڕنـدەیان بدرێتـە دەسـت و هەموویان پێکەوە (بەیەك جار، وەك یەك پیاو) بەشمشێرەکان لێـی بـدەن و بیکـوژن. چـونکە ئەگەر ئاوا بیکوژن خوێنەکەی بەسەر هەموو هۆزەکانی قـورەیش دا بڵاودەبێتـەوەو هۆزەکـەی خۆیشی ناتوانن تۆڵە لەو هەموو هۆزانە بکەنەوە، بەڵکو لەو حاڵەتەدا ناچاردەبن بـە (دیـە)[1] ڕازی بن، کە پێ یان دەدرێت.

دوای ئەو کۆبوونەوەیەیان لـە (دار النـدوە) بڵاوەیـان لێ کـردو هەمووشـیان ڕێکـەوتبوون لەسەر ئەو ڕایەی (ئەبوجەهل) سەبارەت بەکوشتنی پێغەمبەر. بـەڵام خـودا (جیبریـل)ی نـارد بۆلای پێغەمبەر تا ئەو هەواڵـە تازەیـەی پـێ بگەیـەنێت و ئاگـاداری کـردەوە لـەو پیلانـەی گەلەکەیو داواشی لێکرد کە با ئەو شەوە لە پێخەفەکەی خۆی دا نەمێنێتەوە.

## پێغەمبەر لەماڵی "ئەبوبەکر"دا

(عائیشە) لەم بارەیەوە دەڵێت: }پێغەمبەری خودا دروست بوو بـۆی کـە لەهـەر تـاقێکی ڕۆژدا (سەر لەبەیانی بوایە یان سەر لەئێوارە) بچێت بۆماڵی –ئەبوبەکر-. ئەوەبوو ئـەو ڕۆژەی کە مۆڵەتی کۆچکردنی لە –مەککە–وە پێ درابوو لەگەرمای نیوەڕۆداو بەناوەڕاستی خەڵکیدا

(١) (دیة): نرخی خوێنی (کوژراوە)کـە دەدرێـت بەکـەس وکـارو خـاوەنی کوژراوەکـە، سـا ئـیتر نرخەکـە بەپارەودراوبووبێت یان هـەر کەرەسـەیەکی هاوشـێوەی کـە کـەس وکـاری بکـوژ (قاتـل)ەکـە دوای سـوڵح و ڕێکەوتنێك دەیدەن بەخاوەنی کوژراو.

هات بۆ لامان. هاتنەکەشی بۆیە لەگەرمای نیوەڕۆدابوو، چونکە لەو ساتەدا هیچ کەسێك هات و چۆی نەدەکرد).

ئینجا کەهات (باوکم -ئەبوبەکر)ی بینی و پێ ی فەرموو: {ئەوا خودا ڕێ ی دام بەدەرچوون و کۆچ کردن{. (ئەبوبەکر)یش گوتی: (کەوابوو بەهاوڕێ یەتی ی من) فەرمووی (بەهاوڕێ یەتیت). واتە هاوەڵت دەبم لەمسەفەرەدا.} ..

هەر خودی (عائیشە)ی کچی (ئەبوبەکر) لەوەسفی هەستی پڕ جۆش و خرۆشی باوکی دا دەڵێت: {دەسا بەخودا تا ئەو ڕۆژە نەمدیبوو کەسێك هێندەی باوکم خۆشحاڵ بێت و بەڕادەیەکی وا، کە لەخۆشی دا بگری، ئەوەبوو دیتم ئەو ڕۆژە لەخۆشی دا دەگری. پاشان بەپێغەمبەری گوت: (ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە دوو حوشترەو بۆ ئەم کارە سازم کردوون). ئینجا ڕێ پیشاندەر (دەلیل)ێکی بەکرێ گرت، کەناوی (عبداللە-ی کوڕی -اریقط) بوو تاکو ڕێنمایی ی ڕێگاکەیان بکات و ڕێ ی سەفەریان پیشان دات.

## ڕزگاربوونی پێغەمبەر

بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پیلانە پووچەڵەی کە سەرانی قوڕەیش هۆنیبوویانەوە، لەتاریکایی شەودا چەند لاوێکی (قوڕەیش) لەبەردەرگای ماڵی پێغەمبەردا کۆبووبوونەوەو چاوەڕێ ی ئەوەیان دەکرد، کەپێغەمبەر بخەوێت و هەڵمەت بەرنەسەری‌و بیکوژن.

کاتێك پێغەمبەر بەو حاڵەتەی زانی فەرمانی بە (علی-ی کوڕی -ابوطالب) کردو پێ ی فەرموو: {تۆ لەم پێخەفەم دا بخەوەو ئەم کراسەم بدە بەسەرخۆت داو لەش ودەم وچاوتی پێ داپۆشە، (کە کراسێکی سەوزی -حەزرەمەوتی-ی خەت خەتە)و پێوەی بنوو، بێگومان تووشی هیچ ئازارو ناڕەحەتی یەکیش نابیت} . هەروەها فەرمانی پێکرد کە هەر سپاردەو کەرەسەیەکی خەڵکی لایە پێیان بگەیەنێتەوە.

جێی باسیشە زۆرکەس لەخەڵکی (مەککە) سپاردەو شت ومەکی گرنگی خۆیان لەلای پێغەمبەر دادەنا، چونکە بەپیاوێکی سەرڕاست و دەسپاکیان ناسیبوو.

ئینجا پێغەمبەر لەماڵ هاتەدەرەوەو خوداش لەو کاتەدا هەموو لاوەکانی قوڕەیشی نابیناکردبوو لەئاستیاو نەیاندەبینی، پاشان بەرەو ماڵی (ئەبوبەکر) ڕۆشت، تاکو هەردووکیان پێکەوە کۆچ بکەن. جا کە پێك گەیشتن ڕێکەوتن لەسەرئەوەی سەرەتا ڕووبکەنە ئەشکەوتی (ثور) بۆ خۆحەشاردان تیای دا.

بۆ ئاسان کردنی ئەمەش (ئەبوبەکر) بەر لەڕۆیشتن فەرمانی بە (عبداللە)ی کوڕی کردبوو کە لەنێو خەڵکی دا گوێ هەڵخات و بەڕۆژ گوێ یان لێ بگرێت، تا بزانێت چی دەربارەیان دەڵێن و دوای ئەوە بگەڕێتەوە بۆلایان و هەواڵ و قسەوباسی ئەو ڕۆژەیانپێ بگەیەنێت.

هەروەها (ئەبوبەکر) فەرمانی بەکوڕە خزمەتکاری خۆی (عامر–ی کوڕی –فهیرە) کردبوو، کە بەڕۆژ مەڕەکانی بۆ بلەوەڕێنێت و ئێوارەش لێ یان خوڕێت بەرەو لای ئەوان لەئەشکەوتەکەدا، تاکو لەشیرەکەیان بخۆنەوە.

دوای ئەمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لەدەروازەیەکی بچووکی پشتی خانووەکەیانەوە دەرچوون تاکو زیاتر لەبەرچاو ون بن و بەرەو ئەشکەوتەکە ڕێیان گرتەبەر. ئیدی بەم چەشنە پێغەمبەری خودا لەپیلانی کوشتن ڕزگاری بوو.

هەروەك خوداش لەو بارەیەوە فەرمووییە: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ (١) أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ (٢) وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ (٣) وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴾ الأنفال/٣٠..

واتە: {ئەی پێغەمبەر ئەو کاتە بەیادبێنەرەوە کە بێباوەڕانی قوڕەیش پیلانیان لەدژی تۆ دەگێڕاو نەخشەیان بۆ تاوانەکانیان دادەناو هەندێکیان ڕایان وابوو بت کوژن یاخود دەربەدەرت کەن و لەخاکی خۆتت دوورخەنەوە، بەڵام لەکاتێکدا ئەوان فڕوفێڵ و تەڵەکەبازییان ئەنجام دەدا خودا بەرپەرچی فێڵ و نەخشەکانیانی دەدایەوەو پووچەڵی دەکردنەوە، جا ئەگەر ئەوان فێڵبازو نەخشەکێش بن ئەوا خودا لەوان وریاترو نەخشەکێش ترە بۆ ڕیسواکردن و ڕەنجەڕۆکردنیان}.

## گەڕان بەدوای پێغەمبەردا

دوای تێپەڕبوونی ئەو شەوەی، کە بەتەمای پیلان و ئەنجامدانی تاوانەکەیان بوون، بێباوەڕانی –قوڕەیش– لەگەڵ خۆرهەڵاتن و ڕۆژبوونەوەدا بۆیان دەرکەوت، کە بێگومان "موحەممەد" لەدەستیان دەرچووەو ئەو کەسەی لەپێخەفەکەی دا نووستبوو (علی–ی کوڕی – ابوطالب)[٤] بووە... ئەوەش ڕووداوێکی سەرسوڕهێن و کت وپڕیی ئەوتۆبوو کە عەقڵ و هۆشی

(١) لیثبتوك: واتە (بۆ ئەوەی بت بەستنەوەو بەندت بکەن).
(٢) یخرجوك: واتە (دەرت بکەن لە – مەککە).
(٣) ویمکر اللە: واتە (خوداش نەخشەو پلان دادەنێت بۆ ئابلۆوقەدانی فێڵ و پیلانە چەپەڵەکانیان).
(٤) بەڕاستی لەو شەوەدا خەوتنی (علی – ی کوڕی – ابوطالب) لەپێخەفی پێغەمبەرداو بەجل وبەرگی ئەویشەوە بەهەڵوێستێکی جوامێری و چاوقایمی ی وا دادەنرێت، کە ئەوپەڕی گیانی فیداکاری و دڵسۆزی ی بۆ پێغەمبەری خودا تێدایە، چونکە (علی) ژیانی خۆی خستە مەترسی یەوە لەپێناوی ڕزگاربوونی پێغەمبەردا.

لێ بڕین. کەچی بەمەش وازیان نەهێنا، بەڵکو خەڵاتێکی هێجگار زۆریان دانا بۆ هەر کەسێك بتوانێت بیگێڕێتەوە بۆلایان و نەهێڵێت دەرچێت، خەڵاتەکەش بڕی سەد حوشتربوو.

دیارە کەسانی بەتەماع و هەلپەرستیش بەو خەڵاتە زۆرە خرۆشان و لەهەموو لایەکەوە بەدوای پێغەمبەردا دەگەڕان تاکو هەر کەسە بۆخۆی ئەو خەڵاتەی دەستگیربێت، ئەوەبوو چەندین شوێنیان پشکنی، تا گەیشتنە سەر ئەو چیایەی، کە پەنایان بۆ بردبوو و چوونە بەردەرگای ئەو ئەشکەوتەش، کە چووبوونە ناوی، بەڵام قاچیان لەبەردەم دەروازەی ئەشکەوتەکەدا لاداو نەیانبینین، ئەوەش دیارە هەر بەچاودێری و پارێزگاریی خودابوو.

لەو چرکەساتە ناسکانەدا (ئەبوبەکر) خەمباربوو بۆ پێغەمبەری خوداو دەیگوت: {ئەگەر یەکێکیان جێ پێ ی ببینێت ئەوا دەماندۆزنەوە}.

پێغەمبەریش هەستی بەو بێئارامیو نیگەرانیەی هاوەڵەکەی کردبوو، بۆیە لەوەڵامی ئەندێشەکەیدا فەرمووی: {ئەی ئەبوبەکر چۆن دەڕوانیت بۆ حاڵەتی دووکەس، کەخودا سێ هەمیانە}؟ واتە بۆ پاراستنیان و چاودێری کردنیان. ئینجا دەڕوانێت بۆ (ئەبوبەکر) کە خەم و دڵەڕاوکێ لەدەم وچاوی نیشتبوو و دەیویست نەختێك لەو خەم وپەژارەیەی لەسەرسووك کات، (ئەبوبەکر)یش ڕوودەکاتە پێغەمبەرو دەڵێت: (دەسا بەخودا بۆ خۆم خەمناك و نیگەران نیسیم، بەڵکو دڵتەنگم لەترسی ئەوەی نەبادا تووشی کارەساتی ناخۆش ببیت).. پێغەمبەریش لەوەڵام دا پێ ی دەفەرموێت: (مەترسە چونکە خودامان لەگەڵ دایە).

دەربارەی ئەو حاڵەتە ناسك و حەسساسەش خودا فەرموویەتی:

﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ التوبة/٤٠.

پێغەمبەری خوداو هاوەڵەکەی لەو ئەشکەوتەدا سێ ڕۆژیان بەسەربردو بێباوەڕانی قورەیشیش بێئومێد ببوون لەوەی بتوانن بیاندۆزنەوە، دوای ئەو سێ ڕۆژەش ڕێنماکار (دلیل)ەکەیان هاتەوە بۆلایان و هەردوو حوشترەکەشی پێبوو و بەڕێگایەکی نائاسایی‌و نەزانراوداو لەڕێی کەنارەوە بردنی بەرەو (یەسریب).

ئەم هیجرەتە ناوازەیەی پێغەمبەر لەمانگی (ربیع الأول)دابوو دوای ئەوەی سیازدە ساڵ بوو پەیامی پێغەمبەرێتیی پێسپێررابوو و تەمەنیشی لەو کاتەدا پەنجاوسێ ساڵ بوو.

# پارێزگاریکردنی خودا لە پێغەمبەر

یەکێك لەو کەسانەی بەدوای پێغەمبەردا دەگەڕا بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە پیاوێك بوو کەناوی (سراقە—ی کوڕی —مالك—ی کوڕی —جعشم) بوو کە ئەویش لەپیاوێکی قوڕەیشیەوە هەواڵێکی لەو بارەیەوە پێگەیشتبوو کەوا سێ پیاوی دیوەو پێکەوە بەرەو "یەسریب" دەڕۆشتن. (سراقە)ش پیاوێکی زل و کەڵەگەت بوو و بەئازایەتیش ناوی دەرکردبوو، قەڵغانەکەی لەبەرکرد بێئەوەی کەس پێی بزانێت تاکو دوای (محمد) کەوێت و بیگرێت و خەڵاتە زۆرەکەی چنگ کەوێت.

ئیتر کەوتەڕێو لەدوورەوە (ئەبوبەکر) دیتی ئەوا پیاوێکی چەکداری ئەسپ سوار بەرەو ڕوویان دێت و خەریکە نزیك دەبێتەوە لێیان. ئەمەش نەختێك بێئارامی کرد. بەڵام پێغەمبەری خودا بەوپەڕی هێمنیو دڵنیایییەوە هەنگاوی دەناو هەمیشە لەنزاو دووعادابوو و درێغیی لەقورئان خوێندنیش نەدەکرد.

جا لەکاتێك دا (سراقە) بەپەلە ڕێگای دەبڕی، کت وپڕ ئەسپەکەی سەرسمێکیداو هەڵیدایە سەر زەوی، بەڵام جارێکیتر سواری پشتی بووەوەو هەوڵیدا پێیان بگاتەوە. هێندەشی نەمابوو پێیان بگات کە لەناکاودا ئەسپەکەی جارێکیتر هەڵـەنگاوت و هەر چوار پەلی لەزەویدا چەقیو ئەویشی دوور هەڵداو چەك و تفاقەکەشی لێداماڵرا.

لەم حاڵەتەدا (سراقە) تووشی بێ ئومێدی بوو و بەچاکی بۆی دەرکەوت، کە ئەو لەم هەوڵەی دا دەستەوسانەو لەدڵی خۆیشی دا دەیگوت: (بەڕاستی ئێستا —محمد— بەم حاڵەتەمی زانیوەو پەردەم لەسەر هەڵدەماڵێت و لەکارەکەی خۆشی دا سەردەکەوێت). هەر بۆیەش بەهێمنیو سەرکزی یەوە چوو بۆ لایان و داوای لەپێغەمبەر کرد کەنووسراوێکی تایبەت بەپاراستنی سەرو گیانی پێبدات وەك نیشانەیەکی پشت پێبەستراوی نێوانیان. پێغەمبەری خوداش فەرمانی بە (عامر—ی کوڕی —فهیرە) کرد، کە ئەو نووسراوەی بۆ بنووسێت. ئینجا (سراقە) نووسراوەکەی هەڵگرت و بەرێ ی پێشووی خۆی دا گەڕایەوەو لەڕێگاش هەر کەسێکی بدیایە لەوانەی کەوەك خۆی بەدوای پێغەمبەردا دەگەڕان و بەو خەڵاتە زۆرە لەخشتەبرابوون، ڕێگاکەی لێ دەگۆڕین و وای لێ دەکردن نەکەونە سەر ئەو ڕێگەیەی کە پێغەمبەرو ئەبوبەکری هاوەڵی پێیدا دەڕۆشتن.

لەدوایی دا، کە (سراقە) تەواو دڵنیابوو و هەواڵی زانی، کەوا پێغەمبەر بەسەلامەتی گەیشتۆتە "یەسریب" دەستی ی کرد بەگێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتەی خۆی بۆ خەڵکی، کە لەو ڕێگەیەدا بەسەری هاتبوو.

## گەیشتنی پێغەمبەر بۆ "قباء"

هەواڵی کۆچی پێغەمبەر بەگەرمی بەرگوێ ی خەڵکی -یەسریب- کەوتبوو، ئەوەبوو سەرلەبەیانی ی گشت ڕۆژێك لە کەناری شارەوە چاوەڕوانی ی هاتنی پێغەمبەریان دەکرد، تا ئەوکاتەی گەرمای نیوەڕۆ تینی دەسەندو بێ هیوا دەبوون لەگەیشتنی و دەگەڕانەوە بۆنێوماڵ و سەرکارەکانیان.

پێغەمبەر هەشت ڕۆژی بەگەرمایەکی توندەوە لەوسەفەرەدا پێ چوو، تا گەیشتە جێگەیەك پێ دەگوترێت(قباء)، کە شەش میل-لە یەسریب دوورە. لەوێ ژمارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتوانی بەچەکەکانیانەوە لەپێشوازیی دابوون لەترسی ئەوەی نەبادا دوژمنان پێی بگەن.

پێغەمبەر لەمیوانداریێتی ی (عەمر-ی کوڕی -عەوف)دا بوو و پتر لەدەڕۆژ لایان مایەوە. لەو ماوەیەش دا یەکەمین مزگەوتی لەمێژووی ئیسلام دا بنیات ناو بەمزگەوتی (قباء) ناسرا. قورئانیش ئاماژە بۆ ئەو مزگەوتە دەکات هەروەك لەم فەرمایشتەی خودا دایە:

﴿ لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴾التوبة/١٠٨. پێغەمبەر خۆیشی بەشداریی بنیات نانی ئەو مزگەوتەی لەگەڵ هاوەڵانی دا کرد.

## وتارێکی پێغەمبەر

پاشان پێغەمبەر (قباء)ی بەجێ هێشت لەڕۆژی هەینی (جمعە)داو بەرەو (یەسریب) کەوتەڕێو شوێنکەوتوو و پشتگیریکارانیشی چوار دەوریان دابوو. لەکاتی دوانیوەڕۆدا گەیشتە شوێنی نیشتەجێبوونی بنەماڵەی (سالم-ی کوڕی -عەوف) لەشیوێك دا کەپێی دەگوترێت: (شیوی -رانوناء)و لەوێ نوێژی هەینیی کردو وتارێکی بۆ دان و تیایدا فەرمووی:

{سوپاس و ستایش بۆ خودا کە زۆر سوپاسگوزارم بۆیو داوای کۆمەك و یارمەتی هەر لەو دەکەم. داوای لێخۆشبوون و ڕێنمایی لێدەکەم. باوەڕی پێدێنم و بێباوەڕنابم بەرامبەری. دژی ئەو کەسەشم کەباوەڕی پێناهێنێت. هەروەها شایەتی دەدەم — بەدڵ و بەزمان — کەهیچ

خودایەکی پەرستراو نی یە تەنها —الله— نـەبێت و هـەرخۆی تـەنیاو بـێ هاوەڵـەو شـایەتیش دەدەم، کە —محمد بەندەی خوداو پێغەمبەریەتی، کە بەڕێ ی ڕۆشن و ئاینی ڕاسـت و ڕووناکی ئیسلام و پەندو ئامۆژگاری یەوە ناردوویەتی بۆلای خـەڵکی دوای ماوەیـەکی دیـار لـەناردنی پێغەمبەران و لە کەم بوونـەوەی زانـست و، لـە گومڕابـوونی خـەڵکی و، دابڕانـی پـەیام لـە زەمەنێك داو، نزیك بوونەوە لەقیامەت و، نزیکی لەمردن... هەر کەسێك گوێڕایەڵی ی خوداو پێغەمبەرەکەی بکات بەڕاستی ڕێ ی ڕاستی دەسـت کـەوتووە، هـەر کەسـێکیش سەرپێـچی لەفەرمانیان بکات ئەوا بێگومان سەرلێ شـێواوو کەمتەرخـەم بـووەو زۆریـش گومڕابـووە...

هەروەها من ڕاتان دەسپێرم بە لەخواترسان و پارێزکاری، چونکە باشترین ڕاسپاردەی موسـڵمان بۆ موسڵمان ئەوەیە هانی بدات لەسەر کارکردن بۆ ڕۆژی دوایی و فەرمانی لەسەر خواپەرسـتی پێ بکات. جا وریابن لەوەی کەخودا ئێوەی لێ وریا کردۆتەوە. ئیـدی ئامۆژگـاری یـەك لـەوە چاکترنی یە... یادو زیکرێك لەوە باشترنی یـە. خواپەرستی و پارێزکـاری (تقـوی الله)ی ئـەو کەسـەش کـاری پـێ دەکـات بـەترس وبـیم لـەخوداوە فریـاگوزارێکی ڕاسـتەقینەی مـەرام و ئامانجەکانتانە لەکاروباری ڕۆژی دوایی دا. هەر کەسێکیش نێـوانی خـۆی و خـودا لـەنهێنی و ئاشکرادا چاك بکات و تەنها مەبەستی ڕەزامەندیی ی خودابێت ئەوە بـۆی دەبێتـە بـەختیاری لەکۆتایی ژیان داو بۆی دەبێتە گەنجینەیەك لەدوای مردن کەمرۆڤ لەو سـاتانەی دوای مـردن دا ئاتاجی بەکردەوە چاکەکانی ژیانی دنیایەتی. دەنا گەر کردەوە چاکەکانی فریـای نەکـەون ئـەوا حەزدەکات لەنێوان خۆی و مردن دا ماوەیەکی هێجگار دوور هەبوایـە... خـوداش ئاگادارتـان دەکاتەوە لەخۆی، لەسزای خۆی. هەروەها خودا بـەڕەحم و بەبەزەییـشە لەگـەڵ بەنـدەکانی دا.

هەر ئەو خودایەشە کەفەرمایشتی خۆی بەڕاسـت دەباتەسـەرو بەڵێنیـشی بەجێدەگەیـەنێت و نایشکێنێت، خودای مەزن و باڵادەست دەفەرموێت: ﴿ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾، جا ئێوەش پارێزکـارو لـەخواترس بـن لەئاشـکراو پـەنهانی دا بـۆ ئاسـوودەیی ژیـانی دنیـاو ئاخیرەتتان، چونکە هەر کەسێك لەخواترس و پارێزکاربێت خـوداش گوناهـەکانی دەسـڕێتەوەو پاداشـــتی گـــەورەی دەداتـــەوە... ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴾...

لەخواترسان مرۆڤـی بـڕوادار لـەڕق و تـووڕەیی خـودا دەپارێزێـت و سـزاوکینەی لادەبـات...

هەروەها لەخوداترسان ڕووی مرۆڤ سـپی دەکـات و خـودا ڕازی دەکـات و پلەوپایـەی بـڕوادار بەرزدەکاتەوە.

جا ئێوەش دەست بگرن بەبەشی خۆتانەوەو لەپەنای دینی خوادا زیادەڕۆیی مەکەن. خودا بێگومان بەکتێبەکەی خۆی فێری کردوون و ڕێبازی خۆی بۆداناون تاکو ڕاستگۆیان بناسێت و درۆزنانیش بناسێت. جا ئێوەش چاکەبکەن وەك چۆن خودا چاکەی لەگەڵ داکردوون، دژایەتی ی دوژمنانیشی بکەن و جیهادی تەواویش لەڕێ ی خوادا بکەن ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ﴾ خودا خۆی هەڵیبژاردوون و بە (موسڵمانان) ناوی بردوون، تا ئیدی هەر کەسێك لەناوچێت بەهۆی کفرو بێباوەڕییەکەیەوە لەناوچێت هەر کەسێکیش بژی بەهۆی ئیمان و خواویستییەکەیەوە بژی[1] ﴿لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ﴾. هیچ هێزو دەسەڵاتێکیش نییە تەنها لەخوداوە نەبێت. جا ئێوەش هەر زیکرویادی خودا بکەن و زۆریش زیکری بکەن، کار بۆ دوای مردن بکەن، جا هەر کەسێك نێوانی خۆی و خودا ڕاست کاتەوە ئەوا خوداش دەیپارێزێت لەناخۆشی ی نێوان ئەو کەسەو خەڵکی، چونکە خودا توانای لەناوبردنی خەڵکیی هەیە، بەڵام خەڵکی توانای لەناوبردنی ئەویان نی یە. هەروەها چونکە خودا خاوەنی خەڵکی یەو هەڵس وکەوت لەکاروباریان دا دەکات، بەڵام خەڵکی تواناو مافی ئەوەیان نی یە. هەر هێزو تواناو سەروەری یەکیش تەنها لەخودای گەورەو باڵادەستەوەیە} . [2]

## پێغەمبەر لە "یەسریب"

پێغەمبەر دوای بەجێ هێنانی نوێژی هەینی لە – قباء –، کەوتەوە ڕێ و بەردەوام بوو لەڕۆشتن تا بگاتە شاری (یەسریب)، لەوێ خەڵکی شار هەموویان هاتبوونە دەرەوەو پێشوازیی پێغەمبەریان دەکردو هەر، کە بەدییان کرد هاواریان کرد: (( الله أكبر... ئەوا پێغەمبەری خودا هات.. الله أكبر ئەوا –محمد– هات ﴾ ژنان و منداڵانیش (بۆ بەخێرهاتن کردنی) ئەم سروودەیان دەگوتەوە:

طَلَعَ البَدرُ عَلَينا — منْ ثَنيات الوَداع
وَجَبَ الشُكرُ عَلَينا — ما دَعا لله داع

... تا کۆتایی سروودەکە.

---

(١) چونکە باوەڕو ئیمانداریێتی هۆی ژیانی ئاسوودەو ڕاستەقینەن چ لەدنیاو چ لەئاخیرەتیش دا.. بەڵام (کفرو بێ باوەڕی) هۆی تیاچوون و سەرگەردانیین لەدنیاو ئاخیرەت دا.

(٢) (البداية والنهاية)ی – ابن كثير – و "تأريخ الطبري".

بێگومان ئەو ڕۆژەش پڕ لەشادیو خۆشی بوو و لەوەوبەر شارەکە لەمێژووی خۆی دا ڕۆژی ئاوای بەخۆیەوە نەدیبوو. ئەو ڕۆژە هەر خاوەن ماڵێك حەزی دەکرد پێغەمبەر ڕوویکاتە ماڵەکەیو داوایان دەکرد میوانیان بێت.

بەڵام پێغەمبەر ڕای وابوو، کە جڵەوی حوشترەکەی بەردات و لێ ی گەڕێت تا بەئارەزووی خۆی لەکوێ دا چۆك دا دەدات، ئینجا ڕووی کردە ئەو جەماوەرە دڵ پڕ لەشادیو بەپەرۆشەی چواردەوریان دابوو و پێ ی فەرموون: {واز لەحوشترەکە بێنن چونکە فەرمانی پێ کراوە} واتە فەرمانی بەوە پێکراوە کەوا لەشوێنێکی تایبەتی دا چۆك دا دەدات و لەبەردەرگای هەر ماڵێك بوو دەچنە ئەو ماڵە.

حوشترەکەش وردەوردە ڕێگەی بڕی، تا گەیشتە شوێنێك کەعەرەب پێ ی دەڵێن (مربد)، واتە: (شوێنی وشك کردنەوەی خورما)و بەرامبەر ماڵی (أبو ایوبی أنصاري) بوو و لەوێ دا چۆکی دادا. (مربد)ەکەش موڵکی دوو کوڕی مێردمنداڵی هەتیو بوو و پێغەمبەر ئەو زەوییەی لەسەرپەرشتیارەکەی ئەو دوو هەتیوە کڕی یەوەو ئەو مزگەوتەی تیا دروست کرد کە تا ئەمڕۆش بەمزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەر (الحرم النبوی الشریف) ناسراوە. (دیارە ئەو مزگەوتە، تا ئەمڕۆ چەندین جار دروست کراوەو پەرەی پێدراوە).

جا کە حوشترەکە لەوێ دا چۆکی دادا، پێغەمبەری خودا بووە میوانی (أبو ایوبی انصاری) لەتەنیشت زەوییەکەوە تا ئەو کاتەی مزگەوتەکەو ماڵی خۆیشی لێبنیات دەنرێت. ئەوەبوو دەست کرا بەدروست کردنی مزگەوتەکەو پێغەمبەر خۆیشی کاری دەکرد لەبنیات نانیدا تاکو موسڵمانانیش هان بدات بۆ کارکردن، کۆچکاران و پشتیوانان (المهاجرون والأنصار) گشتیان پێکەوە کاریان دەکردو سەرگەرمی بنیات نان و کاری دڵسۆزانە بوون. پێغەمبەریش بەردی دەکێشا لەگەڵیان دا و بەدەم کارکردنیشەوە دەیفەرموو:

اللّهُم لا عَيْشَ الاّ عَيْشُ الآخِرَة　　　فَاغْفِرْ للأنْصَار والمُهاجِرَة

{خودایە هیچ ژیانێکی ڕاستەقینە نی یە تەنها ژیانی ڕۆژی دوایی نەبێت، خودایە ببوورە لەپشتیوانان وکۆچکاران}...

هەروەها پێغەمبەر ماڵی خۆیشی لەتەنیشت مزگەوتەکەوە بنیات ناو تیای دا نیشتەجێ بوو. جا کاتێك پێغەمبەری خودا لەشارەکەدا جێگیربوو، (کە هەردوای ئەوە بەشاری – مەدینە– ناوبرا)، چەند کەسێکی نارد بەدوای ئەو کەسانەدا، کە لەبەر چەند هۆیەك لەمەککەدا مابوونەوەو دواکەوتبوون لەکۆچ کردن، تا بچن بۆ (مەدینە). هەندێکیان توانییان

دەرچن وەك(عبداللە— ی کوڕی —ئەبوبەکر) لەگەڵ منالەکانی باوکی دا.

بێ باوەڕانی— مەککە —ش نەیاندەهێشت، کە موسڵمانە هەژارو بێ دەسەلاتەکان دەرچن و کۆچ بکەن، بەڵکو بەندیان کردبوون و بەچەندین شێوەی دڕندانەش سزاو ئەشکەنجەیان دەدان.

## بەستنی برایەتی لەنێوان کۆچکاران و پشتیوانان دا

لە (یەسریب) مێژووی بانگەوازی ئیسلامی بەچەند قۆناغێکی نوێ دەستی پێ کرد، وەك:{قۆناغی ڕێنمایی کردن (الهداية){و}قۆناغی ڕێکخستن (التنظيم){و}قۆناغی سەرکەوتن(النصر)} . لەو شارەداو لەسەرەتای هیجرەتا چەندین هۆزو تیرەی هەمە جۆری تێدا دەژیان، لەپێش هەمووشیانەوە ئەو موسڵمانانەی بەدەم بانگەوازەکەوە چووبوون و باوەڕیان بەپەیامەکەی —موحەممەد— هێنابوو و، پێغەمبەریش ناوی نابوون (الأنصار/ واتە پشتیوانان)، کە خەڵکی مەدینە بوون (واتە — یەسریب) ئەو موسڵمانانەش کە لەمەککەوە بۆ (یەسریب) دەرچووبوون ناوی نابوون (المهاجرون/ واتە کۆچکاران). جگە لەموسڵمانان، جوولەکەکانیش لەو شارەدا هەبوون. لەگەڵ ئەو بتپەرستانەش کە لەسەر شیرك و هاوبەش بۆ خوادانان مابوونەوە.

جا وێڕای ئەودیاردەی فرەڕەگەزی یەش لەدانیشتوانی—مەدینە—دا ڕق و کینەیەکی دێرین و ڕەگ داکوتاو لەنێوان چەند هۆزو تیرەیەك دا هەبوو، کە زۆرجار دەبووە هۆی بەرپابوونەوەی جەنگ وکوشتار لەنێوانیان دا. هەر بۆیەش ئەرکێکی گەورەی پێغەمبەری خودا ئەوەبوو ڕێو شوێنێکی بنەڕەتی بگرێتەبەر بۆ یەك خستنی هەموو خواست و هەست و بیروڕایەکی نێو ئەو کۆمەڵگە لێك ترازاوو بەش بەشکراوە.

یەکەمین چالاکی ی پێغەمبەری خودا ڕێکخستن و دابین کردنی گوزەرانی ئەو کۆچکارانە بوو، کە لە —مەککە-وە هاتبوون و کە هەندێکیان لەوێ خاوەنی ماڵ و سامان و ژیانی خۆش بوون و بەڵام هەموو ئەو ژیان و گوزەران و ماڵ و سامانەیان جێ هێشتبوو و بەئاینەکەیانەوە هەڵاتبوون.

گرنگترین چارەسەریش (بۆ یەکتر ناساندنی خەڵکی)، کە پێغەمبەر بەکاری هێنا بەستنی ئەو برایەتی یە بوو لەنێوان هەردوو کۆمەڵە موسڵمانەکە (پشتیوانان و کۆچکاران)دا، ئەوەبوو پێ ی فەرموون: }دوو دوو لەپێناوی خوادا ببنە برای یەکدی{واتە: هەر برایەك لەکۆچکاران و هەر برایەك لەپشتیوانان ببنە برای یەکتر... (( تَآخَوا في الله أخَوَينْ أخَوَينْ)). بێگومان بەو برایەتی یە ئیمانیو ئاینپەروەری‌یەش هاوخەم و هاوکاری یەکدی بوون لەبەرەو ڕووبوونەوەی

باره گرانەکانی ژیان داو ((تەنانەت میراتگری یەکتریش بوون))[١] وەك چۆن برایانی نێو یەك خێزان میراتگری یەکدی بوون.

ئیدی هەر پشتیوانێك (واتە هەر ئەنصاری یەکی دانیشتووی –مەدینە-) برایەکی کۆچکاری لە (موهاجیرینی –مەککە) دالّدەداو لەماڵی خۆی دا حەواندی یەوەو زۆر بەچاکی خزمەتی کرد کە ئەو جۆرە میوانداری‌یەی ئەو سەردەمە، تا ئەمڕۆش جێ ی سەرسوڕمان و تێڕامانە.

نموونەیەکی ئەو حاڵەتەش: (عبدالرحمن–ی کوڕی –عوف) کاتێك هات بۆ –مەدینە– پێغەمبەری خودا لەنێوان ئەو و (سعد–ی کوڕی –ربیع– ی –انصاري)دا برایەتی‌ی دروست کرد، (واتە ئەو دوو کەسەی پێکەوە دانا وەك چۆن ئەوانی‌تری دوو دوو کردبوو بەبرای یەکدی).

جا(سعد) بە (عبدالرحمن)ی گوت: }برام.. بێگومان من لەهەموو خەڵکی مەدینە ماڵ و سامانی زیاترو خێزانی زۆرترم هەیە، تۆش نیوەی ئەو ماڵ و سامانەم هەڵگرە بۆخۆت. دووژنیشم هەیەو لەم دوو هاوسەرەم یەکێکیان، (کە کامیان بەباشترو جوانتری دەبینیت) هەڵبژێرە تا بۆتی تەڵاقبدەم.

بەڵام (عبدالرحمن– ی کوڕی –عوف) لەوەڵامی (سعد)دا گوتی: ( خودا پیت و بەرەکەت بخاتە ماڵ و خێزانتەوە... من یەك داواکاریم هەیە ئەویش ئەوەیە ڕێگای بازاڕم نیشان دەن تا بچم کاربکەم )... ئینجا ڕێگای بازاڕی نیشان دراو ئەویش دەستی کرد بەکاری کڕین و فرۆشتن، دوای ماوەیەك قازانجی چاکی بەدەست هێناو حاڵ و گوزەرانی بەرەو باشی ڕۆیشت و توانییشی ئافرەتێك لەپشتیوانان بخوازێت و ژیانی هاوسەری پێکەوەبنێت.

خودای پەروەردگار ستایشی ئەو هەڵوێست و ڕەوشتە بەرزانەی پشتیوانانی کردووە کەچۆن بەتەنگ برا کۆچکارەکانیانەوە هاتوون، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾الحشر/٩.. واتە: {ئەوانەش بەڕاستی زۆر بەئەمەك و ڕاستگۆن

---

(١) ئەم جۆرە میراتگری یە لەڕاستی دا لەئارادابوو هەتا ئەو ڕۆژەی، کە ئایەتی ﴿وأولوا الأرحام بعضهم أولى ببعض﴾ هاتەخوارەوەو دوای ئەوە میرات تەنها بۆ کوڕو کەس وکارە نزیکەکانی هەر کەسێك بوو لەوانەی کە دەمرن و ماڵ و سامانیان بەمیرات بەجێ دەمێنێ بۆ کەس وکاریان.

لەئایینی خوادا، کە خەڵکی—مەدینەن—و لەوێ نیشتەجێ بوون و ئیمانیان بەچاکی و جوامێرانە پەیڕەوکردو ئەو کۆچکارانەیان خۆش دەوێت کەچوونەتە لایان و هیچ حەسوودی یەکیان پێ نابەن و لەماڵ و لانەی خۆیان دا حەواندیاننەوە، هەروەها ئەوان (واتە پشتیوانان) هەموو براکۆچکارەکان لەخۆیان بەچاکترو لەپێشتر دادەنێن تەنانەت گەر خۆیشیان هەژارترین لەوان. جا هەر کەسێك خودا بەهرەمەندی کردبێت بەخۆگرتنەوە لە چاوچنۆکیو بەماڵ بەخشین ئەوا بێگومان سەرفرازو سەرکەوتووە} .

هەروەها خودا لەئایەتێکی تردا ڕێزوستایشی بۆ هەموو کۆچکاران و پشتیوانان پێکەوە داناوەو مژدەی بەهەشتی پێ داون کە گەورەترین هیوای نێو دەروونی بڕوادارانە، هەروەك لەبارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾التوبة/١٠٠.. واتە: }ئەو ئیمانداره پێشینانەی لەکۆچکاران و پشتیوانان بوون و ئەوانەش، کە بەچاکی و چاکەکاری یەوە چ لە هاوەڵان و چ لە(تابعين)و دوای (تابعين)یش شوێنکەوتووی ڕێبازو نەریتیان بوون، کەوتوونەبەر ڕەزامەندی خوداو ڕازیش بوون و خودا لەڕۆژی دوایىدا چەندین باخ و بەهەشتی ڕازاوەی وەهای بۆ ئامادە کردوون کە ڕووباریان بەژێردا دەڕوات و بەنەمری و بەهەمیشەیی تیایان دا دەمێننەوە. بەڕاستی ئەمەش سەرکەوتنە هەرەگەورەکەیە بۆیان} .

پێغەمبەری خودا بەم برایەتی یە ئایینی یە هەموو دڵەکانی بەیەك گەیاندو حاڵ و گوزەرانی کۆچکارە هەژارەکانیشی چاك کرد. بێگومان ئەوەش سیمایەکی هێجگار جوان و سەرکەوتووە لەسیماو دیمەنەکانی ئەو هاوسۆزیو خەمخۆری یە کۆمەڵایەتی یەی کە ئیسلام خستوێتی یە نێودڵی شوێنکەوتوو و پەیڕەوکارانی یەوە بۆ دروست کردنی هاوڕێکی و یەکسانی لەنێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵ و پتەوکردنی پەیوەندییش لەنێوانیان دا.

جا دوای ئەوە پێغەمبەری خودا ویستی لەگەڵ جوولەکەکان دا ڕێکەوتنێك مۆرکات، بۆ ئەم مەبەستەش پەیماننامەیەکی فراوان و ئاشکرای لەنێوان جوولەکەکان و موسڵمانان دا (بەکۆچکاران و پشتیوانانەوە) نووسی و تیای دا بڕیاردرابوو لەسەر یەکێتی ی ڕیزی موسڵمانان کەیەك نەتەوەن، هەروەها بڕیاردرابوو لەسەر: قەدەغەکردنی کوشتن و، پاراستنی ماڵ و

سامانی خەڵکی و، ڕێزگرتن لەئاسایش و سەروەری ی شارەکە.

پاشان پەیمانێکی دی، کە بەجوولەکەکانی دابوو ئەوەبوو، کەئەوان ئـاینی خۆیـان هـەبێت وەك چۆن موسڵمانان ئاینی خۆیان هەیە، هەروەها هەر ڕووداوو پێکـدادان و شـەڕێکی نێـوان دووکەس یان نێوان چەند کەسێکی سەر بەو دووکۆمەڵەیـەی کـە پەیماننامەکـەیان مـۆرکردووە بەرپاببێت ئـەوا چارەسـەرەکەی دەگەڕێنرێتـەوە بـۆلای خـودای باڵادەسـت و پێغەمبەرەکـەی (محمـد)، واتـە بـەپێ ی ئایـەتی قورئـان و ڕێ وشـوێن (سـوننەت)ی پێغەمبـەری خـودا چارەسەربکرێت.

بێگومان بەهۆی ئەو پەیماننامەیەوەو بەهۆی چەسپاندنی برایەتی ی نێوان موسڵمانەکانیش هێمنی باڵی بەسەر شاردا کێشاو موسڵمانان بە ئارامی یـەوە پـەیڕەویی ئاینەکـەیان دەکـردو ئەرك و فەرزەکانیان بەجێ دەگەیاندو لەهیچ بەڵاو ئازاردانێکیش نەدەترسان.

# لایەنی دووەم

## جیهادی پێغەمبەر لە ڕێی بانگەوازدا

١- جەنگی گەورەی بەدر

٢- جەنگی ئوحود

٣- پەیماننامەی حودەیبییە

٤- نامەکانی پێغەمبەر بۆ پادشاو سەرکردەکان

٥- فەتح کردنی مەککە

٦- کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی پێغەمبەر

## فەرمان کردن بەجیهاد

"محمد"ی پێغەمبەر سیازدە ساڵ لەنێو بێباوەڕانی مەککەدا تووشی چەندەها جۆر لەئازارو ئەشکەنجەبوو و خۆیو هاوەڵان و شوێنکەوتوانی بەهەموو شێوازێك ئازاردەدران و وەڕس دەکران.

لەو ماوەیەدا ئایەتەکانی قورئانیش کە لەلایەن خوداوە بۆی دەهات هەر ئەو ئەرکەی بۆ ڕوون دەکردنەوەو هەڵس وکەوت و مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی دا بۆدیاری دەکردن، وەك ئەم ئایەتانەو هاوشێوەکانیان: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾... ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴾... جا کاتێك زوڵم و ستەمی کافران لەسەریان توندوتیژتر بووبوو و گەیشتبووە ئەوەی پیلان لەسەر کوشتنی بگێڕن (وەك چۆن پێشتر باسمان کرد) لەمەککەوە کۆچی کرد بۆ – یەسریب – تا بگات بەو کۆچکارانەی کەپێش خۆی ڕۆشتبوون.

دوای هیجرەتی"محمد"و هاوەڵانیشی بۆ-یەسریب- هەندێك لەو هاوەڵانەی لە-مەککە-دا مابوونەوەو لەبەر چەند هۆیەك نەیانتوانیبوو دەرچن کەوتبوونە بەر مامەڵەیەکی توندتری خەڵکی-مەککە-وە، ئەگەرچی پێشتر بەهۆی پلەوپایەی(محمد)و گەورەهاوەڵانەوە ئازاریان کەمتر دەدراو تەنها تاکە تاکەیەکی بێ باوەڕان ئازاریان دەدان، بەڵام دوای هیجرەت ئەوانەی مابوونەوە کەوتبوونە بەر هێرش و سووکایەتی ی تێکڕای بێ باوەڕان و بەکۆمەڵ ئازاریان دەدان و ڕۆژ بەڕۆژ سزای سەختتر دەدران، تا وای لێ هات ئارامیان لێ بڕاو زۆر لەخودا پاڕانەوەو داوای کۆمەك و فریاگوزاریی بەپەلەیان لێ دەکرد. ئیدی لەو ساتەوەختە ناسکانەدا خودا مۆڵەتی دا بەبڕواداران کەجیهاد بکەن و فەرمانی دەرکرد بۆ کۆچکاران و پشتیوانان کە بەخێرایی و دەسبەجێ فریای برابڕواداراە چەوساوەکانیان کەون لە –مەککە– و ڕزگاریان کەن لەو هەموو زوڵم و ستەمە دڕندانەیەی بێ باوەڕان، هەروەك فەرموویی پێ یان:

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾البقرة/١٩٠-١٩١. واتە: {لەپێناوی خوادا بجەنگن دژی ئەوانەی شەڕوکوشتارتان دەکەن،

بەڵام دەسدرێژی مەکەنە سەر کەسانی بێ توانا وەك منداڵ وپیرو ئافرەت و ئەوانەش کە شەڕخواز نەبوون. چونکە بێگومان خودا دەسدرێژکارانی خۆش ناوێت و سەرخەریان نابێت. هەروەها ئێوە ئەی بڕواداران لەهەر شوێنێك گەیشتن بەو بێ باوەڕە ستەمکارانە بیانکوژن و ڕاویان بنێن و دەریان پەڕێنن وەك چۆن ئەوان ئێوەیان دەرپەڕاند لە شوێنی خۆتان، شەڕو کوشتاریان بکەن تاکو بێ باوەڕان و بێ باوەڕی و شیرك و گومڕایی لەڕیشەدێنن، چونکە بەڕاستی شیرك و هاوەڵ بۆ خوادانان و پاشان هەموو ئەو سزاو ئەشکەنجەیەی کە لەدژی بڕواداران ئەنجامیان دەدا زۆر توندترو کاریگەرترە لەکوشتن}.

هەروەها خودا لەو فەرمانە پیرۆزەدا دەفەرمویت: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾ النساء/٧٥.. واتە: {ئیدی چ بەربەستێکتان لەبەردەم دا ماوە کە ڕێتان لێ بگرێت بۆ کوشتار لەپێناوی خوداو ڕزگارکردنی ئەو پیاوو ئافرەت و منداڵە بێ دەسەڵات و هەژارانەدا، کە کافران ڕێی هیجرەتیان پێ نەداون و بەردەوام ئازارو ئەشکەنجەیان دەدەن و ئەوانیش لەخودا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: خودایە دەربازمان کە لەم شاری (مەککە)یە}، کە تا ئەو ڕۆژە لەژێر دەسەڵاتی بێ باوەڕان دابوو{ کە خەڵکەکەی زوڵمێکی زۆرمان لێ دەکەن، هەروەها ئەی خودای پەروەردگار لەلایەن خۆتەوە سەرپەرشتیارێکمان بۆ دابنێ، کە بەتەنگ حاڵمانەوە بێت و ڕزگارمان کات لەستەمی ئەو خەڵکە، هەر لەلایەن خۆشتەوە سەرخەرو پشتیوانێکمان بۆدانێ، کە سەرمان خەیت بەهۆیەوە بەسەر زاڵمان دا}.

ئەم ئایەتانەش ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کە هۆکاری ڕەواکردنی کوشتارەکە دەرپەڕاندنی بڕواداران بووە بەشێوەیەکی ناڕەوا لەخاکی خۆیان، هەروەها بۆ بەرپەرچ دانەوەی ستەم و دەستدرێژکاری و سەرخستنی براو خوشکە هەژارو بێ دەسەڵاتەکانیان لە -مەککە-داو بەهاناوە چوونیان تا لەو حاڵەتە سەخت و دژوارە ڕزگاربن.

## بڕینی ڕێگای بازرگانی لە -قورەیش-

قورەیشی یەکان عادەتیان وابوو کە لەکاری بازرگانی دا هەموو داهاتێکی کشتوکاڵی و کەرەسە دەسکردەکانیان لەگەڵ -شام-دا ئاڵ وگۆڕ بکەن. هات وچۆیشیان بۆ (شام) هەر لەڕێگەی -یەسریب-ەوە بوو. پێغەمبەریش وای بەچاك زانی کە یەکێك لەئامڕازەکانی

بەرەنگاربوونەوەی کافران ئەوەیە ڕێگەی بازرگانی ی دەرەکییـان لیّ بگرێـت و دەسـت بگرێـت بەسەر بازرگانی یەکەیان دا، تا بەم ڕەنگە سزایان بداتـەوەو هێـزی داراییـشیان کـەم کاتـەوەو ئەوەش ببێتە هۆیەکی تێشکانیان لەبوارەکانی تردا. بۆ ئەم مەبەسـتەش چـەند هـەوڵێك دراو هەر هەوڵێکیش بەسەرکردایەتی ی پێغەمبەر خۆی بوایە بـە (غـزوە) نـاو دەبـرا، بـەڵام گـەر بەسەرکردایەتی ی کەسێکی تر بوایە بە (سریە) نـاودەبرا[1]. دیـارە لەوەوبـەر هەنـدێك هـەوڵ درابوو و زوربەشیان لەڕووی سەربازی یەوە سەرکەوتنی بۆ نەنووسـرابوو و چـەندین کەسیـشیان تێدا کوژرابوو. بەڵام ئاکامە سیاسی و مەعنەوی یـەکانیان دوورمـەوداو کاریگـەریی زۆریـان هەبوو.

ئێمە لەم بەشەی ژیانی پێغەمبەرو لەم بەندانەی لێکۆڵینەوەکانمان دا باسی چەند جەنگێك لەوانـە دەکـەین کـەخودی پێغەمبـەرو بـڕواداران جیهادیـان تیـاداکردووەو جـوانترین وێنـەی قوربانیدانیان پیشان داوە.. ئەو قوربانیدانەی کە لەسەر بنـچینەی بـاوەڕی بـەهێز بـەخوداو، حەزکردنی ڕاستگۆیانە لەگیان بەخشین لەپێناوی ئاینەکەی داو، بـەدی هێنـانی ڕەزامەنـدیی خودا بووە.. لەنێو بڕوادارانیش دا کەسانی خۆبـەختکاری وا هـەبوون کـەڕادەی ڕاسـتگۆییو قارەمانێتییان لەوەسف کردن بەدەرەو مەگەر هەر خودا تواناى وەسف کردنیـانی هـەبێت، وەك دەفەرموێت: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾الأحزاب/٢٣.. واتـە: {لـەنێو بـڕواداران دا چـەندەها پیـاوی وەهـا هەبوون، کە ڕاسـتگۆبوون لـەو پەیمانـەیان دا، کـە بـەخودایان داوەو خۆڕاگربـوون لەجـەنگ و کوشتاردا، یان ڕاستگۆبوون لەو (نەزر)انەیان دا کە لەسەرخۆیان فەرزکردووەو پابەندبوون پێوەی لەسەرئەوەی، کە یان زەبر بەدوژمنان دەگەیەنن، یان دەکوژرێن، جا هەندێکیان هەر جـەنگ و کوشتاریان کردووە، تا گیانی خۆیان بەخت کردووە، هەندێکیشیان هێـشتا لـەژیان دا مـاون و چاوەڕوانی خۆبەخت کـردنن لـەپێناوی خـوادا... بەڕاسـتی ئـەوان هیـچیان لەپـەیمانی خۆیـان نەگۆڕیوەو دوودڵ و ڕاڕانەبوون لەبەخشینی ژیان و گیان بەڕێبازی خودای پەروەردگاریان دا}.

---

(١) ئەو جەنگ و (غەزوە)یانەی کە پێغەمبەر خۆی سەرکردایەتیی کردوون بیست و حەوت جـەنگ بـووە. ژمارەی ئەو (سریە)و پۆل و تیپانەش کە ناردوونی بۆ جەنگ چل و حەوت (سریە) بوون.. ئەو جەنگانەش کـە سەرکردایەتی کردبوون: جەنگی: بەدری گەورە (البدر الکبری)، جەنگی (ئوحود)، جەنگی (مصطلق)، جـەنگی (خندق)، جەنگی (قریظة)، جەنگی (خەیبەر)، فەتح کردنی (مەککە)، جەنگی (حنین)، جەنگی (طائف)..

# بەندی یەکەم

## (( جەنگی گەورەی "بەدر" ))

(لەپشت کاروانەکەوە - لەدەست دەرچوونی کاروانەکە - هەواڵپرسینی کاروانەکە - موسڵمانان لە "بەدر" - خۆسازدان بۆ جەنگ - سەرکەوتنی موسڵمانان)

## لە پشت کاروانەکەوە

پێغەمبەر زانیبووی کەوا کاروانێکی بازرگانی ی گەورەی قورەیش لە(شام)ەوە دێتەوەو بەرێوەیە بەرەو"مەککە". سەرکردەی کاروانەکەش(ئەبو سوفیان) بوو و سی پیاو یان چل پیاویش بۆ پارێزگاریی لەکاروانەکە دانرابوون. پێغەمبەر بەتەمابوو رێگە بەم کاروانە بگرێت و دەست بەسەر کەل وپەلەکانیشیا بگرێت تاکو زیانی دارایی بەسەرانی(قورەیش) بگەیەنێت و داخ بکاتە دڵیانەوە. بۆ ئەم مەبەستە داوای لەهاوەڵان کرد لەگەڵی دا دەرچن بۆ دەست بەسەراگرتنی کاروانەکەو ئەوانیش ملکەچی فەرمان بوون و سێ سەدو سیازدە پیاو لەهاوەڵان ئامادەییان پیشان دا لەو کارەدا. دیارە ئەوەش ژمارەیەکی باش بوو بۆ رێگەگرتن بەکاروانەکەو پێغەمبەریش ئەوەندەیانی لێ دیاری کردو رێگەیان بەرەو (بەدر) گرتەبەر، چونکە ئەو کاروانانەی کە بەرێگەی کەناردا لە(سووریا)وە دەگەڕانەوە بۆ(مەککە) بە(بەدر)دا تێدەپەڕین. ماوەی نێوان(یەسریب)و (بەدر)یش پتر لە (١٦٠) کیلۆمەتر دەبێت. ئەو ولاخانەش، کەپێ یان بوو بۆ سواربوون دوو ئەسپ و حەفتا حوشتر بوو و هاوەڵان بەنۆرە سواری پشتیان دەبوون.

نۆرەی پێغەمبەریش لەگەڵ (علی-ی کوڕی -ابو طالب)و (مرثد-ی کوڕی -مرثدی- غنوی) بوو، کە بەهەرسێکیان یەك حوشتریان پێ بوو و هەر جارەی یەکێکیان سوارپشتی دەبوو. واتە جارێك پێغەمبەرو جارێکی تر (علی)و جارێکی تریش (مرثد). ئەو دووهاوەڵە بەپێغەمبەریان گوتبوو: (ئێمە بەپیادە لەگەڵت دا دەڕۆین و تۆش هەر خۆت سواری حوشترەکە بە). بەڵام پێغەمبەر ئەوەی پەسند نەکرد بوو، بەڵکو فەرمووی پێ یان: {ئێوە لەمن بەهێزترنین و منیش وەك ئێوە بەتەمای پاداشتی خودام و لەئێوە کەمتر بەتەمای نیم}...

پێغەمبەر بەم نۆرەکاری و خۆ جیانەکردنەوەیە ویستوێتی خۆی یەکسان کات لەگەڵ هەر سەربازێك لەسەربازانی هێزەکەی دا.

## لەدەست دەرچوونی کاروانەکە

(ئەبو سوفیان) ئەو هەواڵەی کەوتەبەر گوێ کەوا پێغەمبەر دەرچووە بۆ دەست گرتن بەسەر کاروانەکەدا، بۆیە خێرا یەکێك لەپیاوەکانی نارد بۆلای قورەیشی یەکان لە -مەککە- تا لەو هەواڵە ئاگاداریان کاتەوە. خۆیشی بەکاروانەکەوە لەو ڕێگا ئاسایی یەی جارانیان لای داو بەرێگایەکی تردا ڕۆشت تاکو دەرچن لەدەستی ئەوانەی کە بۆسەیان بۆ داناون.

لەملاشەوە گەورەپیاوانی قورەیش کەوتنەخۆ بۆ بەهاناوە چوونی کاروانەکەیان. بۆ ئەم مەبەستەش نۆ سەدوپەنجا چەکداریان لەژێر سەرکردایەتی ی گەورەکانیان دا سازکرد کە سەد ئەسپ و حەوت سەد حوشتریشیان پێ بوو لەگەڵ چەك و ئازووخەو خۆراکێکی زۆردا.

لەکاتێك دا بەرێ کەوتبوون نێرراوەکەی (ئەبو سوفیان)یان پێ گەیشت و هەواڵی قوتاربوونی خودی ئەبو سوفیان و کاروانەکەشیان پێ دەگەیەنێت و پاشان داوایان لێ دەکات بگەڕێنەوە، (چونکە هیچ مەترسی یەك نەماوە). بەڵام(ئەبو جەهل) شەیدای جەنگ دەبێت و داوادەکات کە هەردەبێت بەرەوپێش بڕۆن و بەردەوام بن لەڕۆشتن و هاواردەکات و دەڵێت:} دەسا بەخواوەندەکانمان ناگەڕێینەوە هەتا دەگەینە(بەدر)و سێ ڕۆژی لێ دەمێنینەوەو بەکەیفی خۆمان تیاڕادەبێرین و ئاژەڵی تیا سەردەبڕین و دەخۆین و مەی دەخۆینەوەو ئافرەتی کەنیزەو سۆزانی گۆرانی و سەمامان بۆبکات و هەموو عەرەبیش دەنگوباسمان ببیستن و ئاگاداری ئەم هاتنەمان بن و هەواڵی ئەم هێزو سوپایەمان بزانن تاکو هەمیشە لێمان بترسن} ...

بێگومان ئەمان بەو لوتبەرزیو خۆهەڵنانەیان وایان لێهاتبوو کەخودا بیانکات بەپەندو عیبرەت و دەربارەیان بفەرموێت: ﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ ﴾الأنفال/٤٧.. واتە: }هەرگیز ئێوەی ئیماندار وەك ئەو کۆمەڵە گومڕایە نەبن کە لە -مەککە-وە بەسەرکردایەتی -ئەبو جەهل- دەرچوون و بەوپەڕی بێ باکی و خۆهەڵنانەوە ڕەفتاریان دەکرد تاکو لەبەرچاوی خەڵك دیاربن و وایان وەسف کەن گوایە بەهێزو بەسامن{..

هەندێك لەوانەی دوای سوپاکەی -ئەبو جەهل- کەوتبوون دوودڵ و بێ ئارام بوون لەو کارەو ئەوەبوو چەند کەسێکیان لێگەڕایەوە، بەڵام هەموو ئەوانی دی لەقورەیش دوای (ئەبو جەهل) کەوتن و ڕێگەیان بڕی تا گەیشتنە دۆڵی (بەدر)و لەڕۆخی ئەمپەڕو دوور لەشوێنەکە لایان دا.

## هەواڵپرسینی کاروانەکە

موسڵمانان بەپەلە بەرەو ڕێ ی کاروانەکە دەچوون لەترسی ئەوەی نەوەك لەدەستیان دەرچێت، ئەوەبوو هەر بەو ڕێگەیەدا دەڕۆشتن و بە هەر شوێنێك دا تێ دەپەڕین هەواڵی ئەو کاروانەیان دەپرسی تا گەیشتنە شیوی (ذفران)و لەوێ لایان دا. هەر لەوێش هەواڵی خۆسازدانی قورەیشیان پێ گەیشت کەوا بەسوپایەکی گەورەوە لە —مەککە— دەرچوون بۆ بەرگری کردن لەماڵ وسامانیان. ئیدی لەو ساتەوەختە چاوەڕوان نەکراوەدا موسڵمانان باری مەسەلەکەیان لەلا گۆڕرا، چونکە تەنها لەوەدا بەند نەبوو کە بەرەو ڕووی کاروانێکی بازرگانی دەوەستن کەژمارەی پیاوان تیای دا کەم بێت، بەڵکو ئێستا دەبێت ڕووبەڕووی سوپایەکی گەورە ببنەوە کە کەرەسەو ئازووخەی پێویستیان بۆ سازنەکردووە.

پێغەمبەریش کەوتە ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەو سوپا بچکۆلەیەی داو هەواڵی پێ دان کەوا خودا سرووشی پێ گەیاندووەو بەڵێنی پێ داوە کەبەسەر یەکێك لەو دوانە (کاروانی بازرگانی یەکە، یان سوپاکەی قورەیش)دا زاڵ دەبن.

ئینجا پێغەمبەر بۆی دەرکەوت، کەهەندێك کەس لەموسڵمانان حەزیان دەکرد تەنها دەست بەسەر کاروانەکەدا بگرن و تەنانەت سکاڵای ئەوەشیان دەکرد گوایە کاتێك پێغەمبەر داوای دەرچوونی لێ کردوون باسی ئەگەری کەوتنە نێو جەنگ کوشتارەوەی بۆ نەکردوون تاکو ئەمانیش کەرەسەو تفاقی پێویستی بۆ هەڵگرن. بەڵام خودا گلەیی لەو موسڵمانانە کردو لەم ئایەتەدا پێ ی فەرموون: ﴿ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ ﴾الأنفال/٧.. واتە: {کاتێك خودا بەڵێنی زاڵ بوونتانی بەسەر یەکێك لەو دوانە (کاروانەکە یان سوپاکەی قورەیش)دا پێ دەگەیاندن و ئێوەش هەندێکتان حەزتان دەکرد، کە ئەوەی چەکی تیانی یە (واتە کاروانەکەتان چنگ کەوێت)}. واتە ئێوە داوای کاری ئاسانترتان دەکردو پێتان خۆش نەبوو ئەوەی، کە دەسەڵات و هێزتان بۆ دەستەبەر دەکات لەئەستۆی بگرن و بەم ڕەنگەش حەزتان لەشەڕو ڕوو بەڕوو بوونەوە نەبوو.

بەڵام لەو ڕاوێژەی پێغەمبەردا (ئەبوبەکر)و (عمری کوڕی خطاب)قسەیەکی وەها ماقووڵ و ڕەوایان کرد کە هەمووی گوزارشت بوو لەباوەڕی قووڵ و ئامادەییشیان بۆ قوربانی دان دەربڕی و لەگەڵ ئەمان دا (میقدادی کوڕی عەمر)یش هەمان هەڵوێستی پیشان داو گوتی:} ئەی پێغەمبەری خودا پەیڕەوی ئەو سرووشە بکە کەخودا پیشانی داویت، دەسا بەخودا ئێمە وەك

(بنو اسرائيل) نابين كاتێك بە (مووسا)ی پێغەمبەریان گوت: (بڕۆ ئەی مووسا خۆت و خوداكەت بجەنگن، وا ئێمەش لێرە لێ ی دانیشتووین)... نەخێر ئێمە وات پێ ناڵێین، بەڵكو دەڵێین تۆ خۆت و خوداشت بجەنگن و ئێمەش لەگەڵتان دا دێین و دەجەنگین. سوێند بەو خودایە، كە بەحەق تۆی ناردووەو كردوویتی بەپێغەمبەر ئەگەر بمانبەیت بۆ (برك الغماد)[1]یش ئەوا بەتوندی شان بەشانی تۆ دەجەنگین تاكو دەگەیت بەئامانج}...

پێغەمبەری خوداش ڕێزی لەو هەڵوێستەی ناو نزای خێری بۆكرد. پاشان ڕووی كردە ئەو پیاوانەی كە خەڵكی –یەسریب– بوون و لەو ئاوڕدانەوەیەی بەلای ئەوان دا ئەوە دەخوێنرایەوە، كە بێگومان ئەو پەیمانەی لەوەوپێش لەوانی وەرگرتبوو لەسەر ئەوەبوو، كە ئەوان تەنها لەناوشاردا لایەنگیری دەكەن، كەوابێت ئێستاش پێچەوانەی نیوەڕۆكی پەیمانامەكەیە گەر لەدەرەوەی شار شەڕبكەن.. بەڵام خێرا یەكێك لەو پیاوانەی (یەسریب)، كە (سعد–ی كوڕی – معاذ)ی گەورەی هۆزی (ئەوس) بوو ڕووی كردە پێغەمبەرو گوتی: {بەخودا وا دیارە ئەی پێغەمبەری خودا تۆ مەبەستت ئێمە بێت}، فەرمووی: (بەڵێ)، ئینجا (سعد) گوتی: {بێگومان ئێمە لەمەوپێش باوەڕمان پێ هێناویت و بڕواشمان پێ كردوویت و دانمان بەو پەیامەش داناوە، كە هێناوتە بۆمان و ڕاستە لەسەرئەوەش پەیمان و بەڵێنمان پێ داویت كەگوێ بیست و گوێڕایەڵت بین. جا ئەی پێغەمبەری خودا تۆش لەسەر فەرمانی خۆت بەردەوام بەو ئێمە لەگەڵتاین، دەسا بەو خودایەی، كە بەهەق ڕوانەی كردوویت گەر دەریامان پیشان دەیت و پیای دا بڕۆیت ئێمەش پیای دا دەڕۆین لەگەڵتاو تاكە پیاوێك لەئێمە لێت دواناكەوێت. ئێمە بێزارنیین لەوەی، كە سبەینێ دەمانگەیەنیت بەدوژمن، چونكە لەجەنگ دا بەئارامین و لەڕووبەڕووبوونەوەدا ڕاستگۆین، لەخوداش داواكارین تۆ بەئێمە خۆشحاڵ كات و چاوت پێمان ڕوون بێت. جا پشت بەخودا ببەستەو لەكاری خۆت دا بەهێزو بەرەكەتی خوداوە هەنگاو بنێ}.

ئینجا ڕووی پێغەمبەر بەو قسانە گەشایەوەو زۆر پێ ی دڵشادبوو، پاشان فەرمووی: {دەبڕۆن و مژدەتان لێ بێت، چونكە بەڕاستی خودا بەڵێنی سەركەوتن بەسەر یەكێك لەو دوانە (كاروانەكە یان سوپاكە)دای پێ گەیاندووم... دەسا بەخودا وا خەریكە من بۆ تیاچوونی ئەو گەلە كافرە دەڕوانم}.

(١) (برك الغماد): ئەم شوێنە بەپێی وتەی (همذاني) لەوسەری ولاتی (یەمەن)دایە.

## موسڵمانان لە - بەدر -

پاشان موسڵمانان کەوتنە ڕێ و هەر دەڕۆیشتن تاکو گەیشتنە ناوچەیەکی نزیك لە(بەدر)و پێغەمبەریش بەسواری حوشترەکەیەوە بوو کەپیاوێکی بەساڵاچووی عەرەبی بینی و لەوەوە زانی ی کەوا سوپای قورەیشیان لێ نزیك بۆتەوە، بۆیە هەندێك لەهاوەڵانی نارد بۆ زانینی هەواڵیان. ئەوانیش دوو کوڕی مێرد منداڵی قورەیشیان لەسەر ئاوی(بەدر) دەسگیرکرد لەکاتێك دا لەوێ ئاویان دەخواردەوە، پێغەمبەر بەهۆی ئەوانەوە جێگەی سوپاکەی قورەیش و ژمارەی سەربازەکانیانی بۆ دەرکەوت.

ئینجا موسڵمانەکان لەدۆڵی (بەدر) دابەزین لەسەرووی دۆڵەکەوەو دوور لەئاوەکەوە کە زەوی یەکی ڕەق و وشکانی بوو و وایان لێ هات ئاویان لەلا نەمابوو و خەریك بوو ورەو تینیان کەم دەبووەوەو هێشتا (نەوموسڵمان)یش بوون واتە تازە چووبوونە نێو ئایینی ئیسلامەوە، جگە لەوەش کە شەکەتیو ماندوێتی تەنگی پێ هەڵچنیبوون و وایان لێ هات وەنەوزێك بدەن و تۆزێك خەو بیانگرێت، دوای ئەمەش بارانێکی بەلێزمەو زۆریان بەسەردا باری و لێ یان خواردەوە و خۆیان پێ شۆردو چەند حەوزێکیشیان لێپێك هێناو جەوەننەو قاپ و قاچاغیان لێ پڕکرد، زەویەکەش بەو ئاوی باراناوە ساف و خۆش بووەوەو هەموو ئەم حاڵەتە نوێ یانەش چالاکی و گوڕ و تیینی خستەوە جەستەیان و ئارامی و خۆڕاگرییشی لەدڵ و دەروونیان دا ژیاندەوە.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو کۆمەکە چاوەڕوان نەکراوەیان کردووەو بەم فەرمایشەی خودا باسی دەکات: ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴾الأنفال/١١..

واتە: {لەکاتێك دا هێندە ماندوو بووبوون کە وەنەوزی خەو دایپۆشیبوون و لوولی دابوون ئەمەش وەك هێمن کردنەوەیەك بوو لەخوداوە بۆ ئێوەو پاشان خودا بارانێکی زۆری بەسەردا باراندن تاکو پاکتان کاتەوەو خۆتانی لێ بشۆن و لێ ی بخۆنەوەو بەمەش هەر وەسوەسەو خورپەیەکی شەیتانتان لێدوورخاتەوە کە دەیخستە دڵتانەوە (واتە کە شەیتان وەسوەسەی لەدڵانتاندا دەکرد بەوەی گوایە لەتینوێتی دا پەرێشان دەبن و ئاوتان دەست ناکەوێت) هەورەها خودا بەو ئاوە زۆرەی بارانەکە دڵتانی پڕکردەوە لەورەو باوەڕو ئومێد بەخودا تاکو جێگیرتان

کات لەسەر مەبەستەکەتان و بوێری و جورئەتی تەواوتان هەبێت لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنتان} . کاریگەرییی ئەو بارانە بۆ موسڵمانان بەو ڕەنگە بوو کەخوداش ئاماژەی بۆکردووە. بەڵام ئەو بارانە کاریگەریی و ئاسەواری نالەباری بۆ سەر بێ باوەڕان هەبوو، چونکە لافاوی بارانەکە هەموو زەوی یەکەی ژێر ئەوانی کردە قوڕولیتاوو وایان لێهات تێ ی دا بچەقن و نەتوانن جم وجووڵ بکەن و بچنە پێشەوە. بەڵام زەوییەکەی ژێر موسڵمانەکان ساف و لووس بووبووەو چەووبەردەکانی ڕەقتر بووبوونەوەو پێ یان تیای دا جێگیرو خۆشڕەو ببو و زۆر بەئاسانی توانای جم وجووڵ و چوونە پێشەوەیان هەبوو. بۆیە پێغەمبەرو هاوەڵانی لەپێش بێ باوەڕەکان دا گەشتنە لای ئاوەکەی (بەدر)و لەنزیکترین سەرچاوەیەوە دانیشتن.

لەو کاتەدا یەکێك لەهاوەڵان، کەناوی (حُباب‌ـی کوڕی ـمنذر) بوو و بەزیرەکیو بیرتیژی ناسرابوو بەپێغەمبەری گوت: (ئەرێ ئەی پێغەمبەری خودا ئایا تۆ بەفەرمانی خودا ئێمەت لەم جێگەیەدا دانا کە بۆمان نەبێت بچینە پێشتر یان بێینە دواوە، یاخود ئەمە هەر بەڕای خۆتە کە لەجەنگ دا بیروڕاو تەکتیك وەبەر بنێیت)؟ لە وەڵام دا پێغەمبەر فەرمووی: (بەڵێ تەنیا بەڕای خۆمەو ئەوەش جەنگەو تەکتیك و بیروڕای تیادا وەبەردەنرێت). ئینجا (حباب) گوتی: {کەوابوو ئەی پێغەمبەری خودا ئەم جێگەیە شیاو نی یە بۆمان، خێرا هەڵیان سێنە تاکو بچینە نزیکترین سەرچاوەی ئاو لەسوپای دوژمنەوەو لەوێ جێگیربین و پاشان هەموو سەرچاوەو بیرەئاوەکانی تر کوێرکەینەوەو دایانپۆشین، دوای ئەمەش لەسەرئەم بیرە ئاوەی نزیکیان حەوزێك دروست کەین و پڕی کەین لەئاوو ئینجا دەست بکەین بەجەنگ و کوشتاریان، تاکو هەر ئێمە ئاو بخۆینەوەو ئەوان دەستیان نەکەوێت و نەخۆنەوە} . ئیتر پێغەمبەر بەبیستنی ئەو قسانە فەرمووی: {بەڕاستی بیروڕایەکی باشت دەربڕی} و خێرا ئەو ڕایەی (حباب)ی پەسندکردو کاری پێ کرد.

لێرەدا جێ ی خۆیەتی هەڵوێستەیەك بکەین لەئاست ئەو کردارە جوانەی پێغەمبەردا، کە بەدەم بیروڕای (حباب)ەوە چووەو لەمەدا وانەیەك دیاری بکەین دەربارەی ئەوەی دەبێت بیروڕا بەپێی ڕاوێژکردنی نێو خۆی موسڵمانان بێت و سەرکردەش هەردەم ئاتاجی بەڕاوێژی چاکی کەسانی خاوەن بیروڕای ڕاست هەیە. هەر لەبەر ئەمەشە خودا فەرمانی بەپێغەمبەری خۆی (محمد) کردووە کە ڕاوێژ لەگەڵ کەسانی وادا بکات، هەروەك پێی دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ﴾آل عمران/١٥٩.. لەلایەکی ترەوە بۆ سووربوونی موسڵمانان لەسەرساغی و سەلامەتی پێغەمبەرەکەیان، (سعد‌ـی کوڕی ـمعاذ) گوتبووی: }ئەی پێغەمبەری خودا با ئێمە کەپرێکت بۆ دروست بکەین تا لەژێر سایەی دا دانیشیت و وڵاخیشت بۆ سازبکەین و لەلای

خۆت بن، ئینجا خۆمان بچین بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی دوژمن. جا ئەگەر خودا بەهێزی کردین و سەری خستین بەسەر دوژمن دا ئەوە دیارە بەحەزو ئاواتی خۆمان دەگەین، خۆ ئەگەر بەپێچەوانەوەبوو ئەوا خێرا لەسەر وڵاخی خۆت بەو بگە بەوانەی، کە لەگەڵەکەمان بەجێمان هێشتوون، چونکە بێگومان چەندین کەس و گەلی تر لەدوای ئێمە هەن و زۆر لەئێمە زیاتر تۆیان خۆش دەوێت و گەر بشزانن تۆ تووشی جەنگ دەبیت دواناکەون لێت و خودا بەوان تۆ دەپارێزێت و ڕێ و شوێن و ڕاوێژت بۆ دادەنێن و جیهادیش لەگەڵتا دەکەن}...

پێغەمبەر زۆر سوپاسی ئەو ڕێزو تەقدیرەی کردو نزای چاکەی بۆکرد. ئینجا کەپرێك لەسەر گردێك بۆ پێغەمبەر دروست کرا تا لەوێوە سەرپەرشتی و سەرکردایەتی ی جەنگەکە بکات.

## خۆسازدان بۆ جەنگ

جا کاتێك موسڵمانان کۆبوونەوەو خۆیان سازدەکرد بۆ جەنگ، پێغەمبەری خودا هەستایە سەرڕیزو ڕیزەکانی بۆ ڕێك خستن و فەرمانی پێ کردن، کە یەکەم جار ئەمان دەست نەکەن بەهێرش بردن بۆ سەریان هەتا فەرمانیان پێ نەکات، خۆ ئەگەر ئەوان هێرشیان هێنا، خێرا تیربارانیان بکەن، هەروەها پێغەمبەر فەرمانی پێ کردن کە شمشێرەکانیان دەرنەهێنن هەتا دوژمنان دێن و پێ یان دەگەن. ئینجا گەڕایەوە بۆ ئەو کەپرەی کە بۆیان دروست کردبوو، تاکو لەوێوە سەرپەرشتی ی جەنگەکە بکات.

سوپای قوڕەیش سەر لەبەیانی لەدۆڵەکەوە هاتن و پێغەمبەریش هەر، کە بەدیی کردن ڕووی کردە قاپی ی بارەگای خوداو لێ ی پاڕایەوەو فەرمووی: {خودایە ئەوە گەلی قوڕەیشەو بەفیزو خۆ بەزل زانینەوە هاتوون و بەخۆیان دەنازن و دژایەتیی تۆدەکەن و پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخەنەوە... جا ئەی خودای پەروەردگار داوای ئەو سەرخستنەت لێ دەکەم کە بەڵێنت پێ داوم... خوایە هەر ئەم بەیانی یەی ئەمڕۆ لەناویان بەریت}.

پاشان پێغەمبەر ڕوانی ی بۆ هاوەڵانی کە ژمارەیان پتر لەسێ سەد کەس[1] دەبوو و ڕوانییشی بۆ کافران و موشریکان کە ژمارەیان هەزارکەس دەبوو و، ڕووی کردە (قبیلە)و فەرمووی: {خودایە ئەو سەرکەوتنەی بەڵێنت لەسەری پێ دابووم بۆم بەجێ بگەیەنە... خودایە

---

(١) لەدەقە عەرەبی یەکەدا ژمارەی موسڵمانان بە (ثلاثمائة و نیّف) هاتووە. وشەی (نیف)یش لەزمانی عەرەبیدا بەژمارەیەك دەڵێن کە لەدەیەك (عقد) زیاتربێت و لەنێوان (١-٣)دابێت، کەواتە ژمارەی موسڵمانان لە (٣١٠-٣١٤) کەس دا بووە. (وەرگێڕ)...

ئەگــەر ئــەم كۆمەڵــە كەســەی شــوێنكەوتوانی ئیــسلام لەناوچــن ئــیتر تــۆ لەســەر زەوی ناپەرسترێیت}.

پێغەمبــەر بــەردەوام نــزای دەكــردو داوای كۆمــەك و فریاكــەوتنی خــودای دەكــردو لێ ی دەپاڕایەوە هەتا كراسەكەی كەوتە خوارەوەو (ئەبوبەكر) بەدەستی خۆی بۆی هەڵگرتەوەو پێ ی گوت: {بەسە ئەی پێغەمبەری خودا، تۆ زۆر زۆرت لەخودا داواكردووە}.

هەندێك لەو ئایەتانەی دەربارەی ئەم نزایەو لەدوای داوای فریاگوزاریی ی خــوداوە هاتوونــە خوارەوە، ئەم ئایەتە بوو كەخودا تیای دا فەرموویە:

﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾الأنفال/٩.. واتە: {كاتێك داوای كۆمەك و فریاگوزارییتان لەپەروەردگارتان دەكردو خوداش وەڵامی داواكاری یەكانی دانەوە كەوا هەزار مەلائیكەتتان فریادەخەم، كە دەستە دەستە دێن و لەپێش سوپای موسڵمانانەوەن و ترس و بیم دەخەنە دەروونی دوژمنانەوە}.

پاشــان پێغەمبــەری خــودا لــەژێر كەپرەكــە دەرچــوو و بــەبازدان و قەڵــەمباز دەرۆشــت و قەڵغانەكەی بەدەستەوە گرتبوو و ئەم ئایەتانەی دەخوێندەوە كە خودا تیایــان دا دەفــەرموێت:

﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴾ القمر/٤٥-٤٦..

واتە: {بێگومان ئەو بێ باوەڕو موشریكانە دەبەزن و ڕادەكەن و پشت هەڵدەكەن، بــەڵام (ڕۆژی دوایی) وادەی ئەوانە، كەسزای سەخت ترو گەورەتر دەدرێن، سزای تاڵتر دەدرێن كە زۆر تونــدو كاریگەرترە لەو سزایەی تێشكان و بەزینی دنیایان}.

## سەركەوتنی موسڵمانان

سەرەتای جەنگەكە بەزۆرانبازی یەكی نێوان شەش كەسی هەردوولا دەستی پــێ كــرد، كــە هەرسێ جەنگاوەرە دەسنیشان كراوەكەی قورەیشی تێداكوژراو پاشــان ســوپای هــەردوولا پێــك گەیشتن و شەڕوكوشتار بەرپابوو، لەو ساتانەدا پێغەمبەری خودا زیاتر بڕواداراانی بۆ جــەنگ و ڕوو بە ڕوو بوونەوە هان دەداو دەیفەرموو: {دەسا بەوەی گیانی (محمد)ی بەدەستە هەر پیاوێــك لەئێوە كوشتاری ئەوان بكات و بەئارامیو بــاوەڕ بەپاداشــت و ڕەوایــی یەكەیــەوە بجــەنگێت و بكوژرێت كەڕووی لەوان بوویێت و پشتی تێ نەكردبن ئەوا بێ هــیچ گومانێــك خــودا دەیخاتــە بەهەشتەوە}...

یەکێك لەو بڕوادارانەی کە ئەم وشانەی دەبیست (عمیر—ی کوڕی —الحمام) بوو، کـە چـەند دەنکە خورمایەکی لەچنگ دابوو و خەریکی خواردنیان بوو و بەلاَم گوتی: }ئـای ئـای ئـەرێ بەڕاست نێوانی من و چوونە بەهەشتم تـەنها ئـەو کاتەیـە، کـە ئەوانـە دەمکـوژن}.. (واتـە خواردنی ئەو چەند دەنکە خورمایە لەلای ئەو ژیانێکی درێژ دەبوو)، هـەر بۆیـە خێـرا دەنکـە خورماکان فڕێ دەدات و شمشێرەکەی دەگرێتـە دەسـت و کوشـتاری دوژمنـان دەکـات، تـاکو دەکوژرێت.

ئەوەی جێ ی ئاماژە بۆ کـردنیش بێـت ئەوەیـە پێغەمبـەری خـودا خۆیـشی بەشـداری ی کوشتارەکەی کردووە، هەروەك (علی) (خودا لیّ ی رازی بێت) لەو بارەیـەوە گێڕاویێتـی یـەوەو گوتوویە: {ئێمە لەو ڕۆژەی—جەنگی بەدر—دا خۆمان دابووە پاڵ پێغەمبەری خودا کەنزیکترین کەس بوو لەدوژمنەوە، هەروەها ئازاترین و بەزەبرترین کەسیش بوو لەجەنگ دا} ...

جا کاتێك ئاگری جەنگ زیاتر کلّپەی دەسەند پێغەمبەری خودا چنگێك خۆلّی هـەلگرت و ڕووی کردە قوڕەیش و فەرمووی: (ڕوویان ڕەش بێـت)، پاشـان چـنگە خۆڵەکـەی بـەڕوویان دا هەڵداو فەرمانی هێرش بردنی بەهاوەلاّنی کردو ئەوانیش هەلّمـەتی شـێرانەیان کردەسـەریان و لەئەنجام دا قوڕەیش بەزین و چەندین کـەس لەگـەورەپیاوان و جـەنگاوەرە بەجەربەزەکانیـشیان کوژران و چەندانی تر لەپیاو مـاقووڵ و کەسـەدیارەکانیان لیّ بـەدیل گـیران... لـەبارەی ئـەو جەنگە بێوێنەو نابەرابەرەوە چەندین ئایەت هاتوونە خوارەوە، کەباسی حەقیقـەتی جەنگەکـەو کۆمەکی خودای پەروەردگار دەکەن، وەك ئەو ئایەتەی، کەخودا تیای دا دەفەرموێت:

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ﴾الأنفال/١٧.

دوای تەواوبوونی جەنگەکە پێغەمبەری خودا فەرمانی دا، کە کوژراوانی دوژمن فڕێدرێنە ناو بیرەوە، ئەوانیش فڕێ یان دانە نێو بیرەکەوەو پێغەمبەریش لەسەر تەرمەکانیان وەستاو لەو کاتەدا هاوەلاّنی گوێیان لێگرتبوو کە لەتاریکایی نیوەشەودا دەیفەرموو: {ئەی خەلکی نێـو بیرەکە... ئەی — (عتبە—ی کوڕی —ربیعە)و (ئەی ئەبو جەهل)و... (ناوی هەموو کـوژراوانی نێو بیرەکەی هێناو) پیّ ی دەفەرموون: ئەرێ ئێوە دیتان خودا ئەوەی بەلێنی لەسەر پێ دابوون چۆن بەجێی هێنا؟، بێگومان منیش دیتم ئەوەی، کەخودا بەڕاستی بەلێنی لەسەر پێ دابـووم بەجێی گەیاند..} ...

لەو کاتەدا موسـلّمانان بـە پێغەمبـەریان گـوت:{ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئایـا لەگـەڵ کەسانێکدا دەدوێیت، کە تەرمـەکانیان وشـك بوونەتـەوە؟} ، ئـەویش لـەوەلاّم دا فـەرمووی:

{ئەوانیش وەك ئێوە گوێ یان لێمەو لەئێوە باشتر دەزانن چی یـان پـێ دەڵـێم، بـەڵام نـاتوانن وەڵامم بدەنەوە} .

ژمارەی کوژراوانی قورەیش گەیشتبووە حەفتا کەس و حەفتا کەسی دیکەشـیان لێ بـەدیل گیرابوو، جگە لەوەی موسڵمانان دەسکەوتێکی هێجگار فرەی ماددییـشیان چـنگ کـەوتبوو. بەڵام ژمارەی کوژراوانی موسڵمانان تەنها چواردە پیاوی خۆبەختکار بوو.

خودا باسی ئەو سەرکەوتنەو ئەم نیعمەتە دەگمەنەی بۆ موسڵمانان کردووەو پێی فەرموون: ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ﴾آلعمران/١٢٣.. واتە: (بێگومان ئێوە لەبیرتان بێت چـۆن خودا لەجەنگی بەدردا سەری خستن لەکاتێك دا ئێوە بێهێزو کەم ژمـارەو کـەم چـەك و تفـاق بوون{ .

بۆ ئـازادکردنی دیلـەکان قـورەیش هەنـدێکیانی بـە (فدیـە)ی پارەومـاڵ ئـازادکردو لـە موسڵمانانیان وەرگرتنەوە، هەندێکی تریش لەو دیلانەی کە پارەوماڵیان نەبوو، تا خۆیانی پـێ ئازادکەن و بەڵام خوێندن و نووسینیان دەزانی (واتـە: کـە خوێنـدەواربوون) ئـەوا لەبەرامبـەر ئازادبوونیان دا دەبوایە هەریەکەیان دە منداڵ لەمنداڵانی (مەدینە) فێـری خوێنـدن و نووسـین بکەن. ئەمەش (فیدیە)کەی بوو.

لە مەشەوە ئەوە بەچاکی ڕوون دەبێتەوە کە (محمـد)ی پێغەمبـەری خـودا یەکـەمین کـەس بـووە، کـە نەخوێنـدەواریی ی قەڵاچـۆکردووەو هـەوڵی تـەواوی بـۆ بڵاوکردنـەوەی زانـست و خوێندەواری داوە.

ئەمەی پێشوو پوختەیەك بوو لەباسی جەنگی (بەدر)، سـەبارەت بـەدیاری کردنـی پەنـدو دەرسەکانی ئەم جەنگەش (ان شاءالله) لەبەندی (پەندو وانەکان)دا باسیان لێوەدەکەین.

# بەندی دووەم

## (( جەنگی - ئوحود - ))

( هەوڵی قورەیش بۆ تۆڵەسەندنەوە لەموسڵمانان - گەڕانەوەی دووڕووەکان - ڕاسپاردەکەی پێغەمبەری خودا - سەرکەوتنی موسڵمانان لەسەرەتای جەنگەکەدا - تێشکانی دوای سەرکەوتن - بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر - موسڵمانان ڕیزەکانیان ڕێك دەخەنەوە - موسڵمانان کوژراوەکانیان کۆدەکەنەوە - چەند وێنەیەکی پاڵەوانێتی و قوربانی دان - بەتین کردنەوەی ورەی موسڵمانان - قسەوباسی مردن )

### هەوڵی قورەیش بۆ تۆڵەسەندنەوە لەموسڵمانان

کافرانی قورەیش ئارامیان لێ هەڵگیرابوو بەهۆی ئەو بەزینە سەخت و ڕیسوابوونەی لەجەنگی —بەدر—دا تووشیان ببوو، چونکە پەڵەیەکی شەرمەزاری و حەیاچوونی وەهایان بەناوچەوانەوە نرابوو کە هەوڵیان دەدا تەنها بەسەرکەوتنێکی گەورە ئەو پەڵە ڕەشە لەخۆیان کەنەوە، واتە: جەنگێکی تر هەڵگیرسێنن و تیای دا تۆڵە لەموسڵمانەکان بسێننەوە.

بۆ ئەم مەبەستەش دەستیان کردەوە بەخۆسازدان و ئامادەکردنی چەك و تفاق و ناردنی نوێنەرانیان بۆلای هۆزوتیرە بێ باوەڕەکانی تری عەرەب و بانگ کردن و کۆکردنەوەیان بۆ جەنگ. دیارە چەندین کۆمەڵ لەهۆزە بێباوەڕەکانی عەرەب بەدەم بانگەشەکەیانەوە چوون. هەروەها قورەیش بۆ مەیسەرکردنی خەرجی و مەسرووفاتی ئەو جەنگە هەموو قازانجەکانی ئەو کاروانە بازرگانی یەی کە (ابو سوفیان) لەپێش جەنگی (بەدر)دا هێنابوویەوە تەرخان کرد بۆ جەنگی داهاتوویان.

بێ باوەڕان بەو شێوەیە توانییان سێ هەزار کەس لەژێر سەرکردایەتی ی (ئەبو سوفیان)دا کۆبکەنەوە. کاتێك ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر گەیشت، ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵانی دا کرد لەسەرئەوەی ئایا بۆ مەبەستی بەرپەرچ دانەوەی هەر هێرشێکی تازە لە —مەدینە—دا بمێننەوە یاخود لەشار دەرچن و لەدەرەوەی شار بەرەنگاریان ببنەوە ؟ بیروڕای (پێغەمبەر خۆی) لەو بارەیەوە ئەوەبوو کە لەشاردا بمێننەوەو خۆیانی تیا قایم کەن تاکو ئەگەر کافران هێرشیان هێنا پیاوانی موسڵمانان تیربارانیان کەن و ژنان و منداڵانیشیان لەسەربانەکانەوە بەردبارانیان بکەن.

بەلاّم ئەو پیاوە موسلّمانانەی کە پێشتر ئامادەی جەنگی (بەدر) نەبووبوون (بەتایبەتیش گەنجەکانیان) زۆر زۆر حەزیان لەچوونە دەرەوەی شاردەکردو سووربوون لەسەر ئەو رایە. ئەو پیاوانەش، کە پێشتر بەشداریی ی جەنگی (بەدر)یان کردبوو پشتگیریی ئەو رایەی لاوەکانیان کرد تاکو لای خەلّکی بەترسنۆك دانەنرێن. پێغەمبەریش لەدوایی‌دا ئەو بیروڕایەی ئەوانی پەسندکردو بڕیاری دەرچوون لەشاریان دا.

ئینجا پێغەمبەر نوێژی (جمعە)ی لەگەلّ داکردن و لەوتارێکی‌دا پەندو ئامۆژگاریی بەگوێیان دا دایەوەو فەرمانی پێ کردن لەسەر ئارام گرتن و خۆڕاگرتن لەبەرامبەر هەر ئەرکێکی گران و نارەحەت دا.

دوای نوێژ داوای کرد قەلّغان و چەکی خۆی بۆ بێنن و فەرمانیشی بە بانگدان(آذان) کرد بۆ دەرچوون لە شارو بەرەو ڕووبوونەوەی دوژمن. لەکاتێك دا هەندێك لەپیاوانی موسلّمانان بینییان وا خەلّکی ئامادەی دەرچوونن بۆ جەنگ لەنێوخۆیان دا بەیەکتریان گوت: (ئەریّ باشە خۆ پێغەمبەری خودا فەرمانی پێ دەدایەن کە لەشاردا بمێنینەوەو بێگومان هەر خۆیشی لە کاروبار و خواستی خودا ئاگادارەو، هەر خۆیشی لەئاسمانەوە سرووشی بۆدێت. خۆزگە بگەڕاینایەوەو خۆمان لەمەدا سەرپشك کردایە).. ئینجا هەر ئەم پیاوانە بەپێغەمبەریان گوت: {ئەی پێغەمبەری خودا با لەمەدینەدا بمێنینەوە وەك چۆن یەکەم جار فەرمانت بەوە پێکردین}، بەلاّم پێغەمبەر لەوەلاّمیان دا فەرمووی: {هیچ پێغەمبەرێك بۆی نی یە کاتێك گەلەکەی بۆ جەنگ هان دەدات و ڕێگەی دەرچوونی بۆ ڕووبەڕوونەوەی دوژمن پێ‌دابن، بۆی نیە بگەڕێتەوەو بیانگێڕێتەوە بۆ ناوشار تا لەوێ جەنگ لەگەلّ دوژمن دابکەن، ڕاستە کەمن پێشتر ئەو قسەیەم بۆکردن و ڕام وابوو لەنێو شاردا بمێننەوە، بەلاّم ئێوە هەر حەزتان لەچوونە دەرەوەی شاربوو، جا ئێستاش دەبێت لەخودا بترسن و تەقواو پارێزکاریتان هەبێت و بەئارام بن لەکاتی شەڕوکوشتاری دوژمن داو، چاوەڕێ ی فەرمانی تری خودابن و بزانن چ فەرمانێك دەنێرێت و پەیڕەویی ی لێ بکەن و پابەندبن پێوەی}.

## گەڕانەوەی دووڕووەکان

پێغەمبەر لەگەلّ هەزار کەس لەهاوەلاّنی دا لەشار دەرچوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی کافران. بەلاّم هێشتا هەر بەڕێوەبوون کە گەورەی دووڕووەکان (عبداللە‌ی کوری أُبي) بەخۆی و سێ سەد کەس لەوانەی لەسەر هەمان تەرزو داب و نەریتی بوون گەڕانەوەو، لەو ڕۆشتنەو لەجیهادەکە پاشگەزبوونەوە. لەو کاتەدا یەکێك لەموسلّمانەکان بانگی کردن و پێ ی گوتن:

{گەلۆ ئایا خودا ڕاینەسپاردوون بەوەی نابێت گەلەکەتان و پێغەمبەرەکەتان لاوازو بێ هێز بکەن کاتێك دوژمن بەرەو ڕووتان دەبێتەوە؟} ئەوانیش لەوەڵامی ئەو موسڵمانەدا گوتیان: {گەر بمانزانیایە ئێوە شەڕو کوشتار دەکەن جڵەوی خۆمان نەدەدایە دەست ئێوە. لەو باوەڕەش داین کەهیچ شەڕو جەنگێك بەرپانابێت}. ئیتر کارەکەیان زۆر بەگران دەزانی‌و تەنها ڕێگەی گەڕانەوەیان هەڵبژارد. ئەو موسڵمانەش پێ ی گوتن {خودا دوژمنانی خۆیتان لێ بەدوور بگرێت و پلەی جیهادو ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی خواتان پێ نەبەخشێت. بەڕاستی خودا هیچ ئاتاجێکی بەئێوەومانان نی یە}...

خودا خۆیشی دەربارەی ئەو دووڕوانە فەرموویە: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾آلعمران/١٦٧... واتە: {دەبا چاك بزانن ئەوانەی کاتێك پێ یان گوترا (وەرن لەگەڵ ئێمەدا کوشتاری موشریك و کافران بکەن و لەپێناوی خوادا بجەنگن و بەرگری لە خۆتان بکەن گەر تەنها بەو جودی خۆیشتان بێت وەك چۆن ئێمە بەرگری لە خۆمان دەکەین، یاخود لەگەڵمان دا بمێننەوە تەنها بۆ ئەوەی زۆر دیاربین و بەسوپایەکی ژمارە زۆرەوە ببینرێین و دوژمن لێمان بترسێت، بەڵام کوشتاریش مەکەن و بەشداریی جەنگیش مەبن)، کەچی ئەوان تاکە وەڵامێکیان ئەوەبوو، کە گوتیان: (گەر بەڕاستی بمانزانیایە ئێوە بەتەمای جەنگن و- یاخود ئەم جەنگە ڕووکارێکی حەقی تێدایە- یان چاك ڕێك نەخراوە، ئەوا بەشداریمان دەکردن. بەڵام دەشێت لە نێوان ئێوەو موشریکان دا جەنگیش نەقەومێت) جا ئەوان بەم وەڵامەیان با چاك بزانن کە دووڕوویی ی خۆیان دەرخست و نزیکی ی خۆیان لەکافرانەوە دەرکەوت زیاتر لەوەی نزیك لەموسڵمانان بن، بەڵکو دوژمنی موسڵمانانن. ئەوەی بەدەم دەیانگوت لەوەوپێش، پێچەوانەی نیازی ناودڵیان بوو. خوداش هەر خۆی دەزانێت و ئاگادارە کەچی لە دڵیان دایە}.

لەو کاتەدا دوو کۆمەڵ لەموسڵمانان لەوانەی تازە هاتبوونە نێو ئایینی ئیسلامەوە، بە دیتنی ئەو ڕەفتارە نامەردانەیەی(عبداللە-ی کوڕی-أُبی)و تاقمەکەی، تووشی جۆرە ترس و گومانێك بوون و خەریك بوو هەمان ڕەفتاری ئەوان بنوێنن و دوایان کەون، بەڵام خودا پاراستنی لەوەو لەسەر خواستی ڕاست جێگیری کردن و دەربارەشیان فەرموویەتی:﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ آلعمران/١٢٢..

بەم ڕەنگەش پێغەمبەری خودا بەحەوت سەد کەس لەهاوەڵانی یەوە خۆی سازکرد بۆ جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەی سێ هەزار کەس لەدوژمنان.

## ڕاسپاردەکەی پێغەمبەری خودا

موسڵمانان بەڕێوە بوون تا گەیشتنە یەکێك لەقەدپاڵەکانی چیای "ئوحود" کە چیایەکەو دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی (یەسریب)ەوەو پشتیان لەچیاکەبوو کاتێك لێ ی دانیشتن، لەوێدا پێغەمبەری خودا پێ ی فەرموون: {هیچ کەسێك دەست بەجەنگ نەکات هەتا فەرمانی پێ دەکەم}.

بێباوەڕانیش لەنێو دۆڵەکەدا مۆڵین و چەندەها ئافرەتیشیان لەگەڵ دابوو تاکو زیاتر هانیان دەن لەسەر کوشتار، دووسەد ئەسپیشیان پێ بوو، تا لەجەنگدا بەکاری بێنن. لای ڕاستی ئەسپەکان بە (خالد-ی کوڕی -ولید) سپێررابوو (کە ئەو هێشتا موسڵمان نەبووبوو)و لای چەپیشی بە (عکرمە-ی کوڕی -أبو جهل) سپێررابوو.

پێغەمبەری خودا جەنگاوەرە تیرهاوێژەکانی خۆی بانگ کرد، (کە ژمارەیان پەنجا تیر هاوێژ بوو)و داوای لێ کردن، کە لە پشت سوپاکە و لە سەر قەدپاڵی چیاکە بمێننەوە و فەرمانیشی پێ دان، کە لەهیچ حاڵەتێك دا شوێنی خۆیان چۆڵ نەکەن، سا ئیتر گەر سەرکەوتووش بووبن یان تێشکابن. ئینجا (عبدالله-ی کوڕی -جبیر)ی کرد بە فەرماندەیان (بەئەمیریان).

دوای ئەمە پێغەمبەری سەرکردەی دانا بۆ خولقاندنی پێشبڕکێ لەسەر پاڵەوانێتی لەنێوان جەنگاوەرەکانی دا شمشێرێکی بەدەستەوەگرت و ڕووی گفتاریشی کردە هاوەڵان و فەرمووی: {کێ ئەم شمشێرە دەگرێت و مافی تەواوی خۆی پێ دەدات}؟ (واتە کێ لەچاك بەکارهێنانی دا هەقی شیاوی خۆی ڕەچاودەکات).. چەندین کەس هەستان و بەڵام لێ ی دەگرتنەوە هەتا نۆرە گەیشتە سەر (أبو دُجانة)و گوتی: (مافی تەواوی ئەم شمشێرە چی یە ئەی پێغەمبەری خودا؟)، فەرمووی: (ئەوەیە هێندەی لەدوژمن پێ بدەیت تاکو خواردەبێتەوە).

(ابو دجانە) کە بەناوی (سماك-ی کوڕی -خرشە)ش ناسرابوو پیاوێکی زۆر ئازاو چاونەترس بوو و پەڕۆیەکی سووری لەسەر دەبەست و هەر کاتێك ئەو پەڕۆیەی بەسەرەوە بوایە خەڵکی دەیانزانی کەوا ئیتر بەرەو کوشتار دەچێت.

(ابو دجانە) دوای وەڵامەکەی پێغەمبەر شمشێرەکەی بەدەستەوەگرت و پەڕۆسوورەکەی (کە بە -پەڕۆی مردن) ناودەبرا دەرهێناو توند لەسەری خۆیی شەتەك داو بەنێو هەردوو ڕیزەکەدا بەفیزو بەخۆنازینەوە هەنگاوی دەناو خوونەریتیشی هەر وابوو کە لەکاتی جەنگ دا بەو فیزو بەخۆنازینەوە بڕوات.

کاتێك پێغەمبەر دیتی (ئەبو دوجانە) بەو شێوەیە دەڕوات، فەرمووی: {ئەم چەشنە ڕۆیشتنە خودا ڕقی لێدەبێتەوە، تەنها لەم جۆرە جێگەیەدا نەبێت}.

# سەرکەوتنی موسڵمانان لەسەرەتای جەنگەکەدا

هەردوو سوپاکە پێك گەیشتن و موسڵمانان زۆر بەگوڕبوون لەشەڕداو لەلوتکەی قارەمانێتی و ئازایەتی دا بوون. (ابو دجانە)ش وەك جەنگاوەرێکی هەڵکەوتوو لەشەڕدا دیاربوو و بەهەر کەسێك لەبێ باوەڕان بگەشتایە خێرا دەیکوشت. هەروەها (حەمزە)ی مامی پێغەمبەریش لەجەنگەکەدا ڕۆڵێکی پاڵەوانێتی ی گەورەی دەبینی و دوو کەسیشی لەهەڵگرانی بەیداخی کافران کوشت جگە لەکوشتنی چەندان کەسی تریان.

لەو جەنگەدا کۆیلەیەکی (حەبەشی) کەناوی (وەحشی) بوو دانرابوو بۆ چاودێری کردنی وردی (حەمزە)، تاکو بیکوژێت. چونکە ئەو عەبدە (واتە — وەحشی) زۆر شارەزابوو لە ڕم هاویشتن داو کەم جار هەبوو هەڵەبکات لەو کارەی داو نیشان نەپێکێت. خاوەنەکەشی بەڵێنی ئەوەی پێ دابوو گەر بتوانێت (حەمزە) بکوژێت ئەوا ئازادی کات و سەربەست بێت و چی تر بەندەو کۆیلەی ئەو نەبێت.

دیارە خاوەنەکەی ئەو عەبدە کە (هیند)ی ژنی (ئەبو سوفیان) بوو دەیویست بەوە تۆڵەی براوباوك و کەس وکارەکانیتری بکاتەوە کە لەجەنگی (بەدر)دا کوژرابوون. (وەحشی) ئەو کارەی بۆ ئەنجام داو بەرمەکەی خۆی —حەمزە—ی پێکاو کوشتیو کەوتە سەرزەوی.

هەڵگری بەیداخی موسڵمانانیش (مصعب—ی کوڕی —عمَیر) بوو کە دەجەنگا هەتا کوژرا. ئینجا پێغەمبەری خودا بەیداخی دایە دەست (علی—ی کوڕی —ابو طالب)و پێ ی فەرموو: (بەیداخەکە ببە بۆ پێشەوە)، ئەویش چووە پێشەوەو دەیگوت: {من ئەو کەسەم کە هەموو شتێك تێك دەشکێنم} .

لەو کاتەدا (ابو سعد—ی کوڕی —ابو طلحة) کە هەڵگری بەیداخی بێباوەڕان بوو بە (علی)ی گوت: {ئەرێ ئەی تێك شکێنەر ئایا دەتوانیت بەرەو ڕووی من بیتەوە لە زۆرانبازییەك دا} ؟ (علی)یش گوتی: (بەڵێ). ئینجا هەردوکیان لەنێوان ڕیزی هەردوولادا کەوتنە زۆرانبازیو شەڕەشمشێرو ماوەیەکی خایاندو لەدوایی دا لەپشتەوە لەیەکیان دەدا تا (علی) لەئەنجام دا هەڵیکوتایە سەریو لێ ی داو کوشتی.

دوای ئەمە هێزی سوارەی بێباوەڕان چەندین جار هێرشیان بردەسەر موسڵمانان و هەموو جارێکیش دەشکانەوە بەهۆی ئەو هەموو تیرەوەی کە ئاڕاستەیان دەکرا.

پاشان پیادەی هەردوولا پێك گەیشتن و شەڕو کوشتار بەخەستی دەستی پێکردو ئافرەتانی قورەیشیش سروودی بەجۆش و حەماسەت خولقێنیان دەچڕی و هانی پیاوە گومڕاو موشریکەکانیان دەدا، بەڵام هەموو ئەو سروودو بەیت و بالۆرانەیان سوودێکی نەبوو بۆیان، چونکە موسڵمانان سەرەڕای کەمی ی ژمارەشیان بەوپەڕی جوامێری و نەبەردی یەوە ئارامیان گرتبوو و هێندەی نەبرد کە کافران هەستیان بەتێشکان و لاوازی دەکرد، بۆیە خێرا پاشەکشەیان کردو ئافرەتەکانیشیان هاواری وەیل و سەرگەردانییان بۆ دەکێشان.
موسڵمانەکانیش دوایان کەوتن بۆ کۆکردنەوەی دەسکەوت و کەرەسە جەنگی یەکانیان.

## تێشکانی دوای سەرکەوتن

کاتێك ئەو (جەنگاوەرە تیرهاوێژانەی، کە پێغەمبەر لەسەر قەدپاڵی چیاکە دایناپوون بۆ پاراستنی موسڵمانان لەپشتەوە) دیتیان ئەوا حاڵەتەکەیان بەرەو سەرکەوتن دەچێت و کافران لەبەزین و پاشەکشێدان حەزیان کرد دابەزن و ئەو بەرزاییی یانە بەجێ بێڵن، بەڵام فەرماندەکەیان (واتە، عبداللە-ی کوڕی -جبیر) پێ ی گوتن: (ئەم کارەتان سەرپێچی یە لەفەرمانی پێغەمبەر). کەچی هەر سووربوون لەسەر ئەو کارەو زۆربەیان هاتنەخوارەوە بۆ چنینەوەی دەسکەوتەکان تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێت، کە لە شوێنی خۆیان جێگیربوون و لەسەر چیاکەمانەوە.

لەو ساتەش دا (خالد-ی کوڕی -وەلید) هەستی بەنەمانی ئەو تەگەرەیەی بەردەمیان کردو ئیتر هەر، کە دیتی ی ئەوا سەرچیاکەو دامێنی چۆڵ کراوە خێرا هێرشی بردەسەر چیاکەو ئەو چەند کەسەشی کوشت کە لەسەری مابوون و ئینجا لەپشتەوە پەلاماری موسڵمانەکانی دا، موسڵمانەکانیش کاتێك ئەو حاڵەتە نائاسایی یەیان دی تووشی نیگەرانیو پەشۆکان بوون و هەر دەسکەوتێکیان هەڵگرتبوو فڕێ یان داو ڕیزەکانیان تێك چوو و تەنانەت وایان لێهات هەندێکیان لەیەکتریان دەدا.

ئەو هاوەڵانەش کە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون لێك دابڕان و هەندێکیان بەرەو (مەدینە) گەڕانەوەو چەند کەسێکیشیان بەرەو سەرچیاکەو لای گاشەبەردەکە دەڕۆشتن.

پێغەمبەری خوداش لەو چرکەساتە ناسکانەدا بانگی موسڵمانەکانی دەکردو هاواری دەکرد: {هۆ بەندەکانی خودا وەرنەوە تەنیشت من.. وەرن لەگەڵ من دابن}. چەند کەسێك لەبەرگری کارانی لەدەوری خڕبوونەوەو یەکێك لەوان (ابو طلحة-ی -أنصاری) بوو کە پاڵەوانێکی کەم وێنەبوو و بەدەسڕاست و نیشانپێك ناسرابوو، لەو جەنگەش دا دووکەوان یان

سیانی شکاندبوو و پارێزگاریی لە پێغەمبەری خوداش دەکرد، لەو ساتەدا بەپێغەمبەری گوت: {ئەی پێغەمبەری خودا باوك ودایکم بەفیدات بن.. دەسا بەخودا ئەمڕۆ ناهێڵم هیچ ئازایەك بتپێکێت. گەردنی خۆم لەجیاتی گەردنی تۆ دادەنێم و خۆم بەفیدات دەکەم}.

یەکێکی تر لەوانەی دەوری پێغەمبەری خودایان دابوو(سعد—ی کوڕی —ابو وقاص) بوو، کە بەپێغەمبەری دەگوت:(سەعد لەپێناوتا خۆی لەناودەبات و باوکم و دایکیشم فیدات بن)...

هەروەها یەکێکی تر لەو ئازاو بەجەرگانە (سهل—ی کوڕی —حنیف) بوو، کە لەتیرهاوێژە ناودارەکان بوو و هێندەی تیر گرتە کافران تاکو لەپێغەمبەری دوورخستنەوە.

یەکێکی تریش لەوان (ابو دجانە—ی—أنصاری) بوو، کە خۆی کردبووە قەڵغانێك بۆ پێغەمبەرو خۆی بەسەردا چەماندبووەوەو هەرچی تیرێکیش دەهات بەرپشتی ئەو دەکەوت هەتا وای لێهات تیرێکی زۆر بەپشتیەوەبوو.

(زیاد—ی کوڕی—حارث)یش یەکێك بوو لەوانەی بەرگریی ی لەپێغەمبەر دەکردو لەو مەوقیعەدا مایەوە هەتا کوژرا.

هەر لەو ساتانەدا یەکێك لەکافران کە (أُبَيّ—ی کوڕی —خلف) بوو بەرەو لای پێغەمبەر هەڵمەتی هێناو ویستی بیکوژێت، جا هەر کە لێی نزیك بووەوە خێرا پێغەمبەر ڕمێکی تێ گرت و بووە هۆی لەناوچوونی.

بێگومان لەو کاتەدا پێغەمبەر خۆی برینداریش ببوو بەهۆی بەردێکەوە، کە کەوتبوو بەسەریاو کاکیلەیەکی دانەکانی شکاندبوو و ناوچەوانیشی ڕووشابوو و لێویشی زامداربوو و خوێن بەگۆنای دا دەهاتە خوارەوە، هەر لەو کاتەدا دەیفەرموو: {چۆن گەلێك ئاسوودەو ئازاد دەبن کە ئاوا لەپێغەمبەرەکەیان بکەن لەکاتێك دا ئەو بانگیان دەکات بۆ سەر ڕێگای ڕاستی خودا}...

لەو بارەیەشەوە خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، کە تیای دا فەرموویە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾آل عمران/١٢٨.. واتە: {بۆت نی یە داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت و هەوڵی ڕاست کردنەوەی کاروباری تایبەتی ی قیامەتیان بدەیت، بەڵکو ئەوە بەخواستی خودا خۆیەتی و گەر بیەوێت تۆبەیان لێ وەردەگرێت یاخود سزایان دەدات، بێگومان ئەوانیش ستەمکارن}.

هەروەها پێغەمبەر کەوتە چاڵێکیشەوە لەو چاڵانەی کە (ابو عامر)ی —ڕاهیب— هەڵی کەندبوون بۆ ئەوەی موسڵمانانیان تێبکەوێت لەکاتی بێئاگاییان دا. (عەلی)ی کوڕی (ئەبو

تالیب) چوو بۆ دەرهێنانەوەیو دەستی پێغەمبەری گرت و (طلحة)ش بەرزی کردەوە تاکو سەرپێکەوتەوەو هاتەوە دەرەوە.

بەم ڕەنگە دوای سەرکەوتنی سەرەتای جەنگ تێشکان.

خوداش لەقورئان دا ئاماژەی بۆ ئەو تێشکانەی ئەوان کرد، کە بەهۆی ئیختیلافی نێو خۆی موسڵمانەکان و سەرپێچی کردنیان لەفەرمانی پێغەمبەرەکەیان و حەزکردنی هەندێکیان لەدەسکەوتەکانەوە بوو. هەروەك فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم (١) بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ (٢) مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ (٣) لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾آلعمران/١٥٢..

هەروەها خودا وەسفی هەڵاتنیان لەجەنگەکەو دوچاربوونیان بەو کارەساتە بەم چەشنە دەکات کە دەفەرمویت: ﴿ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾آلعمران/١٥٣..

واتە: {کاتێك بەپانایی زەوی دا دەڕۆشتن و لەشەڕ هەڵدەهاتن و وەها تێشکابوون، کە لاتان بەلای یەکێك دا نەدەکردەوە لەوانەی خۆڕاگرو دلێربوون و یارمەتی یەکتان نەدەدان، پێغەمبەریش لەپشتتانەوە بانگی دەکردن تاکو بگەڕێنەوە، کە ئەو ڕووی لەدوژمنان بوو و داوای بەرەو ڕووبونەوەی دوژمنانی لێ دەکردن، بەڵام خودا خەفەتی تێشکانی پێگەیاندن وەك چۆن ئێوە خەفەتی زۆرتان بەپێغەمبەر گەیاندبوو بەهۆی سەرپێچی کردنی فەرمانەکەیەوە، خوداخەفەتی تێشکان و لەدەست چوونی دەسکەوتەکانی پێگەیاندن و خەفەت و ئازاری برینداری و کوژرانی پێ گەیاندن... خوداش هەر خۆی شارەزاو ئاگاداری کردارو نەریتتانە...}.

---

(١) تحسونهم: واتە (دەتانکوشتن).

(٢) أراكم ما تحبون: واتە: (ئەوەی پیشان دان کەپێتان خۆش بوو.. کە بەزینی کافران بوو..).

(٣) ثم صرفكم عنهم: واتە(پاشان ڕووی ئێوەی لەکوشتاری ئەوان لادا بەهۆی حەزکردنتان لەدەسکەوتەکان و تا ئەو بەزینەتان تووش بوو).

## بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر

پاشان هەر لەگەرمەی شەڕو کوشتاردا ئەو هەواڵە لەنێو موسڵمانەکان دا بڵاوبووەوە گوایە پێغەمبەر کوژراوە، بەم هۆیەشەوە چەند موسڵمانێك چەکیان فڕێ داو هەندێکی تریشیان گوتیان: {خۆزگە کەسێکمان بناردایە بۆلای (عبداللە‌ی کوڕی –أُبَيّ) تاکو متمانەو سەلامەتی ی لە (ئەبو سوفیان)ەوە بۆ مسۆگەر کردینایە}.

(أنس–ی کوڕی –نضر)یش ڕەخنەی لێ گرتن و گوتی: {خودایە من داوای لێبوردنت لێ دەکەم لەسەر هەڵوێستی ئەم هاوەڵانەو خۆیشم بەدوور دەگرم و پەنات بۆ دێنم لەکاری ئەو کافرانە}... ئینجا (أنس) ڕووی کردە ئەوانەی لەچوار دەوری بوون و پێ ی گوتن: {دوای پێغەمبەر ژیانتان بۆ چی یە ؟ دە هەستن و خۆتان بەکوشت دەن لەسەر ئەو ڕێبازەی کە ئەو خۆی لەپێناودادانا}...ئینجا شمشێرەکەی بەدەستەوەگرت و کەوتەوە شەڕو کوشتاری کافران و وازی لێ نەهێنان هەتا کوژرا.

دوای تەواوبوونی جەنگ دیتیان، کە ئەم هاوەڵە قارەمانە پتر لەهەشتا زامی پێوەیەو هەندێکیان بەهۆی شمشێرەوە یان بەرِم بەری‌کەوتووە یاخود لەتیرەوە بووە.

بێگومان دەربارەی خاوبوونەوەی هەندێك کەس لەجیهادی ڕێ ی خودا کاتێك هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر دەبیستن چەند ئایەتێکی قورئان بۆ ڕێنمایی کردنی موسڵمانان هاتوونە خوارەوەو ئاگاداریان کردوونەوە لەوەی کە ئایینی ئیسلام بەتاکە کەسێکی وەك پێغەمبەرەوە نەبەستراوە کە ئەگەر هەتا ئەو لەژیان دابێت خەڵکی پەیڕەویی بکەن و گەر ئەویش (مرد) یان (کوژرا) ئیدی واز لەئاینەکە بێنن. بەڵکو ئەم ئایینە دەبێت لەئەستۆ بنرێت و خەڵکی خۆڕاگرو سووربن لەسەری و هەردەم بەرگریی لێ بکەن، سا ئیتر خودی پێغەمبەر مابێت یان مردبێت. چونکە ئەم ئاینە بانگەوازێکی (شەخصی) نەبووە، بەڵکو بانگەوازە تەنها بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنیاو شوێنکەوتنی شەرع و ڕێساکەی.. جا ئایا دەشێت بەمردنی (محمد) یان بەکوشتنی، خێرا موسڵمانان هەڵگەڕێنەوەو بچنەوە سەر کفرو بێ باوەڕی؟ بێگومان گەر ئەو حاڵەتەش دروست ببێت و گەر موسڵمانانیش پاشگەزبنەوە ئەوە دیارە هیچ زیانێك بەخودا ناگات. بەڵام خودا پاداشتێکی زۆری ئەو موسڵمانانە دەداتەوە کە بەئارامیو خۆڕاگرییەوە لەسەر ئیسلام دەمێننەوەو کەسوپاس و شوکری نیعمەتەکانی خودا دەکەن، بەتایبەتیش نیعمەتی گەورەی ئیمان و بڕواداریێتی..

ئەمەی پێشووش پوختەی شیکاری ئەم ئایەتەی قورئانە، کەخودا تیای دا دەفەرموێت:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِي۟ن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾آل عمران/١٤٤..

# موسڵمانان ریزەکانیان ڕێك دەخەنەوە

خۆ بەکوشت دانی هەندێك لەهاوەڵان لەسەر پێغەمبەرو بڵاوبوونەوەی هەواڵی مردنیشی لەلایەکی ترەوە هۆیەك بوو بۆ دوورکەوتنەوەی دوژمن لەموسڵمانان.

ئینجا پێغەمبەری خوداو ئەو جەنگاوەرانەی لەچیاکە لەگەڵی مابوونەوە سەرکەوتنە سەر چیاکەو گەیشتنە جێی ئەو گاشەبەردەی، کەهەندێك لە هاوەڵان هەڵاتبوون بۆلای.

جا یەکەم کەس لەوانەی پێغەمبەری ناسی یەوە (کعب‌ـی کوڕی ـمالك) بوو کە پڕ بەگەرووی و بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: (هۆ موسڵمانان مژدەتان لێ بێت ئەوە پێغەمبەری خودایە)، موسڵمانەکان بەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوون و خەم و خەفەتیان لەدڵ دانەماو بەدیداری پێغەمبەرەکەیان شادبوونەوە دوای ئەوەی گومانیان وابوو گوایە کوژراوە.

ئینجا ئەو سەرکەوتنەی سەرەتای جەنگەکەیان بەبیرخۆیان هێنایەوە کە لەدەستیان داو، هەروەها باسی ئەو هاوەڵانەیان دەکرد، کە کوژرابوون.

لەو کاتانەش دا (ئەبو سوفیان) و ژمارەیەك لەبێ باوەڕان بەرەو ڕوویان هاتن و موسڵمانان کە بینییانن ئەو دۆخەی پێشوویان بیرچووەوەو تاکە نیازو ئامانجیان بەرگری لەخۆ کردنیان بوو، پێغەمبەریش فەرمووی: {ئەم جارە ئەوان ناتوانن بێنە سەروومانەوەو ئەمسەرمان لێ بگرن}.

دەسبەجێ لەو ساتەش دا (عمر‌ـی کوڕی ـخطاب) و کۆمەڵێك لە موهاجیران بەرەنگاریان بوونەوەو کوشتاریان کردن تاکو لەچیاکە کردیاننە خوارەوە.

دوای ئەمە ئیتر کافران سوپاکەیان کۆکردەوەو خۆیان سازکرد بۆ گەڕانەوە بەرەو (مەککە)، لەکاتی خۆسازدانیان دا (ئەبو سوفیان) هاواری لەسوپای موسڵمانان کردو لەشوێنێکی بەرزەوە پێ ی گوتن: {وادەی پێگەیشتنەوەمان ساڵی ئایندەیە لە ـبەدرـ}.

پێغەمبەریش یەکێك لەهاوەڵانی ڕاسپارد کە لەوەڵام دا پێی بڵێت: (بەڵێ لەنێوان ئێمەو ئێوەدا وادەیەکی تر هەیە). پاشان (ئەبو سوفیان)و سوپاکەی ڕۆشتن.

پێغەمبەری خوداش ڕووی کردە (علی‌ـی کوڕی ـابو طالب)و پێ ی فەرموو: }هەستەو دوایان کەوەو بەپەنهانی چاودێرییان بکەو بزانە چی دەکەن و بەتەمای چین.. ئەگەر سواری ئەسپەکانیان نەبوون و جڵەوی حوشترەکانیان گرتبوو ئەوە دیارە بەرەو (مەککە) دەڕۆنەوە. خۆ ئەگەر سواری ئەسپەکانیان ببوون و حوشترەکانیان لێ دەخوڕی، ئەوە مانای وایە بەرەو (مەدینە) دەڕۆن. دەسا بەو خودایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر بەرەو (مەدینە) بڕۆن ئەوا دەکەومە شوێنیان و بەرەنگاریان دەبمەوەو شەڕو کوشتاریان دەکەم}.

(علی)یش بۆ بەجێ هێنانی ئەو فەرمانە بەوردی چاودێریی ڕۆشتنی سوپای کافرانی کردو بۆی دەرکەوت بەرەو (مەدینە) نارۆن، بۆیە هاتەوەو بەپێغەمبەری گوت: {بەپەنهانی دوایان کەوتم تا بزانم کوێیان مەبەستە، جا کاتێك دیتم بەتەنیشت ئەسپەکانیانەوە دەڕۆن و جڵەوی حوشترەکانیان گرتووە زانیم کە ئەوان بەرەو (مەککە) مل دەنێن}.

## موسڵمانان کوژراوەکانیان کۆدەکەنەوە

دوای تەواوبوونی جەنگ خەڵك بواریان بۆ ڕەخسا، تا کوژراوەکانیان کۆ بکەنەوەو بیاننێژن، کە ژمارەیان پتر لەحەفتا کەسێك دەبوو. هەندێك لەوانەی زۆرترین زامی پێوەبوو ئەو جەنگاوەرە ئازاو دلێرانە بوون کە بەرگرییان لەپێغەمبەر کردبوو، بۆ نموونە (طلحة) پتر لەحەفتا زامی پێوەبوو. کافران سووکایەتییان بەکوژراوانی موسڵمانەکانەوە کردبوو، تەنانەت (هیند)ی ژنی(أبو سفیان) سکی(حەمزە)ی هەڵدڕی و جگەری دەرهێنا بۆ ئەوەی بیخوات، بەڵام نەیتوانی هیچی لێ قووت بدات کاتێك کە پارچەیەکی لێ خستە سەر دانەکانی و لەدەمی دا دەیگێڕا.

پێغەمبەریشﷺ، کە دیتی ئاوا سووکایەتی بەتەرمەکەی (حەمزە) دەکرێت تەواو پەست و تووڕەبوو و لەتووڕەیی دا فەرمووی: {ئەگەر خودا بەسەر قوڕەیش دا سەری خستم لەجێگەیەکی تردا، دەبێت ئێمەش سووکایەتی بە (٣٠) سی تەرمی ئەوان بکەین}.

موسڵمانەکانیش کاتێك دیتیان پێغەمبەر چۆن پەست و تووڕەبووە لەسەر ئەو کارە ناشیرینەی، کە بەمامی کراوە، خێرا گوتیان: {وەڵڵاهی ئەگەر خودا تەنها یەك ڕۆژ لە ڕۆژان بەسەر ئەوان دا سەرمان خات دەبێت سووکایەتی یەکی وەها بەو تەرمانەیان بکەین کە هەرگیز لەمەوپێش عەرەبێك وای نەکردبێت}...

بەڵام خودای مەزن بەم ئایەتانە ئامۆژگارییی کردن و فەرمووی:

﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾النحل/١٢٦-١٢٨..

واتە: {ئەگەر تۆڵەتان کردەوەو سزای ئەوانتان دایەوە ئەوا هەر بەقەد تاوانەکەی ئەوان سزایان بدەن و تۆڵەیان لێ بسێننەوە. خۆ ئەگەر ئارام بگرن و چاویان لێ بپۆشن لەکاتی سەرکەوتن بەسەریان داو هەمان کرداریان بەرامبەر نەکەنەوە ئەوا بێگومان ئەوە بۆ ئێوە باشترەو جوانتریشە لەئاکاری تۆڵەسەندنەوەو سووکایەتی پێکردنی تەرمەکانیان. هەروەها ئەی

پێغەمبەر ئارام بگرە لەسەر ئازارو ئەشكەنجەی گەلەكەت و لەسەر ئەو سووكایەتی یەی، كە پێتان دەكەن و پەست و خەمناكیش مەبەو خۆت مەخەرە هەڵوێستی خەمباریو پەشیمانی و سینە تەسكی یەوە لەئاست فرِوفێڵ و بەدرِەفتاریی ی ئەوان دا. چونكە خودا هەر لەگەڵ تەقواكاران و لەخواترسان دایەو لەگەڵ ئەوانەیە كە كاری چاك ئەنجام دەدەن}.

بەراستی ئەم فەرمایشتەش راسپاردەو ئامۆژگاری یەكی كاریگەری وەهایە، كەمرۆڤ بۆ ئاستێكی باڵا بەرزدەكاتەوەو لەخەیاڵ و ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەوە دەیبات بەرەو لوتكەی هەواری مرۆڤایەتی. وەك گێرراوەتەوە دوای هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتانە پێغەمبەر نەیهێشتووە سووكایەتی بەتەرمی كوژراوانی دوژمن بكرێت.

## چەند وێنەیەكی پاڵەوانێتیو قوربانیدان

پێغەمبەری خودا زۆر پەرۆشی زانینی هەواڵی هاوەڵانی بوو و دەیویست بزانێت چییان بەسەرهاتووە، بۆیە فەرمووی: {كێ دەتوانێت هەواڵی (سعدی كوری ربیع)م پێبگەیەنێت و سۆراخی بزانێت، كە ئایا ماوە یان مردووە{؟ یەكێك لەپشتیوانان (أنصار) بەدەم داواكەیەوە چوو و گوتی: (ئەی پێغەمبەری خودا من سۆراخی —سعد—ت بۆ دەكەم).

ئینجا چوو، تا بگەرێت بەدوای داو دیتی لەنێو كوژراوان دا كەوتووەو بریندارەو هێشتا نەمردووەو نەختێك گیانی تیا ماوەو لەهەناسەكانی كۆتایی ی دایە. لێ ی پرسی: (پێغەمبەری خودا فەرمانی پێ كردم سۆراخی تۆ بكەم و بزانم لەزیندووەكاندایت یان لە مردووەكان)؟ (سعد) گوتی: {من لەمردوانم و سڵاوم بگەیەنە بەپێغەمبەری خوداو پێ ی بڵێ:(سعد—ی كوری —ربیع— دەیگوت: خودا لەسەر ئێمە باشترین پاداشتت بداتەوە كەهەر شایستەی پاداشتی ئەو پێغەمبەرە بێت، كە لەسەر هەوڵ دان بۆ نەتەوەكەی پێی دەدرێت). هەروەها سڵاوم بەگەلەكەت بگەیەنە (واتە بەموسڵمانان)و پێ یان بڵێ: (سعد—ی كوری —ربیع پێی دەگوتن: بێگومان هیچ پاساوێكتان نامێنێت كاتێك دوژمنان توانای هەڵكوتانە سەر پێغەمبەرەكەتانیان بۆ دەرەخسێت و لەنێو ئێوەش دا هێشتا چاوانێك هەبن توانای بینینیان تێدابێت)}.

ئەو پیاوە نێرراوە ماوەی ئەوەی نەما كە قسەیتری لەگەڵ دا بكات و ئیتر (سعد) گیانی سپارد. ئەویش هاتەوە بۆلای پێغەمبەرو هەواڵی پێگەیاند.

بە راستی ئەم دیمەنەش چەندین پەندو وانەی كاریگەر دەبەخشێت، بەتایبەتی لەخۆشەویستی و قوربانی دان و مردن لەپێناوی بیروباوەرِدا.

دیمەنێکی تر لەم ڕووەوە (ابن اسحاق) گێڕاوێتی یەوە، کە (عەمر ـی کوڕی ـ جموح) کەوا پیاوێکی تەواو شەل بوو و چوار کوڕیشی هەبوون و لەئازایەتی دا وەك شێر وابوون و لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەی جەنگەکان دەبوون. کاتێك موسڵمانان سەرقاڵی خۆسازدان بوون بۆ جەنگی "ئوحوود" کوڕەکانی ویستیان بەندی بکەن و پێیشیان گوتبوو: }خودا لەتۆ بووراوەو پاساوی نەچوون بۆ جەنگت هەیە{. ئەویش چوو بۆلای پێغەمبەری خوداو پێ ی گوت:}کوڕەکانم دەیانەوێت بەندم بکەن و لەم ڕوخسارە (واتە لەڕوخساری پێغەمبەر) دوورم خەنەوەو ناهێڵن لەگەڵت دا دەرچم بۆ جەنگ و کوشتاری کافران... دەسا بەخودا من دەمەوێت بەم شەلی یەمەوە بچمە بەهەشت{. پێغەمبەریش لەوەڵامی دا فەرمووی: {تۆ هیچ گلەیی یەکت لەسەر نەماوەو خودا عوزری بۆ داناویت و جیهادت لەسەرنی یە} . هەروەها پێغەمبەر بەکوڕەکانییشی فەرموو: {بۆتان نی یە ڕێ ی لێبگرن، بەڵکە خودا پلەی شەهیدبوونی پێ ببەخشێت}... ئینجا ئەو پیاوە شەلە بۆ جەنگ ڕۆشت لەگەڵیان داو لەوێش کوژرا.

دیمەنێکی دی (کە دوا نموونە نی یە) ئەوەبوو ژنێك لەخێڵی (بنو دینار) مێردەکەی و براکەی و باوکیشی لەو جەنگەدا کوژرابوون، کاتێك هەواڵی شەهیدەکانیان پێگەیاند، تاکە پرسیارێکی ئەوەبوو گوتی: {ئەی پێغەمبەری خودا چی ی بەسەرهاتووە} ؟ لەوەڵام دا پێیان گوت: (سوپاس بۆ خودا ـ ئەی دایکی فلان ـ ئەو ـ وەك تۆ حەزکەیت ـ سەلامەتە)، ئینجا داوای کرد ڕاستی ی ئەوە بسەلمێنن و گوتی: (دە پێغەمبەرم پیشان بدەن تاکو بیبینم). ئیتر پیشانی دراو دەستیان بۆ ڕاکێشا کە ئەوە پێغەمبەر خۆیەتی‌و ئەویش بەچاکی بۆی ڕوانی تا بۆی دەرکەوت خۆیەتی و پاشان گوتی: {كل مصيبة بعدك جلل} - واتە: {هەر کارەساتێکم بەسەربێت و هەرتۆ ـ ئەی پێغەمبەر ـ تیای دا سەلامەت بیت ـ ئەوا بەبچووکی دەبینم}...

موسڵمانە پێشینەکان بەم باوەڕە بەرزو قوربانی دانە بێ وێنەیەوە سەرکەوتن و لەماوەیەکی کەمی وەك چارە کەسەدەیەك دا ئیمپراتۆریەتەکەیان بنیات ناو گەورەو سەرداری دنیابوون و پارێزەرانی دادو یەکسانی بوون.

## بەتین کردنەوەی ورەی موسڵمانان

موسڵمانان گەڕانەوە بۆ ـ مەدینە ـ و خەم و پەژارەیەکی زۆریشیان لەدڵ دابوو و ئەو تێشکانەی دوای سەرکەوتنەکەی یەکەم جاریشیان لەهێزو بازووی شکاندبوون... لەو ساتە وەختانەش دا سرووشی خودایی یان بۆ هاتەخوارەوەو خودا بەو ئایەتانە دڵنەوایی دەکردن و ورەی بۆ بەتین دەکردنەوەو گیانی ئازایەتی ی تێدا دەژیاننەوەو ئاسەواری بەزینەکەشی لەسەر

سووك دەكردن، هەروەك كە بەم شێوەیە ڕووی فەرمایشتی تێ كردن:

﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ[1] فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ آل عمران/١٣٩-١٤٠ واتە: }لەجیهادو ڕوو بە ڕوو بوونەوەی كافران دا لاواز مەبن و خۆتان بەبێ هێز دامەنێن و، خەم و پەژارە لەسەر ئەو تێشكانە تەنگتان پێ هەڵنەچنێت و چیدی نیگەران مەبن بۆ كوژراوەكانتان، چونكە بێگومان بەهۆی پشتگیریی خوداوە هەر ئێوە لەسەروو ئەوانەوە دەبن و لەئاكام دا سەردەكەون بەسەریان دا. خۆ ئەگەر ئێوە لەجەنگی —ئوحود—دا كوشتارێكی زۆرتان لێ كراو زامێكی قووڵ بەرۆكی گرتبن ئەوا هەمان كارەسات بەسەر ئەوانیش دا پێشتر لەجەنگی (بەدر)دا هات. كاتەكانی سەركەوتنیش خودا خۆی لەنێوان خەڵكی دا دابەشی دەكات و هەندێك جار سەركەوتن بۆ ئەوانەو بڕوادارانی پێ هەڵدەسەنگێنرێت و باوەڕیان پێ ی تاقی دەكرێتەوە، هەروەها خودا چەند كەسێكی تێ دا بەشەهید دادەنێت و پلەی شەهیدبوون لەپێناوی خودایان پێ دەبەخشێت. بەڵام خودا ئەوستەمكارانەی خۆش ناوێت، كە بەهۆی سەرپێچی كردنی فەرمانەكانی پەروەردگاریانەوە ستەمیان لەخۆیان كردووەو خۆیان خستۆتە بەر سزای سەختی خودا{.

قورئان ئاماژەی بۆهۆكارو حیكمەتی ئەو تێشكانە كردووە كە تاقیكردنەوەی ڕادەو گوڕی باوەڕی موسڵمانانەو تاقیكردنەوەیانە بەو ناڕەحەتی یە توندە تاكو (مرۆڤی بڕواداری ڕاستگۆ)و (مرۆڤی ڕاڕاو باوەڕ لاواز) دەركەون و لێك جیابكرێنەوە، هەروەك خودا فەرموویە:

﴿وَلِيُمَحِّصَ[2] ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ آل عمران/١٤١-١٤٢.

هەروەها خودا ئەوەشی بۆ موسڵمانان ڕوون كردۆتەوە كەئەوەی تووشیان بووەو بەسەریان دا هاتووە تووشی شوێنكەوتوانی پێغەمبەرانی پێشووش بووەو بەڵام لەپێناوی خودادا هەر جیهادیان كردووەو جەنگیون و ئەو كارەساتانە نەبۆتە هۆی لاوازبوونیان و هەست كردنیان بە بێهێزیو بێ ئومێدی و قایل بوون بەسەرشۆڕی، بەڵكو بڕوای تەواویان وابووە كە ئەو

(١) قرح: (جرح وقتل): واتە (زامداریو كوشتنیش) دەگەیەنێت.
(٢) لیمحص: واتە (بۆ ئەوەی تاقییان بكاتەوە).

کارەساتی بێ هێزی و تێشکانانەی بەسەریان دا هاتووە دەگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمی خۆیان و بۆ گوناەو سەرپێچی یەکانیان.

بۆیە دوای چەسپاندنی ئەو بڕوایەیان لەخودا پاڕاونەتەوە کە لەگوناهەکانیان خۆش بێت و لەلایەن خۆیەوە هێزو خۆڕاگری و جێگیربوونیان پێ ببەخشێت. خوداش نزاو پاڕانەوەی گیراکردوون و خێرو بەخششی دنیاو ئاخیرەتیشی پێ بەخشیون... هەروەك لەبارەیانەوە فەرموویە:

﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ[1] كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْ[2] وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ آل عمران/١٤٦-١٤٨.

## قسەو باسی مردن

کاتێك پێغەمبەری خودا لەگەڵ هاوەڵانی دا گەیشتنە ناو (مەدینە) گوێ ی لەگریانی موسڵمانان و شین و واوەیلایان بوو، کە بۆ کوژراوەکانیان دەکرد... پێغەمبەر خۆیشی بەو حاڵەتە چاوی پڕبوو لەفرمێسك و خەمباربوو بۆیان، بەڵام جگە لەگریان ڕێی شیوەن گێڕان و شین و واوەیلاکردنی پێ نەدان.

لەملاشەوە دووڕووەکانی (مەدینە) ئەو کارەساتەی موسڵمانانیان بەهەلێکی باش دەزانی بۆ خۆیان تا پیلانی ژەهراوی داڕێژن و موسڵمانان لەپێغەمبەرەکەیان دوورخەنەوە. جوولەکەکانیش کەوتنە فێڵ و تەڵەکەبازیو، دووڕوویی ی ئەوانیش لەدیارترین شێوەدا دەرکەوت.

جوولەکەکان گوتیان (ئەگەر ئەم کابرایە پێغەمبەر بوایە ئەوا کافرەکان بەسەریا زاڵ نەدەبوون و تووشی ئەو کارەساتە نەدەبوو. بەڵام وادیارە ئەو بەتەمای پاشایەتیو دەسەڵاتدارییە). هەڵبەتە دووڕووەکانیش بەهەمان شێواز دەدوان، وەك چۆن بەموسڵمانانیان گوتبوو: (ئەگەر ئێوە گوێ بیستی ئێمە بوونایەو نەچوونایە ئاواتان بەسەردانەدەهات)...

---

(١) ربیون: واتە (چەند کۆمەڵێکی خاوەن باوەڕ).

(٢) ما استکانوا: واتە (سەریان بۆ دوژمنان شۆڕنەکردووە).

قورئانیش ئاماژەی بۆ پیلان و وتە ژەهراوی یەکانیان کردووەو خودا فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾آل عمران/١٥٦.

جا لەوەلاّم دانەوەی ئەو هەراوهوریایەی، کە جوولەکەو دووڕووەکان بەرپایان کردبوو سرووشی خودایی هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرو هاوەلاّنی و حەقیقەتی مردنی بۆ ڕوون کردنەوەو پلەوپایەی شەهیدانی لەلای پەروەردگاریان بۆ دیاریکردن تاکو ئەو خەم و پەژارە زۆرەی ناودڵیان بڕەوێنێتەوە، چونکە مردنیش کاتی خۆی بۆ دیاریکراوەو نەپێش دەخرێت بۆ هیچ کەسێك و نەدواش دەخرێت بۆی..

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴾آل عمران/١٤٥. واتە: {هیچ کەسێك بۆی نی یە بمرێت و مردن بەدەست خۆی بێت تەنها بەمۆڵەت و فەرمانی خودا نەبێت، خوداش خۆی ئەمەی لەتۆماری تایبەت بەدواساتەکانی ژیانی خەڵکان دا نووسیوە. جا هەر کەسێك خوازیاری خۆشیو نیعمەتەکانی دنیا بێت ئەوا بەشی لێ دەدەین و هەر کەسێکیش خوازیاری پاداشتی ڕۆژی دوایی بێت و بۆ ئەوە هەوڵ بدات بێگومان پێی دەبەخشین، خوداش پاداشتی تەواوو ڕاستەقینەی ئەو بەندە بڕوادارو سوپاسگوزارانە دەداتەوە کە گوێڕایەڵیی فەرمانی جیهادیان کردووەو بەسەروماڵ لەهەوڵ و جیهادی ڕێی خوادابوون}.

هەروەها قورئان ئەو ڕاستی یەشی دووپات کردۆتەوە، کەمردن لەپێناوی خودادا هۆیەکە بۆ بەدەست هێنانی ڕەحمی خوداو لێ خۆشبوونی و، بێگومان ئەمەش لەدەسکەوتەکانی ژیانە، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ آل عمران/١٥٧..

پاشان قورئان لەباسی حاڵەتی دوای کوژرانی ئەو شەهیدانەدا وایان وەسف دەکات کە ئەوان زیندوون و لەلای خودای خۆیان بەردەوام ڕزق و ڕۆزییان پێدەدرێت و ئەو ژیانە بەختیارەی لای خوداشیان بە شێوەیەك باس دەکرێت کەخۆشەویستیی شەهیدبوون دەخاتە دڵانەوەو ترسی مردنی تیادا ناهێڵێت، وەك خودا دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ

بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾آل عمران/١٦٩-١٧١

واتە: {ئەی موسڵمانان وای دانەنێن کە ئەوانەی لەپێناوی خوادا کوژراون مردووبن بەڵکو هەر زیندوون و لەلای پەروەردگاریانەوە ڕزق و ڕۆزییان پێ دەبەخشرێت و بەباشترین شێوە باسیان دەکرێت و لە ئاخیرەت دا بەهەشتی نەبڕاوەیان پێ دەدرێت، ئینجا ئەوانیش زۆر شادمان و خۆشحاڵن بەو ڕێزو کەرامەتە بێ وێنەیەی کەخودا پێ ی خەڵات کردوون. دڵشادیشن بەو کەسانەی کەدوای ئەوان خودا پلەی شەهادەتیان پێ دەبەخشێت و هیچ نیگەرانی و خەفەتێکیشیان لەسەر ماڵ و سامانی دنیا نی یەو پەرۆشی هیچ سامان و پلەو پایەیەکی دنیا نین و ئاهی بۆ هەڵناکێشن. هەروەها دڵخۆشن بەو هەموو نیعمەت و بەخششانەی خودا، بەتایبەتیش نیعمەتی شەهیدی و خۆبەخت کردن لەپێناوی سەرخستنی دینی خوادا.. جا خوداش بێگومان پاداشتی ئەو بڕوادارانە ون ناکات، کە بەدەم بانگەوازی خوداو پێغەمبەرەکەیەوە چوون و بەتەواوی خۆیان یەك لاکردۆتەوە بۆ ئەو ئەرکە گەورەو گرانانەی، کە پێ یان سپێرراوە لەجیهادو ڕوو بە ڕوو بوونەوەی دوژمنانی خودادا}...

* **

ئەم ئایەتانەو هاوشێوەکانی تریان دوای ئەو کارەساتەی جەنگی (ئوحود) هاتوونە خوارەوە کەتێشکانیان لەجەنگەکەدا خەم و خەفەتێکی هێجگار زۆرو ئاسەوارێکی قووڵی ی دڵتەنگی ی لەدەروونیان دا دروست کردبوو، چ لەدەروونی پێغەمبەرو چ لەدەروونی هاوەڵانیشی دا، ئەویش دوای ئەوەی باشترین و چاکترین خۆشەویستانیان لە بڕواداران لەدەست چووبوو، لەوانەی خودا پاڵاوتبوونی بۆ ئەوەی، کە (ئەو چیا سەرکەش و بڵندە) دوایین نیشتگای دنیایان بێت و باوەڕی تەواویشیان بەو مەسەلەیە هەبوو کە لەپێناویدا شەهیدبوون و، ڕەزامەندیی خوداشیان بۆ خۆیان مسۆگەرکرد.

پێغەمبەری خودا هەمیشە یادی ژیان و هەڵس و کەوتی ئەو پاڵەوانانەی دەکردەوە. کاتێك لەدوارۆژەکانی ژیانیشیابوو و بەرلەوەی ماڵئاوایی لەدنیا بکات سەردانی گۆڕەکانی ئەو پاڵەوانانەی کردو نزای بۆکردن و بۆ خەڵکیش لەبارەیانەوە دواو پەندو ئامۆژگاریی زیاتری پێگەیاندن، هەروەك (عەقبەی کوڕی عامر) گێڕاوێتی یەوەو گوتوویە: {پێغەمبەری خودا دوای هەشت ساڵ نوێژی لەسەر هەموو کوژراوانی (ئوحود) کردەوەو وەك نوێژێکی ماڵئاواییش

وابوو لەزیندوان و لەمردوان}، پاشان چووەسەر -مینبەر- و فەرمووی:-

{بێگومان من پێش هەمووتان وا خەریکە ماڵئاوایی لەدنیابکەم و، شایەتیشم لەسەرتان و وادەمان سەر حەوزەکەیە[1]... چونکە من لەم جێگەیەمەوە بۆی دەڕوانم... بێگومان من سەبارەت بەئێوە ترسم لەوە نی یە تووشی شیرك و هاوەڵ بۆ خوادانان بن، بەڵکو دەترسم باوەش بەدنیادا بکەن و پێشبڕکێ ی لەسەر بکەن}....

(عقبە) گوتوویە: (ئیتر ئەوە دوایین جاربوو بڕوانم بۆ پێغەمبەری خودا)[2]...

چەند جوانە فەرموودەکەی پێغەمبەر!! (دەترسم باوەش بەدنیادا بکەن و پێشبڕکێ ی لەسەرکەن)... ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە لەو بەڵگانەی، کە ڕاستی ی پێغەمبەرایەتی ی لەچاخەکانی مێژووی موسڵمانان دا سەلماندووە. ئەوەبوو لەڕاستییش دا ترسناکترین بەلاّ، کە لەدوای مردنی پێغەمبەر تووشی موسڵمانان بووبێت هەتا ئەمڕۆ پێشبڕکێ و کێبەرکێ یە لەسەر دنیاو پلەوپایەو پێشەوایەتی. هەر ئەم پێشبڕکێ یەش ئەو دەوڵەتە گەورەو فراوانەی بۆ تێك دان کە بەباوەڕو قوربانی دان بنیاتیان نابوو، بەردەوام، تا ئەمڕۆش هەر ئەو باوەش بەدنیاداکردن و پێشبڕکێ لەسەر دنیایەشە کە بووەتە سیمای دیاری پەرتەوازەیی و لاوازییان و کەوتنە ژێر چەپۆکی داگیرکەران و زاڵ بوونی نەتەوەکانی تر بەسەریان دا.

---

(١)حەوزەکە/ بێگومان ئەم حەوزە لەشتە نادیارەکانی ڕۆژی دوایی یە،بەلاّم وا پێ دەچێت شوێنێکی بەهەشت بێت.

(٢) بخاری گێڕاویەتیەوە.

# بەندی سێ یەم

## (( پەیماننامەی -حودەیبییە- ))

(سەردانی "مسجد الحرام" - ڕێگرتن لەسەردانەکەی پێغەمبەری خودا -
دان وستان لەنێوان "قورەیش" و "پێغەمبەری خوادا" - بەیعەتی (رضوان) -
پەیاننامەی پێکهاتن – کاریگەریی ی پەیاننامەکە لەسەر موسڵمانان -
بەرەنجامی پەیاننامەی "حودەیبییە")

**سەرنجێك:-**

پێغەمبەری خودا جگە لەجیهادی سەربازی، جیهادێکی سیاسیشی هەبووەو ئەم جیهادەش (وەك ئەوی دی) بەهاو بایەخی تەواوی هەبووە، گرنگترین دەسکەوت و ئاکامی ئەم جۆرە جیهادەش بەدی هاتنی ئەو فەتحە گەورەیە، کە (فەتح کردنی مەککە)یەو ئیسلامی پێ بەهێز بوو و لەدورگەی عەرەبییش دا بووە تاکە مەنهەجی دەسەڵات و باڵادەستی.

فەتح کردنی مەککە بەکارێکی سیاسی دەستی پێ کرد، کە خودی پێغەمبەر ئەنجامی داو ئەوپەڕی دانایی و حیکمەتی تێدا بەکارهێنا، کارەسیاسی یەکەش (پەیماننامەی –حودەیبییە) بوو، چونکە نیازو ئامانجی پێغەمبەر هەرگیز شەڕو کوشتار نەبووە، بەڵکو بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی بووە، بەڵام ئەگەر کاری بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەش ڕێ ی لێ بگیرایەو ئاتاج هەر بەکوشتارو ناچاربوون بەخواستی سەربازی بوایە ئەوا پەنای دەبردەبەر. هەر کاتێکیش دەرفەتی ئاشتی هەبوایە پەنای بۆ دەبردو لەکاری سوڵح و ئاشتەوایی دا زۆر کارامە بوو.. لەم بەندەش دا بەکورتی باسی (پەیماننامەی – حودەیبییە) بۆ خوێنەری بەڕێز دەکەین و ئاماژەش بۆ بەرەنجام و ئاسەوارە نایابەکانی دەکەین...

## سەردانی "مسجد الحرام"

لەشاری (مەککە)دا –مسجد الحرام– ڕووگەی عەرەبەکان بوو بۆ عیبادەتیان و هەموو ساڵێك لەمانگە –حەرامەکان[1]– دا حەجیان تیادا دەکردو هەر کەسێك بچوایەتە ناویەوە، پارێزراو دەبوو. تەنانەت گەر پیاوێك لەوێ دا سەرخست ترین دوژمنی خۆی بدیایە جورئەتی ئەوەی نەبوو شمشێرەکەی بەڕوودا هەڵکێشێت یان خوێنی بڕێژێت. کەچی قوڕەیشی یەکان لەو ڕۆژەوەی (محمد)و هاوەڵانی کۆچیان کردبوو بڕیاریان دابوو نەهێڵن بچنە ناو (مسجد الحرام)ەوەو لەنێو هەموو عەرەبەکانیش دا ئەو مافەیان تەنها لەموسڵمانان زەوت کردبوو..

بێگومان موسڵمانەکانیش ئەوەیان زۆر پێ ناخۆش بوو، چونکە ڕێگرتنیان بوو لە بەجێهێنانی ئەو ئەرکە ئایینی‌یەی لەسەریان فەرز کرابوو. تا ئەو کاتەش شەش ساڵ بوو هیجرەتیان کردبوو و زۆر پەرۆشی زیارەتی (مسجد الحرام) بوون.

ڕۆژێکیان موسڵمانان لەلای پێغەمبەری خودا کۆبووبوونەوەو ئەویش ڕووی تێ کردن و پوختەی خەونێکی ئەو شەوەی خۆی بۆ گێڕانەوە کە لەخەونی دا هەواڵی پێ درابوو ئەوان بەپارێزراوی یەوە دەچنە نێو (مسجد الحرام)ەوەو لەکاتێك دا دەچن کەسەریان تاشیوەو هەندێکیشیان قژیان کورت کردۆتەوە بێ ئەوەی لەکەس بترسن.

ئینجا پێغەمبەری خودا دانیشتوانی (یەسریب)و خەڵکی دەوروبەری لەدێهاتی‌و دەشتەکی یەکان کۆکردەوە تاکو لەگەڵی دا بچن بۆ بەجێ هێنانی (عومرە)[2] واتە بۆ سەردانی –مسجد الحرام– لە –مەککە–و لەهەمان کاتیش دا پێغەمبەر پێشبینی‌ی ئەو ئەگەرەشی دەکرد، کە قوڕەیش لەجەنگێك دا بەرەو ڕوویان ببنەوە یان ڕێیان پێنەدەن بچنە ناو (مسجد الحرام)ەوە. لەوەڵامی داواکەی پێغەمبەردا زۆر کەس لەدەشتەکی‌یەکان (الأعراب) ئامادە نەبوون ئەو سەردانەی لەگەڵ دا بکەن و هەروەك قورئان لەزاری ئەوانەوە دەیگێڕێتەوە گوتیان: ﴿شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا﴾الفتح/١١. هۆکاری ڕاستەقینەی نەچوونی دەشتەکی یەکان

(١) مانگە حەرامەکان ئەو چوار مانگەبوو کە شەڕوکوشتار تیایان دا حەرام بوو، مانگەکانیش (ذوالقعدة – و – ذوالحجة – و – محرم – و – رجب)ن.

(٢) عومرە (عُمْرَة) فەرزی سەرشانی هەر موسڵمانێکە یەك جار لە تەمەنیدا (فرض عين) کە سێ ڕوکن و قۆناغی تێدایە: (١- ئیحرام بەستن . ٢- سووڕانەوە بەدەوری کەعبەدا . ٣- هات وچۆی نێوان – صفا – و – مروة -).

لەگەڵ پێغەمبەرو هاوەڵانی دا ئەوەبوو وایان دەزانی گوایە (محمد)و هاوەڵانی هەرگیز لەو سەفەرەیان ناگەڕێنەوەو کافران لەناویان دەبەن..

هەروەك خوداش لەم ئایەتانەدا دەربارەیان دەفەرمووێت:

﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴾الفتح/١١-١٢...

واتە: {ئەو خۆدواخەرانەی لەدەشتەکییەکان بوون و کە شەیتان ڕێ ی نەدان لەگەڵ پێغەمبەردا دەرچن پێت دەڵێن: (ئێمە ماڵ و حاڵ و کارو کاسبی ی ڕۆژانەو کەس وکارو منداڵ و خێزانمان خەریکیان کردووین بەخۆیانەوەو بەهۆی ئەوانەوە ناتوانین لەگەڵتا دەرچین و تۆش ئەی پێغەمبەری خودا داوای لێخۆشبوونمان لەخودا بۆبکە). بەڵام ئەوان وتەی زمانیان و نیازی دڵیان لێك جودایە، چونکە خۆدواخستن ونەهاتنیان لەگەڵ تۆدا بەهۆی گومان کردنیانەوەیە لەسەرگرتنی ئەو سەفەرە. تۆش پێ یان بڵێ: (ئەی کێ دەتوانێت پارێزگاریی لە ماڵ و سامانتان بکات گەر خودا خواستی زیانێکی بۆتان هەبێت، کێ دەتوانێت شتێکتان بۆ دابین کات گەر خودا لێتان قەدەغە بکات. بەڵام لەڕاستی دا خودا خۆی ئاگادرای نیازو ئاکارو کردارتانەو دەزانێت بۆچی لەگەڵم نەهاتن و لەسەرئەوە لێتان دەپرسێتەوە. ئێوە گومانتان وابوو گوایە ئیدی پێغەمبەرو بڕواداران هەرگیز بۆ -مەدینە- ناگەڕێنەوە).

ئینجا پێغەمبەری خودا لەگەڵ کۆچکاران و پشتیوانان و هەندێك لەو عەرەبانەی بەدەم داواکەیەوە چووبوون لەشار دەرچوون[١] و ژمارەیان هەزار و چوارسەد کەس بوو و هیچ چەکێکیان پێ نەبوو تەنها ئەو شمشێرانە نەبێت کە خستبوویاننە نێو کێلانەکانیانەوەو ئاژەڵەکانی دیاری (الهدي)[٢]ش بۆ (بيت الحرام)یان لەپێش خۆیانەوە لێ دەخوڕی تاکو چ قوڕەیش و چ هەر خەڵکێکی دی بەچاکی بزانن، کە ئەوان بۆ سەردان و زیارەتی ماڵی خودا دەرچوون نەك بۆ جەنگ و کوشتار.

(١) دەرچوونیان لەمانگی (ذوالقعدة)دابوو، کە لەمانگە حەرامەکان بوو.

(٢) هەدی(الهدي) ئەو ئاژەڵەیە کە دەکرێتە دیاری بۆ (بيت الحرام) سائیتر حوشتربێت، یان مانگا، یان مەڕ، جا پێغەمبەری خوداش لەو سەردانەدا حەفتا حوشتری قەڵەوی دابووە پێش خۆی. ئەو ئاژەڵانەش دوای کۆتایی هێنانی زیارەت سەردەبڕێن و گۆشتەکەی بەسەر هەژاران دا دابەش دەکرێت.

# ڕێگرتن لەسەردانەکەی پێغەمبەری خودا

پێغەمبەر گەیشتە شوێنێك پێ ی دەڵێن (عسفان)و لەوێ هەواڵێکی پێ گەیشت لەمەڕئەوەی، کەوا قوڕەیش هەستیان بەهاتنی کردووەو بڕیاریان داوە نەهێڵن بچێتە نێو مەککە و خۆشیان سازداوە بۆ جەنگ بەسەرکردایەتی (خالید-ی کوڕی -وەلید) - کە تا ئەو کاتە هێشتا موسڵمان نەبووبوو-.

پێغەمبەری خودا کاتێك هەواڵی (خۆسازدانی قوڕەیشی بۆ جەنگ) پێڕاگەیانرا، فەرمووی: (هەی داخ بۆ قوڕەیش چەند شەڕانیین و شەڕو کوشتار بێخی لەبن دەرهێناون و کەچی ناهێڵن من و خەڵکی بەیەك بگەین.. ئایا جگە لەخێر چی ڕوودەدات گەر ڕێگە بدەن چاومان بەخەڵکی بکەوێت؟ ئەگەر کوشتمیان یان تووشی شکستیان کردین ئەوا خواستی ئەوان بەدی دێت و ئەوە ڕوودەدات کە دەیانەوێت.. خۆ ئەگەر خوداش سەرمخات بەسەریان دا ئەوا هەموویان بەپارێزراوی و سەربەرزی یەوە دێنە نێو ئیسلامەوە. دەسا بەخودا لەکردو کۆشی خۆم و لەجیهاد لەگەڵیان دا بەردەوام دەبم و لەپێناوی ئەو دینەدا تێدەکۆشم، کەخودا منی بەهۆیەوە ڕەوانەکردووە هەتا ئەو کاتەی خودا بەئامانجی دەگەیەنێت یان هەتا ئەو کاتەی مردن یەخەم پێ دەگرێت).

پاشان پێغەمبەری خودا لەگەڵ هاوەڵانی دا ڕێگەیان گۆڕی و لای ڕاستی ڕێگەکەیان گرتەبەر لەنزیك (حودەیبییە)و لەوێ حوشترەکەی پێغەمبەر چۆکی داداو خەڵکەکە گوتیان: (ئەوا حوشترەکە چۆکی دادا)، ئەویش فەرمووی: (نەخێر لەخۆیەوە دانەنیشتووە بەڵکو خودای ڕاگری فیل ڕایگرتووە (واتە: مەبەستی ئەو لەشکرەی ئەبرەهەیە، کە فیلێکی زۆری لەپێشەوەبوو و بەتەمای داگیرکردنی مەککەو ڕووخاندنی -کەعبە- بوون بەڵام خودا لەجێ یەك دا بەندی کردن و ئەو کارەساتە بەناوبانگەی بەسەرهێنان، کە لەمێژوودا تۆمارکراوە).

هەروەها پێغەمبەر فەرمووی: {ئەمڕۆ قوڕەیش داوای هەر کارێکم لێ بکەن، کە مەبەستیان گەیاندنی پەیوەندی (صلە-ی ڕەحم) بێت و بهێڵن خزم و کەس و کاری هەردوولا بەیەکتر شادبن ئەوا ئەو کارانەیان بۆ ئاسان دەکەین}. پاشان حوشترەکەی بەلایەکی تردا لێ خوڕی و حوشترەکەش هەستایەوەو کەوتەڕێ تا گەیشتە ئەوسەری (حودەیبییە)و لەوێ لایان داو خەڵکەکەش زۆر تینوویان بوو و سکالای بێ ئاوی و تینوێتییان لای پێغەمبەر کرد. ئەویش تیرێکی لەهەگبەکەی دەرهێناو دایە دەست پیاوێك لەهاوەڵانی و داوای لێ کرد ئەو تیرە بخاتە بیرێکی ئەو ناوچەیە. ئەویش هەڵیدایە ناوی و ئیدی ئاوێکی زۆری لێوە هەڵقوڵاو ئاوێکی سازگارو شیرینیش بوو و هەموو قاپ و کەرەسەکانیان لێپڕکردو لەدەوری قەراغی بیرەکە کۆببونەوە.

## دانوستان لەنێوان قورەیش و پێغەمبەری خوادا

لەو کاتانەدا، کە موسڵمانان لەو ناوچەیەو لای بیرەکە لایان دابوو، قورەیشی یەکان چەند نێرراوێکیان یەك لەدوای یەك ڕەوانەکرد بۆلای پێغەمبەری خوداو هاوەڵانی و پرسیاری هۆی هاتنەکەیان دەکردو گومانیشیان هەبوو لەو مەبەستەی پێغەمبەرو هاوەڵانی هەیانە لەو سەفەرەدا. پێغەمبەر هەواڵی پێ دان کە ئەو بۆ سەردانی (مسجد الحرام) هاتووە. بەڵام قورەیش لەکاتی هاتنەوەی هەر نوێنەرێکیان و بیستنی ئەو هەواڵەدا کەوا بۆ زیارەت هاتوون گومانیان لەدڵ دا دروست دەبووەوەو باوەڕیان نەدەکرد. بۆیە دواجار نوێنەرێکی جێ ی متمانەی تەواویان نارد کە خاوەن پلەیەکی کۆمەڵایەتیش بوو، ئەویش (عروەی کوڕی مسعودی ثقفي)ی گەورەی خەڵکی (طائیف) بوو، کە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوداو پێ ی گوت: (ئەی محمد، تۆ هەموو جۆرە خەڵکێکت تێکەڵ کردووەو بەچاك و خراپەوە هێناوتن و بەتەمایشیت بێیت بۆلای بنەچەو باوانی خۆت و بۆلای هۆزو تیرەکەت تاکو بەمانە لێکیان بترازێنیت و پەرتەوازەیان کەیت. جا ئەوا قورەیشیش سوێندیان خواردووە لەسەرئەوەی، کە نابێت هەرگیز تۆ بەهێزو دەسەڵاتەوە خۆت بکەیت بەناویان دا. دەسا بەخودا وا دەبینم کەهەموو ئەم خەڵکە هەمەڕەنگەی دوات کەوتوون پشتت بەردەدەن و دەبەزن).

لەوێ دا خێرا (ئەبوبەکر) قسەکەی بە (عروە) بڕی و بەرپەرچی دایەوەو گوتی (نەخێر... هەر ئێمە پشتگیریی لێ دەکەین و بەکەڵکی دێین نەك ئەوان... جا وریابە لەگفتارت)...

(عروە) کاتێك قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەکرد ڕیشی پێغەمبەری دەگرت و (مغیرە-ی کوڕی -شعبە)ش بەدەستی دا دەدا هەر جارێك بیویستایە ڕیشی بگرێ.

دوای ئەو ئاخاوتنەی نێوانیان (عروة) گەڕایەوەو بەر لەگەڕانەوەش تێبینیی ئەو حاڵەتانەی کردبوو، کە هاوەڵان چۆن ڕێز لەپێغەمبەر دەگرن و کاتێك دەستنوێژێك دەگرێت خەریکە لەپێشبڕکێ ی خزمەت کردنی دا یەکتری لەسەر دەخەن و بەفەزڵ وعیبادەتی بەهرەمەند دەبن و کاتێك لەگەڵیشیا دەدوێن دەنگیان لەئاستی دا نزم دەکەنەوەو زۆریش بۆ ناوچەوانی ناڕوانن، تا پتر ڕێزو شکۆی بۆ دانێن.

(عروة)، کە گەڕایەوە هەموو ئەو دیاردانەی هەڵس وکەوتی نێوان پێغەمبەرو هاوەڵەکانی بۆ گێڕانەوەو گوتی: {ئەی کۆمەڵی قورەیش بەخودا من کەچووم بۆ لایان وەك ئەوەی (کیسرا) ببینم لەنێو مەملەکەتیدا و -قەیسەر- ببینم لەڕێزو گەورەیی دا. بەڕاستیش هیچ پاشایەکم لەنێو گەلەکەیدا وەك -محمد- لەنێو هاوەڵانی دا نەدیوە). دیتم گەلێکن لەهەموو شتێك دا

ئەو سەرکردەیەیان دەپارێزن و زۆر دڵسۆزن بۆی و ناهێڵن هەرگیز تووشی هیچ ناخۆشی یەك ببێت. جا ئێوەش بیربکەنەوەو ڕاتان چی دەبێت لەسەر ئەو نیازە ڕاستەقینەیەی، کە خستۆێتی یە بەردەمتان و، کە بە ڕاستی بۆ زیارەت دێت. جا ئێوەش ئەوەی خراوەتە بەرچاوتان پەسندی بکەن. منیش لەسەرئەوە ئامۆژگاریتان دەکەم و بەرژەوەندیی ئێوەم لەلا مەبەستە. لەگەڵ ئەمەش دا من دەترسم ئێوە بەسەریا زاڵ نەبن}.

لەو کاتەدا سەرانی قورەیش گوتیان: (ئەم قسەیە مەکەو وای بۆ مەچۆ، بەلاّم لەوەلاّمی مەبەستەکەی دا بڕیارمان وایە ئەمساڵ بیگەڕێنینەوەو با ساڵی ئایندە بێت بۆ زیارەت).

دوای ئەمە پێغەمبەری خودا وای بەچاك زانی، کە (عثمان—ی کوڕی —عفّان) وەك نوێنەرێکی خۆی بنێرێت بۆلای —قورەیش— تاکو لەنزیکەوە مەبەستی هاتنەکەی بگەیەنێت پێیان. (عثمان) پەیامی پێغەمبەری خودای بە —قورەیش— گەیاندو کاتێك لە وتەو ئاخاوتنی بووەوە، سەرانی قورەیش پیێ یان گوت: }ئەگەر تۆ خۆت دەتەوێت بەدەوری (بەیت)دا بسووڕێیتەوەو — طواف— بکەیت ئەوا ڕێت پێدەدرێت و بۆخۆت بەدەوریا بسووڕێوە} .

(عثمان) گوتی: (من وا ناکەم هەتا پێغەمبەری خودا بەدەوریا نەسووڕێتەوە)..

دوای ئەم وەلاّمە قورەیشی یەکان (عثمان)یان لای خۆیان بەندکرد. بەلاّم ئەم هەواڵە بەجۆرێکیتر لەنێو موسڵمانەکان دا بلاّوکرایەوە کە گوایە قورەیش (عثمان)، یان کوشتووە. کاتێك بەهەمان جۆریش ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر گەیشت، فەرمووی: {ئەم جێگەیە جێ ناهێڵین هەتا ڕووبەڕوویان دەبینەوەو کوشتاریان دەکەین} .

## بەیعەتی —رضوان— "بەڵێنی ڕەزامەندبوونی خودا"

کاتێك بارودۆخەکە بەو بارەدا شکایەوە پێغەمبەری خودا هاوەلاّنی کۆکردەوەو داوای لێ کردن بەیعەت و بەڵێنی لەسەر —مردن— پێ بدەن لەکاتی جەنگ و کوشتاری بێ باوەڕان دا، ئەوانیش هەموو تێکڕا —تەنها یەك کەسیان نەبێت— بەیەك دڵ ئەو بەڵێنەیان پێ داو ڕێ و ڕەسمی بەیعەتەکەشیان لەژێر درەختێك دابوو. پرسیار کرابوو لەیەکێك لەوانەی ئەو ڕۆژە ئامادەی بەیعەت دانەکە ببوون: (لەسەر چ شتێك بەیعەت و بەڵێنتان بەپێغەمبەردا بوو لەڕۆژی —حودەیبییەدا- ؟). ئەویش لەوەلاّم دا گوتبووی: (لەسەر مردن)..

لەگێڕانەوەیەکی تریش دا هاتووە: (ئەوان بەیعەتیان دابوو بەپێغەمبەر لەسەرئەوەی لەجەنگ ڕانەکەن).. مەبەست لەمەش خۆڕاگرتن لەکوشتاردا بووە هەتا سەرکەوتن بەدی دێت

سا ئیتر قوربانیدان هەر چۆنێك و هەر چەندێکیشی بوێت و کەسیان هەڵنەیەت لەبەرامبەر دوژمن دا تەنانەت گەر تووشی هەر ناڕەحەتی و بارگرانی یەکیش بن.

لەقورئان دا وەسفی ئەم بەیعەتە کراوەو ستایشی ئەو بروادارە پاڵەوانانەش کراوە، کە بەیعەتی -مردن-یان دابوو بە پێغەمبەرەکەی خۆیان، هەروەك خودا لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾الفتح/١٨... واتە: {بێگومان خودا ڕازی بووە لەو بروادارانەی بەیعەتیان پێ دایت و ئامادەی بەڵێنی (ڕەزامەندبوونی خودا-بیعة الرضوان) لە -حودەیبییە- بوون لەژێر درەختەکەداو ئاگاداری نیازەکانی نێو دڵیانە، کە چەندە ڕاستگۆو نیازپاك بوون، لەبەرامبەر ئەمەش داو لەپاداشتی ئەو هەستی ئازایەتی و جوامێری یە بروادارێتی یەیان دا خوداش هێمنی و دڵنیایی و خۆڕاگریی ی زیاتری پێ بەخشین و لەمەودواش بەم زوانە فەتحێکی دیارو سەرکەوتنێکی تازەیان پێ خەڵات دەکات}.

## پەیماننامەی پێکهاتن

لەکاتێك دا موسڵمانان لەگەرمەی ئامادەباشی و خۆسازدان بۆ جەنگ دابوون، کت وپڕ هەواڵێکی نوێ یان بۆهات لەسەر ئەوەی، کە -عثمان- نەکوژراوەو دوای هەواڵەکەش هێندەی نەبرد کە -عثمان- خۆیشی هاتەوە بۆلایان. بەم هۆیەوە دان وستان لەنێوان هەردوولادا دەست پێکرایەوەو قورەیش نوێنەرێکی خۆیان نارد بۆلای موسڵمانەکان کە (سهیل-ی کوڕی -عمرو) بوو تاکو مەرجەکانی پێکهاتن و ڕێکەوتنیان پێبگەیەنێت، واتە ئەو چوار مەرجەی کەقورەیش دایاننابوون و، ئەمانە بوون:

**یەکەم:** بڕیاردانی هودنە[1] یەك لەنێوان (قورەیش)و (موسڵمانەکان)دا بۆ ماوەی دە ساڵ.

**دووەم:** ئەگەر کەسێك لەقورەیش پەنای بردەبەر موسڵمانەکان و چووە ناویان لەو ماوەیەدا، دەبێت موسڵمانەکان بیگەڕێننەوە بۆلای قورەیش. بەڵام ئەگەر کەسێك لەموسڵمانەکان ڕایکردە ناو قورەیش، ئەوا نابێت بیگەڕێننەوە بۆلای موسڵمانەکان.

---

(١)-هودنە- لەزمانی عەرەبی دا بەو ماوەیەی دوای وەستانی جەنگ و ئاگربەست دەگوترێت، کە هەردوو لایەنی ناکۆك تیای دا بەچەند مەرجێك شەڕوکوشتار ڕادەگرن و خۆیان سازدەکەن بۆ دان وستان و گفت و گۆی تایبەت بەڕێکەوتن و بەدی هێنانی ئاشتی و بڕاندنەوەی کێشەکان. (وەرگێڕ)..

**سێ یەم:** دەبێت ئەم ساڵە موسڵمانەکان بگەڕێنەوەو زیارەتەکە بۆ (مسجد الحرام)و ئەرکی (عومرە)یان ئەنجام نەدەن، بەڵکو ساڵی ئاییندە بێنەوەو بچنە نێو مەککە بۆ ماوەی تەنها سێ ڕۆژ، دوای ئەوەی قورەیش ئەو سێ ڕۆژە بۆیان چۆڵ دەکەن و بەڵام نابێت موسڵمانەکان هیچ چەکێکیشیان پێ بێت، تەنها ئەو شمشێرانە نەبێت کەکرابن بەکێلانەکانیان دا.

**چوارەم:** هەر کەسێك لە – غەیری قورەیش – بۆی هەیە بچێتە نێو ڕیزی (محمد)ەوە گەر خوازیاری ئەوەبێت، هەر کەسێکیش (گەر بیەوێت) بۆی هەیە بچێتە نێو ڕیزی قورەیشەوە.

پێغەمبەریش ئەو مەرجانەی "قورەیش"ی پەسندکرد.

## کاریگەریی پەیماننامەکە لەسەر موسڵمانان

موسڵمانان لەم پەیماننامەیەدا کارێکی قورسی وایان ڕەچاو دەکرد کە نەتوانن شانی بدەنەبەر، هەر بۆیەش تێکڕا ڕێکەوتن لەسەرئەوەی لەو ڕووەوە لەگەڵ پێغەمبەردا بدوێن. یەکێك لەو قسانەش کەبۆیان کرد ئەوەبوو پێیان گوت: (ئەی پێغەمبەری خودا چۆن دەبێت ئێمە هەر کەسێك لە بێباوەڕان بگەڕێنینەوە بۆلای قورەیش کاتێك دێت بۆلامان و موسڵمان دەبێت کەچی لەهەمان کات دا گەر کەسێك لەئێمە هەڵگەڕێتەوەو بچیتە ناو ئەوان نەیگەڕێننەوە بۆلامان ؟)...

لەوەڵامیان دا پێغەمبەر فەرمووی: {گەر کەسێك لەئێمە پاشگەزبێتەوەو بچێتە نێو ئەوانەوە ئەوە بێگومان خودا خۆی دووری خستۆتەوە، هەر کەسێکیش لەوان بێتە نێو ئێمەوەو ئێمەش بیگەڕێنینەوە بۆلایان ئەوە خودا هەر دەربازێکی ڕزگاربوونی بۆ دەدۆزێتەوە}.

بەڕاستی ڕەنگدانەوەو کارایی ئەو پەیماننامەیە هێندە توندو ناخۆش بوو لەلای موسڵمانەکان کە (عمر–ی کوڕی –خطاب) خۆی بگەیەنێتە لای (ئەبوبەکر)و ناڕەزایی و خەم و ئازاری خۆی لەسەر پەیماننامەکە بۆ ئاشکراکات. بەڵام (ئەبوبەکر) بەهێمنی یەوە ڕووی تێ کردو پێ ی گوت: {ئەو خۆی پێغەمبەری خودایەو سەرپێچی لەفەرمانی خودا ناکات و هەر خوداش پشتیوان و سەرخەریەتی}... کەچی (عومەر) بەو وتەیەی (ئەبوبەکر) قایل نەبوو، بەڵکو چوو بۆلای خودی پێغەمبەرو هەمان وتەشی بۆ دەربڕی و خەم و نیگەرانی ی خۆی بۆ باس کرد لەسەر ئەو پەیماننامەیە... پێغەمبەریش پێی فەرموو: }من بەندەو پێغەمبەریی خودام و سەرپێچی لەهیچ فەرمانێکی ناکەم و خوداش فەرامۆشم ناکات}.

پاشان پێغەمبەری خودا – (علی–ی کوڕی –ابو طالب)ی بانگ کرد بۆ نووسینەوەی مەرجەکان و فەرمانی پێ کرد بنووسێت و دەقی پەیماننامەکە بەم ڕەنگە داڕێژێت: ﴿بِسْمِ اللَّهِ

ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بەڵام خێرا (سهیل)ی نوێنەری قورەیش بەرهەڵستی ی کرد، کە نابێت وای داڕێژێت و پێ ی گوت: (قورەیش تەنها -بِاسْمِكَ اللّهُمْ- دەزانێت). لەو ساتەدا موسڵمانەکانیش هاواریان لێ بەرزبووەوەو بەو پێداگرتنەی نوێنەرەکەی (قورەیش) تووڕەبوون. بەڵام پێغەمبەر فەرمانی بە (علی) کرد بنووسێت (بِاسْمِكَ اللّهُمْ) ودوای ئەوەش پێی فەرموو بنووسێت (ئەم نووسراوە ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا سوڵحی لەسەرکردووە لەگەڵ....)، دووبارە (سهیل) بەرهەڵستی لەسەرئەوەش کردو گوتی: (گەر بمانزانیایە تۆ پێغەمبەری خودایت شەڕو کوشتارمان لەگەڵ دا نەدەکردیت و ڕێگەی زیارەتی (بەیت)مان لێ نەدەگرتیت. بەڵکو دەبێت لەجیاتی ئەوە ناوی خۆت و باوکت بنووسیت. پێغەمبەریش بە (عەلی)ی فەرموو: {ئەی -علی- وشەی (پێغەمبەری خودا-کە (رسول الله) بکوژێنەرەوە} . دیارە (عەلی)یش زۆرگران بوو لەسەری گەر ئەو وشەیە بکوژێنێتەوە. بۆیە پێغەمبەر خۆی نووسراوەکەی لێ وەرگرت و وشەکەی (رسول الله)ی بەدەستی خۆی سڕی یەوەو ئینجا بە (عەلی)ی فەرموو:} بنووسە: ئەم نووسراوە ئەوەیە، کە (محمد-ی کوڕی -عبدالله) سوڵحی لەسەرکردووە لەگەڵ (سهیل-ی کوڕی -عەمر)دا...} ...

لەم بارەیەشەوە سرووشی خودایی هاتۆتە خوارەوەو ئەو جۆرە مامەڵەو هەڵس و کەوتەی (سهیل)ی بەنابەجێ داناوەو لەهەمان کاتیش دا ستایشی ئەو هەڵوێستە لەخۆبوردوانەیەی پێغەمبەرو بڕوادارانیشی تێداکراوە، هەروەك خودا لەبارەیەوە دەفەرموێت:

﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ ﴾الفتح/٢٦.. واتە: (کاتێك کافران لەتوندڕەوی‌و پێداگرتنی کوێرانەی خۆیان دا ئەوپەڕی لوتبەرزو خۆبەزل زان بوون و نەیاندەهێشت موسڵمانان بچنە نێو -مسجد الحرام-ەوە، خوداش (ئارامی‌و دڵنیایی)ی لەلایەن خۆیەوە بۆ پێغەمبەرو بڕواداران ڕەخساندو فەرمانیشی پێدان پابەندبن بەوشەی خوا بەیەك گرتن (توحید)ەوە کە وشەی حەقی (لا اله الاّ الله محمد رسول الله)یەو کە بنەمای تەقواو لەخواترسانە).

دوای نووسینەوەی ئەو مەرجانە کە هەردوولا پێوەی پابەندبوون و کاریان پێ دەکرد، پیاوێکی موسڵمان کەناوی (أبا جندل) بوو و لەوەوپێش قورەیش نەیهێشتبوو هیجرەت بکات، پەنای بردە لای موسڵمانان و، پێغەمبەریش پێ ی فەرموو:{ئێمە ڕێکەوتننامەیەکمان لەگەڵ ئەو قەومەدا بەستووەو پەیمانێك لەنێوانمان دایەو نابێت بیشکێنین. جا تۆش بگەڕێرەوەو ئارام بگرەو دڵنیابە لەپاداشتت لای خودا، چونکە بێگومان خودا دەربازی ڕزگاربوونی بۆ تۆو هەموو بێ چارەو چەوساوانی ئەوێ داناوە} .

## دروستیی عەقڵی هاوسەری پێغەمبەر

دوای تـەواوبوونی مەسـەلەی سـولح و ڕێکەوتننامەکـە، پێغەمبـەری خـودا فـەرمانی بەموسڵمانەکان کرد کۆتایی بـە (ئیحـرام-ی عـومرە)کـەیان بێـنن و سـەریان بتاشـن و ئـەو ئاژەڵانەی بۆ قوربانیی دوای -عومرە-یان هێنابوو سەربڕن.

بەڵام موسڵمانان تووشی خـەم و خەفـەتێکی زۆربـوون و دەسـتیان نەدەچـووە سـەر هـیچ کارێك، ئەمەش وای لێ کردبوون دەست نەکەن بە بەجێ هێنانی ئەم فەرمانەی دوایی و واقیان ورمابوو.

لەو ساتەوەختە ناسك و حەسساسەش دا پێغەمبەر چووەوە نێو شـوێنی حەوانـەوەی خـۆی لەو چادرەدا کەبۆی ئامادەکرابوو و یەکێك لەهاوسەرانیشی (کە -ام سلمە- بوو) لەگەڵ خـۆی دا بردبوو. جا کە چووەلای (ام سـلمة)، فەرمووی: (مـوسڵمانان تیاچوون. فـەرمانیان پێدەکـەم کەچی جێبەجێ ی ناکـەن). (ام سـلمە)ش پـێ ی گـوت: (ئـەی پێغەمبـەری خـودا ئایـا تـۆ حەزدەکەیت ئەوان تیابچن؟ تۆ خۆت سەرەتا ئەو کارانەی فەرمانیان پێ دەکـەیت جـێ بـەجێ بکە، بڕۆ دەرەوە بۆلایان و بـێ ئـەوەی لەگـەڵ کەسـیان دا بـدوێیت بـەرانی قوربـانیی خـۆت سەربڕەو سەرتاشەکەت بانگ بکە با سەرت بۆ بتاشێت)...

پێغەمبەری خودائەو ڕایەی هاوسەرەکەی بەچاك زانی و چووە دەرەوە بێ ئەوەی لەگەڵ هیچ موسڵمانێك دا بدوێت هەتا قوربانی یەکەی سەربڕیو سەرتاشیشی بانگ کرد سەری بۆتاشی.

موسڵمانانیش هەر ئەوەیان لێ بینی، خێرا هەستان و قوربانی یەکانیان سەربڕی و دەستیان کرد بەسەرتاشینی یەکترو ئیدی گرفتی پابەندنەبوون بەو فەرمانەوە لەئارادا نەما.

بەم ڕەنگەش (أم سلمە) نموونەیەکی زیندووی لەڕاستی ی بـیروڕاو دووربینـی و دروسـتی ی عەقڵ پیشان دا.

## لابردنی مەرجێکی پەیماننامەکە

هەر لەو ماوەیەی کار بە پەیماننامەکە دەکرا، موسڵمانێکی دی لەلای قورەیشەوە ڕای کرد بۆلای پێغەمبەر کە (أبو بصیر -عتبە-ی کوڕی -أسید) بوو.

قورەیشی یەکانیش دووپیاویـان نـاردبوو بـەدوای داو داوای تەسـلیم کردنـەوەیان دەکـرد. پێغەمبەری خوداش فەرمانی بە (ابو بصیر) کرد لەگەڵیان دا بگەڕێتەوە. ئەویش لەگـەڵیان دا

گەڕایەوە. بەڵام لەڕێگەدا کاتێك نزیکی جێگەیەك بوونەوە پێی دەگوترا (ذا الحليفة) پەلاماری یەکێك لەو دووپاسەوانەی داو کوشتی و ئەوی تریشیان لەدەستی هەڵات. بەم چەشنە بۆ دووەم جار گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەرو پێ ی گوت (بێگومان تۆ بەپەیماننامەکەتەوە پابەند بوویت و منت بۆلایان گەڕاندەوەو ئیدی قورەیش گلەییت لێ ناکەن).

بەڵام پێغەمبەری خودا فەرمووی: (نەخێر، لێرە مەبە، بەڵکو بەئارەزووی خۆت بڕۆ بۆ جێگەیەکی دی و لە —مەدینە—دا مەمێنەرەوە).

ئینجا (ابو بصير) بەرەو ناوچەیەکی نزیك لەڕێگەی —شام— کەوتەڕێ کە کاروانی بازرگانیی قورەیشی پیادا تێ دەپەڕی و لەوێ جێگیربوو. بێگومان چەند موسڵمانێکی تریش لەوانەی لە —مەککە—وە لەو ماوەیەدا هەڵاتبوون لەو شوێنە لایان دابوو. جا هەموویان لەوێ بەیەك گەیشتن و (ابو جندل)ی یەکەم پەنابەری هەڵاتووش گەیشتە لایان و هەموان پێکەوە ڕێگەیان لەکاروانی بازرگانیی قورەیش دەگرت تا دۆخەکە گەیشتە ئەو ڕادەیەی (قورەیش) ناچاربن نوێنەریان بنێرن بۆلای پێغەمبەری خوداو تکای لابردنی ئەو مەرجەی پەیماننامەکەی لێبکەن و هەردوولا بیسڕنەوەو بەتاڵی کەنەوە، واتە ئەو مەرجەی کە دووەمین خاڵی پەیماننامەکەیان بوو و تایبەت بوو بەگێڕانەوەی هەر موسڵمانێك گەر لەمەککەوە ڕابکات بۆ —مەدینە—و یان هەر موسڵمانێك پاشگەزبێتەوەو هەڵێت بۆ ناو قورەیش و لەمەولا تەسلیمی بکەنەوە.

پێغەمبەریش ئەو تکایەی لێ پەسندکردن و بەم جۆرەش ئەو مەرجەی سەختەی نێو پەیماننامەکە هەڵوەشایەوە کە ئازارێکی توندی بەموسڵمانان گەیانبوو.

## بەرەنجامی پەیماننامەی - حودەیبییە-

لە (مجمع—ی کوڕی —حارثة) گێڕراوەتەوە کە گوتوویە: (بەشداریی ی —حودەیبییە—مان کردو کاتێك ئەو جێگەیەمان بەجێ هێشت دیتمان پێغەمبەری خودا لەشوێنێك دا، کەپێ ی دەگوترێت (كراع الغميم) ڕاوەستاوەو خەڵکی کۆکردۆتەوەو ئەوەی لەسرووش (وحی) بۆی هاتبووە خوارەوە دەیخوێندەوە بۆیان، کە ئەم ئایەتانەبوون:

﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا﴾ الفتح/١-٣

واتە: {ئێمە —ئەی پێغەمبەر— بڕیارمان دا بە —فەتحی —مەککە—و فەتحی شوێنانی تریش

لەداهاتوودا، ئەو فەتحەش ڕوون و ئاشکرایە. هەتا خودا بەگشتی لەهەموو شتێکی پێشوو و دواییشت ببووڕێت (بێگومان خودا ئەم فەتحەو —مغفرة—شی پێکەوە بەستۆتەوەو مەبەست لە لێخۆشبوونێکی ڕەهای گشتگیرو ڕێزنانە، چونکە پێغەمبەر پارێزراو بووە لەگوناەو سەرپێچی)... هەروەها بۆ ئەوەی خودا بەچەندین سەرکەوتن و فەتحی‌تر نیعمەتی خۆی تەواوکات بۆتان و جێگیرتان کات لەسەرڕێ ی ڕاست و، سەرکەوتنێکی بالادەستی و سەربەرزانەتان پێ ببەخشێت کەئایین بەهەموو لایەك دا بلاوکەنەوەو هەموو شوێنێکی سەرزەوی بەڕووی بەرنامەی خودادا بکەنەوە (واتە — فەتحی بکەن)..} ..

کاتێك پێغەمبەر ئەم ئایەتانەی لەو جێگەیەدا بۆ موسڵمانان دەخوێندەوە، پیاوێك لێ ی پرسی: (ئەرێ ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە —فەتح— بوو)؟ فەرمووی: (بەڵێ بەو خودایەی گیانی —محمد—ی بەدەستە ئەمە فەتحێکە)(1).

بێگومان خوێنەری بەڕێزیش سەری سوڕدەمێنێت لەم وەسفەی قورئان کەوا ئەو ڕێکەوتنەی (حودەیبییە)ی بەفەتحی ڕوون ودیار (الفتح المبين) دادەنێت لەکاتێك دا سوپایەکی وەك سوپاکەی موسڵمانان هەموویان ئەو ڕێکەوتنەیان بەلاوازی و بێ دەسەلاتی و خۆبەدەستەوەدان لەقەڵەم دەدا تەنها یەك پیاویان نەبێت، کە (ئەبوبەکر) بوو—خودا لێ ی ڕازی بێت-.

لەدواییش دا موسڵمانان بەرەوبوومی ئەو ڕێکەوتننامەیەیان بینیو بۆیان ڕوون بووەوە کە هەر ئەو ڕێگە چارەیە باشتربووە بۆیان و سوودی زۆرو گەورەتریشی لەهەر فەتحێکی پێشووتر هەبووە بۆیان. بەڵکو تەنانەت زیاتر بۆیان دەرکەوت کە دەبوایە ئەو هودنەیە هەبێت تاکو ڕێگە خۆش بێت لەبەردەم ئیسلام دا بۆ فەتحی دڵان لەڕێ ی قەناعەت پێ هێنان و بەڵگەی سەلمێنەرەوە نەك هەر لەڕێ ی شەڕو کوشتارەوە. دەبوایە هودنەیەك هەبێت کە ماوەیەك چەك بخرێتە لاوەو بوار بۆ عەقڵەکان بڕەخسێنرێت بەشێوەیەکی هێمنانە بیربکەنەوەو لە ڕێساو بنەماکانی ئەم ئایینە نوێیە شارەزابن و پاشان لەڕێ ی قایل بوون و قەناعەت پێهێنانەوە وەریبگرن نەك لەڕێی ترساندن و سام پێدانەوە.

زەمەن هێندە درێژەی نەکێشا کە ئەوانەی ئەو سوڵحەیان بەدڵ نەبوو هەموو حیکمەتێکی سوڵحەکەیان لەڕۆشنترین ڕواڵەت دا بەدی کرد، ئەمەش تەنها دوای دووساڵ لەسوڵحەکەو لەکاتی فەتح کردنی (مەککە)دا.

جا یەکێك لەو موسڵمانانەی ئامادەی ڕێکەوتننامەکەی — حودەیبییە — ببوون ئەو ڕووداوە گرنگە مێژوویی یەو بەرەنجام و ئاسەوارەکانی بەم چەشنە وەسف دەکات، کەدەڵێت:

(١) — امام احمد — گێڕاویتی یەوە.

{دوای ئەوەی دۆخی —هودنە—و ئاگربەست داهات و جەنگ و شەڕوکوشتار ڕاگیراو دەنگی چەك نەماو خەڵکی لەیەکتر بێخەم و پارێزراو بوون و بەیەك دەگەشتن و خەریکی دان وستان و ئاشتەوایی بوون و دەربارەی ئاکام و نالەباری یەکانی کوشتار دەدوان و موسڵمانانیش زیاتر بواریان بۆ ڕەخسابوو کەپەیوەندیی بەکەس و کارو هۆزو تیرەکانی ترو چین و توێژە جۆربەجۆرەکانی خەڵکی یەوە بکەن و چەندین بەرهەمی شیرینی بۆ ئیسلام و موسڵمانان تێدابوو.. ئەوەبوو هەر کەسێکی خاوەن عەقڵ و ژیری بدوێنرایە لەو ماوەیەدا خێرا باوەڕی دەهێناو موسڵمان دەبوو.

بێگومان لەو دووساڵەدا ژمارەی ئەو خەڵکەی موسڵمان دەبوون هێندەی ژمارەی ئەو چەند ساڵەی پێشوو بوون و تەنانەت زیاتریش بوون لەو ژمارەیەی ساڵانی تر. بەڵگەش لەم ڕووەوە ئەوەیە کاتێك پێغەمبەری خودا بۆ (حودەیبییە) ڕۆشت هەزارو چوارسەد کەسی لەگەڵ دا بوو، بەڵام دوای دووساڵ لەڕێکەوتنەکەو کاتێك بەرەو فەتح کردنی —مەککە— ڕۆیشت دە هەزار کەسی لەگەڵ دابوو...

لە (ابن مسعود)یشەوە گێڕراوەتەوە، کە گوتوویەتی: {ئێوە (فەتحی مەککە) بە —فەتح— دادەنێن —و ئێمەش ڕێکەوتننامەکەی —حودەیبییە— بە —فەتح— دادەنێین}.

بەڕاستی جورئەت و چاو قایمی ی پێغەمبەر لەبەجێ هێنان و بەستنی ئەو جۆرە پەیماننامەیەداو قایل بوونی بەو مەرجە قورسانەش سەرەڕای پێ ناخۆشبوونی زۆربەی هاوەڵانیشی و، وەسف و پێناسەی قورئان بۆ ئەم سولح و پەیماننامەیە بەوەی —فەتحێکی ڕوون و دیار—ە لەکاتێك دا هێشتا ئەنجامەکانی دەرنەکەوتبوون و، پاشان شایەتی دانی ئەو ڕۆژانەی دوایی لەسەر ڕاستی و دروستی ی ئەو هەنگاوە بەجورئەت و چاونەترسانەیەی پێغەمبەر... هەموو ئەمانە چەندین بەڵگەی بەهێزن لەسەر ڕاستی ی پێغەمبەرێتی ی (محمد)و لەسەرئەوەی، کە —قورئان— سرووشێکی خودایی یەو لەخوداوە بۆی هاتووە.

# بەندی چوارەم

## ((نامەکانی پێغەمبەر بۆ پادشاو سەرکردەکان))

دوای گەڕانەوەی موسڵمانان لە (پەیماننامەی -حودەیبییە) پێغەمبەری خودا وای بەچاك زانی کە ئیدی کاتی ئەوە هاتووە ئەو پەیامەی پێی ڕەوانەکراوە، بەسەرجەم خەڵکی جیهان بگەیەنێت، هەروەك خوداش لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾سبأ/٢٨...

ئەوەبوو پێغەمبەر چەند نوێنەرێکی خۆی بەچەند نامەیەکەوە نارد بۆلای ئەو پادشایانەی حوکمی وڵاتەکانی خۆیان لەو سەردەمەدا دەکردو لەنامەکان دا بانگەوازی بۆلای ئیسلام دەکردن و هەر نامەیەکیش بەمۆرێك ئیمزاکرابوو کە تازە دروست کرابوو و ڕستەی (محمد رسول الله)ی لەسەر هەڵکەندرابوو.

## نامەی پێغەمبەر بۆ پادشای - ڕۆم -

پێغەمبەر نامەیەکی بە (دحیة الکلبي)دا بۆ ئیمپراتۆری ڕۆمەکان ناردو تیای دا هاتبوو: {بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان... لە -محمد- ی پێغەمبەری خوداوە، بۆ -هیرقل- ی گەورەی ڕۆم-... سڵاو لەو کەسەی دوای ڕێبازی ڕاست دەکەوێت. دوای ئەمە.. من بەبانگەوازی ئیسلام بانگت دەکەم بۆ سەر ئەم ڕێبازە.. تۆش گەر موسڵمان ببیت سەلامەت و پارێزراو دەبیت و خودا دووجار پاداشتت دەداتەوە. خۆ ئەگەر بەدەم ئەم بانگەوازەوە نەیەیت و ڕووت وەرگێڕیت ئەوا گوناهی جوتیارانی دێهاتەکانت لەئەستۆدایە، جا وەك خوداش پێتان دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾آل عمران/٦٤.[١]

(١) واتای ئەم ئایەتە لەبەندێکی داهاتووی ئەم بەشەدا لێکدراوەتەوە.

## نامەی پێغەمبەر بۆ پادشای - فارس -

هەروەها پێغەمبەر نامەیەکی بە (عبداللە—ی کوڕی —حذافة)دا نارد بۆ (کیسرا—ی کوڕی —هورمز)ی پادشای فارسەکان و تێ ی دا هاتبوو: {بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان.. لە —محمد—ی پێغەمبەری خوداوە بۆ —کیسرا—ی گەورەی فارس-... سڵاو لەو کەسەی دوای ڕێبازی ڕاست دەکەوێت و باوەڕ بەخوداو پێغەمبەری دێنێت و شایەتی بەدڵ و زمان دەدات لەسەرئەوەی کەهیچ پەرستراوێك نی یە تەنها خودای تاك و تەنیای بێ هاوبەش نەبێت و، کە —محمد—یش بەندەو پێغەمبەری ئەم خودایەیە... جا وا من بەبانگەوازی خودا بانگت دەکەم بۆ ئەم ڕێبازە، چونکە بێگومان من پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودام بۆلای سەرجەم خەڵکی ی دنیا تا ئەو کەسەی زیندووەو لەژیان دایە ئاگادراو وریاکەمەوەو بڕیاری سزای خوداش لەسەر کافران جێگیربێت و شایستەی سزابن... جا تۆش موسڵمان ببە تا سەلامەت و پارێزراوبیت، بەڵام گەر وانەکەیت و نەیەیتە سەر ئەم دینە ئەوا گوناهی هەموو ئاگرپەرستان و جادووگەرانت لەئەستۆدایە}..

## نامەی پێغەمبەر بۆ پادشای - حەبەشە -

هەروەها پێغەمبەر نامەیەکی بە (جعفر—ی کوڕی —ابو طالب)دا نارد بۆ پادشای —حەبەشە—و تێیدا هاتبوو: {بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان، لە —محمد—ی پێغەمبەری خوداوە بۆ (نجاشي الأصحم)ی پادشای حەبەشە.. تۆ موسڵمان ببەو پەیڕەویی ئایینی ئیسلام بکە، منیش سوپاسی خودات لەسەر دەکەم، خودای (الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن)[1]. شایەتیش دەدەم، کە —عیسا— لەخوداوە ڕۆحی پێدراوەو هەر بەو وشە (کلمة)یەی خودا خۆی (کەپێی فەرموو ببە، بووە)و لە (مەریەم—ی کچی پاکیزەو داوێن پاکەوە) لەدایك بووەو خودای پەروەردگار لەڕۆحی خۆی دروستی کردووەو فووی ژیانی پێ داکردووە وەك چۆن بەدەست و فووی خۆی ئادەمی خەلق کرد. هەروەها من بانگت دەکەم بۆلای بەرنامەی خودای تاك و

---

(١) بەپێویستم زانی کە ڕاڤەو شیکاری ئەو ناوە پیرۆزانەی خودا بەتایبەتی لەم پەراوێزەدا بنووسم: (الملك): واتە خاوەنی هەموو شتێك کە توانای هەڵس و کەوت کردنیشی تیایان دا هەیە.. (القدوس): واتە زۆر پاك و دوورە لەهەر کەم وکوورِییەك.. (السلام): واتە سەلامەت و پارێزراوە لەهەر خەوش و نەنگییەك.. (المؤمن): واتە ڕەخسێنەری باوەڕو بەڕاست دانەری پەیامی پێغەمبەرانیەتی بەهۆی موعجیزەکانەوە. (المهيمن): واتە خاوەنی هەژموون و دەسەڵاتە لەسەر هەموو شتێك. (وەرگێر).

تەنیای بێهاوبەش و بەردەوامی لەسەر گوێڕایەڵی کردن و پەرستنیی‌و پەیڕەوی کردنی من و باوەڕهێنانت بەو پەیامەی کە بۆمن هاتووە. چونکە من پێغەمبەری خودام و لەگەڵ ئەم نامەیەدا کوڕی مامم (جعفر)و چەند کەسێکم لەموسڵمانان بۆلات ناردووە، جا ئەگەر (جەعفەر) هات بۆلات دانی پێ دانێ و باوەڕ بەم پەیامە بێنە لەلای و، لەخۆبوردوویەو خۆت بەزل مەگرە، چونکە من تۆش و سەربازەکانیشت بۆ بەرنامەی خودا بانگ دەکەم. جا وا ئیتر من بانگەوازەکەم پێ گەیاندن و ئامۆژگاریم کردن. ئێوەش ئامۆژگاری و ڕێنماییم وەرگرن... سڵاو لەو کەسەش کەدوای ڕێبازی ڕاست دەکەوێت} .

هەروەها پێغەمبەر بەهەمان واتاو مەبەست چەند نامەیەکی تری ناردووە بۆ هەریەکە لە (مقەوقس—ی گەورەی قیبتی یەکان)و —حاکمی میسر—و-نەسرانی یەکانی (نەجران)و پادشای (عومان)و — هەموو ئەو سەرۆك و سەرکردانەی کەوڵات و میرنشینییەکانیان نزیك و هاوسێی دورگەی عەرەب بوون لەو سەردەمەدا.

## دڵنیابوونی پێغەمبەر لەسەرکەوتنی ئیسلام

ئەوەی شایانی سەرنج و تێبینیی کردنە ئەوەیە پێغەمبەر لەکاتێك دا ئەو نامانەی بۆ ئەو پادشاو سەرۆکانە ناردبوو کەهێشتا دەسەڵاتی لەناوچەی دورگەی عەرەبی دا پەیدانەکردبوو. بەڵام بەمتمانەکردن و دڵنیابوونی تەواوی لەو سەرکەوتنەی کەخودای پەروەردگار بەڵێنی پێ دابوو و کەئیسلام بەسەر هەموو ئاینەکانی ئەو سەردەمەی دا سەردەخات گرنگترین هۆکارو پاڵنەربوو بۆ لەئەستۆنانی ئەو ئەرکە قورسە. بەڵێنی خوداش لەو ئایەتەی سوورەتی (فەتح)دا ڕەنگی دەدایەوە کەدوای ئیمزاکردنی (پەیماننامەی حودەیبییە) هاتەخوارەوە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴾الفتح/٢٨..

بێگومان ئاینی ئیسلام سەرکەوت و گەیشتە هەموو ئەو مەملەکەت و میرنشینییانەی کەپێغەمبەر نوێنەرانی خۆی بەنامەکانیەوە ناردبوو بۆیان، هەروەها لەماوەی چەند دەهەیەکی کەمی دوای وەفاتی پێغەمبەری خودا، ئیسلام بەسەر هەموو ڕێچکەو ئاینەکانی تردا سەرکەوت.. لەڕاستی دا بەدی هاتنی ئەو بەڵێنە لەگەورەترینی ئەو بەڵگانەیە لەسەرئەوەی کەقورئان سرووشێکی خوداییەو لەسەر ڕاستی ی پێغەمبەرێتی ی (محمد)یش.

## ئیسلام بانگەوازێکی چاکسازی یە

ئیسلام ئایینێکی جیهانی یە نەك ئایینێکی ناسیونالی و نەتەوەیی... ئیسلام بۆ چاکسازی یەکی گشتی هاتووە دوای ئەوەی ئاینەکانی تری خودا پڕکران لەبیدعەو شتی سەیروسەمەرە. هەر بۆیە دەبینین پێغەمبەر لەنامەکەی دا بۆ (هیرقل)ی پادشای ڕۆم بەم ئایەتە قورئانی یە ئەرکی ئیسلام دیاری دەکات: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾آل عمران/٦٤.. واتە: {ئەی پێغەمبەر بڵێ: (ئەی ئەهلی —کیتاب— (واتە: ئەی شوێنکەوتوانی تەورات و ئینجیل)، ئەی جوولەکەو گاورەکان، وەرن با هەموومان لەسەر شوشەیەکی دادپەروەرێتی و یەکسانیخواز ڕێك کەوین سەبارەت بەوەی شوێنکەوتووی یەك خودای بێ هاوەڵ و تاك و تەنیابین و هیچ هاوبەش و شت و مەکێکی تری بۆ دانەتاشین و کەسیش نەکەین بەگەورەو بەدانەری حەرام و حەڵاڵ و نەڵێین (عوزێر)، یان (مەسیح) کوڕی خودایە)، خۆ ئەگەر ئەوان —واتە: جوولەکەو گاروەکان بەدەم ئەم بانگەوازەتەوە نەهاتن و بیسەری ئامۆژگاری یەکانت نەبوون ئەوا تۆش خۆت و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵتان پێ یان بڵێن: (دە ئیتر خۆتان شایەت بن لەسەرئەوەی، کە ئێمە موسڵمانین و چووینەتە سەر ئەو ئاینەی کە ئێوەی بۆ بانگ دەکەین و کەچی ڕووی لێ وەردەگێڕن}.

بەڕاستی لەم ئایەتەدا بانگەوازێك بەدی دەکرێت بۆ شوێنکەوتوانی ئاینەکانی تر، کە بە (أهل الکتاب) دادەنرێن واتە: (جوولەکەو مەسیحی یەکان) کە هەردوو کتێبی (تەورات و ئینجیل)یان بۆ ڕەوانەکرابوو و، بەڵام دەسکارییان کردبوو و، ڕێسا دروستەکانیان شێواندبوو، لەم ئایەتەدا بانگ کراون بۆ یەکخواپەرستی (تەوحید) کە بیروباوەڕێکی هاوبەشی نێوان هەموو ئاینەکانە، ئەم یەکخواپەرستی یەش وشەیەکی دادپەروەری و ڕاستی خوازی یەو، یەکسانیی دەخاتە نێوان بڕوادارانەوە. هەر ئەم وشەیەش زامنی پاکژکردنەوەی عەقیدەی هەموانە لە ئەفسانەو گومڕایی، چونکە هیچ خالق و کردگارێك نی یە تەنها خودا (الله) نەبێت، مافی خوایەتیو (پەروەردگارێتی)یش جگە لەخودا بۆ هیچ کەسێکی دی نی یە، سا ئیتر پادشا بێت یان پێغەمبەرێك، یاخود زانایەك بێت... ئا ئەمەیە عەقیدەی ڕەهاو بەربڵاوی یەك خواپەرستی کەخەڵکی ڕزگاردەکات لەعیبادەت و پەرستنی یەکدی و ڕێ نادات هەندێك کەس هەندێکی دی بپەرستن و، خۆیان بەسەر ئەوانی تردا بەرزو پیرۆز بگرن، چونکە خەڵکی هەموویان بەندەی خودایەکی تاك و بێ هاوەڵن و جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تریان نی یە.

بەم ڕەنگەش عەقیدەی یەکخواپەرستی و خوا بەیەك گرتن بۆ ڕزگارکردنی گرۆی بەشەری بووە لەهەر کۆیلەیەتی و بەندایەتی یەك. بەندایەتی کردنیش بۆ یەکێکی دی (لە مەخلووقات) بەهاوبەش بۆ خوادانان لەقەڵەم دراوە. جا ئەگەر (ئەهلی کیتاب) بەدەم ئەم بانگەوازەوە هاتبن ئەوە دیارە ئەوان لەئیسلام نزیك بوونەتەوە، خۆ ئەگەر ملیان بەمە نەدابێت ئەوا پێغەمبەرو ئەو بڕوادارانەی شوێنی کەوتوون دەبێت بەفەرمانی خودا پێ یان بڵێن (دە ئیتر خۆتان بەشایەت بن ئەوا ئێمە موسڵمانین و بەدەم ئەو بانگەوازەوە هاتووین) ﴿فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾. چونکە پێغەمبەران هەموویان خوا بەیەك گرو یەکخواپەرست بوون. بۆ نموونە لەیەکەمین بنەمای شەریعەتی —مووسا—دا فەرمایشتێکی خودا هەیە (هەروەك لەکتێبەکانی جوولەکەش دا هاتووە) کەخودا پێ ی فەرمووە: {منی -خودا- پەرستراوتم، نابێت هیچ پەرستراوێکی ترت لەبەردەما هەبێت}.

ئەو (١٠) ڕاسپاردەیەش، کە هیچ شتێکیان بۆ لێ (نەسخ) نەکراوەتەوە ناواخن و کرۆکی هەر لەسەر یەکخواپەرستی یە، (عیسا)ش دەڵێت: {وا تێ مەگەن من بۆ دانانی شەریعەت و ئایین هاتبم بەڵکو منیش و پێغەمبەرانیش بۆ تەواوکردنی پەیامی یەکدی هاتووین، من بۆ حەرام و حەلاڵ دانان نەهاتووم، بەڵکو بۆ جێبەجێ کردنیان}.[1]

لە (عهد القديم)یش دا لە —مەسیح—ەوە دووپاتی ئەو ڕاستی یە کراوەتەوە... (دنا أحد الكتبة... فسأله اية الوصايا هي أول الكل؟ أجابه يسوع: ان اول الوصايا كلها، اسمع يا اسرائيل: ان الرب الهنا رب واحد)[2].

ئێستاش با بێینە سەر شیکاری بەشی دووەمی ئایەتەکە ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ...﴾، کە بڕیار لەسەر یەکێتیی ی پەروەردگارێتی ی خودا دەدات: ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ قورئان تەفسیرو ڕاڤەی ئەم پەروەردگارێتی یەی خودای بە ئایەتێکی دی کردووە: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾التوبة/٣١.. واتە: {جوولەکەو دیانەکان زاناو خواپەرستە خەڵوەتچی یەکانیان کردبوون بەچەند پەروەردگارێکی وەها بۆ خۆیان کە وەك خودا گوێڕایەڵییان دەکردن}.

کاتێك پێغەمبەر ئەم ئایەتەی دوایی ی بۆ خەڵکی دەخوێندەوە، پێ ی گوترا: {ئەی

(١) – متي – (٥: ١٧).
(٢) – مرقس – (١٢: ٢٨ - ٢٩).

پێغەمبەری خودا ئەوان (واتە جوولەکەو دیانەکان) ئەو زاناو ڕاهیبانەیان نەدەپەرست}.
ئەویش فەرمووی: (مەگەر هەر ئەو زاناو ڕاهیبانەیان نەبوو کە ئەوەی خودا بەحەڵاڵی دانابوو ئەوان حەرامیان دەکرد بۆیان و ئەوەش کەخودا حەرامی کردبوو بەحەڵاڵیان دادەنا)؟.. کەوابوو گوێڕایەڵی کردنی سەرانی ئایینی لەبڕیارەکانیان داو دانانی بڕیارەکانیشیان لەپلەی ئەو حوکم و فەرمانانەدا، کەخودا بەشەرع و دەستوور ناردوونیە خوارەوە بێ خۆبەستنەوە بەسرووشی خودایی یەوە، دەرچوونە لەواتاو ڕۆحی ئایین.
بێگومان هەر ئەو حاڵەتەش بووە هۆی دەسکاری کردنی ئایین و پەیدابوونی ناکۆکیو خیلافات لەهەر ئاینێك دا کە وای بەسەر هاتبێت.

## کاریگەریی نامەکانی پێغەمبەر

با بێینەوە سەرباسی ئەو نامانەی پێغەمبەر ناردبوونی بۆ سەرۆك و پادشایانی ئەو سەردەمەو گەر ئاماژەیەك بۆ کارایی نامەکان بکەین دەبینین هەرچەندە ئەگەر سەرکەوتنێکی وایان بەدی نەهێنابێت، بەڵام هەر جێ ی بایەخ بوون، بەتایبەتیش کە هەندێك لەو پادشایانەی نامەکانیان پێ گەیشت بەباشی مامەڵەیان لەگەڵ داکردبوو، وەك (نەجاشی)ی پادشای –حەبەشە– و، -(مقەوقس–ی گەورەی –قیبطی یەکان– کە ئەم پادشایە، واتە (مقەوقس) دیاری ی بۆ پێغەمبەر ناردو دیاری یەکەش دوو کەنیزەو چەند پۆشاك و ئێسترێك بوون).
سەبارەت بە (قەیسەری ڕۆم)یش کاتێك نامەکەی پێغەمبەری بەدەست گەیشت داوای لە دارو دەستەکەی کرد چەند پیاوێکی عەرەبی گەشتیاری ناو وڵاتەکەی خۆی بۆ بانگ کەن تاکو دەربارەی پێغەمبەر پرسیاریان لێ بکات. ئەوانیش لەوڵات دا دەگەڕان بەدوای خەڵکی عەرەب داو، تا دواجار وا ڕێکەوت (ابو سفیان–ی کوڕی –حرب)یان لە –شام– دۆزی یەوە کە لەگەڵ کۆمەڵێك لەخەڵکی –قورەیش–دا بۆ کاری بازرگانی لەوێ بوون و بانگیان کردن بۆ دیداری ئیمپراتۆر. ئەوانیش چوونەلای و لێ ی پرسین (کامتان بە ڕەچەڵەك نزیکترن لەو کابرایەی، کە خۆی وا ناساندووە گوایە پێغەمبەرێکەو لەخوداوە ڕەوانەکراوە)؟ –ئەبو سوفیان– گوتی: (من لە هەموویان نزیکترم لێوەی). قەیسەر پێی گوت: (نزیك بەرەوەلێم). پاشان لێ ی پرسی: (پلەوئاستی کۆمەڵایەتی و خانەدانی ی ئەو پیاوە لەناوتان دا چۆنە)؟ گوتی: (ئەو لەنێومان دا خاوەنی بنەماڵەیە). هەروەها لێ ی پرسی: (ئایا بەر لەو هیچ کەسێکی ترتان ئیددیعای ئەم کاری پێغەمبەرێتی یەی بۆ خۆی ڕاگەیاندووە)؟ (ئەبو سوفیان) گوتی: (نەخێر). ئینجا

(قەیسەر) گوتی: (ئەی ئایا ئێوە لەوەوپێش تاوانی درۆکردنتان دەدایە پاڵی بەرلەوەی ئەم جارە بۆ خۆی بدات)؟! گوتی: (نەخێر)[١]. دووبارە لێ ی پرسی: (ئەی ئایا لەباب و باپیرانیەوە هیچ موڵك و دەسەڵاتێکی بۆ بەجێ ماوە؟) — ابو سفیان — گوتی: (نەخێر). ئیمپراتۆری رۆم لەپرسیارێکی تری دا گوتی: (ئایا لەنێو خەڵکی دا گەورە پیاوو دەست ڕۆیشتوان دوای ڕێبازەکەی کەوتوون، یان هەژارو چەوساوان؟). لەوەڵام دا گوتی: (تەنها هەژارو چەوساوەکان).ئینجا پادشا لێی پرسی: (ئەی ئایا ئەو هەژارو چەوساوانە ژمارەیان زیاد دەکات یان کەم دەکات)؟ ئەویش گوتی: (لەزیادبوون دان). ئیمپراتۆر[٢] گوتی: (ئایا هیچ کەسێکیان لە ناقایلی دا لەدینەکەی هەڵدەگەڕێتەوە)؟ گوتی (نەخێر)... قەیسەر گوتی (ئایا محمد ئەگەر پەیمان بدات پێشێلی دەکات)؟ گوتی {نەخێر، ئێستاش لەنێوان ئێمەو ئەودا پەیمانامەیەك هەیەو نازانین چی ی تێدا دەکات؟} . پاشان قەیسەر گوتی: (جەنگی نێوان ئێوەو ئەوان چۆنەو کام لا بەتواناو سەرکەوتوون)؟ (ئەبو سوفیان) گوتی: (جەنگی نێوانمان بەنۆرەیە جارێك سەرکەوتن بۆ ئێمەیەو جارێك بۆ ئەوانە). قەیسەر گوتی: ( ـ محمد ـ چ فەرمانێکتان پێ دەکات)؟ گوتی: { پێمان دەڵێت: (تەنها خودای تاك و بێ هاوەڵ بپەرستن و هیچ شتێك مەکەن بەهاوبەش (شریك) بۆی)، داوای قەدەغەکردنی ئەو بتانەشمان لێ دەکات، کە باب و باپیرانمان پەرستوویانن، فەرمانیشمان پێ دەکات بەنوێژکردن و ڕاستگۆیی و داوێن پاکی و ڕەوشتبەرزی و پەیمان بردنەسەرو گەیاندنی سپاردە} .

گێڕراویشەتەوە کەدوای ئەو وت وویژە ئیمپراتۆری ڕۆمەکان لەهەموو ئەو وەڵامانەوە ئەو دەرەنجامەی دەست کەوتووە کە بێگومان (محمد) بەڕاستی پێغەمبەری خودایە. هەر بۆیەش لەدوا وتەی دا بە (ئەبو سوفیان)ی گوتبوو: {ئەو قسانەی بۆت کردم ڕاست بن، رۆژێك دێ ئەو پیاوە — (محمد) — دەبێتە خاوەن و سەرداری ئەم جێگەیەی کە لەسەری وەستاوم} .

---

(١) وا گێڕراوەتەوە، کە (هیرقل) لەبەرامبەر ئەم وەڵامەی دوایی دا گوتوویەتی (کەوابوو ئەو — واتە: محمد — ئەگەر درۆ لەگەڵ خەڵکی دا نەکات چۆن درۆ لەگەڵ خوادا دەکات)؟

(٢) وشەکانی (قەیسەرو ئیمپراتۆر)یش هەر بۆ پادشای ڕۆمەکان (هیرقل) بەکارهێنراوە.

# بەندی پێنجەم

## (( فەتح کردنی –مەککە- ))

( "قورەیش" پەیمانەکە دەشکێنن - بەڕێخستنی لەشکرێك بەنهێنی بۆ "مەککە" - لەڕێگادا بەرەو "مەککە" - موسڵمان بوونی سەرکردەی "قورەیش" - پێغەمبەر دەچێتە نێو "مەککە"وە - لێبوردنە گەورەکە - یەکسانی لەنێوان خەڵکیدا - هێمنترین مرۆڤ )

## "قورەیش" پەیمانەکە دەشکێنن

لەساڵی هەشتەمی کۆچی (هیجری)دا ڕووداوێکی وا هاتە ئاراوە کە هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکەی (حودەیبییە)ی پێویست و شیاوکردو بەم پێ یەش جاری جەنگی لەدژی قورەیشیش ڕەواکرد. ڕووداوەکەش بەم شێوەیە بەرپابوو:

هۆزی (خزاعە) پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەستبوو. ڕۆژێکیان پیاوێك لەهۆزی (بنوبکر) لەبەرچاوی پیاوێکی (خزاعی) قسەی نابەجێ ی بەشەخصی پێغەمبەری خودا دەگوت، ئەویش (واتە پیاوە –خزاعی–یەکە) هەستایە سەرێو لێ ی دا. ئینجا هۆزی (بنوبکر) بەپەلە خۆیان سازدا بۆ تۆڵەسەندنەوە لە (خزاعە)و بڕیاری هەڵگیرساندنی جەنگیان لەسەردان. لەملاوە قورەیشی یەکانیش بەنهێنی یارمەتی ی ئەو هۆزە شەڕانگێزەی (بنوبکر)یان داو چەندان جەنگاوەرو چەك و کەرەسەی جەنگییشیان بۆ ناردن و پتر لە (٢٠) پیاوی هۆزی (خزاعە)ی هاوپەیمانی پێغەمبەریان کوشت. دیارە تاکە ڕێگە چارەی (خزاعی)یەکانیش ئەوەبوو وەفدێکیان نارد بۆلای پێغەمبەرو هەواڵی ئەو ڕووداوەیان پێ گەیاند.

قورەیشی یەکانیش کاتێك بۆیان دەرکەوت ئەو کارەیان پێچەوانەی پەیماننامەی ڕێکەوتنەکەیە خێرا سەرکردەی خۆیان (ابو سفیان–ی کوڕی –حرب)یان نارد بۆ (مەدینە) بۆ تازەکردنەوەی ڕێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەرداو درێژکردنەوەی ماوەکەی. ئەویش چووەلای پێغەمبەرو دەربارەی ئەو کارە بۆی دەدوا کە قورەیش پێی سپاردووەو کە ڕێکەوتننامەکەی نێوان هەردوولا تازە بکرێتەوەو خۆیشی وا دەردەخست گوایە ئاگای لەو هەرایەی نێوان (بنوبکر)و (خزاعە) نی یەو نەیشیزانیبوو، کە وەفدی (خزاعە) پێش خۆی گەیشتوونە لای

پێغەمبەرو هەواڵی ئەو دەسدرێژی یەی قورەیشیان پێ گەیاندووە. جا دوای ئەوەی (ابو سفیان) کۆتایی بەقسەکانی هێنا، پێغەمبەر لێ ی پرسی: {ئایا هیچ شتێکی وا ڕووی داوە کە ئەوە بخوازێت تۆ بگەیتە ئێرە} ؟ ئەویش لەوەڵام دا نکوولی ی لەهەر ڕووداوێـك دەکـرد. پێغەمبەر خێرا پێ ی فەرموو: {کەوابوو ئێمە پابەندین بەکات و پەیماننامەکەی نێوانمانەوە} ئیتر هیچی دیکەی بۆ زیاد نەکرد، مانای دەستەواژەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەگەر ئەوان پەیمانامەکە پێشێل بکەن ئەوا موسڵمانەکان مافی هێرش بردنەسەریان هەیە.. ئەوسا (ابو سفیان) بۆی دەرکەوت کە ئەو لەو وت ووێژەی دا سەرکەوتوو نەبووە. هـەر بۆیـەش خۆی گەیاندە لای چەند پیاوێکی دیاری موسڵمانان و تکای لێ کردن کە بچنە لای پێغەمبەرو داوای لێبکەن ئەوەی، کە (ابو سفیان) لە پێناوی دا هاتووە بۆی جێبەجێ بکـات، واتـە ئـەو پەیماننامەیەی نێوانیان بۆ ماوەیەکی تر درێژو نوێ بکرێتەوە. بەڵام هـیچ کەسێك لـەو پیـاوە موسڵمانانە بەدەم داواکەیەوە نەچوون و ئەویش بەنائومێدی گەڕایەوە بۆ — مەککە -.

## بەڕێخستنی لەشکرێك بەنهێنی بۆ — مەککە-

کاردانەوەو هەڵوێـستی پێغەمبـەریش لەبەرامبـەر ئـەو دەسـدرێژی و پەیمانـشکێنی یـەی قـورەیش دا ئـەوەبوو فـەرمانی دا بەڕێکخـستنی سـوپاو کۆکردنـەوەی هـەموو ئـەو خەڵکـە موسڵمانەی کە لەدێهات و ناوچەکانی دەوروبەری —مەدینـە—دا دەژیـان. بـەڵام باسـی نیـازو ئامانجی لەسازکردن و بەڕێ خستنی ئەو سـوپایەی بـۆ مەککـە لای کـەس نـەکرد تـاکو ئـەم هەواڵەبڵاونەبێتەوە نەبادا قورەیش پێ بزانن و خۆیان ئامادە بکەن بـۆ جـەنگ. پێغەمبـەریش بەتەمای جەنگ و کوشتار لە —مەککە— نەبوو و حەزی بـەخوێن ڕشـتنیش نـەدەکرد، لەبـەر ئەمەش لەخودا پاڕایەوەو ئەم نزایەی لەلاکرد: (خودایـە هـەموو هـەواڵ و نهێنـی و دەنـگ و باسێکمان لە قورەیش بشارەوە تاکو لەوڵاتی خۆیشیان دا پێمان نەزانن و سەرخەرمان بیت).

یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر کە ناوی (حاطـب—ی کوڕی —ابو بلتعە) بوو و چەند کـەس و کارێکی نزیکی لە (مەککە)دا مابوو و لەپێناوی ئەوان دا ویستی کارێکی چـاك بـۆ قـورەیش ئەنجام دا تاکو ئازاری قورەیش لەسەر کەس وکاری هەڵگیرێت. کارەکەشی ئـەوەبوو نامەیـەکی بۆ قورەیش نووسیبوو دەربارەی هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەر بەو سوپایەوە بەنهێنی بۆ لایان لە —مەککە-. پاشان نامەکـەی دایەدەسـت ئافرەتێـك، کـە ئـەویش بـەکرێ بـۆی بگەیـەنێت. ئافرەتەکەش نامەکەی لێ وەرگرت و لـەنێو قژی دا شـاردی یـەوەو کەوتـەڕێ بـۆ گەیانـدنی بەسەرانی قورەیش.

بەڵام خودای میهرەبان لەئاسمانەوە هەواڵی ئەم کەین وبەینەی بەپێغەمبەرەکەی گەیاند دەربارەی ئەو هەوڵە نالەبارەی (حاطب). پێغەمبەریش دەسبەجێ (علی–ی کوڕی –ابو طالب) و (زبیر–ی کوڕی –عَوام)ی بەدوای ئەو ئافرەتەدا ناردو پێیشی فەرموون (خێرا بگەنەوە بەو ئافرەتەی کە –حاطب– ناردویەتی بەنامەیەکەوە بۆلای قوڕەیش و وریایان دەکاتەوە لەو نەخشەیەی کە بەرامبەر ئەوان گرتوومانەتەبەر.

(علی)و (زبیر) بەپەلە دەرچوون و گەیشتنەسەر ئەو ڕێگەیەی، کە ژنەکەی پیادا دەڕۆشت و لەسەرڕێ ی (مەککە) گرتیانەوەو نامەکەشیان پێ بینی و لێ یان سەندەوەو هێنایانەوە بۆلای پێغەمبەرو نەیانهێشت بیگەیەنێت بەقوڕەیش.

پێغەمبەریش (حاطب)ی بانگ کردو لێ ی پرسی: (ئەی –حاطب– چی وای لێ کردیت ئەم کارە بکەیت)؟ ئەویش لەوەڵام دا گوتی: {ئەی پێغەمبەری خودا سەبارەت بەخۆم وەڵلاهی باوەڕی تەواوم بەخوداو پێغەمبەرەکەی هێناوەو خۆم بەئیماندار دەزانم.. نەگۆڕراوم و نەخۆیشم لێگۆڕراوە. بەڵام کابرایەکم هیچ بنەچەو تیرەیەکم نییە، تەنها کوڕێکم لەگەڵ خێزانەکەم لەلایان بەجێ ماوەو منیش لەپێناویان دا چاکەیەکی ئاوام لەگەڵ قوڕەیش داکرد} .

لەو کاتەدا (عمر–ی کوڕی –خطاب) گوتی: (ئەی پێغەمبەری خودا ڕێم بدە ملی بپەڕێنم چونکە ئەم کابرایە دووڕوو دەرچووە).. پێغەمبەریش فەرمووی: }ئەی –عومەر– تۆ چووزانیت وایە، بەشکم خودا لەڕۆژی جەنگی –بەدر–دا ڕووی کردبێتە هاوەڵە بەشداربووەکانی ئەو جەنگەو پێ ی فەرموون: (بەئارەزووی خۆتان هەموو شتێك بکەن، چونکە وا لێتان خۆشبووم)} ...

بێگومان (حاطب)یش لەوە هاوەڵە جوامێرانەبوو، کە بەشداریی جەنگی –بەدر–یان کردبوو. جا هەر دوای ئەو مەسەلەیەش خودا دەربارەی (حاطب) ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ ﴾... تا کۆتایی ی ئایەتەکە، کە ئایەتی ژمارە(١)ی سوورەتی (الممتحنة)یە. واتە: {ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەکەنە پاڵپشت و هاوکار و خۆشەویستیو هاوکارییان بۆ بنوێنن} ...

پێغەمبەریش بەتێڕاوتینی کاروبارو وەرگرتنی پاساو لەکابرای بەهەڵەداچوو وانەیەکی کاریگەریی خستۆتە بەرچاوی خەڵکی، بەتایبەتی کاتێك باری ڕاستی و حەقیقەتی مەترسییەکەی بۆ ڕوون کردۆتەوەو ئەویش لەو هەڵەیەی خۆی پاشگەز بووەتەوە.

کەچی زۆر کەس لەبەر پرسان و دەسەڵاتداران کاروباری خۆیان لێ تێکەڵ وپێکەڵ دەبێت و ناتوانن چاوپۆشی لەهەڵەیەکی بچووك بکەن گەر (ئەو کەسە بەهەڵەداچووە) هەر چەندێك ڕۆڵی گەورەو گرنگیشی گێڕابێت.

قورئانیش مەسەلەکەی بەم فەرمایشتەی خودا ڕوون کردۆتەوە: ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾هود/١١٤.. بێگومان پێغەمبەریش کێشەی ئەو هاوەڵە بەهەڵەداچووەی بەو تەرازووە هەڵسەنگاندو بەهۆی (مەینەتباربوونی پێشتری لەخزمەت کردنی ئیسلام) و (بەشداریی لەیەکەم جیهاد)دا لەو هەڵە کت وپڕی یەی خۆشبوو.

## لەڕێگادا بەرەو – مەککە -

پاشان پێغەمبەر بەسەرکردایەتی دە هەزار جەنگاوەر لەناوەڕاستی مانگی –ڕەمەزان–دا بەرەو –مەککە– بەڕێکەوتن. لەڕێگادا مامی خۆی (عباس–ی کوڕی –عبدالمطلب)ی پێگەیشت کە لەگەڵ منداڵەکانی دا هیجرەتی بۆ–مەدینە–دەکرد بەمەبەستی موسڵمان بوون و هەر لەوێش دا چووە پاڵ موسڵمانان.

هەروەها لەڕێگەدا (ابو سفیان–ی کوڕی –حارث–ی کوڕی –عبدالمطلب) و (عبدالله–ی کوڕی –أبي أميّە) بەکۆمەڵی موسڵمانان گەیشتن و دەیانویست چاویان بەپێغەمبەر بکەوێت. ئەم داواکاریەش بەهاوسەری پێغەمبەر (ام سلمە) گەیەنرا، کە لەگەڵی دابوو لەو سەفەرەدا، ئەویش بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ پێغەمبەردا دواو پێ ی گوت: {ئەی پێغەمبەری خودا ئامۆزاکەت و پوورزاو زاواکەت هاتوون و دەیانەوێت داوای لێبوردنت لێ بکەن} . پێغەمبەری خوداش لەوەڵامیان دا فەرمووی: {نامەوێت بیانبینم و هیچ ئاتاجێکم پێ یان نی یە، ئامۆزاکەم ئابڕووی پێشێل کردم و پوورزاکەشم قسەی خۆی لە -مەککە– پێ گوتم} .

ئەو قسەیەش، کە پوورزاکەی بەرامبەری کردبووی ئەوەبوو زۆر بێ باکانە پێ ی گوتبوو: {وەڵڵاهی باوەڕت پێ ناهێنم هەتا پەیژەیەك بەرەو ئاسمان هەڵنەبڕیەو پێ‌ی‌دا سەرکەویت و منیش بۆت بڕوانم، پاشان کتێبێك و چوار مەلائیکەت بێنیتە خوارەوەو شایەتییت بۆ بدەن لەسەر ئەوەی کەخودا ڕەوانەی کردوویت و کردوویتی بەپێغەمبەر}[1] .

کاتێك (ام سلمە) ئەو وەڵامەی پێغەمبەری بەو خزمانەی گەیاند، (ابو سفیان–ی کوڕی –حارث–ی کوڕی عبدالمطلب)ی ئامۆزای لەوەڵام دا گوتی: {وەڵڵاهی یان دەبێت پێغەمبەر

(١) بڕوانە (الروض الألف: ٢ / ٢٧٦)

ڕێمان پێ بدات بە (چوونەلای و داوای لێبوردن لێکردنی) یاخود دەستی ئـەم کـوڕەم دەگـرم و سەری خۆمان هەڵدەگرین و هەر دەڕۆین و دەڕۆین تاکو لەبرسان و لەتینوان دا دەمرین).
جا کە ئەم وتەیە بەپێغەمبەر گەیەنرا دڵی نەرم بـوو و ڕێ ی بـەویش و بەهاوڕێکەشـی دا بچنەلای، ئەوانیش چوونە ژوورەوە بۆلای و موسڵمان بوون. بەم پێ یەش بۆمـان دەردەکـەوێت چۆن پێغەمبەری خودا لەخۆبوردوو بووەو لەهەڵەوتاوانی ئەوانەش بووراوە کەخراپەیان دەرهـەق کردووە، ئەم لێبوردنەش بەهەستی ڕەحمەت و میهرەبانی یەوە بووە.

## موسڵمان بونی سەرکردەی – قورەیش -

لەشکرەکەی پێغەمبەر لەڕۆشتن بەردەوام بوو تا گەیشتە جێگەیەك پـێ ی دەگوترێـت (مـر الظهران)و لەوێ لایان دا. دیارە ئەم هەواڵـەش لـەقورەیش شـارراوەبوو و بـەجم وجـووڵی ئـەو لەشکرەیان نەزانیبوو و هیچ هەواڵێکیان لەبارەی پێغەمبەرەوە پێ نەگەیشتبوو و نەشیاندەزانی پێغەمبەر چی دەکات بەرامبەریان...

لەشەوێك لە شەوانی ئەو ماوەیەش دا (ابو سفیان–ی کوڕی حرب) کە سەرکردەو پێشەوای قورەیش بوو لەگەڵ(حکیم–ی کوڕی–حزام)و (بُدیل–ی کوڕی–ورقاء)دا لە–مەککە– دەرچوون بۆ زانینی چەند هەواڵ و دەنگ و باسێکی تازە. لەڕێگاش دا ئاگرێکی ڕۆشنیان بەدی کرد، کە لەوەوبەر ئاگری لەو چەشنەیان لەسەر بازگەکانی موسڵمانانەوە بەدی نەکردبوو. بەڵام لەهەمان کات دا نەیاندەزانی کێ لەوێ یەو بۆچی ئەو ئاگرانەیان هەڵگیرساندووە.
(عباس)ی مامی پێغەمبەریش بۆ قـورەیش نیگـەران بـوو و دەترسـا لـەوەی بـەرەنگاری پێغەمبەر ببنەوەو بەهۆی ئەوەشەوە لەناوچن و تەفروتوونا بن. بۆیە خێرا سـواری هێـسترەکەی پێغەمبەر بوو و لەسەربازگەی موسڵمانان دەرچوو هەتا کەسـێکی وا ببینێـت لەوانـەی بـۆ – مەککە– دەچن و نامەیەکی پێ دابنێرێت بۆیان و تیای دا فەرمانیان پـێ بکـات کـە تـازووە دەرچن و بێن بۆلای پێغەمبەرو داوای هێمنیو سـەلامەتیی خۆیـانی لێ بکـەن پـێش ئـەوەی پێغەمبەر بەو لەشکرەوەو بەتوندی هەڵمەت بەرێتە سەریان.
جا کاتێك (عباس) بەڕێوەبوو گەیشت بـە (ابـو سـفیان) و هـەردوو هاوڕێکـەیو هـەواڵی گەیشتنی سوپا گەورەو بەرفراوانەکەی موسڵمانانی پێڕاگەیاندن و ئامۆژگاریی (أبو سـفیان)ی سەرکردەی قورەیشی کرد کە پەنا بباتەبەر پێغەمبەر، چـونکە بـەوە ڕزگـاری دەبێـت، دیـارە (عباس) بەڵێنی ئەوەشی بە (ابو سفیان)دا کە داوای دڵنیایی و سەلامەتی ی بۆبکات، ئەویش

ئامۆژگاری یەکەی پەسندکردو ئینجا (عباس) دەسبەجێ (ابو سفیان)ی لەدوای خۆیەوە سواری هێسترەکەی پێغەمبەر کردو پێکەوە بەرەو سەربازگەی موسڵمانەکان بەرێکەوتن.

کاتێك گەیشتنە لای چادرەکەی پێغەمبەر، پێغەمبەر فەرمانی کرد، کە (ئەبوسوفیان) بۆ خێوەتەکەی خۆی ببات و سەر لەبەیانی ی سبەینێ بیهێنێت بۆلای. ئینجا سەر لەبەیانی ی ئەو ڕۆژە (ئەبو سوفیان) برا بۆلای پێغەمبەرو ئەم وت وویژە لەنێوانیان دا هاتەکایەوە...

پێغەمبەر فەرمووی: {ئەی هاوار ئەبو سوفیان، ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە وریابیتەوەو بزانیت کەهیچ پەرستراوێك نی یە تەنها خودا (الله) نەبێت}؟

ئەبو سوفیانیش گوتی: {باوکم ودایکم فیدات بێت.. چەند هێمن و بەڕێزو لێبوردوویت... من هەردەم ئەوە لەدەروونم دا جێگیربوو گەر لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی تر هەبوایە ئەوا هێشتا شتێکی لێ دووردەخستمەوە}.

دووبارە پێغەمبەر پێ ی فەرموو: {ئەرێ باشە تۆ ئەی (ئەبو سوفیان) کاتی ئەوە نەهاتووە بزانیت من پێغەمبەری خودام}؟

ئەویش گوتی: (باوك و دایکم بەفیدات بێت چەند لەسەرخۆو بەڕێزو لێبوردوویت. بەڵام سەبارەت بەمە بەخودا هێشتا شتێکم لەدڵ دا هەرماوە)...

لەو ساتەدا (عباس) بە (ابو سفیان)ی گوت: {کوڕە قوڕبەسەرت شایەتمان بێنە بەدڵ وزمان لەسەرئەوەی کەهیچ خودایەك نی یە —الله— نەبێت و، کە —محمد—یش بەندەو پێغەمبەری خودایە، شایەتمان بێنە، دەنا قەسەم بەخودا بەم حاڵەتی کافریەوە تیا دەچیت}.

ئینجا (ئەبو سوفیان) بەڕاستی شایەتمانی هەقی هێناو موسڵمان بوو و گوتی: (لا الە الاّ الله محمد رسول الله).

دوای ئەمە -عباس- بەپێغەمبەری گوت: (ئەی پێغەمبەری خودا تۆ خۆت زانیوتە، کە لەمەوبەر (ابو سفیان) چ پلەوپایەیەکی هەبووەو لە چ ئاستێکی بەخۆنازین و گەورەیی دا بووە، جا ئێستاش بڕیاری شتێکی وای بۆبدە کە دەلالەت لەڕێزو شانازی یەك بکات بۆی.

پێغەمبەریش فەرمووی: (بەڵێ وایەو ئێمەش بڕیار دەدەین هەر کەسێك لەخەڵکی مەککە بچێتە نێومالی —ئەبو سوفیان—ەوە ئەوا پارێزراوەو هەر کەسێك دەرگای ماڵی خۆی داخات هەر پارێزراوەو هەر کەسێکیش بچێتە نێو (مسجد الحرام)ەوە هەر پارێزراوە}. واتە کاتێك لەشکری موسڵمانان دەچێتە نێو شاری —مەککە—وەو هەر کەسێك لەدانیشتوانی —مەککە— بەربەرەکانی نەکات و بچێتە یەکێك لەو سێ جێگایانەوە، ئەوا پارێزراوە.

بەڕاستی ئەمەش گەورەترین لێبوردنەو داخۆ چ لێبوردنێك و چ بڕیارێکی دی لەمە گەورەتربێت.. ئەبو سوفیانی سەرکردەی قوڕەیش کە تەواو دڵی موسڵمانانی بریندار کردبوو

لەجەنگی (ئوحود)داو کە هەر ئەویش هەرەشەی ڕیشەکێشکردنی موسڵمانانی لەخاکی خۆیان دا دەکرد ئێستا پێغەمبەر لێی خۆش دەبێت و جگە لەوەش هەر ڕێزو پلەی شیاوی بۆ دادەنێت تاکو شانازیی پێوەبکات، ئەمە لەکاتێك دا هەموو تکایەکی (ئەبو سوفیان) بۆ مانەوەی بووە لەژیان داو کەچی پێغەمبەر مافی ژیان و پلەو پایەش بەو دوژمنە بەزیوە دەدات.

## پێغەمبەر دەچێتە نێو - مەککە -وە

دانیشتوانی (مەککە) بینیان ئەوا هێزەکانی موسڵمانان لێیان نزیك دەبنەوەو، تا ئەو ساتەش هێشتا بڕیارێکی یەکجارییان دەربارەی کوشتارو بەرەنگاربوونەوەی ئەو لەشکرە نەدابوو، ئینجا لەناکاودا گوێیان لەدەنگی (أبو سفیان)ی پێشەوایان بوو، کە پڕ بەگەرووی هاواری دەکردو پێی دەگوتن: }هۆ کۆمەڵی قورەیش ئەوا (محمد) هات و ئێوەش توانای ڕووبەڕووبوونەوەیتان نییە.. هەر کەسێك لەئێوە بچێتە نێومالّی منەوە ئەوە پارێزراوو سەلامەتە، هەر کەسێکیش دەرگای ماڵەکەی خۆی دابخات و هیچ جم وجوولێك نەنوێنێت ئەویش هەر سەلامەتە، هەر کەسێکی دیکەش بچێتە نێو (مسجد الحرام)ەوە هەر سەلامەت و پارێزراوە{...

ئیدی -مەککە- چاوەڕێی هاتنە ناوەوەی موسڵمانانی دەکرد، پیاوانی قورەیشیش خۆیان لەپشت دەرگا داخراوەکانەوە حەشاردابوو، هەندێکیشیان لە -مسجد الحرام-دا خڕببوونەوە، چەند توندڕەوێکیش هەر سووربوون لەسەر جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی لەشکری موسڵمانان.

پێغەمبەر لەشکرەکەی کردبوو بە دووبەشەوە" بەشێکیانی خستبووە ژێر سەرکردایەتیی (خالد-ی کوڕی -ولید)ەوەو فەرمانی پێدابوو لەقۆڵێکەوە بچێتە ناو شارەوە کە بە (کُدی) ناودەبرێت و چیایەك بوو لەخوارووی (مەککە)وە. بەشی دووەمی لەشکرەکەش پێغەمبەر خۆی سەرپەرشتی ی دەکردو لەقۆڵی چیای (کداء)ەوە چووە نێو شارەوە کە ئەویش چیایەك بوو لەسەرووی مەککەوە.

(خالد) لەقۆڵەکەی خۆیەوە تووشی چەند پیاوێك لەهاوپەیمانانی قورەیش بوو و بەربەرەکانییان دەکردن و جەنگێك لە نێوانیان دا ڕووی داو لەئاکام دا دووکەس لە موسڵمانەکان و بیست وهەشت کەس لەو بێ باوەڕانە کوژرا، بەمەش ترسێکی زۆریان لێ نیشت و هەموویان بەزین و ڕایان کرد.

بەڵام پێغەمبەر لەقۆڵەکەی خۆیەوە هیچ بەرهەڵستکارێکی تووش نەبوو و سوارپشتی حوشترەکەی ببوو و خۆی بەسەر بەشی پێشەوەی کۆپانی سەرپشتی حوشترەکەدا چەماندبووەوەو

خەریك بوو ڕیشی بەری دەكەوت، واتە هێندە خۆی دانەواندبوو، كە لەخۆبوردوویی و بێ فیـزی و سادەیی ی پێوە دەبینرا، ئەمەش لەملكەچی ی دابوو بـۆ ئـەو خودایـەی كـە ئـەو فـەتح و سەركەوتنە بێ وێنەیەی پێ بەخشی و سەربەرزی كرد پێ ی.

بێگومان ئەو سادەو ساكاری یە لەپێغەمبەرەوە لەكاتی بەدی نهاتنی ئەو فەتحە گەورەیـەو لەناوەڕاستی ئەو سوپا گەورەو بـەهێزەدا ڕەفتـارێكی بێوێنەیـەو نموونـەی لـەهیچ فتوحـات و سەركەوتنێكی دیكەدا نی یەو هیچ سەركردەیەك لەو جـۆرە كاتانـەدا ئەوەنـدە لـەخۆبوردوو و ساكارنەبووە هەروەك لەمێـژووش دا دیومانـە. خـۆ ئەگـەر هـەر ئـەو سـادەو سـاكاری یـەی پێغەمبەر لەكاتی فەتحی مەككەدا بەراوردكەین لەگەڵ هەموو ئەو هەڵوێستی بەخۆنازین و خۆ بەزل زانینانەی، كە سەرجەم فەرماندەو سەركردەی لەشكرەكانی تر لەسـەركەوتن و فتوحاتیـان دا نواندوویانـە ئـەوا زیـاترو چـەندان هێنـدەش نرخـی ئـەو ڕەوشـتە بـەرزەی لـەخۆبوردنی پێغەمبەرمان بۆ دەردەكەوێت، لەكاتێك دا نرخ و بەهای هـەر سـەركەوتنێكی دیكـەی گـشت فەرماندەیەك زۆر كەمترە لەئاست فەتح كردنی (مەككە)دا.

جا دوای ئەوەی پێغەمبەر بەو شێوەیە دەچێتە نێو شـاری (مەككـە)وە ڕوودەكاتـە مـاڵی پیرۆزی خودا(بیت الله الحرام) كەسێ سەدو شەست بتی بەچوار دەورا دانرابوو. پێغەمبەر دارێك بەدەستەوە دەگرێت و دەست بەشكاندنیان دەكـات و لـەكاتی شـكان و كـەوتنی بتـەكانیش دا دەیفەرموو: ﴿جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾، كە ئایەتێكی قورئانیشە لـە سوورەتی (اسراء)داو ئایەتی ژمارە (٨١)ی سوورەتەكەیە.

پاشان پێغەمبەر فەرمانی دا بەشكاندنی هەموو جۆرە بتێكی گـەورەو بـچووكی قـوڕەیش لەهەر جێ یەك دا هەبن.(١)

كاری شكاندنی بتەكان كە (قوڕەیشی یەكان دەیانپەرستن) بـێ ئـەوەی (هـەر خـودی ئـەو بتانەش توانای بـەرگری لـەخۆكردنیان بووبێـت)، یـان (توانـای ئـازار گەیانـدن بـەو كەسـەی

---

(١) بێگومان پێغەمبەر هەر تەنها ئەو بتانەی نێومالی خودای تێك نەشكاند، بەڵكو لەپێنجەم ڕۆژی دوای فەتحی -مەككە- فەرمانی دا هەرچی بت هەیە لەدەوروبەری مەككەش بشكێنرێن. ئەوەبوو (خالد-ی كوڕی - ولید)ی بە سی(٣٠) پیاوەوە نارد بۆ شكاندنی پەیكەری گەورەی بتێكـی قـوڕەیش، كـە نـاوی (عـوززا)ی لێ نرابوو و لەسەر قەدی دارخورمایەك بوو لەنزیك شاری -مەككە-. هـەروەها پێغەمبـەر (عـەمر-ی كـوڕی - عاص)یشی نارد بۆ شكاندنی بتەگەورەكەی تیرەی (بنو هذیل)، پەیكەری ئەو بتەشیان (سێ میل) لەمەككەوە دووربوو و شكاندنیان. لەهەمان كات دا (سعدی زید الأشل)ی بەبیست سوارچاكەوە نارد بۆ شكاندنی ئەو بتـە بەناوبانگەی كەناوی (مەنات)ی لێ نرابوو و پەیكەرەكـەی لـە (مـشلل) بـوو لەسـەر ڕۆخـی دەریـای سـوورو ئەویشیان شكاند.

دەیانشکێنێت) بۆ لەڕیشەهێنانی دیاردەی بتپەرستی بوو لەدورگەی عەرەب داو پاشان بۆ بنەبڕکردنی پیرۆزییەکەشی لەهزری بێ باوەڕان و هاوبەش بۆ خوادانەران دا.

لەدوای ئەمە پێغەمبەر حەوت جار بە وشترەکەیەوە بەدەوری ماڵی خوادا سووڕایەوەو بەدارەکەی دەستی ئەرکی ڕوکنەکەشی بەجێ هێناو دەستی پێ گەیاند. ئینجا دوای سووڕانەوە (طواف)ەکەو بەجێ هێنانی ئەرکە عیبادی یەکانی، بانگی (عثمان—ی کوڕی —طلحة)ی کردو کلیلی —کەعبە—ی لێ وەرگرت. ئیتر دەرگاکەی کەعبەی بۆکرایەوەو نوێژی تێدا کرد، بەڵام دیتی وێنەی پێغەمبەرانی لەسەرکێشراوەو خێرا فەرمانی دا، کە ئەو جۆرە وێنەو نەخش و نیگارانەش بسڕێنەوەو، هاوەڵانیش فەرمانەکەیان بەجێ گەیاندو وێنەکانیان سڕی یەوە.

## لێبوردنە گەورەکە

پاشان پێغەمبەر لەبەردەرگای کەعبەدا وەستاو خەڵکییش چواردەوریان تەنیبوو و، فەرمووی: (( **لا اله الاّ الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَه، صَدقَ وَعدَهُ، وَنَصر عَبدهُ، وَهَزَمَ الأحزاب وَحدهُ** )).. واتە: {هیچ خودایەك نییە تەنها —الله— نەبێت و، هیچ هاوبەشێکی نی یە، بەڵێنی خۆی بردەسەرو بەندەی خۆی سەرخست و هەر خۆیشی هەموو دەستەو کۆمەڵانی دوژمنانی بەزاند}...

دوای ئەمە هەندێك حوکمی شەرعی ی بۆ ڕوون کردنەوەو باسی ڕەچەڵەکی بنەڕەتی ی ئیسلامی بۆکردن کە بونیادی نەتەوەیەکی گەورەی جیهانیی لەسەر ڕاگیر دەبێت و ئەم نەتەوەیەش بەهیچ ڕەگەزێکی تایبەتی یەوە بەند نی یە، بەڵکو خاوەنی ئایینێکی حەقە. لەم نەتەوەیەدا بەسامان و پلەوپایە خەڵکی لەیەك جیاناکرێتەوەو کەس بەهۆی ئەو شتانەوە لەکەس چاکترو بەڕێزتر نی یە، بەڵکو (بەتەقواو خواپەرستی) خەڵکی لەیەك جیادەکرێنەوەو هەڵدەسەنگێنرێن.

هەر لەم ڕووەوە پێغەمبەر بەخەڵکی قوڕەیشی فەرموو: {ئەی کۆمەڵی قوڕەیش، ئەوا خودا لوتبەرزیی نەفامی ی تێدا نەهێشتوون و هەموو ڕێزو گەورەیی یەکتان بۆ باب وباپیرە پێشینەکانتان دەگێڕێتەوە، خەڵکی هەموویان لە ئادەمن و ئادەمیش لەخۆڵ دروست کراوە}... پاشان ئەم ئایەتەی خودای بۆ خوێندنەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَـٰكُمۡ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ﴾الحجرات/١٣

دوای ئەوە پێغەمبەر ڕووی کردە قوڕەیش، کە لەخانەی تاوانبارو گوناهکارو دەسدرێژکاردابوون و چەندەها جار موسڵمانانیان بەتوندی سزادابوو لە —مەککە—و ئەشکەنجەی

دەروونی و جەستەیی ی سەختیان دابوون و تەنانەت هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریشیان دابوو و جار لەدوای جاریش هێرشیان کردبووە سەر (مەدینە) تاکو زاڵ بن بەسەریان داو موسڵمانەکان ریشەکێش بکەن و، چەندین کەسیشیان لێ کوشتبوون. بێگومان بەگوێرەی سووك ترین و بەبەزەیی ترین یاسای تۆڵەسەندن دەبوایە سەری زوربەی سەرکردە گەورەکانیان بپەڕێنرایەو هەندێکی تریشیان بەندبکرانایەو پاشماوەی خەڵکەکەش ملکەچ و ژێردەستە بکرانایەو چەندین سزای داراییان بەسەردا بسەپێنرایە، وەك چۆن ئەمڕۆ دەوڵەتانی پێشکەوتوو ئەم جۆرە یاسایانە پیادەدەکەن، یاخود دەبوایە هەموو خەڵکی قوڕەیش دوای لەناوبردنی سەرکردەکانیان بکرانایە بەکۆیلە وەك چۆن نەتەوە دێرینەکانی ئەو سەردەمە پەنایان بۆ ئەو جۆرە یاساو نەریتانە دەبرد لەکاتی سەرکەوتنیان بەسەر نەتەوەیەکی تردا.

بەڵام خۆ پێغەمبەر هیچ جۆرە یاساو ڕێو شوێنێکی تۆڵەسێنیی ئاوای نەگرتەبەر، بەڵکو ڕووی گفتاری کردە ئەو گەلە تاوانبارەی –قوڕەیش–و لێ ی پرسیین: {هۆ گەلی قوڕەیش... ئایا ئێوە بەڕای خۆتان وا دەزانن ئێستا من چیتان لێ دەکەم؟}...

دیارە قوڕەیش بەئاسانی دەیانزانی کەپێغەمبەر بەتوندی لەگەڵیان ناجووڵێتەوەو تۆڵەیان لێ ناسێنێتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەواو دڵنیابوون لەڕەوشتی بەرزی پێغەمبەرو هەڵس و کەوتی نایاب و بێ هاوتای.. هەر بۆیەش وەڵامیان بۆ پرسیارەکەی پێغەمبەر ئەوەبوو، گوتیان: {ئێمە هەر خێرو چاکەت لێ چاوەڕوان دەکەین... تۆ برایەکی دڵفراوان و لەخۆبوردوویت و، کوڕی برایەکی بەڕێزمانیت}.

ئیتر لێرەدا پێغەمبەر وتەو بڕیاری لێخۆشبوونی بۆدرکاندن. ئەو وتەوبڕیارە هەرەگەورەیەی، کە بەدرێژایی مێژووی بەشەری و هەتاهەتایە شایەتی لەسەر ئەو ڕەوشت و هەڵس وکەوتە بێ وێنەو بڵندە مرۆیی یەی پێغەمبەر دەدەن، ئەو ئاکارو ڕەفتارەی کەخۆی پێ ڕازاندبووەو، ئەوەبوو لەبڕیاری لێبوردنی دا لەقوڕەیش پێ ی فەرموون: ((اذهَبُوا فَأَنْتُمْ الطُّلَقَاء)).. واتە: {ئیتر ئێوە هەمووتان ئازادن و گەردنتان ئازادبێت لەهەر خراپەو گوناهێك کە بەرامبەر ئێمە کردووتانە}.

## یەکسانی لەنێوان خەڵکیدا

دوای ئەمە پێغەمبەر لەماڵی خودا (مسجد الحرام) دانیشت و– (علی–ی کوڕی–أبو طالب) کە کوڕی مامی بوو و نزیکترین کەسیش بوو لێ ی، چووە لای–و پێ ی گوت: {ئەی پێغەمبەری خودا پلەو ئەرکەکانی (دەرگاوانی)و (ئاوگێڕی)و (خزمەتگوزارییەکانی ماڵی خودا)مان بۆ مەیسەرکە}.

بەڵام پێغەمبەر پێ ی چاك نەبوو، كە ئەو ئەرك و پلە بەرزانەی خزمەتگوزاری لەخاوەنەكانی پێشوویان بسێنێتەوەو بیدات بەخزم وكەس وكارە نزیكەكانی خۆی وەك چۆن حاكم و كاربەدەستانی‌تر لەكاتی چوونەسەر حوكمیان دا ئەو ڕەفتارە دەنوێنن و هەرچی خزم و كەسە نزیكەكانیانە دەیانكەن بەسەركارو بەڕێوەبەر... دیارە پێغەمبەری خوداش زۆر دوورە لەو ڕەفتارەو هەر بۆیەش بەو پێشنیارەی (علی)ی ئامۆزاو دەستەڕاستی خۆی قایل نەبوو، بەڵكو فەرمووی: {—عثمان—ی كوڕی —طلحة) لەكوێ یەو بۆم بانگ كەن}، واتە: (ئەو پیاوەی، كە لەوەوبەرو لەكاتی باڵادەستی ی قوڕەیش دا دەرگاوانی كەعبە بوو)، كاتێك (عثمان—ی دەرگاوانی پێشوو)ی بۆ بانگ كراو گەیشتەلای، پێغەمبەر فەرمووی: {ئەوە كلیلەكەتەو خۆت دەرگاوانی كەعبەیت، ئەمڕۆش ڕۆژی چاكەو ئەمەكداری‌و وەفایە}.

هەروەها پێغەمبەر بۆ چەسپاندنی یەكسانی نێوان هەموو موسڵمانان و دەرخستنی ئەو ڕاستی یەی كەهیچ جیاوازی یەك لەنێوان مرۆڤی ڕەش پێست و سپی پێست دا نی یە فەرمانی بە (بیلال)ی —بەندەی حەبەشی— كرد، كە لەو ڕۆژەی فەتح كردنی —مەككە—دا لەسەربانی —كەعبە— بانگ بدات.

بێگومان ئەمەش ڕێزلێنانێكی وەها گەورەو بێ‌وێنەبوو بۆ (بیلال) كە هەموو موسڵمانێك شاگەشكەی پێ‌دەبردو حەزی دەكرد (وەك ئەو) هەمان ڕێزی لێ بنرایە، چونكە (كەعبە) پیرۆزترینی شوێنە بەهادارو پیرۆزەكانی موسڵمانان بوو. هەر بۆیەش لەو ساتەدا پیاوێكی قوڕەیش زۆر سەری سوڕماو بەهاوڕێ یەكی خۆی گوت: {ئەرێ دەبینیت ئەو عەبدە ڕەشە بۆ كوێ سەركەوت} ؟

هەروەها (بخاری) لە (عروە—ی كوڕی —زبیر)ەوە گێڕاوێتی یەوە، كە لەكاتی فەتحی —مەككە—دا ئافرەتێك دزیی كردبوو، كەس وكارەكەشی پەنایان بردبووە لای (أسامە—ی كوڕی —زەید) تاكو هەوڵێكی بۆبدات و نەهێڵێت سزای دزی‌كردنەكەی بدرێت. جا كاتێك (اسامە)ش لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا كرد، پێغەمبەر ڕووی تێك چوو و پەست بوو و فەرمووی: (چۆن لەسەر سووك كردنی یاسایەك لەیاساكانی خودا قسەم لەگەڵ دا دەكەیت)؟ خێرا (أسامە)ش داوای لەپێغەمبەر كرد لێ ی ببوورێت و گوتی: (ئەی پێغەمبەری خودا داوای لێبوردنم لەخودا بۆبكە لەسەر ئەم هەڵوێستە ناڕاستەم).

بۆ سەر لەئێوارەی ئەو ڕۆژەش پێغەمبەر وتارێكی لەو ڕووەوە بۆ خەڵكی داو تیای دا دوای سوپاس و ستایشی خودا لەسەرئەوەی پێ ی سپاردووە، فەرمووی: {خەڵكینە، هۆزو نەتەوەكانی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە خودا لەناوی بردوون كە ئەگەر كەسێكی خانەدان و

پایەداریان دزیی بکردایە سزایان نەدەدا، بەڵام ئەگەر کەسێکی سادەو بێکەس و عەشرەت دزیی بکردایە سزای تەواویان دەدا. دەسا بەو خودایەی کە گیان و دەروونی -محمد-ی لەدەست دایە ئەگەر (فاطیمە-ی کچی -محمد) دزی بکات ئەوا دەستی دەبڕم}... (دەست بڕینیش سزای دزە)... پاشان فەرمانی کرد سزای ئەو ئافرەتە دزە بدرێت و ئیدی دەستیان بڕی، ئەویش دوای ئەو کارە نابەجێ یە تۆبەیەکی چاك و تەواوی کردو تۆبەی خۆی بردەسەرو، دوای ئەوەش خوازبێنیی کراو شوویشی کرد.

بێگومان ڕەفتارو هەڵس وکەوتی بەرزو مرۆییانەی پێغەمبەر لەڕۆژی فەتح کردنی- مەککە-دا شوێنەوارێکی گەورەی هەبوو لەدڵی ئەو خەڵکانەی کەشەیدای ڕەونەق و گەورەیی ئیسلام ببوون و لەماناو کرۆکی ئەوبەرنامە جوانە تێگەیشتبوون. هەر بۆیەش هاتنەلای پێغەمبەرو بەیعەت و پەیمانیان لەسەر ئیسلام پێ دا. پێغەمبەریش پەیمانی لێ وەرگرتن بەو چەشنەی بیسەرو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی بن هەتا لەتوانایان دا بێت. جاکاتێك پیاوان هەموویان بەیعەتیان پێدا، ئینجا ئافرەتان هاتن و وەك ئەوان بەیعەتیان پێدا.

لەو بارەیەشەوە سرووشی خودایی لەم ئایەتانەدا هاتەخوارەوە بۆ پێغەمبەر کەخودا فەرمانی پێ کردبوو و پێی فەرموو: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾الممتحنة/١٢.

واتە: {ئەی پێغەمبەر ئەگەر ئافرەتان هاتنەلات بۆ پەیمان و بەیعەت پێدانت لەسەر ئەوەی کە: هیچ کەسێکیان شتێك نەکات بەهاوبەشی خوداو، دزی نەکات و، زینا و بەدڕەوشتی نەکات و، منداڵەکانی خۆی نەکوژێت[1] و بوختان و درۆ هەڵنەبەستێت بەو ڕەنگەی لەحاڵەتی منداڵبوونی دا منداڵەکە بخاتە پاڵ مێردەکەی لەکاتێك دا گەر لەو مێردەی نەبووبوو[2] و،

(١) لەسەردەمی جاهیلی دا لەبەر چەند هۆیەك منداڵیان دەکوشت، کچیان زیندەبەچاڵ دەکرد لەترسی ئەوەی گوایە عەیب و عاریان بەسەردا دێنێت.کوڕیشیان لەترسی هەژاری دەکوشت لەهەندێك جاردا. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم جۆرە بوختان و درۆ هەڵبەستنەی هەندێك ژن لەترسی گیانی خۆیان بوو، لەئایەتەکەدا هاتووە (**ولا یأتین ببهتان یفترینه بین ایدیهن وأرجلهن**) لێرەدا وشەی(بین أیدیهن وأرجلهن) مەبەست لەوەیە ئەو منداڵەی کاتێك لەدایك دەبێت و دەکەوێتە نێوان هەردوو دەست و هەردوو پێ ی دایکەکەیەوەو مێردی دایکەکەش باوکی ئەو منداڵە نی یە، واتە پیاوێکی تر دەستی تێکەڵ کردووە لەگەڵ ژنەکەی داو ئەو منداڵەش بووە.جا لەوکاتەدا نابێت ژنەکە منداڵەکەی بداتە پاڵ مێردەکەی. ژنەکان دەبوایە بەیعەت لەسەر ئەوەش بدەن. (وەرگێڕ)

سەرپێچییش لە (ئەمر و نەهی)یەکانی تۆ نەکەن واتە لە (کار بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپـە)دا، ئەگەر ئافرەتانی موسڵمان لەسەر ئەو کاروبارانە بەیعەتیان پێ دایت ئەوا تـۆش بەیعـەتیان لێ وەرگـرەو داوای لێخۆشـبوونیان لەسـەر گوناهـەکانی لەوەوپێـشیان بۆبکـەو خـوداش لێ یـان دەبووریێت، بێگومان خودا زۆر لێبوردەیەو، بەزەییشی زۆرە بۆیان گەر ئەوان پەیمان و بەیعـەتی خۆیان بەرنە سەر}.

# هێمنترین مرۆڤ

بێگومان پێشتر پێغەمبەر خوێنی چەند کەسێکی کەمی لەپیاوان حەڵاڵ کردبـوو و بڕیـاری کوشتنیانی دابوو لەوانەی کە بەدڕندەو تاوانکاری خەتەرناك ناسرابوون و دژایەتی یەکی توندی موسڵمانانیان دەکردو دواییش (لەدوای فەتحی —مەککە) هـەڵاتبوون لەدەسـتی و هەنـدێکیان لێکوژرایەوەو هەندێکی تریشیان موسڵمان بوون و کەوتنەبەر لێبوردنی پێغەمبەر.

لەوانەی کە موسڵمان بوون و کەوتبوونە بەر لێخۆشبوون: (هبار—ی کـوڕی —اسـود)، بـوو ئەم پیاوە خۆی شاردبووەوە، کاتێك پێغەمبەر گەیشتە ئەو شوێنەی کە بە (جعرانە) ناودەبرێت هاتەلای و موسڵمان بوو و پێیشی گوت: (ئەی پێغەمبەری خودا بێگومـان مـن لەدەسـتت ڕام کردو ویستم خۆم بگەیەنمە لای عەجەمـەکان و پاشـان چـاکەو لێبـوردەیی تـۆم بیرکەوتـەوە کەچەند بەسۆزو میهرەبانیت بەرامبەر بەو کەسەی خراپەی دەرهەق کردوویت. جا ئایا ئێستاش ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە شوێنکەوتووی کفرو شیرك نەبووین و دوایـی خـودا بـەهۆی تـۆوە ڕێنمایی کردین بۆ سەرڕێ ی ڕاست و ڕزگاری کـردین لەتیاچـوون؟ جـا تـۆش بەچـاکی لێمـان ببوورە)...

پێغەمبەریش فەرمووی: (وا لێت خۆشبووم).

هەروەها یەکێکی تر لەوانەی کەوتنەبەر لێبوردن و موسڵمان بوون: (صـفوان—ی کـوڕی — أمیّـة) بوو کەهەموو خاکی سـەرزەویی لەبەرچـاو تـەنگ ببـوو و لـەخۆی نائومێـدبوو بـوو و تەنانەت ڕۆیشت تا خۆی بخاتە دەریاوە، بەڵام ئامۆزاکەی خۆی (عمیر—ی کوڕی —وهـب) چـوو بۆلای پێغەمبەرو پێ ی گوت: {ئەی پێغەمبـەری خـودا (صـفوان—ی کـوڕی —أمیـە) —کـە گەورەی تیرەکەی خۆیەتی—، ڕای کردووەو دەیەوێت خۆی فڕێ بداتە دەریاوە، جا تۆش دڵنیـای کـەو لێ ی ببـوورە وەك چـۆن ڕەش و سـوورت دڵنیـا کـردووەو لەهـەموان بووراویـت}. پێغەمبەریش دەفەرموێت: {بگە بەئامۆزاکەت، ئەو دڵنیاکراوو پـارێزراوە}. ئینجـا (عمـیر) گوتی: {ئەی پێغەمبەری خودا نیشانەیەکم پـێ بـدە، تـا پیـشانی بـدەم}. پێغەمبـەریشﷺ

مێزەرەکەی خۆی پـێ دا، تـاکو وەك نیـشانەیەك پیـشانی (صـفوان)ی بـدات لەسـەر بڕیـاری لێبوردنی پێغەمبەر لێ ی.

(عمیر) خێرا مێزەرەکەی لێ وەرگرت و ڕۆیشت، تا گەیشتەوە بە (صفوان)و پـێ ی گـوت: {باوك ودایکم بەفیدات بێت دڵنیابە من لەلای باشترین و چاکەخوازترین و هێمنترین کەسـەوە هاتووم کەچاکترین کەسی نێو خەڵکی یەو کە کوڕی مامیـشتە، بێگومـان سـەربەرزیی ئـەو سەربەرزیی تۆشەو –ئابڕوومەندیی ئەو هی تۆشەو– موڵـك و دەسـەڵاتی ئـەو هـی تۆشـە}، (صفوان) گوتی: (من هەر لێ ی دەترسم)، –عمیر– دووبارە پێ ی گـوت: {ئـەو زۆر هێمـنترە لەوەی کە تـۆ وای لێ ڕادەبینیـت و زۆر دڵفـراوان و لێبوردەیـە) لەگـەڵ ئـەم قـسانەش دا –عومەیر– مێزەرەکەی پێغەمبەری وەك نیشانەیەکی دڵنیاکردن پیشان دا. ئینجـا –صـفوان– گەڕایـەوە بـۆلای پێغەمبـەرو پـێ ی گـوت: (ئـەم پیـاوە وای پـێ ڕاگەیانـدووم کـەتۆ منـت دڵنیاکردووە). پێغەمبەریش فـەرمووی: (ئـەو ڕاسـت دەکـات). ئـیتر (صـفوان)یـش گـوتی: (دوومانگ مۆڵەتم بدە). پێغەمبەر فەرمووی: (تەنانەت با چوار مانگیش بێت). دوای ئەوە –صفوان– موسڵمان بوو و بەچاکی پەیڕەوی ئیسلامی دەکرد.

پیاوێکی تر لەوانەی کەوتنەبەر لێبوردن و تاوانی گەورەشیان ئەنجام دابـوو، ئـەو بکـوژەی (حەمزە)ی مـامی پێغەمبـەر بـوو کـەناوی (وەحـشی) بـوو، ئـەوەبوو نـاوبراو هـات بـۆلای پێغەمبەرو موسڵمان بووو موسڵمانبوونیشی لێ پەسندکرا.

جگە لەمان، شاعیر (کعبـ–ی کوڕی –زهیر) بوو کەهات بۆلای پێغەمبەرو موسڵمان بوو و قەسیدەیەکی لەستایش و ڕێزلێنانی پێغەمبەردا هۆنی یەوەو تیای دا گوتوویەتی:

**انبئت ان رســـول الله أوعدنـــي — والعفو عند رسول الله مأمول**

**مهلاً هداك الذی اعطاك نافلة الـــ — قرآن فیها مواعیظ وتفصیل**[1]

کاتێك لەدوایین دێڕی دا گوتی:

**ان الرســـول نور یســـتضاء بـــه — مهند من سیوف الله مسلول**[2]

ئیتر پێغەمبەریش کەواکەی خـۆی داکەنـدو پێـشکەشی ی کـرد وەك پێخۆشـحاڵی یـەك بـەو شیعرەی کە بۆی خوێندەوە.

---

(١) واتە بیستم پێغەمبەری خودا بەڵێنی لێبوردنی پێـداوم.. ئـێ خـۆ بێگومـان ئـەو لێبوردنـە لەلایـەن پێغەمبەری خوداوە چاوەڕوان کراوو جێ ی ئومێدبووە.. تۆ ئەی پێغەمبەر لەسۆزو خۆشەویستیی خۆتەوەیە کەخودا بەبەخشش و نیعمەتی قورئان هەموو پەندو ڕێوشوێن و شیکارێکی کاروباری بۆ تیاداناوە.

(٢) واتـە: (بێگومـان پێغەمبـەر ڕوونـاکی یەکـەو ڕێ ی پـێ ڕۆشـن دەبێتـەوە... شمـشێرێکی پۆڵایینـە لەشمشێرەکانی خوداو بەڕووی ناحەزان دا هەڵکێشراوە).

بەم ڕەنگە لەفەتح کردنی —مەککە—دا کەسێتیی پێغەمبەرمان وەك گەورەترین فەرماندەی مێژوو بۆ دەردەکەوێت، ئەو فەرماندە نموونەییەیەی بەدڵفراوانیو چاوپۆشیو ڕەحمەت بۆ هەموو کەسێك بەرامبەر ناحەزان و دوژمنانی جوولاوەتەوە، ئەوانەی بەشێوەیەکی دڕندانە ئازاریان دەداو خۆیو لایەنگرانیان دەچەوساندەوە کەچی لەهەموویان خۆشبوو.

بێگومان ئارەزوو لەتۆڵەسەندنەوەو کاردانەوەی ڕەفتار بەهەمان جۆر لەدڵی هەندێك لەهاوەڵانیدا هەبوو. بەڵام پێغەمبەر ئەو ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەیەی لەدڵیان دا دامرکاندەوەو لەجیاتی ئەوە چاوپۆشیو ئاشتیو تەبایی لەدڵیان دا ناشت.

پێغەمبەری خودا بەو ئاکارە بەرزەی (چاوپۆشی)و (لەدوژمن خۆشبوونە) دەیویست ڕووی ڕاستی ئیسلام پیشان دات کە سەرەڕای ئەوەی شۆڕشێکی بەسەر بیروباوەڕە چەوت و تەقلیدییەکان و سیستمە شێواوە کۆمەڵایەتییەکان دا کردووە، بەڵام بەرزو پیرۆزترە لەهەموو ئەو شۆڕش و کودەتایانەی لەڕەوتی کاروانی بەشەریدا بەرپاکراون. چونکە تاکە نیازی شۆڕشی سەرتاپاگیری ئیسلام یەکخستنی کۆمەڵگەی ئینسانیو چاکردنیو بەتین کردنی پەیوەندییەکانی خۆشەویستییە لەنێوان ئەفرادو چین و توێژەکانی کۆمەڵ دا، نەك قۆرخ کردنی چەند دەسکەوت و پلەو ئیمتیازاتێك بۆ خودی شۆڕشەکەو هەڵسوورێنەرو شوێنکەوتوانیو پاشان بەیدەست کردنی تەواوی خەڵکی لەژێر حوکمی چینێکی حوکم بەدەستی خۆپەرست دا..

# بەندی شەشەم

## ((کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی پێغەمبەر))

(حەجی ماڵئاوایی - کۆچی دوایی ی پێغەمبەر)

## حەجی ماڵئاوایی

لە ساڵی دەی هیجری دا پێغەمبەر لە مەدینەوە دەرچوو بەرەو مەککە بۆ حەج کردن، ئەوەش لەڕۆژی (٢٥)ی مانگی -ذو القعدة- ی ئەو ساڵەدا بوو و کۆمەڵێکی هێجگار زۆرو گەورەی موسڵمانانیشی لەگەڵ دابوو، کە لەوەوبەر لەوڵاتی عەرەب دا دیاردەی سەفەری ئاوایان بۆ حەج بەخۆوە نەدیبوو. هەمووشیان بە ورەو تینی بڕواداریەو دڵی پڕ لەشەوق و شادییەوە دەڕۆشتن بۆ بەجێ هێنانی فەرزی حەج، تا گەیشتنە -مەککە- و لەوێ پێغەمبەر سەرمەشقی خەڵکی بوو بۆ حەج و فێرکردنی چۆنیەتی بەجێ هێنانی ئەرکە عیبادیەکانی حەجکردنیان و پیشان دانی ڕێساو شێوازەکانی ئەو فەرزە گەورەیەیان.

لە (مونا) لەڕۆژی دووەمی قوربانی کردنی دا پێغەمبەر وتارێکی گشتی و هەمەلایەنەی بۆ خوێندنەوە وتیای دا مافەکانی مرۆڤی دیاری کرد... لێرەش دا چەند بڕگەیەکی ئەو وتارە بەناوبانگ و مێژوویییەی پێغەمبەر دیاری دەکەین، ئەوەبوو فەرمووی:

{ئەی خەڵکینە ئایا دەزانن ئێوە ئێستا لە چ مانگێک و لە چ ڕۆژێک دان و لە چ وڵاتێکیش دان} ؟ خەڵکەکەش گوتیان: {لەڕۆژێکی بەحورمەت گیراوو، وڵاتێکی بەحورمەت گیراوو، مانگێکی بەحورمەت گیراودایـن} ئینجا فەرمووی: {جا ئیتر خوێن و ماڵ و گیانیشتان هەمان حورمەت و ڕێزی هەیەو هەمووتان سەروماڵ و خوێنتان لەیەکتر حەرامە وەك حورمەتداریی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتان و لەم وڵاتەتان دا، تا ئەو ڕۆژەی بەخودای خۆتان دەگەنەوە}.

پاشان فەرمووی: {گوێم لێ بگرن و تێ بگەن و وریابن لەوەی کە ستەم بکەن، ستەم نەکەن... ماڵ و سامانی هیچ مرۆڤێکی موسڵمان بۆ موسڵمانێکی دی ڕەوا نی یە تەنها بەقایل بوون و پێخۆشبوونی خۆی نەبێت. جا دوای خۆم پاشگەزمەبنەوە بۆ کفرو مەبنەوە

بەکۆمەڵی کافران و دواییش لەملی یەکتری بدەن. بێگومان شەیتان بێ ئومێدبووە لەوەی کە موسڵمانان وا لێ بکات بیپەرستن، بەڵام دەتوانێت نێوانتان تێک بدات. دەبێت بەچاکی بجووڵێنەوە لەگەڵ ئافرەتانیش داو مافی خودا بپارێزن لەئاستیان دا، چونکە وەك دیل[1] وان لەلاتان و تا ئەمڕۆش خاوەنی هیچ شتێك نین بۆ خۆیان. بەڵام بەڕاستی ئەوان هەقیان لەسەر ئێوەی پیاوان هەیە، دیارە ئێوەش هەقتان لەسەر ئەوان هەیە، وەك ئەوەی نابێت کەسێکی‌دی پێ بخاتەسەر پێخەفتان و ڕێگەش نەدرێت بەو کەسەی ڕقتان لێ یەتی بێتە ماڵتانەوە. خۆ ئەگەر ترس و نیگەرانیتان لەسەرپێچیی هەندێك لەئافرەتان هەبوو ئەوا ئامۆژگارییان بکەن و ئاسەواری سەرپێچی‌و خووی نائاسایی‌و ناڕەسەنیان بۆ ڕون بکەنەوە، گەر ئەوەش سوودی نەبوو ئەوا لەقۆناغێکی تری ڕاست کردنەوەیان دا پێخەفیان لێ جیابکەنەوەو لەگەڵیان دا مەخەون، گەر هەر ئەوەش سوودی نەبوو ئەوا لەقۆناغێکی دواتردا بەسووکی لێیان بدەن[2]. بەڵام لەهەموو ئەو حاڵەت و قۆناغانەش دا دەبێت خۆراك و پۆشاکی پێویستیان بەباشی بۆدابین بکرێت و بێبەرگ و بێنان نەکرێن. ئێوە ئافرەتتان وەك سپاردەی خودا لەئەستۆدایەو بەبڕیارو وتەی خودا بۆتان حەڵاڵ کراون. جا هەر کەسێك سپاردەیەکی لەلابێت دەبێت بیپارێزێت و بیگەیەنێتەوە بەو خاوەنەی کە ئەوی پێ ڕاسپاردووەو بەدەستپاکی داناوەو متمانەی پێکردووە} ...

دوای ئەمە پێغەمبەری خودا هەردوو دەستی بڵاوکردەوەو فەرمووی: {ئایا ڕاسپاردەی خودام پێگەیاندن؟} پاشان فەرمووی: {ئەو کەسەی لێرە ئامادەبووە با ئەم ڕاسپاردانەم بگەیەنێت بەبزرەکان، چونکە لەوانەیە گەیەنرێك بەختیارتربێت لەگوێگرێك}[3]...

هەروەها فەرمووی: {هۆ خەڵکینە بێگومان خوداتان یەکە، باوکیشتان یەك کەس بووە، کە ئادەمە— بێگومان ڕێزوگەورەیی بۆ هیچ عەرەبێك لەسەر کەسێکی غەیری عەرەب و بۆ

---

(١) ئەمەش ئاماژەیەکە بۆحاڵی ئافرەتان لەو سەردەمەدا، بەڵام لەژێرسایەی شەریعەتی ئیسلامی دا هەرگیز ئافرەتان مامەڵەی دیل و کۆیلەیان لەگەڵدا نەکراوە، بەڵکو ئەو مافە ڕەواو ماقووڵانەی کە بەئافرەتان دراوە لەئیسلام دا، تا ئەمڕۆش ئافرەتانی سەدەی بیست و سەدەی بیست ویەکی زایینیشی لێ بێ بەشن ئافرەتانی عەرەبیش لەپێش ئیسلام دا لەژیانێکی سەرشۆڕی‌و کۆیلەیەتی دابوون. تەنانەت ژن لەدوای مردنی مێردەکەی بەمیرات دادەنراو دەشفرۆشرا وەك چۆن ئاژەڵان دەفرۆشران و کەمترین مافی لەسەرمێردەکەی نەبوو و نەیاندەهێشت بەو مافانەی خۆی بەختەوەربێت و وەك مرۆڤێك بژی.

(٢) سووك لێدانی ئافرەت ئەو لێدانەیە کە ئازاری پێنەگەیەنرێت و لەشوێنە ناسك و ترسناکەکانی جەستەی نەدرێت. ئەم لێدانەش بۆ ئەو جۆرە ژنانەیە کە لەسنووری شەرم و ڕێزی ئاسایی دەردەچن، نەك ئەو ژنانەی کە ڕێزوئابڕووی خۆیان دەپارێزن.

(٣) (امام احمد) گێڕاویێتی یەوە.

کەسێکی غەیری عەرەبیش لەسەر عەرەبێك و بۆ ڕەشپێستێك لەسەر سوورپێستێك و بۆ سوورپێستێکیش لەسەر ڕەشپێستێك نی یە تەنها بەخواپەرستیو تەقواو لەخواترسان نەبێت... ئایا پێم گەیاندن} ؟ هەموو گوتیان: (بەڵێ... پێغەمبەری خودا گەیاندی)[1].

(طبراني)یش گێڕاوێتی یەوە، کە پێغەمبەری خودا لەوتاری حەجیماڵئاوایی دا فەرموویەتی: {ئایا پێتان بڵێم موسڵمان کێ یە؟ موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لەزمان و دەستی پارێزراوبن. ئەی پێتان بڵێم بڕوادار کێیە؟ ئەو کەسەیە، کە جێ ی باوەڕو متمانەی خەڵکی بێت و دڵنیابن لەماڵ وسامان و نەفسیان لێ ی. ئەی پێتان بڵێم کۆچکار (مهاجر) کێیە؟ ئەو کەسەیە کۆچی کردبێت لەخراپەوگوناەو وازی لێ یان هێنابێت. مرۆڤی بڕوادار خوێن ونەفسی حەرامە لەبڕواداران وەك حەرام بوونی ئەم ڕۆژە بۆ شەڕوکوشتار. گۆشتی موسڵمان حەرامەو نابێت موسڵمانی تر (بەغەیبەت کردنی) گۆشتی بخوات، (واتە نابێت موسڵمان غەیبەتی برای موسڵمانی بکات). هەروەها دەروونی موسڵمان حەرامەو نابێت ستەمی لێبکرێت و ئازار بدرێت. ئازاردانیشی حەرامە...}

❊ ❊❊

پێغەمبەری خودا ئەو وشانەی ئاڕاستەی کۆمەڵانی ئامادەبووی موسڵمانان کردو ئەم وشانەش چەندین ڕێسای بنچینەیی و گرنگیان لەخۆگرتبوو کە لەوەوپێش هیچ وتاربێژێك لەوڵاتی عەرەب دا نەیدرکاندبوون.. لەو ڕێسا بنچینەیی یانەش:

❊ قەدەغەکردنی خواردنی ماڵ وسامان بەناڕەوایی‌و، قەدەغەکردنی کوشتن و پێشێل کردنی ئابڕووو سەروەریی مرۆڤەکان، بێگومان خەڵکی لەوەپێش بۆ پەیداکردنی بەشی زۆری بژێوییان پەنایان دەبردەبەر دزی وجەردەیی و کوشتنی کەسانی دی بەناهەق.

❊ ڕزگارکردنی ئافرەت دوای ئەوەی لەلای عەرەب و سەرجەم گەلانی ئەو ناوچانە بەکۆیلە دادەنرا. ڕزگارکردنیشیان بەبڕیاری ڕاشکاوانەی پێغەمبەر بوو لەسەرئەوەی کەوا ئافرەتان حەقیان لەسەر پیاوان هەیەو دەبێت پیاوان بەچاکی لەگەڵیان دا ڕەفتاربکەن.

❊ ئەوەی شایانی باسیش بێت هەر ئیسلام مافی میراتگیریی بۆ ئافرەتان چەسپاندو جێگیرکرد دوای ئەوەی لەو مافە سروشتیەی خۆیان بێبەش کرابوون. هەروەها ئیسلام مافی سەربەستیی پێدان لەبەڕێوەبردنی ماڵو سامانیان داو لەپەسندکردنی شایەتی دانیشیان دا. ئەمەش لەنێو گەل و نەتەوەکانی ئەو سەردەمەدا دانی پێدانەنرابوو.

---

(١) (امام احمد) گێڕاوێتی یەوە

* چەسپاندنی بنەمای یەکسانی لەنێوان سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵ و ئەفرادی ڕەگەزی بەشەری دا بەچاونووقان لەزمان و ڕەنگ و ڕەگەزیان و، شوێن و پێوەری بەچاکترداناانی هەندێك کەس و خەڵکی لەهەندێکی تریان بەپێ ی سیفەتە دەروونی یەکانی تایبەت بەتەقواو خواپەرستی بێت و لەسەر کاری چاکەبێت.

لەپێش ئیسلامیش دا هیچ کەسێك ئەم بنەمایەی نەدرکاندبوو و نەکەوتبووە سەرزاری کەس، چونکە خەڵکی بەپێی ڕەنگ و ڕەگەزەکانیان هەڵدەسەنگێنران و لەیەکتر بەچاکتر دادەنران. تەنانەت ئەم ڕەفتارە ناپەسندە فەیلەسووفە گەورەکانیشی گرتبووەوە.

بۆ نموونە (ئەفلاتوون) دەیگوت: (من لەسەر سێ شت سوپاسی خودا دەکەم:

١- لەبەرئەوەی بەمرۆڤ دروستی کردووم و نەیکردووم بەئاژەڵ.

٢- کردوومی بەڕەگەزی —یۆنانی— و بەڕەگەزێکیتری دانەناوم.

٣- لەبەرئەوەی لەسەردەمی — سوکرات —دا داینناوم)..

♦ جا دوای ئەوەی پێغەمبەر ئەرکە بەندایەتیو خواپەرستی یەکانی ئەو حەجەی تەواوکرد گەڕایەوە بۆ (مەدینە). هەر کەشاری (مەدینە)شی بەدی کردەوە سێ جار بێژەی (الله اکبر)ی گوتەوەو پاشان فەرمووی: {**لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، آيبون، تائبون، عابدون، ساجدون، لربنا حامدون، صدق الله وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده**}[1].

---

(١) — بخاری — گێڕاوێتی یەوە.

# کۆچی دوایی ی پێغەمبەر

## سەرەتای نەخۆشیی و پەرەسەندنی:

پێغەمبەر چەند مانگێك دوای حەجی ماڵئاوایی، هەستی بەتووشبوونی نەخۆشی یەك دەکرد کە وردەوردە ئازارەکانی زیاتر دەبوون و سەرئێشەیەکی توندیان بۆ پەیدادەکرد. جا کاتێك ئێش و ئازار پەرەی سەند پێغەمبەری خودا داوای لەهاوسەرەکانی کرد ڕێ ی بدەن لەماڵی -عائیشە-دا بکەوێت لەجیاتی ئەوەی وەك نەریتی جارانی لەنێوان ماڵانی هاوسەرەکانی دا بگەڕێت. ئەوانیش (خودا لێ یان ڕازی بێت) مۆڵەتیان پێ دا.

ئیدی نەخۆشی و ئازارەکانی ئەو نەخۆشی یەی ڕۆژبەڕۆژ توندتر دەبوون لەسەری. لەم بارەیەوە (عبدالله - ی کوڕی مسعود) دەڵێت: (لەو کاتانەدا چووم بۆلای پێغەمبەرو ئازارێکی توندی لەئەنجامی زۆر ماندووبوون و نەخۆشی یەوە هەبوو، دەستم لێ ی داو پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا خۆ تۆ ئازارێکی زۆرت هەیەو زۆر ناساغیت). ئەویش فەرمووی: (بەڵێ وایە من وەك هەر پیاوێك لەئێوە نەخۆش دەکەوم و ئازارم دەبێت)... ئینجا پێم گوت: (بێگومان تۆ دوو پاداشتت هەیە)، فەرمووی: (بەڵێ، بەو خودایەی گیانی منی بەدەستە هەر موسڵمانێك لەسەرزەوی دا بژی و تووشی ئازاری نەخۆشی یەك ببێت، یان هەر ئازارێکی دی، ئەوا خودا لەبەرامبەردا گوناهەکانی دەسڕێتەوە وەك چۆن گەڵای درەخت دەوەرێت).

ئەو هەموو ئازارانەش، کە پێغەمبەر لەو نەخۆشی یەی دا چەشتبووی وای لە -عائیشە- ی هاوسەری کردبوو کەنەریتی حەز لەئازار چەشتنی لەدڵ دا بچەسپێت و لەوبارەیەشەوە بڵێت:(هەمیشە حەزم دەکرد چکۆسی و شاگەشکە بەهەر بڕوادارێك ببەم لەتوندیو سەختیی مردنی دا دوای ئەو توندی یەی لەسەر پێغەمبەری خودا بینیم).

## وتاری بۆ موسڵمانان:

گەرمی ی تاو دەردەکە هێندە لەجەستەی پێغەمبەردا تیینی سەند وای لێ هات داوای ئەوە بکات کە ئاوێکی زۆری بۆ بهێنن تا خۆی پێ فێنك بکاتەوە.. فەرمووی پێ یان: (حەوت جەوەندە ئاوم لەئاوی چەند بیرێکی هەمەجۆرەوە پیاداکەن).

(عائیشە) لەم بارەیەوە گوتوویەتی: (ئێمەش لەتەشتێکی -حفصە-ی هاوسەری دا دامانیشاندو ئاوەکەمان بەو شێوەیە کرد بەسەرو لەشیا تا وای لێهات بفەرموێت: بەسە، بەسە، چییتر ئاوم پیامەکەن). دوای ئەم خۆشتنە پێغەمبەر هەستی بەحەوانەوەیەك دەکردو چالاکی ی بەبەرداهاتەوە، بۆیە سەری بەست و چووە دەرەوە بۆ نێو خەڵکی و پێشنوێژیی

بۆكردن، دواى تەواوبوونى نوێژو سەلام دانەوە، چووەسەر مینبەرو دەستیکرد بە وتاردان بۆ خەڵكیو سەرەتا داواى لێخۆشبوونى خوداى بۆ شەهیدانى جەنگى (ئوحود) كردو بۆیان پاڕایەوە. پاشان ڕاسپاردەى خۆى لەمەڕ پشتیوانان (أنصار) دەربڕىو ڕووى كردە كۆچكاران (مهاجرین)و فەرمووى:

{ئەى كۆمەڵى كۆچكاران ئێوە لەزیادبوون دان، بەڵام پشتیوانان لەسەر ئەو شێوازەى ئەمڕۆ لەسەرى دەڕۆن لەزیادبوون دا نین. پشتیوانان هەردەم جێى متمانەى منن و دالّدەدەرمانن. جا ئێوەش دەبێت ڕێز لەو كارە جوامێرىو چاكانەیان بنێن و چاكە لەگەڵ چاكەكاریان دا بكەن}.

ئینجا فەرمووى: {بەندەیەك لەبەندەكانى خودا گەر لەنێوان دنیاو بەشى خوادا سەرپشك بكرێت هەر بەشى لاى خواى هەڵبژاردووە}. لەو كاتەدا (ئەبوبەكر) تێگەیشت و زانى ى مەبەستى پێغەمبەر لەو سەرپشك كردنە خۆیەتى، بۆیە گریا و گوتى: {بەڵكو خۆمان و ماڵ و منداڵمان دەكەین بەفیداى تۆ}... پێغەمبەر پێ ى فەرموو: {لەسەرخۆبە ئەى ئەبوبەكر}، ئینجا ڕووى كردەوە موسڵمانان و لەبەشێكى ترى وتارەكەى دافەرمووى:

{هەر دەرگایەك لە مزگەوتدا هەیە دادەخرێت تەنها دەرگاى -ئەبوبەكر- نەبێت. چونكە نابینم كەسێكى دى لە (ئەبوبەكر) باشتر بووبێت لەهاوەڵێتى كردنى من داو گەورەترین ڕۆڵى هەبووە. جا ئەگەر من یەكەمین هاوڕێى دڵسۆز بۆ خۆم دیاریكەم ئەوا هەر -ئەبوبەكر- لەپێش هەموو كەسێك دا دیارى دەكەم. بەڵام جارێ هەر (هاوڕێ یەتى و برایەتى ى ئیماندارى) تاكو خودا لاى خۆى بەیەكمان دەگەیەنێتەوە}.

پێغەمبەرى خودا سەبارەت بە داهاتووى نەتەوەكەى لەوەش دەترسا، كە كارى خودا پەرستى یەكەیان هەندێك خڵتەى هاوبەش بۆ خوادانان (شیرك)ى تێ بكەوێت و خەڵكى دڵیان بەمەزارو گۆڕى پێغەمبەران و پیاوچاكانەوە ببەستن لەجیاتى ئەوەى دڵ و دەروونیان تەنها بەخوداوە پەیوەست كەن.. هەر بۆیە لەم ڕووەشەوە لەبەشێكى ترى وتارەكەى دا فەرمووى:

{هەندێك لەگەلانى پێش ئێوە گۆڕەكانى پێغەمبەران و پیاوچاكانیان دەكردە مزگەوت و شوێنى نوێژتیاكردن. جا ئێوەش نابێت گۆڕەكان بكەنە چەند مزگەوتێك و مزگەوتى لەسەربنیات بنێن چونكە من ئەوەتان لێ قەدەغە دەكەم}.

## ڕاسپاردنى - ئەبوبەكر - بۆ پێشنوێژیى موسلمانان:

لەكاتێك دا پێغەمبەر نەیدەتوانى پێشنوێژى بكات، فەرمووى: {فەرمانم بگەیەنن بە -ئەبوبەكر- با ئەو پێشنوێژى یەكە بۆ خەڵكى بكات. لەو ساتەدا (عائیشە)ى هاوسەرى، پێى گوت: (ئەى پێغەمبەرى خودا -ئەبوبەكر- پیاوێكى بەسۆزو دەنگ كزەو زۆریش دەگرى

لەکاتی قورئان خوێندن دا)، بەڵام پێغەمبەر هەر فەرمووی: {فەرمانی پێبگەیەنن بچێت پێشنوێژی بۆ خەڵکی بکات} . (عائیشە) دەڵێت: (هەمان وتەی پێشووم پێ گوتەوە). ئینجا پێغەمبەر لەوەڵامی من دا فەرمووی: (ئێوەی ئافرەت زۆر عاطیفی و هەست ناسکن. بڕۆن فەرمانم بگەیەنن بەئەبوبەکر با خۆی پێشنوێژی یەکە بۆ موسڵمانان بکات).

هەر لەم بارەیەوە (عائیشە) گوتوویەتی: {دەسا بەخوادامن تاکە مەبەستێکم لەو وتانەم دا بۆ پێغەمبەر ئەوەبوو، کە ئەو بەرپرسیارێتی یە لەسەر باوکم (ئەبوبەکر) لاببات و تێگەیشتبوومکە خەڵك حەز ناکەن هەرگیز کەس شوێنی پێغەمبەر بگرێتەوە، لەو حاڵەتەش خەڵکی لەهەر ڕووداوێکی لەناکاودا ڕەشبین دەبوون پێ ی، بۆیە حەزم دەکرد ئەوە لە ئەبوبەکر دوورکەوێتەوە} .

ئینجا پێغەمبەر هەندێك وزەی لەخۆی دا بەدی دەکرد، کە بتوانێت بڕوات بۆ نوێژ، بۆ ئەم مەبەستە بەیارمەتی دووپیاو گەیشتە مزگەوت، کە خۆی لەسەرشانیان ڕاگیرکردبوو. جا کە گەیشتە مزگەوت (ئەبوبەکر) سەرقاڵی پێشنوێژی کردن بۆ خەڵکی بوو، بەڵام ویستی خۆی لەکارەکە دوابخات، پێغەمبەریش ئاماژەی بۆکرد، کە لەجێگای خۆی دا بمێنێتەوە. ئینجا چووە تەنیشتیەوە دانیشت و نوێژی کرد، (ئەبوبەکر)یش لەدوای پێغەمبەر نوێژی دەکرد و خەڵکیش لەدوای ئەبوبەکرەوە نوێژیان دەکرد.

### دوا وەسیەت:

جا کە وردەوردە ژیانی پێغەمبەر بەرەو کۆتایی دەچوو، هاوەڵەکانی لەماڵی (عائیشە) کۆکردەوەو بۆی ڕوانین و سەرنجی لەسەرڕاگرتن و فرمێسك کەوتە چاوەکانی و فەرمووی: {بەخێربێن.. خودا بتانهێڵێت.. خودا ڕەحمتان پێ بکات... خودا بتانحەوێنێتەوە... خودا بتانپارێزێت.. خودا بەرزتان بکاتەوە... خودا سەرکەوتووتان کات. خودا ساغ و سەلامەتتان کات.. خودا قبووڵتان بکات... من وەسیەت و ڕاسپاردەم بۆ ئێوە ئەوەیە خودا بپەرستن و بەتەقواو پارێزکاربن... لەخوداش دەخوازم ئاگای لێتان بێت و کاروبارتان هەڵسوورێنێت و ئێوەی پێ دەسپێرم. بێگومان من ترسێنەر و مزگێکنی دەرم لەلایەن خوداوە بۆ ئێوە لەسەرئەوەی سەرپێچی لەفەرمانی خودا دەرهەق بەبەندەکانی و وڵاتەکەیان نەکەن. خوداش خۆی بەمنیش و ئێوەشی فەرمووە: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾القصص/٨٣..

پاشان وەسیەتی بۆکردن کە چۆن کفنی بۆ ببڕن و چۆن بینێژن و هیچ هاوارو شین و ڕۆڕۆیەکنەکەن.

له جابریشەوه گێڕراوەتەوه گوێ ی لەپێغەمبەری خودابووه لەپێش مردنـی دا فەرمووپـە: {گومانی باشتان بەخودا هەبێت}.

پێغەمبەر دەشترسا لەوەی، کە لەپاش خۆی نەتەوەکەی دوای هەواو ئارەزوو بکەون، دیـارە ئەمەش دەبێتە هۆی وازهێنان لەنوێژو خواپەرستی، هەروەها دەترسا لەوەش، کـە نەریتـەکانی لووتبەرزی و خۆبەزل دانان بەسەریان دا زاڵ بن، هەر بۆیەش دیارترین وەسیەتی لەپێش کۆچـی دوایی دا ئەوەبوو داوای لەموسڵمانەکان دەکرد، کە پابەندبن بەنوێژکردنەوەو بـەردەوام لەنوێـژو زیکری خـوادابن و شان بەشانی ئەمــەش زۆر نـەرم و نیـان و بـەڕەحم بـن لەگـەڵ کەسـانی خزمەتکارو کارگوزارو بەندەدا.

لەم بارەیەوە (أنس) — خودا لیّ ی ڕازی بێت — دەڵێت: {بەگشتی ڕاسپاردەی پێغەمبەری خودا بەرلەگیان دەرچوونی، ئەوەبوو هەر دەیفەرموو: (( **الصَّلاة وما ملكت أيمــانكم**..))...} واتە: (بەردەوام بن لەسەرنوێژکردن و ئاگاتان لەژنەکانتان بێت و نەرم ونیان بن لەگەڵیان دا).

## کۆتا ساتەکانی ژیانی پێغەمبەر:

(ئەبوبەکر) پێشنوێژیی بۆ موسڵمانان دەکردو بەمەش گوێڕایەڵیی خـۆی بـۆ فەرمانەکـەی پێغەمبەری خودا دەردەبـڕی و لـەوەدا بـەردەوام بـوو، تـا ڕۆژی دووشـەممە (واتـە ئـەو ڕۆژەی پێغەمبەر تیایدا وەفات دەکات)، لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر پەردەی ژوورەکەی لادا، کە دەیڕوانـی بەسەر مزگەوتەکەداو موسڵمانانی بینی لەنوێژدابوون و زەردەخەنەیەك گرتی، موسڵمانەکانیش گەلێك دڵشادبوون و تەنانەت وایان لیّ هات خەریك بوو دەست بەنوێژ نەکـەن لەبـەر زۆریـی و جۆش سەندنی شادی لەدڵیان دا بەدیتنی پێغەمبەرەکەیان، تەنانەت (ئەبوبەکر) ویـستی خـۆی دوابخات تاکو بگاتە ڕیزی دواوەو بوار بۆ پێغەمبەر بکاتەوە تاکو پێشنوێژییان بۆ بکات. بەڵام پێغەمبەری خودا ئیشارەتی بۆکردن، کە نوێژەکەیان دەست پیّ بکەن و پەردەکەشی دادایـەوەو گەڕایەوە سەرپێخەفەکەی.

ئەوەش دوا دیدارو چاوپێکەوتنی بوو لەگەڵ موسڵمانان دا.

کاتێك هەستی کرد ئەوا مردنی لیّ نزیك دەبێتەوە نەختێك ئاوی لەبەردەسـتی دا دانـابووو دەستی پیّ تەڕدەکردو دەیهێنا بەسەر گۆنای داو دەیفەرموو: {ئای خەم و ئازاری مـردن چـەند گەورەیە}، (فاطیمە)ی کچیشی دەیگوت: (هەی بابەڕۆ چ کارەساتێکە... خەمی تۆ هـەمووی بۆ من بێت ئەی بابەگیان)... پێغەمبەری خوداش پیّی فەرموو: (لـەمڕۆوە خـەم و کارەسـات لەسەر باوکت نامێنێت)، بەڵام پێغەمبەر کـەبینیی (فاطیمـە) چـەندە بـیّ ئـارام و دڵتەنگـە

لەخۆی نزیك کردەوەو سەری خستەژێر قۆڵی یەوەو وتەیەکی بەگوێ دا چرپاند، فاطیمەش بەو وتەیە گریا، پاشان بۆ جاری دووەم وتەیەکی تری بەگوێ دا چرپاندو (فاطیمە) پێکەنی.

(دوای وەفاتی پێغەمبەر، عائیشە دەربارەی ئەو دوو وتەیە لە —فاطیمە—ی پرسی بوو)، ئەویش گوتبووی: (لەیەکەم وتەدا کە باوکم بەگوێ ی دا چرپاندم فەرمووی پێم کە ئەو کۆچی دوایی دەکات و منیش گریام. پاشان لەدووەم وتەیدا هەواڵی ئەوەی پێ ڕاگەیاندم کە من یەکەم کەسم لەکەسە نزیکەکانی کە دوای مردنی خۆی پێ ی دەگەم، ئیتر بەو مژدەیە پێکەنیم).

هەروەها (عائیشە)ی هاوسەری لەوەسفی کۆتا ساتەکانی بەر لەوەفاتی پێغەمبەردا گوتوویەتی: (لەبەردەستی پێغەمبەردا قوتوویەك ئاو هەبوو دەستی تێ دەخست و دەم وچاوی پێ دەسڕی و دەیفەرموو: ((في الرفيق الأعلى، في الرفيق الأعلى ...)) هەتا گیانی کێشراو وەفاتی کرد.

وەفات کردنیشی لەڕۆژی دووشەممە(١٢)ی —ربيع الأول—دا و لەتەمەنی(٦٣)ساڵی دابوو.

بێگومان هەر کەسێك بەوردی سەرنجی فەرموودەکانی پێغەمبەر بدات (لەپێش لەدنیا دەرچوونی داو لەو چرکە ساتانەی کۆتایی ی دا) بەتەواوی قەناعەت بەو ڕاستی یە ڕوونە دێنێت، کە ئەو بەڕاستی و بەحەق پێغەمبەری خودا بووە. چونکە وەسیەت کردنی بەنوێژو پارێزکاری و لەخواترسان و بەرگرتن لەبەدکاری، لەدوایین ڕاسپاردەکانی بووە. ئەو ساتەی پەردەی ژوورەکەشی لاداوەو موسڵمانانی لەنوێژەکەیان دا بینیوەو کە ئەوانیش هەستیان بەبینینی ئەو کردووە، لەجوانترینی ئەو دیمەنانە بووە کە شادیو خۆشی ی بەدەروونی گەیاندووەو لەهەمان کاتیش دا زانیویەتی کە کاتی لەدنیا دەرچوونی هاتۆتە پێشەوە.

بەڵام گریمان گەر پێغەمبەر نەبوایەو وەك خەڵکی دی تووشی ئەو سەرەمەرگە بوایە ئەوا لەو چرکەساتانەی دوایی ی دا، کە مرۆڤ هەست بەنزیك بوونەوەی مردنی دەکات تاکە (هیواو خەم و خەیاڵێکی) بیرکردنەوە بوو (لەکەس وکاری خۆی بەتایبەتی)، کە چۆن دوای خۆی دەژین و بیرکردنەوەش بوو لەخۆشیو ئارەزووەکانی دنیاو لەو ماڵ وسامان و شت ومەکانەی بەجێیان دێڵێت.

تەنانەت هەندێك کەس لەوانەی کەهەمیشە لەژیانیان دا فڕوفێڵیان کردووە لەکاتی سەرەمەرگ و کۆتاساتە ترسناك و بەسامەکانی لەدنیا دەرچوونیان دا لێ یان بینراوەو بیستراوە، کە دانیان بەهەموو تاوانەکانیان داناوەو خۆیان لەگومڕایی بێ بەری کردووە.

بەڵام ئەوەی، کە خەڵکی لە(محمد)ی پێغەمبەریان بینیوە لەکاتی سەرەمەرگ و کۆتاساتەکانی بەخوا گەیشتنەوەی دا پێچەوانەی ئەو حاڵەتە زانراوەی سەرە مەرگی

جادووگەران و تەڵەکەبازان بووە. چونکە خودا هاوسۆزی بووەو پاڵاوتوویەتی بۆ ئەو ڕێزەی، کە پلەی (خلیل)ی پێ ببەخشێت. تاکە هیواو داواکاری ی پێغەمبەر گەیشتنەوە بەخودای پەروەردگاری بوو، کە بە (رفیق الأعلی)ی وەسف کردبوو لەبەر ئەو هەموو سۆزو ڕەحمەت و هاوخەمی یەی خودا بۆی، ئەو (رفیق الأعلی)یەی، کە هەتا دواهەناسەی لەسەرزمانی بووو بەچاکی دەیدرکاند.

بێگومان پێغەمبەری خودا کۆچی دوایی کردو لەدوای خۆیشی ئەو بەرنامەیەی بۆ موسڵمانان بەجێ هێشت، کە (قورئانەکەی خودا)و (سوننەتی خۆی) بوو ئەگەر موسڵمانان پەیڕەویی بکەن هەرگیز گومڕاو سەرگەردان نابن، هەروەها لەدوای خۆی ئەو هاوەڵە پێگەیشتوو و تێگەیشتوانەی بەجێ هێشت، کە بەچاکی ئیسلامیان ڕوون دەکردەوەو کاری فەتح کردنی شارو وڵاتانی تریان پێ تەواودەکردو ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلامیان بەجیهان دەگەیاند.

ئێمەش لەخودا دەپاڕێینەوە، کە خودا پاداشتی(محمد)ی پێغەمبەری بداتەوە (بەو پاداشتە خێرەی، کە بۆ پێغەمبەرانی دیاری کردووە) لەسەر ئەو هەموو هەوڵ و جیهادەی، کە بۆ نەتەوەکەی گێڕاوێتی. هەروەها لەخودا دەپاڕێینەوە کارمان بۆ مەیسەرکات لەپەیڕەوی کردنی ڕێبازە ڕاستەکەی، تاکو بەختیاری و ئاسودەیی ی دنیاو ڕۆژی دوایشمان دەست کەوێت..

# لایەنی سێیەم

## پوختەیەك لە ژیانی شەخسی و کۆمەڵایەتی پێغەمبەر

١- لە ئاکارە بەرزەکانی پێغەمبەر

٢- هاوسەرانی پێغەمبەر

٣- چەند وانەو پەندێك

٤- گەورەی هەموو گەورە پیاوان

# بەندی یەکەم

## ((لەئاکارە بەرزەکانی پێغەمبەر))

("محمد" نمونەی تەواو- شێوەی ڕوخسارو جەستەی- لەخۆبوردوویی ی- ڕەحم و بەزەیی ی- لێخۆشبوون و لەسەرخۆیی ی- زوهدو دنیانەویستیی ی- خواپەرستییو عیبادەتی- ڕەوانبێژیی و دانایی ی )

## "محمد" نمونەی تەواو

ژیاننامەی (محمد) پڕە لەئاکاری هەرەبەرزی مرۆیی و ڕەوشتی نایـاب و بێوێنـەو، هـەموو ئەو هەڵوێستە نەمرانەش کە ئاماژە بۆ خانـەدانی و گـەورەیی یـە ڕەسـەنەکەی و خوونـەریتی جوان و درەوشاوەی دەکەن. بەڕاستی (ئەو) هەر خـودای پـەروەردگار ئـەدەبی پـێ بەخـشیوەو باشترین ئاداب و هەڵس وکەوتیشی فێرکردووەو پاراستوویشیەتی لەخراپـەو بـەدکاری یـەکانی ئەو ژینگەیەی تیایدا گەشەی کردووە، هیچ ڕەوشتێکی جوان نەمابوو، کە پێغەمبـەر خـاوەنی نەبووبێت. هەموو ڕەوشت و ڕەفتارێکی جوان هەر لەوەوە بینراوەو زانراوە. هەر بۆیـەش خـودا لەقورئانـدا ئـاوا وەسـفی ڕەوشـتمەندی یەکـەی دەکـات و دەفـەرموێت:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾القلم/٤.

بەم ڕەنگە -محمـد- نموونـەی بـاڵای پێگەیـشتوانەو کـامڵی ی مرۆڤایـەتی و، پێـشەنگی هەرەچاکی موسڵمانان بووە، خوداش فەرمانی پێکردووین کە بیکەین بە سەرمەشـقی خۆمـان لەهەموو کاروکردارێکدا هەمان ڕەفتارو نەریتی ئەو پەیڕەوبکەین و دوای ئاکارو خەسڵەتەکانی بکەوین تاکو ڕەزامەندی خودامان دەست کەوێت، هەروەك خودا پێمان دەفەرموێت:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾الأحزاب /٢١.

هەر توێـژەرەوەو لێکۆڵیارێـك گـەر بیـەوێت لـەو ڕەوشـتە بەرزانـەی پێغەمبـەری خـودا بکۆڵێتەوە دەبێت شارەزایی ی تـەواوی لـەقورئان هـەبێت و بـۆ ئـەو مەبەسـتە زیـاتر سـوود

لەقورئان وەربگرێت. چونکە هەر ڕەوشتێکی بەرز، کەقورئان بانگەوازی پەیڕەوکردنی کردووە (محمد) پێش هەموو کەس لەخۆی دا بەرجەستەو پیادەی کردووە.

لەم ڕووەوە دایکی بڕواداران (عائیشە) کە نزیکترین کەس بووە لەپێغەمبەرەوە دەڵێت: {ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەری خودا (قورئان) بووە} واتە هەموو ڕەوشتێکی بەڕێنمایی قورئان بووە. جگە لەقورئانیش، کتێبە پیرۆزەکانی فەرموودەش (أحادیث)[1] دەیان هەزار لەگفتارو ڕەفتارە بەرزەکانی پێغەمبەرو ئەو وەسیەت و ڕاسپاردانەیشیانمان بۆ دەگێڕنەوە، کە بانگەواز بۆ هەموو ڕەوشت و خوویەکی جوانی ئینسانی دەکەن و هەر خودی ئەو کتێبانەی لەسەر فەرموودەکانی نووسراون و دانراون بەهێزترین بەڵگەو گەورەترین شایەتی دانن لەسەر پابەندی و تایبەتمەندیی پێغەمبەر بەئەخلاقی نموونەیی و بەرزی بەشەری یەوە.

ئێمەش لەم بەشەی کتێبەکەمان و لەم چەند لاپەڕەکەمە دا، پوختەیەك لەسیفات و ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر بۆ خوێنەران دیاری دەکەین تاکو ڕێنمایی ی ژیانی لێوەرگرن و لەسەر ئەو شێوازە ڕاست و دروستەش هەنگاوبنێن و بەم پێ یەش بەڕەزامەندی خودا بەختەوەربن.

بەڵام پێش ئەوەی سیفەت و ڕەوشتە جوانەکانی دیاری بکەین وا چاکە ئاماژەیەك بۆ ڕوخسارو شێوەی جەستەیی ی پێغەمبەر بکەین، کە هاوەڵانی باسیان لێوەکردووە.

## شێوەی ڕوخسارو جەستەی

پێغەمبەر لەنێو خەڵکی دا جوانترین ڕوو و ڕوخساری هەبوو و هەر کەسێکیش وەسفی کردبێت بەمانگی شەوی چواردە (شەوی بەدر)ی چواندووە. ڕوخساری سپی و تێکەڵ بەڕەنگێکی سوور بووە، هەر دووچاوی گەورەو گلێنەکانی ڕەشی تۆخ بوون، هەروەها چاوەکانی وەك چاوی کلڕێژکراو دەرکەوتوون بێ ئەوەی کلیشی تێ کردبن. پێڵووی چاوەکانیشی نەختێك درێژبوون، برۆکانیشی درێژبوون و وردەکاری یەکی جوان لە هەردوو لای برۆکانی دا هەبووەو، تا ئەملاولای چاوەکانی درێژبوونەتەوە. ناوچەوانی پان بووەو لووتی ڕێك بووە، دەمی فراوان بووە. جوانترین دوولێوی هەبووە، لەنێوان دانەکانی دا ماوە هەبووە، هەردوو ڕوومەتی کەم گۆشت و مام ناوەندی بوون، مل و گەردنی لەهی هەموو کەس جوانتربوون، ملی نەکورت بووەو نە درێژبووە، سینەی پان و فراوان بووە، دوو شانی ڕێك و دوو پێ ی پتەوبووە، بالای

---

(١) کتێبەکانی فەرموودە بەکتێبەکانی سوونەتیش (کتب السنة) ناودەبرێت و گرنگترینیان ئەمانەن: (صحیح البخاري—صحیح مسلم—و—ترمذي—و—نسائي—و—ابوداود—و—ابن ماجە—و—(موطأ—ی امام مالك)و (مسند—ی امام احمد)..

بەرز بووە بەڵام هێندەش درێژ نەبووە، کە زیاد لە ڕادەی مەئلوف بوو بێت، دیارە هێندەش کورتە باڵا نەبووە، کە باڵای نزم بێت.

ورگ و سکی زلی نەبووە، سك وسنگی لەئاستی یەکتردا بوون. هەروەها لەش ولاریشی نەقەڵەو بووەو نەزۆر لاواز بووە. پشتی ڕاست و گەورە بووە. لەنێوان هەردوو شانی دا نیشانەی پێغەمبەرێتی هەبووە کە لەلای شانی ڕاستیا بووە، کە بریتی بووە لە خاڵێکی ڕەش بەسەر زەردا ڕوانیویەتی و چەند تاڵەموویەك دەوری داوە، قژیشی نەلوول بووەو نەخاوبووە، بەڵکو لەنێوان ئەو دووجۆرەدا بووەو گەیشتۆتە سەرنیوەی هەردوو گوێ ی، یان سەرنەرمایی ی هەردوو گوێکانی، لەڕۆشتن و هەنگاونانیشی دا گورج وگۆڵ بووەو گەر بەڕێگەدا بڕۆشتایە هێندە چالاکانە دەڕۆشت وەك ئەوەی بەڕێگەیەکی سەرەولێژدا بڕۆشتایە. گەر ئاوڕی بەلایەك دا بدابایەوە هەموو لەشی پێکەوە دەسوڕاند. دەنگێکی ساف و زوڵاڵی هەبووە. لەخەم و ئەندێشەی نەترازاوو بەردەوام دابووە، هەردەم لەبیرکردنەوەو تێفکرین دابووە. زۆر بێ دەنگ بووەو بۆ پێویستی یەك نەبێت قسەی نەکردووە، هەر بەناوی خودای گەورەوە وتەکانی دەست پێکردووەو کۆتایی پێ هێناوە. لە وتەو ئاخاوتنی دا بەڕوونی باسی نیعمەتی خودای کردووەو نیعمەتەکانی بەگەورەو گرنگ داناوەو گەر کەمیش بووبێت بەبێ بایەخ بۆی نەڕوانیوە. ئەگەر تووڕەو پەست بووبێت ڕووی بەلایەکیتردا وەرگێڕاوە، ئەگەر دڵشادیش بووبێت چاوی داخستووە، لەپێکەنین دا تەنها بزەو زەردەخەنەی هەبووە. هەرکەسێك یەکەم جار دیبێتی شەرمی لێکردووەو بەپیاوێکی بەهەیبەت و سەنگینی ی بینیوە. هەر کەسێکیش تێکەڵی بووبێت و ناسیبێتی خۆشیی ویستووە. ئەوەی وەسفی کردبێت هەر گوتوویەتی: (هەرگیز پێش ئەوو دوای ئەو پیاوی ئاوام نەدیوە)...

پێغەمبەر هەردەم حەزی لەبۆن و بەرامەی خۆش بووەو لەزۆرترینی کاتەکانی دا بەکاری هێناوە بۆ بەدیدار گەیشتنی مەلائیکەتەکان و دانیشتن لەگەڵ موسڵمانان و لەبەر خەریك بوونی بەزۆربەی ئەو دیدارو کۆڕو کۆبوونەوانەوە هەرگیز پیازو سیری نەدەخوارد. سیریشی بە (پاقلەی پیس) ناودەبرد.

## لەخۆبوردوویی ی

سیفەتی لەخۆبوردویی(تواضع) لەژمارەیەکی کەمی ئەو حاکم و دەسەڵاتدارانەدا هەیە کە جڵەوی حوکمیان دەکەوێتە ژێردەست و حوکمڕانی دەکەن، نەخاسمە لەو زەمەنە ڕابردوانەی کە لووتبەرزیو گەورەیی تاکە بنەماو سیمای دیاری حاکمانی سەرزەوی بووە.

(محمد)ی پێغەمبەرو (حاکم بەئەمری خودا)ش پێچەوانەی ئەو بنەماو سیما باوو زانراوانە ڕەفتاری کردووە.. لەخۆبوردوویی‌و خۆبەکەم گرییش لەدیارترینی سیفەتەکانی بووە، یەکێك لەئامانجەکانی پەیامی خۆی لەناوبردنی نەریتی خۆ بەزل زانین بووە کە نەریتێکی ناهەموار بووەو لەسەرانسەری دنیادا بڵاوبووە.

پێغەمبەر زۆرجار لەپەندو ئامۆژگاریی یەکانی دا بۆ نەتەوەکەی دەیفەرموو: {هەر کەسێك تۆزقاڵێك لەنەریتی خۆ بەزل زانیی لەدڵ دابێت ئەوا ناچێتە بەهەشت}[1]. پێغەمبەر لەژیانی خۆی دا لەوپەڕی سادەو ساکاری‌و لەخۆبوردوویی دا بوو. هەروەك لەژیاننامەکەی‌دا باس کراوە کە لەنێو کۆڕو کۆمەڵێك دا دانیشتایە لەکۆتایی و خوارووی مەجلیسەکەدا دادەنیشت. هەروەها لەکۆڕو دانیشتنەکانی دا مافی هەریەکە لەهاونشینانی لەجێگەو مەوقیع دا پێ دەدا تاکو هیچ کەسێکیان وای دانەنێن گوایە ئەوی تر لەو بەڕێزترە..

جارێکیان پێغەمبەر، کە خۆی دابوو بەسەر داردەستەکەی داو دەچوو بۆلای هەندێك لە هاوەڵانی‌و هەر کە گەیشتە لایان هەموویان هەستانە سەرپێ (واتە لەبەری هەستان). ئەویش فەرمووی: (هەڵمەستن بۆم وەك چۆن عەجەم و بیانی یەکان بۆ هەندێك کەسی تایبەتییان هەڵدەستن و بەنابەجێ بەگەورەیان دەگرن)، واتە زیاد لەڕادەی پێویست و بۆ هەندێك مەبەست لەبەریان هەڵدەستن و بەگەورەیان دەگرن...

هەر لەم بارەیەوە فەرموویەتی: (زیادەڕەوی لەمەدح و ستایش کردنی من دا مەکەن وەك چۆن مەسیحی یەکان هێندە ستایشی –عیسا–یان کردو زیادەڕۆییان تیاداکرد تاکو کردیانە کوڕی خودا، بێگومان منیش بەندەیەکی خودام، جا کەوابوو بڵێن: بەندەو پێغەمبەری خودا)[2].

هەندێك لەدیاردەکانی لەخۆبوردوویی و ڕواڵەتەکانی سادەو ساکاریی پێغەمبەر ئەوەبوو خۆی پێڵاوەکانی خۆی دەدووری یەوەو جلەکانی پینەدەکرد، لەناوماڵیش دا یارمەتی‌ی هاوسەری دەداو خزمەتی خەڵکی ی دەکرد، گۆشتی لەگەڵ هاوسەری دا لەت دەکردو کاروباری‌تری لەگەڵ دا ڕادەپەڕاند.

لەهەموو کەسیش زیاتر بەشەرم وشکۆبوو و زۆر بۆ خەڵکی نەدەڕوانی‌و سەرنجی لەسەرڕووی بەرامبەرەکەی ڕانەدەگرت. بەدەم داواکاری‌و پێویستی‌ی هەموو جۆرە چین و توێژێکی خەڵکییەوە دەچوو سا ئیتر بەندە(عەبد) بوونایە یان ئازاد(حرّ) بوونایە. لەنێو

---

(١) – مسلم – گێڕاوێتی یەوە.
(٢) – بخاري – گێڕاوێتی یەوە.

هاوەڵانی دا دادەنیشت و تێکەڵی هەموویان دەبوو و لە دواجێگەی مەجلیسەکەش دا ستاری دەگرت. هەر کەسێك لەگەڵی دا دابنیشتبایە یاخود لەگەڵیا بۆ پێویستیەیەك هەڵبستایە خۆی رادەگرت تاکو ئەو کەسە پێشی کەوێت. هەر کەسێکیش داوای یارمەتی و پێداویستی یەکی لێ بکردایە نائومێدی نەدەکردو شتێکی هەر پێ دەبەخشی، گەر نەیشیتوانیایەو نەیبوایە شتێکی بۆ دابین کات ئەوا بەوتەیەکی جوان بەرێ ی دەکرد.

لە رۆژی فەتح کردنی مەککەدا پیاوێك بە دڵەراوکێ و شڵەژاوی یەوە هاتەلای و لەبەردەمی دا هەڵدەلەرزی، بەلام پێغەمبەری خودا پێی گوت: (لەسەرخۆبەو مەترسە، خۆ من پادشایەك نیم، من کوڕی ژنێکی قورەیشم، کە گۆشتی وشك بووەوەی دەخوارد).

گەر ئەو کەسەی داوای بەڵگەی بنەبڕ(قاطع) لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی دەکات و لەم فەرموودەیەی وردبێتەوە (من کوڕی ژنێکی قورەیشم کە گۆشتی وشك بووەوەی دەخوارد) ئەوا بەهێزترین بەڵگەی لەسەر راستیی پێغەمبەرێتی یەکەی بۆ دەردەکەوێت، چونکە فەرماندەیەك سەرتاپای ولاتێکی کەوتبێتە ژێردەست و هەر خۆی بووبێتە خاوەنی بڕیارو دەسەلات و کەچی خۆی لەهەموو ناوو نازناوێکی گەورەییو دەسەلاتداری دابڕێت، بەراستی جگە لە (وەسفی پێغەمبەرێتی) هیچ وەسفێکی تر شایانی نی یە.

## رەحم و بەزەیی

ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان ئەو تایبەتمەندێتی یە جوانانەی کە مرۆڤ پێ ی ناسراوەو ئەو سیفەت و رەوشتانەش کە خۆی پێ رازاندۆتەوە ئەوا دەبینین هیچ سیفەتێك بەقەد (رەحم و بەزەیی ی) چاك و بەهادار نی یە.

رەحمەت و بەزەیی سیفەتێکی دیاری ئیسلامە، خوداش یەکێك لەسیفەتەکانی کە هەردەم موسڵمان پێ ی دەپاڕێنەوە لێ ی (سیفەتی رەحمەتە) خودا خۆی بەرەحم و میهرەبانەو لەناوە پیرۆزەکانیشی(الرحمن-الرحيم)ەو فەرمووشیەتی: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ الأعراف/١٥٦..

خودا پێغەمبەرەکەی خۆی (محمد)یشی بەو سیفەتە گۆش کردووەو دیارترین ئاکاری بەسۆزیو میهرەبانیی پێبەخشیوە، هەواڵی ئەوەی بۆ موسڵمانانیش دووپات کردۆتەوەو فەرموویە: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾التوبة/١٢٨..

ئەم ئایەتە شایەتی دانێکە بۆ پێغەمبەر، کە چەندە دڵتەنگ و بارگران بووە بۆ ناڕەحەتی و بارگرانی ی موسڵمانان و چەند سووبووە لەسەر ڕێنمایی و دڵشاد کردنیان و پاشان چەند بەسۆزو بەڕەحمیش بووە بۆیان.

سۆزو بەزەیی ی پێغەمبەر بۆ موسڵمانان لەوەدا ڕەنگی داوەتەوە کەشتی زیانبەخش و زەرەرمەندیان لێ دووردەخاتەوەو شتی سوودبەخشیان بۆ دێنێت.

ئایەتەکە ستایشی پێغەمبەر دەکات هەروەك ستایشیشە بۆ ئەو خودایەی کە فەرمانڕەوایەکی بەڕەحم و دلۆڤانی داناوە بۆ موسڵمانەکان و بەهۆی میهرەبانی و بەزەیی یەکەیەوە بێ ئارام و دڵتەنگ دەبێت کاتێك گەلەکەی دڵتەنگ و خەمباربن و تووشی زەرەرو زیان بن.

جگە لەو ئایەتە، خودای پەروەردگار وەسفێکی ڕەحم و نەرم ونیانی ی پێغەمبەر لەجێ یەکی تری قورئان دا دەکات و دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴾آل عمران/١٥٩... خودای مەزن لەم فەرمایشتەش دا ئاوا وەسفی پێغەمبەرەکەی دەکات کە بێگومان ئەو نەرم ونیان بووە بۆ گەلەکەی، ئەم نەرم و نیانی یەش لەڕەحمەتێکی خوداوەیە کە بەپێغەمبەرەکەی بەخشیوە، چونکە گەر تووڕەو مۆن و وشك بوایە لەگەڵ خەڵکی داو هیچ کەسێك لەگەڵیا هەڵی نەکردایەو، پاشان گەر دڵڕەق و بێ ڕەحم و بەزەیی بوایە ئەوا هەموو خەڵکی ڕقیان لێ ی دەبووەو لێ ی دەتەکینەوە. بەڵام پێغەمبەر هەموو ژیانی یەکپارچە ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی بووە، چ لەهەڵس وکەوتی لەگەڵ خەڵکی داو چ لەڕێنمایی یەکانی دا بۆ نەتەوەکەی...

هەر پێغەمبەر بوو، کە بەم فەرمووده زێڕینانە نەتەوەکەی ڕاسپاردووەو فەرموویەتی: ((ارحموا من في الارض يرحمكم من في السماء)).. واتە: {ئێوە ڕەحم بەخەڵکی سەرزەوی بکەن، ئەوا خوداش لەئاسمان دا ڕەحمتان پێ دەکات}، هەروەها دەفەرموێت: ((لايرحم الله من لايرحم الناس)).. واتە {خودا ڕەحم بەو کەسە ناکات کە ڕەحم بەخەڵکی ناکات}.. هەروەها پێغەمبەر فەرموویە: ((لاتنزع الرحمة الاّ من شقيّ))... واتە: {ڕەحمەت تەنها لەئینسانی گومڕاو بەدبەخت دەسەنرێتەوە}.

ڕەحم و بەزەیی کاتێك بەڕوونی لەمرۆڤ دا دەبینرێت کە مامەڵەی باش بێت لەگەڵ کەسانی خوارو خۆیەوە کە لەخۆی بێ هێزو تواناترن... سەرنج بدە مامەڵەی پێغەمبەر لەگەڵ کارگوزاران و خزمەتکارانی دا چۆن بووە، هەروەك یەکێك لەهاوەڵانی گێڕاویێتی یەوەو

گوتوویەتی: {هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەری خودا لەخزمەتکارێکی دابێت}[١]. (أنس)یش – خودا لێ ی ڕازی بێت – گوتوویەتی: {ماوەی دەساڵ خزمەتی پێغەمبەری خودام کردووەو هەرگیز ئاخێکی لەدەست دەرنەبڕیم و گەر کارێکی وام کردبێت کە بەدڵی نەبووبێت نەیفەرمووە (بۆچی وات کرد)، گەر کارێکیشم فەرامۆش کردبێت نەیفەرمووە (بۆچی ئەو کارەت نەکرد)}[٢]، لەو ڕاسپاردانەش کە دەربارەی (سەوداو مامەڵەی باشن لەگەڵ کۆیلەو بەندەکان دا) ئەوەیە کە فەرموویەتی: {ئەوان (واتە بەندەو کۆیلەکان – براوخوشکانی خۆتانن، خودا خستوونییە بەردەستتان، ئێوەش مامەڵەی باشیان لەگەڵ دا بکەن، لەو خۆراکەیان پێبدەن کە خۆتان دەیخۆن، لەو بەرگەیان پێ بدەن کە خۆتان دەیپۆشن، زیاد لەتوانای خۆیان ئەرکیان بەسەردا مەدەن، گەر کاروبارتان بەسەرداداان یارمەتییان بدەن}[٣].

ڕەحمەت و بەزەیی و دڵنەرمی ی پێغەمبەر هێندە زۆرو فراوان بووە تا ئەو ڕادەیەی کە ئاژەڵانیشی گرتۆتەوە، ئەو خۆی ڕەحمی زۆربوو بەرامبەر ئاژەڵان و وەسیەتیشی بۆ خەڵکی ئەوەبوو کە ئەوانیش وابن لەگەڵیان دا. هەروەك لەم بارەیەشەوە فەرموویەتی: {هەر موسڵمانێك درەختێك بنێژێت یان ڕووەك و دانەوێڵەیەك بچێنێت و پاشان باڵندەیەك، یان مرۆڤێك، یان ئاژەڵێك، لێ ی بخوات، ئەوا چاکەو (صدقە)یەکی بۆ دەنووسرێت و خودا پاداشتی دەداتەوە}[٤].

ئەمەش ستایش و هاندانێکە بۆ ئەو کەسەی خۆراکی ئاژەڵ دەدات و بەکارێکی چاکە بۆ مرۆڤ دادەنرێت لەو کارانەی کە بەهۆیەوە لەخودا نزیك دەبێتەوە.

هەروەها پێغەمبەر دەربارەی پاداشتی ئەو کەسەی ڕەحم بەئاژەڵ دەکات فەرموویەتی: {کاتێك پیاوێك بەڕێگادا بڕوات و تینوێتی زۆری بۆ بێنێت و پاشان بیرێك بەدی بکات و بچێتە خوارەوە بۆ ناویەوەو تێرئاوی لێ بخواتەوەو دواییش لەکاتی هاتنەدەرەوەی‌دا سەگێکی تینوو ببینێت کە لەتینوێتی دا زمانی دەرهێنابێت و زەوی بلێسێتەوە، بەمەش پیاوەکە بزانێت کە ئەو سەگە هێندە تینووی بووە وەك چۆن خۆیشی بەو ڕادەیە تینووی ببوو بەهانایەوە بێت و دابەزێتەوە خوارەوە بۆ ناوبیرەکەو چنگی بۆ پڕکات لەئاوو دەمی سەگەکە بخاتە بەردەستی و ئاوی بدات، ئەوا خوداش سوپاسی دەکات و پاداشتی دەداتەوەو لەگوناهەکانی دەبوورێت}[٥]...

---

(١) – مسلم – گێڕاوێتی یەوە.
(٢) – مسلم – گێڕاوێتی یەوە.
(٣) – مسلم – گێڕاوێتی یەوە.
(٤) – بخاري – گێڕاوێتی یەوە.
(٥) – بخاري – گێڕاوێتی یەوە.

هەر دەربارەی ڕەحم کردن بەئاژەڵان، پێغەمبەر دەفەرموێت: {ئافرەتێك کەوتەبەر سزای خودا لەسەرئەوەی پشیلەیەکی بەندکردبوو و هیچ خۆراك و خواردنەوەیەکی پێنەدابو و بەرەڵاشی نەکردبوو، تا پشیلەکە خۆی لەجرِوجانەوەری سەرزەوی بخوات}[١].

سەبارەت بە کوشتنی ئاژەڵانی زیان بەخش و سەربڕینی مەڕ و ماڵاتیش بێگومان ئیسلام ڕێ ی داوە کە ئاژەڵی زیانبەخش (وەك سەگی هارو گازگر) بکوژرێن بەڵام فەرمانی کردووە کە بەشێوازێکی چاکی شەرعییانە کاری کوشتنەکەی ئەنجام بدرێت، هەروەها ئیسلام ڕێیداوە ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان حەڵاڵ کراوە سەربڕێن و دەبێت ئەوانیش بەشێوازێکی دروست سەربڕێن، هەروەك پێغەمبەریش فەرموویەتی: ((ان الله کتب الأحسان علی کل شيء فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة، وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة، ولیحد أحدکم شفرته ولیرح ذبیحته))[٢]... واتە: {بێگومان خودا فەرمانی بەچاکەکاری لەهەموو شتێك دا کردوە... جا ئەگەر ئاژەڵی زیانبەخشتان کوشت خێراو بەشێوازی دروست بیکوژن و با زوو گیانی دەرچێت، ئەگەر ئاژەڵی حەڵاڵ کراویشتان سەربڕی بەچاکی سەری بڕن و تیغەکەتان تیژکەن و جێ وڕێ ی سەربڕینەکە سازو لەباربێت و چاکە لەگەڵ سەربڕراوەکەدا بکەن}.

خۆ ئەگەر لەبەر کەمی ی ماوە نەبوایە ئەوا چەندەها نموونەو بەسەرهاتیترمان لەمەڕ بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەر بەلاوازو بێ هێزەکان دا دیاری دەکرد.

## لێخۆشبوون و لەسەرخۆیی ی

پێغەمبەری خودا هەردەم خووی گرتبوو بەدان بەخۆداگرتن و لێخۆشبوون لەهەر کەسێك هەڵەی بەرامبەر کردبێت سەرەڕای ئەوەی توانای تۆڵەکردنەوەشی هەبوو. بەم خوونەریتەش پابەندیی تەواوی بەفەرمانەکانی پەروەردگاریەوە لێ دەبینرا، هەروەك خوداش فەرمانی پێکردووەو فەرموویە: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾الأعراف/١٩٩.. واتە: {ئەی پێغەمبەر ئەو ڕێگاساناو ساکارەی لێبوردن وەبەرنێ، کەهیچ نارەحەتیو ئاڵۆزییەکی تێ دا نی یەو فەرمان بەو کارە چاکەو جوامێریانە بکە کە خەڵکی عورف و نەریتیان پێوەگرتووەو، ڕوو وەرگێڕە لەو کەسە گەمژەو بێ عەقڵانەی کە بەربەرەکانییان کردوویت}.

---

(١) — بخاري — و— مسلم — گێڕاویانەتەوە.
(٢) — بخاري — گێڕاویتی یەوە.

هەروەها لەمەڕ تەفسیرو شیکاری ئەم ئایەتە گوتراوە: {واتە: ئەی پێغەمبەر گەرهات وچۆی ئەو کەسانە بکەیت، کە پێ یان لێ بڕیویت و پەیوەندیی سۆز (صلة)ی —ڕەحم— بگەیەنییت و، بەخشندەو دەست بڵاویت لەگەڵ ئەوانەش دا کە بێبەشیان کردوویت و، ببووریت لەوانەش کە ستەمیان لێکردوویت، ئەوە مانای وایە تۆ چاوپۆشییت کردووە لەو کەسەی سەردانی نەدەکردیت و، چاکەت کردووە لەگەڵ ئەوەی بێبەشی دەکردیت و گەمارۆی دەخستیتەسەرو، بووراویشیت لەوەی کە زوڵم و ستەمی لێ دەکردیت}.

هەمدیسان هەر لەقورئان دا بۆهاندان لەسەر لێبوردەیی، خودا دەفەرمویێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾فصلت/٣٤.. واتە: {چاکەو خراپە، باوەڕو هاوەڵ بۆ خوادانان، وەك یەك نین و ناخرێنەیەك پلەو ئاستی هاوشێوەو هاوتای یەکەوە، تۆش بەو ڕێبازە هەرەجوان و جوانمەردی یە لەگەڵ بێ باوەڕان و خراپەکاران دا ڕەفتاربکە، کە هەمیشە چاوپۆشی لەنەفام و هەرزەگۆیان بکەیت و بەئارام بیت لەگەڵ ئەوانەی هەڵەت بەرامبەر دەکەن و دووعای خێر بۆ گومڕاو سەرلێ تێکدراویان بکەیت و لەسەر ئازارو خراپەیان دان بەخۆداگرو هێمن بیت، گەر ئاوا ڕەفتار بکەیت لەگەڵیان دا کە باشترین ڕێبازی سەوداو مامەڵەیە ئەوا بێگومان دوژمن دەبێت بەدۆست و ناحەز دەبێت بەخۆشەویست و یاخی دەبێت بەگوێڕایەڵ و هەموان دەبنە ئەو هاوڕێ پارێزگارو نزیکەی کە بایەخ بەکاروبارت بدەن}.

لەڕاستی بەکردەوەش خودی پێغەمبەر هەر ئاوا ڕەفتاری کردووەو چەندین ڕیوایات و (ئەخبار) هەیە لەسەرئەوەی کە هەموو ئەو سیفەتە قەشەنگ و نایابانەی تێدا هەبوون. هەروەك لەم بارەیەوە گێڕراوەتەوەو گوتوویانە: {هەرگیز پێغەمبەری خودا تاکە جارێك تۆڵەی بۆ نەفسی خۆی لەکەس نەکردۆتەوەو لەسەر بەرژەوەندی شەخصیی خۆی تووڕەو دەمارگرژ نەبووە، بەڵکو تەنها لەو کاتانەدا پەست بووە کە یاسایەکی خوداو پیرۆزی یەکی ئیسلام پێشێل کرابێت و، ئیتر تۆڵەی لەپێشێلکاران کردۆتەوە}.[1]

هەروەها لەو ڕەوشتە بەرزانەی تر کە پێغەمبەری پێناسراوە: خۆڕاگرتنی بووە لەبەردەم کەسانی نامۆی تووڕەو دلڕەق دا، هەروەك لەم ڕووەشەوە (أنس) بەسەرهاتێکی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: {من لەگەڵ پێغەمبەردا بەڕێگادا دەڕۆیشتین و ئەویش بەرگێکی (نەجرانی)ی لەبەردابوو، کە کراسێکی زۆر زبرو ڕەق بوو، لەڕێگە پیاوێکی دەشتەکی خۆی گەیاندە لای

(١) — بخاری — گێڕاوێتییەوە.

پێغەمبەرو بەتوندی ئەو کراسە زبرەی بەسەرشان و ملی دا ڕاکێشاو لەناکاو دا ئەو بەشەی سەرمل و گەردنی ڕووشاندو سوورکردەوە، پاشان کابرا بەتووڕەیی یەوە بەپێغەمبەری گوت: (ئەی — محمد — فەرمان بدە لەو ماڵەی خودا بەشی منیش بدەن، کە لەلای تۆیە)، پێغەمبەریش بەپێکەنینەوە بۆ کابرای ڕوانی و سەرنجێکی لیّ داو پاشان فەرمانی دا نەختێکی پیّ بدەن}.

بەسەرهاتێکی تر، کە پێغەمبەر لێخۆشبوونی خۆی تێدا نواندووەو، کە بەڵگەیەکی دیاریشە لەسەر ئارامیو لەسەرخۆیی یە بیّ نموونەکەی، ئەوەیە گێڕاویانەتەوە: {جارێکیان هەشتا پیاوی چەکدار لە —مەککە—وە لەناکاو بە پەنهانی هەڵمەتیان بردە سەر پێغەمبەر و هاوەڵانی لەچیای (تنعیم)ەوە، تا بەیەك جار بدەن بەسەریان داو لەناویان بەرن، بەڵام هەر زوو گشتیان بەدیل گیران و شکستیان تووش بوو. پاشان پێغەمبەر لەهەموویان خۆش بوو}. (١)

پیاوێکی تریش کە پێغەمبەری لەوەوپێش زۆر دڵتەنگ کردبوو و گریاندبوویو خەفەتێکی زۆریشی بەموسڵمانەکان دابوو: ئەو عەبدە حەبەشییە بوو کە ناوی ((وەحشی)) بووو، بکوژی (حەمزە)ی مامی پێغەمبەر بوو. (وەحشی) دەربارەی چۆنیەتی موسڵمان بوونی خۆیو گەیشتنەلای پێغەمبەر دەڵێت:

{دوای فەتحی ((مەککە)) و ((طائیف)) لەشوێنی خۆم دەرچووم تا بگەمەلای پێغەمبەری خودا کە زۆر حەزم بەدیتنی دەکرد، کاتێك گەیشتمەلای لەناکاوێك دا بوو کە بەوردی سەرنجی لەشێوەو ڕوخسارم نەدابوو و منیش لەبەردەمیدا وەستام و شایەتمانی هەقم هێنا، هەر کە بینیمیی پرسیی: (ئەریّ تۆ —وەحشی—یت)؟ گوتم: (بەڵیّ ئەی پێغەمبەری خودا)، فەرمووی: (دە دانیشەو بۆم باس بکە چۆن حەمزەت کوشت)؟ منیش کارەساتەکەم وەك خۆی بۆ گێڕایەوەو کاتێك کۆتاییم بەقسەکانم هێنا زۆر دڵتەنگ بوو و فەرمووی: (هەی ماڵوێران، ون بە لەبەرچاوم با نەتبینم)...

(وەحشی) هەر لەو بارەیەوە دەڵێت: (ئیدی منیش خۆم لەپێغەمبەر بەدووردەگرت تاکو نەمبینێت و بەدیتنم دڵتەنگ نەبێت).

بەڕاستی زۆر گەورەو گرنگە، پێغەمبەر لەعەبدێکی حەبەشی ی بیّ کەس و بیّ عەشرەت ببوورێت کە پێشتر بکوژی مامی بووەو، لەکاتێك دا هەموو موسڵمانانیش تاکە ئومێدو خۆشەویسترین کار لەلایان ئەوەبوو بەچاوی خۆیان کوشتنەوەی ئەو (عەبدە حەبەشی یە

(١) — بخاری — گێڕاویتی یەوە.

بکوژە) ببینن وەك چۆن کوشتنی حەمزەیان لەوەوپێش بەچاوی خۆیان بینیبوو.

بەڕاستی ئەوە لێبوردنێکە لەکاتی تواناو دەسەڵات دا، ئەوە سیفەتێك بوو لەو سیفەتە جوانانەی پێغەمبەر کە (پیرۆزیی ئامانج)و (جوانی ی ڕەفتار)و (سەرکەوتن بەسەر ئارەزووی دەروون)ی تیّدا درەوشاوەتەوە.

## زوهدو دنیا نەویستیی

ئەمڕۆ دیارترین عادەت لەجیهانی هاوچەرخمان دا: ((سووربوونە لەسەر دنیاو کەرەسەو خۆشی یە هەمەچەشنەکانی)). هەر ئەم سووربوون و دنیا پەرستی یەشە چەندین هەراو ناکۆکی لەنێوان کۆمەڵگەکان و تاکەکانی کۆمەڵگەدا ناوەتەوەو مرۆڤیشی وا لیّ کردووە هەردەم لەکێشمەکێشی بەردەوام و بەدوای ماددەدابێت تاکو بەهەر شێوازێك بێت پەیدای کات. بەم پێیەش دنیاو ماددە مرۆڤیان شپرزو ماندوو کردووەو کردووشیانە بەدیلی خەم و دڵەڕاوکێو ئیدی هەر بەدوای بەختیاری دا دەگەڕێت و کەچی نایشی دۆزێتەوە.

لەدیدو تێڕوانینی ئیسلام دا نابێت ماددە بەجۆرێك باوەشی پێدابکرێت کە مرۆڤ بێئاگا بکات لەئەرکە بنەڕەتی یەکانی بەرامبەر خودای خالقیو، بەرامبەر خوشك و برایان لەکۆمەڵگەی ئینسانی دا. جا ئیتر چەندێك لەکەرەسەو شت ومەکە جوانەکانی ژیانی چنگ کەوتبێت و کۆی کردبنەوە، بەڵام سەرەنجام و چارەنووسی هەر مردنەو هەر بەجێهێشتنی ئەو کەرەسە هەمەجۆرە کۆکراوانەیەتیی. خوداش مرۆڤی لەو چارەنووسە حەتمییە ئاگادار کردۆتەوەو پێی فەرمووە: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ﴾التكاثر/١-٢.. واتە: {زۆریی ماڵ ودنیاو پێشبڕکێ و کێشمەکێش لەسەر دنیاو پێوە نازینی، وای لیّکردوون کە لەپەرستن و گوێڕایەڵی ی خودای دوورخستوونەوە، تا کۆتایی بەتەمەنتان دێت و دەمرن و دەچنە نێو گۆڕەکانتانەوەو ئەو کاتەش ناتوانن سوود بەخۆتان بگەیەنن}.

بێگومان خودا لەمرۆڤ دەپرسێتەوەو — محاسبە —ی دەکات لەسەر ئەو هەموو نیعمەتەی کە تیای دا دەژی و کە ئەگەر ببنە هۆی ئەوەی خودای خالقی لەبیربچێتەوەو، یاخود ئەگەر بەناڕەواو بەناهەق دەستی کەوتبن، وەك دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾.

هەروەها خودا بانگەواز بۆ (زوهدو دنیا نەویستی) دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ

وَأَبْقَى﴾طه/١٣١.. واته: {خۆت خەریك مەكە بەسەرنج دان و ڕوانیین بۆ ئەو نیعمەت و دەسەڵات و داراییەو شت ومەكەی كە بەخشیومانە بەچەندەها كەس لەبێباوەڕان و لەبەندەكانیتر، چونكە هەموو ئەو نیعمەتە جۆربەجۆرانە زینەت و جوانیی ژیانی دنیان و بەزووییەو خێرایی تیٚ پەڕ دەبن و لەناودەچن، ئێمە بۆیە ئاوا نیعمەتمان بەسەردا ڕژاندوون تاكو تاقییان بكەینەوەو هەر خۆیان نەفس و ئاكاری خۆیان بۆ ڕوون بێتەوەو بۆ خەڵكیی سەرزەمینیش دەركەوێت كە ئایا ئەوانە سوپاسی خودا دەكەن لەسەر ئەو نیعمەتانە یاخود هەر سپڵەو پیٚ نەزان و بیٚ باوەڕ دەردەچن، بەڵام دڵنیابە ئەی بەندەی بڕوادار هەر ئەو ڕزق و ڕۆزییەی خودا بۆ تۆ چاكترو بەردەوام و نەبڕاوەیە كە بەهەشتی نەمری یە}.

خودای مەزن لەم ئایەتەدا پێغەمبەرو یەكە بەیەكەی بڕوادارانیش ئاگادار دەكاتەوە لەوەی، كە نابێت چاوبڕنە دنیاو هەر هیوای جوانیەو شادیەكانی بخوازن و خۆزگە بەهەبوونی ئەو كەرەسەوشت ومەكە هەمە جۆرانە بەرن كە كافران هەیانە، چونكە هەموو ئەو شتانە بۆ تاقی كردنەوەیانە، ئەو ڕێگە ڕاستەش كەخودا بەئیماندارانی بەخشیوەو ئەو پاداشتەش كە لەڕۆژی دوایی دا بۆی پاشەكەوت كردوون باشترو نەبڕاوەیە بۆ ئەوان.

بێگومان ئەم ڕێسایەش (بانگاشەی گۆشەگیری)و (فەرامۆش كردنی ئامرازەكانی ژیان) و (پەنابردنەبەر سستی و تەمەڵی)یش نی یە، بەڵكو مەبەست لەمە قوربانی دان بەو هەموو نیعمەت و خۆشی یانەیە لەپێناوی سەرخستنی هەق و بۆ بەهاناوەچوونی لاوازو چەوساوانە. هەر بۆیەش یەكێك لەوەسیەتەكانی پێغەمبەری خودا زوهدو دنیانەویستیی بووە تاكو باری تەماع و سووربوون لەسەر دنیا سووك بكرێت، هەورەك فەرموویە: {ئەگەر لەدنیادا زاهیدو خۆنەویست بیت ئەوا خوداش خۆشی دەوێیت، گەر لەنێو خەڵكیش دا ئەوەی ئەوان حەزیان لیٚ یەتی تۆ خوازیاری نەبیت، ئەوا سەرجەمی خەڵكی خۆشیان دەوێیت}.[1]

پێغەمبەری خودا لەژیانیدا نموونەی زوهدو دنیا نەویستیەو ڕوو وەرگێڕان لەتام و خۆشی یەكانی بووە. هەر ئەو زوهدەیشی، یەكێك لەبەڵگەكانی ڕاستی ی پێغەمبەرێتی ی بووە، چونكە دنیا بەهەموو خێرو خۆشیەو پلەوپایەیەكیەوە خرابووە ڕووی (بەتایبەتییش دوای فەتحی مەككە) و كەچی لەو شێوازو نەریتەی خۆی لای نەدا، كە لەجۆری بەرگ پۆشین و خۆراك و شت ومەكی ناومالی دا لیٚ ی بینرابوو. با لەم بارەیەوە زیاتر گویٚ ڕاگرین لە (عائیشە)ی هاوسەری كە چۆن وەسفی ژیانە سادەوساكارەكەی پێغەمبەر دەكات، (عائیشە) دەڵێت: {ئەو

---

(١) – ابن ماجە – گێڕاوێتی یەوە.

پێخەفەی کە پێغەمبەری خودا لەسەری دەنووست لە (پێستەی خۆش کراو) و (تویکڵی دار خورما) پێکهاتبوو}[١].. هەروەها دەڵێت: (هەر چەندە ئێمە کەس وکارو بنەماڵـەی -محمد- بووین، بەڵام جاری وا هەبووە بۆ ماوەی مانگێکی ڕەبەق ئاگر لەماڵمان دا بـۆ چێشت لێنـان نەکراوەتەوەو خۆراکمان هەر ئاوو خورمابووە)[٢]...

دیسان (عائیشە) لەم ڕووەوە گوتوویە: {خانەوادەی (محمد) هەتا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کردووە دووڕۆژی لەسەریەك لەنانی جۆ تێرنەبوون}[٣].

لە (ابن عباس)یشەوە گێڕراوەتـەوە، گوتوویـە: {پێغەمبـەری خـودا چـەندەها شـەوی بەبرسێتیی بەسەر دەبردو نەخۆیو نەماڵ ومنداڵ و هاوسەری هیچ خۆراکێکی ئێوارەیـان شـك نەدەبرد، زۆرجار نانەکەشیان هەرنانی جۆبوو}[٤].

مەبەست لەم ڕیوایات و قسەوباس و بەسەرهاتانەش ئەوەنی یە، کە لەهەموو ژیانی دا هەر ئەو خۆراکە سادەو وشکانەی خواردبێت، بەڵکو هەروەك ڕیوایـەتیش کـراوە پێغەمبـەر حـەزی لەشیرینیو هەنگوین بووەو خواردووشـیەتیو، گۆشـت و سـەوزەو میوەشـی خـواردووە، بـەڵام هەندێك جاریش خـۆی لێ بـێ بـەش کـردوون و نـەیخواردوون، ئەمـەش لـەپێناوی هـەژارانی نەتەوەکەی دا. گەر خۆراکێکیشی خواردبێت هـەر هێنـدەی لێ خـواردووە، کـە تەنگـەتاوی و برسێتی یەکەی بۆ سووك بکات.

## خواپەرستی و عیبادەتی

پێغەمبەری خودا لەهەموو کەس زیاتر بەتەنگ خواپەرستیو عیبادەت کردنی خوداوەبووە. خۆشەویستیی عیبادەت چووبووە نێو قووڵایی ناخ و دڵیەوەو تەنهاوتەنها بـەخوداوە پەیوەسـت بووو هەر لەپێناوی خوداش دا ژیاو خۆی بۆ دابین کردو لەپێناوی خواش دا مرد.

بەکورتی (عیبادەت) بەشێکی هەرەگەورەو هەرەدیاری قەوارە جەستەییو ڕۆحییەکەی بوو. گەورەترین سیمای خواپەرستی یەکەی ئەوەبوو لەهەموو حاڵەتێك دا خۆسپێر (مسلم) و ڕوو لە خودابوو، خۆسپاردن و ڕوو لەخوا کردنیشی لە جوانترین و باشترینی دیاردەکانی دینداریی و ئایینپەروەریی ی بوو. خوداش فەرموویە: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴾النساء/١٢٥.

---

(١) – مسلم – و – ترمذي – (اخراج – یان کردووە).
(٢) – مسلم – (اخراج –ی کردووە).
(٣) – ترمذي – (اخراج –ی کردووە).
(٤) - ترمذي – (اخراج –ی کردووە).

لەنێو هەموو کتێبە ئاسمانی‌یەکان دا تەنها ئەم دەقە بێ وێنە ئیلاهی‌یە بەدی دەکەین کە ئەویش لەقورئان دایەو (چۆنیەتی ڕووکردنە خوداو خۆبەخوداسپاردن) ڕوون دەکاتەوەو تیای‌دا خودا ڕووی فەرمایشت دەکاتە پێغەمبەری خۆی (محمد) و دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾ الأنعام/١٦٢-١٦٣.. واتە: {ئەی پێغەمبەر بڵێ: هەموو نوێژو عیبادەت و ژیان و مردنم تەنها بۆ خودای پەروەرگاری جیهانییانە، ئەو خودایەی هیچ هاوبەش و هاوەڵێکی نی یەو بەوە فەرمانم پێ کراوەو من بێگومان یەکەمینی خۆبەخودا سپێرانم}... واتە یەکەمینی ئەو کەسانەم، کە پەیڕەویی ئەم ڕێبازە دەکەن لەئیسلام بوون و موسڵمانێتی دا.

بەڕاستی ئەم دەقە ئیلاهی یە بێ وێنەیە هەموو لەخۆبڕان و دڵسۆزی یەکی بۆخودا تێدایە.

هەروەها پێغەمبەری خودا لەهەموو حاڵ و باروودۆخێکی دا لەخودا دەترساو هەمیشە زیکرویادی دەکردو داوای لێخۆشبوونی لێ دەکردو ڕۆژانە دەیان جار نزای دەکرد. هەروەك خۆی لەم بارەیەوە فەرموویەتی: (دەسا بەخودا من ڕۆژانە پتر لەحەفتا جار داوای لێخۆشبوون لەخودا دەکەم و تۆبەی لەلا دەکەم).[1]

پێغەمبەری خودا هەمیشە بەنوێژو ڕۆژووی زیاترو قورئان خوێندن خۆی لەخودا نزیك دەکردەوە. بەشەو خواپەرستی‌و شەونوێژی دەکردو سیازدە ڕکات نوێژی لەشەودا دەکرد[2]، هەروەك خودا فەرمانی پێ دابوو و پێ ی فەرمووە: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ الاسراء/٧٩... واتە: {ئەی پێغەمبەر، بەشەو دوای خەوتن هەستەو نوێژی زیادە (وەك فەرزێکی زیاتری تایبەت بەخۆت) بکە بۆ ئەوەی خودا بەرز هەڵت سەنگێنێت و واشت زیندووت کاتەوە کە هەموو خەڵکی سوپاسی تۆ بکات و لەپلەی بەرزی شەفاعەتکاردا دات بنێن}.

پێغەمبەری خودا لەشەونوێژدا هێندە بەپێوە دەوەستا تا هەردوو پێی دەئاوسان و لەو ڕووەوە پێی گوتراوە: (ئەی پێغەمبەری خودا تۆ ئاوا لەخۆت دەکەیت و کەچی بێگومان خوداش لەگوناهی یەکەم و دواییت خۆش بووە)[3]. بەڵام پێغەمبەر لەوەڵامی ئەو وتەیەدا

(١) — بخاري — گێڕاوێتی یەوە.

(٢) — بخاري — و — مسلم — (- اخراج -یان کردووە).

(٣) ئاماژەیە بۆ ئایەتی (لِيَغْفِرَ لَكَ اللهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَما تَأَخَّرَ) کە خودا تیای دا مژدەی لێبووردنی لەگوناهی یەکەم و دوایی (لەهەموو گوناهەکانی) پێ گەیاندووە. دیارە گوناهەکانی پێغەمبەر شتێکی ئەوتۆ نەبوون و وەك گوناهی مرۆڤەکانی دی نەبوون.

فەرموویە: (ئەی ئایا نابێت بەندەیەکی سوپاسگوزاربم لەسەر ئەو بەخششەی خودا)؟![1]
سەبارەت بە ڕۆژوو گرتنی زیادەشی (ڕۆژووی سوننەت)، مانگی وا هەبووە (واتە لەغەیری ڕەمەزان)دا تێکڕای مانگەکە بەڕۆژوو بووەو وایان زانیوە هیچی لێ ناخوات، لەمانگی واش دا هەبووە کە هەر لێی خواردووەو وا زانراوە کە نایەوێت لەهیچ ڕۆژێکیان دا بەڕۆژووبێت. ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممانیش بەڕۆژوو بووەو لەو بارەیەوە فەرموویە: {ڕۆژانی دووشەممان و پێنج شەممان کردەوەکانی بەندە دەخرێتە بەردەم خودا، منیش حەز دەکەم کە بەڕۆژووبم لەکاتی پیشان دانی کردەوەکانم دا}.

هەروەها ئەوەی زیاتر جێ ی سەرنج و لێوردبوونەوە بێت لەعیبادەت و بەندایەتی کردنی پێغەمبەردا ئەو پێکەوە گرێ دانە ناوازەیەی نێوان (بەرزترین پلەکانی خواپەرستی)و (بەجێ هێنانی ئەرکەکانی سەرکردایەتی کردنی نەتەوەکەی) بووە. خۆ ئەگەر پێغەمبەری خودا تەنها لەو عابیدە ئاساییانە بوایە کە خۆیان بۆ گۆشەگیری و خەڵوەتگیری دادەبڕن و خۆیان لەخەڵکی دووردەخەنەوە ئەوا لەکاری بەندایەتیو عیبادەتی دا شتێکی جێ ی سەرنج و تێڕامان بەدی نەدەکرا.

جا ئەو بەیەك گەیاندنەی نێوان {بڵندترین پلەی خواپەرستی{ و }ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی ژیان} لەدیارترینی سیفەتەکانی پێغەمبەر بووە.

لە (أنس–ی کوڕی –مالك)ەوە گێڕراوەتەوە، گوتوویەتی: {سێ پیاو هاتن بۆماڵی هاوسەرانی پێغەمبەر بۆئەوەی پرسیار دەربارەی چۆنیەتی عیبادەت و خواپەرستیی پێغەمبەر بکەن. کاتێك بۆیان باس کراو چۆنیەتی ئەو خواپەرستی یەیان بۆ ڕوون کردنەوە وا دیاربوو کە بەکەمیان زانیبێت. هەر بۆیەش گوتیان: (ئەی ئێمە لەکوێ ین لەئاست پێغەمبەردا کە خودا لەگوناهی یەکەم و دوایی خۆش بووە). ئینجا یەکێکیان گوتی: (من بەدرێژایی شەوگار تا بەیانی شەونوێژ دەکەم و پشوو نادەم). یەکێکی تریشیان گوتی: (من بەدرێژایی ساڵ هەموو ڕۆژێك بەڕۆژووم و هیچ ڕۆژێکی لێ ناخۆم). سێ هەمیشیان گوتی: (من خۆم لەژن بەدووردەگرم و هەرگیز ژن ناهێنم).

دوای ئەوە پێغەمبەری خودا هاتەوە بۆ ماڵەوەو چاوی پێ یان کەوت و قسەکانیانی پێ گەیەنرابوو و پێی فەرموون: {ئایا ئێوە ئەو جۆرە قسانەتان کردووە؟ دەسا بەخودا من کە لەهەمووتان زیاتر لەخواترس و پارێزکارم، بەڵام کاتێك ڕۆژووی سوننەت دەگرم ڕۆژی وا هەیە بەڕۆژووم و، ڕۆژی واش هەیە ڕۆژووی تێدا ناگرم. هەروەها بۆ شەونوێژییش نوێژ دەکەم و

(١) (بخاري) و (نسائي) – اخراج – یان کردووە.

پشووشی تیا دەدەم و دەخەوم، سەبارەت بەژیانی هاوسەرییش من ژن دێنم و خۆم لەژن و هاوسەر دانابڕم... جا هەر کەسێك ڕوو لەم ڕێساو سوننەتەی من وەرگێڕێت ئەوە لەنەتەوەی من نی یە}.

ڕووبەندێکی تری خواپەرستی ی پێغەمبەر ئەوەیە هەمیشە دڵبەستەی خوداو خۆبەندکار بەخوداوە بووەو لەهەموو حاڵ و بارودۆخێك دا هەر بۆلای خودا گەڕاوەتەوە. لەم بارەیەوە چەند زیکرێکی لەحاڵەتە جۆربەجۆرەکان دا دیاری دەکەین، کە بەندایەتی ی خۆی بۆ خودا پیشان دەدات، بۆ نموونە:

* لەکاتی بیستنی هەواڵێکی خۆش دا فەرموویەتی: ((**الحمدلله الذی بنعمته تتم الصالحات**)). [١]

* لەکاتی بەتەمابوونی شتێك دا فەرموویەتی: {**اللهم خِرْ لي واختر لي**}. [٢]

* لەکاتی نووستن دا فەرموویەتی: {**اللهم باسمك وضعت جنبي، وبأسمك ارفعه**}. [٣]

* لەکاتی لەخەوهەستان دا فەرموویەتی: {**الحمدلله الذی احیانا بعدما أماتنا والیه النشور**}. [٤]

* لەکاتی پۆشینی بەرگێکی نوێدا فەرموویەتی: {**الحمدلله الذی رزقني ما اتجمل به في حیاتي**}. [٥]

* دوای نان خواردنیش فەرموویەتی: {**الحمدلله الذی اطعمنا وسقانا وجعلنا مسلمین**}. [٦]

* لەکاتی ڕوانینی دا بۆ ئاسمان فەرموویەتی: {**یا مصرف القلوب ثبت قلبي علی طاعتك**}. [٧]

* لەکاتی لەماڵ دەرچوونیشی دا فەرموویەتی: {**بسم الله توکلت علی الله ولا حول ولا قوة إلاّ بالله، اللهم إني اعوذ بك أن اضل أو أُضَل، أو أَذِلَّ أو أُذَلّ، أو أظلم أو أُظلَم، أو**

---

(١) واتە: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بەنیعمەتەکانی ئەو هەموو کارێکی چاك سەردەگرێت).

(٢) واتە: (خودایە خێرو چاکەم بۆ دیاری بکەو باشترینیانم بۆ هەڵبژێرە).

(٣) خودایە بەناوی تۆوە خۆم پاڵ خستووەو هەر بەناوی تۆشەوە هەڵدەستمەوە).

(٤) واتە: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی، کە ئێمەی زیندووکردەوە دوای ئەوەی مراندبووینی‌و ڕۆژی زیندووکردنەوەش هەر بەدەست خۆیەتی).

(٥) واتە: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی،کە لەو پۆشاکەی پێ بەخشیم تا خۆمی پێ ڕێك وپێك کەم لەژیانم دا).

(٦) واتە: (سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە خۆراك و خواردنەوەی پێ داوین و کردووینی بەموسڵمانان).

(٧) واتە: {خودایە ئەی هەڵگێڕەرەوەی دڵان دڵم لەسەر (گوێڕایەڵی و بەندایەتی کردن بۆ تۆ) جێگیرکە}.

أجهل أو يجهل عَليَّ}. [١]

جگە لەچەندەها نزاو دووعای تر، کە لەکتێبەکانی (سوننەت)دا دیاری کراون و بەڵام ئێمە لێرەدا هەر هێندەمان لێ دەسنیشان کرد.

## ڕەوانبێژیو دانایی

پێغەمبەری خودا لەنێو عەرەبەکان دا پاراوترین زمانی ئاخاوتنی هەبوو و بەوشەی هەمەگیرو پەندی دانایانە دەدواو وتەکانیشی لەبێژەیەکی ڕوون و دەستەواژەی پرتەودارو ڕۆشنایی بەخش دا دەدرکاند بێئەوەی خۆی تێدا شپرزە بکات، یان بۆ وشەیەکی ناسك زۆر لەخۆی بکات و خۆی پێ ماندووکات، فەرموودەو وتە شیرینەکانیشی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوون و هیچ کەم و زیادەیەکیان تێدانەبووەو هەر کەسێکیش لای دانیشتایەو گوێی لێبگرتایە وتەکانی لەبەردەکرد. هەمیشە هەر بانگەوازی بۆ هەق دەکرد، بەداناییو حیکمەت نەبوایە زاری نەدەجووڵاند. ئەو وتە جوانەی کە بەشێوازێکی ڕەوانبێژییش بدرکێنرێت زووتر دەگاتە نێو دڵان وەك ئەو وتە جوانەی کە بەبێ شێوازی ڕەوانبێژی دەدرکێنرێت.

بەم هۆیەشەوە پێغەمبەر کاریگەریی یەکی هێندە بەهێزی لەسەر گەلەکەی هەبووە کەهیچ کەسێکی دی کاریگەریی ئاوای نەبووە.

لێرەش دا چەند نموونەیەك لەو وتەو فەرموودانەی دیاری دەکەین کە سەرەڕای کورتیی‌یەکانیان بەڵگەی زمان پاراویو نیشانەی داناییو دەلیلی ڕێنموونیین:

- {انما الأعمال بالنيات، وانما لكل امرئ ما نوى}[٢]. (رواه البخاري ومسلم).
- {لايؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه}[٣]. (رواه البخاري ومسلم).
- {الدين النصيحة}[٤]. (رواه مسلم).

---

(١) واتە: (بەناوی خودا، پشتم بەخودا بەست، هیچ هێزو بزووتنێك نی یە تەنها بەیارمەتی خودا نەبێت، خودایە من پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کە: (سەر لەخەڵکی تێك دەم یان سەرم لێ تێك بدرێت)، (یان خەڵکی بچەوسێنمەوە، یاخود بچەوسێنرێمەوە)، یان (ستەم لەخەڵکی بکەم یاخود ستەمم لێ بکرێت)، (یان خەڵکی گەمژەونادان بکەم یاخود گەمژەونادان بکرێم) خودایە لەهەموو ئەمانە پەنات پێ دەگرم.

(٢) واتە: (کاروبارەکان و کردەوەکان بەپێی نیازەکانە.. پاداشتی کاری هەر کەسێکیش لەقەدەر نیازەکەیەتی).

(٣) واتە: (کەستان باوەڕی ناچەسپێت هەتا ئەوەی کە بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت).

(٤) واتە: (ئایین ئامۆژگاری و ڕێنمایی یە).

- {لا إيمان لمن لا أمانة له}. [١]
- {كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته}. [٢]
- {اذا لم تستح فاصنع ماشئت}. [٣] (رواه البخاري).
- {من حسن اسلام المرء تركه مالا يعنيه}. [٤] (رواه الترمذي وابن ماجه).
- {دع مايريبك الى ما لا يريبك فان الخير طمأنينة وان الشر ريبة}. [٥](رواه الترمذي).
- {خصلتان لا تجتمعان في مؤمن: البخل وسوء الخلق}. [٦]
- {اتق الله حيثما كنت وأتبع السيئة الحسنة تمحها وخالق الناس بخلق حسن}. [٧]
- {آية المنافق ثلاث: إذا حدّث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا اؤتمن خان}. [٨]
- {رحم الله عبداً قال خيراً فغنم أو سكت فسلم}. [٩]
- {انما الصبر عند الصدمة الأولى}. [١٠]
- {الغنى غنى النفس}. [١١]
- {ذو الوجهين لايكون عند الله وجيهاً}. [١٢]
- {لايلدغ المؤمن من جحر مرتين}. [١٣]

---

(١) واتە: (ئەوەی دەستپاك نەبێت ئیمانیشی نی یە).

(٢) واتە: (هەریەکەتان سەرپەرشتیارێکەو هەریەکەشتان بەرپرسن لەسەرپەرشتکراوانتان).

(٣) واتە: (گەر شەرمت نەکرد هەرچی ئارەزووت لێ بوو بیکە).

(٤) واتە: (بەڵگەی موسڵمان بوونی کەسێك بەچاکی، ئەوەیە واز لەمەسەلەیەك بێنێت کە پەیوەندیی بەوەوە نی یە).

(٥) واتە: (ئەوەی گومانت لێ یە وازی لێ بێنە بۆئەوەی گومانت لێ ی نی یە، چونکە خێروچاکە لەدڵنیایی دایەو شەروخراپەش لەگومان بردنایە).

(٦) واتە: {دوو رەوشتی نابەجێ نابێت لەبڕوادارا هەبێت: (چاوچنۆکی)و (بەدخوویی)}.

(٧) واتە: (لەهەر جێگەیەك بوویت لەخوابترسەو پارێزکاربەو، لەدوای خراپەش چاکە بکە، چونکە دەیسڕێتەوە، بەرەفتاری چاکیش لەگەڵ خەڵکی دا هەڵس وکەوت بکە).

(٨) واتە: (نیشانەی مرۆڤی ناپاك و دووڕوو سێ شتە: ١- ئەگەر قسە بکات درۆی تیا دەکات. ٢- ئەگەر بەڵێن بدات نایباتەسەر. ٣- ئەگەر متمانەی پێکراو بەدەسپاك دانرا خیانەت دەکات).

(٩) واتە: (ڕەحمەتی خودا لەبەندەیەکی خودابێت کە بەوتەی باش و سوودمەند دەدوێت و پاداشتی دەبێت، یان کە بێدەنگ دەبێت و لەئەنجامی بێ دەنگی یەکەی دا ساغ و سەلامەت دەبێت).

(١٠) واتە: (خۆڕاگرتن لەیەکەم حاڵەتی زانینی کارەسات و لەگەرمەی ناخۆشی دایە).

(١١) واتە: (دەوڵەمەندیی، دەوڵەمەندیی دەروونە).

(١٢) واتە: (ئینسانی دووڕوو لەلای خودا پیاوماقووڵ و ڕووسپی نی یە).

(١٣) واتە: مرۆڤی بڕوادار دووجار لە کونێکەوە پێوەنادرێت).

◆ {السعيد من وعظ بغيره}[(١)].

◆ {من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيراً أو ليصمت، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم جاره، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليُكرم ضيفه}[(٢)]. (رواه البخاري ومسلم).

◆ {البرحسن الخلق، والأثم ما حاك في نفسك وكرهت أن يطلع عليه الناس}.[(٣)](رواه ومسلم).

◆ {من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الأيمان}[(٤)]. (رواه مسلم).

◆ {أربع من كُنَّ فيه كان منافقاً، ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها: إذا حدّث كذب، وإذا وعد أخلف وإذا خاصم فجر، وإذا عاهد غدر}[(٥)]. (رواه البخاري ومسلم).

خۆ ئەگەر لەبەر کەمی ی ماوەو لەترسی درێژەدان بەباسەکە نەبوایە ئەوا سەدان فەرموودەی ترمان لەم بارەیەوە دەهێنایەوە، کە ئەوپەڕی زمانڕەوانی و شێوازی ڕێنمایی کورت و کاریگەریان تێدایەو گەلێك چەمك و واتای قووڵیش دەبەخشن.

---

(١) واتە: (مرۆڤی بەختەوەر ئەو کەسەیە کە پەندو عیبرەت لەکەسانی تر وەردەگرێت).

(٢) واتە: (هەر کەسێك باوەڕی بەخوداو ڕۆژی دوایی هێناوە با قسەی باش بکات یان بێ دەنگ بێت، هەر کەسێکیش باوەڕی بەخوداو ڕۆژی دوایی هێناوە با ڕێز لەهاوسێ ی بگرێت، هەر کەسێکیش باوەڕی بەخوداو ڕۆژی دوایی هێناوە با ڕێز لەمیوانی بگرێت).

(٣) واتە: (چاکە کردن ناکاری جوانە، خراپەکردنیش ئەوەیە لەدەروونتا ڕێك خرابێت و هۆنرابێتەوەو تۆش حەز نەکەیت خەڵکی پێ ی بزانن).

(٤) واتە: (هەر کەسێك لەئێوە بەدکاری یەکی بینی با بەدەست و بازوو لەناوی بەرێت و بیگۆڕێت بەچاکە گەر بەهێزو دەست و بازووش نەیتوانی، با بەزمان بیگۆڕێت، خۆ ئەگەر بە زمانیش نەیتوانی با بەدڵ دژی بێت و پشتگیریی نەکات هەر چەندە ئەمەی دوایی لەلاوازترینی باوەڕەوەیە).

(٥) چوار دیاردەی ناشیرین هەیەو لەهەر کەسێك دا هەبن ئەو کەسە بەدووڕوو (منافق) دادەنرێن، گەر کەسێك بەشێکیشی لەوانە تێدابێت ئەوا لەسەر بەشێکی دووڕوویی یە تا ئەو کاتەی دەستی لێ هەڵدەگرێت، چوار دیاردەکەی دووڕووییش ئەمانەن: ١) ئەگەر قسە بکات درۆی تیادا دەکات.. ٢) ئەگەر بەڵێن بدات نایباتەسەر.. ٣) ئەگەر دژایەتی ی لەگەڵ خەڵك دا هەبوو بەدکرداری دەکات.. ٤) ئەگەر پەیمانی تەبایی‌و دۆستایەتی ببەستێت ستەمی تێ دا دەکات و پەیمان شکێن دەبێت.

# بەندی دووەم

## ((هاوسەرانی پێغەمبەر))

( یاسای فرەژنی لەئیسلام دا - نموونەی زیندوو لەسەر داوێن پاکی ی پێغەمبەر - هۆیەکانی فرەژنی لەژیانی پێغەمبەردا - پوختەیەك لەژیانی هاوسەرانی پێغەمبەر - هاوسەرانی پێغەمبەرو بارگرانی ی ژیان )

### یاسای فرەژنی لەئیسلام دا

لەم باسەدا دەربارەی ئەوە نادوێین، کەچۆن ئیسلام ئافرەتی رزگارکردووەو چەندە مافی پێ داوە لەو مافانەی، کە ئافرەتی سەدەی بیستەمیش پێ ی نەگەیشتبوو، بەڵکو لێرەدا تەنها باسی فرەژنی دەکەین لەگەڵ باسی ئەو هۆیە هەرەپێویست و گرنگانەی کە هانی پێغەمبەری بەرێزیان دا بۆ هێنانی چەند ژنێك و پیادەکردنی سیستمی فرەژنی ی.

بێگومان فرەژنییش لەزوربەی شەریعەت و رێساکانی پێشترو لەلای گەلانی دێرین باوو زانراوبووە. عەرەبەکان خۆیشیان لەپێش ئیسلام دا لە هەموو نەتەوەکانی تر زیاتر فرەژنییان پەیرەو دەکرد. بەڵام ئیسلام هات و سنوورێکی بۆ پیاو دانا کە نابێت لێ ی دەرچێت، ئەویش سنووری تا چوار ژن لەحاڵەتی هەرەپێویست و شیاوی خۆی داو بەچەند مەرجێکی گەورەو گرانیش، وەك: رەچاوکردنی دادگەری لەنێوان هاوسەرەکانی داو رێزو بەهای هیچ کەسێکیان لەویتر بەزیاتر نەزانیت و پاشان دڵنیاکردنیان لەهەر ستەم و زوڵم لێکردنێکیان، سا ئیتر ستەم کردنەکە لەئەرکی دارایی و مەسرەفی ناوماڵ و نیشتگەدا دەبێت، یان لەچۆنیەتی و چەندێتی و شیاوبوونی شوێنی نیشتەجێ کردن دابێت، هەروەها دەبێت بەچاکی و بەخۆشی مامەڵە لەگەڵیان دا بکات و خۆی بەدووربگرێت لەهەر خوونەریتێکی وا، کە ببێتە هۆی نەبوونی یەکسانیو هاوبەشی لەنێوان هاوسەرەکانی دا.

بێگومان (فرەژنی) شێوازێکی زۆر پێویستی کۆمەڵایەتی یە بۆ رێ گرتن لەپیاو کە گوناهی زیناکردن ئەنجام نەدات و منداڵانی بێ کەس وکار (زۆڵ) بۆ کۆمەڵ بەجێ نەهێڵێت.

لەبنەڕەت دا ئەم رێسای فرەژنی یەش بۆ پاراستنی ژنان دانراوەو پاشان بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووی پیاوان و، دواییش بۆ پاراستنی هەموو مافێکی ژن و منداڵەکانی.

ئەم ڕێگەچارەی فرەژنی یەش زیاتر لەحاڵەتە نائاساییەکان دا پەنای بۆ دەبرێت، بەتایبەتی کاتێك گەل ونەتەوەکان لەدوای جەنگ و تیاچوونی ژمارەیەکی زۆری پیاوان ئافرەتێکی هێجگار زۆریان تێدا دەمێنێتەوەو ژمارەیان چەندان هێندەی پیاوە ماوەکان دەبن و هەمووشیان بێوەژن و بێ کەس دەمێننن. جا ئەگەر هەر پیاوێکی ڕزگاربووی جەنگ یەکێك لەو بێوەژنانە بخوازێت ئەوا بارستایی کارەسات و بێ ئومێدی، تا ڕادەیەکی باش کەم دەکرێتەوە. یاخود جاری وا هەیە پیاوێك ژنەکەی تووشی نەخۆشی یەکی هەمیشەیی ی بێ چارەسەر دەبێت و ناتوانێت پێویستی یەکانی مێردەکەی بەجێبێنێت، جا ئایا لەو حاڵەتەدا پیاوەکە تەلاقی بدات باشترە یان ژنێکی تر بێنێت و هەمان ماف و ئاتاجی ژنی یەکەمیشی بپارێزێت و هیچ جیاوازی یەك نەخاتە نێوانیانەوە ؟!

هەروەها پیاوی واش هەیە ژنەکەی نەزۆکەو ئەویش بۆیە ژنی هێناوە تاکو منداڵی هەبێت، جا ئەگەر ژنێکی دی بهێنێت ئەوا باشترە بۆی بەو مەرجەی هەمان ژنی نەزۆکیشی بەهەموو ڕێزو ماف و ئەرکێکیەوە بهێڵێتەوە. جگە لە چەندان هۆیتر کە دیاردەی فرەژنی دەسەلمێنن.

بێگومان هەر فرەژنییەکەش باشترە لەتەلاق دان و گەر ئەوە ڕەوا نەکرایە ئەوە دیارە مرۆڤ بە ژن و پیاویشەوە پەنایان دەبردە بەر کاری ناڕەواو گوناهکاری.

(محمد)ی پێغەمبەریش لەژیانی دا یازدە ژنی لەحاڵەت و ئاستە جیاجیاکان دا خواستووەو ئەم کارەش تەنها پەیوەست بووە بەخۆیەوەو لەنێو قەوم ونەتەوەکەشی دا هەر خۆی لەلایەن خوداوە ئەو کارەی پێ سپێرراوە واتە (خواستنی یازدە ژن).

دیارە دوژمنانی ئیسلام، کە هەرگیز درێغییان نەکردووە لەناشیرین کردنی بڕواداران و شەخصی پێغەمبەرو هێرش کردنە سەر بەرنامەی خودا، درێغیشیان نەکردووە لەتیرو توانج دانە ئەو لایەنەی ژیان و سیرەتی پێغەمبەرو دروست کردنی هەراو هوریاو پروپاگەندە لەسەرئەوەی گوایە (پێغەمبەر ژیانی بەئارەزووبازی بردووەتە سەرو ئەمەش هەرگیز ناگونجێت لەگەڵ ئەو شان و شکۆو ڕێزە گەورەیەی کە دەبوایە پێوەی دەرکەوتایە.

## نموونەی زیندوو لەسەر داوێن پاکی ی پێغەمبەر

بۆ وەڵامی پروپاگەندەی دوژمنان، کە گوایە (پێغەمبەری ئیسلام ژیانی بەئارەزووبازی بردۆتەسەر) زۆر بەسانایی ئاماژە بۆ ئەو نموونە زیندووەی ژیانی دەکەین و دەڵێین: (هەر خودی ئەو ژیانەی –محمد– لەمنداڵیەوە تا پیریی باشترین نموونەیە، کە بەمرۆڤێکی بەحەیاو داوێن پاك ناسرابوو و هیچ کەسێك لێ ی نەبینیوە کە ئەو ڕۆژێك لە ڕۆژان لەهەرەتی لاوی ی دا خۆی

بەدەم ئارەزووی جنسی یەوە دابێت، هەروەها لێیشی نەبیستراوە کە ئەو حەزی لەبەزمی گۆرانی و مەی خواردنەوەو مێ بازی و هاوڕێ یەتی کردنی ئافرەتان بووبێت. تەنانەت هیچ کەسێکیش لەدوژمنانی سەردەمی خۆی تۆمەتێکی لەو جۆرانەی نەخستۆتە پاڵ، لەکاتێك دا ئەو دوژمنانەی زۆر سووربوون لەسەر دۆزینەوەی هەر خەوش و شوورەیی یەك تیای دا تاکو زیاتر زلی کەن بۆی و جاڕبدەن لەدژی و گومان لەدڵی خەڵکی دا لەسەر پێغەمبەرێتی یەکەی دروست کەن.

## خاتوو (خەدیجەی کچی خووەیلید):

(خاتوو خەدیجە) یەکەمین هاوسەری پێغەمبەربووە کە خواستوویەتی‌و بێوەژنێك بوو لەتەمەنی چل ساڵی دا. بەڵام تەمەنی (محمد) -٢٥- ساڵ بوو، تا -خەدیجە-ش مابوو ژنی تری نەهێنا... (خەدیجە)[1] پێش هیجرەت کۆچی دوایی کرد... واتە لەپێش هیجرەتیان دا بۆ (یەسریب) کە تەمەنی لەشەست ساڵ زیاتر بووەو بەڵام (محمد) هێشتا تەمەنی لەپەنجا ساڵی نزیك نەبووبۆوە.

بەم ڕەنگە پێغەمبەر نزیکەی بیست وپێنج ساڵی لەگەڵ (خەدیجە)ی تاکە هاوسەری‌دا بەسەر برد. سەرەڕای ئەوەش لەوڵاتی عەرەبەکانی ئەو سەردەمەدا وا باوبوو کە پیاو چەند ژنێکی هەبێت، کەچی پێغەمبەر ژنی تری بەسەر (خەدیجە)دا نەهێنا. بەم خۆڕاگرتنەش پەیڕەویی داب و نەریتی خەڵکی ی لەفرەژنی یەکەی ئەو کاتەدا نەدەکردو ئەو نموونە ساکارەشی بەرجەستە دەکرد، کە ڕێسای بنچینەیی لەژیانی هاوسەری دا بوونی یەك ژنە بۆ پیاو لەحاڵەتە ئاسایی یەکان دا.

(خەدیجە) لەگەڵ ئەوەدا، کە بەتەمەن و بەساڵاچوو بوو، بەڵام خۆشەویستترین هاوسەر بوو لای پێغەمبەرو هەردەم یادو باس و خواسی (خەدیجە)ی لەسەرزمان بوو تەنانەت لەلای ئەو هاوسەرانەشی باسی دەکرد کە دواتر خواستبوونی‌و کە ئەوانیش جۆرە (غیرە)و دەمارگیری‌یەکیان لەدڵ دا بۆ دروست دەبوو لەکاتی باس کردنی (خەدیجە)دا بەو ڕادەیە.

(عائیشە)ی هاوسەری پێغەمبەر دەڵێت: (پێغەمبەری خودا زۆرجار لەکاتی لەماڵ دەرچوونی‌دا هەر باسی -خەدیجە-ی دەکردو ستایشی باشی دەکرد. ڕۆژێك لەڕۆژان لەکاتی

---

(١) خاتوو خەدیجە -خودا لێ ی ڕازی بێت- پێش ئەوەی شووبکات بەپێغەمبەر هاوسەری (عتیق-ی کوڕی-عائذ-ی کوڕی-عبدالله-ی کوڕی-مخزوم) بووەو کاتێك -عتیق- مردووە(ابو هالە-ی کوڕی-زرارة-ی کوڕی-نباش التمیمی) خواستویێتی و پاشان دوای ئەو ئینجا شووی کردووە بەپێغەمبەر.

باسكردنی دا بەجۆرێك تووشی دەمارگیری بووم، كە گوتم بەپێغەمبەر: (ئەریٚ ئەو هەر پیرەژنێك نەبوو كە ڕۆشت و خوداش لەو باشتری كرد بەهاوسەرت)؟ (عائیشە لێرەدا مەبەستی خۆی بووە). پێغەمبەریش پەست بوو و ئینجا گوتی: {نەوەڵڵا، خودا لەو باشتری پیٚ نەداوم، چونكە خەدیجە ئەو ئافرەتە خۆڕاگرەبوو، كە لەكاتێك دا خەڵكی باوەڕی پیٚ نەدەهێنام، ئەو باوەڕی پیٚ هێنام و لەكاتێكیش دا خەڵكی بە درۆیان دەخستمەوە ئەو بڕوای بە هەموو وتەیەكم دەكردو پاشان لەدۆخێك دا كە خەڵكی كۆمەك و یارمەتی یان لیٚ دەگرتمەوە ئەو بەهەموو ماڵ و سامانی خۆی دڵنەوایی ی دەكردم. هەروەها خودا لەوەوە كوڕێكی پیٚبەخشیم كە لەهاوسەرانی دواییمەوە كوڕم نەبووە}.[1]

بێگومان هۆكاری ئەو هەموو خۆشەویستی یەی پێغەمبەر بۆ (خەدیجە) لەئارەزووبازی یەوە نەبووە، هەروەك كە لەجوانییشیەوە یان لەبەر گەنجی و كەم تەمەنی ی (خەدیجە)ش نەبووە، بەڵكو هۆكارو سەرچاوەكەی (ئەو خۆشەویستی یە) چاكەخوازی و ڕەوشتبەرزی و وەفاداریی خەدیجەو زوو باوەڕهێنانیشی بەپەیامەكەی بووە.

## هۆیەكانی فرەژنی لەژیانی پێغەمبەردا

خۆ ئەگەر هۆكارو فاكتەری فرەژنی ی پێغەمبەر لەئارەزووی جنسی یەوە سەرچاوەی بگرتایە ئەوا بێگومان جوانترین كچی دورگەی عەرەبی ی هەڵدەبژاردو هەموو هۆزو تیرەكانیش شانازییان پێوەدەكرد، كە كچانی خۆیانی پیٚ بدەن و پێیشی ڕازی دەبوون. بەڵام ئەو خۆی خوازیاری ئەو جۆرە كارانە نەبووەو لەهەموو هاوسەرەكانیشی دا تەنها (عائیشە) كچ بوو كەخواستی، دەنا هەموو هاوسەرەكانی تری بێوەژن بوون مەبەستیشی لەو فرەژنی یە بۆ ڕاپەڕاندنی چەندەها كاروباری (فێركاری)و (یاسادانان)و (كۆمەڵایەتی)و (سیاسی) بووە.

بۆ نموونە ویستوویەتی چەند مامۆستایەكی ژن پیٚ بگەیەنێت تاكو ئافرەتانی تر فێری حوكمە شەرعی یەكان بكەن، ئیٚ خۆ ئافرەتانیش نیوەی كۆمەڵن و لەئیسلام دا هەمان ئەرك و فەرمان كە بەسەر پیاوان دا دراوە، بەسەر ئەوانیش دا دراوە. بێگومان لەو سەردەمەدا زوربەی ئافرەتان شەرمیان دەكرد گەر دەربارەی چەند مەسەلەیەكی تایبەت بەخۆیان پرسیار لەپێغەمبەر بكەن، نەخاسمە ئەو مەسەلەو حاڵەتانەی، كە تەواو پەیوەستن بەژنان خۆیانەوە وەك سووڕی مانگانە (حیض)و زەیستانی و لەشگرانی (جنابة)و كاروباری تری هاوسەری و ژن و

---

(١) بڕوانە كتێبی (الأصابة — في تمييز الصحابة)ی (ابن حجر).

مێردایەتی. لەبەرئەوە باشتر وابوو ئەو پرسیارانە بەهاوسەرەکانی بگەیەنن و ئەوانیش ئاراستەی پێغەمبەری هاوسەریان بکەن و پاشان وەڵامەکانیان بەئافرەتان بگەیەننەوە.

لەلایەکی تریشەوە کاروباری یاسادانان لەسەر بنچینەی قورئان و سوننەت بووە. سوننەتیش پێك هاتووە لەفەرموودەو کردارو بڕیاردانی پێغەمبەر (قَولـهُ وفعلـهُ وتقريـره). جا ئایا جگە لەهاوسەرانی، کێ ی تر توانیویەتی هەڵس وکەوتی پێغەمبەر لەناوماڵ دا بەرەفتارو گفتارییەوە بەموسڵمانان بگەیەنێت[1]؟ ئەوەبوو دوای ماوەیەك هەندێك لەهاوسەرانی بوونە چەند مامۆستایەکی لێهاتوو و بەهەموو ئەمانەت و دەسپاکی یەکیانەوە یاساو ڕێبازی پێغەمبەریان بەموسڵمانان دەگەیاند.

هەروەها جگە لەم لایەنەش چەندین حیکمەتی دیکە لەکاری هێنانی چەند ژنێك لەژیانی پێغەمبەردا هەبووەو سوودی بەکاروباری ((یاساڕێژی و کۆمەڵایەتی و سیاسی)) گەیاندووەو لەکاتی باسکردنی پوختەیەك لەژیانی هەر یەکە لەهاوسەرانی دا ئاماژەی بۆدەکەین.

(١) یەکێك لەسەرچاوەکانی ئەم باسەمان (محاضرة)یەکی مامۆستا (محمد علي الصابوني)یە کە لە (ندوة المحاضرات لرابطة العالم الأسلامي) لەساڵی (١٩٧١)دا بڵاوکراوەتەوە.

# پوختەیەك لەژیانی هاوسەرانی پێغەمبەر

## خاتوو (سودە ی کچی زمعە):

دوای کۆچی دوایی ی (خەدیجە)، پێغەمبەر خواستویەتی، کە بێوەژنێك بووەو یەکێك بوو لەوانەی کۆچیان کرد بۆ (حەبەشە) و بەڵام مێردەکەی[1] لەحەبەشە بووە بەگاورو هەر لەوێش مردووە[2]. ئەم ژنەش بێ کەس و بێ سەرپەرشتیار ماوەتەوەو ئەگەر بۆلای خزم و ماڵەبابی بهاتایەوە (لەمەککە) ئەوا بەزۆر ناچاریان دەکرد لەئیسلام پاشگەزبێتەوە یان ئازارێکی زۆریان دەدا. پێغەمبەریش ئەوی لەخۆگرت و خواستی‌ی بۆئەوەی ڕێزی لێ بنێت لەسەر ڕاستی‌و پابەندیی بەباوەڕەکەیەوە.

## خاتوو (عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق):

کاتێك پێغەمبەر خوازبێنیی کردووە، ئەو کچێك بووە لەتەمەنی نۆ ساڵی داو خۆیشی لەتەمەنی پەنجاوپێنج ساڵی نزیك بۆتەوە. هەر تەنها (عائیشە) لەنێو هەموو هاوسەرەکانی تری دا کچ بووە کاتێك داخوازیی کردووە. ئیتر کە پێغەمبەر بۆتە زاوای (ئەبوبەکر)ی باوکی (عائیشە)، ئەوە گەورەترین خەڵات بووە بۆ (ئەبوبەکر) لەژیانی دا، هەروەك چۆن باشترین شێوازیش بووە بۆ بڵاوکردنەوەی سوننەت و فەرمان و حوکمە شەرعی یەکان، بەتایبەتیش ئەو سوننەت و حوکمانەی، کە پەیوەست بوون بەکاروباری ژیانی ئافرەتانەوە. چونکە (عائیشە) زیرەکترینی دایکانی بڕواداران بووەو لەهەمووشیان زیاتر زانستی شەرعیی لەبەربووە. هەر بۆیەش زۆر کەس لەگەورەهاوەڵان دەربارەی هەندێك لەو حوکمە شەرعییانە پرسیاریان لێ دەکرد، کە ئاڵۆزو گران دەبوو لەسەریان. پێغەمبەریش شایەتی ی زانین و لەبەرکردنی ئەو هەموو زانستەی بۆ (عائیشە) داوەو فەرموویە: {خذوا شطر دينكم عن هذه الحميراء}... واتە: {نیوەی فەرمان و حوکمەکانی ئایینەکەتان لەم ئافرەتە سوورکەڵەیە وەرگرن}.

هەندێك کەس لەرۆژهەڵاتناسان (مستشرقين) تیرو توانجیان داوە لەو ژن و مێردایەتی‌یەی نێوان بەساڵاچوویەك و کچە عازەبێك، واتە نێوان (پێغەمبەرو عائیشە). بەڵام هەر لەنێو بیانی‌یەکان خۆیان دا کەسانی بەویژدان و دادپەروەر وەڵامی درۆو دەلەسەو تیرو توانجەکانی داونەوەو ڕاستی‌یەکەیان ڕوون کردۆتەوە.

---

(١) مێردەکەی (سودە) ناوی (سکران–ی کوڕی –عمرو–ی کوڕی–عبدشمس) بوو.
(٢) بڕوانە (تأريخ الطبري) – ج٢ –.

بۆ نموونە (بۆدلی)ی ڕۆژهەڵاتناس دەڵێت: {عائیشە– وێڕای بچووکی و کەمی ی تەمەنی، بەڵام ئافرەتێکی پێگەیشتوو و باڵغ بووە، چونکە ئافرەتی عەرەب لەو سەردەم و ژینگەیەدا زوو پێدەگەیشتن و لەدوای بیستساڵی و سەرەتای سی ساڵییانەوە بەرەو پیربوون دەچوون.

ئەم حاڵەتی ژن و مێردایەتی یەش (واتە لەنێوان پێغەمبەر و عائیشەدا) هەندێك لەمێژوونووسانی بەخۆیەوە خەریك کردووەو تەنها لەدەلاقەی کۆمەڵگەی هاوچەرخەوە بۆی دەڕوانن، بێ ئەوەی بەوردی سەرنج لەم ڕەوشە بدەن، کە هەتا ئەمڕۆش لە (ئاسیا)دا بەداب و نەریتێکی کۆمەڵایەتی ماوەتەوە، یان بێ ئەوەی بیربکەنەوەو ئاگادارین لەوەی، کە لە خۆرهەڵاتی – ئەوروپا–ش دا ئەم داب و نەریتە هەیەو پیاوی بەساڵاچووی وا هەیە، کە هێشتا هاوسەرەکەی لەتەمەنێکی گەنجی ی دایە. تەنانەت، تا چەند ساڵێکی کەم لەمەوبەر لە (ئیسپانیا)و (پورتوگال) حاڵەتێکی ئاسایی بوو لەلای خەڵکی. ئەمڕۆش لەهەندێك ناوچەی دووری شاخاویی ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بەدیاردەیەکی ئاسایی دەبینرێت}.[1]

## خاتوو (حفصەی کچی عمری کوڕی خطاب):

ئەویش بێوەژن بوو کاتێك پێغەمبەر خواستیی. مێردەکەی (حفصة)[2] موسڵمانێکی چاك بوو و لەجەنگی (بەدر)دا شەهیدبوو، دوای ئەوەی ڕۆڵێکی گەورەی تیادا گێڕابوو. (حفصە)ش پاش شەهیدبوونی مێردەکەیو دوای تەواوبوونی ماوەی (عدة)ی ماتەمی یەکەی، باوکی (واتە عومەر) حەزی کرد مارەی بکات لە (ئەبوبەکر) و بۆ ئەو مەسەلەیە چووە لای (ئەبوبەکر)، بەڵام ئەو بێدەنگ بوو (واتە نەیویست). پاشان حەزی دەکرد بیدات بە (عثمان) بەتایبەتیش کە لەو ماوەیەدا هاوسەرەکەی (عوسمان)، کە (رقیە)ی کچی (پێغەمبەر) بوو کۆچی دوایی کردبوو. بەڵام (عوسمان)یش نەیویست و پێ ی گوت (جارێ لەم ماوەیەدا نامەوێت ژن بێنم). ئیدی (عمری کوڕی خطاب) ئەو باس وخواسەی خۆی بۆ پێغەمبەری خودا گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: {حفصە شوو بەپیاوێکی چاکتر لە عوسمان دەکات و، (عوسمان)یش ئافرەتێکی چاکتر لە حفصە دەخوازێت}.[3] دوای ئەوە پێغەمبەر (حفصە)ی لە عومەر خواست و کچەکەی خۆیشی (ام کلثوم) دا بە (عوسمان).[4]

---

(١) بڕوانە کتێبی (الرسول)ی (بودلی) ص –١٢٩ – لەتەرجەمە عەرەبیی‌یەکەیەوە.

(٢) مێردەکەی (حفصە) ناوی (خنیس–ی کوڕی–حذافة السهمي) بووە.

(٣) بڕوانە کتێبی (الأصابة في تمییز الصحابة).

(٤) بەم شێوەیەش بەعەمەلی مانای فەرموودەکە بەدی هات و -حفصە- شووی کرد بەپیاوێکی چاکتر لە

بەم ڕەنگەش پێغەمبەر هەمان پلەی خزمایەتیشی بە عمر داو بوو بەزاوای، وەك چۆن ئەو پلەیەی بە (ئەبوبەکر)یش لەوەوپێش دابوو. کەوابوو ئەم ژن هێنانەو پیادەکردنی فرەژنی لەم ڕووەوەش بۆ بەتین کردنی پەیوەندیی نێوان خۆی و هاوەڵانی بووە وەك خەڵاتێك بۆیان لەسەر بەجێ هێنانی ئەرکە قورسەکانی جیهاد لەڕێ ی ئیسلام دا. ئەمەش خۆی لەخۆی دا حیکمەتێکی ترو هۆیەکی تری فرەژنی بووە لەژیانی پێغەمبەردا.

## خاتوو (أم حبيبه) واته (رملەی کچی ابو سفيان):

ئەویش هەر بێوەژن بوو کاتێك پێغەمبەر خواستی. مێردەکەشی[1] لەو موسڵمانانە بوو کە کۆچیان کردبوو بۆ (حەبەشە)و (رَملة)ش لەگەڵیا کۆچی کردبوو، بەڵام ئەویش وەك مێردەکەی (سودە) ببوو بەگاور(نصراني)و هەوڵی دابوو کە ژنەکەشی (رملە) بخاتە سەر ئەو ئایینە، ئەویش گوێڕایەڵی ی ناکات و ئارام دەگرێت و لەسەر ئاینەکەی خۆی (ئیسلام) دەمێنێتەوە. دوایی مێردەکەی لەسەر ئایینی (نەسرانی)و بە (گاوری) دەمرێت. کاتێك پێغەمبەر بەوە دەزانێت نێرراوێکی خۆی بۆلای (نەجاشی)ی پادشای —حەبەشە— ڕەوانە دەکات تاکو ئەو ژنەی بۆ بخوازێت. ئەویش بۆی داوادەکات و دەبێتە هاوسەری پێغەمبەر.

ئەوەی بەڕوونی لەم ژن هێنانەی دا دیاربێت ئەو نیازە جوانەی پێغەمبەرە کە ویستوویەتی ئەو ژنە خاوەن باوەڕە قایل کات و ڕێزی لێ بنێت بەو خواستنەی لەبەرامبەر خۆڕاگرتنی و پابەندبوونی بەئیسلامەوە. هەروەها بۆ ڕاکێشانی دڵی (ابوسفیان)ی باوکیشی بوو کە سەرکردەی قوڕەیش بوو تاکو لەڕادەی دوژمنایەتی یەکەی کەم کاتەوە بەرامبەر بەموسڵمانان و سۆزو خۆشەویستی بخاتەجێ ی.

## خاتوو (أم سلمه) واته (هندی کچی أبی أميّه):

لەنێو خەڵکی دا ئەم ژنە بەتینترین باوەڕو جیهادی هەبوو، ئەمیش لەگەڵ مێردەکەی دا کۆچیان کردبوو بۆ (حەبەشە) تاکو بەئاینەکەیانەوە لەدەست ئازارو دڕندەیی ی قوڕەیشی یەکان دەربازبن، دوای ئەوە بۆ مەدینەش کۆچی کردووە. لەجەنگی (ئوحود)دا مێردەکەی (هیند) کەناوی (ابوسلمەی کوڕی عبدالأسد) بوو بەسەختی بریندابووەو بەهۆی ئەو برینەیەوە کۆچی

---

—عوسمان— و هەروەها -عوسمان-یش ئافرەتێکی چاکتر لە -حفصە-ی هێنا، کە کچەکەی پێغەمبەری خودا بوو (واتە—ام کلثوم) بوو.

(١) مێردەکەی (رملە) ناوی (عبیدالله—ی کوڕی —جحش—ی کوڕی —خزیمە) بووە.

دوایی‌ی کردووە. پێغەمبەر ئەم هاوسەرەشی کاتێك خواستووە کە بێوەژنێکی بەتەمەن بووەو لەوەڵامی داخوازی یەکەی پێغەمبەردا پێی گوتووە: (من ژنێکی بەتەمەنم و منداڵم زۆرەو دەبێت بەخێویان کەم و پاشان من ئافرەتێکی زۆر دەمارگیرم)... پێغەمبەریش دەفەرموێت: (من لەتۆ بەتەمەن ترم و، منداڵەکانیشت خودا سەرپەرشتیان دەکات و دەربارەی نەریتی دەمارگیرییشت لەخودا دەپاڕێمەوە لەدڵتا نەیهێڵێت). [١]

جا ئایا ئەم جۆرە ژن هێنانە بەمەبەستی خۆشی و ڕابواردن بووە؟ نەخێر هەرگیز کەسێك نی یە وا بڵێت، بەڵکو ئەم ژن هێنانە بەمەبەستی (ڕێزنان لەو ئافرەتە بەتەمەنە)و (لەئەستۆگرتنی ئەرکی منداڵەکانی)و (قایل کردنی دڵ و دەروونی)و (خەڵات کردنیشی لەسەر ئەو هەموو جیهادو ئارام گرتنەی) بووە.

## خاتوو (زەینەبی کچی جحش):

پێغەمبەری خودا بۆیە ئەم بێوەژنەشی خواستووە تاکو هەندێك داب ونەریتی سەردەمی نەفامی هەڵوەشێنێتەوە، چونکە (زەینەب) ئافرەتێکی قوڕەیشی و لەبنەماڵەیەکی گەورەو ناسراوبوو و لەهەمان کات دا کچی پووری پێغەمبەریش بووە، واتە کچی (ئومەیمەی کچی عبدالمطلب) بووەو لەوەوپێش ژنی (زەیدی کوڕی حاریسە) بوو. (زیدی کوڕی حارثة)ش بەندە(عبد)ێك بوو لەماڵی پێغەمبەرداو لەلای خۆی و (خەدیجە)ی هاوسەری بووەو بەپێ ی داب ونەریتە نەفامی یەکەی ئەو سەردەمەش هەر کەسێك (یەکێکی دی خاوەنی بوایەو بەندەی نێوماڵیان بوایە) بەکوڕی (کابرای خاوەن ماڵ) دادەنرا. هەربۆیە عەرەبەکان (زەید)یشیان بە (زەیدی کوڕی محمد) ناودەبرد.

خودای پەروەردگار سەرەتا خواستی وابوو (زەینەب)ی خانەدان و خاوەن پلەوپایەی دیاری کۆمەڵایەتی بدرێت بە (زەید). ئەمەش تاقیکردنەوەی خودا بووە بۆ (زەینەب) بۆ تێکشکاندنی هەستی شانازی بە (دەمارگیری ی تیرەپەرستی)و (خۆهەڵنان بەبنەماڵەو خانەوادەی ناودارەوە) کەدیاردەیەکی نالەباری نێو دورگەی عەرەبی بوو. ئیتر پێغەمبەری خودا لەو بارەیەوە لەگەڵ (زەید)دا دەدوێت و باسی خواستنی زەینەبی بۆدەکات و کاتێك زەینەبیش بەوە دەزانێت قایل نابێت و ئەو جۆرە شووکرنە ڕەت دەکاتەوە بەهۆی ئەو شانازی کردنە بەبنەماڵەو پلەوپایەی بەرزی کۆمەڵایەتی یەوە...

---

(١) بڕوانە کتێبی (الأصابة في تمييز الصحابة)ی دانراوی (ابن حجر).

خوداش لەو بارەیەوە ئەم فەرمایشتەی خۆی لەچەند ئایەتێك دا دەنێرێتە خوارەوەو دەفەرموێت:

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴾الأحزاب/٣٦.. واتە: {هیچ پیاوێکی بڕواداری وەك براکەی زەینەب (عبدالله ی کوڕی جحش) و هیچ بڕوادارێکی ئافرەتیش وەك (زەینەب) خۆی بۆیان نی یە سەربەست بن لەفەرمانێك دا، کەخوداو پێغەمبەرەکەی بڕیاریان لەسەر دابێت و بەئارەزووی خۆیان هەڵس وکەوت کەن، جا هەر کەسێك لەبڕواداران (پیاو بێت یان ژن) سەرپێچی لەفەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بێگومان تووشی گومڕاییەکی ئاشکرابووە}...کاتێك ئەم ئایەتانە هاتنەخوارەوە ئیدی (زەینەب)ی بڕوادار ملکەچی فەرمانەکەی پێغەمبەربوو و قایلیش بوو بەو شوکردنە، بەڵام هێشتا ئێش وئازاری دەروونی لەناخ دا مابوو، چونکە ناچار کرابوو بەکارێك، بەڵام بەهۆی ئەوەی هێندە دەمارگیریی و بەخۆنازینی تیرەگەرێتیی تێدابوو، هەروا بەئاسانی نەیدەتوانی بەسەرخۆی دا زاڵ بێت.

(زەینەب) شووی بە (زەید) کردو ماوەیەك لە گەڵی دا دەژیا، بەڵام دوایی پەیوەندیی ی نێوانیان بەرەو خراپی و ناتەبایی دەچوو، چونکە هەمیشە قسەی ڕەقی بەمێردە بێ کەس و عەشیرەتەکەی دەگوت و خۆی بەسەردا بادەداو شانازیی بەپلەوپایە کۆمەڵایەتی یەکەیەوە دەکرد تا کار گەیشتە ئەوەی (زەید) نەتوانێت لەگەڵیا بژی و ناچاربوو تەڵاقی بدات.[1]

دوای ئەوەی (زەینەب) تەڵاق درا خودا فەرمانی بەپێغەمبەرەکەی کرد، کە (زەینەب) بخوازێت و بیکات بەهاوسەرێکی خۆی تاکو ئەو بیدعەو داب ونەریتە شێواوەی نەفامی بسڕێتەوە کە بیدعەی بەکوڕدانان (بدعة التبني) بوو، چونکە لەوەوبەر بەپێی ئەو داب ونەریتە کوێرانەیە کە (زەید) بەکوڕی (محمد) دانرابوو (محمد) بۆی نەبوو هاوسەری تەڵاق دراوی(زەید) مارەکاتەوە، لەبەرئەوەی گوایە(ژنی کوڕەکەی خۆی دەخوازێتەوە)، بەڕاستی ئەو داب ونەریتەی ئەوسای عەرەبەکان زۆر نابەجێ بوو، جا بۆ ڕیشەکێش کردنی ئەو جۆرە داب و نەریت و بیدعە ناشیرینەش دەبوایە پێغەمبەری خودا سەرەتا لە خۆیەوە دەست پێبکات، تاکو

---

(١) بێگومان لەو ماوەیەدا کە (زەینەب) زۆر پەستی دەکرد، (زەید) هەردەم دەچووە لای پێغەمبەرو سکاڵای حاڵی خۆی لەلادەکردو پێغەمبەریش هەمیشە ئامۆژگاریی دەکرد کە بەئارام بێت و هاوسەرەکەی بهێڵێتەوە، وەك لەئایەتەکەش داهاتووە: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ ... تا کۆتایی ئایەتەکە ﴾ – (الأحزاب/٣٧)..

ئەو عادەتە نەفامی یە هەڵوەشێنێتەوەو ڕێساکانی ئیسلامیش بەو جۆرە جێگیرو پەیڕەوکات، کە خودا دەیەوێت و فەرمانی پیّ کردبوو.[١]

دیارەو گومانیشی تێدا نی یە، کە پێغەمبەر لەبەردەم کارێکی وەها قورس دا لەزمان و قسەوقسەلۆکی خەڵکی نەفام و دووڕووەکانیش دەترساو سڵی دەکردەوە لەوەی پیّ ی بڵێن: (ئەوا محمد هاوسەری کوڕەکەی خۆی دەخوازێتەوە بۆ خۆی). هەر بۆیەش نەختێك سستی ی دەکرد لەبەجیّ هێنانی کاروباری ئەو ژن هێنانەش دا. لەبەر ئەم سستی یەش خودا گلەیی ی لیّکردو لەم فەرمایشتەدا پیّ ی فەرمووە: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ[٢] إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا[٣] ﴾الأحزاب/٣٧. واتە: {ئەی پێغەمبەر ئایا تۆ لەخەڵکی دەترسیت، بەڵام خودا هەر خۆی شایستەی ئەوەیە لیّ ی بترسیت و فەرمانی جێبەجیّ کەیت. جا کاتێك (زەید) ئاتاجە گرنگەکەی خۆی لێوە دەسکەوت و وای لیّهات نەیەوێت و بەهۆی مامەڵەی توندی زەینەبەوە هاوسەری خۆی (واتە — زەینەب)ی تەڵاق دا، ئێمە بڕیارمان دا تۆ بیخوازیت و کردوومانە بەهاوسەری تۆ تاکو ئیدی هیچ عەیب و شەرمەزاری یەك نەمێنێت لەسەرئەوانەی کە کوڕیتر کراوە بەکوڕیان بەپیّ ی داب ونەریتە نەفامی یەکەو ئیدی گوناە نەبێت لەسەریان گەر هاوسەرە تەڵاق دراوەکانی ئەو کوڕە (بەکوڕدانراوانەی خۆیان) مارەکەنەوە}.

بێگومان (محمد)ی پێغەمبەر، هەر لەمنداڵی یەوە (زەینەب)ی دەناسی، چونکە کچی پووری بوو (واتە کچی خوشکی باوکی بوو) و کەسیش بۆی نەبوو ڕیّ ی لیّ بگرێت گەر بیویستایە هەر لەسەرەتاوە (زەینەب) بۆ خۆی بخوازێت و گەر بەتەمای خۆشیو ڕابواردن و چێژی دنیایی بوایە لیّ ی.

دیارە (زەینەب)یش ئەو خاڵۆزایەی خۆی (واتە محمد)ی لەهەموو پیاوێکیتر بەباشتر دەزانی. کەوابوو چۆن کەسێك ئەگەر خۆی کچێکی خزمی بوێت، داوای کات بۆ پیاوێکی ترو

---

(١) عادەتی جێگیرو ڕەچاوکراوی عەرەب تا ئەو کاتەش ئەوەبوو هاوسەری تەڵاق دراوی کەسێکی بەکوڕدانراوی پیاوێك بۆی نەبوو شوویکاتەوە بەو پیاوەی کە بەباوکی ئەو مێردەی پێشووی دانرابوو. (زەید)یش کوڕی (حاریسە) بووە نەك کوڕی (محمد)ی پێغەمبەر.

(٢) (أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ) واتە: (هاوسەرانی بەکوڕدانراوانیان).

(٣) (قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا) واتە: (کاتێك تەڵاقی داوە)...

دواییش، کە دەبێت بەژن بەتەمای بێت و بۆخۆیی مارەی بکاتەوە؟

بەم ڕەنگە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم ژن هێنانەشی (واتە خواستنەوەی زەینەب) تەنها بۆ پەیڕەوکردنی فەرمانەکەی خودابووەو بەمەبەستی پووچەڵ کردنەوەی هەندێك داب ونەریتی نەفامیو بۆ ڕاپەڕاندنی کردەیی (عەمەلی)یانەی ڕێساکانی ئیسلام بووە تاکو لەعەقڵ وهۆشی بڕواداران دا ڕەگ داکوتن.

## خاتوو ( جوەیرییەی کچی الحارث ی کوڕی أبوضرار ):

پێغەمبەر بۆیە ئەم ژنەشی خواستووە تاکو هۆزەکەی ڕاکێشێت بەلای ئیسلام داو پاشان ئەو سەربەستیەیەشیان پێبدات کە لەدەستیان دابوو، واتە (ئازادیان کات لەدیلی دوای ئەوەی لەجەنگ دا بەزیبوون). چونکە (جووەیرییە) لەهۆزی (بنو المصطلق) بوو، واتە (ئەو هۆزەی لەوەوپێش خۆیان سازدابوو بۆ هێرش بردنەسەر پێغەمبەر) بەسەرکردایەتی سەرەك هۆزەکەیان (حارث ی کوڕی ابوضرار)ی باوکی (جوەیریە).

کاتێك ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر دەگەیەنرێت، خێرا ئەو دەسپێشکەری دەکات و هێرش دەکاتەسەر ئەو هۆزەو لەناوچەکەی خۆیان دا دەیانبەزێنن و ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل و کۆیلە دەگیرێت چ لەپیاوانیان و چ لەئافرەتان و وەچەو ماڵ و منالّیان و سامان و داراییەکی زۆریشیان بەدەسکەوت دەگیرێت.

یەکێك لەئافرەتە کۆیلەکراوەکانیش: {خاتوو (جویریەی کچی حارث)ی سەرەك هۆزەکە بوو} کە کەوتبووە بەردەستی یەکێك لەموسڵمانەکان (واتە بەر ئەو موسڵمانە کەوتبوو وەك کۆیلەو کەنیزەیەك).

ئەم ئافرەتەش دەیەوێت بەپارە خۆی لێ ڕزگارکات و لەکۆیلەیەتی ئازادبێت. بۆئەم مەبەستە دێت بۆلای پێغەمبەرو پێ ی دەڵێت: {ئەی پێغەمبەری خودا من (جوەیرییەی کچی حارث ی کوڕی ابوضرار)ی گەورەی هۆزەکەمم. وەك لەتۆش پەنهان نی یە دوچاری مەینەتیی کۆیلایەتی بووم و کەتوومەتە بەردەستی موسڵمانێك کەناوی (ثابتی کوڕی قیس)ەو بڕیارم داوە لەگەڵی دا ڕێك کەوم لەسەرکاری ئازادبوونم (واتە: لەبەرامبەر چەردەیەك پارەدا کە بەکۆیلەگیراوەکە دەیدات بەخاوەنەکەی)، جا ئێستاش هاتووم بۆلات و داوای یارمەتییو دەسگیرۆییت لێ دەکەم لەکاری ئازادبوونم دا} .

لێرەش دا حیکمەتی پێغەمبەر بەڕوونی دەردەکەوێت لەبەرژەوەندییی (بنو المصطلق)دا، کە لەدیارترین و بەهێزترینی هۆزەکانی عەرەب بوون و بەدیل گیرانی ئەو هەموو ئافرەت و

پیاوەیان بەو ژمارە زۆری یەش حاڵەتێکی توندو ناخۆشی لەلای کەسانی جوامێرو مـاف خـواز دەخولڤاند، جگە لەوەی کە گرفتێکی گەورەی کۆمەڵایەتی ی دەنایەوەو چارەسەریـشی هـەروا ئاسان نەبوو.

حیکمـەتی پێغەمبـەری خـودا بـەرەفتارێکی جـوان و دروسـت دەرکـەوت کـەبووە هـۆی ئـازادبوونی سـەرجەم دیـل و بەکۆیلـەگیراوەکان، ئـەوەبوو پێغەمبـەر لـەوەڵامی قـسەکانی (جویریـە)دا فـەرمووی: {ئایـا دەتـەوێت لـەوەش باشـترت دەسـت کـەوێت} ؟ واتـە (باشـتر لەئازادبوونی خۆی بەتەنیا). ئەویش گوتی: {لەوە باشتر چـی یـە ئـەی پێغەمبـەری خـودا} ؟ فەرمووی: {من رێکەوتنی ئازادبوونەکەت لەئەستۆ دەگـرم (واتـە کرێـی ئازادییەکـەت بـۆ دەدەم)و ئینجا دەت خوازم} ...

ئیدی (جویریە)ش بەوپەڕی شادیو خۆشحاڵییەوە گوتی: (زۆرباشە ئەی پێغەمبەری خودا، منیش ئامادەم)...

جا هەر کە ئەم هەواڵە بەموسڵمانەکان گەیشت و بیـستیان پێغەمبـەری خـودا (جویریـەی کچی حارث)ی خواسـتووە گوتیـان (کـەوابوو نابێـت خزمـەکانی پێغەمبـەر بەبەنـدەو کۆیلـە بهێڵینەوە)، هەر بۆیەش دەسبەجێ گشت دیل و گیراوەکانی بەردەستیان بەپیاو وژن و منداڵ و ماڵ و سامانیانەوە ئازاد کرد.

لەم بارەیەوە (عائیشە) گوتوویەتی: (پێغەمبەری خودا بەخواستنی ئەو ژنە سەد خێزانی لە (بنو المصطلق) ئازاد کرد. بەراستی نەمدیوە ئافرەتێك بەقەد (جووەیریە) سوودوخێرو بەرەکەتی بەو رادەیە بۆهۆزەکەی خۆی بووبێت).

## خاتوو (صفیّةی کچی حُیَی کوڕی أخطب):

باوکی صفیّە گەورەی هۆزی بنوالنضیری سەربەخێڵی (بنو اسرائیل) بوو. ئەم ژنـە لـەدوای کوشتنی مێردەکەی لەجەنگی (خەیبەر)دا بەدیل دەگیرێت[1]. پێغەمبـەریش دوای تـەواوبوونی جەنگ بانگی دەکات و پێ ی فـەرموێت: {گـەر لەسـەر دینـی خـۆت (کـە جوولەکـە بـووە) بمێنیتەوە ئەوا بەزۆر ناچارت ناکەین بۆ سەر ئەم دینە تازەیەی خۆمـان. خـۆ ئەگـەر بـاوەڕیش بێنیت و خوداو پێغەمبەرەکەی هەڵبژێریت ئەوا دەتکەمە هاوسەری خـۆم} . ئـەویش دەڵێـت: {من هـەر خـوداو پێغەمبەرەکـەی هەڵدەبـژێرم} واتـە بـاوەڕدێنم و موسـڵمان دەبم. ئینجـا پێغەمبەریش لەکۆیلایەتی ئازادی کردو خواستی و کرێی ئازادکردنەکەی بۆکردە مارەیی} .

(١) مێردەکەی (صفیە) ناوی (کنانە ــی کوڕی ــربیع ــی کوڕی ــابوالحقیق) بووە.

بێگومان پێغەمبەر مەرجی لەسەر ئەو ژنە داناو ئەویش پەسندی کرد. بەم رەنگە خواستنی ئەم ژنەش بۆ رێزلێنان و خەلات کردنی ژنەکە خۆی بووە، چونکە ئەو ژنە خانمی هەرەگەورەی هۆزەکەی بووە. ئەم هۆزەش سەرسەختترینی دوژمنانی موسلمانان بوون لەو سەردەمەدا. کەوابوو پێغەمبەر بەم ژن هێنانەشی ویستوویەتی ئەو هۆزە بەلای ئیسلام دا راکێشێت و وانەیەکیان فێرکات لەسەر پێکەوە هەلکردنی ئاشتیانەو بەلاوەنانی دوژمنایەتی و ناکۆکی.

### خاتوو (میمونەی کچی حارث ی هلالی):

دوایین هاوسەری پێغەمبەر بووەو بێوەژن بووە کاتێك خواستویێتی و[1] کاری خواستنەکەشی وەك رێزلێنان و پێزانینێك بووە بۆ رۆلی جوامێرانەی تیرەکەی، کە بەراستی هەردەم هاوکاریی پێغەمبەریان کردووەو یارمەتیو پشتگیرییان کردووە.

## منالەکانی

هەموو منالەکانی پێغەمبەر لە (خەدیجە)ی یەکەم هاوسەری بوون، تەنها (ئیبراهیم) نەبێت، کە لە (ماریەی قیبطی) بووە، منالەکانیشی ئەمانەن: (قاسم، طیب، طاهر، عبدالله، زینب، رقیە، ام کلثوم، فاطمة). لەنێو منالەکانی دا کورەکان هەر زوو و بەمندالی مردوون، کچەکانیشی شوویان کردووەو مندالیان بووە.

## هاوسەرانی پێغەمبەرو بارگرانیی ژیان

کۆتایی ئەم بەندەش بەدیاری کردنی لایەنێکی ئەو ژیان و گوزەرانە دێنین، کە پێغەمبەرو هاوسەرەکانی تیای دا ژیاون، ژیانێك کەهەمووی هەر نەداریو بارگرانی و بێ بەش بوون و دووری لەخۆشی و ئارەزووەکانی دنیابووەو هەرگیز خۆیان بەدەم ئارەزووەکانی دەروون و نەریتی خۆدەولەمەندکردن و کۆکردنەوەی مال و سامانەوە نەداوە.

پێغەمبەری خودا چەندەها شەو خۆی و خێزانی بەبرسێتی ماونەوەو خواردنی ئێوارەیان نەبووەو بێ شێو سەریان ناوەتەوە، زۆرجار نانەکەشیان هەر لەنانی جۆ بووە.

---

(١) خاتوو (میمونە) پێشتر هاوسەری (ابارهم — ی کوری — عبدالعزی) بووە.

(عائیشە)ی هاوسەری پێغەمبەر دەڵێت: (خانەوادەی —محمد— بۆ سێ ڕۆژی لەسەریەك تێریان لەنانی جۆ نەخواردووە تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کردو بەخودای خۆی گەشتەوە).

خانووەکانی هاوسەرانی پێغەمبەر بەسادەترین شێوە دروست کرابوون، لەقوڕو داری بڕاوەی دارخورما بنیات نرابوون، لەسەردەرگاکانیشیان چەند پەردەیەك لەتووکی بزن، یان لەپێستی حوشتر هەڵواسرابوون، (واتە لەجیاتی دەرگا).

ئاوا بووە دیاردەو ڕواڵەتەکانی ئەو ژیانەی کە پێغەمبەری خوداو هاوسەرانی بەسەریان دەبرد. بەڵام خۆ ئەگەر پێغەمبەر ئارەزووی لەژیانی فەنتازی و باق وبریقی دنیا بکردایە ئەوا دەیتوانی لەقاپ و پیاڵەی ئاڵتوونی دا خۆراك و خواردنەوەی بۆ دابنرێت و، گەر خوازیاری کۆشك وتەلاریش بوایە ئەوا بەئاسانی بۆی بنیات دەنراو بەتەنها ئیشارەتێك هەموو خەڵکی ی دەخستە خزمەتی خۆیەوە، بەتایبەتیش دوای ئەوەی لەوڵات و ناوچەکانی دورگەی عەرەبی دا خەڵکی هەموو کەوتنەبەر سایەی حوکمڕانیی ئەوەوەو هەر خۆیشی تاکە گەورەو دەسەڵاتداریان بوو و ئەو گەلەش یەکپارچە هەموویان گوێڕایەڵییان دەکردو خۆشیان دەویست.

بێگومان هاوسەرانی پێغەمبەر بەوپەڕی لەخۆبوردنەوە هاوبەشی پێغەمبەریان دەکرد لەو ژیانی بارگرانیەو مەحروم بوونەدا بێ ئەوەی ئاخ و ئۆفێکیان لێ ببیسترێت، یان بێزاربن و داواکارییان هەبێت، تەنها ئەوەندە نەبێت، کە یەك جار مەسەلەیەکی تایبەتییان باس کردووەو قورئانیش وەك بەسەرهاتێك تۆماری کردووەو بووەتە بەڵگەنامەیەکی وەڵام دەرەوەی هەموو ئەو تاوان و تۆمەتە هەڵبەستراوانەی کە لەو ڕووەوە دراونەتە پاڵیان.

ئەوەبوو جارێکیان هاوسەرانی پێغەمبەر (بەهۆی شانازیەو خۆنازینیان بەوەی کەوا خێزان و خانەوادەی ئەون) سکالایان لەلای دەربڕی لەسەرئەوەی بۆچی بەشی پێویست و ئاساییان لەئەرکی دارایی و شت ومەکی ناوماڵ و پۆشاك بۆدابین نەکردوون؟! لەبەرئەمە داوای زیادکردنی بڕی خەرجی و ئارایشتی نێوماڵ و کەل وپەلی پێویستتریان کرد وەك چۆن ئافرەتانی تری خەڵکی بۆیان دابین کراوە.

وەڵامی پێغەمبەر بۆ ئەو داواکاری و سکالایەیان ئەوەبوو ماوەیەك بەجێ ی هێشتن و لێ یان زویربوو و نەهاتەوە بۆلایان تاکو سرووشی خودایی ی لەم ئایەتانەدا بۆ هاتەخوارەوەو خودا ئەم نەخشەو پلانەی بۆداناو فەرمووی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾الأحزاب/٢٨-٢٩.. واتە: {ئەی پێغەمبەر بەهاوسەرەکانت

بلێ: ئەگەر ئێوە پەرۆشی ژیانی دنیاو ئارەزوو و خۆشی یەکانی بوون و حەز لەنیعمەتە جۆربەجۆرەکانی دەکەن و هۆگری جوانیو نیگارە سەرنج ڕاکێشەکانی بوون ئەوا هەرگیز من ئەو شتانەم بۆ ئێوە دەست ناکەوێت و ناتوانم ئەو چەشنە داواکاریانەتان بۆ پەسندو جێبەجێ بکەم، خۆ ئەگەر هەر لەسەرئەوە سوورن ئەوا وەرن با مافی خۆتان پێ بدەم و تەڵاقتان بدەم و بەجوانی دەسبەردارتان بم. بەڵام ئەگەر خوازیاری ڕەزامەندیی ی خوداو مانەوە لەگەڵ پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی دوایی (آخرة)[1] بن ئەوا دەبێت ئارام بگرن لەسەر ئەو ژیانی بارگرانی و دەسکورتی یەی کە لەگەڵ من دا دەیبەنەسەرو ئیدی خوداش لەبەرامبەری ئەو ئارامی یەدا پاداشتێکی گەورەو نەبڕاوەی لەقیامەت دا بۆ ئافرەتانی چاکەکاری نێو خۆتان ئامادەکردووە، واتە: (ئەو ئافرەتانەی کە لەکاروکردەوەی ژیانیان لەگەڵ من دا بەئەمەك و چاکەخوازو بەئارامن).

کاتێك ئەو دووئایەتەی سوورەتی (ئەحزاب) هاتنەخوارەوە، پێغەمبەر بۆ پەیڕەوکردنی ئەم فەرمانە تازەیەی خودا یەکە یەکە بەسەر هاوسەرانی دا گەڕاو سەرەتا لە -عائیشە-وە دەستی پێکردو پێ ی فەرموو: {من ئەمرۆ مەسەلەیەك دەخەمە بەرچاوت تۆش پەلە مەکە هەتا پرس وڕا بەدایك و باوکیشت دەکەیت}، ئینجا هەردوو ئایەتەکەی بۆ خوێندەوەو (عائیشە)ش دەسبەجێ گوتی: {ئەرێ من لەم مەسەلە ڕوونەدا پرس وڕا بەدایك و باوکم بکەم؟ من بێگومان ئیتر هەر خوداو پێغەمبەرەکەیو ڕۆژی دواییم دەوێت}. پاشان دوای (عائیشە) پێغەمبەر ئەو مەسەلەیەی خستە بەرچاوی هاوسەرەکانی تری و ئەوانیش هەمان خواستی (عائیشە)یان دەربڕیو تەنها خوداو پێغەمبەرو ڕۆژی دواییان هەڵبژارد لەجیاتی دنیاو خۆشیو ئارەزوو و جوانی یە -کاتی- و بەسەرچووەکانی.

جائایا ئەوە ژیانی کەسێك بووە کە بەدوای ئارەزووو خۆتێرکردن و خواستنی چەند ژنێك دا وێڵ بێت بەمەبەستی هەوەس پەرستی؟ ئایا ئەوە نەریتی پێغەمبەرێك بووە؟ بەڕاستی هەرگیز کەسێکی دادگەرو بەویژدان قسەی وای لەزار دەرناچێت گەر بەچاکی و بەم شێوەیە لەو هۆکارو پاڵنەرانە تێگەیشتبێت کەپێغەمبەریان واڵێ کردووە ئەو چەند ژنە بخوازێت لەکاتێك دا تەمەنیشی لەپەنجاساڵی تێپەڕی کردبوو و دوای ئەوەش، کە زوربەی هەرەزۆری وەختەکانیشی بۆ ڕێك خستنی کاروباری موسڵمانان و ڕێنمایی کردنیان و، بۆ خواپەرستی و عیبادەت تەرخان کردبوو.

---

(١) ئاخیرەت (الآخرە) ئەم دەقە قورئانی یە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەرئەوەی کە هەر کەسێك خوازیاری بێت دەبێت ڕێگەی (بارگرانی و دەسکورتی و خۆمەحرووم کردن لەخۆشی یەکانی دنیا) هەڵبژێرێت. واتە ڕێگەی خۆگرتنەوە لەدنیا تاکە ڕێگەی گەیشتنە بەپاداشتی ڕۆژی دوایی و بەبەهەشت وەك پێغەمبەریش فەرموویەتی: (( حفت الجنة بالمكارة وحفت النار بالشهوات )).

# بەندی سێ یەم

## (( چەند پەندو وانەیەك ))

( چەند وانەیەك لەهیجرەتەوە - چەند وانەیەك لەجیهادی پێغەمبەرو بڕوادارانەوە -
ژیانی پێغەمبەر شایەتی لەسەر ڕاستی ی پێغەمبەرێتی ی دەدات -
ئاهەنگ گێڕان بەیادی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە )

## چەند وانەیەك لەهیجرەتەوە

هیجرەتی پێغەمبەرو ئەو بڕوادارانەی لەگەڵی دابوون لە —مەككە—وە بۆ —یەسریب— ڕاكردن و ترسنۆكی و بێ ئومێدی نەبوو، هەروەها گەشتێكی خۆشیو سەیرانكارییش نەبوو كە ماوەیەك خۆیان لەئەركە گرانەكانی بانگەوازو ئازاردانی قوڕەیش دوورخەنەوە تاكو وچانێك بدەن...بەڵكو ئەوهیجرەتە هێڵێكی جیاكەرەوەی نێوان (هەقی لاوازكراو)و (هەقی سەربەست و شۆڕشگێڕ) بوو، كە دەڕۆیشت (بۆبنیات نانی هێزەكەی) تاكو ڕیشەی ستەم و ملهوڕان لەبن دەربێنێت. لەو هیجرەتەدا پێغەمبەری خوداو بڕواداره شوێنكەوتووەكانی بەربەرەكانی یەكی كاراو فیعلی ی ئەو دەسەڵاتە دڕندانەیەی قوڕەیشیان كردو بەكۆچكردنیان لە مەككەوە بۆ — یەسریب — ئەو نیشتمانەی خۆیان بەجێ دەهێشت، كە تیای دا پێگەیشتبوون و، ئەو ماڵ و سامان و خانووبەرەیەشیان جێ دەهێشت، كە لەماوەی ژینی ناڕەحەتیان دا بەدەستیان هێنابوون... ئەمەش هەمووی لەخۆبران و خۆفیداكردن بووە بۆ ئەو عەقیدەیەی كەخۆیان لە پێناودا (نەزر) كردبوو.

لەوێش لە(یەسریب) پێغەمبەر سیستمێكی نوێ و كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی بنیات دەنێت كە هەموو جۆرە فەرق و جیاوازی یەكی تێدا هەڵدەگیرێت و چین وتوێژەكان وەك یەكیان لێ دێت و دادپەروەریی ی تێدا دەچەسپێت... هەر لە — یەسریب —یش دا پێغەمبەر سوپای ئیسلامی ی لەكۆچكاران و پشتیوانان (المهاجرين والأنصار) پێك هێنا، ئەو سوپایەی كەبیروباوەڕی ئیسلامی ی بڵاوكردەوەو دەسەڵاتی وەحشیانەی قوڕەیشی ڕیشەكێش كردو بتپەرستیشی لەدورگەی عەرەبی دا لەناوبرد.

هەر بۆیەش هیجرەت ڕووداوێکی ترسناك بوو لەمێژووی بانگەوازی ئیسلامی داو شۆڕشێکی جوامێردیو دلێرانەبوو، چونکە سەرەتایەك بوو بۆ سەرکەوتنی پێغەمبەری خودا لەجیهادیدا بۆ گەیاندنی بانگەواز. یەکێك لەکارە داناییەکانی گەورەمان (عمر ـ ی کوڕی ـ خطاب)یش ئەوەبوو هیجرەتی کردە ڕێساو بنچینەی مێژووی ئیسلامی و لەم بارەیەشەوە گوتوویەتی: {هیجرەت هەق و ناهەقی لەیەك جیاکردەوە، جا ئێوەش بیکەن بەبەرواری مێژووی خۆتان}.. جوانترین هێماو ئاماژەیەکیش بۆ واتای هیجرەت لەئیسلام داو بۆ ئەنجامدەرانی کارەکەش ئەوەیە (مێژووی ئیسلام) ئەو موسڵمانانەی بە (پەنابەران) ناونەبردووە کە مەککەیان جێهێشتبوو بەرەو ـ یەسریب ـ. ئەوان شایستەی ڕێزو پێزانینی خودابوون کە ستایشی کردوون وەك چۆن ستایشی پشتیوانان (أنصار)یشی کردووە، کە بەوپەڕی سنگ فراوانی و گیانی برایەتی ی بێ وێنەوە پێشوازیان لێکردن.. وەك خودا خۆی ستایشی هەموویان دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾التوبة/١٠٠... واتە:{خودا ڕازی بووە لەو کۆچکارە پێشینانەی کە یەکەمین جار هیجرەتیان کرد، ڕازی بووە لەو پشتیوان و (أنصارانەش) کە بەو ڕەفتارە بەرزە بێ وێنەیە پێشوازییان کردن و هاوخەم و هاوئازارو هاوڕێبازیان بوون، هەروەها خودا ڕازی بووە لەهەموو ئەو کەسانەش کەشوێن پێ ی ئەو بڕوادارانەیان هەڵگرتووە چ لە (تابعین)و (تابعینی تابعین)و سەرجەم ڕۆڵە خواویستەکانی نەتەوەی ئیسلام، خودا لەهەموویان ڕازی بووە، کە بە (احسان)و چاکەکاری و دڵسۆزی ی تەواوەوە دوای ڕێبازی ڕاستی خودا دەکەون و ئەوانیش بەپاداشتی خودا قایل و سەرکەوتوون}.

هیجرەت لەڕێبازو نەریتی هەموو ئەو موسڵمانە چاکسازی خوازانەیە کە خودی کۆچکردنەکە دەکەنە پێگەیەکی نوێی بانگەوازەکەیان. لەمێژووش دا باسی هیجرەتی باوکی پێغەمبەران (ئیبراهیم) کراوە کە بۆ پاراستنی دینەکەی لە ـ عێراق ـ ەوە بەرەو (شام) هەڵاتووە دوای ئەوەی فارسەکان بەربەرەکانییەکی زۆریان کردووەو هەوڵی سووتاندنیشیان داوە، هەر لەمێژوودا باسی هیجرەتی (مووسا)ش کراوە، کە چۆن لە (میسر)ەوە خۆی و ئەو بڕوادارانەی لەگەڵی دابوون کۆچیان کردووەو دەربازبوون لەدەست فیرعەون و سوپاکەی، هەروەها باسی هیجرەتی (عیسا) کراوە لەشاری (بیت لحم)ەوە بۆ (ئۆرشەلیم) ـ واتە بۆ (قودس).

کەوابوو هیجرەت سرووشی گەورەترین وانەمان دەخاتە دڵ و دەروونەوە، چ لەڕووی خۆڕاگرتن لەسەر ناڕەحەتی و، چ لەڕووی قوربانی دان و خۆبەخت کردنەوەو، چ لەڕووی جێگیربوون لەسەر بیروباوەڕو، پاشان لەڕووی متمانە بەسەرکەوتنەوە.

# هیجرەت و مەرجەکانی

هیجرەت چەند مەرج و ئەرکێکی گرنگی تێدایەو دەبێت مرۆڤی بڕوادار جگەلەو دەرس و پەندانەی لەمەوپێش دیاریمان کرد ڕەچاویان بکات، وەك: (هەڵاتن بەرەو لای خودا)[1]... هەڵاتنیش بەرەو لای خودا سەرکەوتنە بەسەرماددەو هەموو پێداویستییە ماددیەو شت و مەکە فریودەرو سەیروسەمەرەکانی دا..

هەر بۆیەش خودا لەمەڕ بەسەرهاتی هیجرەتی پێغەمبەرەوە فەرموویە:

﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾التوبة/ ٤٠.

واتە: {ئەگەر ئێوە یارمەتیی پێغەمبەر نەدەن و هیجرەتی لەگەڵ دا نەکەن و هەر باوەش بکەن بەدنیاوماڵ و سامان و شت ومەکە فریودەرەکانتان داو یاریدەدان و سەرخستنی فەرامۆش بکەن، بەڵام خودا خۆی ئەرکی سەرخستنی لەئەستۆ ناوەو کاری هیجرەتیشی بۆ مەیسەرکرد لەکاتێك دا خۆی و هاوەڵەکەی (کە ئەبوبەکرە) لەئەشکەوتەکە لایان دابوو، دوژمنانیش وێڕای زۆریو بەهێزی و هەرلکوتانە سەریان و دەرپەڕاندنیان لە (مەککە)، بەڵام خودا هەرخۆی هەردوکیانی لەو ئەشکەوتەدا پاراست، ئەوەبوو پێغەمبەر بەهاوەڵەکەی ڕاگەیاند کە نەترسێت، چونکە خودامان لەگەڵ دایە. خوداش هێمنیو دڵنیاییی پێبەخشین و دڵی هاوەڵەکەشی هێورکردەوەو متمانەی سەرکەوتنیشی پێگەیاندن و چەندین سەربازی لەمەلائیکەت بۆناردن، کە پارێزگارییان لێ بکەن و، هیچ کەسێکیش توانای بینینی ئەو سەربازانەی نەبوو. بەم چەشنە خودا چاوی موشریکان و کافرانی لەئاستیان دا وەرگێڕاو شیرکی هەڵتەکاندو (بانگاشەو پروپاگەندەی هاوەڵ بۆ خوادانان و بێ باوەڕی و گومڕاییانی خستە نزمترین ئاستەوە) و لەچینی هەرەخواروودا سەرنگومی کرد، لەبەرامبەردا (وشەو فەرمایشتی خوداو بانگەواز بۆ ئیسلام)ی بەرزکردەوەو بەیداخی دین و بیروباوەڕی خواپەرستی ی بەرز شەکاندەوە. بێگومان خوداش هەر خۆی بەهێزو دانایە... بەهێزە لەکاروباری داو هیچ کەسێك

---

(١) سەرچاوەی ئەم باسە کتێبی (القرآن والنبيّ)ی دکتور (عبدالحليم محمود)ە.

توانای ڕوو بە ڕوو بوونەوەی نی یە، داناشە لەپشتگیری کردنی بڕواداران و موجاهیدانی دڵسۆزو سەرخستنیان دا}.

لەم ئایەتەدا خودا وێنەی ڕووداوێك دەگرێت، کە تیای دا کافران پێغەمبەر لە —مەککە— دەردەکەن و ئەویش بەپەنهانی لەتاریکایی شەودا بەرەو شارێکی تر دەردەچێت تا لەوێ بەئازادی بانگەواز بۆ بەرنامەی خوداو عیبادەت بکات. خودا ئەمە بەسەرکەوتنێك وێنادەکات لە کاتێك دا پێغەمبەر خۆی و هاوەڵە هەرەدڵسۆزو ڕاستگۆکەشی (ئەبوبەکر) لەو ئەشکەوتەدا خۆیان حەشاردابوو و کافرانیش لەهەموو شوێنێك دەگەڕان بەدوایان دا تاکو بەئاشکرا زەفەریان پێ بەرن و بیانکوژن.

کەوابوو هیجرەت لە — دیدوتێڕوانینی قورئان —دا سەرکەوتنە، چونکە هەڵاتنە بۆلای خودا گەر تەنانەت ببێتە هۆی مردنیش، هەروەك خوداش خۆی لەم ڕووەوە دەفەرموێت:

﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوا أَوْ مَاتُوا لَيَرْزُقَنَّهُمُ اللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾الحج/٥٨... واتە: (ئەگەر ئەو بڕوادارانەی لەپێناوی خوادا کۆچیان کردووە، لەڕێگەی کۆچ و هیجرەتیان دا بکوژرێن یان بمرن ئەوا خودا دوای مردن و لەدنیا دەرچوونیان ڕزق وڕۆزییان هەر پێ دەداو بەچاکی پاداشتیان دەداتەوە کە بەهەشتی نەبڕاوەیە. بێگومان هەر خودا خۆی باشترینی ڕۆزی دەرو پاداشت دەرەوانە).

موسڵمانانیش هەمیشە فەرمانی هیجرەت کردنیان پێ کراوەو خودا ئەو هیجرەتەی بە{هەڵاتن بۆلای خۆی (الفرار الی الله)} ناوبردووەو فەرموویەتی: ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾الذاریات/٥٠... واتە: {ئەی بڕواداران ئێوە لەژێردەستی دا مەمێننەوەو بەئاین و بیروباوەڕەکەتانەوە ڕاکەن بەرەولای خودا، چونکە بەڕاستی من ترسێنەرێکی لێکدەرەوەم بۆ ئێوە}، واتە: (لەسزای سەختی خوداوە ڕاکەن بۆلای پاداشتەکەی).

کۆچ کردنی مرۆڤی ئیماندار بەرەو لای خودا دەبێتە هۆی دڵنیاییو هێمنی ی دەروونی و دەستەبەرکردنی پشتگیریی خوداو دەیخاتەبەر سایەی پارێزگاری و سەرپەرشتیاریی ی خۆی... هەر بۆیەش پێغەمبەری خودا لەئەشکەوتەکەدا بەهاوەڵەکەی خۆی (ئەبوبەکر)ی دەفەرموو: (دڵتەنگ مەبە، چونکە بێگومان خودا لەگەڵمان دایە= **لاتحزن ان الله معنا**).

دیسان هیجرەتی ئیماندار بۆلای خودا بەڵگەی دڵسۆزی و پیشاندانی خۆشەویستی یە بۆخودا. ئەمەش بەندە بەوازهێنان لەو کارانەوەی کەخودا ڕێ ی لێگرتوون، هەروەك پێغەمبەری خودا دەربارەی واتایەکی تری هیجرەت دەفەرموێت: {موسڵمان ئەو کەسەیە، کە

موسڵمانان لەزمان و دەستی پارێزراوبن، موهاجیریش ئەو کەسەیە هیجرەتی لەو کردارو ڕەفتارانە کردووە کەخودا قەدەغەی کردوون}.

هەروەها لەمەرج و ئاکاری بەرزی کۆچکردن: (نیازی خاوێن و پوختەکراوە بۆ خزمەتی ڕێبازەکەی خودا بەتەنها). جا ئەگەر نیازەکە بۆ ئەوە تەرخان و ئاڕاستە بکرێت ئەوا هەموو کردەوەیەکی پڕ لەخێرو چاکە دەبن و هەر کردارێکی هیجرەتێکە.

دەنا گەر نیازەکە بۆ مەبەستی خزمەت کردنی ڕاستەقینەی ڕێبازی خودا ئاڕاستە نەکرابێت ئەوا سەرەڕای ئەوەش کارەکان بەڕواڵەت چاك دەرکەون بەڵام لای خودا پەسند ناکرێن..

هەر بۆیەش پێغەمبەر لەفەرموودە بەناوبانگەکەی دا فەرموویە: **((انما الأعمال بالنيات وانما لكل امريء مانوى. فمن كانت هجرته الى الله ورسوله فهجرته الى الله ورسوله. ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها او أمرأة يتزوجها فهجرته الى ما هاجر اليه))**.

لەواتای ئەم فەرموودەیەوە ئایینی ئیسلام دژی ئەو کەسانەیە کەدەڵێن (کاری خێر هەر خێرەو هەر بۆ چاکەکارییە)، یان کەدەڵێن: (کاری خێرو چاکەکردن بۆ قایل کردنی ویژدانە). جا ئەگەر کاری خێر لەبنەڕەتەوە بۆخودا ئەنجام نەدرابێت ئەوا هەواوئارەزووی مرۆڤەکان لەڕێی ڕاست لای دەدەن و بەرەو خراپەو شێواندنی دەبەن. چونکە (نیەتی پاك) و (تەبەننی کردنی نیاز تەنها بۆ ڕێبازی خودا) لەگرنگترینی ئەو کۆڵەکە پتەوانەیە کەئایینی ئیسلامیان لەسەردامەزراوە.

پێغەمبەری خودا بۆ ڕوون کردنەوەی بایەخی (نیەت پاکی) لەدوای فەتحی مەککەوە فەرموودەیەکی لەم بارەیەوە هەیە لەدوای ئەو فەتحە بێ وێنەیەی کەتیایدا ئیسلام و موسڵمانان بەسەر دوژمنانیان دا سەرکەوتوون، فەرموویەتی: **{لا هجرة بعد الفتح – أي فتح مكة، ولكن جهاد ونية}**...

# چەند وانەیەك لەجیهادی پێغەمبەرو بڕوادارانەوە

## ورەی گیان وخۆڕاگری:

هەر کەسێك بەوردی سەرنج لەهەردوو جەنگی "بەدر" و "ئوحود" بدات هەست بەبوونی ورەی گیان و ئازایەتی لەدڵی بڕواداران دا دەکات. ئەمەش لەگرنگترینی هۆیەکانی سەرکەوتنیان و خۆڕاگرتنیان بووە لەناخۆشترین حاڵەتی کوشتاردا. ورەی گیان و (ڕۆحی مەعنەوی) ئەو ڕاستییەیە کە فەرماندە گەورەکانی گەل و نەتەوەکانی تریش دانیان پێ داناوە.

بۆ نموونە (ناپلیۆن) گوتوویەتی: {ڕێژەی هێزی مەعنەوی لەمەیدانی کوشتاردا سێ ئەوەندەی هێزی ماددی یە} . لەجەنگی دووەمی جیهانییش دا (مۆنتیگمری) جەختی لەسەر گرنگی ی ورەی گیان و کاریگەریی لەبەدەست هێنانی سەرکەوتن دا دەکردەوە. ئەم سەرکردەیەش هەر لەخۆیەوە دانی بەوەدانەناوە، بەڵکو لەسەر بنچینەیەکی ئاگاداریی تەواو شارەزایییەکی زۆریەوە لەسەر جەنگ و سەرکردایەتی کردنی لەشکرەکان بەو حەقیقەتە گەیشتووە.

توێژینەوە نوێ یە جەنگی یەکانیش سەلماندوویانە، کەجەنگاوەری لێهاتوو ئەوەیە هەردوو هێزی مەعنەوی‌و ماددیی تێدابێت.

هێزی مەعنەوییش لەکانگای باوەڕەوە هەڵدەقوڵێت، واتە باوەڕ بەو دۆزو کێشەیەی کە سەربازەکە لەپێناوی‌دا دەجەنگێت، جگە لەمتمانە بەخۆکردن و متمانە بەتوانای خۆیشی، پاشان متمانەکردن بەسەرکردەو بەتواناو دانایی ی سەرکردە.

خودای مەزن دوای جەنگی – بەدر – چەند ئایەتێکی ناردۆتە خوارەوەو تییان دا پلەی هێزی مەعنەوی و پێویستی ی ئەو جۆرە هێزەی لەجەنگ دا ڕوون کردۆتەوە. وەك دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾س/١٥-١٦. واتە: {ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ڕووبەڕووی سوپای کافران بوونەوە کاتێك ئەوان بەژمارەو هێزێکی زۆرەوە بەرەو لاتان دەهاتن

ئێوەش بەوپەڕی ئازایەتی و سووربوونەوە ڕووبەڕوویان ببنەوەو پشتیان تێمەکەن و ڕامەکەن. چونکە هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا بگەڕێتەوەو پشتیان تێبکات (مەگەر بۆ فڕوفێڵی جەنگیو فریودانی کافران بێت تا وابزانن هەڵدێت و بەڵام دواییش بێتەوە سەریان، یاخود بۆئەوەی بگاتەلای کۆمەڵێکی تری ئیمانداران و یاریدەیان بدات لەجەنگ دا) هەر کەسێك لەبەر ئەو دووهۆیە لەجەنگ هەڵنەیەت و خۆڕاگرنەبێت و بەرپەرچی لەشکری کافران نەداتەوە ئەوا کەوتۆتەبەر تووڕەیی و ڕق وکینەی سەختی خوداو لەڕۆژی دواییش دا هەر دۆزەخ جێگەی دەبێت. دۆزەخیش خراپترین چارەنووسە بۆیان} .

خودای مەزن لەم ئایەتەدا هەڵاتن لەجەنگی قەدەغەکردووەو داوای خۆڕاگری لەبەرامبەر دوژمنان دا دەکات. چونکە هەڵاتن لەدەست دوژمن و بەرەوڕوو نەبوونەوەی لەو گومانەوە سەرهەڵدەدات کە گوایە بڕواداری بەزیو گومانی لەبەڵێنی خودا هەبێت سەبارەت بەسەرخستنی نەتەوەی خاوەن باوەڕ لەجەنگ دا. هەروەها لەوەشەوە سەرهەڵدەدات کەموسڵمان ترسی هەبێت لەهەر هێزێك لەهێزەکانی دوژمن دوای گومان کردنی لەهێزی خودای خالق. ئەمەش لەم لایەنەوە بەجۆرێك لەجۆرەکانی (شیرك و هاوبەش بۆ خوادانان) لەقەڵەم دەدرێت و دوای ئەوەش ترس و دڵەڕاوکێ و لاوازی دەکەوێتە نێو ڕیزی جەنگاوەرانەوەو ئینجا دوژمنانیش حاڵەتی ئەوانی بۆ دەردەکەوێت و دەبێتە هۆی کوشتنی موسڵمانان.

لەڕاستییش دا دڵی مرۆڤی خاوەن باوەڕ دەبێت وەك چیاکان پتەوو ڕەگ داکوتاوبێت لەسەر ئیمانەکەیو بەهیچ هێزێکی سەرزەوی نەبەزێت، چونکە ئەو دڵە پەیوەستە بەخوداوەو، پاشان مردن و ئەجەلیش هەر بەدەست خودا خۆیەتی و مرۆڤی ئیماندار بۆی نی یە لەترسی ژیان وگیانی هەڵبێت و تێ ی تەقێنێت.

دیسان هەر لەو ئایەتانەی دەربارەی ئەم حاڵەتانە هاتوونەخوارەوە بۆ پێغەمبەرو بڕواداران، ئەمانەیە، کەخودا تێیان دا دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٤٥﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴾الأنفال/٤٥-٤٧..

خودای مەزن لەو ئایەتانەدا ئاماژە بۆ ئەو هۆکارە ڕاستەقینانەی سەرکەوتن دەکات کە لەکانگەی ورەی گیان و هێزە مەعنەوی یەکانەوە هەڵدەقوڵێن، وەك: خۆڕاگرتن لەکاتی

ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن داو، یادی خوداو پەیوەستی بەخوداوە کەسەرچاوەی هەر هێزێکە لەوجوددا، گوێڕایەڵی کردنی خوداو پێغەمبەرەکەی بەو چەشنەی خۆیان لەسەرپێچی بەدووربگرن و موسڵمانان پابەندبن بەفەرمانەکانەوەو، پاشان بەلاوەنانی هەر ناکۆکی یەکی نێوخۆیان، چونکە ناکۆکی و ململانێ ی خۆیەخۆی یەکدی هۆکاری شکستی یە، هەروەها ئارام گرتن لەسەر بارەگرانەکانی جەنگ و، دەرچوون بۆکوشتار بێ لەخۆبایی بوون و لوتبەرزیو شانازی بەهێزو سوپاوەو، لەدواییش دا هەر تەنها لەپێناوی خودادا بجەنگێت نەك لەخۆشەویستی ی ناوبانگ و خۆدەرخستن دا...

خودای مەزن لەئایەتێکی دی دا گرنگی ی ئارام گرتن دەردەخات و دەفەرموێت:

﴿ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾الأنفال/٦٦..

واتە: {گەر سەد کەسی خۆڕاگر لەئێوە هەبێت ئەوا دووسەد کەس لەکافران دەبەزێنن. گەر هەزار جەنگاوەری خۆڕاگرو بەجەربەزەشتان هەبێت ئەوا دووهەزار جەنگاوەری دوژمن دەبەزێنن بەیارمەتی خودا. خوداش هەر لەگەڵ جەنگاوەرانی خۆڕاگری بەئیمان دایەو پشتگیرییان دەکات و سەریان دەخات}.

لەدوایی دا پێویستە هۆیەکی زۆر گرنگ بۆ بەهێزکردنی گیانی مەعنەوی و ورەی بڕواداران دیاری بکەین، ئەویش پێویستی ی باوەڕبوونی موسڵمانە بەو ڕاستی یە بەڵگەنەویستەی کە ئەگەر لەپێناوی خوادا بکوژرێت ئەوا نەمردووەو لەلای خودای پەروەردگاری هەر زیندووەو خودا پاداشتێکی هێجگار زۆرو گەورەی بۆ ئامادەکردووە، (وەك پێشتر لەباسی جەنگی — ئوحود —دا ئاماژەمان بۆکرد).

## سەرکەوتن لەخوداوەیە:

جا ئەگەر ئەو هێزە مەعنەوی یەی کە لە (باوەڕ بەخوداوە سەرچاوە دەگرێت) و کە لەهەر تەماع و چاوبڕینە دەسکەوتێکی ماددییش دا بڕاوە)، لەئارادابێت ئەوا (سەرکەوتن لەخوداوە) لەدیارترین و ڕۆشنترین وێنەی دا بەدی دێت، وەك لە — جەنگی بەدر —دا دەرکەوت..

بێگومان موسڵمانان لە — جەنگی بەدر —دا ژمارەیان کەم و کەرەسەو تفاقیشیان هێندە نەبوو، دوژمنەکانیشیان ژمارەیان زۆر بوو و کەرەسەو تفاقی ی زۆریشیان پێ بوو.

بەڵام ئەوان (واتە موسڵمانان) بۆ گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەیان و بەرگری لە عەقیدەکەیان جەنگین و خوداش لەقورئان دا بەوشەی (أذلة) وەسفی کردوون، واتە: (بەهۆی

کەمی ی ژمارەو چەك و تفاقی جەنگی یەوە موسڵمانان بێ هێزو لاوازبوون). دیارە مرۆڤیش تەنها لەدۆخی شکستی ی نەفسی دا هەست بەلاوازی دەکات، خودا فەرمووی پێ یان: ﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ﴾آلعمران/١٢٣. واتە: (بێگومان خودا لەجەنگی بەدردا سەری خستن لەکاتێکدا ئێوە بێ‌هێز بوون)، هەروەها موسڵمانەکان پێشبینی ی سەرکەوتنیان لەڕۆژی جەنگی (بەدر)دا نەدەکرد، بەڵکو دوای ئەوە لەڕێ ی موعجیزەی خودایی یەوە هەستیان پێ کرد کە ئەوان سەرکەوتوون، وەك خودا لەم فەرمایشتەی دا پێ یان دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّى مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴾الأنفال/٩..
واتە: {کاتێك ئێوە داوای بەهاناوە هاتنی خوداتان دەکردو خوداش بەدەم داواکەتانەوە هات و پێ ی ڕاگەیاندن کەوا هەزار مەلائیکەتی یاریدەدەرو یەك لەدوای یەك دەنێرم بۆ لاتان تا یاریدەتان بدەن}...

دیسان موسڵمانان دەزانن کە ئەوان کاتێك بەسەر دوژمنان دا سەرکەوتوون ئەو سەرکەوتنەیان هەر لەخوداوە بووە نەك تەنها بەهێزی خۆیان، وەك خوداش دەفەرموێت: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴾الأنفال/١٧...جا مادام مەسەلەو باری ڕاستی ئاوابێت کەوابوو سەرکەوتن هەردەبێت لەخوداوەو بەیارمەتی خودابێت، وەك خودای بالادەست خۆیشی بەڕوونی دەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ ئەم ڕستەیە لەهەردوو ئایەتی ژمارە (١٢٦)ی س وورەتی (آل عمران) و ژمارە (١٠)ی سوورەتی (الأنفال)دا هەیە، واتە: {سەرکەوتن تەنها لەخوداوەیە}. خوداش سەرکەوتن تەنها بەو کەسە دەبەخشێت کەخۆی بۆ خودا تەرخان و یەکلاکردۆتەوە.

لەجەنگی (ئوحود)دا موسڵمانان بەشێوەیەك دەستیان بەجەنگ کرد کەپابەندبوون بەفەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەیەوەو وردەوردە نیشانە سەرەتایی‌یەکانی سەرکەوتنیان بۆ دەردەکەوت.

بەڵام کاتێك هەندێك کەس لەموسڵمانانی سەرچیاکە سەرپێچییان لەفەرمانەکانی پێغەمبەر کردو هاتنەخوارەوەو نیازو هیوایان لەشەڕو کوشتارەکە هاتەسەر کۆکردنەوەی دەسکەوتە ماددی یەکان، ئیدی دوای سەرکەوتن تووشی بەزین و تێشکان بوون.

## سەرکەوتنی پێغەمبەر بەڵگەیەکە لەسەر ڕاستی ی پێغەمبەرێتی یەکەی:

کاتێك پێش جەنگی بەدر موسڵمانەکان دەرچووبوون بۆ دەست گرتن بەسەرکاروانەکەی قوڕەیش دا، خۆیان ئامادە نەکردبوو بۆ جەنگێکی گەورە، چونکە وایان زانیبوو بەرەو ڕووی چەند پاسەوانێکی کاروانەکە دەبنەوەو ئەمەش تەنها ئاتاجی بەچەند چەکێکی سووکە تا دەست بەسەریان دا دەگرن. بەڵام لەڕووبەڕووبوونەوەی سوپایەکی گەورەدا دەبێت ژمارەیەکی زۆر لەسەربازو لەکەرەسەو ئازووخەو چەك ئامادەبکرێت.

پێغەمبەریش لەحاڵەتی زانینی جەنگێکی نابەرابەردا فەرمانی کردووە بەموسڵمانان ڕووبەڕووی سوپاکەی قوڕەیش ببنەوە کە بۆ پاراستنی کاروانەکەیان ناردبوویان، ئەمەش بەپشت بەستن بەو بەڵێنی سەرکەوتنەی کەخودا پێی گەیاندبوو. خودا فەرموویە: ﴿وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ﴾... واتە: {کاتێك خودا بەڵێنی یەکێك لەو دوانە: (کاروانەکە)، یان (تێکشکاندنی سوپای قوڕەیش)ی پێ دەگەیاندن} . جا کاتێك یەکێك لەو دوانەش،(کە کاروانەکە) بوو لەدەستیان دەردەچێت، ئەوا هەردەبێت بەڵێنی خودا لەوەیتریان دا بەدیبێت کە سەرکەوتنە بەسەر سوپا گەورەکەی قوڕەیش دا. ئیتر پێغەمبەریش داوا لەهاوەڵانی دەکات کە بەرەو ڕووی لەشکری قوڕەیش ببنەوە. دیارە لەبەرامبەر داواکارییەکی ئاواش دا هەندێك لەهاوەڵان تووشی هەڵوێستی دوودڵیو دڵەڕاوکێی کت وپڕی بوون و پێغەمبەریش هەر کە بەوەی زانیوە خێرا هێورو ئارامی کردوونەتەوە.

خۆ ئەگەر پێغەمبەر بەتەواوەتی دڵنیانەبوایە لەڕاستیی ئەو بەڵێنەی کە بەسرووش پێی گەیەنرابوو ئەوا هەرگیز ئەو لەشکرە بچووك و کەم ژمارەیەی تووشی ئەو جەنگە نەدەکرد کەهیچ نیشانەیەکی سەرکەوتنی تیادا نەدەبینی، لەبەرئەم هۆیانە:

**یەکەم**: زیاتربوونی ژمارەی سەربازانی نێو سوپاکەی قوڕەیش، کە لەڕێژەی(٣) بەرامبەر(١)دابوو لەئاست سەربازانی موسڵمانەکان دا. ئەمەش بەڕای پسپۆڕانی سەربازی ژمارەیەکی زۆر گەورەو نابەرابەرە، بەتایبەتیش لەسەردەمێك دا، کە شەڕو کوشتار تەنها بەتیرو شمشێرو ڕم کراوە. ژمارەی موسڵمانەکان تەنها(٣١٥) کەس بووەو ژمارەی بێ باوەڕەکانیش(٩٥٠) کەس بووە.

**دووەم**: باڵادەستی ی دوژمن لەڕووی چەك و تفاق و ئازووخەوە کە ئەمانەش چەند هۆکارێکی دیاری سەرکەوتن و یەکلاکەرەوەی جەنگن. کافرەکان(٢٠٠) ئەسپیان پێ بوو، بەڵام موسڵمانەکان تەنها دوو ئەسپیان پێ بوو. کەچی وێڕای ئەو هەموو نابەرابەرییەش هێشتا ورەو گیانی ئازایەتی ی موسڵمانەکان زۆر بەرزو بەتین بوو. جا سەرکردەیەکی شارەزاو

هەڵکەوتووی ئاوا سوپاکەی بەرەو جەنگ ببات و دڵنیابێت لەسەرکەوتن و بەر لەدەست پێکردنی جەنگ بفەرموێت: {مژدەتان لێ بێت ئێستا وادەی ئەوە نزیك بۆتەوە، کە بۆ لەناوچوونی ئەو قەومە بڕوانم} و پاشان فەرموودەکەی بەدی بێت و موسڵمانان بەو شێوەیە سەرکەون بەسەر قوڕەیش داو تەفروتوونایان بکەن، ئەوا بێگومان لەلێکدانەوەی باری شەخصیی ئەو فەرماندەیەدا هەردەبێت بگوترێت (بەڕاستی و بەحەق ئەو سەرکردەیە هەر پێغەمبەرێکی خودایەو خودا هەر خۆی ئاوا پشتگیری ی کردووەو (نەصرەت)ی داوە. [1]

## گەورەیی قوربانیدان:

پێش بەستنی پەیماننامەی —حودەیبییە— گەورەترین وێنەی قوربانی دانی موسڵمانانمان دێتەبەرچاو، ئەوەبوو پێغەمبەرو بڕواداران بەشێوازێکی ئاشتیخوازانە بەرێ کەوتبوون بۆ سەردانی (مسجد الحرام) بەڵام قوڕەیش ڕێگەی ئەو سەردانەیان پێ نەدان. پێغەمبەریش (عثمان—ی کوڕی —عفّان)ی لەلایەن خۆیەوە نارد بۆلای قوڕەیش، کەچی قوڕەیشی یەکان — عثمان—یان بەندکردو هەواڵەکەشی وا گەیشت بەموسڵمانەکان کە گوایە کوژراوە. ئیدی پێغەمبەریش بەتەمای کوشتارو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دوژمنە دەسدرێژکارانەبوو. داخۆ لەوساتە وەختەدا ڕادەی بەدەنگەوە هاتنی موسڵمانەکان بۆ ئەو هەنگاوەی پێغەمبەرەکەیان چەند بووبێت؟ لەڕاستی دا ئەوان لەسەر مردن پەیمانیان پێ دا، پەیمانیان پێ دا کە لەبەردەم دوژمن دا هەڵنەیەن تەنانەت گەر هەمووشیان مردبن.. چەند گەورەو بەرێزە ئەو ئیمانەی کەژیان و مردن تیای دا وەك یەك وەستاوە. بێگومان موسڵمانە پێشینەکان بەو ئیمانەیانەوە تێکوشاون و هیچ هێزێکی سەرڕووی زەوی نەیتوانیوە بەرۆوویان دا بووەستێت.. هەر بۆیەش چەندین وڵات و مەملەکەتیان ئازاد کردووەو بەسەریەك لەدوای یەکی حاکم و سوپا سەرکوتکەرەکانیان دا سەرکەوتوون.

جا ئەگەر هەمان باوەڕو ئیمان لەدڵی موسڵمانانی ئەمرۆش دا بچەسپێت ئەوا چی دی لەژیانی لاوازی و ژێردەستەیی دا نابن، چونکە هێزی گەلان (بەژمارەو سەرژمێرییان) پێوانە ناکرێت، بەڵکو بەڕادەی باوەڕو عەقیدەو قوربانی دانیان دەپێورێت.

دیارترین نموونەی ئەم ڕاستی یەش موسڵمانە پێشینەکان و، {لەچەرخی نوێش دا گەلی (ڤیێتنام)ە} . [2]

---

(١)لەسەرچاوەکانی ئەم باسە چەند وتارێکی بڵاوکراوەی مامۆستا (محمد فريد وجدي)یە لەگۆڤاری (أزهر)دا.

(٢) دیارە من وەك ئەمانەتێك ئەو ڕستەیەم کردووە بەکوردی،نەك لەبەرئەوەی هاوڕای نووسەرم. (وەرگێڕ).

گەلی عەرەبی موسڵمان و (هەر گەلێکی تری موسڵمانیش) ئەمڕۆ ئاتاجێکی هێجگار فرەیان بەو ئیمانە هەیە. جا ئایا ئامادەن بۆ بەیعەت و پەیمان دان بەسەرکردە دڵسۆزو خاویستەکانیان لەسەر مردن لەپێناوی سەندنەوەی خاکیان و بنبڕکردنی ئەو سەرشۆڕی و سووکایەتی یەی، کەپێیانەوە لکاوە؟ یان هەر وەك دەشتەکی یەکان (اعراب) بڕوبیانوو دێننەوە کاتێك بەپێغەمبەریان دەگوت: (بە کاروکاسبی و بەخێوکردنی ماڵ و منداڵمانەوە خەریك بووین و ناتوانین بێین بۆ جیهاد، تۆش داوای لێخۆشبوونمان لەلای خودا بۆبکە) = (شغلتنا أموالنا وأهلونا فاستغفر لنا).

لەڕاستیش دا ئەمڕۆ زۆر کەس سەرقاڵی دەست بڵاوی و خەرج کردنی پارەو پوولی زۆرن لەکاری بنیات نانی کۆشك وتەلاری بەرزداو، لەسەرکردنەسەر خۆشی و ڕابواردنی زیاد لەڕادەی دنیاو هۆگربوونی ژیانی کەم خایەنی دنیادا، لەم بوارەش دا لەپەرتەوازەیی و دژایەتی یەکتردا دەژین و ململانێ لەسەر دنیا دەکەن بۆ پەیداکردنی دەسکەوتەکانی و زەوت کردنی دەسەڵات و پلەوپایە تیای دا.

هەموو ئەمانەش جیهادی ڕێ ی ڕزگارکردنی خاکی خۆیانیان لەبیربردوونەوە، کە دەبوایە لەواقیع دا هەرچی هەیانە لەماڵ و سامان و پلەوپایە لەو پێناوەدا بەکاریان بێنایە.

## ژیانی پێغەمبەر شایەتیی لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتیی دەدات

زوربەی شوێنکەوتوانی ئاینەکانی تر، بەتایبەتی ئەوانەی بەشێوەیەکی ڕاست لەئایینی ئیسلامیان نەکۆڵیوەتەوەو هیچ شارەزایی یەکیان لەژیاننامە (سیره)ی —محمد— ی پێغەمبەردا نی یە وای بۆ دەچن گوایە قورئان لەدانان و صیاغەی (محمد) خۆیەتیو بۆ چەند مەبەست و ئارەزوویەکی شەخصی بەکەسێکی تری نووسیوەتەوە، کەوابوو (بەگوێرەی ئەم بۆچوونە) پێغەمبەریش نەبووەو لەلایەن خوداوە بۆ ڕێنمایی گرۆی ئادەمی ڕەوانە نەکراوە.

بەڵام پێویستە ئەوەی بەدوای حەقیقەت دا دەگەڕێت و خوازیاریەتی، بەوردی لە ژیاننامەی (محمد) بکۆڵێتەوەو سەرنج بدات لەو هەموو ڕووداوو بەسەرهاتانەی ژیانی، ئەوسا بەدڵنیایی یەوە بۆی ڕوون دەبێتەوە کە بەڕاستی و بەبێگومان ئەو پێغەمبەری خودابووە.

هەر مێژووی (محمد)یش ئەو گومانە لادەبات کە گوایە ئەو ئیددیعای پێغەمبەرێتی ی بۆ خۆی بەدرۆ کردبێت، چونکە ئەو بەجوانترین ڕەوشت و ئاکارەوە ناسرابوو هەر لەکاتی منداڵی یەوە، تا باڵغ بوون و گەشەکردنی تەواوی و بەشێوەیەك وەسفی دەکرا، کەخەڵکی هاوزەمانی خۆی ناوی (الأمین)یان لێ نابوو، واتە (دەسپاك و سەرڕاست و جێی هەموو متمانەیەك)...

(محمد) تا تەمەنی چل ساڵی دەربارەی پێغەمبەرێتی و وەرگرتنی پەیامی خودا هیچ باس و خواسێك بۆ گەلەکەی ناکات. خۆ ئەگەر کابرایەکی بزێوو بێ باك بوایە یاخود کەسێکی خۆپەسندو بەتەماع بوایە ئەوا لەو ماوەیەی پێشووی داو لەهەرەتی لاوی دا بوارێکی دەدۆزی یەوە بۆ گرتنەبەری هەرکارێك کە مۆرکی بێ باکی و گوێ نەدان بەئاکامەکانی تێدابوایە. بەڵام بەتەمای هیچ کاروبارێکی لەو شێوەیە نەبووە.

گەر سەرنج لەکارو هەڵس وکەوتی زوربەی ئەو بێ باك و بزێوانەش بدەین دەبینین لەتەمەنی گەنجیو هەرەتی لاویتی دا دەستیان بەچالاکی خۆبردنە پێشەوەو پێ نانەسەر مەترسی کردووە.

پاشان ئەوەی زیاتر شایانی لێوردبوونەوە بێت ئەوەیە پێغەمبەر دوای ئەوەی تەمەنی دەگاتە چل ساڵان حەزی لەتەنهایی بووەو ڕووی کردۆتە ئەشکەوتی (حەڕرا)و چەندەها شەو تیایدا ماوەتەوەو بەعیبادەت و بیرکردنەوەو لێوردبوونەوەوە خەریك بووە، لەو ساتانەش دا سرووشی لەخوداوە بۆدێت کە لەنێو ئەشکەوتەکەدایەو تووشی ترس و بیمێکی زۆر دەبێت و دەسبەجێ دەگەڕێتەوە بۆلای خێزانەکەی و بەدەم هەڵ لەرزینەوە پێ ی دەفەرمویت: {ترسم لەسەرخۆم هەبووە} ، ئەم وتەیەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ڕاستگۆییو دڵسۆزی و دووربوونی لەهەر گومانێك لەو گومانانەی کەبۆی دەهۆننەوە لەسەرئەوەی گوایە ئیددیعای پێغەمبەرێتی ی بەدرۆکردووە. چونکە (محمد) وەسفی حەقیقەتێکی کردووە کە بەهەردووچاوی خۆی بینیویەتی و زۆریش لێ ی ترساوەو ترس و لەرزێکی تەواوی خستۆتە دڵیەوە، بەم هۆیەشەوە تووشی سەرماو سۆڵەیەکی جەستەیی بووەو لەسەرمان دا هێندە هەڵلەرزیوە کە بەهاوسەرو ئەفرادی خێزانەکەی فەرمووە: (دام پۆشن، دام پۆشن).

بەڵگەیەکی دی لەو بەڵگانەی، کە ڕاستی ی پێغەمبەرێتی یەکەی دەسەلمێنن گەواهیدانەکەی (ورقە-ی کوڕی -نوفل)ە کە پیاوێکی شارەزای (ئینجیل) بووەو کاتێك ڕووداوی هاتنەخوارەوەی سرووشی بۆسەر (محمد) بیست، گوتی: {ئەوە هەمان ڕێسا و شەریعەتە، کە خودا بۆ -مووسا-شی ناردبوو} . (ورقە-ی کوڕی -نوفل) ئەم قسەیەی لەخۆیەوە نەکردووە بەڵکو بەپێ ی ئاگاداربوونی لەو ژیانە پاك و بێگەردو سەرڕاستانەیەی (محمد)یش گوتوویەتی، کە هەردەم دووربووە لەناوبانگ و خواستنی پلەوپایەی بەتاڵ. چونکە (وەرەقە) لەئاخاوتنی (محمد)دا سیمایەکی ڕاستەقینەی ڕاستگۆیی ی بەدی کردووەو ئەوەی لێوەی بیستووە لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکەی ئەشکەوتی (حەڕرا)دا گوزارشتێکی پاك و بەریئانەی دوور لەهەر بیرکردنەوەو قسە ڕێکخستنێکی پێشتر بووە.

پاشان دوای ئەوەی خودا فەرمان بەپێغەمبەر دەکات کە بانگەوازەکەی بەئاشکرا ڕاگەیەنێت، ئەویش دەچێتەسەر چیای (صفا)و هەموو ڕۆڵەکانی -قورەیش- بانگ دەکات و

پێیان دەفەرموێت: }ئایا ئەگەر پێتان بڵێم ئەوا لەشکرێکی ئەسپ سوار لەقەدپاڵی ئەودیوی ئەم شاخەوە بەرەولای ئێوە دێن، باوەڕم پێدەکەن{ ؟ هەموویان دەڵێن: (بەڵێ، باوەڕت پێ دەکەین، چونکە تۆ لای ئێمە هیچ تاوانێکت نی یەو تا ئێستاش وتەی درۆمان لێ نەبیستوویت).

لەوێ دا –محمد– بەوە متمانە بۆ پێغەمبەرێتی‌یەکەی دەستەبەر کردووە کە لەوەوپێش هەردەم بەیداخی ڕاستی و ڕاستگۆیی ی بەرزکردووەتەوە، ژیانی یەکپارچە بەرەمزی بەرائەتێکی تەواو و پاکژی و بێ گەردیی تەواو وەسف کراوە، هەر ئەم ڕەمزەش بەڕاشکاوی بەرپەرچی هەر گومانێك دەداتەوەو بە ڕۆشنی جارِی ڕاستی و بێ خەوشیی گفتارو ئاخاوتنی داوە.

بۆ جەخت کردنەسەر ئەم ڕاستی یەش، لەم بارەیەوە کەسێکی وەك مامۆستا (محمد الخضر حسین) لەوتەیەکی جوانی دا دەڵێت: {ئەگەر –محمد– بەڕاستگۆیی‌یەوە ئیددیعای گەیاندنی ئەو پەیامەی نەکردایە ئەوا کەسانی ژیرو تێگەیشتوو لەو ماوەیەدا جارێك ناڕاستی ی ئەو بانگەوازەی لەکەم وکووڕی یەك دا هەر بۆدەردەکەوت. چونکە پێغەمبەری خودا (محمد) بیست وسێ ساڵ لەنێویان دا بەو بانگەوازەوە مایەوەو ئەمەش ماوەیەکی درێژە بۆ مۆڵەتی هەر کەسێك گەر بیویستبایە لەگۆشەو کەنارێکەوە چاو بەو بانگەوازو پەیامەی دا بگێرێتەوەو چاودێریی ڕەفتارو هەڵس وکەوتەکانی ئەو بانگەوازکارە (واتە – محمد) بکات تاکو لەسووچێکەوە ئاسەوارێکی وا کەشف کات کە دەلالەت لەسەر (پێچەوانەبوونی گفتاری لەگەڵ ڕەفتاری)دا بکات، یان لەسەرئەوەی گوایە شتێك لەبارەی خوداوە باس دەکات، کە خۆی هیچی لەبارەوە نازانێت. بەڵگەیەکی شایەتی‌دەر لەسەرڕاستیی پێغەمبەرێتی یەکەی ئەوەیە (ڕەوتی ژیان)و (ئاکارو ڕەوشتی) پاك و بێگەردبووە لەهەر پەڵەیەك کە (بانگەوازی پەیامبەریی)ی ناشیرین بکات.

ئەوانەی کە بەتین ترین و قووڵترین باوەڕیان بەو پەیامەی هێناوەو زۆرترین سۆزو خۆشەویستی و شکۆیان لەدڵ دا بۆ هەڵگرتووە ئەو کەسانەبوون، کە درێژترین ماوەیان لەگەڵیا بەسەربردووەو زۆرترین ماوەی شەرەفی هاوەڵێتی، یان لەگەڵیا هەبووەو چەند ساتێکی کەم نەبێت هەرگیز لێ ی دانەبڕاون. هەروەها کۆچکاران و پشتیوانان بەردەوام لەخزمەتی دابوون و ڕۆژبەڕۆژ ئیمانیشیان زیاتربووە} .

جا بێگومان –محمد– لەگشت هیواو ئاواتێکی دنیایی دابڕابوو (وەك پێشتر لەژیاننامەکەی‌دا ئاماژەمان بۆکرد) کاتێك وەفاتی کردووەو لەدنیاش دەرچووە هیچ کۆشك و

تەلارو ماڵ و سامانێکی لەپاش خۆی بەجێ نەماوە کە هاوسەرو منداڵەکانی سوودی لێببینن. وەك خۆیشی فەرموویەتی: {ئێمەی گرووهی پێغەمبەران هیچ شتێکمان بەمیرات لێ بەجێ نامێنێت} . ئەو ڕۆژەی کۆچی دواییش دەکات قەڵغانەکەی بەبارمتە لەلای کابرایەکی جوولەکە دەبێت کەخەرجی دەکات بۆ بەخێوکردنی ماڵ و منداڵی خۆی (واتە: جوولەکەکە ئاوا سوودی لێ دەبینێت).

جا ئەگەر لەمێژوودا باسی هەر پێشەوایەك وا کرابێت کەچەند کەسێکی نزیك و دڵسۆزی لەسەر هەمان ڕەفتارو نەریتی خۆی هەڵبژاردبێت بۆئەوەی یارمەتیی بدەن لە بەدەست هێنانی ئامانجەکانی داو نەختێك هاوبەشیشی بن لەدەسکەوت و قازانجە دنیاییەکان دا، بەڵام نزیکترینی هاوەڵانی پێغەمبەرو بەتایبەتییش (هاوسەرو کەس وکارەکانی) نموونەی زوهدو ڕوو وەرگێڕان لەدنیابوون و هەردەم ڕوویان لەعیبادەت و خواپەرستی بووە. جا ئایا ئیتر هیچ بەڵگەیەکی لەمە بەهێزتر هەیە لەسەر ڕاستی ی پێغەمبەرێتی یەکەی ؟!

## ئاهەنگ گێڕان بەیادی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە

موسڵمانە پێشینەکان هەرگیز بەبۆنەی یادی ساڵڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە ئاهەنگ و ڕێوڕەسمی تایبەتییان سازنەکردووە. ئەم دیاردەیەش چەند سەدەیەك دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر داهێنراوە. (ئەمەش داهێنراوێکی باشە)[1] و ئەو ژیاننامەو سیرەتەیەو ئەو ڕێبازە ڕاستەشیمان وەبیردێنێتەوە کە وزەیەکی نوێمان پێ دەبەخشێت بۆ پابەندی بەئیسلامەوە کەهۆی بەختەوەریی خەڵکیە لەدنیاو ڕۆژی دواییان دا.

یادکردنەوەی ڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەر بەخوێندنەوەی ڕەوتی ئەو ژیانەی دەبێت کەتیای دا باسی (پێشڕەوایەتیی چاك)و (ئاکاری دەسگیرۆیی کردنی هەژاران) و (ئەنجامدانی خێروچاکە)و (بەهێزکردنی پەیوەندی (صلە)ی ڕەحم وسۆز)و (بانگەواز بۆ ڕێگەی خودا) بکرێت، چونکە هەموو ئەم ڕەوشت و کردارە نایابانە ناوەڕۆکی پەیامی (محمدی) بوون.

بەڵام لەشاری (بەیرووت)[2] و-لەوانەیە لەچەند شارێکی تری جیهانی ئیسلامی-یش دا بەشێوەیەك ئاهەنگی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر دەگێڕرێت کەجێ ی ڕەزامەندیی ی خوداو

---

(١) وەك ئەمانەتێك ئەم بڕگەیەی دوایی باسەکەم کردووە بەکوردی، دەنا بەهیچ شێوەیەك لەسەر بیروڕای نووسەری کتێبەکەنیم لەم دێڕانەی دواییدا. (وەرگێڕ).

(٢) جێی باسە نووسەری ئەم کتێبە خەڵکی لوبنانە. (وەرگێڕ)

پێغەمبەرەکەی نی یە، چونکە لەهەندێك لەو ئاهەنگانەدا مەوادی گڕدار دەتەقێننەوەو یاریو گوللەی ئاگرین بەئاسمان دا هەڵدەدەن و دەیان هەزار (لیرە)[1]ی تێدا خەرج دەکەن. ئەم کارانەش لەقورئان دا قەدەغەکراون، چونکە بەفیڕۆدانی ماڵ و سامانە بیٚ ئەوەی سوودێکیان تیادابێت، هەروەها دروست کردنی مەترسییشە بۆ خەڵکی و وەڕس کردنیانەو تێکدانی ئارامیو حەوانەوەیانە. چونکە یادکردنەوەی لەدایك بوونی پێغەمبەر بەتەقاندنەوەی مەوادی گڕدارو فیشەك تەقاندن بەهەوادا دەبێتە هۆی دوورخستنەوەی خەڵکی لەڕێبازی پێغەمبەر لەجیاتی ئەوەی دڵی خەڵکی ی بەلادا ڕابکێشرێت.

جا هەتاکەی حکومەت بەپیٚ ی ڕێنمایی یەکی بەڕێز (موفتی ی وڵات) نابزوێت بۆ دانانی چەند یاسایەکی توند بۆ ڕێگرتن لەفرۆشتن و بەکارهێنانی مەوادی تەقەمەنی و تەقەکردن بەهەوادا بەو بۆنەیەوە؟

ئەی بۆچی مامۆستا بەڕێزەکانی ئاین و پیاوماقووڵ و نوێنەرانی گەڕەکەکان لەو بۆنەیەدا دەست ناکەن بەکۆکردنەوەی کۆمەکی دارایی و پاشان لەکاروباری خێرو بەرژەوەندیی موسڵمانان دا بەکاری بێنن، وەك بنیات نانی مزگەوت و نەخۆشخانەو خانەی بەخێوکردنی هەتیوان و پەك کەوتەکان؟!

---

(١) لەبەرئەوەی لەدەقە عەرەبییەکەدا وشەی (لیرە) هەبوو ئێمەش هەروامان دانایەوە، لیرەش پارەیەکی لوبنانی یە وەك دراوەکانی (دینارو دۆلارو تمەن و ...هتد). (وەرگێڕ).

# بەندی چوارەم

## ((گەورەی هەموو گەورە پیاوان))

بەڵگەیەك لەو بەڵگە بەهێزانەی ئاماژە بۆ ڕاستی ی پێغەمبەرێتی ی (محمد) دەکەن و پاشان ئاماژەش بۆ ئەو ڕاستی‌یە دەکەن کەئەو خۆی گەورەی هەموو گەورەپیاوان و دەسەڵاتداران و پێشەوایانی مێژووە، ئەو کارە چاکسازی و ڕیفۆرمە کۆمەڵایەتی و سیاسی یە گەورانەیە کە هەرخۆی (بەیارمەتی خودا) لەدوورگەی عەرەبی دا ڕێکی خستن و لەماوەی لەچەندساڵێکی کەمیش دا ئەنجامی دان، کەتەنها بەپێغەمبەران ئەنجام دەدرێن. دەنا گەر پێغەمبەر نەبوایە لەوانەیە چەندین سەدەو هەزارەی درێژی بخایاندایەو لەپاش گۆڕانکاری‌یەکی سەخت و زۆری یەك لەدوای یەکیش بوایەو لەوانەشە ئەگەری سەرگرتنیان کەمیش بوایە. لەو ڕیفۆرم و کارە چاکسازی‌یە بێ وێنانەش، بۆنموونە:

١- یەکخستنی گەلی عەرەب لەو سەردەمەداو بڕیاردانی لەسەر یەکسانی لەنێوان ڕۆڵەکانی‌دا دوای ئەوەی هۆزو تیرەکان لەنێو خۆیان دا لەسەر بچووکترین مەسەلە بەگژیەکدا دەچوون و، شانازییان بەبنەماڵەو ڕەچەڵەکەوە دەکردو خۆیان بەناوبانگ و نازناوەوە بادەدا.

٢- گۆڕینی ڕەوتی ئاکاری عەرەب بۆ بەرزترین ئاستی ڕەوشتمەندی‌و جوانترین ڕێسای ئاداب و هەڵس وکەوت، پاشان بەدی‌هێنانی دادگەریی کۆمەڵایەتی دوای ئەوەی کچانیان زیندەبەچاڵ دەکردو بەچاوی سووك و شوورەیی بۆ ئافرەتیان دەڕوانی‌و سڵیشیان لەکەمترین بەدکاری‌و هەوەسبازی نەدەکردەوە گەر بۆیان بلوایە، هەروەها هیچ مافێکی هەژاروکەم دەستانیان نەدەپاراست.

٣- زاڵ بوونی بەسەر دیاردەی بتپەرستی داو بنبڕکردنی، کەچەند سەردەمێکی درێژبوو لەنێو خەڵکی دا باوبوو و نەوە دوای نەوە بۆ یەکتریان بەجێ هێشتبوو، لەجێ ی ئەو باوەڕە شێواوو نابەجێ یەی (بتپەرستی)یش دا ئاینێکی ئاسمانی ی جێگیرکرد، کە لەسەربنچینەی خوا بەیەك گرتن و شەریعەتێك دامەزرابوو، تاکو ژیانی مرۆڤ و پەیوەستی ی بەخوداو بەکۆمەڵگەکەشیەوە ڕێك خات، ئیدی مرۆڤی ڕزگارکرد لەخلتەو شوێنەواری نەفامی‌و، لەپشێوی‌و ئەفسانەو شتی پووچەڵ، بەم پێ یەش ئەو کۆمەڵگە نموونەیی‌و ئایدیالیستەی لەواقیع دا بەدی هێنا، کە فەیلەسووفەکان لەکلاوڕۆژنەی هزرو خەیاڵیانەوە باسیان لێوەدەکرد.

بێگومان تەنها یەك كار (بەڵێ تەنها یەك كار) لەو كارە گەورەو نەمرانە لەسەردەستی پیاوێك بەدی بێت ئەوا شایانی گەورەترین ناوو نازناو دەبێت و پاشان دەبێتە یەكێك لەنەمرانی مێژوو.

ئەی باشە ئەم هەموو كارە گەورەو پیرۆزانەی كەسەرجەمی هەموویان لەسەردەستی (محمد)ﷺ بەدی هاتوون چۆن هەڵسەنگێنرێن و چ وەسف و ناوو نازناوێك بۆ ئەنجامدەرەكەیان دابنرێت؟ ئێمە لێرەدا وتەی هەندێك لەزانا بەویژدانەكانی خۆرئاواو ئەدیبە دادپەروەرەكانیان دیاری دەكەین كەتیای دا شایەتی لەسەر گەورەیی پێغەمبەر دەدەن...

(ویلّ دیورانت) دەڵێت: {ئەگەر باسی گەورەیی بكەین و سەنگی خۆی بۆ دابنێین بەو چەشنەی كەمرۆڤی گەورە چ جێگەو پلەیەكی لەدەروونی ئادەمی دا هەیە، دەبێت بڵێین كە — محمد— لەگەورەترینی گەورەپیاوانی مێژووە.. چونكە ئەو ئەركەی لەئەستۆنابوو كە ئاستی رۆحیو رەوشتمەندیی گەلێك بەرزكاتەوە كە لەكەش و ئاووهەوای گەرمەسێرو بیابانێكی وشك دا دەژیان و خۆیان خستبووە نێو شەوەزەنگی نائارامی وگومرایی یەوە.

-محمد- لەبەدی هێنانی ئەو مەبەست و نیازەی دا بەرادەیەكی وا سەركەوت كەهیچ كەسێكی چاكسازو چاكەخوازی دی لەمێژووی هەموو بەشەریەت دا پێ ی ناگات و هاوشانی نابێت. كەم كەسیش هەن، كە جگە لەو هەندێك هیواو مەبەستیان بەدی هێنابێت.

هەروەها ئەو (واتە محمد) لەرێی ئایینەوە بەئامانجی خۆی گەیشت، چونكە بەوپەڕی سووربوون و هۆگرییەوە پابەندبوو بەئایینەوە، لەو رۆژگارەش دا هیچ هێزێكی دی وەك (هێزی ئایین) عەرەبی هان نەدەدا بۆ گرتنەبەری ئەو رێبازەی كە ئەو بۆی هێنان و كە گرتیانەبەر.

پێغەمبەری ئیسلام توانی ی بچێتە نێو زەین و ئەندێشەیانەوە، لەهەموو مەترسی یەكانیان و هیواو ئەندێشەكانیان تێ بگات و بەگوێرەو رادەی تێگەیشتنیان لەگەڵیان دا بدوێت.

وڵاتی عەرەبیش لەكاتی دەسپێكرانی بانگەوازدا بیابانێكی وشك و برینگ بوو و چەند هۆزو تیرەیەكی لەبتپەرستان تێدا دەژیا كە نموونەو هاوشێوەیان لەبتپەرستی دا كەم بوو و پەرتەوازەو لێك جوداو دژ بەیەكیش بوون. بەڵام دوای هاتنی ئیسلام و پاشان دوای كۆچی دوایی — محمد —یش بوون بەنەتەوەیەكی یەكگرتوو و بەهێز. چونكە—محمد— هەموو داب ونەریتێكی دەمارگیریی كوێرانەو ئەفسانەو دیاردە پووچەڵەكانی ریشەكێش كردو لەجێ ی ئاینەكانی (یەهوودی و نەسرانی و ئەو ئاینە كۆنەی وڵاتەكەی دا) ئاینێكی ئاسان و رۆشن و تۆكمەی جێگیركرد، جگە لەجێگیركردنی بونیادێكی ئەخلاقی بەكۆڵەكە پتەوەكانی ئازایەتی و

سەربەرزیی نەتەوایەتی، کە لەماوەی کەمتر لەچارەکە سەدەیەکیش دا لەسەد جەنگ دا سەرکەوت، شوێنکەوتوانیشی لەماوەی سەدەیەك دا گەورەترین دەوڵەتیان لەدنیادا دامەزراند کە هەتا ئەمڕۆش وەك هێزێکی گەورەو بەسام لەنیوەی جیهان دا ماوەتەوەو سەنگ و بارستایی خۆی هەیە}[1]...

هەروەها ئەدیبی فەڕەنسایی (لامارتین)[2] دەڵێت: {ئەگەر (ئامانجی گەورە)و (کەرەسەی سادە) و (دەسکەوتی مەزن) بەو سێ پێوەرەی هەڵسەنگاندنی بلیمەتی ی مرۆڤ دابنرێن، ئیتر کێ دەتوانێت لەسەر (ئاقاری مرۆڤایەتی)-محمد- بەراورد کات لەگەڵ یەکێك لەگەورەپیاوانی مێژوودا؟ چونکە گەورەترین پیاو لەمێژوودا بەتەنیا نەیتوانیوە لەیەك سەردەم دا سوپا دروست کات و یاسای ڕێك وپێك دابنێت و دەوڵەت بنیات بنێت و چەندین وڵات و مەملەکەتیش ئازادو یەك خات.

هەندێك لەگەورەپیاوان تەنها توانای بنیات نانی دەوڵەتێکی ماددییان هەبووە، کە زۆرجار لەپێش مردنی خۆیان دا دەوڵەتەکانیان ڕووخاون و بەرلەوەی کە شانۆی ژیان بەجێ بێڵن بەچاوی خۆیان لەناوچوونی حوکم و شکستی ئەزموونەکانیان بینیوە.

بەڵام (محمد) هەستی ئینسانییەتی ئینسانی بزواندووەو، یاساو شەریعەتی ڕاستی پەیڕەوکردووەو وڵات و مەملەکەتانی لەدەوری کۆکردۆتەوەو هەموو گەلان و حکومەت و ملیۆنەها کەسی لەسێیەکی قەرەباڵغی گۆی زەوی ی خستۆتەژێر سایەی ئەو حوکمە عادیلانەیەوە، سەرەڕای ئەوەش مەڵبەندی هەر پەیکەرو بت و خواوەندو ئاین و بیروڕاو عەقیدەیەکی نامۆی هەڵتەکاندووەو چەندین مرۆڤی ناوچەکانی تری هوشیارکردۆتەوە..

بەڕاستی ئەو (واتە محمد) لەسەربنچینەی (کتێبێك)، کەهەر پیتێکی یاسایەك بووە، نەتەوەیەکی گەورەو فراوانی وەهای پێك هێنا کەهەموو گەل وتیرەو هۆزێکی لەهەموو چەشنە زمان و ڕەگەزێك لەخۆگرتبوو. لەدڵ و دەروونی ئەو نەتەوە موسڵمانەش دا نەریتی ڕق لێبوونەوەی بت و خواوەندە ساختەکانی چاندبوو و وای لێ کردبوون هەردەم پەیوەست بن بەپەرستنی خودای ڕاستەقینەی تاك و تەنیاوە، ئەو خودایەی، کە هەرخۆی هەیەو لەوجودایەو ئەگەرچی بەچاوی سەریش نابینرێت بەڵام ئاگاداری هەموو شتێکە. بەم مەنهەجەش سیماو تایبەتمەندییەکی زیندووی جوانی بەو نەتەوەیەی خۆی بەخشیوە کە مۆرکی جیاکردنەوەی

---

(١)بڕوانە: کتێبی(قصة الحضارة)ی (ویل دیورانت).جوزئی(٢)بەرگی(٤)،وەرگێڕانی بۆ عەرەبی(محمد بدران).

(٢) (لامارتین) شاعیرێکی بەناوبانگی ڕۆمانسی ی فەڕەنسایە(١٧٩٠ – ١٨٦٩) چەند دیوانە شیعرێکی هەیە، شیعرەکانیشی بەجوانترین شیعری شاعیرانی فەڕەنسا دادەنرێت لەسەدەی نۆزدەهەم دا. هەروەها ئەندامیش بووە لەحکومەتی کاتی ی فەڕەنساو لەساڵی(١٨٤٨)دا وەزیری دەرەوە بووە.

لەنەتەوەكانی دی بۆ دەستەبەر دەكات. پابەندبوونی موسڵمانانیش بەو عەقیدەیەوەی، كە بەرپەرچی هەر شتێكی سنوور بەزێنی حورمەتی ڕاستەقینەی ئیلاهی دەداتەوەو كە بەتوندی دژایەتی دەكات ئەو ڕێزو (فەزڵە)یە كەشوێنكەوتوانی (محمد)ی پێ دەناسرێنەوە.

موعجیزەی — محمد — لەوەش دا دیارە كەتوانیویەتی سێ یەكی گۆی زەوی لەو سەردەمەدا لەژێر بەیداخی بیروباوەڕەكەی دا كۆبكاتەوە. ئەمەش نەك هەر موعجیزەی ئینسانێك بێت، بەڵكو موعجیزەی ئەو بیروباوەڕو فیكرەیە كە پەیڕەویی كردووە. بێگومان ئەو بیروباوەڕی خوا بەیەك دانانەی كە (محمد) لەسەردەمی زاڵ بوون و باڵادەستی ی فیكرە ئەفسانەییو بۆش و پووچەڵەكان دا هێنایو بانگەوازی بۆ دەكرد خۆی لەخۆی داو لەكرۆك و ناواخنی پاكی دا كارایيو كارلێكی چەسپاندنی دەردەخست، ئەویش لەو چركەساتانەدا كەپێی كەوتە ئاخاوتن و دواندنی خەڵكیو هەر بەو ناوەڕۆكەش سەركەوت بەسەر هەموو پەیكەرەكانی عەقیدەی بتپەرستی و تێك شكاندنی بتەكان دا، تاكو بەنوورو ڕۆشنایی ی ئەو گەوهەرە پڕ خێرو بەرەكەتە سێ یەكی قەرەباڵغی پڕ لەدانیشتوانی گۆی زەوی ڕووناك بێتەوەو بدرەوشێتەوە.

ئیدی تاكە (فەیلەسووف)و (وتاربێژ)و (پێغەمبەر)و (بنیات نەری حوكمی یاساو شەرع)و (جەنگاوەر)و (بزوێنەری بیر)و (چەسپێنەری ئەو عەقیدە ڕاستەی كە لەسەر بناغەی عەقڵی ساغ دەوەستێت و كەهیچ وێنەو پەیكەرو نیگارێك بەپیرۆز دانانێت)و (دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتێكی ڕۆحی لەبیست وڵات و مەملەكەتی سەر زەوی دا) هەر تەنیا (محمد)بووە.

جا ئەگەر وردبینەوە لەهەموو ئەو پێوەرانەی كە بنچینەیەك بۆ گەورەیی مرۆڤایەتی دادەنێن ئەوا چ مرۆڤێكی دی لە (محمد) گەورەتر دەبینین؟!)[1] ....

---

(١) لەكتێبی (Mahomet) محمد، بەپێنووسی (فرانیسكۆ گابریل) — (Franeesco Gabrieli)ی بەڕێوەبەری پەیمانگەی (دیراساتی ئیسلامی) لەدانشگای (ڕۆما) كە هاوڕێی بەڕێزیشمان مامۆستا (محمد صالح البنداق) ئەو چەند دێرەی لەو كتێبەوە بۆكردبووین بەعەرەبیو بەو تەرجەمە وردوڕێك وپێكەی یارمەتیی‌داین. (نووسەر).

## ناوەرۆکی کتێب